# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی یەکەم

چاپی دووەم
٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

## لێکدانەوەی

## مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز

## بەرگی یەکەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

# سەرەتا

مـەیل و خواهیـشی خـوا وابـوو دەسـتمکرد بـە تەفـسیری قورئـانی پـیرۆز لـە سـورەتی ﴿یـس﴾ەوە، لەبـەر چـەند هۆیـەك كەلـە سـەرەتای تەفـسیری ئـەو جزمـەوە وتوومـە، وە لـەو سـەرەتادا چـەند شـتێکم وتـووە لـەبارەی گـەورەیی قورئـان و پێویـستی مـەردوم بـە قورئـان و تەفسیری قورئان، وە هەروەها چۆنێتی سروشتی ئەم تەفسیرەم باسکردووە لەبەر ئەوە لێرەدا بە پێویستم نەزانی هیچی تر بڵێم، بەڵکو دەستمکرد بەوەی کە مەبەستی ڕاستەقینەیە، وە ئەپاڕێمەوە لە خوای میهرەبان کە یارمەتیم بدات و لێم وەرگرێ و سوود بەخشی بکات بۆ ڕۆڵەکانی ئیسلام، وە ئەپاڕێمەوە کە ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکات و بیکات بە بەربەست و بەرهەڵستێ بۆم لە ئاگری دۆزەخ.

وصلي الله وسلم علي سيدي ومولاي رسول الله وعلي آله الطيبين و خلفائه الراشدين والأزواج الطاهرات، أمهات المؤمنين و كل تابع لهم بإحسان الي يوم الدين.

ــ آمين ــ.

# پێشەکی

﴿هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾

صدق الله العظيم

هەموو موسڵمانێك پێویستە باوەڕی هەبێ بەمەی کە گەورەترین منەتی خواو بەڕێزترین خەڵاتو بەنرخ ترین چاکەی بەسەر ئادەمی یەوە بریتییە لە قورئان. چونکە:

قورئان یەکەم سەرچاوەیە بۆ ئەم ئایینو شەریعەتە گەورەو گشتییە ئیسلامە کە تاقانە ڕێگای ڕزگارییە بۆ ئادەمیو جیهان لە هەموو گێژاوێکدا.

قورئان هۆی بەهێزیی نەپچڕاوی پەیوەندی بەندەکانی خوایە بە خوای خۆیانەوە وە مایەی گەیشتنیانە بەڕەزامەندی خواو چاکە بێوێنە نەبڕاوەکەی ڕۆژی دوایی، قورئان جیاکەرەوەی چاكوخراپ، خێرو شەڕو ڕاستو درۆو ڕێكو چەوتو هەموو هەقو ناهەقێکە.

قورئان چارەسەری هەموو دەردو نەخۆشییەکی دەرونیو کۆمەڵایەتی ئەکات، وەبەرگری هەموو ستەمو ناڕەواییو دەست درێژیەك ئەکات.

قورئان ڕێزو نرخ ئەدا بە ئادەمی، وەئەیگەیەنێ بە پۆپەی هەرە بەرزی خۆی، وە هەموو مافێ ئەدا بە خاوەنەکەی بێ کەمو کوڕیی.

قورئان گەورەترین موعجیزەی خوایە لەم جیهانەدا هەموو کات گەورەییو بەرزی ئایینەکەمانو پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) ڕوون ئەکاتەوە.

قورئان ئەو قورئانەیە کە خوای گەورە دەربارەی ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾.

قورئان فەرموودەی خوایە کەواتە هیچ پێنوسێكو هیچ زوبانێك ناگات بەڕوون کردنەوەی ڕادەی بەرزیو گەورەیی قورئاندا، وەباشترین سەنای ئێمە بۆ قورئان ئەمەیە بڵێین: ئێمە ناتواناو دەستە پاچەین لەئاستی ڕوونکردنەوەو دیاری کردنی ڕادەو پلەی بەرزی قورئان.

کەواتە گەورەترو بەنرخ ترینی هەموو خزمەتێ بۆ گشتیو هەموو یەکەیەکەیە بریتییە لە هەوڵو تێکۆشان لەڕێگای گەیاندنو بڵاو کردنەوەی قورئانو چەسپاندنی مەبەستەکانی قورئان لەناو هەموو گەلو تیرەو نەتەوەکانی ئادەمیدا، وە بۆ بەجێهێنانی ئەم مەبەست بە

ڕاڤەو تەفسیر کردنی قورئان بەنوسین زۆر بەکارو پڕ سوودە، جا لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی لەسەرخۆم کە بەگوێرەی توانا و زانینم لەو ڕووەوە خۆم بەشدار بکەم لەو خزمەتە گەورەدا، وەلەبەر ئەوەی تەفسیر بە زمانی کوردی زۆر کەمە، وەگەلی کوردیش ئەتوانم بڵێم: سەردەستەو یەکەمە لەسۆزو ڕێزو گوێڕایەڵیدا بۆ قورئان.

هەر چەند شارەزاییم کەمەو کەمتر خەریکی نوسینی کوردی بووم، بەڵام لام وایە ئەم تەفسیرە بەجۆرێ هاتووە مەبەستەکەی بە ئاسانی وەربگیرێ بێ گرێو گیران، وە لەم تەفسیرەدا سەرچاوەی باوەڕ پێ کراوم هەڵبژاردووەو شوێنی ڕای بەهێزی کۆڕی زانایان کەوتووم، وەلەهەر شوێنێکدا پەندو ڕایەکی باوەڕ پێکراو بووبێ بەهێزترینم کردووە بە تەفسیر، وە زۆربەی ڕایەکانی ترم لەداوێنەوە نویسوە، وەلەبەر ئەوەی تەمێ و ڕێنموونی کردن گرنگ ترین مەبەستو ئامانجی قورئانە زۆرتر ئەم بارەم گرتووە بەپێی ئەوەی کە زانی بێتمو وەرم گرتبێ لە فەرمایشی زانایانی ئیسلامەوە.

وە بۆ زیادە ڕوونکردنەوە پەیوەندی نێوانی ئایەتەکانم باسکردووە پێش گەیشتن بەئایەتی دواو تەفسیر کردنەوەی، وە ئەو باسی پەیوەندییە بووە لە ڕاڤەو هۆی ڕوون کردنەوەی مەبەستی هەر ئایەتێ کە لەدوایەوە هاتبێ، پاشان تەفسیری ئایەتەکەم کردووەتەوە بەجۆرێ کە ئەو کەسەی عەرەبی نازانێ ئەزانێ کام وشە ئەبێتە تەفسیر بۆ وشەی قورئانەکە، ئینجا زۆر بەکورتی مەبەستی ئایەتەکەم وتووە.

لەکۆتاییدا داواکارم لەزاناو مامۆستایان هەر هەڵەیەکیان بینی ئاگادارم بکەن، وە ئاپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە وەری گرێو بیکات بەهۆی سڕینەوەی گوناهم، وەپڕ سوودو پیتو بەرهەم داری بکات بۆ خۆمو برا کوردەکانم.

**وصلي الله وسلم علي سيدنا محمد وعلي آله وصحبه وكل تابع لهم باحسان الي يوم الدين**

# سورەتی ﴿الفاتحە﴾
## مەککەیی یەو (٧) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئـەم سـورەتە بـەرێزترو گـەورەترینی سـورەتەکانی قورئانـە، وەك لـە حەدیـسی (ئـەبو هورەیرە)ەدا هـاتووە لـە چەند ڕێگایـەکی ڕاسـتو تـەواوەوە (صـحیح)ەوە کە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی بە (ئوبەی کەواتە کەعب): سوێند بە کەسێ کە گیانی منی بەدەستە وێنەی ئەم سورەتە نەهاتووەتە خوارەوە لە (تەورات)و نەلە (ئینجیل)و نەلە (زەبوور)و نەلە (قورئان)دا.

ئەم سورەتە بە چەند ناوێکی گەورەو گرنگ ناوبراوە، یەکێ لەوناوانە کە زۆرتر پێی بەناوبانگە ﴿الفاتحة﴾یە یا (فاتحة الکتاب)ە، چونکە یەکەمی قورئانەو لەمەوە دەست ئەکرێ بە قورئان، وەناو ئەبرێ بە (أم القرآن)، چونکە وەك بنەڕەت وایە بۆ قورئانو هەموو مەبەستەکانی قورئان ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەم سورەتە، جا لەبەر ئەوە زانایانی ئیسلام ئەم سورەتەیان بە گرنگ گرتووەو زۆر درێژەیان داوە بە تەفسیر کردنی، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبە گەورانە بکات کە بە ناوبانگن، وەلە ناو ئەو هەموو تەفسیرە گەورەو درێژانەدا گوڵ چینم کرد، چەند شتێکم باسکرد کە لەدڵما گرنگتربوونو لەگەڵ ڕێگەو سروشتی تەفسیرەکەمدا ڕێکتر بوون کەلەم تەفسیرەدا باری تەمێو ئامۆژگاریەکانی قورئانم گرتووەو لەو ناوچەیە دواوم.

ئەم سورەتە ئەبێ لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا بخوێنرێ، نوێژی فەرز یا سوننەت، وە هەر نوێژێ ئەم سورەتەی تیا نەخوێنرێ بە نوێژ دانانرێ بەلای زۆربەی زانایانەوە وەك لەم فەرموودە (حەدیس)ەوە وەر ئەگیرێ کە (موسلیم)و (بوخاری) ئەیهێنن لە (عوبادەی کوڕی صامت)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب) نوێژ نیە بۆ هەر کەسێ کە (فاتحة)ی تیا نەخوێنێ، وە بێگومان ئەوەش لە خۆڕایی نیە، بەڵکو ئەبێ

هۆیەکی گرنگی هەبێ بۆ ئەوە، وە ئەوەی کە بۆ ئێمە دەرکەوێ لەو بارەیەوە ئەمەیە: ئەم سورەتە ئاماژە ئەکات بۆ چەند بەندێکی گەورە لە بیرو بڕواو عەقیدەی ئیسلامی، وە بۆ چەند مەبەستو بۆچوونو تێگەیشتنێکی ئیسلامی، وە بۆ چەند مەبەستو پەندو تەمێیەکی ئیسلامی کە بنەڕەتێکی سەرەکین بۆ ئایینی ئیسلامو مەبەستێکی پێویستن بۆیو بەبێ ئەوانە ئیسلام نابێو بەدی نایەت، وەك دەست نیشانیان بۆ ئەکەین بە یارمەتی خوا لەکاتی تەفسیری ئایەتەکاندا، کەواتە با زۆر بخوێنرێو بڕوادارو موسڵمان هەمیشه بژی لەگەڵ ئەو بیرو بڕواو مەبەستە گەورەیانەداو هەمیشە دڵی بەستراوو پەیوەست بێت پێیانەوە، تا نەترازێو لا نەدا لە ڕێگە ڕاستەکەی خوا. خوای گەورە دەروازەی ئەم سورەتە ئەکاتەوە، وەك دەروازەی هەموو سورەتەکانی تری قورئان بێجگە لە سورەتی ﴿التوبة﴾، بەم وشە بەفەرە: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾.

لە پێشەوە لە دڵما بوو وە ویستم ئەم وتەیە تەفسیر نەکەمەوە، لەبەر دوو شت:

یەکەم: ئەوەندە لەناو بانگەو زۆر بەکارئەهێنرێ مەردوم تێئەگەن لەواتاو مەبەستەکەی.

دووەم: هیچ وتەو دەستەواژەیەك (عیبارەتێ) دەست ناکەوێ کە پڕ بە پڕو جێگری بێت، کەواتە با لەسەر شێوە بێ وێنەکەی بهێڵرێو بە وتەو دەربڕینی ناتەواو گەرد نەکەوێتە سەر ڕووو شێوەی شیرینی، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لە ئایەتو وتەکانی تری قورئان هەر وانو بێ وێنەو بێجێگرنو تەفسیریش ئەکرێتەوە بە زمانی کەمو کوڕو دەستەپاچەی ئێمە، بۆ نزیك خستنەوەی ماناومەبەستەکانیان لەدڵو زانینمانەوە، لەبەر ئەوە لەو نیازە پەشیمان بوومەوە و لێرەدا لە تەفسیرەکەیا ئەڵێم: هەر بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانی خاوەن بەزەیی بێسنوورو فراوانەوە دەست ئەکەین بەم سورەتەو بە قورئان.

زانایان چەند ڕایەکیان هەیە لەم وتە پیرۆزەدا: ئایا ئایەتێکە لە هەموو ئەو سورەتانەی کەوا لە پێشیانەوە، یا لەهیچ سورەتێ نییەو ئایەتێکی سەربەخۆیە لە قورئانو سورەتەکانی

پێ‌جیا کراوەتەوە لەیەکتر؟ یابەشێکە لە سورەتی ﴿الفاتحة﴾و سەربەخۆیە لە سورەتەکانی تردا؟ لەناو ئەم ڕایانەدا بەهێزتر ئەوەیە کە بەشێکە لەم سورەتەو بەمەوە ئایەتەکانی ئەبن بە حەوت ئایەت کە بەلای هەمووانەوە حەوتن، ئیتر ئایا بەشێك بێت لە سەرەتەکانی تر یا نەء ؟

دەست پێکردن بەناوی (خواوە لەیەکەم جارەوە، پەندو ئەدەبێکە کە خوای پەروەردگار سروش (وحی) پێکرد، هەر لەیەکەم جارەوە کە دەستی کرد بە ناردنە خوارەوەی قورئان لەئەشکەوتی (حیرا)دا بەناردنی سەرەتای سورەتی ﴿العلق﴾: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ و هەر ئەوەش ڕێکە لەگەڵ یاسای گەورەی بۆچوونی ئیسلامدا کە هەر خوا یەکەمەو لەپێش هەموو شتێکەوەیە، چونکە هەر خوا هەیەو بوونی ڕاستەقینەی هەیە، وە هەر شتێ ببێ لە بوونی ئەوەوە وەرگرتووە، وە هەموو شتێ یەکەم جارو سەرەتای بوونی لەوەوە دەست پێ‌ئەکات، کەواتە ئەبێ هەموو دەست پێکردنێکی ڕەوا هەر بەناوی ئەوەوە بێت، وەئەبێ بەناوی ئەوەوە هەموو کردەوەو بزووتنەوەیە ببێت، هەرچۆنێ ناوی ﴿اللَّهِ﴾ تایبەتییە بە خواوەو بە هیچ کلۆج دروست نییە بەکار هێنانی بۆ هیچ کەسی تر، هەروەها ناوی ﴿الرَّحْمَٰنِ﴾ تایبەتییە بە تانیاش بێت، کەواتە باشتر تایبەتی ئەبێت کاتێ ﴿الرَّحِيمِ﴾یشی لەگەڵ بێت.

ئەم دوو سیفەت‌و ناوە: ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، هەموو بارو جۆرو شێوەو شوێنی میهرەبانی‌و بەزەیی ئەکرنەوەو لێیانەوە وەرئەگیرێن کە ئەوەش هەر بۆ خوا دەست ئەداو ئەگونجێ، کەواتە ئەك دوو ناوە بە فەڕو یاسایە ترمان نیشان ئەدات لە بەندو یاساکانی بۆچوونی ئیسلامی، وە پەیوەندی بەینی خواو بەندەکانی ڕوون ئەکاتەوەو جیای ئەکاتەوە لەو جۆرە پەیوەندیانەی کەلە زۆر چەرخی نەفامیدا بڕیار ئەدران، وەك لەمەوپاش باسیان ئەکەین بە یارمەتی خوا.

لەپاش دەست پێکرنی بە﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ناوی خوای خاوەن بەزەیی و میهرەبان، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ هەموو سوپاس و ستایش و وەسف دان بەچاکە بۆ خوایە کە پەروەردگارو پێکەیەنەرو تەگبیر کەری هەموو جیهانیانە، بێگومان بڕوادار تەنها بە بیر کردنەوە و یادی خوا ئەو سوپاس و ستایشە دڵی داگیر ئەکات و یەکەم شتە کە دێت بە دڵیدا، چونکە هەر لە یەکەم جارەوە ئەبینێ و ئەزانێ کە بوونەکەی بەهرەیەکە لەلایەن خواوە، وە شتێکی ئاشکرایشە کە چاکە و بەهرە دڵ ئەهێننەو سۆزو پەرۆش و سوپاس، وەچاو لەبەریی تیا ئەهێننە جۆش بۆ بەخشندەی بەهرە و چاکەکە، ئینجا با بوەستێ کەلە هەموو کات و چرکەیەکدا ئەو هەموو چاکە و بەهرانە کە وەك بارانی بەهار بە تەوژم ئەڕژێن بەسەر گیانلەبەراندا، بە تایبەتی ئەم ئادەمییە کە جیا کراوەتەوە لە هەمووان و ڕادە و پلەی بەرزی تایبەتی پێدراوە... جا لەبەر ئەوە سوپاس و ستایش بۆ خوا لەسەرەتاو یەکەم جارو لەم جیهانەدا، وە سوپاس و ستایش بۆ خوا لەدوا دوایی و لە ڕۆژی دواییدا، کە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ ئەکات بەندو یاسایەکە لە بەندو یاساکانی ئیسلام، ئینجا لەگەڵ ئەمەی ئەو سوپاس و ستایشە بەرهەمێکی سروشتییە بۆ چاکە و بەهرەکانی خوا، کەواتە بەندە هیچ هونەرێکی نییە و شایستەی پاداشت نییە لەسەر سوپاس و ستایشەکەی، لەگەڵ ئەوەدا میهرەبانی و فەزڵی خوا ئەوەندە زۆرە هەرکات بەندەی بڕوا داری سوپاس و ستایشی کرد بۆی ئەنوسێ بە کردەوەیەکی چاکی وا کە قورستربێت لە کردەوەکانی تری... وەك، (ئیبن و ماجە) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن و عومەر)ەوە –خوا لێیان ڕازی بێ– کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەندەیە لە بەندەکانی خوا ووتی: ﴿یارب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك﴾، ئینجا فریشتە نووسەرەکان پەکیان کەوت نەیان زانی چۆنی بنووسن و چ ڕادەیەکی بۆ دابنێن، لەبەرئەوە بردیان بۆ حوزوری خواو وتیان: ئەی خوایە بەندەیەکت وتەیەکی وتوەو نازانین چۆنی بنوسین، ئینجا خوایش، کەلە هەموو کەس زاناترە – فەرمووی: بەندەکەی من چی وتووە؟ ئەوانیش عەرزیانکرد کە وتی: ﴿یارب لك الحمد...﴾، خوایش فەرمووی پێیان: بەو جۆرە کە وتویەتی بینوسن هەتا پێم ئەگات ـ واتە بە ڕۆژی دواییدا ـ من خۆم پاداشتی ئەدەمەوە پێی.

بەشی یەکەمی ئەم ئایەتەئاماژەی کردبەو یاسا گەورەیەی کە باسکرا، وەبەشی دووەمیشی ﴿رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ دەست نیشان ئەکات بە یاساو بەندێکی گەورەو گرنگی تر کە بریتییە لە پەروەردگاریی و کار بەدەستی یەکی گشتی بێ سنوور لە هەموو بارو ڕوویەکی ژیانەوە، وە خاوەن داریەکی وا کە هەموو شتێکی ئادەمی و جیهانی جیهانیان بە پێی فەرمان و بڕیاری خوایە بەتەنها.

خوای پەروەردگار کە ئەم بوونەوەری دروستکردووە، ئیتر وازی لێنەهێناوەو هەروا لەرەڵلای نەکردووە، بەڵکو وەك بە تەنیا و بەبێ هاوبەش دروستی کرد، هەروەها بە تەنیا و بەبێ هاوبەش پارێزگاری و چاودێری و سەرپەرشتی ئەکات، وە تەنیا خۆی کار بە دەست و بەڕێوەبەری هەموو کارو باریەتی، وە پەیوەستی نێوان خۆی و دروستکراوەکانی هەمیشەییە لە هەموو کات و لە هەموو حاڵەتێکدا.

ئەو پەروەردگاریی و خاوەن دارایی و کار بەدەستییە گشتی و بێ سنوورە دوو ڕێگایەو شوێنی جیابوونەوەی ڕێگای ڕاستی تاك و تەنیایی و یەك تایی خوایە لە هەموو ڕێگا درۆو چەوتەکانی تر کە بێ تروسکەن لەڕووناکی بڕواو بە هەموو جۆرێ لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای تاك و تنیا، وە ئەم باوەڕە ناڕاست و نارەوایە لە کۆنەوە بووەو ئێستاش هەیە، قورئان بۆمان باس ئەکات لەبارەی هێندێ لە بت پەرستەکانەوە کە ئەیان وت: ئێمە ئەمانە ئەپەرستین لەبەر ئەوەی نزیکمان بخەنەوە لە خواوە، وە لەبارەی تاقمێ لە نامەدار: جوولەکەو گاور... کە زاناکان و عابیدەکانیان بڕیاریاندا بۆ خۆیان بە چەند خوایە تر بێجگە لە خوا، واتە بەپێی بەرنامەو یاسای ئەوان ڕەفتاریان ئەکرد، وە هەروەها باسی ئەو هەموو ئوممەت و گەلە بت پەرستانەمان بۆ ئەکات کە پێغەمبەرە کانیان بۆ ڕەوانەکران تا بیانگێڕنەوە بۆ ڕێگای تاك و تەنیای خوا، لە ڕێگای چەوتی بت پەرستیانەوە، بەتایبەتی لەو سەردەمی نەفامیەدا کە ئیسلام هات، هەموو جیهان شەپۆل ئەدا بەبت و پەرستییەوە، بە چەندەها بتی جۆر بەجۆرو جیاواز کە هەر کۆمەڵێکیان دائەنا بە ژێر دەستەو بچووك لەپاڵی بتێکی گەورەدا کە ناویان ئەبرد بە گەورەو خوای پەرستراوەکانی تر.

ئەم پەروەردگارێتی و کار بە دەستی و بەڕێوەبەرییە گشتییەی کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کرد هەرکەس بڕوای پێی ببێ و بیکا بە بەرنامەی ژیانی، ئەو کەسە ڕژێمێکی تێرو تەواوی هەیە لە عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیداو ڕزگار ئەبێ لە بێ سەرو پێی و بێ ڕژێمی عەقیدەو سەرگەردانی و بێئارامی دەروون لەنێوان چەند پەرستراوێکدا، کە نازانێ ڕوو بەلای

کامیانەوە بکاتو کامیان پێویست ترە ڕازی کردنی، وە چۆن هەموویان ڕازی بکات، ئینجا ئەم ئایەتە دەست نیشان ئەکات کە ئەو کار بەدەستیو بەڕێوەبەریی خوا بۆ هەموو، شتێکی هەمیشەییە بە بێ پچڕانو بڕانەوە، نەك وەك (ئەرستۆ) ـ کە بەگەورە ترین فەیلەسووف دائەنرێو ژیریی ئەو بە گەورەترین ژیریی تەماشا ئەکرێ ـ ئەو (ئەرستۆ)یە ئەڵێ: خوا ئەم بوونەوەرەی دروستکردو لەپاشا وازی لێهێناو گوێی پێنادا، چونکە بەرزو گەورەترە لەوەی کە خەریك بێتو بیربکاتەوە لە غەیری خۆی! بەڵکو ئەو هەر خەریکە بە خۆیەوەو بیر هەر لە خۆی ئەکاتەوە!!

کاتێ کە ئیسلام هات جیهان پڕبوو لە چونکە بیروباوەڕو بۆچوونو شتی پڕوپووچو ئەفسانە. وە هەقو ناهەقو ڕاستو پڕوپووچو پاڵفتەو شتی قەڵبو ئاینو ئەفسانە تێکەڵ بوو بوون... وە دڵو دەروون لەناو ئەو هەموودا داماوو سەرگەردان بوو، وە ئارامی نەئەگرت لەسەر بارێ، وە بنەڕەتو هۆی ئەو بێ ئارامیو تەمو تاریکییە تێ نەگەیشتنو بۆچوونی تاریك تاریكو ناڕەوا بوو لە بارەی خواو سیفەتو نیشانەکانیو پەیوەندی دروستکراوەکانی پێیەوە، وە بە تایبەتی جۆری پەیوەستیو پەیوەندی ئادەمی پێیەوە، وە بە هیچ کلۆج نەئەگونجا دەروون دامەزرێ لەسەر بڕیارێك لەبارەی ئەم بوونەوەرەوەو ئادەمیو بەرنامەی ژیانێ بۆ ئادەمی پێش ئەوەی دامەزرێ لە بارەی عەقیدەو تێگەیشتنی لە خواو لە سیفەتەکانی، وە پێش ئەوەی بگات بە باوەڕێکی ئارام دەرو دڵنیاکەر لەناو ئەو هەموو بیروباوەڕە پڕو پووچانەی کە بەدرێژی چەند چەرخ تەپیان دابوو لەمێشكو لە دەرووندا، وە مەردوم تێ ناگات لە ئەندازەو ڕادەی پێویستیو ناچاری بەو ئارامو دڵدامەزرانە، مەگەر کاتێ خۆی بکەوێتە ناو ئەو هەموو شتە پڕو پووچەی کە باسکران، وە بژی ماوەیەك لەناو تاریکیو بێئارامی ئەو بیروباوەڕی ناڕاستانەدا، جا لەبەر ئەوە یەکەم ئامانجو مەبەستی ئیسلام ئازاد کردنی دڵو دەروونە لە هەموو شتێکی ئەفسانەو پڕو پووچ، وە جێگیر کردنی بیروباوەڕێکی ڕاستو دروستو ڕەوا لەبارەی خواو سیفەتەکانیو پەیوەندی بە دروستکراوەکانیو پەیوەندی ئەمان بە خوای خۆیانەوە، ئینجا لەبەر ئەوە تاكو تەنیایی خوا بەشێوەکی تەواوو پاكو خاوێن کە بە هیچ ڕەنگ تۆزو گەردێکی بەسەرەوە نەبێ، نەلە دوورو نەلە نزیك، ئەو تاكو تەنیاییە یەکەم یاساو بەنرەتێکە کە ئیسلام هێنایو چەسپاندی، وە هەمیشە پاكو خاوێنی ئەکاتەوە لە دەرووندا ئەیەوێ بە هیچ جۆر تۆزو تەمو تاریکی ڕووی تێنەکات، وە هەروەها لەبارەی سیفەتەکانییەوە ئەیەوێ

بە ڕوونیو بەو جۆرو شێوەی کە ڕاستو شایانە جێگیریان بکات لەدەروونـدا، چونکە بە ناسینی خواو سیفەتەکانی دڵو دەروون ڕزگار ئەبێ لەو هەموو بیرو باوەڕە لارو چەوتانەو ئەو هەموو ئەفسانەو فەلسەفەو خەیاڵاتە پڕو پووچانەی کەلە کۆنو تازەوە مەردومی زۆرو زەبەنەیان پێ گومڕاو سەر لێ شێواو بوو، وەلە پلەی بەرزی ئادەمێتی هاتنە خوارەوە بۆ ڕادەی پەست تر لە هەموو گیان لەبەرانی تر.

ئەو کەسەی کە سەرنجی ئەو هەموو تێکۆشانە بدا کە ئیسلام هەڵسا پێی، ئەو تێکۆشانەی کە لە ئایەتەکانی قورئاندا دەرئەکەوێ، ئەو کەسەی کە سەرنجی ئەوە بدات، بەبێ ئەوەی سەرنجی ئەو تەمو تاریکییە بدات کە مەردومی تیا ئەژی بە گومڕایی لە چۆڵو بیابانی نەفامیو نەزانیو بەد عەقیدەیدا، ئەو کەسە لەوانەیە تێنەگات بە ڕادەو ئەندازەی پێویستی بەو هەموو تێکۆشانو هەوڵو خەریك بوونەی کە ئیسلام هەڵسا پێی لەبارەی چەسپاندنی ئەو بیروباوەڕە پاكو ڕاستەی کە باسکرا، کە بریتییە لە بڕوا بە خواو سیفەتەکانیو ناسینیان بەو جۆرو شێوەی کە شیاوو شایانە... بەڵام هەرکەس سەرنجی ئەو دووانە بدا تێئەگات لە پێویستیو ناچاری بەو هەموو هەوڵو تێکۆشانە دوورو درێژە، هەرچۆنێ تێئەگات لە ئەندازەی گەورەییو گرنگی ئەو کارو کردەوەی کەئەم ئایینو عەقیدەیە پێی هەڵسا، وە هەڵئەستێ بە ئازادکردنی دەروونی ئادەمیو بەرەڵاکردنی لە کۆتو زنجیری نەفامیو بەد عەقیدەیی، وە ڕزگارکردنی لە ئەركو مەینەتی پەرستنی چەند بتو شتی پڕوپووچ.

ئەو هەموو جوانیو شیرینیو تێرو تەواویو ڕوونیو سوكو ئاسانی بڕواو عەقیدەیە کە ئیسلام هێنای... ئەوانە دەرناکەون بۆ دڵو ژیریی بە تەواوی مەگەر کاتێ بیربکرێتەوە لەو هەموو شتە لارو چەوتو پڕوپووچەی کە باسکرا... هەرکات ئەو بەراوردە کرا ئەو کاتە دەرئەکەوێ کە ئەم عەقیدەو ئایینی ئیسلامە پیتو فەڕو ڕەحمەتێکە بۆ دڵو ژیرییو سوكو ئاسانو بێئەركو مەینەتە لەسەریان،

ئینجا ئەو دوو سیفەتی بەزەیی و میهرەبانیە دووبارە ئەکاتەوە کەلە سەرەتای سورەتەکەوە بە ئایەتێکی سەربەخۆ ئەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بۆ ئەوەی دڵنیای بکات لەسەر ئەو نیشانەو سیفەتە ئاشکرایەی کە زاڵ و پێشکەوتووە لە پەروەردگاریی و خاوەن دارییە گشتییەدا، وە بۆ ئەوەی جێگیر بکات لە دڵدا بنەڕەت و پایەی ئەو پەیوەندیی و پەیوەستییەی کە هەیە لە بەینی پەروەردگارو بەندەو دروستکراوەکانیا، یا جێگیر ببێ لە دڵا کە پەیەندی و پەیوەستی میهرەبانی و چاودێری هەیە کە سوپاس و چاولەبەریی فەراهەم ئەهێنێ لەدڵدا، پەیوەستی و پەیوەندیەك کە بەرپا ئەبێت لەسەر ئارام و خۆشەویستی دەرئەخات، کەواتە هەربە سروشت دڵ ئەچێ بە پێشوازی ئەو بەزەیی و میهرەبانییەوە بە هەموو خۆشی و سوپاس و چاو لەبەرییەوە.

خوای پەروەردگار بەلای ئیسلامەوە بەو جۆرە میهرەبان و بەزەیی دارە بۆ بەندەکانی، نەك بیان تارێنێ و دەریان بکات بە وێنەی دوژمن، وەك ئیغریقیەکان ئەیان وت دەربارەی بتەکانی (ئۆلۆمپ)، وە نییە لە کەمینا بۆیان و هەمیشە خەریکی پیلان گێڕی نییە دەربارەیان بۆ سزادان و تۆڵە لێ سەندنیان، وەك لە نووسراوی پڕو پووچی چەرخی کۆنی نامەدارا هەیە و بەدەلەسەو دەست هەڵبەست تێکەڵی ئایینەکەیانکرد، وەك ئەو ئەفسانەی کە هاتووە لەبارەی بورجی (بابل)ەوەو لە ئیسحاحی یانزەی (سفر التكوين)دا هەیەو ئەڵێ: دانیشتوانی جیهان یەك زمانیان بووەو بەیەك شێوە قسەیان ئەکرد، وە کاتێ لە ڕۆژهەلات کۆچیانکرد ڕێیان کەوت لە ناوچەیە لە خاك و وڵاتی (شەنعار) لەوێدا نیشتەجێ بوون، ئینجا تەگبیریانکردو وتیان با خشت ببڕین و شارێ دروست بکەین لەگەڵ (بورج) منارەیەکی زۆر بەرزدا، وە ناوو نیشانێ بۆ خۆمان دانێین تا پرژو بڵاو نەبینەوە بەسەر زەویدا، ئینجا خوا هاتە خوارەوە بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو شارو بورجەیدا کە ئادەمی دروستی ئەکەن، ئینجا خوا وتی: ئەمانە یەك گەلن و یەك زمانیان هەیە بە هۆی ئەوەوە یەکێتیان هەیەو ئەتوانن شتی وا بکەن، وە واز ناهێنن و هەرچیان ویست ئەیکەن، کەواتە با بچین بۆ خوارەوە بۆ سەر زەوی زمانیان بەش بەش و جۆر جۆر بکەین تا لە قسەی یەکتر تێ نەگەن، ئینجاخوا لەو زەوییەدا نەیهێشتن و پرژو بڵاوی کردنەوە بە ڕووی زەویداو لەبەرئەوە وازیان هێنا لە دروستکردنی شارەکە، جا لەبەر ئەوە ئەو خاکە ناو برایە (بابل)، چونکە لەوێدا خوازمانی

جۆر بەجۆر کردن، وە لەوێدا پرژو بڵاوی کردنەوە بەسەر هەموو ڕووی زەویدا، ئەگەر خوا میهرەبانی نەکردایەو ئیسلامی نە ناردایە، مەردوم گومڕاو سەرگەردان ئەبوو و ئەکەوتە شوێن بیروباوەڕی ئاوا پڕوپووچ، کەواتە با ئەمەبکەین بە نوونەو بیری لێ بکەینەوە تا بزانین ئیسلام چ ڕەحمەتێکی گەورەیە بەسەر ئادەمییەوە!! ئینجا ئاماژە بۆ بەندو یاسایەکی گەورەو گرنگ لە ئیسلاما کە زۆر بەکارو سوود بەخشە لەژیانی هەموو ئادەمیدا، وە ئەوەش بریتییە لە بڕوا کردن بە ڕۆژی دوایی کە بەهێنانی ئەم سیفەتە دەست نیشانی بۆ ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ کەخاوەنی هەمووکاروبارێکە لە ڕۆژی دواییدا، کە ڕۆژی تۆڵە و پاداشتە. زۆر جار مەردوم بە خوایەتیو پەروەردگاریی خوا هەیە، بەڵام بڕوای نییە بە ڕۆژی دواییو زیندوو بوونەوەو پاداشو تۆڵە وەك قورئان بۆمان باس ئەکات لە چەند ئایەتو شوێنێکدا، کەواتە پێویستە بە تایبەتی ئاماژە کردن بۆ بڕواکردن بەو ڕۆژەش کە بەندێکی زۆر گەورەو گرنگە لە ئاییندا و بەندێکی سەربەخییە لە ڕەوانە کردنی هەموو پێغەمبەراندا ـ دروودی خوایان لێ بێ ـ ئەم بەندە زۆر بەنرخە لە مەدا سەرنج ڕائەکێشێو دڵ ئەبەستێ بەجیهانێکی ترەوە لەپاش ئەم جیهانی ئێستایە، کەواتە ئارەزوو پێویستی ئەم جیهانو زەوییە، ئەو بڕوا دارە داگیرو ژێر دەستەناکەن، بەڵکو ئەم ئەتوانێ زاڵ ببێو سەرکەوێ بەسەر ئەواندا، وە پەلەو هەڵپەو بێئارامی دڵی داناگرێو دنیای لەبەر چاو تەنگو تاریك ناکات، لەپێناوی پێکهێنانی بەرهەمی کۆششو کردەوەکانیدا، چونکە ئەزانێ بەشو ژیانی هەر ئەمە نییە کەلەم جیهانەدایە، وە هەرچی لەدەست دەرچێو هەرچی بەسەر بێت هەروا بەبێ سەرو شوێن ناڕوا، بەڵکو هەمووی ئەبینێتەوە لە ڕۆژی دواییدا، جا کەواتە ئەم بڕوایە هۆی ڕزگار بوونە لە کۆتو زنجیری بەندەیی هەوەسو ئارەزوو، وە مایەی ئازادیو سەربەستییەکە کە شایانو شایستەیە بە ئادەمێتیو ئادەمییەوە، وە هۆی جیابوونەوەی ئادەمێتی ڕاستەقینەیە لە شێوە بەرزەکەی خۆیدا کە خوا بۆی داناوە، لەو شێوە ناڕاستو پەستەی کە نەفام ئەیهێنێ بەسەر خۆیدا، بێگومان هەرگیز ناگونجێ ژیان ببڕێ بەڕێوە لەسەر بەرنامە بەرزەکەی خوا تا ئەم بڕوایە لەدڵی مەردومدا جێگیر نەبێ، وە تا دڵی پڕ ئارام نەبێ بە بڕوا بە هاتنی ژیانێکی تری نەبڕاوە لەجیهانو ڕۆژێ ترا کە هەر ئەوە شایستەیە بۆ فیداکاریو خۆ بەختکردن لە پێناویدا، بێگومان بڕوادار بەو ژیانو ڕۆژە زۆر جیاوازەو هەرگیزوەك بێبڕوانییە نەلەهەستو نەلە سروشتو نەلە کردەوەو ڕەوشتدا، بەڵکو ئەو دوانە دووجۆری جیاوازن، هەرگیز یەك ناگرن نەلەکردەوەی ئەم جیهانەونەلەپاداشتی ئەوجیهاندا.

ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ دوو بەندو یاسای بیرو باوەڕیی تر کەلە یاساو بەندەکانی تری ئەم سورەتەوە پەیدا ئەبن و وەك بەرهەم و سەرەنجام وان بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ ئەی خوای پەروەردگار تەنها تۆ ئەپەرستین و ئەو پەڕی گوێڕایەڵی بۆ تۆ ئەکەین ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی و کۆمەکی ئەکەین، واتە لە هەر کارو مەبەستێکدا کە ڕەوا بیت و بە خۆمان ناکرێ و سەربەخۆ نین تیایا، وەك بە بەرهەم گەیاندنی ئەو کارانەی کە پێیان هەڵئەسین، یا هەر کارو مەبەستێ کەلە توانای بەندەدا نییەو بە خوا نەبێ نابێ، وەك بە هاوارەوە هاتن و فریاد ڕەسی بە شێوەی نهێنی و غەیبی کە تایبەتییە بە خواوە، بۆ ئەم دوو جۆرە ئەبێ هەر لە خوا داوای کۆمەکی بکرێ، وە بۆ غەیری ئەم دوو جۆرەش ئەبێ بەندە بەم شێوە بێت: یارمەتیدان و بەهێزکردن و کۆمەکی وەرگرتن لە هەر هێزێکی ئادەمی کە ڕوو بە خوا بێت و بە پێی بەرنامەی خواو لەسەر خێرو چاکەو ڕاستی بێت، بەلاّم ئەوەی کە گومڕا بێت و پەیوەندی بە خواوە نەبێ و لەسەر بەرنامەی خوا نەبێ، ئەوە نەك کۆمەکی لیّ وەرگرتن، بەڵکو ئەبێ جەنگ و مل ملانێی لەگەڵ بکات و بەربەستی بکات، وە هەرچەند ئەو هێزە بەدە لەبەر چاو گەورەو هەڵەو بێت، ئەبێ بڕوادار هیچ پاکی نەبی لێی، چونکە بە هۆی بەدی و گومڕاییەکەیەوە پچڕاوە لەسەر چاوەی هێزی ڕاستەقینە کە هێزی خوایە، پێ‌بژی و هۆی مانەوەی هەمیشەیی نییە بە وێنەی بەش و پارچەیەکی زۆر گەورەیە کە بپچڕێ لە خۆر یا ئەستێرەیەکی ئاگرینی تر، کە بەزوویی سارد ئەبێتەوەو ئەکوژێتەوە، چونکە پچڕاوە لە سەرچاوەی گەرمییەکەی، بەلاّم هەموو زەڕەو پارچەیەکانی کە پەیوەستن پێیەوە هەر ئەمێننەوەو ناکوژێنەوە، چونکە لەسەرچاوەکەیان نەپچڕاون، پەیوەستن پێیەوە لەگەڵ هێزەکانی ئادەمیدا ئەبێ بەو جۆرە بێت کە باس کرا، وە لەگەڵ هێزە سروشتیەکانی تری بوونەوەردا ئەبێ کۆمەکییان لیّ وەرگرێ و بەچاوی ناسراوی و دۆستایەتی سەرنجیان بدات، نەك بە چاوی بیم و ترس و دوژمنایەتی، چونکە بەهێزی ئادەمی و ئەو هێزانە بە مەیل و خواهیشی خوا فەراهەم هاتوون، وە بەجۆرێ هاتوون ڕێك و گونجاون پێکەوە، وە بێ‌گومان عەقیدەو باوەڕی موسڵمان لەسەر ئەوەیە کە خوا ئەمانەی دروستکردووە بۆ ئادەمی تا بەکاریان بێنن لەسوودو بەرژەوەندی خۆیاندا، بەم ڕەنگە بیریان لیّ بکەنەوەو بیان ناسن و خێرو بێریان لیّ وەرگرن، وە ئەگەر جارو بار زیانیان ببینن و

دووچاری ئازار ببن لێیانەوە ئەوە بێگومان لەڕێی ڕاستی خۆیانەوە بۆیان نەچوونو خەریکیان نەبوون.

ڕۆژئاواییەکان ـ کەلەپوور بەری نەفامێتی ڕۆمانیەکان ـ لەبارەی ڕێ بردنو بەکارهێنانی ئەو هێزانەوە ئەڵێن: (ئادەمی زاڵبوو سەرکەوت بەسەر سروشتدا)، وە بێگومان ئەوە بە گوێرەی بیروباوەڕی نەفامی خۆیانە، کە پەیوەستی نییە نەبە خواو نەبە ڕۆحی ئەم بوونەوەرە گوێڕایەڵو ملکەچەوە، وە ئەو موسڵمانە تێگەیشتووە کە عەقیدەو بڕوای وایە کە خوا ئەو هەموو هێزەی داهێناوە لەسەر یاساو نیزامێ کە هەموو بگونجێن پێکەوە، بۆ ئەمەی بە کۆمەکیو یەککگرتنی هەمووان بگەن بەو مەبەستو ئامانجەی کە بڕیار دراوە بۆیان بە پێی نیزامو یاساکانیان، وە ئەو هەموو هێزانە هەر لە یەکەم جارەوە گونجاوو ژێربار کراون بۆ ئادەمی، وە ڕێگەی دۆزینەوەو ناسینی یاساکانیان ئاسانکراوە لەسەر ئادەمی، وە هەر کات ڕێی برد بە هەرکام لەو هێزانەو بەکاری هێنا پێویستە لەسەری سوپاسی خوا بکات، چونکە خوا ژێر باری کردووە بۆیو ئەم لە خۆیەوە زاڵ نەبووە بە سەریدا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا﴾ ژێر باری کردووە بۆتان هەرچی وا لە زەویدا بە کۆمەڵیو پێکەوە، وە لە ئایەتێ ترا ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا مِّنۡهُ﴾ واتە: لەلایەن خۆیەوەو بە میهرەبانی خۆی ژێر باری کردووە بۆتان هەرچی وا لە ئاسمانەکانو هەرچی وا لە زەویدا هەمووی پێکەوە، ئەو حەلە بەچاوی خۆشیو شادمانی سەرنجی ئەو هەموو هێزە سروشتیانە ئەدات، نەك بە چاوی بیمو ترس، ئەو بڕوادارە تێگەیشتووە بڕوای بە خوای تاكو تەنیا هەیە، وە هەر ئەو ئەپەرستێ، وە داوای کۆمەکی هەر لە ئەو ئەکات، وە ئەم هەموو هێزانە لە دروستکراوی خوای ئەون، ئەمیش ئەگەڕێ بە دوایانداو ئەیان دۆزێتەوە هۆگریان ئەبێتو بەکاریان ئەهێنێت لە بەرژەوەندیو سوودی خۆیدا، ئەو کاتە ئەژی لە بوونەوەرێکی دۆستی خۆشەویستی هۆگری خۆیدا، ئای چ شیرینو بە تامە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وە دەست نیشان کەرە بۆمان لەو بارەیەوە، کە سەرنجی شاخی ئوحودی داو فەرمووی: ئەمە شاخێکە ئێمەی خۆش ئەوێو ئێمەش ئەومان خۆش ئەوێ!!

**ئەم سورەتە -وەك زانايان ئەفەرموون- لەسەرزووبانی بەندەكانی خواهاتووەتە خوارەوە و بۆئەوەهاتووە ئەمان بیڵێن‌وقسەی پێبكەن لەگەڵ خوادا، وەك لەیەكەم جارەوە فەرمویێتی: بەندەكانم بڵێن: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ﴾ هتد، ئینجا ئەم سورەتە كراوە بە دوو بەشەوە، یەكەم خوا كردوویەتی بە بەشی خۆی كە سەرەتاكەیەتی، وە دووەمی گێڕاوە بە بەشی بەندەكانی وەك لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ كە (ئیمامی موسلیم) هێناویەتی لە (ئەبو هورەیرە) وە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا ئەفەرموێ: نوێژم كردووە لە دوو كەرتەوە لە بەینی خۆم‌و بەندەكانما، كەواتە نیوەی هی منەو نیوەی بۆ بەندەكەمە، وە بۆ بەندەكەمە ئەوەی داوای ئەكات لێم... كاتێ بەندە وتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ خوا ئەفەرموێ: بەندەكەم سوپاس‌و ستایشی كردم وە كاتێ وتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ خوا ئەفەرموێ: بەندەكەم وەسفی دام‌و ناوی لە چاكە بردم، وەكاتێ وتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خوا ئەفەرموێ: بە گەورەو بڵند گرتمی وە كاتێ وتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خوا ئەفەرموێ: ئەمە بەینی من‌و بەینی بەندەكەم، وە بۆ بەندەكەم ئەبێ ئەوەی داوای ئەكات، ئینجا كاتێ وتی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۞ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، خوا ئەفەرموێ: ئەمە بۆ بەندەكەمەو ئەوەی داوای ئەكات بۆی ئەبێ، بەشەكەی خوامان تەفسیر كردو دەست نیشانمان كرد بۆ چەند بەندو یاسایەكی گرنگ‌و گەورەی ئیسلامی كەوەرئەگیرێن لە بەشەكەی خوا، ئینجا با بێینە سەر تەفسیری بەشەكەی خۆمان ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ ئەی خوا ڕێنومایمان بكە بۆ ڕێی ڕاست، واتە ئاشنامان بكە پێی‌و دامەزراومان بكە لەسەری كە ئەم دووانە بەرهەمی ڕێنموونی‌و چاودێری‌و بەزەییەكەی خوایە، وە ئەم داوایە بەرهەمی بڕوایە بەوەی كە تەنیا خوا كۆمەكی كەرو كۆمەكی لێداواكراوە، وە ئەمەی كە داوای ئەكەین‌و ئەمانەوێ خوا كۆمەكمان بكات تیایدا، سەردەستەیەو گەورەترین داواكراوە، وە بەجێ هێنانی ئەم داوایە مایەی خۆش بەختی‌و كامەرانییە لە هەردوو جیهاندا خێرو خۆشی هەردوولا مسۆگەر ئەكات، هۆی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خواو نازو ڕێزی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی، چونكە ئەو ڕێگە ڕاستە**

بریتییە لەم ئایینی پاکی ئیسلامە کە بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ژیانی تیایەو گشییە بۆ هەموو ناوچەو کون و قوژبنێ، وە تاقانە ڕێگەی ڕاستە، چونکە لە هەموو بارو ڕوویەکی ژیانەوە ناوەڕاستی گرتووەو دەست نادا بۆ گۆڕان و دەست تێخستن و بڕار کردن بەوێنەی ناوەڕاستی ترازوویەکی ڕاست و هاوسەنگ کە بۆ هەر بارێ لا بدرێ خوارو لارە سەنگ ئەبێ، بێگومان ئایینی ئیسلام، کە بریتییە لە مل کەچی و گوێڕایەڵی بۆ خوا، ئایینی هەموو پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیانە لە زۆر ڕاستان و شەهیدان و پیاو چاکان، لەبەر ئەوە ئەو ڕێگەیە ڕاست و ڕوون ئەکاتەوە بەوەی لەباتی ئەو بە دوایا ئەم ڕستەیە ئەهێنێ، ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگەی ئەو کەسانەی کە چاکەو بەهرەی خۆتت ڕشت بەسەریاندا، کە ئەوانیش ئەوانەن کە وتمان، وەك دەرئەکەوێ لەم ئایەتەوە ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ﴾ سورەتی النساء/٦٩.[1] ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ نەك ڕێگەی خەشم لێگیراوەکان، ڕێی ڕاستیان ناسیو لایاندا لێی، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ وە نەك ڕێگەی گومڕاکان کە ون بوون و ڕێیان نەبرد بە ڕێی ڕاست.

هێندێ ئەفەرموون: خەشم لێگیراوان جوولەکەیەو گومڕاکانیش گاورەکانە، وە هەردوو ڕاکە ئەگونجێن و لەسەر هەردوو بەڵگە هەیە.

ئابەم شێوە کورتە کۆتاییمان هێنا بە تەفسیری ئەم سورەتە بە فەڕە، وە هەر بەم ئەندازەیە کە وتمان دەرئەکەوێ کە زۆر بەجێیەو ماف خۆیەتی کە کراوە بە سەرەتاو یەکەم سورەتی ئەم قورئانە گەورەو بڵندە، وە زۆر بەجێیەو ماف خۆیەتی کەلە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا ئەوترێتەوە. داوا ئەکەین لە خوای میهرەبان کە دڵمان ڕووناك بکاتەوە بە تیشکی ئەم سورەتە پیرۆزەو بەندو یاساکانی لە دڵماندا جێگیر بکات.

**وصلي الله وسلم علي عبده ورسوله محمد وعلي كل عبد مصطفي.**

---

[1] واتە: ئەو کەسانەی کە گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرن، ئەوانە لە ڕۆژی دوایی دا لەگەڵ ئەو کەسانەن کە خوا چاکەو بەهرەی خۆی ڕشتووە بەسەریانا کە بریتین لە پێغەمبەران و صدیقەکان و شەهیدەکان و پیاو چاکان.

# سورەتی «البقرە»
## مەدینەییەو (٢٨٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە هەرچەند هەموو ئایەتەکانی پێکەوەو بەدوای ئەکدا نەهاتوونەتە خوارەوە، بەڵکو لە بەینی ئایەتەکانی دا سورەتو ئایەتی تر هاتوونەتە خوارەوە، تەنانەت ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە هێندێ لە ئایەتەکانی ـ وەك ئایەتی باسی سوودو قەدەغە کردنی ـ لە دوا دوایی هاتنە خوارەوەی قورئاندا هاتوونەتە خوارەوە، ئەم سورەتە هەرچەندە بەو جۆرەیە، بەڵام لەو سورەتانە ئەژمێرڕێ کەلە یەکەمو سەرەتای چەرخی مەدینەوە هاتبنە خوارەوە، ڕای بەهێو لەسەر ئەوەیە کە سەرەتاکەی لە یەکەم جارو سەرەتاوە هاتووە، وە هەموو سورەتێکیش بەپێی سەرەتاکەی تەماشا ئەکرێو ناو ئەبرێ، ئینجا بێگومان کۆکردنەوەی ئایەتی سورەتەکانو ڕیزو کردنی سورەتەکان بەم جۆرو شێوەی کە هەیەو ناسراوە، لەسەر ڕاو فەرمانی پێغەمبەر بووە(ﷺ) وەك ڕوون ئەبێتەوە لە حەدیسێکدا کە (ترمزی) ئەیهێنێ لە (ئیبنو عەباس)ەوە —خوا لێیان ڕازیبێ— وە هەروەها لە حەدیسێ ترەوە کە (مسلیم)و (بوخاری) ئەیهێنن لێیەوە، وە بێجگە لەو حەدیسانە ئەم جۆرو شێوەی کە هەیە بە تەواوترو بە بێگومانو دوبەرەکی دەقی ئەو یەکەم بەرگەیە کە ناو ئەبرێ بە (المصف الأم)وە لەسەر بڕیاری هەموو هاوڕێکانی پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی تیا کۆکرایەوە لە یەکەم جارو سەرەتای جێنیشینی (ئەبو بەکر)دا —خوا لێی ڕازیبێت— وە شتێکی ئاشکرایشە کە ئەو بڕیارە لە خۆڕایی نەدراوەو لەبەر ئەوە بووە کە ئەم قورئانەیان بەم جۆرو ڕیزە وەرگرتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جا لەبەر ئەوە هەر سورەتێ لە سورەتەکانی قورئان تامو بۆنو هەناسەو شێوەیەکی تایبەتی هەیە جیای ئەکاتەوە لە سورەتەکانی تر، هەرچەند لە بنەڕەتدا یەکنو لە یەك سەرچاوەوە هاتوونو هەموو فەرموودەی خوان، ئەوەش بە وێنەی ئەندامەکانی ئادەمی کە هەموو لە بنەڕەتا یەکنو کەچی هەرکام لەو ئەندامانە لە شێوەو دەنگو ڕەنگو ڕەوشتا جیاوازن لەوانی تر.

ئەم سورەتە درێژەو باسو مەسەلەی زۆری تیایە، بەڵام هەموو کۆئەبنەوە لە یەك مەڵبەندا، وە ئەو مەڵبەندەش لە دوو پەلی سەرەکی پێك هاتووە کە پەیوەستیان بە تینە.

یەکـەمیان: ئەگەڕێتـەوە بـۆ هەڵوێـستی جوولەکـە بەرامبـەر بـە ئیـسلام و ئـەو گەلـە موسڵمانەی کەلەسەر بنەڕەتی ئیسلام پێك هات یەکەم جار لە مەدینەدا، وە پەیوەندی بە هێزی ئەو جوولەکانە بە ناپاکەکان و بت پەرستەکانەوە بەدژی ئیسلام و موسڵمانان.

دووەم: ئەخولێتەوە بەدەوری هەڵوێستی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەدا لە یەکەم جاری پەیدا بوونیانـەوە، وە ئامـادە کردنیـان بـۆ هـەڵگرتنی سپاردەی خـوا و هەڵـسانیان بـە فـەرمانی جێنشینی لە زەویدا، لەپاش ئەوەی بەنی ئیسرائیلی پەیمانی خوایان شکاندو وازیان هێنا لەو سپاردە گەورەیەی کە خرا بووە سەر شانیان و خۆیان داڕنی لە شەرەفی نەوەیی و نەژادی (ئیـبراهیم خـەلیل)، هـەموو بـاس و مەبەسـتەکانی ئـەم سـورەتە ئەخولێنـەوە بـەدەوری ئـەو مەڵبەندەدا بە هـەر دوو پەلەکەیـەوە، وەك ڕوون ئەبێتـەوە لـە نیشان دان و خستنە بەر چاوی ئایەتەکانیەوە، وەبۆ ڕوون کردنەوەی ئەوەی کە باس کرا چاك وایە کورتەیە باس بکەین لەو بەسـەرهات و ڕووداوانـەی کە ئایەتـەکانی ئـەم سـورەتە هاتنـە خـوارەوە بۆ چارەسـەر کردن و بـەرەنگاریان، لەگـەڵ بێـدار کردنـەوە و مۆچیاری کردنێکـی هەمیـشەیی بـەوەی کـە ئـەو بەسەرهات و ڕووداوانە بە شێوەیەکی گشتی هەر بووە و هەر ئەیش بەدێژایی چەرخ و ڕۆژگار، وە هۆی هەمیشەیی و تەڕو تازەیی تەمەن و ئامۆژگاریەکانی فەرمانیش هەر ئەویە.

کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە پێك هات لەبەر چەند هۆیە کە ئەو کۆچ کردنەی بە پێویست گێڕاو کـردی بـە کردەوەیـەکی ناچاری بـۆ بـەرێوەبردنی بـانگ و بانگەوازەکـەی خـوا و ڕۆیـشتنی لەسـەر ڕێگـە و ڕچـەی تایبـەتی خـۆی کـە خـوا بـۆی نەخـشە کێشا بـوو. هەڵوێستی ناڕەوا و سەرکێشانەی قوڕەیش لە مەککەدا ـ تایبەتی لە پاش لەدنیا دەرچوونی (خەدیجە) خـاتوون –خـوا لێـی ڕازیبـێ–، وەلـە پـاش مردنـی (ئـەبو تالیب) ـ ئەو هەڵوێـستە ناڕەوایە نزیك بوو لەوەی بە تەواوی بانگ کردنەکەی پێغەمبـەر (ﷺ) بوەستێنێ لـە مەککـە و دەوروبەریدا، هەرچەند لەبەرەوە مەردوم هـەر موسڵمان ئەبوون و گوێیان نـەبوو لـەو هـەموو پـیلان و سزا و ئـازارەی کـە دووچـاریان ئـەکرا، وە ئـەو هەڵوێـستەی قـوڕەیش کـارێکی وای کردبوو عەرەبـەکانی دوورو دەرەوەی مەککە وەسـتا بوون و چاوەڕوانیان ئەکرد، بزانن وای کردبـوو عەرەبـەکانی دوورو دەرەوەی مەککـە وەسـتا بـوون و چـاوەڕوانیان کـرد، بـزانن ئـەو ئاژاوە و دوژمنایەتیەی کە خزمە زۆر نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەکاری ئەهێنن سـەرەنجامی چۆن ئەبێت و سەری لە چیەوە دەرئەچێ؟ وەهیچ هۆو پـاڵ پێوەنەرێ نـەبوو بڕوایان پێبێنـێ بە پیاوێ کە بەو جۆرە کەس و کاری لێی هەڵسابن، بە تایبـەتی کە خزمـەکانی قاپیەوان و

کلیل داری کەعەبەبوون، وەبە هۆی ئەوەوە بیرێکی ئایینیو سەرۆکیان هەبوو لە نیمچە دورگەدا، جا لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەڕا بەدوای جێگاو شوێنی ترا کە بیکا بە نیشتەجێو مەڵبەند بۆ ئاینو بانگەوازەکەی، شوێنێکی وا کە ئاینو عەقیدەکەی بپارێزێو سەربەستی بکاتو لەو وەستانو بەرگریەی کەلە مەککەدا دووچاری بوو، وە پارێزگاری بڕواداران بکات لەسزاو ئازار. وەلە پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە کۆمەڵەکانی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، وە مەبەستی سەرەکی لەو کۆچ کردنەش وا دەرئەکەوێ هەر دەست کەوتنی ئەو بنکەو مەڵبەندە بووبێ.

بەڵگە لەسەر ئەوە ئەمەیە ئەوانەی کە ئەو کۆچەیان کرد لە تاقمی بەندەو هەژارو بێکەسەکان نەبوون، کە هەمیشە لەژێر باری ئازارو سزادا بوون، بەڵکو لەوانە بوون کە کەس دارو تەقیە لێکراو بوونو کەس نەی ئەتوانی ئازاریان بداتو دەست درێژیان بۆ بکات، ئەوانیش وەك: (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب)و (زوبێری کوڕی عەوام)و (عبدالرحمن کوڕی عەوف)و (ئەبو سەلەمەی مەخزومی)و (عوسمانی کوڕی عەففان)، هەروەها لە ئافرەتانیش چەند ئافرەتێك ئەو کۆچەیان کرد کە لە بنەماڵە گەورەکانی مەککە بوونو کەس نەی دەتوانی دەست درێژیان بۆ بکات، یەکێ لەوانە (أم حبيبة) بوو کە کچی (ئەبو سوفیان) بوو کە یەکێ بوو لە سەرۆکە بەرزەکانی قوڕەیش، بەڵێ هەڵ ئەگرێ کە ئەو کۆچ کردنە چەند هۆیەکی تری بووبێ، وە ئەوەی ڕقو خەشمی چەند کەسو چەند بنەماڵەیەکی گەورە هەڵسێو غیرەتیان بێتە جۆش لەوەی کە کوڕو کەسو کاریان دەربەدەر کران، بەڵام لە هەمان کاتدا با مەبەستیان دۆزینەوەی بنکەیە بێت کە هیچ نەبێ بە سەربەستیو بێ مەترسی بتوانن هەڵسن تیایدا بەکاروباری ئایینەکەیان، وە هەروەها وا دەرئەکەوێ ڕۆیشتنی پێغەمبەریش (ﷺ) بۆ (طائف) هەر بۆ ئەو مەبەستە بوو بێت، بەڵام مەبەستەکە پێك نەهات ئەوە بوو گەورەکانی هۆزی (ثقيف) پێشوازیەکی زۆر خراپیان لێکردو بێشەرمیو ناپیاوی خۆیانیان دەربڕی، وەك بە درێژیی لە کتێبی سیرەتو حەدیس دا باس کراوە، ئینجا لە پاش ئەوە خوا دەووری کردەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) وە لەئاینو بانگەوازەکەی، لەلایەکەوە کە خەیاڵ بۆی نەئەچوو، بەم ڕەنگە خوا پەیمانی یەکەمی (عقبة)ی سازاند، ئینجا پەیمانی دووەمیش هات بەدوایدا، کە ئەو دوو پەیمانە خوا کردنی بە قاپی سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر هێزی کوفرو نەفامی دا، وە ئەم دوو پەیمانە پەیوەندیەکی بە هێزیان هەیە بەو

مەبەستەی کە لەم پێشەکیەدا خەریکین پێیەوە، وە بەو بەسەرهاتانەی کە لە مەدینەدا روویاندا بەرامبەر ئەم ئایین و بانگەوازە.

کورتەی داستانی ئەم دوو پەیمانە بەم جۆرە بوو: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی حەجدا پەیوەندی ئەکرد بەوانەی کە ئەهاتن بۆ حەج لە تیرەکانی عەرەبی دەرەوەو بانگی ئەکردن بۆ ئیسلام و داوای لێ ئەکردن پارێزگاری بکرێ لە گەیاندنی فەرمان و ئایینی خوادا، جا بە دوو ساڵ پێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە گەیشت بەشەش کەس لە مەدینەییەکانی هۆزی (خزرج) لەکاتی حەجدا، ئینجا کە بانگ کردنەکەی پێغەمبەریان بیست لەناو خۆیانا وتیان: سوێند بە خوا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکەکانی مەدینە هەڕەشەی پێئەکەن لە ئێمەو ئەڵێن: کاتی هاتووەتە پێشەوە، کەواتە با ئەوان پێشمان نەکەون لێی... لەبەرئەوە کاتێ بانگی ئەمانی کرد گوڕایەڵ بوون و بڕوایان هێنا، وە عەرزیان کرد کەهیچ گەلێ نییە وەك ئەو گەلەی ئێمە ئاژاوەو دوژمنایەتی تیا بێت، بەڵکو خوا بە تۆ یەکمان بخات و ناکۆکیمان نەهێڵێ، ئینجا کە گەڕانەوە بۆ مەدینە ئەم باسەیان گێڕایەوە بۆ گەلەکەیان، ئەوانیش بەوە شادمان بوون و بڕیاریان لەسەردا، ئینجا لەساڵی داهاتوودا تاقمێکی دوانزە کەسی لە هەردوو تیرەکە چوون بۆ حەج، پەیمانیان پێدا لەسەر ئیسلام، وە ئەویش (موصعوبی کوڕی عومەیر)ی لەگەڵ ناردن تا فێری کاروباری ئایینی ئیسلامیان بکات، ئینجا لە ساڵیداهاتووی ئەو ساڵەدا کۆمەڵێکی حەفتاو پێنج کەسی هاتن و بەخزمەتی گەیشتن و داوایان لێکرد کە پەیمانیان لەگەڵ ببەستێ، ئەویش لە شەوا لەگەڵ (عەباس)ی مامی هەرچەند هێشتا بڕوایشی نەهێنا بوو چوو بۆ ناو ئەو مەدینەییانەو بە نهێنی کۆبوویەوە لەگەڵیان و پەیمانەکەی لەگەڵ بەستن، وە ئەم پەیمانە ناو ئەبرێ بە پەیمانی گەورەی (عقبة).

(محمدی کوڕی کەعبی قورزی) ئەفەرموێ: وەك لە چەند ڕیوایەتێکا هەیە لەو شەوەدا (عبدالله ی کوڕی ڕەواحە) کە یەکێ بوو لەو پەیمان دەرانە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەرج دابنێ لەسەرمان بۆ خواش و بۆ خۆشت، ئەویش فەرمووی: مەرج بۆ خوا بەسەرتانەوە ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێ نەکەن بە هاوبەشی، وە بۆ خۆشم ئەمەیە کە بەرگریم لێ بکەن لە هەر شتێ کە بەرگری خۆتان و ماڵی خۆتانی لێ ئەکەن، (عبدالله) عەرزی کرد: ئەگەر ئێمە ئەوەمان کرد چیمان بۆ هەیەو پاداشتمان چییە؟ ئەویش فەرمووی: بەهەشت، ئەوانیش وتیان: کڕین و فرۆشتنەکە قازانجی کرد، نەڕێی هەڵوەشاندنەوەی ئەدەین و نە داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەکەین!! ئاوا بەو جۆرە کارەکەیان بە توندی گرت، لەبەرئەوە ئیسلام

بڵاوبوویەوە لە مەدینەدا بە زوویی و بە پەسپاندی، بە جۆرێ هیچ ماڵێ نەما لەمەدینەدا کە ئیسلامی تێنەکەوێ پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) وە لەپاش ئەو پەیمانە موسڵمانەکانی مەککە دەستیان کرد بە کۆچ کردن بۆ مەدینە بەدوای یەکاو هەموو شتێکیان بەجێ هێشت و تەنیا عەقیدەو بڕواکەی خۆیانیان لەگەڵ خۆیان بردو چوون بۆلای برا مەدینەییەکانیان و ئەوانیش -خوا لێیان ڕازیبێ- بەجۆرێ هاتن بە پێشوازیانەوە کەلە هەموو چین و چەرخ و تەمەنی ئادەمیدا شتی وا نەبینراوە، ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ یاری (غار)ی کۆچیان کرد بۆ بنکە بەهێزە سەربەست و ئازادەکەی ئیسلام کە چەند وەخت بە دوایا ئەگەڕان، کۆچیان کرد بۆ شاری (یثرب)، وە لەدوای ئەوە ناوەکەی بوو بە (مەدینەی ڕەسول) شارەکەی پێغەمبەر، وە هەر لە یەکەم جاری کۆچ کردن و گەیشتن بەو شارە پیرۆزە دەوڵەتی ئیسلامی بەدی هات و بەرپابوو.

لەو یەکەم چینی کۆچ کەران و یارمەتی دەرانە گەل و کۆمەڵێکی هەڵبژێرراوی جیاواز پێك هات کە قورئان لەزۆر شوێنا وەسفیان ئەکات و ئاماژە ئەکات بە ڕادەو پلەی بەرزیان، ئەم سورەتە لە یەکەم جارو سەرەتایەوە باسی پێکۆمەڵ لە ئادەمی ئەکات و ناوو نیشانیان هەڵ ئەدات، کە یەکەمیان تاقمی لە خواترسانە بە شێوەی گشتی، بەڵام یەکەم و سەر دەستە لە ناویانا ئەو کۆمەڵە بەختیارەی یەکەم جاری ئەم ئوممەتەیە لە کۆچ کەران و یارمەتی دەران - خوا لێیان ڕازیبێ-، ئینجا لەپاش ئەوان بێبڕواکان ئەکات بە دووەم و ئەیهێنێ بە دوای یەکەم تاقمدا بە دوای یەکەم تاقمدا کە بێگومان ئەو چینە بێبڕوای یەکەم جارەیش کە بەرامبەر ئیسلام و ئەو موسڵمانانە وەستان، سەر دەستەو یەکەم مەبەستن لەناو ئەو تاقمە خەشم لێگیراوو هەڕەشە لێکراوەدا، ئینجا دێتە سەرباسی ناپاکان و ئەیان کات بە سێیەم تاقم و بەدرێژی لێیان ئەدوێ و زۆر لە کردەوەو ناوو نیشانیان دەرئەخات، ئەم تاقمە لە مەدینە پەیدا بوون لەپاش ئەوەی ئیسلام هێزێکی وای پەیدا کرد کە هەموو کەس لە وڵاتدا بەشتی دائەناو هەموو کەس زۆر یاکەم ناچاربوو تەقیەی لێئەکرد، بەتایبەتی لەپاش جەنگی (بەدر) کە ئیسلام و موسڵمانانی تیا سەرکەوتن و هێزی بت پەرستی تیا شکا، وە لەناو ئەوانەی کە ناچاربوون بە خۆ ڕێکخستن لەگەڵ موسڵمانان دا، زۆر تر تاقمێ بوون لە پیاو ماقوڵان و گەورەکانی مەدینە کە خزم و کەس و کاریان موسڵمان بوو بوون و ئەمانیش ناچار بوون بەدەم موسڵمانێتیان دەرئەبڕی، تا ئەو ڕێزو قەدرەیان بمێنێتەوەو پارێزگاری بەرژەوەندی خۆیان بکەن، یەکێ لەو گەورانە (عبدالله ی کوڕی ئوبەی سەلول) بوو کەلە پێش

گەیشتنی ئیسلام بۆ مەدینە گەلەکەی خەریك بوون تاجی پادشیان بۆ دروست ئەکردو ئەیان کرد بە پادشای خۆیان.

ئەم تاقمە ناپاکە بەنهێنیو لە ژێرەوە بە هیچ ڕەنگ نەئەوەستان لە پیلانو نا پیاویو ئاژاوە نانەوە، وە زیانیان زۆر ترو سەخت تر بوو لە زیانی دوژمنە ئاشکراکان، لەبەر ئەوە قورئان لێرەو لەزۆر شوێنی ترا ئەو هێرشە سامناکانە ئەباتە سەریانو موسڵمانان ئاگادار ئەکاتەوە بە پیلانو دوژمنایەتیەکەیان، وەلە هێرش بردنی ئێرەدا ئاماژە ئەکات بە شەیتانەکانیان کەوا دەرئەکەوێ مەبەست بەو شەیتانانەیان جوولەکەبێت کەئەم ناپاکانە بوون بە کەری ژێر باریان بە هۆی ئەمانەوە پیلان گێڕیو کردەوەی پیسیان ئاڕاستەی ئیسلامو موسڵمانان ئەکرد، ئەو جوولەکانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هەموو تیرەو بەرەبابەکانیان پەیمانی بەست لەسەر چەند بەندێ کە هەموو پێی ڕازیو شادومان بوونو بڕیاریان لەسەردا، کەچی لەپاشا بە سروشتی جوولەکەیی خۆیان ئەو پەیمانەیان شکاند تا خوا تۆڵەی لێسەندن، وە ئەو جوولەکانە یەکەم تاقم بوون کە هەڵسان لە مەدینەدا لە دژی ئیسلامو موسڵمانانو پێغەمبەرمان (ﷺ) وە هۆی دوژمنایەتی یەکەشیان چەند شتێ بوو هێندێکیان ئەمەبوو: جوولەکە لەپێش ئیسلامدا لە مەدینەدا ڕێزو ڕادەیەکی بەرزی بوو، چونکە زاناو نامەدار بوون عەرەبەکان نەخوێندەوارو بێنامە بوون، ئەمە لەم بارەیەوە، وە لەبارێ ترەوە عەرەبەکان بەهۆی دوژمنایەتی سەختی ناو خۆیان لەکار کەوتبوونو هەر تاقمێ ناچار بوو بەمەرامی کردنو دڵنەوایی جوولەکەکان کە بەدەسەڵاتو چەکدارو فێڵباز بوون، کەواتە ئەو دوژمنایەتییە هەلو هەڵکەوتێکی چاك بوو بۆ ئەو جوولەکانە، لە پەنایا بحەوێنەوەو بن بەدەم ڕاستو تەقیە بێکراو، ئینجا کاتێ ئیسلام هاتو بەرزترین نامەی هێنا بە جۆرێ جوولەکەکان داماو بوون لەئاستی، وە پێویست بوون پێی، ئینجا ئەو دوو تاقمە دوژمنەی یەك خستو کردنی بەبرای گیانی بەگیانیەکی وا کە مێژووی ئادەمی شتی وای نەدی بوو، کەواتە بە هاتنی ئیسلام ئەو دەم ڕاستی ئەوانە نەماو ڕێگە بەسرا لە پیلان گێڕی یەکەیان.

بێجگە لەو هۆیە جوولەکە لە پێشەوە لاف ئەوەی لێئەدا کەگەلی هەڵبژێرراوی خوایەو نامەو پێغەمبەرێتی هەر لەناو ئەوان ئەبێت، کەواتە لایان وابوو کە دواترین پێغەمبەریش هەر لەوان ئەبێت، ئینجا کەبینیان لە ناو عەرەبدا پەیدا بوو، لە یەکەم جارەوە وایان زانیبۆ عەرەبە نەخوێندەوارەکانەو، ئینجا کەبینیان یەکەم جار ئەوان بانگ ئەکات بۆ گوێڕایەڵی بۆ

ئەو ئایینە تازەیە، بەو بۆنەیەوە کە ئەوان زاناو شارەزا ترن لەبت پەرستەکان، وە ئەوان شایستە ترن بە گوێڕایەڵی و مل کەچی کاتێ ئەوەیان بینی غیرەت کەشی نەفامانە گیرتنی و ئەو بانگ کردنەیان بەدەست درێژیی و ئابڕو بردن دانا، ئینجا بێجگە لەم هۆیەش هۆی گەورە ئەوە بوو نەخۆشی حەسادەت دڵیداگیر کردبوون بە تەواوی لە دووبارەوە:

یەکەم: لەوەی کە خوا ئەم پێغەمبەرەی (ﷺ) هەڵبژارد کە بەباشی ئەیان ناسی و ئەیان زانی ڕاستە بەپێی ئەو هەواڵ و نیشانانەی کەلە نامەکەی خۆیاندا هاتبوو.

دووەم: لەمەی کە بەزوویی لە مەدینەدا سەرکەوت و کارەکەی بە ڕێکی و بەبێ وە ستان ڕۆیشت و گەیشت بە ئامانج، لەبەرئەم هۆیانەو چەند هۆیە تر هەڵوێستی جوولەکە بو جۆرو شێوە ناڕەوا بوو کە قورئان لەم سورەتەو لە چەند سورەتێ تردا بۆمان باس ئەکات، وە بەڕاستی ماڤ خۆیانە کە ئەو هێرش و هەڕەشە یەختانەیان ئاڕاستە ئەکرێ.

لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە کە قورئان لەکەداری کردوون لە چەند نیشانەو سیفەت و کرەوەیەکی خراپ کەلەپێش ئیسلامدا بوویانەو لەپاش ئیسلامیش تا ئێستاو لەمەولاش هەتا دنیا دنیایە هەر هەیانەو لێیان جوێ نابێتەوە، بە جۆرێ قورئان کە ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو چینەی کەلە چەرخی پێغەمبەرا بوون (ﷺ)، وەك ئەوانە هەر ئەو چینە بن کەلە چەرخی (موسا) پێغەمبەردا (علیه السلام) بوون هەر ئەوانەش بن کەلەپاش ئەو لەچەرخی پێغەمبەرەکانی تریاندا بوون، بە هۆی ئەوە ئەوانە یەك تیرەن و لە هەموو چەرخ و کاتێکدا یەك سروشتیان هەیە، وە کارو پیشەیان یەك جۆرو شێوەی هەیە، وە هەڵوێستیان لەگەڵ هەق و ڕاستی و مەردومدا هەر یەك شتە بەدرێژیی چەرخ و چین و وڵات!! جالەبەرئەوە ئەبینین زۆر جار کردەوەی تاقم و چینەکانی چەرخی (موسا) و دواتر ئەدا بەناو چاوی ئەوانەی کەلە چەرخی ئەم پێغەمبەرەدا بوو (ﷺ) وەلەکاتی باسی پێشووەکاندا، ڕووی فەرموودە ئەکاتەوە جوولەکەکانی مەدینە، وەلەکاتی قسەکردن لەگەڵ ئەماندا ڕووی فەرموودەی ئەگێڕێتەوە بۆ تاقم و چینەکانی پێشووو ڕابردوو، وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەمەوپاش ـ بەیارمەتی خواـ لەکاتی تەفسیری ئایەتەکاندا، وە بەڕاستی ئەمە موعجیزەی قورئانەو هەر لە دەست قورئان دێت ئەم جۆرە کارانە، وەلەبەر ئەوەیە قورئان تەڕو تازەیەو لە هەر چەرخێکدا بیری لێ ئەکرێتەوەو سەرنج ئەدرێ وەك بۆ ئەو کات و چەرخە هاتبێ و دانرا بێوایە، وە هەموو تەمێ و ئامۆژگاریەکانی بەکارە لە هەر چەرخ و چینێکدا، وەك یەکەم چین و چەرخ، وە گەلی موسڵمانی ڕاستەقینە هەمیشە وریا ئەبن بەرامبەر دوژمنیان و هەڵناخەڵەتێن پێی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾

ئەم سورەتە بێجگە لەمانەو گەیاندنی ئەم شتە گرنگانە، دەست نیشان ئەکات بۆ دروست کردن و دارشتنی کۆشکی گەلی موسڵمان و ئامادەکردنی بۆ هەڵگرتنی سپاردەی ئاین و عەقیدە لەزەویدا لەپاش واز هێنان و گوریز کردنی گەلی ئیسرائیلی لە هەڵگرتنی، وە لەپاش هەڵوێستی بەدوخراپی دەربارەی موسڵمانان وئایینی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیان(ﷺ).

لەپاش پێش خستنی ئەم پێشەکییە کە زۆر بەنرخ و پڕ سوودە لە تێگەیشتن و وەرگرتنی مەبەست و ئامانجی سورەتەکەدا، ئینجا با دەست پێبکەین و بەدڵگوێ شل کەین بۆ ئایەتەکانی و داوا بکەین لە خوا کە بەهرەمەندمان بکات بە پیت و فەڕیان.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * الٓمٓ﴾ لەسەرەتاوە وتمان: مەیل و خواهیشی خوا وابوو لە سورەتی ﴿يس﴾ەوە دەستم کرد بە تەفسیری قورئانی پیرۆز، وە هۆی هەڵبژاردنی ئەو سورەتەم بۆ دەست پێکردن باس کردووە لە سەرەتای ئەو سەرەتەدا، ئینجا لەبارەی دوو پیتی ئەو سورەتەو دوانزە پیتەکەی ترەوە کە هەر چواردەیان کۆ ئەبنەوە لەم ڕستەیەدا: (نص حكيم قاطع لە سر)وە لە چەند جۆرو شێوەیە قاصی بیست و نۆ سورەتی قورئانیان پێکراوەتەوە دەربارەی ئەم پیتانە بە کورتی ڕای زانایانی ئیسلامم باس کردووە تیایاندا، کەواتە لێرەدا دووبارە کردنەوە بە پێویست نازانم.

﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾[١] ئەو کتێبە. واتە ئەم قورئانە بەرزو بەڕێزە ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ هیچ گومان و دوو دڵییەکی تیا نییە، واتە هاتنی لەلایەن خواوە ئەوەندە ڕوون و ڕاستە هیچ جێگەو شوێنێکی تیا نییە بۆ گومان و دوو دڵی، وە ئەوەندە موعجیزەیەکی ئاشکرایە شایستە نییە بۆ ئەمەی گومان و دوودڵی ڕووی تێبکات. ئایا گومان و دوودڵی ڕوو بکاتە هۆنینەوەی وتەو وشە شیرینەکانی کە پێك هاتوون هەر لەو پیاتنەی کە مەردوم وتەو وتاری

---

[١] یەکەم زانایان چەند ڕایەکیان هەیە لەبارەی مەبەست بەوشەی ﴿ذَٰلِكَ﴾و ﴿ٱلْكِتَٰبُ﴾ەوە، وە هەروەها ئەم ڕستانەیان بە چەند جۆرێ پێناسە ــ ترکیب ــ کردووە، هەر چەند هەموو ڕایەکان لە مەبەست دا ئەبنەوە بە یەك، بەڵام لەسەر هەر ڕایە تەفسیری تایبەتی خۆی هەیە، وە لەناو هەمووان دا باوەڕم بەوە بەهێزە کەلە تەفسیرەکەدایە.

لێپێك ئەهێنێ‌و كەچی هەموو كەس داماو‌و دەستەپاچە بووو دەستەپاچەیە لەمەی وێنەی كورت ترین سورەتی بێنن، لەگەڵ ئەمەدا چەند جار جاری دا بەناو هەموو جیهانداو بەری بڕییەوە لە هەموو كەس كە ئەگەر ڕاست ئەكەن ئازا بن وێنەی بێنن، وە هەواڵیشی دا كەس ناتوانێ وێنەی بێنێ، وە هەوڵ‌و تەقەللای زۆریش درا لەلایەن دوژمنانەوە، بە تایبەتی یەكەم چینێ كە عەرەب بوون‌و سەر دەستەو سەرۆك بوون لە دوانگەدا، وە مامۆستای هەڵكەوتووبوون لە وتار دان‌و ڕەوانبێژیدا وەلە دوژمنایەتیشدا گەشتبوونە ئەوپەڕی ڕادەو هەمیشە بە دوای ئەوەدا ئەگەڕان ڕەخنەو لەكەیەك بدۆزنەوەو پلارێ بدەن لە پێغەمبەر (ﷺ) و قورئانەكەی، وە وتاری زۆریشیان هەڵبەست‌و لەپاشا هەر خۆیان بۆ خۆیان لەو بارەیەوە دامردنەوەو ئەیان وت ئەمە سیحرو جادووە بۆیە ناتوانین بەرگری بكەین‌و وێنەی بهێنین!!

ئەی ئایا گومان‌و دوودڵی ڕووبكاتە مانا‌و مەبەستی بەرزو ڕێك‌و پێك‌و دامەزراو‌و نەگۆڕاوی، بەبێ ئەوەی هیچ دژایەتی‌و نەگونجاویەك ڕووبدا بە هیچ بەش‌و پارچەیەكیدا، هەر لەسەر تا خواری، كە ئەگەر هی خوا نەبوایە ئەم كتێبە گەورەیە دژایەتی‌و دووبەرەكی زۆری تیا بوایە؟ ئەی ئایا ڕووبكاتە ئەو ڕژێمە ڕاست‌و ڕەوای كە نەخشەی كێشاوە بۆ ژیان لە هەموو بارو ڕوویەكییەوە، چ ڕژێمی ڕۆحی‌و چ ڕەوشتی‌و چ كۆمەڵایەتی‌و ...هتد؟

ئەی ئایا ڕووبكاتە ئەو هەموو هەواڵە غەیبیانەی كە دای بە جیهان‌و جیهانیان، ئیتر چ ئەو هەواڵانەی كەلە پێش هاتنی قورئاندا بەدڵی هیچ كەسا گوزەریان نەكردبوو، وەك هەواڵ دانی پاشە ڕۆژی ئایین‌و ئوممەتەكەی، وە هەواڵ دانی بەنیازو خەتەرەی دڵی مەردوم، وە چ هەواڵدانی بەو شتانەی كە پێغەمبەرو ئەو گەلە عەرەبە نەخوێندەوارەی كە لەوان بوو لەناویاندا پێكەیشت بێئاگا بوون‌و بەهیچ ڕەنگ ئەو هەواڵانەیان نەبیستبوو وەك هەواڵی پێغەمبەران‌و گەلە ڕابوردووەكان‌و بەسەرهاتیان، بەڵكو ئەم هەواڵانە هەموو جیهان لێیان بێئاگا بوون، مەگەر هێندێ لەزانایانی نامەدار لە جوولەكەو مەسیحیەكان، كە ئەو هەواڵانەش بەبێزیادو كەم بەدی هاتن‌و بەڕاست دەرچوون؟

ئەی ئایا گومان‌و دوو دڵی ڕووبكاتە ئەو هەموو مەسەلە ڕاستەو ئەو هەموو شتە ڕاستەقینانەی كە هێنانی‌و ئاماژەی بۆ كردن لەبارەی ئادەمی‌و ئەم بوونەوەرەو ژیانەوە كە لەپێش هاتنی قورئان دا نەزانراوو نەناسراوبوون، وەلە پاش هاتنی بەسیازدە چواردە سەدە تازە ڕێیان پێئەبرێ لە ڕێگای زانیاری تازەوە؟!ئەی ئایا... ئەی ئایا... ئەی ئایا...؟ كەواتە زۆر بەجێیەو هەر ماڤی ئەمە كە فەرموویەتی: ﴿هُدًى﴾ واتە: ئەم قورئانە ئەوەندە ڕێنموونی

کەرو ڕێنیشاندەرو ئەوەندە ئەم سیفەتەی بەهێزە وەك خۆی ڕێنموونی و ڕێنیشاندان بێ وایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەس بەهرەمەند نابێ لێی و چاوی دڵی بەدی ناکات. بەوێنەی خۆرکەچەندەئاشکرایەوکەچی کوێرخۆی وڕووناکیەکەی بەدی ناکات، جا لەبەر ئەوە هەرچەندە ڕێنموونی و ڕێنیشان دانەکەی بۆ گشتییە، لێرەدا تایبەتی کردو فەرمووی: ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾ بۆلەخواترسەکان کەدوورەپەرێزوخۆپارێزن لەهۆی خەشم و ناڕەزایی خوا.

مەبەست بەم لە خواترسانە هەر ئەوانە نییە بڕوایان هێنابێ و لە خوا ترس و خۆپارێزەر بوون، بەڵکو ئەمانیش و ئەوانەش بڕوایان نەهێنا بێ و لە خواترس و خۆپارێز نین، بەڵام ئامادەییان هەیە بۆ ئەوە، وە بەوێنەی چرایەکن کە هەموو کەرەسەی هەڵگیرسانی تەواو بێت و هەر ئەوەی مابێ ئاگری پێوەبنرێ، یا بە بەوێنەی گلۆپێکی کاروبار تەواو هەر ئەوەی مابێ دەست بنرێ بە سویچەکەیداو داگیرسێنرێ، ئەو جۆرە کەسانەش بەو جۆرە ئامادەن و هەر ئەوەیان ماوە تیشکی قورئان بدا لەدڵیان، ئیتر ڕووناك ئەبنەوە بە ڕووناکی بڕوا، بەڵام ڕێنموونی قورئان بۆ ئەم دوو تاقمە لەسەر یەك بارو یەك جۆر نییە، بەڵکو بۆ ئەکەم ئەوەیە دامەزراوی ئەکات و بڕواکەی بەهێز تر ئەکات و زیاتر ئاشنا و زانا و ئاگادار تری ئەکات بە خواو سیفەتەکانی کە ئەوەش هەرگیز تەواو نابێ و دوایی نایە تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش هەتا هەتایە، چونکە ناسینی خوا بێ سنوورو دوایی نەهاتووە، وە بۆ تاقمی دووەم ئەمەیە لەڕێوەڕێگای بڕوای نیشان ئەدات وئینجالەپاش ئەوە بەرزی ئەکاتەوە بۆ ڕادەو پلەی بەرزتر.

ئەو کەسەی کە خوا پێداوەو ئەیەوێ بەهرەمەند ببێ لە قورئانەوە بە ڕووناکی و پیت و فەڕەکەی، پێویستە بچێ بۆلای بەدڵێکی پاك و خاوێنەوەو بەدڵێکی پڕ لە شەرم و سام و بیمەوە، وە بترسێ لەوەی نارێکی و گومڕایی تیابێ، وەبە ئومێدو چاوەڕوانییەوە بووەستێ بەرامبەری و قاپی هەست و دەروونی بۆبکاتەوە. ئەوکاتە قورئان لەڕووناکی و شتە نهێنیەکانی خۆی ئەڕێژێ و ئەیبارێنێ بەسەر ئەو دڵە ڕاستە بەشەرمە لە خوا ترسەدا، وە هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتە بەو جۆرە بوون لەگەڵ قورئاندا، بۆیە قورئانیش پەروەردەی کردن و پێی گەیاندن تا ڕادەیە کردنی بە ڕۆژو مانگ و ئەستێرەیە بە ناوچاوانی ئادەمی و ئادەمێتییەوە!! ئینجا دەست ئەکات بە باسی نیشانەو سیفەتەکانی ئەو لە خوا ترسانە، کە نیشانەو سیفەتی ئەو کۆمەڵە بەختیاوە بوون کە پێك هاتن لە کۆچ کەران و یارمەتی دەران لە مەدینەدا، وە هەروەها لەپاش ئەوان سیفەت و نیشانەی هەموو بڕوادارێکی پاك و خاوێنی ئەم ئوممەتەیە لەهەر چەرخ و چینێکدا، لەهەر تیرەو لە هەر وڵاتی هەتا دنیا دنیایە.

ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ

وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾

---

**یەکەم نیشانەو سیفەت ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: لە خوا ترسەکان ئەوانەن کە بڕوایان هەیە بەوەی کە هەیەو هەستی پێناکەن. دووەم ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژ بەرێكو ڕاستی بەجێئەهێنن. سێیەم ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ وە لەوەی کە پێمان داونو کردوومانە بە بەشو ڕۆزیان هەندێکی بەخت ئەکەنو ئەیدەن لە ڕێی خوادا. چوارەم ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ وە ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بەوەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ، وە بڕوایان هەیە بەوەی کە نێرراوەتە خوارەوە پێش تۆ، واتە هەرچۆن بڕوایان هەیە بەم قورئانو ئایینی تۆ هەروەها بڕوایشیان بە هەموو نامەو ئایینەکانی تری خوا هەیە کە لە پێش تۆوە هاتوون. پێنجەم: ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ وە بەبێگومانو دوو دڵیو بە ئارامی دڵەوە بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی.**

**بەکورتی ئەوە بوو نیشانەو سیفەتی ئەو لە خوا ترسانەی کە قورئان ڕێنموونیان ئەکات و بەهرەمەند ئەبن لە قورئانەوە کە ئەم سیفەتو نیشانانە شایستەو شیاوی ئەم دواترین پەیام و عەقیدەن کە هات بۆ هەموو جیهانو جیهانیان، وە هات بۆ ئەمەی هەموو ئادەمی یەك بگرن لەسەری، وە ببێ چاودێرو بەڕێوەبەری هەموو ئادەمی، تا هەموو بژین لە ژێر چاودێریو سایەیدا بە هەموو هەستو بەرنامەی تێرو تەواوی ژیانیانەوە، ئینجا کەواتە با ئەندازەیە بە درێژی بدوێین لە یەکە یەکەی ئەم سیفەتو نیشانانە بە تایبەتی، تا دەرئەکەوێ لە ژیانی ئادەمیدا.**

**وتەی ﴿غیب﴾ بەدوو جۆر بەکار ئەهێنرێ:**

**یەکەم: شێوەی گشتییە بۆ هەر شتێ کە هەستی پێنەکرێو بە ژیریی ڕووت بزانرێ یان نە ءوە بەڵگەو نیشانە ببێ لەسەری یان نەبێ.**

دووەم: تایبەتییە بەوەی هەستی پێنەکرێ‌و بە ژیریش نەزانرێ‌و هیچ بەڵگەو نیشانەیە نەبێ لەسەری، وەك قەزاو قەدەری خواو شتانەی کە زانینیان هەر لای خوایە، دیارە لێرەدا جۆری یەکەم مەبەستە.

بڕوا بە غەیب یەکەم پێویستییەکە لە ژیانی ئادەمیدا وبەبێ ئەوە ئادەمێتی بەدی نایەو ژیانەکەی تەنگ‌و کەم‌و کوڕە، چونکە یەکەم‌و سەرچاوەی هەموو شتێ، غەیب‌و ئاشکرا، دیاری‌و نادیاری خوایە، کە هەموو بوونەوەر شایەتە لەسەری، وە بە سروشت هەموو ژیرییەك هەستی پێئەکات‌و ئەیناسێ، دەی کاتێ بڕوا بوو بەو خوایە دەر ئەکەوێ ئەو بڕوادارە ئادەمییەکی تێرو تواوەو لەسەر سروشت نەترازاوەو ژیرییەکەی ئیش ئەکات، بەڵام ئەگەر بڕوای نەبێ ئەو کاتە ئاشکرایە کە سروشتی تێکچووەو لە تەوەری خۆی ترازاوە، ژیرییەکەی کوێرەو لەکار کەوتووە.

ئەو کەسەی بڕوای هەیە بە غەیب، ئەزانێ‌و بڕوای هەیە بەو هەموو هێزو وزە گیانیانەی کە نایەنە ژمارە، کەواتە چوار چێوەی ژیریی‌و زانینی زۆر پان‌و پۆڕو فراوانە، بە پێچەوانەی بێبڕوا کەلە چوار چێوەی هەست‌و هەستیار تێپەڕ ناکات.

بەهۆی بڕوا بە غەیبەوە مەردوم جیا ئەبێتەوە لە چوار پێ‌و گیان لەبەرانی تر کە بێ ئاگان لە هەر شتێ کە هەستی پێناکەن، وە بەرز ئەبێتەوە بۆ پلەی ئادەمێتی کەلەو پلەیەدا بۆچوون‌و تێگەیشتنێکی زۆر گەورەو پان‌و پۆڕی هەیە، وە تێ ئەگات لە خۆی‌و لە ژیانی‌و لەو بوونەوەرەی کە تیایدا ئەژی، وە ئەزانێ لە کوێرە هاتووەو بۆچی هاتووەو کێ دروستی کردووە، وە تێئەگات کە جیهان‌و ژیان تەنها ئەم شوێنە تەنگەو ئەم ماوە کورتە نییە، بەڵکو ئەم جیهانە قۆناغێکەو ئەم ماوە ژیانە تیایدا بۆ تاقیکردنەوەیەو جیهان‌و ژیانی بێ‌سنوورو نەبڕاوە پاش بڕانەوەی ئەمان دەست پێئەکات.

بەڵێ ئەو کەسەی کە بڕوای هەیە بە غەیب ئەزانێ کە بێجگە لەم بوونەوەرە بەئاشکراو نهێنیەکانیانەوە، یەکێ هەیە کەلە هەموو گەورەترەو ئەم بوون‌و بوونەوەرە بەو فەراهەم هاتووەو ئەو سەرچاوەیەتی، ئەو یەکەش ئەو پەروەردگاریە کە نەئەم چاوانە ئەیبینێ‌و نە ژیریی تێی ئەگات‌و پیایدا ئەگات، چونکە ئەو بێ‌سنوورەو هێزی ژیریی سنووردارە، وە بێگومان شتی سنوور دارو دوا هاتوو ناگات بەبێ سنوورو دوا نەهاتوودا، ئەوهێزی بیریی‌و

ژێرییەی کە دراوە بە ئادەمی، پێی دراوە بۆئەوەی هەڵسێ بەکارو باری ئەو جێنشینییەی کە پێی سپێراوە لەم زەی‌و جیهانەدا، بەم ڕەنگە ورد ببێتەوەو بە قوڵی بیربکاتەوە لەم هەمووەی کە بۆی دروستکراوەو خراوەتە بەر دەستی‌و ژێر بار کراوە بۆی، وە خەریك بێت ئیش‌و کار بکات‌و بەرهەم فەراهەم بێنێ‌و ئەم ژیانە گەشە پێبدات‌و بێدار ببێتەوە، بە مەرجی یارمەتی وەرگرتن‌و پاڵ پشتی هێزی گیانی (ڕۆحی) کە پەیوەستی هەیە بە پەروەردگارەوە، وە بەمەرجێ پەل نەکوتێ‌و واز بێنێ لەو شتە غەیبییە نەزانراوانەی کەلە سنووری خۆیان نین‌و ئەوانە لێگەڕێ بۆ هێزێکی ترو زانینی ئەوانە لە خوارەوە وەرگرێ لە ڕێگەی ئایین‌و ڕەوانە کراوی خواوە، وە نابێ لە خۆیەوەو بەبێ هودە خەریك بێت بەو شتانەی کەلە سنووری خۆیدا نین، وەك نابێ لای وابێ هەرچی خۆی ڕێی پێنەبردو نەیزانی ئەو شتە نییە، هەرکام لەم دوو بارە ناڕاست‌و ناڕەوایەو هەرکەس ژێر بێت دوور ئەبێ لەم دوو بارە.

بڕوا بە غەیب بەو جۆرە گرنگەو مەردوم بەرز ئەکاتەوە لە ڕادەی چوار پێی‌و گیان لەبەرانی تر، وە ئەیگەیەنێ بە پلەی بەرزی ئادەمێتی، بەڵام بە داخەوە بۆ ماددیەکان کە ئەیانەوێ ئادەمی پەست بکەنەوەو جیای نەکەنەوە لە ڕادەو پلەی چوار پێی‌و گیان لەبەرانی تر، کە هەرچی هەستی پێنەکەن نازانن هەیە!! وە ئەوەش ناو ئەبەن بە (پێشکەوتن) وە ئاشکرایە کە ئەوە لادان‌و پەستی‌و ترازانێکە کە خوا بڕوا دارانی لێپاراست، ئەوەتا یەکەم نیشانەو سیفەتی کردن بەبڕوا بە غەیب، سوپاس بۆ خوا لەسەر چاکەو بەهرەکانی، وە پەستی‌و لاری‌و ترازانیش بۆ ئەوانەی کە بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێن‌و ڕەوای ئەدەن بۆ خۆیان.

سیفەت‌و نیشانەی دووەمی لە خوا ترسەکان بەجێهێنانی نوێژ بوو بەڕێك‌و پێکی‌و ئامادەیی دڵ بە تێگەیشتنەوە، کە بەوە مەردوم بەرز ئەبێتەوە لە پەستی پەرستن بێجگە لە خوا، وەسەرو تەوێڵی تەنها بۆ خوا دائەخات نەك بۆ دروستکراوێکی وەك خۆی، وە هەر دڵێ بەڕاستی سوژدەببا بۆ خواو سەوو ڕۆژ چەند جارێ پەیوەندی بکات بە خوای خۆیەوە، ئەو دڵە هەست ئەکات بەوەی کە بەستراوە بە پەروەردگارییەوە، وە ئەزانێ کە بۆ ژیانەکەی مەبەست‌و ئامانجێکی هەیە بەرزو بڵند ترە لەوەی بەختی ئەکات لەم زەییەو لە پێویستی ئەم زەوییەدا، وە هەست ئەکات بەوە کە بەهێزترە لەو دروستکراوانە، چونکە پەیوەستە بە پەروەردگاری ئەو دروستکراوانەوە... وە ئەوەش هەموو مایەی هێزی دەروونە، هەرچۆنێ

هۆی بیم و ترس و خۆ پارێزییە، وە تەمێ دادەرو پاڵ پێوەنەرێکی بەهێزە بۆ پەروەردە کرنی ئەو دڵەو خاوەنی ئەو دڵە، وە گێڕانیان بە خاوەنی بۆ چوون و هەست و ڕەوشتێ کەلە بەرنامەی خوا وەرئەگیرێن و مایەی ڕەزامەندی خوان.

نیشانەو سیفەتی سێیەمیان کە هێندێ لەو بەش و ڕۆزییەی کە خوا پێی داوون ئەیدەن لە ڕێی خوادا. کەواتە هەر لە یەکەم جارەوە ئەزانن و دان ئەنێن بەوەدا کە ئەوەی هەیانە هی خوایەو بە لوتف و میهرەبانی خۆی پێی داوون، وە لەو زانین و دان پیا نانەوە بە خۆشی و شادمانییەکەوە کەلە دڵەوە هەڵئەقوڵێ و دەست ئەدرێتەوە بۆ چاکە کردن لەگەڵ بێ دەست و هەژاراندا، وە یارمەتیدان و بە خێوکردنی بەندەکانی خوا، وە هەروەها هەست کردن بە پەیوەتی برایەتی ئادەمێتی.... وە بەهۆی ئەوەوە دەروون پاك ئەبێتەوە لە ڕژدی و چرووکی، وە زاخاو ئەدرێتەوە بە چاکەو بەزەیی هاتنەوە، ئەو کاتە ژیان ئەبێ بە جێگای دەست گیرۆیی و کۆمەکی نەك بە جێگەی مل ملانێ و بەربەرەکانی، وە دەستەپاچەو لاوازو پەك کەوتووەکان بەبێ باکی ئەژین و خەمی ژیان ناخۆن، وە ئەزانن وان لەناو دڵ و دەروونداو ڕووی خۆش ئەبینن، نەك لە بەینی چنگڵ و کەڵبەی دوڕندەدا!!

شتدان لەڕێی خوادا زەکات و هەموو خێرێك ئەگرێتەوە، وەلە پێش دانانی زەکاتدا خێرو بەختتکردنی ماڵ لە ڕێی خوادا دانراوەو هەر بووەو لەپاش دانانی زەکاتیش هەر مایەوە، وەك لە چەند حەدیسدا هاتووە، یەکێ لەوانە حەدیسێکە کە (تیرمزی) ئەیهێنێ لە (فاتمەی کچی قەیس)ەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەماڵ و ساماندا بێجگە لە زەکات ماف تریش هەیە... وە بێگومان لیرەدا بەو شێوە گشتییە بێت چاکترەو زۆر بەشی بەو جۆرە تەفسیریان کردووەتەوە.

سیفەتی چوارەم بڕوا هێنانە بە هەموو ئایین و نامەکانی خوا. بێگومان ئەم سیفەتە شایان و شایستەیە ـ بەڵکو پێویستە ـ بۆ ئەم ئوممەتە، کە میرات بەرو وەرگری عەقیدەو ئایینە ئاسمانییەکانی ڕابردووە، وە جێگرو جێنشینی هەموو پەیام و پێغەمبەرێتیەکانە کە هاتن و تێپەڕیانکرد هەر لە سەرەتای ئادەمێتییەوە، وە جڵەوکێش و پێشەوای کاروان و کۆمەڵی ئایین و بڕوایە لەم زەوییەدا هەتا دنیا دنیایە، وە نرخی ئەم سیفەتە بریتییە لە هەست کردن بە یەکێتی ئادەمێتی، وە یەکێتی ئایینی ئادەمی، وە یەکێتی پێغەمبەرەکانی،

وە یەکێتی خواو پەرستراوی، وە هەروەها نرخی ئەم سیفەتە پاك کردنەوەی ڕۆح و دەروونە لە ڕەگەزایەتیەکی ناڕەوا بەدژی ئایینەکان و ئەوانەی بڕوایان هەیە بەو ئایینانە تا لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوا بووبن. و بێجگە لەوانەی کەباسکران نرخ و بەرهەمی ئەو سیفەتە ئارام و شادمانییە بەو میهرەبانی و چاودێرییەی کە خوا بەکاری هێنا لەگەڵ ئادەمیدا بە درێژایی هەموو چین و چەرخەکانی، ئەوەتا ئەو هەموو پەیام و شەریعەت و پێغەمبەرانەی بۆ نارد بە یەك ئایین و بە یەك ڕێنموونی یەك ڕێگەی ڕاست، وە هەروەها کەشخە و شادمانی بە یەك باری و نەگۆڕاوی ئەو عەقیدە و ئایینە لەگەڵ گۆڕانی ئەو هەموو چەرخ و بەسەرهات و ڕووباوەڕانی تردا، وە مانەوەی ئەم وەك ئەستێرەی درەخشان لە ناو تاریکیدا بۆ ڕێ دەرکردنی هەموو وێڵ و ون بوو سەرگەردانێ هەتا هەتایە وەك لە سەرەتاوە تا ئێستا.

دواترین سیفەتی لە خوا ترسەکان بڕوا کردنە لەناخی دڵەوە بە هەموو دڵنیایی و ئارامەوە بە ڕۆژی دوایی کەئەم بڕوایە ئەم جیهانە ئەبەستێ بە ڕۆژی دواییەوە، وە سەرەتاوە یەکەم جار بەدوایی و پاشە ڕۆژەوە، وە کردەوە بە سەرەنجام و تۆڵە و پاداشتەوە، وە مەردوم ئاگادار ئەکات بەوەی کەلە خۆڕایی دروست نەکراوە، وە هەرگیز بەبێ سەرو شوێنی ناڕوا، وە لێپرسینەوەی ئەبێت و دادو داد پەروەری چاوەڕوانییەتی، ئەو کاتە بڕوادار دڵنیا و دڵ ئارامە، وە سەر ناکاتە تاوان و خراپەکاری وە ئەگەڕێتەوە بۆ چاکە و چاکە کاری، وە بە ئومێد و چاوەڕوانی پاداشتی ڕۆژی دوایی ئەو بڕوادارە بەرگەی هەموو گەرما و سەرما و ئازارو سزای ئەم جیهانە ئەگرێ، وە لەکاتی خۆشی و دەسەڵات و جلەوی خۆی بەرەڵا ناکات، بەڵکو ملکەچ و چاو لەبەر تر ئەبێ بۆ خوا، وە هەروەها ئەو بڕوادارە ناژی تەنها لەم جیهانە کەم و کوڕەدا، بەڵکو ئەژی لە جیهانێکی فراوانی نەبڕاوەدا، وە ئەزانێ ژیانی هەر ئەم ماوە کەمەنییە، بەڵکو ئەم ژیانە ژیانی ڕاستەقینە نییە و سەرەتا و پێش ڕەوە و بۆ تاقیکردنەوەیە، تا هەرکەس بگات بەسەرەنجام و بەرهەمی کردەوەی خۆی، وە ژیانی ڕاستەقینە ئەوەیە کەلە ڕۆژی دواییدا هەیە.

أُولَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧

---

هەرکام لەم سیفەتانە ـ وەك باسکرا ـ نرخێکی گرنگی هەیە لە ژیانی ئادەمیدا، جالەبەر ئەوە ئەوانەن سیفەت و نیشانەی لە خوا ترسەکان، وە ئەم سیفەتانە ڕێك و پێکی و پەیوەستیان هەیە پێکەوە و تەواو کەری یەکترن و بەیەك گرتنی هەموویان بەندەی بڕواداری ڕاستەقینە پێکدێت، وە ئەوە بوو شێوە و دیمەنی ئەو یەکەم گەلە موسڵمانەی کە لەیەکەم جارەوە فەراهەم هات لە مەدینەدا، وە پێکهاتبوو لە هاوەڵەکۆچ کەرەکان و یارمەتی دەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ـ خوا لەوانیش ڕازی بێ ـ وە ئەو گەل و کۆمەڵە بەو سیفەت و نیشانانەوە ئێجگار گەرەتر گرنگ و بەنرخ تر بوون، وە خوای گەورە ئیشی زۆر گەورە و بەنرخی پێکردن لەم زەوییە و لە ژیانی هەموو ئادەمیدا.... جالەبەرئەوە ئەوانە یەکەم شایان بوون بەم وەسف و سەناو مزگێنییە ﴿أُولَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەوانەی کە خاوەنی ئەو سیفەت و نیشانانە بوون دامەزراو بوون و جێگیر بوون لەسەر ڕێنموونییەکی گەورە کە بۆیان هات لەلایەن پەروەردگاریانەوە، وە هەر ئەوان گەیشتوون بە ئاوات و ئامانج لە پاش هەوڵ و تێکۆشان بۆی، ئینجا دێتە سەر باسی دووەم تاقم کە بە ڕاستی نوێنەری بێبڕوایین لە هەموو چەرخ و چینێکدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە ئەوانەی کەبڕوایان نەهێناوە و سوورن لەسەر بێبڕوایی بە بێ گەڕانەوە لەم جیهانەدا، ئەوانە: ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ یەکسانەلەسەریان، ترساندنی تۆونەترساندنت بۆیان،واتە: ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانە بڕوا ناهێنن.

ئەم تاقمە بە تەواوی دژو پێچەوانەی تاقمی یەکەمن، ئەوان قورئان ڕێنموونی کەریانە و کاریان لێ ئەکات، ئەوان هەست و دڵ و دەروونیان کراوەیە بۆ تێچوونی ڕووناکی بڕوا، ئەمان هەموو هەست و دڵ و دەروونیان مۆر کراوە و داخراوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ﴾ خوا مۆری ناوە بەسەر هێزی بیستنیاندا، کەواتە شتی ڕەواو ڕاست نابیسن،

﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ﴾ وە بەسەر چاویانەوە پەردەیەکی گەورەو ئەستوور هەیە، کەواتە ڕەواو ڕاستی نابینن، ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ وە بۆیان هەیەسزایەکی گەورە، پەنابەخوا ئەگرین لەسزایە کەخوا بەگەورەی دابنێ و ناوی ببا!!

مەبەست لەم مۆرکردنی دڵ و گوێ و پەردە هێنان بەسەر چاوەدا، هەواڵ دانە بە نەگەڕانەوە و سووریی ئەوانە لەسەر بێبڕوایی، وە دڵنیا کردن لەسەر ئەو هەواڵە بەمەی بە شێوەی چیرۆك وێنەیان بۆ ئەهێنێتەوە بە شتێکی داخراوی مۆر کراو کە ڕێگە نەمێنێ بۆ ئەوەی هیچ شتێکی تێبڕوا، یا مەبەست ڕوونکردنەوەی هۆی بڕوا نەهێنانەکەیانە، کە بەهۆی بەد کرداری خۆیان و سووریان لەسەر بێبڕوایی، خوا دڵ و گوێ و چاویان بەرگری ئەکات لەوەرگرتن و بیستن و بینینی ڕەواو ڕاست، وە بە هەر جۆرو لەسەر هەربار ئاشکرایە کە زۆر پێهێنان و ناچار کردن ڕوونادات لەو بڕوا نەهێنانەدا، وە هەروەها لەهەر بەد کردارییە کە بەندە ئەیکات، چونکە ئادەمی سەربەستییەکی پێدراوە و خواهیشت و هەڵبژاردنی هەیە و ئەتوانێ کام ڕێگا بداتە بەر، وە خواهیشت و هەڵبژاردن و کردەوەکەی زانراوە لای خوا، واتە خوا زانیویەتی کە ئەو بەندەیە بە مەیل و خواهیشت و هەڵبژاردنی خۆی کردەوەکە ئەکات، لەپاش ئەوەش کە ژیریی پێدراوە و ڕێگای ڕاست و چەوتیشی بۆ دیاریکراوە لەگەڵ بەڵگەو نیشانەشدا، وە ترسێنراوە لەسەر خراپەو موژدەشی پێدراوە لەسەر چاکە، ئینجا ئەمەش ئاشکرایە کە خواهیشت و بڕیاری خوا شوێنی زانینەکەی ئەوکەوێ و بە پێی ئەوە ئەبێ کە لەزانینیا تێپەڕی کردووە، کەواتە ئەوەی کە خوا زانیویەتی و خواهیشی کردووە و بڕیاری داوە لەسەر بەندە، هەر ئەوەیە کە بەندەکە بە خواهیشت و هەڵبژاردنی خۆی ئەیکات، بەڵام بەدی نایەت بە خواهیشت و دروستکردنی خوا نەبێ، چونکە تەنها خوا دروستکەرو داهێنەری هەموو شتێکە.

ئەم باس و مەسەلەیە زۆر دوورو درێژەو ئاژاوەو لێکۆڵینەوەی زۆری تیا کراوەو گەلێ کەسی تیا چووە، بەڵام هەرکەس ژیریی تێرو تەواو بێت ئەم ئەندازەی بەسە کە بە کورتی وتمان هەموویشی ئاشکرایە، ئینجا دێتە سەر باسی تاقمی سێیەم و نموونەی سێیەم، ئەم تاقمە نەوەك یەکەم تاقمە لەڕوونی و ڕووناکیدا، وەنەوەك دووەم وایە لە تەم و تاریکیدا، بەڵکو بە جۆرێك لەبەرچاو ئەبروکێتەوەو ئینجا ون ئەبێ.

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩﴾

---

**ئەفەرمویٚ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ لەناو ئادەمیدا هێنی وا هەیە کە ئەڵێ: بڕوام هێناوە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، بەڵام بڕوا ئەوە نییە کە بەدەمی ڕووت بوترێ، بەڵکو بڕوا ئەبێ لە دڵەوە هەڵقوڵێ و ئینجا لەوتارو کردارا دەرکەوێ، وە ئەو تاقمەش بڕواکەیان بەدەمی ڕووت بوو ئەوەی لەدڵیاندا بوو دژو پێچەوانەی وتنەکەیان بوو، لەبەرئەوە خوا بەم جۆرە بەتینە بەرپەرچی دانەوەو بەدرۆی خستنەوە، فەرمووی: ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان ئەوانە هیچ کات بڕوا دارنین.**

**بە ڕواڵەت ئەبوایە بیفەرموایە: (وما أمنوا)، ئەوانە بڕوایان نەهێناوە، بەڵام ئەم شێوەی ئێستا زۆر بەهێزترە، چونکە هەمیشەیی و بەردەوامیان لەسەر بێبڕوایی ئەگەیەنێ لەگەڵ دڵنیا کردن لەسەر ئەوە.**

**ئەم شێوەو نیشانانە کەلەم چەند ئایەتەدا باسیان ئەکات لەیەکەم جارەوە بەدی هاتن لەناو ئەو یەکەم تاقمی مەدینەدا، بەڵام تایبەتی نین بەوانەوە، بەڵکو ئەو نموونەیە هەر بوون و هەر هەیشن و ئەبن لە ناو گەلی موسڵماندا لە هەموو چەرخێکدا ئەوانە پەیدا ئەبن لەناو چینی دەسەڵاتداری بە زل زاندا کە ئەوەندە ئازاو چالاك نین بێپێچ و پەنا خۆیان ساغ بکەنەوە بە بارێکدا خۆیان ببڕن بە مل کۆمەڵێکدا، بەڵکو وەك خۆیان ئەڵێن ئیدارە سازی ئەکەن و ئەیانەوێ لەگەڵ هەموو کەس خۆیان ڕێك خەن، وە ئەوانە زیانیان بۆ ئیسلام و موسڵمانان زۆر بەهێزترو خراپترە لەوانەی کە بەئاشکرا دوژمن و خۆیان بە دوژمن نیشان ئەدەن، ئەوانەی بە زیرەك و لێزان دائەنێن و ئەتوانن مەردوم و موسڵمانان بخەڵەتێنن بە لاف بڕواو موسڵمانێتی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ فێڵ و تەڵەکە ئەکەن لە خواو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بۆ خەڵەتاندنیان.**

**ئەوانە نیازی فێڵ و تەڵەکە لە خواو هەڵەتاندنی ئەویان نەبووە، بەڵام شێوەی ناپاکیان لەگەڵ ئیسلام و بڕواداراندا بەبێ باك و ترسان لە خوا وەك شێوەی فێڵ و تەڵەکە لەگەڵ خواو خەڵەتاندنی خوا وایە، وە بێجگە لەوەش ئەم فەرموودە دەربڕینە شتێکی زۆر گەورە نیشان ئەدات کە مایەی ئەو پەڕی دڵخۆشی و شادمانی بڕوادارانە، ئەوەش بریتییە لە نیشاندانی**

پەیوەستی تەواوی ئەو بڕوادایانە بە خۆیەوە، تا ڕادەیە کۆمەڵ و ڕیزی ئەوان بە کۆمەڵ و ڕیزی خۆی نیشان ئەدا، وە کاری ئەوان بە دوژمنی خۆی سەیر ئەکات، وە ئەو پیلان و کردەوە خراپانەی کە ئاڕاستەی ئەوان بکرێ وای دائەنێ کە ئاڕاستەی خۆی کراوە، وە ئەوەش ئەو پەڕی ڕێزو نرخ پێدانە، وە بەڕاستی بەهرەیەکی ئەوەندە گەورەیە بە هیچ زویان و نوسین و کردەوەیە سوپاس و ستایشی ئەوە ناکرێ و دوایی نایەو بەندەی بڕواداری ڕاستەقینە نازانێ چی بڵێ و چی بکات؟ وە ئەگەر لە شەرم و چاو لە بەریدا بتوێتەوە ماف خۆیەتی!! وە لەهەمان کاتدا ئەم فەرموودەو دەربڕینە هەڕەشەیەکی گەورەو سامناکە لەوانەی کە ئەیانەوێ پیلان بگێڕن بە بڕواداران و کردەوەی خراپیان دەربارە بکەن و ئازارو سزایان پێبگەیەنن، هەڕەشەیە بەمەی کە هەر شتێ بکەن دەربارەی ئەو بڕوادارانە لەڕاستیدا وەك لەگەڵ خوای بکەن وایە، جا کێ ئەتوانێ و ئازایە با لەگەڵ خوا بجەنگێ و ئاژاوەو بەر بەرەکانێی لەگەڵ بکات!

بەڕاستی ئەوەی کە ئەو فەرموودەیە ئەیگەیەنێ و نیشانی ئەدات لەو دووبارەوە کە باسکران، زۆر شایانی ئەوەیە بڕواداران زۆر بە وردی بیری لێبکەنەوە، بۆ ئەوەی دڵ ئارام بن و بە دامەزراوی لەسەر ڕێگەی خۆیان بڕۆن و باکیان نەبێ لە پیلانی پیلان گێڕان، وە لە فڕو فێڵی فێڵ کەران، وە لەسزاو ئازاری پیاو خراپ و دوژمنان، وە هەروەها زۆر شایستەیەو جێگای خۆیەتی بۆ دوژمنەکانیان بیرو هۆشێ بکەنەوەو دڵیان داچڵەکێ و بزانن کە لەگەڵ کێ ئەجەنگن و بەربەرەکانێی کێ ئەکەن؟! ئینجا با بگەڕێینەوە بۆلای ئەو ناپاکانە کە خۆیان بە زیرەك دائەنێن و ناپاکیەکەیان بە لێزانی سەیر ئەکەن، با بگەڕێینەوە بۆ سەریان تا بزانین بەرهەم و سەرەنجامی پیلان و ناپاکیەکەیان چییەو زیانی بۆ کێ ئەبێ؟ با گوێ بگرین لە قورئان کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ وە ئەوانە فێڵ و تەڵەکەیان نەکردووە لەگەڵ خۆیان نەبێ، چونکە زیانی کردەوەی خۆیان هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە، ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾، وە خۆیان هەست بەوە ناکەن، وە بێئاگان لەوەی کە خوا ئاگادارە بەوان و بەکردەوەکەیان، وە نازانن کە خوا ئەو بڕوادارانەی خستووەتە پەنای خۆی و ئەیانپارێزێ لە پیلان و بەد کرداریی ئەوان، ئەوانە پیلان و ناپاکیان لەگەڵ خۆیانکرد کە لایان وابوو ئەو ناپاکی و فڕوفێڵە قازانجیان دەست خۆیان خسووە، وە خۆیان پاراستووە لەوەی بە ئاشکرا جاڕی بێبڕوایی لە خۆیان بدەن لە کاتێکدا بەوە خۆیان بەدبەختکردو خۆیان خستە چاڵی نا ئومێدی و بەش براوی، وە خۆیان دووچاری بەدترین دوا ڕۆژ کرد بەبێ برانەوە،

فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًاۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ
لَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا
يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ
ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

**هۆی ئەو ناپاکیو بەد کرداریەشیان ئەمەیە: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە، نەخۆشی بێبڕواییو بەدعەقیدەیی یانەخۆشی داخ‌وکینەوحەسادەت بەپێغەمبەر(ﷺ) و ئیسلامو موسڵمانان، ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًاۖ﴾ لەبەر ئەوە خوا نەخۆشیەکەیانی زیاد کرد، بەم ڕەنگە دڵی مۆر کردن وەك ئەو تاقمەکەی تر، یا داخو کینەو حەسادەتەکەی بەتین تر کردن بەمەی پێغەمبەر (ﷺ)و موسڵمانانی سەرخستو پایەو پلەی بەرزتر کردنەوە، لەم جیهانەدا بەو جۆرە ژیاندنی، وە لە ڕۆژی دوایش دا بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ﴾ وە لە ڕۆژی دواییدا سزایەکی سەختی ئازار دەریان بۆ هەیە بە هۆی درۆیە کەلەم جیهانەدا کردیانو بەدرۆوە وتیان بڕوامان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە لەسەر ئەو درۆیە مانەوە بە هەمیشەییو وازایان نەهێنا.**

**سیفەتێ تری ئەو ناپاکانە ـ بە تایبەتی گەورەکانیان کەلەپێش هەڵاتنی تیشکی ئیسلام بۆ مەدینە لەناو گەلەکەیاندا سەرۆكو دەم ڕاست بوون وەك (عبداللە ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) ئەوە بوو سەرکەش بوون کەشخەیان ئەکرد بەبارو کردەوەیەکە لەسەری بوونو بە چاکەو سوود بەخشیان نیشان ئەدات، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ کاتێ بوترێ پێیان: شەڕو ئاژاوە مەنێنەوە لە وڵاتداو خراپەکاری مەکەن لەزەویدا، بەبڕوانەهێنانو ناپاکیو دوو زبانی کردنو هاندانی مەردوم لە بڕواجارەکانو بەرگری کردن لەبڕواهێنانو شوێن کەوتنی ئایینی خوا، کاتێ ئەو ئامۆژگاری یە بکرێن ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەڵێن: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ ئێمە هەر چاك کەرو چاکە کەرین لەوڵاتداو دوورین لە خراپەکاریو تێکانی وڵات.**

ئەوانەی کە تێك دەری وڵاتن و پیس ترین کردەوە ئەکەن تیایداو لەگەڵ ئەوەدا ئەڵێن: ئێم ڕێك و پێك کەری وڵاتین، ئەوانە زۆرو زەبەنەن لە هەموو چەرخێکدا، وە ئەوانە سروشتیان تێکچووەو تەرازووی دەستیان ئارەزووی نەفسیانە، بە هۆی ئەوەوە چاکە بە خراپە سەیر ئەکەن و خراپە بە چاکە دائەنێن، وەك هەندێ نەخۆش کە تاڵ بەشیرین ئەزانێ و شیرین بە تاڵ ئەچەژێ، جا لەبەرئەوە دەم کوتیان ئەکات و بەرپەرچیان ئەداتەوە بەم شێوە سەخت و دڵ تەزینەو لە چەند ڕێگایەکەوە دڵنیایی لەسەر ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ﴾ بێدار بن کە بێگومان ئەوانە هەر خراپ کەرو خراپەکارو تێکدەرن، ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾ بەڵام ئەوانە هەست ناکەن، واتە: تێکدان و خراپەکاریەکەیان ئاشکرایەو بەچاوئەبینرێ، بەڵام ئەوان هەستیان نییە.

سیفەتێ تریان ئەمەیە خۆیان زل و بڵند تر لە مەردوم نیشان ئەدەن، وە ئەیانەوێ بەوە پایەو پلەیە پەیدا بکەن لە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾، کاتێ بوترێ پێیان: بڕوا بێنن هەر چۆنێ ئەو خەڵکە بڕوایان هێنا، واتە بڕوایەکی پاك و خاوێن و ڕاست و ڕوون، دوور لە تێکەڵ کردنی ئارەزوو کاری، بەوێنەی بڕوای ئەوانەی کە خۆیان ملکەچکرد بە تەواوی بۆ خواو دڵیان کردەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەر تەمێ و فەرمانێکی... بێگومان ئەو ناپاکانە خۆیان بە بڵندو پایە بەرز دائەنا، لەبەر ئەوە خۆیان بە شایستەی ئەو ملکەچی و فەرمانبەرییە دانەئەنا، بەڵکو هەژارو بێدەستەکان شایستەی ئەوەن، لەبەرئەوە لە وەڵامی ئەو ئامۆژگارییەدا ﴿قَالُوٓا۟﴾ ئەیان وت: ﴿أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ ئایا ئێمە بڕوا ئەهێنین هەرچۆنێ ئەو گێل و گوارانە بڕوایان هێناوە؟ واتە: نەخێر شتێ وا نابێ و شایانی ئێمە نییە، ئینجا لەبەرئەوەی ئەوانە ئەوەندە لە خۆ گۆڕاوو ناپاك بوون، خوای گەورە دەم کوتی کردن و بە پەرچی دانەوە بەم شێوەیە کە ئابڕووی بۆ نەهێشتن و بەم جۆرە جاڕی لێدان: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ بێداربن کە بێگومان ئەوانە هەر گێل و نەفامن وە تێگەیشتن و فامیان نییە، وە هەر ئەوان گێلن نەك ئەوانەی کە ئەمان بە گێلیان ناو بردن: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام ئەو ناپاکانە نەزانن و نازانن.

وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ
١٤ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ١٥ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ

**ئەو كەسەی كە گێلو نەفام بێت نازانێ بە خۆی كە وایە، ئەو كەسەی كە لای دابێو لارێی گرتبێ نازانێ وایە، ئینجا دێتە سەر دواترین نیشانەیان لێرەدا كە دەست نیشان ئەكات بۆ پەیوەستیو پەیوەندی بەتینی ناپاكەكانی مەدینە بە جوولەكە داخ لە دڵەكانەوە... ئەو ناپاكانە بێجگە لە درۆو پیلانو پڕو پاگەندەیە كە پێی هەڵئەسان، بێنرخو كەم زانو ترسنۆك بوون، وەك دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ كاتێ كە ئەگەیشتن بەوانەی بڕوایان هێنابوو: ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ ئەیان وت ئێمە بڕوامان هێناوەو بڕوادارین، ﴿وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ﴾ وە كاتێ تەنیا ئەكەوتنو ئەچوون بۆلای شەیتیانەكانیان ـ واتە ئەوانەی كە هانیان ئەدان لەسەر بێبڕواییو دوژمنایەتی بڕواداران لە جوولەكەكانی مەدینە یا كاهینەكانی خۆیان ـ لەو كاتەدا: ﴿قَالُوٓا۟﴾ ئەیان وت پێیان: ﴿إِنَّا مَعَكُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین لە ئایینو باوەڕدا، وە ئەمەی كەلە ناو محمدو هاوەڵەكانیدا بڕوا دەرئەبڕین بە ئایینەكەیان بەڕاستیمان نییە، ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾، ئێمە هەر لاقرتی كەرینو مەبەستمان لاقرتی كردنە پێیان كە بەدەم ئەڵێین: بڕوامان هێناوە.**

**ئەمەی كە لێرەدا گێڕایەوە لەو ناپاكانەوە جیایەو دووبارە كردنەوە نییە لەگەڵ ئەوەی كەلەسەرەتای باسەكەیانەوە فەرمووی، چونكە مەبەست لەسەرەتاكە هەر ڕوونكردنەوەی ناپاكیەكەیانەو دەرخستنی بیروباوەڕەكەیان، وە مەبەست بەمەی ئێرە دەرخستنی ڕەفتارو كردەوەیانە لەگەڵ بڕوا دارانو هاوەڵو دۆستەكانی خۆیان، وە بێجگە لەوەش ئەمەی ئێرە شتی زیادەی تیایە كەلەوێ نییە، كەواتە بە هەر جۆر بیگیرێ دووبارە كردنەوە نییەو جیاوازە لەگەڵ سەرەتاكەدا، ئینجا با گوێ بگرین لەم هەڕەشە سامناكە خوا ئاڕاستەیان ئەكات بەرامبەر ناپاكیو لاقرتی كردنیان بە بڕوادارەكان ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾ خوا لاقرتی ئەكات بەو لاقرتی كەرانە، واتە بەسووكو ڕیسوا سەرنجیان ئەدا بەجۆرێ هەركەس ئاگادار بێبەوە پێكەنینی پێیان دێتو سەری سووڕ ئەمێنێ لێیان، یا سووكیو ڕیسوایی**

ئەدا بەسەریانداو ئەیانکات بە پەن لەناو مەردومدا، یا تۆڵەی ئەو لاقرتیەیان لێ ئەسێنێ، یا وەك لاقرتی کەر ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکات لە هەردوو جیهاندا، لەم جیهانەدا بەم جۆرە بە ڕواڵەت وەك موسڵمان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکرێ و بە موسڵمان سەرنج ئەدرێن و لەسەر ئەو بارە مۆڵەت ئەدرێن تا بە خۆیان نازانن، ئەمرن و سەریان لە سزای سەختی خواوە دەرئەچێ، وە لە ڕۆژی دواییشدا وەك ڕیوایەت کراوە قاپی بەهەشتیان لێ ئەکرێتەوەو ئەوانیش بە چەسپانی ئەڕۆن بۆلای کە لەگەڵ گەیشتنە لای پێوەئەدرێ و دائەخرێ لێیان، هەربەوجۆرە بانگ ئەکرێن وە قاپیەکان و ئەو لاقرتییە گەورەیان پێئەکرێ لەو کاتە تەنگەداو ئەو سیخە ئاگرینە ئەکرێ بە بەنوکەی دڵیاندا ـ خوا پەنامان بدا لێی ـ.

﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ﴾ وە بەهێزو بە کێشیان ئەکات لەسەرکەشیەکەیاندا کە خۆیان بە خواهیشت و هەڵبژاردنی خۆیان کەوتنە سەری و دایانە بەر ﴿يَعْمَهُونَ﴾ لەکاتێکدا کە دڵیان نابینایەو بەسەرگەردانییەوە ئەسوڕێنەوەو ئەژین، پەنا ئەگرین بە خوا لەو بەد بەختی و سیا چارەییە کە دووچاری ئەوانە دێت، ئەی هاوار بۆ کەسێ کە خوای ئەم بوونەوەرە ئاوا لێی بڕەنجێ تا ئاوا نائومێدو شەقاوەت مەندی بکات!!

وەك لەسەرەتای باسی ئەم ناپاکانەوە وتمان، هەروەها لێرەشدا دەست نیشان ئەکات کە خوای گەورە لە باتی بەندە بڕوادارەکانی خۆی ئەکات بە خاوەن ئاژاوەو جەنگ و بەربەرەکانیەکە، کەواتە با دۆستەکانی خوا شادمان و دڵئارام بن بەو کۆمەکی و بەهرە گەورەیە، وە با دوژمنەکانی ئایینی خوا بترسن و داچڵەکێن لەوەی کە بەرامبەری خوا وەستاون و جەنگ و ئاژاوە لەگەڵ خوا ئەکەن!

دواترین وتە کە حاڵ و باری ناپاکان ڕوون ئەکاتەوە، وە زیان و ڕەنجەڕۆییەکەیان دەرئەخات لێرەدا ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ﴾ ئەوانە کەسانێك بوون کە گومڕاییان کڕی بە ڕێنومایی، واتە ئەوانە ئەیانتوانی ڕێگەی ڕاست بدەنە بەرو ڕێنومایی وەرگرن، بەڵام لەباتی ئەوە ڕێی چەوتیان دایە بەرو گومڕاییان هەڵبژارد بۆ خۆیان، وەك بازرگانێکی نەزان و بێئاگا کە شت و مەکی بێنرخ و نەویستە وەرگرێ لەباتی شتی زۆر بەنرخ

فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦ مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ
مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ
١٨ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ
ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩

---

**﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ کەواتە بازرگانیی و کڕین و فرۆشتنەکەیان قازانجی نەکرد، ﴿وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ﴾ وە ڕێی ڕاستیان نەدایە بەر تا بەجارێ بەسەرو ماڵەوە تیا چوون.**

**تاقمی دووەم هەرچەند بێبڕواو دژمنن، زۆر لەسەریان نەڕۆشت و بەباسی هێندێ سیفەت و ناونیشان وازی لێهێنان و باسەکەیانی دوایی پێهێنا، بەڵام بەدرێژیی دووا لەم تاقمی سێیەمە، چونکە تاقمی دووەم لە بارێکەوە ڕاستیەکیان تیایە و سەرتێك نادەن و بێ پێچ و پەنا بێبڕوایەتی و دوژمنایەتی خۆیان دەرئەبڕن، کەواتە مەردومیان پێناخەڵەتێ، بەڵام تاقمی سێیەم لە هیچ بارێکەوە ڕاستیان تیا نییە و سەر تێك دەرن، وە بە ناپاکی خۆیان ئەکەن بەناو ڕیزی موسڵمانانداو بەناوی دۆستایەتییەوە هەمیشە کەندەیان لێئەکەن و زیانیان لێئەدەن، کەواتە پێویستی هەیە بە زیادە ڕوون کردنەوەی نیازو کردەوە شاراوەکانیان تا موسڵمانان بیان ناسن و خۆیانیان لێبپارێزن و بێباك نەبن لێیان و لە پیلان و کردەوەی پیسیان، ئینجا بۆ زیادە ڕوون کردنەوەی بارو حاڵەتیان دوو چیرۆکیان بۆ ئەهێنێتەوە، چونکە چیرۆك دەستێکی زۆر باڵای هەیە لە نیشاندان و پێناسیندا، چونکە ئەو شتانەی کە هەستیان پێناکرێ بە هەست پێکراو نیشانیان ئەدات و پۆشاکی هەست پێکراویان ئەکا بەبەردا، یەکەم لەمەدا کەلە یەکەم جارەوە موسڵمان بوون و ڕووناکی بڕوا کەوتە دڵیان و لەپاش دا گومانیان پەیدا کردو هەڵگەڕانەوەو بە چوار دەوریاندا مەردوم بڕوای هێناو کەوتە ناو ڕووناکی، لەم بارەیەوە وێنەیان بۆ ئەهێنێتەوە بە کۆمەڵێ کە ئاگرێ هەڵئەگیرسێنن تا دەورو بەریان ڕووناك ئەکاتەوە، ئینجا خوا ڕووناکیەکەیان نەهێڵێ و بیانخاتە تاریکییەکە هیچ بەدی نەکەن تیایا، ئەفەرموێ: ﴿مَثَلُهُمۡ﴾ وێنەی سەر سوڕهێنەری ئەوانە ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ وەك وێنەی کۆمەڵێ وایە کە ئاگرێکیان هەڵگیرساندبێ، ﴿فَلَمَّآ**

﴿أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ ئینجائەوئاگرە دەوروبەری ئەو کۆمەڵەی ڕووناك کردبێتوە ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ خوا ڕووناکیەکانی بردبێ و نەیهێشتبێ، ﴿وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ﴾ وە ئەوانی خستبێتە ناو چەند جۆرێ تاریکی، بە جۆرێ هیچ بەدی نەکەن و بەدی کردنیان نەمێنێ، ﴿لَّا يُبۡصِرُونَ﴾، بەڵێ ئەوانە هەر لە یەکەم جارەوە پشتیان نەکردە ئایینی خواو ڕوویان وەرنەگێڕا لەڕێی ڕاست، گوێچکەیان کەڕ نەکرد لە بیستنی شتی ڕاست وە چاوی خۆیان کوێر نەکرد لەبینین و دڵیان لەکار نەخست بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن، وەك تاقمی دووەم کە باس کرا، بەڵکو ئاگریان هەڵگیرساند بۆ ڕووناکی وەرگرتن و بەدوای ئەو ڕووناکییەدا گەڕان، بەڵام لەپاش ئەوەی ڕووناکیان بینی سوودیان لێوەرنەگرت، چونکە خۆیان تاریکیان هەڵبژارد بۆ خۆیان، لەبەر ئەوە خوایش ڕووناکیەکی لێگرتنەوە و خستنیە ناو تاریکیەکان، وەلە پاشا ئەوانە گوێچکەو زوبان و چاوی خۆیانیان لە کار خست و بە کاریان نەهێنان لەوشتانەدا کە سوودی هەیە بۆیان و بۆی دروست کراون، کەواتە ئەوانە ﴿صُمُّۢ﴾ کەڕن، ﴿بُكۡمٌ﴾ لاڵن، ﴿عُمۡيٞ﴾ کوێرن، ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾ لەبەر ئەوە ناگەڕێنەوە بۆلای ڕاست، وە ناگەڕێنەوە بۆ ڕێنومایی و ڕێنابەن بە ڕووناکی هەرگیز.

شتێکی سەیر هەیە بەتێ هەڵکێش لێرەدا جوانە بوترێ: تاریکی لە قورئانا هەر بە کۆ وتراوە، وە ڕووناکیش هەر بە تاك، وە هۆی ئەوەش بە چەند جۆرێ وتراوە، هەمووی ڕێکەو ئەگونجێ:

١- ڕێگەی ڕاست هەر تەنها یەکێکەو بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ زیاتر بێت بەڵام ڕێگە چەوتەکان زۆرن تا ڕادەیە بەئاسانی نایەنە ژمارە.

٢- ڕووناکی تا زۆر بێت هەر بەکەم دائەنرێ، ئەگەر زیان نەدات، وە تاریکی هەرچەند کەم بێت بەزۆر دائەنرێ، مەگەر لە هێندێ کاتدا کە پێویست بێت.

٣- ڕووناکی وێنەیە بۆ بڕوا، وە تاریکی وێنەیە بۆ بێبڕوایی، دەی بڕوا تا بەهێز بێت هەر کەمە، وە بێبڕوایی تا لاواز بێت هەر زۆرە.

٤- کان و مەڵبەندی بڕوا کە وێنەی ڕوونکییە، دڵی بڕوادارانە کە هەموو ئەبێ یەك دڵ و یەك مەبەست و یەك ئامانج بن، وە کان و مەڵبەندی بێبڕوایی کە وێنەی تاریکییە دڵی بێبڕوایانە کە زۆرو بەش بەش و پچڕاون لەناو خۆیاندا.

وێنەو چیرۆکی یەکەم بەو جۆرە دوایی هات، ئینجا دێتە سەر وێنەو چیرۆکی دووەم بۆ ڕوون کردنەوەی بێئارامی دەروون و سەرگەردانی و بیم و ترسان و پێگیرانیان لە بەینی بڕواداران و سەر کەشەکاندا، لەم چیرۆکەدا شێوەی ئەو ناپاکانە دەر ئەخات لە کاتێکا کە ئایەتەکان و ڕێنموونی خوا لە ئاسمانەوە دێتە خوار بۆ سەریان، ئینجا ئەوانیش بێئارامی دڵیان دائەگرێ و لەگەڵ تاریکی و گومان و شوێن کەوتنی مەردوم و بیم و ترس لە جوڵانەوەیان، بە پێچەوانەی دڵی کۆمەڵی بڕوادارو بێبڕوا، ئینجا کاتێ ڕووناکی ئەو ئایەت و بەڵگەو نیشانە ڕوونانەیان بۆ دەرئەکەوێ، ئەیانەوێ بڕۆن و شوێنی کەون، بەڵام ئەوەندەی پێناچێ تاریکیەکان پەیدا ئەبنەوەو ئەیان وەستێنن لەو نیازەو بەهۆی ئەوەوە بەو بێئارامی و سەرگەردانییەوە ژیان بەسەر ئەبەن، جا وێنەی ئەم ناپاکانە وەك وێنەی کۆمەڵی لێئەکات کەلە چۆڵ و بیابان و شەوێکی تاریکا باران و ڕەهێڵەیە لێیان داکا بەهەورە گرمەو چەخماخەو هەورە تریشقەوەو ئەوانیش بیم و ترس داگیریان بکات و پەنجە بکەن بە گوێچکەیاندا لەبەر هەورە گرمەو تریشقەکەی، لەبەر ئەوەی لە ترسا نەمرن، وە هەرکاتێ ڕووناکی چەخماخە ڕێگەیان بۆ ڕووناك بکاتەوە دەست بکەن بە ڕیشتن و هەر لەگەڵ نەما بوەستن، ئەفەرموێ: ﴿ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتە وێنەی ئەو ناپاکانەیان وەك کۆمەڵی پێشووەکە باس کران لە چیرۆکی یەکەم دا، یان وەك کۆمەڵێ وایە کە باران و ڕەهێڵەیەکی بەهێز بێتە خوارەوە بەسەریاندا لە هەموو لای سەروویانەوە کە ﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٞ ﴾ لەو بارانەو لەگەڵ ئەو بارانەدا ببێ بە جۆرێ لە تاریکی بەشی هەورەکەو تاریکی پڕی و داگیر کردنی، وە تاریکی شەوەکە، تەووژمی باران و تاریکی هەورەکەی و تاریکی شەو ﴿وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ ﴾ وە لەگەڵی دا بێت هەورە گرمەو چەخماخە، ئینجا ئەوانە لەو کاتە سەختەدا ﴿يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم ﴾ پەنجەکانیان ئەخەنە گوێچکەکانیان و سەری پەنجەیان ئەئاخنن پێیاندا ﴿مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ ﴾ لەبەر هەورە تریشقەکان، تا بەوە بەرگری بەتینی دەنگەکەیان بکەن، ﴿ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ ﴾ لە ترسی مردن و لەبەر خۆپاراستن لەمردن، ئینجا بە تێهەڵکێش ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ خوا دەوری بێبڕواکانی داوە بەزانین و توانین و دەسەڵات بۆ ئەمەی دڵبێدارو ئاگادار بکاتەوە کە بە هیچ ڕەنگ بەرگری بڕیارو قەزاو قەدەری خوا ناکرێ، وە هیچ خۆڵادان و فێڵ و تەڵەکەیە سوودی نییە هەرچی خوا بڕیاری دابێ هەر ئەوە ئەبێ،

يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَـٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾

**ئینجا دێتەوە سەر تەواو کردنی وێنەو چیرۆکەکەو حاڵی ئەوانە نیشان ئەدات لەگەڵ ئەو چەخماخەو بزیسکەدا، ئەفەرموێ: ﴿يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَـٰرَهُمْ﴾ نزیکە ئەو بزیسکەو چەخماخەیە بە چەسپانی ئاوی چاویان ببات و بیناییان نەهێڵێ، ئینجا با بزانین ئەوانە لەو کاتە سەختەدا چی ئەکەن؟ ئەوا ئەوەشمان بۆ باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ﴾ هەر جارێ ڕووناکی بدات پێیان و جێگەی پێ و ڕۆیشتنیان بۆ ڕووناك بکاتەوە ئەڕۆن تیایدا، ﴿وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ﴾ وە کاتێ تاریك ببێ لەسەریان، بەم ڕەنگە ئەو ڕووناکییە نەمێنێ ﴿قَامُوا۟﴾ ئەوەستن لە شوێنی خۆیانا بە بیم و ترس و سەرگەردانییەوەو چاوەڕوانی چەخماخەیە تر ئەکەن، واتە زۆر سوورن لەسەر ڕۆیشتن و چاوەڕوانی، هەر جار فرسەت و هەلێکیان دەست کەوێ بە پەلە ئەڕۆن و کە هەلەکە نەما بە ترس و سەرگەردانییەوە ئەوەستن، هەرچۆنێ ناپاکەکان ئەو پەڕی سەرگەردانی و بیم و ترسیان هەیەو نازانن چی بکەن و چی نەکەن، وە بە چی ڕزگار ئەبن! ئینجا لەپاش تەواو کردنی چیرۆکەکە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە هێزی بیستنی ئەبردن و نەی ئەهێشت بەهۆی ئەو هەورە گرمەو تریشقەیە، و هێزی بینینی ئەبردن و نەی ئەهێشت بە هۆی تیژیی ڕووناکی ئەو چەخماخەیە، واتە هۆی نەمانی ئەو دوو هێزە هەبوو بەڵام خوا نەهێشت و خوا دژی ئەوە بەرگری ئەو هۆیانەی کرد و پەکی خستن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ چونکە بە ڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا توانا و دەسەڵاتدارە، وە مەبەست لەهێنانی ئەم دوو ڕستەیە بەدوای ئەم چیرۆکەدا بەهێز کردنیەتی، کەلەمەوە بەتینی و بە هێزی بارو حاڵی ناپاکەکان وەرئەگیرێ کە ئەم وێنەو چیرۆکانە هێنرانەوە بۆ ڕوون کردنەوەیان.**

**لەپاش نیشان دانی ئەو سێ تاقم و کۆمەڵەو هێندێ ناو و نیشانیان، ئینجا بانگ کردنێ ئاڕاستەی هەموو ئادەمی ئەکات، وە بەتێکڕایی فەرمانیان پێئەدات بەمەی بچنە ڕیزی یەکەم تاقم، وە شێوە شیرین و ڕاست و بەڕێزەکەی ئەوان هەڵبژێرن، شێوە پاك و خاوێن و بەکەڵك و پڕ سوودەکەی ئەوان ڕەوا بدەن بۆ خۆیان، شێوەی ڕزگار بوون و گەیشتوو بە ئامانجەکەی ئەوان وەرگرن، شێوەی لە خوا ترسان و خۆ پارێزەران،**

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ ئەی ئادەمی بەتێکڕایی بپەرستن پەروەردگارتان کە ئێوەی دروست کردووەو هەموو ئەوانەی کەلە پێش ئێوەوە هاتن‌و بوون، واتە هەر ئەو ئێوەی دروست کردووە بە تەنیا، وە هەر ئەو دروستی کردوون لە باوك‌و باپیرو بنەڕەتتانەوە، کەواتە ئەبێ ئێوەیش هەر ئەو بپەرستن‌و مل کەچ‌و گوێڕایەڵی ئەو بن... وە مەبەست لەو پەرستنەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ واتە بیپەرستن بۆ ئەمەی بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن لە هەر شتێ مایەی خەشم‌و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەیە، بیپەرستن بە ئومێدی ئەوەی ببن بەو جۆرو تاقمە هەڵبژێرراوە کە قورئان ڕێنیشان دەرو دەست گیریانە، بیپەرستن بە ئومێدی ئەوەی (ئەو شێوە شیرینەتان بۆ پەیدا ببێت: شێوەی خوا پەرستی‌و لە خوا ترسی، بە شێوەی ئەو تاقم‌و کۆمەڵەی کە بە پێی توانا هەڵئەسن بە ماف خوای داهێنەری پەروەردگار، بیپەرستن بە ئومێدی ئەوەی بگەن بەو سیفەتی لە خوا ترسی‌و لێبڕانە بۆ خوا بە تەواوی کە ئەوەش مایەی ڕەزامەندی خوایەو گەیشتنی بەندەبە بەرزترین پلەوئامانجی[1]، ئینجاچەندچاکەوبەهەرەیە تری ئەو پەروەردگارە ئەخاتە بەرچاو کە هاندەرو پاڵپێوەنەری بەندەکانن بۆ ئەو پەرستنە، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾، ئەو خوایەی کە گێڕای بۆتان زەوی بە ڕاخراوێك وەك فەرش‌و جێگاوبان، بەسەریەوە ئەخەون‌و دائەنیشن‌و ئەگەڕێن‌و نیشتەجێ ئەبن‌و بە ئارام‌و بە ئاسانی بەسەریەوە ئەژین.**

---

[1] ئەم تەفسیرە لەسەر ئەوەیە کە وتەی ﴿لَعَلَّكُمۡ﴾ بەسترا بێ‌بە ﴿ٱعۡبُدُواْ﴾ وەوە، کەڕای زۆر لەزانایانی لەسەرە، وە تاقمی تر لەسەر ئەوەن کە بەستراوە بە ﴿خَلَقَكُمۡ﴾ەوە، بەو جۆرەش هەر ئەگونجێ‌و جوانە، بەڵام چەند گێرەو کێشەیەکی تیایە، وە باس کراوە لە شوێنی خۆیاندا، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بەهێزە.

ژێر بار کردن‌و ڕاخستنی ئەم زەوییەو ئامادەکردنی بۆ ژیان تیایداو فەراهەم هێنانی هۆی ژیان‌و گەشە کردن‌و پەرەسەندن بەسەرییەوە. هەرکام لەو هۆیانە نەمێنێ یا کەم‌و کوڕی تێبکەوێ، کارو دەزگاکە ئەشێوێ‌و ژیان ناڕوا. ئێجگار شتێکی نایابەو هۆی سەر سوڕمانە، وە هەر دڵێکوێر نەبێ بە کەمترین سەرنج دان‌و بیرکردنەوە ئەو دەستە قودرەتە لێزان‌و کار دروستە ئەبینی کە ئەم کارو بارەی پێك هێناوە، بەڵام مەردوم هەڵە بازن‌و زۆر شتیان لە بیر ئەچێ، بە تایبەتی دەق‌و ئولفەتی گرت بە هەر شتێکەوە، هەرچەند نایاب‌و سەرسوڕهێنەر بێت، لە بەرچاوی ئەکەوێ‌و سەرسوڕمانی نامێنێ لێی، مەگەر ناو بەناوبێدارو وریا بکرێتەوە، جا لەبەر ئەوە قورئان هەموو جارێ دەسکاری دڵئەکات‌و بێداری ئەکاتەوەو ئەیخاتە ئیش، تابێتەوە هۆش‌و گەورەیی‌و دەسەڵات‌و کار دروستی خوای بیر بکەوێتەوە، ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ وە گێڕای بۆتان ئاسمان بەلای سەرەتانەوە بەسەریان، وەك کۆشك و گومەزێ‌و خێوەتێك، کە ڕازاوەو دامەزراوو بەهێزو ڕێك‌و پێکە، ئەم ئاسمانە هۆیەکی بەهێزەو پەیوەندیەکی بەتینی هەیەبەژیانی ئادەمی لەم زەوییەدابەسووك‌و ئاسانی.

ئەم ئاسمانە بەگەرمی‌و ڕووناکیەکەی‌و بەهێزی کێشندەو ڕاکێشەری ئەستێرەو قەبارەکانی‌و ڕادەی خۆیان‌و دووری‌و نزیکیان لەم زەویەوە، یارمەتی دەرو پێك هێنەری ژیانە لەم زەوییەدا، کەواتە زۆر شایانە بە باس کردن، بۆ بیر خستنەوەی توانا‌و دەسەڵاتی خواو چاکەو هۆیەکانی ژیاندا، وەك ئاوو بەرهەم‌و میوەهات، کە بەدوای باسی ئاسمانا ئەیهێنێ‌و ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ وە هێنایەخوارەوە لە ئاسمان‌و لای سەرووتانەوە ئاوێك، ئاوێکی گرنگ کە بارانە، ﴿فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ ئینجا دەری هێنا لەزەوی بەو ئاوە هێندێ لەبەرهەم‌و میوەهات‌و خواردەمەنی ﴿رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ﴾ لەبەر ڕۆزی دانتان.

ئەم باسی هێنانە خواری ئاوو دەرهێنانی بەرو میوەو خواردەمەنی پێی لە زۆر شوێنی قورئانا هاتووە، بۆ بیر کردنەوە لەدەسەڵاتی خواو بیر خستنەوەی چاکەو بەهرەی خوا... بە ڕاستی ماڤ خۆیەتی ئەوەندە بە گرنگ بگیرێ‌و چەند جار ئامۆژگاری پێبکرێ‌و بیربخرێتەوە، چونکە ئاو کەرەسەی سەرەکییە بۆ ژیانی هەموو زیندەوەران لەزەویدا، وە ژیان بە هەموو جۆرو شێوەکانی لە ئاو پەیدا ئەبێ‌و بنەڕەتەکەی ئاوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ﴾ الأنبیاء/٣٠، واتە هەموو زیندوویەکمان لە ئاو دروست کردووە، ئیتر بێجگە لەوەی

کە ئەو هەموو خواردەمەنییە بە ئاو فەراهەم دێت، بەم ڕەنگە لە ڕێوە دێتە خوارەوەو تێکەڵی خاك ئەبێت‌و ئەو هەموو شتە ئەڕوێنێ بە فەرمانی خوا، یا ڕووبارو دەریا شیرینەکان پێك ئەهێنێ، یا ئەچێ بە ناخی زەویدا، وە بە شێوەی کانی‌و کارێز دێتە دەرەوە، یا بە هەڵگۆستن لە بیرەکان، بەهەر جۆرو شێوەیە ئەم بارانەی کە دێتە خوارەوە، هەموو خواردن‌و خواردنەوەیەکی پێوە بەستراوەو مایەی ژیانە لەم زەوییەدا، کەواتە زۆر بەجێیە ئاماژەی بۆ بکرێ‌و سەرنجی بۆ ڕاکێشرێ‌و بەو بۆنەوە بانگی مەردوم بکرێ بۆ پەرستنی خوای پەروەردگاری ڕۆزی دەری بەخشندە.

لەم بانگ کردنەی کە لێرەدا کردی بۆ ئادەمی، دوو بەند لە بەندە گەورەکانی بیرو باوەڕیی نیشاندا:

یەکەم: تەنیایی‌و یەك تایی پەروەردگاری داهێنەر بۆ هەموو دروست کراوەکان.

دووەم: یەکێتی ئەم بوونەوەرەو ڕێك‌و پێکی‌و پەیوەستی لەنێوان هەموو بەش‌و پارچەکانیدا و کۆمەکی‌و دۆستایەتیان بۆ ژیان‌و بۆ ئادەمی.

ئەوەتا نیشانیدا کە خوای داهێنەری هەمووان تەنیا یەکێکە، وە ئەم بوونەوەرەو زەوییەکەی ڕاخراوە بۆ ئادەمی، وە ئاسمانەکەی بە ڕژێم دارێژراوەو یارمەتی دەرە بەو ئاوەی کە مایەی ژیانە لەم زەوییەدا، وە ئەوەش هەمووی بە هۆی میهرەبانی خوای داهێنەری ڕۆزی دەرە بە تەنیا، ﴿فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا﴾، کەواتە ڕەوا مەدەن بۆ خوا چەند وێنەیە، واتە هیچ وێنەیەك بڕیار مەدەن، بەڵام بەکۆ فەرمووی بە گوێرەی حاڵی بت پەرستەکان کە چەند بتێکیان بڕیار دابوو، وە هەروەها هێنانی بە کۆ زیادە سەر زەنشت‌و تەشەر دانی تیایە، چونکە هەرکەس ژێر بێئەزانێ بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ بوونی تەنیا یەك وێنەو یەك هاوبەش، چ جای چەند وێنەو هاوبەشێ، وەك سەر زەنشتیان ئەکات‌و تەشەریان لێئەدات، کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، واتە هیچ هاوبەشێ بۆ خوا دامەنێن لە کاتێکدا کە ئێوە زانینتان هەیە، وە بێگومان هەرکەس زانینی هەبێ‌و بێبەش نەبێ لەزانین هەرگیز هاوبەش ڕەوا نادا، چونکە هەموو کەس زانایەو ئەبێبزانێ کە ئەم کارو بارە بەبێ تەنیا خوایە ناگونجێ‌و ناڕوات بەڕێوە، یا ئێوە ئەزانن بەو شتانەی کە باس کران ئەزانن کە خوا زەوی ڕاخستووە بۆتان، وە ئاسمانی کردووە وەك کۆشك‌و بانێ بە لای سەرتانەوە، وە

ئەزانن ئەو ئاو ئەبارێنێ و بەو ئاوە ئەو هەموو ڕۆزیەتان بۆ فەراهەم ئەهێنێ، وە ئەشزانن کە ئەو شتانە تەنیا دەست کردی ئەوەو بتەکان هیچ دەسەڵات و هاوبەشیان نییەتێیاندا، کەواتە لەپاش ئەو زانینانە ڕەوا دانی هاوبەش ئێجگار بێجێ و نا شایستەیەو ئەو پەڕی نەفامییە.

ئەو یەکەم گەلەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی هاتە سەرو بیستی، بڕوایان بوو بە خوای پەروەردگارو ئەو زانینەیان بوو، وەك لە چەند ئایەتێکدا قورئان بۆمان باس ئەکات وەلەپاش ئەوانیش هەموو گەل و هەموو کەس ئەو بڕواو زانینانەیان هەر بووەو هەر هەشیانەو هەر ئەشیان بێت، وە ئەو کەسەی کە ئەو بڕواو زانینانەی نەبووبێ، یان نیەتی و نایبێ، ئەو بڕواو زانینانەی بۆ دەست ئەدات و ئەتوانێ بە کەمێ ورد بوونەوەو بیر کردنەوە دەسکەوتیان بکات، کەواتە وەك زانا وایەو ئەو سەر زەنشت و تەشەرە ڕووی تێئەکات، وە هەرکەس لەوەدا ملە جەڕێ بکات و دان نەنێ بە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەدا، کە داڕێژراوە بە ڕژێم و یاسایەکی تێرو تەواو، بە جۆرێ هەموو ژیرێ تیایدا سەرسامە، بێگومان ئەو کەسە یا ئەیەوێ دەم بازی بکات و سەرکێشی بەکار بێنێ و لەدەروونی خۆیدا ئەزانێ کە خوا هەیە، یا ئەو کەسە ناتەواوەو بێبەشە لە هەموو فام و تێگەیشتنێ، وەك ئەو سێ تاقمەی کە لەکاتی خۆیدا پەیدا بوون لەناو یۆنانیەکانداو ناو ئەبران بە (سۆفسطائي)وە بڕوایان بە هیچ شتێ نەبوو، تەنانەت بۆ خۆیان و هەموو هەست پێکراوێکیش، وە هەرکەس ئاوا پەست و ناتەواو بێت، شایستەو شیاوی ئەوە نییە قسەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ، بەڵکو چارەی ئەوانە ئەوەیە وەك زانایان فەرموویانە: بسوتێنرێن بە ئاگر تا دان بنێن بە بوونی شتا یا بسوتێن بۆ خۆیان!!

ئەو وێنەو هاوبەشانەی کە قورئان ئەوەندە بە توندی لێیان ئەدوێ و دژیانە بۆ ئەوەی بڕواو عەقیدەی تاك و تەنیایی خوا پاك و خاوێن بێت و گەردی لێنەنیشێ، ئەو وێنەو هاوبەشانە تەنها ئەو بتانەنین کە ئەو بت پەرستانە بەو شێوە سادەییە بڕیاریان ئەدان و ئەیان پەرستن، بەڵکو ئەو وێنەو هاوبەشانە چەند شێوەو جۆری تریان هەیە، کە وەك ئەو بتانە ئاشکراو دیاری نین، بۆ وێنە: ئومێدو چاوەڕوانی و پشت بەستن بە غەیری خوا جۆرێکیانە، ترسان لە غەیری خوا جۆرێکیانە، بڕوا بەسوودو قازانج، یا زیان گەیاندنی غەیری خوا بەشێکیانە. لە (ئیبن و عەباس)ەوە ئەیگێڕنەوە -خوا لێیان ڕازیبێ- کە

فەرمووی: وێنەکان بریتین لە هاوبەش، کە هێندێکیان شاراوە ترە لە ڕۆیشتن و جوڵانەوەی پێی مێروولە بەسەر بەردێکی ساف ڕەش، وە لەناو تاریکی شەوا.

ئەوەش وەك ئەوە کابرایە بڵێ: سوێند بە خوا بەگیانی تۆ ئەی فڵان وە بەگیانی خۆشم، یا بڵێ. ئەگەر قازەکە نەبوایە لە ماڵا دزمان بۆ ئەهات، یا کابرایە بڵێ بە هاوڕێیەکی خواو فڵان نەبوایە. لە حەدیسێکدا هەیە کە پیاوێ چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وە وتی پێی: خوا ویستی و تۆ ویستت، ئەویش پێی فەرموو: ئایا تۆ منت کرد بە وێنەی خوا!!

پێشووەکان و هەڵکەوتووە خوا ناسەکانی ئەم ئوممەتە بەو جۆرە بوون و بەو شێوەیە سەرنجی هاوبەشی شاراوەو وێنەکانیان ئەدا لەگەڵ خوادا، جا با بیرێ بکەینەوە لە خۆمان و لەوان، ئەوان لە کوێ و ئێمە لە کوێ؟!!

بەڕاستی مەسەلەکە زۆر خەتەرەو جێی مەترسییە ـ خوا یارمەتیمان بدات لە جێگیر کردنی ئەو باوەڕە پاك و خاوێنە لەدڵ و دەروونمانا و پاراستنی لە هەموو تەم و تاریکی و لەکەیەك ـ لای خوارو یەکەم پلەی باوەڕ بە تەنیایی و یەکتایی خوا ئەمەیە کەلە هەموو شتێکدا، وەلە هەموو بەسەر هات و ڕووداو خۆشی و ناخۆشی یەکدا، دڵی بەندە لە پێشەوە بگەڕێتەوە بۆلای خواو هەموو ئەوانە لە خواوە بناسێ، کەواتە ئەگەر مەترسی لە هەرشت یا لەهەر کەس بوو، ئەبێ لە پێشەوە سەرنجی لای خوا بدات و مەترسی لەو بکات کەلە ڕێگەی ئەو شتە یا ئەو کەسەوە زیانێکی پێبگەیەنێ، وە هەروەها لەکاتی ئومێدو چاوەڕوانی هەر خێرو چاکەیەکدا، وە لە هەموو بەسەرهاتێکدا ئەگەر بەندە بەو جۆرە نەبێ، کاری خەتەرەو باوەڕەکەی ناتەواوەو پاك و خاوێن نییە.

هەرچۆنێ بت پەرستەکان لە مەککە دوو دڵ بوون لە ڕاستی قورئان و پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا (ﷺ)، وە مەردومیان دوو دڵ ئەکرد لە مەککەو لە غەیری مەککەدا، هەروەها جوولەکەکانیش لە مەدینەدا گومانیان ئەخستە ئەوە، وە ناپاکەکانیش بەد گومان و دوودڵ بوون تیایدا، ئینجا ئەوا قورئان لەپاش ڕوون کردنەوەی تاك و تەنیایی خوا، بەر ئەبڕێتەوە لە هەمووان، بەجۆرێ ڕێی هیچ ملە جەڕێ و دەم بازییە ناهێڵێتەوە بۆ هیچ کەس،

وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ ئەگەر ئێوە لە گومان و دوو دڵیدان، لەو قورئانەی کە ئێمە ناردمانە خوارەوە بەرەبەرەو وە جبە بۆ سەر بەندەمان واتە محمد (ﷺ) ناو بە بەندە لەم شوێنەدا چەند شتی گرنگ ئەگەیەنێ:**

**١- ڕێزی پێئەدات نزیکی ئەخاتەوە لە خۆیەوە، بەمەی ئەیکات بە بەندەی تایبەتی خۆی کە ئەوە بەرزترین ڕادەو پلەیە بۆ ئادەمی.**

**٢- بڕیار دانی بەندەیی و ناوبردنی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەرزترین کەسە بە بەندە ئەبێتە بەربەست و بەرهەڵست و هۆی فڕێدانی هەر وێنەیەك کە بۆ خوا ڕەوا بدرێ، چونکە لە جێیە ئەم بەندە بێت، ئیتر هیچ کەسی تۆ چۆن وێنەی ئەبێت.**

**٣- با زیادە ڕەوی نەکرێ لە شانیداو لە سنووری بەندەیی دەر نەکرێ، ئەگەر ئێوە لە گومان و دوو دڵیدان ﴿بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾[1] دەی سورەتێك بێنن کە وێنەی ئەوە بێت کە ناردمانە خوارەوە، ئیتر هەر سورەتێك باکورت ترین سورەت بێت، وەك سورەتی ﴿الکوثر﴾ کەسێ ئایەتی کورتە وێنەی ئەوە بێت لە ڕەوان بێژی و ڕێك و پێکی هۆنینەوەو ڕاستی و ڕەوایی ماناو مەبەستدا، ئەم بەر لێ بڕینەوە دەست نیشانی بۆ کرا هەر لە سەرەتای سورەتەکەوە بەو سێ پیتە ﴿الٓمٓ﴾، واتە ئەم قورئانە پێك هاتووە لە**

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ڕاناوەکە بگەڕێتەوە بۆ وشەی (ما)، وە بەو جۆرە ڕێکە لەگەڵ ئایەتەکانی وێنەی ﴿الإسراء، هود، یونس﴾دا کە هاتوون بۆ بەر بڕینەوە وەك ئێرە، وە ڕێکە لەگەڵ باس و مەبەستی شوێنەکەدا، لەبەر ئەوە ئەم ڕایەم هەڵبژارد بەسەر ئەو ڕاکەی تردا، کەڕاناوەکە ئەباتەوە بۆ وشەی ﴿عَبْدِنَا﴾، وە زۆربەی زانایانیش هەر لەسەر ڕای یەکەمن.

وێنەی ئەم پیتانە کە ئێوە قسەی پێئەکەن و وتەو وتاری پێئەهۆننەوە، دەی ئەگەر گومانتان هەیە لەوەدا کە لەلایەن خواوە هاتبێ و ئەڵێن: دەست هەڵبەستی محمد یان هەرکەسێ ترە، ئازا بن وێنەی بهێنن، با کەمترین سورەتیش بێت ﴿وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾[1]، وە بانگ بکەن هەموو ئەوانەی کە ئامادە ئەبن لاتان، بۆ کۆمەکی و یارمەتیدانتان بێجگە لە خوا، کە ئەو دەسەڵاتی هەیەو ئەوەتا ئەم قورئانە بێوێنەی فەرمووەو ناردویەتییە خوارەوە، ﴿إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾، ئەگەر ئێوە ڕاستن لەوەی کە ئەیڵێن دەربارەی ئەم قورئانە.

ئەم بەر لێ برینەوە هەر لە چەرخی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەتا ئێستاو لەمەو لایش هەر بووەو هەر هەیە هەتا هەتایە، وە ئەمە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایەو دەمی هەموو دەم بازێ ئەبەستێ و ڕێی هیچ جموجوڵ و دەم بازیەکی ناهێڵێ، وە هەرکەس هەر قسەیە بکات بێگومان خۆی بێئابڕوو ئەکات و نەفامی خۆی دەرئەبڕێ، چونکە ئاشکرایە کە دوژمنی داخ لەدڵی ئەم پێغەمبەرو قورئانە چەند زۆرە هەر لەیەکەم جارەوە تا ئێستا، وە بەر لێ برینەوەی دوژمنیش ئێجگار کاریگەرە لە دەروونیدا، وە هاندەرو پاڵ پێوەنەریەتی بر بەرەنگاری و بەختکردنی دەسەڵات و توانای، لە ڕێگەی زاڵ کردن و سەرخستنی قسەو مەبەستی خۆیدا، دەی ئەگەر بگونجایەو لە دەسەڵاتدا ببوایە هێنانی ئەو وێنەیە، ئەبوایە لەم ماوە دوورو درێژەدا لەلایەن یەکێکەوە، یا گەل و کۆمەڵێکەوە ئەو وێنەیە بهێنرایە، بە تایبەتی ئەم یەکەم چینە کە عەرەب بوون و مامۆستای بەرزی بەناو بانگی دووان و دوانگاو ڕەوانبێژی بوون و سوار چاکی جیهان بوون لەو مەیدانەدا، وە لەو بارەیەوە هەوڵ و تەقەللای زۆریشیانداو چەند بەستەو هۆنینەوەیەکیان داڕشت، بەڵام هەر بۆ خۆیان شەرم گرتنی بەرامبەری قورئانی پێبکەن، ناچار وتیان ئەمەی محمد ئەیڵێ جادووەو جنۆکە پێی ئەڵێن، بۆیە ئێمە ناتوانین بەرامبەری بکەین!... وە هەروەها قورئان هەر ئەمێنێتەوە بە بێوێنەیی و

---

[1] ئەم ڕەستەیە بە پێنج جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، وەك لە (كشّاف)و کتێبە گەورەکانی ترا باسکراوە، وە ئەو جۆرانەش هەر ڕێکن و ئەگونجێن، بەڵام ئەم شەشەمە کەلە تەفسیرەکەدا وتراوە دڵم پێی بە ئارام ترەو بڕوام بەهێزترە پێی، چونکە ڕێکە لەگەڵ ئایەتی ﴿الإسراء﴾دا: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ﴾ الایە/٨٨.

بەچـار نـەکراوی، وەك هەواڵیـشی پێئـەدات بـە ڕسـتـەیەکی تـی هـەڵکێش لـەم هەڕەشـە سامناکەی کە ئەیکات لە بێبڕواکان ئەگەر نەگەڕێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ ئینجا ئەگەر وێنەی سورەتێ لەم قورئانەتان نەهێناوە هـەرگیز نایشی هێنن ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ کەواتـە خۆتـان بپـارێزن لـە ئاگرێـك کـە سـوتەمەنی و هەڵگیرسێنەری ئادەمییـەو بەرد، واتـە کاتـێ بـەرتان لـێ بڕایـەوە، بە هێنـانی وێنـەی سـورەتێ، وە ئێـوەش هـەوڵ و تەقەللاتانـدا لەپاشـدا دەستەپاچـە دەرچـوون، ئەوکاتـە دەرئەکـەوێ کەئـەم قورئانـە موعجیزەی خوایەو پێویستە لەسەرتان بڕوای پێبهێنن و بەهۆی ئەوەوە خۆتـان بپارێزن لـەو ئاگرەی کە باسکرا.

ئەو بەر لێ بڕینەوە زۆر شتێکی سەیرەو سەرسوڕهێنەرەو زۆر جێگەی بیر لێکردنەوەیە، ئەگەر ئەوە لەلایەن خواوە نەبوایە، هیـچکەس نـەی ئـەتوانی ئـاوا بێباك و بێسـەر لێکردنـەوە بەربڕێتەوە لە هەموو کەس، وە سەیرتر ئەوەیە کە هەواڵیشیدا کە هەرگیز ناتوانن و نایکـەن، وە شتێکی ئاشکرایە ئەگەر لە توانادا بوایە ئـەیانکردو هـەرگیز سستیان تیـا نەئەکردو لێـی نە ئەوەستان، چونکە ئەگەر شتی وایان لەدەست بهاتایەو بیان کردایە، قورئانیـان بـە تـەواوی پـەك ئەخسـت و بـە بەڵگـەو مـوعجیزە نەئەمایـەوە، بـەڵام ئـەوە ڕووی نـەداو نـەکراو هـەرگیز ناشـکرێ، ئـەوەتا قورئـان زیـاد لـە هـەزارو چوارسـەد ساڵەو هـەتا هەتایـە، ئـەخوڕێ بـە ملـی هـەموو جیهـان و جیهانیانـداو بـەریان لـێ ئەبڕێتـەوە تێـزە تێزەیـان ئـەدات و هـەموو دوژمنەکانیش داماو و دەستەپاچە کەوتن و هیچیان پێنەکراو هیچیان پـێ ناکرێ، وە ئەگـەر ئەو بەر لێ بڕینەوەو هەوڵ دانە سەبارەت بـە یـەك تـاقم و چینیش بکرایـە هـەر بـەس بـوو، وە هەر موعجیزە ئەبوو، چ جای ئەمە کە دەربارەی هـەموو کـەس و هـەموو گـەل و چینێکە هـەتا هەتایە! کەواتە ئەو هەوڵ دانەش کە فەرمووی: ﴿وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ بە تەنها خۆی موعجیزەیەکە لە موعجیزە جۆر بە جۆرەکانی قورئان، جا لەبەر ئەوە ئەو هەڕەشە سەخت و دڵ داچڵەکێنەرەی کرد لەوانەی کە دەستەپاچەن لە ئاستی ئەو بەر لێ بڕینەوەو کەچی بڕوایش ناهێنن بەم شتە ڕاست و ڕوونە،

هەرەشەی کرد بەو ئاگرە سامناکەو لەپاشا فەرمووی: ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئامادە کراوە بۆ بێبڕواکان، ئەو بێبڕوایانەی کە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵو هێزی بیستنیانو پەردەی هێناوە بەسەر هێزی بینینیاندا. ئەو بێبڕوایانەی کە قورئان بەری لێ بڕینەوەو ئەوانیش پەك کەوتووو دەستەپاچە دامانو کەچی بڕواشیان نەهێنا... کەواتە ئەوانە وەك بەرد وان! هەرچەند لە شێوەی ئادەمیدان، کەواتە زۆر بەجێیە جووتو هاوسەر بکرێن، وە بێجگە لەوە ناوبردنی بەرد لەم شوێنەدا شێوەی سزاکە بەتین تر ئەکاتو نیشانی ئەداتو کە ئەو ئاگرە لەم جۆرە نییە کە ئێستا ناسراوە، بەڵکو ئەوە ئاگرێکی تایبەتییە، بە بەردو ئادەمی هەڵئەگیرسێ، خوا پەنامان لدا لێی، ئینجا هەڵئەگرێ مەبەست ئەو بەردەی کە ئەبێ بە سوتەمەنیو هەڵگیرسێنەر بتەکان بێت ــ وەك هەندێ فەرموویانە ــ وەلە سورەتی ﴿الأنبياء﴾دا ئاماژەی بۆ ئەکات، ئەو بەردانە ئەکرێن بە هاوسەری بت پەرستەکان لە دۆزەخدا بۆ سزادانی دەروونیانو هەمیشە لە داخو مەراقدا بن کە چۆن بە دەستی خۆیان ئەو بەردانەیانکرد بەهۆی ئەو سزا سەختەی کە ئەیچەژن.

هەرچۆنێ ئاڵتوونو زیوی سامانداره بێبڕواکان، کە ماف لێدەرناکەن لە دۆززەخدل سوور ئەکرێنەوەو بەو ئاڵتوونو زیوە داخ ئەکرێن بۆ سزادانی دەروونیان، ئینجا ئایا ئاگری دۆزەخ هەموو یەك جۆرەو لەسەر یەك شێوەیە کە باسکرا، یا چەند جۆرو شێوەی تریشی هەیە؟ لەئایەتو حەدیسەوە وا دەرئەکەوێ کە چەند جۆرو شێوەی تریشی هەیە، ڕەنگە ئاگری جنۆکەو شەیاتین سووتەمەنیەکەی جنۆکەو شەیاتین بێت.

قورئان لە چەند بارو ڕوویەترەوە هەر موعجیزەیەو هەموو کەس دەستەپاچەو پەك کەوتووە لەحاستیدا، بەڵکو بارو جۆرەکانی تری نایەنە ژمارەو هەرگیز دوایی نایەن، وەك فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: (لا تنقضي عجائبه) شتە نایابە سەرسووڕهێنەرەکانی دوایی نایەن.

(قازی ئەبو بەکری باقلانی ) لە کتێبی (التمهيد)دا دوانزە بارو ڕوو باس ئەکات، لێرەدا ئێمە کۆتایی ئەهێنین بە باسەکەو بە یارمەتی خوا بە درێژی لێی ئەدوێین لەسورەتی ﴿يونس﴾ یان ﴿هود﴾ یان ﴿الإسراء﴾دا.

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾

لەپاش ئەو هەڕەشە سامناکەی کە ئاڕاستەی بێبڕواکانی کرد، ئینجا ئەم مزگێنییە ئارام دەرە ئـەدا بــە بڕوادارەکــان، ئەفــەرموێ بــە پێغەمبــەر (ﷺ) ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ مژدەبدە بەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە، بەمەی ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ کە بێگومان بۆیان هەیە لە ڕۆژی دواییدا باخچەو باخاتێ کە جۆگەو ڕووبارەکان دێن‌و ئەچن بە ژێریاندا، بەهەشت بەو جۆرەیە کە حەدیس دەربارەی ئەفەرموێ: (فيها ما لا عين رات ولا اذن سمعت ولا خطر على قلب بشر) شتی وای تیایە نە هـیچ چـاوێك بینیویـەتی‌و نـە هـیچ گوێـچکەیەك بیـستویەتی و نەبـە دڵـی هـیچ ئادەمییـەکا گوزەری کردووە، کەواتە شتی وای کە خوا لـە جیهانـدا وێنـەی دروست نـەکردووە، وە نـاوی ئەوانە نابات، چونکە ئێمە تێی ناگەین، بەڵکو ناوی ئەوانەی ئەبات کە ئێمەی ئەم جیهانـە وێنـەیمان زانیـوە، بـۆ ئـەوەی دڵمـان ڕاکێـشێ بـۆلای‌و بـە هـۆی ئـەوە چاکە بکـەین‌و خۆمـان بپارێزین لـە خراپـە، وەلـەم جیهانـەدا شتێك کـە زۆر دڵ ڕفێن بێـت باخـچەی ڕازاوەی گـوڵ‌و گوڵزارو باخـاتی بـەرو میوەو سایەو سەهەنداری پڕ لـە چەشمەیە، ڕووبـاری ئاوی سـاف‌و شـیرینە، جـا لەبـەر ئـەوە لـە زۆر شـوێندا کـە باسـی بەهەسـت ئـەکات، ئـەم شـێوەی ئەخاتـە بەرچـاوو بـەم جـۆرە وەسـفی ئـەکات‌و ئـەدات، ئینجـا ئەوانـەش کـە وێنـەمان دیتـووەو دروستکراوە لە جیهاندا، هەر لە شێوەو ناوا هاوبەشن لەگەڵ ئەوانەی ئەم جیهانـدا، ئیتر لـە تام‌و بۆن خۆشیدا ئەوانەی بەهەشت شتێ ترن‌و لەگەڵ ئەمانـەی ئێرە هـەر خوایـان یەکە، بـەڵکو ئەوانـەی بەهەشـتیش هـەموو تـاقم‌و چـینێکی تـازەی جیـاوازە لەگـەڵ تـاقم‌و چـینی پێشوودا، لەناوو شێوەدا وەك یەکن، وەك لەم فەرموودەیە وەرئەگیرێن کە بەدوو جۆر تەفسیر کراوەتـەوە: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا﴾ هـەرجارێ بەهەشـتیەکان ڕۆزی‌و خۆراکێکیـان پێبدرێ لەو بەهەشتانە لەهەر جۆرە بـەرو میوەیـەکیان ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ ئـەڵێن: ئەمە ئەوەیە کەلە پێشەوە لەدونیادا پێماندراو دەرخواردماندرا، یا ئەمـە ئەوەیە کەلە پێش

ئێستادا لەبەهەشتا پێماندراو دەرخواردماندرا، لەسەر هەرکام وا ئەزانن هەر وەك ئەوەکەی ئەوەو پێشە کە خواردویانەو هیچ جیاوازیەکیان نییە لە چاکیو تامو خۆشیدا، بەڵام زۆر جیاوازنو هەر لە شێوەدا وەك یەکن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ﴾ ڕۆزیەکەیان بۆ ئەهێنرێ بە جۆرێ لە وێنەو شێوەدا وەك ئەوەکەی لەوەو پێش وایە، تا لێیان ئەگۆڕێو وا گومان ئەبەن کە جیاوازی نییە لێی، وە ئەو یەکێتیو شێوەو وێنەشی پێویستە بۆ ئەوەی باش دڵیان بڕوا بۆ ئەوەی تازەیەو ئارەزووی بکەن بەبێ ترێن، چونکە هەر خۆراکێکی تازەو یەکەم جار کە نەبینرا بێو دەقی پێوە نەگیرابێ، ئەوە ترێزی لێ ئەکرێو دڵ ناچێتە سەری.

ئەو یەکێتی شێوە لەگەڵ جۆر بەجۆرێو جیاوازی لەشتەکانی ترا هەر لەدەست خوای پەروەردگار دێت، بۆ وێنە ئادەمی لە یەکەم جاریەوە تا ئێستاو داهاتوو شێوەی گشتی ئادەمێتی لە هەموو ئەندامو یەکەیەکیدا وەك یەکە، بەڵام هیچ دوو کەسێکی وەك یەك نین، لە شێوەو نیشانە تایبەتییەکانیانو جیاوازی هەیە لە ڕەنگو وێنەو دیمەنو شتەکانی تریاندا.

بەڕاستی ئەو هەموو جۆر بە جۆرییە کە هەیەو خوا فەراهەمی هێناوە لەو هەموو بەرەو تیرەو ڕەنگو شێوەو نیشانەو شتە تایبەتیەکانی دروستکراوەکانیدا، بە ڕاستی شتێکی زۆر سەر سوڕهێنەرەو ژیریی تیایا سەرگەردانە! جێو شوێنو خۆراکی بەهەشتیەکان بەو جۆرە نموونەیەکی لێ باسکردن، ئینجا باسی هاوڕێیو هاوسەریان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ﴾ وە بۆیان هەیە لەو بەهەشتانەدا، حەڵاڵو هاوسەرانێ کە پاكو خاوێن کراون لە هەموو چڵكو چەپەڵیو هەر شتێ بیری لێبکرێتەوەو نەویستراوبێت، واتە خوا بە پاكو خاوێنی فەراهەمی هێناونو فەراهەمیان ئەهێنێو ڕاگیریان ئەکات لەو بە هەشتانەدا. هەر خۆشیو شادمانییە کە کاتیو بڕاوە بێت بێنرخە، جا لەبەرئەوە خوای میهرەبان خۆشیو شادمانی بەهەشتی هەمیشەیی کردووە بەبێ بڕانەوە، وە هەواڵیشی داوە بەو هەمیشەییە، بۆ زیادە ئارام دانو دڵنیا کردن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەو بەهەشتیانە هەمیشەین لەو بەهەشتانەدا بەبێ دوا هاتنو بڕانەوە!! لەپاش ئەوەی بەری بڕیەوە لە هەموو کەس لەبارەی قورئانەوەو بە شێوەی گشتی، کە بەهیچ کلۆج جێگەی گومانو دوو دڵی نییەو لەلایەن خواوە هاتووە، ئینجابە تایبەتی ئەدا لە ڕەخنەو گومانێك کە جوولەکە ئەیان خستە ناوو دەمبازیان پێئەکردن لە مەدینەدا، وە هەروەها ناپاکەکان، هەرچۆنێ بت پەرستەکانیش لە مەککە هەمیشە خەریکی ئەو جۆرە پڕو پاگەندە ئەبوون.

ڕەخنەو گومانەکەیان لەم بارەوە بوو، کە قورئان وێنەو چیرۆك ئەهێنێتەوە بەشتی بێ‌نرخ وەك مێش‌و جاڵجاڵۆکە، وە ئەیان وت ئەوە شایستە نییە بۆ خوا، چونکە لە لایەکەوە ناو بردنی ئەوانە کە شتێکی ئەوەندە نرخن شایستەی خوا نییە، وەلەلایەن ترەوە ئەوە ڕیسوا کردن‌و لاقرتی کردنە بەو دروستکراوانە، کەواتە خوا چۆن شتی وا ئەکات؟! جا لەبەر ئەوە وەك (ئیبن‌و عەباس) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بۆ لەناو بردنی ئەو ڕەخنە بێ‌جێ‌و نەهێشتنی ئەو گومانە ناڕەواو دەم کوت کردنی ڕەخنەگرو گوماندااران، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ﴾ بێ‌گومان خوا شەرم ناکات، واتە بێ‌جێ‌و ناڕەوای دانانێ‌و واز ناهێنێ ﴿أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا﴾[1] لەمەی باسی هەر وێنەو چیرۆکێ بکات‌و بیهێنێتەوە بۆ تێگەیاندن‌و ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستی ﴿بَعُوضَةً﴾ مێشوولە باس بکات‌و بیهێنێتەوە ﴿فَمَا فَوْقَهَا﴾ یا هەرشتێ کەلە ژوور مێشوولەوە بێت‌و لێی تێپەڕیکات لە بچووکی‌و بێ‌نرخیدا وەك باڵی مێشوولە کەلە حەیسدا هاتووە، یا هەر گیان لەبەرێ لەو گیان لەبەرانەی کە بەزەحمەت چاوئەیبینێ، یا وەك ئەوشتانەی کەبە چاو نابینرێن‌و مەگەر بەوردیلکە بین، بە هەرکام‌و بەهەرشتێ وێنە بهێنێتەوە، هیچ ناڕەوایی‌و ناڕێکی تیانییە، چونکە خوای هەمووانەو پەروەردگاری هەمووانە بەبێ جیاوازی، وە مێشوولەو بچووکتر لەو، فیل‌و گەورەتر لەفیل وەك یەکەن لای خوا، وە وەك یەك موعجیزەن‌و هەموو کەس لە حاستیان داماو دەستەپاچەیە، وە هەرچۆنێ لەم بوونەوەرەدایە کۆبێتەوە ناتوانێ گیان بکات بە بەری فیلێکدا، هەروەها ناتوانێ گیان بکەن بە بەری مێشوولەیەکدا... وە بێجگە لەوە مەبەست لەوێنەو چیرۆك، ڕوونکردنەوەو خستنە بەرچاوی هەر شتێکە کە هەستی پێ‌نەکرێ، یا نزیك خستنەوەی هەرشتی کە بە دوور نابینرێ، یا گونجاو بێ هەرشتێ کەبە نەگونجاو دابنرێ، کەواتە تەماشای نرخ‌و بێ‌نرخ‌و گەورەیی‌و بچووکی ناکرێ، بەڵکو بە هەرشتێ مەبەستەکە پێك بێت ئەو شتە ئەکرێ بە وێنەو چیرۆك، کەواتە لە هێندێ کات‌و شوێندا ئەبێ بچوکترین‌و بێ‌نرخترین شت بکرێ بە وێنە.

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ پێناسە ـــ ترکیب ـــ کراوە، بەپێی ئەوانە شێوەی تەفسیرەکە ئەگۆڕێ، بەڵام مەبەست لە هەموو هەر یەك شتە.

فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ
مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا
ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦

---

**خوای گەورە وێنەو چیرۆك ئەهێنێتەوە، وە بەرامبەر ئەوە بەندەكانی دوو جۆرن‌و بەوە تاقیان ئەكاتەوە وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان هێناوەو بڕوادارن ﴿فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ﴾ ئەوانە ئەزانن كە ئەو وێنەیە هەر ڕاست‌و ڕەوایەو بەلێ زانی هاتووەو ڕێكە لەگەڵ كار دروستیدا، لەكاتێكدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە، چونكە بڕواكەیان بە خوا ڕووناكی ئەخاتە دڵیان‌و هەستیاریی فەراهەم ئەهێنێ لە گیان‌و ڕۆحیاندا، بەهۆی ئەوەوە تێ‌ئەگەن لەكار دروستی خوا لە هەموو كارو كردارێكیدا، وە هەر كارو فەرمان بڕیارو وتەو وشەیەك كە لەلایەن خواوە بێت، بەڕاست‌و ڕەواو بە جێی ئەزانن‌و، بە سۆزو پەرۆشەوە وەری ئەگرن‌و ئەچن بە پێشوازییەوە، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان نەهێناوە ﴿فَيَقُولُونَ﴾ ئەڵێن: ﴿مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ﴾ ئایا خوا چی ویستووەو نیازی چی كردووە بەم شتە بێ‌نرخە لەبارەی وێنەو چیرۆكەوە؟! واتە وێنە هێنانەوە بە شتی ئاوا بێ‌نرخ، ناڕەوایەو ناشایستەیە بۆ خوا یا نابێ لەلایەن ئەوەوە شتی ئاوا هاتبێ.**

**ئەم پرسیارە ناڕەوا پرسیاری كەسێكە كە بێ‌بەش بێت لە ڕووناكی بڕوا بە خواو ناسینی خوا، پرسیاری كەسێكە كە پەیوەندی‌و پەیوەستی نییە باوو ڕەوشت‌و تەگبیری خواوە، ئینجا ئەو پەڕی بێ ئەدەبی ئەو پرسیار كەرە نەفامە دەر ئەخات، كەبە نەزانی‌و نەفامی ڕەخنەئەگرێ لەكاری خواو بێزاری لێی، یا ئەیەوێ مەردوم دوو دڵ بكات لەوەی كە شتی والای خواوە هاتبێ، بە هەر جۆر ئەوا وەڵامی پرسیارە ناڕەواكەی ئەدرێتەوە بەهەڕەشەو ترساندن بە بەرهەمی ئەو وێنەو چیرۆكە، ئەفەرموێ: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ﴾ بەو وێنەیە زۆر كەس گومڕا ئەكات، وە زۆر كەسیشی پێ ڕێنموونی ئەكات.**

خوای گەورە لە زۆر شتدا بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە بۆ ئەمەی ئەوەی کە خۆی ئەیزانێ لەلایەن بەندەکانییەوە بەدی بێت‌و دەرکەوێ تا بە گوێرەی ئەووە پاداش‌و تۆڵە ڕوو بدات، چونکە باوو بڕیاری خوا وا هات، کە تەنها بە پێی زانینی خۆی ڕەفتار نەکات لەگەڵ بەندەکانی، بەڵکو تا بەندەکانی هەڵنەسن بە کردەوەکانیان بە ئارەزوو خواهیشی خۆیان‌و ئەوەی خوا زانیویەتی بەدی نەهێنن هیچ پرسیارو پاداش‌و تۆڵەیەکیان نەبێ، جا لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا هەرکەس بە خواهیشی‌و ئارەزووی خۆی ڕێگایە ئەداتە بەرو بارێ ئەگرێ... بۆ وێنە تەنگی‌و ناڕەحەتی ئەدات بەسەر بەندەکانیدا، ئینجا ئەو کەسەی کە بڕواداری ڕاستەقینەو تێگەیشتووە ئەزانێ خوا خوایەو هەموو کاروباری بەجێیەو هەر خۆی ئزانێ چی بەرژەوەندی تیایەو چی تیایدا نییە، وە ئەزانێ هیچ ناڕەحەتی‌و تەنگییە هەروا بە هەدەر ناڕوا ئەگەر خاوەنەکەی بێ‌ئارامی ناکات‌و سەر لە خۆی تێك نەدا، وە ئەزانێ هیچ کەس ناتوانێ فریای بکەوێ‌و دەرووی لێ بکاتەوە، لەبەرئەوە بەو تەنگی‌و ناڕەحەتییە باشتر ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، باشتر ئەلالێتەوەو پەنا ئەهێنێ بە خوای خۆی، بەڵام هەرکەس بێ‌بڕواو ناپاك بێت سەرکێش تر ئەبێت‌و دوور تر ئەکەوێتەوە لە خواو بە ئێجگارو لەڕێز دەرئەچێ، وە هەروەها بەخۆشی‌و دەسەڵات‌و کامەرانی بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە، ئەوانەی کە ژیرو بڕواداری ڕاستەقینەن سوپاس‌و چاولەبەریان بۆ خوا بەهێزو دامەزراوتر ئەبێت، بەڵام بێ‌بڕواو ناپاك‌و نەفام بەوە باشتر لە خۆی ئەگۆڕێ‌و یاخی تر ئەبێت، جا هەر بەو پێیە تاقیکردنەوە بەم وێنەو چیرۆکانە، هێندێ پێی گومڕا ئەبن‌و هێندێ تر ڕێنومایی پێ‌وەرئەگرن، ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، وەهیچ کەس گومڕا ناکات بەو وێنەو چیرۆکانە مەگەر ئەوانەی کە دەرچوون لە سنوورو گوێڕایەڵی خواو ڕێنموونی خواو ڕێ ڕاستەکەی خوا. دەرچوون لەسنوورو گوێ ڕایەڵی سێ پلەی هەیە:

١- کردنی گوناهوتاوان جاربەجار، نەك بەهەمیشەیی لەگەڵ ئەوەدابەخراپ‌وتاوان دابنرێ.

٢- سەرکردنە ئەو تاوان‌و گوناهانەو بەڵام کابرای تاوانبار ئەزانێ خراپەو خۆیشی بە خراپ سەیر ئەکات.

٣- دامەزرانە لەسەری بە هەمیشەیی‌و بە چاکیشی دابنێ.

ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ

---

ئەم پلەی سێیەمە خاوەنەکەی لەڕیزو بڕواداران دەرئەکات، چونکە ئەم سیفەت‌و نیشانانەیان بە دوادا ئەهێنن:

١- ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾، واتە ئەو گومڕاو دەرچووانە کەسانێکن کە پەیمانی خوا هەڵئەوەشێننەوە لە پاش بەهێزکردنی ئەو پەیمانە لەسەریان. پەیمانی خوا لەگەڵ ئادەمیدا چەند جۆرێکە: پەیمانی سروشت‌و ژیریی، کە هەموو کەس بەجۆرێ دروستکراوەو داڕێژراوە پەروەردگاری خۆی بناسێ‌و هەر ئەو بپەرستێ‌و ژیانی بە پێی بەرنامەی ئەو بێت، پەیمانی جێنشینی لەزەویدا کە خوا وەری گرت لە ئادەم، وەك لەمەو پاش باسی ئەکات لە چەند ئایەتێکی داهاتووەدا... وە هەموو ئەو پەیمانانەی کەلەسەر زوبانی پێغەمبەرەکان وەری گرتن لە هەموو گەل‌و ئوممەتەکان لە جیهاندا، وە ئەو پەیمانانەی بەهێز کرد بەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی بوونەوەرو بەناردنی نامەکانی‌و پێغەمبەرەکانی‌و ئەو هەموو موعجیزانەی کە فەراهەم هێنا لەسەر دەستیاندا، جا ئەمانە ئەو هەموو پەیمانانەی خوایان هەڵوەشاندەوە لەگەڵ ئەو هەموو بەهێزکردنەدا، کەواتە هەر پەیمانێ تریش ببەستن لەگەڵ هەرکەسێ ترا هەر هەڵوەشاوەیە، چونکە هەرکەس گوێی نەبێ لە پەیمانی خوا ڕێزی هیچ پەیمانی تری لا نییە.

٢- ﴿وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ وە ئەی بڕن‌و ئەی پچڕن هەرچی خوا فەرمانی داوەبە پەیوەستکردنی‌و پەیوەندی پێیەوە، وەك ڕەحم‌و خزمایەتی، وە برایەتی ئادەمێتی، وە برایەتی بڕواو موسڵمانێتی، وە بڕوا بەنامەکان‌و پێغەمبەرەکانی خوا بەبێ جیاوازی، وە هەروەها هەرچی ڕەزامەندی خوای تیایە، ئەمانە هەموو ئەپچڕن‌و خۆیانی لێدائەڕنن.

٣- ﴿وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە خراپەکاری ئەکەن‌و ئاژاوە ئەنێنەوە لە زەوی‌و وڵاتدا.

خراپەکاری چەند جۆرو شێوەی زۆری هەیە بە ئاسانی نایەنە ژمارە، وەکان و کانگای هەمووی دەرچوونە لە ڕاو فەرمانی خوا، وە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی خوا، وە پچڕینی هەر شتێ کە خوا فەرمانیداوە بە پەیوەستکردنی، وە سەری هەموو نالەباری و لاری و تاوانێ لادانە لەو بەرنامەی کە خوا هەڵی بژارد بۆ ژیان و جیهان، وە بەهیچ کلۆج ناگەنجێ چاك کردن و چاك بوونی کاری ئەم زەوی و جیهانە لەکاتێکدا بەرنامەی خوای تیا بەدی نەهێنرێ، وە یاسا و شەریعەتی خوا دوور بخرێتەوە لە ژیان، وە هەرکات پەیوەندی بەینی خوا و بەندەکانی یەو شێوە پچڕاو نەما، ئەو حەلە تێك چوون و شێوان بەرپا ئەبێ و ژیان و جیهان داگیر ئەکات، بەڵێ بەڕاستی هەموو ئەوانە بەرو بەرهەمی دەرچوونە لە ڕێگەی خوا. لەبەر ئەوە ئەوانە شایستەی ئەوەن کە خوا خەشم و قاریان لێ بگرێ، بەم ڕەنگە گومڕایان بکات بەشتێ کە بەندە بڕواداره گوێڕایەڵەکانی پێ ڕێنموونی ئەکات، ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانەی کەلە سنووری خوا دەرچوون و خاوەنی ئەو سیفەت و کردەوانە بوون، هەر ئەوانەن ڕەنجەڕۆ و زیان کەری ڕاستەقینە، چونکە لەباتی هەڵسان بە پەیمان هەڵیان وەشاندنەوە، وەلە باتی پەیوەستکردنی شتی پێویست پچڕانیان بەکار هێنا، وەلە جێگای چاکە کاری و خراپ چاك کردن خراپە کاری و چاك خراپ کردنیان دانا، وە لەباتی بەهرە و پاداش تۆڵە و سزایان هەڵبژارد!!

لەپاش وەوباس و بەیانە، ئینجارووی فەرمووده ئەکاتە ئادەمی بە شێوەی سەرسوڕمان و بەبێزاری دەربڕین لە بێبڕوایان بە خوای پەروەردگاری گیان دەری گیان سێنی ڕۆزی دەری کار بە دەستی زانا بە هەموو شت، ئەفەرموێ: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ﴾ ئایا ئێوە چۆن بێبڕوان بە خوا، ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە شتێکی بێگیان بوون و لەشتان لەم خاك و بێگیانەیە، ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ ئینجا خوا کردنی بەگیاندارو گیانی کرد بە بەرتانا، واتە خۆتان ئەزانن کەلە پێشەوە گیان لەبەر نەبوون و ئێستاش گیان لەبەرن، دەی ئایا کێ ئەم گیانەی کرد بە بەرتاندا؟ کێ جوێی کردنەوە لەو خاك و خۆڵە بێ گیانە؟ بێگومان هیچ چارە نییەو هیچ وەڵامێ نییە بۆ ئەو پرسیارە دێتە ڕێمان، وە بەهیچ ڕەنگ ڕێمان نییەو هیچ وەڵامێ نییە بۆ ئەو پرسیارە بێجگە لەوە بڵێین: خوا، ئەگەر ئەوە نەڵێین ئەبێ چی بڵێین؟ ئایا بڵێین لە خۆوە و بە ڕێکەوت؟!

ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ
جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

بێگومان هەرکەس دەربەستی ئابڕووی خۆی بێت، هیچ کام لەو ڕوو بارە نالێت، وە هەرکەس بێبەش نەبێت لە فام و تێگەیشتن بە هەرکام لەم دووبارە شەرم ئەیگرێ و تەریق ئەبێتەوە، کەواتە هیچ باری تر نەما جگە لەوەی بڵێین کەسێ دروستی کردین کە جیاوازە لەم هەموو دروستکراوانەو لە سروشتی ئەمان بەدەرە، وە ئەو کەسەش ئەبێ زیندووو زاناو بەدەسەلاْت و کار دروست بێت، کەواتە هەر لە خۆماندا بەڵگەو نیشانەی تێرو تەواو هەیە لەسەر بوونی ئەو خوای پەروەردگارە، وە لەگەڵ بوونی بەڵگەو نیشانەی ئاوا ئاشکرا، بێبڕوایی زۆر ناشیرین و بێزراوو جێگەی سەرسوڕمانە، لەبەر ئەوە ئەو شێوە پرسیارەی ئاڕاستە کرد، ئینجا هەرچۆنێ بۆ گیان بە بەراکردن ڕێ نییەو ملە جەڕە ناکرێ و هەر ئەبێ ئەو وەڵامە ڕاست و ڕەوا بدرێتەوە، هەروەها بۆ گیان دەرکردن و مراندنیسمان ئەبێ هەر بڵێین خوا ئەیکات، ئەگینا ئەو گیانە چییەو چۆن دەر ئەچێت و بۆ کوێ ئەڕوات؟ کەواتە مراندنیش خۆی ئەچەسپێنێ و ملە جەڕەی لەگەڵ ناکرێ وەك گیان بەبەراکردن،لەبەرئەوە ئەمیش ئەکات بە بەڵگەو نیشانەو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ لەپاش دا ئەتان مرێنێ، ئینجا بێ گیانی و گیان بە بەراکردنی یەکەم جارو مراندن بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکراو ڕوونە لەسەر گونجاوی زیندووکردنەوەو گیان بە بەراکردنی دووەم: لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾، لەپاشان زینووتان ئەکاتەوەو جارێ تر ئەتانکات بەگیان لەبەر.

ئەم گیان بە بەراکردنی دووەم جارە هەرچەندە وەك یەکەم جار سووك و ڕوون و ئاسانەو ماق ئەوەی نییە سەری لێبکرێتەوەو بە نەگونجاو دابنرێ و بڕوا نەبێ پێی، هەر چەند ئاوایە، بەڵام ئەو گەلەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی بیست بڕوای پێی نەبوو، وە بەگونجاوی دائەناو دەم بازی تیا ئەکرد، وە هەر لە کۆنەوە لەناو گەلە ڕابردووەکانی جیهاندا تاقمێکی ئاوا نەفام و نەزان بوون کە ژیرییان لەکار کەوتبووو بڕوایان نەبوو پێی، وەك لەم چەرخ و کاتەیشدا هەر لەو بابەتە هەن و بۆ دواوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نەفامی و کۆن و شوێنی ئەوان ئەکەون و کۆنە پەرستن!! ئینجا بەپێی لێ زانی و کار دروستی و داد پەروەریی خوا

ئـەبێ لێپرسـینەوەو پـاداش و تۆڵـە ببـێ، لەبەرئـەوە ئەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، لـە پاشانەگێڕێنرێنەوەوەهەربۆری خوابۆئەمەی بڕیاری خۆی جێبەجێبکات وبەدی بێنێ تیایاندا.

ئابەو جۆرە لە تـەنیا ئایـەتێکی کورتـدا هـەموو شـریتی ژیـانی کـردەوەو پێچایەوە، وە خراپە بەرچاو شێوەی ئادەمی کەچۆن و وا لەناو دەستی قودرەتی خوادا: لە بێگیانی یەکەم جارەوە گیانی کرد بە بەریاو هێنای، ئینجا مراندی و گیانەکەی لێ سەندەوە، ئینجا جارێ تـریش گیانەکـەی دایـەوەو کـردی بـە بەریـدا. وەلـەم نیـشان دانـە چەسـپانییەدا دەسـەڵاتی بێسنووری خوای کێشاو خستییە بەرچاوی دڵ و دەروون.

لە ئایەتی پێشوودا چاکەو بەهرەو بەرهەمی دەسەڵاتی خوای خستە بەرچاو لە ئادەمی خۆیدا، وە بەوە سەرزەنشتی کردو بێزاری دەربڕی لە بێبڕوایی بە خوا، لەم ئایەتەدا چاکەو بـەهرەی فـراوان و بەرهـەمی دەسـەڵات و توانـای ئەخاتـە بەرچـاو لـەم زەوی و ئاسمانـەدا بـۆ ئەوەی دیسان سەرنجی ئادەمی ڕاکێشێ و سەرزەنشتەکەی بە تین تر بکات و بێزاری دەربڕین لە بێبڕوایی بەهێزترو دووبارە بکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ خوا ئەوەیە کە دروستی کرد لەبەر ئەو وتەیە بە جوانی ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەم ئادەمییە بەڕێزە بەلای خواوە، وە بۆ کارو فەرمانێکی گەورەو گرنگ دروستکراوە، دروستکراوە بۆ ئەوەی کار بەدەست و خاوەن و کار بێت لەم زەوییەدا، کەواتە بەرزو بەڕێزترین لەم مۆڵگە پان و فراوانـەدا، وە یەکـەم گـەورەو ئاغایـە تیایـداو ئادەمی یەکـەم شـتە تیایـدا، وە ڕێـزی ئادەمی و ئادەمێتی یەکـەم ڕێـزە، وە بـەرزی و پارێزگـاری ئادەمی و ئادەمێتی ئـەبێ یەکـەم و سەر دەستە بێت، ئینجا هەموو مەبەست و ئامانجی تر لە ڕادەو پلەی دووەمدایەو ژێـر بارو شوێن کەوتووی ئادەمی و ئادەمێتییە، نەك بەندەی ئەڵقە لە گوێبێت بۆ ئامێرو پەیکەر وەك مادیەکانی ئەمرۆ ئەڵێن، لەکاتێکدا کە ئەم ئادەمییە گەورەو ئاغایە لەم جیهان و زەوییەدا، ئەو چاکەو بەهرەیە کە خوا منـەتی پـێ ئـەکا بەسـەر ئادەمیدا لـەم ئایەتـەداو سەرزەنشتی ئەوی پێئەکات لەسەر بێبڕوایی، تەنها ئەوەنییە کە هەرچی لەزەویدایە بۆی دروستکردووە، بـەڵکو لەگـەڵ ئـەوەدا ئەمەیـشە کـە کردوویـەتی بـە ئاغـاو گـەورەی ئـەو دروسـتکراوانە، وە نرخێکی پێداوە بەرزتر لەنرخی هەرچی لەم زەوییەدایە، وە هیچ نرخ و نرخدارێ نابێ بەرز بێتـەوە بەسـەر ئادەمی و ئادەمێتیدا، وە هـەر مەبەسـت و ئامـانجی بچووك کردنـەوەو پەسـت کردنی ئادەمی و کەم کردنەوەی ئەو تا بێت، ئەو مەبەست و ئامانجە پێچەوانەی ڕاستییەو

دچی مەبەستە لە بوونی ئادەمی لەم جیهانەدا، ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ ئینجابەڕێکی نیازی ئاسمانیکرد، واتە نیازی ڕووی کردەلای سەرەوە ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ﴾ ئینجا دروستی کردن بەڕێكو پێکی حەوت ئاسمان، بەبێ ئەمەی هیچ ناتەواوی‌و کەم‌و کوڕی‌و لاری‌و درزو برینیان تیا بێت، ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ وە خوا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێ، کەواتە ئەبێ دروستکراوەکانی تێرو تەواوو بێ لەکەبن، ئینجا کەسێ کە پەروەردگاری ئەم زەوی‌و ئاسمانە بێت، کە هەموو بەش‌و پارچەیەکیان بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونەو شایەتێکی ڕاست‌و ڕاسگۆیە لەسەر بوونی خوایەکی تەنهای زانای کار دروستی دەسەڵاتدار، ئەبێ چۆن مەردوم بڕوای نەبێ پێی؟!

زانایانی تەفسیرو کەلام لەبارەی دروستکردنی زەوی‌و ئاسمان‌و کامیان لە پێشەوە دروستکراوە، قسەی زۆریانکردووە وەك بڵاوبوونەتەوە لە کتێبەکاندا، ئینجا لەبەرئەوە مەسەلەکە غەیبییەو نادیاریی، وە قسەو باسەکانیش لەسەرچاوەیەکی بە هێزی دڵنیا کەرەوە نەهاتوون، چاك وایە خۆمان بەو جۆرە شتانەوە خەریك نەکەین‌و زانینی ئەو شتانە حەواڵەی خوا بکەین، وە هەروەها لەبارەی ئەو حەوت ئاسمانەوە کە قورئان لە چەند جێگەیەکدا ئەفەرموێ، لەم بارەیەشەوە لە کۆن‌و تازەوە قسەی زۆر کراوە، ئەمەش دووبارە هیچ پێویستی نییە خۆ خەریك کردن پێیەوە، وە هیچ کارێکی وایینی‌و جیهانیمان نەبەستراوە پێیەوە، بەس پێویستە لەسەرمان بڕوامان بێ کە حەوت ئاسمان هەیە، چونکە خوا ئەفەرموێ: هەیە، ئیتر نازانین مەبەست بەو حەوت ئاسمانە چییە؟ ئایا مەبەست حەوت کۆمەڵەی خۆرییە وەك ئەم کۆمەڵەی خۆری ئێمە؟ یا مەبەست حەوت مەجەڕەو کاکێشانە؟ یا مەبەست چییە؟ ئەم جۆرە شتانە با هەر حەواڵەی خوایان بکەین. زۆر بە داخەوە کاتی خۆی بەم جۆرە نەکرا، بەڵکو شوێنی قسەی ئەم‌و ئەو کەوتن، بەهۆی ئەوەوە لەبارەی ئاسمان‌و زەوییەوە شوێنی فەلسەفەی ئیغریقی‌و یۆنانیەکان کەوتین‌و ئەوشتە پڕوپووچ دەلەسانە بڵاو بوویەوە لەناو کتێبە کەلامی‌و هەیئەتەکاندا، وە موسڵمانان زۆر بە سۆزو تاسەو ئەیان خوێندو زۆر بەڕاستیان ئەزانی، ئەیان وت ئەم بونەوەرە پێکهاتووە لەسیانزە کورەو نوساون پێکەوە، وەك توێکڵەکانی پیاز، وە مانگ‌و خۆرو ئەستێرەکان خۆیان ناگەڕێن، بەڵکو وا چەقێنراون لەناو قەبارەی تەبەقەکانی ئاسمانداو ئەوان ئەگەڕێن پێیانەوە، وە زەوی دامەزراوەو هەموو ئەوان بەدەوری ئەما ئەگەڕێن، وە هەروەها شوێنی درۆو دەلەسەی وەو

هەموو ئیسرائیلیانە کەوتین کە کتێبە کۆنەکانمان پڕن لەم دوو جۆرە دەلەسانەو دوژمنی ناشارەزا ئەیانکات بە تانەو لەکە بەسەر ئیسلامەوە.

لەپاش باسی دروستکردنی هەرچی لەزەویدایە بۆ ئەم ئادەمییە، ئینجا دێتە سەر باسی بەشێك لە داستانی ئادەم کە یەکەم کەس و سەرچاوەو باوکی ئەم تیرەیە. داستانی ڕێز پێدانی و نیشتەجێ کردنی لەم زەوییەداو گێڕانی بەجێنشینی تیایدا، لەسەر پەیمان و مەرجێ کەلەسەری خۆی و نەوەکانی داینا، وەك لەمەوپاش دێت.

لە زۆر شوێندا قورئان سەرگوزەشتەو داستان ئەهێنێ بەبۆنەی چەند مەبەست و چەند شتێکەوە، کە بە پێی ئەوان ئەدوێ لەو داستانانە، وە زنجیرەیەکیان لێ باس ئەکات کە ئەو مەبەستانە پێك بێنێ، وە بەجۆرو شێوەیەك باسەکان ئەهێنێ و لە ڕێگەیەکەوە بۆیان ئەڕوات کە بەڕێك و پێکی ئەو مەبەستەی کە بۆی هاتوون نیشان بدرێ و بگەیەنرێن و کار بکەن لەدڵ و دەروون‌دا.

چەند کەس وا گومان ئەبەن کەلە داستان و سەرگوزەشتەکانی قورئاندا تیکرارو دووبارە کردنەوە هەیە، چونکە ئەبینن زۆر لەوانە لە چەند سورەتێکدا هاتوون، بۆ وێنە باسی ئادەم و شەیتان لەشەش سورەتدا هاتووە، بەڵام بیرکردنەوەو تێڕوانینێك بە وردی دەری ئەخات کە دووبارە کردنەوە نییە لە هیچ داستانێکدا، بەڵکو لە هیچ زنجیرەیەکدا، چونکە هەرکام لەوانە شێوەیان جیاوازەو ڕێگەی هێنانەکەی جیاوازەو ڕێگەی هێنانەکەی جیاوازە بۆ مەبەستێکی تایبەتییەو بەش زنجیرەیەکی تایبەتی لێ باسکراوە، وە ئەگەر زنجیرەیەك دووبارە کرابێتەوە، بێگومان ئەوە واتاو مەبەستێکی تازە بەجێ ئەهێنێ کە دووبارە کردنەوەکە ناهێڵێ.

هێندێ کەس کە لایان داوە لەڕێگەی ڕاست و سرووشتیان تێکچووەو چاوی دڵیان نابینێ، لایان وایە سەرگوزەشتەکانی قورئان لەسەر باوو شێوە ڕاستەکەی خۆیان نەهاتوون، وە دەستکاری کراون بەزیادو کەم و گۆڕان، وە مەبەست هەر قسە ڕازاندنەوەو ڕێکخستن و هۆنینەوەیەو ئیتر بە بێ ئەمەی گوێ بدرێ بە ڕاستی و ناڕاستی، بەڵام ئەوکەسەی کەبە سروشتێکی ڕاستی نەگۆڕاوو بەدڵێکی بیناوە سەرنجی قورئان بدات ئەزانێ کە ئەو زیادو کەمی و درێژە پێدان و کورتکردنەوەو شێوە گۆڕانەکە لەو سەرگوزەستانەدا بەکار هێنراون هەموو هەر ڕاستن و هیچ کام دژی یەکترنین، وە هەرکام بە بۆنەی شتێکەوە هاتووەو لە

شوێنێکدا هاتووه، که هەر بەو جۆره ڕێك و پێکه که قورئان هێناویەتی، وه هەر ئەو ئەندازه پێویسته وتنی لەو جێگاو شوێنانەدا که قورئان فەرموویەتی، وەك لەمەوپاش به یارمەتی خوا دەست نیشانیان بۆ ئەکەین.

با ئەو نەفامانه بزانن که قورئان کتێبی قسەو داستان گێڕانەوه نییه، وه کتێبی گاڵتەو گەپ نییه، وه کتێبی مێژوو نییه، بەڵکو قورئان کتێبی بانگکردنه بۆلای خوا، وه دەستوور ڕژێمە، وه بەرنامەی ژیانه، جا لەبەرئەوه له ناو بەناوی بانگکردنەکەدا داستان و سەرگوزشتەی تایبەتی هەڵئەبژێری، وه به ئەندازەیەك و له ڕێگەی ترەوه که ڕێك و پێك بێت لەگەڵ شوێن و مەبەستەکەدا، وه لەهەمان کاتدا شێوەیەکی شیرینی هونەریی (فنی) ڕاست به جێ ئەهێنێ، که دوور بێت له دەلەسەو دەست هەڵبەست و ڕازاندنەوەی خەڵەتێنەر، بەڵکو به شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش و دڵ ڕفێن، بەهۆی هێزی ڕاستی و شیرینی گەیاندن و وتن، سەرگوزەشتەی پێغەمبەران ـ درووددی خوایان لێ بێ ـ شێوەی گەل و کۆمەڵی بڕوا نیشان ئەدات لەڕێگە دوورو درێژه نەپێچراوەکەیدا، وه بەسەرهات و داستانی بانگکردن بۆلای خواو به پیرەوه چوون و گوێڕایەڵی ئادەمی ئەخاته بەرچاو تاقم لەدوای تاقم و چین لەدوای چین، هەرچۆنێ هێزو سروشتی بڕوای بڕواداران نیشان ئەدات لەگەڵ سروشتی بۆچوون و تێگەیشتنیان له پەیوەندی بەینی بڕواداران و ئەو خوایەی که ئەو بەهرە گەورەیەی پێبەخشین. وه بێگومان بیرکردنەوەو سەرنج دانی دڵ بۆ ئەو هەموو تاقم و چینه بەختیاره بەدرێژایی مێژوو لەو ڕێگه دوورو درێژەدا، ڕووناکی ڕەزامەندی و شادمانی ئەڕژێ بەسەر دڵ و دەروونداً، وه بێداری ئەکاتەوه به نایابی و گرنگی بڕوا، وه بەدامەزراوی و بنج بەستن و ڕیشه کوتانی له لەشی ئەم بوونەوەرەدا، هەروەها بۆچوون و تێگەیشتنی بڕوایی جوێ ئەکاتەوه له هەموو بۆچوون و تێگەیشتنێ تر که بێگانه بێت لەبڕوا به خواو له ئایینی خوا.

جا لەبەر ئەوه داستان و سەرگوزەشته بەشێکی گەورەیه لەم کتێبه بەرزو بەڕێزه، که کتێبی دواترین بانگکردنه بۆلای خواو بۆ فەرمان بەری خوا، کەواته با لەبەر ڕووناکی ئەم پێشەکییەدا که باسکرا چەند کاتێ بژین لەگەڵ بەسەرهات و داستانی ئادەم دا ـ درودی خوای لەسەر بێ ـ بەم جۆره که لێرەدا هاتووه: با چەند کاتێ بژین لەگەڵ یەکەم داستانی ئەم تیرەی ئادەمییەداو لەگەڵ ئەو تەمێ و ئامۆژگاریانەی که ئەم داستانه ئەیخاته دڵمانەوه.

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا

**با بە چاوی دڵبگەرێینەوە بۆ ناو کۆمەڵی هەرە بەرزی فریشتەو لەو مەیدانەدا بوەستین و گوێ بگرین لەو بەسەر هات و داستانە کە خوای میهرەبان لەم قورئانەدا بۆی ناردین لەسەر زوبانی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە پێی فەرموو: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە پەروەردگارت وتی بە مەلائیکە ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ بەڕاستی من جێنشینێك لەزەویدا دروست ئەکەم و دای ئەنێم، جێنشینێ بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئەوێ و ڕامیاری وڵات وە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خواو گرتنە دەستی هەموو کاروباری جیهان[1]، وە بۆ ئەوەی بێن بەهۆی دەرکەوتن و بەکارهێنانی ئەم هەموو هێزو وزەو خێرو بیرو بەهرەیەکە خوا لەم زەوییەدا دروستی کردون و بەرەبەرە دەرکەوتن و دەستکەوت بوون و دەرئەکەون و دەستکەوت ئەبن ـ بە ئیزنی خواو ڕێنموونی خوا ـ لەسەر دەستی ئەم دروستکراوە تایبەتییەدا کەکرا بە جێنشینی، وە ئەوەی پێویست بوو بۆ هەڵسانی بەم کارە گرنگانە پێی بەخشراو ئامادەکرا بۆی.**

**خوای گەورە ئەم هەواڵەیدا بە مەلائیکە بۆئەوەی بەندەکانی فێری پرس و ڕا بکات لەکاروباری خۆیان، هەرچەند خوا بەهیچ ڕەنگ پێویستی نییە بە هیچ شتێ، هێندێ لە زانایان ئەمەیانکردووە بەهۆی ئەو هەواڵ دانە، بەڵام ڕای زۆربەو بەهێز لەسەر ئەوەیە: تا مەلائیکە ئەم پرسیاری داهاتووە بکەن و ئەو وەڵامە بدرێتەوەو بە هۆی ئەوە تێبگەن لە لێزانی و کار دروستی خوا لە دروستکردنی ئەو جێنشینەدا. ئەو مەلائیکەتانە بۆیان دەرکەوت کە ئەم دروستکراوە تازەیە دوای زۆر بوون و پەرەسەندنیان خراپەکاری و خوێن ڕێژی ئەکەن لەزەویدا، ئیتر ئەو بۆ دەرەکەوتنە لە چەند نیشانە و دروشمێکەوە بوویێت، یا**

---

[1] هێندێ ئەفەموون جێنشینی مەلائیکەیە کەلە پێش ئادەمیدا ئەوان لەزەویدا بوون وە هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست لە جێنشینی تیرەی (جن)ە کە هاتن و ئاژاوەو خراپەکاریان کرد تا خوا لەناوی بردن و لەوانە هەر شەیتان ماوەتەوە، ئەم دوو ڕایش هەر ئەگونجێ، بەڵام ڕای تەفسیرەکە بەهێز ترە بە لامانەوە، چونکە پێغەمبەران بە جێنشینێ خوا ناو ئەبرێن ــ درودی خوایان لێ بێ ــ.

بەهۆی بەراورد کردنی ئەمان بێت لەگەڵ تیرەی پێش ئەمان کە ناو ئەبرێن بە تیرەی (جن)، یا خوا حاڵی کردبن لەسروشتی ئەم دروستکراوە تازەیە، یا هەر لەمەوە زانیبێتیان کە ئەم جۆرە ژیانە لەم زەوییەدا ئەو خراپەکاریو خوێن ڕێژییەی تیا ئەبێت، لەبەر هەرکام لەمانە بۆیان دەرکەوت کە ئەو خراپەکاریو خوێن ڕێژییە بەرپا ئەبێت لەدروستکردنی ئەم جێنشینەوە، ئینجا خۆیان بە هۆی سروشتی پاکی خۆیانەوە کە بێجگە لە چاکەو ئارام ئاشتی هیچی تریان بەلاوە نەبوو، لایان وابوو کە تەنها پەرستنی خواو بەندەی خوا مەبەستە لەبووندا، وە هەر ئەوە ئەبێ مایەی دروستکردنیو دروستکراوان بێت.

ئینجا ئەوا ئەمان هەڵئەسن بەوە بەبێ کەمو کوڕیو وازهێنان، لەبەرئەوە پرسیاریان کرد تا دەرکەوێ بۆیان هۆی دنانی ئەو جێنشینە، نەك خوا نەخواستە مەبەستیان ڕەخنە گرتن بووبێ، چونکە لە هەموو کەس باشتر بڕوایان بوو بەکار دروستی خوا: ﴿قَالُوٓاْ﴾، وتیان: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾، ئایا ئەگێڕی لە زەویداو کەسێ دائەنێی بە جێنشین تیایدا کە خراپەکاری بکات تیایداو خوێن بڕێژێ، واتە لە ناهەقو بە ناڕەوا؟! ﴿وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾[1] لەکاتێکدا کە ئێمە تۆ بەدوور دائەنێین لە هەموو خراپەیەو لە هەر شتێ کە شایانی تۆ نییە لە کاتێکدا سوپاسو ستایشت ئەکەین، وە هەرشتێ کە شایستەو شایان بێت بۆ تۆی دائەنێینو ناوی تۆی پێ ئەبەین، وە هەرشتێ شیاوو شایستە نییە ڕەوای نادەین بۆت، واتە لە کاتێکدا ئێمە هەر تۆ ئەپەرستینو خراپەکاریو ناسوپاسیو نافرمانی ناکەین، مەبەستیان لەمەشدا خۆپەسەندیو کەشخە کردن نەبوو، بەڵکو ئەیان ویست تێبگەن لە هۆو حیکمەتی ئەو جێنشین دانانە، بەوێنەی قوتابییەك کە پرسیار ئەکات لەشتێ کە دێت بەدڵیداو ئەیەوێ تێبگات، ئەوان بێئاگا بوون لەوەی کەلەم جێنشین دانانەدا بەرهەمی زۆر لە سیفەتەکانی خوا بەدی دێتو بەو ناوو سیفەتانە ناو ئەبرێو ئەناسرێ کە بە مەلائیکە بەدی نایەت: ناوو سیفەتی بەزەییو میهرەبانیو دادو ئارامو خۆ گریو لێبوردنو چاو پۆشیو خەشمو تۆڵە سەندنو پاداش دانەوەو جیا کردنەوەی چاکەو چاکەکار لە خراپەو خراپەکار... وە هەروەها ئەگەر ئەو جێنشینە نەبوایە، لێزانیو کاردروستی خوا دەر نەئەکەوت لەدروستکردنی ئەم زەوییەدا، بەم هەموو خێرو

---

[1] ئەو دوو ڕستەو وتەیە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراونەتەوە، هەموو هەر ڕێکن، بەلام دڵم بەوە بە ئاران ترە کەلە تەفسیرەکەدایە.

بێره فراوانەوه كه نایەنه ژمارەو دوایی نایەن تا دنیا دنیایه، وه ژیان گەشەی نەئەكردو جۆر به جۆر نەئەبوو، چونكه مەلائیكه ئامادەو لێهاتوو نەبوو بۆئەو كارانه، وه پێویستی نەئەبوو به ڕۆژی دوایی و ژیانه نەبڕاوەكەی، ئەگەر ئەو جێنشینه نەبوایه ئەو هەموو مەردە خواناسه بەكاره لێهاتووانه نەئەبوون و ناسینی خوا بەم شێوه بەرزو بڵنده بەدی نەئەهات كه ئەوەش زیانێكی بێهاوتایه، بەڵێ له دروستكردنی ئەم جێنشینەوه ئەو خراپەكاری و خوێن ڕشتنه بەرپا بوو، بەلام ئەوه شتێكی كەمه لەچاو ئەو هەموو چاكەو خواناسییه نەبڕاوەو نەهاتووەدا، وەلەپەنای تێكۆشان بۆ نەهێشتنی ئەو خراپەو چڵك و چەپەڵییەدا، پاكی و خاوێنی چاكان و پاكان بەدی هات و دەركەوت، وه لێ بڕان بۆ خواو پەرستنی خوا به تاك و تەنیایی و به پاك و خاوێنی بەو تێكۆشان و فیداكارییه بەدی هات، ئەمه نموونەیەك بوو له بەشێكی زۆر كەم لەوەی كه بۆ ئێمه دەركەوت لەهۆو حیكمەتی دانانی وەو جێنشینه، وه هۆو مەبەستی تەواوو ڕاستەقینه هەر خوا خۆی باش ئەزانێ، وەك دەست نیشانی بۆ كرد له وەلامی ئەو پرسیار كەرانەدا، ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾، بەڕاستی من شتێ ئەزانم سەبارەت به دانانی ئەم جێنشینه كه ئێوه نایزانن، بەكورتی بەم جۆره وەلامی دانەوه، ئینجا به تایبەتی دەست نیشان ئەكات بۆ شتێ كه هۆی هەڵبژاردنی ئادەمه بۆ جێنشینی و مایەی باو دانی بوو بەسەر ئەواندا، ئەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾ خوا ئادەمی فێری هەموو ناوەكان كرد، ناوی هەموو شتێ، وه زاناو توانای كرد كه هەموو شتێ ناو ببا به ناوی تایبەتی خۆی و بەوه دەست نیشان بكات بۆ هەموو ناو براوەكان و مەردوم تێبگەیەنێ له هەر مەبەستێكی خۆی، وه بێگومان ئەوەش شتێكی ئێجگار به نرخ و پێویستەو ناچاری هەیه بۆی له ژیاندا، چونكه ئەگەر ئەوه نەبوایه هیچكەس هیچكەسی بۆ تێنەئەگەیەنرا لەهەر شتێ كه هەستی پێئەكرا، تێ نەئەگەیەنرا مەگەر كاتێ كه ئامادە بوایه به بەرچاوەوه بوایه، بۆ وێنه: هەركەس بیویستایه باسی درەختێ بكات بۆ یەكێ‌تر بەهیچ كلۆج بۆ تێنەئەگەیەنرا، مەگەر ئەو درەخته به بەرچاوەوه بوایه، یا ئەبوایه پەلی كابرای بگرتایه تا ئەی بردە لای درەختەكه ئیتر له هەر شوێنێ ببوایه، وه هەروەها شاخێ یان زەلامێ یا هەر شتێ‌تر... وه بێگومان ئەوەش ئەرك و مەینەتێكی ئەوەنده سەخته بەڕێوه نەئەبراو بەو جۆره ژیان بەسەر نەئەبرا، ئەگەر خوا میهرەبانی نەكردایەو ئەو بەهرەیەی نەئەدا بەم جێنشینه، بەلام مەلائیكه پێویستیان بەم بەهرەیه نەبوو، وەكارو پیشەی ئەوان كه هەر فەرمان بەری و پەرستنی خوایه بەبێ ئەو بەهرەیه بەڕێوه ئەچوو هیچ پێویستیان نەبوو پێی.

ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟
سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ
فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ
وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾

---

خوای میهرەبان ئادەمی فێری ناوی ناو براوەکان کرد ئیتر هەرچۆنێ فێری کرد، ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ لەپاشان ئەو ناو براوانەی پیشانی مەلائیکەتەکانداو ئاگاداری کردن بەسەریانا، ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ﴾، ئینجا پێی فەرموون: هەواڵی ناوەکانی ئەوانەم بدەنێ و ناوەکانیانم پێ‌بڵێن، ئەوەی پێ فەرموون بە شێوەی بەر لێ برینەوە، تا دەرکەوێ دەستەپاچەیی و یەك کەوتنیان، لەبەرئەوە پێی فەرموون: ﴿إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لەوەی کەلە دڵتاندایەو لاتان وایە من هەر دروستکراوێ دروست بکەم ئێوە زاناترو بە هونەر ترن لەو، ئینجا با بزانین لەپاش ئەوە مەلائیکەتەکان چیان وت؟ ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿سُبْحَـٰنَكَ﴾، ئێمە تۆ پاك ئەگرین لە هەرشتێ کە شیاوو شایستەی تۆ نییە، کە یەکێ لەو ناشایستانە ئەوەیە کە کارو فەرمانی تۆ بێ جێ‌بێت‌و تۆ لە هەموو شتێکدا لێزان‌و کاردروست نەبی، وە پاکی‌و بێگەردو بێ لەکەیی بۆ تۆیە لە هەموو کارو بارو بڕیارتدا، ئەم وتەیە ئەکرێ بە پێشەکی بۆ مەبەستێکی گرنگ‌و گەورەکە بە دوایا ئەهێنرێ، وە لێرەدا هێنان‌و پێش خستنەکەی بۆ داوای لێبوردنە لە هەر ناڕەوایی‌و کەم‌و کوڕییە کە ڕووی تێکردبن لەو پرسیارەدا، ئینجا دانیان نا بە نەزانی‌و دەستەپاچەییان سەبارەت بەوەی خوا داوای لێکردن، وتیان: ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ هیچ زانینێ نییە بۆ ئێمە بێجگە لەوەی تۆ فێرت کردبین‌و زانات کردبین پێی، واتە ئێمە ئەو ناوانە نازانین، چونکە هەرچی تۆ فێرت

نەکردبین ئێمە نایزانین، وە تۆش شتێکت فێر کردوین کە ئێمە ئامادەبین بۆیو شیاوو گونجاو بێت لەگەڵ سروشتو جیهانی ئێمەدا، دەی زانین ئەوانە نە ئێمە ئامادەییمان تیایە بۆی، وە نەپێكو گونجاوە لەگەڵ سروشتو جیهانی ئێمەدا، ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ بێگومان هەر تۆ بە هەموو شت زانای، کار دروستی لە هەموو کارو بڕیارتدا، کەواتە دانانی جێنشینو ئامادەکرنی بۆ زانینو هەموو کارو باری جێنشینیەکەیو نەگێڕانی فریشتە بەجێنشینو ئامادە نەکردنیان بۆ زانینو داخوازیی جێنشینی، ئەمانە هەموو ڕێكو ڕاستو بەجێنو هەمووی بە لێزانیو کاردروستی کراون.

لەپاش ئەوەی کە فریشتەکان دانیان نا بە نەزانینو دەستەپاچەیی خۆیاندا، ئینجا: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿يَا آدَمُ﴾ ئەی ئادەم ﴿أَنبِئْهُم بِأَسْمَائِهِمْ﴾، هەواڵیان بدەرێ بە ناوەکانی ئەوانەی کە ئەوان نەیانزانی، ئادەمیش هەواڵی پێدانو هەموو شتێکی بەناوی تیبەتی خۆیەوە برد لەگەڵ هۆی دروستکردنیانو بەرژەوندی لەدروستکرنیاندا ﴿فَلَمَّا أَنبَأَهُم بِأَسْمَائِهِمْ﴾ ئینجاکاتێ ئادەم هەواڵی پێدان بەناوی ئەوانە، ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی بەفریشتەکان: ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾ ئایا پێم نەگوتن: ﴿إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ کە بەڕاستی من زانامو ئاگام بە هەموو نادیارییو شاراوەکانی ئاسمانەکانو زەوی، واتە دەرکەوت بۆتان کە دروستکردنو دانانی ئەو جێنشینە ڕێكو ڕاستو بەجێیە، خوای گەورە ئەمەی پێ فەرموون بە شێوەی تەشەر لێدانو سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەو وتەی کەبە کورتی تێپەڕی کرد لەپاش پرسیارەکەی ئەوان: ﴿إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، ﴿وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ وە ئەزانم بە هەرچی کە ئێوە دەری ئەبڕن، کە هێندێ لەوانە ئەوە بوو پرسیاریان لێکردو وتیان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا﴾... هتد، وە بە هەرچی کە ئێوە دەرتان نەئەبڕی کە هێندێ لەوانە ئەوە بوو کە لایان وابوو خوا لەوان زاناترو بەهونەر تر دروست ناکات.

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾

وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ

فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾

---

لەمەو پێش دوو بەهرەو چاکەی باسکرد دەربارەی ئادەم: گێڕان بەجێنشین و گێڕانی بە زۆر زانا تا ڕادەیە فریشتەکان داماو و دەستەپاچە بوون لەبەر دەم زانینی فراوانیدا، ئینجا باسی بەهرەی سێیەمی ئەکات کە ئەوپەڕی ڕێزی تیایەو گەیاندنیەتی بە بەرزترین ڕادەو پلەیە کە تەنها خوا بەویدا لە جیهاندا، ئەوەش بریتییە لە سوجدە بردنی تایبەتییە بۆ خواو بۆ غەیری خوا قەدەغەیەو مەدرومی پێ کافر ئەبێت، ئەو سوجدەی ڕێز گرتن و مل کەچییەش، هەرچەند لەم ئایین و شەریعەتی ئێمەدا قەدەغەیەو بە هیچ ڕەنگ ڕەوا نادرێ، بەڵام جێگای سەرسوڕمان نییە کە خوا لەو کاتەدا فەرمانی پێدابێ، هەرچۆنێ لەوەو پاشیش بووەو ڕووی داوەو ڕەوا دراوە لەلایەن خواناسانەوە وەك سوجدە بردنی باوك و دایك و براکانی (یوسف) بۆ (یوسف) (علیه السلام)، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە وتمان بە فریشتەکان سوجدە بەرن بۆ ئادەم، ئیتر ئایا ئەو سوجدە بردنە بە دانانی تەوێڵ و ڕوو بووبێ لەسەر زەوی وەك دیمەن و ڕواڵەتی وتەکە ئەیگەیەنێ، یا سەر خەفاندن بووبێ، بە هەرکام بێت خوا فەرمانیدا ﴿فَسَجَدُوٓا۟﴾ ئەوانیش دەست بەجێ سوجدەیان برد، ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ بێجگە لەشەیتان کە ناوی ئیبلیسە، ﴿أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ﴾ ئەو سەرپێچی کردو خۆی بەگەورە تر زانی، واتە لەبەر ئەوە خۆی بەزل زانی و خۆی بە گەورەتر لە ئادەم سوجدەی نەبردو سەرپێچی کرد لە فەرمانەکەی خواو ئەو فەرمانەی بە ناڕەوا دانا، ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ وە شەیتان لە زانینی خوادا یەکێ بوو لە بێبڕوایان، واتە هەرچەند لە ناو فریشتەکاندا بووو خواپەرستی ئەکرد، بەڵام خوا لە پێشەوە زانی بووی کە لەپاشدا خۆی لەڕیزی فریشتەو بڕوادارانداا ناهێڵێ و خۆی ئەباتە ڕیزی بێبڕواکان، یا مەبەست ئەوەیە هەرچەند لە پێشەوە بڕوادار بوو بەڵام لەپاشا گەڕا بەبێ بڕواو چووە ڕزی بێبڕواکان، چونکە ئەو فەرمانەی بە ناهەق و ناڕەوا دانا.

ئایا شەیتان لە تیرەو بەرەی فریشتەیە؟ یا لەتیرەو بەرەی جنۆکەیەو بەڵام تێکەڵی ئەوان بوو، لەگەڵیان ژیا تا بەو بۆنەوە ناوبرا بە فریشتە؟ زانایان دوو بەرەکین لەوەدا، وە هەر کۆمەڵو تاقمێ چەند بەڵگەو نیشانەی هەیە بە دەستەوە، بەڵام بەڵگەو نیشانەی جنۆکەیەتی بەهێزترە، وەك دەرئەکەوێ لەو هەموو لێکۆڵینەوەی کەلەم کراوە لەلایەن هەردوو تاقمەکەوە، هەرکەس ئەیەوێ با بە درێژی سەرنجی ئەو باسە بدا لە کتێبە بەناوبانگەکاندا، وەك تەفسیری (ڕازی‌و روح المعانی)و وێنەیان.

لەپاش باسی ئەوەی کە ڕوویدا لەبەینی خواو فریشتەکان‌و شەیتاندا، ئینجا دێتە سەر باسی ئەوەی کە ڕوویدا لە بەینی خواو ئادەمدا، ئەفەرموێ: ﴿وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ وتمان: ئەی ئادەم نیشتەجێ ببە خۆت‌و هاوسەرەکەت لە بەهەشتدا ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ وە بخۆن لەو بەهەشتە بە لێشاو فراوانی لە هەر شوێنێکدا ئەتانەوێ ئارەزوو ئەکەن ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ وە نزیکی ئەم درەختە مەکەونەوەو لێی نەخۆن تا بەهۆی ئەو خواردنەوە بگەڕێن لە ستەمکاران‌و بچنە ڕیزی ئەوانەوە، واتە بەهیچ کلۆج نابێ بخۆن، ئیتر ئەو قەدەغە کراوە گەنم بووبێ، یا ترێ، یا هەنجیر، یا هەرچی.

هەموو خۆراك‌و میوەی بەهەشتیان بۆ ڕەوا درا بێجگە لە تەنیا خۆراکێ کە قەدەغە کرا لێیان، کە ئەو قەدەغە کردنەش پێویستە بۆ مەردوم لە جیهاندا، چونکە بە بێ ئەوە مەیل‌و خواهیش دەرناکەوێ، وە ئادەمی کە خاوەنی بڕیارو خواهیشە جیا ناکرێتەوە لە گیان لەبەرانی تر کە ئەدرێنە بەر بەبێ ئەوەی خاوەنی ڕاو بڕیارو خواهیشی خۆیان بن، وە بە بێئەوە ئادەمی تاقی ناکرێتەوە: ئایا خۆ گرەو ئەتوانێ هەڵسێ بە پەیمانەکانی‌و هەر سپاردەیەك کە درا بەملیداو خرایە ئەستۆی یان نە ؟ کەواتە لەڕووی ڕاستیدا هەر لەوێداو تەنها بەوە ئادەمی جیا ئەبێتەوە لە ئاژەڵ‌و گیان لەبەرانی تر، وە ئەوانەی کە ڕائەبوێرن‌و ژیان ئەبەنەسەر بەبێ ئەوەی خاوەنی خواهیش‌و بڕیاری خۆیان بن، بەڵکو بێدەسەڵات‌و داماو‌و دەستەپاچەن لەبەردەم ئارەزووی نەفسی خۆیاندا، ئەوانە هەرچەند لە شێوەی ئادەمیدان، بەڵام لەڕووی ڕاستیدا ئادەمی نین‌و لەڕیزی گیان لەبەرانی ترن، جا ڕەنگە ئەو قەدەغەیە کە کرا لەو بەهەشتەدا دەست نیشان‌و ئاماژە بێت بۆ ئەم قەدەغەیەی کە پێویستە لە ژیانی ئەم زەوی‌و جیهانەدا،

فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾

**﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا﴾ ئینجا شەیتان هەڵی خلسکاندن لەو بەهەشتەی کە نیشتەجێ بوون تیایدا، واتە خستییە دڵیانەوە کە خواردنی ئەو خۆراکە ئەبێتە هۆی مانەوەیان لەو بەهەشتەدا بە ئێجگاری‌و بێبڕانەوە، بەهۆی ئەوەوە لەبەرچاویان شیرینی کرد تا خواردیان، ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ بەهۆی ئەوە دەری کردن لەو شوێنە خۆش‌و گرنگەی تیایا بوون یا لەو ڕێزو نازو خۆشییەی کە تیایا بوون، ئینجا لەوێدا تاقیکردنەوە کە تەواو بوو بەمەی (ئادەم)(علیه السلام) بەڵێن‌و پەیمانەکەی لە بیرچوو، لەبەرئەوە بڕیاری خوایش دەربارەیان دەرچوو بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟﴾ وتمان پێیان: دەرچن لە بەهەشت‌و بچنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئەوانەی کە ئەم فەرموودەیان ئاڕاستە کرا یا هەر ئادەم‌و حەووایە، بەڵام بەکۆی دانا بە پێی ڕۆڵەو نەوەو وەچەیان کە ئەمان کان‌و بنەڕەتن بۆیان، کەواتە وەك هەموو ئەوان وان‌و جێگرن بۆیان، یا مەبەست لێرەدا شەیتانیشە وەك لە (ئیبن‌و عەباس)و زۆربەی پێشەوایانەوە هاتووە، وە لەسەر هەرکام ئەوا لێرەدا هەواڵیان پێئەدات بە هێ،دێ لە چۆنێتی ژیان‌و ماوەی ژیانیان لەپاش دەرچوون‌و هاتنە خوارەوەیان ئەفەرموێ: ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ هێندێکیان دوژمن ئەبێ بۆ هێندێ ترتان لەسەر باری یەکەم ئەوەتا ئەو هەموو دوژمنایەتی‌و کوشتن‌و برینە ڕوویدا لەناو ڕۆڵەو نەوەکانی ئادەم‌و حەووادا بە درێژیی تەمەنی ئادەمی، وە لەسەر باری دووەم هەر ئاشکرایە بەدوژمنایەتی شەیتان بۆ ئەم تیرەو ئەوجەنگ‌وئاژاوەوبەربەرەکانێ دوایی نەهاتووەلە نێوانیاندا ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ وە بۆتان هەیە شوێنی نیشتەجێیی، یا نیشتەجێ کردن لەزەویدا، وە ژیان‌و ڕابواردن تا ماوەیە کە ماوەو تەمەنی ئەم ژیان‌و جیهانەیە، ئینجا ئادەم لە پێ‌هەڵکەوتن‌و هەڵخلیسکانەکەی ڕاست بووەوە بەمەی میهرەبانی خوا فریای کەوت‌و وتەو وشەی گەڕانەوە بۆلای خواو داوای لێبوردنی خستە دڵییەوەو ئەویش بە پەرۆش‌و خۆشییەوە چوو بە پیری ئەو وشەو وتانەوەو وەری گرتن‌و بەکاری هێنان‌و خوایش گەڕانەوەکەی لێ وەرگرت‌و میهرەبانی لەگەڵ کرد،**

فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا
يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٨﴾

---

وەكـو ئەفـەرموێ: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ﴾ ئینجا ئـادەم بـە خۆشـیو پەرۆشـەوە چـوو بەپیری چەند وتەو وشەیەکەوە لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆی هاتن، بەدڵ گەڕایەوە بۆلای خوای خۆیو ئەوانە وت ﴿فَتَابَ عَلَيۡهِۚ﴾ بەهۆی ئەوە خوا تۆبەو گەڕانەوەکەی لیٚ وەرگرت ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چونکە بەڕاستی هەرخوا زۆروەرگری تۆبەوگەڕانەوەی میهرەبانوبەزەیی دارە.

باسی تۆبەو گەڕانەوەی حەوواو تۆبە لیٚ وەرگرتنی ئەوی نەکرد، چونکە لە هەموو شتێکا ئەم شوێن کەوتووو تابیعی ئادەمە، ئادەم چی کردبیٚو وتبیٚ ئەمیش کردیو وتی، کەواتە دیارە کە خوا لەو بورد لەمیش بوردووە، ئەو وتەو وشەیانەی کە ئادەمو وەری گرتن زۆربەو ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە ئەمانەن کەلە سورەتی ﴿الأعراف﴾دا گێڕایەوە لێیانەوە ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەی خوای ئێمە، ئێمە ستەممان کرد لە خۆمان، وە ئەگەر نەبووریو میهرەبانیمان لەگەڵدا نەکەی بیٚگومان ئێمە لەزیان کەرانو بەش بڕاوان ئەبین، ئینجا دواترین فەرمانو فەرموودەی خوا لە بارەی سپاردەی جێنشینی ئادەمو نەوەکانی لەم زەوییەدا، وە لەبارەی هەڵسانیان بە کارو باری ئەو سپاردەیەو پاداشتیٚ کە دەستکەوتیان ئەبیٚ لەسەری، یا هەڵنەسانیانو تۆڵەو سزایەك کە دووچاریان ئەبیٚ بەهۆی ئەو هەڵنەسانەوە، ئەمانە هەموو لەم فەرموودەیەدا دەرئەکەوێت: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ﴾ وتمان بچنە خوارەوە لە بەهەشت هەموو پێکەوە بۆ سەر زەوی ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ ئەو حەلە لەهەرکەس شوێنی ڕێنموونیەکەی من کەوت، واتە ئەوانەی کە فەرمانیان پیا دراوەو بەری فەرمانی من ئەکەون ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەوانە بە هۆی ئەو شوێن کەوتنەوە هیچ جۆرە مەترسیەك نابیٚ لەسەریان لەوەی دووچاری ناخۆشیەك بن ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ وە دڵ غەمگین غەمبار نابن لەدەست نەکەوتنی هیچ ویستو خواستێکیان، واتە ئەچنە بەهەشت،

# وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾

**﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ وە ئەوانـەی کەلـە جیهانـدا بڕوایـان نـەهێنا بۆبـە ئـاینو ڕێنموونی من، وە ئایەتـەکانی ئێمـەیان بەدرۆ دانابـێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەوانە هـاوڕێو هاوسەری ئاگر ئەبن لـەدوا ڕۆژدا ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لـەو ئاگرەدا ئەمێنێتـەوە بـەبێ دوا هاتنو بڕانەوە، خوا پەنامان بدات لەو ئاگرە.**

**ئامۆژگاری بەو جۆرە هەر لە یەکەم جارەوە ئادەم ئاشنا کرا، وە هـەروەها لـەپاش خـۆی نەوەکانی ئاشنا کران بەو دوژمنایەتیو بەربەرەکانیەی کە پەیدا بوو، وە پەیدا ئەبێ لەبەینی هێزی شـەڕو هێزی خێردا، وە ئاشـناو زانـا کـران کـە هەرکـەس بێـەوێ سـەرکەوێو زاڵببـێ بەسەر هێزی شەڕدا چۆن سـەرئەکەوێو زاڵئەبێ، وە هەرکـەس زیـانو ژێـر کـەوتن بـۆ خـۆی ڕەوا ببینـێ چۆن ئەشکێو زیان بارو ڕەنجەڕۆ ئـەبێ، ئینجا با بگەڕێینـەوە بـۆ سـەرەتای ئـەم باسو داستانە بۆ هێنانی پرسیارێ کە بەجێیەو دێتە ڕێی مەردومو پێویستە وەڵام دانـەوە:**

**پرسیار: هەر لەم یەکەم جارەوە خوا هەواڵیدا بە فریشتەکان کە جێنشینێ لەزەویـدا دائـەنێ... کەواتـە ئـادەمی جێنـشینەو هـەر لـە یەکـەم جـارەوە بـۆ ئـەم زەوییـە دروسـتکراوە، کەواتە لەبـەر چـی لـە ڕێـوە نیشتەجێ نـەکرا لـە شوێنی نیشتەجێیەکەی خۆیداو لەبەرچـی برایە شوێنێکی ترو ئەو خۆراکەی لێ قەدەغەکراو بەو جۆرە تاقیکرایەوە؟ ئایا هەر لە یەکـەم جارەوە بۆ لەزەویدا دانەنرا بەڵکو لەشوێنی ترا دانـراو ئینجا لـەوێ دەرکراو فـەرمانی پێدرا بە هاتنە خوارەوەی لەوێوە بۆ ئەم زەوییە؟**

**ئەوەی کە بچێتە دڵەوە لەوڵامی ئەم پرسیارەدا ـ وە بێگومان زانینی تـەواوو ڕاستـەقینە هەر لای خوایەـ ئەمەیە ئەو تاقیکردنـەوەو پاڵفـەتـە کردنـە پـەروەردەو ئامادەکردنێك بوو بۆ ئەو جێنشینییە، وە بێدار کردنەوە بوو بۆ ئەو هێزو وزەیانـەی کە تیایـدا دروسـتکرا بـوون، فێرکردنو ڕام کردن بوو بۆی لەسـەر دووچـار بـوونی هەوڵـەو لادان لەڕێگـەی ڕاسـتو، ئینجـا چەشـتنی داخو مـەراقی پەشـیمانی لـەو هەڵـەو لادانـە، وە هـەروەها هەسـتکردن بـە دوژمـنو ناسینی، وە لەپاش ئەوانەگەڕانەوەو پەنا هێنان بە خوا.**

خوای میهرەبان ویستی ئەم دروستکراوەی بێتە خوارەوە بۆ جێگاو نیشتەجێی جێنشینیەکەی، بەم تاقیکردنەوەو پاڵفتە کردنەوە تا ئەوە ببێ بە توێشووی ڕێگەی ژیانی، وە ببێ بە چەکی دەستی لەو ئاژاوەو بەربەرەکانێ هەمیشەییە کە دێتە ڕێی، وە ئەو بەسەرهاتە ببێ بە پەندو ئامۆژگاریو بێدار کردنەوە لە هەر هەڵەو فریو خواردنێك کەلە داهاتوودا ڕوویدات بۆ خۆیو هەموو نەوەو وەچەکانی، ئینجا چەند پرسیارێ تریش هەیە. ئایا ئەم داستانو بەسەرهاتە لەکێ بوو؟ وە ئەو بەهەشتەی کە ئادەمو حەووای تیا بوو، ئەو ماوەیە کامەیە؟ وە ئەو فریشتانە کێبوون؟ وە ئیبلیس کێ بوو؟ خوا چۆن قسەی لەگەڵ کردن؟ وە ئەوان چۆن وەڵامیاندایەوە؟ وە حەووا کەی دروستکرا وە چۆن دروستکرا. وە هەروەها....

ئەمانەو وێنەیان لەو غەیبو نادیاریانەن کە هەر خوا خۆی ئەیانزانێ، وە خوای لێزانو کار دروست زانیویەتی کە هیچ سوودو بەرژەوەندیە لەزانینی ئەمانەدا نییە بۆ ئادەمی، لەبەرئەوە ئەو زانینو ناسینەی پێنەدوان لە ڕێگەی باوی خۆیانەوە، وە کاروباری جێنشینیەکان هیچ نەبەستراوە بە زانینو ناسینی ئەم جۆرە شتانەوە، وە زانینی ئەم جۆرە شتانە بۆ ئێمە تەنها ئەبێ لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە بێت (ﷺ)، وە لەم ڕێگەیشەوە شتێکی تەواوو قەتعیان پێنەگەیشتووە کە بەبێ مەترسیو بێگومان باوەڕمان پێی ببێو دانی پیا بنێین وە هەر ڕیوایەتێ لەم بارەیانەوە هاتووە نەگەیشتوونەتە ڕادەی حەدیسی (صحیح)، کەواتە دەم گرتنەوە لەمانە زۆر ڕێكو ڕاستو ڕەوایە، بەڵێ لەبارەی ئەو بەهەشتەوە ڕای زۆربەو بەناو بانگ لەسەر ئەوەیە کە مەبەست بەهەشتی ڕاستەقینەیە کە ئەبێ بە جێگەی پاداشت دانەوە لە ڕۆژی دواییدا، وەك وەرئەگیرێ لەدیمەنی چەند حەدیسو ڕیوایەتێکەوە، یەکێ لەوانە حەدیسی وتوێژەکەی ئادەمو موسایە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ کە (بوخاری)و (موسلیم)و (ئەبو داود)و (تیرمزی)و (نەسائی) ڕیوایەتیانکردووە، وە بێگومان لەو حەدیسەوە وا دەرئەکەوێ کە مەبەست بەهەشتی ڕاستەقینەی بەناو بانگە، وە بێجگە لەوەش خوا فەرمانیدا بە ئادەم کە نیشتەجێ ببێ لە بەهەشتدا[1] دەی بێگومان هەرکات بە ڕووتی

---

[1] نیتر بەبێ ئەوەی ناونیشانێکی بۆ هەڵداو بڕێ بەسەر شتێکی تایبەتیدا.

ناوی بەهەشت برا، دڵ هەر بۆ بەهەشتی ڕاستەقینە ئەڕوا، بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز ئێمە ناتوانین ئەو یەهەشتە ببڕین بەسەر شتێکی تردا.

(موعتەزیلە)و (ئەبو موسلیمی وەصفەهانی)و چەند کەسی تر لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەو بەهەشتە بەهەشتێ ترە کە خوا دروستی کرد بۆ تاقی کۆدنەوەی ئادەم، وە ئەوەش باغێکی خۆش بوو لە بەینی فارس‌و کرماندا، یا لە وڵاتی عەدەندا، یا لە فەلەستیندا، وە خاوەنەکانی ئەم ڕایە چەند بەڵگەیەکی ژیریی ئەهێننەوە لەسەر ڕاکەیان، بەڵام بەرپەرچی هەموویان دراوەتەوە، وە هیچ پێویست نییە بە درێژەدان بەو باسەو هەرکەسێ پێی خۆشە با تەماشای کتێبە درێژەکانی تەفسیرو کەلام بکات، وە هەرکام مەبەست بێت هیچ زیادە نرخ‌و بایەخێك نادات بە مەبەست لەهێنانی داستان‌و بەسەرهاتەکە، کەواتە پێویست نییە بەو هەموو لێکۆڵینەوەو بەربەرەکانێ‌و دووبەرەکیەی کە کەوتە ناو موسڵمانان لەو جۆرە مەسەلەو باسانەدا، وە بەڕاستی ڕێگەی ڕاست‌و بێگرێ ئەوەیە کە شتە غەیبی‌و نادیاریەکان لێ گەڕێین‌و لە خۆوە قسەیان لێ نەکەین، وەلە دیمەن‌و ڕواڵەتی قورئان‌و حەدیسی (صحیح) لا نەدەن بەبێ ناچاری یان بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز، هەرکات بەو جۆرە ڕەفتاریانکرد دووچاری گێرەو کێشەی بێ سوود نابین‌و کاتی بەنرخی خۆمان زایە ناکەین بە فیڕۆ بڕوا، ئینجا با جارێ تی بگەڕێینەوەو بیر بکەینەوە لەو هەموو شتە گرنگانەی کەلەم داستانەوە وەرئەگیرێن.

ئاشکرا ترین شتێ کە ئەم بەسەرهات‌و داستانە نیشتمان ئەدات گەورەترین نرخ‌و ئەو پلەو پایە بەرزەیە کە خوا دای بەم ئادەمییە، ئەوەتا هەر لەیەکەم جارەوە خوای گەورە فریشتەکانی ئاگادار کرد کە ئادەم دروست ئەکرێت بۆ ئەمەی ببێ بە جێنشین لەزەویدا، وە لەپاش دروستکردنی فەرمانیدا بە فریشتەکان سوجدەی ڕێزو بەگەورە گرتنی بۆببەن، وە شەیتان نەفرینی لێکرا کە گوێ ڕایەڵ نەبوو وەك فریشتەکان.

ئیسلام ئا بەو جۆرە ئادەمیمان نیشان ئەدات‌و تێمان ئەگەیەنێ لێی، کەواتە ئادەمی گەورەو ئاغای ئەم زەوی‌و جیهانەیە، وە هەرچی دروستکراوە لەم زەوییەدا هینی ئادەمییەو لەبەر ئادەمی دروستکراوە، وەلە ئایەتی پێش ئەم باسەدا بەتایبەتی ئەوەی فەرموو، کەواتە ئادەمی بەنرخ ترو بەڕێزترو بەرزترە لە هەموو شتێکی (ماددی)و هەرچی شتێ کەبە نرخە

لە جیهانی (مادده)دا، وە بەهیچ ڕەنگ ڕەوا نییە ئادەمی بکرێ بە بەندەی ئەڵقە لەگوێو ژێر دەستو سەرچۆڕ بکرێ لە پێناوی (مادده)و ئەو شتانەو ئەو دەستکەوتانەی کە هەر لەجیهانی (مادده)دا بەنرخن. ڕەوا نییەو دروست نییە دەست درێژی کردن بۆ سەر هیچ ماف و نرخێکی ئادەمیو ئادەمێتی لەبەر خاتری دەستکەوتو بەرهەمێکی (ماددی)، وە هەروەها بە ڕوونی دەرئەکەوێ کە دەورو کاری ئادەمی لەم زەوییەدا یەکەمو سەردەستەیە، کەواتە ئادەمی ئەبێ کاربە دەست بێتو سەرکردایەتی ئەبێ بۆ ئەم بێتو جڵەوی ژیانو جیهان بە دەست ئەم بێتو ئەم دەست بخاتە کاروباریانو بارو شێوەیان بگۆڕێو ئاڵو گۆڕیان پێبکاتو بیانبات بەرەو هەر بارو ڕوویەك کە بەرژەوەندی تیا بێت، نەك وەك (ماددی) یەکان کە ئەڵێن: ئابووریو هۆی بەرهەم هێنانو دابەشکردنی سەرۆکو سەردەستەیەو ئادەمی ژێر دەستەو ملکەچە بۆیانو هەموو کاروباری ئادەمی دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوانو ئادەمی دەستەپاچەو پەك کەوتووە لەبەردەمیاندا!! ئەم ئادەمییە بەهۆی جێنشینیەکەی لەزەویدا کە قورئان بۆی بڕیارداوە ئەبێ ئیش کەرێکی گرنگ بێت لە ڕژێمی ئەم بوونەوەرەدا، وە ئەبێ بوونی تێبینی کرابێ لەم ڕژێمەدا، چونکە ئەو ژیانو جێنیشنیەی کە خوا بۆی داناو بڕیاریدا لەم زەوییەدا بەستراوە بەم ڕژێمی بوونەوەرەوە، بەستراوە بە خرۆو مانگو ئەستێرەکانیەوە، بەستراوە بە باو بارانو هەموو بەشو پارچەو شتەکانی تریەوە، وە بەبێ ئەمانە هەموو ئەو ژیانو جێنشینیە ناگونجێ بەڕوە نابرێ، کەواتە هەرچی وا لەم زەویو جیهانەداو هەرچی والەم بوونەوەرەدا هەر هەمووی ژێر بارو خزمەت کارە بۆ ئادەمیو لەبەر خاتری ئەم دروستکراوە!! جا تۆو خوا ئەم ڕادەو پلە بەرزە لەکوێ کە قورئان بۆی داناوە لەگەڵ ئەو ڕادە پەستو بێنرخەی کە (ماددی)یەکان بۆی ڕەوا ئەبینن و بەهیچ ڕەنگ ڕەوا نادەن بەرز بوونەوەو تێپەڕ کردنی لێی!! وە بێگومان ئەم دوو تێڕوانینو بیروباوەڕە زۆر جیاوازو دوورن لە یەکترەوە، وە بەهیچ کلۆجێ کۆنابنەوەو هەرکام ڕژێمێکی تایبەتی دائەنێن بۆ ئادەمی، بەلای (ماددی)یەکانەوە ئادەمی هەر بریتییە لە لەشەکەیو بەهیچ ڕەنگ بڕوایان نییە بەڕۆحو هیچ نرخێك دانانێن بۆ ئەو شتانەی کە پێیان ئەوترێ خۆراكو پێبژێوی ڕۆح، بەڵکو هەموو هەوڵو تەقەللایان هەر بۆ پێویستیانو پێبژێوی لەشە، بەڵام بەلای ئیسلامەوە ئادەمی پێکهاتووە لە ڕۆحو لە لەش، وە پێویستە پارێزگاری مافو

پێویستی هەردوو، وە بەرژەوەندی هیچ کام ژێر پێ نەکرێ لەپێناوی ئەوی تردا، بەڵێ هەرچەند ڕۆح شتێکی سەرەکی و بنەڕەتییەو لەڕاستیدا هەر ئەو شتە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو لاش مەبەست و پێویستە، وە ئەبێ بەشی هەردولا ڕاگیر بکرێن لە سنووری ڕاست و ڕەوای خۆیانداو ماوە نەدرێ بە لەش تا زاڵ ببێ و سەرکێشی بکات بەسەر ڕۆحدا، چونکە کاروباری جێنشینیەکەی بەو جۆرە نەبێ بەڕێك و ڕاستی ناڕواو بەڕێوە نابرێ، بەکورتی نەوەك ئەوانە کەهەر خەریکن بەکاروباری ڕۆحەوەو هیچ نرخ دانانێن بۆ ماددەو کاروباری لەش، وە نەوەك (ماددی)یەکانیش کە لاقرتیان دێت بە ڕۆح و هیچ نرخێکی بۆ دانێن و هەموو مەبەستی ئادەمی کورت هەڵئەهێنن لەبەرهەمو شت و مەك و پێویستی سکدا وەك گیان لەبەرەکانی تر.

لە بیرو باوەڕی ئیسلامدا ئادەمی ناچارو بێ دەسەڵات نییە بەسەر کردەوەی خۆیدا، بەڵکو خۆوەسەری و سەربەخۆییەکی پێدراوەو خاوەنی خواهیشەو مەیلی خۆیەتی و ئەتوانێ کام بار هەڵبژێرێ و کام ڕێگا بداتە بەر، وە لەسەر ئەوە فەرمان و تەکلیفاتی شەرعی ڕووی تێ ئەکات لەجیهانداو ئەگات بە تۆڵەو پاداشتی کردەوەکانی لە ڕۆژی دواییدا... وە ئەتوانێ پارێزگاری ئەو سپاردەو پەیمانە بکات لە خواوە بۆی هاتووە، تا بەهۆی ئەوەوە بەرزبێتەوە بۆ ڕادەو پلەی ملکەچ و ژێر بار نەبێ بۆ ئارەزووی نەفس و شەیتانی و زاڵ ببێ بەسەر هەموو پیلان و فرو فێڵێکداو نەترازێ لەڕێگەی ڕاست، وە لە هەمان کاتدا ئەشتوانێ لە ڕادەو پلەی بەرزی خۆی بێتە خوارەوە، وە گومڕایی سەرخات بەسەر ڕێنوماییدا، وە دەست بەرداری ئەو سپاردەو پەیمانە ببێت کە ڕادەو پلەی بەرز ئەکاتەوە، وە بێگومان ئەم دەسەڵات و توانین و خود سەرییە بەهرەو ڕێزێکی تایبەتییە بۆ ئادەمی بێجگە لەڕێزو بەهرەکانی تر کە باسکران لە تەفسیری ئایەتەکانی ڕابردوودا، هەرچۆنێ لە هەواڵ دان بەم داستان و بەسەرهاتەدا تەمێ و ئامۆژگاریەکی هەمیشەیی هەیە بەوەی سروشتی ئاژاوەو بەربەرەکانیەکە نیشان ئەدات، کە هەر لە یەکەم جارەوەو هەتا هەتایە ئەو ئاژاوەو بەربەرەکانییە بەرپا بوو لە بەینی تەمێ و ئامۆژگاری خواو فێڵ و تەڵەکەو هەڵخەڵەتاندن و گومڕا کردن لەلایەن شەیتانەوە، لەبەین بڕواو بێبڕواییدا، لەبەین هەق و بەتاڵدا، لەبەینی ڕێنومایی و گومڕاییدا، وە ئادەمی جێگەو مەیدانی ئەو جەنگ و ئاژاوەو بەربەرەکانییەیە، وە

هەر ئادەمی ئەو جەنگە ئەباتەوەو سەرئەکەوێ تیایدا، یا تێك ئەشکێ و زیان بار ئەبێ، وە بێ‌گومان لەو هەواڵدانەدا بێدارکردنەوەیەکی هەمیشەیی هەیە بەمەی کە ئادەمی سەربازی ئەو مەیدانەیەو هەر ئەویش یان سەرئەکەوێ و یان تێك ئەشکێ، کەواتە با بێ‌ئاگا نەبین لەم تەمێ و بێدار کردنەوەو وریا بین، بەڵکو بەیارمەتی خوا سەرکەوین و تێك نەشکێین، لەپاش ئەوانەی کە باسکران و وەرگیران لەم دستانەوە، ئینجا باسی بەندێکی گرنگی بیروباوەڕی ئیسلام ئەکەین کە ئەم داستانە نیشانی ئەدات لەبارەی تاوان و گەڕانەوە لەتاوان... ئەو بەندەش ئەمەیە کە تاوانی ئادەمی شتێکی شەخصییەو بەهەڵبژاردن و دەسەڵاتی تاوان کار پەیدا ئەبێت، نەك شتێکە پێویست کرابێ لەسەری و ئەبێ بەناچاری هەر بیکات ـ وەك بیروباوەڕی کەنیسە ئەیڵێت ـ، وە هەروەها ڕزگار بوون لە تۆڵەی تاوان شتێکی شەخصییەو بەئارەزووو بەدەستی تاوانبارەکەیە، بە تۆبەو گەڕانەوەی خۆی بۆلای خوا، نەك بەو جۆرە کە کەنیسە ئەڵێ. گوناهەکەی ئادەم کەوتە گەردنی هەموو ئادەمی و هەموو بەشدار بوون تیایدا، بە هۆی ئەوەوە عیسا ـ کەبە کوڕی خوای دائەنێن ـ خۆی کرد بەفیداکارو قوربانی بۆ ڕزگار کردنی ئادەمیەکان لە گوناهەکەی ئادەمی باوکیان! نەخێر ئەوە ڕاست نییە، بەڵکو گوناهی ئادەم هەر لە گەردنی خۆی بوو، وە ڕزگار بوونیشی بە تۆبەو گەڕانەوە خۆی بەدی هات، وە هەروەها گوناهی هەر ئادەمییەو ڕزگاربوونی لێی... بێ‌گومان بۆچوون و تێگەیشتن و بیروباوەڕێکی ڕوون و ئاسان و ڕەوانە، باری هەموو کەس ئەخاتە سەر شانی خۆی، وەهانی هەموو کەس ئەدات بۆ هەوڵ و تێکۆشان و چاوەڕوانی و ئومێد، نەك پەك کەوتوو ناچارو نائومێد!

ئەمانەی کە باسمانکرد بەشێ بوون لەو بەندو بیروباوەڕە گرنگانەی کە ئەم بەسەرهات و داستانی (ئادەم)ە (علیه السلام) گەیاندنی و نیشانی دان، وە ئەم بەش و ئەندازەیە بەسە بۆمان کەبیکەین بە سەرمەشق بۆ ئەمەی تێبگەین گرنگی و سوود بەخشی داستان و سەرگوزەشتەکانی قورئان و لەدامەزراندن و داڕشتنی بەندو یاساو بیروباوەڕەکانی ئیسلام لەدڵ و دەروونەدا، ئەو بەندو یاساو بیروباوەڕەی کە هەر ئەوان شیاو شایان و شایستەن بەم ئادەمییەوە کە لەلایەن خواوە کراوە بە جێنشین، وە پەیمانی جێنشینیەکەی لەسەر ئەوەیەکە ڕێنموونی هەر لە خوا وەرگرێ و بەسترابێ بە بەرنامەی ئەوەوە لە ژیاندا، لەو چەند

ئایەتەی ڕابردوودا باسی چەند بەهرەی گەورە گەورەی کرد کە خوا هەر لەیەکەم جارەوە بەخشنی بەم تیرەی ئادەمییە، وە باسی ئەو فەرمان و پەیمانەی کرد کە دای بەسەر ئادەم و هەموو نەوە و وەچەکانیدا تا ڕۆژی دوایی، وە فەرمان و پەیمانەی کرد بە یاسا و بەرنامە بۆ جێنشینیەکان لەزەویدا، پاش ئەوانە ئینجا گەردش ئەکات لەگەڵ تائیفە و نەوەکانی ئیسرائیلدا، بەم جۆرە چاکە و بەهرە تایبەتیەکانی خۆی بەسەریانەوە باس ئەکات و ئەیداتەوە بە ناچاویاندا، ئینجا باسی فەرمان و پەیمانێ ئەکات کەدای بەسریانداو لێی سەندنەوە، تا بەپێی ئەوە هەڵسن بە کاروباری جێنشینیەکەیان، لە پاشان ئەوان یاخی بوون لە فەرمانی خواو پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە، بە هۆی ئەوەوە خوایش لە جێنشینی خستن و ژێر دەستە و زەبوون و ڕیسوای کردن، وە بڕوادارانی ئەم ئوممەتە تێئەگەیەنێ و ئامۆژگاریان ئەکات لە پیلان و دوژمنایەتیەکەیان، هەرچۆنێ ئەیانترسێنێ و ئاگادریان ئەکات بەهۆی لادان و هەڵخلیسکان و بەش براوی و پەستی و لێکەوتنیان لە بەهرەی جێنشینی، کەواتە ئەم باسە زۆر پەیوەستە لەگەڵ باسی ڕابردوودا و زۆر ڕێک و بەجێیە کە ئەم ئەهێنێ بەدوای ئەودا.

قورئان لێرەدا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند هەڵوێست و چەشمەندزیەکیان بە کورتی یا بەدرێژی، وە هەرچەند زۆر لەم هەڵوێست و کردەوانەیان لە سورەتە مەککەییەکانیشدا باسکراون، بەڵام مەبەست لەباسەکان جیاوازە، لە سورەتەمەککەییەکانیشدا باس ئەکرێن ـ لەگەڵ بەسەرهات و داستانی ترا- بۆ دڵنەوایی و دامەزراندن و دڵ بەهێز کردنی ئەو تاقمە کەمەی مەککە کە بێدەسەڵات بوون و دامابوون بەدەست ئەو هەموو دوژمن بەهێزو سەرکێشانەوە، بەگێڕانەوەی ئەو داستانانە ئەو تاقمە کەمە دڵخۆش ئەکران کە پاشە ڕۆژی سەرکەوتن و بەختەوەری هەر بۆ ئەمان ئەبێت بە وێنەی بڕوادارە کەم و بێدەسەڵاتەکانی گەلەکانی ڕابردوو، وە ئاگادار ئەکران بەسەختی و درێژیی ڕێگاکەیان، وەبەمەی توێشووی ئەو ڕێگایە خۆگری و دامەزراوی و کۆڵ نەدان و وەستانە بەدیاری کارو بڕیاری خواو گوێڕایەڵی بۆ خوا، بەڵام مەبەست لە گێڕانەوەیان لێرەدا ئاگادار کردنی بڕوادارانە بە نیازو کردەوەی خراپی ئەو جوولەکانە و دوژمنایەتیان بۆیان، وە تەمێی بڕوادارەکان و ترساندنیان لەوەی لادەن لە ڕێگەی خواو بکەونە ئەو چاڵانەی کە جوولەکە تێیان کەوت لە پێش چەرخی

ئەماندا، جالەبەر جیاوازی مەبەستەکان شێوەی ڕاگەیاندن و نیشان دانەکەیان جیاوازە، هەرچەند لە هەردوولا هەر باسی لاری و نالەباری و لادانی ئیسرائیلیەکانە.

داستان و سەرگوزەشتەی ئیسرائیلیەکان لە هەموو داستان و سەرگوزەشتەکانی تر زۆرتر هاتووە لە قورئاندا، وە بە گرنگ تر گیراوە، وە ئەوەش لەبەر میهرەبانی و کار دروستی خوایە لە چارەسەرکردنی کاروباری ئەم ئوممەتەدا، وە پەروەردە کردن و پێگەیاندن و ئامادەکرنی بۆ هەڵسانی بە کارو فەرمانی ئەو جێنشینیە هەرە گەورەیە کە خرایە سەرشانی، وەئەو سپاردە قورس و گرنگەی کە خرایە ئەستۆی، بەو داستانی ئەوانە ئەم ئوممەتەی تەمێ کردو لە هەمان کاتدا ئاگاداری کردن بەو هەموو هەڵوێستە ناڕەواو ئەو هەموو پیلان و دوژمنایەتییە بەتینەی کە جوولەکە هەڵسان پێیان هەر لە یەکەم جاری هاتنی ئیسلام بۆ مەدینە، وە ئەو ئاگرەی کەلەو کاتەوە هەڵیان گیرسان بەدژی ئیسلام و موسڵمانان نەیان کوژاندەوەو هەرگیز نایکوژێننەوە هەتا بمێنن، لەگەڵ ئەوەدا لەبەر نالەباری خۆیان لە پێش ئیسلام و لەپاش ئیسلامدا لە هەموو لایەکەوە لە لایەن گەلانی جیهانەوە هەر سەرکوتکراوو دەرکراوو سزادارو بوون بەسەخت ترین شێوە، وە هەرگیز جێگای بەزەیی نەبوون لەلایەن هیچ گەل و ئوممەتێکەوە بێجگە لە ئیسلام کەبە بەزەییەوە کۆشی بۆ کردوونەتەوەو جێگەی کردونەتەوەو گرتوونییە خۆی و هەموو مافێکی خۆیانی پێداون، ئەو ئیسلامەی کە دژی ڕەگەزایەتییە بە هەموو جۆرو شێوەیە، وە بە هیچ ڕەنگ ڕێگا نادا بۆ چەوسپاندنەوە بە تایبەتی چەوساندنەوەیە کەلەبەر جیاوازی ئایین بێت، وە هەمیشە قاپسەکانی کراوەو لەسەر پشتن بۆ هەرکەسێ کە بەڕاستی ئاشتی خوازبێت و ئازاری ئیسلام نەدات و پیلان نەگێڕێ بە موسڵمانان. بەڕاستی ئەبوایە جوولەکە یەکەم کەس بوایە لە مەدینەدا بۆ بڕوا هێنان بە ئیسلام، چونکە قورئان بڕوای بە تەورات بووو ڕاستی تەوراتی دەرئەخست، وە ئەو جوولەکانە لە پێش هاتنی ئیسلامدا چاوەڕوان بوون بۆ هاتنی، بەپێی ئەو هەموو ناونیشان و موژدەی کە تەورات هێنابووی ئیسلام و پێغەمبەری هەمووان (ﷺ) وە ئەوەندە دڵنیا بوون بە هانتیان کەلێ جار هەڕەشەیان ئەکرد لە عەرەبە بت پەرستەکان و ئەیان وت: با ئەو پێغەمبەرە بێت جا ئێمە دوای ئەکەوین و بەهۆی ئەوەوە زاڵ ئەبین بەسەرتاندا، کەچی کاتێ هات باوەڕیان پێ‌نەهێناو بوون بە پیس ترین دوژمنی!

يَٰبَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ

---

ئینجا با گویْ شل کەین لە قورئان تا ئەو هەموو شتە گرنگانەمان بۆ ڕوون بکاتەوەو ئەو گەردشەبکات بە دەروونمانا بە ناو ئەو جوولەکە بەدرکارانەدا، ئەفەرمویْ: ﴿يَٰبَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەی نەوەو بەرەی ئیسرائیل بیربکەنەوەو باسی چاکەو بەهرەی من بکەن کەرشتم بەسەرتانا،باسی بکەن بەدان پیانان وچاولەبەری وسوپاس وهەڵسان بەماف.

ئەو کەسەی کە بە شارەزایی چاوێك بگێڕێ بە مێژووی ئەو گەلەدا سەرسام و سەرگەردان ئەبێت لەو هەموو چاکەو بەهرە گەورانەی کە خوا ڕشتی بەسەریاندا، جا لێرەدا بە کورتی سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ ئەو چاکەو بەهرەیانە پێش ئەوەی کە بەدرێژیی باسی هێندێکیان بکات لەمەو پاش، لەیەکەم جارەوە ئەوەیان بیر ئەخاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرو پاڵپێوەنەر بۆ گوێڕایەڵی و هەڵسانیان بەو بەڵێن و پەیمانەی کە خوا لێی وەرگرتوون و داوایان لێ ئەکات کە ئەفەرمویْ: ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ﴾ وە ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە داتان بە من بەجێی بێنن و بەپێی ئەوە ڕەفتاربکەن، ئەگەر ئێوە وا بکەن ﴿أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ﴾ منیش ئەو بەڵێنەی کە داومە پێتان بەجێی ئەهێنم و هەڵئەسم پێی.

ئایا مەبەست بەم فەرمان و پەیمانە ئەوەی یەکەم جار بێت کە خوا ڕایگەیاند بە ئادەم وەك لەدواترین ئایەتی باسی پێشوودا فەرمووی: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ ...هتد، وە لەوێدا ڕاڤەمان کرد؟ یا فەرمان و پەیمانێکە کە بەستراوە لەبەینی سروشتی ئادەمی و خوادا؟ یا ئەو پەیمان و فەرمانەیە کە خوا بڕیاریدا بۆ ئیبراهیم (علیه السلام) کە باپیری (ئیسرائیل)ە وەك لەمەوپاش باسی دێت؟ یا فەرمان و پەیمانێکی تیبەتییە بەم تیرەی (ئیسرائیل)ەوە، وەك ئەمیش هەردێت لەمەو پاش؟ ئەم پەیمان و فەرمانانە هەموو بوون و ناوەڕۆکی هەموویان هەر ئەوەیە کە بەندەکانی خوا دڵی خۆیان پاك و خاوێن بکەن بۆ پەروەردگاریان، وەلە هەموو بارو ڕوویەکەوە ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانەکانی وەکورتەی ئایینی خوا هەر ئەمەیە، وە هەر ئەوەیە ئەو ئایینی ئیسلامەی کە هەموو پێغەمبەرانی پێ ڕەوانەکران ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ، وە بەندو بەشێ لەو فەرمان و پەیمانانە ئەمەیە کە ئەفەرمویْ: ﴿وَإِيَّٰيَ

﴿فَٱرۡهَبُونِ﴾، وەهەر لە من بترسن لە هەرشتێ کە ئەیکەن‌و لە هەرشتێ کە وازی لێ ئەهێنن‌و نایکەن. وە بەندو بەشێ ترکە داوایان لێ ئەکات بەم فەرموودەیە ﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ﴾ وە بڕوا بێنن بەو قورئانەی کە ناردمە خوارەوە لە کاتێکدا کە ڕێکە لەگەڵ ئەو نامەی کە لەگەڵ ئێوەیەو بەڕاستی دائەنێ، ڕێکە لەگەڵی‌و بەڕاستی دائەنێ لەمەدا کە هاتووەتە خوارەوە بەو ناونیشانەو لەسەر ئەو بارو شێوەی کەلە نامەکەتاندا هاتووەو باسکراوە، وە ڕێکە لەگەڵی‌و بەڕاستی دائەنێ لەو داستان‌و ئامۆژگاری‌و بەڵێن‌و هەڕەشەو بانگکردن بۆ خواپەرستییە تاکو تەنیاو دادپەروەری لەناو مەردومداو جڵەوگیری لە تاوان‌و خراپەکاری‌و هەموو شتە ئایینیەکانی تر کە باسکراون لە تەورات‌و ئینجیل دا، تەنانەت ڕێکە لەگەڵیان‌و بەڕاستیان دائەنێ لە هەر بڕیارو یاسایەکدا کە لەواندا هاتووەو لەم دواترین ئایین‌و شەریعەتەدا سڕاونەتەوە، چونکە هیچ کام لەوانە بۆ هەمیشەیی نەهاتوون‌و بە هەمیشەیی ناو نەبراون، نەلە تەورات‌و نەلە ئینجیلدا، وە قورئانیشدان نەنێ بەوانەداو بەڕاست‌و ڕەوایان دائەنێ لەو کات‌و چەرخەدا، وە بێجگە لەوەش ئایینی خوا هەر یەك ئایینە هەر لەیەکەم جاری هاتنی تا دواترین جار، وە بۆ یەك مەبەست هاتووە کە بریتییە لە گوێڕایەڵی خواو بەسترانەوە بە فەرمان‌و بڕیاری خواو دوور کەوتنەوە لە هەموو فەرمان‌و بڕیاری تر، ئیتر ئەو فەرمان‌و بڕیاری خوا بە هەر شێوەو وێنەیە هاتبن، کەواتە ئەم ئیسلامەی کە پێغەمبەرمان (ﷺ) هێنای هەر ئەو تاقانە ئایینەی خوایە کەلە دواترین شێوەیدا هات، وە ئەم ئیسلامە درێژە پێدانە بۆ ئایین‌و پەیامی خواو ئەو فەرمان‌و پەیمانەی کە خوا لە سەرەتای ئادەمێتیەوە ناردی‌و خەڵاتی ئادەمی پێکرد، وەئەم ئیسلامە یا لەکاتی داگرتووە بەسەر ڕابردوودا، وە دەستی ئادەمی‌و ئادەمێتی دەگرێ بۆ داهاتوو، وە یەکتێتی ئەخاتە بەینی تەورات‌و ئینجیل‌و کۆیان ئەکاتەوە، وە زیاد لەوە ئەوەی کە خوا ویستی لە خێرو چاکە کە پیویست‌و شیاو بێت بۆ داهاتووی دوورو درێژی ئادەمێتی لەم ئایینە پان‌و فراوانە جیهانییەدا هات بە شێوەی هەمیشەیی تا جیهان جیهانە، وە بەو شێوەیە هەموو ئادەمی کۆ ئەکاتەوە بەبرایەتی‌و ئاشنایی‌و دۆستایەتی، کۆیان ئەکاتەوە بە جۆرێ هەموو یەك بگرن لەسەر فەرمان‌و پەیمانی خوا، وەلەسەر ئایینی خوا، وە بەش بەش نەبن بە چەند تاقم‌و کۆمەڵ‌و تیرەو بەرەیەك، بەڵکو هەموو یەك بگرن لەسەر بەندەیی خواو دەست بگرن بەو فەرمان‌و پەیمانەی خوا کە نەگۆڕاو نەشێواوە، کەواتە ئەوانە هەرچۆنێ بڕوایان هەیە بە نامەکەی خۆیان ئەبوایە یەکەم تاقم‌و یەکەم کەس بوونایە لەبڕوا هێنان بەم قورئانە،

وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلۡبِسُواْ
ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ
مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾

---

نەك چەسپانی بکەن لە بێبڕواییدا وەك تەشەر لێدان بەوە کە پێی بفەرمووێ: ﴿وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ﴾ مەبن بە یەکەم تاقمی بێبڕوا پێی، واتە یەکەم تاقم لەناو نامەداردا، چونکە ئاشکرایە بت پەرستەکان یەکەم تاقمن و لەپێش هەموو کەسەوە بێبڕوان، ئینجا هەمی تر تەشەریان لێ ئەدات و سەرزەنشتیان ئەکات و بڕوا نەهێنانەکەیان ئەخاتە بەرچاو بە کارێکی نەفامانە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾، وە بەئایەتەکانی من مەکڕن بۆ خۆتان پول و پارەو ماڵ و دەستکەوتێکی کەم، وە ئایەتەکانی من مەگۆڕنەوە بەو شتەکەمەو لەپێناوی ئەو شتە کەمەدا دەست مەنێن بە ئایەتەکانی منەوە، بەم ڕەنگە بڕوایان پێ نەهێنن.

ئەم بکڕانە زۆرتر زانا و پیاوە ئایینیەکانیان ئەگرێتەوە کەلە پەنای ئایینەدا ڕێزو سەرۆکایەتیان هەبوو، وە بەناوی ئایینەوە خزمەتی زۆر ئەکران و دەستکەوتیان ئەبوو بە دیاری بۆ بردن و بەرتیل، بۆ ئەوەی بە ئارەزووی ئەوان فتوایان بۆ دەرکەن، وە مانەوەی ئەوانە لەدەستیان بەوە ئەبوو کە بڕوایان نەهێنایەو بەرگری گەلەکەیان بکردایە لەبڕوا هێنان بە ئیسلام، چونکە ئیسلام دژی بەرگری کەرە لەو جۆرە شتانەو لە هەموو شتێکی ناڕاست و ناڕەوا، وە بێگومان ئەو دەستکەوتانە شتێکی کەم و کوڕو بێنرخن و ماوەکەیان زۆر کەمە، بەڵکو ئەگەر مەبەست ئەوەش بێ هەر کەمەکاتێ بەراوورد بکرێ لەگەڵ بڕوا بە ئایەتەکانی خواو سەرەنجام و پاداشتی ئەو بڕوایە لای خواو لە ڕۆژی دواییدا، بێگومان هەرکەسێ کڕین و ئاڵ و گۆڕی وا ناکات لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ﴾ وە هەر لەمن بترسن و خۆتان بپارێزن، بە بڕوا هێنان و شوێنکەوتنی هەق و ڕاستی و ڕوو وەرگێڕان لەو کڕین و گۆڕینەوەی کە باسکراوە.

یەکێ تر لە کردەوەی پیسی ئەو جوولەکانە ئەوەبوو کە دەستیان خستە نامەکەیان و قسەو ڕای خۆیانیان تێکەڵکردو نووسیانەوە لەگەڵ فەرموودەکەی خوادا، بەهۆی ئەوەوە

هەق‌و ناهەقیان تێکەڵ ئەکردو سەریان ئەشێواند لە مەردوم، وە هێندێ شتیان ئەشاردەوەو دەریان نەئەخست، بەم ڕەنگە ئەیان وت: شتی وامان لە تەوراتدا نەدیوە، یان هەر ئەیان سڕییەوە، یان ئەیان گۆڕی بە پێچەوانەی فەرمان‌و فەرموودەکەی خوا، ئەوشتانەش وەك سیفەت‌و ناونیشانی پێغەمبەر (ﷺ) کەلە تەوراتدا هاتبوو، وە قورئانیش هەواڵی دابەوە، وە هەروەها ئایەتی ڕەحمی زینکەرو چەند شتی تریش، ئەو کردەوە پیسەشیان بۆ ئەوەبوو کە بەرگری مەردوم بکەن لە ئیسلام، وە گومان‌و دوو دڵی‌و بێئارامی بخەنە ناو ڕیزو دڵ‌و دەروونی موسڵمانان، وە ئەو سەر تێکدان‌و سەر شێواندنە هەمیشە پیشەی جوولەکە بوو هەر بەردەوامیشن لەسەری‌و بەهەر جۆر بۆیان بکرێ ئەیانەوێ کۆمەڵ‌و ڕیزی موسڵمانان تێك بدەن، ئینجا ئەو قورئان بێئابڕوو شەرمەزاری کردن‌و ئەو کردەوە پیسەیدا لەڕوویان و بە تەشەر لێدانەوە خستییە پێش چاویان‌و جڵەوگیری لێی‌و فەرمووی: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ حەق تێکەڵی بەتاڵ مەکەن‌و حەق مەشێوێنن بە بەتاڵی خۆتان ﴿وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ﴾ وە حەق مەشارنەوە ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە زانان، وە کارو کردەوەی ناڕاست‌و ناڕەوا شایستەی زانا نییە، یالە کاتێکدا کە ئێوە ئەزانن کردەوەکەتان بەو جۆرەیەو ناڕاست‌و ناڕەوایە، وە بێگومان پیس ترین کردەوەی خراپ ئەوەیە کە بەدەستی ئەنقەست‌و بەزانینەوە بکرێت، ئینجا بانگیان ئەکات کە بێتە ڕیزی بڕواداران‌و تێکەڵی کۆمەڵیان ببن، وە واز بێنن لەو دووره پەرێزی‌و ڕەگەزپەرستییە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە بەڕێك‌و ڕاستی نوێژی موسڵمانان بەجێ بهێنن، وە ئەو زەکاتە بدەن کە ئەوان ئەیدەن ﴿وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ وە ڕکوع بەرن لەگەڵ ڕکوع بەراندا پێکەوە بە کۆمەڵ، واتە نوێژی بکەن کە ڕکوعی تێدابێت‌و بە جەماعەتیش بکرێت نەك وەك نوێژی خۆتان ـ واتە جوولەکە کە ڕکوعی تیا نییەو تەنها یەکە یەکە ئەیکەن، ئینجا سەرزەنشتیان ئەکات بەمەی کە خۆیان بانگی بت پەرستەکان ئەکەن بۆ بڕوا هێنان بە ئایینی خوا کەچی بەرگری گەل‌و کۆمەڵی خۆیان ئەکەن لەبڕوا هێنان بە ئایینی خوا ـ واتە ئیسلام کە بڕوای هەیە بە تەورات‌و بەڕاستی دائەنێ ـ وەك بەدرێژی باسمانکرد، یا بە دزیەوە فەرمانیان ئەدا بە هێندێ کەس بە موسڵمان بوون، یان بە چاکەو خێرو دەست گیرۆیی کەچی خۆیان ڕەفتاریان پێ‌نەئەکرد،

وە بۆ سەرزەنشت کردن‌و سەرسوڕهێنان لەو کردەوەیانە ئەم شێوە پرسیارەیان ئاڕاستە ئەکات: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ﴾ ئایا ئێوە فەرمان ئەدەن بە مەردوم بە چاکە ﴿وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ؟﴾ وە خۆتان لەبیر نییەو وازی لێ ئەهێنن؟ ﴿وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە نامەی خوا ئەخوێننەوە کە فەرمانتان پێ‌ئەدات بە پەیڕەوی ئایینی خوا بە ڕاستی‌و ڕێگەی ڕاستی خوای نیشان داون، ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایائێوەژیرنین‌وتێ‌ناگەن لە خراپی ئەو کردەوەتانە؟! واتە کردەوەکەتان دژو پێچەوانەی نامەی خوایەو دژو پێچەوانەی ژیرییە، کەواتە ئەوپەڕی گرتووە لە خراپی‌و ناشایستەییدا.

ئەم ئایەتە هەرچەند لە یەکەم جارەوە هاتە خوارەوە دەربارەی ئەو یەکەم تاقمە لە جوولەکە، بەڵام تایبەتی نییە بەوانەوەو بەو چەرخ‌و کاتەوە، بەڵکو بۆ هەموو کەسە ـ بە تایبەتی پیاوانی ئایینی ـ وە هەیشەییە هەتا هەتایە، بەڕاستی دەردی بێ‌دەرمان‌و کوشندە ئەوەیە کە پیاوانی ئایینی ئایینەکەیان بکەن بە پیشەسازی‌و هۆی ژیان‌و دەستکەوتی پووڵ‌و پارەو دارایی‌و سامان، جا ئەو حەلە بەدەم شتێ ئەڵێن کەلە دڵیاندا نییە، فەرمان ئەدەن بە چاکەو خۆیان نایکەن، لەخراپەو خۆیان ئەیکەن، وە فتوای ناهەق ئەدەن‌و بەدیمەن ڕێکی شەرعی ئەکەن‌و لەڕووی ڕاستیدا دژی ئایینی خوایەو زۆر دوورە لێیەوە، وە بەهۆی ئەوەوە دوور ئەکەونەوە لە خواو خۆیان نزیک ئەخەنەوە لە ستەمکاران‌و دوژمنانی خواو ئایینی خوا.

ئەو دەردە سەختە بەرهەم‌و سەرەنجامی پیسی ناگەڕێتەوە تەنیا بۆ ئەو پیاوە ئایینیانە، بەڵکو ڕوو ئەکاتە ئایینەکەی خواو نرخ‌و ڕێزی ناهێڵێ لە دەروونی مرۆڤدا، وە مەردوم بێ‌بڕوا ئەکات بەئایین، وە هیچ نرخ‌و ڕێزێ ناهێڵێ بۆ هیچ قسەیەکی ڕاست‌و هیچ پیاوێکی ڕاست، کە پڕ بە دڵ ئەیەوێ ئامۆژگاری بکات‌و بەندەکانی خوا بانگ بکات بۆلای خواو ئایینی خوا.

وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ

ئـەم سەرزەنـشتە سـەختانە ڕوو ناكەنـە فەرمانـدان بـە چـاكە، بـەڵكو ڕوو ئەكەنـە كۆكردنەوەی لەگەڵ بەشی دووەمدا كە بریتییە لـە جوڵانـەوەو ڕەفتاركردنیان بە پێچەوانەی فەرمان دانیان بەمـەردوم، ئەگینا هەرچەند خۆیـان بەد كردارو بەد ڕەفتـار بن فەرماندانیان بەچاكە شتێكی پەسەندو پێویستە هەڵسانە بە شتێ كە ئیسلام پێویستی كردووە لەسەر هەموو كەسێ بە هەموو هێزو توانا، وە ئەم ئایەتە بەهیچ جۆر ناكرێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە مەردومی خراپ و بەد كردار نابێ ئامۆژگاری و فەرمان بە چاكەو بەرگری لە خراپە بكات، وەك هێندێ بە هەڵە ئەوەیان وتوە! بێ‌گومـان یـەك خستن و ڕێككردنـی وتـارو كردار هـەروا شتێكی سووك و ئاسان نییە، وە ڕێگەیەكی تەختكراوو بێ‌گرێ نییە، بەڵكو پێویستی هەیە بەڕام كردن و ڕاهێنانی دەروون (نفس)، وە پێویستی هەیە بە پەیوەستی بەیادی خواو داوای یارمەتی و كۆمەكی خوا، جا لەبەر ئەوە قورئان تەمێی ئەو جوولەكانەی یەكەم جاری كرد، وە هەروەها لەپەنای ئەواندا هەموو مەردومێك تەمێ ئەكات و بانگی ئەكات بۆ كۆمەكی وەرگـرتن بە سیفەتی ئارام و خۆگری، وە بەنوێژ، فەرمووی: ﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ﴾ وە كۆمەكی داوا بكـەن بـە خـۆگری و بـە نوێـژ، داوای یارمـەتی و كۆمـەكی بـە خـۆگری زۆر جـار هـاتووە لـە قورئانـدا، چـونكە بەڕاسـتی ئـەم سـیفەتی خۆگرییـە توێـشوویەكی بـەهێزو پێویـستە بـۆ بـەرەنگاری هـەموو نارەحـەتی و زەحمـەتێ، وە نارەحـەتی یەكـەم لەسـەر دەروون (نفـس) واز هێنـان و دەست بەرداریـیە لەسـەرۆكایەتی و سـەركردایەتی و سوودو بەرژەوەندی و سـامان و دەستكەوت، وازهێنان و دەست بەردار بوون لەمانە لەبەر ڕاستی و لە پێنـاوی ڕاسـتیدا (لەبـەر حەق و لە پێناوی حەقدا)، ئینجا با بزانین كۆمەكی وەرگـرتن بەنوێـژ چۆنەو چییە؟ بێ‌گومـان نوێژی ڕاستەقینە پەیوەندی بەندەیە بە پەروەردگاریەوەو گەیشتنی دڵیەتی پێی، وە ئەوەش نوێشووی دڵەو مایەی هێزو دامەزراوی و زاڵبوونە بەسەر هەموو نارەحەتیەكدا، پێغەمبـەری ئـازیز (ﷺ) كـەدڵ و دەروون و گیـانی پـیرۆزی پەیوەسـت بـوو بـە خـواو بـە سروشـی (وحـی)

خواوە، هەرکاتێ ناخۆشی و نارەحەتییە ڕووی تێبکردایە پەلاماری نوێژی ئەداو نوێژی ئەکرد بەهۆی ئارام و شادمانی دڵی و تیماری هەموو زامێکی.

(ئیبن و عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- لەسەفەرێکیدا هەواڵی مردنی (قثم)ی برای پێدرا، ئەویش فەرمووی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ لەپاشا لەوڵاخەکەی دابەزی، وەلە ڕێگەکە لای داو دوو ڕکات نوێژی کردو درێژەی پێدا، ئینجا هەڵساو چوو بۆلای وڵاخەکەی و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ وە بێگومان کۆمەکی وەرگرتن بە خۆگری و نوێژەیان هەر نوێژ قورس و گرانە لەسەر هەموو کەس ﴿إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ مەگەر لەسەر لە خوا ترسەکان کە دەروونیان ملکەچەو سام و بیمی خوای تیا جێگیرە، لەسەر ئەمانە گران نییەو بەڵکو خۆش و بەلەزەتە چەند دڵیان بەستراوەو خەریکە بە یادێ خواوە، کە تەنها بە یادی خوا دڵ ئارام پەیدا ئەکات، وە هەم ئەمانە بە ئومێدن و چاوەڕوانی پاداشتی گەورەن لای خوا کە هیچ شتێ هاوتای ناکات و شایانە بۆ ئەوەی لەپێناویدا هەموو بارێکی قورس بە سووک تەماشا بکرێ، وەك بەم فەرموودەیە دەست نیشانی بۆ ئەکات: ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ﴾ واتە ئەوانە کە کەسانێکن بڕوایان هەیە بەمەی کە ئەگەن بە حوزوری خوای خۆیان و ئەگەن بە پاداشتی کردەوەیان لای خوا ﴿وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ وە بڕوایان هەیە کە زیندوو ئەکرێنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆلای خوای خۆیان.

وتەی (ظن) کە لەبنەڕەتا بریتییە لە گومانێکی بەهێز، لێرەدا مەبەست بڕواو زانینی تەواوە، وەك لە چەند شوێنێ ترا هەر بەم جۆرە مەبەستە بەکار هێنراوە لە قورئاندا، وە هەروەها لە زمانی عەرەبدا بە شێوەی گشتی بەکارهێنانی ئەم جۆرەو وتەیە ـ وەك زانایان ئەفەرموون ـ بۆ دەست نیشانکردنە بەوەی کەزانین و بڕوای بڕوادار با خەتەرەو خەیاڵی لەگەڵ بێت لە هێندێ جاردا، وە ئەگاتە ڕادەی بینین و بیستن هەر باشەو وەرگیراوە لای خوا، لەبەزەیی و میهرەبانی بەزیاد بێت کەشتی ناتەواو وەر ئەگرێ لە بەندەکانی و بە تەواو بۆیان حیساب ئەکات و چاوپۆشی ئەکات لە کەم و کوڕی! ئینجا بانگێ تر ئەکاتە نەوەی (ئیسرائیل) و چاکەو بەهرەی خۆیان بیر ئەخاتەوەو ئەیانترسێنێ لەو ڕۆژی گەڕانەوەو بە خزمەت گەیشتنە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەی نەوەکانی (ئیسرائیل) بیربکەنەوەو باسی چاکەو بەهرەی من بکەن کەڕشتم بەسەرتاندا،

وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ

---

﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وە بە تایبەتی باسی ئەوە بکەن کە من باوو ڕیزی ئێوەم دا بەسەر جیهانیاندا، واتە جیهانیانی چەرخی باوو باپیرە پێشووەکانیان کە خوا بەرزی کردنەوە بەسەر هەموو گەلەکانی چەرخی خۆیاندا بە پێغەمبەرێتی و پادشایەتی و دەسەڵات و زانین و کردەوەی چاک و دادپەروەری و دەستگرتنیان بە ئایین و بەرنامەی خواو هەڵسانیان بە فەرمانی جێنشینی لەزەویدا، وە بێگومان ئەو چاکەو بەهرەیانە مایەی شادمانی و سەربەرزییە بۆ هەموو تیرەو نەوەکانیان، تەنانەت ئەو چینەشیان کە کەوتنە چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو هەموو تاقم و چینەکانی دواترین هەتا جیهان جیهانە، ئیتر با خۆشیان بێبەش بن لەو هەموو چاکەو بەهرەیانە، بەڵکو لەپاش لادانیان بوون بە جێگەی دەرکردن و نەفرینی خوا لێیان، کەواتە زۆر پێک و بەجێیە ئەو چاکەو بەهرەی باوک و باپیرە پێشووانە بدا بە ناوچاوانی ئەماندا و بەوە سەرزەنشتیان بکات لەسەر بڕوا نەهێنان و هانیان بدات بۆ بڕوا هێنان و هاتنەوەیان بۆ ناو ڕیزو کۆمەڵی بڕواداران و بۆ ژێر ئاڵا و سەرکردایەتی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە نوێنەرو جێنشینی هەموو پێغەمبەرانە - درودی خوایان لەسەربێ- وە گەڕانەوەیان بۆ ئەو ڕیزەی کەبوویان، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەیان ترسێنێ لەو ڕۆژەی کە باس ئەکرێت، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لە پرسیارو سزای ڕۆژێ کە ﴿لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا﴾ هیچ شتێ ناگەیەنێ بە هیچ کەسێ‌تر، وە هیچ تاوان و گوناهێکی لە کۆڵ ناخات و نایگرێتە گەردن بۆی، وە هیچ مافێ کە بەسەریەوە بێت بۆی جێبەجێ ناکات، هەرکەس گوناهو تاوانی خۆی بەملی خۆیەتی و پرسیاری خۆی لێ ئەکرێ، ئەوەش بیروباوەڕێکی گەورەو بەندێکی گرنگی ئیسلامییەو ناو ئەبرێ بە (التبعة الفردية) وە بنەڕەتەکەی لەسەر ئەو زانین و خواهیشت و هەڵبژاردنەیە کە خوا داوێتی بە ئادەمی و ڕێک و ڕاستیشە لەگەڵ دادپەروەریی خوادا، ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ﴾ وە هیچ تکاو لاڵەیەکی لێ

وەرناگیرێ، واتە ئەگەر هەرکەسێ تکای بۆ بکات تکاکەی وەرناگیرێ ﴿وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ وە هیچ پوول‌و پارەو فیداکاری‌و بەدەل‌و بریتییەکی لێ وەرناگیرێ، ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە ئەوانە سەرناخرێن‌و پەنا نادرێن لە خوا، وە ڕزگار ناکرێن لە سزای خوا[1]، کەواتە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە نائومێدن لە ڕزگار بوون، نە پەنا دان‌و بەرگری لێکردن بە زۆرو دەسەلات، وە نە بە تکا بۆ کردن، وە نە بەتکا بۆ کردن، وە نەبەلێ گرتنی بارە قورسەکەیان، وە نەبەبژاردن‌و بەدەل‌و بریتی دان ـ خوا پەنامان بدات لەبەد ەختی ئەو ڕۆژەـ، جوولەکە لایان وا بوو کەلە جیهاندا هەرخراپەیەك بکەن زیانی نابێ بۆیان لە ڕۆژی دواییدا، چونکە باوك‌و باپیریان باری گوناهیان لە کۆڵ ئەخەن‌و تکایان بۆ ئەکەن، یا لەو ڕۆژەیشداـ وەك لەم جیهانەدا ـ بەرتیل‌و بەدەل‌و بریتی کەڵکی هەیەو ڕزگاریان ئەکات لە سزاو تۆڵە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەم کوتی کردن‌و دای لە دەماخیان، موعتەزیلەو چەند کەسێ تر لە کۆن‌و تازەوە کە شوێنی ئەوان کەوتوون، لایان وایە تکاو شەفاعەت بۆ گوناهە گەورەکان نابێ‌و دەست نادات لە ڕۆژی دواییدا، وە بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە، وە کۆڕو جەماوەری ئوممەت لەسەر ئەوەن کە تکاو شەفاعەت هەیە بۆ گوناهباران، با خاوەنی گوناهە گەورەکانیش بن، بە مەرجێ بڕوادار بێ‌و بە بڕواداریییەوە بمرێ، بەڵام بەبێ خیلاف‌و دووبەرەکی هەرکەسێ بەبێ بڕوایی بمرێ ئەو کەسە بێ بەشە لە تکاو شەفاعەت چ بۆ بێ بڕواییەکەی، وە چ بۆ هەر گوناهێ‌تر، جا بۆ ئەوەی مەسەلەکە بە جوانی دەرکەوێ پێویستە لە پێشەوە بزانین مەبەست لە شەفاعەت چییە؟ ئینجا پاش ئەوە ئەکۆڵینەوە لە بەڵگەی هەردوولا، تکاو شەفاعەت ئەگەر بریتی بێ لەوەی کەلەم جیهانەدا هەیە، بەم ڕەنگە کاربەدەست بڕیاری تۆڵەو سزای تاوانبارێك ئەدات، لەپاشان تکاکارێ داوای لێ ئەکات تا پەشیمانی ئەکاتەوەو ئەو نیازو بڕیارەی کە داویەتی پێی ئەسڕێتەوە.

ئەگەر مەبەست بە شەفاعەت ئەوەبێت بێگومان هیچ بڕوادارێ ناتوانێ شتی وا ڕەوا بدات، چونکە بەهیچ کلۆجێ نیازو بڕیاری خوا ناگۆڕێ‌و ناگونجێ پەشیمان بوونەوە ڕوو

---

[1] ئەم تەفسیرە لەسەر ئەوەیە کە ڕاناو لە هەردوو (منها)دا بگەڕێتەوە بۆ (نفس)ی دووەم کە بەم جۆرە باشتر ئەپێتە دڵەوە، وە بەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەو: یەکەم: بگەڕێتەوە بۆ (نفس)ی یەکەم. دووەم: یەکەم بۆ یەکەم‌و دووەم بۆ دووەم.

بکاتە خوا، وە ئەگەر بریتی بێ لە نزاو تکاو لاڵە لە خوا بۆ بەجێ هێنانی مەبەستو داواکراوی تکاکارەکەبێ، بێ ئەوەی بزانێ نیازو بڕیاری خوا چۆنە، وە لەگەڵ ئەوەدا بزانێ کە خوا چۆنی بڕیار دابێ هەر ئەوە ئەبێ و بەڵام خوا تکای تکاکارەکەی کردووە بە هۆی بەجێهێنانی بڕیارەکەی خۆی، وە بێگومان ئەوەش ڕێز گرتنی تکاکارەکەی تیایە، ئەگەر بەم جۆرە مەبەست بێت ئاشکرایە کە ئەوە ڕێكو ڕەوایەو هیچکەس ڕێگەی نییە بە ناڕەوای دابنێ، وە کۆڕو جەماوەری ئەم ئوممەتە هەر بەم جۆرە ڕەوای ئەدەنو بڕوایان بە بوونی هەیە، ئینجا بەڵگەی ئەوانە کە بڕوایان بە شەفاعەت نییە ئەم ئایەتی ئێرەیە وەك وتمان، بەڵام ئەوە نابێ بەبەڵگە لەسەر قسەکەیان، چونکە:

١- ڕۆژی دوایی دوورو درێژەو چەند ڕووداو هەڵوێستی جۆر بەجۆرو جیاوازی تێدا هەیە، کەواتە هەڵ ئەگرێ ئەو وەرگرتنی تکایە لە یەکەم جارەوە بێت تا ئیزن دەرئەچێ و ڕێی تکا کردن مەرەخەس ئەکرێ.

٢- ئەو وەرنەگرتنە تایبەتییە بێبڕواکانەوە لەبەر ئەم خاڵانەی کە دێن:

أ- ئەم ئایەتە لەبارەی جوولەکەوە هاتو ئاڕاستەی ئەوان کراو دەم کوتی ئەوانی پێکراوە.

ب- خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە داوای سڕینەوەو لێبوردن بکات بۆ بڕوا داران.

ت- بێبڕواکان بەداخو هەناسەی ساردەوە ئەڵێن: ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾ ئێمە نە تکاکارمان هەیەو نەدۆستێکی دڵگەرم، کەواتە وا وەرئەگیرێ کە بۆ بڕواداران تکاکارو دۆستی دڵگەرم هەیە.

٣- ئەم ئایەتە تایبەتییە بەو کەسانەوە کە خوا ئیزن ئەدا بە تکاکردن بۆیان، وەك وەرئەگیرێ لەدیمەنو ڕواڵەتی ئەم ئایەتانەوە ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ ئایا کێیە ئەو کەسەی کە تکا ئەکات لای خوا، مەگەر بە ئیزنو ڕای خوا، واتە هیچکەس ناتوانێ تکا بکات لای خوا تا خوا ئیزن نەدات، لەدوای ئیزنی خوا تکا ئەکرێت ﴿لَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾ سوودی نابێ تکا کردن لای خوا مەگەر بۆ کەسێ کە خوا ئیزن بدا بۆی، ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾ مەلائیکەتەکان تکا ناکەن مەگەر بۆ کەسێ کە خوا ڕەزای بێ، بەڵگەی ئەوانەی کە شەفاعەت ڕەوانادەن تەنیا ئەم ئایەتی ئێرە بوو

بەو لێکۆڵینەوەیە دەرکەوت کە نابێ بە بەڵگە لەسەر ڕاو بڕیارەکان، وە بە بەڵگەو ڕابەری کۆڕو جەماوەری ئوممەتیش بە کورتی ئەم دوو شتەیە کە دێت:

أ- دیمەنو ڕواڵەتی ئەم ئایەتانەی کە باسمانکردنو یەکی ئەو تاقمەمان پێ‌خستن.

ب- ئەو هەموو حەدیسە (صحیح)انە کە زۆر بە ناوبانگنو لە یەراوە (صحیح)ەکانی حەدیسدا هاتوونو بڵاوەیانکردووە لە کتێبە کەلامیەکانداو لەبەر بەناوبانگیان پێویست نییە بە هێنانیان، ئینجا لەسەر ڕای کۆڕو جەماوەری هیچ دژایەتییە نییە لە بەینی ئایەتو حەدیسەکانداو هەموو دەستە مل ئەبن، بەڵام لەسەر ڕای ئەو تاقمە دژایەتی پەیدا ئەبێ لەبەینی ئایەتەکەی ئێرەو ئەو ئایەتانەی کە باسمانکردن، مەگەر بە زۆرە ملێ یەك بخرێنو پینە پەڕۆ بکرێن، وە ئەبێ بە هیچ ڕەنگ گوێ نەگیرێ لەو هەموو حەدیسە یا بە جۆرێ پینەو پەڕۆ بکرێن کە دوورە لە ژیرییەوە، کە هەرکام لەم دوو بارە شایانی بڕوا دارو ژیر نین!!

لە پێشەوە بەکورتی باسی چاکەو بەهرەی خۆی کرد بەسەر نەوەو بەرەی ئیسرائیلیەوە، ئینجا بەدرێژیو بە تایبەتی باسیان ئەکات، لەگەڵ هەڵوێستی ناڕەوایان، وە سپڵەییو ناسوپاسیانو لادانیان لە ڕێگە، وە لەناو چاکەو بەهرەکانیدا ڕزگار کردنیان لە تاقمی فیرعەون ئەکات بە یەکەمو سەردەستە ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾ باسی ئەو کاتە بکەنو بیر لەوەبکەنەوە کە ئێمە ئێوەمان ڕزگار کرد لە تاقمە تایبەتیەکانی فیرعەون، لەکاتێکدا کە ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئەیاندا بەسەرتاناو پێیان ئەچەشتن خراپترینو بەتین ترین سزا، بەم ڕەنگە ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ﴾ کوڕەکانتانیان ئەکوشتن بە سەربڕین بۆ ئەوەی بێ هێزو لاواز بنو لە ڕەگو ڕیشەبێن، وە ئەڵێن: لەخەودا دیبوویان کاهینێ پێی وتبوون کە منداڵێکیان لێ هەڵئەکەوێو ئەبێتە هۆی نەمانی خۆیو پادشاییەتیەکەی ﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾ وە ئافرەتەکانیان ئەهێشتەوە تا ئەرکی سەرشانتان قورس بێ لە بەخێوکردنیاندا، وە هەم بابمێنن بۆ کارەکەی خۆیان، وە هەم ئەوە ئەوپەڕی سەرشۆڕکردنی تیایەو لەڕێ‌یایەتی.

ئەوەی کە بەسەر باوكو باپیرە پێشووەکانیاندا هات ئەخاتە بیر ئەمان لەم ڕووەوە کە ئەمانەی دوایی بەرەو نەوەی ئەوانن، کەواتە هەر ناخۆشیو خۆشییە بەسەر ئەواندا هاتبێ وەك بۆ ئەمانیش بێت هەر وایە،

وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ
فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ

---

**ئینجا پێش ئەوەی شێوەی ڕزگار بوونەکە بخاتە پێش چاو ئەفەرموێ: ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾[1] وە لەو سزانەدا، یا لەو سزاو ڕزگار کردنەدا تاقیکردنەوەیەکی گەورە هەیە لەلایەن پەروەردگارتانەوە، ئەم ڕستەیەی هێنا بۆ ئەوەی بیدا بەگوێی هەرکەسێکدا کە دووچاری ناخۆشیەك هات، ئەوە تاقیکردنەوەیەو با ئاگای لە خۆی بێت‌و تەمێ‌و توێشووی لێ وەرگرێ بۆ جیهان بە تێکەیشتن‌و زانین‌و خۆگرتن، وە توێشووی لێ وەرگرێ بۆ ڕۆژی دوایی بەنزاو لاڵەو چاوەڕوانی بەزەیی خواو دەروو لێکردنەوەیی‌و پاداشتی ڕۆژی دوایی، وە هەروەها لە خۆشیشدا تەمێ‌و توێشوو هەڵگرێ لێی بۆ هەردوو جیهانی بەچاولەبەری بۆ خوا سوپاس‌و کردەوەی چاك لەبەر خوا تا بەهۆی ئەوەوە بکات بە پاداشتی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی، لەپاش نیشان دانی شێوەی سزا سەختەکەیان، ئینجا شێوەی ڕزگار کردنەکەیان ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن‌و بیری لێ بکەنەوە کە ئێمە دەریاکەمان لەتکردو دوانزە شەقامان تێ خست بۆ ئەمەی بە هەر شەقامێکدا تایفەو بەرەبابێ گوزەر بکات لە دوانزە تایفەو بەرەبابەکانتان.**

**ئەو گەلە پێکهاتبوو لە نەوەو بەرەی دوانزە کوڕەکەی یعقوب پێغەمبەر (علیه السلام) وە هەر تاقمێ لەوانە ئەیان ویست سەربەخۆو جیاوازبن، لەبەرئەوە خوا ئەوەیشی بۆ کردن‌و بەو شێوەیە پەڕاندنییەوە لە دەریاکە، کەوا دەرئەکەوێ ئەم دەریای سوورە، ﴿فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ﴾ واتە ئێوە چوونە سەر شەقامەکان‌و فیرعەون‌و کۆمەڵەکەی شوێنتان کەوتن‌و ئینجا ئێوەمان ڕزگار کردو لەدەریاکە پەڕانمانەوەو فیرعەون کۆمەڵەکەیان نقوم**

---

[1] وشەی ﴿بَلَآءٌ﴾ بە تاقیکردنەوە ئەوترێ وەك لە تەفسیرەکەدا هەڵمان بژاردووە بۆ خۆشی‌و ناخۆشیش بەکار ئەهێنرێ، جا لەسەر ئەمە ئەگەر ﴿ذَٰلِكُم﴾ دەست نیشان بێت بۆ کردەوەکەی کۆمەڵی فیرعەون، ئەوکاتە مەبەست سزاو ناخۆشی یە، وە ئەگەر دەست نیشان بێت بۆ ڕزگار کردنەکە ئەو حەلە مەبەست خۆشی‌و بەهرەیە، وە ئەگەر دەست نیشان بێت بۆ ئەوەی باسمان کرد بۆ تاقیکردنەوە ڕێکە وەك بەو شێوەش لە تەفسیرەکەدایە.

کردو کردنمان بە ژێر ئاوەکەوە، بەم ڕەنگە ئاوەکەمان وەك خۆی لێکردەوەو هێنامانەوە بەسەر ئەواندا ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە سەرنجی ئەوانتان ئەداو بەچاوی خۆتان ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەتان بینی، بێگومان ئەم بەسەرهات‌و دیتنە بۆ ئەو تاقمەبوو کە لەگەڵ (موسا)دا (علیه السلام) بوون‌و لە چەرخی ئەوا بوون، بەڵام ـ وەك وتمان لەمەوپێش ـ چاکەو بەهرەی باوك‌و باپیر ئەگەڕێتەوە بۆ نەوەو وەچەکانیان‌و هۆی شادمانییە بۆیان، هەرچۆنێ خراپی‌و نالەباریان هەر پرشنگێکی ئەمان ئەگرێتەوەو هۆی سەرشۆڕی‌و غەم‌و پەژارەیانە، جالەبەر ئەوە لەم بەسەرهات‌و داستانەدا بەدێمەن ڕواڵەت ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو تاقم‌و چینەی کەلە چەرخی پێغەمبەردا بوون (ﷺ)، ڕووی فەرموودەیان تێ ئەکات وەك ئەمان ئەو یەکەم تاقم‌و چینە بن‌و ئەو ڕووداو بەسەرهاتانە بەسەر ئەماندا هاتبن.

باسی ئەم ڕزگار کردنی (موسا) (علیه السلام)‌و تاقمەکەی، وەخنکاندن‌و نوقم کردنی فیرعەون‌وکۆمەڵەکەی، بەدرێژیی لە سورەتە مەککەییەکاندا هاتووە، کەواتە پێویست نییە بە دووبارە کردنەوە، وە لێرەدا هەر مەبەست بیرخستنەوەی گەل‌و کۆمەڵێکە کە ئاگادارن بە قسەو باسەکە، ئیتر ئایا لە سورەتە مەککەییەکان وەریان گرتبێ یا لە کتێب‌و حیکایەت خوانەکانی خۆیانەوە، بیریان ئەخاتەوە بە شێوەی شتێکی بینراو وەك بەسەر خۆیاندا هاتبێ‌و بەچاوی خۆیان دیبێتیان بۆ ئەوەی باش کاریان لێ بکات، ئینجا باسی چەند بەسەرهاتێ تریان ئەکات لەپاش ڕزگار بوونیان‌و دەرچوونیان لە مصر بەسەرکەوتوویی.

خوای گەورە بەڵێنی دا بە (موسا) (علیه السلام) بەوەی تەوراتی بداتێ، وەکاتی بۆ دیاریکرد کە چل شەو بە ڕۆژوو بێت‌و پاش چل شەوەکە تەوراتی بداتێ، ئینجا کە گەلەکەی بەجێ هێشت‌و چوو بەدەم بەڵێن‌و وادەکەیەوە کۆمەڵێکی زۆریان لێ بوو بە گوێرەکە پەرست، وەك درێژیی لە سورەتی ﴿الأعراف﴾و ﴿طه﴾ دا باسی فەرمووە، وە لێرەدا بیریان ئەخاتەوەو ئەیداتەوە بە ناچاوانیاندا ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە بەڵێنمان دابە موسا بە مانەوەی چل شەو کە ڕۆژەکانی بە ڕۆژوو بێت بۆ وەرگرتنی تەورات ــ مانگی ذوالقعدةو دە ڕۆژی مانگی قوربان ــ یا مانگی قورئان‌و دە ڕۆژی موحەڕرەم، ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ﴾ ئینجا لەپاش ڕۆشتنی موسا بەدەم بەڵێنەکەیەوە ئێوە گوێرەکەتان دروستکرد، واتە بۆ ئەوەی بیپەرستن،

وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى
ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم

---

یا گوێرەکەتان گێڕا بە پەرستراوی خۆتان ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە ستەمکار بوون، بەمەی هاوبەشتان بۆ خوا دانا، یا بەمەی بەرگری (سامری)تان نەکردو بێدەنگ بوون لێی تا ئەوەی کرد کە کردی، واتە ئەگەر ئاوڕێکتان بدایەتەوە بۆلای ژیریی خۆتان ئەتان زانی کە ئەوە ناهەقی و ستەمکارییە. ئایا کێ ستەمکار ترە لە کەسێ کە واز بێنێ لە پەرستنی خواو ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەی و بچێ گوێرەکەیەك بپەرستێ و بیکات بە هاوبەش بۆ ئەخوایەی کە ڕزگاری کردن لەوگەلە ستەمکارەی کە ئەو هەموو سزای دان، ئەو گەلەی کە گوێرەکەیان زۆر بە پیرۆزو بەڕێز دائەنا، ﴿ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو ستەمکاری و گوێرەکە پەرستییە لێتان بوردین و ئەو تاوانە گەورەیەمان سڕییەوە لەگەڵێتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی چاکەو بەهرەی ئێمە بکەن بە سەرتانەوە، چاکەو بەهرەی ئەو لێبوردن و سڕینەوە بەتایبەتی سوپاس بکەن بە دڵ و بە زوبان و بە کردەوەو بەردەوامی لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی.

وشەی (شکر)بە چەند جۆرێ ڕاڤەکراوە: شێخ جونەیدی بەغدادی ئەفەرموێ: بریتییە لە خۆدانان بە ناتەواناو دەستەپاچە لە هەڵسان بە سوپاس، شێخی شیلی ئەفەرموێ: بریتییە لە چاولەبەری و ملکەچی و پەستی لە ژێر باری منەتی خوادا، (ذوالنون)ی مصری ئەفەرموێ: گوێڕایەڵییە، ﴿وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ وە باسی ئەو کاتە بکەن کە بەخشیمان بە موسا تەورات کە کتێبەو جیاکەرەوەی هەق و ناهەقە بۆ ئەوەی ڕێنموونی وەرگرن و لەپاش گومرایی بکەونە سەر ڕێی ڕاست، ئینجا باسی چۆنێیەتی لێبوردنەکە ئەکات، کە بە شێوەیەکی زۆر سەخت بووە، چونکە ئەو سروشتە ڕوخاوو بۆشەی ئەوان ڕێك وڕاست نەئەبووەوە بەوشێوە سەختە نەبێ، وە بەو تەمێ کردنە نەبێ، وە بێگومان ئەوەش چاکەو بەهرەیەکی گەورە بوو بۆ هەمووان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە موسا وتی بە گەلەکەی، واتە ئەوانەی کە لایان داو گوێرەکەکەی (سامری) یان پەرست ﴿يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم﴾ بێگومان ئێوە ستەمتانکرد لە خۆتان،

﴿بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ بە هۆی گێڕانتان ئەو گوێرەکەیە بە پەرستراو بۆ خۆتان، واتە ئەو تاوانە زۆر زلەتان کرد کە ئەوپەڕی ناڕەوایی بوو، لەباتی پەرستنی خواو لە جێی پەرستنی ئەودا کە هەر ئەو شیاوو شایانە بۆ پەرستن، لەباتی پەرستنی ئەو گوێرەکەتان پەرست کەوێنەو نموونەیە بۆ نەفامی و نەزانی و کەودەنیتان! ﴿فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ﴾ کەواتە بگەڕێنەوە بۆ لای کەسێ کە ئێوەی داهێناو دروستی کردن بە ڕێك و پێکی، وە هەر ئەو بپەرستن، ﴿فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ ئینجا خۆتان بکوژن، ئیتر ئایا تەوبەو گەڕانەوەکەیان بریتی بووبێ لەم کوشتنە، یا بەمە تەواو بووبێ و ئەم کوشتنە نەبوایە تەوبەکەیان وەرنەئەگیرا؟، وە ئایا مەبەست کوشتنی ڕاستەقینەیە وەك کۆڕو جەماوەری لەسەرەو چەند ڕیوایەتێ پێی هاتووە؟ یا مەبەست خۆ سەرشۆڕکردن و هێزو توانا بەختکردنە لە خواپەرستی و گوێڕایەڵیدا تا ڕادەیە نیشانەو دروشمی ئەو گوناهەیان پێوە نەمێنێ وەك هێندێ لە زانایان فەرموویانە؟ بەڵام هیچ پێویست نییە بە لادان لە دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکە بە تایبەتی کە چەند ڕیوایەتیشی لەسەرە، وە گوناهەکەیان ئەوەندە زل و بێ جێ بووە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە خوا ئەو کوشتنەی کردبێ بە کەفارەت و هۆی سڕینەوەی، وەلەسەر ڕای یەکەم ئایا مەبەست ئەوەیە هەر تاوانبارێ خۆی بکوژێ، یا کۆمەڵی تاوانباران لەناو خۆیاندا یەکتر بکوژن، یا مەبەست ئەوەیە ئەوانەی کە گوێڕایەڵ بوون و لایان نەدا تاوانبارەکان بکوژن بۆ ئەوەی پاك بکەنەوە بەو کوشتنە لە تاوانی گوێرەکە پەرستیەکەیان، وە خۆیشیان پاك بکەنەوە لە تاوانی بەرگری نەکردن و بێ دەنگ بونیان لەو تاوانە گەورەی کەلە ناویاندا کرا؟ زۆربە ئەم ڕای سێیەمی هەڵبژاردووە، وەك چەند ڕیوایەتیشی پێهاتووە، کەواتە ئەگەر فەرمانەکە بە تاوانبارەکان مەبەست بە کوشتنی خۆیان ـ کە دیمەنی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ ـ ملکەچ بوونیانە بۆ ئەو کوشتنە، وە ئەگەر فەرمانەکە بە گوێڕایەڵەکان بووبێ، ئەو حەلە لەناو بردنیان بە نەفسی خۆیان لەبەر ئەوەیە کە هەموو بڕواداران وەك یەك لەش وان، هەرشتێ ڕووبکاتە هەرکامیان بۆ هەموویان ئەگەڕێتەوە، ئینجا بەتێهەڵکێش ئەم ڕستەیە ئەهێنێ بۆ هاندانیان لەسەر تەوبەو گەڕانەوە، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ﴾ ئەو گەڕانەوەو کوشتنەی کەباسکران چاکە بۆتان لای دروستکەرو داهێنەرتان،

﴿فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ واتـه ئێـوەش هەڵـسن بـەو فەرمانـەی پێتانـدرا، ئینجـا خـوا تەوبـەو گەڕانەوەکەی لێ وەرگرتن ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چونکە بەڕاستی هەر ئەوە تەوبە وەرگرو بەزەیی فراوان.

ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەو ئەو هەموو چاکەو بەهرە گەورەیانەو ئـەو سـڕینەوەی تـاوان و لێبوردنـە، ئـەو سروشـتەی ئـەوانی نـەگۆڕی، وە ئـەو دڵ و دەروونـە ڕەق و تـەق و سەرکێشیەی ئـەوانی نـەرم و پـاراو نـەکرد، وە بـەو هـەموو شـتە گـەورەو گرنگـە بڕوایەکی دامەزراوی بێگێرو گرفتی تیا فەراهەم نەهێنان، چونکە سروشتیان تێکچووبوو، وە دەماری پیاوەتی و ڕەوشتی شیرینی ئادەمێتیان شل بوو، وە ژیرییـان لـە کـار کـەوتبوو لەژێر باری ئەرك و مەینەت و شیلاق و قەمچی لەو ماوە دوورو درێژەی کە بەسـەریان برد بە ژێر دەستەیی و بەسەر شۆڕیی لە چەرخی فیرعەون و گەلە ستەمکارەکەیان، وە هەرکەس دەق بگرێ بەو جۆرە ژیانەوەو بەو شێوە پەروەردە ببێ، ئەو کەسە لەگەڵ باری لە کۆڵ بخرێ و قەمچی لەسەر هەڵگیرێ یاخی ئەبێت و لەخۆی ئەگۆڕێ، وە لەگەڵ خرایە ژێر بارو قەمچی لـێ بەرزکرایەوە بەزەیوونی و سەرشۆڕی وەك مردوو ئەکەوێ لە ژێـر دەسـتی زۆرداردا، جا لەبەر ئەو سروشت تێکچوونەیان داوایانکرد لـە موسا پێغەمبـەر (علیه السلام) خوایان بەئاشکرا نیشان بدات ئەگینا بڕوای پێناهێنن، وە لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە ئەو داواکەرانە حەفتا کـەس بـوون لەوانـەی کـە موسـا هـەڵی بژاردن بـۆ ئـەوەی بچن بـەدەم وادەی خـواوە بـۆ کێـوی (طور)، وە لەگەڵ ئەوەدا لەوەشیان بوردو سزای لەسـەر لابردن و کەچـی هـەر نـا سوپاسییان کرد!! ئینجا ئەوا خوا ئەمانیشی دانـەوە بەناو چاوا، ئەفـەرموێ: ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ﴾ بیر بکەنـەوەو باسـی ئەوکاتـە بکـەن کـەوتتان ﴿يَٰمُوسَىٰ﴾ ئـەی موسـا ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةً﴾ هـەرگیز ئێمە بڕوا ناهێنین لەبەر قسەی تۆ و دان نانێین بە تۆدا لەوەی کە خوا تەوراتی پێبەخشیوی، یـا خـوا قسەی لەگـەڵ کـردی و فـەرمانی پیـادای، بێگومـان ئەوانـە بڕوایـان بووەبـە موسـا لەوەوپێش، کەواتە مەبەست بڕوا نەهێنانیانە بەوەی کە وتمان، یا بڕوای تێرو تـەواو بـەبێ دوو دڵی و گێرو گرفت، بەهـەرکام مەبەست بووبێ بیانوویان ئەمە بوو وتیـان: ﴿حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةً﴾! هەتا خوا نەبینین بە ئاشکراو بەچاوی سەرمان

فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾
وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا
ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ
شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ

---

**﴿فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ﴾ بەهۆی ئەو سەرکێشی و قسەو داوا ناڕەواتانەوە ئەو هەورە بریشقەو ئاگرە داگیریکردن تا سوتاندنی، یا بومەلەرزەو شاخەو شریخەیە داگیریکردن تا مراندنی ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەتان ڕوانی و بەچاوی خۆتان ئەو بەسەرهاتانەتان بینی، یا نیشانەو دروشمێ کەلە پاشا مایەوە ﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ﴾ ئینجا لەپاشدا زیندوومان کردنەوە لەپاش مردنتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەمەی سوپاسی چاکەی خوا بکەن کە زیندووی کردنەوە لەپاش مردن، یا چاکەی لەپاش سپڵەیی و ناسوپاسیتان.**

**ماوەی ئەو مردنەیان شەوو ڕۆژی بووبێ یا هەرچەندو لەپاشدا زیندوو کردنەوەیان بۆ خوا هیچی تێناچێ و هیچ ژیرێ نابێ سەری لێبکاتەوە، هەرهیچ نەبێ بیر لەوە بکرێتەوە کە زۆر کەس دووچاری وەستانی دڵ و سەکتە ئەبن و لەپاشا چاك ئەبنەوە، ئینجا چاکەو بەهرەیە تریان بیر ئەخاتەوەو کەچی پاش ئەوەیش هەرچاو لەبەر نەبوون، ئەفەرموێ:**

**﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ﴾ وە هەوری تەنك و فێنکما کرد بە سێبەر بە سەرتانەوە، بۆ بەرگری گەرمای خۆر لە کاتی گەڕان و مانەوەتان لە دەشت و بیابانی بەینی شام و مصردا، ئیتر ئەوە لەو کاتەدا بووبێ کەلە دەریاکە پەڕینەوەو ڕێیان کەوت لە دەشت و بیابانێکی وشك و گەرمی بێ ئاوو سێبەر، وەك هێندێ ئەفەرموون: یا ئەو بەهرەیە لەپاش ئەوە بووبێ کە مل پێچیانکرد لەجەنگکردن لەگەڵ ئەو ستەمکارانەی کە موسا (علیه السلام)، فەرمانی پێدان، وە وتیان پێی برۆ تۆو خواکەت جەنگیان لەگەڵ بکەن، ئێمە لێرەدا دانیشتوین، ئینجا خوا تۆڵەی ئەوەی لێ سەندن بەوەی چل ساڵ شارەکەی لێ قەدەغە کردن و لەو ماوەدا بگەڕێن بەسەرگەردانی و بمێننەوە لەو دەشت و بیابانەدا، وەك زۆریە ئەفەرموون بە هەرکام خوا میهرەبانی لەگەڵ کردن و بەو جۆرە بەرگری گەرمای لێکردن وە خۆراکی پاك و خاوێنیشی بۆ**

سازدان بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ﴾ وە باراندنمان بەسەرتانا گەزۆو شەلاقە، کە پەلەوەرێکی گۆشت خۆشە، ئەم دوو خۆراکەی بۆ فەراهەم هێنان بەبێ ئەرك و مەینەت، بەڵکو بەم جۆرە کە ڕیوایەتکراوە ڕۆژ ئەبووەوە تا خۆر کەوتن گەزۆ ئەبای و وەك تەم داگیری ئەکردن، وە ئەو پەلەوەرەشیان بۆ ئەهات، هەرکەس ئەندازەی خۆی لێ ئەگرتن کە بەسی بوایە تا ڕۆژی دواتر، وە هەروەها بۆ هەموو ڕۆژێ، ﴿كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾وە پێمان گوتن: بخۆن لەوخۆراکەخۆش وپاکانەی کەپێماندان وکردمان بە ڕۆزیتان، بەڵام ئەوانە سپڵەو ناسوپاس بوون و مل پێچیانکرد لە فەرمان، ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ وە بەوە هیچ ستەم و دەست درێژییان نەکرد لە ئێمە ﴿وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکو ستەم و دەست درێژییان لە خۆیانکرد، چونکە زیانی بەد کرداریەکەی خۆیان گەڕایەوەو خۆیان زیان باربوون، ئینجا لەسەریان ئەڕواو کردەوەی خراپی خۆیان و بەهرەی خوا ئەدات بە ناوچاویاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ بیر بکەنەوەو باسی ئەوکاتە بکەن کە گوتمان پێتان: بچنە ناو ئەم شارە، واتە شاری (قدس) کەلە پاش دەرچوونیان لە مصر خوا فەرمانی پێدان لەسەر زمانی موسا کە بچنە ناوی، وە گەلی (عمالقة)ی لێ دەرکەن، ئینجا ئەوانیش مل پێچیانکردو نەچوون، وەك دەست نیشانمان بۆ کرد لە تەفسیری ئایەتی پێشوودا، ئینجا لەو ماوەی چل ساڵەدا تاقمێکی تازە پەیدا بوون بەسەرکردایەتی ـ یوشەعی کوڕی نون ـ پاش وەفاتی موسا (علیه السلام) هاتن و شارەکەیان گرت، بەڵام لەم جارەشدا هەر نافەرمانی و نالەباریان بەکارهێنا، وەك: دەرئەکەوێ لە گێڕانەوەی داستانەکەوە ﴿فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا﴾ ئینجا بخۆن لێی لە هەرشوێنێ ویستتان، بە لێشاوو فراوانی و بەئارەزووی خۆتان ﴿وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا﴾ وە بچنە قاپیەکە بە مل کەچییەوە بۆ خوا، یا لەپاش چوون سوجدە ببەن بۆی لە سوپاسی ئەوەی کە ڕزگاری کردن لەسەرگەردانی و زاڵی کردن بەسەر دوژمنداو شادی کردن بەو شێوەی کە پێتان خۆشە، ﴿وَقُولُوا حِطَّةٌ﴾ وە بڵێن: مەسەلەی ئێمە، یا کاری تۆ ئەی خوای ئێمە ئەوەیە کە گوناهو تاوانمان لابەری و بیسڕیتەوە لێمان، ئێوە بەو شێوە بچن و ئەوە بڵێن ﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ﴾ ئێمە ئەبورین لێتان و گوناهو تاوان و هەڵەکانتان دائەشارین وئەیان سڕینەوە،

وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾

﴿وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ واتە ئەوانەتان کە خراپن هەڵەو تاوانەکانتان ئەسڕینەوە، وە ئەوانەتان کە چاك‌و چاکەکارن ئەمڕۆ پاداشتتان زیاد ئەکەین ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ﴾ واتە ئینجا ئەوانەی کە ستەمکار بوون بە پێچەوانەی فەرمان جوڵانەوە، بەم ڕەنگە بە شێوەیە تر چوونە ژوورەوە دژو جیاواز لەو شێوەی کە فەرمانیان پێدرابوو، وە ئەو وتەی کە پێیان وترا گۆڕیان بە وتەیە تر جیاواز لەو، وەك ئیمامی (بوخاری)و (موسلیم)و (تیرمزی) ئەفەرموون‌و حەدیسێ ئەهێنن لە (ئەبو هورەیرە) وە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: گوترا بە نەوەی (ئیسرائیل) بچنە قاپیەکە بە ملکەچی‌و سوجدە بردنەوە، وە بڵێن: کاری ئێمە سڕینەوەو لابردنی تاوانە لێمان ئەی خوایە، ئینجا ئەوانیش بە پاشەڵپاش چوون‌و وتەکەشیان گۆڕی‌و وتیان: (حطة): حبة في شعرة... واتە بە لاقرتییەوە وتیان: داوای دانەوێڵەیەکت لێ ئەکەین لەمو ﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾ ئینجا ئێمەش هێنامانە خوار بەسەر ئەوانەی کە ستەمکار بوون سزایەك لە ئاسمانەوە بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانمان بەو کردەوەو گۆڕینی وتەیە کە باسکران، ئەو سزایەش تاعوون بوو(٢٤٠٠٠)بیست‌وچوارهەزاریان(٧٠٠٠٠)حەفتاهەزاریان پێ‌مرد، یاهەرسزایە تر.

ئەم ڕووداوە هەرچەند لە دواتردا ڕوویدا پاش ڕووداوەکانی تر کەلێرەدا باسکراون لەپێش‌و لەپاشی ئەمەوە، چونکە ئەوانی تر لە چەرخی (موسا)دا (علیە السلام) ڕوویانداوە ئەمەیان پاش وەفاتی، هەرچەند شتەکە بەو جۆرەیە، بەڵام وەك یەك‌و لەسەر یەك بارو شێوە دران بەناوچاوی هەموو تیرەو بەرەی (ئیسرائیل)دا بەتایبەتی ئەو یەکەم چین‌و تاقمەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچەکەدا، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە مێژووی هەموو تاقم‌و چینەکانیان هەر یەك شتە، کۆنی وەك تازەی وایە، وە ناوەندی وەك ئەم لاو ئەولای وایە... هەمووی مل پێچییەو لادانەو چاخی بوون‌و نا فەرمانییە!

﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا

---

**ئينجا چاكه وبەهرەيه تريان بير ئەخاتەوه كه كردی دەربازەيان لەو دەشتو بيابانەدا، ئەوەش ئەمه بوو هەر چۆنێ بەبێ ئەرك‌و زەحمەت ئەو خۆراكه پاك‌و خاوێنەی بۆ سازاندن كەباسكرا، هەروەها ئاوی پاك‌و خۆش گەواریشی بۆ فەراهەم هێنان به شێوەی موعجيزه لەسەر دەستی (موسا)دا (عليه السلام) وەك ئەو هەموو موعجيزانەی تر كه لەسەر دەستيدا بينيان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ باسی ئەو كاته بكه ئەی پێغەمبەر، يا باسی ئەو كاته بكەن ئەی نەوەی (ئيسرائيل) كه (موسا) داوای ئاوی كرد له خوا بۆ خواردنەوەو ئاوداشتی گەلەكەی، ﴿فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ﴾ ئينجا ئێمەش گوتمان پێی بەمەی به گۆچانەكەت بده له بەرد ئيتر هەر بەردێ بێ، يا بەردێكی تايبەتی بووبێ، واته بده لەبەرد بۆ ئەوەی ئاوی لێ هەڵقوڵێ، ئينجا ئەويش لێی داو به هۆی ئەوەوه بەردەكه دوانزه درزو كونی تێ بوو ﴿فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا﴾ ئينجا دوانزه كانی لێ هەڵقوڵا به پێی ژمارەی دوانزه بەرەو نەوەكانی ئيسرائيل كه هەريەكێ لەوانه له نەوەی يەكێ له دوانزه كوڕەكانی (ئيسرائيل)ن كه ناز ناوه بۆ يەعقوب پێغەمبەر - سەلامی خوايان لێ بێ - وه ئەو دوانزەيه سەرو بنەڕەتی تيرەو بەره ئيسرائيليەكانن، وه ئەم دوانزه تيرەيه هەر له كۆنەوەو تا ئێستاش ئەو ڕژێمی بنەماڵەييانەيان پەسەند كردو به پێی ئەوه جوڵانەوەتەوه، جا به پێی ئەوه فەرمووی: ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ بێگومان هەموو بەرەو كۆمەڵی چەشمه (كانی)و شوێنه ئاو خواردنەوەی تايبەتی خۆيانيان ئەناسی.**

**خوای گەوره بەو جۆرەو به سووك‌و ئاسان خۆراك‌و ئاوی بۆ فەراهەم هێنان‌و ڕەوای دا بەم جۆرەی كه ئەفەرموێ: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ﴾ بخۆن‌و بخۆنەوه له ڕۆزی خوا، واته ڕەوايه بۆتان به ئارەزووی خۆتان، بێگومان زۆر جار خۆشی‌و نازو نيعمەتی به لێشاو ئەبێته هۆی بەرەڵايی‌و تاوان‌و خراپەكاری بۆ ئەوانەی كه ناپياوو سپڵەن، لەبەرئەوه**

فەرمووی پێیان: ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ زیادە ڕەوی مەکەن‌و درێژە مەدەن بە خراپەکاری لە وڵاتدا لەکاتی خراپەکاریتاندا، واتە کۆتایی بێنن لەو خوو پیشەیەی کە لەمەوپێش لەسەری بوون، ئینجا ئایا ئەو بەسەرهاتی داوای ئاوە هەریەك جار بووبێ، وەك ڕواڵەتی ئایەتەکە زیاد لە یەك جار نیشان نادا، یا دووبارە بووبێتەوە، وەك لە هێندێ ڕیوایەت ئەگێڕێ، هەرچەند بووبێ تابێ هیچ ژیرێ لێبکاتەوەو لێی سەرسام بێت، چونکە ئەو پەروەردگارەی کە ئەم بوونەوەرەی فەراهەم هێنا لە هیچ ئەبێ هەرچی ویست ببێ‌و بەدی دێت، هەرکەس بیرێ بکاتەوە لەم هێزو وزەو شتە نهێنیانە کە خوا دای هێنان‌و بەرەبەرە دەرئەکەون، هەرکەس بیرێ لەوانە بکاتەوە، نابێ سەر بکاتەوە لە هیچ کارێکی تری ئەو خوایە، هیچ سەر لەشتی وا ناکەینەوەو بەڵام خۆیشمان خەریك ناکەین بەو هەموو ڕیوایەتە جۆر بە جۆرانەی کە بڵاوبوونەتەوە لە کتێبەکانی تەفسیردا کە دڵنیانین لە ڕاستیان‌و زۆربەیان لەو ئیسرائیلیانەن کە ئاشکرایە دەلەسەو دەست هەڵبەستن.

خوای میهرەبان لەو چۆڵ‌و بیابان‌و گەرمایەدا ئەو خۆراك‌و خواردەمەنی بە پاك‌و خاوێنەی بۆ فەراهەم هێنان بەو جۆرو شێوە کەس نەدیوە، وە بەسێبەری هەور فێنکی بۆ سازاندن، کەواتە ئەوبوایە زۆر بە کەشخەو شادمانیەوە سەری بەندەیان داخستایەو دامەزراندایە لەسەر ئەو بارو خۆراکەی کە خوا پێیدان، بەڵام هەر دەروونێ کە تێکچوو، وە هەر سورشتی کە گۆڕاو شێوا چاکی لێ ئەبێ بە خراپ‌و خراپی لێ ئەبێ بە چاك، لەبەر ئەوە ئەوانە بیریان نەئەکردەوە لەمە کە خوا ڕزگاری کردن لەو ژیانە پەست‌و سەرشۆڕیەی کە ساڵەها ئەیان ناڵاند یە دەستییەوە، وە لەباتی ئەوە بیری ینیسك‌و سیرو پیازو ترۆزیەکەی ئەو سایان ئەکردەوەو بە سۆزو پەرۆشەوە داوایان ئەکرد، وە لێرەدا دەست نیشان بۆ ئەکات‌و ئەیداتەوە بە ناوچاویاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ﴾ باسی ئەوکاتەو بیر لەو کاتە بکەنەوە کە گوتتان: ﴿يَٰمُوسَىٰ﴾ ئەی موسا ﴿لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ﴾ هەرگیز ئێمە بۆ ناگیرێ‌و ئارام ناگرین بەسەر یەك جۆر خۆراکەوە ﴿فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ کەواتە داوا بکە لە پەروەردگارت ﴿يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ﴾ تا دەر بێنێ بۆمان لەوەی کە زەوی ئەیڕوێنێ ﴿مِنۢ بَقۡلِهَا﴾ لەگیاو سەوزیەکەی، ﴿وَقِثَّآئِهَا﴾ وە ترۆزیەکەی ﴿وَفُومِهَا﴾ وە سرەکەوی، یا گەنم‌و ئەو دانەوێڵانەی کە نانیان لێ ئەکرێ،

وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ

﴿وَعَدَسِهَا﴾ وه نیسکەکەی، ﴿وَبَصَلِهَا﴾ وه پیازەکەی، واته خۆراکی جۆر جۆرو جیاوازی ترمان ئەوێ، ئینجا لەبەر ئەوەی داواکەیان بێ‌جێ‌بوو (موسا)(علیه السلام) بەسەرزەنشت کردن‌و بێزاری دەربڕینەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ﴾ ئایا ئێوە شتێ داوا ئەکەن بۆ خۆتان کە پەست‌و کەم نرخە ﴿بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ﴾ لە باتی شتێ کە ئەو بەرزو بەنرخ ترو باشترە؟ بێ‌گومان گەزۆو گۆشتەکەیان خۆشترو پاك‌و خاوێن تربوو، وە حەڵاڵ ترو بێ‌ئەرك بوو، وە شتێکی زۆر بە نرخ‌و نایاب بوو، بەڵام وەك لە پێشەوە گوتمان چی ئەکەیت لە دەست دەروونی شێواو سروشتی گۆڕاو؟! ﴿ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا﴾ دابەزن بۆ ناو شارێك یا بۆ وڵاتەکەی جارانتان کە ناوی (مصر)ە، واتە ئەوەی کە ئێوە داوای ئەکەن داواو نزای ناوێ وەك ئاوو خۆراکەکەی ئێرەتان، بەڵکو بەبێ داواو نزا لەو شوێنانە خوا ئەو خۆراکانەی دروستکردووە بە زۆری، یا مەبەست سەرزەنشت کردن‌و تانەو تەشەر لێ دانیانە، واتە ئێوە ژیانی ڕێزو بەرزی‌و سەربەستیتان ناوێ‌و هەر فێری سەرشۆڕی‌و ژێر دەستەیین، کەواتە بگەڕێنەوە بۆ (مصر)ەکەی جارانتان‌و ئەو ژیانە پەستە... لەوێ نیسك‌و پیازو ئەوشتانەتان دەست ئەکەوێ، بەسەر شۆڕی، سەری تێ‌بکەن‌و واز بێنن لەم ژیانە بەرزەو لەوکارو فەرمانە گەورە گرنگەکەی کە داواتان لێکراوە، لەسەر هەر بار دابەزن بۆ ئەوێ ﴿فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾ چونکە بێ‌گومان لەوێ هەیە بۆتان ئەوەی داواتانکرد.

خوای میهرەبان چاکەو بەهرەی خۆی ڕشت بەسەر ئەوەی (ئیسرائیل)دا لە هەموو لایەکەوە، بەڵام ئەوان سپڵەو ناسوپاس بوون لەبەرئەوە چاکەو بەهرەکانی خۆی لێ گرتنەوەو بەم جۆرەی لێکردن کە ئەفەرموێ: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ﴾ هەڵدرا بە سەریانەوەو چوار دەوریان درا بە زەبوونی‌و سەرشۆڕی‌و هەژاری‌و بێ نەوایی، بەوێنەی خێوەتی کە هەڵدرێ بەسەر هەرکەسێکەوە، ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ وە گەڕان بە شیاوو شایستە بە خەشمێکی گەورە لەلایەن خواوە،

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟
يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ
ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەیان دەربارە کراو بەسەریان هات بە هۆی ئەوەوە کە ئەوانە بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی خواو ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگە گەورانەی کە نیشانیاندرا، ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ وە پێغەمبەرەکانیان ئەکوشت بە ناهەق و ناڕەوا بەلای خۆشیانەوە، واتە هەرچۆنێ ناهەق و ناڕەوا بوو خۆشیان ئەیان زانی و هیچ بڕوبیانوویەکیان بە دەستەوە نەبوو، بەڵکو بە ئارەزووی خۆیان ئەیان ویست ستەم و دەست درێژی بکەن، چونکە دەقیان گرتبوو بە تاوان و خراپەکاری و دەست درێژییەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾ ئەو بێبڕوایی و کوشتنی ناهەق و ناڕەواش بە هۆی ئەوەوە بوو کە یاخی بوون وە هەموو جارێ دەست درێژییان ئەکرد، واتە فێری یاخی بوون و دەست درێژی بوو بوون، بەهۆی ئەوەوە زیادە ڕەویان کرد تا ئەو ڕادەیە بێبڕوا بوون و پێغەمبەرانیان کوشت، ئینجا خوایش ئەوەی بەسەر هێنان کە سەرشۆڕی کردن و دوژمنی بەسەردا زاڵ کردن و پرژو بڵاوی کردنەوە بە وڵاتاندا بەلاتی و کەم دارایی، بە تایبەتی لەرچاو برسێتی و چرووکی و لاتی دەروون کە هیچ گەلێ لە جیهاندا وەك ئەوان دووچار نییە بەو دەردەوە[1] وە هەرچیان بەسەرهاتبێ و بەسەریان بێت ماڨ خۆیانە، چونکە لە مێژووی هیچ گەلێ لە گەلەکانی جێهاندا نەبینراوەو نەبیستراوە ئەوەی کە لەم گەلەوە ڕوویدا لەدڵ ڕەقی و دەست درێژی و یاخی بوون و سپڵەیی دەربارەی ڕێگەنیشان دەرو ڕێنموونی کەرانیان، ژمارەیە لە پێغەمبەرەکانیان سەربڕی و بە مشار دایان هێنان، وە لە هەموو مەیدانێکی خراپی و نا پیاویدا پێشەواو سەر دەستە بوون!! وە لەگەڵ ئەوەدا لە قسەی زل زل نەئەکەوتن و لاڨ سەیریان لێ ئەدا، هەمیشە ئەیان وت: هەر خۆیان ڕێی ڕاستیان داوەتە بەر، وە ئەوان گەلی هەڵبژێراوی خوان، وە پاداشتی خوا هەر بۆ ئەوان ئەبێ،

---

[1] پشت بە خوای گەورەی لە سورەتی ﴿آل عمران﴾دا ئەم باسە درێژە پێ ئەدەین، کەواتە با لێرەدا ئەم ئەندازەیە بەس بێت.

وه فەزڵو بەهرەی خوا هەر بۆ ئەوان بێت... ئینجا قورئان لێرەدا تێهەڵکێشی ئەمێنێ بەدوای ئەو هەڕەشەی کە باسی پێشووی پێداوپی هێنا، وه هەم ئەو لاف لێدەرانەی پێ بەدرۆ خستەوەو دەم کەوتی کردن، وه بڕیارو یاسایەکی گشتی دەکرد لەبارەی بڕواو ئایینو عەقیدەوە، وه لەبارەی یەکێتی ئایینی خواوە، وه ڕوونی کردەوە کە فەزڵو بەهرەی خوا تەرخان نییە بۆ هیچ گەلو تیرەو ڕەگەزێکی تایبەتی، بەڵکو بۆ هەموو بڕوادارانە، لە هەر چەرخیو لە هەر شوێنێ، هەرکەس بە پێی ئەو ئایینە کە لەسەری بووە، هەتا پەیامێ تر هاتبێ بە دوایداو ئایینێکی هێنابێ کە پێویست کرابێ لەسەر هەموو بڕواداران بیگرنە گەردنو بچنە ژێر ئاڵای، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێنا، واتەموسڵمانانی ئەم ئوممەتە[1] بەڕاستوناپاکییەوە،﴿وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾وەئەوانەی کەلەسەر ئایینی یەهودن، ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ وه مەسیحیەکان، ﴿وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ وەئەوانەی کەلەپێش ئیسلامدا لەناو بت پەرستەکانی عەرەبدا لایاندا لە بت پەرستیو گەڕانەوە بۆلای ئایینی خواپەرستی بە تەنهاو گەڕانەوە بۆ ئایینی ئیبراهیمی خەلیل ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ هەرکەس لەوانە بە ڕێکی بڕوای هێنابێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ وه کردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، بۆ ئەوانە هەیە پاداشتی خۆیان لای پەروەردگاریان ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ وه هیچ مەترسییە نییە لەسەریان لە ڕۆژی دواییدا لەکاتێکدا بێبڕوایان مەترسی ئەکەن لە تۆڵەو سزا، ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وه ئەوانە غەمبار نابن لە کەمو کوڕیو پاداشت، کەواتە هەر بڕواو عەقیدەی ڕاستو کردەوەی چاك جێگای ئومێدە، نەك نەسەبو نەژادو تیرەو هیچ شتیتر، وه بێگومان شتێکی ئاشکرایە دان ئان بە هەرکام لەو عەقیدەو ئایینانە بۆ کاتو چەرخی تایبەتی خۆیانە، ئەگینا دوای هاتنی ئیسلام هیچ ئایینو عەقیدەیە تر بەهیچ ڕەنگ نرخی نییە لای خوا، بێجگە لەم ئایینی ئیسلامە، وه هیچ کردەوەیەکی چاك سوودی نییە کە بنەڕەتەکەی ئیسلام نەبێو لەسەر ئەم دانەمەزرابێو بەپێی بەرنامەی ئەم نەبێت، وەهەرکەس لەسەر هەر ئایینێ تر بێتو بڕوا نەهێنێ بە ئیسلام لە ڕۆژی دواییدا بێ بڕانەوە لە ئاگردایە، مەگەر لەم جیهانەدا ناوی ئیسلامی نەبیستبێو بێ ئاگا بێت لە ئیسلام،

---

[1] ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە پێنج جۆری تریش تەفسیرکراوەتەوە، بەلام ئەمەی کەلە تەفسیرەکەدایە چاکتر لە دڵدا ئەچەسپێ، وەزانینی تەواو هەر لای خوایە.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ

**ئینجا باسی بەھرەو ھەڵوێستێ تری (ئیسرائیل)یەکانی پێشوو ئەکاتو ئەیداتەوە بە ناوچاوی جوولەکەکانی مەدینەدا کە یەکەم تاقم بوون لە جوولەکە کەئەم قورئانەیان بیست، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە پەیمانو بەڵێنمان لێ وەرگرتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ وە شاخی (طور)مان بەرز کردەوە بە لاسەرتانەوە، وە گوتمان پێتان: ﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ ئەو نامەیەی کە پێماندانو فەرمانمان پێدان وەری گرن بە هێزو بە توندی، وە بە کۆششو تێکۆشانو بە بڕ سستیو گوێ پێنەدان، ﴿وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ﴾ وە ئەوەی کە تیایەتی بیڵێنو بیخوێننو لە بەری بکەنو بیری لێبکەنەوە، وە لەبیری مەکەنو ڕەفتاری پێبکەن ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکو بە هۆی ئەوەوە بپارێزن لە هۆی خەشمو سزای خوا، واتە بە ئومێدو چاوەڕوان بن بۆ ئەوە، باسی ئەو پەیمانەی کە خوا وەری گرت لێیان بەدرێژیی هاتووە لە چەند سورەتێکی قورئاندا، وە هەندێکی لەم سورەتەدا دێت لەمەوپاش، وە کورتەکەی بریتیبووە لە وەرگرتنی تەوراتو ڕەفتار کردن پێی، وە لێرەدا بڕوا وایە ئەمە مەبەستێ بێت، وەك دەرئەکەوێ لە ڕیوایەتی (ئەبو حاتم)ەوە کە ئەیگێڕێتەوە لە (ئیبنو عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە (موسا)(علیه السلام) کاتێ تەوراتی بۆ هێنان کە داواو فەرمانی بە ئەركو نارەحەتی تیا بوو، (ئیسرائیل)یەکان مل پێچیان کرد لەوەرگرتنی، ئینجا خوا فەرمانی بە جوبرەئیل کە ئەو شاخە هەڵکەنێو ڕاگیری بکات بەلای سەریانەوە هەتا ترسانو لایان وابوو کە ئەکەوێ بەسەریاندا، لەبەرئەوە ملکەچ بوونو وەریان گرت، کەواتە ئەو وەرگرتنە بە زۆر پێهێنانو ناچار کردن بوو، نەك بە پێخۆش بوونو خۆشی سەری خۆیان، ئینجا لێرەدا گرێیە پەیدا ئەبێتو پێویستە بە کردنەوەی ئەو گرێیە، گرێیەکەش ئەمەیەکە ئەو زۆر پێهێنانە چۆن یەك ئەکەوێت لەگەڵ ئەوەی کە خوا ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ﴾ لە ئاییندا زۆر پێهێنان نییە، وە هەروەها لەگەڵ ئەم یاسا ئیسلامیەدا: کە هەرچی خوا داوای ئەکات لە بەندەکانی ئەبێ لەوانە بێت بە خواهیشو هەڵبژاردنی خۆیان هەڵسن پێی؟ لەوەڵامدائەڵێین وئەوگرێیەئەکەینەوە بەم شێوەیەی کە دێت:**

١- ئەو ناچار کردن و زۆر پێهێنانە شتێکی کاتی و تایبەتی بووە بەو ئوممەتو شەریعەتەوەو چارەسەری ناڵەباری و سەرکێشی ئەوانی پێکراوە، جا لەبەر ئەوە ئەو گوێ ڕایەڵییە ناچاریەیان لێ وەرگیراوە.

٢- ئەو ناچار کردن و زۆر پێهێنانە.بۆ بڕوا هێنان نەبووە، بەڵکو بۆ کردەوەو ڕەفتار کردن بووە بەو بڕیارانەی کەلە توراتدا هاتبوون، دەی لەو ئایەتەیشدا مەبەست ئەوەیە زۆر پێهێنان لەسەر بڕوا هێنان نییە، بەڵکو لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمان بەرییە، وە لە گوێڕایەڵی و فەرمان بەریدا پێخۆش بوون پێویست نییە، بەڵکو خواهیش و هەڵبژاردن مەرج و پێویستە کە زۆر جار پێخۆش بوونی لەگەڵ نابێ، واتە زۆر شت هەیە بە خواهیش و هەڵبژاردن ئەکرێ لەگەڵ ئەوەیشدا ناخۆش و بێزارەوە.

٣- مەبەست ئەو ئایەتە ئەوەیە کە ئایین شتێ نییە بە زۆر بچێتە دڵەوە، وە بەزۆر ناچەسپێ لەدڵدا، بەڵکوشتێکەبەبیرلێکردنەوەو دڵنیا بوون جێگیر ئەبێ لە دەروونداا.

ئەگەر مەبەست بەو ئایەتەو وێنەی جڵەوگیری بێت لە زۆر پێهێنان، ئینجا ئەڵێین بڕیاری ئەو ئایەتە تایبەتییە بە نامەدارو ــ أهل الکتاب ــ ەوە کە بە جەنگ نەکردن و سەرانە دان و وازیان لێ ئەهێنرێ و لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا ئەژین و پارێزگاری مافیشیان ئەکرێ: یان ئەڵێین: بڕیاری ئەو ئایەتە سڕاوەتەوە بە ئایەتەکانی جەنگ و کوشتار، وەك لەو حەدیسە ــ صحیح ــ ەیشەوە دەرئەکەوێ کەلە کتێبە بڕوا پێکراوەکاندا هاتووە (أمرتُ أن أُقاتل الناس حتي یشهدوا أن لا إلـه إلا الله...) فەرمانم پیا دراوە جەنگ بکەم لەگەڵ مەردوم هەتا شایەتمان دێنن... هتد، کەواتە ئەو زۆر پێهێنانی ئیسرائیلیانە وەك ئەم جەنگ و کەشتاری وایە لەم ئوممەتەداو هیچ دژایەتی نییە لە بەینیاندا، ئینجا بابێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ لەپاش ئەوەی بەو جۆرو شێوەیە پەیمانمان لێ وەرگرتن، ئینجا ڕووتان وەرگێڕاو پشتتان تێکرد، واتە هەڵگەڕانەوە لەو پەیمانەو سەرپێچیتان کرد لە فەرمان، وە لەگەڵ ئەوەشدا هەر میهرەبانی و بەزەیی خوا فریایان کەوتەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئینجا ئەگەر بەهرەو میهرەبانی و بەزەیی خوا نەئەبوو بەسەرتانەوە، بەم ڕەنگە یارمەتیدان بۆ گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە، وە لێیشی وەرگرتن، یا مۆڵەتی دان و پەلەی نەکرد بۆ سزادانتان، ئەگەر ئەو بەهرەو میهرەبانییە نەبوایە،

﴿لَكُنتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئێوە لەزیان کەران ئەبوون و وتیا ئەچوون. ئینجا بێ پەیمانی و بێبارییە تریان ئەداتەوە بە ناو چاویاندا، وە دەستەپاپەییان لە گوێڕایەڵی و فەرمان بەریدا، وە خۆ نەگرتنیان بەرامبەر ئارەزووی نەفس و سوودو دەستکەوتێکی کەمی ئەم جیهانەدا، بەهۆی ئەوەوە خۆیان خستە بەر تۆڵەی سەختی خوا.

ئەوانە داوایانکرد کە ڕۆژێکی پیرۆزیان بۆ دیاری بکرێ کە هەر خوا پەرستی تیا بکەن و واز بێنن لەکارو فەرمانی ژیان لەو ڕۆژەدا، خوایش ڕۆژی شەممەی بۆ دانان، وە ئەوانە دانیشتووی شارێ بوون لە تەنیشت دەریادا، ئینجا خوا تاقیکردنەوە بە ماسی) کەلە ڕۆژی شەممەدا بەزۆری دەرئەکەوتن و لە ڕۆژەکانی ترا خۆیان ئەشاردەوە! ئینجا ئەوانە خۆیان بۆ نەگیراو لەو تاقیکردنەوەدا دەرنەچوون، بەڵکو دەست درێژیانکردو پەیمانەکەیان شکاند بە شێوەی فێڵ و تەڵەکە بەم ڕەنگە حەوزو کەنداویان هەڵکەندو جۆگەیان لە دەریاکەوە بۆ بردنەوە، ئینجا لەو ڕۆژی شەممەدا ماسی لەدەریاکەوە ئەهاتنە ناو حەوزو کەنداوەکانەوە، ئینجا بەربەستیان ئەکردن و ئەیان بچڕین لە دەراکەو ئەمانەوە لە حەوزو کەنداوەکاندا، لە ڕۆژی شەممەدا بەو جۆرەیان ئەکردو لە ڕۆژی یەك شەممەدا ئەیان گرتن، ئەم بەسەرهاتە وەك لە شوێنی تردا باسی فەرمووە هەروەها لای جوولەکەکان شتێکی بەناوبانگی ناسراو بووە، لەبەرئەوە ڕووی فەرموودەکەی کردە خۆیان و فەرمووی: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ سوێند بەخوا زانیوتانە و ئاگادارن بەوانەی کە دەست درێژیانکرد لە شەممەدا، لە ڕێزی شەممەو لە بڕیاری خوا بۆ ئەو ڕۆژە.

ئەوانە بەو جۆرە پەیمانی خوایان شکاند، وە بەهۆی ئەو بێباری و بەرگە نەگرتن و شوێن کەوتنی ئارەزووی نەفسەوە لە پلەی بەرزی ئادەمیێتی خۆیان هێنایە خوارەوە بۆ ڕادەی چوار پێ و گیان لەبەرانی تر کە عەزم و بڕیاریان نییە و خۆیان بۆ ناگیرێ بەرامبەر داواو ئارەزووی سکیان،

فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾

---

کەواتە شایستەی ئەم تۆڵەیە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ﴾ ئینجا ئێمەش پێمان وتن ﴿كُونُواْ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ﴾ ببن بە مەیموون، بەڕیسوایی و بێئابڕووی و سەر شۆڕیی، واتە لە تۆڵەی ئەو دەست درێژییەدا خوا ویستی ببن بە مەیموون و ڕیسواو بێئابڕوو بن، ئینجا ئەوەی خوا ویستی دەست بەجێ بەسەریان هات، ئیتر ئایا شێوەی ئادەمی لەسەر لەشیان نەمابێت و شێوەی مەیموونیان بەسەردا کێشرابێ؟ وەك زۆربەو کۆڕی زانایانی تەفسیر ئەفەرموون، یان مەبەست گۆڕانێکی دەروونیان بێت، بەم ڕەنگە لە هەست و خواست و ڕەوشتدا وەك مەیموونیان لێ هاتبێ، وەك (مجاهد)و چەند کەسێ ئەفەرموون، بەڵام باری یەکەم بەهێزەو بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز لادان لێی ڕەوا نییە لەبەر چەند هۆیەك:

١- ڕای یەکەم ڕێکە لەگەڵ دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکە، وە شتێکی ئاشکرایە کەبە بێبەڵگەیەکی ڕاست و ڕەوا لانادرێ لە دیمەن و ڕواڵەتی ئایەت و حەدیس.

٢- (ئیمامی موسلیم) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن و مەسعود)ەوە کە پیاوێك پرسیار ئەکات لە پێغەمبەر (ﷺ) بەبارەی مەیموون و بەرازەوە کە ئایا لەو ئادەمیانەن کە کراون ئەمان؟ ئەویش لە وەڵاما ئەفەرموێ: خوا هەر گەلێکی لەناو بردبێ یا سزای دابێ لەمەوبەر، بە تەواوی لە ڕەگ و ڕیشەی هێناون نەوەو بنەمای نەهێڵاونەتەوە بۆ دوای خۆیان، وە مەیموون و بەراز لە پێش ئەوەوە بوون، واتە پێش ئەوەی هێندێ ئادەمی بکرێن بە مەیموون و بەراز، دەی شتێکی ڕوونە کە ئەو پرسیارکەرە باوەڕی وابووە کە ئەو ئادەمیانە شێوەیان بە تەواوی گۆڕاوە بە مەیموون و بەراز، بەڵام گومانی لەوەدا بووە کەئایا مەیموون و بەراز هەر لەو ئادەمیانەوە پەیدا بوون، یان لە پێشیشەوە هەر بوون؟ ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) وەڵام و بەرپەرچی گومانەکەی دایەوە کە ئەو دوو گیان لەبەرە لە پێشەوە بوون، نەك لە بنەڕەتدا هەر ئەو ئادەمیانە بووبن، وە بێدەنگ بوو لەو بارەکەی تر کە پرسیارکەرەکە لەسەری بوو، وە بێدەنگ بوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەشتی وا بڕیار دانە لەسەری، ئەگینا ئەبوایە بەرپەرچی ئەویشی بدایەتەوە، وەك بەرپەرچی گومانەکەی دایەوە.

٣- ئەو باری یەکەمە بەبێ گیروگرفت و قۆرت و گرێ زۆر گونجاو و پەیوەستە لەگەڵ ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَاهَا نَكَالًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا﴾ ئینجا ئەو گۆڕان و ڕووداوەمان گێڕا بە تەمێ دادان و بەرگری بۆ ئەو چین و تاقمەی کە لەو کاتەدا بوون و ئادەمی بوون ﴿وَمَا خَلْفَهَا﴾ وە بۆ ئەو چین و تاقمانەی پاش ئەوان و داهاتوو، کە ئەوەیان ویستبێ ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وە گێڕمان بە ئامۆژگاری بۆ هەموو لە خواترسەکان لە هەموو گەل و میللەتێ، چونکە بەو گۆڕانە ئاشکرایە مەردوم تەمێ خوار ئەبێ، نەك هەر بە گۆڕانی دەروونی کە بەچاو نابینرێ، وە بەداڕنینی شێوەی شیرینی ئادەمی و گۆڕانی بە شێوەی بێزراوی مەیموون خراپ بەرگری ئەکرێ لە خراپەکاری، ئینجا ئەو گۆڕانە لەشییە بە تەنها بەسە بۆ ئەو تۆڵەیە و ئیتر پێویست نەبوو بە گۆڕان لەبارەی ژیریی و زانین و تێگەیشتنەوە، بەڵکو پێویشت بووە مانەوەی ژیریی و زانینیان بۆ ئەوەی بزانێ چیان بەسەر هاتووە، تا بە ئێش و سزای دەروونییەوە بتلێنەوە، وەك وەرئەگیرێ لە هێندێ ڕیوایەتیشەوە کە ئەوانەی ئەوەیان بەسەرهات کەس و کاری خۆیانیان ناسی و ئەوان ئەمانیان نەئەناسی، ئەو کەس وکارەیان کە موسڵمان بوون و لەکاتی خۆیدا ئامۆژگاری ئەمانیان ئەکرد بەلە خوا ترسان و کۆتایی هێنان بە گوناهو تاوان، چونکە ئەو گەلە بوون بە سێ تاقم: یەکەم: بەرگری کەر. دووەم: بێ دەنگ لەو گوناهە. سێیەم: گوناهکار.

یەکەم ڕزگار بوو، دووەم وەك سێیەم دووچاری بوون، ئەو دووەمەی کە وەك زۆربەی موسڵمانی ئێستا هەقی بەسەر هیچ شتێکەوە نییە و ئەڵێ من لە هیچ شتێکدا نیم و هەقیشم بەسەر هیچ شتێکەوە نییە، وە ئەگێڕنەوە کە هی وا بوو خزمی ئەچوو بۆلای ئەو دووچار بووانە، ئیتر ئەی ناسیەوە، یا نە ؟ وە پێی ئەوت: ئایا من بەرگری و جڵەوگیریم نەکردی؟ ئەویش بە دەست نیشان ئەی وت: بەڵێ و فرمێسك بە چاویدا ئەهاتە خوارەوە.

لێرەدا باسی گۆڕانی بە بەراز نەکردن وەك لە سورەتی ﴿المائدة﴾دا ئەفەرموێ، لەبەر ئەوە ئەوانە تاقمێ تر بوون لە (ئیسرائیل)ی پاش ڕەوانە کردنی (عیسا) پێغەمبەر (ﷺ) یا بەبۆنەی ئەوێ لێرەش ئەزانرێ وەك ئەگێڕنەوە لە (قتادة)وە گەنجەکانیان بوون بە مەیموون و پیرەکانیان بوون بە بەراز. ئینجا داستان و بەسەرهاتێ تریان ئەگێڕێتەوە کە لاری و نالەباری و مل پێچیان دەرئەخات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان، وە لەبەر ئەوەی گێڕانەوەکەی یەکەم جارو لە شوێنی تردا باسی نەکردووە بە درێژیی باسی ئەکات.

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةًۭ ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًۭا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾

کورتەی بەسەرهاتەکە ئەوەیە: کە (ئیسرائیل)یەکان پیاوێکیان کوشت لە خۆیان، ئینجا هەرکەس کوشتنەکەی لە مل خۆی ئەکردەوەو ئەینا بەسەر یەکێ تردا، ئینجا خوای گەورە فەرمانیدا بەسەربڕینی ڕەشەوڵاخێك، وە بەگۆشتی ئەو سەربڕاوە بدەن لە مردووەکە، تا بەهۆی ئەوەوە خوا زیندووی بکاتەوەو ڕاستی بڵێ لە بکوژەکەی‌و گومان‌و دوو دڵی تیا نەمێنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ باسی ئەوکاتە بکەن کە (موسا) وتی بە گەلەکەی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةًۭ﴾ بەڕاستی خوا فەرمانتان پێئەدات کە مانگایەك سەربڕن، بێگومان ئەمە فەرمانی پێغەمبەرەکەیان بوو کە ڕزگاری کردن‌و ئەو هەموو موعجیزەیان لەسەر دەستی دابینی، وە فەرمانەکەشی لەلایەن خواوە پێئەگەیاندن، کەواتە ئەبوایە بە بێوەستان‌و سەرلێکردنەوە دەست بەجێ فەرمان بەریان بکردایە، کەچی ج جای ئەوە زۆر بە نەفامی‌و بێشەرمی وەڵامیان دایەوە، بەم ڕەنگە ﴿قَالُوٓا۟﴾ وتیان: ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًۭا﴾ ئایا لاقرتیمان پێئەکەیت؟ تا ئەو ڕادەیە نەفام بوون ڕەوایان ئەدا کە پێغەمبەرێکی ئاوا گەورە لاقرتی بکات بەوناوو فەرمانی خوا!! ئینجا (موسا)(علیه السلام) وەڵام‌و بەرپەچی نەفامی‌و بێشەرمی ئەوانی دایەوە، بە نەرم‌و نیانی، وە بەشێوەیەکی ناسك گەڕاندنیەوە بۆ ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی شەرم‌و ئەدەب لە پەروەردگار، وەتێی گەیاندن کە ئەو گومانی ئەوانە شایستە نییەو هەرکەس نەفام‌و نەزان نەبێت شتی وا بە لاقرتیەوە نالێت: ﴿قَالَ﴾ موسا وتی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ من پەنا ئەگرم بە خوا لەمەی کە یەکێ‌بم لە نەفام‌و نەزانان، بەم ڕەنگە کردەوەی ئەوان بکەم.

ئەبوایە تەنها ئەو تەمێیان بەس بووایە، هەر بەوە بگەڕانایە تەوە بۆلای خواو فەرمانەکەیان بەجێ بهێنایە، بەڵام چی ئەکەیت لەگەڵ ئەوانە کە بارو سروشت شێواو بوون! بەڵێ، ئینجا ئەیان توانی دەستیان ببردایە بۆ هەر جۆرە وڵاخێ‌و یەکێکیان بهێنایەو سەریان بڕیایە، ئەو حەلە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان ئەبوون، بەڵام لارو نالەبار بوون، بەو جۆرەیان نەکرد،

قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ
فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا
بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ

---

**بەڵكو﴿ قَالُوا۟﴾ وتیان بە(موسا): ﴿ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ﴾ داوا بكە بۆمان لەپەروەردگارت تا ڕوونی بكاتەوە بۆمان لەچییە ئەو مانگایە، واتە ناوونیشانی هەڵدا بۆمان.**

**هەرچەند شێوەی پرسیارو داواكەیان ناڕەواو بێ شەرمانە بوو، چونكە وتیان داوابكە لە پەروەردگارت وەك تەنیا پەروەردگاری ئەوبێت، نەك خۆیشیان، وە وەك ئەم شتە مەبەستو پێویست تەبێ بۆیان، بەڵكو هەر مەبەستو پێویستی خواو (موسا) بێت، هەرچەند ئەوان بەو جۆرە بوون، بەڵام بە پێی سروشتی پاكی پێغەمبەرێتی (موسا) گوێی نەدا بەوە، بەڵكو داوایكرد لە خوا ڕوونی بكاتەوە، خوایش ڕوونی كردەوە بەم جۆرەی كە (موسا) ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ بێگومان خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ﴾ كە ئەوە مانگایەكە ﴿لَّا فَارِضٌ﴾ نە پیرە كەلە سك نیشتبێتەوە ﴿وَلَا بِكْرٌ﴾ وە نە تازە پێگەیشتوویشە كە هێشتا ئاوس نەبووبێ، واتە نە زۆر جوانە، بەڵكو ﴿عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ﴾ میانەیە لە بەینی ئەو دوو تەمەنەدا كە باسكرا، ئینجا ئامۆژگاری كردنو هانیدان لەسەر فەرمان بەری، فەرمووی: ﴿فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ﴾ كەواتە ئەوەی كە فەرمانتان پێدراوە بیكەنو بەجێی بێنن، وە بێگومان ئەگەر لار نەبوونایە ئەمەیان بەس بوو، ئیتر لەسەری نەڕۆشتنایەو ولاخێكی نە پیرو نە جوانیان سەر بڕیایەو بە هۆی ئەوەوە ڕزگار ئەبوون لە نا فەرمانیو خۆیان نەئەخستە تەنگیو گرێ، بەڵام نەفس بەدبەخت بوون، لەبەر ئەوە وازیان نەهێناو هەمی تر ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان بە (موسا) ﴿ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ﴾ داواو پرسیار بكە لە پەروەردگارت تا ڕوونی بكاتەوە كە ڕەنگی چۆنە؟ ئەویش پرسیارو داوایكردو خوایش ئاگاداری كرد بەمەی كە ﴿قَالَ﴾ (موسا) پێی فەرموون: ﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ بێگومان خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ﴾ كە ئەوە مانگایەكی زەردە كە**

فَاقِعٌ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ

---

**﴿فَاقِعٌ لَّوۡنُهَا﴾ ڕەنگەکەی زەردی تەواوە ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ سەرنج دەرانی کەیف خۆش و سەرسام ئەکات، ئەوەندە شیرین و تێرو تەواوە! ئەوانە هێشتا بەوەش کۆتاییان نەهێنا، بەڵکو جارێ تری: ﴿قَالُواْ﴾ وتیان بە (موسا): ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ پرسیارو داوا بکە لە پەروەردگارت تا ڕوونی بکاتەوە بۆمان کە ئەو مانگایە چییە؟ چونکە: ﴿إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا﴾ بەڕاستی ئەو وڵاخە بەو نیشانانەوە شێواو شێواوە لە سەرمان، واتە لەو بابەتانە زۆر هەن و وەك یەك وان، نازانین کام هەڵبژێرین، لەبەرئەوە ئەو هەموو پرسیارەمان کرد ﴿وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە ـ ئەگەر خوا ویستی ـ ڕێبەر ئەبین و ئەوەی کە داوا کراوە لێمان دەستمان ئەکەوێ.**

**لەبەر لاری و گیریی و ملە جەڕەی ملەجەڕەی خۆیان مەسەلەکەیان هەتا هات گرێی تێهات و هەرجارەی چەند سیفەت و نیشانەی زیادکرد، ئەوەتا لەپاش نیشانە پێشووەکان ئەم نیشانانەی تریشی زیاد کە باس ئەکرێن، وە هەرچەند بەهۆی ئەم هەموو نیشانانە بە باشی شتەکەیان ڕوون بوویەوە، بەڵام ئەگەر وایان نەکردایە هەر لە یەکەم جارەوە هەر جۆرە ڕەشەوڵاخێکیان سەر ببڕیایە جێی ئەگرت بۆیان، وەك لە پێشەوە گوتمان، بەڵام ئەوان ملە جەڕەو لاریان بەکار هێنا و خوایش شتەکەی قورسکرد لەسەریان، ﴿قَالَ﴾ (موسا) فەرمووی پێیان: ﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ﴾ بەڕاستی خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٞ﴾ ئەوەی کە فەرمانی پێدراوە مانگایەکە کە ﴿لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ﴾ ژێر بارو موو چێنراو نییە کە زەوی بکێڵێ ﴿وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ﴾ وە کشتوکاڵ ئاو نادات، واتە نەفێری جووتکراوە و نەفێری ئاو هەڵگۆستن لە**

بیرو ڕووبار بۆ ئاوداشتی کشتوکاڵ ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾ پاك کراو پارێزراوە لە عەیبو لەکە ﴿لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ﴾هیچ ڕەنگێکی جیاوازی تیانییە، بەڵکوزەردێکی یەك ڕەنگەبەبێ ڕەنگ‌ویشانەیەکی تر.

لەپاش ئەو هەموو گیروگرفتە هیچ چاریان نەما، ئینجا ﴿قَالُواْ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّۚ﴾ گوتیان: ئامۆژگاری ئێستا ڕاستیەکەت هێناوە ڕوونتکردەوە، واتە لەمەوبەر بۆمان ڕوون نەبوو، ئەوا ئێستا بە تەواوی ڕوونتکردەوە، بەڵام شێوەی‌و وتەکەیان ناڕەواو بێشەرمانەیە، چونکە وا نیشان ئەدات کە هەرچی لە پێشەوە گوتراوە ڕاست نەبووە، یا تا ئێستا نەمان زانی ئەوەی کە ئەیڵێیت ڕاستەو بەڕاستی ئەیڵێیت!

لەپاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت پەیدایانکردو ﴿فَذَبَحُوهَا﴾ ئینجا سەریان بڕی ﴿وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾ لەکاتێکدا نزیك نەبوون لەوەی کە بیکەن‌و سەری بڕن، واتە سستیانی لەبەر بڕینی وڵاخەکەدا ئاشکرا کرد بۆیان، فەرمووی: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَٰٔتُمْ فِيهَاۖ﴾ وە باسی ئەوە بکەن کە یەکێکیان کوشت‌و ئینجا دوبەرە بوون تیایا‌و هەرکەس کوشتنەکەی لەخۆی دوور ئەخستەوەو ئەیدا بە مل ئەوی تردا ﴿وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ وە خواش دەرخەری ئەوەبوو کە ئێوە ئەتان شاردەوە، واتە دەری خست کە کێ ئەو پیاوەی کوشت، بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَاۚ﴾ ئینجا گوتمان بدەن لەو کوژراوە بەهێندێ لەوە سەر بڕاوە، ئەوانیش بە پارچەیەکی ــ ئیتر بە زوبانی یان دڵی یان هەر بەشێکی تری ــ دایان لە کوژراوەکەو بەویستی خوا ئەو کوژراوە بەو لێدانە زیندوو بوویەوەو هەواڵیدا کە فلان کوشتمی، ئیتر بەوە گومان‌و دوو دڵی‌و دوو بەرەکی نەما لە ناسینی بکوژەکەدا، وەلەپاش ئەو هەواڵ دانە ئیتر مردەوە، بێ‌گومان هەرکەس ژیر بێت نابێ سەری سووڕبمێنێ لەشتی واو سەری لێ بکاتەوە، چونکە ئەو خوایەی کە ئەم ئادەمییەی دروستکرد لە خۆڵێکی هەست‌و بێ‌گیان، ئەتوانێ لەدوای بێ‌گیانکردن‌و مراندنی جارێ تر گیانەکەی بداتەوە، بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە سەرکردنەوە لەم جۆرە شتانە! هەرچۆن لە یەکەم جارەوە گیانیدا بەبێ گیان، هەروەها بێ‌گیانی ئەکاتەوەو هەمیتر گیانی پێ‌ئەداتەوە، ئینجا ئایا بۆچی لەم ڕێگەوە زیندووی کردەوەو بۆچی لەڕێوە بە بێ‌هیچ هۆیەك زیندووی نەکردەوە؟ وە ئایا پەیوەندی ئەو وڵاخە سەر بڕاوە چییە بەو کوژراوەوە؟ وە بەشێ لەو بێ‌گیانە بۆچی

ئەبێ بەهۆی گیان دانەوەی ئەو کوژراوە؟ ئەمانەو وێنەی ئەمانە هەر خوا خۆی ئەزانێ، وە ئەم جۆرە شتانە هۆیەکی ئاشکران کە دەسەڵاتوتوانینی بێ سنووری خوامان نیشان ئەدەن، وە ئێمە هەر بەرهەمەکە ئەبینین و ئەناسین، ئیتر نازانین و تێ ناگەین لەو دەسەڵاتو توانینەو لە ڕەوشتو ڕێگەی ئیش و کار کردنی، بەڵێ زانایان چەند حیکمەتو بەرژەوەندییەکیان باسکردووە لەم مەسەلەدا، بە جوانی ئەزانم ئاماژە بۆ کردنیان:

١- سەر بڕینی ئەو وڵاخە لەسەر فەرمانی خوا عیبادەتو خواپەرستییەو مایەی پاداشتو ڕەزامەندیو لێبوردنی خوایە.

٢- ئەو ڕووداوە بوو بە تەمێ و دەرس دادان بۆ هەموو بڕوادارێك کە نابێ بە هیچ ڕەنگ سەر بکاتەوە لە فەرمانی خواو سستیو گیرو گرفتی تیا بکات، بەڵکو بەبێ پرسیارو لێکۆڵینەوە چەسپانی بکات بە فەرمان بەریو گوێڕایەڵی، وە هەرکەس گیرو گرفتو لاری بەکار بێنێ شایستەی ئەوەیە توندو تیژی لەگەڵ بکرێتو فەرمانەکەی لەسەر گرانتر بکرێ.

٣- ئەگێڕنەوە کە پیاوێکی خواناس کوڕێکی منالی گوێڕایەڵی بوو، وە گوێرەکەیەکیشی هەبوو، لە پاشان پیاوە خواناسەکە گوێرەکەکەی بەرەڵا کردە ناو پاکژو لەوەڕگا وتی: خوایە ئەمە ئەدەم بە سپاردە بە تۆ بۆ ئەم کوڕەم تا گەورە ئەبێ، ئینجا ئەو گوێرەکەیە بە مانگایەك دەرچوو لەسەر ئەو شێوەو نیشانەیە کە خوا فەرمانیدا بە سەربڕینی، وە بوو لە تاقانە وڵاخی کە (ئیسرائیل)یەکان لەدوایدا ئەگەڕان، بەهۆی ئەوەوە ناچار بوون زۆر بە گران لێیان کڕی، کەواتە خوای میهرەبان بەو تەگبیرە ئەو سوودو قازانجەی گەیاند بەو کوڕە چاکە بە هۆی نزای باوکە خواناسەکەیەوە!

٤- هەرکەس ئەیەوێ سەدەقەو قوربانی بکات با دەست بژێ و چاکترین هەڵبژێرێ بۆی.

٥- زیندوو کردنەوەی ئەو مردووە بە هۆی لێدانی لە پارچەیەك لەو وڵاخە سەربڕاوە بێگیانە، موعجیزەیەکی گەورەبوو کە خوا بە بەرچاویانەوە فەراهەم هێنا، وە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بوو لەسەر ڕاستی زیندوو بوونەوەی پاش مردن بە سووك و ئاسانیو بەبێ ئەرك،

كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ
فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَـٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ
فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ

**وەك دەست نیشانی بۆ ئەكات كە ئەفەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ واتە خوا مردووەكان زیندوو ئەكاتەوە لە ڕۆژی دواییدا هەرچۆنیٚ بینیتان ئەم مردووەی زیندوو كردەوە ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ﴾ وە بەڵگەو نیشانە ڕوونەكان خۆی نیشانتان ئەدات ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی تیٚبگەن و بە گوێرەی ژیریتان ڕەفتار بكەن، وەتا بزانن دەسەڵاتی خوا بیٚسنوورەو هەرچی ویست ئەیكات، وە ئەو كە بتوانیٚ تەنها مردوویە زیندوو بكاتەوە ئەتوانیٚ هەموو مردوویە تریش زیندوو بكاتەوە. لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهات و داستانەی لەسەرەتاكەیەوە دەستی پیٚنەكرد كە بریتییە لە ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا﴾ هەتا ئەگاتە ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بۆ ئەمەی بەدیەمن بیكات بە دوو داستان و بەسەرهات و لەسەر هەركام بە تایبەتی سەرزەنشت و ئەنگیان لیٚ بگریٚ:**

**یەكەم: لەسەر لاقرتی كردنیان بەو فەرمانەی كە ئاڕاستەیانكرا، وە لەسەر لاری و گیرو گرفتیان و چەسپانی نەكردن لە گویٚ ڕایەڵیدا.**

**دووەم: لەسەر ئەو كوشتنی ناهەقەی كە كردیان و ئینجا شاردنەوەو دان نەنانیان پێی هەتا خوا ئاشكرای كرد، ئینجا هەرچەند بە ڕوواڵەت كردی بە دوو بەسەرهات و لە ڕووی ڕاستیشدا یەك بەسەرهاتە، هەرچەند بەو جۆرەی كرد، بەڵام لەپاشا دەست نیشانی كرد بەوەی یەك بەسەرهاتە، ئەوەش بەم ڕەنگە لەبەشی دووەمدا ڕاناوێكی بردەوە بۆ لاخە سەربڕاوەكە كە لەبەشی دووەم دا باسی فەرموو، دەی ئەگەر بەو جۆرەی نەكردایەو داستانەكەی لەسەر ڕیٚزی بگێڕایەتەوە ئەو مەبستە گرنگە پێك نەئەهات!!**

**بیٚگومان ئەبوایە (ئیسرائیل)یەكان بە هۆی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەو ڕووداوو بەسەرهاتە گرنگانەوە كەبە چاوی خۆیان بینیان، بە تایبەتی ئەم ڕووداوی دواییییە، ئەبوایە بە هۆی ئەوانەوە سام و ترسی خوا لەدڵ و دەروونیاندا جیٚگیر ببوایە، وە ملكەچ و**

گوێڕایەڵ‌و نەرم بوونایە، کەچی هەر تەمێیان وەرنەگرت‌و دڵیان نەرم نەبوو هەر سەرکێشی‌و تاوان‌و خراپەکاریان لێ نەبڕا. جا لەبەرئەوە ئەوا جاڕی خراپی لێدان بەم جۆرەی کە ئەفەرمویَ: ﴿ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا دڵتان ڕەق‌و وشل‌و بێ‌خێر بوو لە پاش ئەوەی کە ڕوویدا وباسکرا، لە زیندوو کردنەوەی ئەو مردووەو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە گەورەو ڕوونانە، ﴿فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ﴾ کەواتە دڵەکانتان وەك ئەو بەردانە وان لە وشکی‌و ڕەقی‌و نەرم نەبووندا ﴿أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗ﴾ یان لەبەرد بە تین ترن لە ڕەقی‌و وشکیدا، واتە هەرکەس ئەودڵانە بناسێ‌و بارو حاڵیان بزانێ، ئەیان کات بەوێنەی بەرد یان بە وێنەی شتێ تر کە لەبەرد ڕەق تر بێت وەك ئاسن‌و پۆڵا، ئینجا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە بەتین ترن لەبەرد بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ﴾ بێ‌گومان لەناو بەردا هێنی وا هەیە کە کونی گەورەیان تێ ئەبێ‌و بەرزۆری ڕووبارەکانی لێ هەڵ ئەقوڵێ، ﴿وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ﴾ وە هێنی وا هەیە لەت لەت ئەبێت‌و درزی لێ پەیدا ئەبێ لەباری درێژی یا پانی، ئینجا ئاوی لێدەرئەچێ، ﴿وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ﴾ وە هێنی وایان هەیە لە بەرزەوە دێتە خوارەوە لەبەر بیم‌و ترسی خوا. واتە بەرد هیچ کامی نییە ملکەچ‌و ژێر بار نەبێ بۆ فەرمانی خواو بەبێ سەرپێچی‌و سەرکەشی هەڵئەسێ بەوەی کە خوا ئەیەوێ لێی، بەڵام دڵەکانی ئەوانە یاخییە سەرپێچی ئەکات، کەواتە لەبەرد ڕەق‌و وشك ترن.

سەبارەت بە وشکی‌و ڕەقی‌و بێ خێری ئەو دڵانە قورئان پلە پلە هاتە خوارەوە وەك یەکەم فەرمویێتی: ئەو دڵانە ڕەق ترن لەبەردو وەك هەندێ بەرد خێری زۆر فراوانیان لێ پەیدا نابێ، ئینجا پلەیە هاتە خوارەوە فەرمووی: خێرو بێری کە میشیان نییە بەوێنەی هێندێ بەرد کەلەت ئەبێت‌و درزی تێئەکەوێ‌و ئاوی لێدەردێت، ئینجا هاتە خوارەوە فەرمووی: وەك بێ خێرن هیچیش کاریان لێ ناکات، نەك وەك هێندێ بەرد کە کاریان لێ ئەکرێ‌و لە جێگەی خۆیان ئەترازێن‌و بێ‌گومان ئەمەی هیچ سوودو خێرێکیان ببێ، پەنا ئەگرین بە خوا لەو دڵە ڕەقانە کەبەهیچ ڕەنگ نەرم نابن‌و هیچ بەڵگەو نیشانەو ئامۆژگاریەك کاریان لێناکات، وە بەهیچ کلۆجێ بیم‌و ترسی خوایان نییە، بەڵکو دڵێکی ڕەق‌و وشك‌و بێ خێرو بێ‌بڕوان.

وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ
كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾

---

**کەواتە مافی خۆیانە ئەم هەڕەشە سامناکەیان ئاڕاستە بکرێ لەلایەن خواوە: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ وە بێگومان خوا بێئاگا نییە لەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن.**

**لەبارەی وتەی ﴿مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ﴾ وە چەند ڕایەکی جیاواز هەیە، ئەوەی کەوا پەسەند کراو بێت لای زۆر لە خواناسانەوە ئەمەیە کەلە ڕواڵەتەکەی لانادرێ، بەڵکو بەردو هەرشتێ تر کە ئێمە بەبێ هەستو نیازو هۆشیان دائەنێین، هەموو ئەوانە هەستو هۆشو نیازی تایبەتی خۆیان هەیەو خوای خۆیان ئەناسنو ئەیپەرستنو بیمو ترسیان هەیە لە خوای خۆیان!**

**لێرەدا دواییهات بە یەکەم گەردشو خولانەوە لەگەڵ (ئیسرائیل)یەکان لە مێژووی دوورو درێژیاندا کە پڕە لەلاریو نالەباریو سەرکەشیو یاخی بوونو لەسنووری خوا دەرچوون، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە گەلو کۆمەڵی موسڵمانان هەواڵیان ئەداتێو قسەو باسیان بۆ ئەکات لەبارەی (ئیسرائیل)ی یەکانەوەو کردەوەو ڕەوشتیان ئەخاتە بەرچاوو ئاگاداریان ئەکات بە پیلانو فرو فێڵیان، بۆ ئەمەی نەخەڵەتێن بەقسەو پڕو پاگەندەیان، وە لەدرێژیی ئەو قسەو باسو لێکۆڵینەوە جۆر بە جۆری شێوەو ڕەوشتییەوە دەرئەکەوێ گەورەیی دوژمنایەتیو کینەو پیلانی ئەو جوولەکانە کە بە هەمیشەیی بە کاریان ئەهێنا لەگەڵ گەلو کۆمەڵی موسڵماناندا، وە لەو چەرخەوە تا ئێستاو لەمەو لایش هەر نەوەستاون و هەرناش وەستن، ئەوەی کەلە دەستیان هایبێو لەدەستیان بێت بە کاریان هێناوەو بەکاری ئەهێنن لەدژی ئیسلامو موسڵمانان، بەڵام قورئان دوژمنایەتیو نیازی پیسو پیلانەکانیانی دەرخستو بەرامبەر هەموو ئەوانە تەمێو ئامۆژگاری موسڵمانانی کردو ڕێگەی بەرگریو بەرپەرچ دانەوەی نیشان دان، وە ئاشنارەزای کردن بەهۆی سەرکەوتنو زاڵ بوونیان بەسەر ئەو دوژمنە کوڵ نەدەرەو هەموو دوژمنێ تریاندا، کەواتە لە هەرکاتو چەرخێکدا موسڵمانان شوێنی تەمێو ئامۆژگاریەکانی قورئان بکەنو ئەو ڕێگە بدەنە بەر کە ئەو کێشاوە بۆیان، وە ئەو چەکە بەکار بێنن کە ئەو بۆی ئامادەو دیاری کردون، هەرکات بەو جۆرە بن هیچ باکیان نابێ نەلە جوولەکەو نەلە هیچ دوژمنێ تر، وە سەرکەوتنو زاڵ بوونیان مسۆگەر ئەبێت بەوێنەی زاڵ بوونو سەرکەوتنی یەکەم چینو گەلی ئەم ئوممەتە، وە**

هەرکاتیش لایاندا لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆیان و گوێڕایەڵی تەمێ و ئامۆژگاریەکانی قورئان نەبوون و ئەو کاتە وەك ئەم چەرخەیان بەسەر دێت کە جوولەکە توانی لەناو جەرگەی ئیسلامدا نیشتمان و میرییە بۆ خۆی فەراهەم بێنێ و هەموو مافێ ژێر پێبکات و هەرچی پەن و ڕیسوایی هەیە بە سەر وڵات و بە ناو موسڵمانەکانی بێنێ و بە ئارەزووی پیس و ناپاکی خۆی بەڕاستەو بە چەپەدا ئاژاوە بنێتەوەو خراپەکاری بکات!

دوژمنەکانی ئیسلام بەپاشی تێگەیشتبوون لەوەی کە باسمانکرد و ئەیانزانی موسڵمانان ژێر دەست و زەبوون ناکرێن تەنها بەوە نەبێ کەلا درێن لەڕێگەی قورئان، جا لەبەرئەوە هەوڵ و تەقالای دوژمنەکان، بە تایبەتی جوولەکە هەر بۆ لادانی موسڵمانە و دوور خستنەوەیەتی لە قورئان.

پێغەمبەر (ﷺ)و یارانی زۆر سوور بوون لەسەر موسڵمان بوونی جوولەکەکان، وە ئومێدەوار بوون بە هاتنیان بۆ ژێ ڕێنموونی ئاڵای ئیسلام، چونکە ئایینەکەیان نزیکتر بوو لە ئیسلامەوەو بەشداری موسڵمانەکان بوون لە بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و تۆڵەدا، ئینجا قورئان هاتە خوارەوەو چەند هەواڵێکی پێ فەرموون: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ﴾ ئایا چاوەڕوانن کە بکەونە دوای ئێوەو گوێڕایەڵبن بۆ بانگکردنتان، واتە بە تەمای ئەوە نەبن و بڕوا هێنان دوورە لەوانەوە، لەبەر چەند هۆیەك:

١- ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ﴾ واتە ئایا بە تەمای بڕوا هێنانی ئەمانەن لە کاتێکدا کە تاقمێ لەوان ـ واتە زاناو عابیدەکانیان ـ فەرموودەی خوا ئەبیستن کە تەوراتە، ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾ کەچی لەپاشدا ئەیگۆڕن بە شتێ تر لەلایەن خۆیانەوە لەپاش ئەوەش کە وەریان گرت و تێی گەیشتن، وەك (ئیمامی بوخاری) ئەفەرموێ: ناوونیشانەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) گۆڕی، وە ئایەتی ڕەجمیان گۆڕی، ئەو گۆڕینەش ئەکەن ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەزانن ناهەقی و دەست هەڵبەست ئەکەن کە ئەوەش ئەوپەڕی لاری و ناپیاوییە، دەی لە جێیە زاناو عابیدەکانیان بەو جۆرە لادەن لە تەوراتەکەی خۆیان و بەو شێوە سوور بن لەسەر ناهەق و بەتاڵ، ئیتر چۆن بڕوا ئەهێنن بەم ئاینێ و قورئانەو ملکەچ ئەبن بۆی، وە چۆن ژێردەستەو شوێن کەوتووەکانیان بڕوا ئەهێنن؟

وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ
ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا
يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا
يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ

---

٢- ئەمەیە کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ کاتێ کە بگەن بەوانەی بڕوایان هێناوەو موسڵمانن ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ ئەڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوەو بڕوامان هەیە بەوەی کە (محمد) ڕەوانە کراوی خوایە، ئەوەش بە پێی مژدەی تەورات بە هاتنی ئەوانە کە گەیشتن بە موسڵمانەکان هێندێکیان بڕواهێنانیان دەرئەبڕی‌و ئەیان گوت:

کە ناوونیشانی پێغەمبەر لە تەوراتدا هاتووەو ئێمە ئەزانین کە پێغەمبەرە وە هێندێکیان بێ‌دەنگ ئەبوون لەکاتی تێکەڵی موسڵماناندا، بەڵام ﴿وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ کاتێ کە جوێ ئەبنەوە لەوان‌و ئەمان خۆیان ئەکەونە یەك، ئەوانەی کە بێ‌دەنگ بوون ڕەخنە ئەگرن‌و سەرزەنیشتی ئەوانی تریان ئەکەن، کە بە ڕووپامایی بڕوایان دەرئەبڕی‌و ئەیان وت سیفەت‌و ناوونیشانی پێغەمبەر لە تەوراتدا هاتووە، بەم ڕەنگە (قَالُوٓا۟) ئەڵێن ﴿أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئایا قسەیان بۆ ئەکەن‌و هەواڵیان پێ‌ئەدەن بەشتێ کە خوا باسی کردووەو دەری خستووە بۆتان لە تەوراتدا بە تایبەتی لەبارەی ڕاستی پێغەمبەرێتی (محمد)ەوە، ئایا هەواڵی وایان پێ‌ئەدەن ﴿لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ﴾ تا ئەوان بەوە دەم کوتتان بکەن‌و قسەکەی خۆتان بکەن بە بەڵگە بەسەرتانەوەو پەکتان بخەن لەلای خوای خۆتان، واتە کە کتێبی خواو لە بڕیاری خوادا، یان پەکتان بخەن بەوە لە کاتێکدا کە لەلایەن خواتانەوە هاتووە، کەواتە شتێکی بە هێزەو ملە جەڕێتان بۆ ناکرێ، یان مەبەست پەك خستنیانە لای لە ڕۆژی دواییدا، بەم ڕەنگە لایان وابووبێ هەرچی بە دەم نەیڵێن لێرە لەو ڕۆژەدا لێیان ناگیرێ، واتە ئەگەر ئەو هەواڵەیان پێ‌بدەن سەری لەوەوە دەرئەچێ کە ئەوان دەم کوتتان بکەن هەر بە قسەو وتەی خۆتان ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین؟ واتە ژیر بن‌و وا نەکەن، بەڵام قسە بکەن‌و

نەیکەن، وە ئەوەی کە خوا بۆی باسکردوون بیلێن، دەری بڕن یا بیشارنەوە، وە بە ناپاکی بڕوا دەربڕن یا دەری نەبڕن، بە هەر جۆر بن و لەسەر هەربار بن، خوا ئاگادارو زانایە بە هەموو شتێ، وەك بەشێوەی سەرزەنشت وهەڕەشە ئەیدابە گوێ یانداو ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ﴾ ئایا ئەوانە نازانن کە بەڕاستی خوا ﴿يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ ئەزانێ و ئاگادارە بە هەرشتێ کە نهێنی ئەکەن و ئەیشارنەوە، وە هەرشتێ کە دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن؟ واتە با بزانن کە خوا ئاگایە بە هەموو شتێ، کەواتە با بترسن و خۆیان بپارێزن لە خەشم و سزای خوا.

لەم باسەوە دەرکەوت کە کارو پیشەی ئەوانە ڕووپامایی و ناپاکی فێڵ و تەڵەکەیە، وە هەرکەس ئاوا بێت دوورە لە بڕوا هێنانەوە، جا لەبەرئەوە ئەم بارو پیشەی کردن بە هۆی بە تەما نەبوونی بڕوا هێنانیان.

٣- ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ﴾ وە هێندێ لەوان نەخوێندەوارو نەزانن، ﴿لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ﴾ نازانن و ئاگایان لە تەورات نییە بە چەند ئاوات و ئومێدو دەلەسەیەك نەبێ بە ناوی تەوراتەوە زاناو پیاوە ئایینیەکانیان پێیان ڕاگەیاندوون لە بارەی ڕزگار بوونیان لە سزای ڕۆژی دوایی و هەرچی بکەن خوا لێیان ئەبوورێ بە هۆی تکای باوك و باپیریانەوە، وەئەوان گەلێ هەڵبژێراوی خوان... ﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ وە ئەوانە هیچ نین بێجگەلەوەی کەکۆمەڵ وتاقمێکن گومان ئەبەن و دوو دڵن و شوێن کەوتوون لەو شتانەی کەوەریان گرتووەوئەیلێن وبەتەماینی، بەبێ تێگەیشتن و زانین، کەواتە چۆن چاوەڕوانی بڕوا هێنانیان لێ ئەکرێ؟ وە چۆن موسڵمانان بە تەمای بڕوا هێنانی ئەوان بن؟

زاناو عابیدەکانیان بەو جۆرە دەستیان خستە ئایین و نامەکەی خوا تا سەر تێك دەن لە نەخوێندەوارو نەزانەکان و بڕوا نەهێنن. وە ئەو تاوانە گەورەشیان بۆ ئەوەکرد کە سەرکردایەتی و سەرۆکایەتیەکەیان هەر بمێنێتەوەو هەر خاوەنی سەرو ماڵی ژێر دەستەو نەزانەکان بن، وەك مەڕو ماڵات و بیان دۆشن و خێرو بێریان لێدەربێنن، ئینجا لەبەر ئەوە خوایش ئەم هەڕەشە سامناکەی ئاراستەکردن و فەرمووی: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ﴾ ئینجاسزای سەخت و بەتین بۆ ئەوانەی کە بەدەستی خۆیان نامەو نوسراو ئەنووسن

ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ
وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ
ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾

---

﴿ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئینجا ئەڵێن: ئەمە لەلایەن خواوەیە، بۆ ئەوەی لێیان وەرگرن و بچەسپێ لەدڵیاندا، ئیتر مەبەست ئەو نامەو نووسراوە تەورات بێت کە دەستکاریانکردوو تێکەڵیانکرد لە قسەی خۆیان، یا مەبەست ئەو فتواو بڕیارانە بێت کە دژو پێچەوانەی ئایین و تەوراتی خوا بوون، بەڵام وایان نیشان ئەدا کە لە ئایینی خوایەو لەلایەن خواوە هاتوون، ئەو گۆڕاندن و دەستکاری و دەلەسەو دەست هەڵبەستەشیان ئەکرد ﴿لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ بەرامبەر ئەوە وەرگرن بۆ خۆیان بەش و دەسکەوتێکی کەم کە هەر لەم جیهانەدا بەنرخە، کەواتە هەرچەند زۆرو بەنرخ بێت لەم جیهانەدا هەر کەم و بێ‌نرخە لە چاو بەس و دەستکەوتی ڕۆژی دواییدا کە دەستیان پێوە ناو دەست بەرداری بوون لە پێناوی ژیانی ئەم جیهانەدا. ئەو تاوانی ئەوانە لە دوو بارەوە بوو:

یەکەم: دەلەسە بوو بەدەم خواوە.

دووەم: هەڵبژاردنی ئەم ژیانە کەم و کورتە بەسەر ژیانی زۆرو نەبڕاوەی ڕۆژی دواییدا.

جالەپێشەوە هەڕەشەی لێکردن لەسەر کردەوەکەیان بە شێوەی گشتی، ئینجا هەڕەشەکە دووبارەو سێ‌بارە ئەکاتەوە بە تایبەتی لەسەر هەرکام لەو دووبارە، ئەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ ئینجا سزای سەخت و بەتین بۆیان لەبەرئەوەی کە دەستی ئەوان نووسی، ﴿وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ﴾ وە سزای سەخت بۆیان لەبەر ئەوەی کە پەیدایانکردو وەریان گرت بۆ خۆیان.

ئەو تاوانە تایبەتی نییە بەو گەل و ئوممەتە پێشووانەوە، بەڵکو لەم ئوممەتەیشدا لەو جۆرە تاوانە بە زۆری ڕووی داوە، چەندەها نووسراوی ناڕاست و ناڕەوا نووسرا بەناوی ئایینی ئیسلامەوە لەلایەن بەکرێگیراوانی گاورو جوولەکەو بێبڕواکانەوە، وە چەندەها فتواو بڕیار دەرکرا لەلایەن زاناو عابیدە بەکرێ گیراوەکانی زۆردارو ستەمکارانەوە بۆ

یارمەتی دان و پایە پێدانی ئەو زۆردارو ستەمکارانە بۆ ئەوەی ڕێزو دەستکەوتیان نەبڕێ بەم ژیانە کەم و کورتەدا، بەڵام ـ خوا بەرەکەت بدا ـ لەم ئوممەتەدا ئامانجی بۆگەنی نیاز پیسەکان بەدی نایەت، چونکە قورئانی ئەم ئوممەتە هەمیشە بەئاسمانی بەرزی ڕێنموونییەوە ئەدرەوشێتەوەو جیهانی بە جۆرێ ڕووناك کردووەتەوە، هەرکەس خۆی کوێر نەکات و چاوی نەنووقێنێ ڕێگەڕاستەکەی خوا بەدی ئەکات، وە هەروەها ڕەوشت و کردەوەی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) وە پەیڕەوی کرنی یاران و شوێن کەوتووەکانی لاپەڕەی مێژووی داگیر کردووەو هەموو بەرهەڵست و بەربەستێ بۆ دووکەڵ و لافاوی لێڵ و قوڕینی هەموو بیرو باوەڕو شتێکی ناڕەوا، ماوە نادەن بۆ گۆڕان و تێکەڵ بوونی ئەوانە بەم ئایینە پاکەوە، وە قەڵغانێکی بە تینی کارلێ نەکراون بەرامبەر هەموو تیرێکی ژاراوی دوژمن، وە ئەوانەی کە ویستویانەو ئەیانەوێ دەستکاری ئەم ئایینە بکەن و بیگۆڕن، هەر ڕوو ڕەشی و نەفرینی گەلی موسڵمانان بۆ ئەمێنێتەوە لە جیهاندا، وە بۆ ڕۆژی دواییش لەو هەڕەشە سامناکەی خوادا بەشدارن بەوێنەی پێشەواکانیان لە زانا و عابیدەکانی گاورو جوولەکە کە یەکەم تاقم بوون ئەو هەڕەشەیان ئاڕاستەکرا.

ئینجا باسی هەندێ درۆو دەلەسەیان ئەکات و هەندێ لەو ئاواتانەیان کە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ لەگەڵ دادو باوی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەوانە گوتیان و ئەڵێن: ﴿لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً﴾ هەرگیز ئاگرمان لێناکەوێ لە ڕۆژی دواییدا مەگەر چەند ڕۆژێکی ژمێرراوی کەم، حەوت یا چل ڕۆژ، ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان بۆ سەرزەنشت و دەم کوت کردنیان: ﴿أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدًا﴾ ئایا ئێوە لای خوا هەواڵ و پەیمانێکتان وەرگرتووە لەسەر ئەوە؟ ئەگەر وەرتان گرتووە لەلایەن خواوە، ﴿فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓ﴾ کەواتە خوا پێچەوانەی وەعدی خۆی ناکات، ﴿أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئەی ئایا بەدەم خواوە شتێ ئەڵێن لە خۆتانەوە کە نازانن هەیەو ڕاستە؟ واتە بەڵێ هەر ئەمەیە کە بەدەم خواوە دەلەسە ئەکەن کە ئەوەش تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئینجا وەڵام و بەرپەرچی ئەو درۆزلەیان ئەداتەوە بە شێوەی یاسایەکی گشتی کە ئەوان و هەموو تاوانێکی وەك ئەوان بگرێتەوە، ئەفەرموێ: بلێ نەخێر وانییە کە ئێوە ئەڵێن، بەڵکو ئاگرتان لێ ئەکەوێ و ئەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی و بێبڕانەوە،

بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً﴾ هەركەس گوناهێکی گەورە بکات کە شیایستەی بکات بۆ ئاگرو ئەو دەستکەوتە بە خۆشییەوە بۆ خۆی ڕاکێشێ ﴿وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾ وە گوناهو خراپەکەی لە هەموو لایەکەوە دەوری ئەدات و داگیری ئەکات تا وای لێ ئەکات پەشیمانی و گەڕانەوەی نابێ و هەموو کون و کەلەبەرێکی لێ ئەگیرێ لە حاستی ڕووناکی بڕواو خێروچاکە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەو کەسانەێ کە بەو جۆرەن هاوڕێی هەمیشەیی ئاگری دۆزەخ ئەبن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لەناو ئەو ئاگرەدا ئەمێننەوە بەبێ دواهاتن و بڕانەوە، واتە ئەو جوولەکانە بەو جۆرەیان لێهاتووەو ڕووناکیان تیا نەماوە، کەواتە پاشە ڕۆژو تۆڵەیان ئەو ئاگرە نەبڕاوەیە، ئینجا بەرامبەر بەوانەو تۆڵەی سەختی نەبڕاوەیان، باسی چاکان و پاداشتی نەبڕاوەیان ئەکات، ئەوەش بەپێی باوی قورئان، کە هەڕەشەو مزگێنی ئەهێنێ بەدوای یەکدا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کەسانێ کەبڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیانکردووە لە جیهاندا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ ئەوانەهاوڕێ و نیشتەجێی هەمیشەیی بەهەشت ئەبن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوان لە بەهەشت ئەمێننەوە بەبێ بڕانەوە، خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان بکات لەو بەهرەو نازو ڕێزەدا.**

**پێویستە لەسەرمان زۆر بە وردی بیربکەینەوە لە مزگێنیەکانی قورئان کە بەستراون بەبڕواو کردەوە چاکەکانەوە، بۆ ئەوەی هەڵنەخەڵەتێین، ـ وەك جوولەکەکیان ـ بەو جۆرە ئومێدو ئاواتەی پێ هەڵخەڵەتا، وە با بزانرێ ئەو کەسانەی کە بەدەم ئەڵێن: موسڵمانین و کەچی خراپەکاری بڵاو ئەکەنەوە لەزەوی لە وڵاتدا، وە بەرگری چاکە ئەکەن کە سەربەستەو سەرکردەی چاکەکان چەسپاندن و دامەزراندنی بەرنامەو شەریعەتی خوایە لە زەویدا، وە پەیڕەوی کردن وبڵاوکردنەوەی خووڕەوشتەکانی قورئان وپێغەمبەر(ﷺ) لەوڵات ولەناو گەلدا، ئەو کەسانە بە هیچ ڕەنگ پەیوەندیان نییە بە ئیسلامەوە، وەبێ بەشن لە ئەجرو پاداشتی خوا، وەهیچ پەناو پارێزەرێکیان نییەلەسزاو تۆڵەی خوا، خوا پەنامان بدات لەو بەدبەختییە.**

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾

---

ئینجا هەمی تر ئەڕوا لەسەر ئەو جوولەکانەو بارو حاڵو هەڵوێستی خراپیان دەرئەخات بۆ گەلو کۆمەڵی موسڵمانان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە پەیمانی (ئیسرائیل)ییەکانمان وەرگرت، لە پێشەوە لە ئایەتی (٦٣)دا دەست نیشانی کرد بۆ ئەو پەیمانەی کە لێی وەرگرتن، لە کاتێکدا کە شاخەکەی ڕاگرت بەسەریانەوە، وە فەرمانی دا کە بەهێز بیگرن... جا لێرەدا ئەندازەیە بە درێژی باسی هێندێ لە بەندەکانی ئەو پەیمانە دەکات، کە یاسایەکی هەمیشەیین لە ئایینی خواداو لەم ئایینو شەریعەتەیشدا هاتوون، کەچی ئەوان خۆیانی لی وێڵ ئەکەنو دانی پیا نانێن، ئەو بەندانەش ئەمانەن:

١- ئەفەرموێ: ﴿لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ واتە هیچ کەسو شتێ مەپەرستن بێجگە لە خوا.

٢- ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ وە لەگەڵ باوکو دایکدا چاکە بکەن بە ڕێکو پێکی ﴿وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ وە لەگەڵ خزمو خوێشدا، ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ وە لەگەڵ هەتیواندا، ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ وە لەگەڵ هەژاراندا.

٣- ﴿وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ قسەو وتەی چاکو پاک بکەن دەربارەی مەردومو بە چاکی بدوێنو وتو وێژیان لەگەڵ بکەن کە سەردەستەو یەکەم بریتیە لە فەرمان دان بە چاکەو جڵەو گیریان لە خراپە.

٤- ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە بە ڕێکو ڕاستی نوێژ بەجێ بێنن.

٥- ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەکات بدەن.

بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە ئەم بەندانە کانو سەرچاوەی هەموو خۆشبەختیو کامەرانیەکن لە هەردوو جیهاندا، وە بە هیچ ڕەنگ دەست نادەن بۆ گۆڕانو دەست تێ خستن لە هیچ کاتو چەرخێکدا، وە لە ناو هەر کۆمەڵو گەلو چینێکدا، وە ماڤ خۆیانە کە کراون بە بەندو یاسایەکی هەمیشەییو دامەزراو لە هەموو ئایینێکدا... لەم باسەوە دوو شتمان بۆ دەرئەکەوێ:

یەکەم: یەکێتی ئایینی خواو ڕێکو پێکی ئەم دواترین ئایینو شەریعەتە لەگەڵ ئایینو شەریعەتە پێشووەکاندا لە بنەڕەتدا.

دووەم: سەرکێشیو نالەباری جوولەکە بەرامبەر ئەم ئایینە، کە بانگیان ئەکات بۆ وێنەی ئەو بیرو باوەڕو کردەوەی کە کاتی خۆی پەیمانیان دا بە خواو پەیمانی لی وەرگرتن لەسەریان، جا لەبەرئەوە شەرمەزاری کردن بەوەی دای بە ناوچاویانداو پێی فەرموون: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ﴾ لە پاش ئەوەی پەیمانتان دا ئینجا پشتتان تێکردو ئەو پەیمانەتان نەبردە سەر مەگەر کەمێکتان، ئەوانەی کە بەڕێکی پەیڕەوی تەوراتیان کرد تا ئینجیل هات، ئینجا شوێنی ئینجیل کەوتن تا قورئان هات، ئینجا شوێنی قورئان کەوتن ﴿وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ﴾ وە ئێوە گەلو کۆمەڵێکن ڕوو وەرگێڕن لە فەرمانو پەیمان، واتە باوو پیشەتان ئەوەیە، ئینجا ڕووی فەرموودەیان تێئەکاتو دژایەتیو پێچەوانەیی هەڵوێستەکانیان ئەدا بە ناوچاویاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە پەیمانمان لی وەرگرتن بەم جۆرە ﴿لَا تَسْفِكُونَ دِمَاءَكُمْ﴾ خوێنی خۆتان ناڕێژنو یەکتر ناکوژن ﴿وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَارِكُمْ﴾ وە خۆتان یەکتر دەرناکەن لە شوێنو وڵاتی خۆتاندا، وە نابێ دەست درێژی بکەن لە یەکتر نە بە کوشتنو نە بە دەربەدەر کردن ﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ﴾ ئینجا خۆتان دانتان نا بەو پەیمانەدا چین لەدوای چین کە ئەبێ ڕاگیر بکرێو نەشکێنرێ ﴿وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ لەکاتێکدا خۆتان شایەتن لەسەر ئەوەو شایەتی ئەدەن لەسەر دان نانتان بەوەدا

ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ

---

**﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ کەچی لە پاش ئەوە ئێوە ئامۆژگاری ئەوانەن کە ئەبینرێن بەم شێوەیە ﴿تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ یەکتر ئەکوژن ﴿وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ﴾ وە تاقمێ لە خۆتان ئاوارەو دەربەدەر ئەکەن لە وڵات و جێ و شوێنی خۆیان ﴿تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ لەکاتێکدا کۆمەکی و پشتگیری ئەکەن بە دژیان کە بەوەش ناهەقی و تاوان و دەست درێژی ئەکەن لە بارەی خوێن ڕشتن و ئاوارە کردنی یەکتر گوێیان نەئەدا بە پەیمانەکەی تەورات و ئەیان شکاند، بەڵام لەبارەی دیلەکانی خۆیانەوە لە هەر لایەك ببوایەن بە ماڵ و سامان بەرەڵایان ئەکردن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ﴾ وە ئەگەر ئەوانە بێن بۆ لاتان و بە دیلی بەردەستان بکەون بەرەڵاو ڕزگاریان ئەکەن بە ماڵ و شتێ لە بریتیاندا، ئەمەیان ئەکرد لەبەر بڕیارو فەرمانی تەورات کە پێویستی کردبوو لەسەریان، بەڵام گوێیان نەبوو لە ئاوارە کردنی برا (ئیسرائیل)ییەکانیان کە تەورات قەدەغەی کردبوو لەسەریان، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ﴾ لە کاتێکدا کە قەدەغە کراوە لەسەرتان دەر کردن و ئاوارە کردنیان، کەواتە کردەوەکانی دژی یەکتر بوون، بەم ڕەنگە لە لایەکەوە یاخی بوون لە تەورات و لە لایە ترەوە ملکەچ و گوێڕایەڵ بوون، جا لەبەر ئەوە بە سەرزەنشت کردن و بێزارییەوە ئەفەرموێ پێیان: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ دەی ئایا ئێوە بڕواتان هەیە بە هێندێ لە تەورات، وە بڕواتان نییە بە هێندێ تر؟ ئەم کردەوەو ڕووداوەی کە دای بە ناوچاویاندا شتێکی تازەکی بوو کەمێك پێش هاتنی ئیسلام بۆ مەدینە، داستانەکەی ئەمە بوو: لە مەدینەدا دوو تاقم و خێڵ هەبوو، ئەوس و خەزرەج کە لەناو عەرەبدا لەو دووانە دوژمن تر نەبوو دەرحەق یەك، وە سێ خێڵی جوولەکەش هەبوو هەر لە مەدینەدا: بەنی قەینوقاع، بەنی نەضیر، بەنی قورەیزە، یەکەم و دووەم سوێن خواری خەزرەج بوون، وە**

سێیەمیش سوێن خواری ئەوس بوو، ئینجا کە جەنگ بەرپا ئەبوو لە بەینی ئەوس‌و خەزرەجدا هەرکام بە سوێن خوارەکانیانەوە جەنگیان ئەکرد لەگەڵ ئەوی تر، جا لەوێدا وا ئەبوو جوولەکەی سوێن خواری خێڵێ جوولەکەی سوێن خواری خێڵەکەی تری ئەکوشت، کە ئەوەش قەدەغە بوو لەسەریان بە پێی تەورات‌و پەیمانێ کە خوا لێی وەرگرتبوون، وە هەر خێڵ‌و تاقمێ زاڵ ببوایە ئەوی تری دەربەدەر ئەکردو ماڵ‌و سامانی تالآن ئەکردو دیلی لێ ئەگرت، کە ئەوەش قەدەغە بوو لەسەر جوولەکە دەربارەی یەکتر بیکەن بە پێی پەیمانی خواو تەورات، ئینجا کاتێ جەنگەکە ئەکوژایەوەو مەسەلەی دیل ئەهاتە پێشەوە جوولەکەکان ئەکەوتنە تێکۆشان بۆ بەرەڵاکردنی هەر جوولەکەیەك کە دیل بوایە، ئیتر لە هەرلایەم ببوایە، ماڵ‌و سامانیان ئەدا لە رێی بەرەڵا کردنیدا، ئەوەش بەپێی فەرمان‌و بڕیاری تەورات کە پێویستی کردبوو لە سەریان بەرەڵاکردنی دیل‌و بەندەی (ئیسرائیل)ی، کەواتە لە بارێکەوە گوێڕایەڵ‌و ملکەچ بوون بۆ تەورات، وە لەبارێ ترەوە یاخی بوون‌و قەدەغەی تەوراتیان رەوا ئەدا، لەبەرئەوە بەو شێوەیە کردەوەکانیانیدا بە ناوچاویانداو ئینجا فەرمووی: ﴿فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ﴾ ئینجا هەرکەس لە ئێوە ئەوە بکات تۆڵەی هەیچ نییە ﴿إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ بێجگە لە ریسوایی‌و سەرشۆڕی لە ژیانی دنیادا، ئەوسێ تاقمە دووچاری دەردی خۆیان بوون، بەم رەنگە یەکەم‌و دووەم بە ریسوایی دەرکران لەمەدینە، وە سێیەمیش کوژران‌و بەدیل گیران‌و سامان‌و جێ‌و شوێنیان دەردەستکرا، هەرکام بە پێی کردەوەی خۆی وەك ئەگێڕنەوە لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە ـ خوایان لێ رازی بێت ـ کە فەرمووی: بەنی قورەیزە باوی کوشتن‌و برین بووە، وە ئەوانی تریان باویان دەرکردن‌و داگیر کردنی جێ‌و شوێن بووە، ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ﴾ وەلە رۆژی دواییدا ئەگێڕێنرێن‌و ئەبرێن بۆلای بەتین ترین سزا، بەتین تر لە سزای ریسوایی‌و بەسەرهاتی جیهانیان، بە تین تر لە هەموو سزای جیهان، بە تین ترین سزا کە سزای هەمیشەیی‌و نەبڕاوەی دۆزەخە، بە تین ترین سزای ئەوە تاوانانەی کە کردیان، بەهەرحاڵ‌و لەسەر هەربار مەبەست ئەوەنییە کە سزای رۆژی دوایی یان لە سزای هەموو کەس‌و هەموو تاقمێ بە تین ترە، کەواتە هەیچکەس رێی هیچ رەخنەیەکی نییە، بەم رەنگە بلێ چۆن سزای ئەمانە بە تین تر ئەبێ لەوانەی بڕوایان بە خوا نییە یا ناپاکن،

وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ﴿٨٧﴾

---

**ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو هەڕەشە سامناکەو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ بێگومان خوا بێئاگا نییە لەهەر کردەوەیەکتان، واتە هەمیشە تۆڵەو سزای لە کەمینایە بۆتان و چاوەڕوانی ئەکات و هەلی خۆیەتی، ئینجا هەڵئەگرێ ئەم ڕستەیە ئاراستەی ئەم ئوممەتە کرابێ، وە مەبەست ئەوە بێت ئەم ئوممەتە تەمێ خوار ببێ لە (ئیسرائیل)یەکانەوەو وەك ئەوان ڕەفتار نەکەن، بەم ڕەنگە بڕوامان ببێ و باش ملکەچ ببین بۆ هێندێ لە قورئانەکەمان و یاخی و سەرکەش لەوی تر، کە بێگومان ئەو دەردە کوشندەیە زۆربەی ئەم ئوممەتەی ئەمڕۆی داگیر کردووە لە پێش هەموانەوە ئەو کاربەدەستانەی کە لاف موسڵمانێتی لێ ئەدەن و کەچی هەموو قورئانیان دوور خستۆتەوە لە ژیان و بەشێکی زۆر کەمی دەروونی و شەخسی نەبێ نەیان هێشتووەتەوەو لە جێگای زۆربەکەیدا دژو پێچەوانەیان داناوە!!**

**هەزار بار ڕەحمەت و ڕەزامەندیی خوا لە خەلیفەی دووەم (عومەری فاروق) کە ئەڵێن لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (ئیسرائیل)یەکان ڕۆشتن و تێپەڕیانکرد، ئەی ئوممەتی (محمد) (ﷺ) ئێوە مەبەستن بەم ئایەتە، ئینجا ئاوڕێ ئەداتەوە بۆلای موسڵمانان و هەموو ئادەمی بۆ ئەمەی ئاگاداریان بکات بەسەر حەقیقەتی ئەو تاقمە (ئیسرائیل)یەو بەرهەم و سەرەنجاکی کردەوەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن کە ژیانی جیهانیان کڕی بە ڕۆژی دوایی، واتە ژیانی جیهانیان هەڵبژارد بۆ**

خۆیان و دەست بەرداری ژیانی ڕۆژی دوایی بوون لە پێناوی ئەمدا، لەگەڵ ئەوەی ئەیانتوانی ئەو هەڵبژاردن و ئاڵ و گۆڕە نەکەن، بەڵام ئەو کردەوەی بە کڕین و فرۆشتن دانا، چونکە پاڵ پێوەنەریان بۆ ئەوە چەند دەستکەوت و بەرژەوەندیەک بوو لە جیهاندا، کەواتە وەك کڕین و فرۆشتن وایە، ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ ئینجا ئەوسزایەی کەبۆیان دانراوە سووك ناکرێ لەسەریان، ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە ئەوانە یارمەتی نادرێن لەلایەن هیچ تکا کارو هیچ کەسێکەوە، ئینجا هەڵوێست و کردەوەی پیسیان دەرئەخات دەربارەی پێغەمبەرێتی و بەرامبەر پێغەمبەرەکانی خۆیان بۆ ئەمەی بێئابڕوویان بکات و بەڵگەو بیانوویان بڕێ کە ئەیان وت: ئێمە تەمێ و فەرمان و بەرنامەی پێغەمبەرەکانی خۆمانمان پێیەو هەر لەسەری ئەڕۆین و پێویستمان نییە بەم ئایینە تازەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ سوێن بە خوا بەخشیمان بە موسا کتێبێ کە تەوراتە، ﴿وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ﴾ وە لەپاش ئەو چەند پێغەمبەرو ڕەوانەکراومان هێنا بەدوایدا، هەندێ لەوانە داودو سولەیمان و زەکەریا و یەحیایە ـ سەلامی خوا لە هەموویان بێت ـ ئەڵێن: لەپاش موسا (٤٠٠٠٠) هاتووە، وە هەندێ تر ئەڵێن: (٧٠٠٠٠) هاتووە، هەموو ئەوانە هەرچەند بووبن شوێنی تەورات کەوتوون و بۆ تازە کردنەوەو دامەزراندنی هاتوون، ئینجا پاش ئەوانە عیسا هات، وە لەبەر ئەوەی عیسا یەکێکە لەو پێنج پێغەمبەرە گەورانە کە ناو ئەبرێن بە (أولوا العزم) بە تایبەتی باسی کردو فەرمووی: ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ وە بەخشیمان بە عیسای کوڕی مەریەم چەند موعجیزەو بەڵگەی ڕوون، وەك زیندوو کردنەوەی مردوو، وە چاك کردنەوەی کوێرو بەڵەك و موعجیزەکانی تری ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ وە بە هێزمانکرد بە ڕۆحی پاك و خاوێن کراوە ـ واتە جوبرەئیل ـ یا ئەو ڕۆحە تنایبەتییەی خۆی کە بەو شێوە تایبەتییە خوا پێیداو لەڕێگەی باوی پیاو و ئافرەتانی نرەوە نەهات.

خوای میهرەبان ئەو هەموو بەهرەیەی ڕشت بەسەر گەلی (ئیسرائیل)یدا، کەچی لە باتی سوپاس و گوێ ڕایەڵی و ملکەچی و چاولەبەری بۆ خواو ئەو پێغەمبەرانە، یاخی ئەبوون و

سەرکێشیان ئەکرد لە هەر فەرمان و بڕیارێ کە بەدڵیان نەبوایەو بەپێی ئارەزووی نەفسی پیسیان نەبوایە، وە بڕوایان نەهێنا بەو پێغەمبەرانە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ تا ئەو ڕادەیە هەندێکیان بە درۆزن دانان، وە هەندێکیان هەر کوشتن چ جای بڕوا پێهێنان، وە ئەو هەڵوێستە پیسەیان شتێکی ناسراوو زانراو بوو لە ناو ئەو تاقم و چینەشدا کەلە چەرخی پێغەمبەردا بوون (ﷺ) جا لەبەرئەوە ئەوا قورئان ئەیداتەوە بە ناو چاویاندا، بە بێزاری دەربڕینەوەو سەرسووڕ ئەهێنێ لەو کردەوەو هەڵوێستە پیسەی کە پێشووەکانیان هەڵسان پێی، وە بە شێوەیە ئەیدا لە ڕوویان وەك ئەمانیش بەشدار بن لە هەموو کردەوەو هەڵوێستەکەی ئەواندا، بۆ ئەوەی دەرکەوێ کە ئەمانیش وەك ئەوانن لە سروشت و نیازی پیسیاندا، ئەفەرموێ: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ ئینجا ئایا هەرجارێ پێغەمبەرێکتان بۆهاتبێ بە فەرمان و بڕیارێکەوە کە نەفستان نەیەوێ و پێی خۆش نەبێ ﴿فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ﴾ ئێوە خۆتان بە گەورە دانا و سەرکێشیتانکردن لە شوێن کەوتن و بڕوا پێهێنانی؟! ﴿وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ ئینجا تاقمێکتان لەوان (زەکەریا و یەحیا و چەندی تر)، واتە کوشتنتان، بەڵام بە وشەی ڕابردوو نەی فەرموو، لەبەر ئامادەکردنی شێوەی ئەو کردەوە ناهەموارە کە بەبیر لێکردنەوەی ئەبێ دڵ بێتە لەرزەو موچڕکە بە لەشدا بێت، وە هەم بۆ ئەوەی دەست نیشان بکرێ بەو نیازە پیسەی کەلە دڵی ئەو تاقمەدا بوو کەلە چەرخی پێغەمبەردا بوون (ﷺ)، وە بە هەموو جۆرێ کە پێیانکرا هەوڵیاندا، بەڵام خوا پاراستی.

خوای میهرەبان ئەم هەواڵانە ئەدا بەم ئوممەتە بۆ ئەمەی بترسن و خۆیان بپارێزن لە کردەوەی گەلی (ئیسرائیل)ی، کە باشترین گەلی چەرخی خۆیان بوون، بەڵام بەهۆی لادانیان لە بەرنامەی خوا گۆڕان بە پیس ترین گەل و جێنشینیان لێ سەنرایەوەو کران بە نەفرین لێکراوی خوا، ئەم هەواڵانە ئەدا بەم ئوممەتە تا وەك ئەوان نەکەونە چاڵی بەد بەختی و ژێر کەوتن و شەرمەزاری و ڕیسوایی.

وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ
مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟
كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ

---

باسی هەڵوێستی کردن لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خۆیاندا، ئینجا باسی هەڵوێستیان ئەکات بەرامبەر ئەم پەیامە تازەو ئەم پێغەمبەرە تازەیە، کە سەرنج ئەدەین هەروەك لەوەو بەر وان و وەك ئەمانەی ئێستا هەر ئەو چینەبن کە بەرنگاری ئەو پێغەمبەرە پێشووانە وەستان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ ئەوانەو وتیان و ئەڵێن: دڵمان پێچراوەتەوەو پەردەی بەسەرەوەیە، واتە تێناگەین لەم بانگەوازە تازەیە، وە ناچێتە دڵمانەوەو بە هەر جۆر بانگ بکرێن دڵمان نابیستێ و دڵمان لەسەر ئەو سروشتە دامەزراوە، مەبەستیان نا ئومێدکردنی پێغەمبەر (ﷺ)و موسڵمانان بوو لەوەی هەوڵی موسڵمان بوونیان بدەن، یا مەبەستیان ئەوە بوو ئەوە بکەن بە هۆو بیانووی بڕوا نەهێنانیان و بەو قسەیە خۆیان ڕزگار بکەن لە دەست بانگ کەرانیان، لەسەر هەرکام خوا بەرپەرچیان ئەداتەوەو بە درۆیان ئەخاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾ نەخێر، ڕاست ناکەن لەوەی کە وتیان، بەڵکو خوا نەفرینی لێکردن و دەری کردن لە بەزەیی خۆی بە هۆی بێبڕوایی خۆیانەوە کە بە ئارەزووو خواهیشی خۆیان کەوتنە سەری، واتە ئەوانە هەر لە کۆنەوەو لە تاقمە پێشووەکانیانەوە بە بێبڕوایی هاتوون، یان لە ڕێوەو لە یەکەم جارەوە بێبڕواییان بۆ خۆیان هەڵژارد بە هۆی ئەوەوە خوایش قاری لێگرتن لە تۆڵەی ئەوەدا، دووری خستنەوە لە بەزەیی خۆی و بەرگری کردن لەوەی سوود وەرگرن لە بانگکردن و ڕێنموونی، ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ بە هۆی ئەوەوە زۆر کەم بڕوا ئەهێنن و زۆر بە دەگمەن بڕوا هێنان لەوانەوەڕووئەدات، ئەوانەبەپێی نامەکەی خۆیان بڕوایان بوو بە هاتنی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ)، وە ئومێدەوار بوون کە بە هۆی شوێن کەوتن و بڕوا پێ هێنانی سەرکەون و زاڵ ببن بەسەر بت پەرست و بێبڕواکاندا، کەچی لە پاش هاتنی ئەم قورئانەوە کە ڕێك بوو لەگەڵ نامەکەی خۆیاندا، بڕوایان نەهێنا لە کاتێکدا ئەشیانناسی، وەك

ئەفـەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ کاتـێ هـات بۆیـان نامەیـەك لەلایـەن خـواوە، واتـە قورئان کە ﴿مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ﴾ ڕێك بوو لەگەڵ ئەو نامەی کە لای ئەوان‌و بە دەست ئەوانەوە بوو، واتە نامەکەی ئەوانی بە ڕاست دائەناو دەقی ئەو بوو لە بنەڕەتی ئایین‌و لە مەبەست‌و لە ئامانجدا ﴿وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ﴾ لە کاتێکدا لە پێش هاتنیدا ئەوانە ﴿يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەهۆی ئەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) داوای سەرکەوتن‌و زاڵ بوونیان ئەکرد لە خوا بەسەر ئەوانەی بت پەرست‌و بێ‌بڕوا بوون، بەم ڕەنگە لە کاتی جەنگکردن لەگەڵیان ئەیان وت: ئەی خوایە زاڵمان بکە بەو پێغەمبەرەی کە دواترین ڕەوانە کراوەو ئێمە ناوونیشانمان دەست ئەکەوێ لە تەوراتدا، وە هەڕەشەیان لی ئەکردن‌و ئەیان وت: نزیکە هاتنی پێغەمبەرێك کە قسەو ئایینی ئێمە بە ڕاست دەرئەکات، ئێمە بڕوای پێ‌ئەهێنین‌و شوێنی ئەکەوین‌و ئینجا پێکەوە جەنگتان لەگەڵ ئەکەین‌و لەناوتان ئەبەین، وەك گەلی (عاد)و (إرم) لەناو بران، ئەو جوولەکانە ئاوا بوون‌و بەتەمای ئەوە بوون کەچی ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ﴾ ئینجا کاتێ هات بۆیان ئەو نامەی کە ئەیان ناسی، بە هۆی ناسینی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە ناوو نیشانی لە تەوراتدا هاتبوو، کاتێ ئەوەیان بۆ هات ﴿كَفَرُواْ بِهِۦ﴾ بڕوایان پێ نەهێنا ﴿فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە خەشم‌و نەفرینی خوا لەسەر ئەو بێ‌بڕوایانە بێت.

ئەوانە لایان بوو کە ئەم دواترین پێغەمبەرەش هەر لەوان ئەبێت، ئینجا کاتێ کە هات‌و دەرکەوت لەوان نییەو بەڵکو لە گەلی عەرەبە، حەسادەت داگیری کردن‌و بە هۆی ئەوەوە سەرکێشییان بەکار هێناو دانیان پیا نەنا، وەك دەرئەکەوێ کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ﴾ زۆر خراپە ئەو شتەی کە بۆ خۆیانیان فرۆشت‌و هەڵیان بژارد بۆ خۆیان، ئەو شتەش ﴿أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بڕوا نەهێنانیانە بەوەی کە خوا ناردیە خوارەوە ـ واتە قورئان ـ وە بڕوا نەهێنانەکەشیان ﴿بَغۡيًا﴾ لەبەر داخ‌و حەسادەت بوو، داخ‌و حەسادەتێ ﴿أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ﴾ ئەمەیە کە خوا بەشێ لە (وەحی) سروشی خۆی ئەهێنێتەخوارەوە بۆسەربەندەیەك لەبەندەکانی کەخواخۆی مەیلی ببێ‌وهەڵی بژێرێ بۆی، واتەهۆی بڕوانەهێنانیان بەقورئان حەسادەت بردن بووبەپێغەمبەرمان(ﷺ) کەلە خۆیان نییەو لە عەرەبە

فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا بِمَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْۗ

---

﴿فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍۚ﴾ کەواتە گەڕانەوە بە شایستەیی بۆ خەشم لەسەر خەشمی خوا بە پێی حەسادەت و بێبڕواییەکەیان، یا دووچاری خەشمی خوا بوون لەسەر بڕوا نەهێنانیان بە قورئان و بە پێغەمبەرمان (ﷺ) بێجگە لە خەشمێ لەسەر بڕوا نەهێنانیان بە ئینجیل و عیسا (علیه السلام) ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ وە بۆ بێبڕوایانە هەیە سزایەکی ڕیسواکەر، ئەوەش بەرامبەر ئەوەی کە خۆیان بە گەورە سەیر ئەکرد و لایان وابوو کەس هاوتایان نییە لە هونەرمەندیدا ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ کاتێ لەلایەن موسڵمانانەوە پێیان بوترێ: ﴿ءَامِنُوا بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بڕوا بێنن بەوەی کە خوا ناردییە خوارەوە ـ واتە قورئان ـ ﴿قَالُوا﴾ ئەڵێن: ﴿نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ بڕوامان هەیە بە هەمیشەیی بەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەرمان، واتە تەورات و هەرشتێ تر کە هاتبێ بۆ بەهێز کردن و دامەزراندنی تەورات، ﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ﴾ لەکاتێکدا کە باوەڕیان نییە بە غەیری ئەوو بەوەی کەلە پاش ئەو هاتووە ـ واتە قورئان ـ ﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ﴾ لەکاتێکدا کە هەر ئەویش ڕاستە و شایانە بە ڕاست ناوببرێ ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْۗ﴾ کە ڕێک و پێکیشە لەگەڵ تەورات و ئەوەی کەلای ئەوانە، واتە قسە و هەڵوێستەکەیان هۆی سەرسوڕمانە، چونکە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بە تەورات هەبێ، ئەبێ بڕوایان بە قورئانیش ببێ کە ڕێکە لەگەڵ تەوراتدا و وەک دەقی ئەو وایە، کەواتە لە ڕووی ڕاستیدا هۆی بڕوا نەهێنانیان بە قورئان بڕوا نەبوونیانە بە تەورات، ئەوانە کە لاف بڕوا بە تەوراتیان لێ ئەدا و درۆیان ئەکرد وەک خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەم کوتیان بکات و بەرپەرچیان بداتەوە بە بێبڕوایی،

قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ
بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ
وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ۖ

---

**ئەفـەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئـەی پێغەمبـەر بڵـێ بەوانـە: ﴿فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن دەی لەبەرچی پێغەمبەرەکانتان کوشت لەمەوپێش؟ ئەو پێغەمبەرانەی کە هاتن بۆ چاسپاندنو بەهێزکردنی بڕوا بە تەورات.**

**بەڵگەو نیشانە لەسەر بێبڕوایی ئەوانە هەر ئەوە نەبوو کەلەپاش (موسا) ئەو پێغەمبەرانەیان شەهید کرد، بەڵکو هەر لە چەرخی (موسا)یشدا کە ئەو هەموو موعجیزە گەورانەی نیشاندان، کەچی بێبڕواییان لێدەرکەوت، وەکو فەرمانیدا بەمەش دەم کوتیان بکات: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ سوێند بە خوا (موسا)تان بۆ هات بە چەند موعجیزەو بەڵگەی ڕوونەوە لەسەر پێغەمبەرێتیەکەیو لەسەر تاکو تەنیایی خوا ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ کەچی دوای ئەوە گوێرەکەکەتان گێڕا بە پەرستراوی خۆتان، ئەو گوێرەکەی کە (سامیری) بە بەرچاوتانەوە دای ڕشتو دروستی کرد! ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ ئەوەتانکرد لەکاتێکدا کە ئێوە ستەمکارو دەست درێژیی کەر بوونو ئەو کارە بێجێیەتان کرد، یان ئێوە گەلێکن کە هەمیشە ستەمکارو دەست درێژیی کەرن، وە هەروەها دەم کوتیان بکاتەوە بەم هەڵوێستەی تریشیان: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە پەیمانمان لێ وەرگرتن لەسەر ئەوەی ڕەفتار بکەن بە پێی فەرمانی تەورات، ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە سەرپێچیتان کردو ئێمەیش کێوی (طور)مان، بەرزکردەوەو ڕاگیرمان کرد بەلای سەرتانەوە، تا بکەوێ بەسەرتاندا، ئەگەر ملکەچ نەبن، ﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ۖ﴾ وە پێمان گوتن: ئەوەی کە پێمان سپاردوون وەری گرن بە کۆششو بە توندی، وە بیبیستن بە بیستنی وەرگرتنو گوێڕایەڵی.**

قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩٣﴾

ڕووی فەرموودەی کردە جوولەکەکانو پەیمانو فەرمانەکەی خستنە بەرچاو، ئینجا ئاوڕ ئەداتەوە بەلای بڕواداران و هەموو ئادەمیدا، هەواڵیان پێ ئەدات کە هەڵوێستی ئەو جوولەکانە چۆن بوو، ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا﴾ قسەکانمان بیست، وە سەرپێچی ئەکەین لە فەرمانەکەت گوێڕایەڵی نابین، واتە بیستمان بەڵام نەک بە بیستنی وەرگرتنو گوێڕایەڵی، ﴿وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ ئەوەیان وت لە کاتێکدا کە خۆشەویستیو شێوەی گوێرەکەو گوێرەکە پەرستی خراوەتە دڵیانو تێکەڵیان بووەو دامەزراوە لەدڵیاندا ﴿بِكُفۡرِهِمۡ﴾ بەهۆی بێبڕوایی لەوەو بەریانەوە کە دەقیان پێوە گرتبوو، ئیتر ئایا سەرپێچییەکەشیان بەدەم وتبێ، وەک زۆربە ئەفەرموون لەبەرئەوەی لانەدەن لە دیمەنو ڕواڵەتەکەی بەبێ بەڵگەو پاڵ پێوەنەرێک، یان بە کردەوە سەرپێچییەکەیان کەیاندبێو لەپاشا دەریان خستبێ، وەک کۆمەڵێ ئەفەرموون، لەسەر هەرکام خوا فەرمانیدا کە پێغەمبەر (ﷺ) سەرکوتیان بکات بە جۆرو شێوەیەک کەبێ نرخی نیشان ئەدات دەربارەی ئەو بڕوایەی کە لافیان لێ ئەدا پێی، وە ئەیکات بە جێگەی گاڵتەو لاقرتی ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ﴾ شتێکی زۆر خراپو بێزراوە ئەوەی کە بڕواکەتان فەرمانتان پێ ئەدان پێی، ئەوەش کە بریتییە لە گوێرەکە پەرستیو یاخی بوونو سەپێچی لە فەرمانی خوا! وە بڕواکەیان بە هیچ دەرنەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن، چونکە ئەم ڕستەیە یا بۆ ئەوەیە بیانخاتە گومانو دوو دڵی لە بڕواکەیاندا، یا مەبەست ئەوەیە کە دژایەتیو نەگونجاوی بڕوا بە خوا هەیە، لەگەڵ گوێرەکە پەرستیدا، هەرکام بوو ئەوی تر نابێ ببێ، دەی کە ماتوڵ خۆشەویستی گوێرەکە پەرستی هەیە ئەبێ بڕوا بە خوا نەبێت.

ئەو (ئیسرائیل)یانە لافیان لێ ئەدا کە ئەوان گەلی هەڵبژێراوی خوان، هەر ئەوان لەسەر ڕێگەی ڕاستن، هەر ئەوان ئەگەن بە ئامانج لە ڕۆژی دواییدا، وە هەموو گەلو ئوممەتەکانی

تر بێبەشن لە ڕۆژی دواییدا، وە یەکەم مەبەستیان لەو قسەو باسە ئەوە بوو کە بڕوای موسڵمانەکان بێهێزو لاواز بکەن بە بەڵێنەکانی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ)،

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾

**ئینجا خوا فەرمانیدا کە پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بفەرمووێ: دەی داوای مردن بکەن ئەگەر ڕاست ئەکەن لە قسەو لافەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بلێ پێیان: ﴿إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەگەر بەهەشت هەر بۆ ئێوەیە بە تایبەتی و بێ هیچکەس تر لای خواو بە پێی بڕیاری خوا ــ وەك خۆیان ئەڵێن ــ ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ﴾ دەی ئاواتی مردن بخوازن و داوای مردن بکەن لە خوا، ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن، کە ئەڵێن بەهەشت هەر بۆ ئێوەیە، چونکە هەرکەس دڵنیا بێت و لای وابێت کە بەهەشتییە ئەبێ پێی خۆش بێت ڕزگار بوونی لەم جیهانی تەنگ و تارکی و غەمەو گەیشتنی بەو جیهانی نازو ڕێزو خۆشییە، وەك زۆر لە پیاوە خواناسەکانی ئەم ئوممەتە ئەو ئاواتەیان خواستووە بە ئومێدی گەیشتن بەو خۆشییە، وە ئاوات خواستنێ کە جڵەوگیری لێکراوە ئەوەیە کە لەبەر دووچار بوون بێت بە سزاو زیانێکەوە وەك لە دەقی حەدیسەکەدایە: (لا يتمنين أحدكم الموت لضر اصابه) هیچکام لە ئێوە ئاوات بۆ مردن نەخوازێ لەبەر زیان و ئازارێ کە تووشی بوو بێت، زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەم ئایەتەیان بەو جۆرە تەفسیر کردووە کە وتمان، وە هێندێ ئەفەرموون: مەبەست ئەوە بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگی ئەو تاقمە جوولەکە بکات (مباهلە)یان لەگەڵ بکات، تا دەرکەوێ کە ئەوانە درۆئەکەن لەو هەموو قسەو لافەدا کە لێی ئەدەن بۆ خۆیان، وەك خوا فەرمانیدا کە بانگی تاقمێ لە مەسیحیەکان بکات بۆ ئەو (مباهلە)، ئەوەش ئەوەیە کە دوو تاقم بوەستن برامبەر یەك و داوابکەن لە خوا کە درۆزنەکەیان لەناو بەرێ، بەڕاستی ئەم تەفسیرە زۆر جێگای بڕوایەو باش جێگیر ترە لە دڵدا، وە چەند حەدیسێ پشتگیرە بۆی:**

**یەکەم: ڕیوایەتی (ئیبن و ئەبی حاتەم) کە صەحیحەو لە (ئیبن و عەباس)ەوە ــ خوایان لێ ڕازی بێت ــ کە فەرموویەتی: ئەگەر ئەو ئاواتەیان بخواستایە هەرکام لەوان تف لە گەرویدا ئەگیرا، واتە هەناسەی نەئەداو ئەمرد.**

دووەم: وێنەی ئەو ڕیوایەتە کە (بەیهەقی) ئەیهێنێ لە (ئیبن و عەبباس)ەوە.

سێیەم: ڕیوایەتی (بوخاری) لێیەوە کە ئەفەرموێ: (لو أن الیهود تمنوا الموت لماتوا) ئەگەر جوولەکە ئەو ئاواتەیان بخواستایە ئەمردن.

چوارەم: ڕیوایەتی (ئیبن و جەریر) لێیەوە بەوێنەی ئەوەی پێشوو.

پێنجەم: حەدیسێ کە (ئیمامی ڕازی) لە تەفسیرەکەیدا ئەیهێنێ کە لە تەواوی شتەکە ڕوون ئەکاتەوە: (لو خرج الذین یباهلون لرجعوا لایجدون اهلا و لا مالا) ئەگەر ئەوانەی کە (مباهله)یان لەگەڵ کرا بهاتنایەتە پێشەوە بۆ مەیدان ئەگەڕان بەبێ خێزان و بە بێ ماڵ، واتە هەموو ئەمردن.

بەڵێ بەڕاستی ئەم ڕیوایەتانە پشتگیرو بە هێزکەری ئەم تەفسیری دووەمەن، چونکە وانیشان ئەدەن کە ئەو مردنەیان تۆڵەیەك ئەبوو بۆیان، وە هەروەها دیمەن و شێوەی ئەم هەواڵە نیهنی و غەیبییەش هەر پشتگیرو یارمەتی دەرە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا﴾ وە هەرگیز ئەوانە ئاوات بۆ مردن ناخوازن تا ماون ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەهۆی کردەوەی خراپی لەمەوپێشیان کە بەدەست و ئارەزووی خۆیانکردوویانە، واتە خۆیان ئەزانن کە درۆ ئەکەن، وە ئەترسن ئەگەر داوای مردن بکەن خوا داواکەیان وەرگرێ و ئەوکاتە دووچاری سزای خۆیان بێن، چونکە ئەزانن کە کردەوەی خراپی زۆریانکردووە کە مایەی سزای سەختیانە، ئەو کاتە ئەم دنیایەشان ئەڕوات و ئەو دنیاش... جا لەبەرئەوە ئەو ئاواتە ناخوازن، ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە خوا زانا و ئاگایە بەو ستەمکارانە، زانا و ئاگایە بە خۆیان و بە هەرشتێ کە لەوانەوە ڕوو ئەدات، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە ئەو ئاواتە ناخوازن، وتمان ئەم هەواڵەش هەر پشتگیرو یارمەتی دەرە بۆ ئەم تەفسیری دووەمە، چونکە ئەم هەواڵە خۆی بەرلێ بڕینەوەی تیایە بۆ ئەو جوولەکانە و وایش نیشان ئەدات کە مەبەست بە ئایەتی پێشوویش هەر بەرلێ بڕینەوەیە و بانگکردنیانە بۆ ئەو (مباهله)یە کە باسمانکرد، تا دەرکەوێ کە درۆ ئەکەن لەو هەموو قسە و لاف و گزافانەدا، وە بەو بانگکردنە دەم کوت کران و نەیانتوانی بێنە مەیدان و ئەو ئاواتە بخوازن، وە ئەم هەواڵە غەیبییەش بەدی هات، کەواتە ئەمەش یەکێ بوو لە موعجیزەکانی قورئان و بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان (ﷺ)، چونکە

ئەگەر ئەم هەواڵە لەلایەن خواوە نەبوایە، کەس نەی ئەتوانی هەواڵی وابدات لەو جوولەکە دوژمنانە کە هەمیشە هەوڵو تەقەللایان ئەدا بۆ پلارێ بیدەن لەم ئایینە پیرۆزە، وە لەکەو ڕەخنەیەکی لێبدۆزنەوە، ئینجا هەواڵیشی لێدان بە نەکردنی شتێکی زۆر ئاسان کە هیچی تێ نەئەچوو، چونکە ئەیانتوانی ئەگەر بەدرۆیش بوایە ئەو ئاواتەیان بخواستایە بەدەم، بەڵام نەیانکردو ڕاستی هەواڵەکە دەرکەوت بۆ هەمووان، وە لە لایەتریشەوە ئەو پەك کەوتنو دەستەپاچەیی ئەوانە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە ئەو جوولەکانە بۆیان دەرکەوتووە ڕاستی ئەم ئایینو پێغەمبەرە (ﷺ) لەبەر ئەوە نە یانتوانی ئەو ئاواتە بخوازن، ئینجا پێویستە بزانین کە ئەو بانگکردنو هەواڵدانە تایبەتی بووە بەو چینو تاقمەی کەلە چەرخی پێغەمبەردا بوون (ﷺ) نەك بۆ هیچ تاقمو چینێ تربێت، وەك ڕیوایەتکراوە لە (نافیع)ەوە کە ئەفەرموێ: جوولەکەیەك بەربەرەکانی لەگەڵ کردینو وتی: لە قورئانەکەتاندا هەیە کە ئێمە ئاواتی مردن ناخوازین، دەی ئەوا من ئاواتی مردن ئەخوازمو نایش مرم، (ئیبنو عومەر) ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ گوێی لەو قسەیە بوو، بە ئەوە ڕقی هەڵساو چووەماڵەوەو شمشێری دەرکێشاو هاتە دەرەوە، ئینجا جوولەکەکە بینی ڕایکرد، (ئیبنو عومەر)یش فەرمووی: سوێن بە خوا ئەگەر پێی بگەیشتمایە ئەمدا لە گەردنی، ئەو سەگە نەفامە وای گومان بردووە کە ئەم ئایەتە بۆ هەموو جوولەکەیەکە یا بۆ هەموو کاتە، نەخێر! ئەم دوو ئایەتە تایبەتییە بەو جوولەکانەی چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) کە مل ملانێیان ئەکرد لەگەڵیو دژی پێغەمبەرێتیەکەی بوون لە پاش ئەوەی کە ئەیان ناسیو ئەیان زانی ڕاستە، وە بەرپەرچ دانەوەو بەربەرەکانی لەگەڵیان هەر بە زوبان بوو نەك بە شیرو تیر، وە بەڵگەیە تریش لەسەر ئەوە ئەمەیە کە (ئیبنو جەریر) ئەیهێنێ لە (ئیبنو عەباس)ەوە ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێت ـ کە ئەفەرموێ: ئەگەر ئەو ئاواتەیان بخواستایە لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون یەك جوولەکە لەڕووی زەویدا نەئەماو هەموو ئەمردن، ئەوانە یەك هەر ئەوەبن کە ئاوات نەخوازن بۆ مردن،

وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٖ وَمَا هُوَ بِمُزَحۡزِحِهِۦ مِنَ ٱلۡعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلۡ مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّجِبۡرِيلَ

---

بەڵکو بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ﴾ سوێند بە خوا ئەوانەت دەست ئەکەوێ‌و بۆت دەرئەکەون بە سوورترین ئادەمی لەسەر ژیان، تەنانەت ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۚ﴾[1] لەوانەش کە بت پەرستی‌و هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە، کە ئەمانە ئەبوایە سوور تر بوونایە لەسەر ژیان، چونکە بڕوایان بە زیندوو بوونەوەو تۆڵەو پاداشت نییە، کەچی ئەو جوولەکانە سوورترن لە مانیش، چونکە ئەزانن دوا ڕۆژیان هەر ئاگرە بەهۆی ئەو هەموو تاوان‌و خراپەکارییەی کە کردوویانە، ئەوانە ژیانیان خۆش ئەوێ‌و سوورن لەسەری تا ڕادەیەك ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ هەرکام لەوان پێیان خۆشەو ئاواتە خوازن بەمەی کاشکێ ـ خۆزگە ـ تەمەنی درێژ بکرێ، ماوەی هەزار ساڵ! بەڵام ئەگەر ئەو ئاواتەش بەدی بێت هیچ سوودی نابێ، چونکە ﴿وَمَا هُوَ بِمُزَحۡزِحِهِۦ مِنَ ٱلۡعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ﴾ تەمەن درێژ کردن‌و درێژەدان بە ژیان دوور خەرەوەو ڕزگار کەری ئەو کەسە نییە لە سزا، هیچ کار ناکات لەو سزایەی کە بەرەو ڕووی ئەڕوات، بەڵکو تابێت تێن‌و بڵێسەی زیاد ئەکات، چونکە هەتا بێت گوناهو تاوان زۆرتر ئەکات‌و باری گرانتر ئەبێت، ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بەم ڕستە سامناکە کە هەڕەشەی لێ ئەبارێ ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ خوا بینایە بە هەموو کردەوەیەك کە ئەوانە ئەیکەن، کەواتە تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بەپێی کردەوە خراپەکانیان، ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) وە فێری ئەکات کە بەربەرێتەوە لە جوولەکەکان‌و جاڕ بدا بەم شتە ڕاستەو ڕایگەیەنێ ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ﴿مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّجِبۡرِيلَ﴾ ئەگەر هەرکەس دوژمنی (جوبرەئیل)ە دەی با لە داخا بمرێ

---

[1] ئەم ئایەتە بەدوو سێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام زۆربە لەسەر ئەوەیە کەلە تەفسیرەکەدایەو دڵیش زۆر پێی بە ئارامە، وە زانینی ئەواوو ڕاست هەرلای خوایە.

فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن
كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ
أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾

---

﴿فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ چونكە بێگومان قورئانی هێنایە خوارەوە بە وەجبە وەجبە بۆ سەر دڵی تۆ بە ئیزن و ڕەزای خوا، كەواتە بە ئارەزووكاری خۆی نەیهێناوە، بەڵكو فەرمان و ڕەزامەندی خوای بە جێهێناوە بە هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە بۆ سەر دڵی تۆ، واتە هێزی ژیریی و بیریی و تێگەیشتنت كە بەو هێزە شت وەرئەگیرێ و پارێگاری ئەكرێ و ئەزانرێ ئەو قورئانەی هێنانە خوارەوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ لە كاتێكدا كە ڕێك و پێكە لەگەڵ ئەو نامە و ئایینی خوا كەلە پێشییەوە هاتووە، وە بەڕاست و ڕەوایان پیشان ئەدات ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وە ڕێ نیشان دەرو مژدە دەرە بۆ بڕوا داران، بەڵێ وەك چەند جارێك وترا قورئان ڕێك و پێكە لەبنەڕەت و لە شێوە گشتیەكەیدا لەگەڵ هەموو نامە و ئایینە ئاسمانیەكاندا، وە بەڕاستی ڕێ نیشان دەرو مژدە دەرە لە دڵە بڕوا دارەكان كە خۆیان بۆ كردووەتەوە و ئامادەن بۆ گوێڕایەڵی. نەك بۆ ئەوانەی كە ڕووی لێ وەرئەگێڕن و یاخین لێی، لەبەرئەوە قورئان لە چەند شوێنێكیدا ئەمە و وێنەی ئەمە چەند بارە ئەكاتەوە، ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ هەركەس دوژمنی خوا و فریشتەكانی و جوبرەئیل و میكائیل بێت، بێگومان خوا دوژمنی بێبڕواكانە، واتە دوژمنایەتی هەركام لە پێغەمبەران و فریشتەكان و ئەوانەی كە خوا نزیكی خستوونەتەوە لە خۆی، دوژمنایەتی هەركام لەوانە دوژمنایەتییە لەگەڵ خوادا، وە هەركەس دوژمنی ئەوانە بێت كافرو بێبڕوایە و خوایش دوژمنی هەموو بێبڕواكانە.

لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە دوو حەدیس ڕیوایەتكراوە، یەكێكیان باس ناكەین، چونكە (حافظی عێراقی) ئەفەرموێ: هیچ سەنەدێكم دەست نەكەوتووە بۆی، بەڵكو ئەمەیان ئەهێنین كە (ئیبن ئەبی شەریبە و ئیبن و جەریرو ئیبن ئەبی حاتەم) هێناویانە كە (عومەر) -خوا لێی ڕازی بێ- ڕۆژێك ئەچێتە قوتابخانەی جوولەكەكان و پرسیاریان لێ ئەكات لەبارەی (جوبرەئیل)ەوە، ئەوانیش ئەڵێن: ئەوە دوژمنمانە، (محمد) ئاگادار ئەكات بەسەر نهێنیەكانی ئێمەدا، وە ئەو خاوەنی وێرانكردن و سزایە، و میكائیل خاوەنی

خۆشی و ئاشتییە، ئینجا (عومەر) ئەفەرموێ: ئەی ڕادەو پلەی ئەو دووانە چییە لای خوا؟ ئەوانیش ئەڵێن: جوبرەئیل لای ڕاستییەو میکائیل لای چەپی، وە دوژمنایەتی هەیە لە نێوانیاندا، (عومەر)یش ئەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە بەو جۆرە بن کە ئێوە ئەڵێن نابێ دوژمنی یەکتر بن، وە بەڕاستی ئەبێ ئێوە لە کەربێبڕوا تربن، وە هەرکەس دوژمنی هەرکامیانە ئەو کەسە دوژمنی خوایە، لەپاشا (عومەر) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەگەڕێتەوەو تەماشا ئەکات جوبرەئیل پێشکەوتووەو ئەم ئایەتەی هێناوەتە خوارەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێی ئەفەرموێ: ئەی (عومەر) ئەوا خوا قسەکەتی بەڕاست دەرکردو بە گێرەی ئەوە قورئانی ناردە خوارەوە. بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامییە قسەی ئاوا بێ‌جێ، بەڵام چی ئەکەیت لەدەست حەسادەت و ڕق و کینەی بەتین کە ئاوا سەر ئەشێوێنێ لە مەردوم و دووچاری هەڵەو نەفامیەکی ئەکات!! ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) دامەزراو دڵ بەهێزی ئەکات لەسەر ئەو قورئانەی کە ناردوویەتییە خوارەوە بۆ سەری، وە بۆی ڕوون ئەکاتەوە کە هۆی بڕوا نەهێنان پێی لادانەو دەرچوونە لە سروشت، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ سوێندبەخواناردمانەخوارەوەبۆلای تۆچەندئایەتێکی ڕوون و ئاشکرا، ڕوونن لە واتا و مەبەستدا، وە ڕوونن لەمەی کەلەلایەن خواوە هاتوون، ﴿وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ وە هیچکەس بێبڕوا نییە پێیان بێجگە لە یاخییە دەرچووەکان لە سنووری ژیریی و لە سروشت، چونکە بێگومان سروشتی ڕێك و ڕاست و ژیریی ناگونجێ لەگەڵ بڕوا نەهێنان بەو ئایەتانەی کە خۆیان فەرز ئەکەن و ئەچەسپێنن لە دڵ و دەرووندا، کەواتە جوولەکە یان هەرکەسێکی تر کە بڕوایان پێ نەهێنن هەر لەبەر تێك چوونی سروشت و لەکار کەوتنی ژیرییانە، ئینجا ئاوڕێك ئەداتەوە بۆلای موسڵمانان بە تایبەتی، وە بۆلای هەموو ئادەمی بە گشتی، بێزاری دەرئەبڕێ لەو جوولەکانە، وە بەتایبەتی جاڕی ڕەوشت و خویەکی خراپیان لێ ئەدات کە بریتییە لە بێ‌پەیمانی و وەفایی و شکاندنی هەموو بەڵێن و بڕیارێ، ئەوانە سوێندو پەیمانیان شکاند کە لێیان وەرگیرا لە ژێر شاخی (طور)دا، وە چەند عەهدو پەیمانێ تریان شکاند کە دایان بە پێغەمبەرەکانی تریان، وە لەدواییدا پەیمانێکیان شکاند کە دایان بە پێغەمبەرمان(ﷺ) لەیەکەم جاری هاتنی بۆ مەدینەی منەوەرە، کەچی بوون بە یەکەم تاقمێ کە یارمەتی و کۆمەکی دوژمنیانکرد بە دژی پێغەمبەرو ئایینەکەی، وە یەکەم کەس بوون کە ڕەخنەو لەکەیان گرت لە ئایینەکەی، وە هەوڵ و تەقەللایاندا بۆ تێکدانی ڕیزو

کۆمەڵی موسڵمانان و خراپەو ئاژاوە نانەوە لەناویاندا، بە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی کە دایان.

أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُواْ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ
رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ
وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا
كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُواْ

---

ئەفـەرموێ: ﴿أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُواْ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ﴾ ئایـا ئەوانـە بڕوایـان نـەهێنا بـەو ئایەتـە ڕوونانەو هـەموو جارێ پـەیمانێکیان دابێ تاقمـێ لـەوان پەیمانەکەی فڕێداو هـەڵی وەشاندەوەو ڕەفتاری پێنەکرد؟ واتـە کارو کردەوەکـەیان زۆر نـاڕەواو بێزراوە ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڵکو زۆربەیان بڕوا ناهێنن.

بەکورتی لەم ئایەتەدا دوو حاڵو باری خراپی باسکردن:

یەکەم: ئەوانە جێگەی بڕوا نینو بێباوەڕو بێپەیمانن.

دووەم: زۆربەیان چاوەڕوانی بڕوا هێنانیان لێنـاکرێ، وە ئـەم دووەمـە هـەواڵێکی غـەیبی بـوو ئـەوەتا زۆربـەی جوولـەکە بڕوای نـەهێنا بـە پێغەمبـەر (ﷺ) وە بڕوایش ناهێنێ، خراپ ترین نموونـەی بێباریو بێ پـەیمانیان ئەمەیە کە ئەفـەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ کاتـێ کـە پێغەمبـەرێکی گـەورەو بـەڕێزیان بـۆ هـات لـەلای خـواوە ــ واتـە محمد ــ کـە ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ کە بڕوادارو بەڕاست گێڕە بۆ ئەوەی کە لەگەڵ ئەوان بوو ـ واتـە تـەورات ـ کە ئەوەتا بەڕاستی دائەنێو بڕوای پێی هەیە، وە ڕاستییەکەی دەرئـەخات بە خۆی کە سـیفەتو نیـشانەکانی ڕێـکو پێکـە لەگـەڵ ئـەوەی تـەورات هـەواڵی پێـداوە، کاتـێ ئـەم پێغەمبـەرەیان بـۆ هـات ﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ تاقمـێ لەوانـە کـە نامـەیان پێـدرا ﴿كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ﴾ نامەکەی خوایان فڕێ دایە پشتی خۆیانەوەو پشتیان تێکردو گوێیان نەدایە ﴿كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەك هەر نەزانن ئەوە نامەی خوایەو لەگەڵ ئەوەدا چاك ئەشیانزانی، ئەو تاقمە کەلە جوولەکەی چەرخی پێغەمبەر بوون (ﷺ) پشتیان کردە تـەورات کـە فـەرمانی پێئـەدان بـە شـوێن کـەوتنی ئـەم پێغەمبـەرە (ﷺ) وە سـیفەتو نیـشانەکانی

باسکردبوو بۆیان بە جۆرێ کە بەچاکی ئەیان ناسی، وە هەروەها پشتیانکردە قورئانیش کە ڕێك و پێك بوو لەگەڵ تەوراتەکەی خۆیاندا.

ئایەتەکە تەشەریان لێئەدات بەوەی کە ئەوانە نامەی خوایان پێدراوەو زانان کەچی ئەو نامەیان واز لێهێناو خۆیان لێ کەڕو کوێرو نەزان کرد کە ئەوەش ئەوپەڕی تاوان و نەفامییە، وە ئەگەر ئەوانە نەخوێندەوارو بێ‌نامە بوونایە وەك بت پەرستەکان بە هەر حاڵ وەك ئەمان جێگەی تەشەر نەئەبوون.

ئەوانە وازیان هێنا لە نامەکەی خواو خستیانە کەنار ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ﴾ وە شوێنی جادوو دەلەسەیەك کەوتن کە شەیتانەکان ئەیان وت و ڕەفتاریان پێ ئەکرد لەسەردەم و چەرخی پادشایەتی (سلیمان) پێغەمبەردا (علیه السلام)، یان شوێنی درۆو دەلەسەیەك کەوتن کە شەیتانەکان ئەیان خوێند و ئەیان گوت لەبارەی پادشایەتی (سلیمان)ەوەو دەست هەڵبەستیان ئەکرد و مەردومیان پێ گومڕا ئەکرد، کە گوایە (سلیمان) جادو بازبووەو بەجادو بازی ئەو پادشایەتییەی بۆ خۆی سازاند و ئەو هەموو شتەی پێ ژێر بار کرد، واتە زۆر بە پەرۆش و گرنگی ڕوویانکردە ئەو نوسراوو نامەی جادوو دەلەسانەو خەریك ئەبوون پێیەوە.

(سوفیانی کوڕی عویەینە و ئیبن و جەریر) هەواڵێ ئەهێنن لە (ئیبن و عەباس)ەوەو (حاکم)یش بە صەحیحی دائەنێ، کە فەرموویەتی: شەیاتین ئەچوون گوێیان ئەناو ئەیان خستە دڵی مەردومەوەو ئەوانیش ئەیان نووسییەوەو ئەیانکرد بەنامە، ئینجا خوا (سلیمان)ی ئاگادار کرد بەسەر ئەوەدا، ئەویش وەری گرتن و فڕێی دانەژێر تەختەکەی، ئینجا پاش (سلیمان) شەیتانێك هەواڵیدا کە (سلیمان) غەزنەیەکی بێ وێنەی هەیە، ئینجا کە دەریان هێنا ئەو نامەو جادووانە بوون، ئینجا دەست بەدەست نووسرانەوە تا خوا لە قورئاندا پاکی (سلیمان)ی دەرخست بەمەی کە فەرمووی: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ﴾ (سلیمان) بێ‌بڕوا نەبوو، واتە جادوباز نەبووەو جادووی نەکردووە، بەڵام بەو جۆرەی کە فەرمووی نیشانی ئەدات کە جادووبازی و بڕوا کردن پێی کوفرو بێ‌بڕواییە، وە بەم جۆرە باشتر پاکی (سلیمان) دەرئەکەوێ لەو قسەو دەلەسە ناڕەوایەی کە خستیانە شوێنی، وەك باشتر ئەو مەبەستە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڵام شەیتانەکان بێ‌بڕوا بوون لە کاتێکدا

يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ

---

﴿يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾ كە مەردومیان فێری جادوو کرد بە نیازی گومڕا کردنیان ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ﴾ وە هەم فێری ئەوەیان ئەکردن کە هێنرابووە خوارەوە بۆ سەر ئەو دوو فریشتەی کە لە وڵاتی (بابل)دا بوون کە ناویان (هاروت)و (ماروت) بوو، ئیتر ئایا مەبەست بەمە هەر ئەو جادووە بێت کە باسکراو بەڵام ئەم سیفەتو نیشانەشی بۆ باسکرد؟ یان ئەمە جۆرێکی تایبەتی بووبێ لە جادوو کە بەهێزتر بووە لە جۆرەکانی تری، یان کەمترو بێ‌هێزتر، لەبەر ئەوە جیای کردەوەو بەتایبەتی باسی کرد؟ هەرکام لەم سێ بارە ڕای کۆمەڵێ لە زانایانی لەسەرەو هەڵئەگرێ‌و ئەگونجێ.

لە بارەی (هاروت)و (ماروت)ەوە قسەو باسی زۆر کراوەو بڵاو بوونەتەوە لە ناو مەردوما بە دەماودەمو بە نوسین، وە هەروەها چەند هەواڵو ڕیوایەتێك لە بارەیانەوە هاتووە لەلایەن هەواڵ نووسەکانی کۆنەوە، وەك باسکراون لە کتێبەکانی تەفسیردا، جا لەبەر ئەوە پێویستە ئەوەی کە ڕاستو ڕەوایەو وەرگیراوە لای زانا بەرزەکانی ئیسلام دیاری بکرێ‌و بڕیاری ناڕاستی‌و ناڕەوایی بدرێ بەسەر هەر وتراوێ تردا بۆ ئەوەی نەشارەزا نەکەوێتە هەڵەو شتی دەلەسەو پڕو پووچ، کەواتە ئەڵێین: زانایانی حەدیس ئەفەرموون: سەرجەم ئەو ڕیوایەتانە دەلەسەو دەست هەڵبەستن، وە هیچکام لەوانە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتووە، بەڵکو هێندێ لەو ڕیوایەتانە وەك لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە نەهاتووەو ئاشکرایە کە دەلەسەیەو لە ئیسرائیلییاتە، هەروەها دژو پێچەوانەی ژیرییەو بە ڕاستی بە گێڕانەوەشی مەردوم تەریق ئەبێتەوەو بێجگە لەوەش کە لەگەڵ ڕواڵەتی حەدیس‌و ئایەتدا یەك ناکەوێ تا ئەو ڕادەیە (شیهابی عێراقی) ئەفەرموێ: هەرکەس بڕوای بەوە ببێ لە ئیسلام دەرئەچێ، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای تەفسیری (رازی)و (روح المعانی)و (أبوالسعود) بکات، کەواتە با

هیچكەس گوێی نەدا بە هیچكام لەو ڕیوایەتانەو هەر هەواڵو قسەو باسێ كە لەو ڕیوایەتانەوە وەرگیرابێ، بەس هەر ئەمە ئەڵێین: كە (هاروتو ماروت) دوو فریشتە بوون ڕەوانە كران بۆ تاقیكردنەوەی مەردوم تا دەركەوێ كێ ڕێی خوا بەرناداو كێ لائەدا لە ئایینو ڕێی خوا؟ وە هۆی ڕەوانە كردنیان ئەوە بوو لەو چەرخو سەردەمەدا جادوگەری بڵاوەی كردبوو، وە مەردوم بە گرنگی خەریك بوون پێیەوە، وە چەند شتی نایابو سەرسوڕهێنەران پێ ئەكرد، بە تایبەتی لە خاكی (بابل)دا كە ڕۆژو ئەستێرە پەرست بوون، وە لاف پێغەمبەرێتی پێ لێئەدرا، ئینجا خوا ئەو دووانەی ناردبۆ ئەوەی خەڵكی ئاشنا بكەن بە هەموو ڕێگەكانی جادوو تا بتوانن بەرەنگاری جادووگەرانو بێبڕوایان بوەستنو بەربەستی جادووەكانیان بكەنو موعجیزەی پێغەمبەران جیا بكەنەوە لە جادوو جادوگەران، نەتوانن لاف پێغەمبەرێتی لێبدەن، وە تا نەتوانن زیان بگەیەنن بە مەردوم لە ڕێگای جادووبازییەوە، وە پێش ئەوەی مەردوم فێر بكەن ئامۆژگارییان ئەكردن، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ﴾ وە هیچكەسیان فێری جادوو نەئەكرد هەتا لە پێشەوە پێیان ئەوت: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ﴾ ئێمە هەر تاقیكەرەوەینو بۆ تاقیكردنەوەی مەردوم هاتووین لە لایەن خواوە، وە هەركەس لە ئێمەوە فێری جادوو بێو ڕەفتاری پێبكاتو بەڕاستی دابنێ ئەو كەسە كافر ئەبێتو بە بێبڕوا دائەنرێ، وە هەركەس خۆی بپارێزێ لە فێربوون یان ئەگەر فێر بوو ڕەفتاری پێئەكاتو بە ڕاستی نەزانێ ئەو كەسە موسڵمانو بڕواداره ﴿فَلَا تَكْفُرْ﴾ كەواتە بێبڕوا مەبەو خۆت كافر مەكە، وە لەگەڵ ئەو تەمێو ترساندنەدا هەندێ كەس وازیان نەئەهێناو هەر سوور بوون لەسەر فێر بوون، تا فێریان ئەكرد ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا﴾ ئینجا ئەوانیش فێر ئەبوون لێیانەوە ﴿مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ جۆرە جادوییەك كە بەوە جیا بوونەوەو پچڕانیان ئەخستە نێوان پیاوو ژنەكەیو بە تەڵەكەو جادوو بازی دڵیان ڕەش ئەكردن لەحاستی یەكتر، بێگومان هیچكەسو هیچ شتێ هیچی بەدەست نییەو هەموو ڕووداو بەسەرهاتێ بە دەست خواو بە خواستو فەرمانی خوا پەیدا ئەبێ، جا لەبەر ئەوە لێرەدا كارەكە ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا، ئەوەش بەپێی باوی كەئەیەوێ ئەو بۆچوونو تێكەیشتنە بچەسپێنێ لە دەروونی مەردوەمدا،

وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ
عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ
كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟

---

ئەفـەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾ بەڕاسـتی ئـەو جادوگەرانـە بـە جادووەکـەیان زیانـدەری هیچکەس نین مەگـەر بـەئیزن و خـواهیش و زانینی خـوا، بەڵێ بە ڕاستی هەر شتێ لەم بوونەوەرەدا هۆی هەرشتێ تر بێت ئەوە بەئیزن و خواهیشی خوایە و مەیلی نەبێ شتەکە ڕوونادات، ئەگەر هەزارەها هۆی بەدی هاتنی ببێ و هەمووشی کۆببنەوە، بۆ وێنـە: یـەکێك دەستی بکـەوێ لـە ئـاگر دەسـتی ئەسـوتێ بـە پێـی یـاوی خـوا، وە ئـەو سـووتاندنە خـوا فەراهـەمی ئـەهێنێ و بـە مـەیل و ئیزنـی خوایـە، چـونکە خـوا ئاگرەکـەی وا دروسـتکردووە کـە ئامادەیـە بـۆ سـووتاندن و لـەکاتی لێکەوتنەکـەدا خـوا سـووتاندن بـەدی ئەهێنێ، وە هـەرکاتێ بیـەوێ پـەکی ئەخات و ناهێڵێ هیچ بسووتێنێ، وەك یـەکی خسـت لـە سووتاندنی (ئیبراهیم) پێغەمبـەر (ﷺ) وە هـەروەها هـەموو شتێ تر، ئینجا حەقیقەتی ئەوە دەرئـەخات کـە فێـری ئـەبوون، بەمـەی کـە شـتێکی خراپـی زیانـداری بـێ سـوود بـوو بـۆ خۆیشیان، ئەفەرموێ: ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ﴾ فێری شتێ ئەبوون کە زیانی پێ ئەگەیاندن، ﴿وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ﴾ وە سوودیشی پـێ نەئەگەیانـدن، وە هەرشـتێ بـەو جـۆرە بێـت ئـەبێ هـەموو ژیرێ خۆی لێ بپارێزێ، چونکە هەر ئەوەیە خراپی ڕووت و پەتی، وە بەسـە لـە خراپیدا کە ئەو فێر بوونە هۆی بێبڕواییە و دەچوون لەئایینی خوا، چونکە فێر بوونەکەیان بۆ بـەرگری کردنـی جـادووو جادووگـەران نـەبوو، وە بۆئـەوە نـەبوو کـە موعجیزەی پێ‌جیا بکەنـەوە لـە

جادووو هەڵنەخەڵەتێن بە قسەی ئەوانە کە بە درۆ لاف پێغەمبەرێتیان پێ لێ ئەدا، بەڵکو ئەیان ویشت ڕەفتاری پێبکەن‌و مەردومی پێ گومڕا بکەن، ئینجا ئاشکرایە کە بێبڕوایی‌و دەرچوون لە ئاینی خوا کانگاو سەرچاوەی هەموو شەڕو خراپەیەکەو هیچ شەڕو خراپەیە تری پێناگات.

ئەو جوولەکانە نامەی خوایان فڕێ داو پشتیان تێکردو گۆڕیانەوە بەو پڕ پووچ‌و دەلەسەی کە شەیتانەکان دەست هەڵبەستیانکرد ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ﴾ وە سوێن بە خوا ئەو جوولەکانە ئەیانزانی ﴿لَمَنِ اشْتَرَاهُ﴾ کە بێگومان هەرکەسێ ئەوەی کڕی. بۆ خۆی‌وهەڵی بژاردبەسەرنامەی خوادا: ﴿مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ نییە بۆ ئەو کەسە لە ڕۆژی دواییدا هیچ بە شێك لە بەهەشت، ئای هاوار بۆ کەسێك کە تاوان‌و خراپە بکات بەزانین‌و لە ڕووی زانینەوە! ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ﴾ وە سوێند بە خوا زۆر خراپە ئەوەی کە خۆیان فرۆشت لە بریتیدا، واتە ئەمانە دەستیان هەڵگرت لە بەهەشت‌و نازو ڕێزی ئەو جیهان لە پێناوی ئارەزووی نەفس‌و بەرژەوەندی ئەم جیهان، کەواتە وەك خۆیان فرۆشتبێ بەم شتە کەم‌و بێ نرخەی ئەم جیهانە، ئەوانە هەرچەند ئەیانزانی کارەکەیان سەری لەو بێ بەشییەوە دەرئەچێ، بەڵام بە پێچەوانەی زانینەکەیان ڕەفتاریان ئەکرد لەبەرئەوە بەنەزانیان نیشان ئەدات‌و ئەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە زانا بوونایە بەو جۆرەیان نەئەکرد، ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُواْ وَاتَّقَوا﴾ وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە قورئان‌و بە پێغەمبەر (ﷺ) وە لە خوا بترسانایەو خۆیان بگێڕایەتەوە لەو بارو کردەوە لارەی کە وان لەسەری، بێگومان پاداشت ئەدرانەوە لەلایەن خواوە،

لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾

﴿لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ﴾ بێگومان پاداشتێك لەلایەن خواوە چاكترە، واتە پاداشتێك لەلایەن خواوە لە ڕۆژی دوایی نەبڕاوەدا هەرچەند كەمیش بێت چاكترە لە پاداشتی زۆری ئەم جیهانە بڕاوە، چ جای ئەوە كە پاداشتی خوا لەو ڕۆژەدا وەك هەمیشەیی و نەبڕاوەیە هەروەها ئێجگار زۆرو فراوانە تا ڕادەیەك كە بیرو خەیاڵی ئێمە پیایدا ناگات.

ئەوانە ئەیانزانی پاداشتی ڕۆژی دوایی چاكترە بەڵام كردەوەیان پێچەوانەی ئەو زانینە بوو لە بەرئەوە لێرەشدا بەنەزانی دانان و فەرمووی: ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە زانا ئەبوون بڕوایان ئەهێناو لە خوا ئەترسان، یا خۆزگە زانا بوونایە، واتە ئەوەندە حاڵیان خراپە جێگای بەزەیین و ئاواتی زانینیان بۆ ئەخوازرێ بۆ ئەوەی دووچاری ئەو بەدبەختییە نەهاتنایە، ئینجا لە كۆتایی باسەكەدا بە جوانی ئەزانم هەندێ بدوێم لە بارەی جادووەوە، لەم چەند خاڵەدا:

١- زانایان دوو بەرەكین و ڕایان جیاوازە لە جادوودا، كۆڕو جەماوەر لەسەر ئەوەن كە شتێكی ڕاستەو هەیەو هەر چاو بەست و تەڵەكە نییە، بەڵكو هەندێكی چاوبەستی ڕووتە، وە (موعتەزیلە)و تاقمێ لە ئەهلی سوننەت وەك (ئەبوبەكری ڕازی)و (ئەبو جەعفەری ئوستر ئابادی)و (ئیبن و حەزمی زاهیری)و چەند كەسێ تر لەسەر ئەوەن كە هەر فێڵ و تەڵەكەو چاوبەستەو لە ڕووی ڕاستیدا هیچ نییە، وەك قورئانیش بەو جۆرەی نیشان ئەدات سەبارەت بە جادووی جادوو بازەكانی فیرعەون: ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾[1] (ئەبو بەكری ڕازی) ئەفەرموێ: ئەگەر ئەوەی جادووكەران هەڵئەستن پێی ڕاست بوایە ئەبوایە هەموو پادشاو دەسەڵاتدارەكانیان بەردەست بكردایەو خۆیان ببونایە بە پادشای هەموو جیهان، وە هەموو غەزنەو سامانیان ڕاكێشایەتە ژێردەستی خۆیان، ئەگەر ئەوەی كە هەڵئەستن پێی ڕاست بوایە

---

[1] واتە بەهۆی جادووەكەیانەوە خرانە خەیاڵی (موسا) (علیه السلام) كە ئەو گوریس و داردەستانە ئەجوڵێن و ئەشلەژێن.

بەو جۆرە ئەبوون، نەك بگەڕێن بەوڵاتانداو بەو جۆرە ئاوارەوا ژیان بەسەر ببەن‌و چاوەڕوانی دەستی مەردوم بن.

٢- جادوو چەند جۆرێکی هەیە، (ئیمامی ڕازی) لە تەفسیرەکەیدا هەشت جۆری بۆ باس ئەکات‌و بە پێویستی نازانم درێژە دان بە باس‌و ڕوونکردنەوەیان، بەڵام لەو جۆرانەوە وا دەرئەکەوێ کە جادوو نەهەر هەمووی چاوبەستی ڕووتەو نە هەر هەمووشی ڕاستەو حەقیقەتی هەیە، وە بە هەرحاڵ‌و لەسەر هەر بار شتێکی ئاشکرایە کە جادووکار ئەکات‌و بەرهەمی ئەبێت لە هەست‌و دەروونداا، ئیتر با ئێمە نەزانین بە چۆنیەتی جادوو کارکردن، ئەویش وەك ئەو هەموو هێزە نادیاریانە کە تا ئێستا کەس نەیزانیوە چۆنیەتی خۆیان‌و کارکردنیان‌و بەرو بەرهەمیان، یا وێنە هەستیاری شەشەمی نەزانراو (التليثائي) یا ئەوەی کە ناوئەبێ بە (التنويم المغناطيسي) یا ئەوەی کە پێی ئەوترێ (احلام التبؤية) کە تا ئێستا هیچکەس نەیزانیوە ئەمانە چین‌و چۆن پێکدێن؟ وە تا ئێستا زانیاری سەبارەت بەم هێنرا کە بەناچاری باوەڕی پێهێنان‌و دانی پیانان هەر ئەوەی لێهاتووە ئەم ناوانەی لێ ناون ئیتر بەبێ ئەوەی بزانێ ئەمانە چین‌و چۆن پێکدێن؟! ئەو جوولەکە نەفرین لێکراوانە هەمیشە بە دوای ئەوەدا گەڕاوون پلاری بوەشێنن بە هەرجۆرو لە هەر ڕێگەیەکەوە کە لەدەستیان بهاتایە، بۆ نموونە: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانەکانی فێری شتێ ئەکرد، عەرزیان ئەکرد: (راعنا يا رسول الله) واتە گوێبگرەو لێمان بوەستەو بە هێواش‌و چاودێریمان بکە، وە ئەم وتەیە لە دەنگ‌و ئاوازدا وەك وتەی (راعين) وایە کە لە زمانی عیبریدا جنێوێکی ناشیرینەو جوولەکەکان بە نهێنی‌و لەناو خۆیاندا بەکاریان ئەهێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، نەفرینی خوا لەوان بێت، ئینجا کاتێ کە گوێیان لێبوو موسڵمانەکان وتەی (راعنا) بەکار ئەهێنن، ئەوەیانکرد بە هەل بۆ خۆیان‌و دەمیان خوارئەکردەوەو بەگاڵتەوە ئەیان وت بە پێغەمبەر (ﷺ) (راعين) واتە پێش نەفام، وەلە ناو خۆیاندا پێ‌ئەکەنین بەوەی کەبە ئاشکرا جنێوی خۆیان ئەدەن‌و کەسیش پێیان نازانێ،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ
عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ أَن
يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو
ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

وە نەیان ئەزانی کە خوای گەورە ئاگادارەو هەمیشە بەرگری ئەکات لە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی (ﷺ) جا لەبەرئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمانیدا کە ئەو وتەیە بەکارنەهێنن، بەڵکو وتەیەتر بەکاربهێنن کە مەبەستەکەی خۆیان بگەیەنێ و جوولەکەش نەتوانن مەبەستی بۆگەنی خۆیان تێکەڵ بکەن فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَقُولُواْ﴾ مەڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾ ﴿وَقُولُواْ﴾ وە بڵێن: ﴿ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ﴾ واتە سەرەنجمان بدە، یا چاوەڕوانیمان بکەو لێمان بوەستە هەتا تێی ئەگەین و لەبەری ئەکەین و ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ وە بۆئەو جوولەکە بێبڕوایانە هەیە سزایەکی ئازار دەری سەخت.

لێرەدا پێویستە بیربکەینەوە لە ئەندازەی پیسی و دوژمنایەتی و کینەو بێشەرمی و بێشەرەفەی جوولەکە، هەرچۆنێ بیربکەینەوە لەو هەموو بەهرەو میهرەبانی و چاودێری خوا بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وە بۆ ئەوە گەلە موسڵمانە، وە بەرگری کردنی لە دۆست و خۆشەویستەکانی، بەرامبەر هەر پیلان و هەر نیازێکی پیس لەلایەن دوژمنەکانیانەوە! ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە بۆ موسڵمانەکان ئەو هەموو داخ و کینەو دوژمنایەتی و حەسادەتەی کەلە دڵی جوولەکەو بت پەرستەکاندایە بۆیان، بۆ ئەوەی موسڵمانەکان خۆیان بپارێزن لەو دوژمنانە، وە هیچ کاتێ لێیان ئەمین نەبن، وە هەمیشە دەست بگرن بەو ئایینە پیرۆزەی کە داخی سەختی لەدەروونی ئەو دوژمنانەدا، ئەفەرموێ: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، نەلە نامەدارو نەلە بت پەرستان حەزناکەن و پێیان خۆش نییە ﴿أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ﴾ کە بهێنرێتە خوارەوە بۆ سەرتان هیچ خێرو چاکەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوە.

قورئان نامەدارەکانی کۆ کردەوە لەگەڵ بت پەرستەکان‌و هەردووکی وەك یەك بە بێبڕوا دانان، چونکە هەر دووکیان بڕویان نییە بە دواترین ئاین‌و شەریعەتی خوا، وە هەردوو بەدنیازن‌و داخ لە دڵن بۆ بڕواداران، وە هەردوو هیچ خێرو خۆشیەکیان ناوێ بۆیان، وە گەورەترین بەهرەیەك کە خوا ڕشتی بەسەر بڕوادارەکانداو بوو بوو بەڵك‌و داخ لەدڵی ئەواندا ئەم ئایینە پیرۆزە بوو، وە ئەم گەورەترین سپاردەیە بوو کە خوا پێی سپاردن، وە داخ‌و پێ ناخۆش بوونەکەیان لەبەر نەخۆشی حەسادەت بوو کە دەروونی داگیر کردبوون، وە خۆیان بەشیاوو شایستە تر دائەنا بۆ ئەو خێرو فەڕەی کە خوا ڕشتی بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)و بڕواداراندا، دەی مەگەر ئەو حەسوودە داخ لە دڵانە هەر بە ژانەوە بتلێتەوە، چونکە ﴿وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ﴾ خوا هەرکەسێکی بوێ‌و مەیلی هەرکەسێ بکات، تایبەتی ئەکات بە ڕەحمەت‌و میهرەبانی خۆیەوەو جوێی ئەکاتەوە لەناو بەندەکانیدا، ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ وە خوا خاوەنی بەهرەو چاکەی گەورەو فراوانە، کەواتە کە پێغەمبەری (ﷺ) تایبەتیکرد، وە ئەو هەموو بەهرەی ڕشت بەسەر خۆی‌و بڕواداراندا، بێگومان زانیویەتی کە ئەوو یارەکانی شیاوو شایستەن بۆ ئەو تایبەتی کردنەو هەر ئەوە ڕاست‌و ڕەوایە کە ئەو کردوویەتی، بێگومان پێویستە لەسەر بڕواداران کە دڵ‌و دەروونیان بێتە سۆزو پەرۆش‌و هەمیشە چاولەبەری ئەم چاکەو بەهرە تایبەتییە بن کە خوای میهرەبان ڕشتی بەسەریاندا، وە زۆر بە گرنگی بگرن‌و کامەران‌و دڵخۆش بن پێی‌و ڕێزی خۆی بدەنێ، هەرچۆن پێویستە لەسەریان کە هەمیشە وریا‌و چالاك‌و لێهاتووبن بەرامبەر پیلان‌و کینەی دوژمنەی داخ لە دڵەکانیان‌و هەرگیز نەخەڵەتێن پێیان.

خوای زانا‌و کاردروست هەندێ لەبڕیارو فەرمانی سڕییەوەو گۆڕی کە بە پێی لێزانی خۆی بەرژەوەندی ئەما لە هێشتنەوەی ئەو فەرمان‌و بڕیارانەدا، ئینجا جوولەکەکان بە سروشتی پیسی جوولەکەیی خۆیان ئەوەیان بە هەل‌و هەڵکەوتێکی گرنگ دانا بۆ پڕو پاگەندەو پیلان‌و فاك‌و فیکی خۆیان سەبارەت بە لەکەدار کردنی ئەم ئایینە پیرۆزە دوو دڵ کردنی ئەو بڕوادارانەی کە هێشتا دامەزراو نەبوون‌و بڕواکەیان ڕیشەی دانەکوتابوو، بنج بەست نەبوو بوو، ئەیان وت بەوانە: ئەگەر ئەمە لەلایەن خواوە بهاتایە نەئەسڕایەوەو

فەرمانێکی تازە دەرنەئەچوو دژی پێشووەکە، بە تایبەتی ئەو هێرش‌و هەڵمەت دانە بە تین‌و بەهێز بوو لەکاتی گۆڕانی ڕووگە (قیبلة) لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (کعبە) لە پاش ئەوەی ١٦ مانگ پاش کۆچکردنیش هەر ڕووگە (بیت المقدس) بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانەکان، هەرچۆن ڕووگەی جوولەکەکانیش بوو، چونکە لە پێش ئەو گۆڕانەدا ڕێگەیان بوو پڕوپاگەندە بکەن لای نەزان بەوەی کە ئایینەکەیان ڕاستەو ئەوەتا موسڵمانەکانیش هەر ڕوو ئەکەنە ئەو ڕووگەیە کە ڕووگەی ئەمان بووە، بەڵام لەپاش گۆڕانی ڕووگە دەمیان بەسترا لەو پڕوپاگەندە کردنە، لەبەرئەوە بەو گۆڕانە ئاگریان تێچوو بە هەموو جۆر ئەیان وت: ڕووکردن بۆ (بیت المقدس) ئەگەر ڕاست بووە بۆچی گۆڕرا؟ وە ئەگەر ڕاست نەبووە ئەبێ نوێژو خواپەرستی لەمەو پێشتان دروست نەبووبێ، بەو شێوە شەیتانییە ئەیان ویست موسڵمانەکان دوودڵ بکەن لە ڕاستی ئایین‌و عەقیدەکەیاندا.

وا دەرئەکەوێ ئەو هێرش‌و هەڵمەتە بۆ گەنەیان تا ڕادەیەك کاری کردبێت‌و دڵی هەندێ لە بڕواداراانی بێ ئارام کردبێ تا قورئان هاتە خوارەوەو دڵئارامی کردن، وەك لەمەوپاش پێی ئەگەین بە یارمەتی خوا لەسەرەتای جزمی دووەمەوە، ئینجا بەبۆنەی گۆڕانی ڕووگە، یا بەبۆنەی گۆڕانی هەندێ لە فەرمان‌و یاسای تر لە ئیسلامدا یا بەبۆنەی هەندێ لە بڕیارو یاسای تەورات کە قورئان هێنای‌و دەستی تێخست‌و بژارەی کرد، تا ڕێك کەوێ لەگەڵ هەموو کات‌و باوو بارێکدا بەبۆنەی هەرکام لەمانە، یان بەبۆنەی هەموویانەوە، ئەوا قورئان بڕیارێکی ڕوون‌و ڕەوان‌و بڕاوە دەرئەکات بە شێوەی گشتی سەبارەت بە سڕینەوەو بژارکردنەوە، وە هەموو فیك‌و فاك‌و پڕوپاگەندەی جوولەکەکان لەناو ئەبات‌و لە ڕیشەیان ئەهێنن، وە پێش ئەوەی دەست بکەین بە ئایەتەکە بە جوانی ئەزانم هەندێ بدوێم لەبارەی ئەو سڕینەوە کە لە شەرعدا پێی ئەوترێ (نسخ)، بەم شێوە کورتە کە دێت:

١- سڕینەوەی بریتییە لە نەهێشتن‌و هەڵگرتنی بڕیارێکی شەرعی بە بڕیارێکی شەرعی تر کە بەدوای یەکەمدا هاتبێ، وە ئەم بڕیاری دووەمە دەئەکەوێ لە ماوەی ڕەفتار کردن بە بڕیاری یەکەم داویی هات.

٢- ئەم سڕینەوەیە شتێکی ڕاستەو بەدی هاتووە بە چەند بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرا لە ئایەتەکانی قورئاندا کە بەڕاستی ڕێگا ناهێڵێتەوە بۆ سەرنجی کردن و ملەجەڕێ لێی و هەرکەس تێگەیشتنی تەواو بێت ئەبێ دانی پیا بنێ.

٣- هۆی ئەو سڕینەوەش ئەمەیە کە فەرمان و یاساکانی خوا هاتوون لەبەر بەرژەوەندی بەندەکانی و چارەسەکردنی هەموو تەنگ و چەڵمەو گیرو گرفتیانەوە ئەوەش زۆر جار بە پێی چەرخ و شوێن ئەگۆڕێ و جیاوازە، گومڕایی ئەگەر یاساو بڕیارێکی پێویست لەچەرخێکدا درا، ئەبێ بگۆڕێ لەچەرخێ ترداکە پێویست نەبێ، بەڵکو دژو پێچەوانەی پێویست بێت لەو چەرخەدا، وە ئەو گۆڕانە بە وێنەی گۆڕاندنی خۆراک و دەرمان وایە بۆ نەخۆش کە پێویستە گۆڕاندنی بە پێی کات و جۆرو ڕادەی نەخۆشییەکان، وە پێغەمبەرەکان سەلامی خوایان لێ بێ- ڕەوانەکراون بۆتیمارو چارەسەر کردنی هەموو زام و دەردێکی ژیریی و بیریی و دەروونی و کۆمەڵایەتی لە هەر بارو ڕوویەکی ژیانەوە.

٤- ئەو سڕینەوە لەم شەریعەتەدا بۆ چەند شتێکی بچووك بوو کە سەرەکی و بنەڕەتی نەبوون لە ئایینەکەدا، وەك گۆڕانی ڕووگەو عیددەی مێرد مردووو چەند شتێکی تری وێنەی ئەمانە کەلە یەکەم جارەوە بەرژەوەندی بووە لە بوونیاندا تا گەلی موسڵمان پێ گەیی و گەشەی کردو بەهێز بووو ئامادەیی پەیدا کرد بۆ وەرگرتنی یاساو دەستووری هەمیشەیی و نەگۆڕاو ئەو کاتە ئەوانەی کە بەرژەوەندی نەما لە مانەوەیانداو بەکاری هەموو چەرخ و چینێ نەئەهاتن، ئەوانە بەرەبەرە سڕانەوەو گۆڕان بە شتێکی هەمیشەیی و هەموو کاتی، وەك هەموو یاساو بەندەکانی تری کە هەر لە یەکەم جارەوە بە هەمیشەیی هاتن و دەستیان نەئەدا بۆ سڕینەوەو دەست تێ خستن.

٥- هەر سڕینەوەو دەست تێ خستن و بژار کردنێك بووبێ تایبەتی بووە بە چەرخ و ژیانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وە هەر لەو وەرگیراوە ئیتر بە قورئانیان لەلایەن خۆیەوە بێ بە پێی فەرمانی خوا، وە لەپاش ئەو ئیتر بۆ هیچ کەس ڕەوا نەبووەو ڕەوا نابێ هەتا هەتایە بە هیچ جۆر سڕینەوەو گۆڕان و دەست تێ خستن و بژار کردن و سەر لێکردنەوە لەم ئایین و شەریعەتە گشتی و جیهانییەدا!!

٦- نابێ هیچ بڕوادارو ژیرێ بڕوای بەوە نەبێ یان دوو دڵ بێت تیایدا، یا سەری سووڕ نەمێنێ لەوە، چونکە:

أ- خوا لە دوا دوایی هاتنە خوارەوەی قورئانو ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) بە مزگێنییەوە هەواڵی داو ڕووی فەرمودەی کردە ئەم ئوممەتەو فەرمووی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بە پایان گەیاند، دەی کاتێ گەیشتووە بە پایان کە دەست نەدا بۆ بژارو گۆڕان.

ب- ئەوە هەموو بەندو یاساکانی ئەم ئایینو شەریعەتە یەك بە یەك نووسراونەتەوەو لە جیهاندا بە ناوبانگن، ئایا کێ ئەتوانێ لە ڕووی ژیریی و زانیارییەوە هەرکام لەو یاساو بەندانە بە ناڕاستو نەشیاو دەرکات؟ ئەوا جاڕ بێت بە هەموو جیهاندا کە ئیسلام بەر ئەبڕێتەوە لە هەموو کەس منەتی نەبێ و هەرکەس بڕوای نەبێ و هەرکەس بڕوای نییە هەرچی لەدەست دێت بەکاری بێنێ لەم مەسەلەداو قسەی خۆی سەربخات.

ت- ئەم ئایینو شەریعەتە بەندو یاسا گشتییەکانی بە جۆرێ هێناوە کە زانایان بتوانن بڕیاریان لێ وەرگرن بۆ هەر ڕووداوو بەسەرهاتێکی تازە کە دەقی یاساو بەندەکانی نەیان گرتبێتەوە، وە ڕێگەی زانایانیشی داوە بۆ ئەو وەرگرتنە، وە هەر هەڵەیەکیش بکەن لەوەدا چاوپۆشیان لێ ئەکاتو پاداشتیشیان ئەداتەوە لەسەر ئەرکو زەحمەتێ کە کێشاویانە، وە بۆ ئەو مەبەستە پێسەواو زاناکانی ئیسلام هەر لە چەرخی یەکەمەوە کەوتنە کۆششو تێکۆشانێکی بێوچان تا توانیان بڕیاریان وەرگرت بۆ هەر ڕووداوو بەسەرهاتێ کە بەدڵدا گوزەر بکات، ئیتر با هەرگیز بەدی نەیەت، ئینجا ئەو دەروازە پانو فراوانەو دانەخراوە، بەڵکو لەسەر پشتە هەتا ئەم جیهانە هەیە، وە هەمیشە زانایان ئەتوانن لەبەر ڕووناکی قورئانو حەدیسو ڕاو بڕیاری زاناو پێشەواکان چارەسەری هەموو گرێیەك بکەنو بڕیاری هەر ڕووداوو بەسەرهاتێکی تازەتریش باس بکەنو ڕوونی بکەنەوە!!

﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ

قسەو باسی زۆرتر هەیەو بەلام با زیاد لەمە درێژە نەدەین بە باسەکە یا خوێنەرەکان بێزار نەکەین و بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە کە ڕاستی و ڕەوایی سڕینەوەکەمان بۆ باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ ئەگەر ئایەتێك بسڕینەوە ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ یا لە بیری بەرینەوە لەدڵدا نەیهێڵین ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ﴾ چاکتر لەو ئایەتە ئەهێنین بۆ بەندەکان، کە چاکتر بێت لەمەدا کە ئەم سووك و ئاسانترە لەسەر بەندەکان وەك پێویست کردنی وەستانی هەرکام لە موسڵمانان بەرامبەر دە کەس لە بێبڕواکان لەکاتی جەنگ و کوشتاردا، کە سڕایەوە بە پێویست کردنی وەستان بەرامبەر دووکەس لە بێبڕواکان، یا چاکتر لە زۆری ئەجرو پاداشتدا، وەك پێویست کردنی ڕۆژوو گرتن یا فیدیە دان کەلە یەکەم جارەوە بەو جۆرە پێویست کراو خرایە دەست و ئارەزووی بەندە، لەپاشدا ئەوە سڕایەوە بە پێویست کردنی ڕۆژوو گرتن ﴿أَوْ مِثْلِهَآ﴾ یا وێنەی سڕاوەکە ئەهێنن، واتە لە سووك و ئاسانی و ئەجرو پاداشتدا وەك سڕاوەکە وایە، بەلام بێگومان بەرژەوەندی لەم دایە، وەك ڕووکردنە (بیت المقدس) کە سڕایەوە بە ڕووکردنە (کەعبە) کە وەك یەکن لە سووك و ئاسانی و ئەجرو پاداشتدا، بەلام دیارە لە چەند ڕوویەکەوە بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان لە ڕوو کردنە (کەعبە)دایە، زانایان ئەفەرموون: سڕینەوەی ئایەت سێ جۆری هەیە:

١- سڕینەوەی تەنها حوکم و بڕیارەکەی کە ئەمە زۆرترو بەناو بانگ ترە، وەك ئەو چەند وێنەیە کە هێنامانەوە.

٢- سڕینەوەی تەنها خوێندنەوەکەی بە قورئانی، وە هێشتنەوەی حوکم و بڕیارەکەی وەك خوێندنەوەی (فاقطعوا ايمانهما) واتە پیاوو ئافرەتی دز دەستی ڕاستیان ببڕن، کە سڕایەوە بە (ايديهما) یا خوێندنەوەی (الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما) واتە: پیاوو ئافرەتی گەورەی ژن هاوەر شوو کردوو کاتێ زینایانکرد بەردبارانیان بکەن،

ئەی ئەو دووانە خوێندنەوەکەیان بە قورئانی سڕایەوەو بڕیارەکەیان هەر هەیە، ئەوەتا دز یەکەم جار دەستی ڕاستی ئەبڕێ‌و پیاوو ئافرەتی ئاواش بەرد باران ئەکرێن.

٣- هەردوو بسڕێتەوە، ئەوەش وەك دایکی بڕواداران عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: (کان فیما انزل عشر رضعات یحرمن فنسخن بخمس معلومات) واتە لە پێشەوە ئایەت هاتە خوارەوە بەوەی کە بە دە جار شیر خواردن مەحرەمێتی پەیدا ئەبێت، لە پاشا ئەو ئایەتە سڕایەوە بە پێنج جاری زانراو بە بێ‌گومان، وە ئەم سێ جۆر سڕینەوە وەرئەگیرێن لە ئایەتەکە بە چەند شێوەیەك، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە جۆری یەکەم‌و دووەم لە ڕستەی ﴿مَا نَنسَخْ﴾ وەرئەگیرێن، واتە ئەگەر هەر ئایەتێك بسڕینەوە بەم ڕەنگە بڕیارەکەی نەهێڵین یان خوێندنەوەکەی، وە سێیەمیش ڕستەی ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ ئەیگەیەنێ، واتە لە بیری بەرینەوەو لە دڵدا نەیهێڵین بە هیچ ڕەنگ، ئەوەش کاتێ ئەبێت کە بە خۆی‌و حوکم‌و بڕیاریەوە نەمێنێ، وەك لە پێشەوە گوتمان جوولەکەکان لەم مەسەلەی سڕینەوە (نسخ)دا ئێجگار کەوتنە فاك‌و فیك‌و پڕو پاگەندە بۆ ئەوەی بڕواداران بەد گومان بکەن، وە تا ڕادەیەکیش کاریانکرد لە دڵی هەندێ لە بڕواداران، جا لەبەرئەوە قورئان بەو شێوەیە لە پێشەوە باسی ڕاست‌و ڕەوایی سڕینەوەی کردو ئینجا دەست نیشانێ ئەکات بۆ بەڵگەو نیشانەی بەهێز لەسەر گونجاوی‌و بەجێیی سڕینەوە، وە بە شێوەی ئامۆژگاری‌و بێزاری دەربڕین لە بەدگومانی‌و هەر هەڵوێستێکی تری ناڕەوا، ئەم پرسیارە ئاراستە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئایا نەتزانیوە کە خوا ئاوا تواناو زۆردارە بە سەر هەموو شتێکدا؟ واتەخوا کە ئاوا تواناو زۆردار بێت، ئەبێ توانا بێت بەسەر سڕینەوەی ئایەت‌وهێنانی چاکترلەوئایەتەیان وێنەی لەجێگایدا، ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئایانەتزانیوەکەهەربۆخواهەیە پادشایەتی‌و کاربەدەستی هەموو ئاسمانەکان و زەوی؟ واتە خوایە کە ئاوابێ ئەبێ سەر نەکرێتەوە لە هیچ کارو فەرمانێکی، وە هەمووفەرمان‌وبڕیاری وەرگیرێ بەوپەڕی ملکەچی‌وگوێڕایەڵیەوە،

وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا رَسُولَكُمْ
كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾
وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ
عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا وَٱصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ

﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ وە نییە بۆتان بێجگە لە خوا هیچ خاوەن‌و کاربەدەستێ‌و هیچ کۆمەك‌و یارمەتی دەرێك، واتە هەرکەس بزانێ کە هەر خوا کاربەدەست‌و خاوەن‌و کۆمەکیەتی، ئەبێ ئەو کەسە بزانێ کە خێرو چاکەو بەرژەوەندی هەیە لە هەموو کارو فەرمانێکیدا،وە گومان‌ودوودڵیی نابێ لە هیچ سڕینەوەو هێشتنەوەو هیچ کارو بڕیارێکیدا، وە بە دڵێکی پڕ لە بڕواو ئارامەوە کارو فەرمانەکانی وەرئەگرێ‌و هیچ قسەو باسێکی تر کاری لێناکات، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا رَسُولَكُمْ﴾ ئایا ئێوە ئەتانەوێ داوا بکەن یا پرسیار بکەن لە پێغەمبەرەکەتان، واتە داواو پرسیاری بێ‌جێ‌و داواو پرسیارێ کە لەبەر گومان‌و سەرپێچی‌و بیانوو گرتن بێت، ﴿كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾ هەرچۆنێ داوا یا پرسیار کرا لە (موسا) (علیە السلام) بەو جۆرو شێوەی کە باسکرا ــ واتە شتی وا نەکەن ــ، چونکە ئەو جۆرە داواو پرسیارە سەری لە کوفرو بێ‌بڕوایی یەوە دەرئەچێ، ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە هەرکەسێ لە باتی بڕوا بێ‌بڕوایی وەرگرێ‌و هەڵی بژێرێ بۆ خۆی، بێ‌گومان ئەو کەسە ڕێگەی ڕاستی ونکردووەو لایداوە لێی، وە ئەوەش ئامانج‌و ئاواتی زۆر کەسە لە جوولەکەو نامەدارەکان، وەك لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە لە ڕیزی هەڵوێست‌و کردەوە ناڕاست‌و بەدەکانی جوولەکەدا کە لە سەرەتای سورەتەکەوە هێنای، ئەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ زۆر لە نامەدار پێی خۆشەو

ئاواتەخوازە ﴿لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا﴾، بۆ ئەوەی بتانگێڕنەوە ــ لەپاش بڕوا هێنانتان ـ وە بتانکەنەوە بەبێ بڕوا، پێیان خۆشە ئەوەتان بەسەر بێنن (حسدا)، لەبەر حەسادەت بردنیان پێتان، حەسادەتێکی بەمێزو گەورە کە پەیدا بووە ﴿مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ لەلایەن خۆیانەوەو لە دەروونی خۆیان هەڵقوڵاوە، کەواتە گەیشتووەتە ئەوپەڕی ڕادەو پلە، ئینجا ئەو پێخۆش بوونەشیان لە ڕووی نەزانینو سەر لێ شێوانەوە نییە، بەڵکو ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ لەپاش دەرکەوتنو ڕوون بوونەوەی هەقو ڕاستیەکە بوو بۆیان، وەلە پاش ئەوەی کە ئەیانزانی ئێوە لەسەر ئایینی ڕاستو ڕێی ڕاستن، وە خۆیان ناڕاستنو لەسەر ڕێی چەوتن، وە ئەو زانینو دەرکەوتنەش بە هۆی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە بوو کە لە تەوراتدا هاتبوون، بەڕاستی ئەوەش ئەوپەڕی لاریو نالەبارییە کە یەکێ ڕێی ڕاست بناسێو نەیداتەبەر، ئینجا بەوەش واز نەهێنێ بەڵکو بیەوێ مەردومی تریش گومڕا بکاتو ئاواتە خواز بێت بۆ گومڕا کردنی!!

ئەو حەسادەتە پیسەو ئەو داخو کینە ڕەشەبوو کە هەر لە یەکەم جارەوە دڵو دەروونی جوولەکەی تاریك کردو پڕی کرد لە دوژمنایەتی بەرامبەر ئیسلامو موسڵمانان، وە پاڵی پێوە نان بۆ ئەو پیلانو کردەوە خراپانەی کە هەڵسان پێیانو هەمیشەو لە مەولایش هەر خەریکن پێیانەوە، کەواتە با موسڵمانان هەمیشە وریا بن، جا قورئان لەو کاتەدا کە ئەو نیازو نیهادە پیسەی دەرخستن، لەو کاتەدا نیاز پاکو ڕەفتار شیرین بنو بەم جۆرە فەرمانی پیادان: ﴿فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟﴾ ئینجا ئێوە ببوورن لێیانو تۆڵەیان لێ مەسێنن، وە چاوپۆشی بکەن بەبێ لێدانو سەرزەنشتیان ﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ﴾ هەتا خوا کارو فەرمانی خۆی ئەهێ، کە بریتییە لە فەرماندان بە جەنگو کوشتار، یا دەرکردنی (بني نضير)و کوشتنی (بەنی قورەیزە) کە بەوە شەوکەتی جوولەکە شکاو بەرەو ڕیسواییو زەبوونی هاتن

إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا تواناو زۆرداره بەسەر هەموو شتێکدا، کەواتە ئەوکاروفەرمانەئەهێنێ، وەتۆڵەئەسێنێ لەبێبڕواکان وموسڵمانانیش زاڵ وسەرکەوتووئەکات.

فەرمانیدا بەچاو پۆشیو وازهێنان لەو جوولەکانەو وەستان بەدیاری کارو فەرمانی خواوە، ئینجا فەرمان ئەدا بەبڕواداران کەلەسەر کارو پیشەی خۆیان بڕۆنو ئەو ڕێگەیە بدەنە بەر کە خوا بۆی داناون، فەرمووی: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بە ڕێكو ڕاستی بەجێبێنن، وە زەکات بدەن، کە ئەم دوو کردەوە گەورەیە هەرچۆنێ نیشانەی بەندەیی بۆ خوا هەروەها هۆی یارمەتیدانی خوایە بۆ بەندەکانیو زاڵ کردنیانە بەسەر دوژمندا.

باوی قورئان وایە ئەم دوو کردەوە پێکەوە باس ئەکات، چونکە یەکەمیان باری یەکەیەکەی پێ چاك ئەبێت، وە دووەمیان حاڵو باری گەلو کۆمەڵی پێچاك ئەبێت، ئینجا هانی موسڵمانان ئەدات لەسەر هەر کردەوەیەکی چاكو مزگێنی ئەدات بەدەستکەوتنی پاداشت وبەرهەمی کردەوەچاکەکان لای خواولەڕۆژی دواییدا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ هەرخێروچاکەیەك کەپێشی بخەن بۆخۆتان ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾دوستتان ئەکەوێتەوە لای خوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بە هەموو کردەوەتان، کەواتە کردەوەکانتان زایە ناکات، بەڕاستی ئەم دوو فەرموودەیە هەرچۆنێ دڵخۆش کەرە، هەروەها دڵ تەزێنیشە، ئینجا دووبارە ئەڕوا لەسەر جوولەکەو گاورەکان، ڕاو قسە بێ جێکانیان ئەهێنێو بەرپەچیان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات لەسەر لاف لیدانیان بەو ڕاو قسە ناڕەوایانە و بڕیاری ڕاستو ڕاستەقینە دەرئەکات،

وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُواْ
بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ
أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ واتە جوولەکەکان وتیانو ئەڵێن: هەرگیز هیچکەس ناچێتە بەهەشت بێجگە لەوانەی کە جوولەکەت، وە نەسرانیەکانیش ئەڵێن: هیچکەس ناچێتە بەهەشت بێجگە لەوانەی کە نەسرانین، ﴿تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ﴾ ئەوەیە ئاواتو ئامانجەکانیان، وە بێگومان ئەو جۆرە قسانەش هەر لافو قسەی پووتن بەبێ هیچ بەڵگەو نیشانەیەك، وە هەرچیش بەڵگەونیشانەی نەبێ نرخی نییەوبەڕاست دانانرێ جالەبەرئەوە فەرمانیدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بەریان لێ بپڕێتەوە بە داواکردنی بەڵگەو نیشانە لەسەر قسەو لافەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ پێیان بڵێ: ﴿هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ﴾ بەڵگەو دەلیلەکەتان بێنن ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن، بەو بەرلێ برینەوە سەر شۆڕو داماوی کردن، ئینجا بەدرۆیان ئەخاتەوەو یاسایەکی ڕاستو ڕەوا دەرئەکات سەبارەت بە بەهەشتیەکان، ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ﴾ نەخێر ئەوەی ئەوان ئەیڵێن ڕاست نییەو بەهەشتی خوا بۆ هیچ گەلو نەتەوەیەك نییە بە تایبەتی، بەڵکو بۆ هەر کەسێکە کە بەم جۆرە بێت: ﴿مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ﴾ هەرکەس خۆی ملکەچ بکات بۆ خوا بە پاكو خاوێنیو بەبێ هیچ هاوبەشێك ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ لەکاتێکدا کە لەڕەوشتو کردەوەدا چاك بێت بەم ڕەنگە بەپێی فەرمانو ڕەزامەندی خوا بێت ﴿فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ بۆ ئەو کەسە هەیە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری، ئەو پاداشتەی کەلە جیهاندا بەڵێنی پێداوە، ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وە هیچ ترسو بیمێك نییە لەسەریان، وە غەمبارو غەمگین نابن، واتە ئەگەن بە پاداشتی خۆیان بەبێ ئەوەی هیچ هۆی ترسو غەمێك ڕوویان تێبکات، ئەوە بوو بە یاسایەکی گشتی کە هەموو ئادەمی تیایدا یەکسانە لە هەموو چینو تاقمو لە هەر تیرەو نەتەوەو وڵاتێك، کە هەر ئەوەش ڕاستو شایانو شیاوە لەگەڵ خوایەتی خوا بۆ هەمووان، وە لەگەڵ دادو کار دروستی خوادا.

﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ١١٣﴾

**هەرکام لە جوولەکەو گاور ئەو لافە درۆینەیان لێ ئەدا کە باسکرا، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە هەرکام لەمان و بت پەرستەکانیش لەناو خۆیاندا ئەوانی تر بە گومڕا دائەنێن، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ جوولەکەکان وتیان و ئەڵێن: نەسرانیەکان لەسەر هیچ شتێ نین کەشت بێت و ئایینەکەیان ڕاست نییە، ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ وە نەسرانیەکانیش وتیان و ئەڵێن: جوولەکەکان لەسەر هیچ شتێك نین و ئایینەکەیان ڕاست نییە، ئەوەیان ئەگوت ﴿وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوانە نامە ئەخوێنن ـ واتە تەورات و ئینجیل ـ کە هەرکام لەو دوونامەیە بڕوای هەیە بە نامەکەی تر و شوێن کەوتووی بەڕاست دائەنێ کەواتە قسەکانیان دەربارەی یەکتر دژو پێچەوانەی نامەکانیانە، هەرچۆنێ ئەمانە کە زانا و نامەداران دەربارەی یەکتر ئەوەیان ئەوت، ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ﴾ هەروەها ئەوانەش کە نازانن و زنا و نامەدار نین و وێنەی وتەکەی ئەوانیان وت و ئەڵێن، واتە عەرەبە نەخوێندەوارەکان زانا نین و نامەیان نییە، کاتێ بینیان جوولەکەو نەسانیەکان بەو جۆرە دژی یەکترن، وە هەرکام لەوان بڕوای هەیە بە چەند شتی بڕوپووچ کە هیچ کەمتر نین لە قسەو شتە پڕوپوچەکەی ئەوان، کاتێئەوەیان بینی لەوانەوە ئایینەکەی ئەوانیان لە پێش چاو کەوت وتیان: هیچ کامیان لەسەر شت نین و ئایینی ڕاستیان نییە!!**

**قورئان قسەکانی گێڕانەوە دەربارەی یەکتر بەو جۆرەی کە بیستمان، ئینجا لێیان ئەگەڕێ بۆ خوا تابڕیاریان بۆ دەرئەکەوت لە ڕۆژی دواییدا بەو جۆرو شێوەی کە ڕاست و ڕەوایەو خۆی ئەزانێ، ئەفەرموێ: ﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ﴾ ئینجا خوا بڕیار ئەدات لە بەینیاندا ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لە ڕۆژی دواییدا ﴿فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾ لەوەی کە ئەوان لە جیهاندا دووبەرەکی بوون تیایدا، بڕیار ئەدات بەوەی کە هەرکام لەوانە ئەگەیەنێ بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی خۆی، بەگوێرەی دادو لێزانی و کاردروستی خۆی، وە گێڕانەوەی**

کارو باری ئەوانەو حەواڵە کردنیان بۆ ئەو دادگایە باشترین شتە بەرامبەر ئەو لافو قسە ناڕەوایانە، ئەوانە کە ژێربێ وەریان ناگرێ‌و هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیشیان بەدەستەوە نییە لەسەریان.

لەم باسە پێشووەدا باسی بت پەرستەکانی کرد لەگەڵ جوولەکەو گاورەکاندا، ئینجا لێرەدا باسی پیسترین گوناهو گەورەترین ستەمو تاوان ئەکات کە بریتییە لە بەرگری کردنی مزگەوتەکانی خوا لەوەی یادو باسی خوایان تیا بکرێ، وە هەوڵدان بۆ وێران کردنیان، جا هەڵئەگرێ ئەمە ئاماژە بێت بۆ ئەو کردەوە پیسەی کە نەسرانیەکان کردیان لەپاش نەمانی (عیسا)(علیه السلام) لەناویاندا، ئەوە بوو چوون پەنایان برد بە پادشای ڕۆمو هانیاندا لەسەر ئەوە بدا بەسەر جوولەکەکاندا لە وڵاتی شامدا، ئەویش هاتو بەربادی کردن بە کوشتن‌و بڕین‌و بەدیل گرتن‌و وێرانکردنی جێ‌و شوێنیان، وە (بیت المقدس)ی ڕووخاندو بەردی بەسەر بەردییەوە نەهێشت، وەهەیکەلی (سلیمان)ی ڕووخاندو چەند دانەیەك لە تەوراتی سوتاند، وە هەڵئەگرێ مەبەست بەم ستەمو تاوانە بەرگری کردنی قوڕەیش بێت کە لەساڵی شەشەمی کۆچیدا بەرگری پێغەمبەر (ﷺ)و یارەکانیان کرد لەوەی بچنە مەککەو تەواف کەعبە بکەن لەسەر ئەم بارە مەبەست بە هەڵدانیان بۆ وێرانکردن ئەوەیە کە ئەیان ویست ماڵی خوا هەر جێگەی بت پەرستی بێت‌و بەرگری خواپەرستانیان ئەکرد لەوەی خواپەرستی تیا بکەن، کە وێرانکردنی ڕاستەقینە ئەوەیە، وە هەڵئەگرێ ئەمە دەست نیشان‌و ئاماژە بێت بەو هەموو پیلان‌و فاك‌و فیك‌و هەوڵ‌و تێکۆشانەی کە جوولەکە پێی هەڵسان لە بارەی گۆڕانی ڕووگە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (کەعبە) کە یەکەم ماڵی خوا بوو بۆ ئادەمی‌و ئەو جوولەکانە ئەیان ویست بەرگری مەردوم بکەن لە ڕوو تێکردن‌و خواپەرستی تیایدا، بە ڕاستی لەم کاتەدا شتێ‌تر کەوتە دڵمەوەو لە هیچ کتێبێکدا نەم دیوە، ئەوەش ئەمەیە کە مەبەست تاوانی هەرسێ تاقمەکەیە کە هەرسێکیان دژی ئەم ئیسلامن‌و یەك بارو یەك مەبەستیان هەیە کە بەرگری کردنی هەموو مزگەوتەکانی خوایەو نەهێشتنی ناوی ئیسلام لە ڕووی زەویدا کە هیچ ستەمو تاوانێ ناگاتە ئەوە، لەسەر ئەم بارە پەیوەستی ئەم ئایەتە بە پاش‌و پێشی خۆیەوە زۆر پتەوترو ڕێك ترە، وە زانینی ڕاستەقینە هەر لای خوایە، وەلەسەر هەر بارو بەهەرحاڵ ئایەتەکە بە شێوەیەکی گشتی‌و بە یاسایەکی گشتی هاتووە،

وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ
لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ
عَظِيمٞ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿١١٥﴾
وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ

---

**ئەفەرموێ:** ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ﴾ ئایا كێ ستەمكارترە لەو كەسەی كە بەرگری مزگەوتەكانی خوای كردبێ ﴿أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ﴾ لەوەێ ناوی خوایان تیا ببرێ ﴿وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ﴾ وە تێكۆشانی كردبێ لەوێران بوونو پەك خستنیان لە خواپەرستی تیایاندا؟ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ﴾ ئەوانە شایستە نەبوو بۆیانو مافی ئەوەیان نییە بچنە ناو ئەو مزگەوتانەوە مەگەر بەبیمو ترسەوە لە خوا، لەبەر ڕێزو بەرزی ئەو مزگەوتانە بە لای خواوە، واتە نەئەبوو بچنە ناویان بە ترسو لەرزەوە نەبێ، چ جای ئەوە كە بەرگری بكەن لە خواپەرستی تیایانداو هەوڵی وێرانكردنیان بدەن، كەواتە تاوانو ستەمەكەیان ئێجگار گەورەیە، یان نەئەبوو بچنە ناو مزگەوتەكان بە ترسو لەرزەوە نەبێ لە بڕواداران، واتە پێویستە لەسەر بڕواداران كارێكی وا بكەن كە ئەوانە بە ترسو لەرزەوە نەبێ نەتوانن بچنە مزگەوتەكانیان، چ جای ئەوە بێنو زاڵبنو داگیریان بكەنو وێرانیان بكەن، یا لەزانینو بڕیاری خوادا تێپەڕی كردووە كە ئەوانە نەچنە ناو مزگەوتەكانی خواوە مەگەر لەكاتی ترسو پەنا هێناندا، لەسەر ئەم بارە ئەو بەرگری كەرانە ببڕێن بەسەر بت پەرستەكانی قوڕەیشدا چاكترە كە ئەوە بوو لە ساڵی فەتحی مەككەدا هەركەس پەنای ئەهێناو ئەچووە ناو ماڵی خواوە پەنا ئەدرا، ئینجا هەڕەشە ئەكات لەو بەرگری كەرە تاوانبارانە بە تۆڵەی هەردوو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾ بۆیان هەیە لە جیهاندا ڕیسوایی و بێنرخی ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ وە بۆیان هەیە لە ڕۆژی دواییدا سزایەكی گەورە كە سزای دۆزەخو سزا لەوە گەورەترو سەخت تر نییە، ئینجا دەم كوتی جوولەكەكان ئەكاتەوە

لەو هەموو پڕوپاگەندەی کە کردیان سەبارەت بە گۆڕاندنی ڕووگە بۆ (کەعبە)، ئەفەرمویٚ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ هەر هینی خوایەو بۆ خوایە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، واتە هەموو جیهانو وڵات هینی خوایەو هەموو وەك یەك موڵکێتیو دروستکراویەتیو خوا پەروەردگاریەتی، ﴿تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ کەواتە بۆ هەر شوێنیو بۆ هەر لایە ڕوو بکەن لەوێدا خوا هەیە بەزانینو ئاگاداریو خوایەتی، وە هەر شوێنی خوا فەرمان بدات بە ڕوو تێکردنی هەر ئەوە ڕووگەیە، چونکە هیچ لایەو هیچ شوێنی لە خۆیەوە نەبووە بە ڕووگەو لەبەر خۆی نییە، بەڵکو لەبەر خوایەو بەپێی فەرمانو خواهیشی خوایە، کەواتە ئەو نوێژانەی کە بەرەو (بیت المقدس) کراون لە پێشەوە، ڕەواو دروستنو زایە نابن خوا وەری گرتوون، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ واتە چونکە بەڕاستی بەهرەی خوا فراوانەو لەکارو فەرمانیدا بەندەکانی تەنگەتاو ناکاتو کەمو کوڕی ناخاتە پاداشتیان، زانایە بە بەرژەوەندیانو بە هەموو نیازو کردەوەیان[1]، ئینجا قسەیەکی زۆر ناڕەواو وتەیەکی زۆر پیسو بێجێ ئەخاتە بەرچاو کە بۆ خوا ڕەوا دراوە بە نەزانیو نەفامی، ئەفەرمویٚ: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾، ئەوانە وتیانو ئەڵێن: خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی داناوەو فەراهەمی هێناوە، هەرچەند بە ڕواڵەت ئەم قسە بە ناوی جوولەکەو نەسارنیەکانەوە هاتووە، بەڵام لەڕاستیدا قسەی بت پەرستەکانیشە، ئەوەتا هەرچۆنێ جوولەکە ئەڵێن (عوزەیر) کوڕی خوایەو کاورەکانیش ئەڵێن: (عیسا) کوڕی خوایە، هەروەها بت پەرستەکانیش ئەڵێن فریشتە کچی خوایە، وە قورئان لێرەدا دیاری نەکردو بەدرێژی باسی نەکرد، چونکە شوێنەکە شوێنی ئەوە نییە، بەڵکو شوێنی ئەوەیە کە بەکورتی باسی ئەو سێ تاقمە بکات کەلەو کاتەدا بەدژی ئیسلام هەڵسان لە نیوەدوورگەدا، وە سیرە ئەمەیە کە هەمیشەو تا ئێستاش هەر ئەو سێ تاقمەیە دژو دوژمنی ئیسلامن کە ئەمڕۆ دەرئەکەون لە پۆشاکی سەهیۆنێتیو سەلیبیێت شیوعیەتی جیهانیدا، وە بێگومان سێیەمەکە دوژمن ترو بەد بڕوا ترو بەد کردار ترە لە بێجگە پەرستیەکەی ئەو چەرخو سەردەمەدا!

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرو شێوەیە تریش تەفسیر کراوەتەوەو چەند ڕیوایەتێ هەیە لەهۆی هاتنە خوارەوەیدا، ئەوانیش ئەگونجێن.

سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا
قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾

---

ئینجا پێش هەموو شتێ بۆ بەرپەرچدانەوەو خستنەوەی ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ خوا بە پاك‌و خاوێن ئەگرم‌و پاك‌و خاوێنە لە هەرشتێ کە شیاوو شایستەی خواو خوایەتییە نییە، کە یەکێ لەو نەشیاوو ناشایستانە نەبوونی ڕۆڵەو کوڕو کچە بۆی، چونکە بوونی ئەوە پێویستی هەیە بەوەی کە خوا وێنەی ببێ، وە بوونی ئەم بوونەوەرەو ڕژێمی تێرو تەواوو نەگۆڕاوی بەڵگەیەکی ڕوون‌و ڕەوانە لەسەر تاك‌و تەنیایی‌و بێ‌وێنەیی پەروەردگار لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، وە بێجگە لەوە کوڕو ڕۆڵە بۆ کەسێ ئەبێ کە پێویستی ببێ بە یارمەتیدان‌و کاتێ ئەم نەما ئەو جێگەی بگرێتەوە، خۆ ئاشکرایە پێویستی بە یارمەتی‌و نەمان بە هیچ جۆر ناگونجێ لەگەڵ خوایەتیدا، ئینجا ئەوەی کە ئەو نەفامانە دای ئەنێن بە ڕۆڵەو کوڕو کچ موڵکی خواو دروستکراوو بەندەیەکی ملکەچن بۆی‌و جیاوازن‌و هاوبەش‌و وێنەی خوا نین لە هیچ شتێکدا، دەی ئەگەر ڕۆڵەی بوونایە ئەبوایە نە موڵك‌و نە دروستکراوو نە بەندە بوونایە، وە ئەبوایە هاوبەش‌و وێنەی بوونایە لەگەڵی نیشانەو سیفەتدا، کەواتە ئەوەی کە ئەو نەفامانە وتویانەو بڕیاریان لەسەر داوە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ، وەك بەرپەرچیان ئەداتەوەو دەست نیشان ئەکات بەو نەگونجاوییە کە ئەفەرموێ: ﴿بَل﴾ نەخێر ئەوەی کە ئەوانە وتیان وانییەو ناگونجێ، وە ئەوانەی کە ئەو نەفامانە ئەیان کەن بە کوڕو کچی خواو کوڕو کچی خوا نین، بەڵکو ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان‌و زەویدا کە هەندێ لەوانە ــ عوزەیرو عیساو فریشتەکانە ـ هەموو هەر موڵك‌و دروستکراوی خوان ﴿كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموو ئەوانە ملکەچن بۆی‌و سەرپێچی ناکەن لێی لە هیچ خواست‌و خواهیشێکی ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ داهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوییە لە نەبوون‌و بەبێ ئەوەی وێنەو کەرەسەیان بووبێ، ﴿وَإِذَا

﴿قَضَىٰٓ أَمۡرًا﴾ وه كاتێ هەر شتێكی ویستو بڕیاری هەر شتێكیدا ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن﴾ هەر ئەوە ئەڵێت پێی: ببە، واتە هیچ كارو كردەوەیەكی ناوێ بێجگە لەوەی مەیلو خواهیشی ڕووی تێبكات ﴿فَيَكُونُ﴾ ئیتر دەست بە جێو بەبێ دووا كەوتن ئەو شتە ئەبێتو فەراهەم دێت لەسەر هەر بارو شێوەیەك كە خوا ویستبێتی!! دەی خوایە كە ئەوە سیفەتو ناونیشانو دەسەڵاتی بێت، نە پێویستی بە كوڕو كچ هەیەو نەئەگونجێ كوڕو كچی ببێ، چونكە كوڕو كچ ئەبێ هاوبەشی باوكەكەیان بنو نموونەیەك بن لەو، وە هاوبەشو نموونەش ناگونجێ بۆ خوا، كەواتە بڕیاردانو ڕەوادانی كوڕو كچ بۆ ئەوپەڕی نەفامیو تێنەگەیشتنەو هەركەس تێ بكات لە مەبەست بە خواو خوایەتی، وە تێ بگات لە ڕادەو پلەی بەرزو پاكو بێ وێنەی خواو خوایەتی، هەرگیز ئەو شتە پڕوپووچە بەدڵیا گوزەر ناكات كە بەدڵو خەیاڵی نەفاماندا دێتو گوزەر ئەكات دەربارەی خوای پەروەردگار، بەڵكو بڕوای هەر بەوجۆرە ئەبێت كە ئیسلام بۆمان ڕوون ئەكاتەوە، كە سووكو ئاسانو بێقۆرتو گرێیە لەدڵی هەر كەسێكدا كە ژیری ببێو لە كار نەكەوتبێ! ئای چەندە سووكو بێقۆرتو گرێیە لە دڵو دەرووندا كە ئەم بوونەوەرە لە خۆیەوەو بەڕێكەوت بەدی نەهاتووە، بەڵكو پەروەردگارێكی هەیە، وە ئەو پەروەردگارە هەر بووەو هەر ئەبێو نەبوون ڕووی تێناكات، وە زانینو دەسەڵاتی بێ سنوورەو بۆ هەرشتێ كە بیەوێ بیكات هیچ پێویستی نییە بێجگە لەڕوو تێكردنی مەیلو خواهیشی ئەو پەروەردگارە، وە ئەو خوایە كار دروستەو هەموو كارو فەرمانی بەجێیە، وە بەهیچ ڕەنگ وێنەو هاوبەشی نییە، وە دروستكراوەكانی جیاوازن لە خۆیو بوونیان جیاوازە لەبوونی خۆی، نەك وەك هەندێ نەفام كە ئەڵێن بە یەك بووت هەنو بە یەك بوونیان هەیە، وە هەندێ تر ئەڵێن: بوونی ئەم دروستكراوانە تروسكەو ڕووناكییەكە كە هەڵ ئەقوڵێ لە خواوە، وە هەندێ تر ئەڵێن: دروستكراوەكان وێنەو شێوە بینراوەكەی بوونی خوایە... وە هەروەها چەند شێوەو شتی پڕوپووچی تر كە گوتراوەو هەموو كەسێكی ژیر شەرم ئەكات لەوەی شتی وا بەدەمیدا بێت.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾

هەركەسێ ئەم بۆ چوون و تێگەیشتنە ئیسلامییەی بۆ پەیدا ببێ و بژیەت لەگەڵی، پێکەنینی دێت بە هەموو ئەو بۆچوون و تێگەیشتنانەی کە هاتوون و وەرگیراون لە هەموو ئەوانەی کە ناونراون بە (فەیلەسوف) ئیتر چ (ئیغریقیەکان)و ئەوانەی کۆن، وە چ ئەوانە پاش ئەوان و تازەکان، بەڵێ لە ڕێگەی ئیسلامەوە مەردوم خوای خۆی ئەناسێ و تێ ئەگات لە خۆی و لەم بوونەوەرەی کە تیایدا ئەژی، وە تەنها ئیسلام مەردوم ئەپارێزێ لەناسینی خواو ئادەمی و بوونەوەردا، ئینجا قسەو وتەیەکی زۆر نارەوای بت پەرستەکان ئەخاتە بەرچاو کە زۆر جار بەوە بیانوویان ئەگرت و بەریان ئەبریەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) هەرچۆنێ جوولەکەو گاورەکان پەڵپ و بیانوویان ئەگرت بەوێنەی ئەوە لە پێغەمبەرەکانیان ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ، وە بەوە دەرئەکەوێ کە ئەمان و ئەوان وەك یەك وان لە سروشت و لەبۆچوون و لە گومراییدا، کەواتە ئەوان هیچ بەهرەو هونەرێکیان نییە بە مل ئەمانداو هەروەك ئەمانن و لە ڕادەی ئەماندان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ ئەوانەی کە نازانن ـ واتە نەخوێندەوارو بێ نامەکان وتیان و ئەڵێن: ﴿لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ﴾ واتە بە خۆی پێمان بڵێ هەر چۆنێ ئەدوێ لەگەڵ فریشتە، یا سروش (وحی) مان بۆ بکات ﴿أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ﴾ یا بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونمان بۆ بێت لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتیەکەت، کەواتە ئەوەندە نەفام بوون، ئەم قورئانە گەورە کە گەورەترین بەڵگە و موعجیزە بوو کە خۆیان گەلآڵەیان ئەگرت و داوایان ئەکرد، وەك ئەو چەند شتەی کە لە سورەتی ﴿الإسراء﴾دا ئەیانگێڕێتەوە لێیانەوە، کە یەکێ لەوانە ئەوە بوو بەرز ببێتەوە بۆ ئاسمان و نامەیەکیان بۆ بێنێ و بیخوێنێتەوە، بە هەرحاڵ ئەو بیانووو پەڵپە بێجێیان ئەگرت و ئەو قسە ناڕاستەیان ئەکرد، خوایش ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ﴾ هەروەها ئەوانەی کە لە پێشیانەوە بوون ـ واتە جوولەکەو

گاور ــ وێنەی وتەو قسەکەی ئەمانیان وت بە پێغەمبەرەکانیان، ئەوەتا وتیان بە (موسا) (علیه السلام): خوامان بە ئاشکراو بە چاو پیشان بدە، وە وتیان بە (عیسا) (علیه السلام): با خوا خوانو خۆراکێکمان لە ئاسمانەوە بۆ بێنێتە خوارەوە... ئەوانو ئەمان هەر عینادو سەرکەشییان بەکار هێناو داواو قسەکانیان وەك یەك وابوون، چونکە: ﴿تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ﴾ دڵەکانیان وەك یەك وانو بە وێنەی یەکتر لە کوێریو گومڕاییو نەفایدا، ئەو یاخیانە پەڵپیان ئەگرت بە یەکێ لەو دوو شتە: قسەکردنی خوا لەگەڵیان، یا هاتنی ئایەتو نیشانەیەك، قورئان وەڵامو بەرپەرچی نەدانەوە لە یەکەمیاندا، چونکە داواکەیان زۆر نەفامانەیەو شایستەی وەڵامدانەوە نییە، وەك ئەڵێن: وەڵامی نەفام بێدەنگیە، وە سەبارەت بە دووەم پەڵپ فەرمووی: ﴿قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ بە ڕاستی ئێمە ئایەتەکانمان بە ڕوونی باسکردووە یا بە ڕوونی هێنامانە خوارەوە بۆ گەلو کۆمەڵێ کە ئەزانن بە زانینێکی وا کە دڵ پێی ئارامەو بە هیچ ڕەنگ گومانو دوودڵی ڕووی تێناکات، واتە ئەوانە داوای تەنیا ئایەتێکیان کردووەو ئێمە چەند بەڵگەو ئایەتی گەورەمان بە ڕوونی باسکردووە بۆ گەلو کۆمەڵێکی زانا کە ڕاستییان ئەوێو بە دوای ڕاستیدا ئەگەڕێن، دەی ئەوانە کە ئاوا نەبن نیشانەو بەڵگەو موعجیزە کاریان لی ناکات، وە هەروەها لەم فەرموودەیەدا دڵنەواییو دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەری (ﷺ) تیایە کە غەمبار نەبێ لەسەر بڕوا نەهێنانی ئەو یاخییانە، چونکە تاوانو قوسورەکە لە خۆیانەوەو خۆیان بە دوای ڕاستیدا ناگەڕێن.

لەپاش بەرپەرچ دانەوەی قسەو وتە ناڕەواکانی ئەو بێبڕوایانەو دەرخستنی هۆو پاڵ پێوەنەریان لەولاریوناڵەبارییەی کەوان لەسەری، ئینجاڕووی فەرموودەئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کارو فەرمانی پێویستی خۆی بۆ دیاری ئەکات، وە بۆی ڕوون ئەکاتەوە مەبەستو هۆی جوولەکەو گاور لەو ئاژاوەو بەربەرەکانێی کە بە کاری ئەمێنن لەگەڵی، وە ئەوەی کە ئەوان ئەیانەوێو داوای ئەکەن لێی ئەم بە هیچ ڕەنگ پێی ناکرێ! وە ئەگەر خوانەخواستە بیکات ئەکەوێتە بەر خەشمو سزای خوا.

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ
وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بە ئایینی ڕاستەوە بە موژدەدەرو ترسێنەر، واتە کارو فەرمانی تۆ ڕاگەیاندنەو ڕێنموونی وە موژدە دان بە گوێڕایەڵان و ترساندنی یاخی و تاوانباران، ئیتر تۆ بەوە هیچت لەسەر نامێنێ، ﴿وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ وە تۆ پرسیارت لێ ناکرێ لە دۆزەخیەکان کە بۆچی بڕوایان نەهێنا لە پاش ئەوەی پێت ڕاگەیاندن ئەوەی کە پێی ڕەوانە کراوی؟ واتە دەین و تۆبالیان بە ملی خۆیانەو هیچ شتێ ڕوو ناکاتە تۆ، ﴿وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ وە هەرگیز ڕازی نابن لە تۆ نە جوولەکەو نە نەسرانیەکان ﴿حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡ﴾ هەتا نەکەویتە شوێنی ئایینەکەیان، واتە بە هیچ ڕەنگ بە تەمای بڕوا هێنانی ئەوانە نەبێت، وە ئەوانە هەرگیز واز ناهێنن لە دوژمنایەتی و ئاژاوەو پیلان گێڕی لەگەڵت، مەگەر تۆ واز بێنی لەم ئایین و کارە گەورەی کەوای لەسەری، وە شوێنی ئایینی ناڕاست و پڕوپووچی ئەوان بکەوێ، کەواتە هۆی بەربەرەکانێ و دوژمنایەتیەکەیان ئەوە نییە بەڵگەو نیشانەی ئاشکرایان دەست ناکەوێ لەسەر ڕاستی پێغەمبەرو ئایینەکەی، وە هەروەها بڕوا نەهێنان و دوژمنایەتیەکەیان لەبەرئەوە نییە کە نازانن و دڵنیا نین لەوەی کە ئەو لەسەر ئایینی ڕاستەو لەلایەن خواوە هاتووە، بەڵکو هۆو پاڵنەریان تەنها ئەو ئایین و عەقیدە ڕاستەیەکە ڕاستەیە کە خوا ناردییە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵێ بەڕاستی هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە هۆو پاڵنەریان هەر ئەم ئایین و عەقیدەیە بوو، هەروەها لەپاش یەکەم جارو تا ئێستاش و بۆ لەمەو لایش هەر ئەم ئایین و عەقیدەیە هۆو پاڵنەریانە بۆ ئەو هەموو پیلان و دوژمنایەتییە بەهێزەی کە هەمیشە بەبێ وەستان وچان بەکاری ئەهێنن دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، بەڵام هەردەمە بە ناوێکەوەو لە ژێر ئاڵایەکدا، ئەوسا بەبێ شاردنەوەو پێچ و پەنا بە ناوی ئایین و لە ژێر ئاڵای ئایینیدا، بەڵام کە زانیان بەو ناوەو لەژێر ئەو ئاڵایەدا تا بێت غیرەتی موسڵمانەکان

ئەمێنێتە جۆش‌و بە هێزترو بەتین تریان ئەکات، بارەکەیان گۆڕی‌و ئەو ناوەیان سڕییەوەو ئەو ئالآیان گۆڕی بە ناوو ئالآی خاك‌و وڵات‌و ئابووری‌و ڕامیاری‌و ئەم جۆرە شتانە، وە وایان نیشانداو وایان بردە دڵی بێئاگاو گێل‌و گەوارەکانەوە کە مەسەلەی ئایین‌و عەقیدە شتێکی کۆن بوو تێپەڕی‌و زۆر بێجێ‌بوو! وە بەهیچ ڕەنگ نابێ ئەوە بهێنرێتەوە کایە، چونکە ئەوە کارو پیشەی دواکەتووانەو ئەمڕۆ ڕۆژی پێشکەوتنەو مەردوم پێشکەوتووەو تازە ناگەڕێتەوە بۆ ئەو بیروباوەڕە کۆنەپەرستیانە... کەچی لە هەمان کاتدا سەهیۆنیستی‌و سەلیبێتی جیهانی لەگەڵ شیوعیەتی جیهانیدا قۆڵیانکردووە بە قۆڵی یەکتردا بەرامبەر بە ئیسلام‌و مەبەست‌و ئاوات‌و ئامانجیان لە پێش هەموو شتێکدا نەهێشتنی ئیسلامە، وە هەرچەند لە ناو خۆیاندا دژی یەکترین‌و دوژمنایەتیان ببێ، کاتێ کە مەسەلەی ئیسلام هاتە پێشەوە هەموو یەك ئەگرن‌و بە هەموویانەوە جەنگی لەگەڵ ئەکەن، کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانان چالاك‌و وریاو تێگەیشتووبن، هەڵنەخەڵەتێن بە قسەی دوژمن، وە هەمیشە ئەم هەواڵە کرنگەیان لە یاد بێت کە خوا ئاڕاستەی پێغەمبەری خۆشەویستی (ﷺ) کردین بەم فەرموودە بە فەڕەی کە ئێستا خەریکین بە تەفسیرەکەیەوەو لەگەڵی ئەژین، ئینجا ئەم هەواڵەی کەلەم فەرموودەیەدا ئاڕاستەی کرد ئایا جوولەکەو گاورەکان بەدەم گوتبێتیان بە پێغەمبەر (ﷺ) یان لەناو خۆیاندا گوتبێتیان یان هەر نیازو بڕیارێ بووبێ لە دەروونیاندا؟

بە هەرکام‌و لەسەر هەربار خوای پەندو ئامۆژگاری کرد بەدەم کوتکردنیان بەم فەرموودەیە: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ﴾ بەڕاستی هەر ڕێنموونی خوا ڕێنموونییە، واتە هەر ئەم ئایینی ئیسلامە ڕاستەو بێجگە لەو ناڕاستەو ڕاو ئارەزووی نەفسە، کەواتە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ لادان‌و جوێ بوونەوە لە ڕێنموونی خوا، وە بە هیچ ڕەنگ نابێ واز بهێنرێ نەلە زۆرو نەلەکەمی، ئینجا ئەم هەڕەشە سامناکە دڵ داچڵەکێنەرە ئاڕاستە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم﴾ سوێند بە خوا ئەگەر تۆ شوێنی ڕاو ئارەزووەکانی ئەوان بکەوێ

بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ
تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ
أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ
مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾

---

**﴿بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ﴾ لەپاش ئەو زانینەی کە هات بۆت ـ واتە وەحی و سروشی خوا ـ یان ئەو ئایینەی کە ڕاستی و ڕەواییەکەی زانراوە بۆت ﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ﴾ نابێ بۆت لەلایەن خواوە نە هیچ دۆست و کاربەدەستێك کە پارێزەرت بێت، وە نە هیچ یارمەتی دەرێك کە بەرگری تۆڵەو سزات لێبکات، بێگومان هەرگیز پێغەمبەر (ﷺ) لەوانە نەبووە بە هیچ جۆر لابدات لە ڕێگەی خواو شوێنی ڕێگەو ڕای پڕوپووچی دوژمنانی خوا بکەوێت، بەڵام ئاراستەکردنی ئەم هەڕەشەیە کارو مەسەلەکە گرنگ تر ئەکات، وە بیم و ترس بە تین تر ئەکات لەدڵی ئوممەتدا!! ئینجا بە تێهەڵکێش باسێکی بڕوادارانی نامەدار ئەکات و نیشانەی بڕواکەیان ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ کەسانێ کە نامەمان پێداون ﴿يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ لەکاتێکدا کە نامەکەیان ئەخوێننەوە بە خوێندنەوەیەکی ڕاست و ڕەوا بەبێ گۆڕاندن و زیادو کەم، وە بەبیر لێکردنەوەو ملکەچی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ﴾[1] ئەوانەی کە بەو جۆرەن هەر ئەوانە بڕوایان هەیە بە نامەکەیان، نەك ئەوانەیان کە بەو جۆرە نایخوێننەوەو دەستکاری و گۆڕاندنی تیا ئەکەن و پەیڕەوی فەرمانەکانی ناکەن و پەیڕەوی فەرمانەکانی ناکەن و شوێنی ئارەزووی خۆیان ئەکەون، ئەمانەیان هەرچەندلاف بڕوا لێبدەن لە ڕووی ڕاستیدا بڕوایان نییە پێی ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾وەهەرکەس بڕوای پێی نییە،هەرئەوانەزیانبارو خەسارەتمەندن،ئایاچ زیانبارییە ئەگاتە ڕادەی زیانی دەست هەڵگرتن لەبڕواو هەڵبژاردنی بێبڕوایی لەباتی بڕوادا؟!**

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام بەڕاستی ئەمەی کەلە تەفسیرەکەدا بە پەسەند ترەو باشتر ئەچێتە دڵەوە.

لەپاش ئەو هەموو قسەو باس و لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئیسرائیلیەکاندا، وە لەپاش نیشاندان و خستنە بەرچاوی مێژوویان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکانیان، لەپاش هەموو ئەوانە قورئان لایەك ئەکاتەوە بۆ لایان و بانگێ تریان ئەکاتەوە، وەك دواترین بانگ کە ئاڕاستەیان ئەکات، بۆ ئەوەی فریای خۆیان بکەون با بەتەواوی بەش بڕاو نەبن لەو سپاردە گەورەیەی کەلە کۆنەوە درابووە دەستیان ـ سپاردەی عەقیدەو ئایینی خوا ـ وە بانگ کردنەکەی یەکەم جارو سەرەتای باسەکەیان بۆ دووبارە ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی نەوەکانی (ئیسرائیل) ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ بیربکەنەوەو باسی چاکەی من بکەن کە ڕشتم بەسەرتاندا ﴿وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ وە بە تایبەتی باسی ئەوە بکەن و بیر لەوە بکەنەوە کە من باوی ئێوەم دا بەسەر هەموو جیهانیانی چەرخی خۆتاندا، ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا﴾ وە بترسی لە ڕۆژێك کە لەو ڕۆژەدا ﴿لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا﴾ هیچ کەسێك هیچ شتێك جێبەجێ ناکات بۆ هیچ کەسێکی بێبڕوا ﴿وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ﴾ وە هیچ بەدەل و بریتییەکی لێ وەرناگیرێ ﴿وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ﴾ وە هیچ تکاو لاڵەیەك سوودی پێناگەیەنێ ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ وە یارمەتی نادرێن و بەرگری ناکرێن لەسزای خوا.

لە تەفسیری ئایەتی (٤٧-٤٨)دا کە وێنەی ئەم دوو ئایەتی ئێرەن چەند شتێکمان گوت، کە بۆ ئێرەیشەو پێویست نییە بە دووبارە کردنەوەی.

لە ئایەتەکانی ڕابوردوودا قسەو لێکۆڵینەوە لەگەڵ نامەداردا بوو، سەبارەت بە ڕەوشت و کردەوەیان، وە هەڵوێستیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان و بەرامبەر ئایین و شەریعەتەکەیان و چەند بەڵێن و پەیمان کە لێیان وەرگیرا لە چەرخی (موسا) پێغەمبەرەوە (علیه السلام) تا چەرخی پێغەمبەرمان (ﷺ)، وە زۆربەی ئەو قسەو باسانە دەربارەی جوولەکەبوو، کەمێکی لەبارەی نەسرانیەکانەوە بوو، لەگەڵ چەند دەست نیشانێك بۆ بت پەرستەکان، بە بۆنەی نامەدارەکانەوە، ئینجا لێرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ قۆناغێکی مێژوویی پێشتر ـ ئەگەڕێتەوە بۆ چەرخی ئیبراهیم (علیه السلام)ـ وە باس و داستانی ئیبراهیم لەسەر ئەم بارو شێوەی کە لێرەدا باسکراوە زۆر گرنگ و بەکارە بۆ دەم کوتکردنی جوولەکەکان لەو هەموو دەم بازی و ئاژاوە سەختەی کە هەڵئەسان پێی لەگەڵ گەلی موسڵمان لە مەدینەدا، بێگومان نامەدارەکان لە بنەڕەتدا ئەگەڕێنەوە بۆلای ئیبراهیم لە ڕێگەی ئیسحاقەوە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ وە شانازیان ئەکرد بەو نەژادە پاکەوە، وە بەوەی کە خوا بەڵێنی داوە بە پیت و فەڕ بۆ ئیبراهیم و

نەوەکەی، جا لەبەرئەوە ڕێنموونیو چاودێری ئایینی خوایان هەر بۆ خۆیان دائەنا، هەرچۆنێ بەهەشتیشیان هەر بۆ خۆیان ڕەوا ئەدا، ئیتر کردەوەیان هەر چۆن ببێ!! ئینجا بێگومان قورەیشیش هەر لەبنەڕەتدا ئەگەڕایەوە بۆلای (ئیبراهیم) لەرێگەی (ئیسماعیل)ەوە، وە کەشخەو شانازیان ئەکرد بەوەوە، وە بەهۆی ئەوە چاودێرو کلیلەوانی ماڵی خوا بوون، وە بەهۆی ئەوەوە بوو بوون بە سەرۆكو گەورەی هەموو عەرەب، جا لەپێشەوە ئەندازەیە بە درێژیی دوا لە بارەی جوولەکەو گاورەوەو ئەندازەیە باسی لافو گزافی کردن، وە ئەندازەیە پیلانو پڕوپاگەندەی دەرخستن کە هەڵئەسان پێی بۆ بەرگری ئیسلامو تێکدانی ڕیزی موسڵمانان، ئینجا ئەوا لێرەدا دێتە سەر باسی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)، وە باسی کەعبەو دروستکردنیو هەندێ شتی تایبەتی بەو کاڵی خواوە، وە لەو باسانەوە دەرئەکەوێ پڕوپووچی ئەو لافو گزافانەی کە جوولەکەو گاورو بت پەرستەکان لێیان ئەدا بە بۆنەی نەژادو پەیوەستیان بەو پێغەمبەرانەوە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ وە هەروەها لەو باسەوە وەرئەگیرێ ڕاستیو بەجێی گێڕانی کەعبە بە ڕووگەی موسڵمانان، وە دەرئەکەوێ کە ئایینی (ئیبراهیم) خواپەرستیەکی پاكو خاوێنەو زۆر زۆر دوورە لەم ئایینە پڕوپووچەی کە ئەو سێ کۆمەڵەی لەسەرنو لایان وایە ئەوەیە ئایینی (ئیبراهیم)، هەرچۆنێ دەرئەکەوێ یەکێتیو زۆر نزیکی ئەم ئاینو عەقیدە تازەیە لەگەڵ ئاینو عەقیدەی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و (یەعقوب) کە ئیسرائیلە، ئەو ئیسرائیلەی کە جوولەکەو گاورەکان خۆیان بە نەوەو پەیڕەوی کەری دائەنێن، وە هەروەها ڕوون ئەبێتەوە کە بڕواو عەقیدە کەلەپووری دڵی بڕوادارە نەك کەلەپووری ڕەگەزایەتی، وە ئەو کەلەپوورە بەهۆی نەژادو خزمایەتی دەستکەوت نابێ، بەڵکو بەبڕواو عەقیدە دەستکەوت ئەبێ، کەواتە هەرکەس بڕوای ببێ بەم ئاینو عەقیدەیەو پەیڕەوی بکات ـ ئیتر لە هەر تیرەو بەرەو بنەماڵەیەك ببێ ـ ئەو کەسە شیاوو شایان ترە نەك کوڕی پێغەمبەر کەبێ بڕوا بێت! چونکە ئاین ئایینی خوایە، وە خوا خوای هەموو بەندەو دروستکراوەکانیەتی بە یەکسانی، وە هیچکەس پەیوەستی نییە بە خواوە بە نەژادو بە خزمایەتی!! کەواتە پەیوەندیو پەیوەستی جوولەکەو گاورو قورەیش پچڕاوە (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و (یەعقوب) کاتێ کە لایاندا لە ئاینو عەقیدەکەیان.

لەم باسی (ئیبراهیم)ە هەنگاو بە هەنگاو دێین و لە کاتێکەوە کە خوا تاقیکردەوەو ئینجا هەڵی بژاردو کردی بە پێشەوا تا ئەم ئوممەتە موسڵمانە فەراهەم هات لەسەر وەرگرتنی نزای (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل) لەکاتێکدا کە خەریك بوون بناغەی کەعبەیان بەرز ئەکردەوە، کەواتە ئەم ئوممەتە شایستە بوو بۆ وەرگرتنی کەلەپورەکەیان و هەڵگرتنی ئەو سپاردە گەورەیەی کە وەسیەتیان پێکرد بۆ دوای خۆیان، ئینجا با بێنە ژێر سایەو سەهەندی قورئان، ئەو باس و مەبەستانەمان بدا بە گوێچکەداو دڵ و دەروونمان پاراو بکاتەوە پێیان، ئەفەرموێ بە پێغەمبەرمان (ﷺ): ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ﴾ باسی ئەوکاتە بکە کە پەروەردگار (ئیبراهیم)ی تاقیکردەوە بە چەند فەرمان و جڵەوگیریەك، ئیتر ئەوانە بریتی بن لە کردەوەکانی حەج، یان ئەو سی سیفەت و کردەوە بێت کە دەیان لە سورەتی ﴿التوبة﴾دا هەیەو دەیان لە سورەتی ﴿الأحزاب﴾دا وە دەکەی تریان لە سورەتی ﴿المؤمنون﴾و ﴿المعارج﴾دایە، یان ئەو دەشتەیە کە پێیان ئەوترێ (خصال الفطرة)، وە بە ناوبانگن، هەرکام لەمانە یان هەرشتێ تر بووبن خوای پەروەردگار ئەوانەیدا بەسەریدا بۆ ئەوەی بەوانە تاقی بکاتەوە، وە مەبەست لە تاقیکردنەوەی خوا ئەوەیە، ئەوەی کە خوا زاناو ئاگایە پێی با ئەو تاقیکراوە بە کردەوە پێی هەڵسێ و بەدی بێنێ، وە هەرچۆنێ پێش بەدی هاتن خوا زانایە پێی لەپاش بەدی هاتنیش هەر بیزانێ و زانینی بەسەری تێپەڕ بکات، بۆ ویچنە: خوای گەورە پێش دروستکردنی (ئیبراهیم) زانیویەتی کە (ئیبراهیم) دروست ئەکات و فەرمانی پیا ئەدات و ئەویش بە ڕێکی گوێڕایەڵ ئەبێت، بەڵام باوی خوا وا هات کە تەنها بە پێی زانینەکەی ڕەفتار نەکات بەرامبەر کردەوەکانی بەندەکانی، بەڵکو ویستی ئەوەی کە خۆی زانایە پێی بەندەکانی بە کردەوە بەدی بێنن، جا لەبەرئەوە خوا ئەو چەند شتەی داوا کرد لە (ئیبراهیم) ﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ ئینجا ئەویش بە ڕێك و پێکی بەجێیهێنان و هەڵسان پێیان، لەبەر ئەوە شایستەی ئەو پلە بەرزە بوو کە خوا بەڵێن و هەواڵی پێدا،

بەم جۆرە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی بە (ئیبراهیم): ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾، بە ڕاستی من تۆ ئەگێڕم بە پێشەوا، واتە پێغەمبەر بۆ ئادەمی، بۆ ئەوەی ئەوان پەیڕەوی بکەن و ئەمیش ئەوان ڕاکێشێ بۆلای خوا، وە بیانخاتە سەر ڕێگەی خێرو چاکە، بێگومان ئادەمی بە سروشت ئارەزووی لەسەر ئەوەیە کە خێرو خۆشی و بەهرەی فراوان بێت و پەرە بسێنێ و درێژە بکێشێ و نەبڕاوە بێت لە ڕێگەی نەوەو وەچەی خۆیەوە، وە ئەو هەست و ئارەزووە سروشتییە زۆر بەهێزەو خوا لە بەندەکانیدا فەراهەم هێناوە تا ژیان گەشە بکات و پەرە بسێنێ لەم ڕێگە سروشتییەوە، وە تاقم و چینەکانی داهاتوو کارو فەرمانی پێشووەکان بگرنە دەست و هەرکەم و کوڕیەکی بوو تەواوی بکەن، وە بەو شێوەیە هەموو تاقم و چینەکان هاوکارو یارمەتی دەری یەکتر ئەبن و ئەو کاتە کاری ژیان و جیهان هەمیشە بەرەو پێشکەوتن ئەڕوات، وە لەسەر ئەو بنەڕەتە ئیسلام یاسای میرات و کەلەپووری دانا، لەبەر بەجێهێنانی داخوازی سروشت، وە بەهۆی ئەوەوە مەردوم بکەوێتە هەوڵ و تێکۆشان و ئەوەی لەدەستی دێت بەکاری بێنێ لە زۆر کردنی سامان و هەرشتێ کە هۆی کامەرانی ژیانە بۆ ئەوەی لەپاش خۆی نەوەو وەچەکانی بژین بەخۆشی و دەست بگرن بەسەر هەموو بەرو بەرهەمەکەیدا، ئەو هەست و ئارەزووە سروشتییە خوا لە ئادەمیدا فەراهەمی هێنا لەبەر بەجێهێنانی ئەو مەبەستە گرنگەی کە باسکرا، جا بە پێی ئەو هەستە سروشتییە (ئیبراهیم)(علیه السلام) ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾، هەندێ لە ڕۆڵەو نەوەیشم ئەگێڕی لە پێشەوا؟ واتە هەندێ لەوانیش بگێڕە بە پێشەواو پێغەمبەر، ئینجا خوا وەڵامی دایەوە بە پێی ئەو یاسا گەورەو گرنگەی کەلە پێشەوە باسمانکرد کە پێشەوایی بە خزمایەتی و نەژاد دەستکەوت نابێت، بەڵکو بۆ کەسێك ئەبێت کە شیاو و شایستە بێت بۆی بە هۆی بڕواو ڕەوشت و هەستی پاك و کردەوەی چاکەوە، وە هەرکەس وا نەبێ بێبەشە لێی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ واتە سپاردەی پێشەوایی و پێغەمبەرێتی من بۆ ستەم کاران نابێ و دەستکەوتی ئەوان نابێ، ئیتر ئەوانەی کە ستەم لە خۆیان ئەکەن بەبێ بڕوایی و لادان لە ئایینی خوا، وە چ ئەوانەی کە ستەم لە مەردوم ئەکەن بەدەست درێژیی لێکردنیان.

(ئیبراهیم)(علیه السلام) داوای ئەو پێشەوایی و پێغەمبەرێتیەی کرد بۆ هەندێ لە ڕۆڵەو نەوەکانی، وە خوای گەورەیش لەوەڵامیدا بەبێ بەشی هەندێ لە نەوەکانی ــ واتە ستەمکارەکانیان ــ لەو پێشەوایی و پێغەمبەرێتیە، دەی لەمەوە وەرئەگیرێ کە داواکەی وەرگرتووە، بەم ڕەنگە هەندێکیان ئەکات بە پێشەواو پێغەمبەر، بەڵام ئەو هێندە نابێ لە تاقمی ستەمکاران بن، بەڵکو ئەبێ لە تاقمی دادپەروەران بن، کەواتە ئەو وەڵام و فەرموودەیە هەرچۆنێ ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو نەوەکانی ستەمکارن، هەموو ئەوەش ناگەیەنێ کە هەرکام ستەمکار نەبوون ئەیکات بە پێشەواو پێغەمبەر، بەڵکو هەر ئەوە ئەگەیەنێ کە وتمان: کە ستەمکارەکانیان لەو پێشەوایی و پێغەمبەرێتییە بێبەشن، کەواتە جوولەکەکان ئەبێ نائومێد بن لەو پێشەوایی و سەرکردایەتیەی کە بە تەمای بوون و هەڕەشەیان پێ ئەکرد لە عەرەبەکانی مەدینە، ئەبێ نائومێد بن لەوە بەهۆی ستەمکاریان و دەرچوون و سەرکەشیان لە فەرمانی خواو لادانیان لە ئایین و عەقیدەی باپیرە گەورەیان (ئیبراهیم)(علیە السلام)، بێ‌گومان ئەو پێشەواییەی کە خوا بەڵێنیدا بە (ئیبراهیم) پێشەوایی پێغەمبەرێتی بوو، وە هەروەها ئەوەش کە (ئیبراهیم) داوایکرد بۆ هەندێ لەنەوەکانی، ئینجا ئایا مەبەست بەو پێشەواییەی کە قەدەغەی کرد لە ستەمکاران هەر ئەو پێشەواییە بێت، وەك بە دیمەن و رووالەت وایە، یان مەبەست گشتی بێت لە پێشەوایی، جێنشینیش؟ بە هەرکام مەبەست بێت بێ‌گومان لە ئایینی پاکی ئیسلامدا مەرجێ لە مەرجەکانی دانانی جێنشین دادپەروەری ئەو جێنشینەیە، واتە دروست نییە هەڵبژاردنی هەرکەس کە دادپەروەر نەبێت، ئینجا ئەگەر هەڵبژێررا یان بە زۆر خۆی کرد بە کاربەدەست و حوکمڕان، ئەوکاتە دووباری هەیە:

١- هەرچۆنێ خۆی گوناهبارەو ستەمکارە لە نەفسی خۆی، هەروەها بە پێی یاساو شەریعەتی ئیسلامیش ڕەفتار ناکات لەناو گەل و لەوڵاتدا، بەڵکو بە پێی یاساو ڕژێمی ئەرزیی ڕەفتار ئەکات.

٢- لەگەڵ نەفسی خۆیدا ستەمکارو تاوانبارەو بەڵام هەر یاساو شەریعەتی خوابە جێ ئەهێنێ لە گەل و وڵاتدا.

لەسەر باری یەکەم بەبێ خیلاف‌و دووبەرەکی بە هیچ ڕەنگ دروست نییە گوێڕایەڵی بۆی‌و یارمەتیدان‌و ڕازی بوون بە بڕیارەکانی، وە پێویستەو فەرزە لەسەر گەل هەوڵ‌و تێکۆشان بکەن بۆ لابردن‌و دوورخستنەوەی، وە بە پێی دەقی قورئان‌و حەیس دورست نییەو قەدەغەیە کە مترین خۆشەویستی‌و مەیلی دڵ بۆی، وە هەرکەس کەمترین مەیلی دڵی ببێ بۆی ئەو کەسە ستەمکارەو ئەگەر نەگەڕێتەوە لەوەو تۆبە نەکات بە ئاگری دۆزەخ سزا ئەدرێ، وە لەسەر باری دووەم خیلاف‌و دووبەرەکی تیا هەیە، کۆمەڵ‌و جەماوەری زاناو پێشەواکان لەسەر ئەوەن کە گوێڕایەڵی دروست نییەو بڕیارەکانی دانامەزرێن.

ئیمامی حەنەفی ئەیفەرموو: ئەگەر مەنصورو کۆمەڵەکە بیانەوێ مزگەوت دروست بکەن‌و فەرمانم پێبدەن کە خشتەکانی بژمێرم بۆیان لە گوێیان ناکەم، جا لەبەرئەوە بەنهێنی فتوای ئەدا بە یارمەتیدانی زەیدی کوڕی عەلی ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ وە ئەیفەرموو: پێویستە لەسەر موسڵمانان کۆمەکی بکەن بە ماڵ‌و لەگەڵی ڕاپەڕن بەرامبەر مەنصوری عەبباسی‌و وێنەی ئەو، وە لەسەر فەرمانی ئەو کوڕێك کەوتە شوێن ئیباهیم‌و عەبدوڵلای کوڕی حەسەن تا شەهید کرا، لەپاشا دایکەکەی هات گلەیی کرد لە ئیمام لەسەر قسەی تۆ کوڕەکەم کوژرا، ئیمامیش فەرمووی: خۆزگە من لە شوێن کوڕەکەی تۆ بوومایە، وە هەروەها سوفیانی کوڕی عوبەینەو چەند پێشەوای تر فەرموودەی وایان زۆرە، وە تاقمێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە گوێڕایەڵی دروستەو فەرمان‌و بڕیاری بەجێئەهێنرێ، بەڵام چەند حەدیسێکی صەحیح قوڵ گرو یارمەتی دەری ئەم تاقمەیە، با زیاتر درێژە نەدەین بەم مەسەلەیە، چونکە بە ڕوونی‌و بەدرێژیی ڕوونکراوەتەوە لە کتێبەکانی کەلام‌و حەدیس‌و (فقە)دا. لەبۆچوون‌و تێگەیشتنی ئیسلامیدا هەموو پەیوەستی نەژادو خزمایەتی‌و خۆشەویستی و دۆستایەتی بەستراوە بە پەیوەستی عەقیدەو بڕواو، هەرکات پەیوەستی عەقیدەو بڕوا نەبوو یا پچڕا لە ناو مەردوم‌و لە بەینی هەر دوو کەسێکدا، ئیتر هەموو پەیوەستیەکانی تر ئەپچڕێ‌و نامێنێ‌و هیچ نرخێکی نابێ لە ئیسلامدا، تەنانەت لە بەینی باوك‌و کوڕو ژن‌و مێرددا، کەواتە لە ئیسلامدا یەکێتی بڕواو عەقیدە جێنشینی یەکێتی خێزان‌و بنەماڵەو تیرەو نیشتمانە!!

وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ
وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ
هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ

﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا﴾ باسی ئەو کاتە بکە کەئێمە کە عبەمان گێڕا بە شوێنی کۆبوونەوەو گەڕانەوەو هاتو چۆ بۆ ئادەمی لەهەر لایەکەوە، وە بە شوێنی هێمنی و ئارام و ئاشتی و بێباکی، ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ واتە: وە گوتمان پێیان کە جێگە نوێژێك بوو خۆتان دابنێن لەشوێنەکەی (ئیبراهیم)دا، شوێنی وەستانی بەسەر ئەو بەردەی کە بەوە بەناوبانگەو ئێستا جێگای هەردوو پێی پێوە دیارەو دوو ڕکات نوێژی تیا ئەکرێ لە پاشا تەواف کردن یان مەبەست هەموو کەعبەو حەرەمەکە بکەن بە جێگەی نوێژو پاڕانەوەو تەواف کردن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ﴾ وە فەرمانمانداو ڕامان سپارد بۆلای ئیبراهیم و ئیسماعیل بەمەی کە ماڵەکەم پاك بکەنەوەو بە پاکی ڕایگرن لە هەر شتێ کە شایستە نییە، ئیتر چ لە هەر بتێ کە عەرەبەکانی بەنی جورهوم لەو دەورو بەرە دایان نابێ یا هەر شتێکی پیس و قیزەونی تر ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ وە بەو شێوە ئامادەی بکەن بۆ تەواف کەران و داینشتوان و ڕکوع و سوژدەبەران، واتە نوێژ کەران، کەواتە بە هەموو ڕەنگ گێڕانی ئەو ماڵی خوا بە ڕووگەی موسڵمانان، چونکە ماڵەکە ماڵی خوایەو مەردوم بەندەی خوان وە خاوەنی ئەو ماڵە فەرمانیداوە بە دوو بەندە لە بەندە هەڵبژێراوەکانی کە ئەو ماڵە دروست بکەن و بە پاکی ڕایگرن و ئامادەی بکەن بۆ خواپەرستان، ئیتر چۆن جوولەکە ـ کە خۆیان بەنەوەی ئیبراهیم دائەنێن ـ ڕەخنە ئەگرن لەوەو دەم ڕیژیی و پڕو پاگەندەی تیا ئەکەن؟!

ئینجا جارێ تریش دڵنیایی ئەکات لەسەر هێمنی و ئارام و ئاشتی بۆ ئەو ماڵی خۆیە بە هۆی نزای (ئیبراهیم)ەوە، وە هەروەها جاری تریش دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوەی کە نەژادو خزمایەتی بە تەنها هیچ سوودی نابێ ئەگەر پەیوەستی عەقیدەو بڕوا بپچڕێ، ئەمیش هەر

بە پێی نزای (ئیبراهیم)(علیە السلام)، ئەفەرموێ:﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ﴾ باسی ئەو کاتە بکە (ئیبراهیم) وتی: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا﴾ ئەی پەروەردگار ئەم شێوەو ئەم شوێنە چۆڵە بگێڕە بە شارێکی هێمن و ئاسایشدار، ئەم نزایەی کرد لەیەکەم جارەوە کە هاتە خاکی مەککە، وەك (سەعیدی کوڕی جوبەیر) ئەگێڕێتەوە لە (ئیبن و عەباس)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– کەکاتێ بە فەرمانی خوا ئیسماعیل و دایکی لەو شوێنە دانا و گەڕایەوە بەرەو شام، هاجەر کەوتە شوێنی و بانگی لێکرد کە بەلای کێوە ئێمە بەجێئەهێڵی لەم شوێنە چۆڵەدا، ئەویش وەڵامی نەئەدایەوە هەتا گوتی: ئایا خوا فەرمانی پێداوی بەمە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، ئینجا ئەمیش گوتی: خوا زایەمان ناکات و ئیتر دڵئارام بوو، وە ئەویش ڕۆشت هەتا گەیشتە (کداء) کە ئیتر لەوەو لا مەککەی لەبەرچاو ون ئەبوو، لەوێدا ڕووی کردە شێوەکەو ئەم نزایەی کرد، وە نزاکەی دوو شت ئەگرێتەوە:

١- خوا بیکات بە شارێك، وە شارەکەش هێمن و ئاسایشداربێت.

٢- ﴿وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وە ڕۆزی دانیشتوانی بدە لە هەموو جۆرە بەرو میوەکان، خوای میهرەبان نزاکەی وەرگرت بە تێرو تەسەلی، بەم ڕەنگە کردی بەو شارە کە لەسەر زەویدا تاقانە شارێکە کە هێمن و ئارام و ئاشتی ئاسایشدارە، وە هەمیشە بەرو میوەی هەر چوار وەرزەکە لەوێ دەست ئەکەوێ بە زۆری و فراوانی لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی هیچی نییە!!

لە وەڵامی نزای پێشوودا خوا پێشەوایی قەدەغەکرد لە ستەمکاران، جا لەوەوە (ئیبراهیم)(علیە السلام) پەندی وەرگرت و لێرەدا شەرمی کرد کە داوای ڕۆزی بکات بۆ هەموو دانیشتوانی شارەکە، بەڵکو بێدەنگ بوو لەبێبڕوایان و هەر داوای بۆ بڕواداران کرد فەرمووی: ﴿مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ هەرکەس لەوان کە بڕوای هێنابێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئینجا خوای گەورە وەڵامی دایەوەو داواکەی تەواو کردو باری ئەوانیشی ڕوونکردەوە کە ئەم باسی نەکردن، بەمەی کە ڕۆزی ئەمانیش ئەدات، بەڵام دوا ڕۆژیان ئاگری دۆزەخە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿وَمَن كَفَرَ﴾ ڕۆزی ئەوەش ئەدەم کە بڕوا نەهێناب

فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ

---

**﴿فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا﴾ ئینجا بەو ڕۆزییە ئەیژیەنم ماوەیەکی کەم، کە ماوەی ژیانیەتی لەم جیهانەدا، ﴿ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە ناچاری ئەکەمو بە توندی ئەیبەم بۆ لای سزای ئاگر ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ وە ئاگر دواڕۆژو چارەنووسێکی زۆر خراپو بەدە! ـ خوا پەنامان بدات لێی ـ ئینجا شێوەیەکی شیرینمان نیشان ئەدات، شێوەی ئامادە کردنو ڕێكو پێککردنی ماڵەکەی خوا بۆ خواپەرستان لەلایەن (ئیبراهیم)ەوە کە باوکی هەموو پێغەمبەرانی پاش خۆیەتی، وە لەلایەن (ئیسماعیل)ی کوڕی یەوە کەلەنەوەی ئەو گەورەترینو دواترین پێغەمبەرانی خوا پەیدابوو ـ سەلامی خوا لە هەمووان بێت ـ شێوەی ئەو ئامادە کردنەمان بۆ باس ئەکات بەدەم لاڵانەوەوە بۆ خۆیانو بۆ پەیدا بوونی گەلو ئوممەتێکی موسڵمان لەناو نەوەکەیاندا، وە بەجۆرێ ئەو باسەمان بۆ ئەکات وەك ئێستا ئەو کاتە بێتو ئێمە بە چاوەوە بینو سەرنجی ئەو باوكو کوڕە بدەین کە خەریکن بەو کارە پیرۆزەوە، وە وەك ئاوازی نزاو لاڵەکەیان ئێستا ئامادە بێتو بدا بە گوێچکەماندا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ﴾[1] باسی ئەو کات بکەن کە (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل) بناغەکانیان بەرز ئەکردەوە لەو ماڵە، واتە ـ کەعبە ـ بەم ڕەنگە چین لەسەر ژێنیان لەسەر دائەنان، یا چین لەسەر چین دیوارەکانیان بەرز ئەکردەوە، ئەو کردەوە ڕابوردووە بە کردەوەی ئێستای ناو ئەبات، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿يَرْفَعُ﴾ بەرز ئەکاتەوە، لەبەر ئامادەکردنی ئەو کردەوە پیرۆزەو هێنانی بۆ پێش چاو، کەبە ڕاستی هەر زۆر شیرینەو شایانە بۆ بیر لێکردنەوە، وەرە بیربکەرەوە لەو دیمەنە جوانە، (ئیبراهیمی خەلیل) وەستا بێتو (ئیسماعیل) شاگردو بەردەست، هەردوو ئیش بکەن لە دروستکردنی یەکەم ماڵی خوا لەزەویدا بۆ ئادەمی!!**

---

[1] بەرز کردنەوەکەی لە ڕێوە بۆ (ئیبراهیم) داناو لەپاشدا باسی (ئیسماعیل)ی کردو کردی بە هاوبەشی، چونکە ئیبراهیم گەورەترو بەرزترە، وە ئەو پێشەواو وەستا بوو، (ئیسماعیل) شوێن کەوتووو شاگردی بوو، وە لە ڕووی ڕاستیشدا بەرز کردنەوە (ئیبراهیم) ئەی کردو (ئیسماعیل) بەردی ئەدا بەدەستیەوە، وەك لە حەدیسدا ئەفەرموێ.

رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً
لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ
يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن
يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ

---

خەریکن بەو کارە گەورەوە لە کاتێکدا ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿تَقَبَّلْ مِنَّآ﴾ لێمان وەرگرەو ڕازی بەلە کارو کردەوەمان، ئەو داوایەت لێ ئەکەین، چونکە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی هەر تۆ بیسەری نزای ئێمەی کە ئاگاو زانای بە نیازمان ﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ﴾ ئەی پەروەردگارمان بمانگێڕە بە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانت و فەرمانبەری ئاینی و شەریعەتت، یان بە خاوێن کەری خۆیان و کردەوەو نیازمان بۆ تۆ ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾ وە هەندێ بە نەوەمان بگێڕە بە گەل و کۆمەڵێکی ملکەچ و گوێڕایەڵ بۆ تۆ، یان تۆ پەرست بن بە تەنهاو پاک و خاوێن و بەبێ هیچ هاوبەش ڕەوا دانێک ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا﴾ وە نیشانمان بدەو ئاشنامان بکە بە نیشانەو شوێنەکانی عیبادەت و خواپەرستیمان لە حەج و عەمرەدا ﴿وَتُبْ عَلَيْنَآ﴾ وە تۆبەو گەڕانەوەمان لێ وەرگرە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چونکە بەڕاستی هەر تۆ زۆر تۆبە وەرگرو بەزەییداری، پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ هەرچەند گوناهبارو تاوانکار نین، بەڵام بەرامبەر بە خوا هەر کەم و کوڕیان هەیەو پێویستن بە گەڕانەوە بۆلای خوا لە هەر ناتەواوی و کەم و کوڕیەکیان، وە بێجگە لەوەش ڕادەو پلەکانی خوا ناسی هەرگیز دوایی نایەن، وە هەرکات بەندە پلەو ڕادەیەکی بڕی و بەرز بوویەوە بۆ ڕادە پلەیەکی بەرزتر پێویستی هەیە بە تۆبە کردن لە ڕادەو پلەی پێشووتر کە ناتەواو و کەم و کوڕە لەچاو ڕادەو پلەی تازەدا کە تێرو تەواو ترە.

شەرم و ئەدەب لە خوا ئەبێ ئاوا بێت، وە بڕوا بە خوا ئەبێ بەو جۆرو شێوەبێت کە لەم نزاو پاڕانەوەدا دەرئەکەوێ، وە ئەبێ موسڵمان و بڕوادار لەم ڕێگە ڕاستەوە خەریک ببێ و خواپەرستی بکات، ئەو دوو پێغەمبەرە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ بەدەست و دەم خەریکن بە خواپەرستییەوە و شەکەت و ماندوون، بەڵام گوێیان لە هیچ نییەو سۆزو پەرۆشیان هەر بۆ

وەرگرتن‌و ڕەزامەندی خوایە، وە داوای ڕێنموونی ئەکەن بۆ ئیسلام‌و دامەزرانیان لەسەر ئیسلام، چونکە نەزانن دڵی مەردوم وا لە بەینی پەنجەی قودرەتی خوادا، ئەگەر بە هەر بارێکدا وەری گێڕێ ئەتوانێ‌و کەس هیچ دەسەڵاتێکی نییە، وە هەموو شتێك بەدەست خوایەو داوای کۆمەك بۆ ئەوە هەر لە خوا ئەکرێ، ئینجا بێگومان دڵی بڕوادار هەمیشە بەستراوە بە ئایین‌و عەقیدەکەیەوە، وە گرنگ ترو بەنرخ تر بە لایەوە عەقیدەو بیروباوەڕەکەیەتی، جا لەبەر ئەوە نزایانکردە لای خوا کە ئایین‌و عەقیدەکەیان بهێڵێتەوە لەناو چینەکانی پاش خۆیان، وە بێ بەشیان نەکات لەو چاکەو بەهرەیە کە هیچ بەهرەیەکی تر هاوتای ناکات، ئینجا داوایانکرد کە نەوەکەیان بێبەش نەکات لە ڕێگەنیشان دەرو ڕێنموونی کەرێك کە ئایەتی خوایان بەسەرا بخوێنێ‌و فێری هەر شتێکیان بکات کە پێویستە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا﴾ وتیان: ئەی پەروەردگارمان ﴿وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ﴾ ڕەوانە کراوێك لە خۆیان تا زیاتر بە سۆزو بەزەیی بێت پێیان، وە ئەوانیش باشتر شانازی پێوە بکەن، وە نزیکترین لە گوێ ڕایەڵییەوە، چونکە ناسراوە لایان‌و شارەزای پاکی‌و ڕاستین، کە ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ﴾ بخوێنێ بەسەریاندا نیشانەو بەڵگە ئاشکراکانی تۆ لەسەر خوایەتی‌و تاك‌و تەنهایی تۆو پێغەمبەرێتی‌و هەموو شتەکانی تر کە (وەحی) سروشتیان ئەکەیتەلای، ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ وە فێری کتێبی تۆیان بکات، واتە قورئان، ﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ وە هەموو ڕەوشت‌و کردارێکی ڕاست‌و بەجێ کە ڕەوشت‌و کرداری خۆیەتی ﴿وَيُزَكِّيهِمۡۚ﴾ وە پاك‌و خاوێنیان بکات لەبەد بڕوایی‌و بەد کرداریی، ئەم داوایەت لێدەکەین کە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر تۆ زاڵی کار دروستی، واتە هەر تۆ زاڵی بەسەر هەموو شتێکدا، وە هەموو کردەوەت ڕاست‌و بە جێیەو لە شوێنی خۆیدایە، کەواتە ئەتوانی‌و دەسەڵاتت هەیە بەسەر ئەو داوا کراوەداو داواکراوەکانیش هەموو ڕاست‌و بەجێن، ئا بەم شێوە نزاکەیان دوایی پێهێنا‌و وەسف‌و سەنای خوایانکرد بەم دوو سیفەتە کە تایبەتین بەوەوە، وە ڕێك‌و پێکیشە لەگەڵ داواکراوەکەیاندا.

خوای میهرەبانی نزاکەی وەرگرتن بە ڕەوانە کردنی پێغەمبەرمان (ﷺ) کەلە نەوەی هەرنووکیانەو ئیتر پێغەمبەرانی تر لە (ئیسحاق)ەوە تا دوایی هەر لەنەوەی (ئیبراهیم)ن ـ سەلامی لە هەمووان بێت ـ ئەم پێغەمبەرەی ڕەوانە کرد لەناو گەلی قورەیشدا کەلە نەوەی

(ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)ن، وە بەو جۆرو شێوەی ڕەوانە کرد کە ئەوان داوایانکرد بەم ڕەنگە ئەو سیفەتو نیشانانەی تیا بەدی هات بە تێرو تەسەلیییەوە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەدا (ﷺ)، ئەو گەلە نەفامو نادانو بت پەرستەبوون بە چاکترین گەلو کۆمەڵ لەناو هەموو گەلو چینەکانی ئادەمیدا، وە بوون بە مامۆستای جیهاندا فریای ئادەمی کەوتنو فێری وێڵو پیاوەتیانکردن، وە پێغەمبەرێتیەکەی بوو بەڕەحمەتی خوا بەسەر جیهانو جیهانیانەوە، سەلاتو سەلامی خوای لێ بێو خوا پاداشتی بداتەوە لەباتی هەموو جیهانو جیهانیان، وە هەرچۆنێ لە واقیعی ژیاندا دەرکەوت کە داواو نزاکەی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل) بەم شێوە بەدی هات، هەروەها لە فەرموودەی خۆیشیدا ئەوە هەیە لە حەدیسێکدا کە (ئیمامی ئەحمەد) ئەیهێنێ لە (عیریاض)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من نزاکەی ئیبراهیم، وە مزگێنیەکەی عیشا، وە خەوەکەی دایکم کەدی لەکاتی لەدایك بوونی مندا، ئایینی پاكو خاوێنی ئیبراهیمی ڕوونکردەوە، ئەو ئایینەی کە داوایکرد لە خوا بیهێڵێتەوە لەناو نەوەکانیدا، وە هەر لەو نەوەیە پێغەمبەرێك ڕەوانە بکات بەو ئایینە پیرۆزەوە، وە شتێکی ڕوون کە خوا ئەو نزایەی وەرگرتو بەدی هێنا بە ڕەوانە کردنی محمد (ﷺ)، کەواتە ئەم ئایینەی کە پێی هات هەر ئەو ئایینەیە کە (ئیبراهیم)ی لەسەر بوو، وە داوایکرد بۆ نەوکانی لەپاش خۆی، دەی ئیتر چۆن جوولەکەو گاورو بت پەرستەکانی عەرەب مل ملانێ ئەکەن لەگەڵ ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) وە ملکەچ ناکەن بۆ ئەو ئایینەی کە پێی هات، وە ڕازی نابن پێشەواییەکەی، لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان بە نەوەو شوێن کەوتووی (ئیبراهیم) دائەنێن، وە لە کاتێکدا کە لادان لە ئایینەکەی ئەم لادانە لە ئایینی (ئیبراهیم) ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ﴾ وە ئایا کێ ئایینی (ئیبراهیم)ی پێ ناخۆشەو پشتی تێئەکات؟ واتە هیچ کەس ئەوە ناکات ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ﴾ مەگەر کەسێك کە خۆی سووكو ڕیسواو بێنرخ بکاتو خۆی گێلو نەفام بکات، ئینجا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر سووكو ڕیسواییو هەڵەی ئەو کەسانەی کە لائەدەن لە ئایینی (ئیبراهیم) بەمەی کە (ئیبراهیم) لە جیهاندا هەڵبژێرراوی خوایەو لە ڕۆژی دوایشدا لە بەندە چاکەکانی خوایە، کە خاوەنی پایەو پلەی بەرزن، دەی هەرکەس لابدا لە ئایین ئەوا ئەو کەسە بێگومان نەفامو نەزانەو سووكو ڕیسوایە،

وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ سوێند بە خوا ئێمە (ئیبراهیم)مان هەڵبژارد لە جیهانداو پاڵفتەمانکرد بە پێغەمبەرێتی و پێشەوایی و بەمەی کە کرا بە باوکی هەموو پێغەمبەرانی دوای خۆی، ﴿وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وە بە ڕاستی لە ڕۆژی دوایشدا لە بەندە چاکەکان کە خاوەنی پایەو پلەی بەرزن، (ئیبراهیم)مان هەڵبژارد ﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ﴾ کاتێ پەروەردگاری پێی وت: ملکەچ بەو ئایینەکە پاك‌و خاوێن بکە بۆ خوا، ﴿قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەویش گوتی: ئەوا ملکەچ بووم‌و ئایینی خۆم پاك‌و خاوێن کرد بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیان، واتە بەبێ گێرو گرفت‌و سەر لێکردنەوە گوێڕایەڵ بوو، وە ملکەچ بوو بۆ فەرمانی خوای خۆی، ئیتر ئەوە پێش پێغەمبەرێتی بووبێ، یان پاش، ئەگەر پێش پێغەمبەرێتی بووبێ مەبەست ئەوەیە خوا نایە دڵی بیرکردنەوە لەم بوونەوەرەو ڕووی دڵی تێکرد بە بەندەیی و ملکەچی، وەك (حەسەن)و(ئیبن عەباس) ئەفەرموون –خوا لێیان ڕازی بێ– وە ئەگەر پاشی پێغەمبەرێتی بووبێ، وەك هەندێ ئەفەرموون، ئەوکاتە مەبەست گوێڕایەڵییەو وەرگرتن‌و ڕەزامەندی دڵە بۆ هەر فەرمان‌و بڕیارێك بە تایبەتی لەگەڵ دامەزراوی بە ڕێك‌و پێکی لەسەر ڕێکە خواو پێی ڕەزامەندی خوا، بەهەر حاڵ‌و لەسەر هەربار دایارە مەبەست ئەوە نییە کەلە پێشەوە بێبڕواو نا موسڵمان بووەو خوا فەرمانی پێ‌ئەدا کە بڕوا بێنێ‌و موسڵمان ببێ، ئینجا وەسفی (ئیبراهیم) ئەکات بەمەی کە هەرچۆنێ خۆی لەسەرئەوئایین‌ومیللەتەپاکەبوو،هەروەهائەیویست کە کوڕەکانیشی هەر لەسەر ئەو ڕێ و ڕچەبن، ئەفەرموێ: ﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ﴾ (ئیبراهیم) وەسیەتی کرد بەو ئایین‌و میللەتی ئیسلامە بۆ کوڕەکانی ﴿وَيَعۡقُوبُ﴾ وە (یەعقوب)ی کوڕەزایشی وەسیەتی پێکرد بۆ کوڕەکانی خۆی کە دوانزە بوون، وەك لەخەوەکەی (یوسف)ەوە دەرئەکەوێ، وە کوڕانی (ئیبراهیم)یش (ئیسحاق)و (ئیسماعیل) کە پێغەمبەر بوون لە قورئاندا ناویان هاتووە لە چەند شوێنێکدا، وە بێجگە لەمان چەند کوڕێ تری بووە، دوان یان شەش یان دە یان بیست‌و دوو بە پێی چەند ڕیوایەتێ کە هاتوون لەو بارەیەوە، هەرکام لەم دوانە وەسیەتیانکرد بۆ کوڕەکانیان،

يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ
يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ
إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾

بەم ڕەنگە پێیان وتن: ﴿يَٰبَنِيَّ﴾ ئەی کوڕەکانم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ﴾ بێگومان خوا هەڵی بژاردووە بۆتان ئایینی ئیسلام ﴿فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ کەواتە مەمرن مەگەر بە موسڵمانێتی، واتە ڕاگیرو دامەزراو بن لەسەر ئیسلام، تا ماون هەرگیز لێی جوێ مەبنەوە.

لە پاش ئەوەی بێزاری دەربڕی لەوانەی کەلە ئایینو میللەتی (ئیبراهیم) لائەدەن، وە وەسیەتی (ئیبراهیم)و (یەعقوب)ی گێڕایەوە بە فەرمان دانیان بەو ئایینو میللەتە هەتا ماون، لەپاش ئەوە ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە جوولەکەکان کە بڕوا ناهێنن بەو میللەتو ئایینی ئیسلامەی کە پێغەمبەرمان هێنای (ﷺ) وە درۆ هەڵئەبەستن بەدەم (یەعقوب)ەوە کە گوایە لەکاتی مردنیدا وەسیەتی کردووە لە جوولەکەیەتی، ڕووی فەرموودەیان تێ ئەکات بە سەرزەنشتو بەدرۆ خستنەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ﴾ واز بێنن لەو وەسیەتانەی کە باسکران، ئەی ئایا ئێوە ئامادەو دیارەوە بوون ﴿إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ﴾ لەو کاتەدا کە مەرگ ئامادەی (یەعقوب) بوو وە هاتە سەری؟[1] واتە نەخێر ئێوەی ئێستا ئامادە نەبوون، کەواتە چۆن بە درۆوە دەم ئەکوتنو درۆ هەڵئەبەستن بەدەم (یەعقوب)ەوە، یان بەڵێ تاقمو چینە پێشووەکەتان بە دیارەوە بوون ئەو کاتەی کە مەرگ هات بۆ (یەعقوب) ﴿إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ﴾ لەو کاتەدا کە گوتی بەکوڕەکانی: ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِي﴾ ئایا ئێوە چی ئەپەرستن لەپاش من؟ لە وەڵامدا﴿قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ﴾ وتیان: خوای تۆ ئەپەرستنو

---

[1] زۆر بە لەسەر ئەوەن کە ئەم فەرموودە ئاڕاستەی (ئیسرائیل)یەکان کراوە، وە (أم) مونقه طیعه یە بە مانا (بل) وای پرسیارە، وە (بل) بۆ وازهێنانو گواستنەوە لەوترلوی پێشوو، وە (أ) لێرەدا بۆ ئینکارە، ئەگەر مەبەست ئامادەیی ئەو تاقمە بێت کەلە چەرخی پێغەمبەردا بوون (ﷺ)، وە ئەگەر مەبەست ئەوانەی چەرخی (یەعقوب) بن، ئەو کاتە پرسیارەکە بۆدان پیانانە، وە هەندێ ئەڵێن: (أم) موتەسیلە، وە هەندێ تر ئەفەرموون: ئەم فەرموودەیە ئاڕاستەی بڕواداڕانە، ئەم دوو ڕایە هەرچەند ئەگونجێن، بەڵام ئەوەی پێشوو بەهێز ترە وەك لە تەفسیرەکەدایە.

خوای باوك‌و باپیرت كه (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)ن، (ئیسماعیل)یان به باوك ناو برد له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا مامی باوكیانه، له‌به‌رئه‌وه‌ی مام وه‌ك باوك وایه به پێی عورف، وه‌ك حه‌دیسی (بوخاری)و (موسلیم)یش ئه‌فه‌رموێ: (عم الرجل صنو ابیه) مامی مه‌ردوم هاوڵقی باوكێتی، ﴿إِلَٰهًا وَاحِدًا﴾ كه ئه‌و خوایش یه‌ك خوایه ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ وه ئێمه ملكه‌چ‌و گوێڕایه‌ڵین بۆی له هه‌موو فه‌رمانیدا، وه ئایینی خۆمانی بۆ پاك‌و خاوێن ئه‌كه‌ین له هه‌موو شتێكی ناڕه‌واو ناشایسته، به هه‌ر جۆرو له‌سه‌ر هه‌ربار ئه‌وا خوا جووله‌كه‌كانی ده‌م كوت كردو به‌درۆی خستنه‌وه به‌گێڕانه‌وه‌ی قسه‌و وتاری (یه‌عقوب)(علیه السلام)، گێڕانه‌وه‌ی به‌و جۆرو شێوه به‌هێزه قورئانییه كه‌كار ئه‌كات له هه‌ست‌و هۆش‌و ده‌روون! به‌ڵێ به‌ڕاستی شێوه‌و دیمه‌نكه ئێجگار سه‌یرو سه‌رنج ڕاكێشه‌و ئه‌وپه‌ڕی گه‌وره‌یی‌و گرنگی وه‌سیه‌ت پێكراوه‌كه ده‌رئه‌خات. پیاوێكی وا گه‌وره خه‌ریكه به دنیا ده‌رئه‌چێ‌و ئه‌و هه‌موو كوڕه كۆ بوونه‌ته‌وه، ئایا له‌و كاته‌دا دڵی به‌چییه‌وه خه‌ریكه؟ ئایا له‌وكاتی سه‌ختی گیان ده‌رچوونه‌دا به چ شتێكه‌وه دڵی به‌ستراوه‌و خه‌ریكه؟ ئایا ئه‌و مه‌به‌سته گه‌وره‌و گرنگه ئه‌بێ چی بێت كه ئه‌و پیاوه له‌و كاته‌دا ئه‌یه‌وێ دڵنیاو ئارام ببێ له‌سه‌ری؟ ئایا ئه‌و كه‌له‌پووره‌ی به‌جێی بهێڵێ بۆ ئه‌و كوڕه خۆشه‌ویستانه‌ی‌و ئه‌یه‌وێ به ساغی‌و پاكی بگاته ده‌ستیان‌و پێیان بگه‌یه‌نێ له‌ناو ئه‌و كۆڕو كۆمه‌ڵه‌دا؟ ئه‌و كه‌له‌پووره‌و ئه‌وسپارده گرنگه ئه‌و بیرو باوه‌ڕو عه‌قیده پیرۆزه بوو كه‌دڵی داگیر كردبوو تا ئه‌و ڕاده‌یه سه‌ختی‌و سامناكی هاتنی مردنیش له بیری نه‌بردبوو!! له‌پاش ئه‌وه‌ی ئایین‌و میلله‌تی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و شوێن كه‌وتووانی ڕوونكرده‌وه‌و ده‌ری خست كه ئایینی ئه‌وان هه‌ر ئه‌م ئایینی ئیسلامه‌یه كه هات بۆ پێغه‌مبه‌رمان (ﷺ)، كه‌واته ئاشكرابوو ئه‌وانه‌ی كه ملكه‌چ ناكه‌ن بۆ ئه‌م ئایینی ئیسلامه‌و خۆیان به ئه‌وه‌و شوێن كه‌وتووی (ئیبراهیم) دائه‌نێن، ئه‌وانه هیچ په‌یوه‌ستیان به (ئیبراهیم)و ئایینی (ئیبراهیم)ه‌وه نییه‌و به ته‌واوی پچڕاون لێی، له‌پاش ئه‌و باس‌و به‌یانه، ئینجا دڵنیایان ئه‌كات له‌سه‌ر ئه‌و پچڕان‌و نه‌مانی په‌یوه‌ستییه، وه به‌ته‌واوی ئه‌وانه نائومێد ئه‌كات له‌وه‌ی كه به ته‌مای سوود وه‌رگرتن بن وه‌رگرتن بن له نه‌سه‌ب‌و نه‌ژاده‌كه‌یان،

تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾ (ئیبراهیم)و ئەوان گەلو میللەتێ بوون کە ڕۆشتنو تێپەڕیانکرد ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ﴾ وە هەر بۆ خۆتانە هەر کردەوەیەك کە کردووتانە ﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ وە ئێوە پرسیارتان لێناکرێ لە هەر کردەوەیەك کە ئەوان کردوویانە، کەواتە هەرکام لەو دوو گەلو کۆمەڵە حیسابو پرسیاری تایبەتی خۆی هەیە، چونکە هەرکام ڕێگای تایبەتی خۆی هەیە، وە هەرکام شێوەو نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە، وە هەرکام ئاڵای جیاوازی خۆی هەیە، ئەوانی ڕابردوو گەلو میللەتێکی بڕواداری موسڵمان بوون، کەواتە پەیوەندیو پەیوەستیان نییە بەو گەلو میللەتەی پاش خۆیان کە لایاندا لە ڕێگەو ڕێبازەکەی ئەوان، وە ئەمانی دوایی بەشو پارچەیەك نین لەوان، هەرچەند لە نەوەو نەژادی ئەوان بن، چونکە هۆی پەیوەندی لە ئیسلامدا بڕواو عەقیدەیە ئیتر هەرچەند لە تیرەو ڕەنگو نەژادو وڵاتدا زۆر جیاوازو دووربن، بە پێچەوانەی باوو تێگەیشتنی نەفامی کە ئەم شتە زەمینیانە ئەکات بە هۆی یەکێتیو پەیوەستی کە ئەمانە شتێکن هیچ دەسەڵاتی مەردومیان تا نییە، وە بەرهەمی بەشە خاكو خۆڵەکەیەتی کە پەستو کەم نرخە، بەڵام بڕواو عەقیدە بە دەسەڵاتو هەڵبژاردنی مەردوم دەستکەوت ئەبێت، وە بەرهەمی بەشە ڕۆحەکەیەتی کە بەرزو بەڕێزترین بەشیەتیو بەوە جوێ ئەبێتەوە لە گیان لەبەرانی تر، وە ئادەمێتی لەسەر ئەم بەشە ڕاگیرە، کەواتە هەرکەس فامدارو ژیر بێت شتێ ئەکات بە هۆی پەیوەستی کە جوێی ئەکاتەوە لە گیان لەبەرانی ترو ئادەمێتیەکەی بەرز ئەکاتەوە.

لەبارەی نەسەبو نەژادەوە مەردوم سێ بەشن، بەم شێوەیە:

١- زۆر نرخ ئەدەن بە نەسەبو نەژادی بەرزو زۆر زیادە ڕەوی تیا ئەکەن، بە تایبەتی دەربارەی سەیادەت، تا ڕادەیەك لە سنووری قورئانو حەدیس دەرئەچن.

٢- بە پێچەوانەی یەکەم هیچ نرخو ڕێزێك دانانێن بۆی.

٣- میانەیەو لە ناوەڕاستدایە، نەوەك یەکەم نرخی بێ سنووری بۆ دائەنێ، وە نە بە بێ‌نرخیش سەیری ئەکات، بەم ڕەنگە هیچ سوودو نرخێکی بۆ دانانێ لەگەڵ

بێبڕوایی و بەد عەقیدەییدا، وە نرخ و سوودی بۆ دائەنێ لەگەڵ بوونی عەقیدەو بڕوادا، ئینجا بێگومان بەشی یەکەم و دووەم هەر هەڵەن و لائەدەن لە ناوەڕاستی ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام، وە هەرکام پێچەوانەی هەندێ لە ئایەت و حەدیسی ڕاست و سەحیحن، بەڵام سێیەم ڕاستن و ناوەڕاستی ڕێگەی ئیسلامیان داوەتە بەرو دژو پێچەوانەی هیچ ئایەت و حەدیسێکی سەحیح نین، وە بەسە بۆ بەڵگەی ڕاست و ڕەوا لەسەر ئەم ڕای سێیەمە سوود وەرنەگرتنی کوڕە بێبڕواکەی نوح لە نوح پێغەمبەر (علیه السلام) وە سوود وەرگرتنی دوو منداڵە هەتیوەکە کە لە سوورەتی ﴿الكهف﴾دا خوا بۆمان باس ئەکات کە لەبەر باوکە ساڵحەکەیان هاوڕێکەی موسا (علیه السلام) دیوارەکەی بۆ ڕاستکردنەوە..

بە کورتی نەسەب و نەژادی پاك جێگای ئومێدە بۆ ئەوەی بڕوادار ئەگەر خوا مەیلی بێت، نەك کابرا پشت ببەستێ پێی و پشتێنی لێ بکاتەوەو بەتەمای ئەوە بێت کە خوا هەموو لارییەکی بۆ ڕاست ئەکاتەوەو هەموو گوناهی ئەسڕێتەوە لەبەر باوکە چاکەکەی، بێگومان ئەوەش هەڵەیەکی زۆر گەورەیەو پێچەوانەی یاسای ئیسلامەو دوورە لە ڕاو بڕوای زانایانی ئیسلامەوە، (ئیمامی غەزالی) ــ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ــ لە (احیا)دا فەرموودەیەکی شیرینی هەیە بۆ دەم کوت کردنی ئەوانەی کە هەڵئەخەڵەتێن بەو جۆرە ئەفەرموێ: هەرچۆنێ هیچکەس بە خواردن و خواردنەوەی باوکی تێرو تێراو نابێ، هەروەها هیچکەس بە چاکی و کردەوەی چاکی باوکی ڕزگار نابێ لە تاوان و گوناهی... ئینجا با بەم کورتەیە واز بێنین و بگەڕێینەوە بۆ ژێر سایەو سەمەندی ئایەتەکان، ئینجا لەبەر ڕووناکی ئەو باس و مەسەلە ڕاستانەی کە هێنای لە (ئیبراهیم) و (ئیسماعیل) و کەعبەوە، هەندێ لە قسەو لاف و گزافی نامەدارەکانی چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) ئەهێنێ و ئەکۆڵێتەوە لێیان و لەو شتانەی کە ئەیکەن بە بەڵگەو نیشانەو دەمەدەمێ پێ ئەکەن، وە لە پاش ئەو لێکۆڵینەوە دەری ئەخات کە قسەو لافەکانیان بێبنج و بنەوانەو بەڵگەکانیان ناڕاست و ناڕەوایە، وەك دەرئەکەوێ کە ئایین و عەقیدەی ئیسلام شتێکی ڕاست و سروشتییەو هەرکەس لێی لابدا لاری و نالەباریی خۆی دەرئەخات،

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾
قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْ﴾ واتە جوولەكەكان وتیانو ئەڵێن بە موسڵمانەكان: هیچ ئایینێ ڕاست نییە بێجگە لە ئایینی یەهودی، كەواتە ببن بە یەهودی تا بگەن بە خێرو خۆش بەختیو بكەونە سەر ڕێی ڕاستو ڕێنموونی خوا وەرگرن، وە هەروەها نەسرانیەكانیش ئەیانوت بە موسڵمانەكان: ئایینی ڕاست هەر ئایینی نەسرانیەو ببن بە نەسرانی تا بكەونە سەر ڕێی ڕاستو ئایینی ڕێنموونی خوا وەرگرن، هەركام لەم دوو تاقمە بەو جۆرە لاف لی ئەداو هەر خۆی بە خاوەنی ئایینی ڕاست دائەناو بانگی موسڵمانانی بۆ ئەكرد، خوایش فەرمانیدا بە پێغەمبەر (ﷺ) كە دەم كوتی هەردوو بكات بە تەنها وتەو وشەیەك، فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ﴿بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ﴾ نەخێر نە بە یەهوود ئەبینو نە بە نەسرانی، بەڵكو بە میللەتی (ئیبراهیم) ئەبینو شوێنی ئایینی ئەو ئەكەوین لە كاتێكدا كە (ئیبراهیم) لادەرە لە ناحەقو ناڕاستو دامەزراوە لەسەر ئایینی حەقو ڕاست كە ئایینی خوا پەرستییە بە تاكو تەنها ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ وە لە بت پەرستانو هاوبەش بڕیار دەران نەبووە، واتە وەك ئێوە نەبووە كە خۆتان بە نامەدارو نەوەو شوێن كەوتووی (ئیبراهیم) دائەنێن، كەچی لاتان داوە لە ئایینی ئەوو عوزێرو، عیسا بە كوڕی خوا دائەنێن، وە هەروەها وەك قوڕەیش نەبووە كە لە نەوەی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)ن وە خۆیان بە قاپیەوانو كلیل داری ماڵی خوا دائەنێنو كەچی بە تەواوی لایان داوە لە ئایینی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)، وە مەلائیكە بە كچی خوا دائەنێنو هەر تاقمێكیان شتێ تر ئەپەرستێو هەر خوا ناپەرستێ!**

**دەی ئەگەر ڕاست ئەكەن با هەموومان شوێنی ئایینە ڕاستەكەی (ئیبراهیم) بكەوین، وە هەموو لە یەك ڕیزا ڕاوەستێنو ببین بە یەك گەلو ئوممەت بەبێ ئاژاوەو جیاوازی، ئینجا فەرمان ئەدا بە موسڵمانان كە جاڕی یەكێتی ئایینی خواو بڕوا بە ئایینی خوا بدەن لە (ئیبراهیم)ەوە هەتا (عیسا)و هەتا دواترینی هەمووان، وە بانگی نامەدارەكانیش بكەن بۆ بڕوا هێنان بەم تاقە ئایینی خوا، ئەفەرموێ: ﴿قُولُوٓاْ﴾ بڕوادارەكان بڵێن: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ ئێمە بڕوامان هێناوە بە خواو بەو قورئانەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆ لامان،**

وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾

---

**﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ وە بەو نامەو ئاییینەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ لای (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و (یەعقوب)و نەوەکانی (ئیبراهیم) کە بریتی بن لە (١٢) کوڕەکەی (یەعقوب)، یان ئەوانیش‌و نەوەیان‌و هەر لقێ تر کە لە (ئیسحاق) بوو‌بێتەوە کە ئەو نامەیانەی هات بۆ (ئیبراهیم) بۆ ئەمانیش بوون ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ وە بەو تەورات‌و ئینجیل‌و موعجیزانەی کە دراو بەخشرا بە (موسا)و (عیسا)، ﴿وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ وە بەوەی کە دراوەو بەخشراوە بە هەموو پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ لەکاتێکدا ئێمە هیچ جیاوازیەك ناخەینە نێوان هیچ کام لەوان، بەم ڕەنگە بڕوامان بە هەندێ ببێ‌و بێ‌بڕوا بین بە هەندێ، وەك جوولەکە بڕوای بە عیساو محمد نییە، وە یا گاور کە بڕوای بە محمد نییە – سەلامی خوا لە هەمووان بێت – بەڵکو بڕوامان بە هەموو پێغەمبەرانی خوا هەیە بە تێکڕایی ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ وە لە کاتێکا ئێمە ملکەچین بۆ خوا بە ئارەزووو پێ‌خۆش بوونی خۆمان، وە دان ئەنێین بە بەندەیی خۆمانا بۆی، ئەم یەکێتی خستنە نێوان هەموو پێغەمبەران‌و پەیامەکانیان بنەڕەت‌و یاسایەکی گرنگە لە ئیسلامدا، وە بە هۆی ئەمەوە ئەم ئوممەتی ئیسلامە بووە بە جێگرو جێنشین‌و کەلەپوور بەری هەموو ئایین‌و پەیامەکانی خوا، وە بە هۆی ئەمەوە ڕژێمی ئیسلامی ڕژێمێکی جیهانیەو هەموو جیهینیان ئەتوانن بژین لە سایەو سێبەریدا بەبێ ڕەگەزایەتی بۆ هیچ گەل‌و چین‌و تاقمێ، وە بێ چەوساندنەوەی هیچ تاقم‌و هیچکەس، وە بە هۆی ئەوەوە گەلی ئیسلامی گەلێکی کراوەیە بۆ هەموو ئادەمی کە پێکەوە بژین بە خۆشەویستی‌و ئارام‌و ئاشتی، جا لەبەر ئەوە خوای پەروەردگار ئەم بڕیارە دەرئەکات: کە لە پاش ناردنی ئەم ئایینە، ئاییینی ڕاست‌و عەقیدەی ڕاست هەر ئەمەیە کە ئەم ئایینە هێنای، کەواتە هەرکەس گرتیە گەردن، بێ‌گومان ئەو کەسە لەسەر ڕێی ڕاستەو ڕێنموونی خوای وەرگرتووە،**

فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ
وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾
قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ

وە هەركەس ڕووی لێ وەرگێڕێ‌و پشتی تێبكات ئەو كەسە هەرگیز دانامەزرێ‌و هەمیشە وا لە بەربەرەكانێ‌داو لاڕێ ئەگرێ وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە بڕوا ئەهێنن بەوەی كە ئێوە بڕواتان پێهێناوە بەو جۆرەی كە باسكرا، ﴿فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟﴾ ئەوا ئەوانە ڕێنموونی خوا وەرئەگرن‌و ئەكەونە سەر ڕێی ڕاست، ﴿وَّإِن تَوَلَّوْا۟﴾ وە ئەگەر ڕوو وەرئەگێڕن لەو بڕوایەی كە ئێوە هەتانە وە بە قسەتان ناكەن ﴿فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ﴾ ئەوا ئەوانە هەر لە دژایەتیەكی گەورەدا ئەبن بەرامبەر حەق‌و ڕاستی، وە ئەوانە دوژمنی حەق‌و ڕاستی‌و ڕێنموونی خوان.

بە ڕاستی ئەم فەرموودەیە، وە ئەم شایەتیە لەلایەن خواوە، شادمانی‌و شانازی بەدی ئەهێنێ لە دڵی بڕوادارادا بەو بارو ڕێگەی كە لەسەریەتی، چونكە ئەزانێ كەواتە هەر خۆی لەسەر ڕێی ڕاستەو ڕێنموونی خوای وەرگرتووە، وە ئەوانەی كە بڕوا ناهێنن دژو دوژمنی حەق‌و ڕاستین، وە هەركەسیش وابێ هەر خۆی بەش بڕاوو زیان بارە، ئینجا دڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەداتەوەو دڵ ئارامی ئەكات بەرامبەر دوژمنانی‌و پیلان‌و بەربەرەكانێی ئەو بێبڕوایانە، بەوەی كە خوا چارەسەری ئەوانەی بۆ ئەكات‌و ئەمەو ئایینەكەی زاڵ ئەكات، وە بەو دڵخۆشی دانەوە بڕوادارانیش دڵئارام بوون‌و باكیان نەما، ئەفەرموێ: ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئینجا بێگومان خوا چارەسەری پیلان‌و دژایەتی‌و دوژمنایەتی ئەو بێبڕوایانەت بۆ ئەكات، واتە هەر بەرگریەكت بكەن بە هیچ دەرئەچێت‌و تۆو ئایینەكەت زاڵ‌و سەركەوتوو ئەبن! ئەوەندەی پێ‌نەچوو خوای میهرەبان ئەو بەڵێنەی بەدی هێنا، بە دەركردنی (بەنی نەزیرو بەنی قەینوقاع) لە مەدینە، وە بە كوشتن‌و بەدیل گرتنی (بەنی قورەیزە) ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ وە هەر خوا بیسەری زانایە، واتە لە ڕووی ڕاستیدا هەر ئەو بیسەری زانایە، یا بیسەری زانایە بە هەموو شت‌و بە هەموو ئاشكراو نهێنییەك، ئەم فەرموودەیە یا بۆ دڵنیا كردنە لەسەر ئەو بەڵێنەو بەهێز كردنیەتی لە دڵدا، واتە ئەی پێغەمبەر خوا بیسەری داواو

نزاته، واته زانایه به نیازو مەبەستت، کەواته ئەتگەیەنێ بە مەبەستو ئامانجی خۆت، یان مەبەست هەڕەشە کردنە لە بێبڕواکان، واتە خوا بیسەری قسە ڕاستو ناڕەواکانیانەو ئەوەی کە دەری ئەبڕن، وە زاناو ئاگایە بە نیازو کینەو دوژمنایەتیان بۆ بڕواداران، کەواتە تۆڵەیان لێ ئەسێنێ، ﴿صِبۡغَةَ ٱللَّهِ﴾[1] واتە بڵێن: خوا ڕەنگی کردینو ڕازاندینیەوە بە ڕەنگی خۆی، بەم ڕەنگە بڕوا هێنانەی کە باسکراو بە ئایینەکەی خۆی جوانو ئارایشتی کردینو ئەو بڕوایە تێکەڵی دڵو دەروونو هەستمان بوو بە جۆرێ بەرهەمو دروشمو نیشانەی پێمانەوە دیارە، بەوێنەی پۆشاکێ کەبە ڕەنگکردن جوان ئەبێتو ئەو ڕەنگە تێکەڵی ئەبێتو پێیەوە دیارە، هەندێ ئەفەرموون: مەبەست لەم وتەو دەربڕینە هاوتایی و هاو وێنەییە بۆ باوکی نامەدارەکان کە منداڵی خۆیان ڕەنگ ئەکرد بە ڕەنگێکی تایبەتی و ئەیانکرد بە نیشانە لەسەر ئەوەی  کە ئەو منداڵە یەهودی تەواوە، یان نەسرانی تەواوە، لەسەر ئەم ڕایە واتە بڵێن: خوا ئێمەی ڕەنگکرد بە ڕەنگی خۆیو ئێمە بە ڕەنگی ئێوە خۆمان ڕەنگ ناکەین، ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗ﴾ ئایا کێ شیرین تر بێت لەبارەی ڕەنگکردنەوە لە خوا، واتە ڕەنگکردنی خوا لە هەموو ڕەنگکردنێك شیرین ترە ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ﴾ واتە بڵێن: ئێمە بڕوامان هێنا بە خواو بەوانەی کە باسمانکرد، وە ئێمە هەمیشە هەر بۆ خوایە گوێڕایەڵو ملکەچینو هەر ئەو ئەپەرستین بە تەنهاو هیچکەسو هیچ شتێ ناکەین بە هاوبەشی، واتە وەکو ئێوە نینو وەك ئێوە ناکەین ئەی نامەدارەکان، ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بەتەواوی دەم کوتیان بکات لە لافو گزافەکانیاندا، بەڕوون کردنەوەی هەڵوێستو بیروبڕوای موسڵمانەکان کە بە هیچ کلۆجێ دەست نادەن بۆ گیرو گرفتو سەر لێکردنەوەو دەم بازی تیا کردن، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ﴿أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ﴾ ئایا ئێوە بەربەرەکانی و موجادەلەو شەڕە قسەمان لەگەڵ ئەکەن لەبارەی خواو لە ئایینی خوادا بەو لافو گزافانەی کە لێی ئەدەنو ئەڵێن، وەك ئەوەی کە لاتان وایە پێغەمبەرێتی هەر بۆ گەلی ئێوە شیاو ترەو نەبێ تایبەتی بێت پێتانەوە؟ وە هەروەها ئەو چەند لافانەی کە لەم سورەتەدا باسکران،

---

[1] ئەم ئایەتەو مەبەست لەم وتەیە بە چوار پێنج شێوەی تر باسکراوەو تەفسیر کراوە، وە ئەو جۆرو تەفسیرانەش هەر ئەگونجێنو ڕێکن، بەڵام ئەوەی کە لە تەفسیرەکەدا وتراوە دڵ پێی بە ئارام ترەو لە دڵدا دامەزراو ترە، وە زانین بە ڕاستی هەر لای خوایە.

وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ وَلَنَآ أَعۡمَـٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَـٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمۡ تَقُولُونَ إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ
وَإِسۡمَـٰعِيلَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَـٰرَىٰۗ قُلۡ ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ
وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَـٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٠﴾

---

﴿وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ﴾ لەكاتێكدا كە ئەو خوایە پەروەردگارو خاوەن و كاربەدەستی ئێمەیش و ئێوەیشە، بەبێ هیچ جیاوازی و زیادە پەیوەندیەك، وە ئەو خوایە زاناو ئاگایە بە تەگبیری بەندەو دروستكراوەكانی و خۆی ئەزانێ كام شایستەو شیاوی چییە، كەواتە بەچی ئێوە ئەو لاف و گزافانە لێ ئەدەن؟ ﴿وَلَنَآ أَعۡمَـٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَـٰلُكُمۡ﴾ وە لە كاتێكدا هەر بۆ خۆمانە كردەوەكانی خۆمان و پرسیار لێكراوین لەسەریان، وە هەر بۆ خۆتانە كردەوەكانی خۆتان و پرسیار كراون لێی ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ﴾ وە لە كاتێكدا ئێمە پاك و خاوێن كەری ئاین و كردەوەكانمانین بۆ خوا بە هیچ هاوبەش و وێنەیەك، بەڵام ئێوە هاوبەش و وێنەی بۆ بڕیارو ڕەوا ئەدەن، كەواتە بە هیچ ڕەنگ ڕێگەتان نییە دەمە دەمێمان لەگەڵ بكەن بەو لاف و گزافانە، چونكە خوا خوای هەردوو لامانە وەك یەك، وە هەردوولا وەك یەك بەندەین بۆ ئەو خوایە، وە ئێمە ئەمەشمان زیادە لە ئێوە كە ئاین و كردەوەكانمان هەر بۆ خوایە بە پاك وخاوێنی، كەواتە ئێمە شیاو شایستە ترین بەو بەهرەیانەی كە ئێوە بۆ خۆتانی دائەنێن و لافی پێوە لێ ئەدەن، وە بێجگە لەوەش ئەمەی كە وترا هەڵوێست بیرو باوەڕی موسڵمانانە، دەی كەی هیچ كام لەمانە جێگەی قسەو باس و سەر لێكردنەوەو موجادەلەیە؟ بێگومان هەركام لەو سێ شتە جێگای قسەو باس نین و ئاشكرایە ڕاستیان، جا لەبەر ئەوە وازی لەوانە هێناو گواستیەوە بۆ مەسەلەیە تر كە ئەویش هەر جێگەی قسەو باس و دەم بازی نییە، وە سەرزەنشتیان ئەكات لەسەر ئەو قسە بێ جێیەش و بێزاری دەرئەبڕێ لێیان لەسەر ئەوە: ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ تَقُولُونَ﴾ ئەی ئایا ئێوە ئەڵێن: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَـٰعِيلَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَـٰرَىٰۗ﴾ كە بێگومان (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و (یەعقوب)و نەوەكان، جوولەكە بوون یان نەسرانی؟ لەكاتێكدا كە ئەوانە لە پێش (موسا)وە هاتن و ڕۆشتن، وە لە پێش

داهاتنی یەهودێتی و نەسرانێتی دا ئەوان هاتن بە ئاینی ئیسلام کە خوا شایەتی دا لەسەر ڕاستییەکەی، وەك باسکرا لە ئایەتەکانی پێشوودا، کەواتە جوولەکەو گاورەکان شتێ ئەڵێن کە دژو پێچەوانەی قسەو هەواڵدانی خوایە، وە ئەوانە کە قسەو وتراویان دژو پێچەوانەی قسەو هەواڵی خوا بێت، هەر شیاوی ئەوەن کە بە لاقرتی پێکردن و بێزاری دەربڕینەوە ئەم شێوە پرسیارانەیان ئاراستە بکرێ کە خوا لێرەدا فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿قُلْ﴾ بڵێ بەوانە ﴿ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ ئایا خوا زانایە یان ئێوە؟ ئەی خوا زانایە کە شایەتی ئەدات بەوەی کە (ئیبراهیم) نە یەهودی بووەو نە نەسرانی، بەڵکو موسڵمانێکی لادەر بووە لە هەموو شتێ تر بۆ لای ئیسلام، وە بە هیچ ڕەنگ هاوبەشی بۆ خوا ڕەوا نەداوە؟ بێگومان ئەم شێوە پرسیارە وەڵامی ناوێ، وە سام و هەیبەتی لاقرتی و بێزاری دەربڕینەکە دەم و زوبان ئەبەستێ لە وەڵام دانەوە! ئینجا دەست نیشان ئەکات بە سەرزەنشتێ ترو لەکەدار کردنیان بە تاوانباری و هەڕەشەیان لێ ئەکات لەسەر ئەوەی کە شتەکە ئەزانن و ئەیشارنەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ ئایا کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە شایەتیەکی لابێ کە لەلایەن خواوە درابێ و ئەویش بیشارێتەوە؟ واتە ئێوە هەرچۆنێ ئەزانن کە ئیبراهیم و ئەوان لەسەر میللەتی ئیسلام بوون و لە پێش یەهودێتی و نەسرانێتییەوە هاتن، هەرچۆنێ ئەوە ئەزانن، هەروەها شایەتیەکیشتان لایە لە نامەکانتاندا بۆتان هاتووە کە لە دواییدا خوا پێغەمبەرێ ڕەوانە ئەکات لەسەر ئاین و میللەتی (ئیبراهیم)، بەڵام ئێوە ئەو شایەتییە ئەشارنەوە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وە بێگومان خوا بێئاگا نییە لەوەی کە ئێوە ئەیکەن.

بە ڕاستی ئەبوایە بەم جاڕ لێدان و هەڕەشەیە بکەوتنایەتە بیەو دڵەلەرزەو بە ڕاستی و بەبێ پێچ و پەنا ئەوەی کە شاردبوویانەوە دەست بەجێ دەریان خستایەو موسڵمان بوونایە، خوا پەنامان بدات لە سەرکەشی و عیناد.

لەپاش ئەوەی کە بە تەواوی دەم کوتی کردن و مەسەلەکەی بە باشی ڕوونکردەوە، وە باسی کرد جیابوونەوەو جیاوازی (ئیبراهیم)و ئەوان لە نامەدارەکانی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) وە پچڕانی پەیوەستی ئەمان لەوان.

لەپاش ئەوە ئینجا ئایەتەکەی (١٣٤)دووبارە ئەکاتەوە بۆ دڵنیا کردن لەسەر پچڕانی ئەو پەیوەستیەی کە ئەوان کەشخەیان پێوە ئەکرد، وە لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا بە درێژی باسمانکرد با سەرنج بدرێ‌و ئیتر لێرە هەر ئایەتەکە دووبارە ئەکەینەوە: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ صدق الله العظيم.

تەواو بوو بە یارمەتی خوای میهرەبان تەفسیری ئەم جزمی یەکەمە لە ٨ی رەجەبی ١٤٠٤ خوا بە بەزەیی وەری گرێ‌و سوود بەخشی بکات بۆ برا موسڵمانەکان، وە یارمەتیم بدا بۆ ئەوەی کە ماوە. داواکارم خوا نەمکوژێ تا ئەم تەفسیرە تەواو ئەکەم.

وصلي الله وسلم علي خير خلقه محمد وعلي آله وصحبه إلي يوم الدين.

مەبەستی گرنگ‌و سەرەکی ئەم جزمە پێگەیاندن‌و ئامادەکردنی کۆمەڵ‌و گەلی موسڵمانان بۆ هەڵگرتنی سپارەی هەرەگەورە، سپاردەی ئەم ئایین‌و عەقیدەیە، وە سپاردەی جێنشینی لەم زەویەدا بەناوی ئەم ئایین‌و عەقیدەیەوە، جا بەو بۆنەیەوە ناو بەناو ئەدوێ لە دوژمنەکانی ئەم گەل‌و کۆمەڵە، لە پێش هەموویانەوە ئیسرائیلیەکان کە زۆربەی باسەکانی جزمی یەکەم ئەگەڕایەوە بۆ لای ئەوان لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەوان.

مەبەستی گرنگ و سەرەکی ئەم جزمە پێگەیاندن و ئامادەکردنی کۆمەڵ و گەلی موسڵمانان بۆ هەڵگرتنی سپارەی هەرەگەورە، سپاردەی ئەم ئایین و عەقیدەیە، وە سپاردەی جێنشینی لەم زەویەدا بەناوی ئەم ئایین و عەقیدەیەوە، جا بەو بۆنەیەوە ناو بەناو ئەدوێ لە دوژمنەکانی ئەم گەل و کۆمەڵە، لە پێش هەموویانەوە ئیسرائیلیەکان کە زۆربەی باسەکانی جزمی یەکەم ئەگەڕایەوە بۆ لای ئەوان لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەوان.

ئەدوێ لە پیلان و جەنگ و ئاژاوەیان لەگەڵ ئەم گەلە موسڵمانە بۆ نەهێشتنی خۆیان و عەقیدەو ئایینەکەیان، وە پەندو ئامۆژگاری ئەم ئوممەتە ئەکات بۆ بەرەنگاری کردنی ئەو جەنگ و ئاژاوە جۆر بە جۆرانەو بەهەڵست وەستانیان، وە بۆ خۆپاراستن لەلادان لە ڕێگە ڕاپتەکەی خوا، وە لە هەڵخلیسکان لێی بەوێنەی جوولەکەکان لەپێش ئەماندا.

ئەیەوێ ئەم گەلە ئامادە بکات و پێی بگەیەنێ بەو ڕەوشت و کردەوەو نیشانانەی کە پێویستن بۆ گەلە جێنشینە، وەهەوێ سەربەرستی و سەربەخۆیی بن بۆی، کە مایەی گرتنە دەستی جڵەوی ژیان و جیهانیانە، ئینجا سەیر تر لە هەموو شت لێرەدا ئەوەیە ئەو پەندو ئامۆژگاریانەو ئەو ڕەوشت و کردەوانەی کە ئەم قورئانە هێنای بۆ پێك هێنانی یەکەم تاقم و چینی ئەم میللەتە، هەر ئەوانە بەکار دێن لە هەموو چەرخ و وڵاتێکا بۆ پێك هێنان و دووبارە کردنەوەی یەك چین و تاقم کەیەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا!!! وە هەروەها ئەو بەرەنگاری و بەربەرەکانێیەی کە قورئان پێی هەڵسا بەدژی دوژمنەکانی یەکەم چین و تاقم، هەر ئەو جۆرو شێوەیە بەکەڵکەو بەکاردێت لە هەموو چەرخ و وڵاتێکدا، هەرچۆنێ دوژمنەکانی لە هەموو چەرخ و وڵاتێکداو بۆ هەموو تاقم و چینێ هەر ئەوانەی یەکەم جارن لە ڕاستیدا، وە پیلانەکان هەر ئەوانەی یەکەم جارن، شێوەو دیمەنەکانیان گۆڕاوە، بەهۆی گۆڕانی باوی چەرخ و ڕۆژەوە، وە گەل و میللەتی موسڵمان لەهەموو چەرخ و وڵاتێکدا، لە جەنگ و بەربەرەکانێدا پێویستی بە پەندو ئامۆژگاریەکانی قورئان و ئەو ڕێ و ڕچەیە هەیە کە ئاراستەی یەکەم تاقمی کردو بۆی دیاری کردن، هەرچۆنێ پێویستن بە پەیڕەوی کردنی قورئان کارو فرمانەکانی تری دا.

بەکورتی ئەبێ قورئان پێشەوای ئەم ئوممەتەبێت، وە جڵەوو سەرکردایەتی ژیانی هەر بەدەست قورئانەوە بێت، وە قورئان ڕێنیشاندەرو دەست ڕاکێشی بێت لە ڕێی ژیاندا، وە قورئان سەرچاوەو دەستووری هەمیشەیی بێت کەلە بەرنامەی ژیانی لێوە وەرگرێ، وە ڕژێمی گەل‌ویاسای ڕەوشت‌وکردەوەویاسای هاوکاری لەگەڵ جیهان‌وجیهانیان هەموو میری دەوڵەتان لەودەستوورەهەتاهەتاییەوەرگرێ کەبێجگە لەوە پڕە لە هەڵەو زیان، جا لەبەرئەوە قورئان هەمیشە تەڕو تازەیەو هەرگیز کۆن نابێ، وە هەمیشە گەورەترین موعجیزەی خوایەو بەوێنەی خۆر ئەدرەوشێتەوەو درەخشانە بە ئاسمانی ڕێنموونیەوە هەتا هەتایە!!

هەرچەندە هیچ ئایەتێك نیە کە باسی ڕووگەی (قیبلە) موسڵمانەکان بکات بۆ چەرخی مەککەیان، بەڵام لە چەند ڕیوایەتێکەوە وەرئەگیرێ کەلەو چەرخدا ڕوویان ئەکردە کەعبە، ئینجا پاش کۆچ کردن بۆ مەدینە ڕوویان ئەکرد (بیت المقس) کە دیارە ئەوەش لە سەر فەرمانی خوا بووە، ئیتر بالە قورئاندا نەهاتبێت، وەلەسەر ئەو بارە مانەوە تا ماوەی شانزە یان حەڤدە مانگ، هەرچەند ئەو ڕووکردنە لەدڵی عەرەبە موسڵمانەکاندا قورس‌و بەئەرك بوو، چونکە دڵیان بەسترابوو بە کەعبەوە کە جێگای شانازی بوو بۆیان لەباوك‌و باپیریانەوە، تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ)، هەرچەندە بەدەم هیچی نە ئەفەرموو، وە داوای گۆڕینی ڕووگەی نەئەکرد، لەبەر شەرم کردن لە خوا، بەڵام چاوی بەرەو ئاسمان بوو چاوەڕوانی ئەکردو بە تەمای ئەو گۆڕینە بوو تا خوا بۆی کرد، وەلەو ماوەیەدا جوولەکەکان دەمیان بەرەڵاکردو ڕووکردنی موسڵمانەکانیان بۆ (بیت المقدس) ئەگرت بەدەستەوەو پڕوپاگەندەیان پێ ئەکرد بۆ خۆیان‌و دژی موسڵمانەکان، ئەیان ووت: ڕووکردنی ئەوان بۆ ڕووگەی ئێمە بەڵگەو نیشانەیە لە سەر ئەوە کە ئایینەکەی ئێمە ڕاستە، وە ئەوان لە ڕووگەدا پەیڕەوی ئێمە ئەکەن ئەبێ لە هەموو شتێ تریش دا هەر پەیڕەویمان بکەن، کەواتە ئەبێ ئەوان بگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە نەك بانگی ئێمە بکەن بۆ موسڵمان بوون، وە موسڵمانەکان بەو پڕوپاگەندەیە زۆر دڵگران ئەبوون، ئینجا کاتێ موسڵمانەکان ـ لەسەر فەرمانی قورئان ـ ڕوویان کردە کەعبەو گێڕایان بە ڕووگە، کاتێ ئەوە ڕوویدا بە جارێ جوولەکەکان کەوتنە فاك‌و فیك‌و هێرش‌و پڕوپاگەندە بۆ تێك دانی ڕیزی موسڵمانەکان‌و بێ‌ئارام کردنی

دەروونیان‌و دوو دڵ کردنیان لە ئایین‌و عەقیدەکەیاندا... ئەیانگوت بە موسڵمانەکان: ئەگەر ڕووکردنی لەمەو پێشتان ناڕاست‌و بەتاڵبووبێ، ئەبێ نوێژەکانی ئەو ماوەیەتان نادروست‌و بەتاڵبووبێ، وە ئەگەر ڕاست‌و ڕەوا بووبێ ڕووکردنی تازەتان ناڕاست‌و ناڕەوابێت‌و نوێژەکانی ڕوو بە کەعبە نادروست‌و بەتاڵ بێت... بەهەرحاڵ نابێ ئەم گۆڕینی فەرمان‌و ئایەتانە لە خواوە هاتبێ، کەواتە ئەبێ محمد سروشی لە خواوە بۆ نەهاتبێ ـ نەفرینی خوا لە جوولەکە، وە بەڕاستی ئەو هێرش‌و پڕوپاگەندەیە زۆر بەهێزو بەیتن بوو، وەك دەرئەکەوێ لەوەی کە قورئان زۆر بە گرنگ ئەم مەسەلەی گۆڕینەی بە گرنگ گرت، ئەوەتا لەسەرەتای ئەم جزمەوە تا ئایەتی (١٥٢) خەریك پێیەوە، بێجگە لەوەی کە لەبەشی چوارەمی جزمی یەکەمەوە خەریکە بنەوان ئەبەستێ‌و سەرەتا دائەمەزرێنێ بۆ ڕاست‌و ڕەوایی سڕینەوەی هێندێ لە فەرمانەکان کە ئەم گۆڕینی ڕووگەیە بەشێکە لەوانەو بەرهەمی ڕاستی‌و ڕەوایی ئەو سڕینەوەیە، ئینجا چاك وایە پێش دەست کردن بە تەفسیری ئایەتەکانی هێندێ بدوێین لەبارەی پێویستی ڕووگەو گۆڕاندنیەوە، چونکە ئەو گۆڕاندنە ڕووداوێکی گەورە بوو لە مێژووی گەلی موسڵماندا، وە چەند بەرهەمی گرنگ لێ پەیدا بوو لە ژیانیاندا، بێگومان بوونی ڕووگەو یەکێتی ڕووگە هۆی یەکێتی گەل‌و میللەتە، وە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی سەربەخۆییان، وە مایەی کۆکردنەوەی هۆش‌و هەست‌و نیازیانە لەکاتی ئەو خواپەرستیەی کە ڕووگەی بۆ دانراوە، وە بەو ڕووکردنەیان خواپەرستیەکەیان بە یاساو ڕژێم ئەڕوا بەڕێوە، بێجگە لەوانەش لەکاتی نوێژو خواپەرستیدا ئەبێ دڵ ڕووبکاتە خوا، کەواتە با لەشیش ڕووبکاتە شوێنێ کە خوا فەرمان بدات‌و دیاری بکات بۆ ڕووتێکردن، ئینجا ڕووکردنی موسڵمانان لە چەرخی مەککەداو لە یەکەم جارەوە بۆ کەعبە شتێکی زۆر بەجێیەو جێگەی سەر لێ کردنەوەی نیە، چونکە کەعبە پیرۆزترین ماڵی خوایە لەسەر زەویدا، وە لەبەر فەرمانی خوا دروستکرا بۆ ئادەمی‌و هەر لە یەکەم جاری دروست کردنیەوە کرا بە ڕووگەو شوێنی خواپەرستی، وە لە چەرخی نەفامی‌و بت پەرستیش هەر بە ماڵی خواو پیرۆزترین ماڵ سەیر کراوە، کەواتە کاتێ کە ئیسلام هات‌و لەیەکەم جاریشەوە لە مەککە هەڵهات، زۆر ڕێك‌و بەجێبوو موسڵمانان ڕووبکەنە ئەو ماڵە پیرۆزە، بەڵکو

ڕووتێنەکردنە ئەبوو بە مایەی زیادە دوژمنایەتی ئەو بت پەرستانەو دوور خستنەوەو تاراندنیان وترازاندنیان لەئیسلام، ئینجاگۆڕاندنی ڕووگەلە کەعبە بۆ (بيت المقدس) لە یەکەم جاری چەرخی مەدینەوە ئەویش هەر زۆر ڕێكو ڕاستو پڕ لە بەرژەوەندی بوو، چونکە:

یەکەم: ئەو گۆڕاندنە بوو بە تاقی کردنەوەو هۆی دەرکەوتنو جیا بوونەوەی گوێ ڕایەڵو شوێن کەوتووەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەیاخیو هەڵگەڕاوان، وەك لەمەو پاش لە ئایەتەکەدا دەست نیشانی بۆ ئەکاتو بەدرێژی ڕوونی ئەکەینەوە بە یارمەتی خوا.

دووەم: بەو گۆڕاندنە دەرکەوت کە ئەم ئایینی ئیسلامە بەڕاستیو پاکی بۆ خوایەو بە هیچ ڕەنگ ڕەگەزایەتی تیا نیە، ئەوەتا موسڵمانەکان کەلەو سەردەمەدا عەرەب بوونو کەعبە مایەی شەرەفو شانازی خۆیانو بابو باپیریانەو زۆربەشیان پەروەردەو پێگەیشتووی دەورو بەری بوون: ئەو موسڵمانانە ئەو ڕووگەیان گۆڕی بۆ (بيت المقدس) کە زۆر دوور بوو لێیانەوەو بەهێنی ئەوان دائەنراو بە ڕوواڵەت هیچ پەیوەندیان نەبوو پێیەوە.

سێیەم: ئەو گۆڕاندنە دەست نیشان بوو بە یەکێتی ئایینەکانی خوا، ئەوەتا موسڵمانەکان جیاوازی ناخەنە بەینی کەعبەو (بيت المقدس).

چوارەم: گێڕانی (بێجگە المقدس) لەو کاتو چەرخەدا دەم بەستنی جوولەکەکانی مەدینەی تیابوو وە کوژانەوەی بڵێسەی کینەو کێشەیان، وە ئەبوایە ببوایە بە هۆی دڵ نەرم کردنو ڕاکێشانیان بۆ ئیسلام، کەچی بە پێچەوانەی ئەوەوە بە پێی سروشتی پیسیان، بوو بە هۆی دەم کردنەوەو فیكو فاکیان، ئەوەبوو ـ وەك لە پێشەوە باسمان کرد ـ ئەیانگوت: ڕووکردنی محمدو شوێنکەوتوانی بۆ ڕووگەکەی ئێمە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئایینەکەمان، کەواتە هەرچۆنێ لە ڕووگەدا شوێنمان کەوتوون، با لە هەموو شتێکدا هەروابن، وە ئەوان مافی ئەوەیان نیە ئێمە بانگ بکەن بۆ ئایینەکەیان، بەڵکو ئێمە شایانین بە بانگ کردنی ئەوان! ئینجا لەپاش ئەوەی کە بەو گۆڕاندنە تاقی کردنەوەکە بەدی هاتو موسڵمانە ڕاستەکان بەبێ سەر لێ کردنەوە شوێنی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) کەوتن، وە ڕوویان کردە ڕووگەی تازە، وە لەپاش ئەوەی جوولەکەکان دەستیان کرد بەو دەم درێژی کردنە، وە لەپاش ئەوەی مەبەست لەو گۆڕانە بە تەواوی بەدی هات، ئینجا فەرمان هاتە خوارەوە بە

گەڕاندنەوەی موسڵمانان بۆ ڕووگە سروشتیەکەی خۆیان و ڕوو بکەنەوە ئەو ماڵەی کە (ئیبراهیم)ی باوکی هەمووان دروستی کرد لەسەر فەرمانی خوا بۆ ئادەمیزاد، بۆئەوەی ببێتە شوێنی کۆبوونەوەو هات و چۆو گەڕاندنەوە بۆلای، وە بۆئەوەی ببێت بە کەلەپوور بۆ ئەو گەل و میللەتە موسڵمانەی فەراهەم هات لەسەر نزاو لاڵەی (ئیبراهیم)، وەك لە پێشەوە باسمان کرد لە تەفسیری ئایەتەکانی ڕابردوو لە جزمی یەکەم دا، بەڵێ بە ڕاستی گێڕانی کەعبەیە ڕووگەی هەمیشەیی و هەتا هەتایی بۆ گەل و میللەتی موسڵمان لە پاش ئەو ماوەی کە ڕووکرایە (بيت المقدس)و مەبەست لەو ڕوو کردنە بەدی هات، شتێکی سروشتیەو ڕێك و پێکە لەگەڵ بارو حاڵی ئەم میللەتە کە کەلەپوور بەری (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)ن لە ئایین و لەو بەڵێن و پەیمانەی کە خوا دای بە (ئیباهیم)، بەڵێ بەڕاستی هەر ئەوە ڕێك و بەجێیە کە ئەم گەل و میللەتە موسڵمانە ببێ بە کەلەپوور بەر بۆ ئەو ماڵی خوا لە مەککەدا، ئەوە بکات بەو ڕووگە تا لە هەموو شتێکدا ببێ بە میرات و کەلەپوور بەرو جێنشینی (ئیبراهیم)، بۆ ئەوەی لە هەموو شتێکداو لە هەموو شێوەو دروشمێك دا جوێ ببنەوە لە (ئیسرائیل)ی یەکان کە لایاندا لە (ئیبراهیم)و بەشداری ئەمانیان نەکردو خۆیان جوێ کردەوە، بێگومان تایبەتی و جوێ بوونەوەی ئوممەتی موسڵمان هەرچۆنێ پێویستەو ناچاری هەیە بۆی لە بۆچوون و بیروباوەڕو عەقیدەدا، هەروەها پێویستەو ناچاری هەیە پێی لە شێوەو دروشمی خواپەرستی و ڕووگەشدا، چونکە ئادەمی ـ کە پێك هاتووە لە لەشێکی ئاشکراو گیانێکی نهێنی ـ بەسروشت و مەیل و ئارەزووی هەیە بەدەرخستنی هەستە دەروونیەکانی کەنهێنین، بە چەند شێوەو دروشمێك کە ئاشکران تا ببن بە نیشانە لەسەر ئەو هەستە دەروونیانەی، وە ئەو شتە دەروونیانە ئارام ناگرن و دانامەزرێن هەتا بەو شێوە دەرنەخرێن، وە هەرکات بەو شێوە دەرکەوتن ئەو حەلە ئارام ئەگرن و ئارەزووی مەردوم ئەشکێ، وە لەش و دەروون مەبەست و داخوازیان بەدی دێت جا لەبەرئەوە لەسەر ئەو بنەڕەتە سروشتیە ئیسلام ئەو نیشانەو دروشمە خواپەرتیانەی داهێناو دایمەزراند، ئەوەتا تەنها نیازو ڕووکردنێکی ڕۆحی و دەروونی وازی نەهێنا بەڵکو لە نوێژدا ڕووکردنە ڕووگەو هەستان و خوێندن و ڕکوع و سوجدەو... هتد دانا تا نیشانە بن لەسەر ئەو پەرستن و ڕووکردنە ڕۆحی و دەروونیە،

وە هەروەها لە ڕۆژووو حەج و عیبادەتەکانی تردا، بۆ هەرکان چەند کردوەو بولآنەوەیەکی دانا و بڕیاری دا، بۆ ئەوەی نهێنی دەروون ڕێك بخات لەگەڵ دیمەن و ڕواڵەتیدا، وە داخوازی سورشتی بەجێ بێنێ بەجۆرێ ڕێك بێت لەگەڵ بۆچوونی تایبەتی بڕوادارەکەدا، ئەگەر ئیسلام ئەو شێوەو دروشمانەی دانەنایە مەردوم بەپێی مەیل و ئارەزوو سورشتیەکەی نیشانەو شێوەی بۆ هەستە نهێنیەکانی دائەنا ئەو کاتە بەناڕاست و ناڕەوا دەرئەچوو، وەك ئەو هەموو بت پەرستانە کە هەر تاقمێ شتێکی بۆ خۆی دانا و کردی بە دروشم و نیشانەی هێزی هەرە گەورە کە بەسروشت لە دەروونی خۆیدا هەستی پێ ئەکات و ئەیەوێ لە شێوەی شتێکی ئاشکرادا دەرکەوێ، ئیتر ئەستێرە، خۆر، مانگ، دار، بەرد، گیان لەبەرو هەرشتێ‌تر... بەڵام ئێستا بەدانانی ئەو نیشانەو شێوە خواپەرستیانە، لەلایەکەوە مەیل و ئارەزووە سروشتیەکەی بەجێ ئەهێنێ، وەلەلایەکی ترەوە بڕوادار ئەپارێزێ لە هەڵەکردن لە پەرستنی خواو لادان بەو بارو حاڵەی کە خوا پێی خۆشەو شایستەیە بۆ خوا.

بەم ڕەنگەخوای پێ‌ئەناسێ بە پاك و بێگەرد لە هەموو هاوبەش و وێنەیەك وە ڕووگەیەکی بۆ دیاری کردووە کەلەسەر فەرمانی خوا ڕووی تێ‌بکات کاتێ کە بەدڵ بە هەست و نیازو بەکردەوە ڕوو ئەکاتە خوایەك کە بێ وێنەو بێ جێگا و بێ شوێنە، کەواتە بڕیاردانی ئەم شێوە خواپەرستیانەو دیاری کردنی ڕووگە بۆ بەرژەوەندی بڕوادارەکان و بڕواداران زۆر پێویستن پێی و بەبێ ئەوانە موسڵمان کیان و سەربەخۆییەکی جیاوازی بۆ پەیدا نابێ کە ئەو کیان و سەربەخۆییە تایبەتی و جیاوازەش زۆر پێویستە بۆوە لەبەر بەهێزکردن و پاراستنی ئەوکیان و سەربەخۆییە موسڵمانان جڵەوگیری کراوە لە لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی تا موسڵمان لەسەر ڕەوشت و کردارێك دا کە تایبەتی بێت بە نا موسڵمانەوە، وە ئەو جڵەو گیریەش لەبەرئەوە نیە کە ئیسلام ڕەگەزایەتی بەکابهێنێ یا ڕەگەزایەتی ڕەوابدا، نەخێر نەوەڵڵا ئیسلام دوورە لەوە، وە تەنها ئیسلام ئەتوانێ ڕەگەزایەتی لە ڕیشە دەربێنێ بەڵکوئیسلام لەوەدا زۆر ئەیەوێ پاراستن و بڵاوکردنەوەی ئەو بەرزترین بەرنامەیە کە هێنای بۆ هەموو ناوچەکانی ژیان، وە بێ‌گومان ئەو مەبەستە گرنگەش بەو تێکەڵ و

پێکەڵیە هەرگیز ناگونجێ‌و بەبێ پاراستنی ئەو کیان سەربەخۆییە بە هیچ ڕەنگ ناکرێ‌و دەست نادا.

ئیسلام ئایینی خوایەو هاتووە بۆ خێرو چاکەی هەمووان‌و جیاوازە لە هەموو بیرو باوەڕو بۆچونێکی تر، کەواتە پێویستە پاراستنی لە هەموو بۆچوون‌و باوو باوەڕێکی تر. ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی گەلی موسڵمان بەو ئیسلامە سەرکردایەتی ژیان‌و جیهان بگرنە دەست‌و ببن بە مامۆستاو فێرکەری هەموو نەزان‌و نەفام‌و وێڵ‌و سەرگەردانێك، دەی کاری واش بە تێکەڵ‌و پێکەڵی‌و شوێن کەوتن‌و لاسایی کردنەوەی ئەم‌و ئەو هەرگیز نابێ‌و ناگونجێ. ئیسلام کە هاتووە بۆ ئەوەی کە تەنها لە خواو لە بەرنامەکەی هەموو شتێ وەرگیرێ، دەی چۆن ئەبێ موسڵمان شوێنی کەسی تر بکەوێ‌و لاسایی ئەو بکاتەوە لەو شتانەی کە تایبەتێن پێیانەوە؟!

ئیسلام دەستەبەرو کەفیلە بۆ ئادەمی بە بەرزترین ئاسۆ لە بۆ چوون‌و تێگەیشتن دا، وە بەڕاسترین بەرنامە لەژیاندا، لەبەر ئەوە بانگی هەموو ئادەمی ئەکات کە بگەڕێنەوە بۆ لای ئیسلام‌و خۆ خستنە ژێر ئاڵاو سایەو پەنای، دەی بێ‌گومان هەموو ژیرو فانداری ئەزانێ کە ئەوە ڕەگەزایەتی نیە داوای یەکێتی ئادەمی بکات لەسەر بناغەو بنەڕەتی خۆی نەك لەسەر بناغەو بنەڕەتی تر، وە لەسەر بەرنامەکەی خۆی نەك لەسەر بەرنامەی تر، وە لە ژێر ئاڵاکەی خۆیدا نەك هەر ئاڵایەکی تر، کەواتە ئەو کەسەی کە بانگی مەردوم ئەکات بۆ یەکێتی لەبڕوا بە خوای هەمووان، وە یەکێتی لەبەرزترین بۆچوون‌و تێگەیشتن دا، وە یەکێتی لە چاکترین ڕژێم دا، وە نایەوێ ئەو یەکێتیە بە پیرۆز بفرۆشێ بە لادان لە بەرنامەکەی خوا، وە خۆ خستنە ناو چاڵی تاریك‌و ڕەشی نەفامی‌و گومڕایی، ئەو کەسە بە هیچ ڕەنگ ڕەگەز پەرست نیە، وە ڕەگەزایەتی بەکار ناهێنێ... یا ڕەگەز پەرستەو ڕەگەزایەتی بەکار ئەهێنێ، بەڵام بۆ خێرو ڕاستی‌و چاکە! دەی خۆزگە بە ڕەگەز پەرستی واو ڕەگەزایەتی ئاوا.

گەل‌و کۆمەڵێ موسڵمان کە ڕوو ئەکەنە ڕووگەیەکی تایبەتی‌و دیاری ئەبێ تێبگەن لە مەبەست بەو ڕووکردنە، بێ‌گومان ڕووگە لە ڕووی ڕاستی دا تەنها شوێن‌و لایەك نیە کە نوێژکەران ڕووی تێ‌ئەکەن، بەڵکو ئەبێ بزانن ئەو شوێن یا ئەو لایە کە کراوە بە ڕووگە هەر

دەست نیشانە، دەست نیشان بە جیاوازیی و تایبەتێتی ئەو گەل و کۆمەڵە، جیاوازیی و تایبەتێتی لە بۆچوون دا، وە لەکیان و سەربەخۆیی دا وە لە مەبەست و ئامانج دا وە لەخەریك بوون بە گرنگ گرتنی کاروباردا. گەل و میللەتی موسڵمانی ئەمڕۆ لە ناو ئەو هەموو بۆچوونە نەفامیانەی کە شەپۆل ئەدات لە هەموو زەویدا، وە لەناو ئەو هەموو مەبەست و ئامانجە نەفامیانەی کەلە هەموو لایەکەوە بەدوای دا ئەگەڕێن، وە لەناو ئەو هەموو خەریك بوون بەو کارو پیشە نەفامیانەی کە دڵی مەردومی داگیرکردووە، وەلە بەینی ئەو هەموو ئاڵا نەفامیانەی کەلە ناو گەل و نەتەوەکاندا بەرزکراونەتەوە... گەل و میللەتی موسڵمانی ئەمڕۆ زۆر پێویستە بەوەی جیا ببێتەوە بە شەخسیەتێکی تایبەتی کە جاوازبێت و تێکەڵی ئەو هەموو شەخسیەتە نەفامیانە نەبێت کە ئەمڕۆ زۆریان سەندووە، وە زۆر پێویستە بە جیابوونەوە بە تێگەیشتن و بۆچوونێکی تایبەتی لە بوون و بوونەوەرو ژیان و ئادەمی کە دوورو جیاوازبێت لە هەموو ئەو تێگەیشتن و بۆچوونە نەفامیانەی کە باون، وە جیابوونەوە بە خەریك بوون و بە گرنگ گرتنێکی جیاوازو دوور لە هەموو خەریك بوون و بە گرنگ گرتنی نەفامیانە کە ڕێك و شایان بێت لەگەڵ شەخسیەت و بۆچوونە تایبەتیەکەی خۆیاندا، وە زۆر پێویستە بە جیا بوونەوە بە ئاڵایەکی تایبەتی کە هەر ناوی خوای هەڵگرتبێ و هەر بەناوی خواوە بێت، تا بە هۆی ئەوەوە بناسرێ لە هەموو جیهاندا بەوەی کە گەل و میللەتێکی جیاوازی میانە و هەڵبژێرراوە خوا هێناویەتی بۆ ئادەمی بۆ ئەوەی سپاردەی خوا هەڵگرێ و هەڵسێ بەو ئەرکە گەورەیە، بێگومان ئەم ئایین و عەقیدەی ئیسلامە بەرنامەیەکی تێرو تەواوە بۆ ژیان، وە ئەم بەرنامەیە ئەو گەل و میللەتە جیا ئەکاتەوە کە جێنشین و جێگرو کەلەپوور بەری هەموو ئایین و شەریعەتە ئاسمانیەکانە، وە کراوە بە شایەت و چاودێر بەسەر ئادەمێتی و هەموو ئادەمیەوە، وە داوای لێ کراوە بەوەی سەرکردایەتی گەلانی جیهان بکات و بانگیان بکات بۆلای خوا، وە بە تەنها بەدی هێنانی ئەم بەرنامەیە لە ژیانی دا ئەو هەموو بەهرەو هونەرەی دەست کەوت ئەبێ و جیا ئەبێتەوە لە هەموو گەل و میللەتەکانی جیهان، وە بەبێ ئەو بەرنامەو بەدی هێنانی، بێ بەشە و لەو بەهرەو هونەرانەو بێ ناوو نیشانە، هەرچەند لاف لێ بدات و ناوو نیشان بۆخۆی دابنێ!

لەپاش ئەم پێشەكیو سەرەتایە كە ڕاستی پێویستە موسڵمانان بە گرنگ بیگرنو بیری لێبكەنەوە، پاش ئەوە ئینجا دێتە سەر ئایەتەكان كەبەدرێژیی باسی گۆڕانی ڕووگەو هۆی گۆڕاندنەكەی ئەكەن، بە جۆرێ ڕەخنە گران دەم كوت ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيۡهَاۚ﴾ نەزانو سوك ئەقڵەكان لە ئادەمی ئەڵێن: واتە جوولەكەكان وەك ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە ئایا چی ئەوانی ـ واتە موسڵمانەكان ـ لادا لە ڕووگەكەی خۆیان واتە (بيت المقدس) كەلەمەوبەر لەسەری بوونو بەرەو ئەوێ نوێژیان ئەكرد؟ واتە لادانەكەیان كارێكی بێجێو بێزراوە، (ئیمامی مالیك)و (بوخاری)و (تیرمزی) حەدیس ئەهێنن لە (بەرای كوڕی عازەب)ەوە ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ كە ئەفەرموێ: یەكەم جار پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەدینەو نیشتەجێ بوو لای خاڵوانی ـ یا گوتی لای باوانی دایكی ـ وە شانزە یا حەڤدە مانگ ڕوولە (بيت المقدس) نوێژی كرد، وە پێی خۆش بوو ڕووگەی بەرەو كەعبە بێت، وە یەكەم نوێژی كە كردی بەرەو كەعبە نوێژی عەسربوو، وە كۆمەڵێك لەگەڵی ئەو نوێژەیان كرد، ئینجا یەكێ لەوانە گوزەری كرد بەلای ئەهلی مزگەوتێكدا كەلە نوێژدابوون، ووتی بەوانە: شایەتی ئەدەم بە خوا كە نوێژم كرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو كەعبە ئەوانیش لە نوێژەكەدا وەرگەڕان بەرەو كەعبە، وە جوولەكەكان زۆر پێخۆشحاڵبوون كەنوێژی بەرەو(بيت المقدس) ئەكرد ـ وەك لەسەرەتاكەدا باس كراـ ئینجا كە پێغەمبەر(ﷺ) لایدا بەرەو كەعبە بێزارو دڵگران بوون بەوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ﴾ ئینجا ئەزانن و بێ سەقیلەكان ـ واتە جوولەكەـ ئایا چی ئەوانی لادا لە ڕووگەكەی خۆیان كەلەمەوبەر لەسەری بوون؟ ئینجا ئایا ئەو پرسیارو بێزاری دەربڕینە لە پێشەوە بووبێ و مەبەست بەم ئایەتە بەرپەرچ دانەوەو دەم كوت كردنی ئەو ڕەخنە گرانە بووبێ، وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرموون، یەكێ لەوانە ﴿فَقَالَ﴾ كە ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هەرچەند لە دانانو خوێندنەوەدا لەپێش ئایەتی داهاتوودایە: ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ﴾، بەلام لە هاتنە خوارەوەدا دوای ئەوكەوتووە، وە وشەی ﴿سَيَقُولُ﴾ بەپێی

ڕواڵەتەکەی نیە کە بۆ داهاتوویێت، بەڵکو بۆ ڕابردووەو لە دیمەنی داهاتوودا نیشانی ئەدات لەبەر نیشان دانی بەردەوامیان لەسەر ئەو ڕەخنە گرتنە، وە بەڵگەیان لەسەر ئەم ڕایە دیمەنو ڕواڵەتی ئەو ڕیوایەتەیە کە هێنامان، ئایا ئەم ئایەتە بەم جۆرەیە کە گوترا! یان هەر بەپێی ڕواڵەتەکەیو بۆ داهاتووەو مەبەست پێی سەرەتایەو ڕێگە تەخت کردنو جاڕدانی گۆڕاندنی ڕووگەیە بە ئایەتی داهاتوو: ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ﴾ وە هەوڵدان بەو پرسیارو ڕەخنەگرتنە لە پێشەوە بۆ ئامادەکردنو ئارام دانە بەدەروونی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەرو بەو پرسیارو ڕەخنەیە با لەناکاودا نەیەتو دەروونی پێ دانەچڵەکێ، وە لەبەر ئامادەکردنی وەڵامو بەرپەرچ دانەوەیان کە ئەوە بەهێزترەو بەکار ترە لەدەم کوت کردنیاندا، وە بێجگە لەوەش ئەو کاتە ئەبێتە هەواڵدان بە شتێکی غەیبی بەدی هاتنی موعجیزەو بەڵگەیەکی ڕوون ئەبێت لەسەر ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ).

زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەم ڕای دووەمەیە، وە دیمەنو ڕواڵەتی ئایەتەکە قۆڵگیریانە لەگەڵ ڕیوایەتی (ئەبو ئیسحاق) عبیدی کوڕی حەمیدو (ئەبو حاتەم) کەلە ڕیوایەتی ئەواندا ئەمەش هەیە کە خوا ئەو ئایەتەی هێنایە خوارەوە: ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾.

بەڕاستی ئەم ڕای دووەمە چاك ئەچێتە دڵەوە دڵ زۆر پێی بە ئارامە، وە ئەگونجێ ڕێك بخرێ لەگەڵ ڕیوایەتە پێشووەکەدا، بەم ڕەنگە ڕووکردنی یەکەم جاری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کەعبە لە نوێژی عەسردا بە ئیلهام بووبێو خوا خستبێتی بە دڵیەوە پێش هاتنە خوارەوەی ئایەتی گۆڕاندن، ئینجا خوا بەم ئایەتە هەواڵی پێدابێ کەلە داهاتوودا ئەو پرسیارو ڕەخنەیە ئەگرن پاش جاڕدانی گۆڕاندن، ئینجا ئایەتی گۆڕاندن هاتبێو پاش ئەوە ئەوان ئەو پرسیارو بێزاریەیان دەربڕیبێ، وە بەم شێوەیە ڕواڵەتی ئایەتەکەو هەردوو ڕیوایەتەکە یەك ئەکەونو دەستەمل ئەبن، وە بێگومان تا دەست بداتو بگونجێ ئەبێ ئایەتو حەدیس یەك بخرێنو دژایەتی نەهێڵرێ لەنێوانیاندا، ئەم یەکخستنە کە باسم کرد هەرچەند لە هیچ تەفسیرێکدا نەم دیوە، بەڵام بەلامەوە ڕێكو پێکەو هیوادارم کە خوا یارمەتیم بدات بۆ هەقو ڕاستیو سوپاسی خوا ئەکەم لەسەری.

﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾

---

لەسەرەھەباروھەر جۆر خوا فەرمانی داو پێغەمبەری (ﷺ) فێرکرد کە وەڵام و بەرپەرچیان بداتەوە بەجۆرێ ڕێی دەم بازیان نەبێت و لەھەمان کاتدا بۆچوونی گشتی ڕوون بکاتەوە بە پاك و خاوێنی لە هەڵەو لاری، ئەفەرموێ: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ هەر بۆ خوایەو موڵکی خوایە شوێنی ڕۆژهەڵات و شوێنی ڕۆژئاوا، واتە هەموو جێ و شوێنەکان دروست کراوو موڵکی خوایەو هەموو یەکسانە بۆ خواو تایبەتێتی خوا نیە بە هیچ جێگایەکەوە، کەواتە هەر جێگەو شوێنێ بکا بە ڕووگە مافی خۆیەتی و کەس مافی هیچ قسەو باسێکی نیە، وە هیچ جێگەو شوێنی خۆی لە خۆی دا هیچ بەهرەو هونەرو باوێکی نیە، بەڵکو بەدەست خوایەو بە خواهیش و هەڵبژاردنی خوایە ﴿يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ وە خوا ڕێنموونی هەرکەس ئەکات کە خۆی بیەوێ بۆ ڕێگەی ڕاست، کەواتە ئەگەر خوا هەر لایەك و هەر ڕووگەیەك هەڵبژێرێ بۆ بەندەکانی هەر ئەو لاو شوێنە چاکەو هەر لەو شوێنەوە ئەڕۆن بۆ ڕێ ڕاستەکەی.

ئا بەو بڕیارو فەرموودەیە ڕوونی کردەوە بۆچوون و تێگەیشتن لە هەموو لاو شوێنەکان، وە ڕوونی کردەوە تاقە سەرچاوەیەك کە ئادەمی بڕیاری لێ وەردەگرن، وە دەری خست کە ڕووکردنی ڕاست و ڕەوا هەر ڕووکردنە بۆلای لە هەموو کات و بەسەرهاتێکدا، ئینجا لەبەینی دوو فەرموودە کە ئاڕاستەی پێغەمبەریان ئەکات (ﷺ) ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەم ئوممەتەو باسی گرنگی خۆی بۆ ئەکات لە بوونەوەردا، وە باسی کارو پیشەی گەورەو بە نرخی ئەکات لەم جیهان و زەویەدا، وە پایەو پلەی بەرزی لەناو ئادەمی و لە ژیانی ئادەمی دا، بەجۆرێ کە پێویستە ڕووگەی تایبەتی جیاوازی هەبێ، وە شەخسیەتی تایبەتی هەبێ، وە گوێ لە کەس نەگرێ و قسەی کەس نەبیستێ بێجگە لەو پەروەردگارەی کە هەڵی بژارد بۆ ئەو کارو فەرمانە گەورەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ ئا بەوجۆرو شێوە گرنگە ئێوەمان گێڕا بە ئوممەتێکی ڕاست و چاك و هەڵبژێرراو عەدل و دادپەروەر ﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی ببن بەشایەت بەسەر گەل و میللەتەکانی تری ئادەمی لە ڕۆژی دوایی دا، شایەتی

بدەن کە پێغەمبەرەکانیان پەیامی خوایان پێ ڕاگەیاندن ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ﴾ وە پێغەمبەریش ـ واتە: محمد ـ چاودێرو شایەت بێت بەسەر ئێوەوە، شایەتی بدات کە ئێوە عالن‌و ڕاست ئەکەن لەو شایەتیەی کە داتان، ئەوەش وەکو لە حەدیسێکدا هەیە کە (ئیمامی ئەحمەد) ئەیهێنێ لە (ئەبو سەعید)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی دوایی دا پێغەمبەری وا دێت کە یەك کەسی لەگەڵە، وە هی وا هەیە دووکەسی لەگەڵە، وە هی وا هەیە زیاتر لەوە، ئینجا گەلەکەی بانگ ئەکرێ‌و پێیان ئەوترێ: ئایا ئەمەی پێ‌ڕاگەیاندن؟ ئەوانیش ئەڵێن: نەخێر، ئینجا ئەوترێ بە پێغەمبەرەکە: ئایا پەیامەکەت ڕاگەیاند پێیان: ئەویش ئەڵێ، ئینجا پێی ئەوترێ: کێ شایەتیت بۆ ئەدات؟ ئەویش ئەڵێ محمدو ئوممەتەکەی، ئینجا محمدو ئوممەتەکەی بانگ ئەکرێن‌و پێیان ئەترێ: ئایا ئەمەی ڕاگەیاند بەوانە؟ ئەمانیش ئەڵێن: بەڵێ، ئینجا بەم ئوممەتە بەچی ئەزانن؟ ئەوانیش ئەڵێن: پێغەمبەرمان (ﷺ) هات‌و وە هەواڵی پێ‌داین کە پێغەمبەران پەیامی خۆیان گەیاند، ئا ئەوەیە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا ﴾، وە لە ڕیوایەتێکدا ئەفەرموێ: ئینجا محمد ئەهێنن‌و پرسیاری حاڵی ئوممەتەکەی لێ ئەکەن وە ئەویش بە پاك‌و ڕاستیان دەرئەکات‌و شایەتی لەسەر عەدالەتیان، وە ئەوەش ئەوەیە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ﴾ بەخ بەخ لەو پایەو پلەو بەهرەیە کە خوا داویتی بەم گەل‌و ئوممەتە، بەڕاستی سوپاسی هەر تەواو نابێ! خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو بەهرەو ڕێزەدا.

ئەمو میللەتە هاتووە بۆ ئەوەی مامۆستاو چاودێربێت بەسەر هەموو گەلانەوە، داد بخاتە ناویانەوەو بەداد بجوڵێتەوە لەگەڵ هەمووانـدا، ئەم سەنگ‌و تەرازوو دابنێ بۆ کێشانەو پێوانەی هەموو شتێ، ئەم نرخ‌و بێ‌نرخی دیاری بکات، ئەم دەم ڕاست‌و بڕیار دەرو لێپرسراوو حەکەم بێت لە هەموو کاروبارێکدا، ئەم ئەبێ بڵێ ئەوە ڕاستەو ئەوە ناڕاستە، ئەوە هەقەو ئەوە ناهەقە... ئەبێ ئەم ئوممەتە ئەو شتانەی بەدەست بێت، نەك ئەو گەلانەی کەلە مەردومەوە بۆ بۆچوون‌و بیروباوەڕ وەرئەگرن‌و بەگەزو ترازووی مەردوم کێشانەو پێوانە ئەکەن. ئەم میللەتە کە ئاوا مامۆستاو چاودێری ئەمەو ئەبێ هەموو شتێ بڕیارو ڕای ئەوی لەسەربێت. ئەم میللەتە میانەیەو ناوەندە لە هەموو شتێکدا: لە بۆچوون‌و عەقیدەو باوەڕدا، بەم ڕەنگە زیادە ڕەوی ناکات لەبارەی ڕۆح‌و پێویستیەکانی ڕۆحەوە، وە نەلە بارەی لەش‌و پێویستیەکانی لەشەوە، بەڵکو بەشی هەردوو بەجێ ئەهێنێ بەبێ زیادەو کەم،

وه هەوڵ و تێكۆشان ئەكات بۆ بەرزكردنەوەی ژیان لەكاتێكدا كە هەوڵ ئەدات بۆ پاراستن و درێژەدان و پەرەپێدانی، وە میانەیەو ناوەندیە لە بیرو هەست و زانین و زانیاریدا، بەم ڕەنگە نایەسترێتەوە تەنها بەسەر ئەوەی كە ئەیزانێ و ئیتر كون و كەلەبەری هەموو بەراوردو زانینی بگرێ، وە نایشچێت بەدەم هەموو دەنگ و بانگ و ئاوازێكەوە، وە وەك مەیموون لاسایی كەرو شوێن كەوتوو نیە، بەڵكو هەر بۆچوون و بەرنامەو زانینێكی لایە دەستی پێوە ئەگرێ و ئینجا چاو هەڵئەخات و سەرنجی هەموو بەرو بەرهەمی بیرو بەراوردێك ئەدات و هەرچی بەكاربێت وەری ئەگرێ، چونكە نیشانەو شیكاری ئەم میللەتە ئەم وتە پیرۆزەیە كە بە ناوبانگە لە ناوی دا: (الحكمة ضالة المؤمن انى وجدها فهو احق بها)[1] كەواتە وەری ئەگرێ بەبڕواو بەزانینەوە ئوممەتێكی میانەو ناوەندیە، لە ڕژێم دانان و هۆندنەوەو ڕێك و پێك كردندا، بەم ڕەنگە كارو باری ژیان واز لێ ناهێنێ و بە تەنها نایداتە دەست نیازو هەستی پاك و دەروون، وە وازیشی لێ ناهێنێ و نایدتە دەست زۆرو دەست وەشاندنی یاساو قانوون، بەڵكو بە تەمێ ئامۆژگاری نیازو هەست و دەروون پاك و خاوێن ئەكاتەوەو لە هەمان كاتدا گەلیش ئەهۆنێتەوەو زۆرو دەست نیشاندنی یاساو قانوونیش ئەخاتە بەرچاو، وە بە تێكەڵكردنی ئەو دووانە چارەسەری لاری و گرێ ئەكات.

میللەتێكی میانەو ناوەندیە لەكارو باری كۆمەڵایەتی دا، بەم ڕەنگە فەردو ئەندامی گەل ناتوێنێتەوە لەناو گەل لەناو میری و دەوڵەتدا، وە لە هەمان كاتدا بەریشی بەرەڵا ناكات بەئارەزووی نارەوای خۆی بجوڵێتەوە تا زیان بگەیەنێ لە گەل یا دەوڵەت، بەڵكو مافی ڕەوای هەردوو ئەدات و یەكیان ئەخات، وە هێزو وزەی ئەندامی گەل ئەخاتە كار بۆ بزووتنەوەو گەشە كردنی ژیان و پارێزگاری گیان و شەخسیەتیان ئەكات و لە هەمان كاتدا جڵەوگیریان ئەكات لە زیادە ڕەوی كردن، وە كارێكی وا ئەكات كە گەل ببێتە دەستەبەرو كەفیل بۆ ئەندامەكانی، وە ئەندامەكانیش ببن بە فەرمانبەرو خزمەتكاری گەل بەرێك و ڕاستی.

میللەتێكی میانەو ناوەندیە لە جێ و شوێندا، بەم ڕەنگە كەوتۆتە ناوكەو ناوەڕاستی ناوچەكانی زەویەوە، وە بەهۆی ئەم شوێن و جێگە گرنگەیەوە ئەتوانێ ببێتە چاودێرو لێپرسراو بۆ هەموو ئادەمی، وەلەوەی كە هەیەتی ببەخشێ بە هەموو دانیشتوانی زەوی، وەلە ڕێگەی ئەمەوە خۆراك و پێبژێوی ڕۆح و لەش بكات بە هەمووان، وە خوا كارێكی وای

---

[1] واتە هەموو كارو شتێكی ڕاست و ڕەواو دروست بەدوا گەڕاوی بڕوادارە، لە هەر شوێنێ دەست كەوت و دۆزیەوە ئەو شایان و شایستە ترە پێی و هێنی ئەوە.

کردووه نەوت و زۆربەی کانە گرنگەکان لەم خاکە ناوەندیە دێتە دەرەوە و ژیانی جیهان بەستراوە بەم خاکە ناوەندیەوە!

میللەتێکی میانەو ناوەندیە لە کات و چەرخدا، بەم ڕەنگە لە چەرخی هاتنی ئەمدا چەرخی منالّی و ساوایی ئادەمیێتی لەبارەی بیری و ژیریی و ڕێ بردن بەو هەموو خێرو بێری جیهانەوە دوایی هات لە پێش ئەمەوە و چەرخی تازەی ژیان و جیهان دەستی پێکرد و ئەم میللەتە کەوتە ناوەند بۆ ئەمەی تەپ و تۆزی پڕوپووچی منالّی بتەکێنێ لە ئادەمیێتی، وەلە هەمان کاتدا ئامۆژگاری ئادەمی بکات و جڵەوگیری بکات لەسەر لێ شێوان و لادان لە ڕێگەی خوا بەهۆی ئەم هەمووبەرهەمی بیریی وژیریی وبەراوردەوە، وەوازنەهێنێ لەخۆراك و بژێوی ڕۆحەکەی ولەسەرڕێگەی ڕاست بڕوات،وەپارێزگاری کەلەپوورەڕۆحیەکەی بکات کەلەچەرخی پێغەمبەرانەوە بۆی هاتووە دەست بەدەست، وە ئەو کەلەپوورە ڕێك و جووت و هاوتا بکات لەگەڵ بەروبەرهەمە ژیریی و بیرییەکەی کە هەمیشە بەرەو پەرەسەندن و گەشە کردن ئەڕوات!

بەکورتی ئەم ئایینی ئیسلامە لە هەموو شتێکدا میانەیەو ناوەندی گرتووە لە هەموو کردەوەو ڕەوشتێکی بەندەییشدا، بۆ وێنە فەرمان ئەدات بە سەخاوەت و دەست گوشادی کە میانەوناوەندی بۆچرووکی و ئیسراف و بە فیڕۆ دەست نان بە ماڵەوە بە خۆڕایی، وە فەرمان ئەدات بە ئازایی و چالاکی کە میانەو ناوەندییە بۆ دڕندەیی و دەستەپاچەیی و زەبوونی، تەنانەت لەبارەی خواپەرستیشەوە نایەوێ زیادە ڕەوی، وەك نایەوێ کەم و کوڕی لەوەی کە پێویستی سەرشانی کردووە، جا لەبەرئەوە ئەم ئایینە پیرۆزە دەست نادا بۆ گۆڕاندن و دەست تێخستن و بڕارەکردن، وە هەرجۆرە دەست کاریەك بکرێ هەڵەو لار دەرئەچێت وەك شتێ کەلە ناوەڕاستی تەرازوویەکی ڕاستدابێت دەست نادابۆلادان بە هیچ بارێکدا ئەگەر بە هەربارێکدا ترازێنرا لارە سەنگ ئەبێت، ئەم ئایینە پیرۆزە بەم جۆرەیە، وە ئەم میللەتەش بەم جۆرەیە کە باس کرا، وە ئەمڕۆ کە ئەم میللەتە نیە لەو جێگەو شوێنە بەرزەی خۆی دا، وە ئەو ڕادەو پایەو پلە بەرزەی نیە، بەهۆی ئەوەوەیە کەلای داوە لەو ئایین و بەرنامەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووەو وازی لەوە هێناوەو چەند ئایین و بەرنامەی تری بۆ خۆی داناوە کە لە ئاسمانەوە نەهاتووەو لە چاڵاوی بۆگەن و زەلکاوی ئەم زەویە دەرهاتووە، وە خۆی ڕەنگ کردووە بە چەند ڕەنگێکی جیاواز لەو ڕەنگەی کە خوا بۆی داناوە! وە بێگومان کە میللەتێك دانرابێ بۆ ئەو کارو پیشە گەورەیەو بۆ ئەو مامۆستایی و سەرکردایەتیە، شایستەو شایانە بە تێکۆشان و فیداکاری بە ماڵ و بە گیان تا بکات بەو پلەو پایە بەرزەی خۆی.

وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾

ئینجا بە بۆنەی گۆڕاندنی ڕووگە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبە لە پێشەوە باسی هۆی ڕووکردنە (بیت المقدس) ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ﴾ لەبەر هیچ شتێ ڕووگەمان نەگێڕاو دانەنا بەو تەرەفەی ــ واتە: بیت المقدس ــ کە پێش ئێستا لەسەری بویت ــ یان کەعبە کەلە پێش کۆچ کۆدن بۆ مەدینە ڕووی تێئەکرد ــ واتە: نەمان گێڕایتەوە بۆلای کەعبە ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ﴾ مەگەر لەبەرئەوەی بزانین کێ شوێنی پێغەمبەر ئەکەوێ و بەجۆرێ جیا ئەبێتەوە ﴿مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ﴾ لە کەسێ کە پاشەو پاش وەر ئەگەڕێتەوە، واتە: دوو دڵ ئەبێت و لە ئایینەکەی هەڵئەگەڕێتەوە، بە کورتی مەبەست لەدیاری کردنی (بیت المقدس) بە ڕووگە، یان مەبەست لە گۆڕاندنی ڕووگە لەوەوە بۆ کەعبە تاقی کردنەوە بوو تا دەرکەوێ کێ دامەزراوە لەسەر ئایین و گوێ ڕایەڵی هەر فەرمانێ کە پێی بکرێ، وە کێ دانەمەزراوەو هەڵئەگەڕێتەوە لە ئایینەکەی؟ لەسەر هەرکام تاقی کردنەوەکە بەدی هات و دامەزراوو دانەمەزراو دەرکەوتن و جوێ بوونەوە لە یەکتر، لەسەر باری یەکەم کە سەخت ترو بەتین ترە تاقی کردنەوەکە لەم ڕووەوە بوو کە ئەو یەکەم چین و کەلە عەرەب بوون و کەعبە ڕووگەو جێگەی حەجی باوک و باپیریان بوو، وە نیشانەو مایەی شەرەف و بەرزیان بوو، وە جێگەی هەموو هیواو ئومێدی بوو لە هەست و دەروونیاندا، لەگەڵ ئەوەدا فەرمان بدرێ بە ڕوو وەرگێڕان لەوەو ڕووکردن بۆ جێگەو شوێنێ تر کەلەوەو بەر هیچ پەیوەندیەکیان نەبووە پێیەوە، بەڕاستی هەر دڵێ لەکاری وادا دامەزراو بە ئارام بێت ئەوە ڕاستە لەگەڵ خۆی و ئەو دڵە لێ بڕواوە بۆ خواو پاک و خاوێن کراوە بۆی! وە بەڕاستی جێی خۆیەتی ئەو تاقی کردنەوەو پاڵفتە کردنە، وە زۆر پێویست بوو پچڕینی ئەو پەیوەستیەی کەلە دەروونی ئەو گەلەدا دامەزرابوو، چونکە ئەو ڕێزو ڕوو تێکردن و پەیوەستیە لە پێش هاتنی ئیسلام دا لەسەر بنەڕەتی ئایین و عەقیدەی ڕاستەقینە نەبوو، وە تەنها لەبەر خوا

نەبوو، بەڵکو بەشی زۆرو بەهێزی ڕەگەزایەتی و نەتەوایەتی بوو، وە ئەو ماڵی خوا کرابوو بە ماڵە پیرۆزەکەی عەرەب لەو کاتەدا، خوایش ویستی کە هەر ماڵە پیرۆزەکەی خۆی بێت بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێ، وە بۆ هەموو بێت وەك هەر لە یەکەم جارەوە فەرمانی دا بە (ئیبراهیم) کە هەر لەبەر خواو بە ناوی خواوە دروستی بکاتو بۆ هەموو ئادەمی، کەواتە پێویست بوو ئەو تاقی کردنەوەو بەو تاقی کردنەوەیە دەرکەوت پاكو خاوێنی دەروونی پاکانو لێ بڕانیان بۆ خواو ڕووت بوونیان لەهەر شتێ تر، وە دەرکەوت فەرمان بەریی و مل کەچی و گوێڕایەڵیان، یەکەم بەو جۆرە تاقی کردنەوەو پاڵفتەکردن بەدی هات، وەلەسەر باری دووەمیش تاقی کردنەوەکە لەم ڕووەوە بوو کە دەرکەوت کێ بە فاكو فیکی جوولەکەو پڕوپاگەندەی ناپاکانو بت پەرستەکان بێئارامو دوو دڵ نابێتو بێجگە لە گوێڕایەڵی و مل کەچی بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) هیچی تری مەبەست نیە، ئەوە بوو وەك لە پێشەوە باسمان کرد، جوولەکەکان نەئەوەستان لە پڕوپاگەندە لە هەموو کاتێکدا، کاتێ ڕوو ئەکرایە (بیت المقدس) ئەیان ووت: ئایینەکەی ئێمە ڕاستە بۆیە ئەکەنە ڕووگەکەمان، وە ماتووڵ ڕووگەکەمان ڕاستەو بڕوایان پێ ی هەیە دەی با لە هەموو شتێکدا شوێنی ئێمە بکەون، وە کاتێ کە ڕووگە گۆڕا ئاگریان تێچوو ئەیان ووت: ئەگەر ڕووکردنیان بۆ ڕووگەکەمان ڕاست بوو بۆچی گۆڕیان؟ وە ئەگەر ڕاست نەبوو ئەبێ نوێژەکانی لەوەو پێشیان ڕاست نەبووبێت، وە ناپاکەکانیش هەمیشە شوێن کەتوو لاسایی کەری جوولەکەکان بوون، وەبت پەرستەکانیش کاتی ڕوو کردنە (بیت المقدس) ئەیان ووت: چۆن ئەمە لائەدا لەماڵێ کە(ئیبراهیم) دروستی کردووەو ڕووگەو مایەی شەرەفی باوكو باپیریەتی، وە کاتێ گۆڕرا بۆ کەعبە ئەیان وت: کە گەڕایەوە بۆ کەعبە ئەگەڕێتەوە بۆ ئایینی باوكو باپیری، یا ئەیان وت: دوو دڵە لە ئایینەکەی خۆیداو هەر دەمە ڕوو ئەکاتە لایەك!

لە هەر بارێکەوە سەرنج بدرێ بە ڕاستی ڕووداوو مەسەلەیەکی گرانو گەورە بوو لە دڵو دەرووندا، مەگەر بۆ کەسێ کە خوا ڕێنموونی کردبێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ﴾ بە ڕاستی ئەو ڕووگەیەیان بەسەرهاتو گۆڕانی شتێکی گرانو گەورە بوو مەگەر لەسەر ئەوانەی کە خوا ڕێنموونی کردنو خستنیە سەر ڕێگەی ڕاستو دامەزراوی کردن لەسەری، بۆ ئەو خوا پێداوانە هیچ ئەركو گرانی نەبوو، چونکە ئەوانە بەرامبەر

فەرمانی خوا بێجگە لە ملکەچیو گوێڕایەڵی هیچی تریان نیەو هیچی تر نازانن، ئەوانە بەرامبەر هەر کارو فەرمانێکی خوا وەك ئاسنن بەرامبەر موقناتیس، واتە هەرچۆنێ ئاینێ لە هەر لایەك ببێ موقناتیس بەرەو ئەو لایە ئەڕواو ئەوەستێ، هەروەها بڕواداریش ئەبێ هەمیشە ڕوو بکاتە ئیسلامو هەر بەرەو ئیسلام بڕواو بوەستێ.

ئینجا موسڵمانەکان دڵئارام ئەکات لە مەترسی دروست نەبوونو وەرنەگرتنی ئەو نوێژانەیان کە بەرەو (بیت المقدس) کردیان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ وە بێگومان خوا نەیویستووە بڕواکەتان زایە بکات، واتە ئەو نوێژانەتان کە بەرەو (بیت المقدس) کردووتانە، وەك لە حەدیسی سەحیحدا ئەفەرموێ: کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کرایە کەعبە، هاوەڵەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەی ئەوانە چۆنن کە لەمەوبەر بوونو نوێژیان بەرەو (بیت المقدس) کرد، ئینجا ناوبردنی نوێژ بە بڕوا لەبەر ئەوەیە کە نوێژ دووەم پایەی ئیسلامو بڕوایە، یان مەبەست بڕوایە بەو ڕووگە سپاوەو بەو نوێژانەی کە ڕوو بەرەو ئەوێ کراون، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خوا زۆر بە بەزەییە بە مەردوم، میهرەبانە پێیان، کەواتە داوای شتێکیان لێ ناکات کە لە توانایاندا نەبێت، وە ڕێنموونی بڕواداران ئەکات، وە یارمەتیو کۆمەکییان ئەکات بۆ دەرچوون لە تاقی کردنەوەدا، کاتێ کە بە دڵ ڕاست بکەن لەگەڵ خوادا، وە پاداشتیان ئەداتەوە کاتی دەرچوونو سەرکەوتن لە تاقی کردنەوەدا، ئینجا لە کۆتایی باسەکەدا ئەگەڕێینەوە بۆ کردنەوەی گرێیەك کە ئەکەوێتە دڵ لە دیمەنو ڕواڵەتی ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ﴾دا کە وا نیشان ئەدات ئەو زانینی خوا لە پاش تاقی کردنەوەکە پەیدا ئەبێت، لەگەڵ ئەوەدا زانینی خوا هەر بووە بەبێ سەرەتا وەك هەیەو هەر ئەمێنێ بە بێ گۆڕانو دواهاتن.

لە وەڵامو کردنەوەی ئەم گرێیەدا کە لە ڕواڵەتی ئێرەو چەند شوێنێ تری وێنەی ئێرە پەیدا ئەبێتو ڕوو ئەکاتە دڵ، لە وەڵامو کردنەوەی ئەوەدا زانایانی ئیسلام حەوت شتیان فەرمووە: لە ناو ئەوانەدا دوانیان هەڵئەبژێرین لێرەدا:

یەکەم: مەبەست زانینە بە شتەکە بە بەدی هاتوویی و دەرکەوتنی ئەوەی کە خوا لە پێشەوەزانیویەتی، واتەزانینی خوا هەر یەك زانینەو نەگۆڕاوە، بەڵام دوو بارو حاڵەتی هەیە:

أ- بارو حاڵەتی پێش پەیدا بوونی زانراوەکە.

ب- بارو حاڵەتی پاش پەیدا بوون‌و بەدی هاتنی زانراوەکە، وە مەبەست بە زانینی خوا لەم جۆرە شوێنانەدا زانینە لەسەر بارو حاڵەتی دووەم، کە تۆڵەو پاداشت شوێنی ئەم بارو حاڵەتی دووەمە ئەکەوێ‌و بنەڕەتی لەسەر ئەمە، واتە ئەوەی کە خوا زانیویەتی لە بارەی کردەوەی بەندەکانیەوە تا ئەوان بەدی نەهێنن‌و هەڵنەسن پێ‌ی، خوا تۆڵەو پاداشتی نابێ بۆیان.

دووەم: وەڵام بۆ ئەو گرێ‌یە ئەمەیە: مەبەست بەو زانینە جیاکردنەوەیەکە زانینەکە هۆیەتی، واتە لەبەر هیچ شتێ ئەو ڕووگەیان بەو جۆرە لێ نەکرد مەگەر لەبەر ئەوەی جیا بکەینەوە ئەو کەسەی کە شوێنی پێغەمبەر ئەکەوێ لەو کەسەی کە هەڵئەگەڕێتەوەو شوێنی ناکەوێ، وە بەم جۆرە زۆر جوان‌و ڕێکیشە لەگەڵ وتەی ﴿مِمَّن يَنقَلِبُ﴾ وەك (ئیبن‌و عەباس)یش لێرەدا بەم جۆرەی تەفسیری کردووەتەوە.

لەپاش ئەوە ئینجا ئایەتی لەم چوار ئایەتی داهاتووەدا جاڕی گۆڕانی ڕووگە ئەدات لەگەڵ بێدارکردنەوەی موسڵمانان لە پیلانی جوولەکە لەو بارەیەوە، وە دەرخستنی نیازو مەبەستی خراپیان لەو پیلان‌و هێرشەیان کە کردیان‌و هەڵسان پێ‌ی، لە یەکەم جارەوە سۆزو ئارەزووی پێغەمبەر (ﷺ) نیشان ئەدات بۆ ئەو گۆڕاندنە، چونکە کەعبە ڕووگەی (ئیبراهیم)ی باوکی بووە -سەلامی خوا لە هەردوو- وە یەکەم ماڵی خوایە لە زەویدا، بێگومان گەلە موسڵمانەکەشی هەر ئەوەیان پێخۆش بوو، بێجگە لەوانە ڕوو کردنە (بيت المقدس) بوو بوو بە هۆی پیلان‌و پڕوپاگەندەی جوولەکەکان لەناو موسڵمانەکاندا، وە لە پێش هەموو شتێکەوە خوای گەورە وەك ئایینێکی گشتی‌و هەمیشەیی نارد بۆ هەموو جیهان‌و جیهانیان، ئەبێ بنێتە دڵی پێغەمبەرەکەی ئارەزووی ڕوو کردنە ئەو ماڵەی خۆی کە هەر لە یەکەم جارەوە بۆ هەموو ئادەمی دروست کردووە، ئەم ئایینە گەورەو گشتیە هەر ئەو ماڵە گەورەو گشتیەی شایانە، لەبەرئەوە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بەئومێدو چاوەڕوانیەوە چاوی هەڵئەخست بەرەوئاسمان، بەڵکوخوای میهرەبان فەرمان دەرئەکات بەڕوو کردنە کەعبە، بەڵام شەرمی کرد لەوەی بەدەم داواکە بکات، تا وەك تەگبیرو ڕاوێژی لێ نەیەت بەرامبەر بە خوا،

﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ١٤٤ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ بێگومان زۆر جار ئەبینین چاوهەڵخستن‌و ڕوانین‌و وەرگەڕانی ڕووت بەرەو ئاسمان کە ڕووگەی نزایەو سەرچاوەی هاتنی سروشی خوایەبە ئومێدی هاتنی فەرمان بە گۆڕانی ڕووگە بۆت ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَا﴾ بەهۆی ئەوەوە سوێند بە خوا پێت ئەبەخشین ڕووگەیەك کە پێت خۆشەو ئارەزووی ئەکەیست لە دەروونی خۆتدا، وەرێت ئەدەین بەڕووتێکردنیان وەرت ئەگێڕین بۆڕووگەیەك کە پێت خۆشە.

لە پێشەوە بەڵێنی پێدا تا بەو بەڵێنە جارێك دڵی خۆش بکات، ئینجا جارێکی تر دڵخۆشی کرد بە بەدی هێنانی بەڵێنەکەی، فەرمووی: ﴿فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ﴾ کەواتە ڕووت وەرگێڕە بۆ لای مزگەوت‌و بەرەو مزگەوتێ کە قەدەغە کراوە، واتە کەعبە، بەڵام بەو مزگەوتەی ناوبرد کە بەچوار دەوریایەتی بۆ ئەوەی دەست نیشان بێت بەوەی کە بۆ ئەوانەی دوورن ڕووکردنیان بەرەو کەعبەو بۆ ئەو تەرەفە بەسەو پێویست دەر ئەکات، ئینجا چۆنێتی ڕووکردن‌و چ ئەنداز پێویستە لەکتێبی زانایان‌و سەر مەزهەبەکاندا باس کراوەو پێویست نیە باس کردنی لێرەدا.

ئەوەی لێرەدا پێویستە، بیرکردنەوەیە لەوەی کە خوا ئەو شوێنە پیرۆزەی گێڕا بە ڕووگە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وە بۆ میللەتەکەی، چ ئەو تاقم‌و چینەی کە لەگەڵی بوون، وە چ هەر تاقم‌و چینێ تر دوای ئەوان تا ئەم جیهانە ببێ، لەبەرئەوە لەپاش فەرمان دان بە پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی، ئینجا فەرمانی دا بە شێوەیەکی گشتی، فەرمووی: ﴿وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ﴾ وە ئێوە لەهەر لایەك بن‌و لەهەر شوێنێ بن ڕووتان وەرگێڕن بۆلای ئەو مزگەوتەو بەرەو ئەو مزگەوتە.

خوا میهرەبان یەك ڕووگەی دانا كە ئەم میللەتە كۆبكاتەوەو یەكێتی بخاتە نێوانیان، ئیتر لەهەر وڵاتێ بن لەهەر تیرەیەك بن‌و هەر زمان‌و ڕەنگێكیان ببێ، تەنها ڕووگەیەك ببێ، كە هەموو میللەت ڕووی تێبكەن، بەهۆی ئەوەوە هەست بكەن كە وەك یەك جەستەو لەش وان، وە یەك مەبەست‌و ئامانجیان هەیە، وە هەموو تێكۆشان ئەكەن بۆ پێك هێنانی یەك بەرنامە، بەرنامەیەك كە بنەڕەتی لەسەر ئەوەیە كە هەموو تەنها خوایەك ئەپەرستن، وە پێغەمبەرێكیان هەیە، وە ڕوو ئەكەنە یەك ڕووگە.

ئا بەو جۆرە خوا یەكێتی خستە نێوان ئەم میللەتە لەگەڵ جیاوازی تیرەو ڕەنگ‌و زمان‌و وڵاتیان، وە یەكێتی دانەمەزراند لەسەر بنەڕەتێ تر لەم بنەڕەتە ئەرزیانە، چونكە یەكێتی لەسەر هەركام لەوانە هەموو ئادەمی تیا بەشداری نیەو بە هیچ كلۆجێ ناگونجێ بەشدار بوونی هەمووان لە هەركام لەوانە مایەی پچڕان‌و بەش بەش بوونە لەناو جۆرەكانی ئادەمی دا، نەك یەكێتی‌و یەگ گرتن، وە بێجگە لەوەش یەكێتی نەبێ لەسەر شتێ بێت كە دەسەڵاتی تێدابێت‌و تایبەتیش بێت بەو گەل‌و كۆمەڵەوە.

دەی ڕەنگ‌و زمان‌و نیشتمان‌و تیرە نە دەسەڵاتی مەردوم هەیە بەسەریاندا، وە نە بە خواهیش‌و ئارەزووی مەردوم پەیدا ئەبن، وە نە تایبەتیشن بە ئادەمیەوە، بەڵكو گیانلەبەرانی تریش یەك ئەگرن‌و یەكێتیان ئەبێت لەو جۆرە شتە ئەرزیانەدا!

ئینجا حاڵ‌و باری نامەدارەكان باس ئەكات سەبارەت بەو ڕووگە تازەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ بێ‌گومان ئەوانەی كە نامەی خوایان پێدرا بوو ـ واتە: جوولەكەو گاورەكان ـ ﴿لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ بەباشی ئەزانن كە هەر ئەم گۆڕان‌و ڕووكردنە كەعبە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوەیەو فەرمان پێدراوی ئەوە، چونكە ئەزانن كە كەعبە یەكەم ماڵی خوایەو (ئیبراهیم)ی باپیریان دروستی كرد، وە ئەزانن كە ڕووگەی ئەم میللەتە كەعبەیە بەپێی هەواڵێ كەلە پێغەمبەرەكانیانەوە پێیان گەیشتووە، وە هەروەها بێ‌گومان بوون بەپێی ناوو نیشانی نامەكانیان كە محمد (ﷺ) پێغەمبەرە، كەواتە ئەزانن كە هەرشتێ لەوەوە بێ‌ڕاستەو لای خواوە هاتووە.

ئەوانە بەباشی ئەوەیان ئەزانی کەچی پێچەوانەی زانینەکەیان ڕەفتاریان ئەکرد، وە ئەوانە هیچ زیانێ ناگەیەنن بە موسڵمانەکان، بەڵکو خۆیان زیان ئەکەن، وەك بەم ڕستە تێهەڵکێشەش بێدارمان ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ بێ‌گومان خوا بێ‌ئاگا نیە لەهەر کردەوەیەك کە ئەوان ئەیکەن، یان لەهەر کردوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، ئەوەش لەسەر خوێندنەوەی بە (تعلمون) وەك بەهەردوو جۆر هاتووە.

بێ‌بڕواکانی مامەدار کە بەو جۆرە دژی گۆڕینی ڕووگەن، لەبەئەوە نیە نیشانەو بەڵگەی ڕوون‌و بەهێزیان دەست ناکەوێ لەسەر ڕاستی‌و بەجێ‌یی ڕووکردنە کەعبە، بەڵکو لەبەرئەوە خۆیان ڕاست نین‌و نایانەوێ شوێنی هەق‌و ڕاستی بکەون‌و ئەیانەوێ شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆیان بکەون، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر تۆ هەموو بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون بهێنی بۆ ئەو نامەدارانە لەسەر ڕاست‌و ڕەوایی ڕووگەکەت ﴿مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ﴾ ئەوانە هەموو شوێنی ڕووگەکەت ناکەون، کەواتە ئەوانە هەر سەرکێشی بەکار ئەهێنن‌و بەرژەوەندی پەرست‌و داخ لەدڵن... ڕەنگە هەندێ لەدڵ پاکی خۆیان لایان وابێ کە جوولەکەو گاورو موسڵمان نابن لەبەرئەوەیە کە ئیسلام ناناسن، یان بە جۆرو شێوەیەکی ڕێك‌و دڵنیا کەر ئیسلامیان نیشان نەدراوە، نەخێر هەرکەس وا بزانێ هەڵەیە، وە بە پێچەوانەوە ئەوانە کە ئیسلامیان ناوێ، لەبەرئەوەیە کە ئەیناسن‌و تێ‌ی گەیشتوون‌و ئەترسن لەنەمانی هێندێ بەرژەوەندی‌و دەسەڵات‌و شەخسیەتیان، وە داخ لەدڵن‌و پێ‌یان ناخۆشە مل کەچ بن‌و سەر شۆڕکەن بۆی، جا لەبەرئەوە بەهیچ جۆر ناوەستن، بەهەرجۆر لەدەستیان بێت پیلان ئەگێڕن‌و بەرگری ئەکەن‌و بەربەستی بۆ فەراهەم ئەهێنن‌و بە ئاشکراو بەنهێنی جەنگ‌و ئاژاوەیان هەیە دەربارەی ئیسلام، ئایا چ شایەتێك ڕاست ترە لەم ئایەتەی کە خەریکین پێ‌یەوە، ئایا چ شایەتێك ئاوا بارو حاڵی ئەوانە دەرئەخات، هەرچۆنێ ڕووداوو واقیعی جیهانیش، ئەوەمان بۆ دەرئەخات!

وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْۖ

---

ئینجابەرامبرەئەو بارو حاڵی ئەوانە هەڵوێستی پێغەمبەریش ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ﴾ وە بێگومان تۆش هەرگیز صگێن کەوتووی ڕووگەی ئەوان نابیت، وە بێگومان هەرکەسیش شوێنکەوتووی پێغەمبەر (ﷺ) بێت ئەبێ بەهیچ ڕەنگ شوێنی هیچ ڕووگەیەك نەکەوێ، بێجگەبەوڕووگەیەی کەخوابەخشی بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ)، وە ئەبێ هیچ ئالأیەك هەڵنەکات بێجگە لەو ئالأیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵی کرد، وە هیچ بەرنامەیەك وەرنەگرێ بێجگە لەو بەرنامەی کە ڕووکردنە کەعبە دەست نیشانی بۆ ئەکات، موسڵمان ئەبێ ئاوابێت، ئەگەر خۆی بە موسڵمان دابنێت، ئەگینا موسڵمان نیەو هەر قسەی ڕووت ئەکات! ئینجا بارو هەڵوێستی نامەدارەکانیش بەرامبەر یەکتر دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍۚ﴾ هیچ کام لەو دوو کۆمەڵەش شوێنی ڕووگەی ئەوی تر ناکەون، دوژمنایەتیو ناکۆکی بەینی جوولەکەو گاور دەربارەی یەکتر، وە دوژمنایەتیو ناکۆکی تاقمو بەرەکانی ناوخۆی هەرکام بۆ ئەوی تر، ئەو دوژمنایەتیو ناکۆکیانە شتێکی ئاشکرایەو زۆر بەتینە، ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِۙ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر شوێنی ئارەزووی ئەوان بکەوی لەپاش ئەو زانینەی کە هات بۆت پێت گەیشت لەلای خواوە، زانینی ڕاستو ڕەوایی ئەوەی کە خۆتی لەسەری، وە ناڕاستیو ناڕەوایی ئەوەی کە ئەوانی لەسەرنو داوای ئەکەن لەتۆ، ئەگەر تۆ شتی وا بکەیت ﴿إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئەو حەلە تۆ لەستەم کاران ئەبیتو ئەچیتە ڕیزی ئەوان، بێگومان هەرگیز پێغەمبەر (ﷺ) لەوانە نەبووە شوێنی ئارەزووی ناڕەوای ئەوان بکەوێت، وە هەرگیز شتی وا ڕێی تێناچێو گومانی ئەوەی پێ نابرێ، بەتایبەتی لەم شوێنەدا کەلە پێشەوە خوا هەواڵی

داو بە توندی دڵنیایی لەسەر کردو فەرمووی: ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ﴾ بەڵام ئاراستە کردنی ئەم ڕستەو وتەیە چەند شتی گرنگی لێ وەرئەگیرێ:

١- نیشان دانی زۆر گرنگی و گەورەیی ڕاوەستان و دامەزراوی لەسەر ڕێنموونی و ئامۆژگاری خوا، وە دوور کەوتنەوەو خۆ ڕووت کردن لە هەموو شتێ بێجگە لە گوێڕایەڵی خواو ڕێ و بەرنامەی خوا.

٢- دیاری کردن و ڕوون کردنەوەی زانین و ڕاستی و جیاکردنەوەی لە نەزانی و ناڕاستی، بەمەی کە زانین و ڕاستی هەر ئەوەیە کەلە خواوە هاتبێ و لە خواوە وەرگیرابێ، ئیتر بێجگە لەوە نەزانیەو هەواو ئارەزووی نەفسە، کەواتە ئەو دووانە کۆ نابنەوەو هەرکام گیرا ئەوی تر نابێ.

٣- دەرخستن و ڕوون کردنەوەی خراپی و ناڕەوایی شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووی نەفسی، ئیتر لەلایەن هەرکەسەوە بێ.

٤- تەمێ و ترساندنێکی بەتینی گوێ گران و مەردومی تر.

٥- زیادە ناڕەوایی و گەورەیی تاوانی زانا.

لەپێشەوە فەرمووی کە بێگومان نامەدارەکان بەباشی کە ئەو گۆڕینی ڕووگە بۆ کەعبە ڕاستەو لای خواوە هاتووە، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەریان و دڵنیایی ئەکات لەسەر ناسین و زانینیان بەوەی کە قورئان هێنای و پێغەمبەر (ﷺ) ڕای ئەگەیەنێ، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانەی کە نامەمان پێدان ــ واتە زاناکانیان ــ ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ پێغەمبەر ئەناسن هەرچۆنێ کوڕەکانی خۆیان ئەناسن، واتە بە بێگومان و دوو دڵی ئەزانن کە پێغەمبەرەو بەباشی ئەیناسن بەهۆی ئەو ناوو نیشان و سیفەتانەی کەلە نامەکانیاندا هاتووە، وە بەهۆی ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانەوە، ناسینی مەردوم بۆ کوڕی خۆی ئەوپەڕی پۆپەیە لە ناسیندا، وەئەوە وێنەو چیرۆکێکە لە زمانی عەرەبدا ئەیهێننەوە بۆ زانینی بەهێزی بێگومان، جا بەو پێیەو لەسەر ئەو باوە قورئان کری لێرەدا بە چیرۆکێك بۆ ناسینی ئەو نامەدارانە،

﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾

وە لەگەڵ ئەو ناسینە بێگومانەدا ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ﴾ وە بێگومان تاقمێ لەوانە ئەو حەق و ڕاستیەی کە ئەیناسن ئەیشارنەوەو دەری نابڕن، ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەزانن، واتە کە زانان و شتی وایش شایانی زانا نیە، یا لە کاتێکدا کە ئەزانن و بێئاگا نین لێی و ئەزانن ئەو شاردنەوە تاوان و هۆی خەشم و تۆڵەی خوایە، وە بێگومان تاوانێ بەو شێوەیە سەیر بکرێ زۆر گەورەیە. فەرمووی تاقمێ لەوان کە سەرکێشە خۆ بە زل زانەکانیان بوو، بەڵام تاقمێ تریان دانیان نا بە ڕاستیداو بڕوایان هێنا، یەکێ لەوانە (عبدالله ی کوڕی سەلام) -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەگێڕنەوە فەرموویەتی: من ئاشنا ترم بە پێغەمبەر (ﷺ) لە کوڕەکەی خۆم، (عمر) -خوای لێ ڕازی بێت- فەرمووی: لەبەر چی چۆن؟ ئەویش لە وەڵامیدا فەرمووی: من هیچ گومانم نیە لەمەدا کە محمد (ﷺ) پێغەمبەرە، بەڵام لەوانەیە کوڕەکەم ایکی ناپاکی کردبێ واتە لە من نەیگرتبێ، ئینجا سەری (عبدالله)ی ماچ کرد، ئەم زانا بەرزە بەو جۆرە دانی نا بە شتە ڕاستەکەداو بڕوای هێنا هەرچۆنێ (تمیمی) داریش کە لە زانایانی نەسرانی بوو دانی نا بە ڕاستیداو بڕوای هێنا بە وێنەی (عبدالله) -خوا لە هەردوو ڕازی بێت-، ئینجا کاتێك کە نامەدارەکان (أهل الكتاب) پیاوخراپی وەك ئەو سەرکێشانەیان تیا بێت کەواتە نابێ بڕواداران دڵ بگۆڕن بە قسەی پڕو پوچ و پڕو پاگەندەی ئەوان، وە بە هیچ ڕەنگ مافیان نیە قسەو هەواڵیان لێ وەربگرن.

ئینجا بۆ دڵنیاکردن و بەهێزکردنی دڵی موسڵمانان ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ هەق و ڕاستی لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە، واتە هەر ئەوە ڕاستە کەلە لای خواوە هاتووە، وەك ئەوەی کە تۆ وای لەسەری، وە هەرچی لەلای خواوە نەهاتبێ ئەوە ناهەق و ناڕاستە، وەك ئەوەی کە نامەدار ئەیڵێن و وان لەسەری: ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتە بە هیچ جۆرێ لەوانە نەبێت کە گوماندارن لەوەی لەلایەن خواوە ـ سبحانە ـ بۆیان هاتووە، بێگومان هیچ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گوماندارو دوو دڵ نەبووە لە هیچ شتێکی ئەو ئایینە ڕاست و پیرۆزەی کەلەلای خواوە بۆی هاتووە، بەڵام ئەاڕاستەکردنی ئەم فەرموودەیە بۆ ئاگادارکردنەوەیەو تەمێ و ئامۆژگاریەکی بەهێزی تیایە بۆ موسڵمانان، ئیتر چ ئەو

موسڵمانانەی کەلەو چەرخەدا بەهۆی پیلان و فاك و فیکی جوولەکەوە دڵ کرمین و گوماندار بوورین، وە چ ئەو موسڵمانانەی پاش ئەوان کە پیلان و قسەی جوولەکەو دوژمنانی ئایینەکەیان کاریان لێ نەکات و دڵیان ئەگۆڕێ لە ئاستی ئایینەکەیان.

ئای موسڵمانانی ئەمڕۆو لەمەپاش چەندە پێویستیان بەوە هەیە ئەم تەمێ و ئاگادار کردنەوەیەیان هەمیشە لەبیربێ تا بە هیچ جۆر هەڵنەخەڵەتێن و قسەی دوژمنانی ئیسلام کاریان لێ نەکات.

زۆر زۆر بەداخەوە کەلە زووەوە تا ئێستاش موسڵمانان بێ ئاگا بوون لەو تەمێ و ئامۆژگاریە، بەهۆی ئەوەوە دوژمنانی ئەم ئیسلامە لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات بوون بە جێگەی پرس و ڕاوهەموو ڕازو نیازیان، وە مێژووی خۆیان وئایینەکەیان لەودوژمنە خوێن خوارانەوە وەرگرت و وەری ئەگرن، وە گوێ ئەگرن لە قسەو باسە ژاراویەکانیان سەبارەت بە قورئانەکەیان و فەرموودەو ڕەوشتی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) وە هەروەها سەبارەت بە مێژووی تاقمە پێشووەکانیان، وە قوتابی و خوێندکارەکانیان ناردو ئەنێرن بۆ لایان بۆ وەرگرتن و خوێندنی ئیسلام و علمە ئیسلامیەکان لەو دوژمنانەوە، وە لە دانیشگاو زانستگاکانی ئەوان دەرچین و شەهادەی ئەوانیان بەدەستەوەبێت لە خوێندنی ئیسلام و تێگەیشتن لە ئیسلام و علمە ئیسلامیەکان!! ئینجا ئەوانیش ئەگەڕێنەوە بەسەر لێ شێواوی و کەللەیەکی بۆش و مێشکێکی پوچ و دڵ و مێشکێکی پوچ و دڵ و دەروونێکی پڕ لە ژار بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان، بەڵام با هەموو تێگەیشتوویەك کە بزانێ کە قورئانەکەمان هەر قورئانەکەی یەکەم جارە، وە قورئان نامەی هەمیشەیی و هەتا هەتایی ئەم میللەتەیە، وە بۆ ئەوە هاتووە ڕێبازی بۆ دیاری بکات و نەخشەی بۆ بکێشێ لە هەموو چەرخ و چینەکانیاندا، وە نامەدارەکان هەر نامەدارەکانی یەکەم جارن بەڵکو خراپتریش بوون، وە هەروەها هەموو بێبڕواکانی تریش، وە دوژمنایەتی ئەوانە لەسەر ئەم ئایینەیەو ئایینەکەشمان هەر ئایینەکەی یەکەم جارە، کەواتە با موسڵمانان باش بیربکەنەوەو لا نەدەن لە نەخشەو ڕێبازی ئایینەکەیان، وە هیچ گومان و دوو دڵی ڕوویان تێ نەکات و بزانن کە هەر ئەوە ڕاستە کە لەلایەن خواوە هاتووە بۆیان،

وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۖ

---

ئینجا دیسان تەمێی موسڵمانەکان ئەکات بە گوێ نەگرتن لە نامەداران‌و خەریك نەبوون بە قسەو باسیانەوە، وە دەست نیشانیان بۆ ئەکات بەدامەزراوی لەسەر ڕێگەو ڕێبازی خۆیان‌و چەسپانی کردن لە کارو کردەوەی خێرو چاکەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ بۆ هەر میللەتێ شوێن‌و لایەك هەیە، واتە ڕووگەیەك ﴿هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ کە هەرکام ڕووتێ کەری ڕووگەی خۆیەتی، ئەوەتا (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل) ــ سەلامی خوایان لێبێ ــ کەعبە ڕووگەبوو بۆیان، وە (ئیسرائیل)یەکان (سەخرەی بیت المقدس) ڕووگە بوو بۆیان، وە نەسرانیەکان ڕوویان ئەکردە ڕۆژهەڵات، کەواتە ئەو پیلان گێڕو پڕوپاگەندە کەرانە چییان بەدەستەوە هەیە بۆ تانەو ڕەخنەگرتن لە ڕووکردنە کەعبە، بێگومان هیچیان بەدەستەوە نیە، کەواتە با دەمبازی نەکەن‌و مل کەچ بکەن بۆ بڕیارو فەرمانی خوا، وە با موسڵمانەکانیش خۆیان خەریك نەکەن‌و بەو نەفامانەوە، بەڵکو گوێ ڕایەڵ‌و چەسپانی کەر بن بۆ کارو کردەوە چاکەکان، چونکە هەر ئەو بەکەڵکە بۆ دوا ڕۆژی هەموو، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾ کەواتە چەسپانی بکەن ئەی بڕواداران بە گوێ ڕایەڵی‌و کردنی هەموو کارو کردەوە چاکەکان لە ڕووکردنە ڕووگەو هەرشتێ تر کە ڕەزامەندی خوا تێدابێت، وە هەل‌و هەڵکەوتی ژیان لەدەست خۆتان مەدەن، وە خۆتان خەریك مەکەن بە ئاژاوەو پیلانی نامەدارەکانەوە، چونکە: ﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا﴾ ئەگەر لەهەر شوێنی ببن لە جیهاندا خوا گیانتان ئەکێشێ‌و لەپاش دا هەمووتان کۆ ئەکاتەوە لای خۆی بۆ حیساب‌و پرسیارو تۆڵەو پاداشتان ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بە ڕاستی خوا توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، وە هێندێ لەو شتانە مراندن‌و زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەتانە لە ڕۆژی دوایی دا.

ئینجا دووبارە فەرمان ئەداتەوە بە ڕووکردنە ڕووگەی تازە بۆ بەهێزکردن‌و دڵنیایی کردن لەسەر فەرمانەکە، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لە هەر شوێنێ ڕۆشتی‌و دەرچوویت بۆ سەفەرێك ڕووت وەرگێڕە بۆ مزگەوتی بەڕێزی قەدەغەکراو،

وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ

---

﴿وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۗ﴾ وەبێگومان ئەو فەرمانە ڕاستو ڕەوایە لە لایەن پەروەردگارتەوەیە، ئەم فەرمانی دووەمە جیاوازە لە فەرمانی یەکەم سێبارەوە:

١- لێرەدا باسی نامەدارو هەڵوێستی ئەوانە نیە.

٢- شایەتی دانی خوا لەسەر ڕاستیو هاتنی فەرمانەکە لەلایەن خواوە.

٣- هەڕەشەو ترساندنێکی نهێنی لەوەی گوێڕایەڵی نەکرێو لادرێ لەم شتە ڕاستە بەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ بێگومان خوا بێئاگا نیە لەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە ئەگەر گوێڕایەڵ نەبنو لادەن لەم فەرمانە، خوا ئاگای لێیەو ئەو کاتە شایستەی تۆڵەی خوا ئەبن، لەم دووبارە کردنەوەو بەتوندی گرتنو هەڕەشە لەسەر کردنەوە دەرئەکەوێ کەلە دەروونی هێندێ لە موسڵمانان‌دا بێئارامیو قورسیەکی وابووە کە پێویست بکات بەوە، ئینجا بۆ جاری سێیەم فەرمان ئەداتەوە لەبەر مەبەستێکی تری تازە، کە بریتیە لە نەهێشتنی بەڵگەو پیلانی نامەدارەکان کە ڕووکردنی (بیت المقدس)یان ئەکرد بە نیشانەی ڕاستو ڕەوایی ئایینەکەی خۆیانو باودانی بەسەر ئایینی پاکی ئیسلام دا، وەئەیان گوت ئەو پێغەمبەرەی کە موژدەی دراوە بە هاتنی لەنامەی ئێمەدا ڕوو ئەکاتە کەعبە ئێستاکە ڕووئەکاتە قودس، ئەبێ ئەو پێغەمبەرە نەبێ، وە هەروەها نەهێشتنی برووبیانوو ڕەخنەگرتنی بت پەرستەکانی عەرەب کە ئەیان ووت ئەو ڕووکردنە مایەی بەرگری کردنی عەرەبەو دوور خستنەوەی لە ئیسلام، وە هۆی بێڕێزیو نرخ نەدانە بەکەعبە! وە ئەیان گوت پێغەمبەرێ کەلە نەوەی (ئیبراهیم) بێ ئەبێت ڕووبکاتە کەعبەکەی ئەو، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ﴾ لە هەر شوێنێك بوویتو دەرچوویت بۆ گەڕانو سەفەرکردن ڕووت وەرگێڕە بۆلای مزگەوتی قەدەغەکراو، ﴿وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ﴾ وە ئێوەش بڕوادارەکان لە هەرشوێنێ بوون ڕووتان وەرگێڕن بۆلای ئەو مزگەوتەو ڕووبکەن بەرەو ئەوێ،

لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾

**﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ بۆ ئەوەی بۆ مەردوم ـ واتە: جوولەکەو بت پەرستەکان ـ نەمێنێ بەڵگەو ڕەخنەیەك کە هەیانە بەسەرتانەوە، وە ڕێی هیچ دەمبازیەکیان نەبێ لەبارەی ڕووکردنتان بەرەو (بیت المقدس)، وەك باسکرا، واتە با هیچ کەس لە جوولەکەو بت پەرستەکان ڕێی قسەیان نەمێنێ ﴿إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾ مەگەر ئەوانەیان کە هەر ستەمکاربوون‌و مەبەستیان هەر سەرکێشی‌و دان نەنانە بە هەق‌و ڕاستی دا، واتە ئەوانە هەر لە قسەی ناهەق‌و ناڕەوا ناکەون، ئەوەتا جوولەکەکانیان ئەڵێن: ڕووگەی گۆڕی بۆ کەعبە، چونکە مەیل‌و ئارەزووی هەیە بۆ ئایینی گەلەکەی‌و وڵاتەکەی خۆی خۆش ئەوێ، وە بت پەرستەکانیشیان ئەڵێن: پەشیمان بوەوەو گەڕایەوە بۆ ڕووگەی باوك‌و باپیری‌و نزیکە بگەڕێتەوە بۆ ئایینەکەشیان! ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ ئینجا ئێوەش مەترسن لەوانەو باکتان نەبێ لەڕەخنەو دەمبازیان، چونکە بەوە هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنن ﴿وَاخْشَوْنِي﴾ وە لەمن بترسن، کەواتە گوێڕایەڵم بن‌و بە پێچەوانەی فەرمانم مەجوڵێنەوە.**

**هاتنە خوارەوەی ئەو هەموو ئایەتانە لەبارەی ڕووگەو گۆڕاندنیەوە بەو هەموو لێکۆڵینەوەو دڵنیا کردن لەسەر ڕاستی ئەوەی کە خوا کردی، وە دەم کوت کردنی دوژمنان‌و بێبڕواکان، ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕووداوو بەسەرهاتی ڕووگەیە ئێجگار گەورەو گرنگ بووە، وە بڕینی ئەو قۆناغە هەر زۆر سەخت بووە لەسەر موسڵمانان بە هۆی پیلان‌و فاك‌و فیکی دوژمنانەوە بە تایبەتی جوولەکە کانگاوو سەرچاوەی هەموو لاری نالەباریەکن، وە مامۆستای پیلان‌و ئاژاوە نانەوەن، باشترین بەڵگە لەسەر سەختی‌و بەتینی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتەو بڕینی ئەو قۆناغە هێنانی ئەم دوو وتەو ڕستەیە بوو بە دوای ئەو هەموو باس‌و بەیانەدا ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي﴾، وە هەروەها ئەم دوو وتەیە دەست نیشان ئەکەن بەوەی کە هەرکەس لەسەر هەق‌و ڕاستی بێت، ئەبێ بیمی لەکەس نەبێت، بەڵکو ئەبێ ئەو بیم لێ کراوبێت، وە ئەو کەسەی کەلەسەر ناهەقە ئەبێ گوێی پێنەدرێ‌و ئەبێ بەبێ نرخ سەیربکرێ، چونکە هەق‌و ڕاستی هەمیشە بەرزو بڵندە، وە دەردو نەخۆشی هەق‌و ڕاستی‌و هۆی دەرنەکەوتنی هیچ نیە بێجگە لەوەی کە ئەهلەکەی وازی لێ بێنن‌و بترسن لە**

ناهەق و ئەهلی ناهەق. لێرەدا سێ شتی کرد بە هۆی ڕووکردنە کەعبە: یەکەم ئەوەبوو کە فەرمووی: بۆ نەهێشتن و نەمانی قسەو ڕەخنەی مەردوم وەك بەدرێژی باس کرا.

دووەم: ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلِأُتِمَّ نِعۡمَتِي عَلَيۡكُمۡ﴾ وە بۆئەوەی بەهرەو چاکەی خۆم بەسەرتانەوە تەواو بکەم، بەم ڕەنگە کەعبەی کرد بە ڕووگەکە گەورەترین ماڵی خوایە لەسەر زەوی دا، وەکە باوکی هەمووان دروستی کرد لەسەر فەرمانی خوا بۆ هەموو ئادەمی، وە بەو ڕووگەیە ئەم میللەتە جیابووەوە لە هەموو گەلان و میللەتانی تر، وە سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت، کەواتە تەواوترین بەهرەو چاکەی خوا لەبارەی ڕووگەو لەو کاتەدا گێڕانی کەعبەبوو بە ڕووگە بۆ ئەم میللەتە، هەرچەند بە شێوەی گشتی و لە هەموو بارو ڕوویەکەوە تەواوترین چاکەو بەهرە ئەوە بوو کە لەدوا دوایی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) خوا هەواڵی پێدا لە ئایەتی ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ و بە هاتنە خوارەوەو دامەزراندنی ئەم ئایینی ئیسلامەو ئەم شەریعەتە جیهانیە هەتا هەتاییە.

سێیەم: هۆ ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾[1] وە لەبەر ئەوەی ڕێ ببەن بە هەق و ڕاستی و بکەونە سەر ڕێگەیەك کە ئەتانگەیەنێ بە ئامانج و مەبەست، چونکە لە ڕووی ڕاستی دا ڕووگەیەك کە خوا پێی خۆش بێت و بەرژەوەندی هەردوو جیهانی ئەم میللەتەی تێدا بێت، ئەو ڕووگەیە کەعبەیە. قورئان بەو جۆرو شێوەیە کە باس کرا بڕیارێکی قەتعی و بڕاوەی دا لەبارەی گێڕانی کەعبە بە ڕووگەیەکی هەتا هەتایی ئەم میللەتی ئیسلامە، بە جۆرێ بە تەواوی ڕوونی کردەوە کە ئەبێ هەموو موسڵمانان سەفەری بن یان نیشتەجێ بن، وەلە هەر شوێنێ بن دوور یان نزیك ڕووگەیان ئەبێ هەر کەعبە بێت بۆ هەر نوێژێ بێجگە لە نوێژی سوننەت کەلە سەفەردا بکرێ، وەك لە کتێبی حەدیس و فیقهدا باس کراوە بەدرێژیی، ئینجا چەند جارێ فەرمانی دا بە ڕوو تێ کردنی، وە لە هەر جارێکدا شتێکی تازەی لەگەڵ ووت، بەم جۆرە لە یەکەم جاردا

---

[1] ﴿وَلَعَلَّكُمۡ﴾ وێنەی لە قورئاندا لە چەند شوێندا هەیە، وە لە تەفسیرەکەی دا سێ ڕا هەیە: ١. تەنها بۆ تعلیلە، واتە لەبەرئەوە. ٢. بۆ گەیاندنی ئومێدو چاوەڕوانیە، ئەو کاتە ڕوو ئەکاتە بەندەکانی خوا، واتە بە ئومێدو چاوەڕوان بن. ٣. بۆ گەیاندنی بەڵێنو پێخۆش بوونە بەو شتەی کەلە پاش وتەی ﴿لعلّ﴾ەوە دێت، بەم جۆرە یا هەر جۆرێکی تر کە بگونجێ بەکار ئەهێنرێ بۆ خوا.

ڕایگەیاند کە ئەو فەرمانە لەبەر حەزو پێخۆش بوونی پێغەمبەرە (ﷺ) وە لەدووەم جاردا لەبەر ئەوەیە کە هەرچۆنێ حەزو ئارەزووی ئەوی لەسەرە، هەروەها هەر ئەمەش ڕاستو هەقە لای پەروەردگاری، وە لەجاری سێیەمدا بۆ نەهێشتنی قسەو ڕەخنەی مەردومە، وە نرخ نەدانە بە هەرکەس کەلەبەر دەم هەقو ڕاستی ناوەستێ، وە لەگەڵ ئەوەدا هەست ئەکەین کەلەو کاتەدا لە ناو ڕیزو گەلی موسڵمانانْدا لەبارەی ڕووگەو گۆڕاندنەکەیەوە بێ ئارامیو لاوازیەك پەیدا بوو بوو کە داخواز بوو بۆ ئەو دووبارەو سێبارە کردنەوەو ئەو هەموو دڵنیا کردنەوەو ئەو ڕوون کردنەوە، وە باس کردنی هۆی ئەو گۆڕاندنە، وە لەوەشەوە دەرئەکەوێ کە چەندە بەتینو بەهێزبووە ئەو هێرشو پیلانو پڕوپاگەندەی کە بێبڕواکان پێی هەڵسان، وە تا چ ڕادەیەك کاری کردووە لە دڵو دەروونی هێندێ کەس دا، تا قورئان بە جۆرو شێوەی خۆی چارەسەری کرد، وە ئەم چارەسەر کردنە با هەر بمێنێتەوە بە درێژایی چەرخو ڕۆژگار بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە بەسەرهاتانە لەسەر هەربارو بە هەر شێوەیەك کە ڕوو ئەدەن لەو بەربەرەکانیو پیلانو دوژمنایەتی کە دوژمنانی ئیسلام بەکاری ئەهێنن بەرامبەر ئیسلامو موسڵمانان.

ئینجا بەبۆنەی ئەو چاکەو بەهرەی کە خوا ڕشتی بەسەر ئەم میللەتەدا لەبارەی گێڕانی کەعبە بە ڕووگە، بەو بۆنەیەوە باسی بەهرەی گەورەی خوا ئەکاتو بیریان ئەخاتەوە بە ناردنی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) هەر لە خۆیان بۆلای خۆیان، کە ئەوەش بەرهەمی نزاکەی (ئیبراهیم)ی باوکیان بوو، کە قاپیەوانو کلیل داری ئەم ماڵە بەفەڕە بوو کە گێڕای بە ڕووگەی موسڵمانان، ئەفەرموێ: ﴿كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ﴾ واتە کەعبەمان گێڕا بە ڕووگە بۆ ئەمەی چاکەو بەهرەی خۆم بەسەرتانەوە تەواو بکەم لەبارەی ڕووگەوە، یان لە بارەی پاداشتی ڕۆژی دواییەوە بە وێنەی تەواوکردنی چاکەو بەهرەیان بەسەرتانەوە بەوەی ڕەوانەمان لە ناوتاندا پێغەمبەرێك لە خۆتان کە ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا﴾ ئەخوێنێتەوە بەسەرتان ئایەتەکانی ئێمە، واتە قورئان کە گەورەترین موعجیزەیەکە لە خوا دای بەو پێغەمبەر (ﷺ) هەتا هەتایە، وە هەتابێت گەورەییو پیتو فەڕی ئاشکراتر ئەبێت، ئەو قورئانەی کە هەموو ئادەمیو جنۆکە تێیدا سەرگەردانەو لە حاستی داماوو دەستە پاچەیە... بەخ بەخ لەو بەهرەو چاکەیە!!

ناردنی پێغەمبەر کە بەهرەیەکی زۆر گەورەیە، ئینجا ئەو پێغەمبەرەش لە خۆیان بێت، ئینجا بە کتێبو فەرموودەی خۆیەوە رەوانەی بکات، لەو فەرموودەیەدا رووی فەرموودەیان تێبکاتو بانگیان بکات بۆ رێی راست، بۆ کامەرانیو بەختەوەری هەردو جیهان، بەراستی زۆر پێویستە بیربکرێتەوە لەم چەکەو بەهرەیەو لەو رادە بەرزکردنەوەو لەو پلەو پایەدانە. ئایا ئەم بەندانە کێنو چین، هەتا خوا بەو جۆرە بەگەرمی بیانگرێو رووی فەرموودەیان تێبکات؟ ئەمانە کێنو چین تا خوا ئاوایان لەگەڵ بکات؟! ﴿وَيُزَكِّيكُمْ﴾ وە پاکو خاوێنتان ئەکاتەوە، بەڵێ بەراستی پاکو خاوێنتان ئەکاتەوە لە هەموو بارو رووییەکەوە، گیانو رۆحیان پاک ئەکاتەوە لە چڵکو چەپەڵی بت پەرستیو نەفامێتی، وە لە پیسی ئەو بۆچوونو تێکەیشتنانەی کە رۆحو گیانی ئادەمی بێئارامو تەنگەتاو ئەکەنو ئەبن بە بارێکی قورس بەسەریەوە، وە پاکو خاوێنتان ئەکاتەوە لە چەپەڵی ئارەزووەکانی نەفس کەلە ئادەمێتی ئەخەنو ئەیبەنە ریزی گیان لەبەرانی تر، بەڵکو پیس ترو پەست تر لەوان، وە گەلو کۆمەڵیان پاک ئەکاتەوە لە سوودو حەرام خۆریو دەستو دەم پیسیو تالانو برۆ، وە ژنیان پاک ئەکاتەوە لە دەستکاریو دەست درێژیی، وە دادو دادپەروەری بلاو ئەکاتەوە، بە جۆرێ ئادەمێتی شتی وای بەخۆیەوە نەدیوەو هەرگیز نایبینێ، مەگەر لەسایەی ئیسلامو لە ژێر حوکمی ئیسلامو بەرنامەی ئیسلام دا، وە پاکیان ئەکاتەوە لە هەر چڵکو چەپەڵیەکی تر کە رووی ئادەمیو ئادەمێتی قیزەونو ناشیرین کردووە ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ وە فێری نامەیەکتان ئەکات کە قورئانە، وە حاڵتیان ئەکات لێیو زاناتان ئەکات بە مەبەستو نهێنیەکانی، ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾و فێری کاردروستیتان ئەکات، بەم رەنگە هەموو کارو کردەوەتان بەجێبێتو هەموو شتێ لەشوێنو رادەو پلەی خۆی دا لە هەموو کارو کردەوەیەکدا پەیرەوی پێغەمبەر بکرێ (ﷺ) وەك (ئیمامی شافیعی) ئەفەرموێ: حیکمەت بریتیە لە

ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) وە ئەوەی کە ئەم وتەیە ئەیگەیەنێ، وە ئەو بەرو بەرهەمە شیرینە بەرێکی بەدی هات لەو گەل و کۆمەڵەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردەی کردن و پێی گەیاندن و پاك و خاوێنی کردن بە ئایەتەکانی خوا، ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ﴾ وە فێری شتێکیان ئەکات کەلەوەوبەر نەتان زانیوە، وە ئەو شتانەی کە بەبیریی و ژیریی نازنرێن، بەڵکو هەر لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە ئەزانرێت ـ درودی خوایان لەسەر بێت ـ بەڵێ بەڕاستی فێری شتێکی کردن کە هەر بە خەیاڵیشتاندا گوزەری نەکردبوو، ئەوەتا هەر لەبارەی ژیانەوە ئەو یەکەم گەل و کۆمەڵەی فەراهەم هێنا کە لەوەو بەر بەشێکی زۆر کەمیان ئەزانی کە دەستی ئەدا بۆ ژیانی ئەو هۆزو بەرەیە بە کەمو کوڕی و ناتەواوی، ئینجا فێری هەموو وێڵ و نوسوڵێکی کردن، وە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا جڵەوی ژیان و جیهانی دایە دەستیان و توانیان هەڵسن بەسەرکردایەتی ئادەمی و ئادەمێتی بە هەموو لێزانی و کاردروستی و ڕێك و پێکی یەوە، وە ئەو شۆڕشە گەورەو ئەو کارو فەرمانە کەس نەدیوەی پێکردن بەم قورئانەو بەو ڕەوشت و تەمێ و ئامۆژگاریە شیرینەی خۆیە کە لەم قورئانەوە وەری گرتن، وە هەر مزگەوتەکەی زانستگایەك بوو کە ئەو گەل و کۆمەڵەی لێ دەرچوو، ئەو گەل و کۆمەڵەی کە کردەوەکانیان وەك ئەستێرەی بەرە بەیان ئەدرەوشێتەوە بە ئاسمانی مرۆڤایەتیەوە هەتا هەتایە، ئەو گەل و کۆمەڵەی کە مێژووی ئادەمی شتی وای نەدیوە نە لەوەو بەرو نە لەوەو دوا! وە ئەو بەرنامەیەی کە ئەو گەل و کۆمەڵەو ئەو سەرکردایەتیەی فەراهەم هێنا و پێی گەیاند ئامادەیە بۆ فەراهەم هێنان و پێگەیاندنی چەند چین و تاقمی تر کە نوێنەری ڕاستەقینەی یەکەم بن، ئەگەر گەلی موسڵمان بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە پاك و خاوێنەکەی، وە بە ڕاستی بڕوا بێنێ بەم قورئانەو بیکات بە بەرنامەی ژیانی، نەك هەر وتەو وشەی ڕووت کە بە ئاواز بخوێنرێتەوە بۆ خۆشی.

ئینجا دوایی یاساکە ئەهێنێ بە بەهرەو میهرەبانیەکی تر، لە کاتێکدا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ ئەوەی سوپاسی بکەن و خۆیان بپارێزن لە سپڵەیی و ناسوپاسی و بێبڕوایی، ئەفەرموێ: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ کەواتە ئێوە باسی من بکەن و یادی من بکەن منیش باس و یادی ئێوە ئەکەم، باس و یادی ئێمە بۆ خوا ووتنی ڕووت نیە بەزمان، بەڵکو لەڕاستی دا بریتیە لە

یادو حاڵێکی دەروونی، ئیتر وتنی لەگەڵ بێت یان نە ؟ وە هەست کردن بە بوونی خوایەو ئەو ناوو سیفەتو نیشانانەی کە بۆ خۆی دایناون، هەستێکی وا کە لای خواروومەکەی بگاتە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری فەرمانەکانی خوا (جل شأنە) ئینجا لەوێوە بەرز ئەبێتەوە بۆ ئەوەی چاوو دڵی هەر خوا ببینێ بە تەنهاو ئیتر هیچی تر نەبینێ لەگەڵ، وە هەروەها شتێکی تری لە بیربچێتەوە، ئەوەش بۆ کەسێکە کە خوا ئەوەی پێ ببەخشێو شیرینی لیقاو گەیشتن بە خوای پێ بچەژێ.

زانایانی تەفسیر بەدەجۆر ئەم فەرموودەیان تەفسیر کردووەتەوە، وە هەروەهایان لە بارەی ئێمەوە ئەگەڕێتەوە بۆ گوێ ڕایەڵی و پەرستن، جا لەبەرئەوە لەبەر ئەوە (سەعید کوڕی جوبەیر) -خوا لێی ڕازی بێ- فەرموویەتی: باسم بکەن بە گوێڕایەڵی، وە لەبارەی خواوە ئەگەڕێتەوە بۆ پاداشت دانەوەو دەرخستنی ڕێزو ڕەزامەندیی، واتە ئێوە باسو یادی من بکەن بە گوێڕایەڵی و پەرستن، منیش باسی ئێوە ئەکەم بە پاداشت دانەوەو دەرخستنی ڕێزو ڕەزامەندی! بە هەر حاڵو لەسەر هەربار بەڕاستی دیمەنو حاڵەتی فەرموودەکە ئێجگار پاڵ پێوەنەرو ڕاکێشەری سۆزو پەرۆشە، وە مافی ئەوەی هەیە بەندەی بڕوادار لە خۆشی دا پەڕو باڵ دەرکات، وە لە شەرمو شکۆدا بتوێتەوە! وەرە بیرێکی لێ بکەرەوە، وەك خۆی کردبێ بە هاوڕێو هاوسەری بەندەکانی و بەرامبەر باسی ئەوان بۆی ئەویش باسی ئەمان ئەکات، بەڕاستی زۆر سەیرەو هیچ زمانو هیچ پێنوسێ ناتوانێ ڕادەو پلەی ئەو بەهرەو میهرەبانیە دەرخات!! هەر لەدەست دەریای بێ پەیو سنوری ئەو دێت بەهرەو میهرەبانی ئاوای لێ بباریێ! خوای گەورە فەرمان ئەدات کە ئێمە باسی ئەو بکەین بە گوێڕایەڵی بەدڵو بەلەش، کەواتە بە یەك جار گشتیە بۆ باس بە زبانو باس بەدڵو باس بە ئەندامەکان.

یەکەم: بەسوپاسوسەناوخوێندنی قورئانەکەیو هەروتەیەکی ترکەئەوفەرمانی پێدابێ.

دووەم: بەبیرکردنەوەی لە هەموو سیفەتەکانی و لەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی کە بەم بوونەوەرەدا داینا‌ون، وە بەبیرکردنەوە لە بەڵێنو هەڕەشەکانی.

سێیەم: بە بەکار هێنانی هەمووئەندامەکان لە هۆی ڕەزامەندی خواو دوور خستنەوەیان لە هەر شتێ کە خوا پێی ناڕازیە،

وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ﴿١٥٤﴾

---

**﴿وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ﴾ وە سوپاسم بکەن لەسەر ئەو چاکەو بەهرەی کە ڕشتم بەسەرتاندا، وە ناسوپاسیو سپڵەیی مەکەن بەمەی دان نەنێن بە چاکەو بەهرەکانم دا، وە یاخی بنو سەرپێچی بکەن لە فەرمانم، یان بێبڕوا مەبن پێم بەم ڕەنگە باسو یادو سوپاسم نەکەن کە ئەوەش سەری لە بێبڕواییەوە دەرئەچێ، وە سوپاسی خوا چەند پلەیەکی هەیە، دەست پێئەکات لەدان نان بە چاکەو بەهرەی خواو شەرم کردن لە گوناهو سەرپێچی لە فەرمانی، وە دوا پلەی بەوە ئەبێ کە بەندە لێ ببڕێ بۆ سوپاسو چاو لەبەری خوا بەلەشو بە زمانو بەدڵ، تا موسڵمانان یادو باسو سوپاسی خوایان کردو چاولەبەری بوون خوایش هەر لە جیهاندا پاداشتی دانەوە بەمەی باسو ناوبانگی بەرزکردنەوە لە جیهاندا، وە دەسەڵاتی پێدانو سەری خستن تا ڕادەیەك سەرکردایەتیو جڵەوی جیهانی خستنە دەست، ئینجا کاتێ خوای خۆیانیان لە بیرچووەوە خوایش ناوو نەمێشتنو ئەو چاکەو بەهرەیەی لێ گرتنەوە تا بوون بە ژێر دەستەو پێشێل کران، وە بێگومان هەرکاتێ بگەڕێنەوە بۆلای خواو بە پێی فەرمانی ئەم ئایەتە بجوڵێنەوە خوایش دەروویان لێ ئەکاتەوە، وە دەرمانی هەموو دەردێکیان پەیڕەوی کردنی فەرمانی ئەم ئایەتەیە، کە باسەکەی پێ دوایی هێنا.**

**لەپاش باسو دیاری کردنی ڕووگە، وە جیا کردنەوەی ئەم میللەتەو گێڕانی بە گەلو میللەتێکی سەربەستو سەربەخۆ، وە گێڕانی بە میللەتێکی ناوەندیی چاودێرو شایەت بەسەر ئادەمیەوە، لەپاش ئەمانە ئینجا یەکەم تەمێو ئامۆژگاری بۆ ئەم میللەتە ئەمەیە کە کۆمەکیو یارمەتی داوا بکەن بە خۆگرییو نوێژ لەسەر هەڵسانیان بەو ئەرکە گەورەی کە خراوەتە سەر شانیان، وە بە ئامادەبوونیان بۆ فیداکاری بە گیانو بە ماڵ بۆ دامەزراندنو چەسپاندنی ئایینو بەرنامەکەی خوا لە دەروونی خۆیانو لە ژیانی خۆیانو مەردومو جیهان ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱسۡتَعِينُواْ**

﴿بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ كۆمـەكی داوا بكـەن بـە خـۆگری و بـە نوێـژكردن و ئـەو دوو شـتە بكـەن بـە یارمەتی دەری خۆتان لە هەڵسانتان بەو ئەرك و فەرمانانەی كە داواتان لێ كراوەو خراوەتە سەرشانتان.

فەرمان دان بە خۆگری و خۆگرتن لە زۆر شوێندا هاتووە لە قورئاندا، چونكە خوا ئەزانێ كە ئەركی ڕاوەستان لەسەر ڕێگەی خوا بەڕێكی و بێ ئەم لاوئەولا، وە ئەركی ڕاگیر كردن و پاراستن و چەسپاندنی ئایینی خوا زۆر گرانەو بەبێ ئەو خۆگری و دامەزراویە ناكرێ و ناڕوا بەڕێوە.. پێویستە خۆگری لەسەر بەجێهێنانی عیبادەت و گوێڕایەڵی فەرمان، وە خۆگری لە خۆگرتنەوە لە گوناهو تاوان، وە خۆگری لەسەر تێكۆشان و بەربەرەكانی دوژمنەكانی، وە خۆگری لەسەر پیلان و پڕوپاگەندە، وە خۆگری لەسەر درێژە كێشانی جەورو ستەم و بەلا و ناڕەحەتی بەبێ دەروو لێ كردنەوەی خواو هاتن بە هاوارەوە، وە خۆ گری لەسەر درێژە كێشانی ئاژاوەو دوژمنایەتی سەخت و بەتین، وە خۆگری لەسەر كەشخەو شادمانی ناهەق، وە خۆگری لەسەر تەنیایی و كەمی یارمەتی دەر، وە خۆگری لەسەر كەللە بۆشی دوژمنە گومڕاكان، ئینجا كاتێ كاتێ كە ماوەی تێكۆشان زۆر درێژە بكێشێ و سزاو مەینەت سەخت بێت، خۆگری بێ هێزو لاواز ئەبێت، یان هەر نامێنێت، ئەگەر توێشوو یارمەتی دەرو دڵ بەهێزكەرێك نەبێت، جا لەبەرئەوە نوێژی كرد بە هاوسەر بۆ خۆگریەكە، چونكە نوێژ سەرچەشمەیەكی هەمیشەییەوشك ناكات، وەتوێشوویەكی دوایی نەهاتووە،سەرچەشمەیەكە كە هێزو وزە تازە ئەكاتەوە، وە خۆراك و توێشوویەكە كە دڵ تێر ئەكات، بەهۆی ئەوەوە خۆگریەكە بەهێز ئەبێت و دوایی نایەت، ئینجا بێجگە لەوانەش دڵپڕئەكات بە ڕەزامەندی و خۆشی و ئارام و دڵنیایی، بێگومان ئەم ئادەمیە كە دەسەڵات و توانای تا ڕادەیەكەو سنوورێكی هەیە، هەركاتێ زۆری پێكەیشت، وە كاتێ هێزی شەڕی نهێنی و ئاشكرا بەرەنگاری وەستا، وە هەركاتێ پێ‌گیرا بەدەست هێزی ئارەزوواتی نەفس و خۆشی جیهانەوە، وە كاتێ باری جەورو ستەم قورس و گران بوو لەسەر شانی درێژەی كێشا، وە كاتێ بینی خۆی تابێت بەرەو كزی ئەڕوات، وە بەبێ بەرهەم و دەستكەوتێكی وا، وە هێزی شەڕی بینی تا بێت گەشە ئەكات و بافیش ئەكاتە خۆی، ئادەمی كاتێ دووچاری ئەم جۆرە

بەسەرهاتانە هات بە ناچاری پەنا ئەهێنی و ئەبێ پەیوەندی بکات بە خوای پەروەردگارەوەو کۆمەکی لێ داوا بکات، دە بێگومان نوێژ چاکترین و بەکەڵك ترین ڕێگەیە بۆ ئەو پەیوەندی و پەیوەستیە، جا لەبەرئەوە پێغەمبەر خۆشەویست (ﷺ) لەکاتی تەنگی و ناڕەحەتی دا ئەیفەرموو: ئەی بیلال خۆشی و ڕەحەتیمان پێبدە بە نوێژکردن، بەم ڕەنگە بانگ و قامەتی بۆ بکات، وە هەرکاتێ کارو بەسەرهاتێکی ناخۆش ڕووی تێبکرایە پەلاماری نوێژی ئەداو نوێژی زۆری ئەکرد.

ئەم ئایینە بەرنامەی خواپەرستیە، وە هەندێ لە سوودو بەرهەمی خواپەرستی ئەمەیە کە خۆراك و توێشووی ڕێگەیە، وە کۆمەکی و یارمەتی دەری ڕۆحە، وە پاك کردنەوەی دڵە لە هەموو تەم و خەمێك، خوای گەورە بە نوێژ پێغەمبەری گەورە کردووە، پەروەردەی کردو پێی گەیاندو ئامادەی کرد بۆ هەڵسانی بەو کارە گەورەیە، ئەوەبوو کە فەرمانی پێدا لەسەرەتاوە کە شەو هەر نوێژ بکات مەگەر بەشێکی کەمی.

نوێژی خواپەرستیەکە کە دڵ ئەکاتەوە، وە پەیوەستی بە خواوە بە هێزئەکات، وە ئەرکی سەرشان سووك ئەکات، وە ڕووناکی ئەخاتە دەروون، وە ئارام و خۆشی ئەخاتە دڵ، بەڵام ئەو نوێژەکەی کە نوێژی ڕاستەقینە بێت، جا لەبەرئەوە تەمێی بڕواداران کردو فەرمانی دا بەخۆگری و نوێژکردن تا بتوانن هەڵسن بە ئەرکی سەرشانیان و فەرمانەکانی خوا بە ئاسانی بەجێئەهێنن، ئینجا ئەم بەڵێنە گەورەیەشی پێدان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ بەڕاست خوا لەسەر ئەم بارە خۆگرەکاندایە، لەگەڵیاندایە بە شێوەیەکی تایبەتی، یارمەتی ئەدا، دامەزراویان ئەکات، بەهێزیان ئەکات، دڵ ئارامیان ئەکات.

خۆگری و خۆگرتن خوو ڕەوشتێکی زۆر گەورەو گرنگەو زۆر پێویستە بۆ بڕواداران، جا لەبەرئەوە ئەوەندە بە گرنگ گیراوە لە قورئاندا، وە حەدیسی زۆر هاتووە لەشانی دا، بێگومان ڕێگەی بڕوادارانی ڕاستەقینە سەختەو چەند کۆسپ و گرێ و پلەی دێتە ڕێیان لە کاتی تێکۆشانیان بۆ بڵاوکردنەوەو چەسپاندنی ئایینەکەیاندا.

کوشتن و بڕین و دەربەدەری و لەدەست چوونی دارایی و سامان و کەم و کوڕی بەرهەم، جا ئەوا قورئان ئەوانە ئەخاتە بەرچاوو مژدەیان پێئەدات لەسەر خۆگریان لەو بەسەرهاتانەدا،

لەیەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن یُقۡتَلُ فِی سَبِیلِ ٱللَّهِ أَمۡوَ ٰتُۢۚ﴾ ئەوانەی کەلە ڕێگەی خوادا ئەکوژرێن پێیان ئەڵێن: ئەوانە مردوون و بەمردوو ناویان مەبەن ﴿بَلۡ أَحۡیَاۤءࣱ﴾ بەڵکو ئەوانە زیندوون ﴿وَلَـٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ﴾ بەڵام ئێوە هەست ناکەن بەزیندوویییەکەیان.

ئەو خوا پێداوانە دروست نیە بە مردوویان دابنێین، وەك دروست نیە بە مردوویان ناو بەرین، ئەوەش بە شایەتی خواو بەپێی فەرموودەی خوا، بەڵێ ئەوانە لەبەرچاوو بە دیمەن و ڕووالەت کوژراون و مردوون، بەڵام ئەبێ بزانین زیندوویی و مردوویی هەر ئەوە نیە کە ئێمە ئەیزانین، وە بەسە بۆ هەموو بڕوادارێ کە خوا هەواڵ ئەدا بەمەی کە ئەوانە زیندوون، ئیتر با ئێمە تێنەگەین لە جۆری ئەو زیندوویییە.

ئەوانە زیندوون بۆیە ناشۆررێن وەك مردووەکان، وەکفن ناکرێن وەك مردووەکان، بەڵکو ئەمان هەر بە پۆشاکەکەی خۆیانەوە ئەنێژرێن، ئەمانە زیندوون و پاکن پێویستیان بە شۆرین نیە، وە ئەمانە نەمردوون کەواتەپۆشاکەکەیان لەبەر داناکەنین. هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: مەبەست زیندووی ڕۆحیە، وە هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست زیندوویی ناوبانگ و باسیان بە چاکەو کارکردنی کردەوەکەیان لە دڵی مەردوم دا، وە بێجگە لەم دوو ڕایە چەند ڕای تریش هەیە، بەڵام بەڕاستی هیچ پێویست نیە لادان لە دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکە، وە نابێ ئێمە هەموو شتێ ڕێك بکەین لەگەڵ باوو زانینی خۆماندا، چەند شتی نهێنی نەناسراوو نەزانراو لەم جیهان و بوونەوەرەدا هەیەو با ئەمەش یەکێ بێت لەو شتە نهێنی و نەزانراوانە، ئەوانە زیندوون و کەس و کارە خواناسەکانیان بە زیندوویان دائەنێن لەبەرئەوە دڵ غەمگین و نارەحەت نابن بە کوشتنەکەیان، بەڵکو موژدە بەخش ئەبن پێی! ئینجا زیندوون و ڕیز لێ گیراون لای خوا، پاداشتی گەورەو تێرو تەواویان هەیە وەك لە چەند حەدیسی صەحیح دا هاتووە، بەڵام ئەو ڕێزو پاداشتە گەورەیە بۆ کێ ئەبێت و ئەو شەهیدانە کامەن؟ بێگومان ئەوانەن کە تەنها لەبەر خواو لە ڕێی خوادا ئەکوژرێن، وە بەبێ هیچ مەبەست و نیازی تر وەك ئەوەش ڕوون کراوەتەوە لەچەندحەدیسێکی صەحیحی تردابەجۆرێ هیچ تەم غوبارێکی بەسەرەوە نەماوە.

وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ (١٥٥) ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ (١٥٦)

ئینجادیسان ئەبڕواثامادەکردنی بڕواداران و تەمێیان ئەکات کە چۆن بن لە کاتی ڕووداوو بەسەرهاتی سەختدا، وەچۆن وەری گرن و بچن بەپێشوازیەوە؟ ئەفەرموێ: ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ﴾ سوێن بەخوا تاقیتان ئەکەینەوەبە کەمێك لە ترس و ﴿وَٱلۡجُوعِ﴾ برسێتی و قات و قڕی و ﴿وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ﴾وە کەم کردنەوەلەسامان ومالات ﴿وَٱلۡأَنفُسِ﴾ وەلەخۆتان بەکوشتن و مردن و نەخۆشی ﴿وَٱلثَّمَرَٰتِ﴾ وە لەبەرهەم ودەرامەتدابە ئاگرو ئافات، واتە ئەو جۆرە بەسەرهاتانەتان بەسەر دێنین دەرکەوێ کامتان خۆگرن ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وە مژدە بدە ئەی پێغەمبەر بەو خۆگرانە، بێگومان بڕوادران پێویستن بەو پەروەردەکردن و تای کردنەوە بۆ ئەوەی هەڵسن بە ئەرکی عەقیدەو بڕواکەیان، تا خۆشەیست و بە نرخ بن لە دڵیان و هەرگیز دەست بەرداری نەبن، چونکە هەر شتێ بەڕەنج و زەحمەت کەوێ لای خاوەنەکەی بەنرخ ترو بەرێز ترە، بەڵام هەر شتێ بە سووك و ئاسان دەست کەوێ، بە ئاسانیش دەست پێوە ئەنرێ و دەست بەرداری ئەبێ، وە هەروەها هەرشتێ بە ڕەنج و زەحمەت دەست کەوێ لای مەردومی تریش بە نرخ دار سەیر ئەکرێ و لەوانەیە ئەوانیش هەوڵی بۆ بدەن، وە بێجگە لەوەش ئەو جۆرە بەسەرهاتانە مەردوم پاڵفتەئەکەن و چڵك و چەپەڵی پێوە ناهێڵن، وە هەرکەس لەو تاقی کردنەوەدا چەپەڵیان پێوە نامێنێ. گرنگ تر لە هەموو شت ئەوەیە هەرکەس لەو تاقی کردنەوەدا دەرچێت فێری پەنا بردن بە خواو پشت بەستن بە خواو گەڕانەوە بۆ لای خوا ئەبێت، کە ئەوەش بەرزترین پلەیە بۆ بڕوادر، وەك دەرئەکەوێ لەمەی کەلە باسی ئەو خۆگرانەدا ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ﴾ واتەئەوخۆگرانەکەکسانێکن کاتێ بەڵا وناڕەحەتیەکیان دووچار بوو ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەڵێن: ﴿إِنَّا لِلَّهِ﴾ بێگومان ئێمە بەندەو موڵکی خواو دروست کراوی خواین، ﴿وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ وە ئێمە هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێینەوە لە ڕۆژی دوایی دا، واتە هەرچی خوا بیکاو هەرچیمان بەسەربێنێ ڕاستەو مافی خۆیەتی، وە ئێمە ڕازین بە هەر بڕیارێکی خوا، وە ئێمە بڕوامان هەیە بە زیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵەی خوا، وە ڕازین بە هەر پاداشتێ کە خوا بەڵێنی پێداوە، بێگومان مەبەست تەنها ووتنی ئەم وتەیە نیە، بەڵکو ئەبێت لە پێشەوە لەناخی دڵەوە هەڵقوڵێ و زمان دەرخەری ئەوە بێت کە لە دڵ دایە،

**ئەو کاتە شایان و شایستە ئەبێت بەم بەڵێنە گەورەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ﴾ ئەوانەی کەلە کاتی بەسەرهاتی سەخت و ناخۆش دا بەو جۆرەن کە باس کرا ئەوانە دائەبارێ بەسەریاندا لەلایەن پەروەردگاریانەوە چەند وەسف و سەنا و لێ بوردن و میهرەبانی و بەزەیی ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ وە هەر ئەوانە ڕێنومایییان وەرگرتووە و ڕێیان بردووە بەهەق و ڕاستی و ڕێی ڕاست، ئەوانە کە بێ چەندو چوون و گیرو گرفت مل کەچ بوون بۆ خوای خۆیان، وە ڕازی بوون بە هەموو حوکم و بڕیارو فەرمانێکی و لاڵەو پانایان هەر بۆ لای ئەوە، ئەوانە شیاوو شایانی ئەو مزگێنیەبوون کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندن لەلایەن پەروەردگارەوە.**

**بەڕاستی مزگێنیەکە ئێجگار گەورەو بەنرخە، هەموو بڕواداری پێویستە لەهەر بەسەرهات و تەنگاوە و سەختیەك دا بیری لێ بکاتەوە و بیکات بە دەرمانی دەردی و تیماری زامی، مزگێنیەکە هەر زۆر گەورەیە، خەلیفەی دووەم -خوا لێی ڕازی بێ- وتەیەکی زۆر فەرمووە دەربارەی: (نعم العدلان) زۆر چاکە هەردوو تای بارەکە، واتە سەڵاوات و ڕەحمەت، (نعم العلاوة) وە زۆر چاکە سەربارەکەش، واتە: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾، ئینجا پێویستە لەسەر تێکۆشەرانی ڕێی خوا لێرەدا بوەستن و بیرێك بکەنەوە لەمەی کە خوای گەورە ئەو هەموو بەڵا و بەسەر هاتە سەختەی خستەتایەکی تەرازووەکەو بەرامبەر ئەوە ئەم مزگێنیەی خستە ئەو تاکەکەی تری، ئیتر هەر ئەوەو هیچ بەڵێنی سەرکەوتن و زاڵ بوون و هیچ دەسکەوتێکی نەدا، چونکە خوا ویستی گەلی بڕوادار ئامادەو پەروەردە بکات بۆ کارێکی زۆر گەورە، گەورەتر لە خۆیان و لە ژیانیان و لە هەر خۆشی و شادمانیەکی ئەم جیهان و زەویە، ئەو کارە گەورەش بریتیە لە تێکۆشان و فیداکاری لە ڕێی ڕەزامەندی خواو چەسپاندنی ئایین و فەرمانی خوادا، جا لەبەرئەوە ویستی ئەو بڕوادارانە خۆیان ڕووت بکەن و داڕنن لەهەر مەبەست و ئامانج و ئاواتی تر، وەلە هەر داخوازو ئارەزوویەکی تر، تەنانەت ئارەزوو سەرکەوتنی ئایینی خوا لەسەر دەستی ئەواندا، بەکورتی ویستی لێ ببڕێن تەنها بۆ گوێ ڕایەڵی ئایین و بانگەوازەکەی ئەو، بە ئومێدو چاوەڕوانی ڕەزامەندی ئەو بەبێ تێکەڵ کردنی هیچ شتێ تر، ئینجا دوای ئەوە هەر سەرکەوتن و زاڵ بوون و دەسەڵاتی کە خوا نوسیبێتی، ئەوە هەمووی بۆ ئەو ئایین و بانگەوازەیە کە ئەوان هەڵیان گرتووە و گرتوویانەتە گەردن.**

﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨﴾

ئینجا لەم بیست ئایەتی داهاتووەدا ئەیەوێ ڕێك و پێك کردنی چەند یاساو بنەڕەتێك کە بۆچوون و تێگەیشتنێکی ڕاست و ڕەوای بڕوای لەسەر ڕاگیرەو دانەمەزرێ، لەگەڵ بەردەوامی لەسەر بەرەنگاری جوولەکەکانی مەدینە کە هەمیشە خەریك بوون و کۆتاییان نەئەهێنا لە بێئارام کردن و دوو دڵ کردنی مەردوم لەو یاساو بنەڕەتە ئیسلامیانەدا، وە شاردنەوەو دان نەنان بەو هەق و ڕاستیەی کە ئاگاداربوون پێی، وە نیشان دانی هەق بە ناهەق و ناهەق بە هەق، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو یاساو بنەڕەتانە ڕێك و پێك ئەکاتەوە، نەك بە تایبەتی سەبارەت بە جوولەکە، جا لەبەرئەوە بەبۆنەی باسی ڕووگەوە کە تێپەڕی کرد یەکەم جار باسی سەفاو مەروە ئەکات کە نیشانەیەك بوو لە نیشانەکانی خواپەرستی و چەند باوێکی نەفامی تێکەڵ کرابوو، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی سەفاو مەروەکە دوو شاخی بچکۆلەن لە پاڵی کەعبەدا، لە نیشاننەکانی ئایینی خوان، واتە هات و چۆ لە بەینی ئەو دوو شاخەدا حەوت جار لە خواپەرستیە، لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە چەند ڕیوایەتێك هاتووە نزیك تریان لە دڵەوە ئەو ڕیوایەتەیە کە ئەفەرموێ: هێندێ لە موسڵمانان بەڕەوایان نەئەزانی گەڕان و چەرخە کردن لە بەینی سەفاو مەروەدا لەکاتی حەج و عەمرەدا، لەبەرئەوەی کە لەسەردەمی نەفامی دا ئەوەیان ئەکرد، وە لەو چەرخ و سەردەمەدا دوو بتیان دانابوو بەسەر ئەو دوو شاخەوە: (ئەساف) بەسەر سەفاو (نائیلە) بەسەر مەرەوەوە، بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان پێیان ناخۆش بوو سەفاو مەروە کردن، وەك لەسەردەمی نەفامی دا ئەکرا.

(ئیمامی بوخاری) حەدیس ئەهێنێ لە (عاصمی کوڕی سولەیمان)ەوە کە ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە (ئەنەس) -خوا لێی ڕازی بێ- لە سەفاو مەروە، ئەویش فەرمووی: ئێمە لامان وابوو کە ئەوە لەباوی سەردەمی نەفامیە، لەبەرئەوە کە ئیسلام هات خۆمان لێ

گرتەوەو بە خراپمان دائەنا، ئینجا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە، وە هەروەها لەو کاتەدا مەککە بەدەست بت پەرستانەوەبوو، بەڵام هیچ دوور نیە هێندێ لە موسڵمانان بە یەکە یەکە بۆیان ڕێك کەوتبێ چوون بۆ حەج و عەمرە، وە ئەو موسڵمانانە خۆیان گرتبێتەوە لە سەفاو مەروە کردن، وە ئەو خۆ گرتنەوەش بەرهەمی ئەو پەروەردە کردن و گۆڕاندنە بوو کە ئیسلام بەسەری هێنان تا ئەو ڕادەیەبێزاری کردن و دووری خستنەوە لە هەر کاروبارێکی سەردەمی نەفامی، وە دەروونیان گرژ ئەبوو و دائەچڵەکا کەهەر کارو کردەوەیەك کە بۆنی باوی سەردەمی نەفامی لێ بهاتایە، وە مەترسیان ئەکرد کەلە ئیسلامدا قەدەغەبێت، وە لەڕاستی دا ئیسلام ئەوەیە، ئیسلام بریتیە لە خۆ داڕنین و دەرچوون بە تەواوی لە هەموو شتێکی نەفامی، وە هەر کارو کردەوەو باوێکی چەرخی نەفامی بکرێ ئەبێ لەسەر ڕاو فەرمانی ئیسلام بێت وە بەناوی ئیسلامەوە بێت، جا لەبەرئەوە ئیسلام هەر شتێکی سەردەمی نەفامی کە هێشتبێتیەوە پاك و خاوێنی کردووەتەوەو بچڕیویەتی لەوو پەیوەستی کردووە بە خۆیەوە، ئەو کاتە موسڵمان هەرکام لەوانەی بەجێبهێنایە لەبەر ئیسلام و بەناوی ئیسلامەوە بەجێی ئەهێنا، نەك لەبەرئەوە کەلەوەو بەر هەر باو بووە، بۆ وێنە ئەم سەفاو مەروە کردنە کە تێکەڵی بت پەرستی کرابوو لەبەردەمی دوو بت دا ئەکرا، ئیسلام پاك و خاوێنی کرد لە دروشم و نیشانەی بت پەرستی و پەیوەستی کرد بە خۆیەوە، ئیتر لەپاش ئەوە موسڵمان کە بەجێی ئەهێنێ لەبەرئەوەیە کە ئیسلام ڕەوای داوەو کردوویەتی بە نیشانەی خواپەرستی و ئیتر بیم و ترس نەما لە بەجێ هێنانی، چونکە کارو فەرمانەکە کارو فرمانێ ترەو نیازەکە نیازێ ترە، لەپاش ئیسلام بە جێئەهێنرێ لەبەرئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ﴾ ئینجا هەرکەس نیازی حەجی ماڵی خوای کرد یان نیازی عەمرەی کرد و خەریك بوو پێیانەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ هیچ گوناهو حەرەجێکی لەسەر نیە لەمەی کە گەڕان و هات و چۆیکات لەبەینی ئەو دوو شاخەدا بەو جۆرو شێوەی کە زانراوو بەناوبانگە، واتە هیچ مەترسیەك نیە لە کردنی دا، لەبەرئەوەی کەلە چەرخی نەفامیدا کراوە، بەڵکو شتێکی ڕەوایەو شەرعیە، ئیتر ئایا سوننەت بێت، وەك ئەگێڕنەوە لە (ئیمامی ئەحمەد)ەوە

که (ئەنەس)و (ئیبن و عەباس)و (ئیبن و زوبەیر)یشە لەسەرە، یان واجیب بێت، وە (ئیمامی حەنەفی) لەسەرە، یان فەرزو ڕوکنە وەك (ئیمامی مالیكو شافیعی) ئەفەرموون ـ خوا لە هەمووان ڕازی بێت ـ، وە هەروەها ئیسلام زۆربەی کردەوەکانی حەجی دان پیا ناو هێشتنیەوە، لە پاش پاكو خاوێن کردنیان لە هەر شتێك کە پەیوەندی بە بت پەرستیەوە هەبوو، وە پەیوەستی کردن و گێڕانی بە کردەوەیەکی ئیسلامی، بەناوی ئەوەی کەلەو نیشانانەن کە خوا داینـاون و (ئیبراهیم) فێری کردن، وەك بەدرێژیی باسیان دێت لەباسی حەجدا لە شوێنی تایبەتی خۆی دا، وە عەمرەش وەك حەج وایە بەس عەمرەکاتی تایبەتی بۆ دیاری نەکراوەو وەستانی عەرەفەشی نیە، ئینجا بۆ ئەوەی هیچ لەدڵ نەمێنێ بەرامبەر ئەو تەواف و گەڕانەوە، دەست نیشان ئەکات بەوەی کە کردەوەیەکی چاکەلە کۆتایی ئایەتەکەدا: ئەفەرموێ: ﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ هەرکەس گوێڕایەڵی ئەکات بەچاکی، یان گوێڕایەڵی ئەکات بە کردنی کارێکی چاك ئیتر حەج یان عەمرەو سەفاو مەروە کردن یا هەر کردەوەیەکی چاك ﴿فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا پاداشت دەرەوەیەکی زۆر زاناو ئاگایە، ئەزانێ بە هەر کردەوەو ئەندازەو چۆنێتی کردەوەکان، کەواتە هیچ شتێ زایە ناکات و پاداشتی تەواوی ئەداتەوە، واتە هەرکەس کردەوەیەکی چاك بکات بۆ خوا بێگومان خوا بەوە ڕازیەو خۆشەو پاداشتی لەسەر ئەداتەوە، بەڵام بە جۆرێ ئەفەرموێ بڕوادار شەرم ئەیگرێ و لە شەرمدا لەوانەیە نەتوانێ سەر بەرزبکاتەوە، چونکە ڕواڵەتی ووتەی (شاکر)وا نیشان ئەدات کە خوا سوپاسی بەندەکەی ئەکات!! لە میهرەبانی و بەزەییە بێ سنوورەکەی بە زیاد بێت، ئینجا بەبۆنەی باسی سەفاو مەروەوە هێرش و هەڕەشەیەکی زۆر سەخت و سامناك ئاڕاستەی ئەوانە ئەکات کە ڕێنومایی و ئایەتە ڕوونەکانی خوا ئەشارنەوە کە ئەوانەش گەل و کۆمەڵی جوولەکە بوون کە بەدرێژیی لەم سورەتەدا باس کران، کەلەوەوە دەرئەکەوێ کە پیلان و نالەباریان لەبارەی ڕووگەو حەجەوە نەبووەو هەر بەوەوە نەوەستاون،

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ
يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۚ
وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ

---

ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ ﴾ بەڕاستی کەسانێ کە ئەو ئایەتە ڕوونانە ئەشارنەوە کە ئێمە ناردوومانەتەوە خوارەوەو بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکران لەسەر حەق و ڕێی ڕاست، کە هەندێ لەوانە ئەو ئایەتانەیە کەلە (تەورات و ئینجیل)دا هاتوون لەبارەی ڕاستی پێغەمبەرێتی (محمد)ەوە، وە ئەو ڕێنموونیانە ئەشارنەوە کە ڕێی ڕاست نیشان ئەدەن و پێویست ئەکەن بەبڕوا هێنان و شوێن کەوتنی محمد، کە ئەوانەش ئەشارنەوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ﴾ لەپاش ئەوەی کە بەڕوونی ئێمە باسمان کردووە بۆ ئادەمی لەنامەی خۆماندا، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەو کەسانەی کە ئەوە ئەکەم خوا دەریان ئەکات لە میهرەبانی خۆی و نەفرینیان لێ ئەکات ﴿وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ وە نەفرینیان لێ ئەکەن نەفرین کەرانی مەلائیکەو ئادەمی و جنۆکە، واتە داوای نەفرینی خوایان بۆ ئەکەن، یا دوور ئەکەونەوە لێیان و خەشم و بێزاری دەر ئەبڕن لێیان و یەخەیان لێ هەڵئەتەکێنن، ئەم ئایەتە هەرچەند هاتە خوارەوە سەبارەت بە زانایانی نامەدار بە تایبەتی جوولەکە کەباسی ئیسلام و پێغەمبەریان شاردەوە کە بەڕوونی لە (تەورات و ئینجیل)دا باسی کرابوو، هەرچەند لەبارەی ئەوانەوە هاتە خوارەوە، بەڵام تایبەتی نیە بەوانەوە، بەڵکو گشتیە بۆ هەر کەس لە هەر شوێن و لە هەر شەرخێ کەلە دەستی قەسد هەر هەقێ بشارێتەوە کەلە لایەن خواوە هاتبێ، یا پێچی تێ بخات و بای بدا بە بارێکی ناڕاست و ناڕەوادا لەبەر هەر مەبەست و دەست کەوتێك لەم جیهانەدا، بە تایبەتی ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ و ڕێی ببێ ڕاستەکە دەربخات، وە بێگومان خوا ئاگاو زانایە بە هەموو شتێ و هیچ کەس هیچ فڕو فێڵی بۆ ناکرێ، خوای میهرەبان هەموو کات قاپیە پان و فراوانەکەی لەسەر پشتە بۆ هەرکەسێ کەلە کاتی خۆی دا بگەڕێتەوە، لەبەرئەوە سەبارەت بەو تاوانبارانەش ئەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾ بێجگە لە

کەسانێ کە پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە لەوەی کە کردیان ﴿وَأَصۡلَحُوا۟﴾ وە ئەوەی کە تێکیان داوە چاکی ئەکەنەوە، بەم ڕەنگە هەرچیان دەست کاری کردووە وەك خۆی لیٚ بکەنەوە بەو جۆرەی کە خوا ڕازیە، وە هەرکەسێکیان لە ڕێگە ترازاندووە بیهێننەوە سەر ڕێی ڕاست، ﴿وَبَيَّنُوا۟﴾ وە بەڕوونی ئەوەی کە خوا ناردی‌و مەبەستە لای باسی بکەن‌و دەری بخەن، یان بە ڕوونی‌و بەبێ پێچ‌و پەنا باسی کردەوەو بەسەرهاتی خۆیان بکەن کە بەو جۆرە ئەو تاوانەیان کردو ئێستا پەشیمانن‌و پێچەوانەی ئەوەی پێشوو ئەجولێنەوە، وە هەروەها هەرکەس بە هەر بیروباوەڕێك سەر تێك بدا لە مەردوم ئەبێ بەو جۆرە تۆبە بکات ئەگینا خوا لێی وەرناگرێ، ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئینجا ئەوانەی کە بەو جۆرە ئەگەڕێنەوە، تۆبەو گەڕانەوەکەیان لیٚ وەرئەگرم، ﴿وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ وە هەر من زۆر تۆبە وەرگری میهرەبان‌و بەزەیی دارم. ئەوانەی کە بەو جۆرە ئەگەڕێنەوە لە جیهاندا پێش ئەوەی بگەنە کاتی نائومێدیی لە ژیان خوا تۆبەیان وەرئەگرێ‌و تاوانەکەیان ئەسڕێتەوە، بەڵام ئەوانە کەهەر سوورن لەسەر تاوان‌و بێبڕوایی‌و ناگەڕێنەوە تا مردن، ئەوانە بەم جۆرەن کە ئەم ئایەتە سامناکە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڕاستی کەسانێ کەلە جیهاندا بێبڕوا بوون ﴿وَمَاتُوا۟ وَهُمۡ كُفَّارٌ﴾ وە مردن لە کاتێکدا کە بێبڕوا بوون، واتە لە جیهاندا بێبڕوا بوون‌و بەبێ بڕوایش مردن ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ﴾ ئامۆژگاری ئەوانە ﴿عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ بە هەمیشەیی جێگیرو دامەزراوە بەسەریانەوە نەفرینی مەلائیکەو ئادەمی، هەموو پێکەوە ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لەکاتێکدا ئەمێننەوە لەو نەفرینەدا بەبێبڕانەوە، مەبەست بە نەفرینی ئادەمی نەفرینە لەلایەن بڕوادارانەوە یان لەلایەن بێبڕواکانیشەوە کەلە ڕۆژی دوایی دا لەناو خۆیاندا نەفرین ئەکەن لەیەکتر، خوا پەنامان بدات لەو بەد بەختیە.

ئەو سیاچارانە لە جیهاندا بەویست‌و خواهیشی خۆیان قاپی بەزەیی خوایان لە خۆیان داخست، وە ئەو هەل‌و هەلکەوتەی کەلەم ژیانی جیهانەدا پێیان درابوو لە دەست خۆیان دەرکرد، ماوەکەیان دوایی هات‌و ئەوان هەر سوور بوون لەسەر بێبڕوایی‌و هەر نەگەڕانەوە، لەبەرئەوە دووچاری ئەوە ئەبن‌و ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ سووك ناکرێ لەسەریان سزاکەیان، سزای ئەو نەفرین‌و دەرکردن‌و بەش بڕاوی لە هەموو خێرو خۆشی‌و بەزەییەك، یان سزای ئاگری دۆزەخ کە سەرەنجامی ئەو نەفرینی خوایە، بە هەرکام مەبەست بێت سزاکە سەخت ترین سزایەکە کە دووچاری ئەبن،

وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا
أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ

---

**﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ وه به هیچ ڕهنگ مۆڵهت نادرێن‌و دواناخرێن لێی یان سهرنج نادرێن‌و تهماشا ناكرێن به شێوهیهكی بهزهیی‌و میهرهبانی.**

**ئینجا دێته سهر باسی تاك‌و تهنیایی خوا كه یهكهم بنهڕهتی گهورهو سهرهكیه بۆ بڕواو ههموو بۆچوونی كهله بڕوا پهیدا ئهبێ‌و ههر كردوهیهك كه بهرههم‌و سهرهنجامی بڕوایه، وه ههروهها ئهو تاك‌و تهنیاییه تاقانه بنهڕهتێكه كه ئهم بوون‌و بوونهوهرهی لێ فهراههم هاتووه‌و لهسهری ڕاگیره.**

**هیچ گومان‌و دوو دڵیهك نهبووه لهبارهی بڕوا بهبوونی خوا، وه ههرگیز سروشت‌و ژیریی ئهو شته ڕاستهی له بیر نهچووه‌و زانیویهتی كه ئهبێ خوایهك ببێ‌و بڕوا بهوه شتێكی پێویسته‌و ناچاری ئهو بڕوایه خۆی ئهچهسپێنێ له دهروونـدا، سروشت‌و ژیریی ئهو شته ڕاست‌و ڕهواو ئاشكرایهی له بیرنهچوو، تهنها لهم چهرخ‌و ڕۆژی دواییهدا نهبێ كه تاقمێكی سهرگهردانی سهر لێ شێواو پهیدا بوون كه پچڕاون‌و دوور كهوتوونهتهوه له سروشت‌و ژیریی، دان نانێن بهبوونی خواداو ئهڵێن نیه!! وه ئهم تاقمه تاقمێكی بێزراوی بێ سهرو پێی بێ‌بنهڕهتن‌و ڕهگ‌و ڕیشهیان ناچێ بهناو ئهو بوون‌و بوونهوهرهدا، جا لهبهرئهوه بێ‌گومان پاشهڕۆژو چارهنووسی ئهم تاقمه ههر نهمان‌و وشك بوون‌و داڕزانه لهناو ئهم جیهان‌و بوونهوهرهدا، ئهم جیهان‌و بوونهوهره ههرگیز ڕێ نادهن بهمانهوهی ئهو تاقمه، وه سروشتیان دژو پێچهوانهی مانهوهیانه، بهڵێ بێجگه لهمانهی دوایی ههموو كهس بڕوای بووه بهبوونی خوایهك، بهڵام بۆچوون‌و تێگهیشتن جیاواز بووه لهبارهی ئهو خوایه‌و سیفهت‌و نیشانهكانی‌و پهیوهندی به دروست كراوهكانیهوه‌و پهیوهندی ئهمان بهو خوایهوه، جا لهبهرئهوه قورئان باس‌و قسه له نهبوونی ناكات، چونكه له ڕووی ڕاستی دا بوونی خوا جێگهی سهر لێ كردنهوه‌و لێكۆڵینهوه نیه، وه قسه لهنهبوونی جێی نابێتهوه لهناو قساندا،**

بەڵکو قورئان هەمیشە باسی تاک‌و تەنیایی خواو سیفەتەکانی تری ئەکات، وە هەموو بۆچوون‌و تێگەیشتنە ناڕاست‌و ناڕەواکان ڕاست ئەکاتەوە، وەك لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ خواو پەرستراوی ڕاستەقینەی ئێوە تەنها یەك خواو پەرستراوە ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، وە هیچ شیاوو شایانی پەرستن نیە بێجگە لەو خوای تاك‌و تەنیا ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ كە میهرەبان‌و بەخشندەو بەزەیی دارە بەبێ سنوور، وەلەبەر ئەم دووسیفەتەولەسەربنەڕەتی ئەم دوانەهەموویاساوڕژێم‌و بەرنامەکەی خوا هاتووەوبەرپابووە.

هەرکات‌و ئەم تاك‌و تەنیاییە دامەزراو جێگیر بوو لە دەروونـدا، ئەو کاتە مەردوم بەندەیی‌و گوێڕایەڵی هەر بۆ یەك کەس ئەکات، وە لەیەك لابنەڕەت‌و یاسای ڕەوشت‌و کردەوە وەرئەگرێ، وە لەیەك سەرچاوە بنەڕەت ئەهێنێ بۆ هەموو یاساو قانوونێکی، وە بەیەك بەرنامە کاروباری ژیانی ئەڕوا بەڕێوە، جا لەبەر زۆر گەورەیی‌و گرنگی ئەم تاك‌و تەنیاییە قورئان ئەو هەموو جارە باسی ئەکات‌و ئەیەوێ بڕوای بەندەکانی خوا بەهێز بکات پێ‌ی، بەهێنانی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە لەسەری وەك لێرەدا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەری بەدروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و گۆڕانی شەوو ڕۆژو گەڕانی کەشتی لەدەریاکانداو باراندنی باران بەو هەموو خێرو بێرەیەوە، وە گۆڕاندنی با هەردەمە بەبارێکداو هێنانی هەور ژێر بار کردنی لەو جێگەی تایبەتی خۆیەدا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بەڕاستی لەدروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ وە لە گۆڕانی شەوو ڕۆژو هاتنیان لە دوای یەکداو جیاوازیان لە تاریکی‌و ڕووناکی‌و زیادو کەم کردنیان‌و ﴿وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾ وە کەشتیدا کە ئەگەڕێ لەدەریادا ﴿بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ﴾ بە شتێکەوە کە سوود ئەگەیەنێ بە ئادەمی، وەك ئەو هەموو شت‌و مەکەی کە ئەیهێنێ‌و ئەیبا لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ﴾ وە لەو ئاوو بارانەی کە خوا هێنایە خوارەوە لە ئاسمان‌و لای سەرەوە ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا﴾ ئینجا بەو ئاوە زەوی زیندوو کرایەوە بە ژیاندنەوەی ئەو هەموو هێزو وزەیەو ڕواندنی ئەو هەموو ڕووەك‌و سەوزەیە ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖ﴾ وە بە زۆر پرژو بڵاوی کردووەتەوە لەزەوی دا لە هەر جۆرە گیان لەبەرێك کە ئەگەڕێ بەسەر زەویدا،

﴿وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ وە لە گۆڕاندنی ئەو بایانە لە هەڵکردن و ڕووکردنیان بۆ ئەو لاو ئەو لا، لەسەر چەند بارو شێوەی جیاواز، ﴿وَٱلسَّحَابِ ٱلۡمُسَخَّرِ بَيۡنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وە لەو هەورەی کە ژێر بارکراوەو ڕاگیر کراوە لە بەینی ئاسمان و زەوی دا ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ لەهەرکام و لە ئەوانەدا چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون هەیە بۆ هەر گەل و کۆمەڵێك کە ژیرن و بیر ئەکەنەوە.

خوای گەورەو میهرەبان لەم ئایەتەدا هەشت جۆر لەدروست کراوەکانی خۆی باس کردو سەرنجی هەموو ژیرێکی ڕاکێشا بۆ چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرا کەلەمانەدا هەن کە هەرکام لەمانە چ جای هەموو هەتا جیهان بەرەو پێشکەوتن بڕواو زانایانی جیهان پلەو ڕادەیان بەرزتر بێتەوە لە زانین و زانیاری دا گرنگی و نایابی ئەمانە ئاشکرا تر ئەبێت و چەندەها شتی سەرسوڕهێنەریان لێ دەرئەکەوێ کە مایەی بەهێزی و دامەزراوی بڕوان بە خوای پەروەردگاری تاك و تەنیای میهرەبانی بەزەیی دار.

سەیرتر لە هەموو شت ئەوەیە کە ئەم حەوت بەڵگەیە لەم ئایەتەدا، وە هەروەها هەموو بەڵگەکانی تری قورئان پێویست نین بە لێکۆڵینەوەو بیر لێ کردنەوەی زۆر، بەڵکو هەر دیمەن و ڕواڵەتەکەیان بەسە، با بە شێوەیەکی سادەش بێت و بێ ئەوەی قووڵ بۆی داچین، جالەبەرئەوەئەم بەڵگە قورئانیانە بۆ هەموو جۆرە کەسێك دەست ئەدەن، مەگەر کەسێك کە بە تەواوی چاوودڵی کوێربێت وسەمەسایان لێ بڕابێت، ئەم بەڵگە قورئانیانە بەسە بۆ هەرکەسێ ئیتر خوێندەوار بن یان نە؟ زیرەك بن یان نە؟ لەئاوەدانی دا گەورە بووبن یان نا؟ هەرچەند شتەکە وایە، بەڵام چاك وایە کە هەریەك بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەیان تیا بکەین بەڕیز:

١- ئاسمانەکان: نازانین لە چ بارێکەوە قسە بکەین؟ ئایا لەباری گەورەیی و پانی و فراوانیەوە، یا لەباری مانگ و ڕۆژو کۆمەڵەی خۆرو ئەستێرەکانی و پرژو بڵاو بوونەوەیان و شێوەو دیمەنی دڵ ڕفێنیان، کە هەرکام لەوانە شێوەو گەردش و خولانەوەو جێ و شوێن و ڕێگەو هەڵهاتن و ئاوبوونێکی تایبەتی هەیە، بە ڕژێمێکی تێرو تەواوو بەبێ دواو بەر، یا لەباری ڕێکی و گونجاوی و پەیوەستی نێوانی ئەو ئەستێرانەی کە کۆمەڵ کۆمەڵ لێ وەستاونەتەوە، وە لەگەڵ زۆر دووریشیان لە یەکترەوە پەیوەندی و پەیوەستیان ناپچڕێ و هەر ماونەوە بەدرێژایی ئەو هەموو

چەرخ و کاتەی کە تێپەڕیٚ کردووە بەسەریانداو هەر خوا ئەزانیٚ چەندە دوورو درێژن!! بۆ وێنە: تەرازوو کۆو حەوتەوانەکان و عەقرەب...هتد، هەرکام لەمانە پێك هاتووە لە چەند ئەستێرەیەك، کەچی لەگەڵ ئەو جیاوازیو دوورییە پێکەوە ئەگەڕێن و هەڵدێن و ئاوا ئەبن!!

بەڕاستی ئەم ئەندازە بیرکردنەوەیە لەم شتانە کەوا بە بەرچاوەوە بەسە بۆ هەرکەسیٚ کە چاوی و دڵی سەمەسای لیٚ نەبڕابیٚ وهێزی ژیریی لەکار نەکەوتبیٚ. بەسە بۆ ئەوەی دڵ پڕبیٚ لەبڕوا بەو دەستە قودرەتە لێزان و بەدەسەڵات و کارزان و کاردروستەی کە ئەمانە ئەکات.

٢- زەوی: ئەم زەویە گەورەو فراوانە کە بەسە بۆ مردووو زیندووی هەموو گیان لەبەرەکانی و لەشی هەمووی بەو هەموو جۆرجۆری و جیاوازیانەوە پێك هاتووە لە کەرەسەکانی ئەم دایکە گەورەیەو بە خۆراك و پیٚ بژێوی ئەم ژیان و گەشەئەکەن و پەرە ئەسێنن.

ئەم زەیە کە پێك هاتووە لەو هەموو بەش و پارچە جۆر بە جۆرەو بەو هەموو ڕێکی و ڕێك کەوتن و گونجاوی و یەك گرتن و کۆمەکی و قۆڵگیریەی کە دامەزراوە لە نێوان ئەو بەش و پارچانەدا. ئەم زەویە کە ئەم هەموو هێزو وزەو پێویستیانەی ژیانی تیایە، بەبیٚ دامان و یەك کەوتن، وە ئەو هەموو درەخت و سەوزەو ڕووەکە لە سکی دێنە دەرەوە، بەردارو بیٚ بەر بەو هەموو جیاوازیە لە تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەو قەبارەدا لەگەڵ ئەوەدا هەر لەم زەویە دەردێن و بە ئاوێك ئاو ئەدرێن!!

بەڕاستی نازانین بیر لە کویٚی بکەینەوەو لە چ بارێکی بدوێین کە ئەوانەش کە دەست نیشانمان بۆ کردن بەشێکی کەم بوو لەدیوی دەریٚ و لەوەی کەول بە پێش چاوە، وە بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە هەرکەس ئەم بەڵگە ئاشکرایانە دڵی پاراو نەکاتەوەو تێر ئاوی نەکات بە ئاوی ساف و بێگەردی بڕوا بە خوای تاك و تەنیای میهرەبانی بەزەیی دار!!

٣- گۆڕان وبەدواهاتنی شەوو ڕۆژ: بەڕاستی ئەمەش شتێکی زۆرنایابی سەرسووڕهێنەرە، بەڵام بەهۆی دەق پێوەگرتن و زۆر بینینەوە مەردوم بیٚ ئاگائەبێت لیی، بەڵام کە قورئان جار بەجاریٚ وریامان ئەکاتەوەو سەرنجمان ڕائەکێشیٚ بۆی لەبەرچاو تەڕو تازە ئەبێتەوەو سەرسووڕئەمێنیٚ لەکرداری بیٚ وێنەی خوا، بیر ئەکەینەوە کە هەمیشە ئەو دوانە دێن بەدوای یەك داو بەناو یەکدا بە ڕێژەو یاسایەکی ڕێك و پێکی نەگۆڕاو، تاریکی دێت و ڕووناکی بەدوای ئەڕوات، شەبەق دێت و بەرەبەرە بۆ ئاوا بوون ئەڕوا تا

ئـەوا ئـەبێت، وە ئـەم دووانـە جیاوازیـان هەیـە لـەماوەو درێـژیو کـورتی دا بـەپێی جیـاوازی وڵاتو ناوچـەکانو وەرزەکـان کـە ئـەوەش سـوودو بەرژەوەنـدی مـەردومی تیایەو یەکێکە لە پێویستیەکانی ژیان، دەی ئایا کێ ئەو ئاڵو گۆڕو جیاوازیە فەراهەم ئەهێنێ بەو یاساو ڕژێمە ڕاستو نەگۆڕاوەوە؟!

بەڕاسـتی هەرکەسـێ ڕێـزی خـۆی بـە لاوە بێـت، ئـەبێ هـەر بڵـێ: خـوای تـاکو تـەنیای میهرەبانی بەزەیی دار، وە ئەبێ خۆی لەدەروونی خۆیشی دا تـەریق بێتـەوەو شـەرم بیگـرێ لەوەی غەیری خوای بەدڵ دا بێت.

٤- ئەو کەشتیانەی کە ئەگەڕێن لەناو دەریاکـان دا: بـەو هـەموو زەلامو بـاری زۆر قـورسو گرانـەوە، بـەبێ ئـەوەی نـوقم بـبنو بنیـشن، دەی ئایـا بێجگـە لـە خـوای تـاکو تـەنیای میهرەبان کێ ئەو کارە گرنگەی فەراهەم هێناوەو ئەیبا بەڕێوە؟ بێگومـان ئاشکرایە کـە ئەو کارە گرنگە چەند هۆو یاسایەکی هەیە بەبێ ئەوانـە ئـەو کـارە ناگـونجێ، دەی ئایـا کێ ئەو هەموو هۆو یاسایەی داهێنا لەم بوونەوەرەدا بێجگە لە خوا؟

٥- ئـەو بارانـەی کـە لای سـەرەوە دێتـە خـوارەوە: بـەو هـەموو پیـتو وزەیـەوە، خـوای میهرەبان وەك لە چەند ئایەتدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، گەرمی ئەهێنێو زاڵی ئـەکات تا لەزەویو دەریاکان هەڵمو تەم پێك بێت، ئینجا با ئنێرێ ئەو هـەڵمو تەمـە هـەڵگرێو بەرزی بکاتەوەو کۆی بکاتەوەو تەپەی بدا تا ئەیگێڕێ بەو هەورەی کەوا بەبەرچاوەوە، ئینجـا ئـەی بارێنێتـەوە بـۆ سـەر زەوی، ئینجـا بـەو بارانـە ئـەو زەویـە وشـكو مـردووە ئەژیەنێتـەوەو زینـدووی ئەکاتـەوە بـەو هـەموو گیـاو سـەوزەو ڕووەکـە، وە هـەروەها بەهۆی ئـەو ئـاوە چـەند گیـان لەبـەر لـەم زەویـەدا ئەژیەتـەوەو گیـانی ئەچـێ بـە بـەردا، بێجگـە لـەوەی کـە ئـەو سـەوزەو ڕووەکانـە هـۆی ژیـانو گـوزەرانی گیـان لەبـەرانی ئـەم زەویەن، دەی ئایا لەو ئاوە چۆن ئەم گیایانـە پەیـدا بـوون؟ وە ئایا گیانـە چیەو لەکوێ هـات؟ ئەگـەر بڵـێین: شـاراوە بـوو لـەو دانـەو ناوکـەو کەرەسـانەدا، دەی ئایـا لـە کوێـرە هاتو خۆی داشارد لە تاو ئەوانەدا؟ ئایا لە چی پەیدا بوو؟ یەکەم سەرچاوەی چیە؟ بە ڕاستی ئەم پرسیارانە خۆیان ئەچەسپێنن لەناو سروشتو ژیریی داو بەرگری ناکرێنو خۆشاردنەوەو ڕاکردن لێیان نابێو ناگونجێ.

بێبڕواو بێ ئایینەکان زۆریـان هـەوڵدا خۆیان بشارنەوەو خۆیـان هەڵـەو بـێ ئاگـا بکـەن لەم پرسـیارانە کـە هـیچ وەڵام نادرێنـەوە، مەگـەر بـەدان نـان بـەبوونی پـەروەردگارێکی توانـاو

دەسەڵات دار بەسەر بەخشینی گیان بەو گیانانە، وە زۆریان هەوڵدا کەوا ببەنە مێشکی مەردومەوە کە وان بەرێوە بۆ داهێنان و دروست کردنی گیان، بەبێ پێویست بەبوونی خوا، کەچی لەپاش دا هەر لەو وڵاتی بێ ئاینی و بێبڕوادا نائومێد بوون و وازیان لەو هەوڵ و تەقەلا هێنا و ناچاربوون دانیان نا بەوەی کە پێیان ناخۆشەو بێبڕواییەکەیان لە ڕیشە ئەهێنێ... دانیان نا بەوەی کە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ دروست کردن و داهێنانی گیان! وە بەرزترین زانای ڕوس ئەوە ئەڵێت و بەباشی دانی پیا ئەنێ! وە لە پێش ئەمانەوە داروین ویستی بە فێڵ و تەڵەکە خۆی داشارێ لەو پرسیارانە!

٦- گۆڕاندنی باو گێڕانی بە چەند بەش لە هەڵکردن و ڕووکردن دا: بەڵێ بە ڕاستی ئەمەش یەکێکە لە شتە نایابەکانی ئەم جیهانەو ژیان بەستراوە پێیەوە، وە لەڕووی ڕاستیش کەس نازانێ با لەبەرچی هەڵئەکات و بەهۆی چی ئاوا جۆر بەجۆرو جیاوازە، کەواتە هەرکەسێ ژیر تێگەیشتوو بێت بەبیر لێ کردنەوەی بڕوای بەهێزتر ئەبێت و ئەیکات بە نیشانەو بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر تاک و تەنیایی خواو میهرەبانی و بەزەیی بێ سنووری.

٧- ئەو هەورە ژێر بارکراوە لەو شوێنە تایبەتی یانەدا: بەڵێ بەڕاستی فەراهەم هێنانی ئەم هەورە کە ژیانی ئەم جیهانەی پێوە بەستراوەو ژێربارکردنی لەو ڕادەو جێگەتایبەتیەدا، هەر تەنها ئەوە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ئەو دەستە قودرەتە بێ هاوتایەی کە ئەوەی کرد، ئیتر بێجگە لەو هەموو بەسەرهات و گۆڕانەی کە بەسەری دێت، لە ڕەنگ و دیمەن و تەنکی و ئەستووری و هێندێ جار گول گول لێی ئەوەستێتەوەو هێندێ جار پارچەی گەورە گەورە ئەڵێی چەند شاخ و چیایەکن، وە بێجگە لەوەی کە ویستی بیبارێنێ ئیتر بە بارانی یا بە بەفرو تەرزە، ئەیبارێنێ بە ڕژێم و یاسایەکی سەرسووڕهێنەر!! بەڵێ بەڕاستی ئەمانەی کە لەم ئایەتەدا سەرنجی بۆ ڕاکێشان، هەرکام لەمانە هەر بەم شێوە سادەش کە باسیان لێ کرا چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوونیان تیایە، بۆ هەرکەس کە ژیر بێت، لەسەر تاک و تەنیایی خوای میهرەبانی بەزەیی دار کە ئەو هەموو شتەی دروست کرد و ڕێک و پێک و گونجاوی کردن بۆ ژیان و بەرژەوەندی ئەم ئادەمی یە، کەواتە ئەبوایە هەموو ئادەمی بە یەک جار چاو لەبەر بوایەو کەمەری بەندەیی ببەستایە هەر ئەوی بپەرستایە وهیچ کەس و هیچ شتێکی نەکردایە بە هاوبەش و وێنەی، کەچی لەگەڵ ئەوەدا،

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾

---

وە لەگەڵ ئەم هەموو تەمێ و ئامۆژگاریەدا زۆر لە ئادەمی بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ لەناوئادەمیدا ﴿مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا﴾ هینی وا هەیە کە چەند هاوبەش و وێنە یەك ڕەواو بڕیار ئەدات بۆ خوا، لە کاتێکدا تێپەڕ ئەکات لە خوای تاك و تەنیاو پەرستنی بە تەنیا، ئەو وێنەیانە ڕەوا ئەدەن ﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ﴾ لە کاتێکدا خۆشیان ئەوێن وەك خۆشویستنیان بۆ خوا، واتە یەکسانیان ئەکەن لەگەڵ خوادا لە مەیلی دڵ و ڕێز گرتن و گوێ ڕایەڵی دا، ئیتر ئەو وێنەیانە دارو بەرد یا مانگ و ڕۆژو ئەستێرە، یا مەلائیکەو شەیتان و جنۆکەن، وەك لەو کاتەدا کە ئەم ئایەتە هات ئەو جۆرە باوبووە، یا هەر شتێ ترو هەرکەسێ و هەر نیشانەو دروشمێ تر... ڕەوا دانی هەرکام لەوانە لادانە لەباوەڕ بە تەنیایی خواو بت پەرستی و هاوبەشی ڕەوادانە بەنهێنی یان بە ئاشکرا، ئەگەر لەگەڵ خوادا باس بکرێن یان لە خۆشەویستی دڵدا یەکسان بکرێن، ئینجا ئەگەر خۆشەویستی خوا لە دڵدا نەهێڵرێ و هەر وێنەو هاوبەشەکان بکرێن بە خۆشەویست و ڕێزگیراوی دڵ و گوێڕایەڵی کراو ـ بێگومان ئەوەش بە زۆری هەیەو ئەبینرێ ـ خوا پەنامان بدات، ئەگەر هەرکەس بەو جۆرەبێت ئەبێ حاڵی چۆن بێت، وە گەورەیی تاوانەکەی لە چ ڕادەیەك دا بێت، وە پلەی نەزانی و نەفامیەکەی چۆن بێت؟! خوا پەنامان بدات لە هەموو جۆرە نەفامی و نەزانی یەك.

نەفام و هاوبەش ڕەوا دەر بەو جۆرە بوون کەباس کران، بەڵام ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ کەسانێ کە بڕوایان هێناوەو بڕوادارن بە تین ترن لەبارەی خۆشەویستیان بۆ خوا، لەهەر

خۆشەویستیەك كە بیان بێت بۆ هەر شتێك بە جۆرێ هیچ خۆشەویستیەكی تر هاوكێش‌و هاوتای ناكات، بەراورد ناكرێ لەگەڵ خۆشەویستیان بۆ خوا، داواكارین لە خوای میهرەبان خۆشەویستی خۆی لە دڵماندا بەهێزترو دامەزراوتر بكات، بەتێن تری بكات لە هەر خۆشەویستیەكی تر ــ آمین ــ، ئینجا بەشێ لە سزاو بەسەرهاتی ڕۆژی دوایی ئەو بت پەرستانە باس ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾[1] ئەوانەی كە جەورو ستەمیان كرد بەرەوادانی ئەو هاوبەش‌و وێنەیانە، ئەگەر ئەزانن ﴿إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ﴾ لەو كاتەدا كە سزای ڕۆژی دوایی ئەبینن ئەو سزایە ئامادەكراوە بۆیان، ئەگەر ئەزانن لەوكاتەدا ﴿أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ كە هەموو هێزو دەسەڵات هەر بۆ خوایە، وە ئەزانن كە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ﴾ خوا تۆڵەو سزای زۆر بەتینە، لەو كاتەدا كە ئەوە ئەزانن‌و بۆیان دەرئەكەوێ كە بتەكانیان هیچ نەبوون، پەشیمانی‌و داخ‌و خەفەت‌و ناڕەحەتیەكی وا داگیریان ئەكات كە باسی ناركێ‌و باس كردن پیایا ناگات، یان ئەگەر ئەو ستەمكارانە لە كاتی بینینی سزای ڕۆژی دوایی دا ئەزانن كە بتەكانیان هیچ سوودیان نیە، لەو كاتەدا ئەزانن كە هەموو هێزو توانا هەر بۆ خوایە، وە خوا تۆڵەی بەتینە، ئەگەر ئەو ستەمكارانە ئەزانن ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ﴾ كاتێ كە سەرۆكە پێشەواكانی ئەم جیهانە یەخەی خۆیان هەڵئەتەكێنن‌و خۆیان بەری ئەكەن ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ﴾ لەو كەسانەی كە داوایان كەوتن ﴿وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ﴾ لەكاتێكدا كە هەردوو تاقم سزای خوا ئەبینن ﴿وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾ وە هەر ئومێدو هۆی خێرو خۆشی ڕزگار بوونێ كەلە جیهاندا بوویان، هەمووی ئەپچڕێ،

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تر خوێندراوەتەوەو بە پێی ئەوانە چەند تەفسیری هاتووە، وە هەموو هەر باش‌و ڕێكن، بەڵام تەفسیرەكە لەسەر ئەم خوێندنەوەیەیە كە ئەمڕۆ باوە لە ناو قورئانەكاندا.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ

وه هەموو پەیوەندیو پەیڕەویو پەیوەستی نێوانیان ئەبڕاو نامێنێ ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ﴾ وە ئەوانەی کەلە جیهاندا شوێن کەوتن و کەوتوو بوون ئەڵێن: ﴿لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ﴾ ئای کاشکێ گەڕانەوەیەك نەبوو بۆمان بۆ جیهان ﴿فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ﴾ تا بە هۆی ئەوەوە خۆمان بەری ئەکردو یەخەی خۆمان هەڵئەتەکاند لەوانە ﴿كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ﴾ هەرچۆنێ ئەوان ئاوا خۆیان لێ بەری کردین و بێزاریان دەربڕی لێمان، ئەوەش بەم ڕەنگە لە پاش گەڕانەوەی هەردوو لا ئەم جارە شوێنیان نەکەوین و بە هیچیان نەزانین و دوور کەونەوە لێیان، یان لەپاش گەڕانەوەی خۆیان بۆ جیهان، ئینجا شوێنی ئایینی خوا بکەوتنایەو هەر خوایان بپەرستایە بە تەنیا، ئینجا بهاتنایەتەوە بۆ ڕۆژی دوایی دا خۆیان بەری بکردایە لەو سەرۆکانەو هەقی جاری پێشوویان لێ بسەندنایە، واتە ئەم شوێن کەوتووو بت پەرستانە کە لایاندا لە خواپەرستی و لایاندا لە خواپەرستی و لایان وابوو کە ئەو بتانە کەڵکیان ئەگرن، ئەو ستەمکارانە لەکاتی بینینی سزای ڕۆژی دوایی دا باش ئەزانن کە هێزو دەسەڵات هەر هینی ئەو خوایەیە کە ئەوان لەجیهاندا نەیان پەرست، وە تۆڵەو سزایشی زۆر بە تینە، وە هەروەها ئەو ستەمکارانە ئەزانن و ئەبینن کە سەرۆکەکان کە ئەمان فیداکارو گوێڕایەڵ بوون بۆیان و ئەیان پەرستن، ئەو سەرۆکانە لە ڕۆژی دوایی دا بێزاری دەر ئەبڕن لەمان و خۆیانیان لێ بەری ئەکەن، وەلەو کاتەدا ئەوان هیچیان بۆ نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی ئاوات ئەخوازن کە بگەڕێنەوە بۆ ئەم جیهانەو داخی دڵی خۆیان ساڕێژ بکەن، وە هەقی خۆیانیان لێ بسێنن بەو جۆرەی کە باس کرا، جا با بیرێك بکەینەوە لەو هەموو داخ و مەراق و شەرمەزاریە کە خوا ئەیهێنێ بەسەری ئەوانەدا!!

بەڕاستی زمان و پێنووس دەستەپاچەن لەڕوون کردنەوەی ڕادەی ئەو هەموو داخ و دووە ﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡ﴾ هەروەها خوا بەو جۆرە ئەوانە زاناو ئاگادار ئەکات بەکردەوەکانیان بە چەند داخ و ئێش و ئازارێکی دەروونی بەسەریانەوە، یان کردەوەکانیان نیشان ئەدات لە کاتێکدا کە هەموو پەشیمانی و داخ و ئێش و ئازارن بەسەریانەوە، چونکە بێگومانن لەوە کە هەموو هۆی سزاو خەشمی خوان ـ خوا پەنامان بدات ـ

وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ
مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ

---

﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ وە ئەوانە بێگومان بە هیچ ڕەنگ دەرناچن لە ئاگرو هەر ئەمێننەوە تیای دا! لەمەو بەر باسی ئەوەی کرد بەڕوونی کە هەر خوا پەرستراوی ڕاستە، وە هەر ئەو دروست کەرو داهێنەری هەموو شتە، وە هەرکەس وێنەو هاوبەش ڕەوا بدا بۆی دووچاری سزای سەختی خۆی دێت، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە هەر ئەو ڕۆزی دەری ژیەنەری بەندەکانیەتی، وە هەر ئەو یاسایان بۆ دائەنێ و حەرام و حەلاڵ هەر بە دەست ئەوە، لە ڕووی ڕاستی دا ئەمە شتێکی زۆر ڕاست و ڕەوایە کە هەرکەس دروست کەرو ڕۆزی دەر بێت هەر ئەویش حەلاڵ و حەرام کەر بێت، جا لەبەرئەوە ئەوا لێرەدا ڕەوا ئەدات کە بخۆن لە هەر شتێ کە خوا حەلاڵی کردووە بۆیان، بێجگە لەوەی کە قەدەغەی کردووەو لەمەو پاش باسی ئەکات، وە فەرمان ئەدات کە حەلاڵ و حەرام هەر لە خوا وەرگرن، وە شوێنی شەیتان نەکەون لە هیچ شتێ لەوانەدا، چونکە شەیتان دوژمنیانە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی بە تێکڕایی ﴿كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بخۆن لە هەرچی خۆراک و خواردەمەنی کەلە زەوی دایە ﴿حَلَٰلٗا طَيِّبٗا﴾ لەکاتێکدا کە حەلاڵێکی پاک و خۆش و بەلەزەتە، واتە ڕەوایە بۆتان خواردنی هەر خۆراکێک بە مەرجێک حەلاڵ بێت و شەرع قەدەغەی نەکردبێت، کە ئەوەش پاک و خۆش و بەلەزەتە لای شەرع، وەک (ئیمامی مالیک) ئەفەرموێ: ئەوەیە کە دەمی شەرع بە خۆش و بە لەزەتی بزانێ و بێزی لێ نەکاتەوە، یا لەبەرچاوی شەرع لە چڵک و چەپەڵی دوور بێت و گومانی حەرامی پێ نەبرێ.

دیارە ئەو کاتە بە لەزەت و بێ لەکە ئەبێت لە دەمی هەموو تەبیعەت و سروشتێکی ساغ و ڕێکدا، وە بێ لەکە ئەبێت لەبەرچاوی، ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ وە شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و ڕێبازی ئەو مەدەنە بەر لە هیچ شتێکدا، واتە پەیڕەوی مەکەن و باوەڕتان بە هیچ قسەو ڕاو بڕیارێکی نەبێ تا بەهۆی ئەوەوە بترازێن لە ڕێی ڕاستی خواو دووچاری ڕای هەڵەو ناڕەوایی بێن کە یەکێ لەوانە ئەمەیە حەرام حەلاڵ بکەن و حەلاڵ حەرام بکەن، بە

کورتی هەموو گوناهو بێ شەرعیەك هەنگاوەکانی شەیتانەو ئەبێ خۆ لابدرێ لێی، ڕیوایەت کراوە لە (ئیمامی جەعفەری صادق)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە فەرموویەتی: هێندێ لە هەنگاوەکانی شەیتان سوێند خواردنە بە تەڵاق‌و نەزر کردن لەو شتانەی کە گوناهن، وە هەر سوێندێ بە غەیری خوا بخورێ.

خوای میهرەبان جڵەو گیری ئەکات لە شوێن کەوتنی شەیتان‌و ئەمەش ئەکات بەهۆی ئەو جڵەوگیرییە ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە شوێنی نەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، وە دوژمنایەتیەکەشی دەربڕی‌و هەواڵی پێدا لەسەرەتای ئادەمێتی‌و هەر لە یەکەم کەس کە ئادەمی باوکی هەموانە، ئینجا باسی چۆنیەتی دوژمنایەتیەکەی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِالسُّوٓءِ﴾ واتە شەیتان هانتان ئەدات‌و فەرمانتان پێ ئەدات هەر بەخراپەکاری، ئیتر لە وتارو کرداردا، یان لەنیازو باوەڕدا ﴿وَٱلْفَحْشَآءِ﴾ وە بەگوناهو گەورەو زۆر ناشیرین ﴿وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ وە بەمەی بەدەم خواوە شتێك بڵێن کە نازانن خوا ڕەوای داوەو ئیزنی هەیە لەسەری، واتە بەدەم خواوە درۆ هەڵبەستن ئەوەی حەرام کردووەو ئەوەی حەڵاڵ کردووە کە ئەمە لە گەورەترین گوناهو تاوانە، دەی کەسێ کە ئاوا لە پێی سەری مەردوم بێت بۆ خراپ کردن‌و دووچار کردنی لە هەموو بارو ڕوویەکەوە ئەبێ چۆن پەیڕەوی بکرێ‌و لە گوێی بکرێ‌و بەدوژمن سەیر نەکرێ؟! ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ وە کاتێ بوترێ بەو شوێن کەوتوانی شەیتانە: ﴿ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ شوێنی ئەوە بکەون کە خوا ناردی بە خوارەوە ﴿قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ ئەڵێن نەخێر، بەڵکو شوێن ئەوە ئەکەوین کە باوك‌و باپیرمان دەست کەوت لەسەری، واتە هەر شوێنی ئەوە ئەکەوین کەلە باو باپیرمانەوە هاتووەو بۆمان بەجێماوە، ئینجا ئیتر ئایا ئەم ئایەتە دەربارەی بت پەرستەکانی هاتبێ، کەلە پێشەوە باسی ئەوان کراوە، یان دەربارەی جوولەکەکان هاتبێتە خوارەوە، وەك ئەگێڕنەوە لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەو جوولەکانە هەر جارێ پێغەمبەر (ﷺ) بانگی ئەکردن بۆ ئیسلام گوێڕایەڵیان نەئەکردو هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی کەلە باوك‌و باپیریانەوە بۆیان جێمابوو، وە هەمیشە کەشخەیان پێوەئەکرد...

دەربارەی هەرکام هاتبێ ئەوا قورئان بێزاری دەرئەبڕێ لەدەست ئەوەی کە هەرکەس لەبارەی ئاین‌و عەقیدەوە هیچ شتێ لە غەیری خوا وەرگرێ، وە بێزاری دەرئەبڕێ لە شوێن کەوتنی کویرانەو ئەو لاسایی کردنەوە، بەبێ زانین‌و تێگەیشتن،

أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ ئایا ئەوانە هەر شوێنی ئەوە ئەکەون کە بۆیان بەجێ ماوە بە کاتێکدا ئەگەر باوك باپیریان هیچیان نەزانی بێت و تێنەگەیشتن لە هیچ شتێ لەبارەی ئایینەوە، وە ڕێنموونیان وەرنەگرتبێ و ڕێیان نەکەوتبێ لە هەق و ڕاستی؟ واتە وتەو بڕیارەکەیان بێزارو ناڕاستەو جێگەی سەرسووڕمانە! ئینجا شێوەو چیرۆکێکی ڕیسواکەریان بۆ ئەهێنێتەوەو ئەیانباتە وێنەی ئاژەڵ و ماڵات کە دەنگی شوانەکەی ئەبیستێ و ئەچێ بەدەمیەوەو ئیتر بەبێ ئەوەی تێبگات لە ماناو واتای دەنگەکە ئەفەرموێ: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ وێنەی ئەوانەی کە بێبڕوان و لە زانینی خوادا تێپەڕی کردووە بڕوا نەهێنانیان، لەمەدا کە هەر دەنگەکەی ئەبیستن و ئیتر تێناگەن لە ماناو وتەکەی، ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً﴾ وەك وێنەی کەسێکە کە دەنگ و ئاوازو تێخوڕین و بانگ کردن بەکار بێنێ لەگەڵ چوارپێ و ماڵات کە هیچ شتێ نابیستێ، بێجگە لە دەنگی بانگ کردن، ئیتر لە نزیکەوە یان لە دوورەوە، واتە هەرچۆنێ چوارپێ لە هیچ تێناگات، بەڵکو ئەگەر شوانەکەش تێی خوڕی یا بانگی کرد هەر دەنگە ڕووتەکە ئەبیستێ و ئیتر تێناگات لە ماناکەی، هەروەها ئەو بێبڕوایانەش هەر دەنگی بانگ کەرەکەیان ئەبیستن.**

**ئەم چیرۆکە بەدوو جۆری تریش هۆنراوەتەوەو باس کراوە، وە لە مەبەست دا هەرسێ جۆرو بارەکە هەریەك ئەگرنەوەو هەر جوانن، بەڵام ئەم بارەی کەلە تەفسیرەکەدا وتراوە ڕێك ترە لەگەڵ دیمەنی داڕشتنی ئایەتەکەو کەم ئەرك تریشە، وە لەسەر هەربار شێوەی چوارپێی هێنا بەسەر ئەو بێبڕوایانەدا، بەڵکو لە ڕووی ڕاستی دا ئەوانە پەست ترن لە چوارپێ، وەك لە ئایەتی ترا ئەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ بەڵکو ئەوانە گومڕا ترن، وەلێرەشدا ئەوە وەرئەگێڕێ کە ئەفەرموێ: ﴿صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ﴾ ئەوانە کەڕن، لاڵن، کوێرن، واتە وەك کەڕو لاڵ و**

کوێر وان، چونکە سودی ڕاستەقینە وەرناگرن لە هێزی بیستن و وتن و بینینیان، وە ئەو هێزانە بەکارناهێنن لەو مەبەستانەی کە بۆی دروست کراون! ﴿فَهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ کەواتە ژیرنین و تێگەیشتنیان نیە،بەڕاستی ئەوەش ئەوپەڕی نەفامی و بێ‌نرخیە کە کەسێ هەموو کون و کەلەبەری ژین و ڕێنومایی لە خۆی بگرێ و کاروباری ئاین و عەقیدەی لەلایەکی ترەوە وەرگرێ، بێجگە لەلای خوا.

ئینجا بەتایبەتی ڕووی فەرموودە ئەکاتە بڕواداران، بەڕەوادانی خواردنی ڕۆزیە پاك و حەڵاڵەکان، وە تەمێ کردنیان بە سوپاس کردنی بەخشندە، وە ڕوونی ئەکاتەوە ئەو شتانەی کەلێی قەدەغە کردوون، وە بێزاری دەرئەبڕی لە جوولەکەکان کە دەمبازی ئەکەن لەو شتە حەڵاڵ و حەرامانەدا کە هەن لای خۆشیان لە نامەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە بە سیفەتی بڕوا هێنان بانگی لێ کردن وەك باوی خۆیەتی لەم جۆرە شوێنانەدا تا پەیوەستی خۆیان بیربکەوێتەوە بە خوای خۆیانەوە، بەهۆی ئەوەوە بە هەموو سۆزو پەرۆشەوە ئامادە ئەبن بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانبەری، وە بۆ وەرگرتنی هەموو کاروباری ئاین و ژیانیان تەنها لە خواو دوورکەوتنەوەیان لە غەیری خوا، ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ بخۆن لە حەڵاڵ و پاك و بەلەزەتەکانی ئەوەی کە پێمان دان و کردمان بە ڕۆزیتان.

بەم فەرموودە بێدارمان ئەکاتەوە کە هەر خۆی ڕۆزی دەرە وە هەموو شتێکی حەڵاڵ و پاك خۆشی بۆ ڕەوا داوین، وە هیچ کام لەوانەی قەدەغە نەکردووە لێمان، وە هەرچی قەدەغە کردبێ لەبەرئەوەیە پاك و خاوێن و خۆش نیە، نەك ویستبێتی پێ پەشیمان بکات و تەنگیمان بەسەر بێنێ، کەواتە زۆر بەجێ و شیرینە و پێویستە لەسەرمان سوپاسی ئەو خوایە بکەین، وەك فەرمانیشمان پێ ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ﴾ سوپاسی خوا بکەن لەسەر چاکە و بەهرەکانی ﴿إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾ ئەگەر ئێوە هەر ئەو ئەپەرستن ئەبێ پەرستنەکان تێرو تەواوبێت و شایان بێت لەگەڵ چاکە و بەهرە و گەورەیی ئەودا، وە ئەوەش بەبێ ئەو سوپاسە نابێ، چونکە سوپاس بریتیە لە بەخت کردن و بەکارهێنانی چاکە و بەهرەکانی خوا بە پێی فەرمانی خواو لەڕێی ڕەزامەندی خوادا،

ئینجا باسی خۆراکە قەدەغە کراوەکان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ﴾ وە قەدەغەی نەکردووە لەسەرتان خواردنی هیچ شتێ بێجگە ﴿ٱلْمَيْتَةَ﴾ مردارەوە بوو ﴿وَٱلدَّمَ﴾ وە خوێن ﴿وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ﴾ وە گۆشتی بەراز ﴿وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ﴾ وە ئەوەی کە سەبڕاوبێت بەناوی غەیری خواوەو ناوی غەیری خوا برابێ لەکاتی سەربڕینیدا، وەك ئەوەی کە باو بووە لە لایەن بت پەرستەکانەوە لەکاتی سەبڕینی سەربڕاوەکاندا ناوی بتەکانیان ئەبرد بەدەنگی بەرزو ناوی ئەوانیان لێ ئەهێنا، یا وەك گاورەکان ئەگەر لەکاتی سەربڕیندا بڵێن: بە ناوی عیسای مەریەمەوە بە پێی بڕیاری ئیمامەکان ئەوەش حەرامە وەك هینی بت پەرستەکان، وە هەروەها بەناوی هەرکەس و هەرشتێ ترەوە، بێگومان مردارەوەبوو بە هەموو جۆرو بەشەکانیەوە حەرامە، بێجگە لە ماسی و کوللە لە حەدیسی بەناو بانگی (ئیبن و عومەر)دا – خوا لێیان ڕازی بێ– حەڵاڵ کراون و لە عورفیشدا پێیان ناوترێ مردارەوەبوو، وە مەبەست بە خوێن خوێنێکە بڕواو جاری بێ وەك لە ئایەتی سورەتی ﴿الأنعام﴾دا ئەفەرموێ: کەواتە جگەرو سپڵ خوێنێکی خەستی وەستاون حەرام نین وەك بە خوێنیش ناو نابرێن لە عورفدا وە لەدەقی حەدیسی نابراویشدا حەڵاڵکراون، دەقی حەدیسەکە: (حلت لنا ميتتان ودمان: السمك والجراد والكبد الطحال) حەڵاڵ کراوە بۆمان دوو مردارەوەبوو، وە دوو خوێن: ماسی و کوللەو جگەرو سپڵ، وە بە تایبەتی لە بەرازدا ناوی گۆشتی برد، لەگەڵ ئەوە هەموو شتەکانی تریش هەر حەرامن بەلای کۆڕو جەماوەرو ئیمامانەوە، چونکە زۆربەی خوراو گۆشتەو شتەکانی تر وەك تابیع وان، وە هەم لەبەر دەربڕین و ئاشکرا کردنی حەرامی گۆشتەکەی کە بت پەرستەکان زۆر بە پاك و خاوێنیان دائەناو باویان ئەدا بەسەر هەموو گۆشتی ترداو بەلایانەوە ناڕەوا بوو قەدەغەکردنی، ئینجا بێگومان هەر کەس بڕواداربێت هەرگیز سەرناکاتەوە لە هیچ شتێ کە ئیسلام قەدەغەی کردبێ، دڵنیایە لەوە کە ئەو شتە پیسەو لەناخی دڵیەوە بە پیسی دائەنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا چاك وایە کە هەوڵبدەین تا بۆمان دەرکەوێ هۆی پیسی ئەو قەدەغە کراوانە، جا لەبەرئەوە لەو بارەیەوە با هەندێ

بدوێن سەبارەت بەم چوارەی ئێرە: شتێکی ئاشکرایە کە مردارەوە بوو وە هەروەها خوێنی جاری شتێکی قیزەونن و دەروونی پاك و ساغ نایەوێن و بۆی قوت نادرێن، وەلە تام و بۆن و رەنگدا بێزراون، بێجگە لەوەی کەلە زانیاری تازەدا دەرکەوتووە لەپاش چەند چەرخ دوای قەدەغە کردنی قورئان کە چەند میکرۆب و چەند کەرەسەو شتی زیاندەر کۆئەبنەوە لەو دووانەدا، وە نازانین ئایا زیانەکەیان هەر لەوبارەیەوە هەیە کە تائێستا ڕێی پێبراوە، یان چەند شتی تریش هەیە کە هۆی ئەو قەدەغە کردنە بن کە هێشتا نەزانراون و دەرنەکەوتوون بۆ مەردوم؟ ئینجا بەرازیش شتێکی ئاشکرایە کە دەروونی ساغ و خاوێن بێزی لێ ئەکاتەوەو بێزارە لە شێوەو دیمەنەکەی، بێجگە لەوەی کەلەم دواییەدا دەرکەوتووە کەلە گۆشت و خوێن و دەمارو ڕخۆڵەکانیدا کرمێکی زۆر پیس هەیە (کرمی شریتی لەگەڵ هێلکەکانی دا کەبن برو چار ناکرێن)، بەڵێ ئەمڕۆ کۆمەڵێ ئەڵێن: چەند هۆیەکی تازە پەیدابووە بۆ کوڵاندنی تا رادەیەك چارەسەری ئەو کرم و هیلکەیانە ئەکات بە جۆرێ بیم و باك نامێنێ لەزیانیان، بەڵام ئەوانە بیر لەوە ناکەنەوە کەلە پاش قەدەغە کردنی قورئان چەند چەرخ تێپەڕی کرد بەبێ ئەوەی کەس بزانێ ئەو کرم و هیلکانە هەن لەو گۆشتە پیسەدا، دەی ئایا بەچی ئەزانن کە چەند شتی پیسی تری تیا نیە کە بە چەند چەرخێ تر پێیان بزانرێ؟! کەواتە هەر بەوە چۆن دڵنیا بوون و لایان وایە کە هۆی قەدەغەکردنی هەر ئەو کرم و هێلکەیانەیەو بەو کوڵانە بەتینە چارەسەری ئەکرێ؟ بەڵکو ئەبوایە بە دۆزینەوەی ئەو شتە پیسە ئیجگاری بێزراو ببوایەو دڵگەرمین ببونایە لە حاستی داو مل کەچ بوونایە بۆ ئەو شەریعەتە بەرێزەی کە بەچەند چەرخ پێشکەوت لە زانین و زانیاری ئادەمی و ئەو شتە پیسەی بینی لەو گیاندارە پیسەدا!! ئینجا ئەوەی کە ناوی غەیری خوا لێ ببرێ ئەوە مافی خۆیەتی کە بەو جۆرە بەتینە قەدەغە بکرێ، ئیتر هەرچەند لە خۆی دا گیانلەبەرێکی پاك و خاوێن و بێ لەکەبێت، چونکە ئەو ناوبردنی غەیری خوایە دژی بۆ چوون و تێگەیشتنی ڕاستە، وە دژی دڵ ساقیە، وە ناگونجێ لەگەڵ پاکی ڕۆح و خاوێنی و یەکباری دەروون لەگەڵ خوادا، کەواتە قەدەغە کردنی خواردنی ئەم جۆرە لەبەر هۆیەکی ڕۆحی و دەروونیە، بێگومان دڵ و دەروونی بڕوادار ئەبێ بێزیکاتەوە لە شتێ کەلە باتی ناوی خوای میهرەبان ناوی شتی

تر کەسی تریبێ لێی و یارمەتی خوا واز لێ بهێنرێ بۆ یارمەتی یەك یا شتێکی تر... بێگومان بە پێی چەند حەدیسێکی صەحیح خواردنی زۆر لە گیان لەبەرانی تریش قەدەغەکراوە، کەواتە چۆن لەم ئایەتەو ئایەتی ﴿الأنعام﴾دا کورت هەڵهێنراوە لەم چوار شتەداو ڕواڵەتی وا نیشان ئەدات کە قەدەغە کراوی تر نیە؟

بۆ کردنەوەی ئەم گرێیەو نەهێشتنی ئەم دژایەتیە ڕوواڵەتیە چەند شتێ هەیەو وتراوە هەرکام بەسە بۆ ئەو مەبەستە:

١- مەبەست (حصر) کورت هەڵهێنانە لەو چوارەدا تا کاتی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتە، وەك ڕوواڵەتەکەشیان و وا نیشان ئەدەن، کەواتە با لەپاش دا ئەوانی تر قەدەغە کرابن لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ).

٢- مەبەست کورت هەڵهێنانی قەدەغە نیە بەتێکڕایی، بەڵکو مەبەست کورت هەڵهێنانە لەناو ئەو هەموو شتانەی کە ئەوان بە حەڵاڵیان دائەناو هەر بە نەزەر ئەوانەوەیە، واتە لەناو ئەو هەموو شتانەدا کە ئێوە بە حەڵاڵتان دائەنان هەر ئەم چوارەی قەدەغە کردووە.

٣- مەبەست کورت هەڵهێنانە لەشتی پیسدا، واتە خوا هەرشتی پیسی لە سەر قەدەغە کردوون، بەڵام لەباتی شتی پیسدا ناوی ئەم چوارەی برد کە سەرەکیین لە پیسی دا.

٤- دەقی ئایەتەکە حەڵاڵی هەموو شتەکانی تر ناگەیەنێ کە ناو نەبراون، بەڵکو لەدەرەوەی دەقەکە وەرئەگیرێ، وە ئەو جۆرە وەرگرتنەش بێ هێزو لاوازەو شتێکی بەهێزو قەتعی نیە، بە تایبەتی لەم ئایەتەدا کە ئەو گەیاندنەش بە وتەی ﴿إِنَّمَا﴾ دەست نیشانی بۆ ئەکرێ کەلە خۆی دا لاوازەو هەموو زانایان لەسەر ئەوەنین کە شتی وای لێ وەرئەگیرێ، کەواتە ئەو حەیسە صەحیحانەی کە هاتوون بۆ قەدەغە کۆدنی خواردنی گۆشتی چەند شتی تر، ئەو حەدیسانە بەهێزترن و گوێ بەمان ئەدرێ نەك بەو حەڵاڵیەتەی کە وەرئەگیرێ لە دەرەوەی ئایەتەکە، یان ئەم حەدیسانە دەست ئەدەن بۆ ئەوەی بکرێن بە سڕەرەوە (ناسخ) بۆی.

فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ
وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾

---

**٥- مەبەست کورت هەڵهێنانە لە کاتی خۆشیو پێگەیشتن بە ڕادەی ناچار بوون، ئەو کاتە ڕەوا ئەدرێو قەدەغەکە نامێنێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ﴾ ئینجا هەرکەس ناچار کرا بەبرسێتیو خواردنی ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ لەکاتێکدا کە دەست درێژیی کەر نەبێ لە ناچارێکی تر، یا لە کاتێکدا کە هەڵنەسا بێتو یاخی نەبووبێ لە دەوڵەتی موسڵمان، ﴿وَلَا عَادٍ﴾ وە لەکاتێکدا کە زیادە ڕەوی کەر نەبێت لە خواردنەکەیاندا، بەم ڕەنگە زیاد لە پێویستو بەرگری گیان نەخوات، یان جەردەو ڕێگیر نەبێت، هەرکەس ناچار کرابێو بەو جۆرەبێتو لەو قەدەغە کراوانە بخوات ﴿فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نیە لەو خواردنەدا، چونکە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زۆر لێ بووردەی بەزەیی دارە، کەواتە لەو کاتی ناچاریەدا قەدەغە کردنەکە نامێنێو ئەوەی پێویستە ڕەوای ئەدات، لە میهرەبانیو بەزەییەکەی بە زیاد بێت.**

**جوولەکەکان دەمبازی زۆریان ئەکرد لە بارەی حەڵاڵ کراوو حەرام کراوەکانی قورئان دا، وە لەبارەی ئەو شتانەی کە بە تایبەتی قەدەغە کرابوون لەسەر جوولەکەو بۆ موسڵمانان ڕەوا درابوون، وە هەروەها دەمبازیشیان ئەکرد لەبارەی قەدەغەی ئەو شتانەوە کەلە تەوراتو قەدەغە کرابوون، وە مەبەستیشیان لەو هەموو دەمبازیە دڵکرمێن کردنو دوو دڵکردنی مەردوم بوولەڕاستی ئەوفەرمانانەو ڕاستی سروش (وحی) پێکردنیان بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، جا لەبەرئەوە ئەم هێرشە بەهێزو بە تینە لێرەدا ئەکرێنە سەر ئەوانەی کە ئەوەی خوا ناردوویەتە خوارەوە، وە ئەیشارنەوەو باسی ناکەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە لە نامەی خۆی**

ئەیشارنەوە ﴿وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾ وە بەوە ئەکڕن بۆ خۆیان پارەو دەستکەوتێکی کەم، واتە لە پەنای ئاین و ئاینەوە سەرۆکایەتی و ڕێزو سامانیان دەست کەوت ئەبوو بە ناهەق و ناڕەوا، وە ئەگەر ئەوەی کە ئەیانزانی بەڕاستی دەریان بخستایە ئەبوو موسڵمان بن و واز بێنن لەدەست کەوتەکەیان، دەی ئەوەیان نەئەکردو دەستیان هەڵگرت لە ڕەزامەندی خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی لە پێناوی ئەو دەست کەوتە کەمەی ئەم جیهانە!!

﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانەی کە ئەوە ئەکەن ﴿مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ﴾ هەر ئاگر ئەخۆن پڕ بەسکی خۆیان، ئێستا ئەیخۆن بەم ڕەنگە ئەوەی کە ئێستا ئەیخۆن سەری لە خواردنی ئاگرەوە دەرئەچێ و تۆڵەکەی خواردنی ئاگر ئەبێت، کەواتە هەر لە ئێستاوە وەك ئاگر بخۆن ئاوایە، یان مەبەست ئەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا ئەیخۆن لەباتی ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەیخۆن و دەست کەوتیان ئەبێت، بەو شێوەیە کە حەرام و بێ شەرعیە، ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ وە خوا لە ڕۆژی دوایی دا قسەیان لەگەڵ ناکات، واتە تەفسیری میهرەبانی و بەزەییانە، بە هیچ ڕەنگ قسەیان لەگەڵ ناکات، چونکە خەشمی بەتینی هەیە دەربارەیان، ئەو کاتە ئەبێ بڵێین: هەر پرسیارو حسابێکیان ئاڕاستە بکرێ لەلایەن خواوە بەهۆی مەلائیکەوە ئەبێت، نەك وەك بڕواداران کە یەکسەر لەلایەن خواوە ئاڕاستەیان ئەکرێ ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمۡ﴾ وە چاکیان ناکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی گوناهو تاوانەکەیان، یان وەسف و سەنایان ناکات، ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە بۆیان هەیە سزایەکی ئێش و ئازاردەر، خوا پەنامان بدات بەو بەدبەختیە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ کەسانێکن کە گومڕاییان کڕی بۆ خۆیان لە جیهاندا بەڕێنموونی، بەم ڕەنگە لەباتی ڕێنموونی گومڕاییان هەڵبژارد ﴿وَٱلۡعَذَابَ بِٱلۡمَغۡفِرَةِ﴾ وە بۆ ڕۆژی دواییش سزایان کڕی بۆ خۆیان بە لێبووردن و سڕینەوەی گوناهو خراپکارییان ﴿فَمَآ أَصۡبَرَهُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ ئای چەند خۆگرن لەسەر ئاگر!! واتە ئەوانە جێگەی سەرسوڕمانن کە چۆن هیچ گوێیان نیە لەو خراپی و بەد کرداریە کە سەریان ئەکات بەناو ئاگرداو ئاگری دۆزەخیان بۆ مسۆگەر ئەکات، ئای هاوار بۆ ئەو لاقرتی پێکردنەی کە ئەم ڕستەو وتەیە نیشانی ئەدات!!

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿١٧٦﴾
لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ
وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ

---

**بەڕاستی تۆڵەیەکی ڕێكو سەرو بەرە لەگەڵ تاوانەکەیاندا، تاوانی شاردنەوەی نامەیەك کە خوا بینێرێتە خوارەوە بۆ ئەوەی ڕاگەیەنرێو جاڕی پێ لەناو مەردوم دا، وە بۆئەوەی بە کردەوە بەدی بهێنرێ لە ژیاندا، وە بۆئەوەی ببێ بە یاساو بەرنامەی ژیان، کەواتە هەر کەس بیشارێتەوە، ئەو کەسە پەکی ئەخات لە کارو ئیشەکەی خۆی کە خوا ناردوویەتی بۆی، لەکاتێکدا کە هەر ئەویش هەقو ڕاستەو هاتووە بۆ ئەوەی کارو کردەوە بکاتو ڕووی ژیان بگۆڕێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّۗ﴾ ئەو تۆڵەو سزایە کە باس کرا بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا نامەی خۆی ناردووەتە خوارەوە کە هەقو ڕاستی پێیەو بە هیچ ڕەنگ ناهەقیو ناڕاستی ڕووی تێ ناکاتو کەچی ئەوانە نایانەوێو پێچەوانەو دژی ڕەفتار ئەکەن ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە بەڕاستی ئەوانەی کە دووبەرەکیان هەیە لەنامەی خوادا، بەم ڕەنگە بڕوایان بە هێندێکی هەیەو بێبڕوان بە هێندێ تری، ئەوانەی وان لە دژایەتیو بەربەرەکانێیەکی دوور لە هەقو ڕاستی دا، وە بەربەرەکانێو دژایەتی لەگەڵ سروشت دا، وە لەناو خۆیشیاندا ﴿لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ﴾.**

**ئینجا بە تەنیا یاساو بنەڕەت دائەنێ بۆ بۆچوون تێکەیشتنێکی ڕاستو ڕەوان لەبارەی بڕواوە، وە چەند یاساو بنەڕەتێك دائەنێ بۆ کردەوەو ڕەوشتێ کە لەبڕوادا هەڵئەقوڵێو پەیدا ئەبێ، وە نیشانەو سیفەتی ڕاستیانو لە خواترسان دیاری ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾ هەر ئەمە نیە چاکەو کردەوەی چاك کە ئێوە ڕووتان وەرگێڕنو ڕووتان بکەنە لای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەو کردەوەی چاك چەند شتێکە کە ڕوو کردنە ڕووگە یەکێکیانە یان ڕووکردنتان بۆلای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا هەر چاکە نیە، چونکە ڕووکردن بۆ ئەو دوو لایە سپراوەو پێویست کرا ڕووکردن بەرەو کەعبە، یان**

ڕووکردنە ڕووگە بە تەنیا چاکە نیەو نابێتە چاکە، ئەگەر ناسینی خوای لەگەڵ نەبێت و ناسینی خوایش نابێ بەبێ ئەو شتانەی کەلەم ئایەتەدا باس کراون، ڕای بەهێز لێرەدا کە زۆربەی زانایانیشی لەسەرە ئەمەیە کە ئەم ئایەتە پێویستی هەیە بە باسی ڕووگەو گۆڕاندنی ڕووگە، کە نامەدارەکان بە تایبەتی جوولەکە دەمبازیو پڕوپاگەندەی زۆریان تیا کرد، وەك لە پێشەوە بەشێکی زۆری تێپەڕی کرد، جالێرەدا ئەگەڕێتەوە سەر بانو مەبەستی ڕاست و گەورەو ڕاستەقینە ڕوون ئەکاتەوە سەبارەت بەو مەسەلەو هەموو مەسەلەکانی تر کە جوولەکە دەمبازیان تیا کرد، بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە مەبەست لەڕووکردنە ڕووگە، وە هەروەها هەرشتێ کە کراوە بە نیشانەو دروشمی خواپەرستی، مەبەست ڕووکردن نیە بۆ (بیت المقدس) یا کەعبە، وە هیچ نیشانەو دروشمێك بە تەنیا خۆیو بە ڕووالەتی ڕووت چاکە بەدی ناهێنێو بەرهەمی نابێ بۆ مەردوم، بەڵکو چاکە لەڕووی ڕاستیدا بۆچوونو هەست چەند کردەوەو ڕەوشتێکە کە بەرو بەرهەمی ببێ لەدەروونی گەلو ئەندامی گەل دا، وە کاریگەرات لەژیانیاندا، وە بێگومان ئەم بەرو بەرهەمە گرنگو گەورانە بەو دیمەنو ڕووالەتانە دەست کەوت نابن، کەواتە تەنیا ڕووکردن بۆ هەر ڕووگەیەك چاکە نیەو بە چاکە دانانرێ، بەڵکو چاکەی ڕاستو ڕاستەقینە ئەمەیە کە لەمەدا دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێ:

﴿وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ﴾ بەڵکوچاکەچاکەی ﴿مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ کەسێکەکە بڕوای هێنابێ بە خوا بە ملکەچیو ڕەزامەندیو ئارامی دڵەوە ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ وە بڕوای هێنابێ بە ڕۆژی دوایی، ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ وە بە فریشتە ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ﴾ وە بە نامەی خوا ﴿وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ وە بە هەموو پێغەمبەران ﴿وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ وە ماڵی بەخشیبێ لەگەڵ خۆش ویستنی ئەو ماڵەدا، بەخشیبێتی بەمانە:

١- ﴿ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ خزمەکانی.

٢- ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ وە بە هەتیوەکان.

٣- ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينَ﴾ وە بە هەژاران.

٤- ﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە بە ڕێبوارو سەفەریی، کە دامابن بۆ ئەو ماڵە.

٥- ﴿وَٱلسَّآئِلِينَ﴾ وە داواکەرانو سواڵکەران.

٦- ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾وە لەئازادکردنی بەندەکاندا، ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژی بە ڕێكو ڕاستی بەدیهێنابێ ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەکاتی دابێ بەو جۆرە کە شەرع پێویستی کردووە،

﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُواْۖ﴾ وه ئەوانەی کە کاتێ بەڵێن و پەیمان بدەن هەڵئەسن پێ ی و ئەیبەنەسەر، واتە بەڵێن و پەیمانێك کە شەرعی بێت ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وه تایبەتی ئەکەم بە باسەوە خۆگرەکان ﴿فِي ٱلْبَأْسَآءِ﴾ لەکاتی بێ دەستی و نەبوونی دا ﴿وَٱلضَّرَّآءِ﴾ وه لەکاتی زیان و نەخۆشی و دەردو ناساغی دا، ﴿وَحِينَ ٱلْبَأْسِۗ﴾ وه لەکاتی جەنگ و کوشتار لە ڕێ ی خوادا کە خۆگرتن لەوەدا ئەگاتە ئەوپەڕی پلەو ڕادە. لەم ئایەتەدا یانزە سیفەت و خەسڵەتی کۆکردەوە کەلە ڕاستی دا ئەبن بەسێ بەش:

بەشی یەکەم: بڕوایە بەو پێنج شتە کەبنەڕەتە بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، وه سەرچاوەی هەموو پیت و فەڕێکە، ئادەمێتی لەسەر ئەو بڕواو عەقیدەیە دائەمەزرێ و ڕاگیر ئەبێ، وه مایەی پەیوەستی و بەستنەوەی دڵە بە خوای پەروەردگارەوە.

بەشی دووەم: بەخت کردنی ماڵ و داراییە لەو شەش تاقمەدا کە بەوە پەیوەندی و پەیوەستی بەهێزو بەتین فەراهەم دێت لە بەینی بەندەکانی خوادا، کە ئەمەش مایەی ئارامی دڵ و ژیانی کامەرانیە.

بەشی سێیەم: ئەو چوارەکەی ترە کە هۆی پاك و خاوێنی دەروونی مەردومە، وه مایەی گەیشتنە بە پایان لە ئادەمێتی دا، جا لەبەرئەوە بە جوانی ئەزانم هێندێ دوان و ڕوون کردنەوەی نرخ و بەرو بەرهەمی ئەم شتە گرنگانەی کە ئەم ئایینە پیرۆزە کۆی کردوونەتەوە، بێگومان بەهۆی بڕوا بە خوا ـ ئەم بڕوا ڕاستەقینەی کە خوا ئەیەوێ ـ بڕوادار ڕزگاری ئەبێت لە هەموو مل کەچی و بەندەییەکی ناڕەوا بۆ هەرکەس و هەرشتێ لەم بوونەوەرەدا، وه ئازادی ڕاستەقینە وەرئەگرێ، وه بەرزئەبێتەوە بۆ ڕادەو پلەی بەرزی یەکسانی لەگەڵ هەموو بەندەکانی تر لە یەك ڕیزدا، لەبەردەم تاقانە پەرستراوە ڕاستەقینەکەدا کە پەروەردگاری هەمووانە، جا بەهۆی ئەوەوە ئەو بڕوادارە بەرز ئەبێتەوەو هیچ کەس و هیچ شتێ ناتوانێ بیکات بە بەندەی ئەڵقە لەگوێ ی خۆی، وه بڕوا بە خوا مایەی گواستنەوەیە لە بێ ڕژێمیەوە بۆ ڕژێم، وەلە بێ نیازو سەرگەردانیەوە بۆ ئەوەی ببێ بە خاوەنی ئامانج و مەبەست لە هەموو شتێکدا، وه هۆی ڕزگار بوونە لە بچڕان و پرژو بڵاوبوونەوەی دەروون بۆلای

پەیوەستی و کۆبوونەوەو یەك باری و یەك ڕوویی، وە بڕوا بە ڕۆژی دوایی بڕوا کردنە بە داد پەروەری لە تۆڵەو پاداشتدا، وە بڕواکردنە بەوەی کە ژیانی ئادەمی بەسەر ئەم زەویەوە هەروا بە فیڕۆ ناڕوا، وەهیچ خێرو چاکەیەك، وە هیچ ستەمو دەست درێژیەك بێ‌سەرو شوێن ناڕەوا، کەواتە هەر دڵێ بڕوای بەو ڕۆژە نەبێ هەرگیز بە ئارامەوە ژیان بەسەر نابات، وە بڕوا بە مەلائیکە بە شێکە لە بڕوا بە غەیبو نادیاری کە بەو بڕوایە ئادەمی جوێ ئەبێتەوە لەگیانلەبەرانی تر، کەواتە بە هیچ کلۆجێ ئادەمێتی بەدی نایەت بەبێ بڕوا بە غەیب کە بڕوا بە مەلائیکە بەشێکی ترە، وە بڕوا بە نامەی خواو پێغەمبەرانی بڕواکردنە بە یەکێتی ئادەمی و یەکێتی و تەنیایی خواکەی، وە یەکێتی ئایینەکەی و یەکێتی بەرنامەکەی، وە بێ‌گومان بڕوا کردن بەو یەکێتیە زۆر زۆر پێویستە لە ژیانداو کارکەرێکی بەهێزە لە نەهێشتنی ئاژاوەو دووبەرەکی و کینەو دڵ پیسی دا، ئینجابا بێینە سەر باسی بەشی دووەم کە بەخشینی ماڵو بەخت کردنیەتی لەو چەند تاقمەدا لەگەڵ ئەوەش دا ماڵەکە خۆشەویستو بەنرخ بێت لەدەروونی بەخشندەکەدا، چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەبێت هونەری تیانیەو بەرهەمێکی جوانی نابێت، بەڵام ئەگەر بە نرخو خۆشەویست بێت ئەبێتە هۆی ڕزگاربوون لە چرووکی و چاو برسێتی و بەرچاو تەنگی، وە ئەبێتە هۆی ڕزگار بوونی ڕۆحو دەروون لە بەندەیی ماڵو سامان، وە بەندەییەی کە مەردوم سەرشۆڕ ئەکات، وە سەری پێ‌دائەخات، تا ڕادەیەك زۆر کەس ئامادەئەبێت کەلە پێناوی ماڵو ساماندا ڕازی ببێ بە هەموو بێ ئابڕوویی و بێ ناموسی کە دیارە ئەو کاتە ئادەمێتی نامێنێ‌و کابرا ئەچێتە ڕیزی گیان لەبەرانی تر!! بێ‌گومان هەرکەس بەو جۆرە خۆپەرستو ماڵ پەرستو نەفس پەرست بێت هەمیشە ئامادەیە بۆ بەندەیی هەرکەسێك کە دەستی بۆ درێژبکات، وە هەرکەس ئازاد بێت لە بەندەیی ئارەزووەکانی ئەو کەسە لەناو گەلدا ئازادو سەر بەرزە!! ئینجا بێجگە لەوەی کە باس کرا ئەو بەخشینی ماڵو سامانە زۆر بەنرخو سوود بەخشە لەناو گەلو کۆمەڵدا... یەکەمو سەردەستە خزمەکان کە بەجێ‌هێنانی سیلەی ڕەحمە کە ئەوەش نیشانەی پیاوەتی و مەردایەتیە، وە مایەی ڕێزگرتنو بەهێزکردنی خێزانو بنەماڵەیە، وە خێزانیش یەکەم خشتە بۆ کۆشکی گەلو هەرچەند ئەو ڕێكو پێك تربێت گەل بەرزو بەهێزتر ئەبێت، وە یارمەتی و کۆمەکی هەتیوان مایەی پەیوەستی و یەك گرتنی گەورەکانە لەگەڵ

بچووکەکان، وە بەهێزو دەسەڵاتداران لەگەڵ بێهێزو بێدەسەڵاتاندا، وە جێ پڕکردنەوەو قەرەبوو کردنی ئەو پارێزگاریو چاودێرییەی کەلە کیسی هەتیوەکان چووە بە هۆی نەمانی باوکیانەوە، وە بەو کۆمەکیو دەست گیرۆییە منداڵە هەتیوەکان ئەپارێزرێن لە پرژو بڵاو بوونەوەو تار بوونیانو دووچاربوونی کارو بەسەرهاتی ناڕەوا،وە دەرو دەروونیان پاك ئەبێت لە ڕقو کینە لە مەردوم، وە ئەو هەژارانەی کە ئابڕووی خۆیانیان خۆش ئەوێو داوا ناکەنو دەست پان ناکەنەوە لە کەس، دەست گیرۆییان زۆر بە نرخو پێویستە لەبەر پاراستنی ئەو پیاوەتیو دەرون بەرزییەیان لە لایەکەوە، وە لە لایەکی ترەوە لەبەر چارەسەر کردنی داماویو پەك کەوتوویيان، وە بۆ ئەوەی هەست بکەن بەو قوڵگیریو لێپرسینەوەی کە ئەبێ ببێ لە ناو گەلی موسڵماندا، تا ڕادەیەك نابێ هیچ کەس تیایدا داماوو زایە ببێ، وە پێویستو بەنرخە بۆ ڕێبوارو سەفەری کە لە ماڵو نیشتمانو کەسو کار براوەو داماوو پەك کەوتووە، تا هەست بکات بەوەی کە ئادەمی ئەبێ هەموو کەسو کار بن بۆ یەکتر، وە هەموو زەوی نیشتمانە بۆیان، وە لە هەر شوێنێ بنو لەناو هەر کۆمەڵێکدا بن شوێنی خۆیانەو کەسو کاری خۆیانە، وە بۆ داواکەرو سواڵکەرانیش پێویستە تا پێویستییان چارەسەر بکرێ، وە بۆ ئەوەی بەڵکو واز بێنن لەو سواڵکردنە کە ئیسلام پێی ناخۆشەو بێزارە لێی، لە ئایینی ئیسلامدا هەرکەس ئەندازەی پێویستی ببێ یا کارو ئیشێکی دەست کەوێ کە خۆی پێ بژیەنێ نابێ سواڵ بکات، وە ئیسلام فەرمان ئەدات کە مەردوم ئیشو کار بکەنو سواڵ نەکەن، وە دان بگرێ بە خۆیداو سواڵ نەکات، کەواتە ئەبێ کاتێ سواڵ بکات کە هۆی ژیانی نەبێت، وە بۆ ئازاد کردنی بەندە کە بە هۆی کردەوەی خراپی خۆیەوە جەنگی کرد لەگەڵ ئیسلامدا تا دووچاری ئەو بەندەییە بوو، ئەو یارمەتیو ماڵ بەخت کردنە پێویستە تا ئەو بەندەیە ئازادی خۆی وەربگرێتەوەو ڕزگاری ببێ لەو بەندەییەی کە ئیسلام دای نەهێناوەو بە ناچاری دانی پیا ناو لەگەڵ ئەوەشدا لە چەند ڕێگایەکەوە هۆی ئازاد بوونی زۆرو فراوان کردووە، یەکێ لەو هۆیانە یەك لەسەر هەشتی(٨/١) زەکاتی دیاری کردووە کە بەخت کرێ لەو ئازاد کردنەدا!! ئینجا دێینە سەر باسی بەشی سێیەم کە چوار شتەو یەکەمیان بەجێهێنانی نوێژە بە ڕێکی، بێگومان ڕێکیو ڕاستی نوێژ ئەمە نیە ڕوو بکرێتە ڕووگەیەکی دیاری کراو، بەڵکو ڕێكو ڕاستی نوێژ بەمە ئەبێت کە نوێژکەر لە هەموو بارو

ڕوویەکەوە ڕوو بکاتە خوای خۆی لە دیوی ناوەوەی، بە لەش و بە ژیریی و گیان و ڕۆح، نوێژ تەنها بزوتنەوەو جووڵانەوەیەکی لەش نیە وەك وەرزش کردن، وە تەنها ڕووکردنێکی ڕۆحی نیە، بەڵکو نوێژی ڕاستەقینەی ئیسلامی کورتەیەکە لەبیروباوەڕی ئیسلام لە بارەی ژیانەوە، ئیسلام دان ئەنێ بە ئادەمی دا لەبارەی لەش و ژیریی و ڕۆحیەوە، وە هیچ دژایەتیەك نابینێ لەبەینی بزووتنەوەو تێکۆشانێکی ئەم هێزانەی کە ئادەمیان لێ پێك هاتووە، وە نایەوێ پەکی هیچ کام بخات و لە ئیشی سروشتی خۆیان بیان وەستێنێ، نایەوێ پەنگ بخواتەوە بە لەش بۆ ئەوەی ڕۆح بەرەڵابێت، چونکە ئیش کردن و بەرەڵا بوونی ڕۆح نەبەستراوە بە لەکار خستنی لەشەوە، جا لەبەرئەوە گەورەترین خواپەرستی داناوە بە نوێژ کە بەجارێ بزووتنەوەو تێکۆشانی هەر سێ هێزەکەی تیا دەرئەکەوێ، وە بە جارێ هەمووی ڕوو ئەکاتە پەروەردگاری، بەشێك لە نوێژ وەستان و ڕکوع و سوجدە بردنە کە کارو کردەوەی لەشە، وە بەشێ تری خوێندن و بیرکردنەوەیە کە کارو کردەوەی ژیرییە، وە بەشێ تری ڕووکردن و بەستنەوەی دڵ و مل کەچیە بۆ خوا کەئەمەش کارو پیشەی ڕۆحە، هەموو ئەمانە بە جارێك پێك دێن، کەواتە نوێژی ڕاستەقینە بیرو باوەڕی ئیسلام لە بارەی ژیانەوە ئەخاتەوە بیری نوێژکەرەکە لە هەموو نوێژێکدا، بەڵکو لە هەموو ڕکاتێکدا، دووەم زەکات دان کە هەڵسان بە مافێکی کۆمەڵایەتی کە خوا دایناوە لە ماڵی دەوڵەمەندانـدا بۆ هەژارو بێنەواکان، لەبەرئەوەی کە لەڕاستی دا خوا خۆی خاوەنەو ئەو خستوویەتیە دەستی ئەو بەندەیەو کردوویەتی بە خاوەنی، وە مەرج و مافی لەسەر دانا کە یەکێك لەوانە زەکات لێ دەرکردنە، باس کردنی زەکات لێرەدا لەپاش باس کردنی بەخشینی ماڵ بەو شەش تاقمەی کە باس کران، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە زەکات مافێکی تایبەتی جیاوازە لەو بەخشینەو هیچ کام جێگەی ئەوی تر ناگرێتەوە، بەڵکو زەکات پێویست کراوێکی تایبەتی دیاری کراوە، وە ئەو بەخشینە سوننەتەو ئەندازەشی دیاری نەکراوە، وە هەرکام بەشێکن لەو چاکەیە کەلە یەکەم جاری ئایەتەکەوە فەرمووی، وە هەردوو بەشدارن لەپێك هێنانی ئیسلامی ڕاستەقینە...

سێیەم بەجێهێنان و هەڵسانە بە بەڵێن و پەیمانی شەرعی، کە ئەمەش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ئیسلام و قورئان لە چەند شوێندا باسی ئەکات و گێراویەتی بە نیشانەی بڕوا، وە بە نیشانەی ئادەمیێتی و نیشانەی چاکەو چاکە کردن، ئەم سیفەتە شیرینە زۆر پێویستە

بۆ پێك هێنان و بڵاوبوونەوەی ئارامی و دڵنیایی و بڕواكردن بە پەیوەندیەكانی گەل و ئەندامی گەل، وە پەیوەندیەكانی گەل و میللەت و میرییەكان، وە ئەبێ لە یەكەم جارەوە دەست پێبكات لەو بەڵێن و پەیمانانەی كە لەگەڵ خوادا ئەبێت ببەسترێت، وە ئیسلام هەڵئەسێ بەم سیفەتە لەگەڵ دۆست و دوژمنەكانی داو دەگاتە ئەوپەڕی ڕادەو سنوور، بەجۆرێ كە هەموو ئادەمی پێی نەگەیشتووە لە هەموو تەمەن و مێژووی دا وە پێشی ناگات مەگەر لە ژێر چاودێری و ڕێنموونی ئەم دا، چوارەم خۆگرتن و ئارامی لەكاتی سزاو ناخۆشی و بیم و ترس دا، بەم سیفەتە پیاوەتی و مەردایەتی دەستكەوت ئەبێ، وە بەم سیفەتە پێئەكات و ئامادەئەبێت بۆ بەربەرەكانی و زۆرانبازی لە بەسەرهاتەكانی ژیان و جیهاندا، وە بەم سیفەتە بەهێزە مەردوم دامەزراو ئەبێت لەكاتی خۆشی و تەنگی دا، بەم ڕەنگە لەكاتی خۆشی دا لە خۆی ناگۆڕێ، لەپەت بەرەڵا نابێت، وە لەكاتی تەنگی دا جیهان تاریك نابێ لێی و دنیای نایەتەوە یەك، وە ئەتوانێ بەرگری تاوان و جەورو ستەم بكات و پارێزگاری ڕەوشتی پاك و كردەوەی چاك بكات، وە بە تایبەتی ئەم سیفەتە زۆر زۆر پێویستە و ناچاری هەیە پێی بۆ گەل و كۆمەڵی موسڵمان كە گرنگترین و گەورەترین سپاردەی خراوەتە سەرشان، سپاردەی جێنشینی و سەركردایەتی و چاودێری ژیان و جیهان كەلەو ڕێگەدا هەموو جۆرە دڕك و داڵ و ناخۆشیەك ڕوو ئەدات و ئەبێ شانی بدرێتە بەرو بەبێ بڕینی ئەو هەموو پلە سەختانە ئەو ڕێگەیە نابڕێ و ئەو كارە گەورەیە بەڕێ نابرێ.

ئەم سیفەتە زۆر گرنگە لای خوا تاڕادەیەك قورئان لەناو سیفەتەكانی تردا جیای كردووەتەوە لە ڕوواڵەت و هۆنینەوەدا، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ كەبە گوێرەی پێشینەكەی: ﴿وَٱلْمُوفُونَ﴾ ئەبوایە بگوترایە ﴿وَٱلصَّـٰبِرُونَ﴾، بەڵام گۆڕی بەم شێوەی ئێستا بۆ گەیاندنی ئەو تایبەتێتیەی، چونكە بە پێی باوی زمانی عەرەب ئەمە پێی ئەوترێ: (منوصب علی الأختصاص)وە كراوە بە نیشانەی تایبەتی ئامۆژگاری بەم جۆرە تەنیا ئایەتێك ئەم هەموو شتە گرنگ و گەورەیەی كۆكردەوە كەلە ڕاستی دا ئەمە كورتەو پاڵفتەیەكی تێرو تەواوە بۆ ئیسلام و بۆ ڕێبازە بێ وێنەكەی، جا لەبەرئەوە ئەم شایەتیە گەورەیەی هێنا بە دوای باسەكەداو ئایەتەكەی پێ تەواو كرد، ئەم شایەتیەش بەرزترین ئافەرینە بۆ ئەو خواپێداوانەی كە خاوەن ئەو هەموو ڕەوشت و كردەوە چاكانەن.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَىۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰۚ

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ﴾ ئەوانەی کە باس کران کەسانێکن کە ڕاستیان کرد، ڕاستیان کرد لەگەڵ ئیسلامو مل کەچیەکەیان بۆ خوای خۆیان ـ ڕاستیان لە بڕواو عەقیدەکەیاندا ـ ڕاستیان کرد لە بەدی هێنانی بڕواو عەقیدەکەیاندا بە کردەوەو ڕەفتار لە ژیاندا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ وە هەر ئەوانەن خۆ پارێز، خۆ پارێز لە سزای خوا (جل شأنە)، هەر ئەوانەن لە خوا ترسی ڕاستەقینە کە هەڵسان بە پێویستی سەرشانیان بە سۆزو پەرۆشەوە، ئینجا با چاوێ هەڵخەین بۆ ئەو ئاسۆ بەرزانەی کە خوای میهرەبان دایناون بۆ بەندەکانی و پێ ی خۆشە کە بەرز ببنەوە بۆیان بەهۆی پەیڕەوی کردنی بەرنامە بەرزو بڵندەکەی، ئینجا با لەو ئاسۆ بەرزو بەرێزانەوە بێینە خوارەوەو بەسەرسوڕمانو بێزاری دەربڕینەوە سەرنجێکی ئەم نەحسو نەگبەتانە بدەین کە دوور ئەکەونەوە لەو بەرنامە پیرۆزەوەو دژی ئەوەستن، وە بە هەموو هێز بەرگری ئەکەنو جەنگ بەرپا ئەکەن دەربارەی هەرکەس کە بانگیان بکات بۆلای ئەو بەرنامە پاکو بڵندە، ئینجا با بەداخەوە دەستمان پان بکەینەوەو وەربگێڕین کەلە ناخی دڵەوە ئاخێکی جەرگ بڕێتە دەرێ وەك خوا (جل شأنە) دەفەرموێ: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِۚ﴾ ئەی داخو مەراقو خەفەت وەرە ببارە بەسەر ئەو بەندە پەستو نەگبەتانەدا!! وەرە جێ ی خۆتەو هەق وایە هەر بەسەر ئەوانەدا بڕژێ ی! ئینجا هەمتر سەرنج ئەدەین ئەبینین ئەو داخو مەراقە خەریکە بار بکاتو نەمێنێ بە ئومێدی خوا (جل ذکرە) وە بەپشت پڕیمان بەهێزو ڕوونی ئەم بەرنامەی خوا (سبحانە) کە خەریکە بەرە بەرە ئەچەسپێتەوە لە دەروونو ژیانی مەردوم دا، وەلە هەموو لایەکەوە مەردوم خەریکن هۆش ئەکەنەوەو لە خەوی نەفامی و بێ هۆشی بێدار ئەبنەوەو خەریکن چاو بەرز ئەکەنەوە بۆ ئاسۆ بەرزەکەی قورئانو ئەیانەوێ دووبارە سەرکەونەوە بۆ ئەو پلەو ئاسۆیە، ئینجا لێرە بەدواوە تا ئایەتی (١٨٩) بەشێك لە ڕژێمی کۆمەڵایەتی باس ئەکات بۆ گەلی موسڵمان کەلە یەکەم جارەوە لە مەدینەدا فەراهەم هات

دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە، هەر چۆنێ باسی ڕۆژوو ئەکات و هۆی دانان و پێویست کردنی و چەند ئادابێکی تری، لەگەڵ چەند شتی تردا، وە ئەوانەی هەموو تێکەڵ کردووە و جۆشی داون و پەیوەستی کردوون پێکەوە، کە ئەوەش ئەوە نیشان ئەدات کە ئەم ئایین و شەریعەتە کۆمەڵەیەکە و دەست نادات بۆ بەش بەش کردن، بەڵکو بە هەموویەوە ئیسلام پێك دێت و بەدی دێت، لە یەکەم جارەوە باسی (قصاص) ئەکات، واتە کوشتنەوەی بکوژی دەست درێژی کەر لە بریتی کوژراوەکەی دا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى﴾ نوسراوە لەسەرتان و پێویست کراوە کوشتنی بکوژ لەباتی و لەبەر کوشتنی کوژراوەکان، بە جۆرێ هەر دەست درێژی کەر بکوژرێ نەك هیچ کەسێکی تر، ئیتر با ئەو بکوژو دەست درێژی کەرە کۆمەڵێك بن و هەرچەند بن وەك کۆمەڵ و جەماوەری زانایان ئەفەرموون، ئینجا ئایا ئەو کوشتنەوە و تۆڵە سەندنە ئەبێ هەر لەسەر ئەو بارو شێوە بێت کە دەست درێژی کەر هەڵسا بێ پێی، یان ئەو هەرچۆن بووبێ تۆڵە سەندنەکە ئەبێ هەر بەشمشێرو سەرکردن بێت؟ زۆربەی زانایان لەسەر باری یەکەمن، وە ئیمامی حەنەفی و هاوەڵەکانی ڕای دووەمیان هەڵبژاردووە.

خوای گەورە بە پێی باوی خۆی بانگی کردە بڕواداران بە سیفەتی بڕواهێنانەکەیان تا بێدار ببنەوە یاسایە خوا دایناوە، کەواتە ئەبێ بەبێ سەر لێ کردنەوە گوێڕایەڵ بن، وەك بڕواکەیان داخوازە بۆ ئەوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ﴾ واتە ئازاد تۆڵەی لێ ئەسەنرێ لە باتی ئازاد دا ﴿وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ﴾ وە بەندە لەباتی بەندە دا ﴿وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ وە مێینە لەباتی مێینەدا، لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە چەند شتێ هاتووە:

١- لا بردن و سڕینەوەی ئەو باوو بڕیارانیە کەلە پێش هاتنی ئیسلامدا هەبوون، وە ئەوانەش ئەمە بوون جوولەکە هەر کوشتنەوەی بکوژەکەیان پێویست ئەکرد، وە نەسرانیەکان هەر لێبوردنیان بەلاوە بوو، وە عەرەبەکانیش هەندێ جار کوشتنیان بڕیار ئەدا، وە هەندێ جار خوێنیان ئەسەند، بەڵام لە هەردوو بارەکەدا زیادە ڕەوی زۆریان ئەکرد، لە بارەی کوشتنەوە ئەگەر جەنگ و کوشتار ڕووی بدایە لەبەینی دوو

خێڵداو کوژراوی جۆر بەجۆر ببوایەو یەکێ لەو دوو خێڵەگەورەو پایە بەرزبوایە، ئەوەی کە پایە بەرزبوایە ئەیانگوت لەباتی بەندەمان ئەبێ ئازاد بکوژین، وە لەباتی ئافرەتمان پیاو ئەکوژین، وە لەباتی پیاوێکدا دوو پیاو ئەکوژین، وە هەر زامێکیان لێ بکرایە داوای دوو قاتیان ئەکرد، وەهەندێ جار بە تەواوی لە سنوور دەرئەچوون وەك ئەگێڕنەوە کە پیاوێك کوڕی یەکێ لەو سەرۆکانە ئەکوژێ، ئینجا خۆم و کەسی بکوژ کۆ ئەبنەوە لای باوکی کوژراو، وە پێی ئەڵێن: ئایا چیت ئەوێ؟ ئەویش ئەڵێ: یەکێ لەسێ شت، ئەوانیش ئەڵێن: ئەوانە چین؟ ئەویش ئەڵێ: یا کوڕەکەم بۆ زیندوو بکەنەوە، یا پڕی ماڵکەم بکەن لە ئەستێرەی ئاسمان، یا هەموو گەلەکەتان بێنن تابیانکوژم لەباتی کوڕەکەم دا، ئینجا هێشتا وا نازانم کە هیچم وەرگرتبێ، وەلە بارەی خوێن سەندنەوە، خوێنی هەر پیاوێکی گەورەیان دائەنا بە چەند چەندانەی پیاوی ژێر دەستو هەژار، ئینجا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کرا ئەوەی کە داد بوو ئەوەی پێویست کرد، وە یەکسانی خستەنێوان بەندەکانی خوا لە تۆڵەسەندندا، وە خوا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە.

٢- (قتادة) ئەفەرموێ: لەسەردەمی نەفامی دا ستەمو دەست درێژیو گوێڕایەڵی شەیتان ئەکرا، بەم ڕەنگە هەر خێڵێ کە زاڵو دەسەلآت دار بوایە، ئەگەر بەندەی هۆزی تر بەندەی ئەو بکوشتایە ئەیانگوت: لەباتی بەندەکەمان هەر ئەبێ ئازادێ بکوژین لەبەر ئەوەی خۆیان بە زل دائەنا، وە ئەگەر ئافرەتێکیان بکوژرایە، ئەیانگوت: ئەبێ پیاوێك بکوژین لەباتی ئەو ئافرەتەدا، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوەو هەواڵی پێدان کەلە باتی بەندەدا بەندەو لەباتی ئافرەتدا ئافرەتو جڵەوگیری کردن لەستەمو زیادەڕەوی، ئینجا ئایەتی سورەتی ﴿مائدة﴾ هاتە خوارەوە: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ وە (شەعبی) وێنەی ئەم ڕیوایەتەی هێناوە لە کۆمەڵی (تابعین)ەوە.

٣- لە (سوددی)ەوە هاتووە کە فەرموویەتی: دوو تاقم لە عەرەب ـ یەکێکیان موسڵمان بوو ئەوی تریان پەیمان دەرـ جەنگو کوشتار لە نێوانیان دا ڕووی داو چەند ئازادو

بەندەو ئافرەتی تیا کوژرا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سوڵحی کردن لەسەر ئەوەی لەباتی ئازاددا خوێنی ئازاد بدرێ، وە لەباتی بەندەدا خوێنی بەندە بدرێ، وە لەباتی ئافرەتدا خوێنی ئافرەت بدرێ.

٤- (ئیبن و ئەبی حاتەم) ڕیوایەتێ ئەهێنێ کە ئەچێتەوە سەر (سەعیدی کوڕی جوبەیر) کەدوو هۆز لە عەرەب کەمێك پێش هاتنی ئیسلام جەنگ و کوشتار بەرپا ئەبێ لە نێوانیان دا، وە کوشتن و زامدار کردن ڕوو ئەدات و لەناو کوژراوەکاندا بەندەو ئافرەتیش ئەبێت، وە بەو جۆرە ئەمێننەوە هەتا موسڵمان ئەبن، وە یەکێکیان گەورەو بەدەسەڵات تر ئەبێت، بەهۆی ئەوەوە سوێن ئەخۆن کە ڕازی نابن تا لەباتی بەندەی ئەمان ئازادی ئەوان نەکوژرێ، وە لەباتی ئافرەتی ئەمان پیاوی ئەوان، ئینجا بەبۆنەی ئەوانەوە ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە، وە لەم ڕیوایەتەو ڕیوایەتی تریشدا کەلە (ئەبو مالیك)ەوە هاتووە ئەڵێن: کە ئەم ئایەتە سڕاوەتەوە بە ئایەتەکەی سورەتی ﴿مائدة﴾: ﴿أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ﴾.

ئینجا لەبەرئەو ڕیوایەتانەو چەند ڕیوایەتی تریش کە هاتوون، وە لەبەرئەوەی هەڵئەگرێ کە سەرەتای ئایەتەکە بە تەنیا وتەیەکەی تەواوبێت و بەبێ پێویستی بە دواکەی وە هەڵئەگرێ تەواوو سەربەخۆ نەبێ و پێویستی هەبێ بە دواکەی تا ئەگاتە ﴿بِٱلۡأُنثَىٰ﴾ لەبەر ئەم دوو هۆیە زانایانی تەفسیرو ئیمامان ڕایان جیاوازە لە تەفسیری ئەم ئایەتەو لە حوکم و بڕیارەکانی دا بەم جۆرە کە دێت:

أ- ئەی بڕواداران بە پێی باوی جوولەکەو نەسرانی و پەرستەکان ڕەفتار نەکەن لە تۆڵە سەندن لە بکوژی تاوانباردا وەك باس کرا، بەڵکو هەر کوشتن پێویست کراوە لە ڕێوە، وە لەسەر کاربەدەستە بەجێی بێنێ، یان لەسەر تاوانبارەکە کە مل کەچ بکات بۆی، وە ئەو کوشتنەش بە بێ زیادەڕەوی و دەست درێژی بۆ کەسی تر وەك لە ئایەتەکەوە دەرئە کەوێ کە ئەفەرموێ: ئازاد لەباتی ئازادو...هتد، لەسەر ئەم ڕایە ئایەتەکە هەر

باسی تۆڵەی ئەم سێ تاقمە ئەکات کە دیاری کردوون و بێ دەنگە لە هەموو جۆرو تاقمی تر، وەحوکمو بڕیاری جۆرو تاقمەکانی تر لە حەدیس و شتی ترەوە وەرئەگیرێ.

ب- ئەی بڕواداران پێویست کراوە لەسەرتان یەکسانی کردن لە تۆڵەسەندندا ئیتر ئازاد بن یان بەندە موسڵمان بن یان بێبڕوا بە مەرجێ جەنگی (حربی) نەبن، وە زیادڕەوی و دەست درێژی نەکەن بۆ بێ تاوان، بەڵکو بۆ وێنە: ئازاد لەباتی ئازاد دا... هتد، نەك وەك باوی سەردەمی نەفامی، لەسەر ئەم ڕایە کە حەنەفیەکانی لەسەرە ئایەتکە گشتیەو بە وێنەی ئایەتی ﴿الإسراء﴾ وایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ هەرکەس کوژرابێت بە ناهەق و ستەمی لێ کرابێ ئێمە دەسەڵاتمان داوە بە خاوەنەکەی بۆ کوشتنەوەی، وە هەروەها وەك ئایەتی ﴿مائدة﴾ وایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ﴾ بڕیارمان داوە لەسەر بەنی ئیسرائیلیەکان لە تەورات دا ﴿أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾کە هەرکەس ئەکوژرێ کە بە ناهەق هەر کەسێ کوشتبێتی، کەواتە بێ دەنگ نیە لەو جۆرانەش کە باس نەکراون، بەڵکو ئەوانیش وەك باسکراوەکانن، وە سەرەتای ئایەتەکە نەبەستراوە بە دواکەیەوە، بەڵکو باسی ئەو دواییەی هەر بۆ جڵەوگیرییە لەو باوە ناشیرینەی کە زۆرداران ئەیانویست بەکاری بێنن لە تۆڵەسەندندا بە دەست درێژی کردن لە بێتاوان و زیادە ڕەوی کردن لە تۆڵە سەندندا.

ت- ئەی بڕواداران پێویست کراوە لەسەرتان تۆڵەسەندن بە کوشتنی بکوژی تاوانبار بەم جۆرە ئازاد لەباتی ئازاد... هتد، لەسەر ئەم ڕایە کە (مالیکی)و (شافیعی)ەکانی لەسەرن سەرەتای ئایەتەکە بە تەنیا سەربەخۆو وتەیەکی تەواو نیە، بەڵکو بەستراوە بە دواکەیەوە، کەواتە لە غەیری ئەم سێ جۆرو تاقمە کەلە ئایەتەکەدا هەیە تۆڵە بە کوشتن نابێ، بەڵکو بە خوێن سەندن ئەبێ بەو جۆرو شێوەی کەلە کتێبەکاندا بڵاوبووەتەوە، وە هەرکام لە خاوەنی ئەم سێ ڕایە بەڵگەو ڕابەری هێناوەتەوە لەسەر ڕای خۆی و لێکۆڵینەوەی تایبەتی تیاکردووە، هەرکەس ئەیەوێ بەدرێژی باسەکە بزانێ با تەماشای کتێبە تایبەتیەکان بکات لە مەزهەبەکاندا، بێجگە لەم سێ ڕایە،

ڕایەکی تریش هەیە کە ڕیوایەت کراوە لە (ئیبن و عەباس)و (سەعیدی کوڕی موسەییب)و (شەعبی)و (نەخەعی)و (ثوري)و (ئەبو مالیك)ەوە ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێت ـ، ئەم ڕایە لە سەرەتاو یەکەم جاردا وەك ڕای سێیەمە، بەڵام ئەڵێ: بەستنەوەی سەرەتای ئایەتەکە بە دواکەیەوە سڕاوەیە بە ئایەتی ﴿مائدة﴾و وەکو ئەو شێوەی گشتی بەسەردا هێنراو پێویست کرا یەکسانی لە تۆڵەسەندن دا بەبێ هیچ مەرج و شەرت و شروتێك، وە ئەڵێ هەر چەند بڕیاری ئایەتی ﴿مائدة﴾ لە پێشەوە بووە لە تەورات دا، بەڵام هاتنە خوارەوەی دواکەوتووە لەم ئایەتەی ئێرە، وە یاسای ئایینە پێشووەکان کەلە قورئان دا هاتە خوارەوە بۆ ئێمەیشە مەگەر ڕابەرو بەڵگەیەکی ڕوون لە ئێمە لابدات و تایبەتی بکات بە پێشووەکانەوە.

ئەم ڕای چوارەمەش بەو شێوەیە هەیە، بەڵام ڕایەکی بەهێز نیە، وەك لە شوێنی تایبەتی خۆی دا باس کراوە، وە بێجگە لەوەش هەڵئەگرێ هەرکام لەم دوو ئایەتە بڕین بەسەر بارێکی تایبەتی جیاوازدا بەجۆرێ هیچ دژایەتی نەمێنێ لەناو ڕواڵەتی ئەم دوو ئایەتەدا، ئەو کاتە پێویست نامێنێ بە سڕینەوەو باسی سڕینەوەی هیچ کام بۆ ئەوی تر، ئەوەش بەم ڕەنگە ئایەتی ﴿مائدة﴾ بڕین بەسەر دەست درێژی یەکێك یا کۆمەڵێك بۆ سەر کۆمەڵێکی تر، وەك لە ڕواڵەتی ڕیوایەتەکانیشەوە دەرکەوتن کە هێنامان لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەدا، واتە ئەگەر دوو کۆمەڵە ئاوا چوون بەگژی یەکداو کوشتاریان لەیەکتر کردو لە پاش دا موسڵمانان ویستیان سوڵحیان بکەن ئەبێ ژمارەی کوژراوی هەر دوو تاقم ژمارە بکرێ و بدرێن لە یەك، بەو جۆرە ئازادو پیاو لە باتی پیاوو ئافرەت لەباتی ئافرەت، ئەگەر ئەم تێڕوانینە ڕاست دەرچێ ئەو کاتە ـ وەك وتمان ـ دژایەتی نامێنێ و پێویست ناکات بەبڕیاری سڕینەوە، ئینجا لەسەر هەموو بارو لەسەر هەموو ڕایەك تۆڵە سەندن بە کوشتن لە کاتێکدا ئەبێت کە دەستی قەست دەست درێژیەکە کرابێ، ئەگینا بکوژ ناکوژرێ، وەك بڕیاری بەتایبەتی هاتووە لە ئایەتی سورەتی ﴿النساء﴾دا،

﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٨﴾

وە هەروەها ئەگەر کاربەدەستی کوژراو لێی نەبوردن ئیتر بە خۆڕایی یا خوێن سەندن، ئەگینا لەم کاتەشدا بکوژ نابێ بکوژرێ وەك دەرئەکەوێ لێرەدا کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾ ئینجا هەر بکوژێك ئەندازێو شتێ لێبوردنی لێ کرا لە لایەن براکەیەوە، واتە خوێن ڕەس و هەقداری کوژراوەکە کەبرای بکوژە لە ئادەمێتی و لە ئاییندا، وە ناوی برد بە برا لەبەر ڕاکێشانی سۆزو بەزەیی هەردوولا، بەشێك لێ بوردنی لێ کرا، بەم ڕەنگە هەقدارەکە دەست هەڵگرێ لە کوشتنی و بە تەواویش لێی نەبورێ، ئەو حەلە خوێنی ئەکەوێ کە ئەوەش بەشێکە لە لێبوردن، یان بەم ڕەنگە هەقدارەکە زیاد لە یەك کەس بێت و هەندێکیان دەست هەڵگرن لە کوشتنی و ڕازی بن بە خوێن سەندن کە ئەو حەلەش کەوشتن نامێنێ، یان مەبەست ئەوەیە دەست هەڵئەگیرێ لەکوشتن و هەندێ لە خوێنەکەش، کە ئەمەش ڕای تاقمێ لە زانایانە، لەسەر هەرکام لەم سێ ڕایە ئەوا ئامۆژگاری هەردوولا ئەکات، ئامۆژگاری لێبوردە ئەکات بەمەی ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ پێویستە لەسەری پەیڕەوی لێبوردنەکەی بەڕێك و پێکی، بەم ڕەنگە توندو تیژی بەکار نەهێنێ لە داوای خوێنەکەداو داوای زیادەی لێ نەکات، وە ئەگەر بێ نەواو دەست تەنگ بوو مۆڵەتی بدات و لێی بوەستێ، وە ئامۆژگاری لێ بوراوەکەش ئەکات بەمەی ئەفەرموێ: ﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ﴾ پێویستە لەسەری خوێنەکەی جێبەجێ بکات و بیدا بە هەقدارەکە، بەم ڕەنگە بەبێ تەفرەو لاری و کەم و کوڕی بیدا بەپێی دەسەڵات و توانا، وەك (ئیبن و عەباس) و (حەسەن) و (قتادە) و (مجاهد) ئەفەرموون -خوا لێیان ڕازی بێ-.

خوای میهرەبان منەتی نا بەسەر ئەم ئوممەتەدا بە دانانی یاسای خوێن سەندن، نەك وەك یاسای تەورات کە هەر کوشتنی تیا پێویست کرا بوو، وە نەك وەك یاسای ئینجیل کە هەر لێبوردنی پێویست کرد بوو لە خۆڕایی و بەبێ خوێن سەندن، لەم شەریعەتەدا یەکێ لە

سێ شت دانرا: خوێن سەندن، لێبوردن بە خۆڕایی و لە ڕێی خوادا، بە دانانی ئەم یاسای خوێن سەندن کارەکەی سووك و ئاسان کرد لەسەرمان وەکو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ ئەو بڕیاری لێبوردن و خوێن سەندنە سووك کردنێك بوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە میهرەبانیەك بوو پێتان، بەمەی کە بکوژ ڕزگاری ئەبێ لە کوشتن و لە هەمان کاتدا ئاشتی و برایەتی پەیدا ئەبێتەوە و هەقداریش بەهرەمەند ئەبێ بەو ماڵ و دەسکەوتە زۆرە، جا لەبەرئەوە هەرکەس بە پێچەوانەی ئەو میهرەبانیە ڕەفتار بکات شایستەیە بۆ ئەوەی ئەم هەڕەشە سامناکەی ئاراستەبکرێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو سووك کردنە هەرکەس دەست درێژی بکات، لە سنووری شەرعی خوا دەرچێ، بەم ڕەنگە کەسی تر بکوژێ غەیری بکوژ، یان هەر بکوژ بکوژێتەوە لە پاش وەرگرتنی خوێن ﴿فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەو کەسە هەیە سزایەکی سەختی ئێش و ئازار دەر، وە بێجگە لەو سزای ڕۆژی دواییە ئەبێ بکوژرێ و خوێن لەم وەرناگیرێ، چونکە بەڵێن و پەیمانی هەڵوەشاندووەتەوە، وە ڕێك کەوتن و ڕەزامەندی هەردوولای بە هیچ دەرکرد، وە دڵ و دەروونی پڕ کردەوە لە کینەو دوژمنایەتی لە پاش پاك و ساف کردن و پاك کردنەوەی، وە ئەو پەڕی ناپیاوی بەکار هێنا لەپاش ڕازی بوون و وەرگرتنی خوێن، دەست درێژی کردو تۆڵەی سەند، ئابەم جۆرو شێوە ڕێك و ڕاستە ئیسلام یاسای دانا بۆ بەندەکانی خوا، سەرنجی هەموو باوێکی داوە و چاودێری هەموو لایەکی کردووە، ئەزانێ کە ئێش و ڕقی کوشتن تا چ ڕادەیەك سەخت و بەتینە لەسەر ئەوە تۆڵە سەندنی بە کوشتنەوە داناوە کە بەوە داخ و ئێشی دڵ سارێژ ئەبێت، وە دەستی دەست درێژی کەرانیش ئەبەستێ لەوەی سەر بکەنە خراپەکاری، وە لە هەمان کاتدا لێبوردنی پێخۆشە و خۆشەویستی ئەکات لەدڵ و دەروندا، وە قاپی ئەکاتەوە و سنووری بۆ دیاری ئەکات، وە بانگی مەردومی بۆ ئەکات کە بە پیاوەتی و ئارەزووی خۆیان هەڵسن پێی، نەك بە زۆرو بیدا بەسەری دا بە زۆر، بێجگە لەوەش بەڵێنی پاداشت دانەوەی پێ ئەدا لەسەر ئەو لێبوردنە.

له پاش دانانی ئەو یاسا بەرزە، ئینجا هۆی دانانەکەی دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ﴾ بۆ ئێوە هەیە لە دانانی یاسای (قصاص)دا ژیانێکی گرنگ، واتە ئەم یاسایە مایەی ژیان و مانەوەتانە، نەك مەبەست تۆڵەسەندن و داخی دڵ ڕشتن و لەناو بردنتان بێت، بەڵێ بە ڕاستی لە هەر بارو ڕوویەکەوە ئەم یاسایە مایەی ژیانە، نەك لەناو چوون و نەمان، مایەی ژیانە چونکە کابرا کە زانی ئەگەر بە ناهەق کەسێ بکوژێ ئەکوژرێتەوە، ئەو کاتە کۆسپەی لێ ئەکەوێ و ئەگەڕێتەوە لەو کارە ناڕەوایە، مەگەر بە دەگمەن و لە حاڵەتی تایبەتی دا، کەواتە بەو گەڕانەوە ئەمیش و ئەویش کە نیازی کوشتنی کردووە ڕزگار ئەبن، وە هەروەها ئەبێتە بەر بەست بۆ تەندنەوەی کوشتار لەناو کەس و کاری هەردوولادا کە ئەو تەندنەوە بە زۆری ڕوو ئەدات و پەیدا ئەبێ لە کوشتنە ناهەقەکەی یەکەم جارەوە، بەڵێ مایەی ژیانە، چونکە ئەو باوی نەفامیەی لابرد کەلە باتی کەسێکدا چەند کەس ئەکوژرا بە ناهەق و بێ تاوان، بەڵێ بە ڕاستی مایەی ژیانە، چونکە مەردومی تری پێ تەمێ خوارئەبێت و جڵەو گیریان ئەکات لەو هەموو کوشتنەی بە چاو ئەبینرێ و هۆکەشی نەبوونی ئەو یاسایەیە کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی، بێجگە لەمانەش دەست درێژی کردن بۆ سەر گیانی تەنیا کەسێك وەك دەست درێژی وایە بۆ سەرگیانی هەموو یەکێك کە بەشداری ئەو کوژراوەیە لە گیان و دروشمی گیاندا، دەی بەم یاسایە بەرگری کرا لە کوشتن و گیان دەرکردنی تەنیا کەسێك، ئەو حەلە جڵەوگیری کراوە لەدەست درێژی بۆ سەر هەموو گیان، کەواتە ئەو یاسایە ژیانی تیایە، ژیان بەبێ سنوور، نەك ژیانی یەکێك، یاخێزان و بنەماڵەیەك، یا خێزان و بنەماڵەیەك، یا ژیانی گەل و کرمەڵێك، بێگومان ئەم یاسا بەرزەبەو جۆرە پڕ سوودو بەهرە بەخشە، لەگەڵ ئەوەدا هەندێ لە پیاوانی یاسای زەمینی ئەیانەوێ ئەو یاسای خوایە لابرێ و ڕەفتاری پێ نەکرێ، چونکە دڵیان گەرمەو بەزەییان دێتەوە بەو بکوژە تاوانبارەدا!! بەڕاستی کوژراوە داماوەکە شایستە ترە بە بەزەیی و سۆز پیا هاتنەوە، ئەگەر ئەوانە بەزەییان بێتەوە بە بکوژی تاوانباردا، ئەبێ کێ بەزەیی بێتەوە بەو گەلەدا کە تاوانباران تێکی ئەدەن و پڕی ئەکەن لە کینەو دوژمنایەتی! بەڕاستی تێڕوانی ئەو جۆرە قانوانە زۆر تەنگ و تاریکە، ئەوانە یان بێبەشن لە ژیریی یان ژیرییەکەیان بێ هێزو لاوازەو ئیش ناکات، وە ئەم جۆرە شتانە بەژیریی تەواو ئەزانرێن،

يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ
خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾

---

**وەك قورئانیش ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو ژیرانەو ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ ئەی خاوەن ژیرییە پاكو خاوێنەکان ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ واتە ئەم یاسایە پێویست کراو پێتان ڕاگەیەنرا، یان هۆو بەرژەوەندی ئەم یاسامان بۆ باس کردن بەڵکو خۆتان بپارێزن لەدەست درێژی بە کوشتن و خوێن ڕێژی لە یەکەم جارەوە، وەلە دوایی دا خۆتان بپارێزن لە دەست درێژی و زیادەڕەوی لە تۆڵەو هەق سەندندا، (زەمەخشەری) ئەفەرموێ: بەڵکو کردەوە بکەن وەك لە خواترسەکان بە پارێزگاری ئەم یاساو ڕەفتار پێ کردنی و بڕیار پێدانی و بەدی هێنانی، وە ئەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە زیاتر تایبەتیەو پەیوەستی هەیە بە حوکمڕان و کاربەدەستانەوە، بێگومان بەبێ ئەو لە خواترسیە هیچ شەریعەت و یاسایەك ڕاگیر نابێ و لە واقیعی ژیاندا بەدی نایەت، وە بەبێ ئەو لەخواترسیە بە هیچ کەس کۆسپەی لێ ناکەوێ و تا بگونجێ گەڕانەوەی لەو شتانەی کە ئارەزووی ئەکات! وە بەهۆی ئەو لە خوا ترسیەوە تاوان و دەست درێژی و خراپەکاری زۆر کەم بوو لەناو گەلی موسڵمانی ڕاستەقینەدا، بەڵێ ئەبێ خراپەکاری زۆر کەم بێت لەناو ئەو گەلەدا، چونکە هەمیشە هەر یەکێ لەو گەلە موسڵمانە چاودێری و پاسەوانێکی بەهێزی وریای لەگەڵەو لە ناو دڵ و دەروونی دا ئیش ئەکات، تا ڕادەیەك ئەگەر جارێ لەجاران هێزی ئارەزووی سەرکێشی بکات و جڵەوی لەدەستی دەرچێ و کارێکی پیسی پێبکات، دەست بە جێبڕواو لە خوا ترسیەکەی ئەکەوێتە سەرزەنشت و تەشەر لێدانی تا ئارامی لێ ئەبڕێ و ناچاری ئەکات بەوەی بچێ لەبەردەم دادگادا ڕاستی خۆی بڵێت و دان بنێت بە تاوانەکەی خۆی دا، بۆ ئەوەی تۆڵەو هەقی لێ بسێنرێ و نەکەوێتە ڕۆژی دوایی و دووچاری سزای دۆزەخ ببێت!! ئیتر با هیچ کەس پێی نەزانی بیت، وە با لەو تۆڵەو هەق لێ سەندنەدا بکوژرێ و سەری تیا بڕوا، وە چەند ڕووداوێکی بەناوبانگ هەیە کە بکرێن بە وێنەو نموونە بۆ ئەوەی کە باس کرا، یەکێ لەوانە ڕووداوی (ماعین) ناو کە دووچاری زینا بوو، چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانی نا بەو کردەوەی کە هیچ کەس لە ئادەمی پێی نەزانیبوو، وە هەرچەند گێروگرفت و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا هەر وازی نەهێناو هەتا تۆڵەی لێ سەنراو بەئارام و لێخۆش بوونەوە**

ئەو بارە گرانەی هەڵگرت و دەستی نا بە گیانی خۆیەوە، تا نەکەوێتە بەر خەشمی خواو سزای ئاگری ڕۆژی دوایی! ئیسلام بەو جۆرە بڕواو لە خواترسی فەراهەم ئەهێنێ لە دڵ و دەروونی مەردوم دا، وە لەباریێ ترەوە یاسا و شەریعەتەکەشی ڕوون و ڕووناکەو ڕێکە لەگەڵ سرووشتی ئادەمی دا، هەر چۆنێ تەمێ و ئامۆژگاریەکانی لەگەڵ عیبادەت و خواپەرستیەکانی قۆڵگیرو یارمەتی دەرێکی بەهێزن بۆ گوێ ڕایەڵی و فەرمان بەری، جا لەبەر هەموو ئەوانە ئیسلام سەرکەوتوو زاڵ ئەبێ و بە ڕێکی بەدی دێت لە ژیاندا، وە شتێکی خەیاڵ پڵاونیە، وەك ڕژێم و یاسا دەست کردەکانی ئادەمی... ئەم قورئانە لە هیچ بارێکەوە هیچ شتێ تری پێ ناگات، تەنانەت لە بارەی وتەو وشەکانیەوە، بۆ نموونە ئەو وتەو ڕستەکورتەی کە ئەم یاسا گەورەو گرنگەی تیایە ﴿فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ﴾ هەوڵی زۆر درا لە هێنانی وتەو ڕستەیەکی تردا کە جێگەی بگرێتەوە، هیچ نەکراو هەر هەوڵێ درا بە بۆش دەرچوو، ئەوەتا هەڵبژێرراوو پاڵفتەکراوی ئەو وتەو ڕستەیانە ئەمەبوو (القتل وانفى للقتل) کە لە سیازدە بارەوە ئایەتەکە باوی هەیە بەسەری دا وەك باس کراوە لە کتێبەکانی عیلمی بەلاغەوهەندێ لە تەفسیرەکاندا، پاکی و بێ لەکەیی بۆ خواو بۆ هەموو سیفەت و کرەوەکانی.

ئینجا یاسای وەسیەت کردنی کاتی مردن ئەهێنێ بەدوای یاسای پێشوودا کە پەیوەستیەکی ئاشکرای هەیە بە یاسای پێشووەوە، ئەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ پێویست کراوە لەسەرتان کاتێ مردن ئامادەبوو، وە نیشانەکانی ڕووی کردە هەرکامێکتان ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا﴾ ئەگەر ماڵ و سامانێك بە جێ بهێڵێ، پێویست کراوە ﴿ٱلْوَصِيَّةُ﴾ وەسیەت کردن بە هەندێ بەو ماڵە ﴿لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ بۆ باوك و دایك و خزمە زۆر نزیکەکانی، ئەوەش ﴿بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ بە دادو بە شێوەیەکی شیرین کە بێزراو نەبێت لەناو مەردوم دا، بەم ڕەنگە لایەنگری تیا نەکردبێ و ئەوەی شایان و شیاو ترە بێ بەش یا دوای نەخستبێ، وەچاك وایە بە جۆرێك بێ کە بێگانەشی تیا بەشدار بێت، وە ئەو پێویست کردنی وەسیەتە ﴿حَقًّا﴾ بێگومان ڕاست و ڕەواو دامەزراوە ﴿عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾ لەسەر خوا ترسەکان کە بە پێی فەرمانی خوا پارێزەری ئەو وەسیەتەن، بێگومان لەسەر هەموو بڕوا دارێ پێویست کرا، کەواتە مەبەست بەم لە خواترسانە بڕوادارانە، چونکە ئەبێ بڕوادار هەرچۆنێ ببێ لە خوابترسێ، یان لەبەرئەوەی لە خواترسی ڕاستەقینە بە ڕێکی فەرمانبەرو گوێ ڕایەڵە، بە تایبەتی باسی ئەوانی کرد، وەك ئەم یاسایە هەر بۆ ئەوان دانرابێ، ئینجا ئایا

مەبەست بە وتەی ﴿خیر﴾ ماڵو سامانی زۆربێت، وەك لە فەرموودەی (ئیمامی عەلی)ەوە وەرئەگیرێ کە (بەیهەقی)و کۆمەڵێك لە (عور)ەوە ڕیوایەتی ئەکەن کە ئیمام -خوا لێی ڕازی بێ- چوو بۆ دیاری بەندەیەکی ئازاد کراوی خۆی لەکاتی سەرە مەرگدا، وە حەوت سەد یا شەش سەد درهەمی هەبوو، ئینجا ووتی بە ئیمام: ئایا وەسیەت نەکەم؟ ئەویش فەرمووی: نەخەیر، چونکە خوا ئەفەرموێ ئەگەر خەیر بەجێبهێڵێ، وە خێر ماڵو سامانی زۆرەو تۆ زۆرت نیە، کەواتە لێی گەڕێ بۆ میرات بەرەکانت، وە هەروەها (ئیبنو ئەبی شەیبە) کەدایکی ئیمانداران (خاتوو عائیشە) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەیگێڕێتەوە کە پیاوێك عەرزی ئەکات: ئەمەوێ وەسیەت بکەم، ئەویش فەرمووی: چەند ماڵت هەیە، ئەویش ئەڵێ: سێ هەزار، ئەویش ئەفەرموێ: ئەی خێزانت چەند کەسە؟ ئەویش ئەڵێ: چوار کەسە، ئەویش ئەفەرموێ: ئەمە کەمە، کەواتە لێی گەڕێ بۆ خێزانەکەت چاکترە.

لەسەر ئەو ڕایە وا دەرئەکەوێ کە ئەو زۆریو کەمیە بە گوێرەی شوێنو کاتو حاڵی مەردوم ئەگۆڕێ، کەواتە ئەندازێکی تایبەتی دیاری ناکەین، ئەگەرچی (ئیبنو عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- لای خواروی دیاری کردووە، وەك (عەبدی کوڕی حەمید) ئەیگێڕێتەوە لێیەوە فەرموویەتی هەرکەسێ شەست دینار بەجێ نەهێڵێ زۆری بەجێ نەهێشتووە، مەبەست بە وتەی ﴿خیر﴾ ئایا ئەمە بێ کە گوترا، یان هەر مەبەست پێی ماڵە، ئیتر هەرچەندە ببێ، وەك (زەمەری) ئەفەرموێ: بەهەرجۆر مەبەست بێت، چەند ڕایەك هەیە لەم یاسایەدا:

١- بەلای کۆڕو جەماوەری زانایانەوە سڕاوەتەوە بە ئایەتی میرات، وە ڕابەرێ ئەم سڕینەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەساڵی فەتحی مەککەدا فەرمووی: (لا وصية للوارث) وەسیەت بۆ میرات بەر نابێت، وە ئەم حەدیسە هەرچەند متواتر نیە، بەڵام زانایان وەریان گرتووەو ڕای گشتی بەسەریەتی، کەواتە وەك (متواتر) وایەو دەست ئەدا بۆ ئەوەی ئایەت بسڕێتەوە، لەسەر ئەم ڕایە پێویست کردنی نەمایەوە لەسەر هیچ کەسو بۆ هیچ کەس، بەڵام سوننەتە بۆ ئەو کەسانەی کە میرات بەر نین، ئتری خزم بن یا بێگانە، وە ئەندازەکەشی دیاری کراوە تا سێیەکی ماڵەکەی، وە هەرچەند زیاد بێت لەو سێیەکە بە بێئیزنی میرات بەر دانامەزرێ، وە بە هەرحاڵ چاك وایە لە چوار یەك تێپەڕ نەکات.

٢- سڕاوەتەوە هەر بۆ میرات بەر، وە ماوەتەوە بۆ خزمی میرات نەبەر.

٣- نەسڕاوەتەوەو لەسەر باری خۆی ماوەتەوە بەلای (ویبن و جەریرو ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی)ەوە.

٤- سڕاوەتەوە دەربارەی باوك و دایك و خزمی نزیكی میرات بەر، بەڵام هەر ماوەتەوە بۆ ئەو باوك و دایك و خزم و نزیكانەی كە میرات نابەن، بەم ڕەنگە ئاینیان جیاوازبێت، ئەمەش بەلای (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- وە هەروەها هەندێ لە هاوەڵەكان و تابعین لەسەر ئەم ڕایەن، وە ڕیوایەت كراوە لە (ئیمامی عەلی)ەوە كە فەرموویەتی: هەركەس لەكاتی مردنیدا وەسیەت نەكات بۆ ئەو خزمانەی كە میرات بەر نین ئەو كەیە كردەوەی خۆی بە گوناه تەواوكردووە، ئەمانە ڕای زانایانی ئیسلام بوون هەركام ڕابەرو بەڵگەی خۆی هەیە، ئینجا كار بەدەستی موسڵمانیش ڕێی هەیە هەركام لەم ڕایانە بكات بە یاساو ڕەفتاری پێبكرێ، وە بەمە دەمی ئەو دەم بەتاڵانە ئەبەسترێ كە لەبەر خۆیانەوە وەك وڕێنەبكەن ڕەخنە ئەگرن لەیاسای میرات و وەسیەت كە گوایە هیچ گوێ نەدراوە بە حەزو ئارەزووی مردووو خاوەن ماڵەكەو بەبێ ڕای ئەو هەموو بەشێك دیاری كراوەو ئیتر كابرا پێی خۆش بێت یان نا؟ لەگەڵ ئەوەدا ئەگونجێ حەزو ئارەزووەكەشی پیرۆزو بەجێ بێت لە هەندێ كاتدا وە ئەوەی یەكێك دوو برای هەبێت، یەكێكیان زۆر بەكەڵك و بەزەحمەت بووبێ و ئەوی تر زۆر بێنرخ بووبێت و بەڵكو هەمیشە دژو پێچەوانەی ڕەفتاری كردبێ، دیارە ئەم كابرای مردووە ئارەزووی هەیە كە بەشی برا چاكەكەی زۆر تربێت دەی ئەگەر جڵەوگیری بكرێت لە وەسیەت بۆ كردنی ئەوا بە داخەوە ئەمرێ، ئەم ڕەخنە بۆش و بێجێیە هەرچەند بێ نرخەو یاسا ئەبێ شتێكی گشتی بێت و نابەسترێ بە هەندێ شتی تایبەتیەوە، وە هەرچەند ئەو یەكە چاكە خوا پاداشتی ئەداتەوە لەسەر چاكیەكەی، كەواتە هەر بەشی ئەو زۆرترە، هەرچەند مەسەلەكە بەو جۆرەیە، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەوەتا لەناو زانایانی ئیسلام دا ڕێگە دراوە بەو وەسیەت كردنە، كەواتە مردووەكە ئەتوانێ لەسەر ڕای زانایان وەسیەت بكات بۆ برا چاكەكەی، مەبەست ئەوەیە ئەم شەریعەتە پان و فراوانەی ئیسلامە خۆی لەخۆی پێك هاتووەو تەنراوەو هەموو قۆرت و گرێیەكی ژیانی پێ ئەكرێتەوەو پێویست نیە بەوەی شوێنی هیچ ڕژێم و یاسایەكی تر بكەوین.

فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١٨١﴾ فَمَنۡ خَافَ مِن مُّوصٖ
جَنَفًا أَوۡ إِثۡمٗا فَأَصۡلَحَ بَيۡنَهُمۡ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ

---

هەركەس وەسیەت بكات پێویستە لەسەری كەسێك یا هەر چەند بكات بە ئەمین دارو وەصی كە هەڵسن بە جێبەجێی لەپاش خۆی، وە هەروەها چاك وایە شایەتیش ڕاگرێ لەسەری، ئینجا كە وەسیەتەكەی شەرعی بوو دائەمەزرێ‌و ئەبێ بە گوێرەی وەسیەتەكەی ڕەفتار بكرێ بەبێ زیادو كەم ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ﴾ ئینجا هەركەس لەو وەصی‌و شایەتانە ئەو وەسیەتەیان گۆڕی بە هەرجۆرو بارێكدا ﴿بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ﴾ لەپاش ئەوەی كە بیستی‌و بە باشی وەری گرت ﴿فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ﴾ گوناهی ئەو گۆڕین‌و وەسیەتە گۆڕراوە هەر لە ئەستۆو لەسەر ئەوانەیە كە ئەیگۆڕن، نە لەسەر وەسیەت كەرەو نەلەسەر وەسیەت بۆكراو.

ئینجا هەڕەشە ئەكات لە گۆڕەرەكان‌و بەڵێن ئەدات بە وەسیەت كەر كە نیازو كردەوەكەی باش بێت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ بەڕاستی خوا بیسەری زاناو ئاگایە بە هەموو قسەو كردەوەو نیازێكتان، كەواتە پاداشتی وەسیەت كەر ئەداتەوەو پرسیارو حیسابیش لەگەڵ گۆڕەرەكان ئەكات. گۆڕین‌و دەست كاری وەسیەت دروست نیە بەس لە یەك حاڵەتدا كە بزانرێ وەسیەت كەر لایداوەو ستەمی كردووە ئیتر بە نەزانین وە بەبێ نیازی ستەم كردن یان بە دەست قەست، وە بەهۆی ئەوەوە ئاژاوە پەیدا ببێ لەناو وەسیەت بۆ كراوەكاندا، لەم كات و حاڵەتەدا ئەگەر هەوڵ بدا بۆ یەك خستنی وەسیەت بۆ كراوەكان بە دەستكاری كردنی وەسیەتەكەو ڕێك كردنی لەگەڵ شەرعدا ئەوە هیچ گوناهێكی لەسەر نیە، وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَمَنۡ خَافَ مِن مُّوصٖ جَنَفًا﴾ ئینجا هەركەس مەترسی كرد لەوەسیەت كەرو زانی كە بە هەڵە لایداوەو ناڕەوایی كردووە لە وەیسەتەكەی دا ﴿أَوۡ إِثۡمٗا﴾ یا زانی كەبە دەست قەست ستەمی كردووەو بەهۆی ئەوەوە ناكۆكی‌و ئاژاوە بەرپا بوو لە ناو وەسیەت بۆ كراوەكاندا ﴿فَأَصۡلَحَ بَيۡنَهُمۡ﴾ ئینجا ئەمیش ڕێكی خستن بەوەی ڕێكی شەرعی كردو ئەو ناڕەوایی‌و ستەمی نەهێشت ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ﴾ ئەوا ئەو كەسە هیچ گوناهێكی لەسەر نیە لەو بارەیەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ

﴿ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ بەڕاستی خوا لێ بووردەی بەزەیی دارە، واتە لە جێیە خوا لێ بووردەیە لە گوناهو بەزەیی دارە بە گوناهکار باشتر لێ بووردەیەو بەزەیی دارە بەم گۆڕەرە کە خێرو چاکەو بەرژەوەندی بەکار هێناوە، بان مەبەست ئەوەیە کە لێ بووردەو بەزەیی دارە لە هەر کەمو کوڕیو درۆو لادانێ کە کردبێتی بۆ یەکخستنی و ڕێك کردنەوەی لەگەڵ شەرعدا.

بێگومان ئەم ئوممەتە کە کرا بەجێگرو جێنشینی هەموو ئوممەتەکان، وە پێویست کراوە لەسەری تێکۆشانو فیداکاری لەڕێی خواداو بۆ چەسپاندنو جێگیر کردنی بەرنامەی خوا لە زەوی دا، وە بۆئەوەی ببێ بە کاربەدەستو فەرمانڕەواو چاودێر بەسەر ئادەمێتیو ژیانو جیهانەوە، بێگومان ئوممەتی ئاوا زۆر پێویستە بە ڕۆژوو بۆ ئەوەی ڕام ببێتو ڕابێت لەسەر پەیوەستی مل کەچیو گوێڕایەڵی بە خوای خۆیەوە، وە بۆئەوەی بتوانێ خواهیشو خواستی خۆی دامەزراو بکات، وە بۆئەوەی فێری زاڵبوونو بەرزبوونەوە ببێ بەسەر هەموو ئارەزووو داخوازیەکانی لەش دا، وە بتوانێ ئەو بارە گرانە هەڵگرێ لە پێناوی فەرمانو ڕەزامەندی خوادا، ئەو حەلە ئامادە ئەبێت بۆ هەڵگرتنی بارو ئەرکی زۆر گرانی ئەو ڕێگەی کە ئەیداتە بەر، کە ئەو ڕێگەش پڕە لە دڕكو داڵ، وە لە هەموو لایەکەوە داخوازو ئارەزووەکانی لەش ڕێی لێ ئەگرێ، وە هۆی لادانو هەڵخلیسکان بەزۆری دەوری داوە!

ڕۆژوو بەوجۆرە پێویستەو بڕوادار داماویی هەیە بۆی، بێجگە لەو بەرو بەرهەمە دەروونیو کۆمەڵایەتیو تەندروستیەی کە بەرە بەرە ڕوون ئەبنەوە بۆ مەردوم، جا لەبەرئەوە ڕۆژوو لە ئیسلامدا بە پایەیەك لە پێنج پایەکانی ئیسلام دانراوە،بێگومان ڕۆژوو بارو ئەرکێکی گرانە بەسەر نەفسەوەو پێویستی هەیە بە کۆمەکی کردنو پاڵ پێوەنان بۆی، وە پێویستی هەیە بە خۆشەویست کردنی لە دەروونیدا، بۆ ئەوەی بێتە سۆزو پەرۆش بۆیو بتوانێ بە خۆشیەوە هەڵسێ پێیو گوێڕایەڵی بکات، جا لەبەرئەوە بە شێوەیە پێویست ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، بانگیان لێ ئەکات بە ناوو سیفەتی بڕوا کە زۆر خۆشەویستە لای بڕواداران، وە پاڵ پێوەنەرێکی بەهێزە بۆ گوێڕایەڵیو ملکەچیو فەرمانبەری،

كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ پێویست کرا لەسەرتان ڕۆژوو، ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ هەرچۆنێ پێویست کرا لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە لە گەلو ئوممەتەکانی، ئیتر ئایا مەبەست گەلو ئوممەتی هەموو پێغەمبەرانی تر بێت لە ئادەمەوە تا ئێستا، وەك دیمەنو ڕواڵەتەکە ئەو شێوە گشتیە نیشان ئەدات، یان مەبەست یەهودو نەسارا بێت، یان هەرچۆنێتر؟ وە ئایا مەبەست بە ڕۆژووەکەی ئەوان هەر وێنەی ئەم ڕۆژووەی ئێمە بێتلە ئەندازەو لە کاتو لە چۆنیەتیدا، یان مەبەست وێنەی ئەم بێت لە پێویست کردندا، لەسەر هەر بارو بە هەر حاڵ مەبەست دڵخۆشکردنو دڵنەوایی ئەم ئوممەتەیە بەوەی کە ئەم ئەرکو پێویست کردنە تەنها نەخراوەتە سەر شانی ئەمان، بەڵکو لە پێشووەکانی ئەمانیشدا داوا کراوە، کەواتە با چاو لەوان بکەنو هەڵسن بەم شتە پێویستە، ئینجا مەبەستی گەورەو سەرەکی لە ڕۆژوودا دەرئەخات تا باشتر گوێڕایەڵی بکرێ بۆ ئەم فەرمانە، ئەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ واتە پێویست کرا ڕۆژوو لەسەرتان، بەڵکو بەهۆی ئەو ڕۆژووەوە خۆتان بپارێزن لە گوناهو خراپەکاریو بچنە ڕیزی لە خوا ترسان کە خۆیان ئەپارێزن لە هۆی خەشمو ناڕەزایی خوا، کە ئەو لە خوا ترسیو خۆپارێزیەش پلەیەکی زۆر بەرزە لە ئیسلامدا، وە لە چەند ئایەتدا پیتو فەڕو بەرو بەرهەمی دەرخراوە، کەواتە گەیشتن بەو پلەیە ئاواتو ئامانجی هەموو بڕوادارێکی ڕاستەقینەیە، بە تایبەتی ئەو یەکەم کۆمەڵە بڕوادارەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێدا، کە ئەوانە باشتر گەیشتبوون لە ئیسلامو ڕێزو نرخی ئەو پلەیان باشتر ئەزانی، جا لەبەرئەوە ڕۆژووەکەی خۆشەویست کرد لەدڵیاندابەمەی کەڕۆژووڕێگەی گەیشتنەبەوپلەبەرزە، ڕێگەی گەیشتنەپێی لەچەندبارێکەوە:

١- ڕۆژوو گرتن ملکەچیو گوێڕایەڵیە بۆ خواو باودانی ڕەزامەندی ئەوە بەسەر ئارەزووو ڕەزامەندی نەفسو دەروونی خۆیدا.

٢- ڕۆژووگر ڕام ئەکات و فێری لە خوا ترسانی ئەکات و دەقی پێ ئەگرێ لە پەنهانیدا، ئەوەتا خۆی ئەپارێزێ لەوەی کە حەزی لێ ئەکات و بە سۆزو پەرۆشە بۆی لە خواردن و خواردنەوەو مامەڵەی ژن و مێردی، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێ بە دیارەوە بێت و هیچ زەخت و زۆرێکی ئاشکرای لەسەر بێت، کە ئەوەش بەبێ ترسان لە خوا هەرگیز نابێ و دەست نادا، وە ئەوە سەنگی مەحەکە بۆ دەرکەوتنی ڕاستی بەندە لەگەڵ خوای خۆی، وە لەسەر جێگیر بوونی سام و بیمی خوا لە دەروونیدا.

٣- فێری لە خواترسی و خۆپارێزی ئەکات لە هەر گوناهێ تر لەو کاتەشدا کە بەڕۆژوو نیە، وە فێری ئەکات کە هەمیشە ئارەزووی نەفسی شوێن شەرع بکەوێ و جڵەوی نەفسی بداتە دەستی.

٤- ڕۆژوو شکێنەرو کەم کەرەوەی ئارەزووی ژن و مێردیە کە ئەو ئارەزووە یەکجار بەتین و زاڵە بەسەر مەردومدا، وە چەکێکی زۆر بەکارە لە دەستی شەیتاندا بۆ ژێر دەست و ژێربار کردنی مەردوم، وەلەبەر ئەوەبە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ لەحەدیسێکدا کە (بوخاری) و (موسلیم) هێناویانەتەوە: (یا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فإنه أغض للبصر، أحصن للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنه له وجاء) ئەی کۆمەڵی گەنجەکان هەرکام لە ئێوە توانا و دەسەڵاتی ئەرکی ژن هێنانی هەیە ژن بێنێ، چونکە ژن هێنان باشتر چاو ئەنووقێنێ لە حەرام، وە باشتر پارێزگاری ئەکات لەداوێن پیسی، وە هەرکەس لە ئێوە دەسەڵاتی ئەوەی نیە با ڕۆژوو بگرێ و لەسەری بێ ڕۆژوو گرتن، چونکە ڕۆژوو بۆی ئەبێ لاوازکەرو شکێنەری تیژیی ئارەزووەکەی، سوودو بەرهەمی سەرەکی ڕۆژوو ئەوەبوو کە باس کرا، وە بێجگە لەوە چەند سوودو بەرهەمی تری هەیە، بۆ نموونە:

أ- سۆزو بەزەیی ئەخاتە دڵی ڕۆژوو گر بەرامبەر بە هەژارو برسیەکان، بەم ڕەنگە لە دەروونی خۆیەوە ئەزانێ حاڵی هەژارو برسیەکان چۆنە، ئەو حەلە دڵی نەرم ئەبێت بۆ کۆمەکی و دەست گیرۆیان، کەواتە ڕۆژوو یارمەتی دەرێکی بەهێزە بۆ پێک بیرو

باوەڕێکی گرنگی ئیسلامی کە پێی ئەگوترێ (التكافل الاجتماعی) دەستە بەرەیی ئەندامی گەل بۆ یەکتر.

ب- بیروباوەڕی یەکیەتی و یەکسانی ئادەمێتی ئەپوێنێ لە دەروونداا، ئەوەتا بەبێ فەرق و جیاوازی ئەبێ دەست دارو بێ دەست، گەورەو بچووک، پادشاو گەدا هەڵسن بەو فەرمانە کە ئەو بیرو باوەڕەش یەکێکە لەکارو ئامانجەکانی ئیسلام.

ت- ڕۆحی ڕژێم و نیزام ئەچێنێ لە دەروونداا، ئەوەتا بە یەکجار دەم ئەگرنەوەو بەیەکجار بەرەڵای ئەکەن لەهەر ناوچەو وڵاتێکدا.

پ- لەبارەی تەندروستیەوە کەڵکی زۆری هەیە، ئەوەتا زیادە خۆراک و شتێ کە کۆئەبێتەوە لە لەش داو تەپەئەدا بە تایبەتی لەشی ئەوانەی کە زۆر خۆرو خۆرن، ئەو شتە زیادانە ئەتوێنێتەوە، وە ئەو زیادە تەریبەی کەلە لەش دا هەیەو زیانی هەیە وشکی ئەکاتەوە، وە ڕیخۆڵەکان پاک ئەکاتەوە لەو هەموو ژارەی کە قەڵەوی و سک گەورەیی فەراهەم ئەهێنن، وە ئەو زیادە چەوری و پیوەی کەلە ناو سکدا هەیە ئەیتوێنێتەوە کە زۆر جێگەی مەترسیە لەسەر دڵ، وە لە حەدیسدا هاتووە، (صوموا تصحوا) ڕۆژوو بگرن با ساغ و تەندروست بن، هەندێ لەزانایانی ئەوروپایی وتویانە: هەر ئەندازەیە شتی زیادەی بێ کەڵکی بێگیان کەلە ماوەی ساڵێکدا لە لەش دا کۆئەبێتەوە، ڕۆژووی یەک مانگ ئەوانە هەموو لا ئەبات و دەریا ئەکات لە لەش.

ئینجا هەمیتر دڵنەوایی بڕواداران ئەکات و ڕۆژووەکەیان لەبەچاو ئاسان ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾ چەند ڕۆژێکی دیاری کراو بگرن، یا ژمێرراو، واتە کەمن و بە ئاسانی ئەژمێررێن، ئیتر ئەو چەند ڕۆژە ئەم مانگی ڕەمەزانە بن کەلە یەکەم جارەوە لێرەدا بە نادیاری باسی کردن و لە پاش دا دیاری کردن بە مانگی ڕەمەزان وەک زۆربە لەسەر ئەوەن، یان چەند ڕۆژێ ترین کەلە پێشەوە پێویست کران و لە پاش دا سڕرانەوە لە جێگەی ئەواندا ڕەمەزانی دیاری کرد وەک هەندێ لە زانایانی تری لەسەرە، لەسەر هەربار هەر کەمن و بە ئاسانی بەجێ ئەهێنرێن، وە ل ئەوەشدا پێویستی ئەو ڕۆژووە هەڵگیرا لەسەر ناساغ هەتا چاک ئەبێتەوە، وەلەسەر سەفەری هەتا نیشتەجێ ئەبێت،

فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ ۚ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾

---

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ ئینجا هەرکەس لە ئێوە نەخۆش بوو ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یان لەسەر سەفەر بوو ئەوە لەسەریان نیە لە ماوەی نەخۆشیو سەفەرەکەیاندا ڕۆژوو بگرن کەواتە ئەگەر هەرکام لەو دووانە نەیگرت ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەوە لەسەریەتی بە ئەندازەی ئەوەی شکاندوویەتی ڕۆژوو بگرێو بیگرێتەوە لە ڕۆژانی تر لەپاشدا.**

**بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە نەخۆشو سەفەرەکە جۆرو هەرچۆن بن ڕۆژوو گرتن پێویست نیە لەو ماوەیەدا، وەك کۆمەڵێ لە زانایانیشی لەسەرە، وەك (ئیبنو سیرین)و (عەتا)و (بوخاری)و چەند کەسێ‌تر، وە (شافیعی) لە ڕایەکی دا ئەوەی هەڵبژاردووە سەبارەت بە نەخۆش، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نەخۆشیەکە بە جۆرێ بێت کە بەزەحمەت ڕۆژووی لەگەڵ بگیرێ، وە سەفەرەکەش حەڵاڵ بێتو لەدوو قۆناغ کەمتر نەبێ بەبارو کاروانی حوشتر، ئیتر با هیچ زەحمەتو ماندوویی تیا نەبێت، ئەم ڕای زۆربە بەهێزە بەپێی فەرموودەی (ئیبنو عەباس) کە فەرموویەتی: ئەی دانیشتوانی مەککە لە کەمتر لە شازدە فەرسەخ دا نوێژ کورت مەکەنەوە، کەواتە لای خواروی سەفەرەکە لەوە کەمتر نیە، وە هەروەها لە حەدیسدا کەمتی لە دوو یان سێ ڕۆژ بە سەفەر دانەنراوە، وەك لە حەدیسی (ئیبنو عومەر)و (ئەبو هورەیرە)ەوە هاتووە.**

**سەبارەت بە شێوەی پێویست کردنی ڕۆژوو دوو ڕا هەیە لەناو زانایاندا، ڕای یەکەم لەسەر ئەوەیە کە لە یەکەم جارەوە هەر ڕۆژوو پێویست نەکرا، بەڵکو یا ڕۆژوو یان فیدیە دان، ئەوەش لەبەرئەوە زۆر زەحمەت بوو لەسەر شانیان، جا لەبەرئەوە ئیسلام تەنگەتاوی نەکردن لەڕێوە، بەڵکو یەکێ لەو دووبارەی لەسەر دانان دڵیان لەسەری دامەزرا، لەپاش ئەوە بە ئایەتی داهاتوو باری ڕۆژووی هێشتەوەو ئەو بارەکەی تری سڕیەوە، ڕای دووەم لەسەر ئەوەیە کەلە ڕێوە هەر ڕۆژوو پێویست کرا، ئینجا لەبەرئەوەی ڕای یەکەم حەدیسو هەواڵێکی لەسەرە کە(ئیمامی بوخاری)و (موسلیم)و (ئەبو داود)و (نەسائی)و (ترمزی)و**

(تەبەرانی) ئەیهێنن لە (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع)ەوە، لەبەرئەوەی لەسەر ئەو ڕایە هیچ پێویست نیە بە تەئویل‌و پینەو پەڕۆ.

لەبەرئەو دوو هۆیە تەفسیرەکە لەسەرباری یەکەم ئەکەینەوەو ئەڵێین: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٌ﴾[1] ئەوانەی کە زۆر بە زەحمەت ئەتوانن ڕۆژوو بگرن، ئەگەر نەیان گرت پێویست لەسەریان فیدیە بدەن، کە ئەو فیدیەش ﴿طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ خۆراکی ڕۆژێکی هەژارێکە لەباتی هەر ڕۆژێکدا کە نەیگرێ، ئینجا هانی ئەو بڕواداره ئەدات زیادە خێرو چاکە، بەم ڕەنگە زیاد لە ئەندازێ خۆراك بدات، وەك (ئیبن‌و عەباس) ئەفەرموێ... ئەفەرموێ: ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا﴾ ئینجا هەرکەس بە ئارەزووی خۆی زیادە خێرو چاکەیەك ئەکات ﴿فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ﴾ ئەوە چاکترە بۆی، چونکە دیارە ئەوە پاداشتی زۆرترە، ئینجا ڕۆژوو گرتنەکەیان بەلاوە خۆشەویستر ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ وە ڕۆژوو گرتنەکەتان چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن بەو سوودو بەهرەیانە کەلە ڕۆژوودا هەن هەر ڕۆژوو گرتنە کە هەڵئەبژێرن، یان ئەگەر ئێوە ئەو هەموو بەهرەو بەرهەمەی تیایە، وەك هەندێکمان باس کرد لەسەرتای باسەکەوە، بەم تەمێ‌و ئامۆژگاریە ڕێگەی خۆش کۆد بۆ پێویست کردنی تەنها ڕۆژوو، وە سڕینەوەی فیدیە دان سەبارەت بەوانەی کە ساغ‌و نیشتەجێن، جگە لەو پیرە پەك کەوتووانەی کە ڕۆژوو تەنگەتاویان ئەکات‌و ئومێدو هیوای ئەوەیان لێ ناکرێ کە بتوانن لەپاش دا قەزای بکەنەوە، ئەمانە ڕێیان هەیە نەیگرن‌و لەباتی هەموو ڕۆژێکدا فیدیە بدەن، ئینجا ڕۆژوو گرتن خۆشەویست ئەکات بەمەی کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، کە قورئانی تیا هاتووەتە خوارەوە، وە قورئانیش دواترین نامەی خوایە کە هات بۆ ئادەمی هەتا هەتایە، وە ئەو قورئانە کە گەل‌و ئوممەتێکی پێك هێنا کە مێژووی ئادەمی شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە، کەواتەمافی ئەوئوممەتەیەکەلە سوپاسی خوادا ئەو مانگە بە ڕۆژووبن‌و خۆیان یەکبار بەکەن بۆپەرستنی ئەوپەروەردگارە میهرەبانەی کە سەری ئەم ئوممەتەی بەرزکردەوە بەم قورئانە،

---

[1] لەسەر ڕای دووەم ناچارین کەوتەی (يُطِيقُونَهُۥ) لەدیمەن‌و ڕواڵەتەکەی لادەین‌و بڵێین مەبەست ئەوانەیە کە ناتوانن، وەك بە درێژی باس کراوە لە شوێنی خۆی دا، دەی ئایا بەبێ ڕابەرو بەڵگەیەك چۆن لایدەین لە دیمەن‌و ڕواڵەتەکەی؟

﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾[1] واتە ئەو چەند ڕۆژە کەمەی کە پێویست کرا لەسەرتان مانگی ڕەمەزانە کە قورئانی تیا هێنرایە خوارەوە، بەم ڕەنگە بە یەك جار لە (لوح المحفوظ) هێنرایە خوارەوە بۆ ئاسمانی یەکەمو ئینجا لە ڕێوە هاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی لە ماوەی ئەو بیستو سێ ساڵی ژیانی پێغەمبەرەدا (ﷺ)، یان مەبەست دەست پێکردنە بە هێنانە خوارەوەی بۆ سەر دڵی بەفەڕی پێغەمبەر (ﷺ) لە شەوی (ليلة القدر) لە ئەشکەوتی (حراء)دا، ﴿هُدٗى لِّلنَّاسِ﴾ لە کاتێکدا ئەو قورئانە ڕێ نیشاندەرە بۆ مەردوم بۆ هەموو هەقو خێرو ڕاستیەك، ئینجا پلەیەك بەرزتر ئەبێتەوە لە وەصفی ئەو قورئانەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ﴾ وە لەکاتێکدا کە چەند ڕابەرو بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەوەی کە ڕێنموونی ئەکات بۆ هەقو ڕاستیو جیاکەرەوەی هەقە لە ناهەق، یان مەبەست ئەوەیە کە قورئان چەند ئایەتو ڕابەرێکی ڕوونە لەناو هەموو کتێبەکانی خوادا کە ڕێنموونی کەرن بۆ هەقو جیاکەرەوەی هەقن لە ناهەق ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ﴾ کەواتە هەرکەس لە ئێوە ئامادەی ئەو مانگە بوو بەم ڕەنگە مانگی بینی یان زانی کە بینراوە بۆی دەرکەوت کە ڕەمەزان هاتووە ﴿فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾ با ئەو کەیە ڕۆژووەکەی بگرێ، یان هەرکەس ئامادەی بوو بەنیشتە جێی با بیگرێ، ئینجا ماوەتەوە ئەوانەی کە دانیشتوانی وڵاتەکانی قوتبی لای ژووروو، یان قوبتی خواروو کە هەرکام لەو دوو شوێنە بە ئەندازەی شەش مانگ شەوەو شەش مانگ ڕۆژە بە پێچەوانەی یەکتر، پێویستە لەسەر ئەو دانیشتوانە بە پێی کاتژمێر مانگی ڕەمەزانو ڕۆژەکانی دیاری بکەن، وە بەراوردی بکەن لەگەڵ کاتی مەککەو مەدینەدا، یان نزیك ترین وڵات کە شەوو ڕۆژی ڕێكو پێکیان هەیە.

---

[1] ئەم وتەیە بە چەند شێوەیەك (ترکیب) کراوە، وە لە مەبەست دا هەریەك شتە، بەلام بە شێوەی تەفسیرەکە سووك ترو کەم ئەرك ترە، لەبەرئەوە ئەوەم هەڵبژارد.

وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾

---

ئەم ئایەتە بوو کە بە تواوی ڕۆژووی پێویست کردو باری شکاندن فیدیە دانی سڕییەوە سەبارەت بەوانەی کەلەش ساغو نیشتەجێن، بێجگە لە پیرە پەك کەوتووەکان وەك باسمان کرد، ئینجا لەبەرئەوەی ئەم فەرموودەیە گشتیە، لێرەشدا نەخۆشو سەفەریی لیٚ دەکرد، ئەگینا وا گومان ئەبرا کە پێویستە لەسەریان، وە دەرکردنی یەکەم جار بەرگری ئەم گومانەی نەئەکرد، چونکە ئەمە بڕیارێکی تازەیەو بڕیارە پێشووەکەی سڕییەوە، لەبەر ئەوە دووبارە فەرمووی: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ هەرکەس نەخۆش بێت یان لەسەر سەفەربێت ـ ئەگەر نەیگرت ـ ئەوە لەسەریەتی بە ئەندازەی ئەوەی کە نەیگرتووە بە ڕۆژوو بێت لە ڕۆژانی تر پاش ڕەمەزان، ئینجا لەباریٚ تریشەوە ڕۆژوو خۆشەویست ئەکات بەمەی میهرەبانی خۆی ئەخاتە بەرچاو، چ لە پێویست کردنی وە چ لە ڕەوادانی نەگرتنی بۆ ئەوانەی کە باس کران، ئەفەرمویٚ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ خوا ئاسانیو ڕەحمەتی ئەویٚ بۆتان، وە سەختیو ناڕەحەتی ناویٚ بۆتان، واتە نایەویٚ تەنگەتاوتان بکات لە پێویست کرنی ڕۆژوو لەسەرتان، ئەوەتا ڕیٚ ئەدات لە نەگرتن لەو کاتو خاڵەتانەدا کە لەوانە بێت تەنگیو ناڕەحەتی ڕوو بدات، خوای میهرەبان نەك تەنها لە مەسەلەی ڕۆژوودا، بەڵکو لە هەموو کاروباری ئایینە بەرزەکەماندا تەنگیو ناڕەحەتی دانەناوە، وە ئەمەی کەلە ئایەتەدا فەرمووی یاسایەکی گشتیە لە هەموو داواو ئەرکیٚ کە لەم ئایینە پیرۆزەدا هەیەو خراوەتە سەرشانی بەندەکانی خوا. خوای میهرەبانی کار دروست لە پێویست کردنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا سیٚ شتی دنانوە:

١- ئەوەی ئامادەیٚ ئەبێتو بیانووی نەخۆشیو سەفەری نیە، ئەبیٚ ڕەمەزان بگریٚ.

٢- ڕیٚی دا بەو بیانوو دارانە کە نەیگرن.

٣- پێویستی کردوفەرمانیدا بەمەی ئەو بیانوو دارانە هەرچەندیان لێ نەگرتبێ لە پاشدا بیگێڕنەوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ لەبەرئەوەی ژمارەی مانگەکە تەواو بکەن، وە لەبەرئەوەی خوا بەگەورە بگرن و وەسف و سەنای بکەن لەسەر ئەوەی ڕێنموونی کردن بۆ گێڕانەوەی ئەو ڕۆژانەی کە نەتان گرتن، وە لەبەرئەوەی سوپاس و ستایشی خوا بکەن، کە خوا بەو جۆرەی کردو ئەوەی لەسەر دانان، واتە پێویستی کرد گێڕانەوەی ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە نەتان گرتن لە ڕەمەزان، بۆ ئەوەی ژمارەی مانگەکە تەواو بکەن، وە بە هەرجۆر مانگێ بە ڕۆژوو بن، تا پاداشت و پیت و فەڕی ڕۆژووی مانگێکتان کەوت ببێ، وە ڕێی گێڕانەوەی نیشان دان و فەرمانی پێدا بۆ ئەوەی لەسەر ئەوە خوا بە گەورەبگرن و وەسف و سەنای بکەن، وە ڕێی نەگرتنی دان لە کاتی نەخۆشی و سەفەرداو کارەکەی لەسەر ئاسان کردن، بەڵکو چاولەبەری خوا بن و سوپاس و ستایشی بکەن[1] ئا بەو جۆرەی کە باس کرا دەرئەکەوێ منەت و چاکەو بەهرەی خوا لە دانان و پێویست کردنی ڕۆژوودا، کە بە ڕواڵەت قورس و گرانە لەسەر لەش و دەروون، وە ئاشکرا ئەبێت کە مەبەست و ئامانج لە ڕۆژوو پێگەیاندن و پەروەردەکردن و ئامادەکردنی بڕوادارانە بۆ ئەو کارو ئەرکە گەورەیەی کە خراوەتە سەرشانیان و پێیان سپێراوە، کارو ئەرکی جێنشینی و سەرکردایەتی ئادەمی و ژیان!

ئینجا پێش ئەوەی باسی ڕۆژوو دوایی پێ بێنێ، لە ناوەڕاستی باسەکەدا ئایەتێك ئەهێنێ کە ئەوپەڕی میهرەبانی خوا نیشان ئەدات بە بەندەکانی، وە دەروونیان پڕ ئەکات لە ئارامی و دڵنیایی، وەدڵیان ئەخاتە سۆزو پەرۆش بۆ مل کەچی و گوێڕایەڵی، وە بەڕاستی ئەم ئایەتە شایستەی ئەوەیە بەبیر لێکردنەوەی هیچ ماندوویی و برسیەتی و تینوویەتی نەمێنێ لای هیچ ڕۆژووەوانێك،

---

[1] ئەم تەفسیرە بەپێی فەرموودەی (زەمەخشەری)یە زۆر لەزانایان پەسەندی ئەکەن، وە بەم شێوەیە پاسایەك لە پاساکانی عیلمی بەدیعی تیایە کە پێی ئەگوترێ: (رد العجز إلى الصدر) کەوتەو وتاری پێ جوان ئەکرێ، وە بە چەند شێوەیە تریش ئەم ئایەتە تەفسیر کراوەو ئەوانیش هەر ڕێکن، بەڵام ئەو پاسایە نیشان نادەن.

ئەفـەرموێ بـە پێغەمبـەر (ﷺ): ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى﴾[1] کاتـێ کـە بەنـدەکانی مـن پرسیاری منت لـێ ئەکـەن لـەبارەی نزیکـی و دووریـم لێیانـەوە ﴿فَإِنِّى قَرِيبٌ﴾ بێگومـان مـن نزیکم لێیانەوە، واتە بڵێ پێیان: کە من نزیکم، بەڵام بەم شێوەی کە لە قورئانەکەدا هاتووە لوتف و میهرەبانی لێ ئەبارێ، چونکە وا نیشان ئەدات کە خوای گەورە خۆی وەڵامەکەیان ئەداتـەوەو حەواڵـەی پێغەمبەریـشیان ناکـات (ﷺ)، هەرچۆنێ هـەر لـە یەکـەم جارەوە ڕێـزو میهرەبانی نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿عِبَادِى﴾ بەندەکانم کە ئەوە تایبەتیەتی ئەگەیەنێ، بەڵێ پەروەردگار نزیکە لە بەندەکانیەوە بە نزیکیەك کە شیاوو شایستەیە بەزاتی پاکی ئەو، نزیکی زانین و ئاگاداری و میهرەبانی و چاودێری... بێگومان بوون و مانەوەی هەموو شتێ لە خواوەیەو بە خوا ڕاگیرە، وە هەروەها بوونی هەرشتێ بەو شتە تایبەتیە هۆی خواوەیە، کەواتـە ئەگـەر تـۆزێ وورد بینـەوە تـێ ئەگـەین کـە خـوا لـە هـەموو شـتێکەوە نزیـك تـرە لـە بوونەکەی بۆی، بەڵکو نزیك ترە لە هەر شتێکەوە تا ئەو شتە بۆ خۆی! کەواتـە زۆر وتەیـەکی ڕاست و شیرینە کە خوا ناسان فەرموویانـە: (سبحان من هـو أقرب من کل شـيء من عينـه) پاکی بۆ کەسێ کە نزیك تـرە بە هـەموو شتێ لە شتەکە خۆی بۆ خۆی! ئینجا ئەو نزیکیە دەرئـەخات و ڕابـەرو بەڵگـەی لەسـەر ئەهێنێتـەوە بەمـەی کـە ئەفـەرموێ: ﴿أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ وەرئەگرم و بەجێ ئەهێنم داواو نزاو پاڕانەوەی نزکەر کاتێ کە هاوارو نزام لێ بکات، دەی ئەگـەر نزیـك نـەبێ بـەو شێوەی کـە باس کرا چۆن نـزاو داوا وەرئـەگرێ و جـێ بـەجێ ئـەکات! ئـەم فەرموودەیـە یاسـایەکی گـشتی نیـەو وا ناگەیـەنێ کـە خـوا هـەموو نزایـەك وەرئـەگرێ، کەواتـە کـەس ڕێی نیە بڵـێ: نزاو داوای زۆر ئەبینین ئەکرێن و وەرنـاگیرێن، وە ئەگـەر واش دابنـێین کـە گـشتیە ئـەو حەلـە ئـەڵێین: وەرگرتنـی نـزا وەك لـە ئایـەتی تـرەوە وەرئەگیرێ بەستراوە بە خواهیش و مەیلی خواوە، ئینجا لـە حەدیس دا چەند مـەرجێکی بۆ دانراوە:

---

[1] ئەمە یاسایەکی گشتی نیە هەر بەپێی باوی زمانی عـەرەب، وە بـە پێـی یاسـای (عیلمـی مـەنتیق) وتـەی ﴿عِبَادِى﴾ هەرگیز بەکار ناهێنرێ بۆ گشتی و هەموو کات.

١- نزاكەر هەڵسێ بە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە.

٢- نزاکەر حەڵاڵ بخواو حەڵاڵ بپۆشێ.

٣- نزاکەر پەلە نەنێتەوە لە خواو ڕاوێژی بۆ نەکاتو گەڵاڵەی بۆ نەگرێ.

٤- داوای گوناهو قەتعی ڕەحم نەکات.

ئەم مەرجانەیەك بەیەك لەحەدیسەصەحیحەکاندا هاتوونو لە کتێبەکاندا بڵاوبوونەتەوە، کەواتە هەرکات ئەم مەرجانە بەدی هاتن ئەو حەلە نزاکە بێگومان وەرئەگیرێ، ئەگینا لازم ناکات، بێجگە لەمانە هەموو، وەرگرتنی نزا هەر ئەوە نیە کە داوا کراوەکە بەدی بێت، بەڵکو باری تریش هەیە، وەك لەحەدیسی (ترمزی)دا هاتووە: کە بریتیە لە بەرگری کردنی ناڕەحەتیو خراپە لە نزاکەر، وە لەم بارەوە زانای خواناس (ئیبنو عەطائوالله ی سکەندەری) وتەیەکی شیرینی هەیە: (فمن الإجابة فيما يختاره لك لافيما تختاره لنفسك، وفي وقت يريده لا في وقت تريده)، خوا بووە بەزامنی وەرگرتنی نزا لەوە کە ئەو بۆت هەڵئەبژێرێ، نەك لە شتێکدا کە خۆت بۆ خۆتی هەڵئەبژێری، وەلە کاتێکدا وەری ئەگرێ کە خۆی ئەیەوێ، نەك لە کاتێکدا کە تۆ ئەتەوێ، وە هەروەها وەرگرتنی نزا باری تریشی هەیە کە سەرەکیەو لەڕووی ڕاستی دا هەر ئەوە شتە، ئەوەش بریتیە لە وەرگرتنی بەوێنەی نوێژو ڕۆژوو عیبادەتەکاتی تر کە کاتی وەرگیران ئەبنە زەخیرەی ڕۆژی دواییو ئەجرو پاداشتەکانیان لەوێ وەرئەگیرێ، چونکە نزاکردن داواو پاڕانەوە لە خوا عیبادەتو خواپەرستیە، وەك لە حەدیسێکدا ئەفەرموێ کە (نعمانی کوڕی بەشیر) ڕیوایەتی ئەکات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (الدعاء هو العبادة) نزا کردن هەر عیبادەتە، بەڵکو لە ڕیوایەتێکدا ئەفەرموێ: (الدعاء مخ العبادة) نزاو لاڵەو پاڕانەوە لە خوا ناوەرۆكو پاڵفتەی عیبادەتە، ئینجا دوعاو نزا چەند کاتێکی تایبەتی هەیە کە زیاتر چاوەڕوانی وەرگرتنی ئەکرێ، یەکێ لەو کاتانە کاتی ڕۆژووە، وەك (ئەبو داود) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبنو عومەر)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: بیستم لە پێغەمبەر (ﷺ) کە بۆ ڕۆژووەوان هەیە لەکاتی بەربانگدا نزاو داوایەکی وەرگیراو.... جا بە هۆی ئەوەوە (ئیبنو عومەر) لەکاتی بەربانگدا خێزانەکانی بانگ ئەکردو نزاو داوای ئەکرد لە خوا، وە هەروەها (ئیبنو ماجە)ش وێنەی ئەم حەدیسە ئەهێنێ لێیەوە، هەرچۆنێ (ئیمامی ئەحمەد)و (ترمزی)و (نەسائی)و (ئیبنو ماجە) لە (ئەبو هورەیرە)وە لەو بارەیەوە حەدیسێك ئەهێنن، ئینجا ڕەنگە هێنانی ئەم ئایەتی نزایە بە تێهەڵکێش لەناو ئایەتەکانی ڕۆژوودا دەست نیشانی تیا بێت بەوەی کە کاتی ڕۆژوو کاتێکی تایبەتیە بۆ نزا کردن.

فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ

---

خـوا میهرهبـانی ئـهو بهڵێنـهی دا، ئینجـا بهرامبـهر ئـهوه ئهفـهرموێ: ﴿فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى﴾ کهواتـه بـا بهنـدهکانم داوای وهرگرتنـی نـزام لـێ بکـهن، یـان بـا ئـهوانیش گـوێم لـێ بکـهن‌و گوێڕایـهڵ بـن کاتـێ کـه مـن بـانگم کـردن بـۆ بڕواهێنـان‌و گوێڕایـهڵی ﴿وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى﴾ دهبـا دامهزراوو بهردهوام بن لهسهر بڕوا هێنانیان به من، وه ئهوهش که ئهکهن ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ به ئومێدو چاوهڕوانی ئـهوهی کـه ئـهوان ڕێ ببـهن‌و بگـهن بـه بهرژهوهنـدی جیهـان‌و ڕۆژی دواییـان، چـونکه چـاوهڕوانی ئـهوه‌و گهیـشتن بـهو ئامانجـه بـهرزه تـهنها لای خـواو لـه بهرنامهکهی ههیه‌و دهست کهوت ئیتر بێجگه لهو ههرچی ههیه ههمووی پڕه له نهفامی‌و لاری‌و ههڵه‌و سهر لێ شێوان، کهواته بهرههمی گوێڕایهڵی‌و بڕواکهشیان ههر بۆ خۆیانه‌و دهست کـهوتی خۆیـان ئـهبێت... لـهپاش ئهم تێههڵکێشه ئینجا دێتـهوه سـهر باسـی ڕۆژوو بڕیارهکانی تهواو ئهکات، لهیهکهم جارهوه که ڕۆژوو پێویست کرا، مامهڵـهی ژن‌و مێردی‌و خواردن‌و خواردنهوه له شهودا دروست بوو تا ڕۆژووهوانهکه ئهخهوت، ئیتر لهپاش خهوتن ههرکام لهوانه قهدهغه بوو، ئینجا یهکێ له موسڵمانان له کاتی بهربانگ دا هیچی دهست کهوت له ماڵ دا، ئینجا خهوی لێ ئهکهوێ‌و له پاش دا که خهبهری ئهبێتهوه تازه هیچی بۆ ناکرێ ناچار بهبێ شێوو پارشێو ڕۆژی دوومیش ههر به ڕۆژوو ئهبێت، بهمۆی ئهوهوه زۆر ناڕهحهت ئهبێت‌و ههواڵهکهی ئهگاته پێغهمبهر (ﷺ) ههرچۆنی ڕێك ئهکهوێ که ههندێ له موسڵمانان لهپاش بهربانگ کردنهوه خۆی یا خێزانی خهوی لێ ئهکهوێ، ئینجا ئارهزووی زۆری پێ‌ئهمێنێ ئهچێته لای خێزانی‌و ههواڵهکهی ئهمیش ئهکات به پێغهمبهر (ﷺ)، وه دهرئهکهوێ که موسڵمانان بهو شێوه ئهکهونه ناڕهحهتی، بهمۆی ئهوهوه خوا میهرهبانی ئـهکات‌و ئهیانگێڕێتـهوه بـهم ئایهتـه: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ ڕهوا دراو حهڵاڵ کرا بۆتان لهشهوی ڕۆژوودا نزیك کهوتنهوه‌و یهك گرتن‌و چوونه لای ژنهکانتان، ئینجا هۆی ئهو ڕهوا دانهش باس ئهکات به جۆرێ ئهو تێکهڵی‌و پهیوهندیه نهرم‌و ناسك‌و شیرین ئهکات لهبهرچاوو لهدهروون‌دا،

هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ

---

ئەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ ژنەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوەو ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، واتە ئێوەو ئەوان لە تێکەڵی و پێچڕانتان بە یەکترەوە وەك پۆشاك وان بۆ یەکتر، یان هەرکام مایەی ئارامی دڵە بۆ ئەویتر بەوێنەی ئارامی دڵ بە پۆشاك، یان هەرکام بەرگری کەری یەکترن لە کاری خراپ و داوێن پیسی بەوێنەی بەرگری پۆشاك لەسەرما و گەما و شتی ئازار دەر، بە هەرجۆر مەبەست بێت پەیوەندی و پەیوەستیەکەیان ڕەوا و شیرین ئەکات و پێویستیان بە یەکتر بە تین و بەهێز دەرئەخات بەجۆرێ دوور کەوتنەوەو کەنار گیریان لە یەکتر گران و زەحمەتە، لەبەرئەوە خوا میهرەبانی کرد ئەو ئەرکە قورسەی لەسەر لابردن، ئیسلام بەو جۆرە هەست و نیازی پیاو و حەڵاڵ هاوسەرو پێویستیان بە یەکتر پاك و خاوێن و بەرزو بەڕێز ئەکات، وە دان ئەنێت بە ئارەزووی ژن و مێردایەتیانداو لەو دیمەن و ڕواڵەتە شیرینەدا دەری ئەخات نیشانی ئەدات!! ئینجا هەستی دەروونی و کردەوەی نێهێنیان دەرئەخات لە کاتێکدا کە میهرەبانی خۆی دەرئەبڕێ بەلێبوردن و لە کردەوەی ناڕەوای لەوەو بەریان و حەڵاڵ کردنی بەجێهێنانی ئارەزووە سورشتیەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ خوا زانی کە ئێوە ستەم و ناپاکی گەورەتان کرد لە خۆتان بەوەی کردەوەی قەدەغەو ناڕەواتان کرد کە ئەوەش مایەی تۆڵە سەندنە لێتان و بێبەش کردنتان لە ئەجرو پاداشت، ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ﴾ ئینجا خوا تەوبەو گەڕانەوەی لێ وەرگرتن کاتێ پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە بۆلای خوا لەو کردەوە قەدەغەی کە کردتان، وەلێتان بورد بەم

ڕەنگە نیشانەو دروشمی ئەوەی پێوە نەهێشن‌و ئەو قەدەغەی لابرد ﴿فَٱلۡـَٔـٰنَ بَٰشِرُوهُنَّ﴾ کەواتە ئێستا کە ئەو قەدەغە نەهێلراو ڕەوادرا، بچنە لای ژنەکانتان‌و لێیان بکەون ﴿وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ﴾ وە لەوەش دا نیازی ئەوە بکەن کە خوا بۆی نووسیوون‌و بگەڕێن بەدوای ئەوەدا کە خوا بڕیاری داوە بۆتان لە ئەولادو لە ژیان‌و لە ڕابواردنی پاك‌و شەرعی، واتە ئاژەڵ‌و حەیوانات هەر مەبەستتان بەجێ هێنانی ئارەزوو بێت، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ئەبێ دڵتان پەیوەست بێت بە خواوەو نیازی ئەوە بکەن کە ئەوە بەخشش‌و ڕەوا دراوی خوایە، وە ئەبێ هەست بکەن بەوەی کە ئەویەك گرتنتانە بەرژەوەندی‌و کار دروستی تیایە لای خواو لەبەر مەبەستێکی گرنگە، ئەو حەلە پەیوەندی‌و پەیوەستی پیاوو ئافرەتەکە پاك‌و پوخت‌و نەرم‌و ناسك‌و بەرزو بڵند ئەبێت! ئینجا خواردن‌و خواردنەوەکەشی ڕەوا داو قەدەغەی هەڵگرت لەوکاتەدا کە باس کراو بە ڕوونی کاتی خواردن‌و خواردنەوەی دیاری کرد، فەرمووی: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ﴾ وە بخۆن‌و بخۆنەوە لە هەرشتێ کە حەڵاڵ بێت هەر لە ئێوارە﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ﴾ هەتا بە ڕوونی دەرئەکەوێ بۆتان‌و جوێ ئەبێتەوە خێت‌و دەزووە سپییەکە ﴿مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ﴾ لەخێت‌و دەزووە ڕەشەکە، مەبەست بە سپییەکە ئەو هێڵە سپییەکە لە یەکەم جاری ئەمانی شەو پەیدا ئەبێت‌و بڵاو ئەبێتەوەو بەدرێژی بەکە ناری ئاسمان‌و ئاسۆدا لەلای خۆرهەڵاتەوە، وە مەبەست بە ڕەشەکەش ئەو هێڵە ڕەشەیە لە تاریکی شەو کە بەدرێژی لەگەڵ سپییەکەدا ئەڕواو بڵاو ئەبێتەوە، ئینجا هەندێ لەزانایان لەسەر ئەوەن کە شەبەق (فجر) ناوە بۆ هەردوو هێڵەکە، بەڵام زۆربەی زانایان ئەفەرموون: شەبەق هەر ناوە بۆ هێڵە سپیەکە، وە ڕای ئەمان بەهێزو بەجێ‌یە، جا لەبەرئەوە ئەڵێن: ئەو هێڵە سپیە ﴿مِنَ ٱلۡفَجۡرِۖ﴾ کە بریتیە لە شەبەق، واتە شەبەقە ڕاستەکە کە نیشانە کەیمان ڕوون کردەوە، نەك شەبەقە درۆزنەکە کەلە پێش ئەو پەیدا ئەبێت، بەرەو ژوور ئەڕواو بڵاو نابێتەوە لە کەناری ئاسمان‌و ئاسۆدا، وە لەپاش دا ئەو نامێنێ‌و بە دوای ئەودا شەبەقە ڕاستەکەدێت، یەکەم

جاری ڕۆژووی باس کرد کەلە شەبەقەوە دەست پێ ئەکات، ئینجا دواییەکەشی دیاری ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ ئینجا لەشەبەقەوە ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن هەتا هاتنی شەو بە ئاوابوونی خۆر، وە لە حەدیسدا هاتووە: (إذا ادبر النهار، واقبل اليل وغابت الشمس فقد افطر الصائم) کاتێ ڕۆژ پشتی تێکردو ڕۆیی، وە شەو هات، وە خۆر ئاوا بوو ڕۆژووەوان ڕۆژوو ئەشکێنێ و کاتی شکاندنی هاتووە، لە پێشەوە بە شێوەی گشتی ڕەوای دا بۆ پیاوان کە بچنە لای ژنەکانیان لە شەوانی ڕەمەزان دا وەك شەوانی تر، ئینجا لێرەدا ئەو شەوانە دەرئەکات مەردوم وان لە (إعتکاف)دا، کە بریتیە لە مانەوەو خۆبەند کردن لە مزگەوتدا بەنیازی لێ بڕان تەنها بۆ خواپەرستی و واز هێنان لە هەرشتێ تر، وە دەرنەچوون لە مزگەوت و نەچوونەوە بۆ ماڵ و بۆ هەر شوێنێك مەگەر لەبەر ناچاری ئاوو نان خواردن و خۆشۆرین و دەست بەئاو گەیاندن، وە ئەم کردەوەش لە هەموو کاتدا خواپەرستیەو فەرمان و کردەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرە بەتایبەتی لەدە ڕۆژی دوایی ڕەزامەندا ڕەوشتی وابووە، جا لەبەرئەوەی ئەو ماوەیە ماوەی لێ بڕانە بۆ خواپەرستی، قەدەغە کرا تیایدا کە موسڵمانان تێکەڵی ژنەکانیان بکەن و بچنە لایان، وە جڵەوگیری کران لەوە بەم فەرموویە: ﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ﴾ وە نەچنە لای ژنەکانتان و پێیان مەکەون لە کاتێکدا کە ئێوە ئەمێننەوە لە مزگەوتەکاندا بۆ خواپەرستی و لێ بڕاون هەر بۆ ئەوە، کەواتە ئەو کات و ماوەیە ئەگەر لە ڕەمەزاندا بێت هەر چۆنێ لە ڕۆژدا ئەو تێکەڵی ئافرەتە قەدەغەیە، هەروەها لە شەویش دا هەر قەدەغەیە، ئینجا لە کۆتایی باسەکەوە ئەو چەند بڕیارانەی کەلە ئایەتانی پێشووەدا تێپەڕیان کرد بەدوای ئەوانەدا فەرموودەیەك ئەهێنێ کە هۆی بەهێزکردنی ئەو فەرمان و جڵەوگیریانەیە، وە مایەی ئەوەیە کە موسڵمانان بە تەواوی کۆسپەیان لێ بکەوێ و نەتوانن بە پێچەوانەوە ڕەفتار بکەن،

ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەو بڕیارانەی کە تێپەڕیان کرد، سنوورەکانی خوان ﴿فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ﴾ کەواتە نزیکیان مەکەونەوە، ئەگەر مەبەست بەو بڕیارانە قەدەغە کردنەکان بن، وەك هەندێ زانایانی لەسەرە، ئەو حەلە مەبەست جڵەو گیریە بە توندی لە کردنیان، وە هیچ جێگەی قسەو باس نیە، وە ئەگەر مەبەست ئەو شەش بڕیارە بێت کە هەندێکیان قەدەغە کردنەو ئەوانی تر یا پێویست کردنەیان ڕەوا دانە، ئەو حەلە جێ ی قسەو لێکۆڵینەوەیە، چونکە چۆن نزیکی شتێ نەکەونەوە کە فەرزو پێویست کراوەیان ڕەوا دراوەو حەڵاڵ کراوە؟ بۆ کردنەوەی ئەم گرێیە دوو شت گوتراوە، هەردوو ڕێکەو بە هەرکام ئەو گرێیە ئەکرێتەوە:

١- مەبەست نزیك نەکەوتنەوەیە بە گۆڕاندن، بەم ڕەنگە ڕەنگە ئەبێ لە سنووری بڕیارەکەدا بوەستێ بەبێ زیادو کەمو گۆڕاندن.

٢- هەرکەس لە گوێڕایەڵی خوادا بێتو بەپێ ی ڕاو بڕیاری ئەو بجوڵێتەوە، ئەوکەسە لە شوێنی هەق ڕاستی دایە، وە ئەوەی کە خوا دایناوە ترازا ئەکەوێتە ناهەقو گومڕایی، ئینجا لێرەدا مەبەست جڵەوگیریە لە ناهەقو گومڕایی، ئینجا لێرەدا مەبەست لەو جڵەوگیریە سنوور شکاندنو کەوتنە ناو ناهەق گومڕاییە، بەڵام ئەم شێوە بەهێزترەو جڵەوگیریەکە بەتێن تر ئەکات، چونکە کاتی نزیك نەکەوتنەوە لە سنوور باشتر دوور ئەبێ لە سنوور شکاندنو کەوتنە ناو ناهەقو گومڕایی، لەسەر ئەم ڕایە ئەم ئایەتە وەك ئەو حەدیسە وایە کە ئەفەرموێ: (فمن حام حول الحمى یوشك أن یقع فیە) هەرکەس لەدەوری قەدەغەدا بگەڕێ نزیکە کە تێی کەوێ.

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ئا بەو جۆرە ڕوون کردنەوە خوا ئایەتەکانی خۆی ڕوون ئەکاتەوە بۆ ئادەمیو بۆ مەردوم بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەوەی بە پێچەوانەی فەرمانی خوا ڕەفتار بکەن، وە لە خوا بترسنو بە پێ ی ڕەزامەندیو فەرمانی ئەو ڕەفتار بکەن، ئینجا بە بۆنەی ڕۆژوو جڵەوگیری لەو شتانەی کە ڕۆژوو ئەشکێنن، وە بە بۆنەی ترساندن لە نزیك کەوتنەوەی سنوورەکانی خوا، بەو بۆنەیەوە جڵەوگیریەکی تر ئەکات، جڵەوگیری لە خواردنی ماڵی یەکتر بە ناهەقو ناڕەوا، ئیتر بە داگیرکردن - یان بەدزی- یا هەر جۆرێ تر کە خوا قەدەغەی کردبێ،

﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ﴾ لەناو خۆتان دا ماڵی یەکتر مەخۆن بە ناهەق و ناڕەوایی و بەبێ شەرعی، بێگومان مەبەست لەوە جڵەوگیری نیە تەنها لە خواردن، بەڵکو مەبەست جڵەوگیریە لە هەر جۆرە دەست درێژییەك بۆ ماڵی یەکتر، کە بە گوێرەی باوو عورف بەو داگیر کردن و دەست درێژیە ئەگوترێ خواردن.

ئینجا بە تایبەتی جڵەوگیری ئەکات لە خواردنی ماڵی یەکتر لە ڕێگەی کاربەدەست و حوکمڕانەوە، بەم ڕەنگە یەکێ ماڵی مەردومی لایەو شایەنی لەسەر نیەو ئەمیش لە خوا ناترسێ تا دان بنێ بەوەی کەوا بەلایەوە، وە ئەیەوێ لە دادگا بە سوێندی درۆیان بە دەمبازی و گازو گیف ئەو ماڵە داگیربکات، یان بەم ڕەنگە بەرتیل ئەدات بە حوکمڕانی خراپ و ئەو یش بە ناهەق بڕیاری بۆ ئەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ﴾ لەسەر باری یەکەم کە زۆربەی زانایانی لەسەرەوە حەدیسیش یارمەتی دەرە، واتە دادو شکاتی ماڵەکانتان مەخەنە لای حوکمڕانەکان ﴿لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ﴾ بۆ ئەمەی بەشێك لە ماڵ و سامانی مەردوم بخۆن بە گوناهو بە ناهەقی، بەم ڕەنگە بە سوێندی درۆ، یان بەدەم و زیانی تیژو گازو گیف خۆتان بەڕاست دەرئەخەن و بەهۆی ئەوەوە لە دادگا بڕیاری ماڵی مەردومتان بۆ ئەدەن ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لەکاتێکدا کە خۆیشتان ئەزانن کە ڕاست ناکەن و لەسەر ناهەقن، وە بێگومان ناهەقی و تاوانێ کە بەزانین و دەست قەست بکرێ زۆر گەورە ترە لەوەی کە بەهەڵەو نەزانیەوە بکرێ، وە لەسەر باری دووەم: واتە ماڵ و سامانی خۆتان مەدەن بە حوکمڕانەکان بە بەرتیا تا لەڕێگەی بڕیاری ئەوانەوە بەشێك لەماڵی مەردوم داگیر بکەن و بە ناهەقی بیخۆن کە خۆیشتان ئەزانن ناهەقی و تاوانە، بە هەرجۆرو لەسەر هەربار بە بڕیاری حاکم هیچ حەرامێك حەڵاڵ نابێ و هیچ حەڵاڵێك حەرام نابێ، وەك لە حەیسێکدا بە ڕوونی

هاتووەکە (ئیمامی بوخاری‌و موسلیم) لە صەحیحەکەیاندا هێناویانە لە دایکی ئیماندارانەوە (أم سلمه) -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: من ئادەمیم، وە مەردوم ئاژاوە ئەهێننە لام، ئینجا لەوانەیە هەندێکیان بەدەم‌و زبان لێزان تر بێت لەوی تر، بەهۆی ئەوەوە بڕیاری بۆ ئەدەم بە پێی دیمەنەو ڕواڵەتەکە، ئینجا هەرکەس بڕیارم بۆ دابێ مافی هەر موسڵمانێك ئەوە پارچەیەکم لە ئاگر بڕیار داوە بۆی، کەواتە ئەگەر ڕازیە بە ئاگر با بیبات یان با وازی لێ بێنێ، ئابەم جۆرە ئەم مەسەلەی ئاژاوەو دادەیشی بەستەوە بەلە خواترسیەوە بەوێنەی هەموو مەسەلەکانی تر کەلە ئایەتەکانی ڕابردوودا باس کران، کەواتە هەموو مەسەلەو کاروبارنی بەرنامەکەی خوا ڕێك‌و پێکن لەگەڵ یەکترو هەموو پەیوەستن پێکەوە، بە هەموویانەوە بەرنامەکە پێك دێت، کەواتە بە هیچ ڕەنگ بەرنامەکەی خوا ناگونجێ‌و دەست نادا بۆ بەش کردن‌و پچڕانی کەرەسەکانی‌و ڕەفتار کردن بە هەندێکی‌و واز هێنان لە هەندێکی تری، بڕوا هێنان بە هەندێ‌و بڕوانەکردن بە هەندێکی تر، کە ئەوەش ئەبێتە بڕوا نەکردن بە هەمووی‌و دەرچوونە لە ئیسلام، وە لە بەشی یەکەمی جومی یەکەم دا بەدرێژی باس کرا... ئینجا هەروەك لەمەو بەر چەند مەسەلەو بڕیاری تر ئەهێنێ لە چەند بارو ڕوویەکی جیاوازەوە کە هەموو کۆئەبنەوە لە چوارچێوەیەکداو ئەمانیش چەند پارچەو کەرەسەیەك نیشان ئەدەن لەبەرنامەکەی خوا، ئەگێڕنەوە لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە فەرموویەتی: هیچ گەلێ لە جیهاندا بە قەدەر ئەم ئوممەتە کەم پرسیار نەبووە، پرسیاریان لە چواردە شت کردووەو وەڵام دراونەتەوە لە قورئان دا، ئینجا لەو چواردەیە هەشتیان لەم سورەتی ﴿البقرة﴾دایەو شەشەکەی تر لەشەش سورەتی تردایە: ﴿مائدة، الأنفال، الإسراء، الكهف، طه، نازعات﴾، ئینجا هەشتەکەی ئێرە:

یەکەمیان: پرسیاربوولەدووری‌ونزیکی خوا، وەك تێپەڕیکرد: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي﴾.

دووەمیان: ئەمەیە کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیارت لێ ئەکەن لە مانگە یەك شەوەکان، بەپێی هەندێ ڕیوایەت مەبەستیان لەم پرسیارە ئەمە بووە کە بۆچی لە یەکەم جارەوە بەوردیی و لاوازی دەرئەکەوێ لە پاش دا بەرە بەرە زیاد ئەکات و لەپاش دا هەمتر بەرەبەرە کەم ئەکاتەوە؟ وە بە پێی هەندێ ڕیوایەتی تر مەبەست ئەوە بوو ئایا لەبەرچی ئەم مانگە یەك شەوانە دروست کراون؟ بە هەرە جۆر مەبەست بووبێت، خوا ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ﴾ ئەی پێغەمبەر لە وەلامیان بلێ: ئەوانە نیشانەن بۆ ئادەمی کە کاتی کاروباری جیهانی خۆیانی پێ دیاری بکەن، وەك کاتی کشتوکاڵ و بازرگانی و کڕین و فرۆشتن و قەرزو مامەڵەیان، وە هەروەها کاروباری ئایینیان، وەك کاتی گرتن و نەگرتنی ڕۆژوو و ماوەی عیدەو سك پڕی ژنەکانیان، وە بە تایبەتی نیشانەن بۆ حەج کەکاتی تایبەتی خۆی هەیەو لەو کاتەدا نەبێ دروست نیە، وە بێگومان دیاری بوونی ئەو کاتانە بە هۆی مانگە یەك شەوە کانەوە سووك و ئاسانەو بۆ هەموو جۆرە کەسێك دەست ئەدات، بەلام دیاری کردنیان بە ساڵ و ڕۆژی خۆریی ناگونجێ و دەست نادات مەگەر بۆ حیساب گێڕەکان، هێشتا ئەمانیش سەبارەت بە حەج زۆر جار دووچاری هەڵەئەبن، ئینجا ئەگەر پرسیارەکە ببرین بەسەر باری دووەمدا ئەو حەلە وەلامەکە ڕێك و لەگەڵی و جێگەی هیچ قسەو باسێك نیە، بەلام لەسەر باری یەکەم وەلامەکە ناڕێکە لەگەڵی، بەلام وێنەی ئەم وەلامە زۆرەو ڕێکە بە پێی یاسایەك لە یاساکانی علیمی ڕەوانبێژی کە ناو براوە بە (الاسلوب الحكيم) واتە ڕەوشت و ڕەفتار کردن لەگەڵ مەردوم دا بەشێوەیەکی لێزانی و کاردروستی، بەم ڕەنگە سەرنجی پرسیار کەر ڕائەکێشێ و تەمێی ئەکات بەمەی کە پرسیارەکەی لەو بارەوەیە کە خۆی نیازی کردووە گرنگ نیە بۆی و با بەشتی واوە خۆی خەریك نەکات، بەڵکو گرنگ تر بۆی ئەوەیە کە لەم بارەوە پرسیارێ بکات کە وەلامەکە دەست نیشانی بۆ ئەکات: لێرەدا واتە پرسیار نەکەن لە هۆی گۆڕانی ڕووی مانگ و ئەو جیاوازیەی کە تێیدا ئەبێ، بەڵکو با پرسیار لەمە بکەن کە بۆچی مانگ بەو شێوەیە دروست کراوە و سوودو بەرژەوەندی لەوەدا چیە؟ لە سەرهەر بارو بە هەرجۆر ئەوا قورئان کارو پیشەی ئەو مانگە یەك شەوانەی بۆ باس کردن، وە دەری خست بۆیان سوودو

بەرژەوەندیان لە ژیانی ئادەمی و ڕووداوو بەسەرهاتی ژیانی ئادەمی دا، وە هیچ نەدوا لە هۆی گۆڕانی ڕوویان بەو جۆرو شێوە تایبەتیانەیان، وە هەروەها نەدوا لە کارو فەرمانیان لەناو کۆمەڵی خۆریی دا کە شێوەی پرسیارەکە ئەمیش ئەگرێتەوە، لە هیچ کام لەوانە نەدوا، چونکە ئەو جۆرە شتانە کارو فەرمانی قورئان نین و قورئان بۆ ئەو جۆرە شتانە نەهاتووە، قورئان هاتووە بۆ گەیاندن و پێك هێنانی مەبەستێکی کە بەم نەبێ ناگەیەنرێ و پێك نایەت، وە پێویست ترە لەو جۆرە شتانە، قورئان هاتووە بۆ دامەزراندن و پێکهێنانی ئوممەتێکی تازە کە دەست بدات بۆ سەرکردایەتی و پێشەوایی جیهان و ژیان لەسەر بۆچوون و تێگەیشتنێکی تایبەتی، وە بە بەرنامە و ڕژێمێکی تایبەتیەوە، کە ئەو کارە گەورەش لە سنووری زانین و ژیریی ئادەمیدا نیەو کاری وا بە خوا نەبێ ناکرێ، وە ئادەمی هەرچەند ڕادەی زانین و ژیریی و بیری بەرزو بەهێزبێت لەو کارەدا هەڵەی زۆر ئەکات و کارەکەی بە ڕێك و ڕاستی لەبەر ناڕوا.

قورئان نەهاتووە بۆ ئەوەی ببێ بە نامەی کیمیا و تەندروستی و ئاسمان ناسی و ئەو جۆرە شتانەی کە لە سنووری زانینی ئادەمدایەو بەتێ ڕوانین و بەراوورد کرن و بیرو ژیریی ئادەمی دەست کەوت ئەبن، کەواتە پرسیارو داواکردنی ئەم جۆرە شتانە لە قورئان و لە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵەیەو نیشانەی نەزانین و بێ ئاگاییە لە کارو پیشەیان، جا لەبەرئەوە وەڵامی پرسیارەکەیان بەو جۆرە هات کە تێپەڕی کردو باس کرا، بێجگە لەوەش قورئان کە نامەی ڕێنموونی و ڕێنیشاندانە باشی شتێك ئەکات کە بۆ هەموو تاقم و چینێك دەست بدات و جێگەی گومان و دوو دڵی نەبێت، وە دەست نەدات بۆ گۆڕان، دەی ئەم جۆرە باس و مەبەستانە کە پێیان ئەگوترێ: (النظريات العلمية) نە هەموو ژیرییەك وەریان ئەگرێ، وە نە بۆ هەموو تاقم و چینێ دەست ئەدەن، وە نە شتێکن دامەزراوو نەگۆڕاو، کەواتە باس کردنیان هیچ بەرژەوەندیەکیان تیا نیە، بەڵکو ئەبێتە مایەی گومڕابوون و هەڵەی چەند کەسێك لە بەندەکانی خوا، بێگومان قورئان نامەیەکی تێرو تەواوە لەبارەی ئەو مەبەستەی کە بۆی ڕەوانە کراوە، وە مەبەست و ئامانجەکەی گرنگ ترو گەورەترە لە هەموو مەبەست و ئامانجێك، وە ئەوەی کە قورئان باسی لێ ئەکات ئادەمیە کە ئەو هەموو زانین و زانیاریە بەرهەمی بیریی و ژیریی ئەمەو بەرەبەرە ئەم دەریان ئەخات، کەواتە ئەم قورئانە کە مەبەستی پێك هێنانی ئادەمیەو خەریکە بە ئادەمیەوەو چارەسەری خۆی و دەروون و بیریی و ژیریی

ئەكات، وە ئەیەوێ گەلو كۆمەڵی ئادەمی فەراهەم بێنێ، ئەم قورئانە كە ئەوە كارو فەرمانو پیشەیی، هیچ پێویستی نیە بە باسی بەرهەمەكانی ئەم ئادەمیە كە بەسروشت پەیدا ئەبن لێیەوەو بەدی دێن، وە ئەو گەلو كۆمەڵە ئادەمیە ئەگەر ڕێكو پێك بێت ڕێی هەموو ئەندامێكی ئەدات، بەڵكو بە توندی هانی ئەدات بۆ پێك هێنانو بەدی هێنانی بەرهەمەكانی، ئینجا پێویستە لەسەرمان هەر شتێك كە قورئان دانی پیانا باسی كرد لە بارەی ئەم بوونەوەرەو پەیدا بوونی ئادەمیو هەر شتێكی تر، پێویستە هەموو ئەو شتانە وەرگرین بە هەموو بیرو بڕوایەكی بە هێزەوە لەسەر ئەو بارو شێوەی كە بۆی باس كردوین بەبێ زیادو كەم، وە بەبێ ئەوەی بیان بڕین بەسەر بارو بڕیارێك كە ژیریی ئادەمیو تێڕوانینی ئادەمیو بەراوردی ئادەمی لەسەرە، چونكە ئەوەی كە قورئان پێی هاتبێ جێگەی گومان نیە، وە دەست نادا بۆ بژارەو هەڵسەنگاندن، بەڵام بڕیارەكانی ئادەمی شتێكی براوە نینو دەست ئەدەن بۆ بژارەو هەڵسەنگاندنو سڕینەوە، تەنانەت لەو شتانەش دا كەلە بنەڕەتدا ڕاستنو پێیان ئەگوترێ (الحقائق العلمية)، چونكە ئەمانەی كە دانی پیا ئەنێنو بڕوایان پێیان هەیە ئەیبەستنەوە بە سنووری بۆ چوونو بەراوردی خۆیانەوە كە زۆر جار لەوەیش دا هەڵە ئەكەن، وەك لەمەو پاش بە ڕوون تر لێی ئەدوێین، كەواتە هەر هەوڵو تەقەلایەك دراوەو ئەدرێ لەبارەی یەكخستنو بڕینی ئەو شتانەی كە قورئان دەست نیشانو ئاماژەیان بۆ ئەكات، لەگەڵ ئەوەی كە زانینو زانیاری ئادەمی پێی گەیشتووە، هەر هەوڵو تەقەلایەك كە لەو بارەیەوە بدرێ هەڵەیە، هەرزۆنێ سێ شت نیشان ئەدات كە شایان نین لەگەڵ گەورەییو بەرزی قورئان دا:

١- تێكشانێكی دەروونی بەرامبەر ڕاو زانینی ئادەمی تا ڕادەیەك ئەو ڕاو زانینە ئەكەن بە چاودێرو كار بەدەستو قورئان ئەكەن بە تابیعو شوێن كەوتوو، جا لەبەرئەوە ئەیانەوێ قورئان بە هێزو دامەزراو بكەن بەزانینو زانیاری ئادەمی، یا بیكەن بە بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاستی قورئان، لەكاتێكدا كە قورئان نامەیەكی تێرو تەواوەو هەموو شتەكانی دامەزراوو براوەن، وە زانینو زانیاری دانەمەزراونو زۆر جار ئەمڕۆ بڕیاری دوێنێی ئەسڕێتەوە، وە ئەوەی كە پێی گەیشاووەو ئەیزانێ ناتەواوەو شتێكی قەتعیو براوە نیە.

٢- تێنەگەیشتنە لە سروشتی قورئانو کارو پیشەی قورئان، کە ئەوەش ئەمەیە پێویستە هەموو بڕوادارێك بە هەموو دڵنیاییەکەوە بزانێ کە قورئان شتێکی ڕاستەو گەیشتووەتە ئەوپەڕی ڕادەو سنوور لە ڕاستی دا، وە ئەیەوێ ئادەمی پێبگەیەنێو پەروەردەی بکات بە جۆرێ ڕێكو پێكو گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی بوونو بوونەوەردا، وە لەگەڵ یاساو ڕژێمی کە خوا دایناوە لەم بوونەوەرەدا، بەڵکو بە خۆشیو دۆستایەتی بژیو هەندێ لەشتە نهێنیەکانی بناسێ، وە هەندێ لەو یاساو ڕژێمە بەکار بێنێ لەکارو باری جێنشینیەکەی لەم زەویەدا.

٣- ئەبێ قورئان لەسەر بارێ دامەزراو نەبێ، بەڵکو بە هەمیشەیی تەئویلو پینەو پەڕۆی تیا بکرێو یەك بخرێ لەگەڵ ڕاو بڕیارو تێڕوانینی ئادەمی دا کە جێگرو دامەزراو نین، وە هەموو ڕۆژێ شتێکی تازە دێتە پێشەوە، دەی هیچ کام لەم سێ شتە شیاوی بەرزیو بەرێزی قورئان نین، بەڵام باوا گومان نەبرێ کە ئێمەی موسڵمان نرخ نادەینو بە گرنگ ئەو تێڕوانینانە ناگرین کەلە زانیاری تازەدا دەرکەوتوون، وە هەروەها ئەوەی کە ڕێی پێبڕاوە لەبارەی بوونەوەرو ئادەمیو ژیانەوە، لەکاتێکدا کە خوا لە دوا دوایی سورەتی ﴿سجدة﴾دا ئەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ لەمەوپاش ئێمە پیشانی مەردومی ئەدەین بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی خۆمان کە هەیە لە نەفسی خۆیانو لە ناوچەکانی جیهاندا، تا دەرکەوێ بۆیان کە قورئانو ئایینی خوا هەقو ڕاستە.

دەی پێی ئەڵێنو فەرموودەیە ئەبێ هەمیشە بیربکەینەوە لە هەرشتێ کەلە زانیاری تازەدا دەرکەوتووەو دەرئەکەوێ، وە بەپێی ئەوانە ماناو مەبەستەکانی قورئان فراوان بکەین لە دەروونماندا، بەڵام بەبێ ئەوەی ئایەتەکانی قورئان ببڕین بەسەر بارێکی تایبەتی لەوانەی کە ئەو زانایانەی ئەیڵێنو بۆی چوون، وە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە چەند شتێ بەوێنە باس ئەکەین: خوا لەدوا دوایی سورەتی ﴿القمر﴾دا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَـٰهُ بِقَدَرٍ﴾ بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان دروست کردووە بە ئەندازەو لەسەر بارێکی تایبەتی، واتە زانیومانە هەر ئەوە ڕاستەو ڕێكو گونجاوە... ئینجا لە زانیاری دا دەرکەوتو لەبەرەوە دەرئەکەوێ کە هەموو بەشو پارچەیەكو هەموو دروست کراوەکانی خوا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە ئەوپەڕی وردەکاری تیا کراوە بە جۆرێ هیچ بارو ڕوویەکی تر شایستەو ڕاست

نیە، بێجگە لەو بارو ڕووەی کە خوا بۆی داناون... ئاوو هەوا پێك هاتوون لە چەند بەش و کەرەسەیەك، بەڕادەو ڕێژەیەکی دیاریی ئەگەر بگۆڕێن بە هەر جۆرێ تر لەکاری خۆیان ئەکەون، ئەم زەویە دروست کراو بارێکی تایبەتی و لەسەر قەبارەیەکی تایبەتی و لە ڕادەیەکی تایبەتی دا لەدووری لە خۆرو مانگ، وە هەروەها ڕادەی قەبارەی شتی تر کە بەهۆی ئەوانەو یەك کەوتن و کۆبوونەوەیان ئەم زەویە دەست ئەدات بۆ ژیان تیایدا، کەواتە هیچ کام لەمانە بە ڕێکەوت و گۆترەکاری نەکراوە، بەڵکو بەنیازو خواهیش بۆ مەبەستێکی دیاری کراوەو دارێژراوە، بێگومان دەرکەوتنی ئەمانەو سەرنج دانیان ماناو مەبەستی ئەم ئایەتە زۆرترو فراوانتر ئەکات لە دەروونماندا، وە قووڵ تری ئەکات لە تێگەیشتن و برچوونماندا، کەواتە بە دواگەڕانی ئەم جۆرە شتانەو زانینی ئەو وردەکاریانە زۆر ڕێك و ڕەوایە بۆ ئەوەی ماناو مەبەستی ئایەتەکە پان و پۆڕتر ببێ لە دەروونماندا، وە قووڵتر بچێتە دڵمانەوە، ئەوەی کە گوتمان بەو جۆرو شێوەیە ڕاست و دروستەو بەڵکو پێویستە، بەڵام ئەوەی کە ناڕاست و ناڕەوایە، وە لەبارەی زانیاریشەوە ناڕێکە ئەم چەند وێنەو نموونەیە کە دێت: خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾ سوێند بە خوا ئێمە ئادەمیمان دروست کردووە لە خولاسەو پاڵفتەیەك لە قوڕ، ئینجا تێ ڕوانینی (دالاس و داروین) پەیدا بوو کەوا دائەنێ و گومان ئەبات کە گیان لە یەکەم جارەوە دەستی پێکرد لەیەك سێڵەوە، وە ئەو سێڵەش لەناو ئاودا پەیدا بوو، وە بەرەبەرە گۆڕاو بەرز بوویەوە هەتا گەیشتە دروست کردنی ئادەمی، ئینجا ئێمە بێێن ئەم ئایەتە بەرین بەسەر ئەمەداو بڵێین: مەبەست لەم ئایەتە ئەمەیە کە ئەوانە گومانیان بۆ بردووە!! نەخێر شتی وا دروست نیە بە هیچ ڕەنگ... چونکە ئەم تێ ڕوانینی ئەوانە شتێکی بڕوانەبوو کە دەست نەدا بۆ بژارەو دەست تێخستن، ئەوەتا چەرخێکی بەسەردا تێنەپەڕی تا دەست تێخراو بژارە کرا تا ڕادەیەك بە تەواوی گۆڕاو لادرا لەسەر ئەو بارو بنەڕەتەی کە لەسەری هات، وە لەپاش دۆزینەوەو دەرکەوتنی ئەو شتانەی کە پارێزەری جۆری زیندەوەرەکانن، بەجۆرێ کە بەهیچ کلۆجێ گۆڕانی هیچ جۆرێ بە جۆرێکی تر، لە پاش دۆزینەوەی ئەوانە کە ناو ئەبرێن بە (کرۆمۆسۆمات) هیچ گومان نەما کە ئەو تێ ڕوانینە هەڵە بووو ڕاست دەرنەچوو، لە کاتێکدا ئەوەی کە قورئان فەرمووی شتێکی قەتعیەو دەست نادات بۆ دەست تێخستن و گۆڕاندن،

کەواتە ئەبێ بڕوامان وابێ کە ئادەمی لە بنەڕەتدا لەوە دروست کراوەو ئیتر زیاد لەوە هیچ درێژەی پێنادەین کە چۆن پەیدا بوو لەو بنەڕەتە تا بوو بەم ئادەمیە.

وێنەیەکی تر: پێغەمبەر ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي ﴾ خۆر ئەگەڕێ، ئیتر بەبێ درێژە پێدان و دیاری کردنی شێوەو بارو جۆرێك بۆ ئەو گەڕانە، وە زانیاری تازەش ئەڵێ: خۆر ئەگەڕێ بە خێرایی (١٢) دوانزە میل لە چرکەیەکدا، ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو ئەستێرانەی کە وان بەدەوری دا، بەڵام لە گەڕان و خولانەوەی لەگەڵ ئەو کاکێشانەی کە ئەم یەکێکە لە ئەستێرەکانی ئەگەڕێ بە خێرایی (١٧٠) میل لە چرکەیەکدا، ئینجا ئێمە نابێ ئەم گەڕان و خولانەوەی خۆرە ببڕین بەسەر ئەم ڕادەو ڕێژەیەدا کە ئەو زانایانە بە دەم بڕو گۆترە کاری وتویانەو دەست ئەدات بۆ دەست تێخیستن یان هەر سڕینەوە لەبنەڕەتەوە، لە کاتێکدا ئەوەی کە قورئان فەرموویەتی ڕاستەو بە هیچ کلۆجێ دەست نادا بۆ ڕاست کردنەوە، یان سڕینەوە، وێنەیەکی تر: قورئان ئەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ ﴾ ئایا بێبڕواکان نەیانزانی کە ئاسمانەکان و زەوی لە پێشەوە لکابوون و نووسا بوون بەیەکەوە، ئینجا ئێمە لە یەکمان جیاکردنەوە؟ ئینجا تێ ڕوانینێك پەیدا بوو ئەڵێ: ئەم زەویە پارچەیەك بوو لە خۆرو ئینجا لێی جوێ بوویەوە، دەنابێ ئێمە دەقی ئایەتەکە ببڕین بەسەر ئەوەداو بڵێین: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە ئەو تێڕوانینە ئەیڵێ، چونکە ئەوە شتێکی دەم بڕەو قەتعی نیە، ئەوەتا چەند تێڕوانینێ تر هەیە لەبارەی پەیدا بوونی زەویەوە کەلە ڕادەی ئەو دایەو کەمتر نیە لەو! بەڵام ئەوەی کە قورئان فەرموویەتی هیچ کەس ناتوانێ دژی بڵێت یان بیسڕێتەوە.

ئەم چەند وێنەیە بەسە بۆ ئەو مەبەستەی کە گوتمان لەسەرەتای باسەکەوە، ئینجا لە کۆتایی ئەم باسی پێشووەدا باسێکی تر ئەهێنین کە پێویستە زانین و وەك تەواوکەر وایە بۆ ئەم باسی یەکەمە، ئەو زانینانەی کە پێویستە بۆمان لە ژیانماندا چەند جۆرو بەشێکن:

١- ئەوانەیکە پێویستمان نیە بە مامۆستاو فێرکەر. بەڵکو خۆمان بە خۆمان ئەیانزانین، ئەوەش بریتیە لەوانەی کە هەستیان پێئەکەین بە هەرکام لە پێنج هەستیارەکەمان، وە هەروەها ئەوانەی کە ویژدان و دەروون ئەیانزانین، وەك برسیەتی و تینوویەتی و غەم و پەژارەو کەیف خۆشی و...هتد.

٢- ئەو شتانەی کە بەهیچ کلۆجێ زانینیان لەلایەن ئادەمیەوە ناگونجێ، وە دەست نادەن بۆ ئەوەی ئادەمی پێیان بگات، بەڵکو زانینیان ئەبێ هەر لە ڕێگەی خواوەبێت، ئەوەش وەك زانینی چۆنیەتی دروست کردنی ئەم دروست کراوانەو زانینی یەکەم دروست کراو، وە هەرشتێ لەو بارەیەوە گوتراوە لەلایەن ئادەمیەوە هەمووی شتێکن بەدەم بڕو گۆترەکارینو ناگەنە ڕادەی گومانی بەهێزیش چ جای زانین. بۆ وێنە: پزیشك ئەزانێ بەزۆربەی گیان لەبەران کە چۆن پەیدا ئەبنو گەشە ئەکەن تا ئەبن بەو گیانلەبەر تایبەتیە، بەڵام هیچ کەس نازانێ کە چۆن ئەم گیانلەبەرانە فەراهەم هێنراونو کران بەم هەموو جۆرە، وەهیچ کەس نازانێ کەرەسەی یەکەم جاریان چیە.

٣- ئەو شتانەی کە زانینو ناسینیان ئاسانە بۆ ئادەمی بەهۆی بیریی‌و ژیریی‌و بەڵگەو نیشانەو بەراورد کردنەوە، وەك زانینی ئەم هەموو پیشەسازیو کشتوکاڵو تەندروستیە، وە هەروەها زانینو ناسینی ئاسمان ناسی کە هەندێ لەوە زانینو ناسینی هۆی گۆڕانیو بارو ڕووی مانگە کەلەسەر ڕیوایەتێ پرسیارکەران لەوەبوو، ئەم جۆرە زانینانە داوا لە پێغەمبەران ناکرێ ـ درودی خوایان لێ بێت ـ وە داوا کردنی زانینی ئەو جۆرە شتانە لەوان لەو دوو ناڕاستو ناڕەوایە:

أ- داوای ئەوە لەوان ئەوە ئەگەیەنێ کە داواکەر نەزانو نەفامە بەکارو پیسەی ئەوان، وە نەزانە بەوەی کە ئەوان بۆچی ڕەوانە کراون، بێگومان ئەوان نێرراون بۆ ڕێنموونی مەردوم بۆ بیرو باوەڕی ڕاستو کردەوەی چاكو ڕەوشتی پاك، وە ترساندن لە کردەوەو ڕەفتار، بە پێچەوانەی ڕاو فەرمانی خوا.

ب- داواکردنی ئەو جۆرە شتانە لە پێغەمبەران ـ سەلامیان لێ بێت ـ ئەبێتە هۆی پەك خستنو بەکار نەهێنانو گوێ نەدان بەو هەموو هێزو وزەو بەهرەیەی کە خوا بەخشی بەم ئادەمیەکە بەکاریان بێنن لە ژیانو لە کاروباری جێنشینیەکەیان لەم زەویو جیهانەدا، ئینجا ئەوەی کە پێویستە لەسەرمان داوای بکەین لەو پێغەمبەرانە ـ سەلامیان لەسەربێ ـ زانینی ئەو شتانەی کە پێویستە لەسەرمان بەرامبەر بە پەروەردگارمان، وە هەروەها زانینو ناسینی حەرامو حەڵاڵ کە ئەم دوو جۆرەش ئەبێ هەر لەلایەن خواوە بزانرێنو بناسرێن.

وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ

---

**ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر بەشی دووەمی ئایەتەکە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ بێگومان چاکەو کردەوەی چاك ئەوە نیە کە ئێوە بچنە ماڵەکانتان لە پشتیانەوەو خۆتان بپارێزن لەچوون لە قاپیەکانیانەوە، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ﴾ بەڵکو چاکەو کردەوەی چاك هینی کەسێکە کەلە خوا ترس بێتو خۆی پارستبێت لە حەرامو قەدەغەکانی خوا، کەواتە واز بێنن لەو باوی خۆتانە کە باوێکی بێ بنچو بنەوانە ﴿وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَاۚ﴾ وە بچنەوە ناو ماڵەکانتان لە قاپیەکانیانەوە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لە ڕەفتار کردن بە پێچەوانەی فەرمانی خوا ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو بگەن بە ئامانجو هۆی ڕزگار بوونتان.**

**لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم بەشی دووەمە لە ئایەتەکەو پەیوەندی بەبەشی یەکەمەوە چەند شتێ گوتراوە، بەهێز تر ئەمەیە کە لەم حەدیسە وەرئەگیرێ کە (بوخاریو موسلیم) ئەیهێنن لە (بەرای کوڕی عازەب)ەوە –خوا لێیان ڕازی بێ– کە ئەفەرموێ: مەدینەییەکان کاتێ کەلە حەجو عەمرە ئەگەڕانەوە لە قاپیەوە نەئەهاتنە ناو ماڵەکانیان، بەڵکو لەپشتەوە کونیان ئەکردە ماڵەکانیانو ئەچوونەوە ماڵ، ئینجا پیاوێك لەوان کە گەڕایەوە لە قاپیەوە چووە ماڵ بە پێچەوانەی باوی خۆیان، بەهۆی ئەوەوە ڕەخنەی لێ گیرا، ئینجا ئەم نیوە ئایەتەهاتە خوارەوە، جا هەر لەم حەدیسەوە وا دەرئەکەوێ کە پەیوەندیو پەیوەستی ئەم دوو بەشە ئەمەیە: بەشی یەکەم باسی ئەوەی کرد کە مانگە یەك شەوەکان نیشانەن بۆ حەج، وە بەشی دووەمیش باسی باوێکی چەرخی نەفامی ئەکات کە تایبەتی بووە بە حەجەوە.**

**لەپاش ئەوە ئینجا جەنگو کوشتار دێتە پێشەوە بە شێوەی گشتی، وە بەتایبەتی لە خاکی حەرەمو لە چوار مانگە بەڕێزەکەدا کە جەنگو کوشتار قەدەغە کراوە تیایاندا، وە هەروەها باسی ماڵ بەخت کردن ئەکات لە ڕێی خوادا کە زۆر پەیوەستە بە جیهادو کوشتار لە ڕێی خوادا.**

لە هەندێ ڕیوایەت دا ئەفەرموێ: کەلە یەکەم جارەوە ئیزن دار بە جەنگ و کوشتار بە ئایەتی سورەتی (حج) ئینجا بەم ئایەتی ئێرە یەکەم فەرمان هاتە خوارەوە پێ ی، لەپاش ئەوەی کەلە چەرخی مەککەدا جلەو گیری کران لێی لەبەر هەر هۆیە کە خوا خۆی باشی ئەزانێ... بەڵام ئێمەیش بەپێ ی تێگەیشتنی خۆمان ئەتوانین دەست نیشان بکەین بۆ ئەوەی بکرێن بە هۆی ئەو جلەو گیریە:

١- مەبەست لەڕام کردنی ئەوکۆمەڵەبڕوادارە بوولەسەرخۆگریی و ڕایەڵی و فەرمانبەری، وەمل کەچ کردن بۆ سەرکردایەتی، وە وەستان وچاوەڕوانی ئیزن و فەرمان لە لایەن سەرکردەوە، لە کاتێکدا کە ئەو بڕوادارانە لەگەل و کۆمەڵێك بوون کە مل هووڕو سەرکێش بوون و هەرگیز سەریان دانە ئەخست بۆ هیچ کەسێك کە ناپیاوی و ستەمیان دەربارەبکات،وەبێ گومان ئەوکاروفەرمانەگەورەو گرنگەی کە خرابووە سەرشانی ئەمان - کاروفەرمانی جێنشینی لەزەویداگرتنە دەستی جلەوگیری ژیان وجیهان-ئەوکارە گەورەو گرنگە بەبێ ئەو ڕام کردن و پێگەیاندن و پەروەردە کردنە نەئەگونجا و نەئەکرا.

٢- خۆگرتنی ئەو بڕوادارانە لەسەر ئەو هەموو سزاو ئازارو ناپیاویەی کە دەربارەیان ئەکرا، لەوانەبوو کە غیرەت و پیاوەتی هەندێ لە بێبڕواکان بهێنێتە جۆش و بیانخاتە سۆزو پەرۆش دەربارەی بڕوادارەکان و ئایینەکەیان، وەك ئەوە ڕووی داو بەدی هات لە کاتێکدا کە قورەیش بە یەك جار هەڵسان لە پێغەمبەر (ﷺ) و کەس و کاری، وە نامەی ئەوبەدژهەڵسان وموقاتەعەیان نووسی وهەڵیان واسی بەدیواری کەعبەدا، ئینجائەوەبوو تاقمێك لە پیاوە بە غیرەتەکان هاتە جۆش و ئەو نامەیان دڕی و پەیمانەکەیان شکاند.

٣- لەو چەرخەدا بڕوادارو بێبڕوا تێکەڵ بوو لە ناو هەموو ماڵ و خێزانێکدا، وە هەرکەس لە بێبڕواکان هەڵئەسان بەسزاو ئازاردانی کەس و کاری بڕواداری خۆی، دەی ئەگەر لەو کاتەدا ئیزنی جەنگ و کوشتار بدرایە ئەبوو هەموو ماڵ و بنەماڵەیەك بەر ببوونایەتە یەکترو خوێن ڕژی پەیدا ئەبوو لەناویاندا، ئەو حەلە ئیسلام ناوبانگی ناشیرین ئەبوو لەبەچاوی مەردوم دا، وە سەرنج ئەدرا بە ئایینی خوێن ڕێژو تەفرەقەو سەرشێوان، بەلام لە چەرخی مەدینەدا کۆمەڵی موسڵمان جیا بووبووەوەو یەك پارچە وەستابوو بەرامبەر کۆمەڵی بێبڕواو ڕێگەی ئەو پڕو پاگەندە نەما.

٤- ڕەنگە کەمی و بێدەسەڵاتی موسڵمانەکان یەکێ بێت لە هۆکاری ئەو جلەوگیریە.

٥- ئەگەر جەنگ‌و کوشتار ڕووی بدایە لەو کاتەدا لەوانە بوو گەلی بێبڕوا تیا بچوایە کەلە پاش دا خۆی یان نەوەی موسڵمان بوون‌و بوون بە ڕۆڵەو یارمەتی دەری ئیسلام! بە هەر حاڵ لە چەرخی مەدینەدا جەنگ‌و کوشتار دەستی پێکرد بەرەبەرە بەپێی داخوازو بەرژەوەندی ئیسلام، لە پێشەوە لەنێوە دوورگەدا، ئینجا لەدەرەوەی نێوە دوورگەدا... ئینجا پێش ئەوەی دەست بکەین بە تەفسیری ئایەتەکانی داهاتوو کە یەکەم جار هاتنە خوارەوە لە بارەی فەرمان بە جەنگ‌و کوشتارەوە، چاك وایە بە کورتی وتەیەك بڵێین لە بارەی جەنگ لە ئیسلامدا، کەبکرێ بە بنەڕەت بۆ تەفسیری ئەم ئایەتانەی ئێرەو هەر ئایەتێکی تر کە هاتبێتە خوارەوە لەبارەی جەنگەوە: بێگومان ئایینی خوا هات لەم دواترین شێوەیەدا کە ئیسلام هێنای، بۆ ئەوەی ببێ بە یاسا بۆ ژیانی ئادەمی لەم سەر زەویەدا هەتا هەتایە، وە بۆ ئەوەی ببێ بە بەرنامەیەکی گشتی بۆ هەمووان، وە بۆ ئەوەی ئەم ئومەتی ئیسلامە هەڵسێ بەسەرکردایەتی جیهان‌و بیبات بەڕێگەی خوا بەپێی ئەم بەرنامەی کە بۆی هات، ئەم بەرنامەی کە بۆ چوون‌و تێگەیشتنێکی تێرو تەواو نیشان ئەدات لەبارەی مەبەست لەبوون بە شێوەی گشتی‌و مەبەست لەبوونی ئادەمی بەتایبەتی، بەو جۆرو شێوەی کە قورئان ڕوونی کردووەتەوە، سەرکردایەتی بکات بۆ ئەو ئامانج‌و مەبەستە گرنگەی کەلە هیچ بەرنامەیەکی زەمینی دا دەست ناکەوێ، وە ئادەمی‌و ئادەمیەتی بەرز بکاتەوە بۆ ئەو ڕادەو پلە بەرزەی کە بە هیچ کلۆجێ پێی ناگات، مەگەر لە سایەو پەنای ئەم بەرنامەیەدا، وە ئەم چاکەو بەهرەیە دەست بخات کە هیچ چاکەو بەهرەیەکی تر هاوتای ناکات، وە هەرکات بێبەش بێت لەم بەهرەیە بێبەش ئەبێت لە هەموو خێرو خۆشیەك، وە هەرکەس بیەوێ بەرگری ئەم بەهرەیە بکات ئەوە کەسە دوژمن ترین کەسە بە ئادەمی‌و ئادەمێتی، وە هیچ دەست درێژیەك ناگاتە ئەوەی کە ئادەمی‌و ئادەمێتی بێبەش بکرێ لەم بەرزی‌و پاکی‌و بەختەوەری‌و بە پایان گەیشتنەی کە خوای میهرەبان لەم ئایین‌و بەرنامەیەدا بەخشی‌و بە خەڵاتی ئەم ئادەمیەی کردو پێی خۆشە بەندەکانی پێی بگەن، ئینجا پێویستە هەموو ئادەمی بانگ بکرێ بۆ ئەم بەرنامەیەو ئەم بانگەوازەی پێبگات، وە پێویستە هیچ شتێ‌و هیچ دەسەڵاتێ ڕێگەی ئەم بانگ کردن‌و ڕاگەیاندنە نەگرێ، ئینجا پێویستە کارێکی وابکرێ پاش ڕاگەیاندن کە مەردوم بەئازادی‌و سەربەستی بتوانن ئەم عەقیدەیە بگرنە گەردن‌و بڕوا بێنن بەم

ئایینـە، وەئـەوەی کـە بـڕوا ناهێنـن نـەتوانن بـەرگری بـڕواداران بکـات لـەوەی لەسـەر عەقیدەو ئایینەکەی خۆیان بڕۆن، وە بتـوانن ئایینەکـەیان ڕاگەیـەنن و بانگی مەردومی بۆبکەن، کەواتە پێویستە لەسەر گەلی موسڵمان هێزێکی وا فەراهەم بێنن کە پارێزگاری ئـەو ئـازادی و سەربەسـتیەیان بکـات و بـەرگری هـەموو دەسـت درێژیـەکیان لـێ بکـات، بـەکورتی پێویـستە لەسـەر بـڕواداران کـە تێکۆشـان و فیـداکاری بکـەن بـۆ نەهێـشتنی هەموو کۆسپ و گرێیـەك کە ڕێی ئەم ئایینی خوا بگرێت، وە موسڵمانان بتـوانن بـە بەربەستی هەڵسن بە پێویستە سەرشانی خۆیـان و کەس نەتوانێ دەست درێـژیان لـێ بکات، یـان بـەرگریان بکـات لـە بـڵاو کردنـەوەی ئـایینی خـوا، جا لەبەرئـەو مەبەسـت و ئامانجە بەرزو پیرۆزانە جیهادو جەنگ و کوشتار پێویست کر.

ئەم ئایەتانەی ئێرە دەست پێئەکەن بە فەرماندان بە جـەنگ لەگەڵ ئەوانـەی کە جـەنگ ئەکەن لەگەڵ موسڵماناندا لە هەرکات و لە هەر شوێنێك، وە هەر لەیەکەم جارەوە مەبەست لـە جەنگەکەو ئەو ئاڵای کە بەرز ئەکرێتەوە لەو مەیدانـەدا بـەڕوونی دیـاریی ئـەکات، ئەفـەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ﴾ جـەگ بکـەن لـەڕێی خـوادا لەگـەڵ ئەوانـەی کـە جـەنگتان لەگەڵ ئەکەن، واتە ئەبێ ئەو جەنگە هەر لەبەر خوابێت، نـەك لەبـەر هـیچ مەبەسـتێکی تـر لـەو مەبەست و ئامانجانـەی کـە جـەنگ و ئاژاوەیـان لەسـەر کـراوە لـە نـاو ئـادەمی دا، جـەنگ لەبـەر خواو لە ڕێی خوادا، نەك لەبـەر زاڵ بوون و بـەرز بوونـەوە لـەوڵات و لـەزەوی دا، وە نـەك لەبـەر دەستکەوت و تـاڵان و داگیر کردنـی خێـرو بێـری وڵات، وە نـەك لەبـەر ژێـر بـارو ژێـر دەسـت کردنی تیرەو بەرەیەك بۆ تیرەو بەرەیەکی تر، بەڵکو تـەنها لەبـەر بەرزکردنـەوەی وتـەو وشـەی خوا لـە زەوی دا، وە لەبـەر دامەزراندن و چەسپاندنی بەرنامـەی خـوا لـە ژیانـدا کـە هـەر ئـەوە بەختەوەری هەمووانی تێدایە، وە لەبەر پاراستنی بڕواداران لەوەی سزاو ئازار بدرێن لەسـەر عەقیدەو ئایینەکەیان، یان گومڕا بکرێن و ڕاکێشرێن بۆ بێبڕوایی و خراپەکاری، یـان دەسـت درێژیان لێ بکرێ و مافیان پێشێل بکرێت، ئیتر بێجگە لەو جەنگە هـەر جەنگێ تـر ناڕاسـت و ناڕەوایەلەئیسلامدا، ئینجالەگەڵ دیاریی کردنی مەبەست وئامانج،ئەندازەیشی دیاری ئەکات،

﴿وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ﴾ وە دەست درێژی و زیادە ڕەوی مەکەن، بەم ڕەنگە ئەوانەش بکوژن، کە جەنگ ناکەن و هیچ مەترسیەکیان لێ ناکرێ بۆ سەر بانگەوازەکەی ئیسلام و موسڵمانان، کە ئەوانەیش بریتین لە ئافرەت و منداڵ و پیرو پەك کەوتووەکان و ئەوانەی کە هەر خەریکی خوا پەرستین و لێ بڕاون بۆ ئەوە لە هەر میللەت و ئاییینێك، یان بەم ڕەنگە لە یەکەم جارەوە ئەمان جەنگ بکەن، وە هەروەها دەست درێژی و زیادە ڕەوی نەکرێ بەلادان و تێپەڕکردن لەو ئاداب و ئوسوڵەی کە ئیسلام دایناوە، نەك ڕەفتارکردن و کردەوە ناڕاست و ناڕەوایانەی کەلە جەنگە نەفامیەکانی کۆن و تازەدا ئەکرێن، ئینجا با گوێ بگرین بۆ چەند حەدیسێك لەبارەی چۆنیەتی جەنگی ئیسلامەوە کە ئادەمی و جیهان یەکەم جار بینیان و وەریان گرت لە ئیسلامەوە:

١- حەدیسی کە (ئیمامی مالیك) و (بوخاری) و (موسلیم) و (ئەبو داود) و (ترمزی) ئەیهێنن لە (ئیبن و عومەر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) جڵەوگیری کردووە لە کوشتنی ئافرەتان و منداڵان.

٢- حەدیسێ (بوخاری) و (موسلیم) لە (ئەبو هورەیرە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر کام لە ئێوە کاتێ جەنگی کرد دەست بپارێزێ لە دەم و چاو...

٣- حەدیسی (بوخاری) لە (عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاری)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) جڵەوگیری کردووە لە تاڵان و لە پەل پەل کردن و ناشیرین کردنی لەشی کوژراو.

٤- حەدیسی (ئەبو داود) لە (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) جڵەوگیری کردووە لە کوشتن بەسستیو بەسزاو ئازار، بەڵکو بە یەك جارو بەکوتو پڕی.

٥- حەدیسی (بوخاری)و (ئەبو داود)و (ترمزی) لە (ئەبو هورەیرە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) جڵەوگیری کردووە لە کوشتن بە سووتاندن.

٦- حەدیسی (ئەبو داود) لە (حاریسی کوڕی موسلیمی کوڕی حاریس) باوکیەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ سریەیەکدا ناردینی، ئینجا کە گەیشتینە جێگای پەلامار دان من پەلەم کرد بە وڵاغەکەمو پێش کەوتم لە هاوەڵەکانم، ئینجا دانیشتوانی خێڵەکە بە هاوارو لاڵەوە هاتن بە پیرمەوە، ئینجا منیش وتم: بڵێن (لا الـه الا الله) ئیتر خوێنو ماڵتان ئەپارێزرێت، ئەوانیش گوتیان، ئینجا هاوەڵەکانم ڕەخنەیان لێ گرتم، وتیان: غەنیمەتەکەت لە دەست دەرکردین: ئینجا کە گەڕاینەوە هەواڵەکەیان دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا ئەویش منی بانگ کردو کردوەوەکەمی بە چاكو ڕەوا دەکردو لەپاش دا فەرمووی پێم: لەباتی هەرکام لە دانیشتوانی ئەو خێڵە خوا ئەوەندەو ئەوەندە ئەجرو پاداشتت بۆ ئەنووسێت.

٧- (موسلیم)و (داود)و (ترمزی) حەدیسێ ئەهێنن لە (بەریدە)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەسێکی بکردایە بە سەرۆك بەسەر لەشکرێکەوە، وەسیەتی بۆ ئەکردو فەرمانی پێئەدا لەبارەی خۆیەوە بەلە خوا ترسیو خۆپاراستن لە گوناه، وە بەچاکەو کردارو ڕەفتاری چاك لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵی بوون، ئینجا پێی ئەفەرموو: تەنها بە ناوی خواوە لە ڕێی خوادا جەنگ بکەن ئەو کەسەی کە بڕوای نەهێناوە بە خوا، جەنگو غەزا بکەن، وە غەدرو بێ پەیمانی مەکەن، وە دەست لە کوژراو مەدەنو پاش کوشتن هیچ بەسەر لەشی مەهێنن، وە هیچ منداڵێ مەکوژن.

٨- (ئیمامی مالیك) لە خەلیفەی یەکەمەوە ئەگێڕێتەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە لەوەسیەتو ئامۆژگاری لەشکری دا ئەیفەموو: ڕێتان ئەکەوێ لە تاقمێك کە لایان وایە خۆیان بەند

کردووه بۆ خوا ـ واته عابیەکان‌و ڕاهیبەکان ـ ئەوانە وازیان لێ بهێنن‌و لێیان گەڕێن بۆ خۆیان‌و ئەوەی کە بە خواپەرستی دائەنێن، وە ئافرەت‌و منداڵ‌و پیر مەکوژن.

ئەو جەنگانەی کە ئیسلام ئەیان کات‌و ڕەوایان ئەدات ئەمانەیە کە باس کران، وە ئەمانەیە ئاداب‌و ئوسوڵیان، وە ئەوەیە ئامانج‌و مەبەست لەو جەنگانەدا، وە هەموو ئەوانەش لەم ئایەتە وەرئەگیرێن کە خەریکین پێ‌یەوە لەگەڵی ئەژین.

موسڵمانەکانی پێشوو ئەیانزانی کە ئەمان بەزۆری ژمارە یان بەزۆری چەك‌و کەرەسەی جەنگ زاڵ نابن‌و سەرناکەون، لەو بارەیەوە دوژمن لەمان زۆرترو بەهێزترە، بەڵکو ئەمان بەهێزی بڕواو گوێڕایەڵی‌و کۆمەکی خوا زاڵ‌ئەبن، دەی کاتێ ئەمان گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکەن وە بە پێ‌ی تەمێ‌و ئامۆژگاری ئەوان ڕەفتار نەکەن، ئەوا تاقانە هۆی سەرکەوتنەکەیان لەدەست دەرئەچێ، جا لەبەرئەوە ئەو موسڵمانە ڕاستانە ئەو ئاداب‌و تەمێ‌و ئامۆژگاریانەیان ئەگرتە گەردن‌و پێ‌ی هەڵئەسان، تەنانەت لەگەڵ ئەو دوژمنانەشیان کە ئەو هەموو سزاو ئازارەیان بەسەر هێنان‌و ئەوەی کەلە دەستیان هات لە ستەم‌و ناپیاوی ڕۆژێ لە ڕۆژان سەریان لێ نەکردەوەو کردیان دەربارەیان، ئینجا فەرمانی جەنگ‌و کوشتارەکە بە هێزتر ئەکات سەبارەت بەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ کردن‌و سزاو ئازاریان دان لەسەر ئایینەکەیان، فەرمان ئەدات بە جەنگ کردن‌و کوشتنیان لەسەر هەرباری‌و لە هەر شوێنێ بن، بێجگە لە خاکی حەرەم، بە مەرجێ کە ئەوان جەنگیان لەگەڵ نەکەن لەو خاکەدا، ئەگەر کردیان ئەوا موسڵمانان ناچارن جەنگیان لەگەڵ ئەکەن‌و ڕەوایە بۆیانجەنگ کردن لەو شوێنە پیرۆزەشدا، بەڵێ ئەبێ جەنگیان لەگەڵ بکەنبە هەرحاڵ‌و لەسەر هەر بارێ مەگەر بڕوا بهێنن‌و بێنە ژێر ئالای ئایینی خوا، ئەو کاتە ئەبێ کۆتاییان لێ بهێنرێ‌و هەر ستەم‌و ناپیاویەکیشیان کردبێ چاوپۆشی لێ ئەکرێ،ئەفەرموێ: ﴿وَاقْتُلُوهُمْ﴾ بیان کوژن، ﴿حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ لە هەر شوێنێ دەستتان کەوتن ﴿وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ وە دەریان کەن لەو شوێنەی کە ئەوان ئێوەیان لێ دەرکرد، واتە هەرکام لەم دووانە: کوشتن‌و دەرکردن بۆتان ڕێك کەوت بەسەریان بێنن.. سوپاس بۆ خوا لە کاتی گرتنی شاری مەککە ئەم دەرکردنە بەدی

هات، ئەوە بوو هەرکەس موسڵمان نەبوو، وە هیچ کام لەو سێ ڕێگەی نەدایە بەر کە پێغەمبەر (ﷺ) داینا بۆ مەککەییەکان، واتە نەچووە ناو کەعبە، وە نە قاپی ماڵەکەی خۆی لەسەرخۆی پێوەدا، وەنەچووەماڵی ئەبوسوفیان، ئەوکەسانەناچاربوون بەدەرچوون لەمەککە.

لە (ئیبن و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە -خوایان لێ ڕازی بێ- کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بە بۆنەی چوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی بۆ عەمرە کردن لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بە پێی پەیمان و یەك کەوتنی ساڵی شەشەم لە حودەیبیەدا، جا کاتێ کە نیازی ئەوەیان کرد موسڵمانان مەترسیان کرد کە قورەیش پەیمانەکە بشکێنن و ڕێگەی ئەوەیان نەدەن و جەنگیان لەگەڵ بکەن، وە ئەمانیش پێیان ناخۆش بوو کە جەنگ بکەن لەو مانگەداو لەو شوێنە پیرۆزانەدا کە هەر لە کۆنەوە قەدەغە بووە جەنگ کردن تیایاندا، ئینجا خوا بەم ئایەتانە ئیزنی دان و فەرمانی دا بەو جۆرەی کە گوترا... بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار خوا ئیزنی ئەم جەنگ و کوشتن و دەرکردنەی دا، وە دەست نیشانی بۆ کردن کە ئەوەی بەسەریان بێنن شتێکی ڕاست و ڕەوایە، چونکە ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ ئەو بتپەرستی و بێبڕوایی‌یەی کە ئەوان ئەیکەن لەو شوێنەدا پیس ترو خراپترە لە کوشتن تیایدا، وە بەرگری کردنی شتی زۆر خراپ بە کردەوەیەك کە کەمتر خراپ بێت شتێکی ڕاست و ڕەوایە، هەندێ لەزانایان بەو جۆرە وشەی ﴿وَٱلْفِتْنَةُ﴾ تەفسیر ئەکەنەوە، بەڵام زۆربە ئەفەرموون: مەبەست پێی ئەو هەموو سزاو ئازارو دەرکردنەیە کە بت پەرستەکان کردیان دەربارەی موسڵمانەکان بۆ لادان و بەرگری کردنیان لە ئایینی ئیسلام، کە بێگومان ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەترە لە کوشتن، چونکە ئەوە دەست درێژییە بۆ سەر ئایین و عەقیدەی ئیسلام کە پیرۆزترین وبەنرخترین شتە لە هەردوو جیهاندا، بەڕاستی ئەم تەفسیرە وەك زۆربەی لەسەرە، هەروەها باشتر ئەچێتە دڵەوە، چونکە لەسەر ئەم بارە دەست ئەدات بۆ ئەوەی کە بکرێ بە یاساوبڕیارێکی گشتی لێ وەرئەگیرێ بۆ هەموو کات و چەرخ و شوێن و وڵاتێك، واتە هەرکات و لە شوێنێك لەلایەن هەر تاقم و هەرکەسێکەوە ئەو کردەوە پیسەکرا، ئیتر بەهەر جۆرو شێوەیەك، ئەوحەلەڕاست وڕەوایەجەنگ لەگەڵ ئەودەست درێژی کەرە وکوشتن و ئاوارەکردنی،

وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾
فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا
عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ

---

ئینجا تەنیا شوێنێك دەر ئەكات لەو بڕیارە، ئەویش بە مەرجێ خۆی ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ جەنگیان لەگەڵ مەكەن لەخاكی حەرام دا ﴿حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ﴾ هەتا ئەوان جەنگتان لەگەڵ نەكەن تیای دا ﴿فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ﴾ ئینجا ئەگەلا ئەوان جەنگیان لەگەڵ كردن تیای دا ئەو حەلە بیاُن كوژن ﴿كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئا بەو جۆرەیە تۆڵەی بێبڕواكان، واتە ڕەوایە كردەوەیان لەگەڵ بكرێ بە وێنەی كردەوەی خۆیان ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئینجا ئەگەر كۆتاییان هێنا لە بێبڕوایی و ئەو بارەی كەوان لەسەری، بێگومان خوا لێ بوردەو لێ خۆش بووی بەزەیی دارە، واتە تەوبەیان لێ وەرئەگرێ و جەنگیان لەگەڵ ناكرێ، ئینجا مەبەست لە جەنگ و كوشتارەكەمان بۆ ڕوون ئەكاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ جەنگیان لەگەڵ بكەن هەتا بێبڕوایی و هاوبەش دانان بۆ خوا نەمێنێ كە مایەی هەموو تاوان و تێك چوون و لادان و لاریەكە لە وڵات و لە جیهاندا، وە هۆی ڕێ گرتنە لە ئیسلام و سزاو ئازار دانی موسڵمانان ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ﴾ وە هەتا ئایین و پەرستن تایبەتی بێت بۆ خوا هەر خوا بپەرسترێ، ئەمەی كە گوترا لەسەر ڕای (قتادە) و (سددی) و چونكە كەسێكی ترە، ئەم ئایەتە دەربارەی مەككەییەكان هاتووە بە تێكڕایی، چونكە بت پەرستەكانی عەرەب هیچ شتێ تریان نیە، بەڵكو یان كوشتن یان موسڵمان بوون، وە هەندێ ئەفەرموون: هەرچەند ئەم ئایەتانە لە یەكەم جارەوە دەربارەی مەككەیەكان هاتوون، بەڵام شێوەیەكی گشتیان لێ وەرئەگیرێ و مەبەست بە وشەی ﴿فِتۡنَةٞ﴾ ڕێ گرتنە لە ئیسلام و سزاو ئازار دانە لەسەر ئیسلام، واتە جەنگیان لەگەڵ بكەن، هەتا هیچ هێزێك نەبێ بەرگری ئیسلام بكات و سزاو ئازار بدات لەسەر ئیسلام، وە ئەم ڕایە ـ وەك لە پێشەوە دەست نیشانی بۆ كرا ـ ڕایەكی زۆر پەسەندەو باشتر ئەچێتە دڵەوە، چونكە لە هەموو كات و چەرخێكدا، هێزی

شەڕ هەیە کە ئەوەستێ بەرامبەر بە ئیسلامو ئەیەوێ ڕێی لێ بگرێ بە هەر جۆر کەلە دەستی بێت، وە ئەبێ موسڵمانانیش بەرامبەر بەوە هێزێك فەراهەم بێنن بۆ شکاندنی ئەو هێزی شەڕە، وە لەبەرئەوەیشە جیهادو تێکۆشان لەڕێی خوادا پێویست کراوە بە هەمیشەیی و کراوە بە فەرزێ لە فەرزەکانی ئیسلام تا ڕۆژی دوایی، وەك لە حەدیسی صەحیحدا ئەفەرموێ و بڕیاری هەموو پێشەواو زانایانی ئیسلامیشی لەسەرە، ئینجا لەسەر ڕای یەکەم پێویست کرا کە جەنگ و کوشتار بەکار بهێنرێ لەگەڵ ئەو بت پەرستەکانە هەتا بت پەرستی نەمێنێ لە مەککەو دەوروبەری، وە هەموو موسڵمان ئەبن، وە هەروەها لەپاش ئەوە تا بت پەرستی نەمێنێ لەتەواوی نیوە دوورگەداو ئایینی تر نەمێنی بێجگە لە ئایینی خوا، وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە نابێ لە نیوەدوورگەدا دوو ئایین بمێنێتەوە، کە ئەوەش شتێکی زۆر ڕاستەو بەرژەوەندی تێدایە:

یەکەم: مەککەو دەوروبەری تا هەموو نیوە دوورگە پایتەختی ئیسلامەو دراوسێی یەکەمی ماڵەکەی خوایە کە دانرا بۆ هەموو ئادەمی، کەواتە نابێ ئایینی دژی ئەو ماڵە لەو خاکەدا بێ.

دووەم: ئەم ئایینی ئیسلامە هات بۆ هەموو جیهان و جیهانیان، کەواتە ئەبێ لە سنوورێك دا نەوەستێ بەرەبەرە بڕوا، دەی چۆن پێش چاك کردنەوەی دەوروبەری خۆی بڕوا بۆ وڵاتانی تر؟! چۆن دوژمن بەدەوری خۆی دا بەجێ بهێڵێ و پەل بهاوێژێ بۆ شوێنی تر؟ بێگومان کاری وا پێچەوانەیە، جا لەبەرئەوە یەکێ لە وەسیەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بوو کە نیوە دوورگە پاك بکرێتەوە لە بت و بت پەرستی، وە سوپاس بۆ خوا بە ماوەیەکی زۆر کەم ئەو وەسیەتە پیرۆزە بەدی هێنرا، لەسەر ڕای یەکەم بەو جۆرە ئەڵێن، وە لەسەر ڕای دووەم ئەبێ بڵێین: ئەبێ جەنگ و کوشتار بکرێ لەگەڵ بێبڕوایان دا بەنیازی ئەوە کە ڕێگر نەمێنێ لە ئیسلامو موسڵمانان و ئایین و خوا پەرستی هەر بۆ خوا بێت، ئەبێ بەم نیازەو لەبەرئەوە جەنگ بکرێ ئیتر با ئەو مەبەست و نیاز کراوە بەدی نەیەت لە هەموو کات و لە هەموو شوێنێك دا، یان ئەڵێن: مەبەست ئەوەیە جەنگ بکرێ تا ئیسلامو موسڵمانان سەر ئەکەون و هیچ هێزێك نەتوانێ بەرگریان بکات و هەموو مل کەچ ببن بۆ یاساو ڕژێمەکەی ئیتر

با هەندێ بڕوای پێ نەهێنن، بە هەرحاڵ بەم جۆرەی کە گوتمان ڕێی ڕەخنە گر نامێنێ کە بڵێ: لەم ئایەتەدا وا وەرئەگیرێ کە هەموو ئەبن بە خوا پەرستو ئایینی تر نامێنێ، کەچی ئەو هەواڵە تا ئێستا بەدی نەهاتووەو لەوانەشە هەر بەدی نەیەت، بێجگە لەمانەش ئێمەی موسڵمان ئەتوانین بە هەموو هێزو دڵنیاییەك بڵێین: ئەو مەبەستە بەدی دێت لەو چەرخەدا کە عیسا پێغەمبەر (ﷺ) دێتە خوارەوە، کە ئەو حەلە هەموو کەس شوێنی ئایینی ئیسلام ئەکەوێ، وەك لە چەند حەدیسێکدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، یەکێ لەوانە ئەم حەدیسەیەکە (ئیمامی مالیك)و (بوخاری)و (موسلیم)و (ئەبو داود) ئەیهێنن لە (ئەبو هورەیرە)وە –خوا لێی ڕازی بێ– کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (والذي نفسي بيده ليوشكن ان ينزل فيكم ابن مريم حكماً مقسطاً فيكسر الصليب، ويقتل الخنزير، ويضع الجزية، ويفيض المال حتى لايقبله أحد، حتى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا وما فيها) سوێند بە کەسێك کە گیانی منی بە دەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ ناوتان بە حەکەمێکی دادپەروەر، ئەو حەلە صەلیب ئەشکێنێ، وە جڵەو گیری ئەکات لە خواردنی گۆشتی بەراز، وە سەرانە لائەبات ـ بەم ڕەنگە ڕازی نابێت لە هیچ کەس بە موسڵمان بوون نەبێت ـ وە سامانو دارایی زۆر ئەبێت تا ڕادەیەك هیچ کەس لە کەسی وەرناگرێ، وەتا ئەو ڕادەیە تەنیا سوژدەیەك بۆ خوا چاکترە دەبێ لای مەردوم لە جیهانو هەرچی وا لە جیهاندا، بێبڕواو دوژمنەکانی ئیسلام تا بەو جۆرە بن کە باس کران، ئەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ، ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡا۟﴾ کەواتە ئەگەر کۆتاییان هێنا لەو بارو کردەوەی کە لەسەری بوون، ئەو حەلە نابێ جەنگیان لەگەڵ بکرێو دەست درێژیان لێ بکرێ، چونکە ﴿فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِینَ﴾ هیچ دەست درێژیو تۆڵەیەك ڕەوانیە مەگەر بۆ سەر ستەمکاران، وە ئەوانەش ئەو حەلە بەو ستەمکارە دانانرێن کە جەنگیان لەگەڵ بکرێ، بێگومان تۆڵە سەندن لە ڕاستو ڕەوایەو هیچ دەست درێژی نیە، وە ناوبردنی بە دەست درێژی لێرەدا بە پێی یاسایەکە لە یاساکانی عیلمی ڕەوان بێژی کە ناو ئەبرێ بە (مشاكلة ومزاوجة) کە بریتیە لە بەکار هێنانی وتەو وشەیەك لە پێشەوە لە ماناو مەبەستی ڕاستەقینەی خۆی دا، ئینجا بەبۆنەی ئەوەوە بەکار بهێنرێ بە چاو لێگەری بۆ ماناو مەبەستێکی دژی مەبەستە

پێشووەکە، وەك ئەفەرموێ: (وجزاء سيئة سيئة مثلها) تۆڵەی خراپە خراپەیەکە بە وێنەی ئەو... لەگەڵ ئەوەدا تۆڵە سەندن بە وێنەی تاوان هیچ خراپ نیەو بەڵکو دادو ڕاستە.

لەپێشەوە باسی حوکمی جەنگ‌و کوشتاری کرد لە خاکی حەرەم دا، ئینجا ئەوا باسی حوکمی جەنگ ئەکات لە مانگە بەڕێزەکان دا کە جەنگ قەدەغەبوو تیایاندا، ئەفەرموێ: ﴿ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ سەبارەت بە هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە دوو ڕا هەیە:

١- لە (ئیبن‌و عەباس)و (مجاهد)و (ضحاك)ەوە کە ئەفەرموون هاتە خوارەوە بەبۆنەی ڕووداوی ساڵی شەشەمی کۆچی کە بەناوبانگە بە سوڵحی حودەیبیە، کە ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەو کۆمەڵە لە هاوەڵەکانی نیازیان کرد بچن بۆ مەککە بۆ زیارەتی ماڵی خواو بەجێهێنانی عومرە، ئینجا کە گەیشتنە حودەیبیە مەککەییەکان بەرهەڵستیان وەستان‌و سووکە جەنگێکیان لەگەڵ کردن، بە بەردو بەرگریان کردن لە چوون بۆ مەککە، لە پاش دا یەك کەوتن لەسەر چەند بەندێك یەکێ لەوانە ئەوە بوو کە ئەو ساڵە بگەڕێنەوەو ساڵی داهاتوو بێن‌و ئەوانیش مەککەیان بۆ بەجێ بێڵن تاماوەی سێ ڕۆژ، ئینجا بە پێی ئەو پەیمانە لە ساڵی حەوتەم دا هاتنەوە لە مانگی (ذي القعدة)دا، وە موسڵمانەکان مەترسیان کرد لەوەی کە بێبڕواکان پەیمانەکە بشکێنن‌و جەنگیان لەگەڵ بکەن‌و ئەمانیش نەتوانن جەنگ بکەن، چونکە لەو مانگانەدا جەنگ کردن قەدەغە بووە.

٢- لە (حەسەن)ەوە کە ئەفەرموێ: بێبڕواکان بیستیان کە خوا جڵەوگیری کردووە لە جەنگ لەو مانگە پیرۆزانەدا، ئینجا ویستیان ئەوە بکەن بە هەلێك بۆ خۆیان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانەکان لەو مانگەدا، چونکە لایان وابوو کە موسڵمانەکان هەرگیز جەنگ ناکەن لەو کاتانەدا، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کەواتە با لەسەر هەردوو ڕاکە تەفسیری ئەم ئایەتە بکەینەوە: لەسەر ڕای یەکەم: ئەڵێن خوا ئەفەرموێ: ئەم مانگە ڕێزداری ئەم ساڵە لە باتی مانگە ڕێزدارەکەی پێشوو، هەرچۆنێ ئەوان لە ساڵی پێشوودا ڕێزمان نەگرت، ئەوا ئێوەش ئەم ساڵ بە زۆر دێن‌و گوێ نادەن،

وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٩٥﴾

---

﴿وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ﴾ وە ئەو مانگە بەڕێزەو ئەو شارە بەڕێزەو ئەو ئیحرامە بەڕێزەی کە ئەوان لە ساڵی پێشوودا ڕێزیان نەگرتن‌و هەتکیان کردن‌و گوێیان نەدا بە ئێوە، تۆڵەیان ڕەوایە بە وێنەی کردەوەکەی ئەوان، بەم ڕەنگە ئێوەش لەم ساڵەدا گوێ نادەن بەوان‌و بەزۆر دێنە مەککە، وە لەسەر ڕای دووەم: ئەفەرموێ: مانگی بەڕێز لە باتی مانگی بەڕێزدا، واتە هەرکەس خوێن ڕشتنی ئێوەی ڕەوا داو جەنگی لەگەڵ کردن لەمانگی ڕێزو قەدەغەدا، ئێوەش خوێن ڕشتن‌و جەنگ‌و کوشتار ڕەوا بدەن تیای دا، وە ئەو شتانەی کە ڕێزیان هەیەو هەتك‌و شکاندنیان قەدەغەیە تۆڵە سەندنیان ڕەوایە بە وێنەی کردەوەی دەست درێژی کەر، لەسەر هەربار ئەوا مەبەستەکە ڕوون‌و بەهێز ئەکات‌و دڵنیایی ئەکات لەسەر ڕاست‌و ڕەوایی کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ کەواتە هەرکەس دەست درێژی کردە سەرتان ﴿فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ ئێوەش ڕەوایە بۆتان تۆڵەیان لێ بسێنن بە وێنەی دەست درێژی ئەو کەسە بۆ سەرتان ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە لە خوا بترسن‌و خۆتان بپارێزن لە کاتێکدا کە تۆڵە ئەسێنن، کارێ نەکەن کە ڕەوا نیەو خوا پێی ناڕازیە ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ وە بزانن کە خوا لەگەڵ لە خواترس‌و خۆپارێزەران دایە بە کۆمەکی کردن‌و یارمەتی دان.

بێ‌گومان تێکۆشان لە ڕێی خوادا هەرچۆنێ پێویستی بە پیاو هەیە، پێویستی بەماڵ‌و سامانیش هەیە، وە لە چەرخی یەکەم دا تێکۆشەری موسڵمان ئەچووە مەیدان بەخۆی‌و هەموو تێشووو کەرەسەو چەك‌و پێویستیەکی جەنگ‌و تێکۆشانەوە، کاتێ کە دەسەڵاتی ببوایە... لەو کاتەدا تێکۆشان‌و جەنگ بەکرێ‌و بە مووچە خۆری نەئەکرا، بەڵکو بەخۆشی‌و خواهیش‌و بە ئارەزوو گیان‌و ماڵ بەخت ئەکرا لەڕێی خوادا، کە ئەوەش شتێکە بە ئاسانی عەقیدەو بڕوای ڕاست پێکی ئەهێنێ، کاتێ کە ڕژێم لەسەر بنەڕەتی ئەو بڕواو عەقیدەیە دامەزرابێت! بەڵام زۆر لە موسڵمانەکان ئەو حەلە بێ نەواو دەسەڵات بوون، وە وەك قورئان بۆمان باس ئەکات هەندێ لەو بێ‌دەسەڵات‌و هەژارانە ئەچوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)

داوایان لی ئەکرد کە وڵاغی سواریان پێبدات کە بیان گەیەنێتە مەیدانی جەنگ کەلەبەر دووری نەیان ئەتوانی بچن بۆی، ئینجا ئەگەر ئەویش لە دەستی دا نەبوایە هیچیان پێبدات، ئەو موسڵمانانە ئەگەڕانەوە بە گریانەوەو فرمێسک هۆنەی ئەکرد یە چاوەکانیاندا لە داخی ئەوەی کە هیچیان دەست ناکەوێ! جا لەبەرئەوە تەمێ و ئامۆژگاری زۆر هاتووە لە قورئانو حەدیسدا سەبارەت بە بەخت کردنی ماڵو سامان لەڕێی خوادا، بەخت کردن بۆ ڕێك خستن و بەڕێ کردنی تێکۆشەرانی ڕێگە خوا، وەلە زۆربەی شوێندا بانگ کردنی بۆ ماڵ بەخت کردن جووتو هاوسەر کراوە لەگەڵ بانگ کردن بۆ تێکۆشانو فیداکاریو گیان بەخت کردن.

جا لەبەرئەوە بەخت نەکردنی ماڵ دانراوە بە تیاچوونو هۆی لەناو چوون بۆ موسڵمانانو جڵەوگیری کراون لیی لەم ئایەتەدا: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ماڵ بەخت کەن لەڕێی خوادا ﴿تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾ وە خۆتان مەخەنە ناو نەمانو تیاچوون، واتە بەدەستی خۆتان لەناو مەبەن بە خەریك بوون بە زۆر کردنی ماڵو سامانو دەست گرتنەوە لە بەخت کردنی لە ڕێی خواداو وازهێنان لە تێکۆشان بە ماڵو بەگیان لە ڕێی ئیسلام دا کە ئەوەش هۆی نەمانو تیا چوونە، تیاچوونی دەروون بە چاو برسیەتیو چرووکی، وە تیا چوونی گەلو کۆمەڵ بە بێ دەسەڵاتیو لاوازی، وە تیا چوون لە هەموو بارو ڕوویەکەوە بە زاڵ بوونو سەرکەوتنی دوژمن کە سەرئەنجامو بەرهەمە بۆ واز هێنان لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا ئەم ڕستەو وتەیە بە چەند جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە کە ئەوانیش هەر ڕاستەو ئەگونجێن، بەڵام جێو شوێنەکە یارمەتی دەرە بۆ هەڵبژاردنی ئەوەی کە گوترا، وە هەروەها ڕیوایەتێك کە بەناو بانگەو بڵاوبووەتەوە لە کتێبەکانی تەفسیردا، وە چەند کەسێك هێناویانە لە (ئەبو عمران)ەوە کە ئەفەرموێ: ئێمە لە ئەستەمبووڵ بووین، ئینجا کۆمەڵو لەشکرێکی گەورە بۆمان هاتو یەکێ لە موسڵمانان پەلاماری داو خۆی خستە ناو کۆڕو کۆمەڵەکەیان، ئینجا مەردوم وتیان: ئەوا خۆی خستە ناو نەمانو تیاچوونەوە، واتە کارێکی ناڕاستی کرد ــ مەبەستیان دەست نیشان بوو بەو جڵەوگیریەی کەلەم ئایەتەدا کراوە لە موسڵمانان ــ ئینجا لەوێدا (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری) هەستاو فەرمووی بەوانەی کە ئەو قسەیان کرد: ئێوە ئەم ئایەتە تەفسیر ناکەنەوە لەسەرباری ڕاستەکەی خۆی، بەڵکو لای ئەدەن، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە سەبارەت بە کۆمەڵی ئێمە کە ئەنصارین، کاتێ کە ئایینی خۆی زاڵکردو لەشکرو یارمەتی دەری زۆر بوو، هەندێ لە ئێمە ماڵو سامانمان ڕۆیی و لە دەستمان چوو، وە خوا ئیسلامی زاڵ کردو یارمەتی دەری زۆر بوو، هەندێ لە ئێمە بەنهێنی گوتی بە هەندێکی

ترمان: بێگومان ئێمە ماڵو سامانمان ڕۆیی و لە دەستمان چوو، وە خوا ئیسلامی زاڵکردو یارمەتی دەری زۆر بوو، کەواتە با ئێمە بوەستین بەدیاری ماڵەکانمانەوەو هەوڵو بدەین ئەوەی کە تیا چووە پەیدای بکەینەوە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کەواتە ئەو تیا چوونو نەمانە ئەو هەوڵ دانو خەریك بوونە بوو کە ئێمە نیازمان کردو ویستمان واز بێنن لە تێکۆشان لەڕێی ئیسلام دا، ئینجا فەرمان ئەدات بە بەرز بوونەوەی موسڵمانان بۆ ڕادەو پلەیەکی بەرزتر ئەفەرموێ: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْ﴾ کردەوەکانتان بە چاکی بکەن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ چونکە بێگومان خوا ئەو چاکەکەرو کردەوە چاك کەرانەی خۆش ئەوێ، جا لەبەرئەوە خۆش بەختی بۆ کەسانێ کە خوا خۆشی بوێنو لە قورئان دا هەواڵ بدا بەو خۆش ویستنەیان!!

ئەم ڕستەو وتەیەش بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام چاکتر ئەوەیە بە جۆرێ تەفسیری بکەینەوە کە ڕێك بێتو دەقی ئەو حەیسە بێت کە (ئیمامی بوخاری)و (موسلیم) هێناویانە لە خەلیفەی دووەمەوە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەو حەدیسە درێژەی کە (جوبرەئیل) - سەلامی خوای لێ بێ - چەند پرسیارێکی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)، یەکێ لە پرسیارەکانی ئەمە بوو گوتی: ئیحسان چیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئیحسان ئەوەیە کە تۆ خوا بپەرستی بە جۆرێ وەك خوا بە چاو بینی، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نابینی، بێگومان ئەو تۆ ئەبینێ، بێگومان ئەوە بەرزترو پیرۆزترین ڕادەو پلەیە، وە هەرکات بەندەی پێ گەیشت، ئەو حەلە فەرمانبەری ئەبێت بۆ هەموو فەرمانەکانی خوا، وە کۆتایی ئەهێنێ لە هەموو جڵەوگیرییەکانیو دوور ئەکەوێتەوە لە هەموو قەدەغەکانی، وە هەمیشە چاودێری زانینی خوا ئەکات لە ئاشکراو پەنهانی دا، ئا بەم فەرمانو فەرموودەیە کۆتایی هێنا لێرەدا بە ئایەتەکانی تێکۆشانو فیداکاری بە ماڵو گیان، ئینجا باسی حەجو عومرە دێتە پێشەوە، وە پەیوەندیو پەیوەستی باسەکان لەم بە شەیش دا ئاشکرایە کە هێنای لە باسی پرسیار لە مانگە یەك شەوەکانەوە کە مەبەستێ لە مەبەستەکانیان دیاری کردنی کاتی حەج بوو، ئینجا بەو بۆنەیەوە هاتە سەر باسی جەنگو کوشتار لە مانگە بەڕێزەکان دا کە سیانیان مانگەکانی حەجن، وە هەروەها باسی جەنگ کردن لەخاکی حەرەمدا تا لە کۆتایی دا هاتە سەرباسی حەجو عەمرەو نیشانەکانی خوا پەرستی تیایاندا،

ئەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ ڕای زانایان جیاوازە لەبارەی ئەمەوە ئایا حەج بەم ئایەتی ئێرە پێویست کرا یان بە ئایەتی سورەتی ﴿آل عمران﴾ کە ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ﴾ جا بەگوێرەی ئەوە ڕایشیان جیایە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، بەم جۆرەی کە دێت ئەو کەسە ـ وەك شافیعیو شافیعیەکان ـ کە لایان وایە ئەم ئایەتە حەج فەرزو پێویست کرا، لە تەفسیرەکەی دا ئەفەرموون: حەجو عومرە بەجێ بێنن بە تێرو تەواوی لەبەر خواو هەڵسن پێیان بە هەموو مافێکیانەوە، وە لەسەر ئەم ڕایە عومرەیش وەك حەج فەرزو پێویستە لەسەر توان هەر بەم ئایەتە، وە ئەو کەسانەی وەك (مالیکیو حەنەفیەکان) کە لایان وایە حەج بەم ئایەتە فەرزو پێویست نەکراوە، ئەفەرموون: کاتێ دەستتان کرد بە حەجو بە عومرە تەواویان بکەن لەبەر خواو مەیان بڕنو دەستیان لێ هەڵمەگرن تالێیان ئەبنەوە، وە لەسەر ئەم ڕایە ئەم ئایەتە هەر ئەمە ئەگەیەنێ کە حەجو عومرە کاتێ دەستیان پێ کرا ئەبێ تەواوبکرێن، نەك پێویست کردنیان لەیەکەم جارەوە، ئینجالەبەر ئەوەی ئایەتی ﴿آل عمران﴾ باسی عومرەی تێدا نیە، وە لەبەر چەند حەدیسێکیش کە بەڵگەن لەسەر پێویست نەبوونی عومرە، لەبەرئەوەی خاوەنی ئەم ڕایە عومرە بە فەرزو پێویست دانانێن، بەڵکو ئەفەرموون: سوننەتە، باسی چۆنێتی حەجو عومرە بەدرێژی کراوە لە کتێبەکانی فیقهدا، کەواتە لێرەدا پێویست نیە لەو بارەیەوە بدوێین، ئەگەر دەسەڵاتو توانا بوو ئەبێ حەجو عومرە بەجێ بێنن بەو جۆرە کە باس کرا، ئینجا بۆ کاتی نەتوانینو بێ دەسەڵاتی فەرمانی خوا بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ﴾ ئینجا ئەگەر بەرگری کران لەبەجێ هێنانی حەجو عومرە لەلایەن دوژمنەوە، وەك (مالیکیو شافیعی) ئەفەرموون، یان بەهەر جۆرو هۆیەکی تریش وەك (حەنەفی) لەسەرەو ئێوەش لە ئیحرام دا بوونو ویستتان بیشکێنن﴿فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ﴾ ئەوە پێویستە لەسەرتان سەربڕینی ئەوەی کە ئاسانەو بە سووك دێت بە دەستتانەوە لە حوشتر یان ڕەشە وڵاخو یان مەڕو بزن، سەربڕینی لەو شوێنەدا کە بەرگری کراون، وەك بەو جۆرە ڕووی دا لە ساڵی شەشەمی کۆچی دا لە حودەیبیە، ئیتر ئایا لەخاکی حەرەم دا بووبێ یان نە ؟ کۆمەڵی لەزانایان ئەفەرموون: ئەبێ هەر لە خاکی حەرەمدا بێت، وە ئەوشوێنەی کە سەربڕینی تێدا کرا لەساڵی ناوبراودا وە بەشێ لە حودەیبیە کەلە خوارووی مەککەوە بەر خاکی حەرەم کەوتبوو،

وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖۚ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ

---

وەك باشتر ڕوونی ئەکەینەوە لەکاتی تەفسیری ئەم فەرموودەیەدا: ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ﴾ وە سەرتان مەتاشن، واتە ئیحرام مەشکێنن ﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ﴾ هەتا ئەوەی کە ئەتانەوێ سەربڕرێت ئەگاتە کاتی سەربڕینی، کە کاتی بەرگری کردنەکەیە ئیتر لە خاکی حەرەمدا بێت یان نا، یان هەتا ئەگاتە شوێنی سەربڕینی کەئەو شوێنەیە بەرگریەکەی تێدا کراوە، ئیتر خاکی حەرەمەیان نا، وەك (شافیعی)و کۆمەڵێك ئەفەرموون، یان ئەگەر ئەو شوێنە حەرەم نەبوو ئەبێت بنێرێت بۆ خاکی حەرەمو ڕۆژێك لێی بوەستن تا گومانی بەهێز پەیدا ئەبێ بە گەیشتن و سەر بڕینی لە شوێنی خۆی دا، ئەو کاتە ئیحرام ئەشکێنێ، ئەمەش بەلای حەنەفی و کۆمەڵێکەوە.

بەکورتی ئەو بەرگری کراوە ئەبێ ئیحرام نەشکێنێ تا ئەو سەربڕینە بەجێ یێت، مەگەر لەکاتێکدا پێویستی ببێ بە سەرتاشین لەبەر عەر هۆیەك کە لەم فەرموودەیەدا باسی ئەگات: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ ئینجا هەرکام لە ئێوە نەخۆش بوو ﴿أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ﴾ یان ئازار سزایەك ببێ لە سەریان، وەك زام، یان ڕشكو ئەسپێ، یان سەر ئێشان: ﴿فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖۚ﴾ ئەوە ئەتوانێ سەر بتاشێ و ئینجا لەسەریەتی فیدیە بدات بە شەش هەژار هەریەکی نیو ساع لە خۆراکێ کە زۆرتر ئەخوڕێ لەو شوێنەدا، یان مەڕێك یان بزنێك سەربڕێ و دابەشی بکات بەسەر هەژارانی ئەو شوێنەدا، وەك بەو شێوە دیاری کراوە لە حەدیسی (کەعبی کوڕی عجرە)دا کە (بوخاری)و (موسلیم)و (نەسائی)و (ئیبن و ماجە)و (ترمزی) ڕیوایەتیان کردووە لێیەوە، وە فیدیە دەر هەرکام لەو سیانە ئەکات ئارەزووی خۆیەتی و خراوەتە دەستی خۆێ، لێرەدا دوایی دێت حوکمو بڕیاری بەرگری کراو لە کاتی بەرگری کرانی دا، بەلای زۆربەی زانایانەوە، بەڵام هەندێ ئەفەرموون: حوکمو بڕیاری ئەو هەر بەوە دوایی دێت کەفەرمووی: ﴿فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ﴾ وەرستەی ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ﴾... هتد، بەستراوو پەیوەستە بە ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ﴾ وە حوکمو بڕیارێکی تازەی گشتی تێدایە لە حوکمو بڕیارەکانی حەج و عومرە، وە هەروەها ڕستەی ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم﴾ ...هتد، واتە حەج و عومرە بە

تـەواوی بـەجێ بێـنن لەبـەر خـوا، وە ئیحرامەکـەتان مەشـکێنن هـەتا ڕۆژی جـەژن و وای سەربڕینی چوار پێ و ماڵاتێ کە ئەتانەوێ لەوێ سەری بڕن، ئیحرامەکەتان مەشکێنن تا ئەو کـات و شـوێنە، مەگـەر دووچـاری نەخۆشـی یـان ئـازارو سـزایەك بـن، ئـەو حەلـە ئـەتوانن بیشکێنن و فیدیەی بۆ بدەن بەو جۆرو شێوەی کە باس کرا، هەرچۆنێ لێرە بەدواوە بۆ باسی حوکم و بڕیارێکی گشتی تازەیە بۆ هەرکەسێك کە ڕێی لێ نەگیرێ بۆ حەج و عومرە، ئیتر ڕێ لێ گیراو بێت بەرەڵا کرابێت یان هەر بەرەڵا بووبێت، ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمۡ﴾ ئینجا کاتێ کە مەترسیتان نەبێ یان کاتێ کە مەترسیتان نەما و بەرەڵا بوون لەبەرگری ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ﴾ ئەو حەلە هەرکەس ویستبێتی سوودو خۆشی وەرگرێ بە خواپەرستی بە عومرە کردن لە پێش حەجدا تاکاتی حەج، وە هەر لەو سەفەرەدا لە مانگەکانی حەجدا عومرەو حەج بەجێ بێنێ ئەوەش بەم ڕەنگە بەو نیازەوە ئیحرامی بەستبێ یان ئیحرامەکەی بە عومرە بکات، یان بە هۆی عومرەوە بە خۆشی ڕابوێرێ، بەم ڕەنگە کە گەیشتە مەککە تەواف و سەفاو مەروە ئەکات و ئینجا ئیحرام ئەشکێنێ و ئەو شتانەی کە قەدەغە بوون لەسەری بەهۆی ئیحرامەوە ئەیان کات تا کاتی حەج، ئینجا هەر لە مەککە ئیحرام ئەبەستێ بۆ حەج، هەرکەس بەو جۆرە ئەکات ﴿فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ﴾ پێویستە لەسەری سەربڕینی ئەوەی کە ئاسانەو بە سووك دێت بەدەستیەوە، ئیتر حوشتریان ڕەشە وڵاخ یان مەڕ یان بزن لە باتی ئەو سوودو خۆشیەی کە دەست کەوتی نەبێت، ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئیحرام بەستنی خۆی و لەوێ ئیحرام دانەبەستێتەوە، شێوەو جۆرێ تر لەسوودو خۆشی وەرگرتن بە عومرە ئەمەیە: هەر لە یەکەم جارەوە ئیحرام دابەستێ بە نیازی حەج و عومرە ئەمیش بە مەرجێ لە مانگەکانی حەجدا بێت کە شەوال و (ذي القعدة) و دە ڕۆژی یەکەم لە مانگی قوربان کەلە شەرعدا ناو ئەبرێ بە (قران)، واتە کۆکردنەوەو هاوسەرکردنی حەج و عومرە بەجارێ، ئەم جۆرە شێوەیش وەك لە ئایەتەکەوە وەر ئەگیرێ، هەروەها حەدیسیش ڕوونی ئەکاتەوەو زانایانی ئیسلامیش بڕیاریان لەسەری هەیە، وە ئەمیش وەك یەکەم جۆر پێویستە ئەو کەفارەت و فیدیەی بۆ بدرێ، چونکە بە جارێ حەج و عومرەی لەسەر نامێنێ، بەڵام لەمەدا جیاوازە کەلە پێشووەکەدا ئیحرامی نابێ بشکێ تا لە هەموو کردەوەکانی حەج ئەبێتەوە. بەکورتی حەج و عومرە لە مانگەکانی حەجدا بەسێ جۆر بەجێ ئەهێنرێ:

یەکەم و دووەم: ئەو دووانە بوون کە گوتران.

فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ

---

سێیەم: کە ناو ئەبرێ بە (إفراد) ئەمەیە: لەیەکەم جارەوە ئیحرام دابەستێ بە نیازی حەجی تەنیا، وە هەموو کردەوەکانی حەج بەجێئەهێنێ و لە پاش تەواو بوون، ئینجا ئیحرامێکی تایبەتی ئەبەستێ بە نیازی عومرە لە دەرەوەی خاکی حەرەم دا، ئینجا دێتەوە مەککەو تەواف و سەفاو مەروە ئەکات ئینجا ئیحرامەکەی ئەشکێنێ بە تاشینی سەریان کورت کردنەوەی مووی سەر بەو شێوەکە لە کتێبەکان دا باس کراوە، ئەمەیان هیچ فیدیەو کەفارەتی نیەو لای زۆربەی زانایان ئەم شێوە گەورەترە ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ ئینجا هەرکەس دەستی نەکەوت یەکێ لەوانە کە سەری بڕێ لەبەر نەبوونی بێ ماڵی یا هیچ کام لەو حەیوانانە دەست نەئەکەوت ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ﴾ ئەو کەسە لەسەریەتی ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەکاتی حەجدا کەباشترئەوەیەئەوسێ ڕۆژە پێش وەستانی عەرەفە بێت ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ وە حەوت ڕۆژی تر کاتێ کە گەڕانەو بۆ وڵاتی خۆیان ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ ئەوە دە ڕۆژی تەواو.

زانایانی ئیسلام لەم مەسەلەدا ڕایان جیاوازە: حەنەفیەکان ئەفەرموون: دانیشتوانی حەرەم هەمیشە لەوێن و نیشتەجێن، لەبەرئەوە هەر حەجیان لەسەرەو عومرەیان نیە. کەواتە ئەم سوود وەرگرتن بە عومرەیەو ئەو شکاندنی ئیحرامە لە بەینی عومرەو حەجدا بۆ ئەوان نیە، جا بەهۆی ئەوەوە فیدیەو کەفارەتیان لەسەر نیە، وە شافیعیەکان ئەفەرموون: عومرەو شکاندنی ئیحرامیان بۆ هەیە بەڵام کەفارەت و فیدیەیان لەسەر نیە، جا لەبەرئەوە ڕایان جیاوازە لە مەبەست بە وتەی ﴿ذَٰلِكَ﴾ لێرەدا کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ بەم جۆرە تاقمی یەکەم ئەفەرموون: ئەو سوود وەرگرتن بە عومرەیەو شکاندنی ئیحرامە بۆ کەسێکە کە ماڵ و خێزانی ئامادەو نیشتەجێی حەرەم نەبن، واتە ئەو کەسە خەڵکی حەرەم نەبێت، لەسەر ئەم ڕایە مەککەییەکان ئەو عومرەو شکاندنەیان بۆ نیەو ئەگەر کردیان فیدیەیان لەسەرەو نابێ لێی بخۆن، وە تاقمی دووەم ئەفەرموون: وتەی ﴿ذَٰلِكَ﴾ دەست نیشانە بۆ ئەو فیدیەو کەفارەت و ڕۆژووە، واتە هەر لەسەر دانیشتوانی وڵاتانە،

کەواتە دانیشتوانی حەرەم ئەو عومرەو شکاندنەیان بۆ هەیە، بەڵام فیدیەو کەفارەتیان لەسەر نیە، ئینجا مەبەست بە دانیشتووی حەرەم هەرکەسێکە کە کەمتر لە دوو قۆناغ دوور بێت لە حەرەمەوە بەلای شافیعیەوە، وە هەرکەسێك کە ماڵی لە دەرەوەی ئەو شوێنانە بێت کە دیاری کراون بۆ ئیحرام دابەستنی وڵاتان بەلای حەنەفیەکانەوە، وە هەرکەسێك کە دانیشتووی مەککە نەبێت بەلای ئیمامی مالیکەوە، ئینجا لێرەدا ئەوەستێ لەباسی حەج و عومرە بۆ ئەوەی بە پێی باوی خۆی ناو بەناو سەرنج ڕاکێشێ و دڵ داچڵەکێنێ و بێداری بکاتەوە بە یادی خواو بیمو ترس لێی و خۆپاراستن لە نافەرمانی و سەرکێشی، ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ وە بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لێی و سەرپێچی نەکەن لە فەرمان و قەدەغەو جڵەوگیریەکانی کە هەندێ لەوانە ئەم فەرمان و بڕیارانە بوون کە لەم باسی حەج و عومرەدا ئاراستەی بڕواداڕانی کردن، ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ وە بزانن کە خوا تۆڵەو سزای زۆر بە تینە بۆ ئەو کەسانەی کە لێی ناترسن و سەرکێش و یاخین لێی، ئینجا بە تایبەتی هەندێ لە بڕیارو ئادابی حەج باس ئەکات و ئەویش دوایی ئەهێنێ بەباسی ئاگاداری خواو لە خواترسی، ئەفەرموێ: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾ کاتی حەج چەند مانگێکی زانراوی ناسراوە: شەوال و ذي القعدة و دە ڕۆژی یەکەم لە ذي الحجة، وەك زۆربە ئەفەرموون: یان هەموو مانگی (ذي الحجة)ش، وەك تاقمێکی لەسەرە کە یەکێکیان ئیمامی مالیکە، واتە حەج ئەبێ هەر لەم ماوەیەدا دەستی پێبکرێ و دوایی پێبهێنرێ و هەموو کردەوەکانی لەکاتی دیاری کراوی خۆیان بکرێن، بەم ڕەنگە لە یەکەم ڕۆژی مانگی شەوالەوە دروستە ئیحرام دابەسترێ بە حەج تا بەیانی شەوی دەهەمی ذي الحجة، وە لە ڕۆژی دەیەم تا ئێوارەی ڕۆژی سیازدە هەموو کردەوەکانی دوایی پێ بهێنرێ مەگەر بۆ ئافرەتێك کە لە حەیزدا بێت، ئەوە ئەوەستێ تا پاك ئەبێتەوە، ئینجا تەواف ئەکات، ئیتر لە هەر ڕۆژێکی ئەو مانگەدا پاك ببێتەوە کەلە بیست و پێنج تێپەڕ نەکات، ئەمە بەلای زۆربەی جەماوەرەوە، وە بەلای تاقمێکی ترەوە کە ئیمامی مالیك لەوانە: دروستە دواخستنی ئەو تەوافە تا دوای مانگ، کەواتە لە پێش هاتنی شەوالەوە ئیحرام نابەسترێ بۆ حەج وەك لەپاش دواهاتنی مانگی قوربان هیچ کردەوەیەکی حەج ناکرێ و دروست نیە، بەڵکو ئەبێ هەر لەو سێ مانگەدا بێت،

فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ

﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ﴾ ئینجا هەرکەس لەوسێ مانگەدا حەجی پێویست کرد لەسەر خۆی، بەم ڕەنگە ئیحرامی دابەست ﴿فَلَا رَفَثَ﴾ ئیتر نەکردەوەی ژن و مێردیو نەباسی ئەو کردەوەو نە قسەی لەق و لۆق هەیە ﴿وَلَا فُسُوقَ﴾ وە نە گوناهو دەرچوون لە گوێڕایەڵی خوا هەیە﴿وَلَا جِدَالَ﴾وەنەدەمەدەمێ وقسە بەشەڕدان هەیە﴿فِي ٱلْحَجِّ﴾ لەماوەو ڕۆژەکانی حەجدا.

هەرچەند هەموو بڕواداری پێویستە هەموو کات دوور بێت لە هەموو گوناهو کارو کردەوەی ناڕاست و ناڕەوا، بەڵام بە تایبەتی ئەبێ لە کاتی حەجدا باشتر خۆپارێزو دووربێت لە هەر گوناهو شتێکی ناڕەوا، چونکە کاتەکە کاتی لێ بڕانە بۆ خواپەرستی، وە کاتی خۆ ڕووت کردنە لە هەموو داخوازو بانگکەرو پاڵ پێوە نەرێکی زەوی دا، وە کاتی ڕام کردن و مۆچاندنی نەفس و ڕیازەی ڕۆحە لەسەر پەیوەندیو پەیوەستی بە خواو پچڕان و لە هەر شتێکی تر، وەکاتی سەرەو تەمێ وەرگرتنە لەوماڵە گەورەی خواو ئەو شوێنە پیرۆزانەدا، کەواتە ئەبێ بڕوادار باشتر خۆپارێزو لەپاش جڵەوگیری کردن لە کردەوەی خراپ، ئینجا کردەوەی چاك خۆشەویست ئەکات لای بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ﴾ هەر چاکەیەك بکەن خوا ئەیزانێ و ئاگادارە پێی. بەڕاستی بەسەر بۆ بڕوادار کە هەست بکات و بیر بکاتەوە لەوەی کە خوا ئاگایە بە هەموو چاکەیەکیو وابە پێش چاوی قودرەتی خواوە. بەسە ئەوە کە ببێ بە هاندەرو پاڵ پێوەنەر لەسەر کردنی چاکە، وە بەڕاستی ئەو هەست و بیر کردنەوە خۆی بە تەنیا پاداشتێکی تایبەتیە پێش پاداشتی ڕۆژی دوایی، ئینجا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ توێشوو هەڵگرتن لەو سەفەرو چوون بۆ حەجەدا، توێشووی لەش و توێشووی ڕۆح... (بوخاری)و (ئەبو داود)و (نەسائی)و (ئیبن المنذر)و (ئیبن و حەبان)و (بەیهەقی) هەواڵی ئەمێنن لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە فەرموویەتی: کۆمەڵێ لە یەمەنی ئەچوون بۆ حەج و هیچ توێشوویان لەگەڵ خۆیان نەئەبردو ئەیانگوت ئێمە پشت بە خوا ئەبەستین، لە پاش دا لەوێ دەستیان ئەکرد بە سواڵ و ئەبوون بە ئەرك بەسەر مەردومەوە،

وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾

---

**به بۆنەی ئەوانەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَتَزَوَّدُواْ﴾ توێشوو هەڵگرن‌و خۆتان بپارێزن لەوەی سواڵ بکەن‌و ببن بە ئەرك‌و بار بەسەر مەردومەوە ﴿فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ چونکە باشترین توێشوو ئەو خۆپارێزی‌و خۆپاراستنەیە.**

**هەندێ ئەفەرموون: مەبەست بە وتەی ﴿ٱلتَّقْوَىٰ﴾ لە خوا ترسی‌و خۆپارێزیە لە نافەرمانی خوا، جا لە پێی ئەوە ئەبێ بڵێین: لە خوا ترسی‌و خۆپارێزی بکەن لە توێشوو بۆ خۆتان، چونکە باشترین توێشوو خۆپارێزیە: ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ وە خۆتان بپارێزن لە من‌و لە من بترسن‌و ترس‌و خۆپارێزیەکەتان تایبەتی بکەن بەمنەوە، ئەی خاوەن ژیرییەکان، ئینجا باسی هەندێ‌تر لە کردەوەو ئادابی حەج ئەکات، وەلە یەکەم جارەوە باسی بازرگانی‌و کرین‌و فرۆشتن‌و خەریك بوون بە دەست کەوتی ئەم جیهانە ئەکات‌و ڕەوای ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ هیچ گوناهو حەرەجێکتان لەسەرنیە لەمەدا کە بەدوای ڕۆزی‌و بەهرەیەکدا بگەرێن لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە هەوڵ بدەن بۆ دەست کەوت‌و قازانجێك لەو سەفەرو ماوەی حەجەدا.**

**(ئیمامی بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: (عکاظ، ذو المجنة، ذو المجاز) لەسەردەمی پێش ئیسلام دا بازاڕ بوون، ئینجا کە ئیسلام هات موسڵمانان بە گوناهیان ئەزانی خەریك بوون بەو کرین‌و فرۆشتن‌و بازرگانیە لە کات‌و ماوەی حەجدا، لەبەرئەوە لەو بارەیەوە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ڕەوای هەموو کەسابەت‌و کرین‌و فرۆشتنێکی حەڵاڵی دا لەو کات‌و**

ماوەیشدا، وە تێ ی گەیاندن کە ئەوە هیچ ئەجرو پاداشتێك کەم ناکاتەوە، وە هێنانی ئەم ڕەوادانە بە دوای قەدەغە کردنی قسەو گفتو گۆی ناشیرینو کردەوەی گوناهو ئاژاوەو دەمە دەمێدا زۆر ڕێكو بەجێیە، چونکە زۆر جار مامەڵەو کڕینو فرۆشتن سەری لە ئاژاوەو دەمە دەمێوە دەرەئچێ، کەواتە با ئەم ڕەوادانە بزانرێ، نەك لە قەدەغە سەیر بکرێت.

سەبارەت بە ڕەوادانی خەریك بوون بە ماڵو قازانجو دەست کەوتەوە چەند ڕیوایەتی تریش هاتووە، وە هەموو ئەو ڕیوایەتانە ئەو بیمو ترسو کۆسپە لێ کەوتنە نیشان ئەدەن کە ئیسلام فەراهەمی هێنا لە دەروونی بڕوادارەکاندا بەرامبەر هەموو باوو کردەوەیەکی سەردەمی نەفامی، وە ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەو بڕوادارانە هەمیشە چاوەڕوانی ڕاو فەرمانی ئیسلامیان کردووە لە هەموو کارو کردەوەیەکیاندا، وە زاتیان نەبووە لە خۆوە بەبێ ئیزنی ئیسلام هیچ شتێ بکەنو پەلاماری هیچ شتێ بدەن، کە لە ڕاستیدا ئیسلامی ڕاستەقینە هەر ئەوەیە، ئینجا بێینەوە سەر شێوەی ڕەوادانەکە کە زۆر سەرنج ڕاکێشەرە لە دوو بارەوە:

١- ناوی ئەو هەوڵو خەریك بوونەی برد بە داوا کردنو بە دوا گەڕانی بەهرەو چاکەی خوا، بۆ ئەمەی ئەو هەوڵدەرە هەست بکات بەوەی کە بە کردەوەی خۆی ڕۆزی خۆی نادات، بەڵکو چاکەو بەهرەی خوا داوا ئەکاتو بەوە خۆی ئەژیەنێو هەرچی ئەو پێ ی نەدات دەست کەوت نابێ، وە هەرچی دەست کەوتبێ خوا پێ ی ئەبەخشێ، وە هەر هۆیەك لە هۆیەکانی ژیان بەکار بێنێ هەر لە خوایەوە بناسێو پشت هەر بە خوا ببەستێ، ئینجا هەرکات ئەوە لە دڵیدا جێگیر بوو، وە ئەو شتە ڕاستە لە دەروونیدا نەخشی بەست، ئەو حەلە هەموو هەوڵو تێکۆشانەکەی هەر خوا پەرستیەو ڕێکە لەگەڵ کردەوەکانی حەجەکەیدا. بەڵێ هەرکەس هەر بە نیازی بازرگانیو دەست کەوتەوە بڕوا هەرچەند حەجی لە کۆڵ ئەکەوێ، بەڵام ئەجرو پاداشتی کەمترە لەوەی کە هەر بە نیازی حەجەوە بڕوا.

٢- ئەو ڕەوادانەی کۆکردەوە لەگەڵ کردەوەکانی حەجدا لە یەك ئایەتدا، ئەوەتا لە پاش ئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ﴾ ئینجا کاتێ بە زۆری خۆتان دەرئەکەن لە عەرەفات و ئەگەڕێنەوە بەرەو موزدەلیفەو مینا ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ ئەو حەلە یادو باسی خوا بکەن بە نزاو سوپاس و (لبیك) کردن یان بە کردنی نوێژی مەغریب و عیشا کە کۆ ئەکرێنەوە لای ئەو شوێنەی کە ناو ئەبرێ بە ﴿ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ واتە هەموو موزدەلیفە یان ئەو شاخەی کە لە موزدەلیفەیەو ناو ئەبرێ بە (قوزەح)و ئیمامی موسڵمانان لەسەری ئەوەستێ، وە ئەو شوێنە ناو ئەبرێ بە ﴿ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ چونکە کراوە بە جێگەو نیشانەی خواپەرستی و بەرێزو پیرۆزە لە ئیسلامدا، ﴿وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ﴾ یادو باسی خوا بکەن هەرچۆنێ ڕێنموونی کردن و فێری ئەو خوا پەرستیانەی کردن، واتە هەر بەو جۆرو شێوەی کە بۆی داناون لەوە لامەدەن، یان یادو باسی بکەن لەبەرئەوەی ڕێنموونی کردن و فێری کردن، ﴿كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ وە بێگومان لە پێش ئەو ڕێنموونی خواو ڕێ نیشاندانەی، ئێوە لە کۆمەڵی گومڕاو ڕێ ون کەران بوون، بێگومان یەکەم تاقم و کۆمەڵی بڕواداران کە ئەم فەرموودەیان چوو بە گوێچکەدا چاك تێگەیشتن لە ئەندازەو ڕادەی ئەو گومڕاییەی کە لەسەری بوون و قورئان دەستی گرتن و ڕزگاری کردن لێی، چاك لە بیریان بووو ئەیانزانی کە لەچ گومڕاییەکدا بوون، گومڕایی بۆچوون و تێگەیشتن لە خۆیان و لە ژیان و لەم بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژین، گومڕایی لەبیروباوەڕدا، گومڕایی لە خوڕەوشتدا، گومڕایی لەژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی دا، گومڕایی لەهەر بارو ڕوویەکی تری جیهان و ژیانەوە، تازە دەر هاتبوون لەو هەموو تاریکی و نەفامی و نەزانیە، بۆ ڕووناکی تێگەیشتن و زانین و فامین بە ژێر سایەی ئیسلام دا، وە هەروەها لە هەموو چەرخ و چینێکدا، هەر زاناو فامیدەیەك کاتێ بیربکاتەوەو بەراوردی نەفامی و نەزانیەکانی زوەی بکات لەگەڵ بیروباوەرە پاك و

بەرزەکانی ئیسلام دا، بەباشی تێ ئەگات لەو منەت و خەڵاتە گەورەی کە خوا دای بە ئادەمی و جیهان بە ناردنی ئەم ئایین و قورئانە پیرۆزە.

مەردومی تێگەیشتووی بڕواداری ڕاستەقینە کاتێ بە پۆپەو لوتکەی هەرەبەرزی ئیسلامەوە بوەستێ و چاوێ هەڵخات و سەرنجێکی ئادەمی بدات لە هەموو چەرخ و چینەکانی داو بە هەموو بۆچوون و تێگەیشتن و بیروباوەڕو بەرنامەو ڕژێمەکانیەوە، ئیتر با دەست کردی گەورەترین زاناو فەیلەسوفی کۆن و تازەش بێت، وە پەسەند کراوی زۆربەی و بیر قوڵ تری کۆن تازەیان بیت، کاتێ مەردوم لە پۆپەو لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلامەوە سەرنجێك ئەدات سەرسام ئەبێت لە خەریك بوونی ئەم ئادەمیە بەو جۆرە شتە دەست کردانەی خۆیەوە کە مایەی سەرگەردانی و بەدبەختی و بێ ئارامین بۆ ئەم جیهان و ژیانە، ئەو ئادەمیەی کەلە خۆ گۆڕاوەو شوێنی ئارەزوو پەسەند کراوو هەڵبژێراوی خۆی ئەکەوێ و لای وایە کە پێویستی نیە بە خوا!! یان هیچ نەبێ پێویستی نیە بە شوێن کەوتنی بەرنامەو سەریعەتی خوا! جا لەبەرئەوە قورئان سەرنجی ڕاکێشان و ئەو بەهرەو چاکە گەورەیەی بیرخستنەوە کە خوا ڕشتی بەسەریاندا بە ناردنی ئەم ئیسلامە، بیر خستنەوە لێرەو لە چەند شوێنی تردا کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ حەج کۆنگرەیەکی ساڵانەی هەموو موسڵمانانە، کەلە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە نوێنەرو وەفدیان دێت و ئەگەن بە یەك لە کاتێکدا کە هەموو پەیوەندی و پەیوەستیەکی نێوان خۆیان فڕێ ئەدەن بێجگە لە ئیسلام، وە هەموو نیشانەیەك لە خۆیان دائەڕنن بێجگە لە نیشانەی ئیسلام، پیاوەکانیان هەموو پۆشاکێك دائەکەنن بێجگە لە دوو پارچەی نەدووراو، وە یەکسانی تەواو نیشان ئەدەن و هەموو ڕەگەزایەتیەك زێڕێ ئەخەن... قورەیش لە سەردەمی نەفامیدا خۆیان جیا ئەکردەوە لە عەرەبەکانی تر، وە یەکێ لەو شتانەی کە خۆیان پێ جیا ئەکردەوە ئەمە بوو لە عەرەفات نەئەوەستان وەك عەرەبەکانی تر، وە لەکاتی گەرانەوەدا لە ڕێگەی ئەوانەوە نەئەگەڕانەوە، ئینجا کە ئیسلام هات ئەو باوی قورەیشەی نەهێشت، وە خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بچێ لە عەرەفات بوەستێ و ئینجا لە عەرەفاتەوە بگەڕێتەوە،

وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ لەپاش وەستانی عەرەفات ئینجا لێی دەرچن و بگەڕێنەوە لەو شوێنەوە کە مەردوم لێیەوە گەڕاونەتەوە هەر لە کۆنەوە کە ئەوەش عەرەفاتە نەك موزدەلیفەیە کە قورەیش کردیان بە جێی وەستان و گەڕانەوەیان بەرەو مینا، ﴿وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَۚ﴾ وە داوای لێ بوردن و سڕینەوە بکەن لە خوا لە خۆ بەزل زانی و هەرکردەوەیەکی ناڕاست و ناڕەوا کەلە حەجەکەتاندا ئەیکەن. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە بۆ ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوە بۆلای و داوای لێبوردنی لێ ئەکەن، ئا بەو جۆرو شێوەیە ئیسلام ئەیەوێ کردەوەو ڕەوشتی موسڵمانان ڕاست بکاتەوە، لەسەر بنەڕەتی یەکسانی، بەبێ هیچ جۆرە ڕەگەزایەتی و جیاوازی تیرەو ڕەنگ و وڵات و زمان و هەر نیشانەو دروشمێ تر کە ئیسلام ڕەوای نەدات و نەفامی کۆن و تازە پەسەندی ئەکات!!

لە پێشەوە باسمان کردن کە عەرەبەکان چەند بازاڕێکیان هەبوو... وە ئەو بازاڕانە تەنها بۆ کڕین و فرۆشتن نەبوون، بەڵکو بازاڕی بەربەرەکانێ و مل ملانێ بوون لە گوتنی هۆنراوەو وتاردا، وە بەربەرەکانێ و مل ملانێ لە کەشخەو خۆ بەزل زانی و شانازی کردن بە مل یەکدا بە باوك و باپیری هەڵکەوتوو و نەژادی بەرزدا، وە بەتایبەتی کە لێ ئەبوونەوە لە حەج کۆڕیان ئەگرت و دەستیان ئەکرد بە باسی گەورەیی و پیاوچاکی و چالاکی باوك و باپیریان، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە عەرەب لەو کاتەدا هیچ کارو کردەوەیەکی گرنگی نەبوو کە خەریك بێت پێیەوە، وە هیچ پەیامێکی ئادەمیانەی بەدەستەوە نەبوو کە خەریك بێت بەڕاگەیاندن و چەسپاندنیەوە بەهێزی وتارو کردار، تا ئیسلام هات و گەورە ترو بەرزترین پەیامی خستە دەستی، جا لەبەرئەوە لە بێکاری و بێئیشیدا خەریکئەبوون بەو شتە بێنرخانەوە و کاتی خۆیان لەوەدا بە فیڕۆ بەخت ئەکرد، بەڵام کە ئیسلام هات ئەبێ لایان بدات لەو کارە بێ سوودانە، وە ئەبێ تەمێیان بکات بەشتێ کە بەکەڵك و بەنرخە، تەمێیان بکات بە یادو باسی خوا لە پاش لێ بوونەوە لە حەجەکەیان، لەباتی ناوو باسی باوك و باپیریان، فەرمووی پێیان، وە بە هەموو بڕوادارێك بە جیهاندا کە بچێ بۆ حەج،

فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

---

﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ﴾ ئینجا كاتێ بەجێیان هێنا نیشانەكانی خواپەرستیتان لە حەجەكەتانداو لێ بوونەوە لێیان ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ﴾ ئەو حەلە باس‌و یادی خوا بكەن وەك یادو باس كردنتان بۆ باوك‌و باپیرتان ﴿أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ یان بە تین ترین لەیادو باسی خوادا تا یادو باسی باوك‌و باپیرتان، واتە باشتر بۆ ئێوە ئەمەیە خەریك بن بە یادو باسی خواوە، نەك بە باسی باوك‌و باپیرەوە، كە ئەگەر ڕاست بكەن تیای دا ئەوا دووچاری لە خۆگۆڕان‌و خۆ بەزل زانی ئەبن كە دوو دەردی زۆر خراپن لەبارەی كۆمەلایەتیەوە، وە ئەگەر درۆش ئەكەن ئەوا هیچ نرخێ نادرێ بە قسەكانتان‌و پێ‌ی سووك‌و ترۆ ئەبن‌و ئەبێ بە گوناهێك لە گەردنتاندا بۆ ڕۆژی دوایی، كەواتە ئەو باس‌و یادی باوك‌و باپیرەتان بگۆڕن هەر یادو باسی خوا، لە كاتێكدا كە خوا ئەو عیبادەتە گەورەی بە نسیب كردن، وەلە كاتێكدا كە ئێوە لەو شوێنە پیرۆزەدان‌و لەو ماوەیەدا لێ بڕاون بۆ خواپەرستی، وە لە كاتێكدا یادو باسی خوا بەندە بەرزئەكاتەوەو پایەو پلەی پێ ئەدات، وە یادو باسی باوك‌و باپیر لەوانەیە سەری لێ تێك ئەدات‌و دووچاری تۆڵەی خوای ئەكات!! ئینجا بۆمان ڕوون ئەكاتەوە كە مەردوم لە یادو باسی خوایش دا دوو تاقمن، وە لەو دووانە یەكێكیان لەسەر ڕێ‌ی ڕاستەو یادو باسەكەی ڕەواو بەجێیە، ئەویتر لە ڕێ‌ی ڕاست لای داوەو داواو باسەكەی ناڕەوایە، ئەفەرموێ: ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ﴾ لەناو ئادەمی دا كەسی وا هەیە ئەڵێ: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا﴾ ئەی پەروەردگارمان لە جیهاندا بەشمان بدەو پێمان ببەخشە واتە هەموو مەبەست‌و ئامانجی هەر خۆشی ئەم جیهانەیەو ئیتر گوێ‌ی نیە لە ڕۆژی دوایی‌و هیچ بەشێكی ئەوێ‌ی ناوێ، لەبەر ئەوە خوایش بێبەشی ئەكات‌و ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُۥ فِى

﴿ٱلْأَخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ﴾ بۆ ئەو کەسە نیە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ بەشێك، خوا پەنامان بدات، ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ﴾ وە لە ئادەمیزاددا کەسی وا هەیە ئەڵێ: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ ئەی پەروەردگارمان پێمان ببەخشە لە جیهاندا شتی چاكو بەشی باش، وتەی ﴿حَسَنَةً﴾ بە هەشت جۆر تەفسیر کراوەتەوە لە لایەن خواناسو زانایانەوە، بەڵام ڕەنگە مەبەستیان دیاری کردنو برینی نەبێ بەسەر هەرکام لەوانەدا، بەڵکو هەر یەکێکیان مەبەستی وێنەو نموونەیەك بووبێ بۆی، کەواتە با نەیبڕین هیچ شتێکی تایبەتی دا، بەڵکو وەك داواکە ئەکەین لە خوا هەر حەواڵەی خۆیشی بکەینو خۆی چی بە چاك ئەزانێ ئەوەمان بۆ بکات، وە ئەوە چاکترە کە ئێمە ڕازی بین بە هەر شتێ کە ئەو بۆمان هەڵئەبژێرێ، ﴿وَفِى ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً﴾ وەلە ڕۆژی دوایشدا شتی چاكو بەشی چاکمان پێ ببەخشە، لێرەدا وتەی ﴿حَسَنَةً﴾ بە چوار جۆر تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام هیچ دیاری ناکەین، وە ئەوەی لەوێ گوتمان لێرەشدا ئەیڵێین، ﴿وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ وە بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ، واتە بمانخەرە بەهەشت بەبێ سزادان ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾ ئەوانە کە داوای چاکەی هەردوو جیهان ئەکەن، بۆیان هەیە بەشێکی گەورەو مسۆگەر لە جۆری ئەو کردەوە چاکانەی کە کردوویانە، یان لەبەرئەو کردەوە چاکانەی کەلە جیهاندا کردوویانە، ﴿وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ وە خوا حیسابو پرسیاری چەسپانە بەم ڕەنگە بەندەکانی بەو هەموو زۆریە لە ماوەیەکی کەمدا حیسابو پرسیاریان تەواو ئەکات، کەواتە وریا بنو خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی کەسێك کە بەو جۆرە بەدەسەڵات بێت، یان مەبەست ئەوەیە، نزیکە بە زوویی ڕۆژی دوایی بهێنێو حیسابو پرسیار بکات، کەواتە فریاکەون چەسپانی بکەن بە کردەوەی چاكو گوێڕایەڵی ئا بەو جۆرو شێوەیە ئیسلام تەمێی موسڵمانان ئەکات بۆ ئەو نزا پەسەندە کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تێدایە، وە نایەوێ واز بێنن لە کاری ئەم جیهانیان، چونکە دروست کراون بۆ ئەمەی بین بە جێنشین لە جیهاندا، وە بە پێی فەرمانو ڕەزامەندی خوا خێرو خۆشی ئەم جیهانە وەرگرن، بەڵێ ئیسلام هەرئەوەی ئەوێ کە بەندەکانی خوا ڕوو بکەنە خوای خۆیان لە هەموو کارو باروی ژیانو جیهانیاندا.

﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٠٣ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ

**ئینجا ڕۆژەکانی حەج و کردەوەکانی دوایی ئەهێنێ بە تەمێ کردن و فەرماندان لە یادو باسی خواو ترسان لە خوا، لە دوو ڕۆژی پاش جەژن یان سێ ڕۆژ، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ﴾ یادو باسی خوا بکەن لە چەند ڕۆژێکی ژمێرراودا کەسێ ڕۆژی پاش جەژنە، واتە وشەی ﴿الله اکبر﴾ بڵێن لە پاش نوێژەکان و لە کاتی سەربڕینی قوربانی و لەکاتی ڕەجمەکاندا، وە هەروەها هەر نزاو ناوبردنێك کە لە حەیس دا هاتبێت ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ﴾ ئینجا هەرکەس پەلە ئەکات و ئەیەوێ لە پاش دوو ڕۆژی پاش جەژن لە مینا دەرچێ و بگەڕێتەوە، وەلەو دوو ڕۆژەدا ڕەجمی شەیتان ئەکات و ناوەستێ بۆ ڕۆژی سێیەمیش، ئەو کەسە هیچ گوناهێکی لەسەر نیە لەو پەلە کردنەداو با دەرچێ پێش ئاوا بوونی خۆر ﴿وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ﴾ وە هەرکەس دوا ئەکەوێ، بەم ڕەنگە ئەمێنێتەوە هەتا ڕۆژئاوا ئەبێت لە ڕۆژی دووەمی پاش جەژن، ئەو حەلە ئەبێ بمێنێتەوە لە ڕۆژی سێیەمیشدا پاش نیوەڕۆ هەرسێ ڕەجمەکە بکات، وەك ڕۆژی یەکەم و دووەم، ئینجا بگەڕێتەوە بۆ مەککە، بەم جۆرە ئەکات ئەمیش هەر هیچ گوناهێکی لەسەر نیە، واتە حاجی ئارەزووی خۆیەتی هەرکان لەم دووبارە ئەکات هیچ گوناهو خراپەیەکی تێدا نیە، بەڵام نەك بۆ هەموو کەس، بەڵکو ﴿لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ﴾ بۆ هەرکەسێك کەلە خوا ترس بێت و خۆی پاراستبێ لە گوناهو هەرشتێ کە بێ شەرعی بێت، ئینجافەرمان ئەدات لەخواترسان و خۆپارێزی، وەئەیان خاتەسۆزوپەرۆش بۆئەوله خوا ترسیە، بە بیرخستنەوەی ڕۆژی دوایی و کۆبوونەوەی گشتی بۆلای خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وەلە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەوەی نافەرمان بن و پێچەوانەی ئەم بڕیارانە بجوڵێنەوە ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ وە بزانن کە بۆلای خوا کۆئەکرێنەوە بە زیندوویی بۆ حیساب و پرسیارو پاداش و تۆڵە لەسەر کردەوەکانتان.**

**ئا بەو جۆرو شێوەیە کە تێپەڕی کر لەو ئایەتانەدا، خوای پەروەردگار فەرزی حەجی گێڕا بە کردەوەیەکی ئیسلام ڕووت، وە پاکی کردەوە لە هەر نیشانەو دروشمێك، وەلە هەر**

چڵو چێوو کەمو کوڕیەك کەلە چەرخو سەردەمی نەفامی دا تێکەڵی کراو بەسەری هێنرا، کەواتە ئەم حەجە بەو حەجە نەمایەوە کەلە سەرەدەمی نەفامی دا ئەکرا، بەڵکو بوو بە خواپەرستیەکی ڕێكو پێك، وە هەروەها نەمایەوە بە باوو تەقلیدێکی عەرەبی، بەڵکو گەڕا بەکردەوەو ڕەوشتو حەقیقەتێکی ئیسلامی، ئەم بەرنامە تێرو تەواوەی کە ئیسلام هێنای بۆ ژیانی ئادەمی، پێك هاتووە لە چەند پەندو تەمێو ئامۆژگاریەك لەگەڵ چەند یاسایەك بە پێی پێویستیو بەرژەوەندی بەندەکانی خوا، وە لەناو ئەو پەندو ئامۆژگاریانەدا بەرنامەیەکی ڕاستو زۆر بەکاری هەیە بۆ پێگەیاندنو پەروەردەکردن، بەرنامەیەك کە بنەڕەتی لەسەر زانینو ئاگاداریەکی بێ سنوورە بە هەموو کاروباری ئاشکراو نهێنیو دیوی دەرو دیوی ناوی ئەم ئادەمیە بە جۆرێ ڕێی لێ ئەبڕێتەوەو لە هەموو ناچەو کونو کەلەبەرێکی دەروونی ئەم ئادەمیەدا ئەوەشتێو دەست نیشانی بۆ ئەکات بۆ هەر شتێ کە لەوانەبێت ئەم ئادەمیەی پێ دامەزراو بێت لەسەر سروشتی پاكو خاوێنی خۆیو نەترازێت لە ڕێی ڕاست، ئینجا هەرکەس چارە ڕەش نەبێت گوێڕایەڵ ئەبێتو بەبێ بەرو دوا لە سنووری ئەو پەندو ئامۆژگاریانەدا ئەوەستێ، وە هەرکەسیش نەحسو نەگبەتو چارە ڕەش بێت ئەوا خۆی کەڕو کوێر ئەکات.

لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا بە شێکی گرنگ هەیە بەو مەبەستو ئامانجانە، وەك دەرئەکەوێ بۆ هەرکەس کە ژیرو تێگەیشتووبێت، لەیەکەم جارەوە وێنەو دوو نموونە لە ئادمە نیشان ئەدات، وە نیشانەو دروشمەکانیان ئەخاتە بەرچاو:

١- نموونەی کەسێکی دەمبازی ڕووپامایی کەری دەم لووسی بەدەم دۆستی، بەدڵ زۆر دوژمن، کە هەرگیز نایەوێ خۆی چاك بکاتو بگەڕێتەوە لە خراپەکاری.

٢- نموونەی بڕوادارێکی ڕاستی ڕاست گۆ کە خۆی بەخت ئەکات لەڕێی ڕەزامەندی خوادا، وە دڵی هەر خوای ئەوێو بە هەموو جۆر ڕوو ئەکاتە خوای خۆی، ئەفەرموێ:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەناو ئادەمی دا کەسی وا هەیە کە وتەو وتاری لەم ژیانو جیهانەدا سەرسامت ئەکاتو سەرت سوڕ ئەمێنێ لە قسەی لووسو دەمی شیرینی، وە لافی خۆشەویستیو دۆستایەتیو بڕواو موسڵمانێتی لێ ئەدات، ﴿وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ﴾ وە خوا ئەکات بە شایەت لەسەر ئەوەی کەلە دڵیایەتیو ئەڵێ خوا ئەزانێ کە دەمو دڵم یەکن لەم قسانەدا کە ئەیانکەم،

وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾

---

﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ﴾ لەكاتێكدا كە ئەو كەسە ئاژاوەو بەربەرەكانێی لەگەڵت زۆر بە تینە، واتەدرۆت لەگەڵ ئەكات ودەمودڵی یەك نین، وەدڵی پڕە لە خەشمو كینەو هیچ خۆشەویستی و دۆستیو خێرو ڕاستی تێدانیە، ئەو كەسە كە ڕووپامایی ئەكاتو بەلافو بلۆف خۆی ئەهێنێتە پێشەوە، بەڵام كاتێ لە ڕوو نەمابەم جۆرەیە كە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ﴾ وەكاتێ پشتی هەڵكرد ﴿سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ چەسپانی ئەكات لەوڵاتدا لە هەر شوێنێ ببێ ﴿لِيُفۡسِدَ فِيهَا﴾ بۆ ئەوەی خراپەكاری بكاتو ئاژاوە بنێتەوە تیای دا ﴿وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَ﴾ وە كشتوكاڵو گیان لەبەر لەناو بەرێ، یان مەبەست لەم ئایەتانەو ئەم كەسە ئەوەیە كە لەبارەی كاروباری جیهانو ژیانەوە قسەی ڕێكو پێكەو بەدەم هیچی نەهێشتووەتەوە، بەڵام كەئیشی كەوتە دەستو بوو بە كاربەدەست دەست ئەكات بە تاوانو خراپەكاریو دەست درێژیو ستەمكاری بە جۆرێ وڵات كاولو وێران ئەكات، بە هەرحاڵو لەسەر هەر بار ئەم جۆرە كەسانە زۆر هەنو تایبەتی نین بەكاتو چەرخو چینێكەوە، بەڵكو هەمیشە لەناو ئادەمی دا ئەونموونەیەهەربووەوهەرئەشبێت ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ﴾ وە خوا خراپەو خراپەكاری ناوێ و خەشمی هەیەلێی، وەهەروەها خراپەكارو خراپەكارانی ناوێو خەشمی بە تینی هەیە لێیان.

خراپتر لە هەموو شت ئەوەیە كە ئەو كەسە ناگەڕێتەوە لەو نالەبارییەی، وە بە تەمێو ئامۆژگاری خراپترو سوور تر ئەبێ لەسەر تاوانو خراپەكاری وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ وەكاتێ بگوترێ پێی: لە خوا بترسەو خۆت بپارێزە لە گوناهو خراپەكاری ﴿أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِ﴾ ئەو لووت بەرزیو خۆ بە زل زانینەی كەلەدەروونی دا هەیە داگیری ئەكاتو هانی ئەدات لەسەر ئەو گوناهو تاوانەی كە جڵەو گیری ئەكرێ لێی، وە سوور تر ئەبێ لەسەری، یان هانی ئەدات لەسەر ئەوەی كە گوێ نەگرێ لە تەمێو ئامۆژگارییەكەو بەرپەرچی

ئامۆژگاری کەر بداتەوە، چونکە بە عاری ئەزانێ کە ئەم بە خراپ و تاوانبار سەیر بکرێ و تەمێ بکرێ، کە ئەوەش تاوانێکی زلە، وەك (ئیبن و مەسعود) ئەفەرموێ: یەکێ لە گوناهە زۆر گەورەکان بەلای خواوە ئەمەیە: ئەگەر بە یەکێ گوترا: لە خوا بترسەو خۆت بپارێزە لە گوناه، ئەو یەکە بەرپەرچی تەمێ کەر بداتەوەو پێی بڵێ: تۆ برۆ خۆت چاك بکەو هەقت بەسەر کەسی ترەوە نەبێ. مەردومی موسڵمان ئەبێ وەك عومەری فاروق بێت –خوا لێی ڕازی بێ– جارێ پێی گوترا: لە خوا بترسە، ئەویش دەست بەجێ ڕوومەتی خۆی لەسەر زەوی دانا!! بەرامبەر ئەو لووت بەرزە تاوانبارە دڵ ڕەقە، خوا ئەفەرموێ: ﴿فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۚ﴾ ئینجا بەسە بۆ ئەو کەسە دۆزەخ، واتەئەوکەسە سزا ئەدرێ لە دۆزەخ بەسە بۆ سزادنی، ئەو دۆزەخەی کە سووتەمەنی و هەڵگیرسێنەری ئادەمی و بەردە!! ئینجا بەو لاقرتیەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ سوێند بە خوا دۆزەخ جێ و بان و بێشکەیەکی زۆر خراپە بۆی وە شوێنی ڕەحەتی و حەوانەوەیەکی زۆر بەدە بۆی.

نموونەی دووەم: ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ﴾ لەناو ئادەمی دا کەسی وا هەیە کە خۆی ئەفرۆشێ، واتە خۆی بەخت ئەکات لە ڕێی خوادا بە جەنگ و کوشتار هەتا ئەکوژرێ، یان بە فەرماندان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپەو وازناهێنێ هەتا ئەکوژرێ، ﴿ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ﴾ لەبەر بەدوا گەڕانی ڕەزامەندی خوا، واتە هیچ نیازو مەبەستێکی نیە جگە لە ڕەزامەندی خواو گەیشتن بەو پلەو پایە بەرزە ﴿وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ وە خوا زۆر میهرەبان و بەلوتفە بە بەندەکانی لە کاتێکدا کە داوای تێکۆشانیان لێ ئەکات، وە ڕێنموونیان ئەکات بۆ شتێ کە ڕەزامەندی خۆی تیایە، چونکە ئەیەوێ نازو ڕێزو پاداشتی بێ وێنەی نەبڕاوەیان بداتێ لەباتی ئەو تێکۆشان و کردەوە کەمەی کە هەڵئەسن پێی.

ئەم ئایەتانەی کە باسی ئەم دوو نموونەیان کرد، هەرچەند هاتبنە خوارەوە بەبۆنەی کەسێکی تایبەتیەوە، وەك ڕیوایەتی زۆر هەیە کە ئایەتەکانی نموونەی یەکەم هاتوونەتە خوارەوە لەبارەی (ئەخنەسی کوڕی شورەیق)ەوە، وە ئایەتەکانی نموونەی دووەم هاتووە لە بارەی (سوهەیبی ڕۆمی)یەوە، هەرچەند بەو بۆنەیەوە هاتبن، بەڵام وەك چەند کار گوترا: ئایەت تایبەتی ناکرێ بەهۆی هاتنە خوارەوەی، بەڵکو لەسەر شێوە گشتیەکەی ئەمێڵرێتەوە و بڕیارەکانیان گشتین، ئینجا لەم کاتەدا کە ئەو دوو نموونەی نیشان دا بانگی بڕواداران ئەکات کەلە نموونەی دووەم بن بەم ڕەنگە بە تەواوی موسڵمان بن و شوێنی شەیتان نەکەون،

ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە وەرنە ناو ئیسلامەوە بەتەواوی بەجۆرێ کە ئیسلام هەموو شتێکتان بگرێتەوەو داگیری بکاتو شوێنێ نەمێڵتەوە بۆ هیچ شتێ تر تیایاندا، بانگیان ئەکات بە سیفەتو نیشانەی بڕواکەیان کە زۆر خۆشەویستە بە لایانەوە، وە بەوە جیائەبنەوەو ئەبن بە نموونەیەکی تایبەتی لە ناو هەموو گیان لەبەراندا، وە بەوە پەیوەست ئەبنو ئەبەسترێنەوە بە پەروەردگاریانەوە، بەم سیفەتو نیشانەیە بانگیان ئەکات تا بە سۆزو پەرۆشەوە بێن بەدەم بانگەکەیەوەو گوێڕایەڵ بن، وە مەبەست لەم بانگ کردنە ئەوەیە ـ وەك دەست نیشانمان بۆ کرد ـ کەلە هەموو بارو ڕوویەکەوە مل کەچ بن بۆ خوا.

هەموو بۆچوونو تێگەیشتنو نیازو کردەوەو حەزو ئارەزوویان شوێن کەوتووی خواستو خواهیشو فەرمانی خوا بنو مل کەچ بن تەنها بۆ حوکمو بڕیاری ئەو بە هەموو ئارامیو دڵنیاییەکەوە، وە بەبێ دواو بەرو دوو دڵیەکەوە، کە بڕوای ڕاستەقینەش هەر ئەوەیە، لە ئاڕاستەکردنی ئەم بانگو فەرمانەوە وا دەرئەکەوێ کەلەو کاتەدا لەناو ڕیزو کۆمەڵی بڕواداران دا چەند کەسێك بووبن کە هێشتا دەروونیان پاكو خاوێن نەبووبێتەوەو بە هەموو ئارامیو دڵنیاییەکەوە ئامادە نەبوونو بۆ گوێڕایەڵی تەواو بەبێ گیروگرفت، کە بوونی تاقمی وایش لەناو گەلو کۆمەڵدا هەر ئەبێ بنو جێگەی سەرسووڕمان نین، جا لەبەرئەوە بە شێوەی گشتی بانگ کرانو فەرمان درا کە هەموو بڕواداران یەك دەستە بنو هەموو چوون یەك بن لە بڕوای بەهێزو تێرو تەواودا، بانگ کرا بۆ ئەوەی کە بڕواداران لە هەموو کاتو چەرخێکدا بە تەواوی لێ ببڕێن بۆ خواو هەموو شتێ تر لە خۆیان داڕنن.

موسڵمانان ئەگەر گوێڕایەڵ بنو بە پێی ئەو بانگو فەرمانە بجوڵێنەوە، ئەو حەلە نیشتەجێ ئەبن لە جیهانی ئارامیو ئاشتی دا، ئەکەونە جیهانێك کە پڕە لەدڵنیاییو ئارامو ڕەزامەندیودامەزراوی بەبێ داماویو سەرگەردانیو دوو دڵی، وە بەبێ تار بوونو گومڕایی، بەجارێ ئەکەونە جیهانی ئارامیو ئاشتی لەگەڵ دەروونو ویژدان دا، ئارامیو ئاشتی لەگەڵ ژیری دا، ئارامیو ئاشتی لەگەڵ ئادەمیو زیندەوەران دا، ئارامیو ئاشتی لە گەڵ بوونو بوونەوەردا، ئارامیو ئاشتیەك کە هەڵئەقوڵێ بە ناوەرۆکی دڵو دەروونەوە، وە ئارامو ئاشتیەك کە ئەبێت بە سایەو سەهەند بۆ ژیانو بۆ گەل.

ئارامی و ئاشتی لە زەوی دا ئارامی و ئاشتی لە ئاسمان دا، لە یەکەم جارەوە ئەو ئارامی و ئاشتی یە ئەڕژێ بەسەر دڵدا لەبارەی عەقیدەو بۆچوون و تێگەیشتنی لە خوای پەروەردگاری، وەڕێك‌وپێکی و سووك و ئاسایی و بێگەردو لە کەیی ئەو عەقیدەو تێگەیشتنە.

تەنیا خوایەك هەیە بڕوادار ڕووی تێ ئەکات و دڵی لەسەری دائەمەزرێ، وە سەری لێ تێك ناچێ و بە یەك ڕێگەدا ئەڕوا، وە ئەو خوایە میهرەبانەو پێی خۆشە بەندەکانی ڕێك و پێك بن و نەك وەك فەلسەفەی ئیغریقیەکان ئەڵێت: خوا نایەوێ بەندەکانی توشی خێرو خۆشی بن، بەڵکو هەمیشە ئەیانتارێنێ و ئەیەوێ لە ناڕەحەتی دا بژین، یا وەك زۆر لە بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرەکان کە چەند خوایەك ڕەوا ئەدەن، وە هەرکام لەو خوایانە دژی بەندەکانن و هەمیشە وان لە کەمینا بۆیان، ئەو تەنیا خوایەی کە ئیسلام بانگی مەردومی بۆ ئەکات، خوایەکی بە دەسەلاتی زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هەرچی ئەم نەیکات هەرگیز نابێ ڕوونادا، کەواتە کاتێ کە بڕوادار ڕووی تێ ئەکات ئەبێ باك و مەترسی نەبێت لە هیچ کەس و هیچ شتێ، وە بەدڵ ئارامی ئەژی، چونکە ئەزانێ هەرچی خوا نەیکات نابێ، وە هەرچیش وە هەرچیش خوا ویستی ئەبێ هەر ببێ و هەر ئەوەیش ڕاست و ڕەواو بە جێیە، وە ئەو خوایە پەروەردگارێکی دادپەروەرو لێزان و کار دروستە، وە بەخشندەو میهرەبانە، وە لێ بوردەو خاوەن چاوپۆشیەو هەمیشە قاپی میهرەبانی لەسەر پشتە بۆ گەڕانەوەو تەوبەی خراپەکاران و تاوانباران، تا ئەگاتە کاتی مردن و نائومێدی لە ژیان، وە هەروەها خاوەنی ئەو هەموو سیفەتە شیرینانەی ترە کە بەناو بانگن لە ئیسلام دا، کەواتە بەندە ئەو خوایە ئەپەرستێ بە هەموو سۆزو پەرۆش و ئارامی دڵ و چاوەڕوانی و ئومێدی خێرو خۆشی هەردوو جیهانەوە... وە هەروەها ئارامی و ئاشتی ئەڕژێ بەسەر دڵ و دەروونی موسڵمان دا کاتێ کە بیر ئەکاتەوە لەو پەیوەندیەی کە ئیسلام نیشانی ئەدات لە بەینی بەندەو پەروەردگاری دا، وە لەبەینی ئەم بوونەوەرەو ئادەمی دا.

ئیسلام تێمان ئەگەیەنێ کە خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە بەڕاستی و لەسەر بنەڕەتێکی ڕاست و ڕەواو بۆ مەبەستێکی ڕاست و گەورەو گرنگ، وە هەرچی دروست کردووە بە حیکمەت و لێزانی دروستی کردوون، وە هەمووی لە ئەندازەو ڕادەیەکی دیاری و تایبەتی دایە بەجۆرێ دەست نادا بۆ دەست تێخستن و گۆڕاندن و بڕارە کردن، وە ئادەمی دروست کراوە بە نیازو بۆ مەبەستێکی دیاریی و تایبەتی، وە هەروا تێ ناپەڕێ و ناڕوا بەبێ سەرو شوێن و لێ پرسینەوە، وە ئەوەی پێویست بێت بۆی دروست کراوە، وە ئەم ئادەمیە

بەرێزە بەلای خواوە، وە ئەوەی پێویست بێت بۆی لەم بوونەوەرەداو بەرژەوەندی ئەوی تیابێت بۆی ئەنجام دراوە وەجێنشینی خوایە لەم زەویەدا، وە خوا یارمەتیو کۆمەکی ئەکات لەسەر هەڵسانی بەجێنشینیەکەی، وە هەرچی وا لە ئاسمانەکانو زەوی دا خوا ژێر باری کردووە بۆ سوودو بەرژەوەندی ئەم، وە ئەم بوونەوەرەی کە تێیدا دەژی هەمووی دۆستو هاوڕێو هاوەڵیەتی، وە هەر کاتێ بەڕاستی ڕووبکاتە خواو خوای خۆی باش بناسێ، ئەو حەلە ڕۆحی لەگەڵ ڕۆحی بوونەوەردا یەك ئەگرنو سۆزو خۆشەویستی بەکار ئەهێنن لەگەڵ یەکتر، وە ئەکەونە وتووێژی دۆستیو بەینی خۆیان، ئەم بوونەوەرە شیرینو دڵ ڕفێنە ڕازاوەتەوەو ئادەمی تێ هێنراوە بۆ ئەمەی بە خۆشیو کامەرانی تیدا بژیو خێرو بێری وەرگرێو ورد بێتەوە لێی تا سوپاسی خوا بکاتو ژیان بەسەر ببا بەپێی بەرنامەی خوا.

بەڕاستی عەقیدەو بۆچوونەکە زۆر بەرزو بەرێزو شیرینە، ڕۆحی ئارامیو ئاشتی ئەڕژێنێ بەسەر خاوەنو هەڵگرەکەی دا: بەندێ لە بەندەکانی ئەم ئاینو عەقیدەیە بڕواکردنە بە ڕۆژی دوایی کەبەڕاستی ئارامیو ئاشتی ئەڕژێنێ بەسەر گیانو هەستو دڵو دەروونی بڕوادارو جیهانی بڕواداردا وە ناڕەزاییو بێزاریو نائومێدی لە دڵ دوور ئەخاتەوە. چونکە باش ئەزانێ کە حیسابو لێپرسینەوەو تۆڵەو پاداشت بە ئەوپەڕی دادو ڕاستیەوە لەو جیهانە نەبڕاوەدا بەدی دێت، کەواتە هەرچی بەسەربێتو هەرچی لە کیس بچێ لێرە هەروا لە خۆڕایی ناڕواو لەدەست دەر ناچێ، وە هەموو کردەوەکانی ئێرەی لەوێ بەترازووی دادپەروەری ئەکێشرێو هەرکەس ئەکات بە بەرهەمی کردەوەی خۆی، کەواتە پەشیمان نابێ لەسەر هیچ چاکەو تێکۆشانێك کە لەم جیهانەدا کردبێتیو لێرە ئەجرو پاداشتەکەی وەرنەگرتبێ.

بڕوا بە ڕۆژی دوایی بەربەستو بەرهەڵستێکی بەتینو بەهێزە بۆ ئەم بەربەرەکانێو زۆرانبازییە شێتانەی کە باوە لەسەر دەست کەوتو شتو مەکەکانی ئەم جیهانەو لە پێناوی دا دەست هەڵئەگیرێ لە هەموو مرۆڤایەتیو پیاوەتیو ناموسو شەرەفێك، چونکە بڕوادار ئەزانێ ڕۆژی دوایی دێتو مافی هیچ کەس فەرامۆش ناکرێو هەموو ئازارو زیانو سزایەکی ئێرە لەوێ بەسەر ئەگیرێتەوە، کەواتە بڕوا بەو ڕۆژە زۆر بەکارو هاندەرێکی بەهێزە بۆ پەلامار دانی هەموو چاکەیەك، هەرچۆنێ بەرگری کەرو جڵەوگیرێکی بەتینە بۆ دوور کەوتنەوەو گەڕانەوە لە هەموو تاوانو خراپەیەك، بڕوادار ئەزانێ کە دروست کراوە هەر بۆ

خواپەرستی، لەبەرئەوە لە هەموو کاروباری دا بەپێی بەرنامەی خوا ڕەفتار ئەکات و ئەجولێتەوە، ئەو حەلە هەموو ئیش و کارو فەرمانی ئەبێ بە خواپەرستی، تەنانەت خەوو خواردنەکەشی، کەواتە لە هەموو کات و بەسەرهاتی دا هەرچاوچی لە خوایەو بەدوای ڕەزامەندی خوادا ئەگەڕێ، وە هەر دڵێکیش بەو جۆرە لەگەڵ خوادا بێت هەمیشە پڕ لە ئارام و ئاشتیە، وە هەروەها بڕوادار ئەزانێ کە لەسەر باوو ڕەوشتی خوا ژیان بەسەر ئەبات، یەك یاسا و قانوونیان هەیە، وە بۆ یەك لا ڕوو ئەکەن، کەواتە دڵی پڕە لە ئاشتی بەرامبەر ئەم بوون و بوونەوەرە، ئەو ئەرك و تەکلیفانەی کە خوا داوای کردووە لە بەندەکانی و پێویستی کردوون لە سەریان بۆ ڕێك و پێك کردنی سروشتیانەو ڕاگیر کردنیان لەسەر سورشتی ئادەمێتی، وە پێی توانینەو گونجاون لەگەڵ ئەو بارو جۆرەی کە ئادەمی لەسەر دروست کردووە، وە ڕێگەی هێزو وزەکانیان ناگرن، بەڵکو لە هەمان کاتدا هەموو هێزو وزەکانی ئادەمی بەرەلا ئەکات بۆ کارو پیشەی خۆیان و بەرز کردنەوەو گەشە کردنیان بە ژیان و پێك هێنان و بەجێهێنانی هەموو پێویست و داخوازیان... جا لەبەرئەوە بەندەکانی خوا سەرگەردان و بێئارام نابن بەرامبەر ئەو ئەرك و تەکلیفانەوە بە سۆزو پەرۆشەوە هەڵئەسن پێیان، وە کاتێ بەرێکی بەجێیان بهێنن دڵ و دەروونیان پڕ ئەبێ لە ئارامی و ئاشتی، وە بە هەموو دڵنیاییەکەوە ڕێگە ئەدەنە بەر بۆلای خوای خۆیان ئەو گەل و کۆمەڵەی کە ئەم بەرنامە ئاسمانیە پەروەردەی ئەکات و پێی ئەگەیەنێ، لە ژێر سایەی ئەو ڕژێمەی کە هەڵئەقوڵێ لە عەقیدەو بیرو باوەڕە بەرێزو پیرۆزەکەیەوە، ئەو گەل و کۆمەڵە ئەژی بە ئەو پەڕی ئارامی و ئاشتیەوە، وە گەل و کۆمەڵێکی پەیوەستی بەسۆزی بەزەیی دارە، وە ئەندامەکانی قۆڵگیرو یارمەتی دەری یەکترن، ئیسلام گەل و کۆمەڵێکی ئاوای پێك هێنا لەبەرزترو بەرێزترو پاك و خاوێن تر شێوەی دا بەجۆرێ کە ئادەمی لە هەموو تەمەنی دا شتی وای بە خۆیەوە نەبینیوە، وە مێژووی جیهان و ئادەمی سەرسامە تیایدا، وە لەپاش ئەو یەکەم جارە هەرێکی هێنا چەند جاری تر لە چەند شێوەیە تردا هەرچەند ناگەنە ڕادەو پلە هەرە بەرزەکەی یەکەمجار، بەڵام زۆر بەرزو پیرۆزترن لە هەموو گەل و کۆمەڵەکانی تری جیهان کەلە هەر ڕێگایەکی ترەوە پێك هاتبن لە کۆن و تازەوە لە ژێر سایەی ڕژێمە زەمینیەکاندا.

ئەو گەل و کۆمەڵەی کە ئیسلام پێکی هێنا گەل و کۆمەڵێك بوو کە تێیدا توایەوە ڕەگەزایەتی بە هەموو جۆرو شێوەکانیەوە: نە تیرەو نە بەرەو نە ڕەنگ و نە وڵات و نیشتمان و نە زمان و نە هیچ شتێکی تر کەلەم زەویەوە هەڵئەقوڵێ و بە نەفامی بەکار

ئەهێنرێن، وە شتێك نین بە دەسەڵاتی مەردوم پەیدا ببن، وە لە نبەڕەتدا هیچ پەیوەندیان نیە بە ئادەمێتیەوە... گەل‌و کۆمەڵێکی دەم پاکی دەست پاکی دوێن پاکی نیاز پاك، بە ئەوپەڕی برایەتی‌و کۆمەکی‌و یارمەتی‌و قۆڵگرتنەوە تا ئەو ڕادەی مەردوم توانی بە سۆزو خۆشیەوە باوی کەسێ تریدات بە مل خۆی دا، وە دەست هەڵگرێ لە ماف‌و پێویستی‌و بەرژەوەندی خۆی لەبەر یەکێ ترو لە پێناوی یەکێ تردا.

لەناو ئەو گەل‌و کۆمەڵەدا پیاو لە ژنی خۆی ئەمین‌و ژن لە پیاوی خۆی ئەمین بوو، خزم لە خزم‌و بێگانە لە بێگانە ئەمین بوو، هەموو کەس بێباك‌و ئەمین بوو لە گیان‌و لە ماڵ‌و لە نامووس‌و لە هەموو شتی!

ئەو گەل‌و کۆمەڵەی کە ئیسلام پەروەردەی بکات‌و پێی بکەیەنێ، ئەبێ بێ کارو پەك کەوتووی تیا نەمێنی، ئیش‌و کار فەراهەم بێنێ بۆ هەرکەس توانایە، وە چارەسەری ژیانی کەوتە کارو پەك کەوتوویش بکات، ئەگەر نەیکات تاونبارە لای خوا، وە هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: هەرکەس لەناو هەر کۆمەڵێك دا بمرێ لە برسا ئەبێ خوێنەکەی بسێنرێ لەو کۆمەڵە!

لەناو ئەو گەلە پاکەدا هەموو کەس ڕێزو ماف‌و سەربەستی‌و ئازادی خۆی وەر ئەگرێ بە بێ جیاوازی، تا ڕادەیەك هەرکەس ڕێی هەیە ڕەخنە بگرێ لەهەر کەسێ تر با سەرۆك میری‌و کۆمار بێت، وە لەسەریەغی تەمێ‌و ئامۆژگاری بکات، وە هەرکەس لاڕێ‌و بێشەرعی ببینێ لە سەرۆك میری ئەتوانێ گوێڕایەڵی نەکات بۆی تا نەگەڕێتەوە بۆ لای خواو خۆی چاك ئەکات، وە پێویستە لەسەر سەرۆکیش ملکەچ‌و گوێڕایەڵ بێت‌و سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەو تەمێ‌و ئامۆژگاریە! وە لەم بارەیەوە ڕووداوی زۆر هەیەکە بەناویانگن، گەل‌و کۆمەڵی موسڵمان ئەبێ دامەزراوو ڕاگیر بێت لەسەر ڕاوێژو پرس‌و ڕاو یەکسانی‌و دادپەروەری کە هەموو کارو بارو مافێکی بەستراوە بە فەرمان‌و بڕیاری شەریعەتی خواوە، نەك بە ئارەزووو خواستی کاربەدەست‌و حاکمەوە، ئەمەی کە گوترا لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هەندێکە لەوەی کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات‌و بانگی بڕواداران بۆئەکات، کەواتە با بە ئەوپەڕی خۆشی‌و شادمانیەوە بڕواداران بێنە پێشەوە بۆ گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەری تا بەختەوەر ببن لە هەردوو جیهاندا.

وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا
جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى
ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ

---

لەپاش فەرماندان بەملکەچی تەواو بۆخواوهاتنە ژێر سایەی، ئینجا جڵەوگیری ئەکات لە شوێن کەوتنی شەیتان‌و ڕۆشتن بە ڕێبازەکانی شەیتاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ وە شوێن ڕێبازەکانی شەیتان مەکەون‌و ڕێگەکانی شەیتان مەدەنە بەر بەمەی بە پێچەوانەی فەرمانی خوا بجوڵێنەوە لەڕێگەڕاستەکەی ئەوبترازێن، ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ چونکە بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوەو دوژمنانی خۆی دەربڕیوەو جاڕی پێداوە، دەی هەرکەس ژێر بێت‌و ڕێزی خۆی بەلاوە بێت چۆن ئەبێت شوێنی دوژمنی خۆی بکەوێ؟ خوای میهرەبان لە زۆر شوێندا —وەك لێرەدا— ڕوونی کردووەتەوە بۆ بەندەکانی کە لە جیهاندا تەنها دوو ڕێگە هەیەو دوو بەرنامە هەیە، یا ڕێگەو بەرنامەی خوا، یا ڕێگەو بەرنامەی شەیتان، وە ڕێگەی خوا تەنیا ڕێگەیەکەو ڕێگاکانی شەیتان چەند ڕێگەیەکن، هەرکەس لە ڕێگەکەی خوا لایداو ترازا ئەکەوێتە سەر ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی شەیتان، وە بە هی چکلۆجێ ئەم دوو ڕێگەیە ناگەن بەیەك و تێکەڵ نابن‌و پرد لە نێوانیاندا نابەسترێ، وە هەروەها بەرنامەی خوا تاقە بەرنامەیەکەو بەرنامەکانی شەیتان زۆرن، وە بە هیچ ڕەنگ بەرنامەکەی خوا یەك ناکەوێ لەگەڵ هیچ بەرنامەیەکی تردا، وە بە هیچ کلۆجێ نابێ تێکەڵی هیچ بەرنامەیەکی تر بکرێ، تێکەڵی هەر بەرنامەیەکی تر کرا بە بەرنامەی خوا نامێنێتەوە، هەرچۆنێ خواخۆی بێ‌وێنەوبێ‌هاوبەشە،هەروەهاڕێگەو بەرنامەکەشی بێ‌وێنەو بێ‌هاوبەشە.

خوای میهرەبان ئەوەی چەند جار ڕوون کردەوە بۆ ئەوەی موسڵمانان لە هەڵوێستی خۆیان تێبگەن‌و دوودڵ‌و سەرگەردان نەبن‌و ڕێگەو بەرنامەکەی خوا بەرنەدەن‌و نەترازێن لێی، جا لەبەرئەوە لە بەشی یەکەمی ئایەتەکەدا فەرمانی دا بە بڕواداران کە بە تەواوی بێنە ناو ئایینی خواو ئیسلامەوە، بە جۆرێ ئیسلام هەموو شتیان بگرێتەوەو داگیریان بکات‌و

جێنەسینێتەوە بۆ هیچ شتێکی تر، وە لەبەشی دووەم دا جڵەوگیری کردن لە شوێن کەوتنی شەیتان‌و لادان‌و ترازان لە تاقە ڕێگەی خوا، وە غیرەتی نانەبەر بەمەی کە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە، کەواتە نابێ شوێنی بکەون، ئینجا لە پاش ئەو ڕوون کردنەوە، هەڕەشەیان لێ ئەکات لەسەر ئەو لادان‌و ترازانەو دەست نیشانیان بۆ ئەکات بەسەرەنجام‌و دوا ڕۆژی سەخت‌وبەدیی لادان‌و ترازانەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە لاتان دا لەوەی بە تەواوی بێنە ناو ئیسلامەوە، لەپاش ئەوەی کە چەند بەڵگەو ڕابەری ڕوونتان بۆ هات لەسەر ڕاست‌و ڕەوایی هاتنە ناو ئیسلامەوە، وە ئایەتە ئاشکراکانی قورئان ئەوەی پێ ڕاگەیاندن، ئەگەر ئیچوە لابدەن ﴿فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بزانن کە خوا زاڵە بەسەر هەموو کارو فەرمانی خۆی داو ئەتوانێ تۆڵەتان لێ بسێنێ، کار دروست‌و لێزانەو هەرچی ڕاست‌و ڕەوایە ئەیکات‌و بەجێی ئەهێنێ کە یەکێ لەو شتە ڕاستانە تۆڵە سەندن‌و سزادانی ستەمکارو تاوانبارەکانە، واتە ئەگەر ئێوە لابدەن لە ڕێی خوا، بێگومان خوا تۆڵەتان لێ ئەسێنێ، ئینجا بەجۆرو شێوەیەکی تر هەڕەشەیان لێ ئەکات‌و ئەیان ترسێنێ بە ڕووداوێکی زۆر سامناك لە ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی کە هەربە بیر لێ کردنەوەی هەق وایە مووچرکە بێت بە لەش داو دڵ بکەوێتە تەپە تەپ، بەڵکو هەق وایە خەوو خۆراك لە مەردوم هەڵگیرێ‌و تیکە لە گەروودا بگیرێ، ڕوداوی دەست کردن بە حیساب‌و پرسیارو مەحکەمەی مەردوم‌و هاتنی کاتی سزاو تۆڵە سەندن لە تاوانباران‌و هاتنە خوارەوەی مەلائیکەتەکانی ئاسمانەکان‌و وەستانیان بەدەوری کۆمەڵی ئادەمیدا، ئەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ﴾ ئایا ئەوانەی کە سەرکێشی ئەکەن‌و نایەنە ناو ئایینی ئیسلامەوە بە تەواوی، ئایا ئەوانە بە تەما هەن‌و چاوەڕوانی هیچ شتێ ئەکەن بێجگە لەوەی کە خوا بێت بۆ لایان لەناو چەند هەورێکی سپی کە ڕاستەو گرۆو سێبەر کەرن، خوا بێت بە هاتنێکی بێ وێنە کە شایستەو شایانی ئەو بێت‌و هەر ئەو ئەزانێ چۆنەو ئێمە هیچی لێ نازانین، نەك بە جۆرە هاتنێك کە لای ئێمە باوەو ئێمە ئەیزانین، یان مەبەست دەرکەوتنی خوایە بۆ بەندەکانی، یان مەبەست هاتنی فەرمان‌و بڕیارەتی، یان هاتنی سزاو تۆڵەی.

هاتنی خوا ئەبێ بەیەکێ لەوجۆرانەمەبەست بێت، چونکە خوا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە بێوێنەیە، بەڵام بۆ هاتنی مەلائیکە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ وە مەلائیکەتەکانیش دێن هەر لەسەر دیمەنو ڕواڵەتەکەی ئەیهێنێتەوە، چونکە مەلائیکە دروست کراوی خوانو بەشدارن لەگەڵی سیفەتو دروست کراوەکانی تردا.

مەبەست لەم پرسیارە بێزاری دەربڕینە لە گیروگرفتو سەرکێشی ئەوانەو لە هۆی سەرکێشیەکەیان، واتە ئەوانە چاوەڕوانی هیچ نین بێجگە لەو ڕووداوو بەسەرهاتەی کە بێگومان دێتو بەدی دێت، وە ئەوانە هەرچەند چاوەڕوانی ئەوەنەبن، بەڵام لەبەرئەوەی سەریان لەوەوە دەرنەچێو دووچار بوونیان بە سزای ئەو ڕۆژە شتێکی مسۆگەرە، لەبەرئەوەی وەك بە تەما بنو چاوەڕوانی ئەوە بن وان، ئینجا ــ لەم کاتەدا کە بەو شێوە پرسیارە ئەو هەڕەشە سامناکە ئاراستە ئەکات ــ لەم کاتەدا بەکوتو پڕێك ئەو ڕۆژە وانیشان ئەدات کە هاتبێو کار لە کارەگا ترازا بێ‌هەموو شتێ تەواو بووبێت، ئەفەرموێ: ﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ﴾ وە هەموو کارێ تەواو کراو دوایی پێ‌هێنراو تازەکار لە کارەگا ترازێنراو هەلو فرسەت لە دەست دەرچوو، واتە هاتنی ئەو ڕۆژەو بەدی هێنانی ئەو هەڕەشەیە ئەوەندە ڕاستەو جێگای گومانو دوودڵی نیە، وەك هاتبێ، ئەمەش بە پێی باوی کەس نەدیوی قورئان لە زۆر شوێندا شتی داهاتوو کە هێشتا نیەو نەهاتووە ئامادەی ئەکاتو لە دیمەنو ڕواڵەتی بەدی هاتوودا نیشانی ئەداتو دڵی بەرامبەر ڕاگیر ئەکاتو ئەیوەستێنێ بە وەستانی کەسێك کە ئێستا کەوتبێتە شتەکە.

لەسەر ئەم ڕایە وتەی ﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ﴾ سەربەخۆیەو نەبەستراوە بە پێشەکەیەوە، یان بەستراوە بە وتەی ﴿يَنظُرُونَ﴾ەوە، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە سەربەخۆ نیەو بەستراوە بە وتەی ﴿يَأۡتِيَهُمُ﴾ەوە، واتە ئەوانەی چاوەڕوانی هیچ شتێ ناکەن بێجگە لە هاتنی خواومەلائیکەوجێبەجێ‌کردنی هەمووکاروباروحیسابوپرسیارو تۆڵەو پاداشتی بەندەکان، ئەم ڕایە هەرچەند ڕێكو گونجاوە، بەڵام بە ڕاستی دڵ بە ڕای یەکەمەوە باشتر ئەنووسێ و بەئارام ترە، وە خوا باش ئەزانێ، لەسەر هەر بارو بە هەر حاڵ ئەوانەی کە دواکەوتوونو بەجێ‌ماون، بە فریاکەونو بە زوویی بێنە ناو ئیسلام، وەك خوا فەرمانی دا، با فریای خۆیان بکەونو بگەڕێنەوە بۆلای خوا کەهیچ چارە نیەو ڕزگار بوون نیە بەو گەڕانەوە نەبێت،

وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾

چونکه ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ هەموو کاروبارەکان هەر بۆ لای خوا ئەگێڕێنرێنەوە، لە پاش ئەوەی کە ئەو هەڕەشە سەختەی ئاڕاستەی سەرکێشەکانی ئەم ئوممەتە کرد، ئینجا سەرنجێك ڕائەکێشێ بۆ ئاووڕ دانەوە بۆلای ئیسرائیلیەکان کە نموونەو وێنەی سەرکێشی و گێرو گرفتن، وەك لەم سورەتەدا باسی هەڵوێستی ناڕاست و ناڕەوایان کرا، سەرنجێك ڕائەکێشێ بۆ ئەوە بەمەی فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە پرسیاریان لێ بکات کە ئایا خوا چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرای پێ بەخشین، پرسیاریان لێ بکات بۆ دەم کوت کردن و سەرزەنشتیان بەوەی کە ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگەو ڕابەرە ئاشکرایانە کاری لێ نەکردن و کەمێکیان بە تەواوی ڕاست و ڕێك بوون لە شوێن کەوتنی ئایینی خواو پێغەمبەرەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ پرسیار بکە لەنەوکانی ئیسرائیل ﴿كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ﴾ ئایا چەند موعجیزەو ڕابەری ڕوونمان پێبەخشین، واتە بە تەشەرەوە بپرسە لەو ئیسرائیلیانەی سەردەم و چەرخی خۆت کە ئێمە نیشانەو موعجیزەی زۆرمان بەخشی بە باوك و باپیرە پێشووەکانیان، ئیتر لەسەر داوای خۆیان یان بەبێ داوا، کەچی لەگەڵ ئەوەدا دوو دڵی و گێرو گرفت و سەرکێشیان بەکارهێنا تا خوا ئەو هەموو سزاو بەسەرهاتە سەختەی بەسەرهێنان، چونکە ئەمە باوو یاسای خوایە ﴿وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ﴾ هەرکەس چاکەو بەهرەی خوا -واتە نیشانەو موعجیزەکانی کە مایەو هۆی بڕواو ڕێنموونین- بگۆڕێ، بەم ڕەنگە بیانکات بە مایەی بێبڕوایی و هۆی گومڕایی، یان ئایەتەکانی نامەکانی بگۆڕێ، بەم ڕەنگە دەستیان تێبخات بە زیادو کەم کردن و سڕینەوەو شاردنەوە، ئەو گۆڕینەش لە نەزانین و بێئاگاییەوە نەبێت، بەڵکو ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ﴾ لەپاش ئەوەی بۆی هاتبێ و پێی گەیشتبێ و تێی گەیشتبێ، هەرکەس ئەو گۆڕاندنە بکات،

بێگومان خوا تۆڵەی لێ ئەستێنێ‌و سزای ئەدات، چونکە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ بەڕاستی خوا زۆر تۆڵەو سزای بەتینە، ئینجا ئایا مەبەست بەو پرسیارە پرسیاری ڕاستەقینە بووبێ کە ئاراستەیان بکات بۆ سەرزەنشت کردنیان، یان مەبەست هەر بیرخستنەوەی ئەو هەموو نیشانەو موعجیزانە بێت، لەسەر هەردوو بار پەندو ئامۆژگاری‌و ترساندنی تیایە دەربارەی ئەم ئوممەتە کە وریای خۆیان بن لەڕێگەی خوا لا نەدەن وەك ئەو ئیسرائیلیانە، هەرچۆنێ تەمێ‌و ترساندنە بۆ هەموو ئیسرائیلیەکان لە پاش هاتنی ئیسلام هەتا هەتایە بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەی خوا لەم جیهانەدا پێش هاتنی ڕۆژی دوایی شتێکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە لە ژیانی ئیسرائیلی دا لە کاتێکەوە کە دەستیان کرد بەو گۆڕاندنەو هەتا ئێستاش، وە هەروەها لەم ئوممەتەشدا هەر زۆر ئاشکرایە، ئەوەتا تا چاویان بڕیە ئەم قورئانەو بە گەورەترین چاکەی خوا سەیریان کردو مەبەستەکانی قورئانیان بەدی هێنا بەڕێك‌و پێکی، تا بەو جۆرە بوون خوا بەرزی کردنەوە لە ژیان‌و جیهاندا تا ڕادەیەك کە مێژووی ئادەمی لە هەموو تەمەنی دا شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە، بەڵام لەکاتێکەوە لایاندا بەرەو پەستی‌و نزمی هاتن تا وایان لێ هات بە ئوممەتی نەمان‌و پێشێل کراون‌و بوون بە شوێن کەوتوو شتێکی ناڕاست‌و ناڕەوادا، زۆر بە داخەوە شوێنی بێگانە کەوتن لە هەموو باوو خوو ڕەوشتێکی پیس‌و بەددا... بێناموسی‌و بەرەڵایی‌و دزی‌و دەخەڵی‌و دەست‌و دەم‌و پیسی‌و هەموو ڕەوشت‌و کردارێکی تر کە دژی پیاوەتی مرۆڤایەتیە، بەڵام هەر هیچ نەبێ داویشیان نەکەوتن لە پێشکەوتنی پیشەسازی‌و کاروباری تازەدا.

ئەو ئوممەتە گەورەیە بەو جۆرەی بەسەرهات، بەڵام ئومێد وایە بکەونەوە سەر ڕەوڕەوەی بەرزیی‌و بڵندی‌و پاشە ڕۆژێکی کامەرانی‌و بەختەوەری بەرەو ڕوویان بێت، چونکە چەند ساڵێکە خەریکە هۆشێك ئەکاتەوەو لەخەوی بێئاگایی ڕاست ئەبێتەوەو ئەزانێ هیچ چارەی نیە بە گەڕانەوە نەبێت بۆلای قورئانەکەی‌و ڕەوشتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وە دەردەکەی خۆی ناسیوە لەگەڵ چارەسەرو دەرمانەکەی دا.

داوای یارەمەتی و ڕێنموونی ئەکەین لەخوا بۆ ئوممەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) لەکاتێکدا دڵخۆش و دڵنیاین بە چەند حەدیسێك کە موژدە دەرن بە پیرۆزی ئەم ئوممەتەو گەڕانەوەی بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆی، لەپاش ئەو هەڕەشەو ترساندنەی کە ئاڕاستەی ئەوانەی کرد کە گیروگرفت ئەکەن لە گوێڕایەڵی و هاتنە ناو ئایینی خوا، وە نیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی خوا ئەگۆڕن، لەپاش ئەوە ئینجا هەندێ لە حاڵ و باری بێبڕواو بڕواداران باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەم ژیانە نزیکە ـ واتە ژیانی ئەم جیهانە ـ ڕازێنراوەتەوەو شیرین و خۆشەویست کراوە لای ئەوانەی کە بێبڕوا بوون و بێبڕوان، شیرین و خۆشەویست کراوە لایان، تا ڕادەیەك دڵی داگیر کردوون و هەر ئەم ژیانەیان مەبەستەو چاویان تێبڕیوەو چاوی لێ کلا ناکەن، لەبەرئەوە هەرچی تێکۆشان و خەریك بوونیان هەیە هەر بۆ ئەمەو چاوێ بەرز ناکەنەوە بۆ ئەو ئاسۆ بەرزانەی کە بڕواداران چاویان تێبڕیوەو کردوویانە بە مەبەستی سەرەکی بۆ ژیان و جیهانیان، بەڵێ بێگومان ئەم ژیان و جیهانە بە سروشت خۆشەویستی هەیە لە دڵی بڕواداریش دا ـ وەك لە چەند ئایەت و حەدیسیشدا دەست نیشانی بۆ ئەکات ـ بەڵام لە هەمان کاتدا بڕوادار خۆی لێ ئەکێشێتەوەو خۆی بە دەمیەوەو نرخ و ڕێزێکی ئەوتۆی نادا، ئەوەش نەك لەبەر گەمژەیی و لێ نەهاتن و داماوی، وەنەك لەبەرئەوەی کەنار گیرە لە ژیان و نایەوێ گەشە بکات بە ژیان و ژیان بەرز بکاتەوە، نەخێر لەبەر هیچ کام لەوانە نیە، چونکە گەشە کردن بە ژیان و بەرزکردنەوەو هەوڵدان بۆ ئاوەدان کردنەوەو شارستانی لەوڵاتداو بەکارهێنانی هەموو هێزو وزەکانی زەوی لە خزمەتی مەردومدا، هەموو ئەوانە بەشێکن لە هەڵسانی بەکارو فەرمانی جێنشینیەکەی کە خوا خستیە سەرشانی، بڕواداری قورئانی کە دڵ نابەستێ بەم ژیانەو چاوی تێ نابڕێ، لەبەرئەوەیە کەوا بەئاسۆی هەرە بەرزەوەو مەبەست و خەریك بوونی گەورەتری هەیەو بەرزو بەڕێزترە لەم ژیان و زەویە، مەبەست و نیازی دڵی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خواو ژیانی کامەرانی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی، وەکارو فەرمانی لەم زەویەدا بریتیە لە تێکۆشان و ژیان و گیان بەخت کردنی لە پێناوی چەسپاندن و دامەزراندنی بەرنامەو ئاڵای خوا لەزەوی دا، وە دانە دەستی سەرکردایەتی و جڵەوی ژیان و جیهان، بەدەستی ئایین و بەرنامەی خوا، جا لەبەرئەوە ئەو بڕوادارە قورئانیە پەرۆشی نیەو نایەوێ

خۆی خەریك بكات بەم ژیان و ڕابواردنە نزیكە كە شتێكی كاتیە و بە زوویی لەناو ئەچێت، ئیتر با بوەستێ ئەو هەموو تاڵی و سوێریەی كەلەم ژیان و جیهانەدا هەیە، هەرگیز نایەوێ خۆی بخاتە ئەو هەموو قوڕاو و زەلكاوە بۆگەنە و پشت بكاتە ئەو مەبەست و كارو كردەوە بەرزو بەڕێزانەی كە باس كران، جا ئەو بێبڕوایانە كە چەقیون لە قوڕو زەلكاوی ئەم جیهانەدا، وە بوون بە بەندەی ئەڵقەی لە گوێی ئەم ژیانە و سەریان كردووەتە خۆشی و ڕابواردنەكەم و كوڕەكەی و لایان وایە مەبەست و ئامانجی ئادەمی هەر ئەو خەوو خواردن و ڕابواردنە ئاژەڵیەیە، ئەم بێبڕوایانە كاتێ سەرنجی بڕواداران ئەدەن كە خۆیان خستووەتە زەحمەت و مەینەت و هاوبەشی ئەمان ناكەن لەو ژیان و ڕابواردنەداو بێبەشن لێی، كاتێ كە سەرنجیان ئەدەن بە نەفام و گێل و نەزانیان تێئەگەن، وە بە تایبەتی لاقرتیان ئەكردو گاڵتە ئەكەن بە بڕوادارە هەژارو بێنەواكان، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ وە لاقرتی ئەكەن و گاڵتەیان لێ دێ بەوانەی كە بڕوایان هێناوە.

ئەو ترازووەی كە بێبڕوایان كێشانەی پێئەكەن و نرخ و بێنرخی پێدیاریی ئەكەن؛ ترازوویەكی بێ كەڵك و بێنرخە و سەرئەكات و بە پێچەوانەشت ئەدات، چونكە ترازووی ئەم زەویە ترازووی دەستی نەفام و نەزانە، ترازووی ڕاست و ڕاستەقینە ئەوەیە كە لەدەستی خوادایە و ئەو داینا و ە و نرخی ئەو بڕوادارانەی پێدیاریی ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ وە ئەوانەی كەلە جیهاندا خۆیان پاراستووە لە خەشم و ناڕەزایی خواو لە خوا ترسان، ئەوانە هەمیشە بەرزن و وان بەلای سەرووی ئەو بێبڕوایانەوە كە ڕۆژی دوایی دا، بەرزن لە جێ و شوێن دا، چونكە ئەمان لە بەهەشت دان و ئەوان وان لە دۆزەخدا، كە پەست شوێنە، وە بەرزن لە ڕێزو قەدردا، چونكە ئەمان ئەگەن ئەوپەڕی پلەو ڕادەی بەختەوەری و كامەرانی، وە ئەوان ئەكەونە ناو چاڵی زەبوونی و ڕیسوایی و چارەڕەشی، وە بەرزن لەمەدا كە قسەیان سوارە بەسەر ئەواندا، تەشەریان لێ ئەدەن و گاڵتەیان پێئەكەن، هەرچۆنێ ئەوان لە جیهامدا تەشەرو توانجیان ئەدا لەمان، كەواتە ئەمان با لەجیهاندا بە ڕێی ڕاستی خوایاندا بڕۆن و هیچ گوێیان نەبێ لەنەفامی ئەو نەفامانە، وە دڵ گران و دڵ تەنگ نەبن لە دەمبازی و گاڵتە كردنیان لەم جیهانەدا، چونكە بە شایەتی خوا ئەمان بەرزو بڵندن لەوان و وان بەلای سەرووی ئەوانەوە.

وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ

---

**﴿وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴾** وە هەرکەس خوا مەیلی لێ بێت ڕۆزی ئەدات بە زۆری و بەلێشاو بەبێ ژمارەو حیساب لەم جیهان یان لەو جیهان یان لە هەردووکیان، وە خۆی باش ئەزانێ چۆن باشەو بەرژەوەندی لەچی دایە، خوا بە لێشاو خۆشی و ڕۆزی ئەدات بەبێ بڕوایان یان لات و بێبەشیان ئەکات لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی ئەزانێ وە هەروەها بڕوادارانیش، کەواتە بڕواداران با هەرچاویان لە خوا بێت و ئیتر دەربەستی هیچ شتێك نەبن پاش ئەوەی کە خوا بەڵێنی داوەو بەشی بەرزو نەبڕاوەی داناوە بۆ چاکان و پاکان.

لەئایەتی پێشووەوە دەرکەوت کە هۆی یاخی بوون و نەگەڕانەوەی بێبڕوایان زۆر خۆش و ویستی ژیانی ئەم جیهانەیە، ئینجا لەم ئایەتەدا کەدێت باس ئەکات لەوە بۆ کات و چەرخێکی تایبەتی نیە، بەڵکو لە هەموو کاتێکدا هەر ئەو زۆر خۆش و ویستنە بووە بە هۆی لادان لە ڕێی خوا، ئەوەتا خەڵکی یەك بارو یەك دڵ بوون لە یەکەم جارەوە، ئینجا بەهۆی بەربەرەکانێ لە ڕێی ژیاندا دووبەرەکی بوون، ئینجا خوا پێغەمبەرانی نارد لەگەڵ نامەی خۆی دا بۆ ئەوەی بارو ڕێی ڕاست دیاری بکەن، وە تەنها ترازووی خوا بگرن بە دەستەوەو بەکاری بێنن بۆ ناسینی هەموو شتێ لەڕادەو پلەی خۆی دا، ئەفەرموێ: **﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾** ئادەمی لە پێشەوە یەك میللەت بوون، لەسەر یەك ڕێگەو بەرنامە، وە یەك بیروباوەڕو بۆچوون وون، هەموو خواپەرست بوون بەبێ هیچ هاوبەشێك، ئیتر مەبەست بەو کۆمەڵە ئادەمیە ئەو کۆمەڵە بچووك بێت پێك هاتبوو لە ئادەم و حەواو ڕۆڵەو نەوەکانیان پێش پەیدا ئاژاوەو دووبەرەکی لەناویاندا، یان مەبەست بەو کۆمەڵە بچووکەبێت کە پێك هاتبوو لەوانەی کەلە کەشتیەکەی نوحدا بوون پاشان نیشتەجێ بوون و هەموو پەیڕەوی نووحیان کرد، یان هەر تاقم و کۆمەڵێ تر، وەك چەند ڕیوایەتێکی هاتووە پێیان، بە هەرحاڵ قورئان بۆمان باس ئەکات کە ئادەمی لەیەك بنەڕەتەوە هاتووەو ڕۆڵەی یەکەم خێزانە کە خێزانی ئادەم و

حەوایە، وە خوا ویستی کە هەموو ئادەمی ببن بە بەرهەمو بێچووی ئەو خێزانە بچکۆلەیە، بۆئەوەی خێزان بکرێ بە یەکەم ئادەمی، وە لەسەر بیروباوەڕی پێك هێنانی خێزان ژیان بڕوات، ئەم ئادەمیە لە یەکەم جارەوە یەك دڵو یەك ئاینو یەك عەقیدەو یەك باوەڕبوون، هەتا زۆر بوونو پەرەیان سەندو جیابوونەوەو دوورکەوتنەوەو بڵاوبوونەوە لە وڵاتدا، وە شێوەی گوزەرانو ژنیان گۆڕا، وە ئەو هەموو هێزو وزەو ئامادەییو لێهاتنە جیاوازانەیان ئاشکرا بوونو دەرکەوتن، پاش ئەوەی کە شاراوە بوون لە لەشو دەروونندا، وە خوا بەو جۆرە سروشتی داڕشتنو لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی چاك ئەزانێ، ئەو جیاوازیو جۆرجۆریە شتێکی پێویست بوو بۆ بەسەر بردنی ژیان لەم زەویەدا، ئینجا بەهۆی ئەو جۆرجۆریو جیاوازیە سروشتیە بەربەرەکانێو ئاژاوە پەیدا بوو فەراهەم هات، وە لەوەشەوە چەند بیروباوەڕو بەرنامەو بۆچوونی جیاجیاو جۆربەجۆر فەراهەم هات ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ لەبەرئەوە خوا پێغەمبەرەکانی ڕەوانەکرد ﴿مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ بەجۆرێ مـوژدە دەرو ترسێنەربن، موژدە دەربن بە بڕواداران، بە پاداشتو نازو ڕێزی بەهەشت، وە ترسێنەری بێبڕوایان بن بە تۆڵەو سزای ڕۆژی دوایی ﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ وە ناردیە خوارەوە لەگەڵیان نامەی خۆی کە حەقو ڕاستی تیابوو، وە نیشان دەری ڕێگاو بەرنامەیەك بوو کە حەقو ڕاستە، بێگومان حەقو ڕاست ئەبێ یەك شت بێتو دەست نادا بۆ ئەوەی لە یەك شت تێپەڕ بکات، وە ئەوا خوایش دەری ئەخات کە هەمیشە نامەی خۆی هەقی هێناوەو هەقێ پێبووە، وە ئەو نامە هەقەشی ناردووە، ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ﴾ بۆئەوەی بڕیاری بداو بێتە حەکەم لە بەینی خەڵکی داو ئاژاوە نەهێڵێ لەناویاندا لەو هەقەی کە تیای دا دووبەرەکی بوون.

ئەم فەرموودەیە دەست نیشانو ئاماژەئەکات بۆ چەند شتێکی گەورەو گرنگ کە سەرەکیو بنەڕەتن لە ئایینی پاکی ئیسلام دا:

١- هەموو ئاینو نامەکانی خوا لە بنەڕەتو مەبەستو ئامانجدا هەریەکن، هەموو بۆ ئەوە هاتوون تەنها خوایەك هەیە، وە تەنیا پەروەردگارێك هەیە، وە ئەبێ تەنیا پەرستراوێك هەبێ، وە تەنیا خاوەن شەرعو یاسایەك هەیە بۆ ئادەمی، ئینجا لەسەر ئەو بنەڕەتە

جیاوازی بووه له هەندێ شتی تایبەتی بە پێی پێویست و بەسەر هاتە تایبەتیەکانی گەل و تاقم و چینەکانی ئادەمی، وە بەپێی گۆڕانی بارو شێوەی ژیان، هەتا دواترین شێوەی ئاینی خوا هات کە ئەم ئیسلامە هێنای، وە ژیانی بەرەڵا کرد کە بەرز ببێتەوە و گەشە بکات و پەرەبسێنێ لە چوار چێوەی ئەم ئاینە پیرۆزەدا بە سەرکردایەتی خواو شەریعەتە زیندووەکەی کە چارەسەری هەموو کۆسپ و گرێیەکی تێدایە.

٢- ئەبێ تەنها ئاین و نامەی خوا حەکەم و حاکم بێت، وە قسە ئەبێ هەر قسەی ئەوبێت، وە هەق و ڕاست هەر ئەوە، وە بەبێ گەڕانەوە بۆلای ئەو کاری ئەم ژیان و ئادەمیە ڕاست نابێتەوە، وە خەڵکی ڕزگار نابن لە ئاژاوەر دووبەرەکی، وە ئاشتی و ئارام پەیدا نابێ لەزەویدا.

٣- ئاین و نامەی خوا ئەسڵ و بنەڕەتەو لە پێشەوە بووە لەناو ئادەمی دا، وە هەموو ئاین و بیرو باوەڕی پڕوپووچ لەپاش ئەو پەیدا بوون و داهاتوون بە هۆی لادان لە ئاین و نامەکانی خواو دوورکەوتنەوە لەو یاساو بنەڕەتە گەورەیە، نەک وەک موستەشریق و ڕۆژئاواییەکان و شوێن کەوتووە نەفامەکانیان ئەڵێن: کە ئاین و خواپەرستی بە تەنیا لەپاش دا داهاتووەو بەرەبەرە بەرز بووتەوە بە گوێرەی بەرز بوونەوەی ئادەمی و گۆڕانی بارو ڕووی ژیانی، پێویستە هەموو موسڵمانێ ئەمەی کە ئەمانەو وتوویانە بە درۆی بزانێ و دژی بێت، چونکە ئەم قسە دژو پێچەوانەی ئاینی خواو قورئانە. بە یارمەتی خوا ئەم قسە ناڕەوایە بە درێژی بەرپەرچ ئەدەینەوەو بەدرۆی ئەخەینەوە لە شوێنێ تایبەتی خۆی دا.

٤- بیرو ژیریی ئادەمی بەس نیە ناتوانێ یاساو بەرنامە دابنێ، وە هەر یاساو ڕژێن و بەرنامەیەکی لە خۆیەوە دانابێت و دای بنێ پڕە لە هەڵەو بەکار نایەت و چارەسەر نیە بۆ ژیان، چونکە بەشایەتی خوا ئاین و نامەی خوا هەقەو ڕاستە، وە هەق و ڕاستیش ئەبێ هەریەک بێت و ناگونجێ زیاد لە یەک، کەواتە هەرشتێ لەئاین و نامەی خوا وەرگیرا ئەوە هەق و ڕاستەو هەرشتێ لەو سەرچاوە پاکەوە نەهاتبێ هەڵەیەو ناڕاستە با هەموو ئادەمی بڕیاری لەسەر بدەن و بەڕاست و ڕەوای دابنێن!!

وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾

خوا میهرەبان نامەی نارد تابیێ بە حەکەم ئاژاوەو دووبەرەکی نەهێڵێ لەناو ئەو خەڵکەداو هەقیان بۆ ڕوون بکاتەوەو هەموو کۆببنەوە لەسەری، لەکاتێکدا ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ﴾ کە هەر ئەوانەی نامەکەیان پێ درا بوو دووبەرەکی بوونو دووبەرەکێتیان بەکار هێنا تیای دا، واتە کارەکەیان پێچەوانە کردەوە، بەم ڕەنگە ئەو نامەیەی کە بۆ نەهێشتنی دووبەرەکیەتی هاتبوو، کردیان بە هۆی دووبەرەکیەتی ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ لەپاش ئەوەی چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوونیشیان بۆ هاتبوو لەسەری، وە دووبەرەکیەتیەکەشیان ﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ﴾ هەر لەبەر حەسادەتی ناو خۆیان بوو کە جێگیربوو بوو لەدەروونیان دا، وە لەبەر زۆر خۆش ویستنو سووریان بوو لەسەر ژیانی ئەم جیهانەو پوولو دەستکەوتی ئەم جیهانە، وە لەبەر بە دواگەڕانی بەرزیو زاڵی بەسەر یەکتردا، بەڕاستی ئەوە شتێکی زۆر ڕاستە، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە هەردوو کەسێك ئاژاوەو دووبەرەکیان بووبێ لەوهەقە ڕوونو ڕەوانەی کە ئەم نامەی خوا هێناویەتی، هیچ دوو کەسێك بەو جۆرە نابن مەگەر کاتی هەردوو یان یەکێکیان دەروونیان نەخۆشو دەردەدار بووبێت بەو نەخۆشیە خراپە کە هۆی زۆربەی ئاژاوەو دەست درێژیە لە جیهاندا، بەڵام هەر دڵی کە بەهۆی بڕوا بە خوا پاك بێت لەو نەخۆشیە بەباشی هەق وەرئەگریو سەری بۆ شۆڕ ئەکات، وەك وەرئەگیرێ لەم فەرموودەیەوە: ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ﴾ ئینجا خوا ڕێنموونی ئەوانەی کردووە کە بڕوایان هێناوە، ڕێنموونی کردوون بە ئیزنو فەرمانی خۆی بۆ ئەو هەقەی کە مەردوم دووبەرەکیان تیا کرد، ڕێنموونی کردن بەهۆی ئارەزوو کردنیان بۆ گەیشتن بە هەقو ڕاستی، ﴿وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ﴾ وە هەکەرس خوا خۆی بیەوێ ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕێگەی ڕاست، وە خوا خۆی بەندەی خۆی باش ئەناسێ، وە ئەزانێ کام بەندەی ئامادەیە بۆ ڕێنموونی وەرگرتنو وەستانو دامەزران لەسەرێ ڕاستەکەی خۆی، ئەتوانین ئەم ئوممەتی پێغەمبەرە (ﷺ) بە وێنەو نموونە بێنێتەوە بۆ ئەوەی کە خوا خستوونیە سەر باری ڕاستو ڕێی ڕاست لەهەر شتێکدا کە جوولەکەو مەسیحی دوو بڕو

دووبەرەکی بوون تیای دا، وەك (ئیبن‌و ئەبی حاتەم) ڕیوایەتیشی ئەکات لە (زەیدی کوڕی ئەسلەم)ەوە کە ئەفەرموێ: دوو بڕ بوون لە ڕۆژی هەینی دا، جوولەکە شەممەی وەرگرت، وە مەسیحیەك شەممە، وە خوا ڕێنموونی ئەم ئوممەتەی کرد بۆ ڕێگە ڕاستەکە کە هەینیە، وە دوو بڕ بوون لە بارەی ڕووگەوە، مەسیحی ڕۆژهەڵاتی کرد بە بەڕووگە، وە جوولەکەش (بیت المقدس) وە خوایش ڕێنموونی ئەمانی کرد بۆ کەعبە، وە دوو بڕ بوون لە بارەی نوێژەوە، هی وایان بوو سەجدەی ئەبردو ڕکوعی نەئەبرد، وە هی وابوو پێچەوانەی ئەوان، وەهینی وایان بوو لە نوێژدا قسەیان ئەکرد، هینی وایان هەبوو کەلە نوێژدا هات‌و چۆو گەڕانی ئەکرد، ئینجا خوا ئەمانی خستە سەر هەق‌و بارە ڕاستەکە، وەك ئەبینین ئەم نوێژە ئەکەن بەم ڕێکیە، وە دوو بڕ بوون لە بارەی (ئیبراهیم)ەوە، نەسرانیەکان بە نەسرانیان دائەنا، وە جوولەکەش بە یەهوودیان دائەنا، ئینجا خوا ئەم ئوممەتەی خستە سەر بارە ڕاستەکە کە ئەمەیە (ئیبراهیم) هیچ کام نەبووە، بەڵکو لە هەموو شتێ لای داوەو ڕێی خوای داوەتە بەرو موسڵمان بووە، وە دوو بڕ بوون لە عیسادا، جوولەکە بڕوایان پێ نەهێناو بوختانیان کرد بۆ دایکی پاکی وە مەسیحیەکانیش کردنیان بە خواو کوڕی خوا، ئینجا خوا ڕێنموونی ئەم ئوممەتەی کرد بۆ بارە ڕاستەکە کە بەندەو پێغەمبەری خوایە، وە هەروەها بۆ هەر شتێ تر کە ئەم ئوممەتە بڕواداره خوا خستیە سەر ڕێ ڕاستەکەی خۆی.

ئینجا ئەو هەموو تەمێ‌و ئامۆژگاریانە کۆتایی پێ‌ئەهێنێ کە مەبەست پێیان داهێنان‌و داڕشتنی بڕوایەکی تێرو تەواوو ڕوون بوو لەدڵی کۆمەڵی موسڵمان دا... کۆتایی پێ‌ئەهێنێ بەمەی ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو بڕوادارانەی کە دووچاری هەر جۆرە سزاو ئازار بوون لەلایەن دوژمنەکانیانەوە لە سەرەنجامی ئەو ئاژاوەو دووبەرەییەی کە پەیدا بوو لەسەر ئایینی خوا لەنێوان ئەمان‌و ئەو دوژمنانەیاندا، ڕووی فەرموودەیان تێ ئەکات کە باوی خوا هەر لە کۆنەوە هەروا بووەو هەروا هاتووە کە ئەبێ بڕوادارو خاوەن عەقیدە بەرگری‌و فیداکاری بکەن لە پێناوی بڕواو عەقیدەکەیاندا، وە نابێ هەروا لە خۆڕایی بەهەشت دابنێن بۆ خۆیان پێش ئەوەی پاڵفتە بن‌و لەو تاقی کردنەوە سەختانەدا دەرچن کە گەل‌و ئوممەتە ڕابووردووەکان گوزەریان کرد پیای داو بەباشی دەرچوون لێیان، ڕووی فەرموودەیان تێ ئەکات بۆ هاندانیان لەسەر خۆگری‌و دامەزراوی‌و بەرگەگرتنیان لەسەر دژایەتی‌و دوژمنایەتی‌و بێ‌بڕوایی دەست درێژی کەران،

أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ

---

ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئایا گومانتان وا بردووەو لاتان وایە کە ئەچنە بەهەشت ﴿وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ﴾ لەکاتێکدا کە هێشتا بەسەرتان نەهاتووە وێنەی سزاو ئازارو بەسەرهاتی سەختی ئەو بڕوادارانەی کە هاتن‌و ڕۆیشتن: لە پێش ئەوە کە ئەو بەسەرهاتی ئەوانە شتێکی سەرسووڕهێنەر بوو، تا ڕادەیەك بە وێنەو چیرۆك ئەگێڕدرایەوە، واتە ئەو گومانەتان بێ‌جێ‌و ناشایستەیە تا ڕادەیەك کە شایانی بێزاری لێ دەربڕینە.

ئەگەر پرسیار بکرێ لەبەسەرهاتیان وەڵامیان ئەدرێتەوە بەمە ﴿مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ﴾ ترس‌و بیمی زۆرو نەبوونی‌و قات‌و قڕی بە تین‌و تاڵان‌و ئاوارە کردن دووچاریان بوو، ﴿وَٱلضَّرَّآءُ﴾و ئێش‌و ڕێش‌و نەخۆشی‌و زام‌و کوشتن‌و بڕین، ﴿وَزُلۡزِلُواْ﴾ وە ناچارو بێ ئارام کران‌و لەرزە، وەك بوومەلەرزە کرابێ بە گیان‌و لەشیان ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ هەتا گەیشتە ڕادەیەك کە پێغەمبەرەکەو ئەوانە کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵی ئەیانگوت: ﴿مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ﴾ ئایا کەی دێت یارمەتی خوا بۆمان؟ کوا تاکەی نایەت ئەوەی کە خوا بەڵێنی پێ‌داین؟ ئەم پرسیارەیان بەدەم گوتیان بەدڵی دا گوزەری کرد بێ مەبەست‌و داواکردن‌و ئاواتە خوازیی، بۆ بەدی هاتنی بەڵێنەکەی خوا، لەبەر درێژە کێشانی دەردبارە گرانەکەیان، نەك خوا نەخواستە گومان‌و دوودڵیان بووبێ لە بەڵێنەکەدا.

بەڕاستی پێویستە زۆر بیر بکرێتەوە لەم ئایەتە، چونکە تا بیری لێ بکرێتەوە سەختی‌و بەتینی ئەو بەسەرهاتانەیان ڕوون تر ئەبێتەوە، ئای هاوار بۆ بەسەرهاتێ ئەوەندە سەخت‌و بەتین بێت، پێغەمبەران –سەلامی خوایان لێ بێت– کە لە هەموو کەس خواناس ترو زانا تر بن بە کارو فەرمانی خوا، وە دڵیان لە هەموو کەسێکی تر پەیوەست تر بێت بە خواوە، ئەو پێغەمبەرانەو شوێن کەوتووەکانیان بێ‌ئارام بکات تا ئەو ڕادەی خۆیان بۆ نەگیرێ وتەی ئاوا بە دەمیاندا بێت یان بە دڵیاندا گوزەر بکات!!

بە ڕاستی شتێکی سامناکی سەرسوڕهێنەرە!! لەو کاتە زۆر تەنگەدا خوا هات بە هاواریانەوەو لەلایەن خواوە ئەم موژدەیان بۆ هات ﴿أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾ ئاگادار بن کە بێگومان یارمەتی دانی خوا بۆتان نزیکە، خوا ئەو مزگێنیەی پێدان و بێگومان ئەبێ بەدی هاتبێ، چونکە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ هەواڵی خوا بە ڕاست دەرنەچێ، کەواتە پێویست نیە بە هەواڵ دانی بەدی هاتنەکەی، ئەوانە ئەو هەموو سزاو زەحمەتەیان چەشت و کەوتنە ئەو تەنگیەو لەگەڵ ئەوەدا سەریان دانەخست بۆ غەیری خوا، وە بەتەمای هیچ شتێ نەبوون کە لای خواوە نەبێت، وە داوای یارمەتی و فریادڕەسییان هەر لە خوا کرد، لەبەر ئەوە شایان و شیاوی و ئەو یارمەتی و بە هاوار چوونەوە بوون، کەواتە با هەموو بڕوادارێک پەیڕەوی ئەو خواپێداوانە بکات تا خوایش بیچێت بە هاواریانەوە، وەك چوو بە هاواری ئەوانەوە، وە ئەوانە بەو دامەزراوی و خۆگریە شایستە بوون بۆ بەهەشت، شایانی ئەوە بوون کە بە تەمای بەهەشت بن!! بێگومان تێکۆشان و تێگڕان و خۆگری لەسەری دڵو دەروون بەهێز ئەکات، وە بەرزو بڵندی ئەکاتەوە بەسەر هەموو شتێکدا، وە پاك و خاوێنی ئەکاتەوە وەك ئاڵتوونی تێزاب، بە هۆی ئەوەوە لە پێش چاوی مەردوم بە گەورەو شیرین و بە نرخ دەرئەکەوێت، هەرچۆنێ نرخ و ڕێزو هێزی عەقیدەو بڕواکەش دەرئەخات، ئەو حەلە خەڵکی بە پۆل هەوڵی بۆ ئەدەن و دێنە ژێر سایەی و ئەیگرنە گەردن، وەك هەر بەو جۆرە ڕووی داوەو باس کراوە لە مێژووی خۆگران و تێکۆشەراندا، بێجگە لەوەش هەر ئەو زاڵبوون و سەرکەوتنە بەسەر هەموو ناڕەحەتی و هێزەکانی زەویدا کە بە ڕاستی ڕێگر پەك خەرە بۆ مەردوم و دەماری پیاوەتی سست ئەکەن.

ئەو زاڵبوون و سەرکەوتنەو بەرەڵابوون لەو کۆت و زنجیرانە دەست کەوتێکی گەورەو گرنگە بۆ بڕواداران ئەو هەموو سزاو ئازارو ناڕەحەتیە ئەهێنێ. ئەوەیە ڕێگەی بڕواداران کە خوا لێرەدا ئەیخاتە بەرچاومان بۆ هەموو چەرخ و چین و کاتێك.

ڕێگەکەیان بڕوای بەهێزو تێکۆشانە بەبێ کۆتایی. وە سزاو ئازارو تاقی کردنەوەو دامەزراوی و خۆگری... وە ڕووکردنە خوا بە تەنیا، ئینجا یارمەتی و زاڵ بوون ئەبێت، لە پاش دا لە ڕۆژی دوایی دا نازو ڕێزی نەبڕاوەی بەهەشت.

لەم شەش ئایەتەی داهاتووەدا باس لە چەند پرسیارێك ئەكات كە موسڵمانەكان ئاڕستەی پێغەمبەریان ئەكرد (ﷺ) كە ئەو جۆرە پرسیارانەشیان لەبەر تێگەیشتن و وریابوونەوەیان بوو لە بارەی عەقیدەو بڕواكەیانەوە، بەم ڕەنگە ئەیان ویست لە هەموو كارو بارێكی ژیانیاندا بەپێی عەقیدەو بڕواكەیان بجوڵێنەوە كە ئەوەش بەڕاستی نیشانەی موسڵمانیەتی و جێگیربوونی عەقیدەو بڕوایە لەدڵ و دەروونداو، یان ئەو پرسیارانە بە هۆی پیلانی جوولەكەو گاورو بت پەرستەكانەوە بوو كە ئەیانویست موسڵمانەكان دوودڵ و دڵكرمێن بكەن لە هەندێ مەسەلەدا، لەبەرئەوە ناچارئەبوون ئەو پرسیارانەیان ئەكرد بۆ ئەوەی شتەكەیان بەجوانی بۆ ڕوون بێتەوەو بەباشی تێبگەن لێی، یان ئەو پیلان و پڕوپاگەندەی ئەوانە كاری ئەكرد لێیان و بێ ئارامی ئەخستە دڵیان، جا لەبەرئەوە قورئان ئەهاتە خوارەوەو وەڵامی ئەدانەوە، بەجۆرێ پرسیاركەران دڵئارام ئەبوون و پیلان و پڕوپاگەندەی دوژمنەكانیان بە هیچ دەرئەچوو، ئینجا با گوێ شل كەین لە ئایەتەكان، ئەو وەڵامانەمان بدا بەگوێدا، ئەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ ئەكەن: ئایا چی بەخت بكەن وە چ جۆرە ماڵێك بدەن لەڕێی خوادا؟

لە پێش ئەم پرسیارەدا چەند ئایەتێك هاتوونەتە خوارەوە لەبارەی ماڵ بەخت كردن لە ڕێی خوادا، وە بێگومان ئەو ماڵ بەخت كردنە لە هەموو كاتدا شتێكی چاكە، وەبە تایبەتی لەو سەردەمی هاتنی ئیسلامەدا شتێكی زۆر پێویست بوو بۆ ئەو كرمەڵە موسڵمانە كە تەنگی و نەبوونی و جەنگ ڕووی تێكردبوون، بێجگە لەوەی كە زۆر پێویست و بەكەڵكە بۆ بتەوكردنی یەكێتی ڕیزی گەل و كۆمەڵ، جا لەبەرئەوە ئەو پرسیارەیان ئەكرد، وە هەرچەند پرسیارەكەیان لەجۆری ئەو ماڵ و شتەبوو كە بەختی بكەن، بەڵام وەڵامەكەیان چۆنێتی بەخت كراوەكەی بۆ باس كردن لەگەڵ دیاری كردنی ئەوانەی كە ماڵەكەیان پێ ئەدرێ، چونكە ناسین و زانینی ئەو پێویست و گرنگە بۆیان،

﴿قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴾ (٢١٥)

فەرمووی: ﴿قُلۡ﴾ لە وەڵامیان دا بڵێ: ﴿مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ﴾ هەر ماڵێکی حەڵاڵو پاك کە ئەیدەن، ناوی ئەبات بەخێر، چونکە لە هەموو باریکەوە خێرە، خێرە بۆ ئەو کەسەی کە ئەیدات، خێرە بۆ ئەو کەسەی کە وەری ئەگرێ، خێرە بۆ گەلو کۆمەڵ، خێرە لە نەفسی خۆی دا، چونکە کردەوەیەکی خاوێنە، کەواتە ئەوەی کە ئەیبەخشێ با زۆر چاك بێتو خۆشەویست بێت بە لایەوە، تا باشتر دڵو دەروونی پاك بکاتەوە، وە وەرگرەکەشی زۆر تر سوودو بەهرەی لێ وەرگرێ، مەبەست ئەوە نیە پێویستە چاکترین ماڵ بدات، چونکە وەك ئایەتی تردا زانراوە ئەوەی پێویست بێتو خوا داوای بکات ئەوەیە کە میانە بێت، نە چاكو دەست بژێ، وە نە خراپو نەویستە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کابرای بەخشندە خۆی ڕام بکات لەسەر بەخشینی شتی چاكو خۆشەویست، ئەو ماڵە حەڵاڵو چاکە کە ئەیدەن ﴿فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ﴾ بیدەن بە باوكو دایك، ﴿وَٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾ وە بەخزمە زۆر نزیکەکان ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ وە بە هەتیوەکان، واتە ئەوانەی کە بێ نەواو پێویستن ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ وە هەژاران ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ﴾ وە بەغەیبو سەفەری کە دامابێت لەو شوێنە، ئیتر لە شوێنو جێی خۆی دا ماڵ بێت یان نا، واتە بۆ ئەمانە چاکترە، نەك ئەبێ هەر بەمانە بدرێ، ئینجا ئایا ئەم ئایەتە سڕاوەتەوە بە ئایەتی زەکات یان نا؟ زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نەسڕاوەتەوە، بەڵکو ئەم ئایەتە هاتووە لە خێرو صەدەقەی سوننەتدا.

باسی بەخت کردنی نەکرد بۆ سواڵکەرولەڕێی ئازادکردنی بەندەدا، لەبەرئەوەی باسی کردوون لەشوێنی ترداو بەهۆی ئەوەوە ئەزانرێ کە لێرەشدا هەر مەبەستن، یان لەبەرئەوە کە بەری گشتی ئەم فەرموودەیە ئەکەون ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ﴾ هەر خێرو چاکەیەك بکەن، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ﴾ بێگومان خوا ئاگاداروزانایەپێی، واتەئەجرو پاداشتتان ئەداتەوە بە ڕێكو پێکی.

ئەمانەی کەدیاری کردن بۆ ماڵ پێدان هەریەکە لە بارێکەوە پەیوەستن بە بەخشندەکەوە، پەیوەستی نەسەبو نەژادو ڕۆڵەیی، پەیوەستی خزمایەتی، پەیوەستی ڕەحەمو بەزەیی، پەیوەستی ئادەمێتیو مرۆڤایەتی، وە بە ڕاستی زۆر بە شێوەیەکی شیرینو سروشتی ڕیزی کردوون بە جۆرێ چاودێری هەستو ئارەزووی مەردومی تیا کراوە، چونکە ئاشکرایە کە مەردوم لە پاش خۆی، وەك لە حەدیسی (موسلیم)دا خۆی پێش ئەخات، ئەفەرموێ: (إبدأ بنفسك فتصدق عليها) لە یەکەم جارەوە لە خۆتەوە دەست پێبکەو خێرو سەدەقەی پێبکە، واتە پێویستی خۆت دەربکە لە پێشەوە ئینجا بڕۆ بۆ کەسی تر، لە پاش خۆی باوكو دایك پێش ترە لە هەموو کەس، ئینجا خزمە زۆر نزیکەکان، ئینجا هەتیوە لاوازو منداڵەکان جێی بەزەیین، لەپاش ئەوان ئەو هەژارە بێنەوایانە کە هیچ شك نابەن، بەڵام لەبەر ڕێزو بەرزی دەروونیان داوا لە کەس ناکەن، لەپاش ئەوان ئینجا ئەو سەفەریە داماوانە کە بڕاون لە ماڵو جێو شوێنی خۆیان کە ئەمانەش لەو چەرخەدا زۆر بوون بە تایبەتی بە هۆی کۆچ کردنیان لە مەککەوە بۆ مەدینە، ئا بەو لێزانیو حیکمەتە بەرزە ئیسلام دەستی بڕواداران ئەگرێو پلە پلە بەرزیان ئەکاتەوە لە چڵكو چەپەڵی ڕژدیو چروکیو چاوبرسیەتی، وە ئەیانپارێزێو ئەیان ڕازێنێتەوە بە دەستو دڵگوشادیو بەزەییو میهرەبانی.

لەپاش فەرمان دانو هاندان لەسەر ماڵ بەخت کردن لە ڕێی خوادا، ئینجا فەرمانو هاندان دێت لەسەر گیان بەخت کردنو فیداکاری بە سەرو بە گیان لە ڕێی خوادا، بێگومان جەنگو کوشتارو گیان بەخت کردن زۆر سەختو گرانە، بەڵام فەرزەو پێویست کراوە هەڵسان پێی، چونکە خێرو فەڕی زۆرە بۆ گەلو کۆمەڵی موسڵمانانو بۆ یەکەیەکەو بۆ هەموو ئادەمی بە تێکڕایی، وە بۆ هەقو ڕاستیو دادپەروەری، جا ئیسلام دان ئەنێ بەو سەختیو گرانیەدا، وە بێزاری دەرنابڕێ لە هەست کردنی موسڵمانان بەو سەختیو گرانیەو ناخۆشیو قورسیەکەی کە هەیە لە دەروونیاندا بەرامبەر جەنگو کوشتار، چونکە ئیسلام دژی سروشت ناوەستێو فێڵی لێ ناکات،

﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦﴾

لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ﴾ نوسراوەو پێویستو فەرز کراوە لەسەرتان جەنگو کوشتار ﴿وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡ﴾ وە ئەو جەنگو کوشتارەش بێزارو ناخۆشە بۆتان، واتە بە سروشت شتێکی گرانەو پێتان ناخۆشە.

هەرچۆنێ دان ئەنێ بە بێزاریو ناخۆشیەکەداو ئەوەشیان لێ ناگرێو بێزاری دەرنابڕێ لێیان لەسەر ئەوە، هەرچۆنێ ئاوا ئەکات هەروا لێیان ناگەڕێ بێتیمار کردنو سووك کردنی ئەو بێزاریو ناخۆشیە، بەڵکو بەگوێرەی لێزانیو کاردروستی خۆی نەسیمی نەرمو ناسکی ئومێد ئەدا بە دەروونو دەماخیاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ وە بێگومان شتی وا هەیە کە ئێوە بێزارن لێیو پێتان ناخۆشە لە کاتێکدا کەئەوە چاکە بۆتانو سوود بەخشە ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡ﴾ وە بەڕاستی شتی وا هەیە کە ئێوە پێتان خۆشەو لەکاتێکدا ئەوە خراپەو زیاندارە بۆتان، بەڵێ بێگومان هەرچی خوا داوای کردووە لە ئێمە هەرچەند بە سروشت لەسەر شنمان قورسو گران بێت هەر ئەوە چاکە بۆمان، وە هەموو ئەوانە بە وێنەی دەرمانی تاڵو ناخۆشن کە پێمان ناخۆشەو کەچی ئەوە بۆمان دەرمانی دەردمانە، وە لەو بارەکەیشەوە هەرچی خوا جڵەوگیری ئێمەی لێ کردبێ هەرچەند ئێمە بە خۆشی دابنێینو ئارەزووی بکەین، ئەوانە هەموو بۆمان خراپەو زیانی هەیە، بەوێنەی ئەو خۆراكو خواردەمەنیانەی کە نەخۆش ئارەزوویان ئەکاتو کەچی وەك ژار وان بۆی، بۆ ڕوون کردنەوە با هەر تێکۆشانو جەنگو کوشتار بای بکەین، ئێمە بە قورسو گرانی سەیر ئەکەین، چونکە هۆی بێ ئارامیو تیاچوونی ماڵو گیانە، بەڵام هەڵسان پێی مایەی سەربەرزیە لە هەر دووجیهاندا، چونکە میللەت کە بەو جۆرە تێکۆشەرو فیداکار بوو لە ڕێی خوادا دوژمن زاڵ نابێت بەسەری داو ئەو حەلە گیانو ماڵو نامووسو خاكو وڵاتی پارێزراو ئەبێت، بەڵکو ئەم زاڵ ئەبێتو بەشدار ئەبێت لە خێرو بێری وڵاتی دوژمنیش دا... لەجیهاندا بەو جۆرە سەربەرزو بەهرەمەندە، وە بۆ ڕۆژی دوایش ئایەتەکانی قورئانو

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پاداشتو پاشە ڕۆژی بەرزو بڵندی دیاری کردوون، وە بە پێچەوانەی ئەوەوە دانیشتنو واز هێنان لەو تێکۆشانو جەنگو کوشتارە مایەی سەرشۆڕیو ژێر دەستەییو داگیر کردنی مافو ماڵو خاکو نیشتمانو ئاوارە کردنو کوشتنو بڕینو نەمانی هەموو ڕێزو پیرۆزییەکە، وەك بە چاو بینرا، کە بە تێکۆشانو فیداکاری کلیلی ژیانو جیهان کەوتە دەستی ئەم ئوممەتە، وە دەرگای هەموو خۆشیو خێرو بێری جیهانی لێ کرایەوە، وە بەدانیشتنو وازهێنانیش ئەو هەموو پەنەی بەسەر هات، بەجۆرێ هەموو شتی لێ داگیرکرا تەنانەت نەما بە خاوەنی قسەو ڕاو بیرو باوەڕی خۆشی چ جای هەرشتی تر وە بە هیچ کلۆجێ ڕزگاروونیشی نابێت هەتا دەست نەکاتەوە بەو تێکۆشانو فیداکاریە، وەك پێغەمبەریش (ﷺ) هەواڵی پێ داوین لە حەیسێکدا کە (ئیمامی ئەحمەد)و چەند کەسێکی تر ئەیهێنن: (اذا ترکتم الجهاد سلط الله علیکم ذلا لا ینزعه منکم حتی ترجعوا الی دینکم) کاتی وازتان هێنا لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا، خوا ژێر دەستەییو سەرشۆڕیی زاڵ ئەکاتو ئەیدا بەسەرتانداو لە کۆڵتانی ناکاتەوە هەتا ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئایینەکەتان: بەڕاستی ئەم حەدیسە زۆر سامناکەو پێویستە موسڵمانان زۆر بیری لێ بکەنەوە، چونکە لە دەقەکەیەوە وەرئەگیرێ کەوازهێنان لەوتێکۆشانە دەرچوونە لە ئایینو گەڕانەوە بۆی گەڕنەوەیە بۆ ئایین!

وازهێنانو دانیشتن سەرەنجامی ئەم جیهانەی ئەو هەموو زیانە بوو کە باسمان کرد، وە زیانی ئەو جیهانیشی دەرئەکەوێ لەو ئایەتو حەدیسانەی کە بە توندی هەڕەشەو جڵەوگیری ئەکەن لەو دانیشتنو وازهێنانە، بێگومان پەیڕەوی فەرمانی خوا لە هەرشتێ تردا هەر ئاوا سوود بەخشە لە هەردوو جیهاندا، وە سەرپێچی لە فەرمانی هەر ئاوا زیاندارو خراپە، کەواتە چاك هەر ئەوەیە کە لای خوا چاك بێت، وە خراپ ئەوەیە کە لای خوا خراپ بێت، چونکە هەر ئەمە ڕاستە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ خوا ئەزانێ چی چاکە بۆتانو ئێوە نازانن... بەڵێ بڕوامان هەیە کە خوا ئەزانێو ئێمە نازانین، کەواتە با بەڕێکیو بەبێ سەرلێکردنەوە مل کەچ بین بۆ هەموو فەرمانو جڵەوگیریەکانی، ئینجا بە بۆنەی باسی پێویست کردنی جەنگو کوشتارەوە دێتە سەرباسی پرسیارێك کە کرا لە جەنگ کردن لە چوار مانگە بەڕێزو پیرۆزەکەدا کە جەنگ کردن تیایاندا قەدەغە بووە لە پێش هاتنی ئیسلام دا، وە هۆی ئەو پرسیارەش ئەوەیە کەلە چەند ڕیوایەتێکدا هاتووە، کە

پێغەمبەر (ﷺ) (عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی) نارد لەگەڵ حەوت کەسدا کە هەموو لە کۆمەڵی کۆچ کەران بوون، ناردنی بۆ (بطن النخلة) لە بەینی مەککەو تائیفدا، وە نامەیەکی چەسپ کراوی پێداو فەرمووی: نەیکەیتەوە تا دووشەو تێپەڕ نەکات بەسەر ڕۆیشتنەکەتاندا، ئینجا کاتێ کردیەوە لە کاتی دیاریی کراودا ئەبینێ نووسیویەتی: کاتێ تەماشای نامەکەت کرد بڕۆ هەتا ئەگەیتە (بطن النخلة) لەوێدا چاو بگێڕەو هەواڵی قورەیش بزانە بۆمان... وە زۆر مەکە لە هیچ کام لە هاوەڵەکانت لەسەر ڕۆیشتن لەگەڵت، وە ئەم ڕووداوە پێش ڕووداوی جەنگی بەدری گەورە بوو، ئینجا (عەبدوڵڵا) تەماشای نامەکەی کردو ووتی: ئەوا بیسەم و گوێڕایەڵم، وە ووتی بە هاوەڵەکانی هەرکەس لە ئێوە بەدوای شەهید بوون دا ئەگەڕێ ئەوا لەگەڵم بێت و هەرکام پێی ناخۆشە ئەوا بگەڕێتەوە، وە من ئەڕۆم فەرمانبەرم، ئینجا ڕۆیی و ئەوانیش هەموو لەگەڵی ڕۆیشتن و ڕێی حیجازیان دایە بەر هەتا هەندێ ڕێگەیان بڕی لەوێدا حوشترێکی (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)و (عوتبەی کوڕی غەزوان) ون بوو، بە هۆی ئەوەوە ئەو دوانە بە جێمان و بەدوای حوشترەکەدا ئەگەڕان و ئەو شەشەکەی تر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە (بطن النخلة) لەوێدا کاروانێکی قورەیش تێپەڕی و شت و مەکی بازرگانی پێبوو، وە (عەمری کوڕی حەزرەمی)و سێ کەسی تری لەگەڵ بوو، عەمریان کوشت و دوانیان گرت و چوارەم لە دەستیان ڕای کردو کاروانەکەیان دەست کەوت، وە کە ئەوەیان کرد لایان وابوو کە ئەو ڕۆژە دواترین ڕۆژی مانگی جەمادی دووەمە، کەچی بە یەکەم ڕۆژی ڕەجەب دەرچوو، کە یەکێکە لە مانگە پیرۆزەکان کە جەنگی تیا قەدەغە بوو لەناو عەرەبەکاندا، وە ئیسلامیش ئەو ڕێزو قەدەغەیەی هەر هێشتەوە بۆ ئەو چوار مانگە (ذي القعدة، ذي الحجة، محرم، رجب)، ئینجا کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: من فەرمانم پێنەدان بە جەنگ کردن لە مانگی بەرێزدا، وە کاروان و دیلەکانی لێ وەرنەگرتن، ئینجا ئەو کۆمەڵە غەم و پەژارە دای گرتن و لایان وابوو کە تازە تیاچوون، وە موسڵمانەکان کەوتنە تانەو تەشەر لێ دنیان، وە قورەیش دەستیان کرد بە فیک و فاک و پڕوپاگەندە بە هەموو جۆر، وە پێغەمبەریان وا پیشان دا کەدەست درێژی کردو ڕێزی عەرەبەکانی شکاندو مافی پێشێل کردن، ئینجا بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بەرپەرچی دانەوەو دەم کوتی کردن، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەست کەوت و دیلەکانی وەرگرت،

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ﴾

فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ ئەکەن لە مانگی بەڕێز کە جەنگ تیای دا قەدەغە بووە ـ ئیتر ئەو پرسارکەرانە موسڵمانەکان بووبن یان بێبڕواکان ـ پرسیار ئەکەن لە ﴿قِتَالٍ فِيهِ﴾ لە جەنگ کردن تیای دا؟ لە وەڵامیاندا ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾ جەنگ کردن تیای دا گوناهێکی گەورەیە، بەڵام ﴿وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ڕێ گرتن و بەربەرست کردنی خەڵکی لەڕێ و ئایینی خوا ﴿وَكُفْرٌۢ بِهِۦ﴾ وە بڕوا نەهێنان بە خوا ﴿وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ وە ڕێ گرتن لەو مزگەوتە بەڕێزەی خوا ـ واتە کەعبەو دەوروبەری یان وەبڕوا نەهێنان پێی بەم ڕەنگە ڕێزیان شکاندو پەنایان نەهێشت، ﴿وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ﴾ وە دەرکردنی ئەهلی ئەو مزگەوتە لێی، ئەو هەموو تاوانە کە کراون لە لایەن بت پەرستەکانەوە ﴿أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ گوناهێکی گورەترن بەلای خواوە لە جەنگ و کوشتار کردن لەو مانگە پیرۆزانەدا، ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ وە ئەو سزاو ئازاردانەی کە بت پەرستەکان کردیان بۆ لادان و وەرگەڕاندنی مەردوم لە ئایینی خوا گەورەترن لە کوشتن، واتە موسڵمانان پێش ئەوان دەستیان نەکردووە بە هیچ گوناهو کردەوەیەکی خراپ، بەڵکو بت پەرست و بێبڕواکان ئەو هەموو تاوانە گەورەیان کرد، وە بە درێژایی سیانزە ساڵ ئازارو سزای موسڵمانەکانیان دا بۆ ئەوەی لە ئایینی خوا وەریان گێڕنەوە، وە دەریان کردن لەو خاکی پاکی حەرەمە کە خوا کردی بە جێگەی ئارامی و ئاشتی، وە ڕێزی کەعبەو ئەو شوێنە پیرۆزەیان شکاند، کەواتە ئەو تاوانبارانە ڕێی دەم درێژیان نیە بە ڕەخنەگرتن لەو جەنگ و کوشتنەی کە ئەو تاقمە موسڵمانە پێی هەڵسان بە هەڵەو نەیانزانی کاتەکە مانگی (ڕەجەب)ە، وە هەروەها موسڵمانەکانیش نابێ دڵگران و دڵ شکست و نائومێد بن بەهۆی ئەو گوناهو کردەوەوە، چونکە بەرامبەر بەو هەموو تاوانەی ئەوان کردەوەکەی ئەمان هیچ

چاونداو زیانێکی وای نیه، وه ویستوویانه بهم زیانه سووکه بوهستن بهرامبهر ئهو ههموو زیانه گهورهو قورسهی ئهوان. ئهو رهخنهی که ئهو بێبڕوایانه گرتیان وتهیهکی ڕاست بوو، بهڵام نیازو مهبهستهکهیان لارو ناڕاست بوو، ئهیانویست له پهنای ئهوهدا موسڵمانهکان بهدناو بکهنو هه‌ڵوێستیان ناشیرین بکهن لهناو خهڵکدا، وه بهدهست درێژی کهرو تاوانباریان دهرکهن، لهکاتێکدا که خۆیان هیچ تاوانێ نهما نهیکهن سهبارهت به ڕێز نهگرتنو ڕێز شکاندنی ئهو شتانهش که بهلای خۆیهوه به ڕێز داریان دائهنان.

لهپاش ئهو ههموو تاوانو دهست درێژیه، ئینجا نیازی بهدو دوژمنایهتی ههمیشهییان ئاشکرا ئهکات، ئهفهرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ واته کۆتایی ناهێننو به ههمیشهیی دوژمنایهتیو جهنگتان لهگهڵ ئهکهن ﴿حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ﴾ بۆئهوهی وهرتان گێڕنهوه له ئایینهکهتان ﴿إِنِ اسْتَطَاعُوا﴾ ئهگهر بتوانن، بێگومان ئهو کۆڵنهدانه له دوژمنایهتیو ئهو نیازه پیسه تایبهتی نیه ههر بهو کۆمهڵی یهکهم جارهوه، بهڵکو بۆ ههموو دوژمنهکانی ئهم ئایینهیه له ههموو چهرخو جینێکدا.

ئیسلام له ههر خاکێکدا ببێ خۆی به خۆی داغو دهردو ترسه بۆ دوژمنهکانی، خۆی بهخۆی ئازار دهرو ترسێنهری دڵو دهروونیانه، ئهوهند بههێزو قایمو سامناکه ههموو ناڕاستو دهست درێژی کهرو خراپهکارێك بێی ئهترسێو بیمی لێ ئهکاتو خهشمو کینهی ههیه بۆی، جا لهبهرئهوه ئهوانه نایانهوێو به ههمیشهیی وان له کهمینا بۆی، وه بۆ ئهوانه که بڕواداران پێی.

خوای میهرهبان ئهوا ههواڵی ڕێكو ڕاستی دا به بڕواداران، وه نیازو مهبهستی خراپی دوژمنانی خۆیانو ئایینهکهیانی بۆ دهرخستن، کهواته با ئهمانیش وریاو چالاكو ئاینهکهی دووچاری بهد بهختیو نائومێدی دێت له ههردوو جیهاندا، وه هاوسهرو هاوڕێی ئاگریش ئهبێت له ڕۆژی دوایی دا، وهکو ئهفهرموێ: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ﴾ وه ههرکهس ـ ئهی بڕواداران ـ بهدڵ وهرگهڕێتهوه له ئایینهکهی، وه به قسهی ئهوان ههڵخهڵهتێ، یان له ترسی ئهوان لائهدا له ئایینهکهی ﴿فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ﴾ ئینجا دوای ئهوه بمرێ به بێبڕوایی، واته پهشیمان نهبێتهوهو نهگهڕێتهوه بۆ ئیسلام،

فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ ئەوانـە كـردەوە چـاكەكانيان كەلـە كـاتی موسڵمانێتی دا كردوونيان ـ هەر چەند گەورەو بەسوود بووبن ـ هەموو ئەو كردەوانـە زايـە ئەبن‌و بەبێ سەرو شوێن ئەڕۆن لەم جيهان‌و لە ڕۆژی دوايی دا.

لەم جيهانەدا بێ بەش ئەبن لەو هەموو فەڕو بەهرەيەكە بۆ كردەوەی بڕوادار هەيە، بەم ڕەنگە خوێن‌و مـاڵی حەڵاڵـە، وە نيكاحی هەڵئەوەشێتەوە، وە نابێ يارمـەتی‌و دۆستايەتی‌و خۆشەويستی بەكاربهێنرێ لەگەڵی، وە نابێ بە چاكە ناوببرێ، وە لـە ڕۆژی دواييشدا هيچ ئەجرو پاداشتێكيان نيە، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ وە ئەوانە هـاوڕێ‌و هاوسـەری ئاگرن، واتـە نيشتەجێن لـە ئاگری دۆزەخدا، ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ وە ئەوانە ئەمێننـەوە لـەو ئاگرەدا بـە بێ‌دوا هاتن‌وبڕانەوە. خوا پەنامان بدات لێی، وەلەهۆی ئەوبەدبەختی‌و بەش بڕوايە- آمين-.

ئەو كەسەی كەلە ئيسلام هەڵگەڕێتەوەو لەسەر ئـەو بـارە بمرێ بەش‌و چارە نووسی لـە هەردوو جيهاندا بەو جۆرەيە كە ئايەتەكە باسـی كـرد، ئينجا ئەگـەر بـەو بارە نـەمردو پێش مردن بگەڕێتەوە بۆ ئيسلام‌و بەباشـی تەوبە بكات‌و لـە سـەر ئـەم بارە بمرێ، بێ‌گومان ئـەو كەسە تۆبەكەی لێ وەرئەگرێ‌و سزاو سووتاندنی ڕۆژی دوايی لـەو بارەيـەوە لەسـەر نامێنێ بەلای زانايانی ئيسلامەوە بـەبێ دووبـەرەكی‌و خيلاف، بـەڵام دووبـەرەكی هـەيە سـەبارەت بـە نوێـژو ڕۆژوو كـردەوە چـاكەكانی حـاڵی موسـڵمانێتی پـێش هەڵگەرانەوەكـەی: (ئيمـامی شـافيعی) لای وايـە مـادام ئەگەڕێتـەوەو تەوبـە ئـەكات ئـەو كـردەوە چاكانەی زايـە نـابن‌و پێويـست نيـە لەسـەری بيـان گێڕێتـەوە، وە (ئيمـامی حەنـەفی‌و ماليك) ئەفـەرموون: هـەموو زايەن‌و ئەبێ هەرچی فەرزەكانە بيانگێڕێتەوە، ئينجا بەرامبەر ئەوانەی كە وەرئەگەڕێنـەوە لـە ئيـسلام، باسـی بـڕواداره خـۆگرو تێكۆشـەرەكان ئـەكات، ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی كـە بڕوايـان هێنـاوە ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە ئەوانـەی كـە كۆچيان كردووەو تێكۆشانيان كردووە لە ڕێی خوادا،

أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ

﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوانە هیواو ئومێدی ڕەحمەتی خواو پاداشتی خوایان هەیە کە بێگومان ئەو تاقمەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ناردنی بە سەرۆکایەتی (عەبدوڵلای کوڕی جەحش) بەری ئەم بەڵێنە ئەکەون سەردەستەن لێرەدا ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ وە خوا لێ بووردەی بەزەیی دارە.

ئینجا دێتە سەر باسی ئارەق و قومار، کە ئەم دوو شتە لەو چەرخەدا عەرەب زۆر بە سۆزو پەرۆشەوە سەریان تێکردبوون و هەمیشە ناویان بەسەر زوبانیانەوە بوو لە کۆڕو وتارو هەڵبەستیاندا، وە تا کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە قورئان نەهاتبووە خوارەوە، نە بە قەدەغە کردن و نە بە ڕەوا دانیان.

ئەم ئایەتە یەکەم هەنگاوە بۆ قەدەغە کردنیان، چونکە دەری ئەبڕێ کە شەڕو خراپەیان زۆر ترە لە سوودو چاکەیان، وە بێگومان هەر شتێکیش وابێ مافی قەدەغە کردنی هەیە، ئەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ﴾ پرسیارت لێ ئەکەن لە ئارەق و قومار؟ واتە لە خواردنەوەی ئارەق و یاری کردن لە قومار کە ئایا حەڵاڵن یان حەرام؟ ﴿قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ لە وەڵام دا بڵێ: لە هەردووکیان دا هەیە گوناهێکی گەورە، چونکە لە چەند بارو ڕوویەکەوە زیانیان هەیە، وە گەورەیی گوناهیش بە پێی زۆری و گەورەیی زیانە، وە چەند سوودو قازانجیشیان تێدایە، ئینجا با هەندێ لە زیانەکانی هەردوو باس بکەین:

یەکەم: زیانی ئارەق خواردنەوە: لەبارەی لەش و تەندروستیەوە:

أ- گەدە تێک ئەدات و ئارەزووی خۆراک کەم ئەکاتەوە یان نایهێڵێ.

ب- چاو زاق و دەرقەڕیووو ناشیرین ئەکات.

ت- سك گەورە ئەكات.

پ- ڕەنگ تێك ئەدات و ئەیشێوێنێ و دیزی ئەكات.

ج- مایەی نەخۆشی جگەرو گورچیلەو زۆربوونی سیلە.

ح- بەزوویی پیری ئەهێنێ، تا ڕادەیەك هەندێ لە پزیشكەكانی ئەڵمان ئەڵێن: تەمەنی چل ساڵەوە وەك شەست ساڵە لێ ئەكات.

خ- چەرخەو گەڕانی خوێن سست ئەكات تا ڕادەیەك گەلێ جار ئەیوەستێنێ و تا لە پڕێكدا كابرا ئەمرێ.

د- هەڵەوی و پیو لەدڵدا فەراهەم ئەهێنێ تا لە ئیشی ئەخات و لەناكاودا كابرا ئەمرێ، وە هەروەها چەند نەخۆشی تر وەك باس كراون لە كتێبەكانی تەندروستی دا.

هەندێ لە پزیشكەكان ئەڵێن: ئەگەر نیوەی ئارەق خانەكان دابخرێن پێویستی نامێنێ بە نیوەی نەخۆش خانەكان!

دووەم: زیانی بۆ هۆش و فام و ژیریی كە ئاشكرایە ئەو هێزانە بێ هێزو لاواز ئەكات تا ڕادەیەك زۆر لەوانەی كە سەریان كردووەتە خواردنەوەی سەریان لە شێتیەوە دەرچووە.

سێیەم: زیانی ماڵی كە ئاشكرایە گەلێ كەسی مووچە خۆری منداڵ دار دائەڕزێنێ و بە ژێر قەرزەوە ئەناڵێنێ ماڵ و منداڵی بە ڕەش و ڕووتی ئەژین و كابرای ئارەق خۆر بە لاتی و هەرزاری ئەمرێ.

چوارەم: زیانی بۆ ناو گەل و كۆمەڵایەتی:

ا- شەڕو لێدان و ئاژاوەی زۆرو زەبەندە فەراهەم دێت لەناو ئارەق خۆرەكاندا تا ئەگاتە كوشتن، وەك چەند جار ئەوانە ڕوویان داوەو بینراون.

ب- سووكی و ڕیسواییەك كە دێت بەسەر سەرخۆشەكان تا ڕادەیەك ئەرشێتەوەو خۆی پیس ئەكات و منداڵ ئەكەونە شوێنی بە فیكەو چەپڵە ڕێزان.

ت- ئەوانەی کە سەر ئەکەنە ئەو شتە پیسە تەمەڵ و تەوەزەل ئەبن و کەڵکی هیچ ئیش و کارێکی وایان نامێنێ.

پێنجەم: زیانی دەروونی: بەم ڕەنگە هەر قسەو مەبەستێکی دەروونی لا بێت دەری ئەبڕێ کە زیانی ئەوەش زۆر گەورەیە، بە تایبەتی لەلایەن ئەوانە کە کاروباری ڕامیاری وڵات و شتی نهێنی لەشکرو عەسکەریان لایە.

شەشەم: زیانی ئایینی:

أ- ئەوانەی کە سەرئەکەنە ئارەق خواردن، بێجگە لە گوناهی ئارەق خواردنەکە سەرناپێچنەوە لە شەڕواڵ پیسی و هەر گوناهو تاوانێ تر کە ئارەزووی بکەن و بۆیان ڕێك بکەوێ.

ب- دوورئەکەونەوە لەیادی خواوخواپەرستی، وە هیچ خواپەرستیەکیان بەڕێکی بۆ ناکرێ بە تایبەتی نوێژ کە کۆمەڵەکەی ئایینە، بە کورتی ئەوەبوو زیانی ئارەق خواردن.

ئینجا با هەندێ زیانی قومار کردنیش باس بکەین:

أ- دوژمنایەتی و ڕق و کینە فەراهەم ئەهێنێ بەزۆری لە بەینی قومارچیەکاندا، تا ڕادەیەك ئەگاتە سەرشکان و زامدار کردن و کوشتنیش.

ب- بەرگری ئەکات لە یادی خواو خواپەرستی.

ت- ئەوانەی کە سەر ئەکەنە قومارکردن فێری تەمەڵی و تەوەزەلی ئەبن و دوور ئەکەونەوە لە ئیش و کارو کەسایەتی پاك و حەڵاڵ، وە چاو ئەبڕنە ئەو کەسب و کردەوە پیسەو بەوە خۆیان ئەژیەنن کە ئەوەش بە زیانی خۆی و گەلیش تەواو ئەبێ.

پ- زۆر جار ئەبێتە هۆی نەمانی سەروەت و سامان لە کوتوپڕێکدا وەك چەند جار بینراوە کە کابرایەکی زۆر بە دەسەڵات ماڵ و سامانێکی زۆر فراوان بەجێ ئەهێڵێ بۆ کوڕێکی

قومارچی کە بەماوەیەکی زۆر کەم هەمووی لێ ئەبەنەوەو ئینجا بە لاتیو نابووتی لەسەر کۆمەڵانەکاندا ئەکەوێ، ئینجا با هەندێ لەسوودو قازانجیشیان باس بکەین:

یەکەم: ئارەق:

١- بارزگانیو دەسکەوتنی سەرمایە.

٢- لابردنی داخو غەمو پەژارە لەکاتی سەرخۆشی دا، هەرچەند لەپاش هۆش کردنەوە زۆر بە زیادەوە داخو غەمەکە دێتەوە.

٣- پەیدا بوونی غیرەتو ئازاییو چالاکی، کە ئەوە گەورەترین سوودی بوو بەلای عەرەبەکانی ئەو سەردەمو چەرخە پێشووەوە، بەڵام بۆ ئێستا زیانی هەیە بۆ کاتی جەنگو کوشتار، چونکە جەنگی ئەمڕۆ زۆر وردیو هۆشو ژیریی ئەوێ، وەك ئەوسا نیە بە شەڕە شیرو پەلاماردان بکرێ.

٤- سەخاوەتو دەست گوشادی، بەجۆرێ کابرای سەرخۆش لە کاتی سەرخۆشیەکەیدا هیچ بە خەیاڵیدا نایەت هەموو ماڵەکەی ببەخشێتو بیدا بە خەڵکی، بەڵام ئەوەش هەر زیانی زۆر ترە لە قازانجی، بە تایبەتی بۆ ئەم چەرخە کە هەر بە فیڕۆو بێجێ ماڵ ئەڕوا، وە زۆرتر دەستی پیاوخراپو بێگانە ئەکەوێ...

دووەم: ئینجا سوودو قازانجەکانی قومار:

١- ڕابواردنو داخو مەراق لە دڵ دەرکردن لەو ماوەیەدا کە خەریکن بەو یاریەوەو هۆشیان بە لای شتی ترەوە نامێنێ.

٢- خۆشیو کەشخەو شادمانی ئەو کەسەی کە ئەیباتەوە.

٣- دەست کەوتنی ماڵو سامان بەبێ ئەرکو مەینەت.

٤- دەست گیرۆییو بووژانەوەی هەژار لە هەندێ کاتدا، ئەوەش لە جۆرێ لە قوماردا کە پێی ئەوترێ: (یا نصیب).

ئارەق و قومار ئەم ئەندازە سوودو قازانجەیان هەیە، بەلام ﴿وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا﴾ گوناهو خراپەیان گەورەترە لە سوودو چاکەیان، وەك بۆمان دەرکەوت لەو ئەندازە لێکۆڵینەوەو بەراوردی ئێرەدا، وە هەتا جیهان بەرەو زانیاری و پێشکەوتن بڕوا زیانی ئەم دووانە زۆر تر دەردەکەوێ و ئاشکرا ئەبن، جا لەبەرئەوە چەند ساڵە لە وڵاتە بێگانەکاندا هەوڵ ئەدەن و لیژنە پێك ئەهێنن و پارەو ماڵ بەخت ئەکەن لە ڕێی نەهێشتن و بەربەست کردنی ئەم دوو شتە پیسەدا، بەلام شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووی نەفس لەلایەن زۆربەوە ڕێگرەو نایەڵێ ئەو هەنگاوە پیرۆزە سەرکەوێ و زاڵ ببێ، زۆر بە داخەوە، بێگومان بەرگری زیان گرنگ ترو لەپێش ترە لە ڕاکێشانی سوودو قازانج، کەواتە هەر ئەم ئایەتە نیشانەیە لەسەر قەدەغەو حەرامی ئەم دووانە، بەلام دیمەن و شێوەی ئایەتەکە بە ڕوونی ئەو قەدەغەیە نیشان نادات، لەبەرئەوە هەرکام لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی لێ وەرگرت هەر بەم ئایەتە کۆتایی پێهێنا، وە هەندێ کەس وانەبوو کۆتایی نەهێنا، وە هەندێ دوودڵ بوون وەك (عومەری فاروق) -خوا لێی ڕازی بێ- کە داوای کرد لە خوا باس و بڕیارێکی ڕوون و ڕەوان بنێرێ تالەپاشدائایەتی﴿مائدة﴾ هاتەخوارەوەو بەتەواوی و بە ڕوونی قەدەغەی کردن.

خوای لێزانی کار دروست لە ناردنی ئەم ئاین و شەریعەتەدا ئەوپەڕی میهرەبانی بەکارهێنا، بەم ڕەنگە لە ڕێوەو بە یەك جار هەمووی نەنارد، بەڵکو بە هێواش و بەرەبەرە تا باری ئەو یەکەم کۆمەڵ و تاقمە قورس و گران نەکات کە زۆر دوور کەوتبوونەوە لە ئایینی خواو بە چەند چەرخ باوك و باپیرەیشیان لە بێئایینی و نەفامیدا ژیابوون، بەرەبەرە ئایینەکەی نارد تا ڕامیان بکات و پێیان بگەیەنێ تا ئامادە ئەبن بۆ هەڵگرتن و گرتنە گەردنی هەموو ئاین و شەریعەتەکە، وە لەبەرئەوەی عەقیدەو باوەڕ بنەڕەتەو بەبێ ئەوە کۆشکی ئیسلام دروست ناکرێ لە یەکەم جارەوە دەستی کرد بە داڕشتنی عەقیدەو بڕوا، وە هەر فەرمان و جڵەوگیرییەك پەیوەندی بەو بنەڕەتەوە بوو بە ڕێکی و بە ڕوونی و بێپێچ و پەنا ناردی و بڕیاری لەسەر دان، ئینجا فەرمانی دا بە هەر خوو ڕەوشتێك کە بنەڕەتی مرۆڤایەتیەو بەرهەمی عەقیدەو بڕوایە، وە جڵەوگیری کرد لە هەر خوو ڕەوشت و کردەوەیەك کە دژی مرۆڤایەتی و عەقیدەو بڕوای ئیسلامە، وە شتەکانی تری دواخست، وە بە تایبەتی ئەو شتانەی کە پەیوەندییان هەر بە باوو عادەتەوە هەبوو، وە خوویان پێوە گیرابوو یان

بەرژەوەندیەکی ئابووریو کۆمەڵایەتییان تیا بوو، ئەم جۆرە شتانەی دواخستو پەلەی تیا نەکردن تا مەردوم دەقیان گرت بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەری خواو پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەو حەلە بەرە بەرە بڕیاری بۆ ئەوانەش دەرکرد، چونکە کۆتایی هێنان لەو شتانەی کە دەقو خووی پێوە گیرابێ، وە دەست هەڵگرتن لەو شتانەی کە بەرژەوەندی مەردومی تیابێت زۆر سەختو زەحمەتە ئەبێ ئاوا هێواشو بەرەبەرە بێت، وە بەو جۆرە ئەم ئایینو شەریعەتە گشتیو جیهانیەی نارده خوارەوەو چەسپاندی، جا هەندێ لەو شتانەی کە دوای خستن ئارەقو قومار بوو کە ئەم دووانە کرابوون بە خوو ڕەوشتێکی ڕاستو ڕەوا، وە ئەو قازانجو بەرژەوەندیانەشیان تیابوو، لەبەرئەوە بە چەند هەنگاوێك قەدەغە کران، قومار کە واز لێ هێنانی ئاسانتر بوو قەدەغەکەی بە دوو ئایەت تەواو کرد:

یەکەم: بەم ئایەتەی ئێرە کە دەست نیشانی کرد بۆ ئەوەی کە گوناهێکی گەورەی تیایەو زیانو خراپەی زۆرترە لە سوودو چاکەی کە بەوە دڵی بڕوادار لێی بێزار ئەبێت، ئینجا دووەم: بە ئایەتی ﴿مائدة﴾ کە لە سەرەتاکەیەوە شەڕو خراپەی بە تەواوی ئاشکرا کرد، ئینجا قەدەغە کردنەکەی هێنا بە دوایدا بە جۆرێ هیچ ڕێگەی نەهێشتەوە بۆ گومانو دوودڵی، بەڵام ئارەق کە زۆر زاڵو بەهێز ترە لە دەروونی بخۆرەکەیدا بە سێ ئایەت قەدەغە کرا، بەڵکو بە چوار ئایەت:

١- یەکەم: ئایەتی سوورەتی ﴿النحل﴾ کە مەککەییە: ﴿تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا﴾ فەراهەم ئەهێنن لە بەرو میوەی خورماو ترێ شتی مەست کەرو ڕۆزییەکی چاك، واتە ئەوەی کە مەست کەرە ڕۆزییەکی چاك نیە، کەواتە ئەوە دەست نیشانە بۆ قەدەغە کردنی.

٢- ئەم ئایەتی ئێرە وەك باسمان کرد.

٣- ئایەتی سوورەتی ﴿النساء﴾: ﴿لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾ نزیکی نوێژ مەکەونەوە لە کاتێکدا کە ئێوە مەستو سەرخۆش بن، بێگومان ئەم ئایەتە بەهێزترە بۆ قەدەغە کردن لەم ئایەتی ئێرە، چونکە بە ڕوونیو بە ئاشکرا جڵەوگیرییەکەی لێ ئەکات، نەك وەك ئەم کە دەست نیشانی تیایەو قەدەغەکەی ڕوون ناکاتەوە، بەڵام ئەوەندەی تیا ئەهێڵێتەوە کە بە تەواوی جڵەوگیریەکەی لێ ناکات بۆ هەموو کات، بەڵکو هەر بۆ کاتی نوێژەکان جڵەوگیری ئەکات، بەڵام دەست نیشانی تیایە بۆ هەموو کاتو ئەیگەیەنێ، چونکە لە شەوو ڕۆژدا کابرای ئارق خۆر پێویستی بە خەوو خواردنو ئیشو کاری

ژیان هەیە کە ئەمانە زۆربەی کاتەکان داگیر ئەکەن، ئینجا پێویستە لەسەری بۆ هەموو نوێژێك ماوەیەکی زۆر دوور بێت لە ئارەق خواردن تا سەرخۆشی نەمێنێ بۆ کاتی نوێژەکانی، دەی بەم جۆرە هیچ ماوەیەك نامێنێو کاتێکی ڕێکی دەست ناکەوێت بۆ خواردنەوەی ئارەقەکەی، کەواتە بەم ئایەتە ڕێی لێ بڕینەوەو ئامادەی کردن بۆ کۆتایی هێنانی بە یەکجاری بە ئایەتی سوورەتی ﴿مائدة﴾ کردی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ کە بە یارمەتی خوا لە شوێنەکەی خۆیدا تەفسیری ئەکەینەوەو بە جوانی ڕوونی ئەکەینەوە.

یەکێ تر لەو شتانەی کە قەدەغە کردنی دواخستو بەڵکو هەر لێ گەڕا تا خۆی بۆ خۆی نامێنێ، بریتیە لە بەندەیی.

مەسەلەی بەندەیی هەرچەند لە چەند سوورەتی تردا لێی دواین کە خوا وای ڕێکخست لە پێش ئەم سوورەتەدا تەفسیری ئەو سوورەتانەمان کرد، هەرچەند لێی دواین لەمەوپێش، بەڵام بە جوانی ئەزانم لێرەش هەندێ لێی بدوێین، چونکە جێگەی قسەو باسە لای نەفامو نەشارەزا!

شتێکی ئاشکرایە وەك ڕۆژی ڕووناك کە ئیسلام بەندەیی دانەهێناوە، بەڵکو لە پێش ئیسلامدا بە سەدەها چەرخو کات بەندەیی داهاتووە لە هەموو جیهاندا لەسەر ناشیرین ترین شێوەو لەبەر بێنرخ ترین هۆ، بەبێ ئەوەی لە هیچ لایەکەوە لە ڕژێمە ئەرزیەکاندا هیچ بێزاریو ڕەخنەیەکی لێ بگیرێ، بەڵکو زۆر بە ڕاستو ڕەوا سەیر کراوە لە ناو هەموو گەلو حیزبەکاندا، تا وای لێ هات گەڕا بە پێویستییەك لە پێویستیەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتی، وە بێگومان گۆڕینی شتی واو قەدەغە کردنی هەر وا بە ئاسانی ناگونجێت، بەڵکو بەبێ یەك کەوتنو یەکێتیەکی گشتیو جیهانی ناگونجێو دەست نادات، جا لەبەرئەوە ئیسلام لێی گەڕاو قەدەغە کردنی بە یەکجاری دواخست تا شتەکە خۆی بۆ خۆی نامێنێو هەموو جیهان تێئەگەن لە ناڕەواییو ناڕاستی یاسای بەندەیی، بەڵام وەك یەکسەرو لە ڕێوە قەدەغەی نەکرد، هەروەهایش لێی نەگەڕا کە لەسەر بارو شێوەی ناڕەوای خۆی بڕوا، بەڵکو هەر لە یەکەم جارەوەو لە سەرەتای هاتنیەوە کەوتنە هەوڵو تێکۆشان بۆ بەرگری کردنو نەهێشتنی بەم جۆرو شێوەیە:

یەکەم: کەوتە تەمێ و ئامۆژگاریی و فەرماندان بە ئازادکردنی بەندە، وە ئازادکردنی بەندەی گێڕا بە کردەوەیەك لە کردەوە چاکەکان کە خوا پەرستی پێبکرێت و ئەجرو پاداشتی پێوەرگرێ لای خوا.

دووەم: ئازادکردنی بەندەی گێڕا بە کەفارەتی چەند گوناهێك.

سێیەم: فەرمانی دا بە یەکسان کردنی بەندە لەگەڵ خاوەنەکەی لە خۆراك و پۆشاکدا، وە قەدەغەی کرد کە ئیش و کاری قورس و گران بدرێت بە سەریاندا، وە داوای کرد لە خاوەنەکان کە یارمەتیان بدەن لە ئیش و کاری قورس و گراندا.

چوارەم: هەموو سەرچاوەکانی بەندەیی وشك و قەدەغە کرد، تەنها یەك هۆو سەرچاوەی هێشتەوە، کە ئەوەش ئەمەیە: جەنگ بەرپا ببێ لە نێوان ئیسلام و دوژمنی ئیسلامدا، وە لەو جەنگەدا دوژمن بە دیل دەست کەوێت، وە ڕەوای دا کە هەندێ لەو دیلانە بکرێن بە بەندە بەرامبەر کردەوەی دوژمن کە دیلی ئەمی کرد بە بەندەو بەندی ئەکرد بە ناشیرین ترین بارو شێوە، وە با بزانرێ کە هیچ ئایەتێکی قورئان فەرمانی نەداوە بە گێڕانی دیل بە بەندە، بەڵکو فەرمووی: ﴿فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ بەدیل بیانگرن، ئینجا پاش ئەوە یان بە پیاوەتی و بە خۆڕایی بەرەڵایان بکەن، یان لە بریتیدا، لە بریتی بەرەڵاکردنی دیلی موسڵمانەکان، یان بریتی ماڵ و سمان، بەم ڕەنگە پێیان بفرۆشن، وە هەروەها با بزانرێ کە بڕیاری بەندەی پێخراوەتە دەست کاربەدەستی موسڵمان کە ڕێی هەیە بێجگە لەو دوو بارەی کە لە ئایەتەکەدایە، ئەم باری سێیەمەش بەکاربێنێ بەپێی داخوازی بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان، وە ئاشکرایە کە ڕەوادانی ئەم باری سێیەمە لە لایەن ئیسلامەوە لەبەرئەوەیە کە دوژمن دیلی ئەمی کرد بە بەندە بەبێ سەر لێ کردنەوە، کەواتە تا ئەو بەو جۆرە ڕەفتار بکات پێویستە ئەمیش ئەوە ڕەوا بدات، وە زۆر ناڕاست و ناڕێکە ئەو دیلی ئەم بکات بە بەندەو ئەم نەیکات، وە ئەگەر هات و کەوتە سەر ڕێی ڕاست و بەندەیی نەمێشت، بێگومان ئیسلام زۆر بەسۆزو بە پەرۆشەوە ئەچێت بە پیری ئەو بڕیاری نەمێشتنەوەو هەرگیز ڕەوا بەندەیی نادات و هەر بە پێی ئایەتەکە ڕەفتار ئەکات کە یاسایەکە دەست نادات بۆ گۆڕان و دەست تێخستن، وە دواترین بڕیاری جیهان هاتە سەر ئەو بڕیاری قورئانە کە هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر بڕیاری دا!!

پێنجەم: بڕیاری (مکاتبە)ی دا، واتە هەرکات بەندە ئارەزووی کرد خۆی بکڕێ لە خاوەنەکەی لەسەر هەر ئەنداز ماڵ کە ڕێك بکەون لەسەری.

شەشەم: یەك لەسەر هەشتی زەکاتی هەموو موسڵمانانی تەرخان کرد بۆ کڕین و ئازادکردنی بەندە کە شتێکی ئاشکرایە تەنیا ئەم ئەندازە بەس بوو بۆ نەمانی بەندە لەناو موسڵماناندا، چونکە خاوەن بەندە پەلپی بگرتایە جێبەجێ ئەکرا لەبەر زۆریی و فراوانی ئەو ئەندازەی کە خوا دیاری کردووە بۆ ئەو مەبەستە!!

ئیسلام هات و بەو جۆرە چارەسەری دانا بۆ هەموو گرێ و گۆتاڵی ژیان و جیهان، ئینجا ئەگەر کەسێك ئەڵێ: ڕاستە ئەمەی کە گوترا سەبارەت بە بەندە، ئایا بۆچی بەندەیی لەناو موسڵمانەکاندا مایەوە و بە زۆرو فراوانی بەندە هەبوو لەناو گەلی موسڵماندا؟ لە وەڵام دا ئەڵێین: ئێمە باسی ئیسلام ئەکەین و ئەڵێین ئیسلام بێگەردو بێ لەکەیە لە هەر شتێکی خراپ و کۆکەرەوەی هەموو چاکەیەکە و چارەسەرە بۆ هەر گرێ و گۆتاڵێ لە جیهاندا، وە هەر کاروبارێکی ناڕاست و ناڕەوا کەبووبێ لەناو موسڵمانەکاندا سووچی ئیسلام نیەو بەهیچ ڕەنگ ڕووناکاتە ئیسلام، بەڵکو سووچی ئەو موسڵمان و کاربەدەستانەیە کە لایانداوە لە ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام و دوور کەوتوونەتەوە لە فەرمان و مەبەست و ئامانجی ئیسلام، وە هەرکەس داوای گەڕانەوە ئەکات بۆ ئیسلام، نایەوێ و داوای گەڕانەوە ناکات بۆلای ئەو کاربەدەست و موسڵمانە ترازوو لادەرانە، وە نایەوێ کردەوە ناڕەواکانی ئەوان بکات بە سەرمەشق، بەڵکو ئەیەوێ و داوای گەڕانەوە ئەکات بۆلای قورئان و فەرمان و ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ)، وە بۆلای ڕەفتارو کردەوەی ئەو کاربەدەستە موسڵمانانەی کە نوێنەری ڕاستەقینەی ئیسلام بوون و بوون بە ئاوێنەیەکی باڵانما بۆ قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ)، کەواتە هەرکەس ژیرو تێگەیشتوو بێت هەرگیز ئەو جۆرە ڕەخنانە ناگرێ، وە بەڕاستی ئەو ڕەخنانەیان لە نەفامیەوە دێت یان لەنیازو مەبەستێکی بۆگەن و پیسەوە، ئەگینا بۆچی ڕەخنەئەگرن بەکردەوەی ئەو ترازوو لادەرانە، وە بۆچی ئاوڕێ نادەنەوە بۆلای ئەو هەموو کردەوە گەورەو گرنگانەی کە کاربەدەست و نوێنەرە ڕاستەقینەکانی ئیسلام پێی هەڵسان بەبێ گرێ و گیروگرفت، کە هەرکام لەو کردەوەو ڕەفتارانە وەك ئەستێرەی بەرە بەیان ئەدرەوشێتەوە بە ئاسمانی جیهان و مرۆڤایەتیەوەو هەموو ژیرو فەیلەسووفێك سەرگەردانە تیایدا!!

ئینجا یەكێ تر لەبیروباوەڕەكانی ئیسلام دەرئەخات لەوڵامی پرسیارێك لە پرسیارەكانی موسڵمانەكاندا، موسڵمانەكان لە یەكەم جارەوە پرسیاریان كرد ئایا لە چ جۆرەماڵێكیان شت بدەن لە ڕێی خوادا؟ وەڵامیان درایەوە بەو جۆرەی كەلە ئایەتی پێشوودا باس كرا، ئینجا لێرەدا پرسیارەكەیان لە ئەندازەكەیەتی، ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیارت لێ ئەكات ئایا چی بدەن و چی بەخت بكەن لەڕێی خوادا، واتە نازانین چەندی لێ بدەین؟ ﴿قُلِ ٱلْعَفْوَ﴾ لە وەڵام دا بڵێ: ئەوەی كە زیادە لە ئەركی خۆتان و سووك و ئاسانە لە سەرتان و ناڕەحەتتان ناكات، ئینجا ئایا ئەم بەخت كردنەی كە لێرەدا داواكراوە بە شێوەی پێویست كردنە، واتە واجب، یان بە شێوەی ئارەزووە، واتە سوننەت؟ وە ئەگەر واجب بوبێ، ئایا مەبەست بەمەش هەر زەكاتە یا سڕاوەتەوە بە ئایەتی زەكات؟ زانایان لەمەدا دووبەرەكین، وە ئەوەی كە باشتر لەدڵدا ئەچەسپێ و دڵ پێی بە ئارام ترە ئەمەیە: ئەم فەرمانە لە یەكەمجارەوە هەرچۆن هاتبێ نەسڕاوەتەوە و هەر هەیە و ئەمێنێتەوە بە شێوەی سوننەت، وە لە هەندێ جار و كاتدا واجب و پێویستە لەگەڵ زەكاتدا، وەك بەڕوونی دەرئەكەوێ لەم حەدیسەوە كە ئیمامی (جصاص) هێناویەتی لەكتێبی (احكام القرآن)دا كە (فاتمەی كچی قەیس) لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەیهێنێ كە فەرموویەتی: (في المال حق سوى الزكاة) لەماڵ و لەدارایی دا مافێكی تر هەیە بێجگە لە زەكات، مافێكی وایە كە خاوەن ماڵ خۆی بە ئارەزووی خۆی ئەیدا لە ڕێی خوادا كە دیارە ئەوە زۆر چاكترە، وە ئەگەر خۆی نەیدا ئەوا ئەو میریەی كە ڕەفتار بە شەریعەتی خوا ئەكات لێ ئەسێنێ لە كاتی پێویست دا، وە ئەگەر سەرپێچی كرد بە زۆر ئەبێ لێی بسێنێ، تا ئەو ماڵە بە فیڕۆ سەرف نەكرێ، یان بەبێ سوود تەپە نەدرێ و كۆنەكرێتەوە بەبێ سوود و بەرهەم، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَـٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە خوا بەڕوونی باسی ئایەتەكانتان بۆ ئەكات،

لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَىٰ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾

﴿لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ *فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ بۆئەوەی تێفکرێن و بیربکەنەوە لە کارو باری جیهان و ڕۆژی دوایی، ئینجا هەرچی چاکترە بۆتان ئەوە بگرن و دوور کەونەوە و دەست بەرداری هەر شتێ تر ببن کە زیانی هەیە بۆتان، یا زیانی زۆرترە لە قازانجی، بێگومان یاسایەك لە یاساکانی کۆمەڵاتی لە ئیسلام دا ئەمەیە کە ناوبراوە بە (التكافل الإجتماعي) واتە پێویستە لەسەر گەل چارەسەر کردنی هەر لاوازو داماوو پەك کەوتوویەك، جا هەتیو کە باوکی نیەو منداڵ و لاوازە شایان ترە بە چاودێری و سەرپەرشتی، چاودێری و سەرپەرشتی خۆیان و ماڵیان، ئینجا ڕێك ئەکەوت کە کاربەدەستی هەتیو خۆراك و ماڵی هەتیوەکەی تێکەڵی خۆراك و ماڵی خۆی ئەکرد کڕین و فرۆشتن و بازرگانی تیا ئەکرد، وە هەندێ جار تێ ئەشکا و زەرەری ئەکرد، لەبەرئەوە ئایەت هاتە خوارەوە، هەڕەشەی کرد لەوانەی کە ماڵی هەتیو ئەخۆن، ئینجا بەهۆی ئەوەوە ئەوانەی کە زۆر لە خوا ترس بوون دوورکەوتنەوە لەوە، بەجۆرێ وائەبوو خۆراکیان ئەدا لە هەتیوەکان ئەگەر شتێکیان لێ بمایەتەوە لێی ئەگەڕان هەتا جارێ تر هەتیوەکە ئەی خوارد یا هەر ئەمایەوە تا زایە ئەبوو تووڕ ئەدرا: وە بێگومان ئەم جۆرە توندو تیژییە لە ئیسلام دا نیە، بێجگە لەوە کە ئەوە کردەوە زۆر جار بە زیانی هەتیوەکە تەواو ئەبوو، جا لەبەرئەوەی کە داماببوون لە مەسەلەی هەتیوەدا پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەکرد کە چۆن بن و چی بکەن دەربارەی هەتیو؟ ئینجا خوا باسی پرسیارەکەی ئەوانی کردو ئەوەی کە ڕێك بێت و بەرژەوەندی تیا بێت بۆی دیاری کردن، ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَىٰ﴾ پرسیارت لێ ئەکەن لە بارەی هەتیوەکانەوە کە چۆن هەڵسن بە کارو باریان؟ ﴿قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ﴾ بڵێ پێیان: خەریك بوون لەگەڵیان بە جۆرێ کە

بەرژەوەندیو چاك كردنی تیابێت بۆ خۆیانو ماڵیان، ئەوە چاكە تا ئەوەی لێیان نەپرسنەوەو كەنارگیر بن لێیان ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ﴾ وە ئەگەر ئێوە تێكەڵییان بكەن لە ئاوو نانو جێو شوێنو دەستو پێوەندیدا بەو جۆرەی كە بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بێت ئەوە شتێكی چاكو شایستە ئەكەن، چونكە ئەوانە براتانن لە ئاییندا ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ﴾ وە ئەزانێو ئاگادارە بەخراپە كەری تێك دەرو چاكەكاری چاك كەر، وە هەركام لەو دووانە جیائەكاتەوە لە یەكترو هەركام بەپێی نیازو كردەوەی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ ئەكات، واتە خوا ئاگادارە بەو كەسەی كە نیازی خراپی هەیە لە خەریك بوونو تێكەڵی هەتیوودا، وەك ئاگادارە بەو كەسەی كە نیازی چاكو پاكی هەیە لەوەدا، كەواتە با بەد نیازو بەدكردار بترسێ لە هەڕەشەو تۆڵەی خوا، وە با نیاز پاكو پاك كرداریش بە ئومێدو موژدەبەخش بێت بە بەڵێنی خوا، خوای گەورە میهرەبانی بەكارهێنا كە بەو جۆرە ڕێی تێكەڵیو سەرپەرشتی هەتیوو ماڵی هەتیویدا، وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئەیخستنە زەحمەتو تەنگەتاوی ئەكردن، بەم ڕەنگە ڕێی نەئەدان تێكەڵیان بكەن، وە ڕەوای نەئەدا خواردنی ماڵیان بەو جۆرەی كە باس كرا، ئەگەر بیویستایە ئەوەی ئەكرد، چونكە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خوا زاڵەو توانایە بەسەر هەر كارێكدا كە بیەوێ بیكات، بەڵام بەو جۆرەی نەكرد چونكە ﴿حَكِيمٌ﴾ لێزانو كاردروستەو هەرچی بەرژەوەندی تیا بێتو ئاسانو سووك بێتو خێرو چاكەی تیا بێت هەر ئەوە ئەكات لە لوتفو میهرەبانیەكەی بەزیاد بێتو هەموو سوپاسو سەنایەك هەر بۆ ئەوەو شایانی ئەوە، ئا بەو جۆرە هەموو كاری پەیوەست ئەكات بە خواوەو ئەیگێڕێتەوە بۆ لای ئەوو هەموو شتێك ئەبەستێتەوە بە مەیلو خواهیشی ئەوەوە كە ئایینو ژینو جیهان هەر بە دەوری ئەودا ئەگەڕێو ئەسوڕێتەوە، وە بەرزیو ئاسانیو سەركەوتنو زاڵی شەریعەتو یاسای خوا لەوەدایە، وە هەر لەبەرئەوەیە كە بەرێكی بەدی هێنرا لە ژیاندا بەبێ كەمو كوڕی، وە هەركات موسڵمانان ڕووبكەنەوە خوا بەوێنەی ئەوە یەكەم تاقمو چینە، هەركاتو ڕێبازی ئەوان بدەنەبەر، بێگومان وەك ئەوان یاساو شەریعەكەتەكەی خوا بەدی ئەهێننەوە لە ژیاندا.

لێره به دواوه تا ئایەتی (٢٣٤) لەگەڵ بەشێك لە یاسا و دەستووری ماڵ و خێزان، ئەو ماڵ و خێزانەی کە بنەڕتە بۆ کۆمەڵی موسڵمان، کە گەلی ئیسلامی لەسەرئەو دائەمەزرێ و بەرپائەبێت و ڕاگیر ئەبێ، ئەو بنەڕەتەی کە ئیسلام هات و زۆر بە گرنگ گرتی، وە تێکۆشانێکی زۆرو گەورەی بەکارهێنا بۆ داڕشتنی و پارێزگاری و پاك و خاوێن کردنی لە هەموو چڵك و چەپەڵیەکی نەفامی و، وەك دەرئەکەوێ لێرەو لە چەند ئایەت و سورەتێ تردا، کە هاتوون سەبارەت بەم بنەڕەتە گەورەیە.

ئەم ڕژێمی ماڵ و خێزانە کە ئیسلام بە گرنگ گرتوویەتی ڕژێمێکی سروشتیەو لە کانگاو سەرچاوەی سروشت هەڵئەقوڵێ، وە پەروەردگاریەکی سروشتیە کە چاودێری و سەرپەرشتی بێچووەکان ئەکات، وە گەشە ئەکات بە گیان و بە لەش و بە ژیرییان، وەلە پەنای ئەوەدا تۆوی بەزەیی و خۆشەویستی و یەکێتی ئەچێنێ لەدڵ و دەروونیاندا، وە بەو هەستەوە پێئەگەن و گەورە ئەبن کە خۆشی ژیانیش بەستراوە بەو هەستە پاکەوە، وە بێگومان قۆناغی ساوایی و بێچوویی ماوەی پێگەیاندن و فێرکردن و ئامادەکردنی ساواو بێچووەکانە بۆ کارو پیشەیەك کە پێویستەو داوائەکرێ لێیان لە داهاوودا پاش گەورەبوون و پێگەیشتنیان، ئینجا لەبەرئەوەی کە کارو فەرمانی ئادەمی لە هەموو کارو فەرمانی هەموو گیانلەبەرێکی تر گەورەترە، وەکارو پیشەیان لەم زەویەدا بەنرخ ترە، لەبەرئەوە ئادەمی لە هەموو گیانلەبەرێکی تر پێویست ترە بەخێوکردن و ئامادەکردن و ڕام کردن، جا بەهۆی ئەوەوە ماوەی ئادەمی درێژترە لە ماوەی ساوایی هەموو گیانلەبەرانی تر، تا باش ترو بەدرێژتر ئامادەبکرێن بۆ دوا ڕۆژو داهاتووی ژیانیان، کەواتە ساوایی ئادەمی لە هەر ساوایەکی تر پێویست ترە بە باوك و دیك و چاودێری و سەرپەرشتی ئەوان کەلە هەموو کەسێکی تر دڵسۆزترو بەسۆزو بەزەیی ترن بە ساواکەیان، کەواتە ئەم ڕژێمی ماڵ و خێزانە باشترین و بەکارترینە بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی بێچووو ساواو منداڵی ئادەمی، وە بە تاقیکردنەوەو کردنەوەو بەراووردکردن و دەرکەوت کە هیچ شتێکی ترو لە هیچ ڕێگایەکی ترەوە ئەو پەروەردەو پێگەیاندنە ناگونجێ و ناکرێ، کەبە هۆی ڕژێمی ماڵ و خێزان و لەو

ڕێگایەوە ئەکرێ‌و ئەگونجێ، بەڵکو بە ڕوونی دەرکەوت کە هەر ڕێگەیەکی تر زیان دەرو تێکدەرە بۆ ساواکەی، بەتایبەتی ڕژێمی پەروەردگا گشتیەکان (المحاضن الجماعية) کە هەندێ لە مەزهەبە دەست کردەکان ویستیان بە زۆرە زمانی بیخەنە جێگای ئەو ڕژێمە سروشتیە لەو کاتەدا کە ویستیان شۆڕشێکی سەرکێشیانە بکەنەسەر هەموو شتە سروشتیەکان! یان لە ناچاری دا هەندێ لە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان ناچار بوون پێی بە هۆی گوم بوونی ساواو منالێکی زۆرو فراوان لە جەنگە نارەوا جیهانیەکاندا! یان لەهۆی داهاتنی ئەو ڕژێمە بۆگەنانەی کە دایکەکان ناچار ئەکەن بە ئیش کردن لە کارگەکانداو بەجێ‌هێشتنی ماڵ‌و خێزان، ئەو ڕژێمە نەفرین لێ کراوەی کە ساوا بێچارەکان بێبەش‌و براو ئەکات لەسۆزو بەزەیی دایکە دڵسۆزەکانیان‌و چاودێریان، وە تووڕیان ئەداتە ناو ئەو پەروەردگاریانە، کە ڕژێمەکەیان دژی سورشتی ئەو ساوایانەیەو ناکۆك‌و نارێکە لەگەڵ دەروونیان، بەهۆی ئەوەوە دووچاری بێ ئارامی‌و گرێی دەروونی دێن، وە لە ڕەوادانی ئەو ڕژێمە نارەوادا هۆو بیانوویان ئەمەیە: با ئەو دایکانە خەریك نەکرێن‌و بێکار نەبن، با ڕادەی ژیانی ئابووریان بەهێزی بێ! لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ تاقم‌و کۆمەڵێکی تر خەریك بن بە بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی ئەو ساوایانەوە، وە بیان خەنە شوێنی دایکەکانیان، کەواتە بۆچی دیاکەکانی خۆیان خەریك نەبن پێیانەوە بەو هەموو سۆزو بەزەییەوە؟ ئایا بۆچی ئەو ساوا لاوازانە بێ‌بەش بکرێن لەو هەموو سۆزو بەزەیی‌و دڵسۆنیە؟! ئایا بۆچی ئەو دایکانە دوور بخەینەوە لە بەرزترو بەنرخ ترین بەرهەمی خۆیان لە ڕووی زەوی دا، وە خەریکیان بکەین لە کارگەکاندا بە شتێکی ترەوە؟! ئایا بۆچی بیان بچڕین لە پارچە جگەرو لە بەنۆکەکانی دڵیان کە هیواو جێگەی ئومێدی پاشە ڕۆژن؟! ئایا بۆچی لە جێی ئەو دایکە بەسۆزانەدا کۆمەڵی تر خەریك بکەین بەو مندالانەوە کە هیچ سۆزو بەزەیی‌و پەیوەندیەکیان پێیانەوە نیە؟! لەگەڵ ئەوەدا لە لەراوردو تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە منداڵ لەدوو ساڵی یەکەمی تەمەنی دا پێویستیەکی دەروونی سروشتی هەیە بە باوك‌و دایکێکی سەربەخۆی تایبەتی، وە بەتایبەتی پێویستە بەدایکێك بە تەنیا بەبێ بەشداری منداڵێکی تر، وە لەپاش ئەو دوو ساڵە

پێویستیەکی سروشتی هەیە بەوەی کە هەست بکات بەبوونی باوك‌و دایکێکی دیاریی کە بەرۆڵەو بەچکەی ئەوان بناسرێ، دەی بێگومان یەکەم مەبەست‌و ئامانج ناگونجێ‌و دەست نادات لەم پەروەردگاریانەدا، وە مەبەستی دووەمیش پێك نایەت لە ڕژێمی ماڵ‌و خێزاندا نەبێت، وە هەر منداڵێك هەرکام لەو دوو مەبەستەی بۆ پێك نەیەت، ئەو منداڵە دووچاری جۆرێك لە نەخۆشی دەروونی ئەبێت‌و لە سروشتی خۆی ئەترازێ، وە هەرکاتێ بەهۆی ڕووداوو بەسەرهاتێکەوە هەر منداڵی بێبەش بوو لە هەرکام لەو دوو مەبەستە، بێگومان ئەوە بارێکی گرانە کەوتووە بەسەری داو دووچار بوونە بە دەردێکی خراپەوەو چارەی نیە، دەی کەواتە بۆچی کۆمەڵی نەفامان لەم سەردەمی نەفامی تازەدا هەوڵئەدەن کە ئەو بارە گرانە بکەوێ بەسەر هەموو منداڵێکدا، وە ئەو دەردو نەخۆشیە پیسە ببێ بە شتێکی گشتی‌و هەموو بگرێتەوە؟! ئایا لەبەرچی ئەم هەموو تاوانە ڕەوا بدەین‌و بیکەین‌و بەرامبەر بەچی بیانکەین؟ بەرامبەر بەوەی زیادە پوول‌و پارەیەك دەست کەوت ببێ، یان لەبەرئەوەی بەو جۆرە دایکە کەبژێنن؟ ئای هاوار بۆ ئەم چەرخ‌و دەورەی نەفامی ئەمڕۆ لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا کە ڕژێمی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیان ڕێگە نادات بە ژیاندنی دایکێکی بێنەوای داماو کە خەریك بێ بە پێگەیاندنی‌و بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی ئادەمی کەبەرزو بەڕێزترە لەم بوونەوەرەدا، ڕێگە نادات‌و هەڵناسێ بە ژیاندنی ئەو جۆرە دایکانە، بەڵکو ئەبێ ئەوانە دەست هەڵگرن لەوەی کە کارگەی ئادەمی بن وە بڕۆنە ناو کارگەی ترەوەو بەهێزی بازووی خۆیان خۆیان بژێنن!! ئای هاوار بۆ ئەو ڕژێمە ناڕاست‌و ناڕەوایانە!! ئینجا هەزار جار هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو ڕژێم‌و تاوانانە بە پێش کەوتن دائەنێن‌و بەرگری لێ ئەکەن!!! جا لەبەرئەوە ئەبینین ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی دامەزراوە لەسەر بنەڕەتی ماڵ‌و خێزان، وە بەوجۆرە بە گرنگ سەرنجی ماڵ‌و خێزان ئەدات، وەلە هەموو بارو ڕوویەکی دواوە لە چەند سورەتێکی قورئاندا.

لەم سورەتەدا دوانزە یاساو بڕیاری داناو باسی کردن، وەك بەدرێژی پێیان ئەگەین و ئەکەونە بەرچاومان بە یارمەتی خوا.

ئەم یاسای بڕیارانەی هەروا بە سادەیی باسی نەکردوون، بەڵکو زۆر بە گەورەو گرنگ نیشانی داون، بەم ڕەنگە دەست نیشانی کردووە بەوەی هەرکام لەوانە یاسایەکی گەورەیە لە یاساکانی بەرنامەی ئیسلام کە دایناون بۆ ژیانی ئادەمی، وە هەرکام بناغەو بنەڕەتێکە لە بناغەو بنەڕەتەکانی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام، وە هەرکام پەیوەستە بە خواو بە مەیل و خواهیشی خواو کاردروستی خواوە، وە هەرکام بەستراوە بەو بەرنامەی کە خوا دایناوە بۆ ژیانی ئادەمی، جا لەبەرئەوە گوێڕایەڵی کردنیان کراوە بەهۆی ڕەزامەندی و پاداشتی خوا، وەك مل پێچی کردنیان مایەی خەشم و سزاو تۆڵەی خوایە، وە لە هەمان کاتدا بڕوا پێیان بەشێکە لە بڕوا بە ئاین و عەقیدەی ئیسلام، وە بڕوا نەکردن بە هەرکام بڕوا نەکردنە بە ئاین و عەقیدەی ئیسلام! ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئەو یاساو بڕیارانە یەك لەدوای یەك، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ﴾ ئافرەتە بت پەرست و هاوبەش بڕیاردەرەکان ئەخوازن هەتا بڕوا نەهێنن، بێگومان دەست و پەیوەندی ژن و مێردی ئەبێ بەهێزترو بەردەوام تر بێت لە هەموو دەست و پەیوەندیەکی تر، کەواتە ژن و مێرد پێویستیان هەیە بە یەکێتیەکی زۆر تێرو تەواو کەلە ناخی دڵ و دەروونیانەوە هەڵقوڵێ، وە شتێکی ئاشکرایە کە عەقیدەو بیروباوەڕی ئایینی بەکارتر بەهێزترین شتە بۆ یەکێتی و یەك خستنی دڵان، هەرچۆنێ دژایەتی لە عەقیدەو بیروباوەڕدا مایەی بێزاری و پچڕان و دوورکەوتنەوەی دڵانە، وە هەتا ئەو دژایەتیە بەهێزتربێت بێزاری و دوورکەوتنەوەکەیان بەتین ترو فراوانترە، وە شتێکی ئاشکرایشە بڕوا بەتاك و تەنیایی خوا زۆر دوورەو هەرگیز لە هیچ شتێکدا کۆنابێتەوە لەگەڵ بت پەرستی و بڕوا بە هاوبەش بۆ خوا، لەبەرئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو قەدەغەکرا، ئیتر موسڵمان ئافرەتی بت پەرست بخوازێ، بەڵام ئەوانەی کەلە پێش ئەم ئایەتە داخوازرابوون هەرمانەوە هەتا ساڵی شەشەمی کۆچی کە ئایەتی سورەتی ﴿الممتحنة﴾: ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ﴾ نە ئافرەتە بت پەرستەکان حەڵاڵن بۆ بڕواداران، وە نەپیاوە بڕواداران حەڵاڵن بۆ ئافرەتە بت پەرستەکان

وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ ۖ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾

بەم ئایەتە ئەوانە پێشوش قەدەغەکران، لە چەرخی مەککەدا زروف و باری موسڵمانان و تێکەڵیان بە بت پەرستەکان ڕێی نەئەداو نەئەگونجا لەگەڵ پچڕینی ئەو پەیوەندیانەو جیابوونەوەیەکی تەواوی کۆمەڵایەتی، بەڵام کاتێ هاتنە مەدینەو بەسەربەستی و سەربەخۆییەکی تەواوی بەهێزیان بۆ فەراهەم هات بارو زروفیان ڕێک و بوو لەگەڵ ئەو قەدەغە کردنەدا، لەبەرئەوە لەم چەرخەدا قەدەغە کردنەکە دەستی پێکرد بەم ئایەتەی کەچوو بە گوێچکەماندا ئینجادەست نیشان و ئاماژەی کرد بۆ هۆی ئەو قەدەغە کردنە، وە خواستنی بت پەرستانی بێزراو کرد لەبەرچاومان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ﴾ وە بێگومان و ڕاستی ئافرەتێکی بەندەی بڕوادار چاک ترە لە ئافرەتێکی بت پەرستی هاوبەش بڕیاردەری ئازاد ﴿وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ با ئەو هاوبەش بڕیار دەرە دڵیان بێگرێ و حەز لەو بکەن لەبەر جوانی، یان لەبەر ماڵ یان هەر شتێکی تر کە دڵتان ڕاکێشێ بۆی، چونکە ئەو بڕواکەی شیرینی ئەکات لای خوا، وە ئەمیش بێبڕواییەکەی ناشیرینی ئەکات، وە هەرچی لای خوا چاك بێت هەر ئەوە چاکەو هەرچیش لای خوا ناشیرین و خراپ بێت هەر ئەوە ناشیرین و خراپە، ﴿وَلَا تُنكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا﴾ وە ژن مەدەن لە پیاوە هاوبەش بڕیاردەرەکان هەتا بڕوا ئەهێنن ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ﴾ وە بێگومان پیاوێکی بەندەی بڕوادار چاکترە لە پیاوێکی ئازادی بت پەرستی هاوبەش بڕیاردەر ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾ هەرچەند ئەو هاوبەش بڕیاردەرە دڵتان بیگرێ بە ژن پێدانی لەبەر هەر هۆیەك کە دڵڕاکێشەرە لەم جیهانەدا، ئینجا ئەو بت پەرستانە بە تەواوی بێزارئەکات و هۆی قەدەغە کردنەکە بەباشی ڕووە ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾ ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانە بانگی مەردوم ئەکەن بۆ لای ئاگر، واتەبانگ ئەکەن بۆ بێبڕوایی و بت پەرستی کە سەرەنجام و پاشە ڕۆژی ئاگری دۆزەخە ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ﴾ وە خوایش بانگ ئەکات بۆلای بەهەشت و لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهو بە ئیزن و ڕێنموونی خۆی، واتە بۆ بڕوا هێنان و کردەوەی

چاك كە بەئیزنی خوا مایەی چوونە بەهەشتو سڕینەوەی گوناهو تاوانن، کەواتە ڕێگاکان زۆر دوورن لە یەکترو بانگەکان زۆر جیاوازن، وە هەردوو کەسێك کە بەو جۆرە دژو جیاوازبن لە ڕێگەو لە بانگ کردنو لە پاشەڕۆژدا هەرگیز ئەو دووانە ژیانێکی ڕێكو پێك بەسەر نابەن پێکەوە، وە هەرگیز ڕەوا نیە ئەو کەسەی کەلەسەر ڕێگەی ڕاستو بانگی ڕوایەو دوا ڕۆژی کامەرانیو بەختەوەریە، ئەو کەسە پیرۆزە ببێ بە هاوسەرو هاوڕێی کەسێك کە ترازابێت بە ڕێگەی ڕاستو بەدەم بانگی ناڕاستەوە بچێو پاشە ڕۆژیشی بەدبەختیو ڕوو ڕەشیو نەفرین لێ کراویی بێت، وە ئەبێ ئەو بەختەوەرە بترسێو خۆی بپارێزێ بە نزیك کەوتنەوەو هاوسەریی ئەو شەرمەزارو نەفرین لێ کراوە، ئەوەك دووچاری دەرد ببێ لێیەوە! ﴿وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ وە خوا بەڕوونی ئایەتەکانی خۆی باس ئەکات بۆ مەردوم، بەڵکو بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرنو خۆیان دووچاری دەردو سزای هەردوو جیهان نەکەن.

خواستنی بت پەرست قەدەغە کرا لەسەر موسڵمان، وە هۆکەشی ئەوەبوو کە دەست نیشانی بۆکرد، بەڵام نامەداری ڕەوادا، ئیتر ئەگەر چی عەقیدەو بڕوای ئەوانیش هەر جیاوازە ئەوانیش هەر بانگ بۆ شتێ ئەکەن کە پاشە ڕۆژو سەرەنجامی هەر ئاگرە، چونکە ئایینەکەی ئەوان لەبنەڕەتدا ڕاستەو ئایینی خوایە، وە ئەوان بڕوایان هەیە بە خواو بە مەلائیکەو بە نامەو پێغەمبەرانو بە ڕۆژی دوایی، کەواتە هەرچەند بڕواکەیان بەجۆرو شێوەیەك نیە کە خوا وەری گرێ، بەڵام وەك بت پەرستەکان دژو دوو ڕوو جیاوازنین، وە ژیان لەگەڵیان ئەگونجێ، لەبەرئەوە ڕەوادانی خواستنی ئافرەتی نامەدار شتێکی بەجێیە، بەڵام پێچەوانەی ئەوە ـ واتە خواستنی پیاوی نامەدار بەرامبەر ئافرەتی موسڵمان ـ هەر قەدەغەیەو ڕەوانەدراوە، چونکە دووشتی زۆر خراپی لێ پەیدا ئەبێت:

یەکەم: ڕۆڵەو نەوە بەناوی باوکەوە بانگ ئەکرێنو ئەناسرێن، وە زۆرتر شوێنی باوکیان ئەکەونو لە عەقیدەو ئاییندا.

دووەم: ئەو ئافرەتە موسڵمانە مێردەکەی ئەیکوێزێتەوەو لەگەڵ خۆی ئەیبات بۆ وڵاتو ناوکەلو کۆمەڵی خۆی ئەیبچڕێ لە موسڵمانەکان، ئەو حەلە بەهۆی تەنیاییو لاوازی زۆر لە ئاسانی لە ئیسلام ئەیترازێننو ئەیبەنە سەر ئایینی خۆیان، بەڵام لەم بارەکەی ترەوە ئەو مەترسیانە نین، بەڵکو ئومێدی خێر هەیە کە ئافرەتەکە ڕزگار بکرێ لە ئایینی ناڕێكو بخرێتە سەر ئایینی ڕاست.

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾

---

بڕیارو یاسای دووەم ئەمەیە کەلە وەڵامی ئەم پرسیارەدا باسی فەرمووە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ﴾ پرسیارت لیّ ئەکەن ئەی پێغەمبەر لەبارەی حەیزی ئافرەتانەوە، کەچیەو چۆن بن‌و چی بکەن لەگەڵیان لەو کاتەدا؟

(ئیمامی ئەحمەدو موسلیم‌و ئەبو داودو نەسائی‌و ترمزیی‌و ئیبن‌و ماجە)و چەند کەسێکی تر حەدیسێ ئەهێنن لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: باوی جوولەکە وابوو کە ئافرەتیان بکەوتایەتە حەیز لە ماڵ دەریان ئەکردن‌و نان‌و ئاویان لەگەڵ نەئەخواردو لەماڵێکدا کۆنەئەبوونەوە لەگەڵی، ئینجا پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەیەوە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو هەموو شتێکی ڕەوادا کە لەگەڵیان بکرێ بێجگە لە کاری ژن‌و مێردی، ئینجا با بێینەوە سەر ئایەتەکەو گوێبگرین لە وەڵامی پرسیارەکە: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر لە وەڵامدا بڵێ: ﴿هُوَ أَذًى﴾ حەیز شتێکی زۆر پیسی قیزەونە، هۆی ئەزیەت‌و ئازارەو ئەو بەو کەسەی کە نزیکی ئەکەوێتەوە، ﴿فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ﴾ کەواتە کەنارگیربن‌و دوور بکەنەوە لە کاری ژن‌و مێردی ئافرەتەکان لە کاتی حەیزدا، ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾وە نزیکیان مەکەونەوە بەو کاری ژن‌و مێردیە هەتا پاك ئەبنەوە لە حەیز، ئینجا ئایا هەر لە دوای پاك بوونەوەو بڕانەوەی ئەو خوێنە حەڵاڵە چوونە لایان با غوسڵ نەکەن وەك هەندێ لە زانایان ئەفەرموون؟ یان پێویستە لە پاش بڕانەوەی حەیزەکە غوسڵ‌و خۆشۆرین، وەك هەنێکی تر لەسەر ئەوەیە، وە بەڵگەشیان ڕواڵەتی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ ئینجا کاتێ خۆیان پاکی تەواویان وەرگرت ـ کە ئەوەش بەوە ئەبێت کە لەپاش بڕانەوەی حەیز خۆی بشۆرێ ـ ﴿فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەو حەلە بچنە لایان لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پیادان بە کەنارگیری‌و دوورکەوتنەوە لێی لەبەر حەیزەکەیان، واتە لەو شوێنە تایبەتیەی کە بۆ ئەوە دانراوە، وەلەوە لانەدەن... دەی بێگومان ڕواڵەتی ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات کەلە پاش نەمانی حەیزو خۆشۆردن ئینجا دروستە مێردەکان بچنە لایان، وە بێجگە لە ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە وتەی ﴿يَطْهُرْنَ﴾

خوێنراوەتەوە بە ﴿يَطَّهَّرْنَ﴾ کە ئەویش ئەو مەبەستە ئەگەیەنێ ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ ئەیگەیەنێ، کەواتە مەبەستەکە بەهێزتر بوو، بێگومان کاری ژن و مێردی هەرچەند پێویستیەکی لەشی و دەروونیە، وە خۆشیەکە لە خۆشیەکان لە ژیاندا، هەرچەند بەو جۆرە گرنگە، بەڵام لە هەمان کاتدا مەبەست و ئامانج شتێکی بەنرخ ترو گەورەترە لەوانە، ئەوەش کە بریتیە لە پەیدابوونی منداڵ و پەرەسەندن و زۆر بوون لەو ڕێگەیەوە، ئینجا کاری ژن و مێردی لەکاتی حەیزدا هەرچەندە مەبەستە ئاژەڵیەکە بەجێ ئەهێنێ، بەڵام مەبەستە گەورەو گرنگەکە بەجێناهێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە چوونە لای ئافرەت لەو کاتەدا صص نەخۆشی و زیانی تێدایە لەبارەی تەندروستیەوە، جا لەبەرئەوەو لەبەر هەر شتێ تر کە خوای میهرەبان ئەزانێ ئەوکارەی قەدەغەکرد بەو جۆرەی کە بیستمان، ئینجا لە کۆتایی دا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە زۆر زۆ ڕئەگەڕێنەوە بۆلای لە هەر کردەوەو کردارێکی ناڕەواو خراپدا، وە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە خۆیان پاک و تەمیز ڕائەگرن لە هەر شتێك کە چەپەڵ و قیزەونە، وە هەر شتێ کە خوای میهرەبان قەدەغەی کردبێ خراپەو ناڕەوایەو چەپەڵەو قیزەونەو پێی خۆشە بەندەکانی لێی دوور بن و ئەگەر هەڵەیان کرد دەست بەجێ بگەڕێنەوە تا ئەو گەڕانەوەیە پاکیان بکاتەوە، قورئان لە چەند شوێنێکدا پەیوەندی ژن و مێرنیشان ئەدات بە چەند جۆرو شێوەیەك کە زۆر نەرم و ناسك و دڵپاراوکەرو سەرنج ڕاکێشن، لە ئایەتێکدا پیاوو ئافرەت نشیان ئەدات بۆ پۆشاکی یەکتر، لە ئایەتێکی تردا ئافرەت ئەکات بە مایەی ئارام و خۆشی و دامەزرانی دڵ و دەروون، وە پەیوەندیەکەیان ئەکات بە پەیوەندی خۆشەویستی و بەزەیی و میهرەبانی، وە لەم ئایەتی ئێرەش کە دێت ئافرەت نیشان ئەدات بە جێگەی ئومێدو دەستکەوتی گرنگ لە ژیاندا، بەم ڕەنگە نیشانی ئەدات بە جێگەی کشتوکاڵ و چاندنی بەزرو تۆوێك کە منداڵی لێ پەیدا ئەبێت، وە هەرکام لەو باس و تەعبیرانە ڕێك و پێك و پەیوەستن بە باس و مەبەستی ئەو شوێن و ئایەتانەی کە باسەکەی تێداکراوە، بۆ وێنە: لێرەدا نیشاندانی بە جێگەی کشتوکاڵ زۆر ڕێك و پەیوەستە لەگەڵ مەبەستی ئایەتی پێش کە جڵەوگیری و قەدەغە کردن بوو لە کاری ژن و مێردی لەکاتی حەیزدا، کە لەو کاتەدا –وەك باس کرا– مەبەستی سەرەکی پێك نایەت و هەر تۆوێکی تێ تووڕ بدات منالی لێ پەیدا نابێت، بەڵام لە غەیری ئەو کاتەدا ڕەوایە تۆو چاندن و کشتوکاڵ کردن بە هەر جۆرو لە هەر بارێکەوە، بە مەرجێ لە جێگەو شوێنی تایبەتی دیاری کراودا بێت،

﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٢٣﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ﴾ ژنەکانتان جێگەی کشتوکاڵو تۆو چاندنە بۆتان، واتە وەك زەویەکانتان وان کە ئەیانکێڵنو بەزرو تۆویان تێئەکەن تا بڕوێو بەرو بەرهەمیان لێ وەرگرن، ﴿فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾ کەواتە بچنە لای ژنەکانتان کە وەك شوێنی کێڵانو کشتوکاڵ وان بۆتان، بچنە لایان لە هەر شوێنێو لەسەر هەر بارێ: بە پێوەو بە پاڵەوەو بە دانیشتانو بە هەر جۆر کە پێتان خۆشە، بەڵام بێگومان ئەبێ ئەو شوێنە پێشی ئافرەتەکە بێت نەك پاشی، لەبەر ئەمانە:

١- حەدیسی زۆرو زەبەندە کە هاتوون لە قەدەغەکردنی پاشی ئافرەتدا، یەکێ لەو حەدیسانە ئەمەیە کە (ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداودو تیرمزی) و چەند کەسێکی تر ئەیهێنن لە (ئەبوهورەیرە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکەس بچێتە لای ژنی خۆی لە حەیزدا یان لە دوایەوە یان بچێتە لای کاهینو بڕوای پێبکات ئەو کەسە بڕوای نەهێناوە بەو ئایینەی کە نێرراوە بۆ سەر محمد، بێگومان بە مەرجێ ئەو چوونە لایە بە حەڵاڵ دابنێ، ئەگینا بوە نابێ بەبێ بڕوا، یان مەبەست بە وتەی (کفر) لە حەدیسەکەدا بێبڕوایی نیە، بەڵکو سپڵەییە، واتە سپڵەیە دەربارەی ئەو ئایینەو چاو لەبەری ئەو چاکەو بەهرە گەورەیە نیە.

٢- لەگەڵ ئایەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ بچنە لایان لەو شوێنەوە کە جێگەی حەیزەو قەدەغە کراوە لەو کاتەدا.

٣- وتەی (حَرۡثٞ)ئەو مەبەست ئەگەیەنێ، چونکە ئاشکرایە کە هەر پێشی ئافرەت شوێنی بەزر چاندنو کشتوکاڵە بۆ بەرهەم هێنانی منداڵ.

﴿وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ﴾ وە پێش بخەن بۆ خۆتان کردەوەی چاك بۆ ڕۆژی دواییتان کە هەندێ لەو کردەوە چاکانە ناوی خوا بردنو نزاکردنە لەو کاتەدا کە دەست ئەکرێ بە کاری ژنو

مێردی، وە هەروەها کردنی ئەو کارە بە سوپاسی خواوە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارەی بۆ حەڵاڵ کردووە، یان بە نیازی ئەوە کە دووچاری حەرامو داوێن پیسی نەبێ، یان بە نیازی ئەوە کە خوا منداڵی چاکی بداتێ، هەرکات ئەو کاری ژنو مێردیە بەو جۆرەکرا ئەو حەلە بە کردەوەی چاكو خواپەرستی ئەنووسرێ بۆ ئەو بڕوادارە، وە هەروەها هەر کاروبارێکی ئەم جیهانو ژیانە بکرێت بە پێی بەرنامەی خوا، هەمووی بە کردەوەی چاكو خواپەرستی ئەنووسێو لە ڕۆژی دوایی دا ئەجرو پاداشتی لەسەر وەر ئەگرێ!! وە ئەو قسەیەی کە بەناونگەو وتراوە: مرۆڤی موسڵمان خەوو خواردنو هەموو شتی هەر خواپەرستیە، قسەو وتەیەکی ڕاستو دروستە، لە بەزەیی و میهرەبانی خوا بە زیادبێت.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە خۆتان بپارێزنو لە خوابترسن لە هەر شتێکدا کە فەرمانی پیادان یان جڵەوگیری کردوون لێی، ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ﴾ وە بزانن کە بێگومان ئێوە بە حزوری خوا ئەگەنو ئەچنە بەردەستی قودرەتی لە ڕۆژی دوایی داو ئینجا بەپێی کردەوەکانتان لەگەڵ ئەکرێ، کەواتە توێشووی باش هەڵگرن بۆ ئەو ڕۆژەتان، ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر موژدە بدە بە بڕواداران، چونکە ئەمان بیری ئەو ڕۆژەیان پێوە بوو، وە لە جیهاندا غەمی خۆیان خوارد، بە کردەوەی چاكو خۆ پاراستن لە گوناهو تاوان، ئینجا وەرە موسڵمان بیربکەرەوە لەم ئایینە بەرزو میهرەبانەت کە چەندە دەستو دڵ گوشادە لەگەڵت، دان ئەنێ بە هەموو هێزو وەزەکانت دا، وە ڕەوای داوە بۆت هەموو پێویستیو داخوزیەکانی لەشو دەروونت، وە هەڵسانت بەو شتانە بە خواپەرستی دائەنێ، وە یەکێ لە میهرەبانیەکەی ئەوەیە کە بەرەڵای نەکردوویت بە نەزانی بڕۆیت بە دەم هێزو وزەکانتەوە، وە بە نەفامی زیادە ڕەوی بکەیتو جڵەوت بدەیتە دەست ئارەزووو داخوازیەکانت تا هەڵەت پێبکەنو هەڵت دێرن، بەڵکو سنووری ڕێكو پێکی داناوە بۆ هەموو شتێکت، ئەگەر لەو سنوورە نەترازێت هەرگیز دووچاری هەڵەو ناڕەوایی نابێت، لە بەزەییو میهرەبانی ئایینە بەرزەکەت بە زیاد بێت.

﴿وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ

---

لەپاش باسی حەیزو جڵەوگیری لە کردەوەی ژن‌و مێردی لە ماوەی حەیزدا، ئینجا بەو بۆنەیەوە دێتە سەر باسی سوێند خوادنی مێرد لە ژنەکەی کە کاری ژن‌و مێردی لەگەڵ نکات، وە بەو بۆنەیەوە لە پێشەوە باسی سوێند ئەهێنێ‌و ئەیکات بە سەرەتاو پێشەکی بۆ ئەو باسە، وە کردی بە یاسای سێیەم لە دوانزە یاساکە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ﴾ سوێند خواردن مەگێڕن بە بەربەست‌و بەرگری کەر لەو شتانەی کە سوێندیان بە دوا ئەخۆن، بەم ڕەنگە بەرگریتان بکات ﴿أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ لەوەی خێروچاکەو لە خواترسی‌و خواپەرستیە، وە لەنهێشتنی ئاژاوەو چاك کردنی بەینی خەڵکی، واتە ئەگەر سوێندتان خوارد لەسەر نەکردنی هەر شتێکی ئاوا سوێندەکەتان مەبەنەسەر، بەڵکو بیشکێنن‌و کەفارەت بدەن بۆ سوێندەکەتان، وەك لەم حەدیسەدا ئەفەرموێ: کە (ئیمامی موسلیم) ئەیهێنێ لە (ئەبو هورەیرە)وە: هەرکەس سوێند بخوات لەسەر شتێ، ئینجا پێچەوانەی ئەوە چاکتربێت، با ئەو کەسە سوێندەکەی بشکێنێ‌و ئەوەی کە چاکترەبیکات، ئەوەش وەك ڕووی دا لە خەلیفەی یەکەم -خوا لێی ڕازی بێ- کە سوێندی خوارد کە هیچ نەدا بە (مسطح)ی پورزای لەپاشدا بە پێی فەرمانی قورئان سوێندەکەی شکاندو کەفارەتی دا بۆ سوێندەکەی، وە هەروەها وەك ئەوەی کەڕووی دا لە (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) کە سوێندی خوارد لەوەی بەینی (بەشیری کوڕی نوعمان)ی زاوای‌و خێزانەکەی چاك نەکات‌و نەکەوێتە بەینیان کە (کەلبی) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەبۆنەی ئەوەوە هاتە خوارەوە.

ئەم تەفسیرە کە هەڵمان بژارد ڕای زۆربەی لەسەرە، وە بەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە کە یەکێکیان زۆر نزیکە لەمەی ئێرەو بەڵکو یەك مەبەست ئەگرنەوە، ئەوی تر ئەمەیە: خوا مەکەن بەنیشانەو پێشانگا بۆ سوێندەکانتان، بەم ڕەنگە لەسەر هەموو شتێ هەر سوێند بخۆن، شتی وا مەکەن، بۆ ئەمەی پیاوی چاك‌و لە خواترس بن، چونکە ئەو کەسەی کە سوێندی زۆر ئەخوات باك‌و بیمی خوا لەدڵی دا نامێنێ، وە هەرکەسیش بەو جۆرە بێت دوورە لە چاکەو لە خواترسیەوە، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە خوا بیسەری هەموو

سوێندو قسەیەکتانە، زاناو ئاگادارە بە هەموو بەسەرهاتو مەبەستێکتان، کەواتە خۆتان بپارێزن و ئەوەی فەرمانتان پێ دراوە بەجێی بهێنن، ئینجا بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە هەندێ لە سوێندەکانمان دانابەستری و لێمان ناگیرێ لە هیچ بارێکەوە، وە هەندێکی دائەبەستری و لێمان ئەگیرێ، ئەفەرموێ: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ﴾ واتە خوا لێتان ناگرێ و تۆڵەتان لێ ناسێنێ و بەگوناه نای نووسێ لەسەرتان هەر سوێندێ لە سوێندەکانتان کە ﴿لغو﴾ بێت، یان کەفارەتتان لێ داوا ناکات لەو جۆرە سوێندانەدا، چەند ڕایەك هەیە لە مەبەست بەم سوێندانە:

١- سوێندی ﴿لغو﴾ ئەوەیە کە لەدەم دەرچێ بەبێ نیازی سوێند خواردن، وەك باوە لە وەڵامی پرسیارێکدا ئەگوترێ: نەواللە، بەڕێواللە، ئەرێواللە، شافیعی و ئەحمەد لەسەر ئەم ڕایەن و ئەفەرموون کەفارەتی لەسەر نیە.

٢- ئەمەیە: سوێند بخورێ لەسەر بوون یان نەبوونی شتێك بەپێی گومان و باوەڕی سوێند خۆرەکەو کەچی لەپاشان بە پێچەوانەی باوەڕو گومانی سوێند خۆرەکەوە دەرچێ، ئەمە ڕای حەنەفی و مالیکەو لایان وایە ئەمە کەفارەتی نیەو یەکەم کەفارەتی ئەوێ، بە پێچەوانەی ڕای یەکەم.

٣- سوێندی کاتی ڕق هەڵسانە.

٤- سوێندە لەسەر شتێکی گوناه.

٥- ئەوەیە کە یەکێك نزای سەر لە خۆی بکات، وەك بڵێ: ئەگەر ئەوەم نەکرد خوا دووچارم بکات بە فڵانە دەردو سزا.

٦- سوێندێکە لەسەر شتێ کەلە بیر نەمابێ.

٧- سوێندێکە کە کەفارەتی درابێت.

لەناو ئەم ڕایانەدا یەکەم بەهێز ترە لەدڵدا، وە دڵ بەئارام ترە پێی، چونکە: بەم جۆرە ڕێك ترە لەگەڵ ئەو ماناو مەبەستەی کەوتەی ﴿لغو﴾ی بۆ بەکارئەهێنرێ لە زمانی عەرەبدا، کە بریتیە لە شتێکی کەوتووی گوێ پێنەدراو.

ڕێکە لەگەڵ چەند حەدیسێکدا یەکێ لەوانە حەدیسێك کە (ئەبو داود) ئەیهێنێ لەدایکی ئیمانداران (عائیشە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سوێندی ﴿لغو﴾ ئەمەیە پیاو لەماڵی خۆیدا لەکاتی قسە کردندا ئەڵێ (نەواللە، بەرێ واللە).

وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ۖ
فَإِن فَآءُو فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَـٰقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ وَالْمُطَلَّقَـٰتُ
يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَـٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ

بەرامبەر ئەم سوێندە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەڵام لێتان ئەگرێ بە سوێندێك ئەگرێ بە سوێندێك کە دڵتان نیازی کردبێ و بە زمان ئەیڵێن دڵیشیانی لەگەڵ بێت، دەی ئەمە وا نیشان ئەدات کە سوێندی ﴿لغو﴾ ئەوەیە کە دەمی ڕووت بێت و نیازی دڵی لەگەڵ نەبێت، ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ وە خوا زۆر داشاردەری گوناهو لێ بوردەیەکی مۆڵەت دەری پەلە نەکەرە، جا لەبەرئەوە لێمان ئەبوورێ لەو سوێندانەی کە بێ نیازی دڵ لە دەممان دەر ئەچێت، وە پەلەش ناکات لە تۆڵە سەندن لە تۆڵە سەندندا لە تاوانەکانمان کە یەکێکیان ئەو سوێندانەیە کە بەدڵ ئەیڵێین و تاوانبار ئەبین تیایاندا، لەپاش لێ بوونەوە لە باسی یاسای سوێند خواردن بە شێوەی گشتی، ئینجا دێتە سەر باسی یاسایەك کە دایناوە بۆ سوێندێکی تایبەتی، کەلە شەرعدا پێی ئەوترێ ﴿إيلاء﴾ کە یاسای چوارەمە لەدوانزە یاساکە، کە بریتیە لە سوێند خواردنی مێرد لەوەی کە ناچێتە لای ژنەکەی و کاری ژن و مێردی لەگەڵ ناکات، ئیتر هەرگیزو بەبێ دیاری کردنی ماوەیەکی دیاریی، یان ماوەیەك دیاری بکات کە زیاد بێت لە چوار مانگ ، یان چوار مانگ، ئەوەش بە گوێرەی جیاوازی ڕای زانایان، وە لە کتێبەکاندا بڵاوبوونەتەوە، بێگومان چەند بەسەرهات و ڕوداوێك پەیدا ئەبن لە ژیانی ژن و مێرددا، کە پاڵ بنێن بە مێردەوە بۆ سوێند خواردنی ئاوا، وە شتێکی ئاشکرایە کە ئەو سوێند خواردن و دوور کەوتنەوە زیان و ئازاری تێدایە بۆ ئەو ژنەو بۆ ئەو ماڵ و خێزانە، ئەگەر زۆر درێژە بکێشێ، وە ئیسلام لە ڕێوە ئەم سوێندو دوور کەوتنەوەی قەدەغە نەکرد، چونکە زۆر چار سوودی هەیەو چارەسەرە بۆ هەندێ لە ئافرەتان کە ئەنازن بە خۆیانەوە، ئیتر لەبەر جوانی یان لەبەر هەرچی، بە هۆی ئەوەوە ژیانی ژن و مێردیی تاڵ ئەکەن، ئینجا بەو سوێندو دوورکەوتنەوە ئەدرێ لەدەماخیان و ئەو لووت بەرزیەیان نامێنێ، هەرچۆنێ ئەو سوێندو دوورکەوتنەوە ئەبێتە هۆی نەمانی بێزاری و کوژاندنەوەی ڕق و

کینەیـەك کـە بەسروشـت پەیـدا ئـەبن لـەناو مـاڵو خێزانـدا، کەواتـە ئـەو وازهێنـانو دوورکەوتنەوە بە کەڵکەو سەری لەخێرو چاکیەوە درەئەچێت، لەبەرئەوە قەدەغە نەکردنی ئەم سوێندو دوورکەوتنەوە بەرژەوەندی تێدایە، بەڵام لە هەمان کاتدا نابێ جڵەو شۆڕبکات بۆ پیاو کە بە ئارەزووی خۆی بجوڵێتەوە، چونکە زۆر جار دەست درێژی ئەکاتو ئەیەوێ ئافرەتە داماوەکە تەنگەتاو بکاتو زبانی پێبگەیەنێ، وە ئەیەوێ بیبەستێتەوە ڕاگیری بکات بە بەستراوەیی، جا لەبەرئەوە سنووری دیاری کرد بە چوار مانگ، ئیتر دوای چوار مانگ یان ئەبێ ئەو پیاوە بگەڕێتەوە سەرباری ڕاست، یان ئەبێ تەڵاقی ئەو ئافرەتەبدات، ئەگەر بەخۆشی خۆی تەڵاقی نەدات، ئەو حەلە حاکمی شەرع تەڵاقی ئەدات، ئینجا باگوێ بگرین لە ئایەتەکە، ئەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ﴾ ئەو کەسانەی کە ئەو سوێندە ئەخۆن کە باس کرا، بۆئەوانە هەیە لەلایەن ژنەکانیانەوە چاوەڕوانی لە چوار مانگدا، واتە تا چوارمانگ وازیان لێ ئەهێنرێ، ﴿ فَإِن فَآءُو ﴾ ئینجا ئەوانە ئەگەر لەو ماوەیەدا، یان لە پاش تێپەڕکردنی کوتو پڕ گەڕانەوە بۆ ژیانی ژنو مێردیی ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ئەوا خوا زۆر داشاردەری گوناهو لێ بوردەیەکی بەزەیی دارە، ئەبوورێ لەوەی کە کردوویانە، ﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ﴾وە ئەگەربڕیاری تەڵاقیان ئەدەن﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ئەو خوا بیسەرێکی زانایە بە سوێند و تەڵاقو مەبەستو نیازیان، کەواتە بە گوێرەی کردەوەو نیازیان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکات.

ئینجا بەبۆنەی ئەو تەڵاقەوە دێتە سەر باسی یاساکانی تەڵاقو عیدەو هەموو شتەکانی تر کە لە تەڵاقەوە پەیدا ئەبن، لە یەکەم جارەوە دەست ئەکات بەباسی عیدەو گێڕانەوەی تەڵاق دراوەکە کە یاسای پێنجەمە، ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ واتە ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوانەی کە مێردەکانیان چووبوونە لایان وە سەرو عوزر شوێنو ئاوس نینو ئازادن، لەپاش تەڵاق دانو کەوتنی تەڵاقەکەیان، با چاوەڕوانی بکەنو خۆیان بگرن لە سووکردنی تازە ﴿ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ تا سێ حەیز، یان سێ پاکی تێپەڕئەکات بەسەر تەڵاق کەوتنەکەیاندا، ئینجا پاش ئەوە ئەگەر شوو ئەکەن بابیکەن؛ ئەو ماوەیە بوەستن تا دەرکەوێ کە سکیان نیە، وە پێویستە لەسەریان چی ئەزانن لەبارەی خۆیانەوە دەری بڕن، بەم ڕەنگە ئەگەر سکیان هەیە یان حەیزیان تەواو نەبووە بەڕاستی بیڵێن،

﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ۚ﴾

---

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ﴾ وە دروست نیەو ڕەوا نیە بۆیان شاردنەوەو ڕاستی نەگوتنی ئەوەی کە خوا دروستی کردووە لە منداڵدانەکانیان دا، ئیتر ئەو سك پڕیێ بێت یان حەیز، شاردنەوەی هەرکام لەوانە گوناهو زیانی زۆری لیێ پەیدا ئەبێت، چونکە ئەگەر سکی ببیێ و بیشارێتەوەو بڵیێ: عیدەم بەسەر چووە ئەوە لە لایەکەوە پەکی مێردەکەی ئەخات لەوەلا بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، وە ئەو گێڕانەوەش مافێکی شەرعیە بۆی ئەگەر هەرسیێ تەڵاقی نەکەوتبیێ، وە لەلایەکی ترەوە لەوانەیە بەو سکەوە شووی تازە بکات کە ئەوەش تاوانێکی زۆر گەورەیە، چونکە ئەو حەلە منداڵی مێردی پێشووی ئەشارێتەوەو ئەیکات بە منداڵی یەکێکی تر، وە هەروەها ئەگەر حەیزی مابێتو بڵیێ نەم ماوە ئەوەش لەلایەکەوە پەکی مێردەکەی ئەخات لەو ماوە شەرعیەی کە باسکرا، وە لەلایەکی ترەوە لەوانەیە شووبکات بەبیێ ئەوەی عیدەی بەسەر چوو بێت کە بەو جۆرەش نیکاحی دانامەزریێ بۆ شووە تازەکەی، کەواتە نابیێ ئەوە دەرنەبڕنو بیشارنەوە ﴿إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوایان هەیە بە خواو هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، چونکە ئەو شاردنەوەیە دژو پێچەوانەی فەرمانو ڕەزامەندی خوایەو بڕواداریش نابیێ وابێت، وە ئەو شاردنەوەیە کە ئەو هەموو تاوانەی لیێ پەیدا ئەبێت مەترسی تۆڵەی سەختی ڕۆژی دوایی لیێ ئەکریێ، دەی هەرکەسێك کە بڕوای ببیێ بە ڕۆژی دوایی نابیێ کارێکی وا بکات کە خۆی شایستەی تۆڵەی ئەو ڕۆژە بکات.

ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوانەی کە باس کران پێویستیان هەیە بە عیدە تا دەرکەویێ سك پڕنین، وە هەروەها ئەوانیشو هەموو تەڵاق دراوێکی تریش پێویستن بەو ماوەی عیدەیە، بۆ ئەوەی ئەویشو مێردەکەشی بیرێك بکەنەوە لە حاڵی خۆیانو هەر ناکۆکیو بێزاریەك کە پەیداب وو لە نێوانیاندا لەدڵی دەرکەنو ئەگەر بە شەرعی ڕێگەیان بوو با بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر، وە ئەگەر گەڕانەوەش نەبوو ئەو ماوەی وەستانە تەمیێ خواری تێدایە بۆ ئافرەتەکە کە ئەگەر شووی تازەی کرد با هەوڵ بدات جارێکی تر ئەوەی بەسەر نەیەت، چونکە تەڵاق دان

وەك لای خوا بێزراوو نەویستەیە، هەروەها لای مەردومیش ڕیسوایی تێدایەو ناشێن سەیر ئەکرێ.

هەرچەند بوونی تەلاق پێویستە بۆ هەندێ کات، ئەگەر خوا میهرەبانی نەکردایەو تەلاقێ دانەنایە گەلێ پیاوو ئافرەت دووچارو ئەکەوتنە ناڕەحەتی بۆ وێنە: ئەگەر پیاوو ئافرەتێك کەوتنە یەك‌و بەهیچ ڕەنگ ڕێك نەکەوتن‌و تەبیعەتیان نەئەگونجا پێکەوە کە ئەوەش زۆر ڕوو ئەدا، ئەگەر ڕێگەی تەلاقدان نەبوایە ئەوانە چیان بکردایە؟ کەواتە لە میهرەبانی خوا بەزیادبێت کە تەلاقی دانا، بەلام کە دایناوە بۆ کاتێ پێویست‌و چارەسەرکردنی هەندێ بەسەرهاتی داناوە، نەك بکرێ بە کوتەکی دەست‌و هەمیشە لە کارابێت، وەك لەناو نەفامی ئەمڕۆدا باوە، بەڵکو وای داناوە کە بکرێ بە دواترین چارەسەرو کردەوە، وە چەند قۆناغێکی لە پێشەوە بۆ داناوە، وەك بە یارمەتی لەمەو پاش لە سوورەتی ﴿النساء﴾دا ئەو باسە بە درێژی دێت، وە لەپاش بڕینی ئەو قۆناغانەو بەکارهێنانی هەموو هۆی یەك کەونن، ئینجا کار ئەگاتە تەلاق دان، وە تەلاقدانەکەش بەسێ جار تەواو بکرێ‌و هەرجارێکیش لە یەك پاکی سەربەخۆ ئەگەر سەرو عوزر بشۆرێ، وەلە جاری یەکەم‌و دووەمدا بەجۆرێ بێت کە ڕێی گەڕانەوەیان ببێ بۆلای یەکترو ژیانی ژن‌و مێردی دەست پێ‌بکاتەوە، جا ئەگەر هەردووی مەیلی ئەوەیان بوو، یان هەر مێردەکە مەیلی بوو ئیتر با ئافرەتەکە بێزاربێت: هەر ئەو مێردانە شایان ترن بۆ ئەو تەلاق دراوانە تا ئەوەی لێیان گەڕێن‌و پاش عیددە شوو بکەن بەمێردی تری تازە، ئەم دوو مافەش بەبێ ئەوەی کە ناسراوو ویستراوە لە لایەن شەرعەوەو باوو عورفی خەڵکی لەسەرە، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ وە مێردە تەلاق دەرەکانیان شایانترو شایستە ترن بە گێڕانەوەیان بۆلای خۆیان‌و ماوەی عیددەدا، یان شایستە ترن بەو گێڕانەوە تا ئەو ژنانەی کە بێزارن لەو گێڕانەوە، واتە ئەبێ قسەو مەبەستی مێردە کان بەجێ‌بێت، بەلام ﴿إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا﴾ ئەگەر ئەو مێردانە نیازی ئاشت بوونەوەو چاك کردنەوەی بەینی خۆیان‌و ئەو ئافرەتانە بکەن، نەك نیازی زیان پێگەیاندن‌و بەستنەوەیان لەناو ژیانێکی تاڵ‌و سوێردا، یان بەدڵ حەزیان لێ ناکەن، بەلام بەعارو سەرشۆڕی بەرەلایان بکەن‌و بچن شووبکەن بە کەسێکی ترا واتە ئەگەر بەو نیازە چاکەوە نەبێت‌و بە هەر نیازێکی خراپەوە بیانگێڕنەوە گوناهیان ئەکات‌و ئەو گێڕانەوە ناڕەواو بێ شەرعی یە.

﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ئەم فەرموودەیە ئەگەر تایبەتی بکەین و پەیوەستی بکەین هەر بەم تەڵاق دراوانەوە لە کاتی عیددەدا، وەك هەندێ لە زانایان ئەفەرموون، ئەوەش بەپێی دیمەن و ڕواڵەتی شوێنەکە، ئەو کاتە لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێین: بۆ ئەو ئافرەتانە هەیە مافیان بەسەر پیاوەکانەوە، بەوێنەی ئەو مافەی کە هەیە بۆ پیاوەکان بەسەر ئەو ئافرەتانەوە، واتە مافی هەردوولا وەك یەك پێویست کراوە لەلایەن خواوە، وەك دەست نیشان کرا بۆ هەردوو مافەکە لەپێش ئەم فەرموودەیەدا، دەست نیشان کرا بۆ مافی پیاوەکان بەوەی کە پێویستە لەسەر ئەو تەڵاق دراوانە چاوەڕوانی بکەن و هەرشتێ لە منداڵدانیاندا هەیە لێ بدەن و نەیشارنەوە، وە مافی ئەوانیش بەسەر پیاوەکانەوە ئەمەیە کە نیازو مەبەستیان لە گێڕانەوەی ئەو ئافرەتانە چاك کردنی حاڵی ئەوان و چاك کردنەوەی بەینی خۆیان و ئەوان بێت، نەك نیازی زیان پێگەیاندنیان، وە بۆ پیاوەکان هەی بەسەر ئەوانەوە زیادە ماف و پیەیەك، کە بریتییە لە مافی گێڕانەوەکەیان، ئەم مافە دراوە بە پیاوەکان کە تەڵاق دانەکەیان پێدراوە، چونکە بەڕاستی زۆر نارێك و ناڕاستە کە مافی تەڵاق دان بۆ پیاوبێت و کەچی مافی گێڕانەوە بە دەست ئافرەت بێت.. ئەگەر ئەم فەرموودەیە تایبەتی بکرێ بەو ئافرەتانەوە لەکاتی عیددەکەیاندا ئەبێ بەو جۆرەی کە گوترا تەفسیری بکەینەوە، وە ئەگەر تایبەتی نەکرێ بە مافی ئەوکاتەوە، وەك زۆربەی زانایان ئەفەرموون، ئەو حەلە ئەڵێین: لە پێشەوە فەرمووی: ئەبێ مەبەست لە گێڕانەوەی ئەو تەڵاق دراوانە چاك کردنی حاڵیان بێت نەك زیان پێگەیاندنیان، ئینجا بەم فەرموودەیە ڕوونی ئەکاتەوە کە هەرکام لە ژن و مێرد هەیە بەسەر یەکترەوە، وە بێگومان مەبەست لە ژن و مێردیی و ژیانی ژن و مێردیی تەواو بەبێ پارێزگاریی مافی یەکتر، وە ئەو مافانەش بەو پێیە بن کە شەرع ئەیەوێ و باوو عادەتی مەردومی لەسەرو لەناو خەڵکدا شیرین و بەجێن، وەك ڕێز گرتنی یەکتر لەبەرەو ڕوو پاش ملە، وە ڕێ نەدانی ئافرەت بە ئامۆشۆی هەرکەس بۆ ماڵیان کە مێرد پێی ناخۆش بێت، وە مێردیش بە چاکی هەڵسێ بە ئەرکی ئەوان لە خۆراك و پۆشاکدا، وەك

لە حەدیسی صحیحدا بە تایبەتی باسی ئەوە ئەفەرموێ، وە مێردەکە سەرۆك خێزانەو وەك شوان وایە ئەبێ هەمیشە چاودێرو پاسەوان بێتو لە بەرژەوەندی خێزانوماڵەکەی بگەڕێ، وە ئافرەتیش بەرامبەر بەوە با فەرمانبەرو گوێڕایەڵ بێت لە سنووری شەرعدا، وە هەردوولا ڕوخۆش بن بۆ یەکترو هەوڵ بدەن بۆ دڵخۆش کردنی یەکتر، وەك (ئیبنو عەباس)-خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: من پێم خۆشە خۆم برازێنمەوە بۆ ژنەکەم، هەرچۆنێ پێم خۆشە ئەو خۆی برازێنێتەوە بۆ من، وە هەروەها هیچ کام داوای کارێ نەکەن لە یەکتر شیاوو شایستە نەبێ، بۆ وێنە: ئیشی دەرەوە کە شایستە ترە بە پیاوو پێویست نیە لەسەر ئافرەتو با ئافرەت هەڵنەسێ پێی، وە خزمەت کردنی ناوماڵو منداڵو نانو چێشت کە شایستە ترە بە ئافرەت با ژن هەڵسێ پێیان، ئیتر با ئەوانیش پێویست نەبن لەسەریان لە شەرعدا، وەك (ئیمامی شافیعی) لەسەر ئەوەیەو ئەفەرموێ: خزمەت کارو فەرمانی ناوماڵیش شەرع پێویستی ناکات لەسەر ژن، بەڵکو چاکەیەکەو بە مرۆڤایەتی ئەیکاتو پێویستە لەسەر پیاو بڵێ بە ژنەکەی: ئەم کارو فرمانەی کە تۆ هەڵئەسێ پێیان لەناو ماڵدا نیە لەسەرت، بەڵکو بەخێری خۆت ئەیکەیت!!

ئینجا لەسەر ئەم تەفسیرەکە ڕای زۆربەی لەسەرە مافەکانی پیاوو ئافرەت ئەوانە بوون کە ئەو چەند وێنەو نموونەمان بۆ باس کردن، وە ئەو زیادەو پایەو پلەیەی کەپیاو هەتەتی بەسەر ژن دا بەپێی ئایەتەکە کە فەرمووی: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ بۆ پیاوەکان هەیە بەسەر ژنەکانیانەوە زیادەو پایەو پلەیەك. زانایان لەوەدا دوو بەرەکێنو یانزە شتیان بۆ باس کردووە، لەناو ئەوانەدا ئێمە سیانیان هەڵئەبژێرین:

١- مافی گێڕانەوەیان بۆ لای نیکاح وەك لە پێشەوە لە یەکەم تەفسیردا گوترا.

٢- هەڵسانی پیاوەکان بە ماوەییو ئەرکی بەخێوکردنی ئافرەتەکانو بەرگری لێ کردنو پارێزگارییان بەپێی توانا لە هەر شتێکی خراپ، لەگەڵ ئەوە کە ژن وەك پیاو یان زیاتر پێویستەو سۆزی هەیە بۆ ماڵو منداڵو کاری ژنو مێردیی.

٣- مافی کاردەستیو سەرۆکایەتی بۆ ئەو ماڵو خێزانە کە بەبێ سەرۆكو کاربەدەست کاروبارو ناڕوا بەڕێوەو ئەبێ سەرۆکێ هەر ببێ.

دەی بێگومان هەرکەسێك ژیر بێت هیچ گومانی نابێ لەوەدا کە ئەو مافە شایانی پیاوەکانە کە بەهێزترو لێهاتوو ترن‌و هەموو ئەرکی ژیانندن‌و بەخێوکردن لەسەرشانی ئەوانە، ئەمانە یاساو بڕیاری خوان ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، کەواتە هیچ کەس ناتوانێ مل ملانێی لەگەڵ بکات، وە هەرکەس سەرپێچی بکات لە فەرمان‌و بڕیاری‌و مافی ماف داران ژێرپێ بکات لە تایبەتی مافی ژن‌و مێردیی‌و ئافرەت، ئەو کەسە خوا دووچاری ئەکات، وە خوا لێزان‌و کار دروستەو هەموو فەرمان‌و بڕیاری ڕێك‌و بەجێیەو پڕ لە بەرچەوەندیەو دەست نادا بۆ گۆڕان‌و بژارە کردن.

ئەمە بەشێکی زۆر کەم بوو لە مافی ئافرەت کە لێرەدا قورئان دەست نیشان‌و ئاماژەی بۆکرد، کە بەڕاستی هەق وایە لیژنەی مافی ئادەمی بەگشتی‌و بە تایبەتی لیژنەی مافی ئافرەتان پیتی ڕووناکی بینووسن لە بەرزترین شوێن‌و مەڵبەندەکانیان دا هەڵبواسن، ئینجا با بێبڕواکان‌و نەفام‌و دوژمنەکانی ئیسلام‌و مرۆڤایەتی تەریق ببنەوەو سەری خەجاڵەتی داخەن‌و کۆتایی بێنن لەدەم درێژی کردن‌و لای هیچ کەس لەڕوویان نەیەت بڵێن ئیسلام مافی ئافرەت ژێر پێ ئەکات، وە با دوژمنەکانی ئافرەت کە خۆیان کردووە بە دۆست‌و داوای مافیان بۆ ئەکەن، با ئەو دوژمنە بە ناو دۆستانە بزانن کە هەموو زانایەکی ژیرو تێگەیشتوو لەو مافانەی کە ئەوان داوای ئەکەی بۆ ئافرەتان هەر بریتیە لەو مافەی کە ئافرەت بەرەڵا بێت تا بەکاربێت‌و بەکار بهێنرێ‌و کەلە کاریش کەوت با بڕوا بکەوێ بەبێ کەس‌و بەبێ دەر، وە بەبێ لانەو یانەو بەخێوکەرێك!! ئینجا دێتە سەر باسی یاسیای شەشەم لەدوانزە یاساکەی ئێرە کە یاسای ژمارەی تەڵاقە لەگەڵ باسی چەند شتی تر کە پەیوەندی هەیە پێیەوە، ئەفەرموێ: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ﴾ لە پێشەوە با بزانین کەلێرەدا زانایانی تەفسیر دوور ڕایان هەیە:

١- ئەم ڕستەو وتەیە سەربەخۆیەو نەبەستراوە بە پێشەکەیەوە، وە هاتووە بۆ دیاری کردنی چۆنیەتی تەڵاق دانی شەرعی، بەم ڕەنگە ئەبێ بەسێ جاربێت‌و نابێ هەرسێکی

کۆبکرێتەوە بەیەك جارو بەیەك وتە، لەسەر ئەم ڕایە کۆکردنەوە حەرامو قەدەغەیە، وە زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن.

٢- سەر بەخۆ نیەو بەڵکو بەستراوە بە پێشەکەیەوەو تەواو کەری ئەوە، بەم ڕەنگە

لەئایەتی پێشوودا باسی مافی گێڕانەوەی تەڵاق دراوەکانی کردو ئیتر سنووری دیاری نەکرد بۆی، وە پێویستە سنووریشی ببێ، لەبەرئەوە بەم ئایەتە سنووری دیاری کرد بەدوو جار، یەکێ لە زانایان کە ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە (ئیمامی شافیعی)یە. کەواتە لەسەر ڕای یەکەم ئەبێ بڵێین: تەڵاقدان ئەبێ جار لەدوای داربێتو نابێ تەڵاقەکان کۆ بکرێنەوەو بە یەکجار بدرێن، وە لەسەر ڕای دووەم ئەبێ بڵێین: ئەو تەڵاقەی کە مافی گێڕانەوە تێدایە بۆ مێرد دووجارە یا دوو تەڵاقە، ئینجا هەرکام لەم دوو ڕایە چەند بەڵگەو ڕایەکی بۆ باس کراوەو پێویست نیە لێرەدا ئێمە بەو جۆرە درێژەی پێبدەینو ئەڵێین: دیمەنو ڕواڵەتی ئایەتەکانی پێشو پاشی ئەم ئایەتە یارمەتی ڕای دووەم ئەدەنو ئەو بەهێز ئەکەنو ئەیچەسپێنن لەدڵدا، چونکە لەسەر ئەم ڕایە ڕێزو هۆنینەوەی ئایەتەکان زۆری ڕێكو بە جێترن، ئینجا ئەو حەدیسەی کە هاتووە لەباسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بە تەواوی بڕوامان بەهێز ئەکات بەم ڕایە، وە حەدیسەکەش لە چەند ڕێگایەکەوە هاتووە کە دڵنیا کەرن بەڕاستی ئەم حەدیسە، یەکێ لەو ڕێگایانە ئەمەیە کە (ئیمامی مالیكو ئیمامی شافیعیو ترمزی)و چەند کەسێکی تر ئەیهێنن لە (عوروەی کوڕی زوبەیر)ەوە ئەویش لە باوکیەوە کە ئەفەرموێ: لە پێشەوە پیاو کەژنی تەڵاق ئەدا ڕێی بوو بیگێڕێتەوە لەکاتی عیددەدا با هەزار جار تەڵاقی بدایە، ئینجا پیاوێك ژنەکەی تەڵاق داو لێی گەڕا تا خەریك بوو عیددەی بە سەر بچێ، لەوێ دا ئەیگێڕایەوە بۆلای خۆی، ئینجا دووبارە تەڵاقی ئەدایەوە، لەپاش دا پێی گوت: والله نە ئەتگرمە لای خۆم، وە نە هەرگیز بەرەڵات ئەکەم، بەم ڕەنگە تەڵاقێت ئەدەم هەتا کاتێ کە عیددەت خەریکە تەواوبێ، لەوێدا ئەتگێڕمەوە، وە هەروەها ئینجا ئەو ئافرەتە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دادەی کرد، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی

ناردە خوارەوە، دەی ئەم حەدیسە هەر ڕای دووەم نیشان ئەدات و ئەمە ئەگەیەنێ کە ئەم ئایەتە سنوور دیاری ئەکات بۆ گێڕانەوەی تەڵاقدراوان، بێگومان لەسەر هەردوو ڕا ئەم ئایەتە دەست نیشان و ڕێنموونی تێدایە بەوەی کە تەڵاق دان با یەك و جار لە دوای جاربێت، وە شتێکی ئاشکرایە بەلای هەموو کەسەوە کە هەر بەو جۆرە ڕاست و ڕێکە، چونکە تەڵاق دەرمان و چارەسەرێکە خوا دایناوە کە بەگوێرەی پێویست بەکاربهێنرێ، وە بێگومان یەك تەڵاق بەسە بۆ چارەسەر کردن، وە زیاد لە یەك زیادە ڕەویە، کەواتە نەبێ چاکە، وە بێجگە لەوەش بە زۆری ئەبینرێ کە تەڵاق دەر یا تەڵاق دراو یان هەردوو لەپاش تەڵاق دانەکە ئەکەونە ئەوپەڕی زیان و ناڕەحتی بەهۆی ئەوەوە زۆر پەشیمان و دڵگران ئەبن و مەرگی خۆیان بە ئاوات ئەخوازن لە داخی ئەو تەڵاق دان و جوێ بوونەوە، کەواتە با ڕێگەیان لێ نەبەسترێ و بتوانن بکەونە یەك، ئینجا ئەگەر بە یەك جار تەڵاق دان و گێڕانەوە تەمێ خوار نەبوون و ژیانی ژن و مێردییان چاك نەبوو با جارێ تریش تاقی بکرێنەوە و ڕێگەی تەڵاق دان و گێڕانەوەیەکی تریان بدرێ، بەڵکو لەجاری دووەم دا چاك بن، لەبەرئەوە ڕێ دران بۆ جاری دووەمیش، وە ئەگەر ئەمجارەش هەر چاك نەبوون و ژیانیان پێکەوە نەئەگونجا با بۆ جاری سێیەمیش ڕێ بۆ جوێ بوونەوەی یەکجاری، لەبەرئەوە ڕێی جوێ بوونەوەیان لێ نەگیرا بۆ ئەمجارەش، بەڵام چونکە تاقی کردنەوە کە بەو دووجارە دوایی هات، ئیتر لەپاش جاری سێیەم ڕێگەی یەك کەوتنەوە گیرا مەگەر ئافرەتەکە شوویەکی تر بکات و ئینجا ئەمیش نەگونجێ و هەر وەك مێردی پێشوو تەڵاق بدرێ، ئەو حەلە ڕێی ئەدرێ پاش عیددە بەسەر چوونی شوو بکاتەوە بە مێردی یەکەمی، ئەگەر ئارەزووی یەکتریان کرد، چونکە لەوانەن بەهۆی ئەو هەموو بەسەرهاتەوە هەردوو لا تەمێ خوار ببن و ئیتر ناکۆکی و ئاژاوە ڕوویان تێ نەکاتەوە، بێگومان ــ وەك وتمان ــ تەڵاقەکان یەکەیەکەبن چاکە و قورئان ڕێنموونی بۆ ئەکات ئەی ئایا کۆکردنەوەیان حەرامە و قەدەغەیە یان نا؟ (ئیمامی حەنەفی و ئیمامی مالیك) و زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە کۆکردنەوەی سێ تەڵاقە قەدەغەیە و حەرامە، وە (ئیمامی شافیعی) و کۆمەڵێکی تر لەسەر ئەوەن کە قەدەغە نیە، وە هەروەها

(ئیمامی ئەحمەد)یش لە فەرموویەکی دا، وە هەردوو تاقم بەڵگەیان هەیە لەسەر ڕای خۆیان وەك لەکتێبەکاندا باس کراون، ئینجا ئایا ئەو تەڵاقانەی کە کۆئەکرێنەوە ـ دوان یان سیان ـ بە جارێك ئەکەون یان هەر ژمارەیەك بگوترێ هەر یەکێکی پێئەکەوێ و تەڵاق هەر بە یەکە یەکە ئەکەوێ؟ یان هەر یەکێکیش ناکەوێ؟

(ئیمامی حەنەفی و مالیك و شافیعی و ئەحمەد) و جەماوەری زانایانی ئوممەت لەسەر ئەوەن کە هەرکات دوو تەڵاق یان سێ کۆکرانەوە لە یەك وتەدا بە جارێ ئەکەون، وەك بەیەکە یەکە بگوترێن، وە ئەهلی ظاهرو شیعەو کۆمەڵێ تر لەسەر ئەوەن کە هەرچەند ژمارە بگوترێ هەر یەك تەڵاقێ پێئەکەوێ، وە (محمدی کوڕی مقاتل و محمدی ئیسحاق و حەجاجی کوڕی إرطاة) لەسەر ئەوەن کە هیچی پێ ناکەوێ، بێگومان ڕای سێیەم بەهیچ ڕەنگ جێی بڕوانیەو هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە کە گوێی بۆ بگیرێ، وە ڕای دووەمیش هەرچەند لە کۆن و تازە چەند زانایەکی لەسەرە، وە دوو حەدیس بەڵگەیە بە دەستیانەوە، بەڵام ئەم ڕایەش لەکاتی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەدا دەرکەوت کە شیاوی ئەوە نیە پشتی پێببەسترێ و ڕەفتاری پێبکرێ، وەك لە شوێنی تایبەتی خۆی دا بەدرێژی ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ڕای یەکەم زۆر بەهێزە، چونکە حەدیسێکی زۆری بەهێزی پێ هاتووە، لەناو ئەو حەدیسانەدا سیانیان ئەهێنم:

١- حەدیسێ کە (بەیهەقی) لە سونەنی خۆی دا ئەیهێنێ لە (سوەیدی کوڕی غفلە) (ل ٣٣٦، ج ٧) کە (ئیمام حەسەن) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ بە خێزانی خۆی: (عائیشەی خثعمیة): تەڵاقت کەوتبێ سێ بەسێ، لەپاش دا پەشیمان ئەبێتەوەو ئینجا ئەفەرموێ: ئەگەر لە باپیرم نەبیستایە ـ واتە پێغەمبەر (ﷺ) ـ یان باوکم هەواڵی پێ نەدایەم کەلە باپیرمی بیستووە کە فەرموویەتی: هەر پیاوێك سێ تەڵاقەی ژنی خۆی بدات بەسێ جارو هەر جارێك لە پاکی دا، یان بە یەك جارو هەرسێکی کۆ بکاتەوە، ئەو ئافرەتە حەڵاڵ نابێت بۆ مێردەکەی هەتا شوویەکی تر نەکات، ئەگەر لەبەر ئەم

فەرمووده نەبوایە (عائیشە)م ئەگێڕایەوە بۆلای خۆم، ئەم حەدیسە بەم جۆرە هاتووەو ئەش بیستراوە هیچ کەس ڕەخنەی لێ گرتبێ، کەواتە زۆر جێگەی بڕوایە.

٢- (اشهب) حەدیسێك ئەهێنێ لە (سەعیدی کوڕی موسەیب)، وەك لە (المدونة)دا ئەفەرموێ: (ج/ ٥ ص ١٦٣) کە پیاوێك لە تیرەی (ئەسلەم) ژنەکەی تەلاق ئەدات سێ بەسێ و بەیەکجار، ئینجا ئافرەتەکە ئەچێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، وە عەرزی ئەکات کە مێردەکەی بەیەك وتە سێ تەلاقەی داوە، ئەویش ئەفەرموێ: سێ تەلاقەت کەوتووە میرات نابەن لە یەکتر.

ئەم حەدیسە هەرچەند (مرسل)ەو ناوی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) تیا نیە، بەلام (مرسل)ێکە کە حەدیس قوڵێگیریەتی و کۆڕو جەماوەری زاناو پێشەواکانی لەگەڵە، کەواتە پەسەندەو وەرگیراوە. (دار القطني) لە سونەنەکەی خۆی دا (ل/١٠٤) حەدیسێك ئەهێنێ لە (ئیبن و عومەر)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– کە ئەفەرموێ: یەك تەلاقی ژنەکەم دا لەکاتی حەیزدا...هتد، ئینجا ئەمەشی تێدایە، کە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر سێ بەسێش تەلاقم بدایە هەر ڕێی گێڕانەوەیم بوو؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، ئەو کاتە جوێ ئەبوویتەوە، وە وتەکەت گوناه ئەبوو.

٣- بێجگە لەم حەدیسانە (ئیمامی مالیك) لە (موطأ)ی خۆی دا فتوای (ئیمامی عوسمان و ئیبن و مەسعودو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) ئەهێنێ لەسەرکەوتنی سێ تەلاقە بە یەك جار سەرباقی ئەم هەموو حەدیس و فتوایانە، شتێکی ئاشکرایە کەلە چەرخی خەلیفەی دووەم دا بڕیاروئیجتماعی خەلیفەو هەموو هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو لەسەر کەوتنی تەلاقی سێ‌بەسێ بە یەکجار، وە بێ‌گومان ئەگەر پاڵپشت و بەڵگەیەکی بەهێز نەبوایە ئەو بڕیارو ئیجماعە نەئەبوو.

بەراستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە هەرکەس گومانی وابێ کە تەڵاقی سێبەسێ لە چەرخی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکردا یەك تەڵاق دانراوە، کەچی عومەرو باقی تر توانیان بەبێ بەڵگەو پاڵشت ئەو بڕیاری ئەوانە بسڕنەوە بە قسەو بڕیاری خۆیان!! زۆر سەرسوڕ ئەمێنێ لە گومانی وادا، هەرچۆنێ سەر سووڕ ئەمێنێ لەوەی کە موسڵمانی ئەمڕۆ شەرم ناکاتو بێباك ڕەفتار بکات بە پێچەوانەی ئەو بڕیارە کە عومەری فاروق دایو هەموو موسڵمانەکانی ئەو چەرخەی لێ بێدەنگ بوونو دانیان پیا ناو ئینجا لەپاش ئەوان کۆڕو جەماوەری هەموو مەزهەبە باوەڕ پێکراوەکان، وەریان گرتو بڕیاریان لەسەردا!! داواکارین لە موسڵمانی ئەمڕۆ ئەو بێ شەرمیە بەسەر خۆی دا نەهێنێ، وە ئەگەر تائێستا هێناویەتی لێی پەشیمان ببێتەوە، ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾ ئینجا دوای ئەو دوو تەڵاقدانە یەکێ لەم دووبارە پێویستە: گێڕانەوەی ئافرەتەکەو ڕاگیرکردنی بە شێوەیەکی شەرعیو ڕێكو پێكو بە گوێرەی ژیانێکی مرۆڤایەتی، یان بەرەڵاکردنی بە شێوەیەکی چاكو شیرین، بەم ڕەنگە باسی بە خراپە نەکات، وە هەر حەقێکی هەیە بۆی جێبەجێبکات، وە ئەو بەرەڵا کردنەی بەمەبێت کە نەیگێڕێتەوە بۆلای خۆیو لێی گەڕێ هەتا عیددەی بەسەر ئەچێتو ئیتر ئەو کاتە سەربەستی وەرئەگرێو ئەتوانێ شووبکات بەهەرکەس کە مەیلی ببێ، وە ناتوانێ بێتەوە بۆلای مێردەکەی مەگەر بەنیکاح کردنو مارەییەکی تازە، بەرەڵا کردنەکەی بەمە بێت تەڵاقی سێیەمیشی بدات، هەرکام لەم دووبارە هەر بەرەڵاکردنە، بەڵام دیمەنو ڕواڵەتی حەدیس لەگەڵ باری دووەمو دایە، ئەوەتا (ئەبو داود)و کۆمەڵێك حەدیسێك ئەهێنن لە (ئەبو رزینی ئەسەدی)یەوە کە پیاوێك گوتی: ئەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ئەبیستم خوا ئەفەرموێ: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ﴾ ئەی تەڵاقی سێیەم لەکوێیە؟ لەوەڵام دا فەرمووی: بەرەڵاکردنی بەچاکیو بەڕێکی تەڵاقی سێیەمە. لەسەر ئەم ڕایە ئایەتی داهاتوو کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ﴾ تەفسیرو ڕوون کەرەوە بۆ ئێرە کە ئەفەرموێ: ﴿أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾ لە پاش ئەوەی چاکەکردنی پێویست کرد لەسەر ئەو کەسەی کە بەرەڵاکردن هەڵئەبژێرێ، ئینجا قەدەغەی ئەکات لەسەر مێردەکان کە هیچ شتێك وەرگرن لە ژنەکانیان بەرامبەر بەرەڵاکردنو تەڵاقدانیان،

وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا﴾ حەڵاڵ و ڕەوا نیە بۆتان وەرگرتنەوەی هیچ شتێك لەوەی كە پێتان داون، ئیتر ئەو شتە مارەیی بێت یان هەر شتێكی تر كە پێتان داین.**

**ئەم لێ نەسەندنەوەو وەرنەگرتنە هەرچەند وەرئەگیرێ لە پێشەوە بە شێكە لەو ئیحسانەی كە فەرمانی پێدا، بەڵام بەتایبەتی باسی كرد لەبەرئەوەی بدات كە كاری ئافرەت زۆر بە گرنگ گیراوە، وە لەبەرئەوەی باشتر ببێتە بەرگری كەر لەو پیاوانەی كە زۆر دارن و ئەیانەوێ ستەم بكەن لە ئافرەتە زەبوون و بێچارەكان، ئینجا ئەو قەدەغەكردنە لە كاتێكدا كە مێرد حەز لە جیابوونەوە بكات و ئافرەتەكەی نەوێ، وە ئەگەر ئافرەتەكە پیاوەكەی نەوێ و بیەوێ جوێ ببێتەوە، ئەو كاتە هیچ گوناه نیەو ڕەوایە بۆ پیاوەكە شتی لێ داوا بكات بەرامبەر بەرەڵاكردنەكەی، چونكە ڕەوا نیە بەبێ تاوان ژنەكەو ماڵەكەشی لەدەست دەرچێ، جا لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ واتە ڕەوا نیە بۆتان هیچ شتێك وەرگرنەوە لەوەی كە پێتان داون، مەگەر پیاو و ئافرەتەكە مترسی بكەن لەوەی كە سنوورەكانی خوا ڕاگیر ناكەن و ئەیان شكێنن، ئەو سنوورانەی كە خوا دایناون و پێویستی كردوون لە سەر ژن و مێرد بەجێهێنانیان بەرامبەر یەكتر، هەروەها مەترسی بكەن كە بەهۆی بێزاری و نەویستنی كە پەیدا بووە لەنێوانیان دووچاری داوێن پیسی یان هەر شتێكی تری ناڕەوا، ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ كەواتە ئەگەر مەترسیتان ئەكرد لەوەی كە ئەو ژن و مێردە سنوورەكانی خوا ڕاگیرناكەن ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ﴾ ئەو حەلە هیچ گوناهێك نیە لەسەر ئەو پیاو و ئافرەتانە لەدان و وەرگرتنی ئەو ماڵ و شتەی كە ئافرەتەكە ئەیدات**

بەمێردەکەی و خۆی پێڕزگار ئەکات و پێی جویێ ئەبێتەوە، کە ئەوەش لە ئیسلام دا پێی ئەگوترێ (خلع) واتە جیابوونەوە و ڕزگاربوونی ژن لە مێردەکەی بەرامبەر ئەو ماڵ و شتەی کە ئەدرێ بە پیاوەکە، واتە گوناهو نیە لەسەر پیاو لە وەرگرتنی ئەو ماڵە، وە گوناهیش نیە لەسەر ژنەکە لەدان و دەست لێ هەڵگرتنی ئەو ماڵە، وە بۆ ئەوەی بەباشی تێ بگەین لەم مەسەلەیە ڕووداوێك لەم بارەیەوە ئەهێنین کەلە چەرخی پێغەمبەردا (ﷺ) بەدی هات و ناوبراوە بە یەکەم (خلع) لە ئیسلام دا (ئیمامی مالیك) لەکتێبە حەدیسەکەی خۆی دا کە ناوی (موطأ) ئەفەرموێ: (حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصاری) ژنی (سابتی کوڕی قەیس) بوو، وە پێغەمبەر (ﷺ) بەیانیەك لەتاریکی و بووم و لێڵدا لە بەرقاپی دا تارمایی ئەو ئافرەتە ئەبینێ و ئەفەرموێ: کێیت؟ ئەویش ئەڵێت: (حەبیبەی کچی سەهل)موسڵمان، ئینجا پێی ئەفەرموێ: ئیشت چیە؟ ئەڵێ بەهیچ جۆر ناژیم لەگەڵ (سابت)، ئینجا (سابت) دێت و پێغەمبەر (ﷺ) پێی ئەفەرموێ: ئەمە (حەبیبە)یەو ئاوا ئەڵێ، ئینجا (حەبیبە) ئەڵێ: هەرچی پێداوم لامە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: لێی وەرگرە، ئینجا ئەویش لێی وەرئەگرێ و تەڵاقێکی ئەدات، ئەم ڕووداوەبەدرێژتر (بوخاری) ئەیهێنێ لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- وە هەروەها (ئیبن و جەریر) ئەیهێنێ لە (عیکرەمە)وە، ئەم ڕیوایەتانە بۆمان ڕوون ئەکەنەوەچۆنیەتی وزاڵی ئەوحاڵەتەدەروونیەی کەبوو بەهۆی ئەو جیا بوونەوە، کە حاڵەتێکی ئەوەندە زۆردار بوو چارەسەر نەکرا بەو جویێبوونەوە نەبێت، لەبەرئەوە پێغەمبەر (ﷺ) دژی نەوەستا و لە بەرنامەکەی خوا ئەو چارەسەریەی بۆ وەرگرت، ئا بەو جۆرە ئیسلام هات چارەسەری دانا بۆ هەموو قۆرت و گرێیەك، وە دەرمانی دیاری کرد بۆ هەموو دەردو نەخۆشیەك، لەبەزەیی و میهرەبانی خوا بەزیاد بێت، ئینجالەبەرئەوەی هەموو ڕاستی و ناڕاستی و لێ بڕان و فرۆفێڵك لەم جۆرو بەسەرهاتانەدا ئەگەڕێتەوە بۆ لە خوا ترسان و لە خوا نەترسان، لەبەرئەوە باسەکەی دوایی پێهێنا بە ترساندن لە خودو لە شکاندنی (سنوورەکانی خوا، فەرمووی: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ ئەو یاسا و بڕیارانە سنووری خوان ﴿فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ کەواتە تێپەڕمەکەن لێیان و دەست درێژیان لێ نەکەن بە کردەوەی پێچەوانەو دژ ڕفتاری.

ئینجا هەڕەشەو ترساندنەکە بەهێز تر ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾هەرکەس دەست درێژی ئەکاتو سنوورەکانی خوا ئەشکێنێ هەر ئەوانە ستەمکارن.

تەعبیرەکانی قورئان زۆر زۆر نایابو سەرنج ڕاکێشن، بۆ وێنە لێرەدا ئەفەرموێ: دەست درێژی مەکەنو تێپەڕنەکەن لە سنوورەکانی خوا، وە لەپاش باسی قەدەغەکردنی خواردنو خواردنەوەو کاری ژنو مێردی لەکاتی ڕۆژوودا لەدوای قەدەغەکردنی ئەوانە فەرمووی: ئەوانە سنوورەکانی خوان، کەواتە نزیکیان مەکەونەوە، وە هۆی ئەو جیاوازیەش جیاوازی شوێنەکانە. لەباسی ڕۆژوودا چەند شتێ قەدەغە کراوە کە نەفس زۆر بە سۆزو ئارەزووە بۆیان، کەواتە نزیك کەوتنەوەشیان هەر جێگەی مەترسیەو لەوانەیە ڕایانکێشێ بۆ شکاندنی سنوورەکان، بەڵام لێرەدا شوێنی ئاژاوەو ناکۆکیو ئەو شتانەیە کە نەفس بێزارە لێیان، کەواتە لێرەدا مەترسی لە شکاندنو تێپەڕ کردن ئەکرێ نەك لە نزیك کەوتنەوەیان!! بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ بدوێو باسی هەرشتێ بکات. ئینجا ئەگەڕێنەوە بۆ سەرباسی تەڵاقی سێیەم، حوکموبەرهەمەکەیمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئینجا ئەگەر لەپاش دووجارەکە تەڵاقی تری دا ﴿فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ﴾ ئیتر ئەو تەڵاق دراوە حەڵاڵ نابێ بۆ تەڵاق دەرەکەی لەپاش ئەو تەڵاقی سێیەمە هەتا شوو ئەکات بە مێردەیکی تر غەیری ئەو، وە ئەو مێردی دووەمە کاری ژنو مێردی لەگەڵ ئەکات وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە (ئیمامی شافیعیو ئەحمەدو بوخاریومسلیم)و کۆمەڵێك ئەیهێنن لە دایکی ئیمانداران (عائیشە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ (عائیشە)ی ژنی (ریفاعە) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و تەڵاقی داومو ئینجا (عبدالرحمنی کوڕی زوبەیر) خواستوومی وە ئێستا کەڵکی پیاوەتی پێوەنیەو کاری ژنو مێردی پێناکرێ، ئەویش فەرمووی: ئەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای (ریفاعە)؟ نەخێر شتی وا نابێ تا کاری ژنو مێردی نەکەن، ئینجا ئەو شووکردنەش ئەبێ بە شێوەیەکی ڕاستیو ئێجگاری بێت بەلای زۆربەی زانایانەوە، نەك فێڵو بە نیازی ئەوە دوای چوونە لای بەگورجی تەڵاقی بدات، وەك باوە بەو جۆرە ئەکرێ، وە بەلای حەنەفیو شافیعی یەوە دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە،

فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ

---

﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئینجا پاش ئەوەی کە شووی کرد بە مێردێ‌ترو مێردەکە چووەلای، ئەگەر ئەم مێردی دووەمە تەڵاقی دا ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ﴾ ئەو حەلە هیچ گوناهو خراپی یەك نیە لەسەر مێردە پێشووەکەو ئەم ئافرەتە کە بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر بە نیکاحو مارەییەکی تازەی سەر لە نوێ ﴿إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ﴾ ئەگەر لایان وابوو کە سنوورەکانی خوا ڕاگیر ئەکەن لەبارەی ژن‌و مێردیەوە، کەواتە هیچ شتێکمان بە ئارەزوو کاری نیە، وە هەروا بەرەڵا نەکراوین بە پێی پێویست‌و خواست‌و ئارەزووی خۆمان یەك بگرین، یا جوێ ببینەوە، بەڵکو بۆ هەموو کاروبارمان خوا سنوورو بڕیارێکی داناوە، ئەبێ ژیانمان لە چوار چێوەی ئەو سنوورانە دەرنەچێ، ئەگینا دووچاری دەردی هەردوو جیهان ئەبین، وە بەپێی میهرەبانی‌و بەزەیی خۆی ئەو سنوورانەشی بە ڕوونی باس کردووە بۆمان، کەواتە هەرکەس ژیرو زانابێت بە باشی ئەو سنوورانە ئەناسێ‌و تێیان ئەگات، وە هەرکەس زاناو تێگەیشتوو نیە تاوان لە خۆیەتی، ئەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەو یاساو بڕیارانە سنووری خوان ﴿يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بە ڕوونی باسیان ئەکات بۆ هەر گەل‌و تاقمێك کە تێ‌ئەگەن‌و زانان، کەواتە ئەوانە چەسپانی ئەکەن بۆ کردەوەکان بەپێی ئەو یاساو بڕیارانە، ئینجا دێتە سەر باسی حەوتەم، کە چەند تەمێ‌و پەندێکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە سەبارەت بە ڕەفتارو کردەوەی چاك‌و شیرین دەربارەی تەڵاق دراوەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کاتێ کە تەڵاقی ئافرەتەکانتاندا، ﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئینجا گەیشتنە دوا دوایی عیددەو ماوەکەیان ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ﴾ ئەو حەلە یان ڕگیریان کەن‌و بیانگێڕنەوە ژێر نیکاحی خۆتان بە شێوەیەکی چاك‌و شەرعی‌و بێ‌زیان پێکەیاندن، یان لێیان جیا ببنەوەو بەرەڵایان کەن بەم ڕەنگە لێیان گەڕێن تا عیددەیان بەسەر ئەچێت‌و ئەو کاتە سەربەست‌و ڕزگار ئەبن،

بەبێ زیان پێگەیاندن بە درێژەدان بە عییدەیان، ئەوەش بەم ڕەنگە لە دوا دوایی عیدەکەیاندا بیانگێڕنەوەو لەپاشدا هەمیتر تەڵاقیان بدەنەوە تا عیدەیەکی تر هەڵبژمێرن، وە هەروەها تەڵاقی سێیەمیش، وە بێگومان ئەو جۆرە ڕگیر کردن و گێڕانەوە بۆ زیان پێگەیاندن، وەك بەم فەرموودەیە دەست نیشانی بۆ ئەکات، ﴿وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ﴾ وە ڕگیریان مەکەن و مەیان گێڕنەوە بە نیازی ئەوەی زیانیان پێ بگەیەنن بەدرێژەپێدانی عیدەکانیان، بۆئەوەی ستەمیان لێ بکەن بەسزادانی دەروونیان بەو درێژەپێدانە، یان بەم ڕەنگە ناچاریان بکەن بەوەی مارەیی و ماڵی خۆیان بدەن پێتان و تەڵاقی لەسەر وەرگرن، ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ﴾ هەرکەس ئەوە بکات بێگومان ئەو کەسە ستەم لە خۆی دەکات بەمەی ئەیخاتە بەر سزای خوا، بەوەی خۆی بێبەش ئەکات لە ئەجرو پاداشتی ئەو ڕێگەو بارە ڕاستەی کە خوا بۆی داناوە، وە هەروەها خۆی بەدناو ئەکات لەناو خەڵکدا، چونکە ئەو جۆرە کردەوانە لەگەڵ ئافرەتی زەبوون و بێچارەدا هۆی سووکی و ڕیسواییە.

ئەو جۆرە کردەوە ناڕەوا باو بووە، وە هەرچۆنێ ئایەتەکە دەست نیشانی بۆ ئەکات چەند هەواڵ و ڕیوایەتێکیش پێی هاتووە، یەکێ لەوانە ڕیوایەتی (ئیبن و جەریر) لە (ئیبن و عەباس)ەوە، وە ڕیوایەتی سوودی کە ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی (سابتی کوڕی یەساری ئەنساری)یەوە کە ژنی خۆی تەڵاق دا بەو جۆرە ناڕەوا تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو جڵەوگیریی کرد لەو ستەم و دەست درێژیانە.

ئافرەت لە سەردەمی نەفامیدا دووچاری هەموو ناڕەحەتی و تەنگەتاوی ئەبوو لە ساوایی و منداڵیدا دووچاری زیندەبەچاڵی ئەبوو، وە هەریەکێك لەوە ڕزگار ببوایە بە ئەوپەڕی سووکی و ڕیسوایی و مەینەتەوە ئەژیاو گەورە ئەبوو، ئینجا کە شووی ئەکرد حوشترو وڵاخ و ماڵات زۆر بە نرخ تر بوو لەو ئافرەتە هەژارە بەلای مێردکەیەوە، ئینجا کە تەڵاق ئەدرا بەو شێوەیە تەڵاق ئەدرا کە باس کرا، ئینجا ئیسلام هات فریای ئافرەت کەوت تیمارە چارەسەری هەموو زام و دەردێکی کرد، وە نەسیمی ناسك و پڕ فەڕو بەزەیی خۆی دا لە دڵ و دەروونیان، وە هات پلەو پایەی بەرز کردەوەو هێنایە ڕیزی پیاوو هەموو مافێکی دیاری کردو پێویستی کرد لەسەر پیاوەکان و کاربەدەستەکان بەجێهێنان و پاراستنی ئەو

مافانە، وە ئەو بەجێهێنان و پاراستنەی گێڕا بە عیبادەت و خواپەرستی و پێچەوانی گێڕا بە ستەم و تاوان و لە خوا یاخی بوون، ئەمانەشی هەموو کرد بەبێ ئەمەی کەس شتی وای بە دڵدا هاتبێ، وە بەبێ ئەوەی هیچ ئافرەتێك داوای هیچێ لەو مافانەی کردبێ، بەڵکو دان نان بەو مافانەدا لە لایەن پیاو باوی گشتیەوە بە ستەم و تاوان دائەنرا، کەواتە ئەوەی کە ئیسلام کردی لە بارەی ئافرەتەوە، وەك لە هەموو بارو ناوچەکانی ترەوە، شۆڕشێك بوو هەڵی گیرساند بۆ سەر ئەو هەموو کارو کردەوە ناڕەوایانەی کە دەربارەی ئافرەت ئەکران، جا لەبەرئەوە پێویست بوو بەو هەموو تەمێ و ترساندن و ئامۆژگاریەی کە لەم ئایەتانەدا بڵاو بوونەتەوە، وە بەبێ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایە ئەو هەموو باوو کردەوە خراپانە لانەئەبران و لە ڕیشەوە دەرنەئەهێنران، ئەم ئایەتانەی کە هاتن لەبارەی کاروباری ئافرەتەوە ـ وەك هەموو ئایەتەکانی تریش ـ ڕوون و ڕەوان و بێقۆرت و گرێن، کەواتە هەرکەس بیەوێ فڕوفێڵ بکات لەو کاروبارانەدا ـ وەك ئەو ڕاگیرکردن و گێڕانەوەی کە ئەکرا بەو نیازە خراپانەی کە باس کران ـ ئەو کەسە وەك گاڵتەو لاقرتی بکات بەم ئایەتانە وایە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ﴾ ئایەتەکانی خوا بە گاڵتە مەگرن، بەم ڕەنگە بتانەوێ بە فڕوفێڵ خۆتانیان لێ بشارنەوەو ڕەفتاریان پێ نەکەن، بەڵکو زۆر گرنگ بیانگرن و بە ڕێکی ڕەفتاریان پێ بکەن، یەکێ لەو فڕوفێڵانە ئەوەیە کە (ئیبن و ئەبی عمر) و (ئیبن و مەروە) ئەگێڕنەوە لە (ئەبو الدرداء )ەوە کە ئەفەرموێ: پیاوی وابوو ژنی تەڵاق ئەدا یان بەندەی ئازاد ئەکرد، لەپاش دا ئەیگوت: گاڵتەم کردو بە گاڵتەوە ئەوەم وتووە، ئینجا بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە جڵەوگیری کردن لەو جۆرە فێڵە، وە حەدیسیش هات ئێجگاری ئەو جۆرە فێڵەی خست!

(ئەبو داودو ترمزی و ئیبن ماجەو حاکم) حەدیسێك ئەهێنن لە (ئەبو هورەیرە)وە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: سێ شت هەن بە گاڵتەیشەوە بگوترێن هەر دائەبەسترێن: نیکاح و تەڵاق و گێڕانەوەی ئافرەت بۆ ژێر نیکاح، وە (ئەبو الدردا ) ئەفەرموێ: نیکاح و تەڵاق و ئازاد کردنی بەندە وە (عمری خەلیفەی دووەم) ئەفەرموێ: چوار شت هەن داخراون و قوفڵ دراون: نەزر، تەڵاق، ئازادکردنی بەندە، نیکاح کردن.

﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾ (٢٣١)

به هەرحاڵ لە کۆن لە تازەوە فڕوفێڵ زۆر کراوەو نوسراونەتەوەو کتێبی تایبەتیشیان بۆ دانراوەو ناوبرا بە {کتاب الحیل} کتێبی فڕو فێڵەکان، وە بەڕاستی ئەو کردەوەیانە بەرهەمو سەرەنجامێکی زۆر خراپیان هەبوو، وە بوون بە هۆی پشت کردنە ئایینی خواو پەك خستنو لە کار خستنی یاساو بڕیارەکانی خوا کە ئەوەش کانگاو سەرچاوەی هەموو پەستیو دواکەوتنو زەبوونیو لەکارکەوتنی ئەم گەلەبوو، وە لەڕووی ڕاستی دا ئەو فڕوفێڵانە سەریان لەلاقرتیو گاڵتەکردن بە ئایەتەکانی خواوە دەرچوو، خوا پەنامان بدات لەوە، ئینجا ویژدانو دەروون ئەهێنێتە جۆش بەوەی چاکەو بەهرەی خوامان ئەخاتەوە بیر، وە بە تایبەتی ئەم قورئانەی کە تەمێو ئامۆژگاریمان ئەکات پێی، وە ئەمان ترسێنێ لەوەی نا فەرمان بین، وە بێدارمان ئەکاتەوە بە ئاگاداریی خوا بە هەموو شتێ، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ بیربکەنەوە لە چاکەو بەهرەی خوا بە سەرتانەوەو باسی بکەن، بە سوپاس کردنو هەڵسان بە مافی ﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ﴾ وە بە تایبەتی بیربکەنەوەو باسی ئەو چاکەو بەهرەیە بکەن کە ناردیە خوارەوە بۆ سەرتان کە ئەوەش بریتیە لە قورئان کە کتێبەو زانینێکی سوود بەخشەو پڕ لە بەرژەوەندیە، یان مەبەست بە کتێبە کە قورئانەو مەبەست لە حیکمەتەکە ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەویش نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی بەفەڕیو خراوەتە دڵیەوە ﴿يَعِظُكُم بِهِۦ﴾ لە کاتێکدا کە ئامۆژگاریتان ئەکات بەوەی کە ناردوویەتە خوارەوە، وە ڕێنموونیتان ئەکات پێی، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وە بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لە مل پێچی لە فەرمانەکانیو هەڵسانتان بە پێچەوانەیان، ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ وە بزانن کە خوا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێك، کەواتە خۆتان بۆ ناشارێتەوەو

هەرچی بکەن و نەیکەن زانایە پێی، وە هەر فەرمانێك بدات هەمووی لەزانینەوەیەو بەرژەوەندی تیایە، کەواتە بە پێچەوانەوە ڕەفتار نەکەن، بێگومان چاکەو بەهرەی خوا بە شێوەی گشتی نایەتە ژمارە بۆ هیچ کەس، کەواتە لەو بارەیەوە مەگەر هەر بێدەنگ بین، بەڵام وەك ئەوە ناکرێ بۆمان، با هەندێ بدوێن لە گەورەترو بەنرخ تری جیهان و جیهانیان، وە بە شێوەی تایبەتی بۆ گەلی عەرەب کە یەکەم چین و تاقم بوون ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا، بێگومان پێش ئەم ئاین و قورئانە شتێك نەبوون کە باس بکرێن و نرخێکیان بۆ دابنرێ، بەڵکو ژێر دەستە بوون و چەوساوە بوون لە ژێر چەپۆکی بێگانەدا، وەلە ناو خۆیشیاندا بەش بەش و پارچە پارچە بوون و هەمیشە خۆ خۆر بوون و بەر بووبوونە یەکتر، وە هیچ شتێکیان پێ نەبوو کە بەکاری خۆیشیان بێت چونکە جای خەڵکی تر... بەبێ دەسەڵاتی و بێنەوایی ئەژیان مەگەر تاکە تاکەیەکیان کە بەخوێن مژینی ئەوانی تر بووبوون بە سەر مایەدار بەسەر باقی ترەوە! وەلە ژیری و فام و دەروونیدا هەر هەژارو بێدەست بوون، گرنگترین شت لەژیانیاندا دەست درێژی و تاڵان و ئارەق خواردن و قومار کردن بوو.

ئالەو پەستی و خواری و بێنرخیە ڕزگاری کردن، وە ڕادەو پلەی بەرزکردنەوە، تا ڕادەیەك فریای ئادەمێتی و مرۆڤایەتی کەوتن و بڕۆن بە تاقانە ڕووناکیەك لە جیهاندا، وە بە مامۆستایەتی و بەسەرکردایەتی ئەمان هەموو جیهان و جیهانیان بەهرەمەند بوون، وە تا ئێستا و لەمەو پاشیش هەتا هەتایە ڕەوشت و کردەوەی ئەوان ڕێگە نیشاندەرو سەرمەشقە بۆ هەموو وێڵ و سەرگەردانێك، گەیشتن بەو ڕادەو پلەبەرزە لە سایەی ئەو ئاینەو ئەم قورئانە پیرۆزەی کە لێرەدا بیریان ئەخاتەوەو سەرنجیان بۆ ڕائەکێشێ، وە ئەو یەکەم تاقمە باشتر تێگەیشتن لە گەورەیی ئەم ئاین و قورئانە، چونکە ئەوانەی یەکەم جار ئەو پەستی و بێوێڵی و بێنرخی سەردەمی نەفامیەیان بە خۆیانەوە بینیوە، وە تازە لەو ژیانە بەدە هاتبوونە دەرەوەو گەیشتبوون بە ژیانی کامەرانی و ئاسوی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی!

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ

---

ستەمو دەست درێژییەکی تر دەربارەی ئافرەتان ئەوەبوو کەلە بارەی شووکردنیەوە گوێ نەئەدرا بە ڕەزاو پێخۆشبوونی ئافرەت، یا بە پێناخۆش بوونی، بەڵکو تەنها ڕاو ئارەزووی پیاو حیساب بوو، ئەمە لەلایەکەوە، وە لەلایەکی ترەوە پیاوی وابوو ئافرەتی تەڵاق ئەدا، بەڵام بەزۆر یا بە هەر جۆرێکی تر هەوڵی ئەدا ئەو ئافرەتەی ئەبەستەوە لە شووکردن، ئینجا ئەم ئایەتە خوارەوە کە دەست ئەدات بۆ جڵەوگیری و قەدەغەکردنی هەرکام لەو دوو جۆرە ستەمە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کاتێ کەژنەکانتان تەڵاق دا ﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئینجا ئەوانیش گەیشتن بە ماوەی خۆیان بەم ڕەنگە عیددەیان دوایی هاتو کاتی شوو کردنیان هات ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ﴾ ئەو حەلە ڕێیان لێ مەگرن و مەیان بەستنەوە لەوەی شووبکەن بە مێردەکانیان، واتە مردەکانی پێشوویان کە تەڵاقیان دان، یان ئەوانەی کە تازە ئەیانەوێ شوویان پێ بکەن ببن بە مێردیان ﴿إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ﴾ کاتێ لەناو خۆیاندا بەیەکتر ڕازی بن بە شێوەیەك کە شەرع و باوی خەڵکی بیەوێ و پێیان باش بێت، جا ئەگەر ڕووی ئەم فەرموودەیە کرابێتە مێردە تەڵاق دەرەکان ئەوا مەبەست جڵەوگیریە لە ستەمی دووەم، وە ئەگەر ڕووی بکەینە کەس وکارو بەدەستی ئافرەتەکان ئەو حەلە جڵەوگیریە لە ستەمی یەکەم، ئایەتەکە هەرکام لەم دووبارە هەڵئەگرێ وەك زانایانی تەفسیر هەردوویان فەرمووەو دووبەرەکێ تیای دا، بەڵام بێگومان ڕواڵەتی ئایەتەکە لەگەڵ باری دووەمدا گونجاوترە، وە بێجگە لەوەش حەدیسێ کە (ترمزی) ئەیهێنێ لە (مەعقەل کوڕی یەسار)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- بە تەواوی ئەیبڕێ بەسەر ئەم باری ئەفەرموێ: (مەعقەل) خوشکی خۆی دا بەیەکێ لە موسڵمانان لە چەرخی پێغەمبەردا (ﷺ) لە پاشان تەڵاقی داو نەیگێڕایەوە هەتا عیددەی بەسەرچوو، ئینجا ئەو دووانە لەدڵەوە حەزیان ئەکرد لە یەکتر، ئینجا کە خزابێنی کەران هاتن بۆ خوازبێنی ئەمیش چووە پێشەوە لەگەڵیان بۆ

خزازبێنی، ئینجا (مەعقەل) پێی ووت: ناکەسی کوڕی ناکەس: من ڕێزم لێ گرتیو کاتی خۆی پێم دایتو کەچی تەڵاقت دا، سوێند بە خوا نایەتەوە لات هەتا ماوڵا، ئینجا خوا کە زانی ئەم دووانە پێویستن بە یەکتر، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە... ئینجا کە (مەعقەل) بیستی فەرمووی: بیستمو گوێڕایەڵیم لەسەرە بۆ خوای خۆم، بەهۆی ئەوەوە بانگی کردە مێردە پێشووەکەیو ووتی: ئەوا لێت مارە ئەکەمو ڕێزت ئەگرم پێی... بێگومان بەهەرحاڵ هەرچۆن مەبەست بێت هەردوو جۆرە ستەمەکە هەر قەدەغەیە لەلایەن خواوەو پێویستە هەموو بڕوادارێك دوور کەوێتەوە لەهەر ستەمو نارەواییەك، وە ئەبێ هەر بڕوادارێك بەسۆزو پەرۆشەوە بوەستێ لەبەردەم ئەم فەرموودەیەدا: ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ئەوەی کە باسکرا ئامۆژگاری پێئەکرێ هەرکام لە ئێوە کە بڕوای هەیەو بڕوا ئەهێنێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی: بێگومان ئەم قورئانو ئایینە ئامۆژگاری هەموو کەسی پێئەکرێ، بڕوادارو بێبڕوا، بەڵام هەر بڕودار ئامادەیە بۆ بڕواو سوودو بەهرەی لێ وەرئەگرێ، لەبەرئەوە تایبەتی کراوەو باسی بێبڕوای تیانیە، وە هەروەها هەر بڕوادارێك ئەبێ بە هەموو دڵنیاییو ئارامی دڵەوە بڕوای هەبێ بەمە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾ ئەو پەندو ئامۆژگاری وەرگرتنو کردنەوە بە گوێرەی پیتو فەردارترە بۆتانو پاكو خاوێن ترە، وە باشتر پاکتان ئەکاتەوە لە چڵكو چەپەڵی گوناهو ستەم، وە ئەو کەسەی کە ئامۆژگاریتان ئەکات خوایە کە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یە ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ وە خوا ئەزانێو ئێوە نازانن، خوا ئەزانێ چی چکەو بەرژەوەندی تێدایە، وە ئێوە ئەو شتانە نازاننو هەرچی خوا زاناتان نەکات پێی ئێوە نایزانن، کەواتە بەرامبەر هەموو کارو فەرمانو بڕیارو یاساڵا خوا بێجگە لە مل کەچیو گوێڕایەڵی نابێ هیچ شتێکی تر ببێ، یاسای هەشتەم پەیوەندی هەیە بە شیردانی منداڵە ساواکان پاش تەڵاق دانی دایکەکانیان، بێگومان هەرچەند باوكو دایك لە پاش تەڵاق دانی تەواوی پەیوەستی ژنو مێردیان نامێنێو ئەپچڕێ، بەڵام پەیوەندیان بە ڕۆڵەو منداڵەکانیانەوە ناپچڕێو هەر ئەمێنێ، وە بێجگە لەوەش ئەگەر لەپاش پچڕانو جوێ بوونەوەی باوكو دایك چارەسەری منداڵەکانیان نەکرێ، بە تایبەتی ساواو شیرە خۆرەکان، ئەبێ ئەو منداڵە هەژارانە زایە بنو تیا بچن، لەبەرئەوە خوای میهرەبان چارەسەری ئەو بێچارانەی کرد بەم جۆرو شێوەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾

دایکەشیردەرەکان شیری ڕۆڵەشیرخۆرەکانی خۆیان ئەدەن دوو ساڵی تەواو، واتەباشیریان بدەنێ، ئینجا ئەم شیردانە پێویست و فەرزە لەسەریان ئەگەر:

١- منداڵەکە باوکی نەبێ یان ببێ بەڵام بێدەست و لات بێت، وە منداڵەکەش ماڵی نەبێ.

٢- ئافرەتێکی تر دەست نەکەوێ کە شیری پێبدات.

٣- منداڵەکە مەمکی غەیری دایکی وەرنەگرێ.

لە غەیری ئەم حاڵەتانەدا فەرز نیە لەسەر دایکەکان، بەڵکو سوننەتە، هەرچەند بەڕواڵەت دایکەکان گشتیە بۆ تەڵاق دراوو تەڵاق نەدراو، بەڵام تایبەتیمان بە تەڵاق دراوەوە، وەك (موجاهیدو ئیبن و جوبەیرو زەیدی کوڕی ئەسلەم)ی لەسەرە، چونکە بە دوای باسی تەڵاقدا هاتووە، وەشیردانی تەڵاقدراوەکان جێگەی قسەو باس و چارەسەرکردنە، وە ئەگەر ئەو پەیوەندیە بە ڕێك و پێکی مابێتەوە ئەبێ ڕۆزی و پۆشاکی پێبدرێ شیربدات و شیر نەدات، وە تەفسیری بەم جۆرە ڕێگە لەگەڵ ئایەتەکانی سوورەتی ﴿الطلاق﴾دا کە هاتوون لەم بارەیەوەو بێگومان تایبەتین بە تەڵاقدراوەوە، ئینجا کاتێ ئەم فەرمانە ڕووبکاتە تەڵاق دراو، ئەبێ باشتر ڕووبکاتە تەڵاق نەدراو، کەواتە ئەوان باشتر ئەبێ شیر بدەن بە ڕۆڵەی خۆیان.

خوای میهرەبان ئەم یاساو بڕیارەی دانا، چونکە خۆی وەك لە هەموو کەسێ میهرەبان ترە، هەروەها خۆی باش ئەزانێ کەشیری دایك بەکارترو بە نرخ ترە بۆ ڕۆڵەی خۆشەویستی، وە سوودی زۆرترە بۆ تەندروستی و دەروونی ئەو ساوایە هەر شیرێکی تر، وە هەروەها خۆیشی باشی زانیوە کە ئەو دوو ساڵە پێویستە بۆ گەشەکردنی ساوا، بە گەشەکردنێکی ڕێك و تێرو تەواو، چ گەشەی دەروونی، وەچ گەشەی لەشی و تەندروستی، وە ئەم دوو شتە لەپاش تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە بەباشی دەرکەوت بۆ زانایانی تەندروستی و دەروونی، جا کەواتە ئەمەش چاکەو بەهرەیەکی تر بوو کەلە پێش دەرکەوتنیاندا خوای میهرەبان دەست نیشانی بۆ کردن. شیر خواردنی و دوو ساڵ دەرکەوت کە زۆر پڕ سوودو بەنرخە بۆ منداڵەکە، بۆ ئەوەی تێرو تەواو تربێت، وە ئەو دوو ساڵە ئەو پەڕی ماوەی شیر خواردنە، نەك ئەبێ دوو ساڵ تەواو بکرێ و بەبێ ئەوە منداڵەکە ناتەواو دەرچێت،

لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ
لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ

**جا لەبەرئەوە لەدوای ئەوە فەرمووی: ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ ئەو دوو ساڵی تەواوە بۆ کەسێکە کە بیەوێ شیر خۆری بکات و بگاتە ئەوپەڕی ماوەی.**

**دایکەکان بەو جۆرە شیر ئەدەن، وە بەرامبەر شیر دانەکەیان ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ﴾ پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە منداڵەکەی بۆ وێنراوە، واتە باوکی منداڵەکان ﴿رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ڕۆزی دانی ئەو دایکانەو پۆشاک بۆ کردنیان بەپێی باوو عورف بەبێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی، یان بە جۆرێ کە حاکمی شەرع دای ئەنێ و ڕجوای ئەبینێ، بێگومان ئەوەی کە دائەنرێ لەسەر ئەو باوکانەو پێویست ئەکرێ لەسەریان ئەبێ ئەندازێك بێت کە لە توانادا بێت، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾ هیچ شتێك پێویست ناکرێ لەسەر هیچ نەفسێك و هیچ ئەرکێك ناخرێ بەسەری دا، مەگەر شتێك و ئەندازێك کەلە توانایەتی، بەڵێ خوای میهرەبان لە هیچ کارێکدا بەندەکانی تەنگەتاو ناکات، بەڵکو هەموو داواو ئەرکەکانی لەسنووری توانینی بەندەکاندایە، لە سنوور بەدەر داوا ناکات، بەڵام ئەیەوێ بەجێهێنانی ئەو ئەندازەی کە لە سنووردایە، بۆ وێنە: لێرەدا باوك و دایك وەك هاوبەشن لە ڕۆڵەکەیاندا، ئەبێ هاوبەشیان بکات لە ئەرك و پێویستی سەرشانیان بەرامبەر ئەو ساوا شیرە خۆرە، بەم ڕەنگە با دایك شیری پێبدات و بەخێوی بکات، وە باوکیش با هەڵسێ بەئەرکی خۆراك و پۆشاکی ئەو دایکە، هەرکام لەم دوانە لە سنووری توانینی خۆیانداو بەبێ زیان گەیاندن بە یەکتر لە ڕێی ئەو منداڵەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا﴾ با هیچ دایکێك بەهۆی منداڵەکەیەوە زیان نەگەیەنێ بەباوکی منداڵەکە، بەم ڕەنگە پەلپ و بیانووی زیاد بگرێ لەخۆراك و پۆشاکدا، وە هەمیشە دڵی خەریك بکات بەو منداڵەوەو غەمباری بکات بەکەم خزمەتی و نەپرسینەوەی ڕۆڵەکەی، یان بەمەی بکەوێتە پەلپ و بیانووو منداڵەکەی بداتەوە بەسەردا کاتێ کە ئەزانێ ئەو پیاوە پێگیراوەو دایەنی دەست ناکەوێ و منداڵەکەش ئولفەتی گرتووە بەمەوەو لای کەسی تر ناژێ، ﴿وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ**

﴿بِوَلَدِهِۦ﴾ وە با هیچ منداڵ بۆ وێنراوێك ـ واتە هیچ باوكێك ـ بە بۆنەی منداڵەكەیەوە زیان نەگەیەنێ بە دایكی منداڵەكە، بەم ڕەنگە بەكەمو كوڕیو چرووكی خۆراكو پۆشاكەكەی بداتێ، یان بكەوێتە بروبیانوو لێی كاتێ كەزانی دایكەكە زۆر بەسۆزو پەرۆشە بۆ منداڵەكە.

لێرەو لە پێشەوە لەباتی ﴿وَالِدَةٌ﴾ واتە باوك فەرمووی: ﴿الْمَوْلُودِ لَهُۥ﴾ واتە كەسێك كە منداڵی بۆ وێنراوە، هۆی ئەوەش ـ وەك زانایان فەرموویانە ـ چەند شتێكە: یەكێ لەوانە ئەمەیە كە (زەمەخشەری) ئەفەرموێ: تا بزانرێ كە دایكەكان منداڵ بۆ باوكەكان ئەوێننو مەبەستی سەرەكی باوكەكانە، وە لەبەرئەوە ئەوەیشە كە بە پۆڵەی ئەوانو بەناوی ئەوانەوە ناو ئەبرێنو بانگ ئەكرێ، وە دایكەكان وەك كیسو زەرفێكن، بە ئەمانەتو سپاردە منداڵەكانیان تیا دانراوە، وەك (مەئمونی عەباسی) ئەڵێت:

لا تزرين بفتى من أن يكون له　　　　أم من الروم أو سودا دعجاء

فلإنما أمهات الناس أوعية　　　　مستودعات وللآباء أبناء.

كەواتە ئەم وتەیە ﴿الْمَوْلُودِ لَهُۥ﴾ لێرەدا زۆر ڕێكو بەجێترە لە وتەی ﴿الوالد﴾ چونكە هاندانی تیایە بۆ باوكەكان لەسەر هەڵسانیان بەئەركی بەخێوكردنی دایكەكان، وە دەست نیشانی تیایە بۆ هۆی پێویست كردنی ئەو ئەركە لەسەر باوكەكان، واتە هیچ منەتێكی نیەو ئەركە هەڵگرێ، چونكە منداڵەكە بۆ ئەوەو ئەركو زەحمەت بۆ منداڵی خۆی ئەكێشێ.

تا باوك ببێ ئەبێ ئەو ئەركە لەسەرشانی ئەو بێت، وەكاتێ باوكیش نەبوو خوای میهرەبان چارەسەری كردووە بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ﴾ لەسەر میراتو كەلەپوور بەرە وێنەی ئەوەی كە پێویست كراوە لەسەر باوك، واتە كاتێ باوك نەبوو پێویستە كەلەپوور بەرهەڵسێ بە خۆراكو پۆشاكی دایكی ئەو منداڵە بەو شێوەی كە شەرع پێویستی كردووە، لەبەر بەدی هێنانی ئەو دەستە بەرەییەی كە ئەبێ ببێ لەناو كەسو كارو خێزانو (التكافل العائلي) واتە هەرچۆنێ كەلەپوور وەرئەگرێ، ئەبێ ئەو ئەركەش هەڵگرێ، ئیتر مەبەست بەم كەلەپوور بەرە كەلەپوور بەربێت لە منداڵەكە كاتێ كە مرد وەك زۆربە ئەفەرموون، یان مەبەست كەلەپوور بەر لەباوكی منداڵەكە، واتە منداڵەكەو ئەبێ لەماڵی ئەو منداڵ بدرێ، وەك (ئیمامی مالیكو شافیعی) ئەفەرموون، یان كەلەپوور بەری تر وەك هەندێ تر ئەفەرموونو لە كتێبەكانیاندا ئەم ڕایە بە درێژی باس كراوە.

﴿فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾

ئەگەر کەلەپوور بەریش نەبوو پێویستە دایکەکە بەخێوی بکات‌و شیری پێ‌بدا لەسەر ئەرکی خۆی ئەگەر دایکیش بێ دەسەلات بوو پێویستە لەسەر دەوڵەت، ئەگەر دەوڵەتیش نەبوو پێویستە لەسەر دەسەلات داری موسڵمانان بە تایبەتی هاوسێ‌و نزیك! ئا بەو جۆرو شێوەیە مافی دانا بۆ ئەو منداڵە بێچارەو دایکە شیر دەرەکەی، وە هەروەها مافی داناو دیاری کرد بۆ هەموو ماف دارو خاوەن مافێك. لە بەزەیی‌و میهرەبانیەکەی بەزیادبێت. ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر شیردانەکەو هەر بەندو بارێکی تری هەبێ تەواوی ئەکات، یەکەم ئەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا﴾ ئینجا ئەگەر باوك‌و دایکەکە، یان دایك‌و کەلەپوور بەرەکە، یان خاوەن‌و کاربەدەستی کەلەپوور بەرەکە ـ ئەگەر مەبەست بە کەلەپوور بەر منداڵەکە بێت ـ ئەگەر ئەوانە ویستیان بڕینەوەی منداڵەکە لە شیریش تەواوکردنی دوو ساڵ ـ وەك زۆربە ئەفەرموون ـ یان بڕینەوەی لەپاش دوو ساڵەکە ـ وەك لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە ـ بەهەرکام مەبەست بێت ئەو بڕینەوە ﴿عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ﴾ بە ڕەزامەندی بێت لەلایەن هەردووکیانەوە، وە بە تەگبیرو ڕاوێژ بێت دەربارەی منداڵەکە بە جۆرێ ئەبێ بەرژەوەندی تێدابێت‌و زیان بار نەبێ، ئەگەر بەو شێوە بێ‌بڕینەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ﴾ هیچ گوناهو خراپییەك نابێ لەسەریان، بێ‌گومان ـ وەك ئایەتەکەش ڕێنموونی کرد ـ تا دایك دەست کەوێ ئەوە باشترە بۆ دایەنی‌و شیردانی منداڵەکەی خۆی کەلە هەموو کەس بەسۆزو پەرۆش ترە بۆی، بەلام ئەگەر باوك زانی کە بەرژەوەندی منداڵەکە لەوەدایە کە دایەنی تری بۆ بگرێ، لەبەرئەوەی دایکە کە سوونەکات‌و ئەمی پێ‌بەخێو منداڵەکە، یان لەبەر هەر هۆیەکی تری ڕاست‌و ڕەوا، هەرکات باوك زانی کە دایەنێ تر چاکترە، ئەو حەلە هیچ ناڕەواییەك نیە لەوەدا کەلە دایکەکەی وەرگرێ‌و بیدا بە دایەنێ تر، وەك لەم بەندی دووەمەدا ئەفەرموێ بە باوکەکان: ﴿وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ﴾ واتە ئەگەر ویستتان دایەن‌و شیردەری بێگانە بگرن شیربدا بە منداڵەکانتان ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە

إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًاۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ

---

﴿إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ﴾ کاتێ ئەو کرێو ماڵەی کە ئەیگرنە گەردنتان بۆیان بیاندەنێ بەو جۆرەی کە باوەو شەرع ئەبەوێ، مەبەست ئەوە نیە بەبێ کرێو بە خۆڕایی نابێ شیریان پێبدرێ، یان کە بەکرێ بوو دروست نیە تا کرێکە نەدات، بەڵکو مەبەست ڕێنموونی کردنە بۆ باشترین بار کە ئەوەیە، ئەو شیردانە بەکرێ بێت، وە کرێکەش بەبێ تەفرەو کەمو کورِیو دەست درێژی کردن بدا بە دایەنەکە، تا باشتر هەڵسێ بەکارو باری دایەنیەکەیو بەرژەوەندی منداڵەکە، ئینجا کۆتایی یاساو باسەکە ئەهێنێ بە فەرماندان لە لە خواترسیو وریا بوونەوە بە ئاگاداری خوا لە هەموو کردەوەکان، بۆ ئەوەی سەرپێچی نەکرێ لە فەرمانەکانی خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ وەبترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لە هەرشتێ کە مایەی خەشمو ناڕەزایی خوایە ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە بزانن کە خوا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن.

لەپاش لێ بوونەوە لە یاسای هەشتەم، ئینجا دێتە سەر باسی یاسای نۆیەم، کە تایبەتیە بەباسی عیددەی ئافرەتی مێرد مردووەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ﴾ واتە ئەو کەسانەتان کە ئەمرن ﴿وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا﴾ وە ژنەکانیان بەجێ ئەهێڵن ﴿بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًاۖ﴾ لەپاش مێردەکانیان چاوەڕوانی ئەکەنو خۆیان ئەگرن چوار مانگو دەشەو، واتە با چاوەڕوانی بکەنو خۆیان بگرن، بەڵام لەبەر بەهێزکردنی فەمانەکەو دڵنیاکردن لەسەر بەجێهێنانی بە شێوەی فەرمان نەهات، بەڵکو هەواڵی پێدا، وە هەرشتێ کە خوا هەواڵ بدا بە پەیدابوونی ئەبێ بەدی بێت، ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئینجا کاتێ گەیشتنە ماوەکەیانو عیددەیان بەسەرچوو ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ هیچ گوناهێك لەسەر ئێوەنی یە ئەی کەسانێ کە دەسەڵاتتان هەیە بەسەریاندا،

﴿فِيمَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۗ﴾ لە هەرکارێك كە ئەوان ئەیكەن دەربارەی خۆیان، لەو شتانەی كە قەدەغە بوون لێیان لە كاتو ماوەی عیدەكەیاندا، بە مەرجێ ئەوەی كە ئەیكەن بەجۆرێ بێت كەوێستراوەو بێزراونەبێ لای شەرع، كەواتە ئەگەر كارێكی ناڕەواو بێزراویان كرد ئەبێ ئەو دەسەلات دارانە بەرگریان بكەن، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ وە خوا زاناو ئاگایە بە هەر شتێك كە ئێوە ئەیكەن، كەواتە وریای خۆتان بن پێچەوانەی فەرمانی خوا ڕەفتار مەكەن.

ئافرەتی مێرد مردوو لەسەردەمی نەفامی دا دووچاری گەلێ توندو تیژیی و ناڕەحەتی ئەكرا لەلایەن كەسو كاری خۆیو مێردەكەیو هەموو گەلەوە.

باوی دەورەی نەفامی عەرەب لەسەر ئەوەبوو، ئافرەت كە مێردی ئەمرد ئەبوایە بچوایەتە بێنرخ ترین جێگەو شوێنو بێنرخ ترین پۆشاكی خۆی بپۆشایەو دوور نەكەوتەوە لە هەموو خۆشیو بۆنو خۆشیەك تا ماوەی سالێك، ئینجا هەلئەسا بە چەند باوێكی بێ نرخ ڕێك بوو لەگەلْ ئەو نەفامیەی كە تیایدا ئەژیان، كەلە مالْ دەرئەچوو پشقلێكی ئەگرت بەدەستەوەو تووڕی ئەدا، وە سواری كەرێك یان بزن یا مەڕێك ئەبوو، ئینجا كاتێ كە ئیسلام هات ئەو ئەركەی ناڕەحەتو شتە ناڕەوایانەی لەسەرشان هەلگرت، وە هەرچۆنێ مێردەكەی لەدەست دەرئەچێو لێی تێك ئەچێ، جلەوگیری كرد لەوەی كەلەلایەن كەسو كاریەوە سزاو ئازاری دلی بدرێ، بەلكو پێویستی كرد كە دلنەوایی بكرێو ئەركی ببرێ بەڕێوە، وە عیدەی كرد بە چوار مانگو دەشەو ــ ئەگەر سكی نەبێ كە ئەو حەلە عیدەی دانانی سكەكەیەتی ــ وە لەكاتی ئەو عیدەیەدا لەمالْ دەرناچێو لە ئازیەتی دایە بەو شێوەی كە شەرع دایناوە، نەك ئازیەتی نەفامی كۆنو تازە، بەلام لەپاش عیدە ئیتر كەس هەقی نیە بەسەریەوەو خۆی سەربەستە لە سنووری شەرعدا، كەواتە بۆی هەیە خۆی ئارایش بكاتو خۆی برازێنێتەوە بەو شێوەی كە حەلالْو ڕەوایە بۆ ئافرەتە موسلمانەكان، وە ڕێی هەیە ڕێی خوازبێنی كەران بدات، وە ئیزن بداتو شوو بەكێ ئەكاتو بەكێ ڕازیە ئارەزووی خۆیەتیو كەس نابێ لیْ بگرێ نەلە كەسو كاری خۆی وە نەكەسو كاری مێردەكەی، كاری ئافرەتەكە بەو جۆرەیە، ئینجا ماوەتەوە ئەو پیاوانەی كە مەیلی ئەو ئافرەتانەیان هەیە ئەبێ لەو ماوەی عیدەیانەدا چۆن بن، ئەوا ئەوەشمان بۆ باس ئەكات لەم یاسای دەهەمدا، وە تەمێمان ئەكات بە جۆرێ كە ئەدەبو ڕێلی تیایە،

ئەمەبو ویڵی بەرزی دەروونی کۆمەڵایەتی ئەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ﴾ هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە لە خوازبێنی کردنی ئەو ئافرەتە مێرد مردووانە لە ماوەی عیدەدەکەیاندا، بە مەرجێ خوازبێنیەکی ساف و بێ پێچ و پەنا نەبێت، بەڵکو بە ئیشارەو دەست نیشان بێت کە لەوانە بێت مەبەستەکەی لێ وەرگیرێ، وەك ئەوە بڵێ: ئەمەوێ ژن بێنم و نازانم خوا رزم لە کێ ئەخات، یان بڵێ: بەراستی ئاواتمە کە خوا ئافرەتێکی چاکی وەك تۆم دەست بخات، وە هەروەها هەر وتەیەکی تر کە مەبەستە کە ئەگەیەنێ و خوازبێنیەکی رووتیش نیە، بێگومان ئافرەتی مێرد مردوو لەو ماوەی عیدەدەدا دڵی بەستراوە بە یاد بیرەوەری ئەو ماڵ و مێردەی کەلە دەستی دەرچوون، وە زۆربەی ئافرەت خۆشەویسی و سۆزی ئەو مێردەی لە دڵی دا جێگیر بووە، وە بێجگە لەوانەش زۆر ئافرەتی مێرد مردوو هەیە سك پڕە، یان لەوانیە سکی ببێ و دەرنەکەوتووەو مەگەر لەو ماوەی عیدەدەدا دەرکەوێ کەسکی هەیە یان نا، دەی ئاشکرایە لەو کات و حاڵەتانەدا خوازبێنی و باسی شووکردنی تازە زۆر بێ جێ و بێ سەرە، وە ئەو خوازبێنیە کوت و پڕی و تەفرە دانەمایەی دڵڕنجاندن و ئازار گەیاندنە بەدڵ و دەروونی خزم و کەس و کاری مردووەکە، جا لەبەرئەوە خوازبێنی بێ پێچ و پەنا قەدەغە کرا لەوماوەی عیدەدەیەدا، بەڵام ئەو دەست نیشان کردن و ئیشارەیە ڕەوا درا، چونکە ئەو خراپانەی کە لەودا هەن لەم دا نین، ئینجا ماوەتەوە ئافرەتێکی تەڵاق دراو بە تەڵاقی کە ڕێی گێڕانەوەی ببێ بەبێ پێویستی بە نیکاحێکی سەرلەخۆ تازە، یا بە تەڵاقێك کە ئافرەتەکەی پێ جوێببێتەوە بەجوێبوونەوەی گەورەم بەم ڕەنگە هەرسێ تەڵاقەکەی کەوتبێ یان بەجوێبوونەوەی بچووك کە ئەوەیە بە نیکاحێکی تازە ببێتەوە بە ژنی لەم سیانە یەکەمیان بە هیچ کلۆج دروست نیە خوازبێنی، چونکە وەك ژنی دار وایە بە پێی بڕیاری زانایانی ئوممەت، وە دووەم و سێیەم بەلای زۆربەی زانایانەوە وەك مێرد مردوو وان، بەڵێ خوازبێنی تەواوی قەدەغە کرد لەکاتی عیدەدەدا، بەڵام قەدەغەی نەکرد کەلەو کاتەدا بە دڵ بڕیاری خوازبێنی و خواستنی بدات لە پاش بەسەر چوونی عیدەدەکەی،

أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ

وەكو فەرمووی: ﴿أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ﴾ واتە هیچ گوناهو ئەرەجێکتان لەسەر نیە لەو جۆرە خوازبێنیەی کاتی عیدده کە باس کرا، یان لەو نیازو بڕیاری خوازبێنیو خواستنەوەی کە لەکاتی عیددەدا داوتانە داتانشاردووە لە دەروونی خۆتانداو دەری نابڕن لایان پاش عیددە، چونکە ئەو نیازو ئارەزووی لە ژێر دەسەڵاتدا نیە، وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ﴾ خوا زانیویەتیو ئەزانێ کە ئێوە باسی ئەو ئافرەتانە ئەکەنو خۆتان پێناگیرێ لەوەی بێدەنگ بن لێیان، بەڵکو مەیلو ئارەزووی خواستنیان دەرئەبڕن، کەواتە باسیان بکەن، ﴿وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ بەڵام وادەو بەڵێنیان لەگەڵ مەکەن بە نهێنیو لەکاتی نهێنی دا، ئیتر وادەو بەڵێن بە کاری ژنو مێردی پاش خواستنو نیکاح کردنیان، یان بە خواستنو نیکاح کردنیان لەپاش تەواو بوونی عیددە، یان بە هەر شتێکی تر ﴿إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ﴾ مەگەر بەوەی وتەو ویستراوو بێزراو نیە بەگوێرەی باو وەنە لەشەرع دا. ئەوەش کە بریتیە لەو جۆرە خوازبێنیەی کەلە سەرەتای ئایەتەکەدا ڕەوا درا، یان بریتیە لەبەڵێن دان لە چاکە کردنو سەرپەرشتیو چاودێری کردنو بەجێهێنانی ئیشو کاریان، تا بەوە دڵیان ڕاکێشن بۆلای خۆیانو ئەوەیان لە بیربێتو شوو بەکەسی تر نەکەن، یان بەمەی یەك بکەونو بەڵێنیان لێ وەرگرن کە شوو بەکەسی تر نەکەن، ئەم باری دواییە لە (ئیبنو عەبباس)ەوە ڕیوایەت کراوە –خوا لێیان ڕازی بێ– بە هەر حاڵو لەسەر هەر بار ئەبێ خۆیان بپارێزن لە هەر قسە ئەکات، وەك وتەی ﴿بالمعروف﴾ ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە گوتمان باشتر ئەچێتە دڵەوەو ڕای لەزانا بەهێزەکانە. ﴿وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ﴾ بڕیاری تەواو مەدەن لەسەر دابەستنی نیکاحو خواستنی ئەو ئافرەتە مێرد مردووانە، واتە ئەو بڕیارەش مەدەن چ جای نیکاح کردنو خواستنیان ﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ﴾ هەتا ئەو عیددەیەی کە نووسراوەو پێویست کراوە دوایی دێتو تێپەڕئەکات،

وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ
عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى
ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدۡ
فَرَضۡتُمۡ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِۚ

---

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ وە بزانن کە خوا ئەزانێ و ئاگادارە بەوەی کەلە دەروونتاندا کە یەکێ لەوانە ئەو بڕیارە ناڕەوایە کە باس کرا ﴿فَٱحۡذَرُوهُ﴾ کەواتە خۆتان بپارێزن لێی، بەم فەرموودەیە دڵی بڕواداری ڕاستەقینە دێتە لەرزەو دائەچڵەکێ، وە بێگومان ئەو بڕوادارە ڕاستەقینانە هەرچەند بیم و ترسیان ببێ، ئەبێ دڵ ئارام بێ و ئومێدی لێبوردن و چاوپۆشیشیان ببێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ﴾ وە بزانن کە خوا زۆر لێ بووردەیە و پەلە ناکات لە تۆڵەسەندندا، بەڵکو بەندە تاوانبارە کە بگەڕێتەوە بۆلای، ئینجا دێتە سەر باسی یاسای یازدەهەم کە بریتیە لە تەڵاقدانی ئافرەت پێش ئەوەی لەگەڵ مێردەکەی بگەن بە یەك و کاری ژن و مێردی بکەن، ئینجا ئەم تەڵاقدراوە دوو جۆرە:

یەکەم: مارەیی بۆ دیاری نەکراو.

دووەم: مارەیی بۆ دیاری کراو.

ئەوا حوکم و بڕیاری هەردوو باس ئەکات: دەربارەی یەکەم ئەفەرموێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ هیچ ئەرەج و ئەرکێکیان لەسەر نیە، واتە گوناه نیەو هیچ مارەیشتان لەسەر نیە ﴿إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ ئەگەر تەڵاقی ژنەکانتان بدەن ﴿مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ﴾ لەکاتێکدا لێیان نەکەوتبێ و نەچووبوونە لایان، یان مارەییتان پێویست نەکردبێ لەسەر خۆتان بۆیان، بۆ تەڵاقدراوی وا بەس هەر بەخششێك هەیە بەپێی توانا و حاڵەتی تەڵاقدەر، وە بوونی ئەم بەخششە زۆر بەجێ و پێویستە، چونکە بچڕانی ئەو پەیوەندیەو دوورکەوتنەوە بێزاری و دڵ ئازارییەك فەراهەم ئەهێنێ، وە بێگومان ئەو بەخششەش ئەبێتە هۆی نەهێشتنی ئەو ناخۆشیە، یان سووك کردنی، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ﴾ وە شتێکیان بدەنێ لەماڵی خۆتان کە سوودی لێ وەرگرن و دڵی پێ خۆش بکەن، ئەمەش لەشەرعدا پێی ئەگوترێ

(موتعه)، ئەو ئەندازە کەمەی کە ئەدرێ بەو ئافرەتە: ﴿عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ﴾ لەسەر ئەو کەسەی کە هەیەتی و سامانداره ئەندازی خۆی کە شایستەیە بۆی، ﴿وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ﴾ وە لەسەر بێدەستو دەست تەنگیش ئەندازی خۆی، هەرکەس بە گوێرەی خۆی ئەو ئەندازەیان بدەنێ ﴿مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ﴾ پێدانێك کە هەقەو پێویستە لەسەر ئەوانەی کە چاکە کەرن لەگەڵ ئەو تەڵاقدراوانەدا، یان ئەوانەی کە چاکە ئەکەن لەگەڵ خۆیان بەوەی کە چەسپانی ئەکەن لەگوێڕایەڵی خوادا.

ڕای ئیمامان جیاوازە لە ئەندازەی ئەو بەخششەدا، با تەماشای کتێبە باوەڕ پێکراوەکان بکرێ بۆ ئەوە، بۆ جۆری دووەم ئەفەرموێ: ﴿وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ ئەگەر ژنەکانتان تەڵاقدا لە پێش ئەوەی چووبنە لایان ﴿وَقَدۡ فَرَضۡتُمۡ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ﴾ لەکاتێکدا کەلە پێشەوە مارەییتان پێویست کردبێ بۆیان لەسەر خۆتان ﴿فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ﴾ ئەو حەلە بۆیان هەیە نیوەی ئەو مارەییە کە پێویستتان کردووە لەسەر خۆتان، بە پێی یاساو ئەو نیوەیان بۆ دانراوە﴿إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ﴾ مەگەر بە ئارەزووی خۆیان ببوورنو دەست هەڵگرن لێی ﴿أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِۚ﴾ یان ببوورێ ئەو کەسەی کە دابەستنی نیکاحەکەی دەست بووە، زانایان دووبەرەکین کە ئایا مەبەست بەم کەسە کێیە؟ بە پێی تەفسیرێ کە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وە کەواتە (ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمو تەبەرانیو بەیهەقی) هێناویانە لە (ئیبنو عومەر)ەوەو کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەریشی لەسەرە، وە هەروەها (ئیمامی حەنەفی مالیكو شافیعی لە فەرموودەی تازەی دا)، بە پێی ئەمانە مەبەست بەم کەسە مێردە تەڵاق دەرەکەیە، وە مەبەست بە لێ بووردنەکەی ئەوەیە بە پیاوەتی دەست هەڵگرێ لەو نیوەی کە بۆی هاتووەتەوەو بیدا بە ئافرەتەکە، وە بەلای (ئیبنو عەباس)ەوە لە ڕیوایەتێکداو بەلای دایکی ئیمانداران (عائیشە)وەو بەلای (طاوسو موجاهیدو عطاو حسنو عەلقەمەو زەهریو شافیعی لە فەرموودەی کۆنی دا)، بەلای ئەمانەوە مەبەست بەو کەسە کاربەدەستی ئافرەتەکەیە کەوا داویەتی بەشوو، ئینجا لێ بووردنەکەی بەلای هەندێ لەو زانایانە بۆ کاتێکە کە تەڵاق دراو منداڵبێتو نا باڵغ، وەبەلای هەندێ ترەوە ڕێی لێ بووردنی هەیە با ئافرەتەکە گەورەو ژیریش بێت،

وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾ حَٰفِظُواْ
عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ

---

به هەرحاڵ لێبووردن و دەست لێ هەڵگرتنە کە شیرین ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ بە هەردوولا: ﴿وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ﴾ وە لێ بروودن و دەست لێ هەڵگرتنیان لە یەکتر نزیک ترە لە لەخواترسی و خواپەرستیەوە، ﴿وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ﴾ وە لەناو خۆتاندا واز مەهێنن لە چاکەو کردەوەی چاک دەربارەی یەکترو ئەو ڕەوشتە چاکە مەخەنە پشت گوێ، کەواتە ئەگەر لەلایەن ئافرەتەکەوە دەست هەڵگیری لەو نیوە مارەییە کەلە خواوە بۆی بڕیار دراوە هەر کردەوەیەکی چاکەو بابکرێ، یان ئەگەر مێردەکە نیوەکەی تریش بدا بە چنەکە هەر شتێکی چاکە با بیکات، هەرکام لەوانە بکرێ زایە نابێت و گوم نابێت لەلای خوا، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بە هەر کردەوەیەک کە ئێوە ئەیکەن، ئینجا لەم کاتەدا کە خەریکە بەو دوانزە یاسایەی کە لێرەدا هێنای لەبارەی ژن و مێردەوە، وە لە هەکام لەو یاسایانەدا دڵی بڕواداری پەیوەست کرد بە خواوە پەیڕەوی کردنی نیشانەی عیبادەت خواپەرستیە، لەم کاتەدا لە هێشتا لێ نەبرووەتەوە لەو بڕیارو یاسایانەو دوازدەهەمیان ماوە، بەدوای یازدەهەمو لە پێش دوازدەوە باسی نوێژ ئەهێنێ کە لەپاش بڕوا هێنان گەورەترین خواپەرستیە لە ئیسلام دا، بۆ ئەوەی بڕواداران تێ بگەن کە گوێڕایەڵی خوا لەوانەدا هەر خوا پەرستیە بە وێنەی نوێژ، وەنوێژ جیا ناکرێتەوە لەوانەو لە هەموو یاساو بڕیارەکانی تر لەمەدا کە پەیڕەوی و گوێڕایەڵی کردن تیایاندا هەر خواستیەو بە هەموویانەوە ئیسلام پێك دێت و بەدی دێت، وە خواپەرستی تنها نابڕێت بەسەر نوێژو ڕۆژوو شتەکانی تردا کە هەر ئەوانە بەناوبانگن بە ناوی عیبادەت و خواپەرستیەوە، وە بێگومان هەرکەس بەو جۆرە تێگەیشتبێ و حاڵی بووبێ زۆر هەڵەیەو زۆر دوورە لە ئیسلامەوەو بەری ئایەتی (٨٥)ی ئەم سوورەتە ئەکەوێ کە ئەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ﴾ ئینجا هێنانی نوێژ لەم شوێنەدا هەرچۆنێ ئەو دەست نیشانەی تیایە کە باسی کرا، هەروەها نوێژ پاڵ پێوەنەرو یارمەتی دەرێکی بەهێزە لەسەر گوێڕایەڵی و پەیڕەوی فەرمان و یاساکانی خوا، وەك لەئایەتی (١٥٣)ی ئەم سوورەتەدا

بەسرێـژی بـاس کـرا، ئەفـەرموێ: ﴿حَـٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ پارێزگـاری بکـەن‌و بـە هەمیـشەیی بەردەوام بن لەسەر بەجێ هێنانی نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیانداو بەمل کەچی‌و ئاگاداری دڵ سام‌و بیم‌و شـەرم لـە خـوا، وە بـەجێهێنانی هـەموو بەش‌و پارچەو ئەو شتانەی کەلـە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیراوە: ﴿وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ وە بە تایبەتی نوێژە ناوەندیەکەیان، ئەو نوێـژەی کە گـەورەترو پیرۆزتـرە، کەئـەوەش نوێـژی عەسـرە بـە پـێ‌ی چـەند ڕیوایـەتێك کـە هـاتووە لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) کەلـە ڕۆژی غـەزای خەندەقـدا لـەکاتی ئـاوا بـوونی خـۆردا فەرمووی: خەریکیان کردین لە نوێـژە ناوەندیەکە، یـان نوێـژە گەورەکە، نوێـژی عەسر، خـوا دڵەکانیان‌و ماڵەکانیان پڕ بکات لە ئاگر... ئەمە ڕیوایـەتی موسلیمە، ﴿وَقُومُوا۟ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ وە بوەستن لە بەر خوا لە نوێژدا بەمل کەچی‌و گوێڕایەڵی، یان بە سام‌و بیم‌و لێ بڕان بۆ باس‌و یادی خواو خەریك مەبن بە هیچ قسەو باس‌و شتێکی ترەوە.

ئەگێڕنـەوە کەلـە یەکـەم جـارو سـەرەتاوە لـەکاتی نوێـژدا قسەیان ئـەکرد لـە بـارەی هـەر شتێکی پێویست کەبە کوت‌وپڕی پەیدا ببوایە، هەتا ئەم ئایەتە هات بەهۆی ئەوەوە زانیان کەلە نوێژدا هیچ خەریك بونێکی تر نابێ.

لەکاتی ئاسایش‌و بێ ترسی دا نوێژ بەو جۆرە بـەجێ ئـەهێنرێ، بـەڵام ئەگـەر تـرس قـایم بوو بە جۆرێ ڕێ‌ی ئەوە نەبوو بەڕێك‌و پێکی بەجێ بهێنرێ، ئەو حەلە بـەپێ‌ی توانـا‌و چـۆن گونجـا وەکو ئەفـەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا﴾ ئینجـا ئەگـەر ئەترسـان لـە دوژمـن، یـان لافاو یان ئاگر یان هەر شتێ‌تر کە ئەگەر لەسەر خـۆو بە ئارامـەوە بیکـەن دووچار ئـەبن، ئەو حەلە بە ڕشتن‌و ڕاکردنەوە بیکەن، ئیتر بە پیادە یان بەسواری، وە هەرکام لەمانە بە پـێ‌ی بـۆ گونجـان‌و ڕووی بـۆ هـەر شـوێنێ بکـات دروسـتە، وە بـە ئیـشارەت رکـوع‌و سـوژدە ببـا، ئـەم نوێـژی ترسـەی کەلـە سـوورەتی ﴿النـساء﴾دا باسـی ئەفـەرموێ ئـەوەی ئـەوێ بـۆ کاتێکـە کـە مەترسی لە دژمن بکرێ‌و هێشتا تێك نەڕژابن، کەواتـە ئەوانـە ئـەگونجێ بکرێن بـەدوو ڕیـزو هەر ڕیزێ خۆی بکات بە ئارامەوە، بەڵام ئـەمـەی ئێـرە بـۆ کاتێکـە کـە تێـك ڕژان‌و پـەلاماردان‌و تێ‌کەوتنەکە ڕووی دابێ‌و ڕێ‌ی بڕیبێتەوە لە نوێژکەر، کە بە پـێ‌ی بـاوی خـۆی نوێـژ بکـات. بەڕاستی شتێکی زۆر سەیرەو جێگەی سەرسوڕمانە گرنگی‌و گـەورەیی‌و پێویستی نوێـژ تـا ئەو ڕادەیە کەلەکاتی ئاوا سەخت‌و سامناکیش دا وازی لێ ناهێنرێ‌و هەر ئەبێ بکرێ!

فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا

بەڵێ بەڕاستی مافی خۆیەتی کە ئاوا بە گرنگ بگیرێ، چونکە نوێژ گەورەترین و بەهێزترین پەیوەندیی و پەیوەستیە بە خواوە، کەواتە بەهێزترو بەکارترین چەك و قەڵغانە بۆ هەموو تەنگی و تەنگانەیەك، وە ئەبێ جەنگ کەر ئەو چەك و قەڵغانە بەکار بێنێ لە مەیداندا، لەکاتێکدا کە شمشێر وا بەدەستیەوەو شمشێری لێ هەڵکێشراوە، ئەم ئایینە پیرۆزە بەرنامەی خواپەرستیە: خواپەرستی لە هەموو بارو شێوەکانی دا، لە ڕێی خواپەرستیەوە بەندە ئەگەیەنێ بە بەرزترین پلەو پاپە، وەلە ڕێی خواپەرستیەوە دامەزراوی ئەکات لەکاتی تەنگی و تەنگانەدا، وەلە کاتی خۆشی و کامەرانی دا، وەلە ڕێی خواپەرستیەوە جەنگ و ئاشتی پێ ئەکات، وە نوێژ گەورەترین نیشانەو دروشمی خواپەرستیە، کەواتە مافی خۆیەتی ئەوەندە گرنگ بگیرێ و لە هیچ کاتێکدا وازی لێ نەهێنرێ! تا بەو جۆرە ترس ببێ نوێژ ئەکرێ بەپێی توانا و بۆ گونجان، ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمۡ﴾ ئینجا کاتێ کە ترستان نەمێنێ و بێباك ببن ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەو حەلە یادو باسی خوا بکەن بەو جۆرەی کە فێری کردوون، ئەوەی کە لەوەو پێش نەتان ئەزانی، واتە نوێژی ئاسایش و بێباکی بەجێ بهێنن بەو جۆرەی کە خوا فەرمانی داوە، بەڵام بە یادو بەباسی خوای ناوبرد، چونکە نوێژ لە ڕاستی دا سەرانسەری یادو باسی خوایە، یان یادو باس و سوپاسی خوا بکەن بەرامبەر ئەوەی کە فێری کردن، ئەو شتانەی کە لە پێشەوە نەتان ئەزانی.

ئایا ئادەمی ئەبێ چی بزانیایە ئەگەر خوای میهرەبان فێی نەکردایە؟ وە ئەبێ چی بزانێ ئەگەر خوا ڕێنموونی نەکات و فێری نەکات؟ بێگومان هیچی نەئەزانی بەتایبەتی ئەم هەموو بیروباوەڕو یاسا پیرۆزانە کە ئەم ئایینە بەرزە هێنای.

لەپاش ئەوەی دەستکاریەکی زۆر بەکاری دڵ و دەروونی کرد بە هێنانی باسی نوێژ لەگەڵ تاو ئەو یاسایانەی کەلەم چەند ئایەتەدا هێنان، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر یاساکان و دوانزەهەمیان کە مابوو، بۆمان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ﴾ ئەوانەتان کە گیان ئەکێشرێن و ئەمرن، ﴿وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا﴾ وە ژنان لەپاش خۆیان بەجێ ئەمێڵن

وَصِيَّةً لِأَزْوَاجِهِم مَّتَـٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَـٰتِ مَتَـٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾

---

﴿وَصِيَّةً لِأَزْوَاجِهِم﴾ پێویست کراوە لەسەریان پێش ئەوەی بگەنە کەنشت، وەسیەت بکەن بۆ ژنەکانیان ﴿مَّتَـٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ﴾ بە مانەوەیان لەماڵەکانیانداو ئەرك كێشانو بەخێوکردنیان تا ساڵێك ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ بەبێ ئەوەی دەکرێن، ﴿فَإِنْ خَرَجْنَ﴾ ئینجا ئەگەر خۆیان بە ئارەزووی خۆیان دەرچنو ساڵەکە نەمێننەوە، یان ئەگەر دوای ساڵەکە دەربچن ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەو حەلە ئەی کاربەدستان، یان ئەی کەسو کاری مردووەکە هیچ گوناهو ئەرەجێکتان لەسەر نیەو هەقتان نیە بەسەریانەوە ﴿فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ﴾ لەوەی کە ئەیکەن دەربارەی خۆیان بە شێوەیەك کە شەرع پێی ڕازیەو بێزراو نیە لەلای، ئەوەش بریتیە لە ئازیەتی شکاندنو خۆڕازاندنەوەو جواب دانەوەی خوازبێنی کەرانو شووکردن، ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ وە خوا زاڵە بەسەر کارو فەرمانی خۆی داو ئەتوانێ تۆڵە بسێنێ لە هەرکەس کە یاخیو سەرکێش بێت لە فەرمانی ﴿حَكِيمٌ﴾ لێزانو کاردروستەو هەموو بڕیارەکانی ڕێكو ڕاستەو بەرژەوەندی تیایە، زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم ئایەتە سڕاوەتەوە بە ئایەتی پێشووە کە عیدەی مێرد مردوو ئەکات بە چوار مانگو دەشەو، وە هەرچەند ئەو ئایەتە لە داناندا لە پێش ئەم ئایەتەیە، بەڵام لە هاتنە خوارەوەدا لەپاش ئەم هاتووەتە خوارەوە، کەواتە دەست ئەدات بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە، وە لەم بارەیەوە (ئیبنو جەریر) هەواڵێ ئەهێنێ لە (هەمامی کوڕی یەحیا)وە کە ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە (قەتادە) لەبارەی ئەم ئایەتەوە، ئەویش گوتی: لە پێشەوە ئافرتی مێرد مردوو ساڵێك لەماڵی مێردەکەی دا ئەمایەوەو جێگەو نانو نەفەقەی لەسەر ماڵی مێردەکەی بوو، ئەگەر دەرنەچوایە لەو ماڵە، ئینجا ئەو جێو نەفەقەی سڕرایەوە بە ئایەتی میرات کە چوار یەك یان هەشت یەکی بۆ دانا، وە عیدەی ساڵەکەش کرا بە چوار مانگو دە شەو بە ئایەتی پێشووە... بەڵام کۆمەڵێك لەسەر ئەوەن کە ئەم ئایەتە هیچی لێ نەسڕاوەتەوە،

بەڵکو ئایەتی پێشوو بۆ عیدەیەکە کە پێویست کراوە بە جۆرێ فەرزو پێویستە لەسەر ئافرەتەکە مانەوەی لەماڵی مێردەکەی دا ئەو ماوەی چوار مانگو دەشەو، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە مێرد وەسیەت بکات بەو ساڵە ئینجا ئافرەتەکە ئەگەر ئارەزووی بوو ساڵەکە تەواو بکات، وە ئەگەر نەیوست پاش چوار مانگو دە شەوەکە بڕواو کەس ڕێی نیە دەست بێنێتە ڕێی، وە لەم بارەوە (ئیبنو جەریر) لە (موجاهید)ەوە ئەمەی هێنا کە باس کرا، بەکورتی لەسەر ئەم ڕابە: چوار مانگو دە شەو فەرزو پێویستە لەسەر ئافرەت، وە لەوەزیاتر تا ساڵێك مافی هەیەو ئەکەوێتە ئارەزووی خۆی، بەڕاستی ڕایەکی زۆر بەهێزەو باش ئەچەسپێ لە دەروونندا، وە بە پێی یاساو بڕیاری زانایان لەکاتی ناچاری دا نەبێ نابێ بڕیاری سڕینەوە بدرێ، دەی بەم شێوەی کە (موجاهید) ئەفەرموێ: زۆر ڕێکە لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکانداو بەبێ پێویستی بە بڕیار دانی سڕینەوە.

لەپێشەوە بڕیاری (موتعە)ی دا بۆ ئەوتەڵاقدراوانەی کە مێردەکانیان نەچووبوونە لایان، ئینجا ئەوا لێرەدا بڕیارێ ئەدات بە شێوەی گشتی بۆ هەموو تەڵاق دراوێك، ئەفەرموێ: ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ بۆ تەڵاق دراوەکان هەیە ئەندازێك پارو ماڵ کە سوودی لێ وەرگرنو دڵخۆش ببن پێی، ئەوەش بەپێی شەرعو عورف ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ کە ئەوە شتێکە ڕاستەو هەیەو دامەزراوە لەسەر خۆپارێزو لە خواترسەکان.

دیمەنو ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەم (موتعە)یە پێویست ئەکات بۆ هەموو جۆرە تەڵاقدراوێك، وە پێویست کردنی زۆر شتێکی ڕێكو بەجێیە ــ وەك باس کرا ــ چونکە ئەو دوور کەوتنەوەو دڵ گرانیەی کەلە تەڵاقەکەوە پەیدا ئەبێ، بەو ئەندازە بەخششە کەم ئەبێتەوە یان هەر نامێنێ.

دیمەنو ڕواڵەتەکە ئەو شێوە گشتیە نیشان ئەدات، هەرچەند (ئیبنو زەید) ئەفەرموێ: مەبەست بەم ئایەتی ئێوەو ئایەتی پێشوو هەر یەك شتەو ئەمیش وەك ئەو هەر بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە مێردەکانیان نەچووبوونە لایان، وە لێرەدا دووبارە کرایەوە، چونکە لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی: پێویست کراوە لەسەر چاکەکەران، ئینجا پیاوێك گوتی: ئەگەر چاکەم کرد ئەوا ئەیکەمو ئەو (موتعە)یەم ئەدەم، وە ئەگەر چاکەم نەویشت ئەوا نایدەم، بەهۆی ئەوەوە ئایەتی ئێرە هاتە خوارەوە پێویستی کرد لەسەر هەموو لە خواترسێك، ئینجا بێجگە لەم ڕای (ئیبنو زەید)ە چەند ڕایەکی تری هەیە لەم مەسەلەدا هەکەرس ئەیەوێ با تەماشای کتێبە باوەڕپێکراوەکان بکات،

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ﴾

---

ئینجا لەپاش دوایی هێنانی ئەم یاساو بڕیارانە ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ ئا بەو جۆرو شێوە ڕوون و ڕەوانە خوا ئایەتەکانی خۆی بە ڕوونی باس ئەکات بۆتان ـ ئەو ئایەتانەی کە خێرو پیت و فەڕی هەردوو جیهانیان تیایە ـ ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆئەوەی بیربکەنەوەو ژیر بن و تێبگەن لەو بەرژەوەندیی و کار دروستیەی لەو یاساو بڕیارانەدا هەیە، وە تێبگەن و پێبزانن لەو بەزەیی و میهرەبانیەی کە خوا دەری خستووە بۆتان، وەلەو چاکەو بەهرەیەی کە ڕشتوویەتی بەسەرتاندا بە ناردنی ئەم ئایینە بەرزو پیرۆزە، چاکەو بەهرەی ئاشتی و ئارام لە هەموو بارو ڕووو ناوچەی ژیانتانەوە.

بەڵێ: بەڕاستی ئەگەر هەموو ئادەمی بیریان بکردایەتەوەو ژیر بوونایە، بەجارێ هەموو ڕوویان ئەکردە ئەم ئایین و قورئانە بە مل کەچی و گوێڕایەڵی بە هەموو سۆزو خۆشی و پەرۆشەوە، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ لە نەفامی و عاقیبەت شەڕی، وە لەبەر دڵی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەم ئوممەتە نووستووە لە خەوی بێ ئاگایی ڕاست بکاتەوە ـ آمین ـ.

ئەم قورئانە نامەی ئەم ئوممەتەیەو دەست گیرو ئامۆژگاری کەریەتی، وە خوێندنگایەکە بۆی کە هەموو وانەکانی ژیانی تیا وەرئەگرێ، وە پەروەردگاریەکە تەنیا بەم پەروەردە ئەبێت و ئەکات بە پایان، وە خوای پەروەردگار بەم قورئانە ئەو یەکەم چین و تاقمەی پێگەیاند کە بە یارمەتی ئەو توانیان ڕێ و بەرنامەکەی ئەو بەڕێکی نەخشە بکێشن و بیچەسپێنن لەزەوی دا، وە بەهۆی ئەم قورئانە کردنی بە مامۆستای ئادەمیزادو فریای کەوتن کەلە پاش وشك بوونی درەختی مرۆڤایەتی سەر لەنوێ ئاشتیان و ڕووانیان تا بە تەواوی هەموو لق و پۆو بەرو بەرهەمی پێگەیشت، وە هەروەها خوای گەورە ویستی ئەم قورئانە لە پاش پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەر بمێنێتەوە بۆ ڕێ نیشاندان و پێگەیاندن و سەرکردایەتی هەموو چین و تاقمەکانی ئادەمی، وە ئامادە کردنیان بۆ جێگری و جێنشینی یەکەم چین و تاقم، هەرکاتێ ئەمانیش ڕێبازی یەکەم و تاقم بدەنەبەر، وە وەك ئەوان هەر

ڕێنموونی قورئان وەرگرن و پەیمانی لەگەڵ ببەستن و هەر دەست بەوەوە بگرن ـ بێگومان ڕەوشتی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر قورئانە ـ وە بەرنامەی ژیانیان هەر لەو وەرگرن، وە هەر شانازی بەوەوە بکەن، کەواتە ئەم قورئانە تەنها وتەو وتارێک نیە کە بۆ پیت و خۆشی بخوێنرێ، بەڵکو یاسا و دەستوورە بۆ هەموو شتێک، یاسا و دەستوورە بۆ تێگەیاندن و پەروەردەکردن و پێگەیاندن، هەرچۆنێ یاسا و دەستوورە بۆ ژیان بە کردەوە، جا لەبەرئەوە ئەم قورئانە گەلێک لە ڕووداوو بەسەرهات و داستانی گەل و چینەکانی ڕابووردوو باس ئەکات بۆ ئەم ئوممەتە بۆ ئەمەی پەندو ئامۆژگاری وەرگرن لە چاکەو چاکەکەرانی ئەوان و تەمێ خوار بێ بە خراپەو خراپەکەرانی ئەوان و دوورکەونەوە لە وێنەی هەر هەڵەو بەسەر هاتێکی خراپیان، وە داستان و بەسەرهاتی ئیسرائیلیەکان زۆرتر ئەیانخاتە بەرچاو لەبەر چەند هۆیەک کە هەندێکمان باس کرد لەجزمی یەکەم و لەم جزمی دووەمەیش دا، وە بێجگە لەوانە لێرەدا ئەمەش ئەڵێین: لەناو ئەم ئوممەتەدا چەند تاقم و چەند کەس پەیدا بوون و ئێستاش هەن و لەداهاتووشدا هەر ئەبن کە لاسایی جوولەکەو گاور ئەکەنەوەو شوێنیان ئەکەون لە هەڵوێستە ناڕاست و ناڕەواکانیاندا، وەک پێغەمبەرمان (ﷺ) هەواڵی پێدا کەلە حەدیسێکدا کەلە کتێبە باوەڕپێکراوەکاندا هەیە، کە فەرمووی: (لتتبعن سنن الذين من قبلكم حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه) بێگومان شوێنی باوو ڕەوشتەکانی ئەو ئوممەتانە ئەکەون کەلە پێش ئێوەدا هاتن، تەنانەت ئەگەر ئەوان چوو بوونە کونی سووسمار ئێوەش ئەچن. جا خوای میهرەبان باوو کردەوەو هەڵوێستە ناڕەواکانی ئەوان ئەخاتە پێش چاوی ئەم ئوممەتە تا ئێمەی موسڵمان خۆمانیان لێ بپارێزین و ئێمەش وەک ئەوان هەڵنەخلیسکێین و لە ڕێی خوا لانەدەین.

ئەم قورئانە پێویستە بە تێگەیشتنەوە بخوێنرێ، وە پێویست بیری لێ بکرێتەوەو وەرگیرێ بە فەرمان و ئامۆژگاریەکی ڕۆژانە، بۆ چارەسەرکردنی هەر بەسەرهات و تەنگ و چەڵەمەیەک کە هاتووەتە ڕێیان و ڕۆژ بە ڕۆژ دێت و یەخەی مەردوم ئەگرێ، بۆئەوەی ڕێگە ڕووناک بکاتەوە بۆ داهاتوو، قورئان ئەبێ ئاوا بخوێنرێ و بیری لێ بکرێتەوە، وە بەو جۆرە وەرنەگیرێ ئەو سوودو بەرهەمەی نابێ کە بۆی هاتووەو دەست نیشانمان بۆ کرد لەم باسەدا، بەڵام هەرکات هەر تاقم و کۆمەڵێک قورئانی بەو شێوە خوێندو ناسی و بیری لێ

کردەوە ـ واتە پەیڕەوی یەکەم تاقم و کۆمەڵی ئەم ئوممەتە بکات ـ ئەو حەلە قاپی پیت و فەڕو بەهرەی خۆی ئەکاتەوە لێی، وەك کردیەوە لە یەکەم تاقم و کۆمەڵ، وە چارەسەری هەموو کۆسپ و گرێیەکی بۆ ئەکات، وەك چارەسەری کردبۆ ئەوان، وە جڵەوی ژیان و جیهان ئەخاتە دەستی، وەك خستی دەستی ئەوان.

لەم چەند ئایەتی داهاتوودا لەو داستان و بەسەر هاتانی ڕابوردووە دوانمان بۆ باس ئەکات: بەسەرهات و داستانی کۆمەڵێکە کە قورئان نە خۆیان و نە جێ و شوێنیان دیاریی ناکات، وە زۆر بەکورتی تێپەڕ ئەکات بەسەریاندا، بەڵام مەبەستەکە ئەگەیەنێ، ئەم یەکەمیانە داستانی کۆمەڵێکی چەند هەزار کەسی بوو لەوڵاتی خۆیان دەرچوون لەترسی مردن، ئینجا ئەو دەرچوون و ڕاکردنە هیچ سوودی نەبوو، وە بەرگری مردنی لێ نەکردن و خوا مراندنی، ئینجا زیندووی کردنەوە، کەواتە نەمردن و نەزیندوو بوونەوەیان بەدەست خۆیان نەبوو، تەنها بەدەست خوابوو، ئینجا مەبەست لەباسەکە هاندانی موسڵمانانە لەسەر جەنگ و کوشتارو ماڵ بەخت کردن لەڕێی خوادا، ئەو خوایەی کە بەخشندەی گیان و ماڵە و توانایە بەسەر سەندنەوەی گیان و ماڵدا، کەواتە هەرکەسێك ژیر بێت نابێ ماڵ و گیانی خۆی نەگوشێ و بیانخاتە سەر دەستی لەڕێی خوادا.

هەواڵی ئەم داستانەی بە جۆرێ هێناوە کە ئەگونجێ و دەست ئەدا بۆ هەرکەسێك کە لە پێشەوە بیستبێتی و ئاگادار بێ پێی، وە دەست ئەدات و ئەگونجێ لەگەڵ هەرکەسیش کە بێئاگابێت لێی و یەکەم جار بێت بچێ بە گوێچکەی دا، وە بۆ هەردوو بەکەڵکە، بۆ یەکەم بیری ئەخاتەوە و سەرنجی بۆ ڕائەکێشێ بە جۆرێك دانی پیا بنێ و سەرسام ببێ لێی، وە بۆ دووەمیش بە گێڕانەوەکەی ئاگاداری بە جۆرێك سەری سوڕبمێنێ لێی، وە وای نیشان ئەدات کە داستانەکە ئەوەندە بە ناوبانگە وەك هەموو کەس زانا و ئاگاداربێت وایە، وەلە قورئاندا وێنەی لەمە زۆرە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوە و بەدڵ ئاوڕێکت نەداوەتەوە ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ بۆلای ئەوانەی کە لە وڵاتی خۆیان دەرچوون و هەڵهاتن ﴿وَهُمۡ أُلُوفٌ﴾ لە کاتێکدا چەند هەزار کەسێك بوون؛

حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ثُمَّ أَحْيَـٰهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾

ڕایان کردو دەرچوون ﴿حَذَرَ ٱلْمَوْتِ﴾ لەبەر خۆپاراستن لە مردن، بە تاعونێ کە کەوتە وڵاتەکەیان، یان لەترسی ئەوەی نەبرێن بۆ غەزاو بکوژرێن لە ڕێی خوادا، ئینجا ئایا ئەوانە کێ بوون، وە لەچ وڵاتێکدا بوون؟ وە لەچ چەرخێکدا بوون؟ قورئان هیچ کام لەمانەی دیاریی نەکردووەو هیچ حەدیسی (صحیح)یشمان دەست نەکەوت لەوبارەیەوە، کەواتە هەر بەو نادیارییە بەسەریا تێپەڕ ئەکەین، وە ئەگەر زانینی ئەو جۆرە شتانە پێویست بوایە بۆمان باس ئەکرا، مەبەست لەم جۆرە شتانە تەمێ و ئامۆژگاری کردن و دەرس لێ وەرگرتنە، دەی زانینی جێ و شوێن و چەرخ و بەرەو تیرە هیچ شتێك لەو تەمێ و ئامۆژگارییە زیاد ناکات، کەواتە بە پێی یاسای ڕەوانبێژی نابێ بگوترێن، ئەگەر بگوترێن وتەو وتارەکە لەکەدار ئەبێت، چونکە بەپێی ئەو یاسا ئەبێ زیاد بە پێویست لە گفتوگۆو نوسیندا نەبێت.

ئەم داستانە لێرەدا بۆ ئەوە هاتووە کە تێگەیشتن و بۆچوون ڕێك و ڕاست بکرێتەوە سەبارەت بە مردن و ژیان و ئەو شتانەی کە بەدیەن و ڕواڵەت هۆی ژیان و مردنن بەلای خەڵکیەوە، وە گەڕانەوەی کاری مردن و ژیان هەر بۆلای ئەو کەسەیە کە مردن و ژیانی داهێناو بەدەستیەتی، وە بەستنەوەی دڵ و ئارام گرتنی تەنها بە خواهیش و بڕیاری خوایە، ئیتر هەڵسان و پەلاماردانی هەرکارو کردەوەیەك کە پێویست کراوەو خراوەتە سەرشان بە بێباك و بێترس، چونکە هەرچی خوا بڕیاری دابێ ئەبێ ببێ و مردن و ژیان هەر بەدەست ئەوە، وە ترس و خۆپارێزی لە مردن هیچ سوودێك نادات و ژیان درێژەی پێنادا، وە ئەجەل و ماوەی دیاریی کراو ناگۆڕێ و زیادو کەمی ناکات، وە بەرگری بڕیاری خوا ناکات، ئەوەتا ئەو کۆمەڵە گەورەیە ویستیان خۆیان بپارێزن لە مردن و لەدەستی دەرچن کەچی بە هیچ جۆرێك خۆیان بۆ ڕزگار نەکراو خوا هەر مراندنی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟﴾ ئینجا خوا فەرمووی پێیان بمرن، بێگومان ئەوانیش بەوە مردن، ئیتر چۆن پێی فەرموون؟ ئایا هەر بەوە مردن کە لە ترسا ڕایان کرد لێی؟ یان بەشتێکی تر مردن کەبە خەیاڵیاندا نەهاتبوو؟

هیچ کام لەمانە باس نەکراوە، چونکە پەندو تەمێ و ئامۆژگاریەك لەوانە وەرناگیرێ، ئەوانە بە فەرمانی خوا مردن ﴿ثُمَّ أَحۡيَٰهُمۡ﴾ لەپاش دا زیندووی کردنەوە، ئیتر ئەو زیندووکردنەوە چۆن بوو لەسەر چ شێوەیەك بوو؟ ئەوانە خوا خۆی باش ئەزانێ، وە لەبەرئەوە وەك لە قورئاندا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها حەدیسێکی صەحیحیشمان دەست ناکەوێ کە شتەکەمان بۆ دیاری بکات، وە هەروەك چەند جارێك وتمان لەم بارو بابەتانەوە ئیسرائیلییاتو هەواڵی ناڕاست بڵاوبوونەتەوە، لەبەرئەوە زاتمان نیە شوێنی ئەوانە بکەوین بارێك دیاری ناکەینو ئەڵێین بڕوامان پێ‌ی هەیەو ئەزانین دەسەڵاتی خوا بێ‌سنووره مەیلی هەرچی بکات ئەیکات، وە هەرگیز ڕەوانیە بۆ هیچ بڕوادارێك سەر بکاتەوە لەو بارو شتانە کە ئێمە وێنەمان نەیدوە، وە بە هەر حاڵو لەسەر هەربار ئەو ڕووداوە عیبرەتو تەمێ بووە بۆ ئەوانەو ئەهلی ئەو زەمانە، وەك بیستنی هەواڵەکەی پەندو تەمێ‌ی تیایە بۆ هەرکەس کە ئەم هەواڵەی پێگەیشتبێ‌و پێ‌ی بگات، کەواتە گێڕانەوەکەی میهرەبانی‌و لوتفی تیایە بۆ خەڵکی، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بەڕاستی خوا خاوەنی چاکەو بەهرەو میهرەبانیە بەسەر هەموو کەسێکەوە، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو کەس کە هەمیشە چاو لەبەری خوا بێتو سوپاسی بکات ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسی خوا ناکەن!

لە پێشەوە گوتمان: لە گێڕانەوەی ئەم یەکەم داستانەدا هاندانی بڕواداران هەیە لەسەر گیانو ماڵ بەخت کردن لە ڕێ‌ی خوادا، ئینجا ئەوا بە دوای باسەکەدا ئەو دوو ئایەتە ئەهێنێ داوای بەخت کردنی ئەو دوانەمان لێ ئەکات:

یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگو کوشتار بکەن لە ڕێ‌ی خوادا، واتە هیچ مەبەستێکی ترتان نەبێ جگە لە ڕەزامەندی خواو بەرز کردنەوەی وشەو وتەی خوا، وە بە ناوی خواو لە ژێر ئاڵای خوادا، نەك بە هیچ ناوێکی ترو لە ژێر هیچ ئاڵایەکی تردا، ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ وە بزانن کە خوا بیسەری زانایە، هەموو قسەو وتەیەك ئەفەرموێ:بیستێ‌و ئەزانێ بە نیازو مەبەستی خاوەن وتەکە، وە لەگەڵ هەکەس بە پێ‌ی قسەو نیازی خۆی ڕەفتار ئەکات.

﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافًا كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٤٥﴾

---

دووەم ئەفەرموێ: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا﴾ ئایا کێیە ئەوەی کە قەرز ئەدات بە خوا، قەرز دانی چاك‌و شیرین، بەم ڕەنگە بە پێخۆش بوونی دڵ‌و نیازی هەر ڕەزامەندی خوابێت، یان شتێکی چاك‌و خۆشەویستی ئەداتێ نەك شتێکی نەویستەو تووڕدراو، لەسەر هەربار خوا ئەوەندە میهرەبانە پاداشتی چاکەی بەندەکانی بە چەند قات ئەداتەوە، لای خوا ڕووەکەی دەقاتەو لای ژوورووی هەر خۆی ئەزانێ، وەك لێرەشدا دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافًا كَثِيرَةً﴾ ئینجا خوایش ئەو هەرزدان‌و قەرزی بۆ چەند قات‌و چەند چەندانە ئەکاتەوە، بە چەند قاتێکی زۆر کە خوا ئەندازەی ئەزانێ، لە جیهاندا چەند قاتی ئەکاتەوە بە زۆر کردن‌و پیت تێخستن‌و ڕەحەتی‌و سوود لێ وەرگرتن‌و کامەرانی، وە لە ڕۆژی دوایشدا بە نازو ڕێزو خۆشی بەهەشت‌و ڕەزامەندی خواو نزیکی لێیەوە، کەواتە با بڕواداری قەرز دەر زۆر دڵشادو شادمان بێت بەو قەرزەی کە ئەیدا، وە نەترسێ لەکەم بوونەوەو نەبوونی، چونکە بوون‌و نەبوون بە دەست خوایە، نەبوون‌و دەوڵەمەندی بە ڕژدی‌و چنگ قوچراوی پەیدا نەبێت، وە نەبوونی بێ‌نەوایش ڕوو ئەدا بەهۆی بەخشین‌و دەست گوشادی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ وە خوا نەبوونی‌و کەم دەستی‌و زۆری‌و فراوانی ئەهێنێ بەسەر بەندەکانی دا ــ ئەوەش بە پێی زانین‌و کار دروستی خۆی ــ، ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ وە هەر بۆ لای ئەو ئەگێڕێنەوە لە دوا ڕۆژدا، کەواتە ماڵ‌و سامان چییەو چ نرخێکی هەیەو ئەبێ بۆچی ئەوەندە بە توند بگیرێ‌و چاوی تێ‌ببڕێ؟! وە بۆ ئەبێ ئەو ماڵ‌و سامانە بەخت نەکرێ لەڕێی خواداو نەکرێ بەزەخیرەو توێشووی ئەو ڕۆژی دواییە؟ ئا بەو جۆرە داستانی یەکەم دوایی هات، دێتە سەر داستانی دووەم، کورتەی ئەم داستانە ئەمەیە: لە چەرخێ لە چەرخەکانی ئیسرائیلیەکاندا پیاو ماقووڵ‌و لە گوێ کراوەکانیان کۆئەبنەوە لای یەکێ لە پێغەمبەرەکانیان ــ کە پێغەمبەری زۆریان بووەو هاتوونەتە سەریان ــ وە داوای لێ ئەکەن کە پادشایەکیان بۆ دیاری بکات لە ژێر فەرمانی داو بەسەرکردایەتی ئەو جەنگ‌و کوشتار بکەن لە ڕێی خوادا.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ

---

له قسه‌و داواکه‌یانه‌وه ده‌رئه‌که‌وێ که عه‌قیده‌که‌یان له‌دڵیاندا بزووتنه‌وه‌و راپه‌رینێکی بۆ په‌یدا بووبێ، وه بڕواکه‌یان له ده‌روونیاندا بێدار بوویێته‌وه له خه‌وی بێ ئاگایی، وه هه‌ستیان کردبێ به‌وه‌ی که ئه‌وان خاوه‌نی ئایینو عه‌قیده‌یه‌کی راستنو له‌سه‌ر هه‌قن، وه دوژمنه‌کانیان له‌سه‌ر ناهه‌قو بێ‌بڕوایی‌و به‌تاڵن، وه بۆیان ده‌رکه‌وت که رێگه‌یان هه‌ر تێکۆشانو فیداکاریه له رێی خوادا، وه بڕوادار هه‌رکات ئه‌و زانینو هه‌ستو تێگه‌یشتنه‌ی بۆ فه‌راهه‌م هات مانای وایه نیوه‌ی رێگه‌ی بڕیوه بۆ سه‌رکه‌وتن، که‌واته بڕوادار له پێش هه‌موو شتێکه‌وه پێویسته بزانێ که خۆی له‌سه‌ر هه‌قه‌و دوژمنی له‌سه‌ر ناهه‌قه، وه ئه‌بێ نیازو مه‌به‌ستیشی هه‌رخوا بێتو خۆی یه‌کبارو یه‌ك نیاز بکات له‌سه‌ر ئه‌و بارو نیازه پاکه به‌بێ تێکه‌ڵ کردنی هیچ شتێکی تر، ئینجا بابێینه سه‌ر ئایه‌ته‌کان به جۆرو شێوه بێ وێنه‌که‌ی خۆی داستانه‌که‌مان بۆ باس ئه‌کات، ئه‌فه‌رموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ﴾ ئایا نه‌ت زانیوه‌و به‌چاوی دڵ ئاورێکت نه‌داوه‌ته‌وه بۆلای کۆمه‌ڵێك له پیاو ماقووڵو قسه ره‌وا، که هه‌ندێ بوون له ئیسرائیلیه‌کان له پاش موسا (علیه السلام)، واته ئایا هه‌واڵو داستانی ئه‌و کۆمه‌ڵه‌ت نه‌زانیوه، هه‌واڵو داستانی ﴿إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ﴾ ئه‌و کاته‌ی که گوتیان به پێغه‌مبه‌رێك که له‌وکاته‌دا بوویان: ﴿ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا﴾ پادشاو کاربه‌ده‌ستێکمان بۆ دیاری بکه به‌سه‌رمانه‌وه بێتو له‌سه‌ر ته‌گبیرو فه‌رمانی ئه‌و: ﴿نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جه‌نگو کوشتار بکه‌ین له رێی خوادا. ئینجا پێغه‌مبه‌ره‌که‌یان ویستی بۆی ده‌رکه‌وێ ئایا راست ئه‌که‌نو لێ بڕاون؟ له‌به‌رئه‌وه: ﴿قَالَ﴾ فه‌رمووی پێیان: ﴿هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟﴾ ئایا ئه‌گه‌ر جه‌نگو کوشتار پێویست کرا له‌سه‌رتان ئێوه له‌وانه‌نو نزیکن له‌وه‌ی جه‌نگ نه‌که‌ن؟ واته ئێستا کاتی ئارامی‌و بێ‌ترسیه، له‌به‌رئه‌وه ئه‌و داوایه ئه‌که‌ن، وه من لام وایه کاتێ جه‌نگ به‌رپا بوو ترس هات ئێوه له‌ترس دا هه‌ڵناسن به‌و جه‌نگه، ده‌ی ئایا ئێوه به‌و جۆره‌ن که من چاوه‌ڕوانی ئه‌که‌م؟ واته لام وایه به‌و جۆره نه‌بن؟

﴿قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ (٢٤٦)﴾

ئینجا ئەوانیش غیرەتیان هاتە جۆش‌و هۆو پاڵ پێوەنەری بەهێزیان باس کرد بۆ جەنگ‌وکوشتار، بەم ڕەنگە﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئایاچی هەیە بۆ ئێمە کە پاڵمان پێوەبنێ بەمەی کە جەنگ نەکەین لەڕێی خوادا ﴿وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ﴾ لەکاتێکداکە ئێمە دەرکراوین لە شوێن‌و وڵاتمان‌و دوور خراوینەتەوە لە کوڕەکانمان، واتە بێگومان جەنگ ئەکەین، چونکە دوژمنەکەمان دوژمنی خواو ئایینمانە، وە دەریشیان کردووین لە وڵات‌و نیشتمان‌و کوڕەکانیشمانیان ژێر دەست‌و دەستگیر کردووە، کەواتە ئەبێ جەنگ بکەین‌و بێجگە لە جەنگ کردن هیچ ڕێگەیەکی تر نەماوە لە ڕەدەممان‌دا، بەڵام بەداخەوە ئەو غیرەت‌و هەڵچوونە هەر لەکاتی ئارامی‌و ئاسایشدا بوو، بڕی نەکرد تا کاتی نارەحەتی‌و تەنگانە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ﴾ ئینجاکاتێ کە فەرمان دراو جەگ پێویست کرا لەسەریان پشتیان تێ‌کردو جەنگیان نەکرد مەگەر کەمێك لەوان کە بەپێی حەدیسی بوخاری سێ‌سەدو سیانزە (٣١٣) کەس بوون بە ئەندازەی ژمارەی جەنگ کەرانی بەدر، خوا لە هەموویان ڕازی بێت، بەڵێ هەڵگەڕانەوە لە پەیمان بە شکاندنی بەڵێن‌و مل پێچی لە فەرمان، هەڵنەسان بە ئەرکی سەرشان بە پشت کردنە هەق کە نیشانەو پیشەی ئاشکرای ئیسرائیلیەکانە، وە هەروەها هەر تاقم‌و کۆمەڵێکی تر کە پەروەردە نەکرابێ بە عەقیدەو بڕوای بەهێز، وە بەبۆنەی تاقیکردنەوەوە پاك‌و خاوێن نەبووبێ لە هەر ناڕاستی‌و لاری ئالەبایەك، جا لەبەرئەوە پێویستە لەسەر سەرکردایەتی کە ئاگای لەوە بێت، نەك لە ناکاودا تێکشکان ڕوو بکاتە لەشکرەکەی، بێگومان ئەو پشت تێکردن‌و هەڵگەڕانەوەی ئەوانە کارێکی زۆر بێزراوو ناڕاست‌و ناڕەوابوو، وە تاوان‌و ستەم بوو، ستەم لە خۆیان، وە ستەم لە پێغەمبەرەکەیان (علیە السلام)، وە ستەم لەو هەقە گەورەی کە ئەشیان زانێ هەقەو ڕاستە جا لەبەرئەوە قورئان ئەوان لەکەدار ئەکات بە تاوان‌و ستەم، وە بێزاری نیشان ئەدات لە کردەوەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا باش ئاگادارە بە ستەمکارەکان‌و زانایە بە هەموو شتێکیان.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًاۚ قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ﴾

لەپێش ئەوەی داستانەکە تەواو بکاتو هەر لە یەکەم جارەوە دەری خستو جاڕی نا فەرمانیو بەڵێن شکاندنی لێدان کە ئەوەش زیادە تەشەرو ڕیسوا تیایە، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر باسەکەو داستانەکە تەواو ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ﴾ واتە ئەوان داوای پادشاو کاربەدەستێکیان کردو پێغەمبەرەکەشیان فەرمووی پێیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ بەڕاستی خوا (طالوت)ی ڕەوانەکردووە بۆتان بە پادشاو کاربەدەست بەسەرتانەوە.

ئەوانە بەلای خۆیانەوە ڕاپەڕین لەبەر خواو ویستیان جەنگ بکەن لە ڕێی خواداو پەکیان هەر لەوە کەوتبوو کە کاربەدەستو پادشایان نیە، ئینجا لەسەر داوای خۆیان ئەوا داواکەیان بەجێهێنرا، کەواتە ئەبوایە بەبێ سەرلێ کردنەوە ڕازی ببونایەو چاوەڕوانی فەرمانی پادشاکەیان بکردایە، کەچی بەداخەوە، بە پێی باوو سروشتی لارو نالەباری خۆیان نارەزایی خۆیان دەربڕی لەو پادشایە کە خوا فەرمانی پێدا بوو، وە ڕەخنەیان بوو لێی، ئەوەتا ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان بە پێغەمبەرەکەیان ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا﴾ ئایا چۆن پادشایەتی ئەبێ بۆئەوبەسەر ئێمەدا؟ واتە شتی وا ڕەوانیە، چونکە دوو ڕەخنەیان بوو لێی:

یەکەم: گوتیان: ﴿وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ﴾ شایانترین بە پادشایەتی لەو، لەبەرئەوەی ئەمان نەسەبو نەژادیان گەورەترەو ئەو لە تیرەو بەرەی پادشا هەڵنەکەوتووە، بەڵام ئەمان هەر بە گەورەییو سەرۆکی هاتوون.

دووەم: ئەیانگوت: ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ﴾ وە ماڵو سامانی فراوانی نەدراوەتێ کە پێویستە بۆ پادشایەتی، یان تا بەهۆی ئەو سامانی زۆرەوە چاوپۆشی بکرێ لێیو گوێنەدرێ بە ناتەواویو پەستی نەژادی، وە بێگومان ئەو دوو ڕەخنەیە لە ترازووی خوادا هیچ قورسییان نیە، کەواتە ئەو دوو ڕەخنەیە لە تێنەگەیشتنەوە هاتبوون، وە بە هۆی نەخۆشی دەروونەوە بوو کە زۆربەی ئیسرائیلی پێوە دووچاربوون، ئینجا پێغەمبەرەکەیان بۆی دەرخستن کە ئەو پیاوە خۆی لە خۆی دا شیاوو شایان ترە، ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ﴾ بەڕاستی خوا ئەوی هەڵبژاردووە بەسەرتاندا،

وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ
﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ءَايَةَ مُلۡكِهِۦٓ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٞ مِّن
رَّبِّكُمۡ وَبَقِيَّةٞ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحۡمِلُهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُۚ

---

**﴿وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ﴾ وە ئەوی زیاد کردووە لە فراوانی لە زانین و لەش و جەستەدا، ﴿وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ﴾ وە خوا موڵك و پادشایەتی خۆی ئەبەخشێ بە هەر کەس کە خوا خۆی مەیل بکات و بیەوێ، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ﴾ وە خوا فراوانە لە دەسەڵات و بەخشین و بەهرەدا، ئەتوانێ هەر بێ دەست و بێ نەوا و هەژارێك بگەیەنێ بە پایان و پێویستی نەمێنێ، وە خوا زانایە و خۆی ئەزانێ کێ هەڵئەبژێرێ بۆ پادشایەتی و هەر کار و فەرمانتێکی تر.**

**ئەو پێغەمبەرە (علیه السلام) بەرپەرچی دانەوە و ئەو بۆچوون و تێگەیشتنە ناڕاستەی کە بوویان بۆی ڕاست کردنەوە، وە شیاویی و شایستەیی ئەو پادشایەی دەرخست لە چەند بارێکەوە:**

**١- خواهەڵی بژاردووە، وەئەو باش ئەزانێ کێ شایان و شیاوە، وە بەرژەوەندی لە چیدایە.**

**٢- ئەوەی کە بەنرخە و پێویستە بۆ ئەو پادشا و کاربەدەستە زانینی فراوانە تا بتوانێ هەڵسێ بە تەگبیری وڵات و کاروباری ڕامیاری، وە هێز و بازوو لە شتێکی گەورەیە تا بتوانێ بەرهەڵستی دوژمن بوەستێ و تەقیەی لێ بکرێ و سام و بیمی ببێ لە دەروونەدا، دەی خوا ئەو دووانەی بە فراوانی پێداوە.**

**٣- خوا خۆی خاوەنی هەموو موڵك و پادشایەتیە، کەواتە ڕێی هەرکەس بدات و کاروباری بخاتە ژێر دەست مەیلی خۆیەتی و کەس ناتوانێ ملە جەڕە بکات لە فەرمان و بڕیاری.**

**٤- خوا خۆی خاوەنی هەموو ماڵ و سامانێکە، کەواتە هەر ئەنداز پێویست بێت خوا ئەیدا بە پادشاکەی خۆی، هەرچەند شتەکەی بەو جۆرە بۆ ڕوون کردەوە، بەڵام خۆی ئەو گەلەی ئەناسی، ئەیزانی کە بەوە دانامرکێن و لە دڵەڕاوکێ ناکەون، لەبەرئەوە ویستی**

بە موعجیزەو ڕابەرو بەڵگەیەکی ئاشکرا دایان بەرکێنێ‌و دڵ ئارامیان بکات، ئەوەش ئەمە بوو کە سندوقەکەیان بۆ بێتەوە کە هۆی دڵنیایی‌و ئارامی دڵیان بوو.

لەبارەی ئەم ئەسندوقەوە چەند شتێك گوتراوەو بڵاوبوونەتەوە لەزۆر لە کتێبەکانی تەفسیردا، نزیك تریان ئەمەیە کە سندوقی تەورات بووەو زۆر بەڕێزو پیرۆز بووە لەناو گەلی ئیسرائیلیدا، وە چەند شتێکی تێدابووە کەلە پێغەمبەرەکان بەجێ ماوە، وە ئەڵێن: ڕوونووسی ئەو لەوحانەی تێدابووە کە خوا بەخشی بە بە موسا (علیه السلام) لەسەر شاخی توور، ئینجا کاتێ کە عەمالیقەکان هاتن‌و وڵاتی ئەمانیان داگیرکردو دەربەدەریان کردن، ئەو سندووقەشیان بە تاڵان کەوتە ژێر دەست، جا ئەم پێغەمبەرە هاتنەوەی ئەو تابووتەی کرد بە نیشانە لەسەر ئەوەی کە (طالوت) لە لایەن خواوە هەڵبژێرراوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ﴾ پێغەمبەرەکەیان پێی فەرموون: ﴿إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ﴾ بەڕاستی نیشانەی ئاشکرای پادشایەتی (طالوت) ئەمەیە کە سندووقەکەیان بۆ بێتەوە ﴿فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ کەلە سندووقەکەدا، یان لە هاتنەکەی دا هەیە ئارام‌و دامەزرانی دڵتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە، ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ﴾ وە تێیدا هەیە چەند شتێك لەوەی کە نەوەو کەس‌و کارە تایبەتیەکانی موساو هارون بەجێیان هێشت‌و بە دەستاو دەست مایەوە، ئەوەش کە بریتی بوو لە چەند پارچە شکاوی لەوحەکانی تەورات‌و دار دەستەکەی موساو هەندێ لە جل‌و بەرگ‌و چەند شتێکی تر کە لەوان‌و لە پێغەمبەرەکانی تریان بجێ مابوون‌و لەو سندووقەدا مانەوە تا ئەو کاتی پادشایەتی (طالوت)ە، نیشانەی ئاشکرای ئەو پادشایەتیە هاتنی ئەو سندووقەیە لە کاتێکدا ﴿تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ کە مەلائیکە هەڵی ئەگرن، ئیتر هاتنی ئەو سندووقە لە ئاسمانەوە بووبێ، بەم ڕەنگە خوا لەکاتی خۆی دا بەرزی کردبێتەوە بۆ ئاسمان‌و ئینجا لەو کاتەدا مەلائیکە بە فەرمانی خوا هێنابێتیانەوە خوارەوەو پارێزگاریان تا هاتبێتە لای (طالوت) وەك بەم جۆرە لە (ئیبن‌و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە، یان هاتنەکەی بەو بووبێ کە ئەو سندووقە مابێتەوە لای (عەمالیقەکان) زۆر بەبێ ڕێزی‌و بە پیس‌و پۆخڵە کردن، ئینجا خوا لە تۆڵەی ئەوەدا دووچاری دەردو سزاو زیانی سەختی کردن، بەهۆی ئەوەوە ترس کەوتە دڵیان‌و گومانیان برد کە خوای ئیسرائیل تۆڵەی لێ سەندوون، لەبەرئەوە سندووقەکەیان خستە سەر عەرەبانەیەك‌و بەستیان لەدووگا جووت‌و بەرەڵایان کردن،

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾

ئینجا بە فەرمانی خوا چوار مەلائیکە دانیانە بەرو پارێزگاریان کردن تا گەیاندیانە ئەو شوێنی (طالوت)ە بە هەر جۆرو لەسەر هەربار هاتنی ئەو سندووقە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر ئاشکرابوو لەبەرئەوە ئەو پێغەمبەر (علیە السلام) فەرمووی بە ئیسرائیلیەکان: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ﴾ بەڕاستی لە هاتنی ئەو سندووقەدا بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرا هەیە بۆتان ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواداران بەڕاستی، واتە ئەگەر بڕواداران بەڕاستی ئەو بەڵگەو نیشانانەتان بەسە، وا دەرئەکەوێ لە دیمەنی ئایەتەکانەوە کە ئەو نیشانە ڕوونە بەدی هات بەو جۆرەی کە پێغەمبەرەکە فەرمووی، لەبەرئەوە بە تەواوی دڵ ئارام و دڵنیا بوون بە پادشایەتی (طالوت).

ئینجا (طالوت) لەشکرێکی پێك هێنا لەوانەی کە گوێڕایەڵیان کردو پەشیمان نەبوونەوە لە بەڵێن و پەیمانەکەیان، بەڵام قورئان بە پێی باوی شیرینی لە گێڕانەوەی داستان و سەرگوزەشتەکاندا، ئەوەی کە پێویست نەبێ باسی ناکات و لێ بێدەنگ ئەبێت، لەبەرئەوە باسی هیچی تری نەکردو لەوێوە هاتەسەرمەبەستەکەو فەرمووی: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ﴾ ئینجا کاتێ کە (طالوت) دەرچوو لە وڵات و جوێ بوویەوە بە هاوڕێیەتی لەشکرەکە بەنیازی جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنەکەیاندا، ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ فەرمووی بە لەشکرەکە: بەڕاستی وەك تاقی کەرەوە خوا تاقیتان ئەکاتەوە بە ڕووبارێك، تا دەرکەوێ ڕاست و ناڕاست، ئەگێڕنەوە کە لەپاش هاتنی سندووقەکە گومانیان نەما لە زاڵبوون و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، بەهۆی ئەوەوە بە چەسپانی هاتنە پێشەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ جەنگ، ئینجا (طالوت) پێی فەرموون: پیرو نەخۆش با نەیەت، وە هەروەها هەرکەس خەریکی دروست کردنی خانوویەکەو تەواوی نەکردووە، وە هەکەرس خەریکە بە بازرگانیەوە، وە هەرکەس قەرزدارە، وە هەرکەس ژنی مارە کردووەو نەی گواستووەتەوە، وە من کەسێکم ئەوێ کە گەنج و چالاك و دەست خاڵی بێت، ئینجا هەشتا هەزار کەس کۆبوویەوە، وە کاتەکە کاتی گەرمای بەتین و بوو، وە ڕێکەوتن بە چۆڵ و بیابانێکی بێ ئاودا، وە داوای ئاویان کرد، (طالوت)یش فەرمووی: خوا تاقیتان ئەکاتەوە بە ڕووبارێك،

﴿فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي﴾ ئینجا هەرکەس لەو ڕووبارە بخواتەوە ئەو کەسە پەیوەستی بەمنەوە نیەو یەك نیە لەگەڵ من ﴿وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ﴾ وە هەکەرس لێی نەخواتەوەو هیچ ڕەنگ تامی نەکات، بێگومان ئەو کەسە لە منەو پەیوەستە بە منەوە، ئینجا لە یەکەم تاقم ئەمە دەر ئەکات: ﴿إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ﴾ واتە هەرکەس لێی بخواتەوە لە من نیە، مەگەر کەسێك مشتێکی لێ هەڵگۆزێ بە دەستی خۆی بۆ دەمو گەروو تەرکردنی، ئەو کەسە هەرچەند کەمو کوڕی هەبێ، بەڵام هەر وەرئەگیرێو پەیوەستی ناپچڕێ. به کورتی ئەوانە سێ جۆرو لەسەر سێ ڕادە بوون:

١- ڕادە پەستو پەیوەستی پچڕاو لە ڕێوە گوێی نەدا بەسەرپێچی لە فەرمانو دەمی خستە ئاوەکەو تێرو پڕی لێ خواردەوە.

٢- ڕادە بەرزو پێویست بە فەرمانی خوا کە بە هیچ ڕەنگ تامی ئاوەکەی نەکردو خۆی گرت لە سنووری ڕەزامەندی خوادا.

٣- مام ناوەندی، نەڕادە بەرزو نە پەیوەستی پچڕاو، کە تەنیا مشتێکی لێ هەڵگۆست.

هەر لە یەکەم جارەوە دەرکەوت کاردروستی خوا لە هەڵبژاردنی ئەو پادشایەدا، ئەو پیاوە زانی کە بۆ جەنگێکی سەخت ئەڕوا، وە لەشکرەکەی لە گەلێکی ژێر دەستی زەبوونەو چەند جار شکاوەو دەقی گرتووە بەو بارەیەوە، وە بەرەنگاری لەشکرێك ئەبێ کە زۆردارو زاڵو سەرکەوتووە، کەواتە لەشکرەکەی پێویستی هەیە بە هێزێکی دەروونی کە بتوانێ خۆی ڕاگرێ بەرامبەر ئەو لەشکرە بە هێزو زاڵە، ئەو هێزە دەروونیەش بریتیە لە عەزمو ئیرادەیەکی دامەزراو کە نەبەزێ بۆ هیچ هێزێك لە هێزەکانی ئارەزووو خواستەکانی نەفس، وە بتوانێ خۆی بگرێ بەرامبەر هەموو ئەركو زەحمەتو بێ بەشیەك، کەواتە ئەو پیاوە پێویستی بوو بە تاقی کردنەوەی ئەو لەشکرەی تا دەرکەوێ بۆی، لەبەرئەوە بەو ئاوە تاقی کردنەوە، کەلە ڕاستی دا تاقی کردنەوەیەکی زۆر سەختو بەهێزبوو، وە بەڕاستی زۆر هونەرێکی گەورەیە خۆگرتنی کەسێکی ماندووی زۆر تینوو لە کاتی گەرمای بەتینیدا، وە ئاو لەبەر دەستی دا بێتو لێی نەخواتەوە، بەڕاستی کەم کەس هەیە لە تاقی کردنەوەی ئاوادا دەرچێ،

فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ (٢٤٩)

---

لەبەرئەوە لەشکرە گەورەیەش بە جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ﴾ ئینجا ئەو لەشکرە تێرو پڕ لەو ڕووبارەیان خواردەوە مەگەر کەمێك لەوان، ژمارەیان (٣١٣) سێ سەدوسیانزە بووە بەپێی حەدیسی (بەڕای کوڕی عازەب) کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی (بەدر)دا فەرمووی: ئێوە ئەمڕۆ بەقەدەر هاوەڵەکانی (طالوت)ن کەلە ڕووبارەکە پەڕینەوە، جا (بەڕای کوڕی عازەب) ئەفەرموێ: ئەو ڕۆژە ئێمە سێ سەدو سیانزە کەس بووین، بەو تاقی کردنەوە دەرکەوت کە ئەبێ گوێ نەدرێ بە لاف لێدان‌و هەڵەو بلەی دەمی، بەڵکو دەرکەوت کە نیازی دەروونی ڕووت بەس نیە، بەڵکو پێویستی هەیە بە کردەوەو بەدی هێنانی لە ڕووداوی ژیاندا، ئەوەتا ئەو لەشکرە گەورەیە کەلە پێشەوە بە دەم هیچی نەمێشتبوویەوە، وە بێ‌گومان نیازو بڕیاری دەروونیشیان هەر بووە.

ئەو لەشکرە گەورەیە لەو تاقی کردنەوەدا داخزاو دەرنەچوو، پەیوەستی پچڕاو هەر ئەو ژمارە کەمە مایەوە کە شیاوی ئەوە بێت پەیوەست بێت‌و پشتی پێ ببەسترێ، ئەو تاقی کردنەوە ئەو لەشکرەی بژارو گێژو تەتەڵەکرد تا ئەو ئەو ژمارە کەمەی لێ دەرچوو ئەوی تری بێ کەڵك‌و دەرچووو توور درا، بەڵام هێشتا تاقی کردنەوەی تریش ماوە، وەك دەرئەکەوێ لەمەدا کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ ئینجا کاتێ کە پەڕیەوە لە ڕووبارەکە خۆی‌و ئەوانەش کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵی بوون ﴿قَالُواْ﴾ هەندێکیان گوتیان ﴿لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ﴾ ئەمڕۆ هیچ دەسەلات‌و توانامان نیە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ (جالوت)و لەشکرەکەی، بێ‌گومان ئەمانە بڕوادار بوون، وە هەڵنەگەڕا بوونەوە لەو بەڵێن‌و پەیمانەی کە بەستیان لەگەڵ پادشاکەیاندا، بەڵام تاقمێکی کەم بوون‌و ئاگاداربوون بەسەر هێزو زۆریی دوژمنەکەیان بەسەرکردایەتی (جالوت)ی نەبەردی ستەمکار کە ئەڵێن: لەشکرەکەی سەد هەزار یان سێ‌سەد هەزار کەس بووە، جا لەبەرئەوە غەمی بێ هێزی‌و لاوازی خۆیانیان لێ هات، بەڕاستی خۆگرتن لەبەردەم هێزێکی وەهادا بە کەم کەس

ئـەکرێ، وە کەسـێکی ئـەوێ کـە بـڕوای بـە خـوا زۆر زۆر بـەهێزبێتو دڵـی پەیوەندیـەکی هەمیشەیی ببێ بە خوای خۆیەوە، وە ئەوەش بوو بە تاقی کردنەوەیەکی تر، هەرکەس لەم تاقی کردنەوەدا سەرکەوێ، بێگومان وای لێ دێ کە باکی نەمێنێ لە هیچ هێزێکی تر بێجگە لە هێزی بێ سنووری خوا،وەك دەرئەکەوێ لەم تاقمەکەی ترەوە کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ﴾ ئەوانـەی کە لایان وابوو بە حـزووری خـوا ئەگەنو بـە تـەمای ئـەجرو پاداشتو بوون لای ئەو، ئەوانە کە بڕوادارە خاوێنـەکان بوون، بۆ دڵخۆش کـردنو هانـدانی ئـەوانی تـر گوتیـان: ﴿كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ﴾ زۆر تـاقمی کـەم دەسـەڵات زاڵبـوونو سـەرکەوتن بەسـەر تـاقمی زۆرو بـە دەسـەڵاتدا بـە ئیـزنو یارمەتی خوا، واتە بکتان نەبێ، چونکە زاڵبوونو زاڵ نـەبوون بە زۆرو کەمی نیە، بەڵکو بە دەست خوایە ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وە خوایش لەگەڵ خۆگرەکانی، کەواتە خۆتـان بگـرنو هـەر پشت بە خوا ببەستن، بێگومان ئەم تاقمە بڕواداری خاوێنو هـیچ گومـانو دوودڵیـان نـەبووە لـە زینـدوو بوونـەوەو گەیـشتن بـە حـزووری خـوا، کەواتـە چـۆن دەربارەیـان فـەرمووی: ﴿يَظُنُّونَ﴾ کەلە زامانی عەرەبدا بە مانا گومانو دوو دڵیە؟ لە وەڵامدا ئەڵێین:

١- مەبەسـت لەگەیـشتن بـە حـزووری خـوا مـردنو کوژرانـە لـەو جەنگـەدا، دەی ئـەوەش شتێکی قەتعی نەبووە بە لایانەوە، بەڵکو ئەوە بەهێزبووە لە دڵیاندا.
٢- مەبەست گەیشتنە بە ئەجرو پاداشتی خواو وەرگرتنی ئەو کردەوەو جەنگەیە لێیـان، دەی بێگومان ئەمەش هەر شتێکی قەتعی نیەو هەر خوا خۆی ئەزانێ.
٣- مەبەسـت گەیـشتنە بـە بـەڵێنی خـوا کـە سەرخـستنو زاڵکردنـی بڕوادارانـە بەسـەر دوژمنانی خوادا، وە بێگومان ئەو بەڵێنە پێویست نیە بەدی هاتنی بۆ هەموو تاقمێكو لە هەموو کاتو جارێکدا، کەواتە هەر جێگەی گومانو دوو دڵی بووە بۆ ئەو تاقمە.
٤- وتەی (ظن) بەکارئەهێنرێ بۆ زانینی تەواو لە زۆر شوێندا، دەربارەی ئەو شتانەی کە هەستیان پێناکرێ، وە هۆی ئەو بەکارهێنانەش ئەمەیە کە زانینی ئەو جۆرە شتانە کە ئاشکرا نین ناگەنە ڕادەی ئەو شتانەی کە ئاشکراو هەست پێکراون، کەواتە زۆر جار زانینی ئەوانە خەتەرەو خەیاڵ ڕووی تێئەکات، وە ئەو جۆرە خەتـەرەو خەیاڵانـە زیـان ناگەیەنێ بەبڕوای بڕواداران، هەرکام لەم وەڵامانە ئەو گرێیەی پێ ئەکرێتـەوە کە لـەو پرسیارەدا دەرخرا!!

وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ

---

ئەو ئامۆژگاریەی کە ئەو بڕوادارە خاوێنانە کردنیان زۆر بەکارو بەکەڵك بوو، وە ئەو سەرکەوتنو یارمەتی دانەی خوا کە بە تەمای بوونو دیّ لاوازەکانیان پیّ بەهێز دەکات خوا بەدی هێنا، وەك دەر ئەکەویّ لەمەدا کە ئەفەرمویّ: ﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ کاتیّ (طالوت)و ئەوانەی کەلە لەگەڵی بوون دەرکەوتن لە دەشتو مەیدانێکی ئاشکراوە بەرامبەر وەستان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ (جالوت)و لەشکرەکەی، وەکەمی خۆیانو زۆربەی ئەوانیان بینی پشتیان بە خوا بەستو ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا﴾ ئەی پەروەردگارمان بڕێژە بەسەرماندا ئارامو خۆگریەکی گرنگ ﴿وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا﴾ وە پێمان دامەزراوبکە، واتە هێزی دڵو دامەزراویمان پیّبدە کە بتوانین بوەستین بەرامبەر بە دوژمن ﴿وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ وە سەرمان بخەو زاڵمان بکە بەسەر کۆمەڵو گەلی بیّ بڕوایاندا تا بیانشکێنن، خوا نزاکەی وەرگرتن ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەوە شکاندنیان بە ئیزنو ویستی خوا، بەڵیّ بە ڕاستی بە ئیزنو ویستی خوا شکاندنیان، ئەگینا کۆمەڵەکەی بڕواداران لە کویّو ئەو لەشکرە زۆرو بەهێزە لە کویّ؟

تاقمە بڕوادارە خاوێنەکە لە کاتی دڵخۆشیو ئامۆژگاریەکەدا گوتیان: بە ئیزنی خوا، ئینجا ئەوا لێرەدا قورئان زاڵبوونو سەرکەوتنەکەیانی گێڕایەوە بۆ ئیزنو ویستی خوا، کەواتە پێویستە بڕواداران لە هەموو کاروبارێکیاندا چاو ببڕنە ئەو وتە پیرۆزە، وە هەمیشە ئەوەیان لەدڵدا بێت کە کارەکە لە ڕاستیدا کاری خوایەو لەسەردەستی بەندەکانی دا دەری ئەخات، کەواتە دووجار خوا بەهرەو منەتی هەیە بەسەر بەندە بڕوادارەکانیەوە:

یەکەم: خوا کارەکەی خۆی کرد بەوانو لەسەردەستی ئەواندا کردی.

دووەم: ڕێزی ئەم بەندەیانەی خۆی ئەگریّو ئەجرو پاداشتیان ئەداتەوە.

﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾

لەناو لەشكری بڕوادارانـدا كوڕێكی گەنجی منـداڵبوو، وە (جـالوت)یـش پادشـایەكی بەهێزی زەبەلاحی سامناك بوو، بەڵام خوا ویستی دەری بخات كە كارەكە بەپێی دیمەنو ڕواڵەتێكی ناڕوا، بەڵكو لەسەرباری ڕاستەقینەی خۆی ئەڕوا، وە ئەو بارەش خوا خۆی ئەیزانێو كـاتو ئەنـدازی بەدەسـت خۆیـەتی، وە بەنـدە هـەر ئەوەی لەسـەرە هەڵسێ بـە پێویستی سەشانی، وە هەڵسێ بە بەڵێنو پەیمانێك كە دوایەتی بە خوا، ئینجا دوای ئەوە ئەوەی كە خوا ئەیـەوێ بـەدی دێـت لەسـەر ئـەو بـارو شـێوەی كە ئەیـەوێو بـۆی دیـاریی كـردووە، جـا بـەو پێـیە خـوا ویـستبووی كـە ئـەو ستەمكارە زۆردارە لەسـەر دەسـتی ئـەو منداڵەدا لەناوبەرێ، وە ئەوەی كە خوا ویستی بەدی هاتو وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ﴾ (داود) (جالوت)ی كوشت، خوا ئەوەی ویست كە نیشانی بدات كە ئەو ستەمكارو زۆردارانەی كەئەوان لێیان ئەترسان لە ڕاستی دا زۆر زۆر دەستەپاچەو لاوازنو هەركات خوا ویستی ئاوابە منداڵێك لەناو ئەچن، ئەو كوشتنە لەسەر دەستی (دواد)دا حیكمەتو هۆیەكی تری تیا بوو كە بەدڵی كەس دا گوزەری نەكردبوو، خوا ویستی بەو كردەوە گەورەیە (داود) دەرخاتو ئامادەی بكات بۆ ئەو كارە گەورەی كە پـێی ئەسپێرێ، كە ئەوەش ئەمە بوو پادشـایەتی بگرێتـە دەسـت لـەپاش (طـالوت)، ئینجـا لـەپاش (داود) (سلێمان)ی كـوڕی بێتەكایەكـە لەسـەر دەسـتی ئـەودا بـەرزترین چـەرخ بێتـە پێـشەوە، چـەرخی ئـاڵتوونینی ئیسرائیلی كەوێنـەی نـەبووە لـە هـەموو مێـژووە دوورو درێژەكەیاندا، وە ئەوەشی پێدان لە پاداشتی ئەو ڕاپەڕینو شۆڕشە ئایینیەی كەلە دەروونیاندا بەرپا بوو لە پاش ئەو پەستیو ڕیسوایيو ژێر دەستەیيو دەربەدەریـەی كە دووچاری بوون لە تۆڵـەی لادانو ترازانیان لە ڕێو بەرنامـەی خـوا، وەك ئەفـەرموێ: ﴿وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ خـوا پادشـایەتیو پێغەمبـەرێتی بەخـشی بـە (داود)، كـە ئـەو دوو شـتە لـەپێش ئـەو بـۆ هـیچ كـەس لەنـەوەی ئیسرائیل ڕووی نەداوە، ﴿وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ﴾ وە فێری كرد لەوەی كە خوا خۆی ویستی.

ئەم (داود)ە (علیە السلام)، وەك خوا كردی بە پاشاو پێغەمبەر، هـەروەها فێری دروست كردنی زرێو تاس كڵاوی كرد كە لەو چەرخەدا زۆر زۆر بەكارو بەكەڵك بووە بۆ جەنگ وەك لە سورەتی تردا بە درێژی باس ئەفەرموێ. لەم كاتـەدا كە داستانەكەی كۆتایی پێهێنا، وە

جارێ دواترین سەرکەوتن و زاڵبوونی دا بۆ ئایین و عەقیدە، نەك بۆ هێزو دەسەڵاتی بێ‌بڕوایی، وە بۆ نیازو ویستی پاك و ڕاست نەك بۆ زۆری ژمارەو چەك، لەم کاتەدا جارێ ئەدات و مەبەست لە بەربەرەکانی و جەنگ و تێك هەڵچوونی هێزی بڕوادار لەگەڵ هێزی شەڕو بێ‌بڕوادار کە خوا فەرمانی پێداوەو مەبەست لەو جەنگ و تێك هەڵچوونە دەرئەخات، کە نابێ مەبەست داگیرکردن و دەست کەوت و تاڵان بێت، وە نابێ مەبەست بەرزی و ڕێزو ناوبانگ بێت، بەس مەبەست چاکەو چاك کردنی وڵاتەو نەهێشتن و کوژاندنەوەی خراپەکاری و سەر شێوان و ئاژاوەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ﴾ واتە ئەگەر خوا بەرگری هێندێ لە ئادەمی نەئەکرد ـ واتە ستەمکارو خراپەکار ـ بە هێندێ تریان کە بەربەستیان بکەن و پەکیان بخەن لە خراپەکاری ﴿لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ﴾ بێ‌گومان وڵات تێك ئەچووو ئەشێوا بەمل یەکداو خێرو خۆشی لەژیاندا نەئەما، لەم ئایەتەدا بەربەست کراوو بەربەست پێکراوی کرد کە هەرکام هێندێکن لە ئادەمی، بەڵام باسی بەربەست لێ کراوی نەکرد، جا هەڵئەگرێ مەبەست پێ‌ی شەڕو خراپە بێت لە ئایین دا یان شەڕو خراپەی ژیان و جیهان، یان شەڕو خراپەی بۆ هەردوو، ئینجا لەسەر باری یەکەم هەڵئەگرێ، مەبەست هەر بێ‌بڕوایی بێت، یان هەر تاوان و کردەوەیەکی خراپی تر، یان هەردوو مەبەست بن، لەبەرئەوە ئایەتەکە تەفسیر کراوەتەوە لەسەر هەرکام لەو بارانە، وەك تەفسیر کراوەتەوە کە بە جارێ هەموو مەبەست بن، وە بەڕاستی دڵ لەگەڵ ئەمەدا بە ئارامەدا بە ئارام ترە، چونکە نەی دایە بە دەمی هێندێ ترداو دەستی نەبەستایەن ئەو حەلە هەموو جۆرە شەڕو خراپەیە لە زەوی دا بەرپا ئەبوو لە هەموو بارو ڕوویەکی ژیان و جیهانەوە، وە بە تەواوی شەڕو خراپە پەرەی ئەسندو ژیان و جیهانی ڕەش و تاریك ئەکرد، ئەگەر خوا ئایین و شەریعەتی خۆی نەناردایەو پێویستی نەکردایە بە ڕاگەیاندن و بڵاو کردنەوەو چەسپاندنی، ئەو حەلە ئادەمی و مرۆڤایەتی بەدی نەئەهات، دوڕندەیی ئەهاتە جێگەکەی، خوای میهرەبان بەرامبەر هێزی شەڕو خراپە هێزی خێرو چاکەی دروست کردو داینا، وە پێویستی کرد کە هێزی چاکە تێکۆشان و فیداکاری بکات بۆ بەربەست کردنی تاوان و خراپە، تەنانەت زۆر جار بەهێزی شەڕو خراپە هێزێکی تری شەڕو خراپە بەربەست ئەکات، وە ئەو دوانە خەریك ئەکات بە یەکترەوەو لە ترسی یەکتر پەرژانیان نابێ و ناتوانن بە ئارەزووی خۆیان پەل بکوتن لە تاوان و خراپەکاری گشتی دا، بەهۆی ئەوەوە لە بەینی ئەو دوو هێزەدا مەردومی تر ئەتوانن ژیان بەسەر بەرن،

وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾

---

ئەگەر خوای کارزان و کارساز بەو جۆرەی نەکردایە ژیان و جیهان کاول و وێران ئەبوون ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڵام خوا خاوەنی چاکەو فەزڵ و بەهرەی زۆر گەورەیە بەسەر هەموو جیهانیانەوە، کەواتە بۆیە ئەو بەربەست و بەرگریەی پێك هێناو ئەو چارەسەرەی کرد، لە بەزەیی و میهرەبانیەکەی بە زیاد بێت، هێندێ لە تەمێ و ئامۆژگاریمان باس کرد کە وەرئەگیرێ لە داستانی یەکەمەوە، ئینجا با باسی هێندێکیش بکەین سەبارەت بەم داستانی دووەمە:

١- ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشە ئایینیە هەرچەندە سستی و کەم و کوڕی و لاوازی تێکەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا هێزی دڵ و دامەزراوی و بەردەوامی ئەو تاقمە کەمەبوو بەهۆی زاڵبوون و سەرکەوتن بەسەر ئەو هێزو لەشکرە زۆرو سامناکەدا لەپاش ئەو هەموو ژێر دەستەیی وزەبوونی و پەراگەندەیی و ئاوارەییەی کە ماوەیەکی دوورو درێژ ئەو گەلەی داگیرکرد.

٢- هۆنینەوەی گەل و دیاری کردنی سەرکردایەتیەك زۆرپێویستەو بەبێ ئەوە هیچ کارێکی گرنگ ناڕوا، وە لەبەرئەوەیە ئیسلام فەرزو پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان دیاری کردن و دانانی کاربەدەست و سەرکردە، تا ئەو ڕادەیە لەکاتی لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەردا (ﷺ)، یەکەم کردەوەو ئیش دانان و دیاری کردنی جێنشین بوو.

٣- ئەو سەرکردەو کاربەدستە ئەبێ لێزان و زاناو نەترس و وریاو بەهێزبێ، بە جۆرێ هەڵنەخەڵەتێ بە گاڵتەو گیفەو لافی گەل، بەڵکو ئەبێ تاقییان بکاتەوەو بەجارو دووجار وازنەهێنێ، ئینجا پشتیان پێ ببەستێ، وە گوێ نەدا بەکەمی ژمارەو پشت نەبەستێ بەزۆری، بەڵکو ئەبێ هەرسەرنجی چۆنێتی بدرێ، چونکە سەرکەوتن و ژێر کەوتن بەستراوە بە چۆنێتیەوە نەك بە چەندێتیەوە.

٤- هەر دڵێك پەیوەست بێت بە خواوەو پشت بەو ببەستێ، بۆچوون و تێگەیشتنی جیاوازەو بە تەرازوو سەنگ و مەنێکی تر کێشانەو پێوانەو بەراووردی هەموو شتێك ئەکات، وە هەرگیز ناترسێ لەدیمەن و ڕواڵەت و نایش خەڵەتی پێی، بۆ وێنە ئەو تاقمە زۆر کەمەی کە خۆی گرت و بێباك خۆی خستە ناو کۆڕو کورەی جەنگەکەوە،

کەمی خۆیان و زۆری لەشکری دوژمنی وەبینی بەڵام هیچ گوێی نەدا بەوە، تەنانەت وەك ئەو تاقمە بڕوادارەکەی تریش غەمی لێ نەهات و مەترسی نەیگرت و نەیگوت: ﴿لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾، بەڵکو بە هەموو هێزی دڵەوە گوتی: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ وە بەڕاستی ڕووی کردە خوای خۆی و ئەو نزا شیرینەی کرد کە باس کرا.

٥- سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر دوژمندا دەستکەوت نابێ مەگەر کاتێ کە کاربەدەست فەرمان ڕەوا و گوێڕایەڵی کراو بێت بە تەواوی.

٦- هێندێ لە باوی لە جیهاندا بریتیە لە بەرگری کردنی هێندێ لە بەندەکانی بە هێدێ تریان کە ئەمەش لەم چەرخی ئەمڕۆدا پێی ئەگوترێ (نظرية تنازع البقاء).

زۆر شتی تر وەرئەگیرێ لەم داستانە، بەڵام با بەم ئەندازەیە کۆتایی بێنین و بێینەوە سەر ئەو ئایەت و فەرموودە بەرزەی کە ئەیهێنێ بەدوای باسەکاندا: ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ ئەو ئایەتە بەرزو بڵندانەی کە ئەو داستان و سەرگوزەشتانەمان تیا گێڕایەوە چەند ئایەتێکی خوا بوون، ﴿نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئەیان خوێنینەوە بەسەرتدا بەڕاستی و بە حەقیانەت کەبە هیچ ڕەنگ جێگەی گومان و دوو دڵی نین و نامەدارەکان ئەزانن کە ڕاست و حەقن و ئێمەش بەڕاستی و حەقیانەت ئەیخوێنینەوە بەسەرتدا کە مافی خوێندنەوەو ناردنیمان هەیە، وە مافی ئەوەمان هەیە کە بیکەین بە بەرنامەو دەستوور بۆ بەندەکانمان، وە هیچ کەسێکی تر مافی ئەوەی نیە، ﴿وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ وە بەڕاستی تۆ (ئەی محمد) لە فروستادەکانی ئێمەیت کە نێرراون بۆ ڕاگەیاندنی ئایین و بەرنامەی ئێمە کەواتە لەبەرئەوە ئەیانخوێنینەوە بەسەرتدا، واتە ئەم هەواڵانە شتێکی نەزانراوی غەیبی بوون نەتۆو نە گەلەکەت شتی وایان نەئەزانی، کەواتە زانینی ئەمانە ئەبێ هەر لەلایەن خواوە بۆت هاتبێ، چونکە تۆ یەکێکی لە پێغەمبەران ـ سەلامی خوا لە هەموویان بێت ـ.

بەم جۆرو شێوەیە ئەم جزمی دووەمەی دوایی پێهێنا کە گەل و کۆمەڵی موسڵمانانی پێ پەروەردەکردو پێگەیاند، تا ببێ بە مامۆستا و ڕزگارکەری جیهان و جیهانیان.

وصلى الله وسلم على هذا النبي الكريم والرسول الأمين إلى يوم الدين.

ئەم جزمە پێکهاتووە لە دوو بەش: بەشی یەکەم: لە ئایەتی(٢٥٣)ی سورەتی ﴿البقرة﴾ەوە دەست پێئەکات تا ئەگاتە سوورەتی ﴿آل عمران﴾. بەشی دووەم: لەسەرەتای سورەتی﴿آل عمران﴾ەوە دەست پێدەکات تا ئەگاتە ئایەتی(٩٢).

لە پێشەوە بەکورتی باسێکی ئەم بەشە ئەکەین، ئینجا ئەچینە سەر درێژە دان لەکاتی تەفسیری ئایەتەکان دا، وەك ـ بەیارمەتی خوا ـ لەسەرتای سورەتی ﴿آل عمران﴾ەوە کورتە باسێك ئەکەین، لە پێشەوە لەبەشی دووەمی جزمەکەو ئینجا ئەچینە سەر درێژەی باس، تا باش تێبگەین لەسروشتو مەبەستی هەرکام لەو دوو بەشە بە تایبەتی، سروشتو مەبەستی جزمەکە بەتێکڕایی و شێوەی گشتی، ئینجا یەکێتی و پەیوەندی و پەیوەستی هەموو ئایەتو بەشەکانی سورەتەکە بە تەواوی.

لە سەرەتای سوورەتی ﴿البقرة﴾ەوە گوتمان: مەبەستی سەرەکی ئەم سوورەتە بریتیە لە ئامادە کردنو پێکەیاندنی کۆمەڵی موسڵمان لە مەدینەدا بۆئەوەی هەڵسێ بە ئەرکی میللەتێکی موسڵمان کە گەورەترین سپاردەی خرابێتە سەر شانو هاتبێ بۆئەوەی ببێ بە مامۆستاو ڕێنیشاندەر هەموو خەڵکی، ئەو پێکەیاندنو ئامادەکردنەش بەوە ئەبێ کە هەموو نیشانەو دروشمەکانی ڕێگاکەی نیشان بداتو شارەزای بکات بە هەرچاڵی و چۆڵی و هەر شتێك کە هۆی تاسەو لەنگەرەو هەڵخیسکان بێت لەو ڕێگەیەدا، ئاگاداری بکات بە توێشووی ئەو ڕێگەیەو هەر دڕكو داڵو ڕێگرێك کە بخرێتە بەر پێی لەلایەن دوژمنەوە، پەندو ئامۆژگاری بکات بە ڕووداو داستانی گەلو کۆمەڵەکانی ڕابردوو بۆئەوەی دووربکەوێتەوە لە هەر هەڵەیەکی ئەوانو هەرکارو کردەوەیەکی ڕاستو ڕەوای ئەوان بەجێبێنێ کە مایەی سەرکەوتنو پێشکەوتنو گەیشتن بە ئامانج بووبێ بۆ ئەوان، جائەو دوو جزمی ڕابردووە هەر خەریك بوو بەو مەبەستانەوە کە باسمان کردن، بە جۆرێ بەرنامەیەکی هێنا بۆ هەموو تاقمو چینەکانی پاش یەکەم تاقمو چین هەتا هەتایە، بەرنامەیەکی دامەزراوی ڕوونی نەگۆڕاو بۆ پێکهێنانی گەلو کۆمەڵی موسڵمان لە هەموو کاتو چەرخێکدا، بۆ سەرکردایەتی کردنی هەموو ڕاپەڕینو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی، جا لەبەرئەوە قورئان بەرنامەو سەرکردایەتیەکی تێرو تەواوی لێزانی کاردروستە لە هەموو کاتێکدا، ڕێنیشاندەرو دەستگیرە بۆ هەموو کەس کە پەنای پێبباتو بێتە ژێر سایەی.

ئەم سورەتە لەدوو جزمی ڕابردووی دا بەو جۆرە هات لەسەر کارو فەرمانی خۆی تا جزمی دووەمی دوایی هێنا بە داستانی ئەو کۆمەڵە ئیسرائیلیەی کە دوایی هات بە کوشتنی(جالوت)، گێڕانەوەی ئەو داستانو هەواڵانەی کرد بە نیشانە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ)و فەرمووی پێی: بێگومان تۆ یەکێکی لە ڕەوانە کراوەکانی خوا. بەو وتە پیرۆزە جزمی دووایی پێهێنا، ئینجا بەو بۆنەیەوە قاپی جزمی سێیەم ئەکاتەوە بە باسی پێغەمبەران کە سەرەتای جزمەکە جۆش ئەداتو پەیوەستی ئەکات بەجزمی پێشیەوە، ئینجا بە بۆنەی ئەوانەوە ئەڕوات بۆ باسی دووبەرەکی شوێن کەوتووەکانی ئەو پێغەمبەرانە، بەو بۆنەیەوە تەمێو ئامۆژگاری ئەم میللەتە ئەکاتو ئەچێتەوە سەر کارو فەرمانی سورەتەکە، کەلە دوو جزمی پێشوودا خەریك بوو پێیەوە، کەواتە هەموو ئایەتو بەشەکانی سورەتەکە پەیوەستو جۆشن پێکەوەو هەموو ئەخولێنەوە بە دەوری مەبەستە سەرەکیەکەدا کە باسمان کرد، ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ﴾ ئەو کۆمەڵە بەرزو بەڕێزەی پێغەمبەران کە تۆ یەکێکی لەوانو ڕەوانە کراون بۆ گەیاندنی بەرنامەو ئایینو شەریعەتی خوا، ﴿فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ باوی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، واتە پێغەمبەران ـ درودی خوایان لێ بێت ـ هەرچەند پلەو پایەیان بەرزترە لە هەموو کەسێکی ترو هەرچەند هەموو وەك یەکن لە سیفەتی پێغەمبەرێتی دا، بەڵام با وا نەزانرێ لە هەموو بارو ڕوویەکی ترەوە چون یەکن، نەخێر چون یەك نین، بەڵکو هەندێکیان ڕادەی بەرزترە بەهۆی چەند سیفەتو بەهرەیەکی ترەوە کە پێی بەخشراوەو نەدراوە بەوانی تر، وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات بەمەی کە ناوی دوانیان ئەبات، بە تایبەتی لەگەڵ بەهرەی تایبەتیاندا، ئەو دووانەش کە(موساو عیسا) ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ، بە تایبەتی ناوی بردوون، چونکە بەهرەو موعجیزەکانیان ئاشکراترو بەهێزترن لە موعجیزەی هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیان، بەناوی ئەو دووانەوە دوو ئوممەت بوون لە کاتی هاتنی ئەم قورئانەدا، وەکو ئێستاش هەر هەن، کەواتە ناوبردنی ئەو دووانە تانەو تەشەرێکی زۆر گەورەیە لەو دوو ئوممەتە کە لایان دا لە ئایینو ڕێبازی ئەو دوو پێغەمبەرە گەورەیە، ئەفەرموێ: ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ﴾ هێندێ لەو فروستادانە کەسێکە کە خوا قسەی لەگەڵ کرد، واتە(موسا) کە ئەوەندە بەناو بانگە بەم بەهرەیە خەڵکی تێ ئەگەن کە مەبەست(موسا)یەو ناوبردنی هیچ پێویست نیە، بەڵکو ناونەبردنەکەی زۆرتر نرخو ڕێز نیشان ئەدات، چونکە ئەوە ئەگەیەنێ کە(موسا) تاقانەیە لەو بەهرەداو هیچ کەس هاوبەشی نیەو بە جۆرێکە هەر دڵ بۆ ئەو ئەڕوات.

سەبارەت بە قسەکردنی خوا لەگەڵ(موسا)و وەرگرتن‌و بیستنی(موسا)، زانایان چەند جۆرو شێوەیەکیان فەرمووە ـ وەك باس کراوە لە کتێبەکانی عیلمی کەلام دا ـ هەر چۆن بێ ئەوە بەهرەیەکی تایبەتی بووەو بە هیچ پێغەمبەرێکی تر نەدراوە، لەبەر هەر هۆیەك کە خوا خۆی ئەزانێ، ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ هەندێکی ترو ناوی ئەمیش نابات، ئەفەرموێ: ﴿وَرَفَعَ بَعۡضَهُمۡ دَرَجَٰتٖۚ﴾ خوا هەندێکیانی بەرز کردووەتەوە بە چەند پادەو پلەیەك بەسەر ئەوانی تردا، زۆربەو جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەم هێندە حەزرەتی(محمد)ە(ﷺ)، بەڵام ناوی نەبرد چونکە قسەو فەرموودەکانی لەگەڵ ئەمەو ئاراستەی ئەم کراوە، کەواتە شوێنەکە شوێنی هەواڵدانە بەم لەبارەی پێغەمبەرانی ترەوە، نەك هەواڵدان بەم لەبارەی خۆیەوە، هەرچەند مەبەست بەم هێندە خۆی بێت، بەڵام ئەم تەعبیرە جیاوازەو رێك ترە لەگەڵ جێ‌و شوێنەکەدا لەوەی کە ناوی ببات، بێجگە لەوەش ناو نەبردنەکە بەهێزترەو رێزی زیاتری تیایە، چونکە وا نیشان ئەدات کە ئەو کەسەی کە ئەو پادەو پلە بەرزانەی هەیە ناسراوەو ناوبردنی ناوێ‌و خەڵکی ئەزانن کە حەزرەتی (محمد)ە(ﷺ)، چەند پایەکی تر هەیە لێرەدا کە مەبەست بەم هێندە پادەو پلەبەرزە (ئیبراهیم)ی خەلیلە، یا(ئیدریس)ە، یا ئەو پێنجەن کە پێیان ئەوترێ(أولوا العزم):(نوح، ئیبراهم، عیسا، موسا، محمد) یا هەر مەبەست(ئیبراهیم‌و محمد)ە ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ.

ئەم پایانە هەرچەند ئەگونجێن، بەڵام ڕیوایەتی(ئیبن‌و جەریر) لە(موجاهید)ەوە ئەیبڕێ بەسەر پێغەمبەرماندا(ﷺ)، هەرچۆنێ دیمەن‌و ڕواڵەتی شوێنەکەش وا نیشان ئەدات، هەروەها زۆربەو جەماوەر کەلەسەر ئەوەن‌و ئەو پایانە هەڵبژاردووە، نزیکەی بیست بەڵگەو دەلیل ئەهێنن لەسەری، کەواتە حەق وایە هەربەو جۆرە تەفسیر بکرێتەوە، چونکە پێویستە هەمیشە لەکاتی تەفسیری قورئاندا، بەهێزترین بارو بەهێزترین ڕا هەڵبژێرێت، بابزانرێ کە ئەگەر مەبەست بەم هێندە کەسێکی تربێت غەیری پێغەمبەریان(ﷺ) هیچ ئەوە نابێتە بەڵگەو پابەر لەسەر ئەوەی کە ئەو هەندە لە پێغەمبەرمان گەورەترو بەرزترە، چونکە بەرابەرو بەڵگەی بەهێز لەسەر پایە بەرزی پێغەمبەرمان ئەوەندە زۆرو ڕوون‌و ڕەوانە هیچ ماوە نادەن بۆئەوەی گومانی گەورەتری ببرێ بە هیچ کەسێکی تر.

بۆ دیاری کردنی ناشارەزا بەجوانی ئەزانم هەندێ لەو ڕابەرو بەڵگانە باس بکەم:

١- قورئان ئەفەرموێ: ڕەوانە کردن ئەم لەبەر ڕەحمەتو میهرەبانیە بە هەموو خەڵك. ئەم بەهرەو پلەیە تەنها بۆ ئەم بووە، کەواتە ئەبێ گەورەتر بێ لە هەمووان.

٢- ئەم ڕەوانە کراوە بۆ سەر هەموو ئادەمیو جنۆکە.

٣- شەریعەتەکەی ئەم بەشایەتی قورئان ڕێك ترو ڕاست ترین شەریعەتو گەورەترە لە هەموو شەریعەتەکانی تر، کەواتە ئەبێ خۆیشی گەورەتر بێ لە هەمووان.

٤- شەریعەتەکانی تری سڕیوەتەوەو جێگرو جێنشینی هەموویانە، وەك خۆیشی کراوە بە خاتەمو دواترین جێگرو جێنشینی هەموو پێغەمبەرو فروستادەکانی خوا ـ دروودیان لێ بێ ـ.

٥- ئوممەتەکەی بەشایەتی قورئان چاکترینی هەموو ئوممەتەکانە، چاکی ئەوانیش بە هۆی شوێن کەوتنو پەیڕەوی کردنی ئەمە، کەواتە ئەبێ خۆشی گەورەتر بێت لە هەموو.

٦- موعجیزەو ڕابەری پێغەمبەرێتیەکەی قورئانە کە گەورەترین موعجیزەی خوایەو بە نرخ ترو گەورەترین چاکەو بەهرەی خوایە بەسەر ئادەمیەوە.

٧- بەپێی چەند حەدیسو بڕیاری هەموو زانایان ئەم گەورەی هەموو مرۆڤە لە ڕۆژی دوایی دا، وە خاوەنی پادەو پلەی بەرزە لەو ڕۆژەدا تا ڕادەیەك کە هەموو کەس لە پێشووەکانو دواییەکان خۆزگەی پێ ئەخوازن، کەواتە ئەبێ لەم جیهانەشدا گەورەتربێت لە هەموو.

٨- بەپێی چەندحەدیسێکی صحیح هیچ کەس لەپێش ئەمەوەناچێتە بەهەشت، جێگەی لە بەهەشت بەرزترو پیرۆزترە، کەواتە ئەبێ گەورەتر بێت لە هەموو کەس.

بەم ئەندازەیەو بەم شێوە کورتە کۆتاییمان هێنا، چونکە ئەوپەڕی گەورەیی پێغەمبەرمان زۆرتر ئاشکرایەو لێکۆڵینەوەی زۆری ناوێ، هەرکەس لەم بارەیەوە هەرچی ئەڵێ مەبەستی دەرخستنی باری ڕاستیە بۆ نەزانو نەشارەزا، چونکە پێویستە بڕوای موسڵمانان بەم شتە ڕاستە ـ مەبەست ئەمەیە نەك خوا نەخواستە لایەنگیری ـ پلەی گەورەیی ئەم هیچ نەنگو ڕەخنەیەك ناگەیەنێ بە گەورەیی ئەوان.

ئینجا دێته سەرباسی دووەم پێغەمبەری دیاری کراو، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ﴾ بەخشیمان بە عیسای کوڕی مەریەم موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکان، وەك چاککردنەوەی کوێرو بەڵەك‌و زیندوو کردنەوەی مردوو، ئەوانەی تر کە لە قورئاندا باسی فەرموون. لە چەند شوێن لە قورئاندا کەناوی(عیسا) ئەبات کوڕیەتیەکەی بۆ مەریەم ئەمێنێ بە دوایدا، چونکە لەو کاتەدا کە ئەم ئاینەو قورئانە هات چەند بڕوای پڕووپووچ داهێنرابوو لەناو مەسیحیەکاندا سەبارەت بەو پێغەمبەرە(ﷺ) بە جۆرێ لە سنووری بەندەییو پێغەمبەرێتی بەرز کرابوویەوە بۆ سنووری خوایەتی، تا ئێستاش ئەو بڕواپڕوو پووچانە هەر ماون لەناویاندا، جابۆ بەرپەرچ دانەوەو دەم کوت کردنیان هەموو جارێ دڵنیایی ئەکات لەسەر ئادەمێتیو بەندەیی ئەو پێغەمبەرە، هەر چۆنێ بەر پەرچی جوولەکەکان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات ـ کە ڕادەو پلەی زۆر نزم ئەکەنەوە دەم درێژی دەربارە ئەکەن ـ بەوەی کە فەرمووی: موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکانمان پی بەخشی، وە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَيَّدْنَـٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾(عیسا)مان بەهێزکردو یارمەتیمان دا بە جوبرەئیل کە فریشتەی سروشە، بێگومان خوا یارمەتیو پشتگیری هەموو پێغەمبەرانی کردووە لە جوبرەئیل، بەڵام سەبارەت بە(عیسا) شێوەیەکی تایبەتی هەبووە، هەر لە یەکەم جاری پەیدا بوونیەوە هەتا دواییو بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان، لە یەکەم جاریەوە بە فوی ئەم کەوتە سکی دایکی، لەپاش لەدایك بوونی هەربە تەگبیرو ڕێنموونی ئەم، دایکی دڵئارام بوو، قسەی سەرکەوت بەسەر ئەوانەدا کە دوو دڵ بوون لە کاری هاتنە دنیای(عیسا)، پاشان هەمیشە لەگەڵ(عیسا)دا بوو، پارێزگاری لێ ئەکرد لە دوژمنەکانی، لە دواییدا خوا کردی بە هۆی ڕزگار کردنی لەدەست ئەو جوولەکانەی کە ویستیان لەناوی بەرن، کەواتە لەبەرئەوە ئەو پشتگیریەی تایبەتی کرد بە(عیسا)وە، ئەو پێغەمبەرانە بەو جۆرە بە موعجیزەو بەڵگەی ڕوونەوە ئاینو بەرنامە ڕاستەکەی خوایان ڕاگەیاند، دەی ئەبوایە ئوممەتەکانیان لە پاش ڕێگە ڕاستەکەیان بدایەتە بەرو بەبێ دووبەرەکی، کەچی بەو جۆرەیان نەکردو بەو جۆرە نەبوون، بەڵکو جەنگو کوشتار کەوتە نێوانیانەوە،

وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخۡتَلَفُواْ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ وَمِنۡهُم مَّن كَفَرَۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلُواْ

---

وەك دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِم﴾ ئەگەر خوا بیویستایە جەنگ‌و کوشتاریان نەئەکرد لە یەکتر ئەوانەی کە پەیدا بوون‌و شوێن ئەو پێغەمبەرانە کەوتن، واتە ئەگەر خوا بیویستایە ئوممەتەکانیان لەپاش ئەوان نەئەکەوتنە جەنگ‌و کوشتار کە ئەو جەنگ‌و کوشتارەش ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ لەپاش ئەوە بوو کە ئەو موعجیزەو بەڵگە ڕوونانەیان بۆ هات لەلایەن ئەو پێغەمبەرانەوە لەسەر ڕاستی ئەو ئاین‌و بەرنامەی کە ئەوان بەجێیان هێشت بۆ دوای خۆیان، کەواتە جەنگ کردن‌و لادانەکەیان زۆر نارەواو ناشایستە بوو، پێچەوانەی ژیری بوو، بەڵام خوا ویستی ئەو جەنگ‌و کوشتارە ببێ، چونکە ئەو ئوممەتانە لەناو خۆیاندا دووبەرە بوون، بەم ڕەنگە هەندێکیان ڕێی ڕاستیان دایە بەرو هەندێ تر لایان دا لە ئایینە ڕاستەکەی خواو لێی دەرچوون، دیارە ئەو حەلە ئەبێ جەنگ‌و کوشتن بەرپا ببێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنِ ٱخۡتَلَفُواْ﴾ بەڵام ئەو ئوممەتانە لەپاش پێغەمبەرەکانیان دووبەرەیەکیان تێ کەوت، ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ وَمِنۡهُم مَّن كَفَرَۚ﴾ بەم ڕەنگە هەندێکیان بڕوایان هێناو بەڕاستی پەیڕەوی پێغەمبەرەکانیان کرد، هەندێکیان بڕوایان نەهێناو لایاندا لەو ئایینەی کە ئەو پێغەمبەرانە بە جێیان هێشت بە هۆی ئەوەوە جەنگ‌و کوشتار بەرپا بوو، واتە خوا ئادەمی بەجۆرێ دروست کردووە کە خاوەنی مەیل‌و خواهیش‌و هەڵبژاردنە، بەپێی ئەو سروشتە تایبەتیەی کە خوا پێی دا ئەوانە بوون بە دوو بەرەوە، لەو دووبەرەکیەوە ئەو جەنگ‌و کوشتارە ڕووی دا، کەواتە ئەو جەنگ‌و کوشتارە دژو پێچەوانەی مەیل‌و خواهیشی خوا نەبوو، بەڵکو بە ویست‌و مەیلی خوا بوو، چونکە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ هیچ شتێ‌و هیچ ڕووداوێ بەبێ مەیل‌و خواهیشی ئەو ببێ لەم بوونەوەرەو لە هەردوو جیهاندا.

خوای پەروەردگار ویستی‌و ئەو ئادەمیەی بەجۆرێ دروست کرد کە دەست بدات بۆ ڕێنموونی‌و بۆ گومڕایی، بتوانێ کام بار هەڵبژێرێ‌و کام ڕێ بداتە بەر، کەواتە ئادەمی بە

خۆیو خواهیشو دەسەڵاتو هەموو شتێکیەوە لەناو مەیلو خواهیشی خوادایە بەپێی ویستو خواهیشی ئەوە، لە هەمان کاتدا هەرشتێکیش بکات بە مەیلو ئارەزووی خۆی ئەیکاتو هیچ ناچارنیە، کەواتە ئەگەر چاکەی کرد ئافەرینی بێتو خوا پاداشتی ئەداتەوە، ئەگەر خراپەشی کرد ئەوا خەتای خۆیەتیو شایستەی سزاو تۆڵە لێ سەندنە. ئینجا ئەم خوا ئەندامەکانی هەرچۆنێ جیاوازن لە دەنگو ڕەنگو دیمەنو ڕوواڵەتدا، هەروەها جیاوازن لە ئامادەییو لێهاتنیان، هەرکەسێك بۆ کارو پیشەیەك، واتە هرەچۆنێ هەموو کارو فەرمانەکانی جیهانو ژیان جیاوازو جۆربەجۆرن، هەروەها ئەندامەکانی ئادەمیش جیاوازو جۆربەجۆرن تا هەر جۆرێك لە ئادەمی هەڵسێ بە جۆرە کارو فەرمانێکی شایستەو شیاوی خۆی، بەو جۆرە کاروباری جێنشینیەکەی بەسەر ببات، بێگومان ئەگەر هەمووی بە یەك جۆر بوایە هەر بۆ یەك کارو فەرمان دەستیان ئەداو باقی کارەکانی تر پەکیان ئەکەوت ـ هەموو سوپاسێ بۆ خوای پاكو تەنیاـ.

ئەوانەی دووبەرەکیان کردو بەو جۆرە بوون بە دوو تاقم تا جەنگ بەرپا بوو، ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟﴾ لەگەڵ ئەوەش دا ئەگەر خوا بیویستایە ئەوانە نە جەنگیان ئەکردو نە خوێنی یەکتریان ئەڕشت، واتە خوا مەیلی ببوایە هەر لە یەکەم جارەوە بە جۆرێ دروستی ئەکردن کە دەستیان نەدایە بۆ دووبەرەکیو هەر لەسەر یەك بار بوونایە وەکو مەلائیکە، بەڵام لەبەرئەو حیکمەتەی کە دەست نیشانمان بۆ کرد، لەبەر هەر هۆیەکی تر کە خوا باش ئەزانێ، وای دروستکردن کە دەست بدەن بۆ دووبەرەکیو کە لەوەیشەوە جەنگو کوشتار ڕوویدا، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر خوا مەیلی ببوایە لەو دووبەرەکیەوە جەنگ بەرپا نەئەبوو، چونکە هەموو شت بە دەست خوایەو بە مەیلی ئەو ئەبێ، ئەوەتا خوا ویستی ئاگر بەجۆرێ دروست بکات کەشت بسوتێنێو بە مەیلی ئەو شت ئەسوتێنێو ئەگەر مەیلی نەبێ ناسوتێنێو پەکی ئەخات، هەروەکو لەبەسەرهاتەکەی حەزرەتی(ئیبراهیم)دا دیمان، هەروەها هەر شتێکی تریش، بەڵێ بڕوامان هەیە کە ئەگەر خوا بیویستایە لەو دووبەرەکیەی ئەوان جەنگو خوێن ڕشتن نەئەبوو،

وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خُلَّةٞ وَلَا شَفَٰعَةٞۗ

---

﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ بەڵام خوا هەرچی بوێت ئەیکات، خوا ویستی مرۆڤ بەم جۆرە جیاوازە تایبەتی یە دروست بکات، وە ویستی سەربەرستی بکاتو بتوانێ ڕێگە بۆ خۆی هەڵبژێرێ، ویستی هەرکام ڕێنموونی وەرنەگرێ لە خوا گومڕابێ، ویستی گومڕاو بێبڕوا بە جۆرێ بن کە بتوانن ستەمو دەست درێژی بکەن، ویستی بڕواو بێبڕوایی و بڕوادارو بێبڕوا جەنگ بکەنو بەیەکدا هەڵگژێن، ویستی بڕوادار تێکۆشانو فیداکاری بکات بۆ چەسپاندنی ئاینو فەرمانی خواو بەرگری کردنی بێبڕوایی و شەڕو خراپە لەدەست درێژی کردن، ئەمانەی ویستو بەو جۆرەشی کرد.

لەپاش دووبەرەکیو جەنگو کوشتار لەڕێی خوادا پاشان بە دوای ئەوەدا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ تێکۆشان بە بەخت کردنی ماڵو سامان لەڕێی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، ﴿أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم﴾ لەو ماڵو داراییەی کە پێمان داونو کردوومانە بە بەشتان هەندێکی بەخت بکەنو بیدەن لەڕێی خوادا، ئیتر مەبەست بەوە زەکات بێت وەك لە(حەسەن)ەوە ئەگێڕنەوە، بەڵگە لەسەرئەوە ئەو هەڕەشەیەکە دێت بەدوای دا، یان ئەویشو خێری تریش کە سونەتە وەك(ئیبنو جورەیجو بەڵخی) دەڵێنو ڕای زۆربەشی لەسەرە، یان مەبەست بەخت کردن بێت لە ڕێی جەنگو غەزادا وەك(ئەصەم) ئەفەرموێ، بەهەر حاڵ ئەو بەخت کردنی ماڵە لەم ڕۆژو جیهانەدا هەلو هەڵکەوتێکە بۆ بڕواداران کە خۆیانی پێ ڕزگارو سەربەرزبکەن لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەر فریای خۆیان نەکەون کارەکەیان لەدەست دەرئەچێ لەبەرئەوەی ئەفەرموێ: ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ﴾ لەپێش ئەوەی ڕۆژێك بێت ـ واتە: ڕۆژی دوایی ـ کە ﴿لَّا بَيۡعٞ فِيهِ﴾ نە فرۆشتنو کڕینی تیا هەیە ﴿وَلَا خُلَّةٞ﴾ وە نە دۆستایەتیو خۆشەویستی ﴿وَلَا شَفَٰعَةٞۗ﴾ نە تکا کردن، واتە ئەمڕۆ فریای خۆتان کەون پێش ئەوەی بکەونە ڕۆژی دوایی کە ئەوەی ئەمڕۆ لە دەستتان چووە

تازە لەوێ بە هیچ ڕەنگ بەسەر ناگێڕێتەوە بۆتان، چونکە لەوێ بازرگانیو کڕینو فرۆشتن نیە تا بەوە دەست کەوتتان ببێو خۆتانی پێ ڕزگار بکەن لەئاگر، دۆستایەتیو خۆشەویستی نیە تا بەهۆی ئەوەوە کۆمەکی بکرێن لەلایەن ئەو دۆستانەوە بەهەڵگرتنی تاوانتان یا بەخشینی چاکە پێتان، تکا کردن نیە تا بەهۆی ئەوەوە ناهەقتان بۆ بکرێ بەهەق یا هەقتان بۆ بکرێ بە ناهەق، وەك لەم جیهانەدا ئەوە ئەکرێ.

شتێکی ئاشکرایە کەلەو جیهان بازرگانیو کڕینو فرۆشتن نیە، کەواتە نەبوونی ئەوە هیچ جێی قسەو باس نیەو لێکۆڵینەوەی ناوێ، بەڵام نەبوونی خۆشەویستیو دۆستایەتی و تکا کردن کە بە ڕواڵەت لێرەدا نەبوونی هێناون بەدوای نەبوونی بازرگانی داو وەك یەك هەواڵی داوە بە نەبوونیان، نەبوونی ئەم دوانە جێی قسەو لێکۆڵینەوەیە، چونکە بەڵگەی زۆر بەهێز هەیە لەسەر بوونیان لە قورئانو حەدیسدا، کەواتە ئەبێ ئەو دژایەتیە ڕواڵەتیە نەهێڵین لە دەروون دا بەم جۆرەی خوارەوە:

١- نەبوونەکەیان تایبەتیە بە بێبڕوایانەوە، وەك قورئان بەدەمی خۆیانەوە ئەیگێڕێتەوە لە ڕۆژی دواییدا ئەڵێن: ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ * وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ تکاکارودۆستێکی دڵگەرممان نیە.

٢- نەبوونەکەیان لە هەندێ کات دایە، بەم ڕەنگە لە یەکەم جارەوە زۆر سەختو بەتینەو هیچ کەس نایپەرژێتە سەرکەس تا لە پاشا هۆشێك ئەکەنەوە، هەروەها لە پێشەوە هیچ کەس ناوێرێو ناتوانێ تکا بکات تا لە پاشا خوا ئیزنی پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەدات تکا ئەکاتو پاش ئەو قاپی تکا ئەکرێتەوە، بەڵام هەر تکایەکیش بکرێ هەر بۆ بڕوادار ئەکرێو بێبڕوا نائومێدو بەش بڕاوە لە هەموو خێرو خۆشیەك ـ خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات ـ آمین ـ لە چەند شوێنێکی تردا لەم مەسەلە دواین.

٣- مەبەست بە نەبوونی دۆستایەتی نەبوونی سوودو بەرهەمیەتی، واتە دۆستایەتیەك نیە کە سوودی ببێ، وە مەبەست لە نەبوونی تکا، نەبوونیەتی بەبێ ئیزن.

بەکورتی بەڵگە لەسەر بوونیان زۆرو بەهێزەو بە ڕوونی بوونیان وەرئەگیرێ لە قورئانو حەدیسەوە، کەواتە ئەبێ بەیەکێ لەم بارانە ئەو ئایەتو حەدیسانە ڕێكو پێكو دەستە مل بکرێن لەگەڵ ئەم ئایەتی ئێرەوونەی ئەمدا،چونکەنابێ لەواقیع دا دژایەتی ببێ لەم بەینەدا،

ئینجالەکۆتایی ئایەتەکەدائەفەرموێ:﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هەر بێبڕواکان ستەمکارن.
زانایانی تەفسیر چەند ڕایەکیان هەیە سەبارەت بە مەبستی ئەم ڕستەیەو هێنانی:

١- مەبەست بە ﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ بێبڕواییە بە خواو ئایینەکەی، لە ڕاستی دا ستەمکاری گەورەو ڕاستەقینە هەر ئەو بێبڕوایانەن، چونکە ستەم ئەکەن لە هەق و ڕاستی و دانی پیا نانێن، ستەم ئەکەن لە خۆیان بەم ڕەنگە ئەیخەنە ناو ئاگر، وەستەم ئەکەن لە خەڵکیش بەم ڕەنگە ئەبن بەهۆی گومرایی و لادانیان لەڕێی ڕاست و سەریان لێ تێك ئەدەن و بێبەشیان ئەکەن لەخێری خواو هەرشتێ کە مایەی ڕەزامەندی خوایە، دژی بەرنامەی خوان و بەرگری بەرنامەی بڕوا ئەکەن لەوەی ئەو بەرنامەیە لە ژیاندا دامەزرێ، وە بەرگری لەشەریعەتی خوا ئەکەن جێگیر ببێ لەناو گەل دا، ئینجا مەبەست لەهێنانی ئەم ڕستەیە لێرەدا هاندانی بڕوادارانە لەسەر بەخت کردنی ئەو ماڵ و سامانەی کە پێویستە بۆڕاگیر کردنی ئایینی خواو بەربەست کردن و لەناوبردنی هێزی بێبڕوایی و سەر شۆڕ کردنی بێبڕوایان کەلە هەموو دوژمنێ دوژمن ترن بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، وەلەهەمووستەمکارێ ستەمکارترن بۆیان، کەواتە لەسەر ئەم ڕایە مەبەست بەو بەخت کردنەی کەلە ئایەتەکەدا فەرمانی پێدا، بەخت کردنە لە ڕێی غەزادا.

٢- مەبەست ئەو بێبڕوایانەیە کە لەم ڕای یەکەمەدا باس کران، بەڵام هێنانی لەبەر دەست نیشانە بەوەی کە ئەو نەبوونی دۆستایەتی و تکایە هەر بۆ بێبڕوایانە، چونکە هەر ئەوانە ستەمکاری گەورەو ڕاستەقینەن، کەواتە مافی خۆیانە نە دۆست و نە تکا کاریان ببێ لەو ڕۆژە سەخت و سامناکەدا.

٣- هەر وەك ڕای یەکەم و دووەم مەبەست ئەو بێبڕوایانەیە، بەڵام هێنانی بۆ دەست نیشانە بەهۆی ڕزگار نەبوونیان لەسزا کەلە ئایەتەکەوە وەرئەگیرێ، واتە خوا بەوە

ستەمیان لێ ناکات، بەڵکو هەر ئەوان ستەمکارن کە بە ئارەزووی خۆیان ڕێی بێبڕواییان هەڵبژاردو دایانە بەر وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًاۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ بێبڕواکان هەر کردەوەیەکیان کردبێ لە ڕۆژی دوایی دا بەحازرو ئامادەیی دستیان ئەکەوێ، خوای تۆ ستەم ناکات لە هیچ کەس، کەواتە ئەوبێبڕوایانە هەر سزاو ئازارێك ئەدرێن مافی خۆیانە.

٤- هەر وەك ڕاکانی تر مەبەست بێبڕواکانە، بەڵام هێنانی بۆ دەست نیشانە بە هۆی بێبەشیان لەتکای تکا کاران، واتە تکا کردنیان بۆ نیە، بێبەش کردنیان لەوە ڕاستو ڕەوایە، چونکە ئەوان ستەمکار بوون لە جیهاندا کە بتەکانیان بە تکا کار دائەنا.

٥- مەبەست هەر بێبڕوایانە، بەڵام مەبەست لە ستەمکاران ئەوانەن کە هیچ نادەن لە ڕێی خوادا، واتە هەر بێبڕوایان هیچ نادەن لە ڕێی خوادا، کەواتە ئەی بڕوادارەکان ئێوە شت بدەنو هەندێ لەدارایی و ماڵتان بدەن لە ڕێی خوادا با وەك ئەوان نەبن.

٦- مەبەست زەکات نەدەرانە، واتە هەر زەکات نەدەرەکان ستەمکاری ڕاستەقینەن، ستەم لە خۆیان ئەکەن کە خۆیان دووچاری خەشمو نارەزایی خوا ئەکەن، ستەم ئەکەن لەماڵو داراییەکەیان کەلە جێی خۆی دا خەرجی ناکەنو بەکاری ناهێنن، ستەم ئەکەن لەوانەی کە زەکاتەکەیان پێ ئەدرێو تێیان دا بەخت ئەکرێ، ستەم ئەکەن لە خۆشویستنی ئەو ماڵو ساماندا کە باوی ئەدەن بەسەر فەرمانی خواو ڕەزامەندی خوادا، جا لەبەرئەوە تاوانو ستەمەکەیان ئەوەندە بە تینە بەبێبڕوا ناوی بردن، وەك لەباسی حەجدا حەج نەکەری بە بێبڕوا ناو برد، لەسەر ئەم ڕایە واتە بڕوادارەکان زەکات بدەن، چونکە هەر زەکات نەدەرەکان ستەمکاری ڕاستەقینەنو گەیشتوونەتە ئەوپەڕی لەستەم دا.

ئینجا بەبۆنەی باسی دووبەرەکی ئوممەتەکان‌و پێغەمبەرەکانەوەو دووچار بوونی زۆربەیان بەبێ‌بڕوایی‌و سەر لێ شێوان، بەو بۆنەوە ئایەتێ ئەمێنێ کە پێک هاتووە لە دە ڕستە هەر ڕستەیەك بنەڕەت‌و پایەیەکە لە بنەڕەت‌و پایەکانی بڕواو عەقیدە لە ئایینی خوادا. هەرکام یاساو دەستورێکی گەورەو گرنگ نیشان ئەدات لە یاساو دەستوورەکانی ئیسلام، جا لەبەرئەوە چەند حەدیس هاتووە لە شانی ئەم ئایەتەدا، یەکێ لەو حەدیسانە ئەمەیە کە(ئیمامی ئەحمەدو موسلیم)و چەند کەسێکی تر هێناویانە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: گەورەترین ئایەت لە قورئان دا(آية الكرسي)یە. ئەم ئایەتە بەفەڕە هەرکەس بە باشی وەریگرێ‌و بڕوای پێ‌بهێنێ هەرگیز دووچاری هەڵەکردن نابێ لەبارەی بڕوا بە خواو بە تاك‌و تەنیایی خوا، کەواتە بە یارمەتی خوا با باش گوێ بۆ شل کەین‌و دڵمانی بوو بکەینەوە، بەڵکو هەندێ لە پیت‌و فەڕو ڕووناکیەکەی بڕژێ بەسەر دڵ‌و دەروون‌و هەستماندا، ئەفەرموێ: ﴿اَللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوایە کە ناوی ﴿اَللَّهُ﴾ یە هیچ پەرستراوێکی تر نیە بەڕاستی‌و هیچ شتێك شیاوو شایانی پەرستن نیە بێجگە لەو.

بەم یەکەم ڕستەیە کە تاك‌و تەنیایی خوا ئەگەیەنێ، ئەدا لە هەرچی بیرو باوەڕی پڕو پووچ‌و هەر لادانێك کە هات بەسەر عەقیدەو بڕوای ئادەمی دا لە کۆن‌و لە تازەوە، هەرکەس ئەم ڕستەیە لەدڵی دا جێگیربێ‌و مەبەست پێی وەرگری ئەو کەسە ئەکەوێتە سەر ڕێ‌و ڕەوڕەوەی ڕاست‌و ڕاستی.

بڕوا بە تاك‌و تەنیایی خوا بنەڕەتێکە کە هەموو بۆ چوونێکی ئیسلامی لەسەر ڕاگیر کراوە، بەو بڕوایەوە هەڵئەقوڵێ بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ئیسلامی بۆ ژیان، چونکە ئەو بڕوایە لە هەر دڵێکدا دامەزرا ئەو دڵە تەنها ڕوو ئەکاتە خوا بە بەندەیی‌و پەرستن، ئەو حەلە هەر بەندەی خوا ئەبێت‌و هەر خوا ئەپەرستێ، مل کەچی‌و گوێڕایەڵی تەنها بۆ خوا ئەکات، حاکمێتی‌و کاربەدەستی هەر بۆ خوا ڕەوا ئەدا، تەنها شەریعەتی خوا ئەکات بە تەرازوو هەر بەو بەراورد ئەکات‌و هەموو شتێ هەڵئەسەنگێنێ.

بڕوا به تەنیایی خوا بەو جۆره گرنگه لای خواو بنەڕەته بۆ هەموو چاکەو پیت‌و فەڕێك، جا لەبەرئەوه ئەبینین قورئان ئەوەنده به گرنگ گرتوویەتی، ئەوەتا له چەرخی مەککەدا به شێوەی گشتی هەر خەریکی داڕشتنی ئەم بڕوایه بوو، بەوه وازی نەهێنا بەڵکو له چەرخی مەدینەشدا هەرچۆن بۆی هەڵکەوێ دێتەوه سەر ئەم بڕواو باسه بەبۆنەی شتێکەوه، ڕستەی دووەم: ﴿ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ﴾ ئەو خوایه زیندووه بەبێ سەرەتاو دوایی هاتن، واته نەبوونی نەبووەو نەمانیشی بۆ نیه، کەواته زیندوویەکەی له غەیری خۆی دەست کەوتی نەبووه، لەڕاستی دا هەر خوا زیندووه، مەبەست له زیندوویی خوا سیفەتێکی تایبەتی بێ وێنەیه بۆ خوا که ڕووته له هەموو نیشانەو دروشمێکی زیندووی تر، چونکه خوا خۆی شتەکەی بڕیوەتەوه که ئەفەرموێ: ﴿لَیۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَیۡءࣱۖ﴾ هیچ شتێ نموونەو وێنەی خوا نیه، نەلەزات‌و نەله سیفات‌و نەله کردارو کردەوەی دا وێنەی نیه، کەواته نابێ هیچ کەس شتێکی تر بڵێ دەربارەی ئەم سیفەتەو هەرکام له سیفەتەکانی تری، بەشێ ئەمەش ئەڵێن که ئەم سیفەته سەرچاوەیه بۆ زانین‌و دەسەلات‌و سیفەتەکانی تری، ئیتر زیاد لەمەی که گوتمان لەسنوورو چوارچێوەی زانین‌و ژیریی ئێمەدا نیه، هەرکەسێك ژیر بێت هەرگیز سەرناکاتەوه لەمەی که گوتمان، چونکه ئێمه زانین‌و ژیریمان کول‌و کۆڵه له ناسینی حەقیقەتی ڕۆح‌و ئەو هەموو هێزو وزەی که هەمانەو بەس ئەزانین هەن‌و هیچی تر، دەی چۆن ئەبێ به تەما بین تێبگەین له خواو ئەو شتانەی که سیفەتی خوان؟! ﴿ٱلۡقَیُّومُ﴾ هەمیشه ڕاگرو تەگبیر کەری هەموو دروست کراوەکانیەتی به گیاندارو بێگیانیانەوه، له هەموو بارو ڕوویەکیانەوه، وه خۆی بەخۆی ڕاگیره، هەرکەسێك ئەم بڕوایه لەدڵی دا جێگیر ببێ ئەو کەسه له ڕووی نایەو شەرم ئەکات لەوەی بێجگه له بەرنامەی خوا هیچ بەنارمەیەکی تر بگرێته گەردن، ئەو خوایەی که ئیسلام بانگمان ئەکات بۆلای‌و ئەیناسێنێ پێمان خوایەکی ئاوایه، نەك ئەوەیه که گەورەترین فەیلەسوف نیشانمان ئەدات ـ واته ئەرستۆ ـ که ئەڵێ: خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کرد، بەڵام خوا بەرزو بڵنده لەوەی بیربکاتەوه لەدروست کراوەکانی، بەڵکو هەمیشه خەریکی خۆیەتی‌و بیر له خۆی ئەکاتەوه.

ڕستەی سێیەم: ﴿لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ﴾ ئەو خوایە نە وەنەوز ئەیگرێ‌و نە خەو، بەم ڕستەیە دڵنیایی ئەکات لەسەر سیفەتی پێشوو، چونکە هەرگیز وەنەوزو خەو ناگونجێن لەگەڵ ئەو ڕاگیرکردن‌و تەگبیرە هەمیشەییەی خوادا کە هەیەتی بۆ دروست کراوەکانی، ئەگەر چرکەیەك خەو بیگرێ ئەم بوونەوەرە تێك ئەچێت، پێش خستنی وەنەوز لە خەو بەپێی باری سروشتی خۆیانە کە وەنەوز لە پێشەوە پەیدا ئەبێ، ئینجا ئەبێ بە خەو، یان لەبەر ڕێك بوونی پیتی دوایی ئەم ڕستەیە لەگەڵ پیتی دوایی ڕستەی پێشوو ـ واتە لەبەر سەجع ـ کە ئەم ڕێکیە بە پێی زانستی ڕەوانبێژی مەبەستێکی گرنگە، یان مەبەست لە گرتنی وەنەوزو خەو زاڵبوون‌و داگیر کردنیانە بە ناچاری، بێ‌گومان خەو بەهێز ترو زاڵترە، کەواتە ئەو حەلە وا ڕێك ترە لە وەنەوزەوە کە سوك‌و بێ‌هێزە بەرز ببێتەوە بۆ خەو کە قورس‌و بەهێزە، لە پاش ئەم دڵنیا کردنە باشتر ئەتوانین بیربکەینەوە لەو چاودێری‌و ڕاگرتن‌و تەگبیرە هەمیشەییەی خوا بۆ ئەم بوونەوەرە پان‌و فراوانە، هەر لەسێڵ‌و خانەکانیەوە تا گەورەترین بەش‌و پارچەی!! وەرەنەی بەندەی خوا بە پێی توانات خەیاڵ بهاوێژەو بیربکەرەوە لەم بوونەوەرە گەورەیە بە هەموو بەش‌و پارچەکانیەوە، بە هەموو ئە تۆم سێڵەکانیەوە، بە هەموو ڕووداوو بەسەرهاتەکانیەوە کە خوای گەورە هەمیشە چاودێرو ڕاگرو تەگبیرکەریەتی، بیربکەرەوەو بە هەموو سۆزو پەرۆشیەوە سوژدە بەرە بۆ خوای ﴿ٱلۡقَيُّومُۚ﴾. سوژدە بەرە بە لەش‌و ڕۆح‌و دڵ‌و ژیریی‌و بە هەست‌و هەموو هێزو وزەکانتەوە.

ڕستەی چوارەم: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ هەر بۆ خوایەو هینی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا لە گیانداروو بێ‌گیان، بەڵێ خوای تەنیا کە هەر ئەو زیندووی ڕاستەقینەیەو هەر ئەو ڕاگیرو تەگبیرکارە، ئەبێ هەر ئەو خاوەنی هەموو شتێك بێ بەبێ هاوبەش‌و بەبێ قەیدو شەرت، بڕوا بەم ڕستەیەو جێگیر بوونی لەدڵدا زۆر گرنگ‌و بەکارە بۆ دوور خستنەوەی هەر هاوبەشی‌و بەشداریەك کە ڕووئەکاتە دەروون بەهۆی ئەم خاوەنی‌و موڵکایەتیەی کە دراوە بە بەندە، هەرکات بڕوا بەم ڕستەیە لە دەروونی بەندەدا دامەزرا، ئەو حەلە تێ‌ئەگات‌و ئەزانێ کە ئەم موڵکایەتی‌و خاوەنێتی خۆیە شتێکی ڕواڵەتیەو لە ڕووی ڕاستیدا هینی خۆی نیەو نابێ بە چاوی موڵکایەتی خۆی سەیری بکات، بەڵکو هینی

خوایەو بەسپاردە داویەتی بە دەستی ئەمو کردوویەتی بە جێنشین تێیدا، ئەم سپاردەو جێنشینە بەشێکە لە سپاردەو جێنشینیەکەی یەکەم جار کە درا بە باوکی هەمووان ـ ئادەم ـ هەرکاتێ ئەو هۆش و هەستەی بۆ پەیدا بوو بیریەکاتەوە کە خوا هەر لە یەکەم جارەوە مەرجی دانا لەسەر ئادەم و رۆڵەکانی لەو سپاردەو جێنشینیەدا، مەرجەکەش ئەوەبوو کەلە سەرەتای ئەم سورەتەوە دەست نیشانی بۆ کرد کە ئەبێ بەپێی ئایین و رێنموونی و بەرنامەی خوا بجوڵێنەوەو رەفتاربکەن، کەواتە هەر کردەوەو جم و جوڵ و دەست کاریەك بکات لەم سپاردەیەدا بەپێی مەرجی خاوەنەکەی نەبێ هەمووی ناڕەواو بەتاڵە، ئەبێ لەلایەن بڕوادارانەوە بەرگری بکرێ لەو کردەوەو دەست کاریانە کە دژو پێچەوانەی فەرمان و ئایینی خوان... پێویستە بڕواداران بەو جۆرە تێبگەن لە یاساکانی ئیسلام و لە ئایەتەکانی قورئان، بەو جۆرە وەریان گرن و بچن بە پێشوازیانەوە، بەو جۆرە بەکاریان بێنن و رەفتاریان پێبکەن لە ژیاندا، ئەو حەلە تەنیا رستەیەکی وەك ئەم رستە کورتە ئەبێ بە یاسایەك لە یاساکانی دەستووری ژیان و بڕوادار بەپێی ئەوە رەفتار ئەکات، ئەوکاتە بەرو بەرهەمی قورئان وەرئەگرێ و بەشدار ئەبێ تێیدا.

هەربڕوادارێك ئەم رستەیەلەدڵیداجێگیربوو، بەم رەنگەهەمیشەهەستی کردبەوەکە خۆی و هەرچی والەژێردەستیداو هەرچی پەیوەندی بەمەوە هەیە هەمووی هی خوایەو ئەم خاوەنی خۆشی نیە چ جای شەکانی تر، هەمیشە لەسەر هۆش بێت کە خۆی و ئەمانەی لەپێش ماوەیەکی دیاری کراو ئەبێ بگەرێنەوە بۆلای خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیان، هەر بڕوادارێك ئەم هەست و هۆشەی وەرگرت لەم رستەیە، تەنیا ئەمەی بەسەر بۆ ئەوەی ڕادەی چرووکی و چاوبرسێتی و حیرس و تەماعی کەم بێتەوە، ئەیگێڕێتەوە لە هەڵپەو شەڕە گرنگ، ئارامی و رەزامەندی ئەخاتە دڵیەوە بە هەر ئەندازەیەك کە خوا پێی داوە، دەست و دڵ گوشادی ئەکات لەحاستی هەژاران و پەك کەوتوان، وە داخ و مەراق ناخوات لەسەر ئەوەی کەلە دەستی دەرئەچێ و نامێنێ، لەکاتی بوون و دەست رۆشتندا زۆر مل کەچ و چاولەبەر ترە بۆ خوا.

رستەی پێنجەم: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ ئایا کێیە ئەو کەسەی کە بێ تکا بکات خوا مەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا، واتە گەورەیی و سامناکی خوا لە ڕادەیەکدایە لە رۆژی دوایی دا هیچ کەس ناتوانێ دەم بکاتەوە بە تکا کردن بۆ هیچ کەس، بە هیچ رەنگ شتی وانابێ و ناگونجێ، مەگەر خوا خۆی ئیزن بدات.

یەکەم کەسێك کە ئیزن ئەدرێت پێغەمبەرمانە(ﷺ) وەك لە چەند حەدیسی صحیح و بەهێزدا هاتووە، ئەو بەهرەو پایەو پلە بەرزەی کە ئاواتی بۆ ئەخوازرێ و سوپاس ئەکرێ لە لایەن هەمووانەوە، ئەو بەهرەی تکا کردنەیە کە خوا پێی ئەبەخشێ و لێی وەرئەگرێ، بە هۆی ئەو تکایە وە قاپی تکا ئەکرێتەوە لە هەرکەسێکە تریش کە شیاوو شایستە بێت و خوا ئیزن بدات، خوا بە میهرەبانی خۆی بێ بەشمان نەکات و بمانخاتە بەر تکای پێغەمبەر(ﷺ).

بەڕاستی ئەم سیفەتەی کە ئەم ڕستەیە نیشانی ئەدات زۆر گرنگ و پڕ سوودە، چونکە بەجوانی پلەی خوایەتی ڕوون و جیائەکاتەوەو ڕێگە نادات کە بە هیچ کلۆجێ ڕادەی بەندایەتی بەرزبکرێتەوە بۆ سنووری خوایەتی، بەڵکو لە سنووری خۆی دا ڕاگیری ئەکات و ئەیوەستێنێ، ئەوەتا هەموو کەس بەگشتی و بەتێکڕایی ئەوەستێنێ لەبەردەم بارەگای خوادا بە مل کەچی و ترس و لەرزەوە، بەجۆرێ هیچ کەس ناتوانێ دەم بدرێتەوە بە تکا کردنیش بە ئیزن و فەرمانی خوا نەبێ، ناتوانێ تکا بکات چ جای ئەوە دەست بخاتە هیچ کارێکی خوا یا هیچ شتێکی بەدەست بێت، کەواتە ئەم ڕستەیە هەر چۆنێ ئەدات لە بیرو باوەڕی پڕپووچ بت پەرستەکان و نامەدارەکان کەلە ئایینی خوا لایان داو لافی کوڕێتی و خزمایەتیان دا بۆ هەندێ لە پێغەمبەران و بەندەکانی خوا، هەرواش ئەدات لە هەر زیادە ڕەوی و لادانێك کە کەوتە ناو موسڵمانانەوە بە تایبەتی بەناوی تەریقەوە کە تەریقە لە بنەڕەتدا شتێکی ڕەواو پێویستە بۆ هەموو موسڵمانێك و هاتووە بۆ ئەوەی پارێزگاری بڕوا بە تاك و تەنیایی خوا بکات و خەڵکی فێری خواناسی بکات و پەروەردەی بکات لەسەر گوێڕایەڵی پەیڕەوی ڕەوڕەوەی قورئان و ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر(ﷺ) کەواتە خواناس و پیاوە هەڵکەوتووەکانی تەریقەت کارو ئیشیان هەر ئەوەیە کە موسڵمانان فێری خواناسی بکەن و پەروەردەیان بکەن لەسەر بەرنامەی قورئان و پەیڕەوی پێغەمبەریان فێربکەن، ئیتر بێجگە لەوە هیچی تریان بەدەست نیە، بەڵێ لەجیهاندا هاوڕێیەتیان پیت و فەڕی تیایەو تکاو نزایان بە ئیزنی خوا سوود بەخشە، لە ڕۆژی دوایشدا تکایان پاش ئیزنی خوایە، ئیتر زیاد لەمە هەرچی وتراوەو بگوترێ زیادە ڕەویەو لە ئیسلامەوە نەهاتووەو لە ئیسلامەوە وەرنەگیراوە، هەر ئەمەی کە گوتمان لەگەڵ قورئان و حەدیس و فەرموودەی زاناو خواناس و پیاوە هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتەدا ئەگونجێ.

يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾

---

ڕستەی شەشەم: ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ﴾ ئەوا خوایە ئەزانێ و ئاگایە بە هەموو کاروباری جیهانی هەرچی والەئاسمانەکان وزەویدا، وە بە هەموو کاروباری ڕۆژی دواییان.

مەبەست لەم ڕستەیە نیشاندانی گشتێتی زانینی خوایە بۆ هەموو شتێ، چ ڕابردووو چ ئێستا و چ داهاتوو، چ ئاشکراو چ هەست پێکراوو هەست پێنەکراو، چ ئەوەی بەندەکانی ئەیزانن، چ ئەوەی نایزانن، بەندەئەبێ ئاوا خوای خۆی بناسێ، وە ئەبێ بڕوای ببێ بەو زانینە گشتیەو هەمیشەییەی خوای خۆی، بێگومان ئەو ناسین و زانینە شەرم و سام و دڵە لەرزەیەك ئەخاتە دەروونی بڕوادارەوە، هۆش وریاییەکی تیا دروست ئەکات کە بەرگری بکات لەوەی سەر بکاتە تاوان و خراپەکاری، ئەو ناسین و بڕوایە بەو جۆرە پێویست و گرنگ و بەکارە بێجگە لەوەی کە پێویستە خوا بناسرێ و بڕوا ببێ پێی بە جۆرو شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا کە خۆی دایناوە بێجگە لەو بارو شێوەیە نەناسینەو نەبڕوا.

خوای پەروەردگار بەو جۆرە زانا و ئاگایە بە هەموو شتە دروستکراوەکانی بەڵام زانین و ئاگاداری ئەمان بەم جۆرەیە کە لەم ڕستەی حەوتەم دا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ﴾ ئەمان زانا و ئاگا نین بە هیچ شتێ لەزانراوی ئەو مەگەر بە شتێ کە ئەو ویستبێتی و مەیلی بووبێ.

بەڕاستی ئەم ڕستەیەش زۆر جێگەی بیرکردنەوەیە، بەتایبەتی لەم چەرخانەی دواییدا کە خوای گەورە گەلێ زانینی نایابی سەرسوڕهێنەری دەرخست و بەندەکانی پێ ئاگادار کرد، بەهۆی ئەو زانینانەوە گەلێ کەس خۆی لێ گۆڕا، پێویستە بیرکردنەوە لەم ڕستەیە تا ئەوەی کە ژیرو بڕوادارە باشتر بڕوای بەهێز ببێ و زیاتر چاو لەبەری خوا ببێ کە بەهرەمەندی کردووە بە هەر زانینێ کە هەیەتی، ئەوەش کە نەفام و لە خۆ گۆڕاوە بگەڕێتەوەو سەری بەندەیی شۆڕبکات، بابیر بکاتەوە تا بێتەوە هۆش کە هەرچی ئەزانێ خوا

فێری کردووە، هەر هیچ نەبێ بیریکاتەوە کە ئەم لە پێشەوە هیچی نەزانیوەو خوا زانینو ڕێی زانینی نیشان داوە، بیرکردنەوە لەم ڕستەیەو لە ڕستەی پێشوو ڕادەی بەندە دیاری ئەکاتو پلەی بەرزو بڵندی بێسنووری خوا نیشان ئەداتو باشی تێئەگات، لەوەی کە هەموو دروست کراوەکانی خوا بەشێکی کەم لە زانینیان پێدراوە، هەڵئەگرێ مەبەست بەم زانراوی خوایە لێرەدا زانراوە تایبەتیەکانێتی کە شاراوەو غەیبەکانە کە تایبەتێ بە خواوەو کەمێك لەوانە بە سروش ئەنێرێ بۆ پێغەمبەرەکانی ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ، وەك لە کۆتایی سورەتی ﴿الجن﴾دا دەست نیشانی بۆ ئەکات.

ڕستەی هەشتەم: ئەوپەڕی دەسەلاتو گەورەیی نیشان ئەداتو دڵنیایی ئەکات لەسەر زانینی زۆرو فراوانی، ئەفەرموێ: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ تەختو کورسی خوا فراوانی هەیە بۆ ئاسمانەکانو زەویو هەمووی ئەگرێتەوەو دەوری داون. زانایان لێرەدا ئەبن بەدوو تاقم:

١- مەبەست لە کورسی دروست کراوێکی گەورەی خوایە کە دەوری هەموو ئاسمانەکانو زەوی داوە، ئیتر ئەو دروست کراوە جیاواز بێت لە عەرش وەك زۆربەی ئەم تاقمە ئەفەرموونو چەند ڕیوایەتێکی لەسەر ئەهێننەوە، یان هەر مەبەست عەرش بێت وەك هەندێکیانی لەسەرە لەگەڵ ڕیوایەتێکدا.

٢- مەبەست چیرۆکەو ڕواڵەتەکە مەبەست نیە، ئەم تاقمەش سێ جۆرو شێوەیان باس کردووە:

أ- چیرۆکە بۆ دەسەلاتو توانینو پاشایەتی.

ب- چیرۆکە بۆ فراوانی زانینو ئاگاداری.

ت- چیرۆکە بۆ گەورەیی.

ئەم سێ ڕایە هەر چەند ئەگونجێن، بەلام ئایا بۆچی بەبێ هۆیەکی بەهێزو پاڵدەرێك لە دیمەنو ڕواڵەتەکە لابدەین لەگەڵ ئەوەدا ڕیوایەتیش ببێ لە چەند ڕێگەیەکەوە؟ ئایا کە خوا دروستکراوی وەك زەویو ئاسمانەکانی هەیە چ بەرگری کەرێك هەیە بۆ ئەوەی دروست کراوی تریشی ببێ بەناوی کورسیو هەرشەوە کە فراوانیان ببێ بۆ هەموو زەویو

ئاسمانەکان؟ ئەگەر بەرگری کەر ئەوەبێت کە وشەی کورسی و عەرش وێنەو لەش و قەبارە نیشان ئەدەن بۆ خواو ئەیخەنە خەیاڵی خەڵکیەوە، وە هیچ نیەو گوێی پێ نادرێ وەك ئەو گشت وتەو وشانە کە ناو ئەبرێن بە(متشابە)و هەموویان بە جۆرێك ئەگیرێن کە رێك بێت لەگەڵ پاکی و بێ وێنەیی خوادا کە ئەوەش مەزهەب و رای یەکەمی ئەم ئوممەتەیە پێش پەیدا بوونی ئەهلی بیدعەتەکان لەناو ئوممەتەدا، ئینجا ئەو مەبەستانەی کە بە شێوەی چیرۆك ئەگەیەنرێن رواڵەتەکەو رای یەکەمیش ئەیان گەیەنێ، چونکە خوایەك کە دورستکراوی ئاوای ببێ ئەبێ دەسەڵات و توانین و پاشایەتی و زانین و گەورەیی بێ سنووری هەبێ، کەواتە با هەر بە شێوەی رای یەکەم تەفسیری بکەینەوە لەگەڵ دوور خستنەوەی هەموو جۆرە نیشانەو دروشمی وێنە بۆ خوای تاك و تەنیا، وە بەکارهێنانی ئەوپەری پاکی و خاوێنی بۆی.

ڕستەی نۆیەم: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ﴾ ئاگاداری کردن و پارێزگاری ئاسمانەکان و زەوی خوا ماندوو ناکات و ئەرك و زەحمەتی نیە بۆی، چونکە هەرشتێ کە خوا بیکات هەر ئەوەی ئەوێ کە ئیرادەو مەیلی ڕووی تێبکات، ئیتر بەبێ تەقەرەو دواکەوتن ئەو شتە ئەبێ.

ڕستەی دەیەم: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ هەر ئەو خوایە پلەو پایە گەورەیە، بڵندە لەوەی کە هیچ وێنەو هاوسەرو دژو ڕێکرێك و هیچ نیشانەو دروشمی کەم و کوڕی و ناتەواویی ببێ، هەر ئەو گەورەیە کە هەرچی شتی تر هەیە لە ئاستی ئەودا بچوکەو بێ نرخەو هیچ نادات، ئەم ئایەتە بەڕێزە مافی خۆیەتی ئەوەندە بەناو بانگەو بە گرنگ گیراوە، لە شانی دا ئەو هەموو حەدیسە هاتووە، چونکە خوا ئەناسێنێ بە بەندەکانی، چەند بیرو باوەڕی سەرەکی و بنەڕەتی ئایینی ئیسلامی لێ وەرئەگیرێ، وە چەند لە سیفەتە گەورەکانی خوای تیایە: خوایەتی، تەنیایی، زیندوویی، ڕاگری بۆ هەموو شتێ، زانین، ئاگاداری، پاشایەتی، دەسەڵات، مەیل، ئیرادە. هەرکەس ئەو ئایەتە لەدڵی دا جێگیر ببێ و نەخشە ببەستێ ئەبێ بە بەندەی ڕاستەقینە بۆ خوای خۆی و لە ڕووی نایەو زاتی نابێ سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا، هەمیشە گوێڕایەڵی ئایین و شەریعەتی خوا ئەبێت.

لەپاش ئەوەی بڕوا بە خوای بەو جۆرە ئایابە ڕوون کردەوە لەم ئایەتەدا، شێوەی پەیوەندی دروستکراوەکانی خوای بە خوای خۆیانەوە ئاشکراکرد... ئینجا ڕێگەی بڕواداران دیاریی ئەکات لە کاتێکدا کە ئەم عەقیدەو ئایینە هەڵئەگرن و ڕای ئەگەیەنن و بانگی خەڵکی بۆ ئەکەن، ئەیانەوێ هەڵسن بە پێویستی سەرکردایەتی خەڵك و جیهان، ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ بە هیچ ڕەنگ زۆر پێهێنان نیە لە ئاییندا، واتە نابێ هیچ کەس بەزۆر موسڵمان بکرێ، چونکە بڕوا کە بناغەی ئایینە بریتیە لە وەرگرتنی دڵ و ڕەزامەندی دڵ بەو ئایینە بەبێ گومان ودوودڵی، ئەوەش بەزۆرپەیدانابێ لەدڵدا، بەڵکوڕێگەی پەیداکردنی لێکۆڵینەوەو وتووێژو بەڵگە هێنانەوەیە، وەك قورئان لە چەند شوێندا دەست نیشانی بۆ ئەکات.

ئەم ئایینەی کە پێغەمبەرمان(ﷺ) ژیریی و بیرو تێگەیشتنە لەگەڵ ژیریی و دەروون و ویژدان و سروشت ئەدوێ، بیروباوەڕی ڕوون و ڕەوان و شتی ڕاست و ڕەواو بێگرێ ئەخاتە بەرچاو، هەرکەس تێگەیشتنی ببێ، بەبێ گومان و دوو دڵی وەری ئەگرێ، وە هەرکەس نەفام و نەزان و گێل بێت لێی ئەگەڕێ و دەین و هەواڵی ئەخاتە ئەستۆی خۆی، جا لەبەرئەوە موعجیزەی پێغەمبەرێتی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) شتێکی مادی نەبوو وەك موعجیزەی پێغەمبەرەکانی تر کە بەبێ بیرکردنەوە خەڵکیان ناچار ئەکرد کە کوێرانە شوێنیان کەون و مل کەچ بکەن، دەی لەجێیەك کە بەرەنگاری هەست نەوەستا بەو جۆرە موعجیزانەو ناچاری نەکرد بە مل کەچ کردن، باشتر بەرەنگاری ناوەستێ بە شیرو تیر، یا بەبرسی کردن و ڕێی ژیان لێ بڕین تا ناچاری بکات بە مل کەچ کردن، وەك باو بووە لە هەموو دەورو چەرخی نەفامی و بت پەرستەکان دا، وە لەچەرخی ئایینە لادراوەکاندا کە دواتری هەموویان مەسیحێتی بوو کەلە پێش هاتنی ئیسلامدا لە چەرخی پادشای قوستەنتین دا هەموو جۆرە زۆرو سزایەکی بەکارهێنا بەو شێوە مەسیحێتی چەسپاند، وەك لە پێش ئەوەوە دەوڵەتی ڕۆمانیەکان ئەو جۆرە سزاو ئازارەیان بەکارئەهێنا دەربارەی ئەو هەژارانەی کەبە دڵنیایی و پێخۆش بوونی خۆیان ئایینی(عیسا)یان گرتبووە گەردن، ئینجا لەپاش ئیسلامیش مێژووی هەموو جیهان شایەتەکە گاورەکان لە ئیسپانیاو ڕۆژئاوای وڵاتی ئیسلام دا چیان کرد بە موسڵمانان، ناچاریان ئەکردن بە وەرگرتنی مەسیحێتی و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، بە کوشتن یا دەرکردن لە وڵات و داگیرکردنی ماڵ و سامانیان! بەڕاستی هەر ئەو کردەوە ڕەش و پسەی کە لەپاش خۆیان بە جێماو هەر مایەوەو درێژەی کێشا بۆ ناو هەموو دەوڵەتەکانی جیهان،

تا ئێستاش کە بووە بەباو هەر میری و زۆردارێك بیروباوەڕی خۆی ئەچەسپێنێ بە زۆری ئاگرو ئاسن و هەموو هۆیەکی تری سزاو ئازاردان!! بەڵام ئیسلام ئەو ئیسلامەیە کە لەو وڵاتە پان و پۆڕەکەی دا ئەو هەموو گاورو جوولەکەو مەجوس و خاوەن بیروباوەڕەکانی تر هەبوو، کەچی ڕۆژێ لە ڕۆژان زۆر نەکرا لە هیچ کەسێك و بە زۆر موسڵمان نەکرا، مێژووی ڕاستی خۆیان شایەتە لەسەرئەوە، گەلێ لە مێژوونووس و زانای ڕاست و بە ویژدانیان شایەتی ئەوەن کە ئەو سەربەستی و ئازادیەی کە دەست کەوتیان بووە لە ژێر سێبەری ئیسلام دا هیچ کاتێ نەیان دیوە لە ژێر سێبەری دەوڵەتی خۆشیاندا، هەر مانەوەی ئەو ئایینانە لەوڵاتی ئیسلام دا لەکاتی ئەوپەڕی زۆرو دەسەڵاتی موسڵماناندا گەورەترین شایەتە لەسەرئەوەی کە گوتمان، لە هەموو ست سەیر تر ئەمەیە کە تەنیا بەندەیەکی مەجوسی غەریب لە مەدینەدا ئەژیا بە هەموو سەربەستیەکەوە لە چەرخی خەلیفەی دووەمدا ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ کە زەوی لەبەری ئەلەرزی ئەو بەندە پیسە هەڕەشەی کرد لەو خەلیفەیەو بە هەڕەشەکەیشی زانی و هیچیشی لێ نەکردو بە سەربەستی مایەوە تا هەڕەشەکەشی بەدی هێنا، ئەوە بوو لەکاتی نوێژی بەیانی دا بە حەنجەرێکی دوو دەمەوە خۆی کرد بەناو کۆمەڵی نوێژکەرەکاندا چواردە کەسی کوشت تا گەیشتە خەلیفەو شەهیدی کرد، بەڕاستی تەنها ئەم ڕووداوە بەسەو ڕووی ئەو دوژمن و نەفامانەو گەوجانە ڕەش ئەکات و تۆپەڵێ قوڕ ئەخاتە دەمیان کە ئەڵێن: ئیسلام بەزۆری شیرو تیر بڵاو بووەتەوە.

ئیسلام کەس بەزۆر موسڵمان ناکات لە هەمان کاتدا غەزاو جەنگی پێویست کردووە بۆ پاراستنی ئایینەکەی خوا کە سەراسەر خێرو خۆشیە بۆ هەموو کەس، پێویستی کردووە لەبەرئەوەی ڕێ نەگیرێ لە هەڵگرانی و ئەوانەی کە ئیسلام نیشان ئەدەن و ڕوونی ئەکەنەوە و خەڵکی بۆ بانگ ئەکەن، پێویستی کردووە بۆ ڕاگیر کردن و پاراستنی ڕژێمی ئیسلام کە تەنها ئیسلام ئازادی و سەربەستی پێك ئەهێنێ بۆ مرۆڤ لە هەمان کاتدا زۆریش لە کەس ناکات لەسەر بڕوا هێنان، ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەو کردەوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕەفتارو کرداری جێنشین و کاربەدەستە خواناسەکان هۆی جەنگەکانی ئیسلام و چۆنیەتیەکەیان دەرئەخەن و بە جوانی ڕوونیان ئەکەنەوە، کەواتە لەمەشدا هەر دەمی دوژمنان و نەفامان ئەبەسترێ و ڕەخنەیەکیان بۆ نادۆزرێتەوە کە بیخەنە ڕوو، مەگەر لەبەر خۆیانەوەو لای نەشارەزا دەمبازی بکەن، ئەوەش بەم ڕەنگە کردەوەی هەندێ بەناو موسڵمان بگرن بەدەستەوەو ڕەخنەی پێ بگرن لە ئیسلام!

﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ

ئیسلام هات ئەم یاساو بیرو باوەڕە بەرزو گرنگەی داهێنا، بەم واتە پیرۆزە جاڕی سەربەستیو ئازادیی دا لە عەقیدەو باوەڕدا کە ئەوەش یەکەم مافی مرۆڤەو بەبێ ئەوە مرۆڤایەتی نیەو نابێ، ئینجا هۆکەشی باس کردو ئەفەرموێ: ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ﴾ واتە زۆر پێهێنان نیەو کەس بە زۆر موسڵمان ناکرێ، چونکە ڕێی ڕاستو ڕێنموونی ڕوونەو جیا بووەتەوە لە ڕێی چەوتو گومڕایی بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە، بەم ئایەتی پێشووە خوا بە تاکو تەنیایی ناسراو بە هیچ کلۆجێ دەست نادا بۆهیچ شتێو بۆ هیچ کەسێ کە وێنەو هاوبەشی خوا بێت، کەواتە هەر بڕوا بە خوا کە ڕێگایەکی ڕاستە شایانە بۆ ئەوەی بەندە بیگرێتە گەردنو سوور بێت لەسەری، بێبڕوایی کە ڕێی چەوتو گومڕاییە پێویستە خەڵك خۆی لێ دوور بخاتەوەو خۆی بپارێزێ لەوەی کە پێی لەکەدارو چەپەڵ ببێ، وە هەرکەس ژێر بێت دڵنیاو دڵئارام ئەبێت بە خواپەرستی، وە هەرکەسیش گێلو نەفام بێت ئەوا چارەسەر ناکرێو بە زۆر(بڕوا) لە دڵیدا جێگیر نابێ، ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ﴾ ئینجا هەرکەس بڕوا ناهێنێ بەهیچ پەرستراوێکی تر غەیری خوا کە هەر پەرستراوێکی تر زۆر ناهەقو ناڕەواو ناڕاستە، ئیتر ئەو پەرستراوە شەیتانە یان بتە یان هەرکەسێکە یان هەر بیرو باوەڕو یاسایەکە کە لە خواوە نەهاتبێو لە خواوە وەرنەگیرابێ، هەرکەس دان نەنێ بە هیچ کام لەوانەو ڕوویان لێ وەرگێڕێو دەروونی خۆی پاك بکاتەوە لە بڕوا بەوانە، ﴿وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ﴾ بڕوا بهێنێ بە خوا بەو جۆرو شێوەی کە خوا فەرمانی پێداوەو نەخشەی کێشاوە لە نامەو ئایینی خۆیدا، دڵ و دەروونی برازێنێتەوە بەو بڕوا پاكو ڕاستە، ﴿فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ﴾ بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە دەستگیرێکی قایمی وا کە ﴿لَا ٱنفِصَامَ لَهَا﴾ هەرگیز ناپچڕێو ئەو کەسەی دەستی پێوە گرتووە ونو زایە نابێ، بێگومان ئەو بڕوا ڕاستەقینە بە خوا یەکەمین هۆی پەیوەندیە بە خواو ناسینی خواو جێگیر بوونی یادی خوا لە دڵدا کە ئەوەش گەیشتنە بە ئەوپەڕی ئامانجو هۆی بەختەوەری لە هەردوو جیهاندا،

کەواتە ئەو بڕوادارە لە هیچ بارێکەوە مەترسی لێ ناکرێو هەرگیز زایە نابێ، بەرهەمی ئەو بڕا ڕاستەقینە دەست گرتنە بە قورئانو ڕەوشتی پێغەمبەرەوە کە قورئانو ئەو ڕەوشتە پاکە جێنشینو جێگری هەموو ئاینو شەریعەتەکانی خوان، تاکە هۆی گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا ئەو قورئانو ڕەوشتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش خۆی بەجێی هێشتن بۆ جیهانو جیهانیان، بەڵێنی دا کە هەرگیز ئێمە ونو گومڕا نابین تا دەست بەو دوانەوە بگرین وەك لە کتێبە سەحیحەکاندا هاتووەو زۆر بەناوبانگیشە.

﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا بیسەری وتەی بڕوادارانەو زاناو ئاگایە بەوەی کە لە دڵیاندا شاراوەیە، کەواتە با بڕواداران گوفتارو نیازیان پاكو خاوێن تر بکەن، وریا بن لەوەی دووچاری ناپاکیو هەر شتێ تر ببن کە مایەی خەشمو ناڕەزایی خوایە، ئینجا بە شێوەی چیرۆك بەرهەمی بڕواو بێبڕواییمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ خوا یارمەتی دەرو کاربەدەستو کارسازی ئەوانەیە کە بڕوایان هێناوەو خوا زانیویەتی کە بڕوا ئەهێنن، بەم ڕەنگە ﴿يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾ دەریان ئەهێنێ لە تاریکیەکان، تاریکایی نەفامیو نەزانیو بێبڕواییو تاوانو بەدخوییو بەدکرداریی، تاریکی هەواو ئارەزووی ناڕەوای نەفسو، تاریکی سەرگەردانیو هەموو تاریکیەکانی تر، لەمانە دەریان ئەهێنێ ﴿إِلَى ٱلنُّورِ﴾ بۆ ڕووناکی، ڕووناکی بڕوا بە خواو بە ئایینی خوا کە هەموو تاریکیەکان بە جارێ لائەبات، ئەو ڕووناکیەی کە تاقانەیەو هاوبەشو وێنەی نیە، نەك وەك تاریکی کە هەموو جۆرو بەشی هەیە، جا لەبەرئەوە قورئان لێرەو لە هەموو شوێنەکانی وێنەی ئێرەدا ڕووناکی بە تاك ئەفەرموێو تاریکی بە کۆ.

بە ڕاستی هەر زۆر شتێکی ڕاستو ڕێکە ناو بردنی بڕوا بە ڕووناکی، چونکە ئەو بڕوا ڕاستەقینەی کە خوا داوای ئەکاتو ئەیەوێ ڕووناکیەکە کە تێکەڵی گیانو لەشو دەروونی بڕوادار ئەبێ بە جۆرێ هەموو شتێ لە ڕادەو شوێنی خۆی دا ئەناسێو دای ئەنێ، هەرشتێ نرخو ڕێزی خۆی ئەداتێ، لە پێش هەموو شتێکەوە خوای خۆی ئەناسێ، تەنها خۆی ئەناسێو تێ ئەکات لەو بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژی، تەنها ڕووناکیەکەو ڕێنموونی ئەکات بۆ تەنیا ڕێگەیەك، هەرچۆنێ زۆر ڕاستو ڕێکە ناوبردنی بێبڕوایی بە تاریکی کە ئەو هەموو شتانە لە پێش چاو ڕەش تاریك ئەکات بە پێچەوانەی بڕوا، ئیتر ئەو بێبڕواییە هەرکام بێت لە جۆرو شێوەکانی.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ
أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ
ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ

---

**خوای میهرەبان بەو جۆرە یارمەتی بڕواداران ئەدات و ئەو بەهرە گەورەیان پێ ئەبەخشێ، بەڵام ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە و لەزانینی خوادا بێ بڕوان، ئەوانە ﴿أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ﴾ دۆست و یارمەتی دەرو کاربەدەستەکانیان بت و پەرستراوەکانیانن کە مایەی یاخی بوون و گومڕاییانن، بەم ڕەنگە ﴿يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ﴾ دەریان ئەهێنن لە ڕووناکیەوە، ڕووناکی سروشت کە ئەو هەموو ڕابەرو بەڵگە ڕوونانەشیان لەسەرە، ﴿إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ﴾ بۆ ناو تاریکیەکان، تاریکی هەر جۆرێ لە جۆرو شێوەکانی بێ بڕواییە کە هەرکام خەڵك چەواشە ئەکەن و شتە ڕاستەکانی لە بەر چاو ڕەش و تاریك ئەکەن، لە جیهاندا بەو جۆرە سەریان لێ تێك ئەدەن، بۆ ڕۆژی دواییش بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ئەو بێ بڕوا دەرکراوانە هاوڕێ و هاوسەری دۆزەخن، بەجۆرێ ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لە ناو ئەو ئاگرەدا ئەمێننەوە هەتا هەتایە ـ خوا پەنامان بدات ـ.**

**لەم ئایەتی ڕابردووەدا فەرمووی: خوا دۆست و یارمەتی دەرو کارسازی بڕوادارانە، ئینجا لەم سێ ئایەتی داهاتووەدا سێ ڕووداو بەسەرهات ئەگێڕێتەوە، کەلە هەرسێکیان دا میهرەبانی و یارمەتی کارسازی خوا ئاشکرایە دەربارەی دوو بەندە لە بەندە بڕوادارەکانی خۆی، بێجگە لەو پەیوەندیە تایبەتیە، هەرسێکیان پەیوەندیەکی گشتیان هەیە بە ئایەتەکانی پێشەوە، بە تایبەتی(آية الكرسي) کە ئەو ئایەتانە هاتن بۆ نیشاندان و داڕشتنی بەشێکی گرنگ لە بیروباوەڕی بۆچوونێکی ئیسلامی ڕێك و ڕاست و تێگەیشتن لە شتە ڕاستەکانی ئەم بوون و بوونەوەرە، ئەم سێ ڕووداوەش باسی مردن و ژیان و زیندووکردنەوە و دەسەڵاتی خوا و خوایەتی خوا ئەکەن.**

ئایەتی یەکەم: باسی وتوویژو لێکۆڵینەوەیەك ئەکات لە بەینی حەزرەتی(ئیبراهیم)و پاشایەکی هاوچەرخی دا کە دەمە قالێ و کردووە لەبارەی خواوە، وە ناوی نابات، ئەو پاشایە بە ناوبانگە بە(نمرود)، بەڵام ئەو بێت یان ئەو نەبێت قورئان ناوی نابات، چونکە ناو بردنەکەی هیچ لە مەبەستی ئایەتەکە زیاد ناکات، هیچ پەندو تەمێیەکی لێ وەرناگیرێ، ئەو ستەمکارە خوا دەسەڵات و سامان و پاشایەتی پێ دابوو، کەچی بە پێچەوانەوە لە خۆی گۆڕاو یاخی بوو تا رادەیەك لافی خوایەتی لێ ئەدا، دەمبازی ئەکرد لەگەڵ حەزرەتی(ئیبراهیم) دەمەقالێ و بەربەرەکانی بوو لەبارەی خوایەتی خواوە، جا لەبەرئەوە ئەو دەمەقالێ ئەگێڕێتەوە بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەی پرسیارێك کە مەبەست پێی سەرسام کردن و سەرسوڕهێنانە لەو سپڵەیی و ناسوپاسی و بەدنمەکی و قسەو کردەوە ناڕەوایە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوەو بە چاوی دڵ ئاوڕێکت نەداوەتەوە ﴿إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ﴾ بۆلای کەسێك کە دەمەقاڵێی کرد لەگەڵ(ئیبراهیم)دا لە بارەی پەروەردگاری(ئیبراهیم)ەوە؟ ئەو دەمەقاڵێشی کەئەیکرد ﴿أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ﴾ لەبەرئەوە بوو کە خوا دەسەڵات و پادشایەتی پێدابوو، واتە لەباتی سوپاس و مل کەچی بۆ ئەو خوایە، ئەو ناپەسەندە یاخی بوو، بەربەرەکانێی ئەکرد لە خوایەتی ئەو خوایەدا ﴿إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ﴾ لە کاتێکدا کە(ئیبراهیم) فەرمووی: ﴿رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾ پەروەردگاری من کەسێکە کە گیان ئەدات و گیان ئەسێنێ و بێگیان گیاندار ئەکات و گیاندار ئەمرێنێ، ئەگێڕنەوە ئەو یاخیە ستەمکارە حەزرەتی(ئیبراهیم)ی بەند کرد لەسەر شکاندنی بتەکان، لەپاش دا پێی گوت: ئەو خوایەی تۆ خەڵك بانگ ئەکەی بۆ پەرستنی کێیە؟ ئەو یش بەم جۆرە وەڵامی دایەوەو ئەم دوو شتە ئاشکرای کرد بە نیشانە لەسەری کە دوو شتی زۆر نایاب و سەرسوڕهێنەرن و هەموو کاتێ بەدی دێن، لە هەمان کاتدا هەرکەسێك کە تۆزێ تێگەیشتنی هەبێ و عەقڵی نەخەسابێ ئەبێ کاری ئەو دووانە بگێڕێتەوە بۆلای خوا، چونکە هەموو مرۆڤێك سەرسام و سەرگەردانە لە تێگەیشتنی ئەو دووانە، چ جای دروست کردن و داهێنانیان، کەواتە ئەبێ هەر حەواڵەی زۆرو دەسەڵاتێك بکرێن کە زاڵە بەسەر مرۆڤ و هەموو گیانلەبەرو شتەکانی تردا کە ئەوەش هەر زۆرو دەسەڵاتی خوایە،

قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ

---

**بەڵام ئەو یاخیە لە خۆ گۆڕاوە تێنەگەیشت لە مەبەستەکەی حەزرەتی(ئیبراهیم)(علیه السلام) یا تێگەیشت و خۆی لێ هەڵەکردو ویستی لەناو گەلەکەی دا خۆی نەشکێنێ، لەبەر هەرکام وەڵامی دایەوە بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ﴾ منیش گیان ئەر ئەکەم و گیانیش ئەسێنم، بەم ڕەنگە ئەتوانم ئەوەی کە بڕیاری کوشتنی دراوە لێی ببورم و بەرەڵای بکەم، وە هەرکەسیش ئارەزوو بکەم فەرمان ئەدەم بە کوشتنی، یان بەم جۆرە کە ئەگێڕنەوە ناردی دوو کەسیان هێنا، یەکێکیانی کوشت و ئەوی تریانی ئازاد کرد، ئینجا لەوێدا حەزرەتی(ئیبراهیم) نەیویست درێژە بدات بە باسەکەو پەکی(نەمرود) بخات بەڕوون کردنەوەی مەبەستەکەی خۆی، بەڵکو لەوە لای داو بەری لێ بڕیەوە بە جۆرێ کە ڕێگەی تەك و جمی نەمێنێ، بەم ڕەنگە داوای لێ کرد کە باوێك لە باوەکانی خوا بگۆڕێ، لەبەرئەوە ﴿قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ﴾(ئیبراهیم) پێی فەرموو: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ﴾ ئەی بێگومان خوا خۆر ئەهێنێ لە ڕۆژهەڵاتەوە، تۆ ئەگەر ئەتوانی لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، واتە هەموو ڕۆژێك خوا خۆر دەرئەخات ئەی تۆ ئەو باوە بگۆڕەو لە ڕۆژئاواوە دەری بخە، بەڵێ بەڕاستی بەری لێ بڕیەوە کە زۆر ئاشکراو بەهێزبوو لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ﴾ ئەوەی کە بێبڕوا بوو ـ واتە: نەمرود ـ پەك خراو دەم کوت کراو داماو نەیتوانی هیچ بڵێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەلە ستەمکارەکان ناکات، چونکە خۆیان نایانەوێ و لێی لائەدەن.**

**برای موسڵمان وەرە بیربکەرەوە کە خوای میهرەبان لەم بەسەرهاتەدا چۆن یارمەتی بەندەی خۆی داو کاری بۆ سازکردو زاڵی کرد بەسەر ئەو ستەمکارەدا تا بەو جۆرە پەکی خست و دەم کوتی کرد، پاشان سەرنجی ستەمکارەکەش بدە کە شەیتان یارمەتی دەری بوو بەو جۆرە خستیە ناو تاریکاییەکانەوە لە جیهاندا، وە لەناو ئەو تاریکیەدا ژیانی بەسەر برد تا سەری کرد بە ئاگری دۆزەخی نەبڕاوەدا.**

پـاش ئـەوە دێتـە سـەر ڕووداوی دووەم: ئەفـەرموێ: ﴿أَوْ كَالَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ﴾ ئايـا نەتزانيوەو بە چاوی دڵ ئاوڕێكت نەداوەتەوە بۆلای وێنەی ئەو كەسەی كەڕابورد بەسەر شارێكدا، ﴿وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ كە ئەو شارەش وێران بوو بوو بەسەر بانەكانی دا، بەم ڕەنگە لە پێشەوە بانەكان تەپی بوون و ڕوخاو بوون ئینجا دیوارەكان كەوتبوون بەسەریاندا.

زانایـانی تەفـسیر دەربـارەی ئـەو شـارو ئـەو ڕێبـوارە دوو بەشـن، حـەوت ڕا هەيـە لەشارەكەدا، لە ڕێبوارەكەدا لە ڕێوە دوو ڕا هەیە كە ئایا ڕێبوارەكە بڕوادار بوو یا بێ بڕوا، هەردوو بەشەكەش بەڵگەو نیشانەی زۆر ئەهێننـەوە لەسەر بۆ چوونەكانیان، ئەوانـەی كەبە بـڕواداری دائـەنێن بـە چـەند كەسـێك نـاوی ئەبـەن، زۆربـەیان بـە(عـوزەیر)ی ئـەزانن كـە ئیسرائیلیە، بە ڕاستی خۆ خـەریك كردن بەو جۆرە شتانەوە هیچ كەڵك و سوودێكی نیە، ئەگەر دیاری كردن و ناوبردن پێویست بوایە ئەوا قورئان لێی بێدەنگ نەئەبوو، دەی كە ئەو لێی بێدەنگ بووە با ئێمەش قسەی لەسەر نەكەین، ئەو ڕێبوارە كە ئەو شارەی بەو جۆرە بینی ﴿قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ گوتی: ـ بەدەم یا دڵی خۆی دا ـ ئایا خوا چۆن ئەم شارە وێرانە زیندوو ئەكاتەوە لەپاش وێران بوونی؟ واتە چۆن ئاوەدانی ئەكاتـەوە لەپاش وێران بوونی؟ واتە چۆن ئاوەدانی ئەكاتـەوەو وەك خۆیو ئەوسای لەپاش وێران بوون و چۆڵ و هۆڵی، یا چۆن دوردووەكانی كە بوونەتە ئێسكە ڕزیـوو زینـدوویان ئەكاتـەوەو ئەم شارە ئاوەدان ئەكەنەوە؟

هەرچۆنی گوتبێ مەبەستی هەرچی بووبێ خـوا میهرەبـانی كـرد، كـارێكی وای كـرد لەگەڵی هەر بە بەسەرهاتی خۆی دڵئارامی كرد، وەك بۆمان باس ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ﴾ ئینجا خوا ئەو ڕێبوارەی مراند ماوەی سەد ساڵ، ﴿ثُمَّ بَعَثَهُۥ﴾ پاشان زیندووی كردەوە، ئیتر ئایا مەبەست بەو مراندنە بە شێوەی ڕاستەقینەو گیان دەركردن بووبێت وەك دیمەنەكـە نیشانی ئـەدات و ڕەئـی زۆربـەی لەسـەرە، یـان مەبەسـت ئـەوە بـێ لـە جووڵـەی خشتبێ و بێ هەست و سڕی كردبێ ـ وەك ڕای هەندێك وایە ـ بە هـەركام مەبەست بێت خوا توانایەو هەرچۆن و هەرچی ویست ئـەبێ بـەو جۆرە ببـێ و هـیچ شتێك لـەو یـاخی نابـێ، هەرچۆن بووبێ مەبەستی چیرۆكەكە ئەگەیەنێ و ڕوونی ئەكاتەوە،

قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا

---

﴿قَالَ﴾ پێی فەرموو: ﴿كَمْ لَبِثْتَ﴾ چەند مایتەوە بە مردوویی و بێ هەستو هۆشی؟ دیارە ئەمیش بێ هۆش بووە لەبەرئەوە بەڕاستی نەیئەزانی و ئەبێ بە گۆترە شتێ بڵێ کە خەیاڵی بۆی بڕوا، ئەمەش ئەمەبوو کە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ مامەوە ڕۆژێکی تەواو یا هەندێ لە ڕۆژێكو کەمتر بووە لە ڕۆژێك، ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: نەخێر مانەوەکەت ئەو ئەندازە نەبوو، ﴿بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ﴾ بەڵکو سەد ساڵ مایتەوە.

خوای دەسەڵات دار هەرچۆنێ ئەو پیاوەی بەساغو سەلامەتی بەو ماوە زۆرەدا هێشتەوە، هەروەها ئەو شتانەشی هێشتەوە کە ئەو پیاوە ئامادەی کردبوون بۆ خواردنو خواردنەوەی خۆی، جابۆ ئەوەی سەرسووڕنەمێنێ لە مانەوەی خۆی بەبێ تێك چوون سەرنجی ڕاکێشا بۆ مانەوەو تێك نەچوونی خواردەمەنیەکەشی کە زۆرتر جێگەی سەرسووڕمانە، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ﴾ سەیری خواردنو خواردنەوەکەت بکە کە هیچ تێك نەچووەو گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، پاشان بۆ دڵنیا کردنی لەسەر تێپەڕبوونی ئەو ماوە زۆرە فەرمووی: ﴿وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ﴾ سەیری گوێ درێژەکەشت بکە کە چۆن نەماوەو ڕزاوەو ئێسكو پروسکی لە یەك بووەتەوە، کە ئەوەش نیشانەی تێپەڕبوونی ئەو ماوە زۆرەیە، جا ئەپرسین ئایا ئەو خۆراکە چۆن وەك خۆی مایەوە؟ ئەڵێین مایەوە بەو دەستە قودرەتەی کە ئەم شتەی بەرهەم هێناوەو هیچ کام لەوە کەمتر نین، بەڵام ئەمانەی تر دەقیان پێوە گیراوەو بەهۆی ئەوەوە بیرناکرێتەوە لە گرنگی و نایابیان، ئایا ئەم هەموو خۆراكو خواردەمەنیە لەم خاکە پەیدا نابێ کە هەر یەکە تامو بۆنو ڕەنگو شێوەیەکی تایبەتی هەیە؟ ئەو خاکە تا خوا بیەوێ بەخاکی ئەمێنێتەوە، کاتێ ویستی ئەو هەموو شتە نایابەی لێ پێك دێنێ کە هەموو زاناو ژیرێ تێیان دا سەرگەردانە!!

بە کورتی خەڵك هەرچەند جەو جوڵو هاتو چۆ بکات ئەبێ هەموو کاروبارو ڕووداوێك بگێڕێتەوە بۆ تاقانە سەرچاوەی ئەم بوونو بوونەوەرە گرنگە، ئینجا هەرکەسێك بیربکاتەوە

لەم دەستکردە گرنگە کە دەستی قودرەتی خوای تێدا ئاشکرایە حەق نیە سەربکاتەوە لەو جۆرە شتانە کە بەپێی باوو زانین و دەسەڵاتی ئێمە دوور یان نەگونجاوبێت، بێجگە لەوەش مانەوەی ئەو زەلامە یان ئەو خواردەمەنیە بەبێ گۆڕان و تێك چوون لەو ماوە دوورەدا نابێ بە نەگونجاو یا بە دوور سەیر بکرێت، هەر بە پێی زانین و باوی ئێمەیش، ئەوەتا ئەبینین لەشی مردووی چەند هەزار ساڵە بەمۆمیا(تحنيط) ئەمێنێتەوە، وەك لە گۆڕی فیرعەونەکانی میسردا ئەو جۆرە لەشانە دەرهێنراون، یەکێ لەو بەڵگانەی کە(داروین)ی پێ خرایەوە بە درۆوە دۆزینەوەی ئەو لەشانە بوو کەلە مرۆڤی ئەمڕۆ تەواو تر بوون، هەروەها میوەو خواردەمەنی ماوەیەکی زۆر هەڵئەگیرێ بەهۆی چەند شتێکەوە کە پێی ئەوترێ (کونسرو)، ئینجا پێی فەرموو: ﴿وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ﴾ ئەو بەسەرهاتەمان بەسەر تۆهێنا بۆ ئەوەی سەرسووڕمانیەکەی لەوەو بەرت نەمێنێ کە وتت خوا چۆن ئەم شارە زیندوو ئەکاتەوە، وە بۆئەوەی تۆ بکەین بە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون بۆ خەڵکی لەسەر ڕاستی زیندوو بوونەوەو دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، بەڵێ بەڕاستی بەڵگەیەکی بەهێز بووە بە تیبەتی بۆ ئەو چینەی کەلەو کاتەدا بوون و ئەو پیاوەیان بینی بەبێ تێك چوون و بە گەنجی و لەگەڵ ئەوەدا پیاوی چەرخێکی ڕابردوو بوو!!

ئەگێڕنەوە ئەڵێن: کەلە پاش ئەوەی هەڵسا و وەك خۆی و ئەوسای لێ هاتەوە، گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی کە تەماشا ئەکات منداڵەکانی پیربوون و خۆیشی هەرگەنجە، ئینجا کاتێ هەواڵ و دەنگ وباسێکی بۆباس ئەکردن، ئەیان وت: ئەمەقسەو هەواڵی سەد ساڵ لەمەوبەرە.

لە پێشەوە فەرمانی دا کە سەرنجی پێشەو پەلا ڕزیوی گوێ درێژەکەی بدات تا بە هۆی ئەوەوە بزانێ کە ماوەی مانەوەکەیان دوورو درێژبووە، ئینجا فەرمان ئەدا کە تەماشای ئەو ئێسکە ڕزیوانە بکات لە کاتێکدا کە خوا زیندوویان ئەکاتەوەو گوێ درێژەکەی ئەوسای لێ پێك ئەهێنێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ﴾ سەرنجی ئەو ئێسکانە بدە﴿كَيۡفَ نُنشِزُهَا﴾ چۆن بەرزیان ئەکەینەوە لە زەوی و ئەیانگێڕینەوە بۆ شوێنی خۆیان تا قەبارە ئێسکەکەی پێکدێت ﴿ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ﴾ ئینجا گۆشتیان ئەکەین بە بەردا، وێنەی پۆشاك کە ئەکرێتە بەر.

خوای گەورە ماوەی سەد ساڵ ئەو پیاوەی هێشتەوە لەگەڵ خۆراکەکەیدا، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گۆڕان و تێکچوونێك ڕوویان تێبکات کە ئەوە بەڵگەو نیشانەی ڕوون بوو بۆ خۆی و بۆ خەڵکیش، ئینجا ئەو گوێدرێژە ڕزیوەی زیندوو کردەوە بۆی و بە پێش چاوی خۆیەوە کە ئەمەش بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر بەهێزو ڕوون بوو ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ﴾ ئینجا کاتێ بە تەواوی و بە چاوی خۆی بۆی دەرکەوت چۆنیەتی زیندوو کردنەوە ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ ئێستا ئەزانم بە ئارامی دڵەوەو بە تەواوی تێگەیشتم کە خوا توانادارو خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، کە یەکێ لەو شتانە زیندوو کردنەوەی مردووە، بەم جۆرە داستانەکە دوایی هات کە سەرسوڕمانی نەهێشت لە دڵ و دەروونی ئەو پیاوەدا، کەواتە ئەبێ ئەمە پەندو تەمێیەکی بەهێز بێت بۆ هەموو بڕوادارێك کە بە هیچ ڕەنگ سەر نەکاتەوە لە هیچ کارێکی خوا، هەمیشە لە دڵیدا جێگیربێت بڕوای قایم بە دەسەڵاتی بێسنووری خواو بەرفراوانی مەیل و ئارەزووی خوا، کە قورئان زۆر بە گرنگ خەریك ئەبێت لە چەندین شوێندا بۆ چاندن و بەهێزکردنی ئەو بڕوایە لە دڵی بەندەکانی خوادا، لەدوای لێ بوونەوە پێم جوانە تێبینیەك دیاری بکەم لەسەر شتێ کەلە شوێنی خۆی دا دەست نیشانم بۆنەکرد. هەندێ لەزانایانی تەفسیر سەبارەت بەو ئێسکە ڕزیوانە چەند ڕایە تریان هەیە:

١- مەبەست ئێسکی پیاوەکەیە، بەم ڕەنگە لە پێشەوە خوا چاوی زیندوو کردووەتەوە، ئینجا بە بەرچاوی خۆیەوە باقی لەشی زیندوو کردووەتەوە.
٢- مەبەست ئێسکە ڕزیووی دانیشتوانی شارە وێرانەکەیە.
٣- مەبەست ئێسکە ڕزیوی خۆی و گوێ درێژەکەیە.
٤- مەبەست ئێسکە ڕزیوی لەشی زیندووەکانە کە لەیەکەم جارەوە خوا دروستیان ئەکات.
٥- ئەم ڕایانەش هەن، بەڵام بەڕاستی هەموو لاوازن و هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەریان و بەزۆرە زمایی نەبێ هیچ کام لەمانە لە دەقی ئایەتەکە وەرناگیرێن، هیچ پێویستیش نیە بەم لادان لەڕواڵەتە. بەڕاستی سەرسووڕئەمێنێ چۆن لەم ڕا ئاشکرایەکە لە تەفسیرەکەدایە لا بدرێ بۆ ئەم ڕا لاوازانە.

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾

---

**ئینجا دێته سەر چیرۆك‌و داستانی سێیەم: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾[1] باسی ئەو كاتە بكە كە(ئیبراهیم) گوتی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە تۆ چۆن مردووەكان زیندو ئەكەیتەوە؟**

**هۆی ئەم داواكردنە حەزكردن‌و سۆزو پەرۆشە بۆ بینینی چۆنێتی ئەو كردەوە نهێنیەی خوا، وەك دەرئەكەوێ لە شێوەی پرسیارەكەی كە بە وشەی ﴿كَيْفَ﴾ كردی، واتە ئەزانم‌و بڕوام هەیە كە مردووەكان زیندوو ئەكەیتەوە، بەڵام نازانم بە چ شێوەیەك ئەیكەیت؟ داوا ئەكەم ئەو شێوەم نیشان بدەیت كە پێی ئەگوترێ(عين اليقين)، كە هەر چەندە بڕوا بەهێزو دامەزراوبێت پێی، خەڵك بە تەبیعەت سۆزو ئارەزووی هەیە بۆ بینینی، هەروەها شتێكی نایابی سەرسووڕهێنەری تر، ئەو جۆرە حەزانە دەسەڵاتی تێدانیەو ئارەزوویەكی ڕۆحیەو دەخلی نیە بە هێزو بێ‌هێزی بڕواوە، بەڵكو ئەو بە چاو بینینە تام‌و خۆشیەكی تری هەیە، لەگەڵ بوونی بەهێزترو پتەوتری بڕوایش دا هەر خۆشەو ئارەزوو ئەكرێ، ئەمە شتێكە بە ویژدان‌و لە دەروونداهەستی پێ‌ئەكرێ، بە تایبەتی لەشتی وادا چەندێ خۆشە بە چاوی سەر ببینرێ كردەوەو بەرهەمی ئەو دەستە قوردرەتەی كە چاوی دڵ هەستی پێ‌ئەكات، كەواتە ئەو داوای حەزرەتی(ئیبراهیم)ە ناكرێ بە جێی لێكۆڵینەوەو قسەو باس‌و هیچ**

---

[1] لەچەندشوێنی ئەم تەفسیرەدالگوتمان وشەی ﴿إذ﴾ یا ﴿اذكر﴾ی لابراوعامل‌و ئیش كەرەتیایدا یان فعلی لە پاشەوە، لێرەدا ﴿قَالَ﴾ەی دووەم لەسەر هەریار باسی كاتەكە ئەكات نەك ڕووداوێك كەلەو كاتەدا بووە لەگەڵ ئەوەدا مەبەست ڕووداوەكەیە لە ڕاستی دا. هۆی ئەوەش دووشتە:

أ- باسی كاتەكە سەر ئەكێشێ بۆ باسی ڕووداوەكەش.

ب- باسی كاتەكە هۆی باس كردنی ڕووداوەكەیە بە دوورو درێژی بەجۆرێ هیچی لێ دەرنەكرێ، بەڵام باسی ڕووداوەكە بە تەنیا هیچ پێویست ناكات بەو جۆرە بێت.

ڕەخنەیەکی تێدانیە، بەڵێ بێگومان مەبەستی حەزرەتی(ئیبراهیم) بەجێ هێنانو دەستکەوتنی ئەو حەزو ئارەزووە بوو، نەك مەبەستی دەستکەوتنی بەڵگەو ڕابەر بووبێ لەسەر ڕاستی زیندووکردنەوە، وە نەك مەبەستی بەهێزکردنی بڕواکەی بووبێ، چونکە لای خواروو یەکەم پلەی بڕوا بریتیە لە بەستنەوەی دڵو وەرگرتنو ڕەزامەندیو مل کەچی دڵ بەوەی کە بڕوای پێی هەیە بەبێ هیچ گومانو دوو دڵیەك، وەکو زانایانی ئیسلام فەرموویانە لەباسی ئیمانداو بەو جۆرە ئیمان ئەناسێنن و نیشانی ئەدەن، ئەو فەرموودانە ڕێکەو دەقی ئایەتو حەدیسە، لای خواروی بڕوا ئەوەیە چ جای بڕوای یەکێکی وەکو(ئیبراهیم) کە گەیشتووەتە لوتکە، بێگومان خوای گەورەو میهرەبانو زانا بووە بەو بڕوا بەهێزەی حەزرەتی(ئیبراهیم)، بەڵام بۆ ئەوەی(ئیبراهیم) ئەو سۆزو پەرۆشەی خۆی دەربڕێ خوای گەورە بە شێوەی لوتفو میهرەبانی ﴿قَالَ﴾ بە(ئیبراهیم)ی فەرموو: ﴿أَوَلَمْ تُؤْمِن﴾ ئایا بڕوات نەهێناوە؟ ﴿قَالَ﴾(ئیبراهیم) فەرمووی: ﴿بَلَىٰ﴾ بەڵێ بڕوام هێناوەو هەمەو هیچ گومانو دوو دڵیم نیە لە ڕاستی زیندوو بوونەوەدا، ﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵام ئەو داوایەم کرد ﴿لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ بۆئەوەی دڵم ئارام ببێو ئەو سۆزو ئارەزووی بینینەی نەمێنێ، ئینجا خوای میهرەبان بەم شێوە داواکەی بەجێهێنا ﴿قَالَ﴾ پێی فەرموو: ﴿فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ﴾ کەواتە چوار پەلەوەر بگرە ﴿فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ ئینجا کۆیان بکەرەوەو ڕامی لای خۆتیان بکە، بۆ ئەوەی لێیان ورد ببیتەوەو باش ناسیو لە پاشا بزانێ کە هیچ پارچەیەك لە هیچ کام نەگۆڕاوەو لە شوێنی پێشووی نەترازاوە، ﴿ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا﴾ پارچە پارچەیان بکەو پاشان هەر پارچەیەکیان لەسەر کەژێکی ئەو نزیکانە دابنێ، ﴿ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا﴾ جا بانگیان بکە دێن بۆلات بە پەلەو هەڵە داوان.

دیارە(ئیبراهیم) هەڵسا بەو فەرمانەی کە پێی سپێررا، وە ئەو هەواڵەی کە خوا پێی دا بەدیهات، ئەو کارە کەس نەدیوەی بەچاوی بینی، ئەو پەلەورانە کە گیانیان تیا نەماو پارچە پارچەکرانو تێکەڵکران، هەر بەشەی دوور خرایەوەو لە شوێنێکی جیاوازدا دانرا، هەموویان بە ئیزنی خوا بە بانگ کردنێکی(ئیبراهیم) دەست بەجێ بە زیندوویی و وەك ئەوشا هاتن بۆلای بە پەلەو بێ دواکەوتن!!

(ابن منذر) ئەگێڕێتەوە لە(حەسەن)ەوە کە حەزرەتی(ئیبراهیم) بانگی کردن: ئەی ئێسکە پارەکراوەکان، ئەی گۆشتە پرش‌و بڵاوەکان، ئەی دەمارە پچڕاوەکان کۆببنەوە، خوا گیانتان تێئەکاتەوە، ئیتر دەست بەجێ‌ئێسك ڕاپەڕی بۆلای ئێسك‌و پەڕ بۆلای پەڕو خوێن بۆلای خوێن‌و هەر یەکە بۆ شوێنی تایبەتی ئەوسای، تا هەموو یەکیان گرت‌و بوونەوە بە پەلەوەرەکەی جاران، لە چەند ڕیوایەتی حەدیسی صەحیحدا هاتووە کە سەری ئەو پەلەورانە بەدەستی حەزرەتی(ئیبراهیم)ەوە بوون، جا کە بانگی کردوون بەو جۆرە لەشەکانیان وەك خۆی بە پەلە هاتنەوەو گەشتنە لای سەرەکانیان کەلە دەستی(ئیبراهیم)دا بوون.

ئەم کردەوە هەرچەندە بەپێی باوو بینینی ئێمە شتێکی زۆر سەرسووڕهێنەرە، بەڵام بۆ هیچ بڕوادارێك نابێ جێگەی سەر لێ کردنەوەبێت، واتە بڵێین چۆن بوو چۆن نەبوو؟ چونکە خوا خوایەو هەرچی ویست هەر ئەوەی ئەو مەیل‌و ئیرادەی ڕووی تێبکات، خوای گەورە بەم وتە پیرۆزە کۆتایی بەم باس‌و ژیرۆکە هێنا، ﴿وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ بزانە کە خوا دەسەڵاتداری لێزانی کاردروستە، زاڵە بەسەر هەموو کاروباری خۆی داو هەرچی ویست ئەیکات، کاردروستیشە هیچ شتێکی لێ ناگۆڕێ‌و لێ ون نابێ، خوا کە زۆر کردەوەی‌و زۆربەی کاری بە پێی ئەسبابە لەم جیهانەدا لەبەر لێزانی‌و کاردروستیەتی، نەك لەبەر پێویستی بوونی بە هیچ هۆیەك، وە هەر خۆی ئەو سەبەبانە دروست ئەکات‌و ئەیانکات بەسەبەب، ئەتوانێ هەروەها باوێك بگۆڕێ‌و تێکی بدات، جا هەرکەس هەر لەم وتەیە بیربکاتەوە ئیتر هیچی تری ناوێ نابێ سەر بکاتەوە لەم جۆرە شتانە، بەڕاستی زۆر جێی سەرسووڕمانە هەندێ لەزانایان ئەکەونە سەرگەردانی لەم جۆرە شتەداو دەست ئەکەن بە تەئویل‌و پینەو پەڕۆ بۆ ئەم جۆرە ڕووداوانەو ئەیانەوێ بەگوێی فام‌و تێگەیشتنی خۆیان ئەو ئایەتانە لابدەن لە دیمەن‌و ڕواڵەتە ئاشکراکەی خۆیان بەبێ هیچ هۆو پاڵپێوەنەرێك بێجگە لەوەی ئەیانەوێ ڕێکیان بخەن لەگەڵ ئارەزووو تێگەیشتنی خۆیاندا، لەگەڵ ئەوەدا ئەبێ ئێمە ئارەزووو تێگەیشتنی خۆمان ڕێك بکەین لەگەڵ دیمەن‌و ڕواڵەتی ئایەت‌و حەدیسدا، کاتێ بەڵگەیەکی شەرعی نەبێ بەدەستمانەوە بۆ لادان لە دیمەنیان، یەکێ لەو پینەو پەڕۆ کەرانەی کە بە ئارەزووی خۆی دەست‌و دەم ئەکوتێ لە ئایەتەکاندا(ئەبو موسلیم)ە کە لێرەدا تەئویلێکی زۆر دووی کردووە کە زۆر نارێك‌و نەلکاوە بە ئایەتەکەو ئەو

هەموو ڕیوایەتانەی کە هاتوون لەم بەسەرهات و سەرگوزەشتەدا، بەڕاستی دڵم ئەوەندە بێزارە لە لادان و تەوئویل کردنی ئەوە، حەزم نەکرد بەهێنان و بەرپەرچ دانەوەی، لە پێشەوە گوتمان کە مەبەستی ئەم سوورەتە درێژە ئامادەکردن و پەروەردە کردن و پێکەیاندنی گەل و کۆمەڵێکە کە هەڵسێ بە ئەرکی سەرکردایەتی خەڵك و جیهان، جا لەو بارەیەوە تا ئێستا چەند یاسا و پایەیەکی پێویستی داڕشت کە پێویست و چارەسەرن بۆ ئەو مەبەستە گرنگە، جا هەر لەسەر ئەو بارە لێرەش بەدواوە تا دوایی سورەتەکە دەست نیشان ئەکات بۆ داهێنان و ڕاگیرکردنی ڕژێمێکی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی کە ئیسلام ئەیەوێ گەلی لەسەر دامەزرێنێ، ڕژێمی یارمەتی و هۆلگیری کە دەرئەکەوێ لە بەخشین و ماڵبەخت کردندا، نەك ڕژێمی سوود خۆری و چاوچنۆکی کەلە سەردەمی نەفامی دا باوبووە، جا لەبەرئەوە فەرمان ئەدات و موسڵمانان هان ئەدات لەسەر ماڵ بەخت لەڕێی خوادا، سوود خۆری قەدەغە ئەکات و نەفرینی لێ ئەکات، ئینجا ئەچێتە سەر باس و بڕیاری قەرزو مامەڵە و بازرگانی کە ئەوەش بەشێکی سەرەکی و بنەڕەتیە لە ڕژێمی ئابووری ئیسلامی و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی کە ئیسلام دایناوە، چەند جارێ لەم سورەتە و لە چەند سورەت و شوێنی تردا فەرمان ئەدات بە بەخت کردنی ماڵ لەڕێی خواداو زۆر زۆر بە گرنگ ئەیگرێ، چونکە پایەیەکی گەورە و بەهێزە لە ڕژێمی ئابووری و کۆمەڵایەتی دا، هەرچۆنێ پایەی یەکەم بۆ غەزاو تێکۆشان لە ڕێی خوادا کە ئیسلام لەسەر ئەوە ڕاگیرە و بەبێ ئەوە کاروبارەی ناڕەواو بەدی نایەت لە ژیاندا، جا لەبەرئەو زۆر گرنگیەکراوە بە هاوتای گیان بەخت کردن و لە پێشەوە باس کراوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ تێکۆشان بکەن بە ماڵتان و بە گیانتان لەڕێی خوادا، گوتمان لە زۆر شوێندا لە زۆر شوێندا فەرمان دراوە بە بەخت کردنی ماڵ، بەڵام لەم شوێنەدا شێوەیەکی جیاوازو تایبەتی هەیە زیاتر درێژە ئەدا بە باسەکەی، دەست نیشان ئەکات بۆ دەستوورو ئادابی دەروونی و کۆمەڵایەتیەکەی، زۆر شیرین و خۆشەویستی ئەکات، وەك لەم ئایەتانەی پاشەوەدا دەرئەکەوێ، لە یەکەم جارەوە هان ئەدات لەسەر ئەو بەخت کردنە بە شێوە جیرۆکێ کەدڵ ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش،

مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا

---

ئەفەرموێ: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وێنەی کەسانێ کە ماڵو دارایی خۆیان بەخت دەکەن لە ڕێی خوادا ﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ﴾ وەك وێنەی کەسێك وایە کە تەنیا دانەوێڵەیەك بچێنێ و ئەویش حەوت گوڵی دەرکردبێ کە ﴿فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ﴾ لە هەر گوڵێکی دا سەد دانە بێ،کە ئەکاتە حەوت سەد، واتە ئەو کەسانەی کە ماڵ ئەبەخشن لەڕێی خوادا، خوا حەوت سەد قات بۆیان زیاد ئەکات هەرچۆنێ کە تەنیا دانە یەك ئەکات بە حەوت سەد دانە کە ئەوە شتێکە بە چاو ئەبینرێ لە جیهاندا ئەوەتا تەنیا دانەیە ئەڕوێنێ و بنجێکی لێ پەیدا ئەکات کە چەند گوڵێکی لێ ئەبێتەوەو هەر گوڵێك ئەو هەموو دانەیەی تیایە کە جاری وا هەیە ئەگاتە حەوت سەد بەڵکو زیاتر، تا دووقاتی ئەو ژمارەیەو زیاتر لەوە وەك ئەویش بە چاو ئەبینرێ بۆ هەرکەس کە مەیلی ببێ، هەرکەس ئەیەوێ با بڕوا بگەڕێ بەناو کشتوکاڵ دا بە تایبەتی مەرەزەو چەڵتووك، ڕێی ئەکەوێ لەسەر بنجی وا کە گوڵەکانی لە پەنجاش تێپەڕئەکەن، هەرگوڵێ لەوانەیە لە سەد دانەی زیاتر بێت، وەك لەبارەی پاداشتەکەشیەوە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ خوا لەو ئەندازەش زیاتر ئەکات بۆ هەرکەس کە خوا مەیلی ببێ لە بەندە ڕاستەکانی خۆی، ئەوەش بەپێی بارو حاڵەتی ئەو بەندەیانەیە لە ڕاستی و لێ بڕانیان بۆ خواو بەپێی پاكو حەڵاڵی و بە نرخی ماڵەکەیانە، هەروەها بەپێی بەخت کردنیەتی لەجێ و شوێنی خۆی داو زیادە کەڵك گرتنیەتی، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ﴾ خوا بەخشایشی زۆرو فراوانەو هەموو شت ئەگرێتەوە، ﴿عَلِيمٌ﴾ زانایە بە هەموو شتێكو بە ڕادەو نرخی هەرشتێ،(ئیبن و ماجە) حەیسێ ئەهێنێ لە(ئیمامی عەلی)و کۆمەڵێك لە زانایانی هاوەڵەکانەوە –خوا لێیان ڕازی بێ–، کە هەرکام لەوانە ئەگێڕنەوە لە

پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: هەرکەس ماڵی بنێرێ بۆ بەخت کردنی لەڕێی خواداو خۆی لە ماڵی خۆی دانیشێ لەباتی هەر درهەمێك دا حەوت سەد درهەمی پاداشت ئەدرێتەوە، هەرکەس لە ڕێی خوادا غەزا بکاتو تێبکۆشێو ماڵێکیش بەخت بکات، لەباتی درهەمێکدا حەوت سەد هەزار درهەم پاداشت ئەدرێتەوە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خەریکین پێیەوە، لە(مەعازی کوڕی جەبەل)ەوە هاتووە کە ئەو غەزاکەرانەی ماڵیش بەخت ئەکەم لە ڕێی خوادا، خوا لە خەزێنەی ڕەحمەتی خۆی ئەوەندەی بۆ ئامادە کردوون زانینی ئێمە پیای دا ناگات، جا بە پێی ئەم حەدیسەو چەند حەدیسێکی تر وا دەرئەکەوێ کە مەبەست بەم بەخت کردنە لەم ئایەتەدا، بەخت کردنە لە غەزادا، نەك هەموو بەخت کردنێکی تریش، وە لەوشەی ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾یشەوە هەروا دەرئەکەوێ، چونکە ئەم وشەیەش لە قورئانو حەدیسدا زۆرتر ئەبرێت بەسەر ئەوەدا، هەر چەند زۆر لەزانایانی تەفسیر لێرەدا بە شێوەی گشتی تەفسیریان کردووەتەوە، بەڕاستی وێنەو چیرۆکەکە ئیجگار شیرینو بەکارو هاندەرە لەسەر بەخشینو بەخت کردن، چونکە یەکەم: شتێکی ڕاستیو واقیعیە نەك خەیاڵی، دووەم: ئەو شێوەی کشتوکاڵە زۆ ردڵڕفێنە، سێیەم: وانیشانت ئەدات کە هەرچی بدەی بۆ خۆتەو هەوڵو بۆ خۆت ئەدەیت. بەڵکو هیچ نابەخشیو ئەوەی کە ئەیدەی بۆ خۆتت داناوەو هەر بە بەشی خۆتی دائەنێیتو هەروەکو ئەو دەنکە دانەوێڵەی کە ئەیکەت بە ژێر خاکەوە، بە ئومێدی ئەوە بەو جۆرە زۆر ببێ، هەمیشە دڵت پێی خۆشەو چاوەڕوانی بە بەرو بەرهەمەکەی بکەیت. بە خشینی ماڵو دەستی یارمەتی درێژکردن هەرچۆنێ جێگەی ئومێدە بۆ دەست کەوتی بەرو بەرهەمو ئەو پاداشتە گەورەی ڕۆژی دواییە، هەروەها مایەی بەختەوەریو کامەرانیو ئارامی دڵە لە ژیاندا، بێگومان هەموو بەخشینو بەخت کردنێك شایانی ئەوەنیە کە خوا بەو جۆرە زۆرو فراوانی بکات، جا لەبەرئەوە دەست نیشان ئەکات بۆ جۆرو چۆنیەتەکەی، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کە ماڵو دارایییان ئەدەن لە ڕێی خوادا، ﴿ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا﴾ ئینجا بە دوای دانو بەخشینەکەدا هیچ منەتێك ناخەنە سەر کەس،

وَلَآ أَذٗى لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾

﴿وَلَآ أَذٗى﴾ نەهیچ ئازارێك ئەگەیەنن بەدڵی كەس بەكەشخەوشانازی كردن‌ودەمارودەعیە واتە باسی بەخشینەكە ناكەن‌و بە شتی سەیر ناكەن، بەڵكو لە بیری خۆیانی ئەبەنەوە، ڕێزی پێ بەخشراوەكە ناشكێنن‌و هەست‌و دەروونی بریندار ناكەن، ﴿لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ بۆ ئەوانە هەیە هەق‌و پاداشت‌و مەزدی خۆیان لای پەروەردگاریان، ﴿وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ هیچ مەترسیان لەسەر نیە لە ڕۆژی دوایی دا، ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ وە بە هیچ شێوەیە غەمبار نابن.

ئیسلام مەبەستی لەو بەخت كردن‌و بەخشینە تەنیا نەهێشتنی ڕووتی‌و برسێتی‌و داماوی نیە، بەڵكو لە هەمان كاتدا مەبەستی پاك‌و خاوێن كردنی دەروونی ماڵ بەخت كەرەكەیە لە چرووكی‌و چاوچنۆكی، وە مەبەستی هەڵگیرساندنی هەستی مرۆڤایەتی‌و برایەتی‌و بەهێزكردنی پەیوەندێتی بەو هەژارو بێ نەواوە كە برایەتی لە ڕەگەزدا، برایەتی لەبەر خواو فەرمانی خوا، هەروەها مەبەستی ئیسلام بیر خستنەوەیەتی بۆ ئەو چاكەو بەهرەیەی كە خوا ڕشتوویەتی بەسەری دا، بەپێی ئایینەكەی بەڵێن‌و پەیمانی لێ وەرگیراوە كە زیادە ڕەوی نەكات لەو ماڵ‌و سامانەی كە پێی داوەو بەفیڕۆ خەرجی نەكات، كەشخەو شانازی پێوە نەكات بەسەر خەڵكدا، ئەو مافانەی كە خوا دایناوە لەسەری بەجێی بێنێ بەبێ كەم‌و كوڕی‌و منەت لەسەرنان، وەك مەبەستی دڵخۆش كردن‌و ڕازی كردنی هەژارو داماوانە، بەهێزكردنی پەیوەندیە بە برا بەخشندەكەیەوە، بەهێزكردن‌و هۆنینەوەی ئەندامی كۆمەڵە لەسەر بنەڕەتی دەستەبەرەیی‌و كۆمەكی‌و دەست گیری یەكتر، دەی منەت نان‌و كەشخەو دەعیەو دەمار ئەو مەبەستە گرنگانە ناهێڵێ‌و لە ڕیشەیان ئەمێنێ، ئەو بەخشین‌و دەست گیرۆییە ئەكات بە ژەهری مارو ئاگر لە دەروونی داماو‌و هەژارەكەدا، ئەوكاتە بەخشینەكەی هیچ پیت‌و فەڕێكی نابێ‌و گەل دڵ زامدار ئەكات‌و ئەیپچڕێ لەیەكتر، كینەو بێزاری پەیدا ئەكات، ئەو بەخشینە لەبەر خوانابێت، بەڵكو لەبەر خۆ زل كردنەو كەشخەو دەمار بەسەر بەندەكانی خوادا، سەر شۆڕكردن‌و ژێر دەست كردنیان، یان ڕووپامایی‌و ناوو شۆرەتی درۆینە، كەواتە بەخشینەكەی مایەی زیادە نەخۆشی‌و دەردی دەروونی ئەبێ، هەرچۆنێ ئازاری هەژارو داماوەكەش ئەدات بەدڵ بریندارکردن‌و ڕێزشكاندن ـ لەوەوە كینەو دوژمنایەتی پەیدا ئەبێ ـ بەوەش ماڵ بەخت كەر دوور ئەكەوێتەوە لە خواو لە باتی پاداشت شایستەی تۆڵە لێ سەندن ئەبێ، هەندێ لە دەروون ناسان لەم دواییەدا ئەڵێن:

چاکەو دەست درێنەوە لە دواڕۆژدا سەری لە دوژمنایەتیەوە دەرئەچێت، بەڵگەشیان ئەوەیە کە هەژارە وەرگرەکە هەست بەکەمو کوڕی و سەر شۆڕی خۆی ئەکات بەرامبەر بەو کەسەی لێ پان کردووەتەوە، ئەو هەستە لەدەروونی دا پەنگ ئەخواتەوە، تا وای لێ دێت ئەکەوێتە هەوڵدان بۆ بەرزبوونەوەو زاڵ بوون بەسەری دا، چونکە هەمیشە ئەم خۆی بەسەر شۆڕ ئەزانێ لە ئاستی ئەودا، ئەویش ئەیەوێ هەمیشە کەشخە بکاتو خۆی بە خاوەن چاکەو پیاوەتی نیشان بدات، دیارە لەوەشەوە کینەو دوژمنایەتی دروست ئەبێت، ئەم قسەو باسە بە هەر نیازێك کرابێ، لەوانەیە لە هەندێ کاتداو سەبارەت بە هەندێ کەسی ناکەس سەری لە ڕاستەوە دەرچێ، هێشتا ئەوەش لەناو گەلە نەفامەکاندا کە زۆر دوورن لە ئیسلامەوە، بەڵام لەناو ئەو گەلانەدا کە تامو بۆنی ئیسلامیان چەشت بێ شتی وا زۆر دوورە، لەلای هەرکەس کە ئیسلامی ڕێکی وەرگتبێ شتی وا بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ ڕووبدات، چونکە ئیسلام چارەسەری ئەو گرێیەی کردووەو بەربەستو بەرهەڵستی وای دروست کردووە کە هەرگیز ماوە نادات بۆ ئەو جۆرە شتە ناڕاستو ناڕەوایانە، ئیسلام ڕۆڵەی خۆی تێئەگەیەنێو پەروەردەی ئەکات لەسەر ئەوە کە ماڵو سامان هی خوایە، ئەو ڕۆزیەی کەلە ژێر دەستی سامانو ڕۆزی داردایە ڕۆزی خوایە، لە ڕاستی دا هیچ کەس گومانی لەوەدا نیە مەگەر کەسانێ کە نەزانو بێ ئاگان لەوەی کە هەرچی هۆکانی ڕۆزیە چ لە نزیك هەموو بەخشش لەلایەن خواوەو خەڵك هیچ دەسەڵاتی نیە بەسەر هیچ کامیاندا، بۆ نموونە: هەر دانەیەك لە دانەوێڵەکان چەند هێزو وزەیەکی ئەم بوونەوەرە بەشدارە لە فەراهەم هێنانو چاندنو پێگەینو بەروبوومی دا کە هیچ مرۆڤێك دەسەڵاتی نیە تیایاندا، ئیتر لە خۆرەوە تا زەویو تا ئاوو هەواو تا هەر شتێکی تر لەو بابەتانە، لەوەوە بیگرە تا هەرچی شتێکی تر کەوا بەسەر ئەم زەویەوەو ناوسکی ئەم زەویە کە خەڵك پێی ئەژی، یا هەر جۆرە سوودێکی لێ وەرئەگرێ، کەواتە هەرکەس هەرشتێ لە ماڵی خۆی بدا بە هەرکەس لەڕاستیدا لە ماڵی خوا پێی ئەدا، وە هەر قەرزێکی دا لە ماڵی خوا ئەیداو کەچی خوا بۆیشی چەند قات ئەکات، کەواتە حەق وایە زۆر چاولەبەربێتو منەت بزانێ لەو هەژارە کەلە ڕێگای ئەوەوە دەست کەوتی گەورەی ئەبێ، ئەو شتە کەمە ئەدا بەو هەژارەو بە هۆی ئەوەوە خوا ئەو پاداشتە زۆرو فراوانەی ئەداتەوە... ئیسلام ئا بەو جۆرە ڕۆڵەی خۆی تێئەگەیەنێو پێئەگەیەنێ بەجۆرێ زۆر بە خۆشیو سۆزی دەروونەوە شت ئەبەخشێ بەبێ منەت نانو کەشخەیەك، بەڵکو بە سۆزو دڵ بەو هەژارەو ئەوپەڕی چاولەبەرییو مل کەچی بۆ خوای میهرەبانی،

﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ
ٱلْـَٔاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ
شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾

به گوێرەی ئەم دەستوورو ئادابە کە لەو ئایەتانەو لە چەند ئایەتی تردا ڕێنموون و ئامۆژگاری بەندە بڕوادارەکانی کردووە ئینجا ئەو منەت نان و دڵ ڕەنجاندنە ناشیرین ترو بێزار تر ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ﴾ قسەیەکی خۆش لەگەڵ هەژارو داماوداو چاوپۆشی لە هەموو هەڵەو قسەیەکیان کە دڵ گران ئەبن پێی ﴿خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى﴾ لەخێرو صەدەقەیەك چاکترە کە ئازارو دڵڕەنجاندنی بە دوادابێت، واتە بە قسەیەکی خۆش کە تیماری داخ و زامی دەروونیان بکرێ و هیچیان پێ نەدرێ، چاکترە لەوەی کە شتیان پێبدرێ و بە قسەیان بە هەر جۆرە ئازارێ دڵیان بشکێ ﴿وَٱللَّهُ غَنِىٌّ﴾ خوا دەوڵەمەندەو لە خێرو چاکەی بەندەکانی و هیچ پێویستی نیە نەبە خۆیان نەبەخێرو چاکەیان، لەبەر بەرژەوەندی خۆیان فەرمانیان پیا ئەدات بە خێرو چاکە، یان خوا دەوڵەمەندە پەکی ئەو هەژارانە ناخات لەلایەکی ترەوە ڕۆزیان ئەدات، ﴿حَلِيمٌ﴾ لەسەر خۆو پەلەنەکەرە لە تۆڵە سەندندا، ئەگینا بەزوویی تۆڵەی ئەسەند لەوانەی کە منەت ئەنێ و دڵی هەژاران ئەڕەنجێنن.

قورئان هەمیشە ناو بەناو سیفەتەکان و ناوی خوا ئەخاتە بەرچاوو ئەیدا بەگوێی بەندەکانی دا، بۆئەوەی پەندیان لێ وەرگرن و خۆیان بخەنە ژێر سایەی ئەو ناوو سیفەتانەو دڵ و دەروونیان پاراوو ڕوون بکەنەوە پێیان و بە پێی ئەوانە ڕەفتار بکەن، لە پاش ئەو باس و پەندو تەمێیە، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە بڕواداران بەوەی کە خێرو صەدەقەکانیان پووچ و بێبەر نەکەن، فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە

بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم﴾ خێرو صەدەقەکانتان پووچ و بێپاداشت مەکەن، ﴿بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ﴾ بە منەت نان و ئازار دانی دڵی هەژارەکان، ئینجا ئەو پووچ کردنەوەو بێپاداشتیە ڕوون ئەکاتەوەو لەو بارەوە کە ئەیکات بە وێنەی پووچ کردنەوەی ناپاکە ڕووپامایی کەرەکان کە بڕوایان نیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی کە بێگومان کردەوەی چاکی ئەمانە بێبەرو پووچە بەلای هەموو کەسەوە، ئەفەرموێ: ﴿كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: پووچ و بێپاداشتی مەکەن بە وێنەی پووچ کردنی کەسێك کە ماڵی خۆی بەخت ئەکات لەبەر ڕیاو ڕووپامایی خەڵکی و هەر ئەوەی مەبەستە کە ببنرێ و ماڵ ئەبەخشێتەوە، ﴿وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی نیە، تا بەخت کردن و بەخشینەکەی لەبەر ڕەزامەندی خوا بێ و بە هیوای پاداشت و ڕزگار بوون لەو ڕۆژەدا، ئینجا بە وێنەو چیرۆکێکی زۆر نایاب، پووچی و بێ خێرو بێری کردەوەی ئەو ناپاکە ڕووپامایی کەرە ڕۆشن ئەکاتەوە، ﴿فَمَثَلُهُۥ﴾ وێنەی ئەو ناپاکە هیچ خێرو سوودێکی لێ وەرناگیرێ ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ﴾ وەك وێنەی بەردێکی ڕەقی ساف وایە کە ﴿عَلَيْهِ تُرَابٌ﴾ خۆڵێکی کەمی بەسەرەوە بێت ﴿فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ﴾ ئینجا بارانێکی دڵۆپە گەورەی بە خوڕ لێی دابێ و خۆڵەکەی بە تەواوی شۆردەبێتەوە ﴿فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا﴾ تا کردبێتی بە بەردێکی سافی لوس پاك لە تۆزو خۆڵ، واتە هەرچۆنێ ئەو بارانە ئەو خۆڵە ئەبات و بە هیچ جۆرێ نیشانەو دروشمیشی ناهێڵێ، هەروەها ئەو ناپاکی و ڕووپاماییەش هیچ جۆرە پاداشتێك ناهێڵێ بۆ خێرو ماڵ بەخت کردنەکەیان و لە ڕۆژی دوایی دا هیچ دەستکەوتێکیان نابێ لێیەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾ ئەوانە هیچ شتێکیان نایەتە دەست لەوەی کەلە جیهاندا کردوویانەو هیچ پاداشتێکی لێ وەرناگرن، ئینجا بۆ ڕوون کردنەوەو بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گوترا ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەلی بێبڕوا ناکات بۆ شتێ کە سوودو قازانجی هەبێ بۆیان، چونکە بڕوا مایەی هەموو چاکەیەکە، کە ئەوان بێبڕوا بوون نابێ ڕێیان بکەوێ لەهۆی بەختیاری و کامەرانی.

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ
بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ
لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ

---

**ئەم فەرموودەیە وا نیشان ئەدات کە منەت نان و دڵ ڕەنجاندنی هەژاران و داماوان و ڕووپامایی کردن، کردەوە و ڕەوشتی بێبڕوایە، کەواتە ئەبێ بڕوادار خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ لەو ڕەوشتانە، پاشان بەرامبەر ئەو وێنە و چیرۆکی پێشووە، وێنە و چیرۆکێکی نایاب و دڵڕفێن ئەهێنێ بۆ ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان لەبەر ڕەزامەندی خوا بەخت ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ﴾ وێنە و نموونەی نایابی ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان بەخت ئەکەن، ﴿ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ﴾ لەبەر بەدوا گەڕانی ڕەزامەندی خوا و هەر بە نیازی ئەوە، ﴿وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ لەبەر دامەزراندن و ڕام کردنی بەشێك لە دڵ و دەروونی خۆیان لەسەر بڕواکەیان، واتە ماڵ لە خۆشویستن دا هاوتای گیانە لەدەروونندا، کەواتە بەو بەخشینە بەشێکی دەروون دائەمەزرێ و ڕام ئەکرێ لەسەر بڕوا و گوێڕایەڵی بۆ خوا، هەروەها بەخشینی زۆر لە دەرووندا، دەی کە ڕام کرا لەسەری ئیتر چاکە و عیبادەتەکانی تر ئاسانە بەلایەوە، یان مەبەست ئەوەیە ئەو دامەزراندن و ڕام کردنە لە دەروونی خۆیانەوە پەیدا ببێ و لە کانگای دڵیانەوە هەڵقوڵێ، هەرچۆن بێ وێنەی بەخت کردنی ماڵ بەو جۆرو شێوەیە لە پاك و خاوێنی پیت و بەرهەمی زۆردا ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ﴾ وەك وێنەی باخێکە کە بە تەپۆڵکە و بەرزیەکەوە بێ کە هەم هەواو هەم خۆر باش ئەیگرنەوە و دووریشە لە لافاو، بەهۆی ئەوەوە درختەکانی جوان و شیرین و پڕ بەرو پوختە ترە، ئەو باخەکە ﴿أَصَابَهَا وَابِلٌ﴾ بارانی دڵۆپە گەورە و بێزمە لێی دابێ، ﴿فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ﴾ بەرو میوەهاتی خۆی یدا بە**

دوو یا چەند چەندانەی باخ و درەختی تر، ﴿فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾ ئەگەر لێزمە بارانی دڵۆپە گەورە لێی نەدا نەرمە بارانی بەسە، چونکە جێگەو خاك و هەواکەی زۆر چاك و لەبارە، واتە ماڵ بەخت کردنەکانی ئەوانە بە پیتەو چەند بەرامبەرە بەلای خواوەو هیچی لێ زایە نابێ، ئیتر با جیاوازی هەبێ بە پێی زیادە ڕاستی و لێبڕان بۆ خوا، وە بە پێی زۆری و بە نرخی ئەو ماڵە بەخت کراوانە، ئینجا لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەست کاریەکی بۆ بێداربوونەوەو وریا کردنەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خوا بیناو ئاگایە بە هەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە ئەبێ هەموو کەس ئاگای لە خۆی بێت کردەوە یەك بکات کە خوا پێی خۆشەو پێی ڕازیە، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر منەت ئێرو ئازاردەرەکانی دڵی هەژاران، یان ناپاك و ڕووپامایی کەرەکان، وێنەو چیرۆکێکی زۆر دڵ تەزێنیان بۆ ئەهێنێتەوە بە دووچاربوونی دوا ڕۆژێکی بەدبەختی و بەش بڕاوی و نائومێدی کە بەهیچ جۆر سەری لێ دەرنەکرێ و چارەسەرێکی دەست نەکەوێ: وێنەی پیاوێکی پیری منداڵ داری کە هەموو سەرو پاچکەو لاوازبن، ئەو پیاوە باخێکی خورماو ترێی کە ڕووبارو کانیاوی تیا بێت و هەموو بەرو میوەیەکی ببێت، ئینجا باو گێژەڵوکەیەك کە ئاگر یا گڕەیەکی هەبێ بدا لەو باخ و میوەهاتە هەمووی بسوتێنێ، جا بیربکەرەوەلەحاڵی ئەو کابرا داماوە کەچی بکات و بۆ کوێ بڕوا؟ ئەفەرموێ: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ﴾ ئایا هیچ کام لە ئێوە ئاواتە خوازەو پێی خۆشە ﴿أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ﴾ کە باخ و بەهەشتێکی ببێ لە دار خورماو چەند جۆر ترێ کە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ جۆگەو ڕووبارەکان بە ژێریاندا بڕۆن ﴿لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ هەموو جۆرە میوەیەکی لە باخەکەدا هەبێ، ﴿وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ﴾ لە کاتێکدا دووچاری پیریی بووبێ و پەکی خستبێ ﴿وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ﴾ چەند منداڵێکی وردو بێ دەسەڵاتی ببێ کە نەتوانن نەخۆیان و نە باوکیان بەخێوبکەن، ئەو پیاوە منداڵ دارە باخێکی ئاوای ببێ کە چاوی تێبڕیوە بۆ ژیانی خۆی و منداڵە وردەکانی ﴿فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ﴾گێژەڵوکەیەکی بەهێز لێیدا کە ﴿فِيهِ نَارٌ﴾ کە گڕەو گەرمیەکی بەهێزی تیا بێت

فَٱحۡتَرَقَتۡۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ
تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ
ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ

---

﴿فَٱحۡتَرَقَتۡ﴾ بەهۆی ئەوەوە باخەکە بسوتێت، واتە ئەوکەسەی کە ماڵی خۆی بەخت ئەکاتو کردەوەی چاك ئەکات لە جیهاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بە ڕووپامایی بەهەر کردەوەیەکی تری خراپ کارێکیو وا ئەکات هیچ پاداشتی لە ڕۆژی دوایی دا نابێت، ئەو کەسە لەو ڕۆژە سەختەدا نائومێدو بەش بڕاوو ماڵ وێرانو سەرگەردان ئەبێ، بە وێنەی ئەو پیاوە پیرەکە لەم چیرۆکەدا باسی فەرموو، جا ئایا کێ پێی خۆشە ئاوای لێ بێتو ئەو تەنگی وتەنگەتاویە بەسەر خۆی بێنێ؟ ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە ڕوونو ڕەوانە خوا ئایەتەکانی خۆی باس ئەکاتو شتی هەست پێنەکراو لەوێنەو پۆشاکی هەست پێکراودا نیشان ئەدا ﴿لَكُمُ﴾ بۆ ئێوە، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڵکو بیربکەنەوە لەو ئایەتانەو پەندو تەمێ وەرگرنو بەپێی داخوازی ئەو ئایەتانە ڕەفتاربکەن.

لە ئایەتەکانی پێشوودا تێی گەیاندن کە ماڵ بەخت کردنێك لای خوا وەرئەگیرێو جێ ئەگرێ کە هەر لەبەر ڕەزامەندی خوابێتو بەدڵێکی پاکەوەو بەبێ منەت نانو ئازاردانی دڵی هەژاران، دوای ئەوە لێرەوە ڕێنموونیمان ئەکات بەمەی کە ئەیدەن لەڕێی خوادا پاكو حەڵاڵ بێتو بەجۆرێکی چاك بێت نەك بێنرخو نەویستە بێت، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، ﴿أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ﴾ بەخت بکەنو بیدەن لەڕێی خوا دارایی چاكو بە نرخ کە بە کاروکاسپی پەیداتان کردووە، ﴿وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ وە لەو بەرو بومە چاکەی کەلە زەوی دەرمان هێناوە بۆتان، ئیتر دانەوێڵە بێ یا بەرو میوە یا خەزێنەو کانی کۆن کە خوا دەری بخات بۆ یەکێ، بە کورتی ئەمە بانگ کردنێکی گشتیە لە

هەموو چەرخێكدا فەرمان ئەدا بە بەختكردنی بەشێ لە هەموو جۆرە سامان‌و داراییەك، ئیتر مەبەست بەم بەختكردنە لێرەدا هەر زەكات دەركردن بێت ـ وەك زۆربە لەسەر ئەوەن ـ یان مەبەست هەر واجبێكی ترو خێرو صەدەقەی سوننەتیش ـ وەك كۆمەڵێ لەسەر ئەوەن ـ بە هەر جۆرێ فەرمان ئەدا كە ئەوەی بەخت ئەكرێ ئەبێ لە باش‌و بەنرخەكان بێت، نەك بگەڕێ كام خراپ‌و بێ‌نرخە ئەوە بدات، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ ﴾ مەگەڕێن بەدوای كەڵك‌و كەم نرخدا كە ﴿مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴾ لەوە بەخت بكەن‌و بیدەن لەڕێی خوادا، ﴿وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ﴾ لە كاتێكدا كە ئەگەر بدرێ بە خۆتان وەری ناگرن، مەگەر بەمەی چاوپۆشی بكەن‌و چاوی تیا بنوقێنن، واتە نابێ شتێ بدەن بە خواو شتێكی بۆ ڕەوا ببینن كەلای خۆتان بێزراوە، خۆتان وەری ناگرن بە چاوپۆشی‌و شەرمەوە نەبێ، ﴿وَاعْلَمُوٓاْ أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ بزانن كە خوا دەوڵەمەندەو پێویستی بە بەخت كردنی ماڵی ئێوە نیە، بێ نیازو پێویستە بەو بێ‌كەڵك‌و خراپەی كە ئێوە ئەیدەن لە ڕێی ئەودا، خوا شایانی سوپاس كردنە، كەواتە ئەبێ چاكترین شت بەخت بكرێ لەڕێی ئەودا، وەك میهرەبانە ئەگەر شتی چاك بدەن لە ڕێی دا بە ڕەزامەندی‌و خۆشیەوە لێتان وەرئەگرێ‌و پادشتتان ئەداتەوە، بێ‌گومان بەخت نەكردنی ماڵ، یا گەڕان بە دوای شتی بێ‌كەڵك‌و بێ‌نرخدا بۆ بەخت كردن، ئەبێ لەبەر چەند هۆو پاڵپێوەنەرێكی ناڕەوا بێت كە دەروونی هەندێ كەس پێوەی دووچارە، وەك لاوازی بڕوا بەوەی كە لای خوایە، یا چاو برسێتی‌و مەترسی لاتی‌و هەژاری، جا لەبەرئەوە ئەوان قورئان ئەوەمان بۆ دەرئەخات‌و تێمان ئەگەیەنێ كە شەیتان ئەو جۆرە شتانە ئەخاتە دڵەوە، ئەفەرموێ: ﴿الشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ ﴾ شەیتان هەژاری ئەخاتە پێش چاوتان‌و ئەتان ترسێنێ پێی، ﴿وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَآءِ ﴾ وە فەرمانتان پێ‌ئەدات‌و هانتان ئەدات بۆ شتی خراپ‌و زۆر ناڕەوا كە یەكێ لەوانە ئەو چرووكی‌و چاوبرسێتی‌و بەزەیی نەهاتنەوەیە كە بەرگریتان ئەكات لەخێرو چاكە، دووچاری حەرام خۆریتان ئەكات، بێجگە لەوانە هەر ترسان لە هەژاری بە هۆی بەخت كردنی ماڵ لەڕێی خوادا شتێكی زۆر بەدو خراپە.

وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةٗ مِّنۡهُ وَفَضۡلٗاۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٢٦٨ يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٦٩ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُهُۥۗ

---

شەیتان بەو جۆرە ئەتانترسێنێ لە بەخت کردنی ماڵ لەڕێی خواداو هانتان ئەدات لە سەر کارو نیازی خراپو ناڕەوا ﴿وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةٗ مِّنۡهُ﴾ خوا بەڵێنی خۆش بوونتان پێئەدا لەلایەن خۆیەوە لە سەر ئەو بەخت کردنە، ﴿وَفَضۡلٗا﴾ بەڵێنی زیاد ڕۆزیو جێپڕکردنەوە بە باشتر لەوەی کە بەختی ئەکەن، وەك لە حەدیسدا ئەفەرموێ: هەموو ڕۆژێ کە ڕۆژ ئەبێتەوە لە بەندەیانی خوا، دوو فریشتە لە ئاسمان دێنە خوارەوە، یەکێکیان ئەڵێ: ئەی خوایە ئەوەی کە ماڵ بەخت ئەکات جێی پڕبکەرەوە، ئەوی تریان ئەڵێ: ئەی خوایە ئەوەی کە ماڵ بەخت ناکاتو دەستی بەسەردا ئەگرێ ماڵەکەی لەدەست بسێنەرەوەو تاپێی بکە. یان مەبەست بەو فەزڵە زیاد لەلا خۆشبوونەکەیە کە پاداشتی زۆری ڕۆژی دواییو شوێن پڕکردنەوەی ئەم جیهانەش ئەگرێتەوە، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ﴾ خوا بەهرەو بەخشینی زۆرو فراوانە ﴿عَلِيمٞ﴾ زاناو ئاگایە بەوەی کە بەختی ئەکەن، کەواتە پاداشتتان ئەداتەوە بەپێی کردەوەکەتان، ئاگایە بە هەر خەتەرەو خەیاڵێك کە بەدڵتاندا گوزەر ئەکات، کەواتە بەپێی نیازی خۆتانتان لەگەڵ ئەکات، بەهرەو بەخشینی خوا هەر بەوەوە ناوەستێتەوە، بەڵکو ﴿يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ﴾ ژیرییو لێزانیو کاردروستی ئەبەخشێ بە هەکەس کە خوا خۆی بیەوێ، دیارە ئەوەش بە شیاوو شایستەیە بەندەکەیە، ئەم وتە پیرۆزە ﴿ٱلۡحِكۡمَةَ﴾ لێرەدا بەزیاد لە(٢٩) جۆر تەفسیر کراوەتەوەو هەندێکیشیان لە یەکەوە نزیکن، ئەوەی کە لێرەدا کرا بە تەفسیری لەوانەیە هەمووی بگرێتەوەو بکرێ بە پاڵفتەو بەرهەمی هەمووی، ﴿وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ﴾ هەرکەس حیکمەتی پێبدرێ ﴿فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ﴾ بێگومان ئەو کەسە چاکەو پیتو فەڕی زۆری پێدراوە، بەڵێ بەڕاستی چاکەو بەهرەی گەورەو زۆری پێدراوە، چونکە هۆی بەختەوەری هەردوو جیهانی پێدراوە، ئەو کەسەی کە ئەو حیکمەتەی پێدرا

بێخراوەتە سەر ناوەڕاستی ڕێگە ڕاستەکەی خوا، بەبێ ئەم لاو ئەو لا، کەواتە خۆی دوور ئەگرێ لەکارو بەدو خراپ‌و لەسنوور دەرناچێ، هەرشتێ کە ئەزانێ‌و ئەناسێ لە سنووری خۆی دا ئەیزانێ‌و ئەیناسێ، چاوی دڵی ڕوونەو ڕێنموونی کراوەو چاك‌و خراپی بۆ جوێ کراوەتەوە، ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ پەند وەرناگرێ‌و بیرناکاتەوە بێجگە لەوانەی کە خاوەنی ژیریی‌و پاك‌و خاوێنن.

پێش ئەوەی کە بچینە سەر ئایەتی داهاتوو بە جوانی ئەزانم ئاوڕێك بدەینەوە بۆلای ئەو مەبەستە گرنگەی کە ئەم ئایەتە نیشانی داین، لە چەند شوێنی تریشدا هەر دەست نیشانی بۆ ئەکات‌و سەرنج ڕائەکێشێ بۆی، ئەو مەبەستە گرنگەش ئەمەیە کە پێویستە لەسەر هەموو کەس بزانێ کە تەنها دوو ڕێگەمان لەبەردا هەیە:

١- ڕێگەی خوا.

٢- ڕێگەی شەیتان.

یا ئەبێ گوێبگیرێ بۆ بەڵێنی خوا یا بۆ هی شەیتان، هەرکەس نەکەوێتە سەر ڕێگەی خواو ئەو کەسە کەوتۆتە سەر ڕێگەی شەیتان‌و شوێنی بەڵێنی ئەو کەوتووە، هیچ بەرنامەیەك نیە بۆ مرۆڤ بێجگە لەو بەرنامەی کە خوا بۆی داناوە، کە هەر تەنها ئەویش ڕاستە، بێجگە لەو بەرنامەی خوا ئیتر هەمووی بەرنامەی شەیتانەو لەلایەن شەیتانەوە، شتەکە بەو جۆرە ڕۆشن‌و ڕەوانەو هیچ پەردەیەکی بەسەرەوە نیەو هیچ کەس هیچ بڕو بیانوویەکی بە دەستەوە نیە، ئینجا هەرکەس کام ڕێگەو بەرنامە هەڵئەبژێرێ، خۆی ئازادەو ئەتوانێ، ئینجا بە شێوەی گشتی باسی بەخشین‌و ماڵ بەخت کردن ئەکات ئیتر چ لەچاکەدا یا خراپە، بە هەر نیازێ بکرێ، دڵنیایی ئەکات لەسەر ئاگاداری خوا پێی، دیارە ئەو کاتە بەپێی جۆری کردەوەو نیازی بەندە پاداشت‌و تۆڵە ئەبێ، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ﴾ هەر شتێکتان بەخت کردبێ‌و دابێتتان زۆر بێ یا کەم، بەئاشکرا بووبێ یا بە نهێنی، بە جۆرێ بووبێ کە خوا پێی ڕازیە یان نە ء ﴿أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ﴾ یا هەر نەزرو بڕیارێکتان دابێ لەسەر خۆتان، ئیتر بە ماڵ یان بە کردەوە، لەخێرو چاکەدا بێت یا شەڕو خراپە، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ

﴿ يَعۡلَمُهُۥ ﴾ ئەوە خوا ئەیزانێ، واتە تۆڵەو پاداشتتان بە پێی کردەوەتان ئەبێ. نەزر بە دوو جۆرە:

١- بڕیاردان و گرتنە ئەستۆی شتێکی شەرعیە لەبەر مەبەستێکی شەرعی، وەك بڕیاردانی خێرو عیبادەتێك لەبەر خوا یا لەبەرئەوەی خوا مەبەستێکی شەرعی بۆ بەجێ بێنێ، وەك بڵێ ئەگەر خوا نەخۆشەکەی ڕزگار کردم نەزربێت لەسەرم ئەوەندە ڕۆژو بگرم یا حەیوانێك سەربڕم بیدەم لە ڕێی خوادا، ئەم جۆرە نەزرە بە بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلام پێوستە بەجێ بهێنرێ.

٢- بڕیاردان و گرتنە ئەستۆی شتێکی ناشەرعی، وەك نەزر بکات لەسەر خۆی بۆ نەکردنی گوناهێك، یا شتێکی شەرعی بکرێتە ئەستۆ بۆ مەبەستێکی گوناهو ناشەرعی وەك بڵێ: ئەگەر قسەم لەگەڵ فلانەکەسدا کرد ئەوەندە پارەو ماڵ نەزربێ لەسەرم بیدەم بە هەژاران، ئەم جۆرەیان ئەبێ گوناهەکە نەکرێ و بەڵام کەفارەتی سوێندی لەسەرە بەو جۆرەی کەلە ئایەتی کەفارەتی سوێنددا دایناوە، جۆرێکی تر لە نەزر هەیە نەخێرەو نەگوناه، وەك یەکێك نەزر بکات لەسەر خۆی نەخواردنی شتی حەلاڵ، بۆ ئەمە چاك وایە هەر لەسەر نەزرەکەی بڕوات، چونکە شکاندنی عەزم و ئیرادە جوان نیە، بەڵام ئەگەر نەزرەکەی بشکێنێ و شتە حەلاڵەکە بخوات، ئەبێ ئەمیش کەفارەتی سوێندێك بدات، خوای میهرەبان ئاگاداری کردین بە ئاگاداری خۆی بەسەر هەموو بەخشین و نەزرێکمان، بێگومان هەست کردنی ئێمە بەوەی کە هەمیشە ئێمە بە خۆمان و کردەوەو نیازەکانمانەوە واین بە بەرچاوی قودرەتی خواوە، هەست کردنی بڕوادار بەوە ئێجگار بە کەڵك و پڕ سوودە، سام ترس لە دەرووندا دروست ئەکات بەجۆرێ کە ڕووپامایی و ئارەزووی خۆ دەرخستنی لێ دوور ئەخاتەوە، هەروەها چەکلی و چرووکی و مەترسی لە هەژاری و بێنەواییە کە شەیتان ئەیترسێنێ لێی، ئینجا دڵ ئارام و دڵشادە بەو پاداشتەی کە خوا بەڵێنی پێداوە بە چاکەکەران، هەست بەڕەزامەندی و ڕاحەتی دڵی ئەکات کاتێ کە بە فەرمانەکە هەڵسا و نەزرەکەی بەجێهێنا، چونکە ئەزانێ خوا چاوی قودرەتی لێیەتی و پێی خۆشە بەندەکانی گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانەکەی.

وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ وَإِن تُخۡفُوهَا وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمۡۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٧١﴾

ئەو كەسەی كە لەبەر خواو بەو مەستەوە ماڵبەخت ئەكات بەو جۆرە دڵئارامو دڵخۆشە، ئەو كەسەی كە بەو جۆرە نیە سپڵەیە بەرامبەر چاكەو بەهرەی خوا كە ڕشتوویەتی بەسەری دا، بەزەیی نیە دەربارەی بەندەكانی خوا، ئەو كەسە تاوانبارو ستەمكارە، ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٍ﴾ ستەمكاران هیچ جۆرە یارمەتی دەرێكیان نیە.

خێرو چاكەو صەدەقەی سوننەت شاردنەوەو دەرنەخستنی چاكترەو خۆشەویست ترە بە لای خواوە، چونكە دوور ترە لە ڕووپامایی و نیازی خۆدەرخستن، بۆ دڵی هەژارەكەش ئەوە چاكە چونكە ڕێزی تیایە بۆی، بەڵام ئەگەر فەرز بن ئەو حەلە دەرخستنی چكترە، چونكە دەرخستنەكەی جاڕ دانە بە مل كەچی و گوێڕایەڵی خوا، ئەو جاڕدانو دەربڕینەش پێویستەو شتێكی چاكە، دووریشی ئەخاتەوە لەوەی كە موسڵمانان بەدگومان بن لێی و وا بزانن كە فەرزی خوا بەجێ ناهێنێ، بێجگە لەوە بەو دەربڕینە ئەبێ بە سەرمەشق و خەڵكی تریش چاوی لێ ئەكەن، بەڵام بە مەرجێك كە شەیتان نەیخەڵەتێنێ و ڕووپامایی پێ نەكات، جا ڕەنگە ئەم ئایەتی داهاتووە دەست نیشان بێت بەم دوو جۆرە خێرو صەدەقەیە، واتە دەربڕاوەكە بڕین بەسەر فەرزدا، وە شاراوەكە بەسەر سوننەتدا، ئەفەرموێ: ﴿إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ﴾ ئەگەر خێرەكانتان دەرئەخەنو بە ئاشكرا ئەیدەن ئەوا ئەو دەرخستنە كارێكە چاكە، ﴿وَإِن تُخۡفُوهَا﴾ ئەگەر ئەیشارنەوە ﴿وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ﴾ بەدزیەوە ئەیدەن بە هەژاران ﴿فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾ ئەوە چاكترە بۆتان، وەك لە پێشەوە هۆی چاكی دەرخستنو چاكتریی شاردنەوەمان باس كرد، هەڵئەگرێ ـ وەك دیمەنەكەش وا نیشان ئەدات ـ كە مەبەست لەسەر هەردوو بارەكە هەریەك جۆربێت، واتە هەر سوننەتی لێ بگیرێ، وەك زۆربەو جەماوەری زانایانی تەفسیر ئەفەرموون، یان هەر مەبەست فەرزبێت، یان بە شێوەی گشتی بگیرێ وەك ڕای هەندێ لە زانایانی لەسەرە، بە پێی هەركام لەم سێ ڕایە ئایەتەكە بۆ ئەمەیە كە شاردنەوە چكترە لە دەرخستن، بەهەر جۆرو هەرباربێ خێرو صەدەقە ئەم بەرهەمە گرنگەشی هەیە ئەفەرموێ: ﴿وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمۡۗ﴾ خوا بە خێرو صەدەقەكانتان

هەندێ لە گوناهەکانتان لەسەر ئەسڕێتەوە، خێرو صەدەقە بە وێنەی تەوبە نیە کە ئەگەر کرا هەموو گوناهەکان بسڕێتەوە، بەڵکو ئەم هێندەلا ئەسڕێتەوە، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خوا ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە کە ئەیکەن، دووبارە بەم فەرموودەیە هێزی لە خوا ترسیو خۆپارێزی ئەخاتە کار، ئارامو هیواو چوەڕوانی لە دەروون دا تازە ئەکاتەوە، پێویستە بیربکەینەوەو ئاوڕێ بدەینەوە لەم هەموو ئامۆژگاریە دوورو درێژەی کە خوای پەروەردگار ئاڕاستەی کردین بەو هەموو شێوە نایابە سەیارەت بە ماڵ بەختکردنو بەخشینی، بەو بیرکردنەوەدا دوو شتمان بۆ دەرئەکەوێ:

یەکەم: چاوتیژی ئیسلامو بینایی بە سروشتو دەروونی مرۆڤ کە ئەزانێ مرۆڤ بە سروشت چەند ماڵو دارایی خۆش ئەوێو سوورە لەسەری، وە پێویستی بە هاندانێکی هەمیشەیی هەیەو هێنانە سۆزو پەرۆشی دڵ تا زاڵبێت بەسەر ئەو چرووکیو چاوچنۆکیەدا، وە بەرەڵابێ لە کۆتو زنجیری ئەو خۆشویستنە بە تینەی کە تێکەڵی سروشتی بووە، بە هۆی ئەوەوە بەرزببێتەوە بۆ ئەو ڕادە بەرزو بەڕێزەی کە خوا پێی خۆشە بۆ بەندەکانی.

دووەم: ئەو هەموو هەوڵو تێکۆشانەی کە قورئان پێی هەڵسا تا ئەو گۆڕانە زۆر گرنگەی هێنا بەسەر ئەو یەکەم گەلەدا کە زۆر بەناوبانگ بوون بە میوانداریو دەست گوشادیو بەخشینی فراوانە، بەڵام هەموو ئەوانەیان ئەکرد لەبەر ریاو ناوو شۆرەتو باس کردنیان لەناو خەڵکی دا، جا ئیسلام توانی دەستو دڵگوشاد تریان بکات، لە کاتێکدا دڵو دەروونی پاك کردنەوە لەو هەموو نیازە بێ نرخانەو ڕووتی کردنەوە لە هەموو نیازو مەبەستێ بێجگە لە نیازی خواو بەدوا گەڕانی ڕەزامەندی خوادا، ڕووی دڵی وەرگێڕان لە هەر لایەکی ترو تەنها ڕووی کردنە خوا، هیچ هیواو چاوەڕوانیەکی تیا نەمێشتن، بێجگە لە هیواو چاوەڕوانی پاداشتی خوا.

ئینجا ڕووی فەرموودەکەی لە بڕواداران لائەداو وەری ئەگێڕێ بە تێهەڵکێش بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ڕوون کردنەوەو دامەزراندنی چەند یاساو بیروباوەڕی ئیسلامی کە زۆر بەکارن لەڕاست کردنەوەی بۆچوونی خەڵك لەسەر بنەڕەتە ئیسلامیەکە، وەلە ڕۆشتنی لەسەر ڕێگەو ڕێبازە ڕاستەکەی ئیسلام.

﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ

(ئیبنو ئەبی حاتەم) لە(ئیبنو عەبباس)ەوە حەدیسێ ئەهێنێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدابین خێرو صەدەقە هەر موسڵمانان بکەین، هەروەها(ئیبنو جەریر) ئەفەرموێ: چەند کەسێك لە موسڵمانی مەدینەیی کە خزمایەتیو ژن خوازیان لەگەڵ بت پەرستەکان هەبوو، خۆیان ئەپاراست لەوەی خێریکەن پێیان، لەسەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی بە پێغەمبەر: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ﴾ لەسەر تۆ پێویست نیە موسڵمان کردن ڕێنموونی کردنی بێبڕواکان ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ بەڵکو خوا ڕێنموونی هەرکەس ئەکات خوا خۆی بیەوێ، خوا بڕواداری ئەکاتو ئەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، واتە کاری خەڵك لەبارەی بڕوا هێنانەوە هەر بە دەست خوایەو بەدەست هیچ کەسێکی تر نیە، بۆ ئەی پێغەمبەر هەر ڕاگەیاندنو ڕێ نیشاندانت لەسەرە، کەواتە با جڵەوگیری نەکرێ لە خێر پێکردنی بێبڕواکان، دوای ئەوە پێغەمبەر فەرمانی دا بە خێرکردن پێیان.

پێویستە لەسەر هەموو کەس بڕوای ببێ کە بڕوا هێنانی دڵو گومڕا بوونی بەدەست خوایەو بەس، تانانەت پێغەمبەریش دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوەدا، دڵەکان دەستکردی خوان، کەواتە دەستکاری کردنو کردنەوەو داخستنیان هەر بەدەست خوایە، ئینجا جێگیر بوونی ئەم بڕوایە لەدڵدا هەرچۆنی خۆی لە خۆی دا بۆچوونو بیروباوەڕێکی ئیسلامیەو ئەبێ ببێ، هەروەها بۆ موسڵمان زۆر بە کەڵکە بۆ ئەوەی داوای ڕێنموونی خستنە سەر ڕێ هەر لە خوا بکاتو چاوەڕوانی ئەوە هەر لە خوا بکات، ئینجا بە تایبەتی زۆر بە کەڵکە کە بانگی خەڵك ئەکەن بۆ ڕێی خوا، چونکە بەهۆی بۆچوونو خۆیان بۆ ئەگیرێ بەرامبەر لاریو سەرکێشی بێبڕوایان، دڵتەنگو بێئارام نابن پێیان، بەڵکو بەزەییان دێتەوە بەوانەدا، چاوەڕوانی ئەکەن کە خوا دڵیان بکاتەوە بۆ بڕوا هێنانو ڕزگار بوونیان لەبێبڕوایی، ئینجا لەمەوە چاو بەرزئەکەینەوەو ئاگادار ئەبین بەسەر ئەو ئاسۆ بەرزانەی کە ئیسلام ئەیەوێ

موسڵمانانی بۆ بەرز بکاتەوەو ڕامیان بکات لەسەر ئەو سنگ فراوانیو چاو پۆشیەکەس نەدیوە کە هەر لە دەست ئیسلام دێت لەگەڵ دوژمنی دا بەکاری بێنێ، چ جای دۆست.

ئیسلام هەر بەمەوە نەوەستا کە بە زۆر کەس موسڵمان ناکات، بەڵکو زیاد لەوە بڕیاری دا کە دەستی کۆمەکیو یارمەتی درێژیکرێ بۆبێبڕواکانیش، پەیوەندی مرۆڤایەتی خستەکار، ئەگەر شەڕکەرو شەڕ فرۆش نەبن بە موسڵمانان، وەك بەبێ جیاکردنەوە لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ﴾، لێرەشدا هانی موسڵمانان ئەدات لەسەر ماڵ بەخشینو بەخت کردن بەسەر هەژاراندا بە شێوەی گشتیو بەبێ جیاکردنەوەی هیچ کەسو تاقمێك، بەڵێنیان پێئەدات بە پاداشتی تێرو تەواو، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ﴾ ئەگەر هەر شتێ لەدارایی بەخت بکەنو بیدەن بە هەژارانو ئەوانەی پێویستیانە، ئەوە بۆ خۆتانی ئەکەن، چونکە سوودو پاداشتی ئەو بەخت کردنە لە هەردوو دنیادا هەر بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە، لە دنیادا هەژاران ئەبن بە دۆستیانو بەرگرییان لێ ئەکەن، نەك هێرشیان ببەنە سەرو تاڵانیان بکەن، وەك لە وڵاتە غەیرە ئیسلامیەکاندا شتی وا زۆر ڕووی داوە، چونکە دەوڵەمەندو سەرمایەدارەکانیان بێ بەزەیینو دەست نادرنەوە لەلاتو هەژاران، لەو دنیاش دیارە پاداشتی بەخت کردنەکەیان بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە، کەواتە با بڕواداران شتی بەکەڵكو بە نرخ بدەن لە ڕێێ خوادا، ئەوەی کە ئەیدەن بە تاڵی نەکەنەوە بە منەت نانو ئازاردانی دڵی خەڵك، وە بەپاکی بیدەنو هەر لەبەر ڕەزای خوا بێت، نەك بە ڕیاو ڕووپامابیان هەر مەبەستێکی تر کە ئەبێ پیشەی بڕوادار هەر بەو جۆرە بێت کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ﴾ ئێوە هیچ بەخت ناکەن لەبەر هیچ شتێ مەگەر لەبەر داواکردنو ڕێزو ڕەزامەندی خوا، بەڵێ بڕوادار ئەبێ هیچ مەبەستێکی نەبێ بێجگە لە ڕەزامەندی خوا، نابێ شت ببەخشێو لا بکاتەوە بەلای خەڵکدا بزانێ چی ئەڵێن! نابێ بیدا لەبەرئەوەی سواری ملی خەڵك ببێو بیانکا بە ژێر باری خۆی! نابێ لەبەرئەوە کە ڕێز پەیدا بکات لای دەسەڵات دارانو لەناو خەڵکدا! کەواتە گوێیان لە هیچ کام لەو مەبەستانە نیە،

وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ

فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ

مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا

---

بەڵكو دڵیان بەمە خۆشە كە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ﴾ هەر شتێ لەدارایی بەخت بكەن ـ واتە: هەر لەبەر ڕەزامەندی خوا ـ ﴿يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ پاداشتەكەی ئەدرێ پێتان، ﴿وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ لە كاتێكدا كە هیچ ستەمیان لێ ناكرێ، واتە هیچ كەمو كوڕی ناكرێ لە بەڵێنو پاداشتیاندا، بەو جۆرەی بەڵێنتان پێدراوە ڕەفتارتان لەگەڵ ئەكرێ كە لای خواری پاداشتی چاكە یەك بە دەیە، وەك باس كراوەو زانراوە، ئینجا بە تایبەتی هان ئەدا لەسەر بەخت كردنی ماڵ بۆ تاقمێك كە چەند سیفەتو نیشانەیكیان بۆ باس ئەكات، ئەو سیفەتو نیشانانە لە یەكەم جارەوە دەقو سەرو بەر بوون بۆ تاقمێك لە یارانی كۆچ كەران كە هەموو ماڵو دارایی خۆیان بەجێهێشتبوو لە مەككەو بە سەڵتە زەلامی هاتن بۆ مەدینەو ئینجا لەوێ لێ بڕانو خۆیان یەك بار كرد بۆ تێكۆشان لە ڕێی خوادا، خۆیان بەندكرد بە دیاری پێغەمبەر(ﷺ)و ماڵەكانیەوە بۆ پاسەوانی، ئەوانە(٤٠٠) كەس بوون بە كۆچ كەران بێماڵو خێزان بوون لە مەدینەدا پێیان ئەوترا:(اهل الصفة)،(صفة) بەشێك بوو لە مزگەوتەكەی پێغەمبەر(ﷺ) بڕ درا بووو سەری گیرا بوو، ئەو كۆمەڵە لەوێدا بوونو هەمیشە بۆ ئیسلام براوبوون، بەهۆی ئەوەی كە هیچ كارو بازرگانیان پێ نەئەكرا، لەگەڵ ئەوەشدا داوای هیچیان لە كەس نەئەكرد ئەوەی نەشارەزا بوایە بەبێ پێویستو دەوڵەمەندی ئەزانین، ئەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ﴾ نیازی ئەو هەژارانە بكەنو ئەوەی كە ئەیدەن لەڕێی خوادا بۆ ئەوانە شایستە ترە كە بەم جۆرەنو باس ئەكرێن.

١- ﴿ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی كە بەندكراون لە ڕێی خوادا، بەمەی كە بە تەواوی لێبڕاونو خۆیان یەكبار كردووە بۆ خزمەتی ئیسلام.

٢- ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ناتوانن گەڕانو هاتو چۆ بكەن بە وڵاتدا بۆ كارو كاسپیو ڕۆزی پەیدا كردن، واتە بەهۆی خەریك بوونو دەست گیرانیان

بەکاروباری ئیسلامەوە، هیچ پەرۆشیان نیە بۆ پەیداکردنی هۆی ژیان و گوزەران، ئەوکاتە پێویستە بژیەنرێن لە لایەن موسڵمانانەوە بەو ماڵ و سامانەی گشتی کەلە شەرعدا پێی ئەگوترێ(بیت المال) ئەگەربوو، وە بە ماڵی تایبەتی دەوڵەمەندان، ئەگەر(بیت المال) نەبوو، بێگومان خەریك بوون و دەستگیران بە زانین و زانیاری و کاروباری لەشکری ئیسلامەوە بەشێکە لەو خزمەتە ئیسلامیانە، کەواتە ئەو هەژارانەی پێیانەوە خەریکن پێویستە بژیەنرێن.

٣- ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ﴾ نەزانی بێئاگا لە حاڵیان لای وایە ئەوانە ﴿أَغْنِيَاءَ﴾ دەوڵەمەندن، ئەوەش ﴿مِنَ التَّعَفُّفِ﴾ لەبەر زۆر پاکی و نیازی خۆیانە کە ناکروزێنەوە و خۆیان بە هەژار نیشان نادەن و هەر چاوەڕوانی خوان.

٤- ﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر(یا هەرکەس) کە سەرنجیان بدەیت ئەیان ناسی و ئەزانی کە هەژارو بێ نەوان بە ڕوخساریاندا کە لاوازو زەردو تێکچوون، واتە لەبەرئەوەی کە خۆیان بەبێ نیازو پێویست نیشان ئەدەن کەس بەحاڵیان نازانێ مەگەر کەسێکی ژیر ئەویش بە دروشم و شێوەیەکەیان دا، یان مەبەست ئەوەیە، وەك ئیمامی ڕازی ئەفەرموێ: ئەوانە کە بەڕاستی لێ بڕوان و خۆیان داڕنیوە لە هەموو شتێ لەبەر خوا، خوا سام و هەیبەت و زەرەشیرینیەکی پێداون هەرکەس سەرنجیان بدا ئەیان ناسێ و جیایان ئەکاتەوە و شەرمیان لێ ئەکات.

٥- ﴿لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ داوا ناکەن لە خەڵکی بە زۆر پێهێنان و واز نەهێنان، وەك ئەوە باوە لەناو سواڵکەراندا، واتە ئەوانە هەرچەند زۆر هەژارو داماون، بەڵام دوورن لەو باوەڕناڕەواو بەهیچ جۆر داوا ناکەن نە بە خواهیش و خۆشی، وە نە بەزۆرو تەنگەتاو کردن، کەواتە مەبەست لەم ڕستەیە وەسفی ئەوانەیە و تەشەر دانە لەوانەی کە سواڵکردن پیشەیانە، ئەم ڕستەیەوەك ئەو چوارەکەی پێشوو هەرچەند لە یەکەم لە یەکەم جارەوە هاتە خوار دەربارەی ئەو کۆمەڵە بەختیارەی(صفة) بەڵام دەقی ئایەتەکە گشتیە و هەر کەسێك و هەر تاقمێکی تر وەك ئەوان وابێ بەشدارە لە وێنەی بەهرەو پاداشتی ئەواندا.

وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾

---

ئەو کۆمەڵە بەرێزانە کە پێویستی و هەژاری خۆیان ئەشارنەوەو پێیان ناخۆشە جگە لە خوا کەس پێیان بزانێ پێویستە هەر شتێکیان کە پێبدرێ بە نهێنیی و بە نەرم و ناسکی بیاندرێتێ، تا ڕێزتان نەشکێ و دەروونیان بریندا نەبێ، وەك لەم فەرموودەیەشەوە وەرئەگیرێ: ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ هەر شتێك لەماڵ و دارایی کە ئەیدەن بێگومان خوا پێی ئاگادارەو ئەزانێ نیازتان چیەو لەبەرچی ئەیدەن، ئینجا لێرەدا دەستووری خێرو صەدەقە دوایی ئەهێنێ بە دەقێکی گشتی کە هەموو ڕێگەو کاتەکانی ماڵ بەخت کردن ئەگرێتەوە، بە بڕیارێکی گشتی کە هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە کەلەبەر خواو لە ڕێی خوادا ماڵ بەخت ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم﴾ ئەوانەی کە ماڵ بەخت ئەکەن لە ڕێی خوادا ﴿بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ بەشەوو بەڕۆژ، واتە هەمیشە ناوەستن لە هەرکاتێکدا دەستیان پیا گەیشت، ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ بەنهێنی و بەئاشکرا، واتە لە هەر حاڵێکدا بۆیان ڕێکەوت، لە پێشخستنی شەوو نهێنی لەسەر ڕۆژو ئاشکرا، وا وەرئەگیرێ کە خێرو چاکەی نهێنی چاکترە لە هینی ئاشکرا، وەك لە پێشەوە بەدرێژی باسمان کرد لە تەفسیری ئایەتی(٢٧١)دا، ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بۆیان هەیە پاداشتی خۆیان لای پەروەردگاریان، ئەم پاداشتەی ئەبڕیوە بەسەر بارو جۆرێکدا، بۆ هەرکام و بۆ هەموو دەست ئەدات، پیت و فەڕ خستنە ماڵ - پیت و فەڕی تەمەن - پاداشت دانەوەی ڕۆژی دوایی - ڕەزامەندی خوا - ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ هیچ مەترسیەکیان لەسەر نیە، مەترسی لە هەر ترس و بیم لێکراوێك، ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ بەهیچ غەمدەرێك غەمبار نابن، لەم دنیاو لەو دنیاشدا.

لەپاش ئەم هەموو هاندان و داواکردنی کۆمەکی و دەست دەرپنەوە، ئینجا پێویستە بزانرێ کە ئیسلام پشتی نەبەستووە بەوەو ژیانی خەڵکی لەسەر ئەوە ڕاگیر نەکردووە، بەڵکو ئەوەی کە دایناوە بە شتێکی سەرەکی پێکهێنانی کارو کردەوەو ڕۆزیە بۆ هەموو توانا و دەسەڵاتدارێك، زۆرکردنی سامان و دابەشکردنی لەسەر دادو ڕاستی، بەڵێ ئەو خێرو صەدەقەشی داناوە بۆ چارەسەر کردنی هەندێ حاڵەت و بەسەر هاتی تایبەتی، ئیتر ئەو

خێرو صەدەقەیە بە شێوەی فەرزو پێویست کردبێت، وەك زەکات کە دەوڵەتی موسڵمان کۆی ئەکاتەوەو بەو شێوەی کە دیاریی کراوە دابەشی ئەکات‌و ئەیگەیەنێ بە جێگەی خۆی، یان بە شێوەی خۆشی‌و ئارەزووی بڕوادار کە هەڵئەسێ پێی بە هیواو چاوەڕوانی ڕەزای خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی، ئیتر ئەندازە بۆ ئەمە دیاریی نەکراوە، بەس ئەبێ لەبەر خوابێ‌و بە بێ منەت نان‌و ئازاردانی دڵ‌و ڕووپامایی، وەرگریش داخوازو داواکەر نەبێ‌و خەڵك تەنگە تاو نەکات، بەم جۆرە بێت کە لەم چەند حەیسەدا باس کراوە!(ئیمامی بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئەبو هورەیرە)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەژار ئەو کەسە نیە کە داوا ئەکات‌و دەنکێ یا دوو دەنك خورما، تیکەیە یا دوو تیکە ئەیگێڕێتەوەو واز ئەهێنێ، هەژار هەر کەسێکە کە زۆر پاکەو خوازتۆك نیەو زۆر ناهێنێ بۆ خەڵك، ئینجا فەرمووی: ئەگەر حەز ئەکەن ئەو فەرموودەیە بخوێننەوە ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾...(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ لە پیاوێکی(مدینة) ئەهێنێ کە دایکی پێی ئەڵێ: ئایا ناچیت داوای شت بکەیت لە پێغەمبەر(ﷺ)، وەك ئەو خەڵکە! ئەڵێ منیش ڕۆشتم داوای لێ بکەم، سەرنجم دا بە پێوە وەستاوەو خوتبە ئەداو ئەفەرموێ: هەرکەس خۆی بە پاکی ڕاگرێ‌و سواڵ‌و خوازتۆکی نەکات خوا پاك‌و خاوێنی ئەکات، وە هەرکەس خۆی بەبێ پێویست‌و بە دەوڵەمەند دانێ خوا بێ پێویست‌و دەوڵەمەندی ئەکات...، بەهۆی ئەو فەرموودەیەوە گەڕامەوەو داوای هیچم لێ نەکرد،(طبراني) هەواڵێ ئەهێنێ لە(ابن سيرين)ەوە کە پیاوێکی قوڕەیشی بەناوی(حارث) لەشام ئەبێ هەواڵی پێ‌ئەدەن کە(ئەبو زەر) بێ‌دەست‌و دەست تەنگە، ئەویش سێ سەد دیناری بۆ ئەنێرێ، ئینجا(ئەبو زەر) ئەفەرموێ: ئەو بەندەی خوا، واتە(حارث) هیچ کەسێکی دەست نەکەوتووە کە سووك‌و بێ نرخ تربێت لە من بەو لاوە. من لە پێغەمبەرم بیستووە ئەیفەرموو: هەرکەس چل درهەمی ببێ‌و داوا بکات ئەو کەسە زۆر خەڵکی دێنێ، واتەبەری ئەو کەسانە ئەکەوێ کە قورئان تەشەریان لێ ئەدا، دەی خێزانی(ئەبو زەر) چل درهەمیان هەیە...هتد.

ئیسلام ڕژێمێکی تێرو تەواوەو هەموو بەش‌و پارچەو بەندەکانی تەواوکەی یەکترن‌و بە هەموویەوە ئیسلام پێك دێ، نابێ بەش بەش‌و پارچە پارچە وەرگیرێ، گەلە تاقانەو بێ وێنەکەی خۆی داهێناو بەو شێوەیە پێی گەیاند، بەجۆرێ کە مرۆڤایەتی وێنەی ئەوەی لە جیهاندا بە خۆیەوە نەدیوە.

لەم چەند ئایەتانەی ڕابردوودا باسی خێرو صەدەقەو ماڵ بەخت کردنی کرد بەو هەموو جۆرو شێوە نایابەی کە باسکرا، ئینجا بەرامبەر بەو شێوەو ڕووە شیرینەی ئەوە، شێوەو ڕووی ناشیرین و تاڵ و ڕەشی سوود خۆری دەرئەخات کە هەر سەرنج دان و بیرلێکردنەوەی شایستەیە بۆ ئەوەی خەڵکی لێ بتاریێ و ڕووی لێ وەرگێرێ، بەڵێ بەڕاستی و خاوێنیە، کۆمەکی و قوڵگیریە، سوود خۆری پیسی و چەپەڵیە، خۆناسی و خۆپەرستیە، خێرو صەدەقە، واز هێنان و دەست نانە بە ماڵ و داراییەوە بە خۆڕایی و بەبێ بریتی و داواکردنەوە، سوود گێڕانەوەی ماڵە بە زیادەوە کە ئەو زیادەیەش بەشێکە لە کردو کۆشکی هەژارە کە یا بەشێکە لە گۆشتی لەشی، لێی ئەپچڕێ و بە حەرامی ئەیخوات، بەشێکە لە کردو کۆشاکی ئەگەر ئەو ماڵەی کە قەرزی کردووە ئیش و مامەڵەی پێکردبێ و بەرهەم و قازانجی نەکردبێ یا تێشکابێ، یا ئەوەی کە قەرزی کردووە بۆ ژیان و نەفەقەی خۆی و ماڵ و خێزانی بووبێ، جا لەبەرئەوە بەدوای باسی خێرو صەدەقەدا سوو خۆری هێنا، شێوەو ڕووە ڕەشەکەی دەرخست، بەڵام پێش ئەوەی بگەینە ئایەتەکە بە جوانی ئەزانم هەندێ لێکۆڵینەوەو ڕوون کردنەوە لەم بارەوە بکەم بۆ ئەوەی نەشارەزا مەسەلەکەی بەباشی بۆ ڕوون ببێتەوە باش تێبگات لە گەورەیی و بێ وێنەی ئەم ئایینە پاکە.

لە ئایەتەکانی ڕابووردوودا کە دەستووری خێرو صەدەقە نیشاندا مەبەست نیشاندانی یاسایەکە لە یاساکانی ڕژێمی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئیسلامی کە خوای میهرەبان دایناوە بۆئەوەی گەلی موسڵمان لەسەری بێت، پێی خۆشە خەڵك ڕابوێرن بەبەرو بەرهەمە پیرۆزەکەی، لە بەرامبەر ئەو ڕژێمی سووخۆریە ڕەش و تاڵ و بێ بەزەییەی کە خەڵکی نەفام دایناوە، کەواتە ئاشکرایە کە ئەم دوو ڕژێمە دژو پێچەوانەی یەکترن، بە هیچ کلۆجێ ناگەن بە یەك و یەکگرتنیان نابێ، نەلە بۆچوون و تێگەیشتنندا، نەلە بناغەو بنەڕەتدا، نە لە بەرهەم و سەرەنجامدا، بێگومان ئیسلام ڕژێمی ئابووری خۆی ــ وەك هەموو ڕژێمی جیهان ــ دائەمەزرێنێ لەسەر بۆچوون و تێگەیشتنێکی دیاریی و تایبەتی، کە هەر ئەوە ڕاست و ڕەوا بەدی هاتووە لە ژیاندا.

دائەمەزرێنێ لەسەر ئەوە کە خوا داهێنەرو بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرەیە، بەزەوی و ئاسمانەکان و هەرچی لەماویاندایە لە گیانلەبەرو بێگیان، خوا کە خاوەن و کاربەدەستی هەمووە ئەم تیرەی مرۆڤەی داناوە لەم زەویەدا، دەسەڵاتی داوەتێ و زاڵی کردووە بەسەر ئەو هەموو ڕۆزی و خۆراك و وزەو هێزانەدا، بەپێی مەرج و پەیمانێ کەلەسەری داناوەو لێی

وەرگرتووە، ئەم موڵك و وڵاتە پان و پۆڕەی واز لێ نەهێناوە بەبێ سەرو پێ و یاسا، کە مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی چی ئەکا بیکا بەبێ بەرگری و جڵەوگیری، بەڵکو کردی بەجێنشین لەم زەویەدا بە مەرجێ ئەوە بەپێی بەرنامەی خواو شەریعەتی خوا ڕەفتار بکات، کەواتە هەر کردەوەو ڕەفتارو مامەڵەو بیروباوەڕو خوا پەرستیەکی بە پێی بەرنامەو شەریعەتی خوا بێ، ئەوە ڕاست و هەرچیشی دژو پێچەوانەی بێت ناڕاست و نادروستە، هەموو ئەوانە ستەم و تاوانەو پێیان نارازیەو نابێ بڕوادار بە خوا، دانیان پیا بنێ و بەڕاستیان بزانێ، کەواتە حاکمێتی و کاربەدەستی و فەرمان ڕەوایی تەنها بۆ خوابێت لە زەوی دا ـ وەك لە هەموو بوونەوەردا ـ مرۆڤ کار بەدەست و ژێر دەستەیە ئەبێ هەر فەرمان و یاساو شەریعەتی خوا بەجێبێنن، بە هیچ کلۆجێ ڕێیان نیە سەرپێچی بکەن و لەو بەرنامەیە دەرچن.

بەندێ لە بەندەکانی ئەو بەرنامەو شەریعەتە بریتیە لە کۆمەکی و دەستە بەری لەناو بڕواداراندا بۆ یەکتر، ڕەوایە بۆیان سوود وەرگرن لەوەی کە خوا پێی داون لەسەر بنەڕەتی ئەو کۆمەکی و دەستەبەریە، لەسەر بنەڕەتی دان نان بە موڵکایەتی تایبەتی کە سنووری بۆ دیاری کراوە، کەواتە هەرکەسێك کە خوا زۆری پێداوەو زیاد لە پێویستی هەیە ئەبێ بەشی ئەوانەی لێ بدات کە کەمی پێدراوەو تەنگ گوزەرانە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویست کراوە لەسەر هەمووان کارو کردەوە بە پێی توانین و دەسەڵات و لێهاتن بێ، کەواتە هەکەس کە پەك کەوتوو کەفتەکار نەبێ، نابێ ببێ بە ئەرك نە بەسەر گەل و نە بەسەر ئەندامی گەلەوە، بەڵکو ئەبێ بەکارو کردەوەی خۆی بژی، ئینجا ئەو بەشەی کە دانراوە لەسەر دەوڵەمەند هەندێکی فەرزەو پێویست کراوەو ئەندازەی دیاری کراوە وەك زەکات، هەندێکی پێویست نەکراوەو خراوەتە خاوەن ماڵەکە، بیبەخشێ چاکەو نەی بەخشێ زۆری لێ ناکرێ، ئەندازەو سنووریش دیاری نەکراوە بۆ ئەوەی ئەیبەخشێ، ئینجا پێویست کراوە لەسەر بڕواداران کە هەمیشە ناوەندی و میانە بن لە خەرج کردنی ماڵ و دارایدا، هەرگیز ماڵ بەفیڕۆ خەرج نەکەن، هەروەها پێویستی کردووە کە کەسب و کارو مامەڵەیان بە جۆرێ نەبێ کە زیان بگەیەنێ بە خەڵکێ تر، وە جۆرێ نەبێ کە ماڵ و سامان بگێڕێتەوەو سەهێندی و بەرەڵا بێت بۆ هەندێ تر تاوای لێ بێت کە بە لێشاو زۆر ببێ لای تاقمێکی کەم و زۆر بەداخ و مەراق و بێ بەشیەوە بکەوێ لە دەروونەوە بڕوانێ. هەروەها پێویستی کردووە پاك و خاوێنی لە نیازو لە کردەوەدا، لە ئامانج و هۆی پەیدا کردن و زۆرکردنی ماڵ و ساماندا، نابێ لە ڕێگەیەکەوە هەوڵ بدەن کە ویژدان و دەروون و ڕەوشت ئازاردار ببێ، یا زیان و ئازار بگات بە ژیان و گیانی

گەل و کۆمەڵ، کەواتە بە جوانی ڕوونە کە سوو خۆری کردەوەیەکە کە یەك ناکەویٚ و هەر لەڕێوە دژی ئیسلامەو ناگونجێ لەگەڵ بیروباوەڕو بۆچوونی ئیسلامدا، چونکە سوو خۆری هەر لە یەکەم جارەوە لەسەر بنەڕەتی ئەوە پەیدا ئەبێ کە مرۆڤ گەورەو ئاغای ئەم زەوییەیە بە جۆرێ سەربەستو بەرەڵایەو هیچ نەبەستراوە بە بەڵێن و پەیمانی خواوە، وە پەیڕەوی فەرمانی خوای لەسەر نیە، ئینجا هەر کەس ئازادو سەربەستە بۆ پەیدا کردن و زۆر کردنی ماڵ و سامان بەهەر جۆرو لە هەر ڕێگەیەکەوە بێت، هەر چۆنێ ئازادو سەربەستە لە خەرج کردن و ڕابواردن پێی، لە هیچ شتێکدا نەبەستراوە بەهیچ مەرج و پەیمان و فەرمانێکە، وە نەبەستراوە بە بەرژەوەندی هیچ کەسێکی ترەوە کە بەرژەوەندی خۆی تیا نەبێ، جا لەبەرئەوە هیچ گوێی نیە لەوە کە بە ملیۆنەها خەڵکی هەژار تیا بچن و زیان بار ببن بە مەرجێ خۆی لەوەدا دەستکەوتێکی ببێ و خەزنەو هەمارەکەی پڕ تربێ!، بەڵێ جار جارێ یاسای زەمینی تەکانێ ئەدات و دێتە پێشەوەو کەمەکێك سنوور دائەنێ بۆ بەرەڵایی سوو خۆرەکان، بەم ڕەنگە ڕادەو پلەی سوومەکە دیاریی ئەکات، جڵەوگیریان ئەکات لە هەندێ فرۆفێڵ و غەش و زیان گەیاندن بە خەڵك، بەڵام ئەوەش لەسەر یاسایەکی ڕاستی و دامەزراو نیە، بەڵکو بە گوێرەی ویژدان و ئارەزووی کاربەدەستەکانە کە هەر یەکە بە جۆرێکن و هەریەکە ڕای تایبەتی خۆی هەیە، هەروەها سوو خۆری بەرپا ئەبێ و ڕاگیرە لەسەر بنەڕەتێکی لاری ناپەسەندو بۆچوونێکی هەڵە، کە ئەوەش ئەمەیە: مەبەستی ڕاستەقینەو بەرزترین ئامانج لە بوونی مرۆڤدا پەیدا کردن و زۆر کردنی ماڵ و سامانە، ڕابواردنە پێی بەهەر جۆر ئارەزوو بکرێ، جا لەبەرئەوە بەربەرەکانێ و زۆرانبازی لەناو خەڵکدا پەیدا ئەبێ لەسەر کۆکردنەوەو زۆرکردنی ماڵ، لە ڕێی ئەوەدا هەموو بیروباوەڕێك و هەموو شتێکی پیرۆز پێشێل و ژێر پێ ئەخرێ.

ئەم ڕژێمی سوو خۆریە مایەی بەدبەختی و تیاچوونی مرۆڤایەتیە لە پێناوی تاقمێکی کەم کە سوو خۆرەکانن، مایەی پەستی مرۆڤە لەبارەی ڕەوشت و دەمارو دەروونەوە، ڕێ ئەگرێ لە گەڕان و چەرخەکردنی ماڵ و گەشەکردنی ئابووری بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا، سەرەنجام و دوا ڕژێمی سووخۆری ئەوەیە کە دەسەڵات و حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی بکەوێتە دەستی تاقمێکی کەم کە پەست و خراپ و بێبەزەیی ترین کەسن، گوێیان نیە لە شکاندنی هیچ بەڵێن و پەیمانێ و هەرگیز نابوورن و تێناپەڕن بەسەر هیچ هەل و هەلکەوتێکی خۆیاندا، ئەوانە ئەبن بە خاوەنی هەموو بەرو بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشان و ماندوویی و ئارەقی

ناوچەوانی زۆربەی خەڵك، ئەو تاقمە کەمە تەنها بە خاوەنی ماڵو سامان نابن، بەڵکو ئەبن بە فەرمانڕەواو خاوەنی هەموو شتێ، لەبەرئەوەی ئەو سوو خۆرانە بیروباوەڕو ڕەوشتی ئایینیان نیەو گاڵتە بە باسی ئایینو ئەکەن، کەواتە ئەبێ ئەو زۆرو دەسەڵاتە گرنگەی کە هەیانە بەکاری بێنن لە داهێنانو گەشە پێدانی چەند بارو بیروبەزمو بازاڕێ کە زیاتر ببێتە هۆی داگیر کردنو دەست بەسەردا گرتنی داراییو سامانی خەڵکدا، بەکار ترو بەهێزکردنی شت بۆ پێکهێنانی ئەو ئامانجە پیسەی ئەوان بڵاوکردنەوەی ئەو شتانەی کە هۆی نەخۆشیو ڕابواردنی نەفسنو خەڵکی بێهۆشو بێئاگا ئەکەن، وەك ئارەقو قومارو بەرەڵاییو هەموو شتەکانی تری لەم بابەتانە، کە هەرکەس کەوتە ئەو داوەوە دواترین پارەی خۆی تیا بەخت ئەکاتو هەرچی هەیە ئەیخاتە ناو ئەو داوەوە کەلە ڕێی دا تەنراوە.

لە هەموو دەردێ خراپتر ئەوەیە کە ئەو سەرمایە دارە گەورانە زاڵبوون لەم چەرخی تازەدا بەسەر هەستو هۆشو ژیریی زۆربەدا، تا ڕادەیەك پێیان سەلماندن کە ڕژێمی سووخۆری زۆر ڕاستو ڕەوایە، هەر ئەم بنەڕەتێکی ڕاستە بۆ بەهێزبوونو گەشەکردنی ئابووری لە جیهاندا، پێشکەوتنی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەرهەمی ئەم ڕژێمەیە، ئەو کەسانەی کە دژی ئەو ڕژێمەنو ئایانەوێ نەمێنێ تاقمێکی بێئاگانو لەسەر خەیاڵ ئەژین، کردوویانە بەچاوو ڕاو لێیان تا ڕادەیەك خەڵکی لاقرتی ئەکات بەو تاقمە خێرخوازە کە ئەیانەوێ ئەوڕژێمەپیسەنەمێنێودنیاڕزگاربێ لەشەڕو خراپەکانی، لاقرتی ئەکرێ بەو تاقمە تەنانەت لەلایەن ئەوانەشەوە کەلە ڕووی ڕاستیدا بەش خوراوو بەش براوی ئەو ڕژێمەن.

ئەو ڕژێمە بۆگەنە ئەگەر بەرگری نەکرێو نەوەستێنرێ دوا ڕۆژێکی زۆر خراپی هەیە تەنانەت لەبارەی ئابووری گشتی جیهانیەوە، چونکە هەر بەسروشتی پیسی خۆی سەری لەوە دەرئەچێ کە هەموو سامان لە زەوی دا بکەوێتە ژێر دەستی چەند کەسێكو ئیتر غەیری ئەوان چاوەڕوانی دەستی ئەوان بن، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە قەرز دەری سوو خۆر هەمیشە لە قازانجدایەو دەستکەوتە زیادەکەی مسۆگەرە، قەرزدارەکەش هەرچۆنێ قازانج ئەکات زۆر جاریش زیان ئەکاتو ژێر ئەکەوێ، دەی کەشتێ هەمیشە لە زیادیدا بێت ئەبێ لە سەرەنجامدا هەموو سامان لەلای کۆببێتەوە، ئینجا لەوانەیە بڵێن: ئێستا شتەکە خەریکە وای لێ هاتووە، ئەوەتا ئەگەر ووردبینەوە ئەزانین کە زۆربەی سامانی ئەمڕۆ ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار کەسێك لە جیهاندا، ئیتر غەیری ئەوان هەمووی کرێکارانو ئیش بۆ ئەوان ئەکەن، ئەوان بەرو بەرهەمی کارو کردەوەو زەحمەتی ئەمان وەرئەگرن، چونکە ئەوەی وا

بەدەست زۆربەی خەڵکیەوە لە یەکێکی قەرزکردووە، ئەویش لە یەکێکی ترو تا دەست بەدەست ئەگەڕێتەوە سەر سەرمایەدارە هەرە گەورەکان.

شەڕو خراپی ئەو ڕژێمە هەر ئەوە نیە، بەڵکو چەند شتی تری خراپی لێ پەیدا ئەبێ، هەرکەس ئەیەوێ لە مەسەلەکە بەباشی تێبگات با تەماشای کتێبی تایبەتی بکات، یەکێك لەو کتێبانە کتێبەکەی(شیخ أبو الأعلی المودودي)یە کە ناوی(أسس الأقتصاد بین الإسم والنظم المعاصرة)... خوا پایەداری بکات.

بەم ئەندازەیە لێرەدا کۆتاییمان هێنا بە باسی شەڕو خراپەی ڕژێمی سوو خۆری، ئەمانەوێ چەند ئاگادار کردنەوەیەك ئاڕاستەی موسڵمانان بکەین سەبارەت بەم ڕژێمە ناڕەوایە:

١- بە هیچ جۆرێ ئیسلام لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا ناگونجێ و یەك ناگرن لە هیچ شوێنێکدا، هەر فتوایەك کە درابێ بۆ ڕەوا بوونی هەر شێوە سوویەك ڕاست نیەو بۆخەڵەتاندنە.

٢- ئەم ڕژێمە هەرچەند بە ڕواڵەت و ڕووکەش و دیمەن جوان بکرێت و بە هەر بۆیاخێ ڕەنگ بکرێ، لەڕووی ڕاستیدا بەڵاو بەد بەختیەو نەهامەتیە بەسەر مرۆڤایەتیەوە، نەك تەنها لەبارەی بڕواو ڕەوشت و بۆچوونیەوە، بەڵکو لەبارەی ژیانی ئابووریشەوە، پیس ترین ڕژێمێکە کە خۆش بەختی و کامەرانی مرۆڤ ناهێڵێ.

٣- ڕژێمی ڕەوشتی و ڕژێمی کاروکردەوە لە ئیسلامدا بەستراون و بەیەکەوە پەیوەستن، خەڵك لەم جیهانەدا لە هەموو کاروکردەوەیەکی دا بەستراوە بە پەیمان و بەڵێن و مەرجی جێ نشینیەکەیەوە، لەم جیهانەدا تاقی ئەکرێتەوەو لە ڕۆژی دوایی دا پرسیارو محاسەبەی ئەکرێ، هەرکارو کردەوەیەك بکات بەپێی پەیمان و مەرجی جێنشینیەکەی هەموو بە خوا پەرستی ئەنووسرێ و پاداشتی ئەدرێتەوە، هەرچی دژو پێچەوانەی پەیمان و مەرجەکەی بێت بۆ ڕۆژی دوایی بە تاوان لەسەری ئەنوسرێ.

٤- ئەو ڕژێمە ویژدان و دەروون و خەڵك تێك ئەدات و هەستی بەرامبەر براکانی ئەشێوێنێ و لەڕاستە ڕێ ئەیترازێنێ و پەیوەندییان ئەپچڕێنێ بەهۆی ئەوەی کە مایەی خۆپەرستی و دڵڕەقی و تێرنەبوون و چاوچنۆکیە بۆ سوو خۆرەکە، بەجۆرێ هەمیشە وا لە کەمینا بۆ ئەوەی بەفرۆفێڵ لەهەر ڕێگایەکەوە کە بۆی دەست بدا پارە لە خەڵکی دەربێنێ، هەمیشە پاڵی پێوە ئەنێ کە سامانەکەی بخاتە پێش قازانج و سوودەکەی زۆر تر بێت، ئەو هەموو فلیمە پیسانەی کە بەرەڵایی و بێناموسی بڵاوئەکەنەوە، ئەو

هەموو نووسینە قیزەونانەو ئەو مەلهەو شوێنی تێکەڵی و سەماو شتە پیسەکانی تر کە رەوشتی خەڵك لە ریشە دەرئەهێنن، یەکەم هۆو پایەی یەکەمی ئەوانە ئەو رژێمە بۆگەنەیە کەهیچ مەبەستێکی نیە جگە لە زۆرکردنی قازنج.

٥- ئیسلام خۆی بە خۆی رژێمێکی تێرو تەواوەو چارەسەرە بۆ هەر گرێ و تەنگ و چەلەمەیەك کە بێتە رێی ژیان، کەواتە کاتێ کە سوو خۆری قەدەغەکردووە رژێمەکانی ژیانی خۆی دامەزراندووە لەسەر بنەرەتێ کە بێنیازو بێ پێویستە بەو رژێمە نارەوایە، هەموو بارو رووی ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی هۆنیوەتەوەو دایرشتووە بە جۆرێ کە هیچ پێویستی نیە بەو جۆرە مامەڵە نارەوایە، ئەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ زیان بکات بەبەرزبوونەوەوگەشەکردنی هەمیشەیی لەبارەی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە.

٦- ئیسلام کاتێ رێی بدرێ رژێمی ژیان دابنێ بە پێی بەرنامەی تایبەتی خۆی هەرگیز پێویست نابێ بە نەهێشتنی بانك و شەریکەکان و هەر شتێکی تری تازە کە پێویستن بۆ بەرزبوونەوەو گەشەکردنی ژیانی ئابووری چەرخی تازە، بەڵکو ئەوانە هەموو پاك ئەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی و سوو خۆری، ئینجا لێیان ئەگەرێ کە ئیش بکەن بەپێی چەند یاسایەکی تر کە پاك و بێگەردن لەو چڵك و چەپەڵیە.

٧- پێویستە لەسەر هەر کەسێ کە ئەیەوێ موسڵمان بێ بڕوای رێك و پێکی هەبێ بەوەی کە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ خوا شتێ قەدەغە بکات کە ژیان پێویستی پێی هەبێت و بەبێ ئەو پێش نەکەوێ، وەك ئەبێ کە بڕوای هەبێ کە بە هیچ رەنگ ناگونجێ کە شتێکی بەدی زیان دەربێ و کەچی لە هەمان کاتدا ژیان و پێشکەوتنی ژیان بەسترابێ بەو شتە بەدو پیسەوە، چونکە خوا داهێنەرو بەدیهێنەری ئەم ژیانەیە. ئەو ئادەمی کردووە بە جێنشین و کاربەدەست تیای دا، ئەو فەرمانی داوە بە بەرزکردنەوەو گەشە پێدانی، ئەو خوایە هەموو ئەمانەی ویست و ئیرادەی کردن، دەی کەواتە هەرکەس ئەو بڕوایانەی نەبێ ئەوا لە ئیسلام حاڵی نەبووە، هۆی حاڵی نەبوونەکەشی ئەو هەموو فاك و فیك و پروپاگەندە پیس و ژاراویانەیە کە چەند چەرخێکە بڵاوئەکرێنەوە دەربارەی بڕواکردن بەوەی کە رژێمی سوو خۆری شتێکی پێویستەو ناچاری هەیە پێی بۆ بەرزبوونەوەو گەشەکردنی ئابووری و ئاوەدان کردنەوەی وڵات و زەوی، ئەو رژێمە رژێمێکی سروشتیەو ئەبێ ببێ، دوو شت بوو بەهۆی وەرگرتن و بڕواکردن بەو پروپاگەندەو فاك و فیکە:

یەکەم: کانگای ئەو قسە پڕوپووچانە ئەوانە بوون کە بە زاناو ڕۆشنبیر بەناوبانگ بوون، ئەوان بە هەموو جۆر هەوڵیان ئەدا بۆ چەسپاندنی لە دەروونەدا، قەڵەمی خۆیان خستە کار بۆ ڕازاندنەوەو لەبەر چاو شیرین کردن.

دووەم: بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانێکی سەرمایەدارەکان ژیانی تازە دامەزراو بەدی هات لەسەر ئەو ڕژێمە پیسە، بەهۆی ئەوە وا گومان ئەبرێ کە ژیان تازە ناگونجێ بەبێ ئەو ڕژێمەو ئەبێ هەر لەسەر ئەو بنەڕەتە بێت، بەڵام ئەمە گومانە ناڕەواو بێ بنج و بناوانەو لەسەر بۆش دامەزراوە، هەرکەس بڵێ ئابووری جیهانی ناگونجێ لەسەر هیچ بنەڕەتێکی تر بێجگە لە بنەڕەتی ڕژێمی سوو خۆری، ئەو کەسە هەڵەیەو درۆیەکی زل ئەکات و واقیعی مێژوو ئەیخاتەوە بە درۆوە، ئەوەتا بە شایەتی هەموو جیهان گەورەترین میریی دەوڵەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزبوو کە تەنها هەژارێکی تێدا دەست نەئەکەوت و هەموو کەس بە ئەوپەڕی ئارام و خۆشی و ژیانی کامەرانیەوە ژیانی بەسەر ئەبرد، لەگەڵ ئەوەدا ئەو ڕژێمە پیسە بەدڵی هیچ کەسێکدا گوزەری نەئەکرد مەگەر بە تف و نەفرەت لێ کردن، لەپاش ئەو دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس و ڕۆژئاوا کە بوو بە سەرچاوەو کانگای شارستانی و ئاوەدانی و ژیانی کامەرانی، بوو بەسەر مەشق و مامۆستا بۆ زانیاری و شارستانێتی ئەوروپا، ئەو دەوڵەتە چەند چەرخێ بەو شێوە لەسەر ڕەوڕەوەی پێش کەوتن و کامەرانی ڕۆشت و بەبێ ئەوەی نزیك بکەوێتەوە لەو ڕژێمە بۆگەنە، هەروەها لە ڕۆژهەڵاتدا دەوڵەتی عەباسی لە چەرخە ئاڵتونیەکەیدا چەند چەرخێکی بەسەر برد بەبێ ئەوەی بۆن و هەناسەی پیسی ئەو ڕژێمە بێت بەسەریاندا، کەواتە لەم چەرخەشدا ئەگەر نیازو نیەت پاك بێت و وەرەو ئیرادە بەهێزبێت هەموو جیهان ـ یان هیچ نەبێ گەلی ئیسلام ـ ئەتوانن خۆیان ڕزگاربکەن لەو سەرمایەدارانە، کە تالان کەرو دزو جەردەی جیهانن، ئەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن بە تێ‌هەڵدانی ئەم ڕژێمەو دەست بگرن بەو ڕژێمە پاك و بێ‌لەکەی کە خوا بۆی هەڵبژاردن، ئەو ڕژێمەی کە بەدی هێنرا، ژیان بەرز بوویەوەو گەشەی کرد لە ژێر سایەیدا لە ڕابووردوودا، هەروەها زۆر ئامادەو گونجاوە بۆئەوەی ئەم ژیانە بەرز ــ نوقسانە ــ وەو گەشە بکاتەوە لەژێر سایەی دا، ئەگەر خەڵکی ژێر بن و ڕێ ببەن بەهۆی ــ نوقسانە ــ ختی و کامەرانی خۆیان، ئەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن لەو کۆت و زنجیرە و بێنە سایەی ئەم ڕژێمی خواوە ئەگەر خێرو خۆشی و پێت و فەڕو کامەرانیان ئەوێ، بۆ خۆیان لەگەڵ دەروون و ڕەوشت پاکی و گەل پاکی دا.

هەركاتێ خەڵكی بێداربوونەوەو نیازیان كرد ڕێگە ڕاستەكەی خوا بدەنبەر، ئەو كاتە ئاسانەو زانایانی ئیسلام دەستیان ئەگرن‌و ڕێنموونیان ئەكەن كە چۆن بڕۆن بەو ڕێگە ڕاستەدا، كەواتە هیچ پێویست نیە لێرەدا لەو بارەیەوە قسە بكەین، ئەوەی كە شایانی باس بوو باس كرا، لەبارەی هەندێ لە زیان‌و شەڕو خراپەی ئەو ڕژێمەوە، دەرخستنی ئەوەی كە ئەو ڕژێمە بۆ ژیانی ئابووری پێویست نیە، ئەڵێین: ئەو مرۆڤەی كەلە پێش ئیسلامدا لە ڕێگەی ڕاست ترازاو ئیسلام دەستی گرت‌و هێنایە سەر ناوەڕاستی ڕێگەی ڕاست هەر ئەو مرۆڤەیە كەلە پاش ئیسلام ترازا لە ڕێی ڕاست، ئیسلامیش هەر ئەو ئیسلامەیە، كەواتە بە ئاسانی ئەتوانێ جارێكی تر مرۆڤی ترازاو بهێنێتەوە ئەگەر خۆیان ئارەزوویان لێی ببێ. ئینجا با بزانین چۆن بوو ئەو شۆڕشەی كە ئیسلام كردی‌و هێنای بەسەر ئەو ڕژێمە بەدەی كە باو بوو لە ناو مرۆڤداو خەڵك لە ژێر باری گرانی دا ئەینالاند، با سەرنجێكی ئەم هێرشە سامناكە بدەین كەبەم چەند ئایەتی داهاتوودا كردیە سەری تا لە ڕەگ‌و ڕیشەی هێنا، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كەسوو ئەخۆن، واتە وەری ئەگرن‌و ئیتر بە هەر جۆر بە كاری ئەهێنن ﴿لَا يَقُومُونَ﴾ ناوەستن یا ڕاست نابنەوە لە گۆڕەكانیان لە ڕۆژی دوایی دا ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ﴾ مەگەر بە وێنەی وەستانیان ڕاست بوونەوەی كەسێك كە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ‌و دووچاری شێتی‌و فێ‌ی كردبێ، واتە سوو خۆر لە سەر شێوەی فێدارو شێت لە ڕۆژی دوایی دا زیندوو ئەكرێتەوە، وەك لە حەدیسێكدا بە ڕوونی هاتووە كە( تەبەرانی) ئەیهێنێ لە(عەوفی كوڕی مالیك)ەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:(خۆت بپارێزە لەو گوناهانەی كە لێبووردن‌و سڕینەوەیان نیە، شاردنەوەو دزی كردن لە غەنیمەت، هەركەس هەرچی لابدا لە ڕۆژی دوایی دا بەشێتی زیندوو ئەكرێتەوە)، ئینجا لەم ئایەتەی خوێندەوە، ڕەنگە ئەو شێوەیە بكرێ بە نیشانەیەك كە سوو خۆرانی لەو ڕۆژە سامناكەدا پێ‌بناسرێ، ئەوەش تۆڵەو سزادانێكی تایبەتیە، پەنا ئەگرین بە خوا لەم هەڕەشەو ترساندنە دەروونیە كە بەڕاستی مافی ئەوەی هەیە هەر بە بیستنەكەی موچركە بێت بە لەشدا، ئەو شێوەیە شێوەیەكی بینراو ناسراوە ئامادەی ئەكات لە پێش چاو تا دەروونی سوو خۆر داچڵەكێ‌و هەستی بێتە جۆش‌و ڕاپەڕێ‌و لەو باوە پیسە

بێته دەرەوە، ئەو حیرص و تەمەعە پیسە لەدڵ دەرکات و واز بێنێ لە خوێن مژی! بەڕاستی ئەگەر وورد ببێتەوە لە حاڵی سوو خۆرەکان بۆمان دەرئەکەوێ کە هەر لە ژیانی ئەم جیهانەدا دووچاری ئەو شێوە ئەبن، ئەبینی ئەوانەی کە سەر ئەکەنە ئەو کردەوە پیسە ڕەوتیان لێ تێك ئەچێ و هۆشیان نامێنێ نە بەلای خۆیانەوەو نە بەلای هیچ کەسی ترەوە، شەو ڕۆژ وان لە مەراقداو هەر بیر ئەکەنەوە لەو هەموو قەرزەو لە سوودەکانی، نەخەو نە خواردنی ئاساییان لا ئەمێنێ، زۆر بینراوە لەوانەوە کە زۆر جار نان و خوانیان بۆ هێناون و هیچ هۆشیان لەلایەوە نەماوە تا سارد بووتەوەو بەکاری خواردن نەماوە، ناچار بۆیان گۆڕاوە بە خزانێکی تر تا سێ چوار جار، وە بینراوە کە هێنی وایان بووە بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆی دا دانیشتووەو بە تەنیا لەبەر خۆیەوە قسەئەکات و جنێو بە خۆی ئەدات کە چۆن ئەو هەموو پارەی بڵاوکردووەتەوەو چۆن کۆیان بکاتەوەو سوودەکەیان وەرگرێتەوە، دەی ئەگەر ئەوە دەست لێ وەشێنراوو شێت نەبێت، ئەی دەست لێ وەشێنراوو شێت کامەیە؟ ئینجا ئایا لە ڕووی ڕاستی دا دەست وەشاندن بۆ شەیتان هەیە، وەك دیمەنی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ، یان ئەوە شتێکی خەیاڵیەو لەم ئایەتەدا هاتووە بە پێی بیرو باوەڕو تێگەیشتنی خەڵکی بە تایبەتی عەرەبی ئەو سەردەمە کە بڕوایان بەو جۆرە شتانە زۆر بەهێز بووە! بێگومان زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەر ڕای یەکەمن لەبەر ڕواڵەتی ئەم ئایەتەو چەند حەدیسێك کە بەهێزن و بە ڕوونی دانی پیا ئەنێن، (موعتەزیلە) و (قفال شاشی) لە زانایانی شافیعی لەسەر ڕای دووەمن، هیچ بەڵگەیەکی بەهێزیشیان بە دەستەوە نیە بێجگە لەوەی کە موعتەزیلەو هەندێ کەس هەرچی دووربێت لە تێگەیشتن و ژیری خۆیانەوە دانی پیا نانێن، بەڕاستی ئەوەش شتێکی ناڕەوایە. خاوەنی (روح المعاني) خوا پایەو پلەی بەهەشتی زۆر بەرزبکاتەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەندازەیەك درێژیی داوە بەم باسەو بەڕاستی جوانی فەرمووەو سەرنجی خوێنەر بە لای دا ڕائەکێشم کە چاوێکی پێدا بگێڕن.

ئەو سوودەی کەلە سەردەمی نەفامی دا باو بووەو ئەم ئایەتانەو ئایەتەکانی تر هاتن لە یەکەم جارەوە بۆ قەدەغەکردن و نەهێشتنی دوو جۆرو شێوەی سەرەکی بووە! سوودی (النسیئة) کە بە ناوبانگ ترەو ئەمەیە کە پارەو ماڵێك ئەدرا بەقەرز مانگێ یا ساڵێك بە ئەندازەی زیادەو قازانج بەرامبەر ماوەکەو قەرزەکەش هەروەکو خۆی بمێنێ لە گەردنی قەرزەکەدا، ئینجا کاتێ ماوەکە دوایی ئەهات خاوەن قەرز داوای قەرزەکەی لێ کرد، ئەگەر نەیبوایە بۆی دوا ئەخست و زیادە سوودی ئەخستە سەر، جاری وا ئەبوو قەرزارەکە

نەئیەبوو چەند جارێك ماوەكەی دوایی ئەهات‌و هەر جارێ ئەخستە سەر بەهۆی ئەوەوە چەند چەندانە ئەبووەوە، وەك لە ئایەتی سورەتی ﴿آل عمران﴾ دەست نیشانی بۆ ئەكات‌و بەیارمەتی خوا پێی ئەگەین، ئینجا لەم سەردەمی دواییەو لەم چەرخی نەفامی تازەدا دەستێكیان تێ خست‌و ئەوەیان دەهێشت كە لە یەكەم جارەوە قەرزەكە بۆ ماوەی مانگ یا ساڵ بدرێ، بەڵكو هەر لە ڕێوە قەرز ئەدرێ ساڵێ یا مانگێ بە ئەوەندە سوود، ئیتر چەند مانگ و ساڵ بە لایەوە بێ، ئەم شێوەی تازە هەرچەند بە ڕواڵەت چەند چەندانەكەی نەهێشت، بەڵام لەڕاستیدا بۆ زۆر كەس ئەمیش هەرچەند چەندانە ئەبێت، چونكە وا ئەبێت چەند ساڵ‌و بە ماوەی ژیانی كابرا قەرزەكە ناداتەوەو چەند قەرزی كردووە دووقات سێ قاتی سوود ئەدات‌و بن مایەكەشی هەر لە گەردندایە.

سوود(فضل) كە ئەمەیە شتێ بكڕێ یا بیفرۆشێ بەشتێ لە جۆری خۆی لەگەڵ ئەوەدا یەكێكیان ئەندازەی زیاتر بێت، وەك كڕین یا فرۆشتنی مەنێ گەنم بە مەن‌و نیوێك، یا كیلۆیەك ئاڵتوون بە كیلۆو چارەكێ ئاڵتوونی تر... هەروەها.

جۆرو شێوەی یەكەم بە پێی قورئان‌و حەدیس‌و بڕیاری هەموو زانایان قەدەغەیەو یەكێكە لە گوناهە زۆر گەورەكان، جۆری دووەمیش بەپێی حەدیس‌و بڕیاری زانایان قەدەغەیە،(ئیبن‌و عەباس) –خوا لێی ڕازی بێ– لە یەكەم جارەوە ئەم جۆری دووەمەی بەلاوە حەرام نەبوو تا ئەم حەدیسەی پێ گەیشت كە(ئیمامی موسلیم‌و بوخاری) ئەیهێنن لە(ئەبو سەعیدی خدری)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئاڵتوون بە ئاڵتوون‌و زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، خوێ بەخوێ، ئەبێ بە ئەندازەی یەك بن‌و هەردوو حازربن... ئینجا هەركەس زیاد بدات یان داوای زیاد بكات بێگومان وەرگرو بدەر ئەبن بە سوود خۆر بە یەكسانی...)

لەپاش بیستنی ئەم حەدیسەئەویش پەشیمان بوویەوەوبڕیاری حەرامی ئەم جۆرەشیدا، ئەم جۆری دووەمە هەرچەند ئەو هەموو شەڕو خراپەی تیا نیە كەلە جۆری یەكەم داهەیە، بەڵام بۆنی ئەوەی لێ دێ لەوەدا كە ئەمیش وەك ئەو بەبێ كردەوە ماڵ ماڵی لێ پەیدا ئەبێ، بەبێ بریتی‌و بە دەل زیادە وەرئەگیرێ، ئەمیش وەك ئەو وەك ئەو لە دەروونێكەوە هەڵئەقوڵێ كە پڕە لەخوود پەرستی‌و باوەدانی خۆبە سەر غەیردا، پڕە لە تەماع‌و تێر نەبوون‌و چاوبرسێتی‌و هەوڵ‌و تێكۆشان بۆ كۆكردنەوەو دەستكەوتنی ماڵ بە هەر جۆرو شێوەیەك، كەواتە هەركەس فێری ئەم جۆرە بوو لە سەرەنجامدا فێری ئەو جۆرەش ئەبێ، كەواتە مافی

خۆیەتی بەو توندو تیژیە ئەم جۆرەش قەدەغە بکرێ، لەم جۆری دووەمەدا پێویست کراوە کە هەردوو ماڵەکە دەست بە دەست بن و بکڕو بفرۆش هەرکەس شتی خۆی وەرگرێ لەو شوێنەی کە مامەڵەکەی تێدا ئەکەن، هیچ کام نەکرێ بە قەرزو وەرگرتنەوەکەی دوا بخرێ ـ ئیتر با زیادەش وەرنەگیرێ ـ لەبەرئەوەی بەهیچ ڕەنگ سەر نەکێشێ بۆ سوودو بە بۆنەی دواخستنەکەوە زیادە بسێنرێ، تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەر(ﷺ) بێزار بووە لە سوودو ویستی کە تارمایەکەشی دەرنەکەوێ لە هیچ جۆرە مامەڵەیەکدا! شتەکە بەو جۆرە بێزراو بووە لای ئەو ویستوویەتی ئەو بیروباوەڕە لە ڕیشەبێنێ و چارەسەری ئەو دەردە کوشندە بکات کە جیهانی نەفامی دەردەدار بوو پێیەوە، کەچی بەداخەوە زۆر کەس هەن کە خۆیان بە موسڵمانیش دائەنێن لەوانەی کە بیروباوەڕی سەرمایەداری کاری لێ کردوون و خۆیان بۆ ناگیرێ لە ئاستی دا، ئەوانە ئەیانەوێ هەرجۆرێ یەکەم قەدەغە بکرێ، ئەویش لەسەر ئەو بارەی کەلە سەردەمی نەفامی دا کراوە، ئیتر جۆری دووەم و ئەم شێوە سوودانەی کە لەم نەفامی تازەدا داهێنراون، هەموو ئەمانە بەناوی ئیسلامەوە حەڵاڵ بکەن بەناوی ئیسلامەوە! بەڵام هەر هەوڵ و تێکۆشانێکیان کرد لەو بارەیەوە هیچ نرخێکی نیە لای هیچ موسڵمانێکی تێگەیشتوو، موسڵمانی ڕاستەقینە ئەزانێ کە ئیسلام دژی ئەو ڕژێم و مامەڵەیە ئیتر بە هەر ناوێ و لەژێر هەر پەردەیەکدا بێت، بە هەر فێڵ و تەڵەکەیە ناوی تری لێ بنرێ وەك ئەو دوو جۆرەی کە باوبوون لەم وڵاتەی ئێمەدا:

یەکەم: بەناوی سەلەمەوە بەم ڕەنگە دوو دیناری ئەدا بە قەرز ـ بەناوی خۆڕایی و بەبێ هیچ ـ بەڵام لەبری ئەو دوو دینارە قەرزە پارەیەکی زۆر کەمی ئەدا بە سەلەمی تەنێ لۆکە بە قەرزدارەکەو ئەویش لە ناچاری دا ئەو پارە کەمەی وەرگرت و لەکاتی حاسڵاتدا تەنێ لۆکەی پێ ئەدا لەگەڵ دوو دینارە دەستیەکەدا، کە بەڕاستی ئەگەر لێك بدرێتەوە وەك چەند چەندانەکەی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام وابوو.

دووەم: بەناوی(بیعي بالوفا) بەم ڕەنگە ئەندازەیەك پارەی قەرز ئەکرد لە پارەدارەکە، بەڵام ڕێك نەیئەوت مانگی ئەوەندە سوودم بدەرێ، بەڵکو خانووەکەی پێ ئەفرۆشت بەو پارەیە لەسەر بڕیاری ئەوە هەرکات پارەکەی دایەوە ئەو فرۆشتنە هەڵوەشێتەوە، ئینجا ئەم ستەمکارە خانوەکەی ئەدا لە کرێ بە هەژارەکە بە مانگانەو هەموو مانگێ کرێی خۆی لێ وەرئەگرت لەپاشان کابرای هەژار هەرکات بۆی هەڵسوڕایە پارە قەرزەکەی ئەدایەوەو هەموو کرێی ئەو ماوەش هەروا ئەڕۆی، دەی ئایا ئەمە ڕێك و پێك سوودە چەندانەکە نیە؟!

خوای گەورە ئەو هەڕەشە سامناکەی لێکردین، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو سوود خواردنەیان، یان ئەو سزای کە بۆیان باس کرا، ﴿بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟﴾ بەهۆی ئەوە بوو کە ئەیانگوت ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟﴾ فرۆشتن و کڕین هەر وەك سوود وایە، بەم ڕەنگە فرۆشتن شتێ کە درهەمێ بدەی بەدوو درهەم وەك فرۆشتنی درهەمێك بەدوو درهەم وایە، واتە ئەو دووانە وەك یەك وان، کەواتە ئەگەر سوود حەرام بێت ئەبێ کڕین و فرۆشتنیش حەرام بێ، وە ئەگەر کڕین و فرۆشتن حەلاڵ بێت ئەبێ سوودیش حەلاڵ بێت، وە هیچ هۆیەك نیە بۆ ڕەوادانی کڕین و فرۆشتن و ڕەوا نەدانی سوود.

ئەوانە ئەو ڕەخنەیان گرت و ئەوەیان کرد بە بەڵگە بۆ خۆیان، بەلام خوا دای لە دەماخیان و ئەو یەکسانیەی بەدرۆخستەوە کە ئەوان بڕیاریان لەسەردا بەمەی کە فەرمووی: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟﴾ خوا فرۆشتنی حەلاڵ کردو سوودی حەرام کرد، کەواتە نابی ئەو دووانە یەکسان بن، ئەبێ بڕیار هەر بڕیاری خوا بێت و نابێ هیچ کەس گوێبگرێ بۆ هیچ بڕیارو قسەو باسێکی تر ئیتر تێبگات لەهۆی بڕیاری خوا یان تێنەگات، ئینجا بێگومان هەرکەس ژیر بێت بە هەندێ بیرکردنەوەوە بۆی دەرئەکەوێ کە ئەو بڕیاری یەکسانیە هەڵەیە و ئەو دووانە بەراورد ناکرێن بە یەکتر لەبەر ئەم ئەم چەند شتنە ئاشکراو ڕوونانە:

١- کڕین و فرۆشتن دەست ئەدا بۆ قازانج و زیان، بەلام سوود هەمیشە قازانجی مسۆگەرە.

٢- کڕین وفرۆشتن لێزانی ولێهاتن وتێکۆشانی ئەوێ، بەلام سوود هیچ کامی ناوێ و پارەدار پارەکەی ئەداو ئیتر خۆی پاڵی لێ ئەداتەوەو قازانجیشی وەکو گوتمان مسۆگەرە.

٣- سوود خواردن خەڵك پەك ئەخات و ئەیوەستێنێ لەکارو کاسپی و پیشەسازی کە ئەوەش بە زیانی خەڵکی تەواو ئەبێ بە پێچەوانەی کڕین و فرۆشتنەوە.

٤- لەسووددا ئەو زیادەیە لەماڵی هەژارو داماوەکە هەروا ئەڕوا بە خۆڕایی بەبێ بەدەل و بریتی لە هەموو کاتێکدا، بەلام کڕین و فرۆشتن ئەگەر هەندێ جار بڕوا ئەوا لە هەندێ جاردا قازانجی دەست ئەکەوێتەوە.

٥- بێجگە لەمانە ئەفەرموێ: هەموو شەڕو خراپەی کە باسمان کردن لە سەرەتاو پێش گەیشتن بە ئایەتەکە کۆئەبنەوە لە سووددا و کڕین و فرۆشتن پاك و خاوێنن لێیان.

فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾

بێگومان پێش هاتنی ئیسلامو تاکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بەبێ لێپرسینەوە سەرکرابووە سوود خواردن، بەجۆرێ بوو بوو بە شتێکی گەورەو گرنگ لە ئابووریو ژیانی کۆمەڵایەتی دا، ئینجا قورئان وەك قەدەغەی کرد، چارەسەری ئەوەشی کرد کە لەو قەدەغەکردنەوە کاری ئابووریو کۆمەڵایەتی بشێوێو بکەوێتە لەرزە، ئەوەش بەمە کە ئەم یاسای قەدەغەیە هەر بۆ داهاتوو بێتو نەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەلە پێشەوە بووە، ئەم چارەسەرەشی بە شێوەی یاسایەکی گشتی هێنا نەك تایبەتی هەر بەو سوودەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ئینجا هەرکەس پەندو ئامۆژگاریەکی بۆ هات لەلایەن پەروەردگاریەوە، وەك ئەم ئامۆژگاریەی کەلەم ئایەتەدا کردی بۆ قەدەغە کردنو کۆتایی هێنان لە ڕەوا دانی سوودو خواردنی، ﴿فَٱنتَهَىٰ﴾ ئەو کەسەش کۆتایی هێنا ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ ئەوا بۆ خۆیەتی ئەوەی کە تێپەڕی کردووە لە پێش ئامۆژگاریەکەدا، واتە هەرچی وەرگرتووە لێی ناسەنرێتەوە، ﴿وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وە کاری ئەو حەواڵەی خوایە، لەمەدا پاداشتی بداتەوە لەسەر ئەو کۆتایی هێنانەی، یا لەمەدا یارمەتی بدات بۆ نەگەڕانەوە بۆ کاری لەوەو پێش، یا لە ڕۆژی دوایی دا خوا خۆی ئەزانێ چی دەربارەی ئەکات، ئەم فەرموودەیە زۆر بەکارە بۆ تەمێ وەرگرتنو کۆتایی هێنان، هەمیشە ئەیخاتە نێوان ترسو هیواوە، ﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ هەرکەس بگەڕێتەوە بۆ باری لەوەو پێشی، بەم ڕەنگە سوود بخواتو بە شتێکی ڕاستو ڕەوای بزانێو بەربەرەکانی لەسەر بکات ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانە بۆ هەمیشەیی لەو ئاگرەدا ئەمێننەوە، چونکە شتێ کە خوا حەرامی کردووە ئەوا بە حەڵاڵی دائەنێن، هەرکەسیش بەو جۆرە بێتو لەسەر ئەو بارە بمرێ بێبڕوایەو بێبڕواش جێگای دۆزەخە بە بێبڕانەوە - خوا بمانپارێزێ لەسزای دۆزەخ - ئینجا قورئان ئەو سوود خۆرانە ئەترسێنێ بەبێ پیتو فەڕی سوود، بڕیاری پیتو فەڕ ئەدا بۆ خێرو صەدەقەکە دژو بەرامبەرە بۆ سوود، ئەفەرموێ: ﴿يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ خوا سوود کەمو بێپیتو فەڕ ئەکات، ﴿وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾ وە خێرو خێرات زیادو پیت دار ئەکات، بەڵێ بەڕاستی هەڕەشەو بەڵێنەکەی خوا ڕاستە، ئەوانەی کە سوود خۆرن هیچ خێرو خۆشیەك نابینن لە ماڵو سامانە پیسەکەیان، پاڕوویەك

بەبێ داخ و خەفەت ناخۆن، بەخۆشی ناژین و بە خۆشیش نامرن، لەپاش خۆیان ماڵ و داراییەکەیان بە ماوەیەکی کەم ئامێنێ و بێ سەرو شوێن ئەڕوا، هەر گەل و وڵاتێك سوودی تێدا بڵاوببێتەوە ــ هەرچەند بە ڕواڵەت دارایی و هۆی گوزەران و ژیانی خۆشی زۆر بەلێشاوبێ ــ ئەو گەل و وڵاتە ژیانیان تاڵە و بەبێ ئارام و ئاشتی ژیان ئەبەنە سەر، مرۆڤایەتی لەناویاندا هەڵنەگیرێ، ئینجا لەم بارەیشەوە هەر کەسێك کە زەکات دەرو خێرو خێرات کەرە هەمیشە لە خۆشی و ئارام و ئاشتی دا ئەبینرێ، هەر گەل و کۆمەڵێك کەدامەزرابێ لەسەر کۆمەکی و دەست گیرۆیی و بەزەیی و چاوپۆشی لەنێوان یەکتردا، لەپشت بەستن بە خواو چاوەڕوانی پاداشتی خوا، ئەوا خوا هەمیشە ئارام و خۆشی و کامەرانی ڕشتووە بەسەریاندا، پیت و فەڕی خستۆتە سامان و ڕۆزی و ڕۆڵەیان، تەندروستی و هێزو ڕەحەتی پێداون، ئەو کەسانەی کە ئەم حەقیقەتانە نابینن لە ژیانی مرۆڤدا، بەڕاستی یان خۆیان لە ئاستی دا کوێر ئەکەن، یان بە خۆیان نازانن پەردەی ئەستوور هێنراوە بەسەر چاویاندا لەلایەن سەرمایە دارە سوود خۆرەکانەوە، هەر لە جیهاندا سوود بەو جۆرە بێپیت و فەڕئەکات، خێرو صەدەقەش بەو جۆرە پیت و فەرو خۆشی تێئەخات، ئیتر با پیت و فەڕو خۆشیەکەی لە ڕۆژی دوایی دا بوەستێ وەك لە چەند حەدیسدا هاتووە، با ئەو سزاو ئازارو بەدبەختیەی کەلە سوود خواردنەوە پەیدا ئەبێ بوەستێ کە سوود خۆر لە ڕۆژی دوایی دا دووچاری ئەبێ. ئەو کەسانەی کە سەر ئەکەنە سوود خواردن زۆر سپڵە و ناسوپاسن بەرامبەر خوای خۆیان، چونکە هیچ نادەن لەڕێی خواداو دەست گیرۆیی بەندە هەژارەکان ناکەن، زۆر تاوانبارن چونکە ئەو ماڵەی کە خوا پێی داون لە خوێن مژینی هەژارەکاندا بەکاری ئەهێنن، هەمیشە ئەیانەوێ هەژاری و بێنەوایی بڵاو بێتەوە تا سوود زیاتر بەبرەو بێت، ئینجا پاش ئەوەی کە خوا سوودی حەرام کرد هەرکەس بە حەڵاڵی دابنێ، بە بێبڕوا دائەنرێ و لەڕیزی موسڵمانان دەرئەچێ، ئیتر هەرچەند بە دەم خۆی بە موسڵمان بزانێ و فەرزەکانیش بەجێبێنێ، جا ئەم فەرموودە سامناکەی دا بە گوێی هەموودا: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ﴾ خوا هیچ کەسێکی ناوێ کە سەربکاتە سپڵەیی و ناسوپاسی، یا سەربکاتە بێبڕوایی بەم ڕەنگە ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە ئەو بە حەڵاڵی دابنێ و سووربێ لەسەر ئەوە، سەر بکاتە تاوان و خراپەکاری، کەواتە ئەوانەی ناوێ کە سوورن لەسەر سوود خواردن و بە ڕەوای ئەزانن، هەرکەسێکیش خوا نەیەوێ لە ڕۆژی دوایی دا بەش بڕاوو بێیارمەتی دەر ئەبێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ

---

ئینجا بەرامبەر ئەو ڕووپەڕە ڕەشەی ئەو بەش بڕوانە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوەی چاکەیان کرد، ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەڕێك و پێکی نوێژیان بەجێهێنا، ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەکاتیان دا، ئەم دوو کردەوەیە لوتکەی هەموو چاکەکانن و دوو پایەن لە پێنج پایەکانی ئیسلام، گەورەترین کردەوەی لەشی و دەروونین، لەبەرئەوەی لەناو کردەوە چاکەکاندا بە تایبەتی باسی کردن، ﴿لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ بۆ ئەوانەی هەیە پاداشتی بەڵێن و پێدراوی خۆیان لای پەروەردگاریان، ﴿وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ هیچ ترسیان نابێ لە ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی، ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ ئەوانە غەمبار نابن لەو ڕۆژەدا بۆ هەر شتێ کەلە دەستیان دەرچووە لە جیهاندا.

بەڕاستی باسی زەکات بەرامبەر سوودو سوود خواردن ئێجگار بەجێیە، چونکە زەکات مانای بەخشینی ماڵە بەخۆڕایی و بەبێ بەدەل! ئەم زەکاتە کە پایەیەکی گرنگە لە پایەکانی ئیسلام، مایەی چاك کردنەوەی ماڵ و دەروونی خاوەن ماڵە، هۆی یەکێتی و برایەتی و خۆشەویستی و بەهێزی گەلە، هەروەها تاقی کرایەوە لە چەند چەرخدا کە چارەسەرە بۆ زۆربەی قۆرت و گرێ کوێرەکانی گەل، ئەگەر کاربەدەستی موسڵمان بە تەواوی وەری گرێ و بە گوێرەی فەرمانی خوا بیگەیەنێ بەجێی خۆی، ئەم زەکاتە کە داهات و دەست کەوتێکی گەورەیە، چونکە بریتیە لەدوو و نیو لە سەدای هەموو سامانی گەل تا(٥٪) و(١٠٪) و(٢٠٪) ئەم دەست کەوتە زۆر قەبەیە بە سووك و ئاسان وەرئەگیرێ و بەخۆشی دڵ و دەروونەوە، بەبێ منەتنان، بەو جۆرە وەرئەگیرێ لەوانەی کە ئیسلام پەروەردەیان ئەکات و پێیان ئەگەیەنێ، ئەم زەکاتە کە ئەوە پلەو پایەو نرخیەتی، بە داخەوە بەهۆی دوورکەوتنەوە لە ئیسلامەوە گەورەیی و گرنگیەکەی فەرامۆش کراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە دەروونی زۆر کەسدا بە شتێکی کەم بایەخ و بێنرخ سەیر ئەکرێ، سەرسوڕئەمێنێ لەوەی دەوڵەتی ببێ ئەو هەموو خێرو بێرە کۆبکاتەوەو بیگەیەنێ بە شوێنی خۆی، لە کاتێکدا کە زەکات هەر لەدەست دارو دەوڵەمەندان ئەسێنرێ و بۆ هەژارانیش ئەگەڕێتەوە، بەڵام سەرسوڕنامێنێ لەو هەموو باخ و سوودو زەوییە کە دەوڵەتەکان بە زۆر ئەیسێنن زۆر تر لە هەژاران و هەژاران کەمتر لێی

بەهرەمەند ئەبن. لە چەرخی نەفامی ئیسلام دا ڕژێمی سوود خۆری لەناو گەلدا ڕیشەی داکوتا بوو، بە جۆرێکیش بوو کە کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتیان بەسترابوو بەو ڕژێمەوە، باوی قورئانیش وایە لە چارەسەرکردنی ئەو جۆرە نەخۆشیانەدا توندو تیژی بەکار نەئەهێنا، یەکسەر لە ڕێوە قەدەغەی نەئەکردن، بەڵکو بەرەبەرەو بە چەند قۆناغێك، وەك لە مەسەلەی قەدەغەکردنی عەرەقدا بەو جۆرەی کردو بە چوار قۆناغ بۆ یەکجار قەدەغەی کرد، جا لەبەرئەوە لە مەسەلەی سوودیشدا پەلەی نەکردو هەر لە یەکەمجارەوە قەدەغەی نەکرد، بەڵکو ئەمیش چوار قۆناغی بڕی:

یەکەم: لە سوورەتی ڕۆمدا کە دەست نیشان ئەکات بەبێ فەڕی سوود بەلای خواوەو ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ ﴾ ئەو قەرزەی کە داوتانە بۆ سوود بۆئەوەی بەسەر ماڵی خەڵکدا زیاد بکات ئەوە لای خوا زیاد ناکات.

دووەم: لە سورەتی ﴿النساء﴾دا کە تەشەر ئەدا لە جوولەکە بە چەند تاوانێ کە بوو بەهۆی ئەوە تۆڵەیان لێ سەنرا، یەکێ لەو تاوانانە سوود وەرگرتنیان بوو کە جڵەوگیری کرابوو لێی، فەرمووی: ﴿ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ ﴾ ئەو دوو ئایەتە هەرچەند سوود قەدەغە ناکەن لەسەر خەڵك، بەڵام پەندو تەمێیەکی ئاشکرای تیایە بۆ موسڵمانان کە دوور کەونەوە لە سوود خواردن.

سێیەم: سورەتی ﴿آل عمران﴾ کە جڵەوگیری ئەکات لێی و بێزاری دەرئەبڕێ و لەبەر چاو ناشیرینی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە، سوود مەخۆن بە شێوەی چەند بەرامبەری.

ئەم ئایەتە هەرچەندە جڵەوگیری لێ ئەکات و قەدەغەی ئەکات، بەڵام بە تەواوی نادا لەبنی و هەموو جۆرەکانی قەدغە ناکات وەك لەم شوێنی چوارەمی ئێرەدا کە بەم حەوت ئایەتە درێژەی دا بە باسەکەی و بە تەواوی لە ڕیشەی هێناو هیچی تیا نەهێشتەوە، بە تایبەتی ئەم چوار ئایەتەی کە دێت و مەبەستەکە باشتر ڕوون ئەکاتەوە، هەڕەشەیەکی یەکجار سامناکی تیایە دەربارەی ئەوانەی کە واز لە سوود ناهێنن، ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە نا فەرمانی،

﴿وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ﴾ واز بێنن لە هەر ئەندازە سوودێکتان کە بەلای خەڵکیەوە ماوەتەوە. لەئایەتی یەکەمدا چاوپۆشی کرد لەو سوودانە کە لە پێش قەدەغە کردندا وەرگیران‌و خوراون، ئەوە بوو فەرمووی: ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ئەوەی کە تێپەڕی کردووەو وەرگیراوە لیێ ناسێنرێتەوە، ئینجا لەوانەیە گومان ببرایە کە ئەوەش مابێتەوەو نەگیرابێ هەر چاوپۆشی لیێ ئەکرێ، لەبەرئەوە لێرەدا ڕوونی کردەوەو فەرمووی: دەست لەوانە هەڵگرن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواداران، واتە ئەگەر بەڕاستی بڕواداران، چونکە نیشانەی بڕوای ڕاستەقینە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریە، بەڵێ بێ‌گومان ئەوان‌و هەرکەسێ تریش بە مەرجێ لەڕیزی بڕوادار دەرناکرێن کە هیچ جۆرە ڕەخنەو نێگەرانی‌و بێزاریان نەبێ لە هیچ یاساو بڕیارێکی خوا، بەدڵ مل کەچ بن بۆ هەر فەرمانێکی خواو خۆیان بە ستەمکارو تاوانبار دابنێن لەسەر هەر بێ شەرعیەك کە هەڵسن پێی، هەرکەس بەو جۆرە نەبێ لەشەرعدا بڕوادار نیە، هەرچەند بەدەم جاڕی بڕواداری‌و مل کەچی بدا بۆ خۆی‌و فەرزەکانیش بەجێ بێنێ.

خوا میهرەبانی لەگەڵ کردن وازی لیێ هێنان لەوەی کە خواردبوویان پێش هاتنی ئایەتی قەدەغەکردن، داوای ئەوانەی لیێ نەکردنەوە، ماڵەکانی داگیر نەکردن نە هەمووی‌و نە ئەو بەشەشی کە تێکەڵی سوود بوو بوو، چونکە لە ئیسلام دا تا یاساو بڕیار دەرچنەچێ‌و ڕانەگەیەنرێ قەدەغەکردن نیە یاساو بڕیار لە ئیسلام دا ناگەڕێتەوە بۆ ڕابوردوو کە ئەوەش زۆر ڕاست‌و بەجێ‌یەو پڕە لە داد، جا لەبەرئەوە لەو قەدەغە کردنەدا هیچ ئاژاوەو سەر شێوانێکی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری ڕووی نەداو بە ئاسانی چارەسەری ئەو دەردە کوشندەی کرد کە چەند چەرخ‌وزەمان جێگیربوو بوو لە لەش‌و دەمارو هەست‌و دەروونی ئەو گەلەدا.

ئیسلام هەرچۆنێ یاساو بڕیارەکانی پڕ لە دادو ڕاستیە، لە هەمان کاتدا پەیوەستیان ئەکات بە بڕواو لە خواترسی بڕوادارانەوە، بەهۆی ئەوەوە چاودێرو پاسەوانی دەرەوە بەهۆی زۆرو دەسەڵاتی کاربەدەستەوە، نەك وەك یاساو بڕیارە دەست کردەکان کە ئەو

چاودێرو پاسەوانە دەروونیەیان نیەو هەر زۆرو دەسەڵاتی کاربەدەست چاودێرو پاسەوانیەتی، بێگومان فێڵو دزی هەر لە پاسەوانی دەروونی ناکرێو فێڵو دزی لە پاسەوانی تر بە تەنیا ئاسانە، جا لەبەرئەوە ئیسلام کاروباری خۆی بە ئاسانی بەڕێوە ئەبات و لەسەدا سەد لە ئیش و کاری خۆی دا سەرکەوتووە، بەڵام ڕژێمە دەست کردەکان سەرکەوتوونین و کاروباریان قورس و گرانەو پۆخڵەو ناپوختە!

بەشی یەکەمی ئەم ئایەتە هاندانەو خستنە سۆزو پەرۆشە لەسەر کۆتایی هێنان لەو سوودە پیسەی کەلە پێشەوە کراوەو ماوەتەوە لای هەژارەکان، ئینجا لەبەشی دووەمدا هەڕەشەیەکی زۆر سامناك ئاڕاستە ئەکات کە هەرکەس فام و تێگەیشتنی هەبێ خۆی بۆ ناگیرێ و دەست بەجێ کۆتایی ئەهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ ئەوەی کە فەرمانم پێدان نایکەن، واتە لە خوا ناترسن و واز ناهێنن لەو سوودەی کە ماوەتەوە، ئیتر بە حەرامی ئەزانن یان نا، ﴿فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ﴾ ئەوا بێگومان ئاگات لە جەنگێکی گەورە بێت لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە، واتە ئامادەبن خواو پێغەمبەری خوا جەنگتان لەگەڵ ئەکەن!

هاوار بۆ ئەو وتە سامناکە، جەنگ لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە، جا مرۆۆ لاوازو بێکەس بۆ کوێ دەرئەچێ و چی پێئەکرێ بەرامبەر ئەو هێزو دەسەڵاتە بێ سنوورە کە بونەوەر لە ئاستیدا ئەلەرزێ!

لەپاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بەکار بەدەستی مەککە کە جەنگ بکات لەگەڵ ئەوانەی کە کۆتایی نەهێنن و داوای سوودەکەیان بکەن، لە خوتبەی حەجی ماڵئاوایی دا فەرمووی:(هەموو سوودێ کەلە سەردەمی نەفامی دا کرابێ لابراو لە ژێر ئەم دوو پێمەدایە، یەکەم سوودێ کەلای بەرم سوودی عەباسی مامەمە)، فەرمانی ئەدا بە سەندنەوەی ئەو سوودانەی کەلە چەرخی نەفامی دا خورابن، کەواتە لەسەر کاربەدەستی موسڵمانە ـ لەناو گەلی موسڵمان داـ جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەی کە دەست بەرداری ڕژێمی سوود خۆری نابن، لە فەرمانی خوا سەرکێشی ئەکەن هەرچەند بڵێن ئێمە موسڵمانین، چونکە ئەگەر بەحەڵاڵی دائەنێن ئەوا لەڕیزی بڕواداران دا دەرئەچن و هەڵئەگەڕێنەوە لە

ئیسلام، كه ئەوانەش ئەگەر تەوبە نەكەن ئەبێ بكوژرێن، ئەگەر بەحەرامو تاوانیشی ئەزانن‌و نەیشی كەن، ئەوا هەڵئەگەڕێنەوە لە میری‌و كاربەدەستی ئیسلام، دیارە ئەگەر لەمەشدا تەوبە نەكەن خوێنیان حەلاڵە، وەك كۆمەڵی خەوارج كە ئیمامی عەلی -خوا لێی ڕازی بێ- جەنگی لەگەڵ كردن‌و كوشتنی، لەپاش لەدنیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانە كەلە زەكات داندا سەرپێچیان كرد حەزرەتی ئەبوبەكر -خوا لێی ڕازی بێ- جەنگی لەگەڵ كردن، هەرچەند شایەتومانیان ئەهێناو نوێژیشیان ئەكرد، چونكە ئەگەر بڕوایان بە زەكات نەبووبێ ئەوا بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دەرچوون، ئەگەر بڕوایان بووبێ‌و سەرپێچیان كردبێ لەزەكات داندا ئەو كاتە لە میریی‌و كاربەدەستی ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، لەسەر هەر بار كوشتن‌و جەنگ كردن لەگەڵیاندا ڕەوا بوو بەپێی حەدیسی صحیح‌و بڕیاری هەموو هاوەڵەكان‌و لە پاش ئەوان پێشەواو زاناكانی تری ئیسلام.

ئەو جەنگەی كە قورئان جاڕی پێدا هەمیشە هەڵگیرساوو بڵێسەدارە بۆ سەر ئەوانەی كە بەو ڕژێمە ڕەفتار ئەكەن، وە هەرگیز كوژانەوەی نابێ، چونكە ئەگەر كاربەدەستی موسڵمان بوو ئەبێ لێی داو بەربەستی بكات، وە ئەگەر نەبوو خوا لە چەند بارو ڕوویەكی ترەوە‌و بە چەند شێوە جەنگی خۆی ئەكات، ئەوەتا ئەبینین ئەوەتەی ئەو ڕژێمە پیسە كرا بە باو لە جیهاندا خوا ئارامی‌و خۆشی نەهێشت‌و بە چەند شێوەیەك جەنگ ئەكات لەگەڵ جیهان‌و جیهانیان، جەنگ لەگەڵ دەمارو دڵ‌و دەرووندا، جەنگ لەگەڵ پیت‌و فەڕو ئارامی‌و خۆشی دا، جەنگ بە ئاژاوەو دووبەرەكی‌و تێك بەردان‌و جەورو ستەم كردن لە یەكتر، لە پاش ئەوانە جەنگی چەك‌و ئاگری وێران كەر كە بێجگە لەو دووجەنگە جیهانیە گەورەی كە ڕوویاندا، بێجگە لە جەنگی سێیەم كە چاوەڕوانی بۆ ئەكرێ‌و هەمیشە خەڵك لە دڵە لە ڕزەدایە لە ترسی ئەو، بێجگەلەوجەنگەگەورەوگشتیانەئەوهەمووجەنگەبچووكانەی تر كە پرشی هەموو شوێن‌و هەموو كەسێكی گرتووەتەوە، بێگومان لەڕووی ڕاستی دا ئەم هەموو جەنگ‌و خراپە ئەگەڕێتەوە بۆلای سەرمایە دارە گەورەكانی جیهان‌و ئەوان ئەو هەموو ئاگرە ئەنێنەوە.

وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسۡرَةٖ
فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ
فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ

---

قورئان یەکەم چین‌و تاقمی بانگ کرد، هەروەها بانگی هەموو چین‌و تاقمەکان ئەکات بۆ گەڕانەوەو تۆبە کردن لەو کارە پیسە بۆ شتێکی پاک‌و خاوێن لە جەورو ستەم، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُبۡتُمۡ﴾ ئەگەر ئەگەڕێنەوەو تۆبە ئەکەن لەوەی کە هۆی جەنگکردنی خوایە لەگەڵتان، ﴿فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ﴾ ئەوا سەرمایەکانتان بۆ خۆتانە، ئەوکاتە ﴿لَا تَظۡلِمُونَ﴾ ستەم ناکەن لە قەرزارەکان، ﴿وَلَا تُظۡلَمُونَ﴾ لەلایەن ئەوانەوە ستەمتان لیٚ ناکریٚ.

ئەگەر گەڕانەوەو تۆبەتان کرد ئەوا ڕزگار ئەبن، ئەگەر هەر لەسەر باری خۆیان سوور بوون، ئەوکاتە یا سوود بە حەڵاڵ دائەنێن یان بە حەران، ئەگەر بە حەڵاڵ دابنێن ئەکوژرێن‌و هەر سەرمایەکتان بوو بۆ(بیت المال)ەو هەر ماڵێکی تریان ببێ بۆ میرات بەرانە بەلای ئیمامی حەنەفیەوە، بەلای ئیمامی شافیعیەوە هەموو ماڵیان بۆ(بیت المال)ە، ئەگەر سوودو بەحەرام دائەنێن بەلای(ئیبن‌و عباس‌و ئیمامی جەعفەری صادیق)ەوە ئەگەر تەوبە نەکەن ئەکوژرێن‌و ماڵەکەیان بۆ میرات بەرانە، بەلای غەیری ئەوانەوە بەند ئەکرێن‌و ماڵەکەیان لیٚ ئەسێنریٚ تا ئەمرن، ئینجا ئەدریٚ بەمیرات بەران، بەکورتی بەهەرحاڵ بەرگری ئەکرێن لەوەی هیچ تەصەوڕێك لە ماڵەکانیاندا بکەن.

شەریعەتی ئیسلام پێی خۆشە موسڵمانان هەوڵ‌و تێکۆشانێك بکەن بۆ قازانج‌و زۆر کردنی ماڵ‌و سامان، چەند ڕێگەیەکی دیاریی کردووە بۆ ئەوە کە هەموو ئەو ڕێگەیانە پاک‌و خاوێنن‌و بەرژەوەندی گەل‌و ئەندامی گەلی تیایە، سوودو هەر جۆرە کەسێکی تری کە قەدەغە کردووە لە خۆڕایی نەیکردووە، بەڵکو ئەو قەدەغانەش پڕ لە خێرن‌و خوا میهرەبانی کردووە بەو قەدەغە کردنە، ئینجا باسی ئەو قەرزارانەمان بۆ ئەکات کە دەست تەنگن بەم

یاسا پڕ لەخێرو بەرەکەتە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ﴾ ئەگەر قەرزدارێکی دەست تەنگ بوو نەیتوانی قەرزەکەتان بداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾ ئەوە پێویستە مۆڵەتی بدەن هەتا کاتی بوون و دەسەلات پەیداکرنی، ﴿وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەگەر قەرزەکەتان بکەن بەخێرو صەدەقە بەم ڕەنگە گەردنیان ئازاد بکەن ئیتر لە هەمووی یان لەهەندێکی ئەوە چاکترە بۆتان، ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن و تێ بگەن، بەڵێ بێگومان ئەم ئازاد کردنە چاکترە، چونکە پاداشتی لای خوا زۆر لەماڵی دنیا باشترە، بێگومان ئەم گەردن ئازاد کردنە مایەی یەکێتی و برایەتی و سۆزو بەزەییە لەناو موسڵمانانەدا.

ئیسلام ئا بەو جۆرە میهرەبان و بەزەیی دارە، قەرزارە هەژارە کە ناگرێتە گازو گرمش و بەندو کۆتی ناکات، بەڵکو یەکێ لەم دوو ڕێگەی بۆ خاوەن قەرزەکە دیاریی کردووە، ئینجا بەزەیی و میهرەبانیەکەی هەر بەوە نەوەستاندۆتەوە بەڵکو یەك لەسەر هەشتی هەموو زەکاتی تەرخان کردووە بۆ هەژارە قەرزارەکان کەلەوە قەرزاریەکەیان نەهێڵن و بیوژێننەوە، ئینجا وەرە لەم ڕوانگەوە سەرنجێکی ڕژێمی ڕەشی سوود خۆریش بدە کە چۆن خوێنی هەژارەکان ئەمژێ و قەرزیان لەسەر کەڵەکەئەکات کە بەهیچ ڕەنگ لە ژێری دەرناچن، وە سەرنجێکی دڵە ڕەش و ڕەقەکانی سەرمایەدارە سوود خۆرەکانیش بدە کە هەمیشە ئاواتیان ئەوەیە هەژارەکان زۆرترو هەژار تر ببن بۆ ئەوەی باشتر دەست بپێچن بەدامێنی ئەماندا و قەرزی زۆرتریان لێ بکەن!

بەدوای ئەوهەمووتەمێ و ئامۆژگاری و هەڕەشەو ترساندنەدا ئەو فەرموودەیە ئەهێنێ کە بەڕاستی دڵ ئەخاتەلەرزەوموچڕکەبەلەش ئەهێنێ، ڕۆژێکی بیرئەخاتەوە کەئاواتی تیا ئەخوازرێ بۆئەوەی هەموودنیا وئەوەندەی تریش ببێ وبدرێ لەڕێی ڕزگاربووندا، لەو ڕۆژەدا هەموو هەق و حیسابێك ئەکرێ و هەموو کەس بە بەرو بەرهەمی کردەوەی ئەم جیهانەی ئەگات، ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێك کە تیا ئەگێڕێنرێنەوە بۆلای خواو بۆ حوزورو بەردەم بارەگای خوا بۆ حیساب لێ پرسینەوە،

ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ۚ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ ۚ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ ۚ

---

**﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ هەموو كەسێ پاداشتو سەرەنجامی ئەوەی کە کردوویەتی لەم جیهانەدا پێی ئەدرێ، ئیتر چاك بێت یان خراپ ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ، واتە نە ئەجرو پاداشتیان کەم ئەکرێتەوەو نە زیادە تۆڵەشیان لێ ئەسێنرێ، یان بەکەم کردنی چاکەوزۆرکردنی خراپە، بێگومان هەرکەس ترسی ئەو ڕۆژە لەدڵیداجێگیربێ هەرگیز ناتوانێ سەر بکاتە گوناهو تاوان، وە ئەگەر خراپەی کرد پەشیمان ئەبێتەوەو ڕووئەکاتە خوای خۆی، بە تایبەتی لێرەدا ئەو فەرمانو جڵەوگیریانەی کە لەپێش ئەم ئایەتەدا تێپەڕیان کردو ئەم ئایەتە هات بە دوایاندا، ئەو فەرمانو جڵەوگیریانە فەرامۆش ناکات، وە زۆر ئاسانە لەسەری مۆڵەت دانی قەرزار یان گەردن ئازاد کردنی.**

**(ئیبنو عەباس) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە دواترین ئایەتێکە هاتە خوارەوە، بە ڕاستی ئەمەش هەر زۆر ڕاستو بەجێیە کە دواترین ئایەت بێت، چونکە ئەو حەلە هەر چۆنێ بەتایبەتی هاندەرو پاڵپێوەنەر ئەبێ بۆ ڕەفتار بەم ئایەتانەی کە هاتن لەبارەی سوودەوە، هەروەها ئەبێ بە هاندەرو پاڵدەر بۆ ڕەفتار بە هەموو قورئان.**

**ئینجا دێتە سەر باسی قەرزی بێسوودو یاسا دائەنێ بۆ پاراستنی بە نووسینو شایەتو بارمتە وەرگرتن لەسەری، هەروەها بازرگانی ئەکات کە قەرزی تیا نەبێ، ئەمانە بەو جۆرە باس ئەکات بەو جۆرە قورئانیە بێ وێنەی کە دەست نادا بۆ دەستکاری کردنو دەست تێوەردانی وتەو مەبەستەکانی، ئەم یاسا گرنگەشی دانا نزیکی دە چەرخ پێش ئەوەی کە خەڵکی بیربکەنەوە لە شتی وا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ﴾ کاتێ کە مامەڵەتان بە قەرزکرد ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تا ماوەیەکی ناوبراوی دیاریی کراو ﴿فَٱكْتُبُوهُ﴾ ئەو قەرزە بنوسن بەو شێوەی کە پێویستە، ئیتر مەبەست لەم مامەڵە قەرزە سەلەم بێ ـ وەك ئیمامی بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕێتەوە ـ کە فەرموویەتی: خوا سەلەمی حەڵاڵ کرد لە قورئانەکەی داو درێژترین ئایەتی لەبارەیەوە**

هێنایە خوارەوە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە، یا مەبەست گشتیەو هەر قەرزێکی تریش ـ وەك هەندێ ئەفەرموون ـ یان مەبەست قەرزی کڕینو فرۆشتنە ئیتر بەم ڕەنگە شتێ بفرۆشرێ بە پارەو بەدەڵی قەرز تا ماوەیەك یا شتێکی قەرز بفرۆشرێ بە پارەوماڵێکی حازر کە پێی ئەوترێ(سەلەم). زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەم ڕای سێیەمەن، شێوەی گشتی ئایەتەکەش هەر ئەم ڕایە نیشان ئەدات، لەسەر ئەم ڕایە زەمەخشەری چەند شیرین فەرموویە: کاتێ مامەڵەتان لەگەڵ یەکتر کرد بە قەرزەکە بیدەن یان وەری گرن کە هەردوو جۆرەکەئەگرێتەوەکەلەم ڕای سێیەمەدایە. بەهەر حاڵ لەسەر شێوە شەرعیەکەی مامەڵەیەکی باشەو حەڵاڵکراوە، چونکە پێویستیو بەرژەوەندی سەلەم کەرو سەلەم ئەریشی تیایە.

ئەم نووسینەبە رای زۆربەی زانایان سوننەتە، وەبەلای هەندێکەوە فەرزە، بە هەر حاڵ شتێکی زۆر ڕاستو بەجێیە، چونکە مەترسی ناکرێ لە لەبیرچوونو ئینکارو ئاژاوە وەك لەدوای ئایەتەکەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، ئینجا باسی چۆنێتی نووسینەکەو نووسەرەکە ئەکات کە کەسێکی سێیەم بێت کە بێ لایەن بێت نەك هیچ کام لە مامڵە کەرەکان کە گومانی لایەنگیری پێ ببرێ، فەرمان ئەدات کە ئەو نووسەرە بەڕاستیو دادپەروەریی شتەکە بنووسێ بەبێ زیادو کەم، کەواتە ئەبێ زاناو لە خوا ترسو پاك بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ با ئەو سەنەدو نووسراوە کەسێك لە ناوتان بینووسێ کە نووسەرێکی ڕاستو دادپەرەوەر بێ کە زیادو کەم نەنووسێو لایەنگیری نەکات، ئەبێ ئاگاداربێت بەسەر هەموو شتێکدا کە بۆئەو مامەڵەیە لەشەرعدا پێویستە، کەواتە وەك زانایان فەرموویانە پێویستە لەسەر کاربەدەست ئەو جۆرە نووسەرانە دیاریی بکات بۆ نووسینی ئەو سەنەدو نووسراوانە، جڵەوگیری هەر نووسەرێك بکات کە شایانو شیاونین بۆ کارەکە، پاشان جڵەوگیری ئەو نووسەرانە ئەکات لەسەرپێچی کردن، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ﴾ با سەرپێچی نەکات هیچ نووسەرێك لەو نووسەرانە ﴿أَن يَكۡتُبَ﴾ لەنووسینی نامەو سەنەدی ئەو مامەڵانە ﴿كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ﴾ لەبەرئەوەی خوا فێری نووسینی کردووە، واتە با چاکە بکات لەگەڵ خەڵکی دا هەرچۆنێ خوا چاکەی کردووە لەگەڵ ئەودا، با سەرپێچی نەکات لەنووسین بەو جۆرەی کە خوا فێری کردووە، یا لەسەر ئەو بارەی کە خوا باسی کرد، بە هەرحاڵ خوا داوا ئەکات لەو نووسەرانە کە بەبێ گیرو گرفت هەڵسن بەو نووسینە، ئیتر لە شێوەی فەرزی کیفایە بێ ـ کە هەندێ ئەفەرموون ـ یا بە شێوەی سوننەت کە ڕای زۆربەی لەسەرە.

﴿فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـًٔاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٌ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ﴾

**هەرچەند لە جڵەوگیری لە سەرپێچی کردنەکەوە وەرئەگیرێ فەرماندان بە نووسین، بەڵام لەبەر گرنگی کارەکە ئەوا بە ڕوونی فەرمان ئەدات بەو نووسینە ﴿فَلۡيَكۡتُبۡ﴾ دەی با ئەو نووسەرە ئەو نامەو سەنەدە بنووسێ بەو جۆرەی کە باس کرا، بێگومان ئەو نووسەرە نابێ قسەی خۆی بنووسێ، بەڵکو ئەبێ قسەی قەرزارەکە بنووسێ، چونکە لەوانەیە قەرز دەر شتێ بڵێ زیانی قەرزارەکەی تیابێ، بەڵام قەرزارەکە داماوەو خوا خوایەتی قەرزەکەی بداتێ لەبەرئەوە ناتوانێ مل ملانێ بکات، هەم قەرزارەکە دانی نا بە قەرزو هەقەکەدا ئیتر کارەکە تەواوەو بەدەمی خۆی قەرزەکە لەملی خۆی توند ئەکات، شایەتیش لەسەر قسەی ئەو ئەگیرێ، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ﴾ با ئەو کەسەی کە قەرزو هەقەکەی لەسەرە دەقی نووسراوەکە بڵێ، ﴿وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ با بترسێ لە خوای پەروەردگارو خۆی بپارێزێ لە درۆو ناهەقی، ﴿وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـًٔاۚ﴾ هیچ شتێکی لێ کەم نەکاتەوە، بەڵکو بە تەواوی بیڵێ و دانی پیابنێ، ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەگەر ئەو کەسەی کە هەق و قەرزەکەی لەسەرە ﴿سَفِيهًا﴾ گێل و ناژیر بێ، ﴿أَوۡ ضَعِيفًا﴾ یا توانای نەبێ لەبەر منداڵی یا زۆر پیری، ﴿أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ﴾ یا ناتوانێ خۆی بەخۆی دەقی نووسراوەکە بڵێ، لەبەر لاڵی یا لەبەر هەر شتێکی تر، ئەگەر قەرزارەکە هەرکام لەمانە بوو ﴿فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ با کاربەدەست و کارسازەکەی دەقی نووسراوەکە بڵێ بە نووسەرەکە بەڕێك و ڕاستی و بەبێ زیادو کەم، ئیتر ئەو کاربەدەست و کارسازە باوك و کەس و کاری بێ یا وەصی و وەکیل و زمان زان بێ و قەرزارەکە ئەو زمانە نەزانێ.**

**لێرەدا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە باسی نووسین دوایی هات، ئینجا ئەچێ بۆ باسی خاڵێکی تر کە لە هەموو کڕین و فرۆشتن و مامەڵەیەکدا سوودو بەرژەوەندی تیایە، ئەوەش بریتیە لە شایەت گرتن لەسەری، ئەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ﴾ داوای دوو**

شایەت بکەو دوو کەس لە پیاوەکانتان بکەن بە شایەت، دوو پیاوی موسڵمانی، باڵغی، ژیری، ئازاد، بۆئەوەی لەکاتی پێویست دا شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کەلە نێوانتاندا ڕووی دا، ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ﴾ ئەگەر دوو پیاو نەبوون ﴿فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ﴾ با پیاوێكو دوو ئافرەت شایەتی بدەن ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ لەو شایەتانەی كە پەسەندیان ئەكەنو پێیان ڕازین، بەم ڕەنگە كە بەدین دراو ڕاستگۆیان ئەزانن و هەردوو تەرەف پێیان ڕازین.

لە یەکەم جارەوە داوای دوو پیاو ئەکرێ، چونکە لەناو گەلو کۆمەڵی موسڵمانی ڕاستو ڕێکدا پیاو وا بەدەرەوەو خەریکی ئیشو کارو بەربەرەکانێی ژیانە، وە ئافرەت تێیدا خانو مانە لە ماڵدا پێویستی بەوە نیە ئیش بکات تا بەوە بژی، بەڵکو پێویستە ئافرەت بە کامەرانی بژیەنرێو خەریك نەکرێت بە کاروباری پووچو کەم نرخەوە، دەستی نەگیرێو خەریك نەکرێ لە گەورەترو بەنرخ ترین ئیشی سروشتی خۆی کە بریتیە لە چاودێریو سەرپەرشتیو بەڕێوەبردنی ماڵو منداڵ، بە تایبەتی پەروەردەکردنو پێگەیاندنی کۆرپە ساواکان کە خۆشیو کامەرانی جیهانو پاشە ڕۆژ بەستراوە بەوانەوە، کەواتە لەناو گەلی موسڵمانی ڕێكو پێکدا لەبازاڕو لەناو کۆڕی کڕینو فرۆشتندا زۆرتر پیاو دەست ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر دوو پیاوی ڕێكو پێك دەست نەکەوت بۆ شایەتی، ئەوا ئەتوانرێ ئافرەت دانرێ، بەڵام نەك بە تەنیا، بەڵکو پیاوی لەگەڵ بێت، چونکە زۆرتر پیاو وریاو بە بیرترە، تەنیا ئافرەتێکیش نابێ، بەڵکو ئەبێ دوان بێ، لەبەرئەوەی ﴿أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ﴾ هەرکام لەو دووانە شایەتیەکەی لە بیربچێ ئەوی تریان بیری بخاتەوە، و یەك بیخەنەوە بیری یەکتر تا بە هەردووکیان جێی پیاوێك بگرنەوە، وات ئافرەت بە سروشت دڵی نیە لای ئەو جۆرە مەسەلانە، بەڵکو دانراوە بۆ پەروەردەکرنو بەجێهێنانی کاروباری ماڵ، لەبەرئەوە لەوانەن کە زوو ئەو شتانەیان بیرئەچێتەوە کە لەگەڵ سروشتیاندا نەهاتووە، کەواتە پێویستیان بەو بیر خستنەوە هەیە، بە هەردووکیان شایەتیەکە تەواو بکەن لێیان وەرئەگیرێ، ئینجا ئەمەی کە هەندێ ئافرەت زیرەكو وریا ترن لە زۆر پیاوان بەتایبەتی لەم چەرخە تازەدا کە ئافرەت لادرا لەکاری سروشتی خۆیو خەریك کراوە بەکارو کردەوەکانی پیاو، ئەم جۆرە شتانە ناگیرێن بە دەستەوە ڕەخنەیان پێناگیرێ، چونکە ئەم جۆرە ئافرەتانە کەمو تاكو تەران لە کۆمەڵو زۆربەی خەڵك جیاوازن، لەدانانی یاساو بڕیاردا تەماشای کۆمەڵو زۆربە ئەکرێو گوێ بە تاكو تەرا نادرێ.

وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓاْ

---

بەپێی تێگەیشتنی ئێمە ئەبوایە بیفەرمواپە:(فتذكرها الأخرى) وات هەركامیان لە بیری بچێ ئەو تریان بیری بخاتەوە، بەڵام کە بەو جۆرەی نەفەرموو ئەبێ مەبەستێکی گرنگ‌و حیکمەتێکی تیابێ، وە لەبارەی ئەو مەبەست‌و حیکمەتەوە چەند شتێ گوتراوە هەندێکی زۆر دوورەو هەندێکی نزیکن، لەناو نزیکەکاندا ئەوەی کە دڵ پێی ئارام بێت ـ خوا خۆیشی ئەیزانێ ـ ئەمەیە: بەپێی ئەم ڕواڵەتە یەکێك لەو دوو ئافرەتە یەکێکیان لە بیری بچێ‌و ئەوی تریان بیری بخاتەوە، مەبەستەکەش ئەوە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەردووکیان ئەگرێتەوە، بەم ڕەنگە هەرکام هەندێ لە شایەتی‌و نووسراوەکەی لەبیرەو هەندێکی لە بیرچووە، ئەو کاتە هەر کامیان ئەبن بەبیر خەرەوەی ئەوی ترو هەر دووکیان بیر خەرەوەن، ئەی ئەم مەبەستەش هەر ئەم دەقە قورئانیە ئەگەیەنێ! جا لەبەرئەوە بە جۆرێ تەفسیرم کردەوە کە ئەم مەبەستە ئەگرێتەوە، ئینجا هەرچۆنێ لە پێشەوە فەرمانی دا لە نووسەرەکان کە سەرپێچی لەنووسین نەکەن، هەروەها لێرەشدا فەرمان ئەدات بە سەرپێچی نەکردنی شایەتەکانیش کاتێ کە بانگ کران بۆئەوەی ببن بە شایەت، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ﴾ باشایەتەکان سەرپێچی نەکەن کە بانگکران ببن بە شایەت یا شایەتی بدەن، کەواتە پێویستە لەسەریان کەبچن بەدەم ئەو داواو بانگەوە، لەبەر ڕاگیر کردنی دادو حەقیانەت‌و بۆ پارێزگاری مافی خەڵك، خوا ئەو فەرمانە ئەدات تا ئەو شایەتانە بەبێ گیروگرفت‌و خۆگرتن پێی هەڵسن، بەبێ منەت خستنە سەر هیچ کەسێ.

لێرەدا باسی شایەتی دوایی هات، ئینجا ئەچێ بۆ مەبەستێکی تر کە بریتیەلە پێویستی نوسینی قەرز ئایا کەم بێ یان زۆر، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ أَن تَكْتُبُوهُ﴾ وە بێزار مەبن لە نووسینی ئەو قەرزو هەقە ﴿صَغِيرًا﴾ ئیتر بچووك‌و کەم بێت، ﴿أَوْ كَبِيرًا﴾ یا گەورەو

زۆر بێت کەلە گەردنی ئەو قەرزەدایە، ﴿إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ﴾ هەتا ماوەکەی خۆی کە دیاری کراوە بۆ دانەوەی.

هەموو جیهان چاویان لە قورئان کردو ئەم نووسینی قەرزەیان کرد بە باو بۆ قەرزدان‌و وەرگرتنی دەفتەرێکی تایبەتی بۆ دیاریی ئەکرێ‌و دادگا لەسەر ئەوە حوکم‌و بڕیار دەرئەکات، بێ‌گومان زۆر جار بێزاری پەیدا ئەبێ لە نووسینی سەنەدو ئەو قەرزانە لەبەرئەوەی قەرزەکە کەچەو شایستەی نووسین نیە، یا کابرا شەرم ئەیگرێ‌و لەبەر دڵی قەرزارەکە نایەوێ بینوسێ، یا هەر سستی‌و تەمەڵی ئەکات، لەبەرئەوە جڵەوگیری کرد لەو سستی‌وبێزارییە، سێ هۆیش بۆئەونووسینەباس ئەفەرموێ:﴿ذَٰلِكُمْ﴾ئەونووسینەکەباسکرا:

١- ﴿أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ ڕاست ترە لای خواو لە بڕیاری خوادا، چونکە لە ڕاستیەوە نزیکترەو دوورترە لە درۆو ڕیا کردن.

٢- ﴿وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ﴾ ڕێك‌و ڕاست ترە بۆ شایەتی لەسەردان، کۆمەکی باشتر ئەکات لەسەر ڕاگیر کردنی ئەو شایەتیەو بەو نووسینە باشتر بیریان ئەکەوێتەوە.

٣- ﴿وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓاْ﴾ نزیك ترە لەوەی کە نەکەونە گومان‌و دوو دڵی لە ئەندازەی قەرزو ماوەکەی دا.

ئەم سێ هۆیە: یەکەمیان بەرژەوەندی ئایینی تیایە کە پێکهێنانی ڕەزامەندی خوایە، دووەم‌و سێیەمیش بۆ بەرژەوەندی ئەوانە بەوەی کە شایەتیەکە ڕاگیر ئەکرێ‌و هیچ کام لە قەرزارو قەرزدەر دووچاری زیان‌و ناهەقی نابن، دوور ئەکەونەوە لە بێ‌ئارامی دڵ‌و بەد گومانی لە ئاستی یەکتر، هەندێ لە زانایان ئەفەرموون وتەی ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ تەنیا بۆ نووسینەکە دەست نیشان نیە، بەڵکو دەست نیشانە بۆ نووسین‌و شایەت گرتنەکە پێکەوە، بەو جۆرەش هەر جوانەو مەبەستەکە ڕێکە، بەڵام ئەوەم هەڵبژارد کە هەر نووسینەکە دەست نیشان بێ، چونکە نزیك ترو ڕێکتریشە لەگەڵ وتەی ﴿وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ﴾.

﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾

تا ئێرە باسی کڕین و فرۆشتنێ بوو کە قەرزی ماوە دووری تیا بێ، ئینجا دێتە سەر مامەڵەو کڕین و فرۆشتنی کە بەو جۆرە نەبێ و بەڵکو دەست بەدەست بێ، بۆ مامەڵەی وا نووسینێ پێویست نیەو هەر شایەت گرتن بەسەو بوونی چاکە، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً﴾ بەڵام کاتێ کە مامەڵەو کڕین و فرۆشتنەکەتان بارزگانیەکی ئامادەی دەست بەدەست بێ کە ﴿تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ﴾ لەناو خۆتاندا بیگێڕن، ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا﴾ لەو کاتەدا هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە لەنە نووسیندا، چونکە بۆ شتی وا هیچ ناکۆکی و ئاژاوە پەیدا نابێ، کەواتە پێویست نیە ئەو ئەرکە زیادە بخرێتە سەرشان، بەڵکو هەر تەنها شایەت گرتن بەسە بۆئەوەی هیچ ڕێگەی قسەو دەمە قاڵێ نەمێنێ، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ شایەت بگرن کاتێ کە شتتان کڕی و فرۆشتتان، ئیتر بۆ ئەم کڕین و فرۆشتنە کە باس کرا یا بۆ هەر کڕین و فرۆشتنێ بێ.

لە پێشەوە لەبارەی نووسینێ و شایەتیەکیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ﴾ با زیان نەبەنووسەرو نە بەشایەت نەگەیەنرێ، بەم ڕەنگە پەلەیان لێ بکرێ و تەنگەتاو بکرێن و خەریك بکرێن لە کارو ئیشی پێویستی خۆیان، یا هەق و کرێی نووسینەکە نەدرێ و خەرج و ئەرکی شایەتەکان نەکێشرێ کاتێ لەدوور هاتبن، یا بە هەر جۆرێ تر نابێ زیانیان پێ بگەیەنرێ، چونکە نووسەرو شایەت زۆر جار تەرەفێك ڕقی لێ هەڵئەگرێ، کەواتە ئەبێ پارێزگاری بکرێن، هەندێ ئەفەرموون: مەبەست جڵەوگیری نووسەرو شایەتە لەوەی زیان بگەیەنن بە مامەڵە کەرەکان، بەم ڕەنگە بە گوێیان نەکەن و داواکەیان بۆ جێبەجێ نەکەن، یان قسەو مەبەستەکە بگۆڕن بە زیادو کەم. ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾ ئەگەر ئەوەی کە ڕێگە نەدرا بیکەن ئێوە بیکەن ئەوە لە فەرمانی خوا دەرچوونە کە دووچارتان ئەبێ، دیارە دەرچوون و یاخی بوونیش لە خوا مایەی بەدبەختی هەر دوو جیهانە،

وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾ ۞ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ
تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ
وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ

---

**﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ خۆتـان بپـارێزن لـه نافـهرمانی خـواو لێـی بترسـن، ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ كارێكتان ئەكات كه سوود بەخشه بۆتان‌و بەرژەوەندی هەردوو جیهانی تیایه، ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ خوا زاناو ئاگایه به هەموو شتێ. ئەم ئایەته درێژترین ئایـەتی قورئانه، حوكم‌و بڕیاری زۆری تیابوو، كەواتـه زۆر شیرین‌و بەجێیـه بـەم پەندو ئامۆژگاریـه گرنگه تـەواوی كردو پێویسته به باشی گوێڕایەڵی بكرێت.**

**ئەگەڕێتـەوه بۆ سـەر باسـی نووسـینی قەرزەكـەو حاڵـەتێك ئـەهێنێ كـه نووسـینی تیـا ناگونجێ، لەو حاڵەدا نووسین هەڵئەگرێ‌و له شوێنی دا بارمته بڕیـار ئـەدا، ئەفـەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ ئەگەر ئێوەی كڕیارو فرۆشیار لەسەر سەفەر بوون‌و لـه سـەفەردا بوون، ﴿وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا﴾ بـەو جۆرەی كـه پێویسته نووسـەرتان دەسـت نەكـەوت، یـا وەك(ئیبن‌و عـەباس) ئەفـــەرموێ: كاغـــەزو مەرەكـــەب نـــەبوو ئـــەو كاتـــه ﴿فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾ لـــەجێی نووســـین‌و شایەتەكاندا با چەند بارمتەیەك هـەبن كەلەلایـەن قەرزارەكانـەوه وەرگیراوبن، واتـه هـەركام لـه ئێوه لەو كاتەدا بارمته وەرگرێ تا له نەفەتانی قەرزەكەی دڵنیابێ.**

**بۆ خاوەن قـەرز دروسته بارمتـه وەرگـرێ بـا نیـشتەجێ‌بێ‌و نووسـەریشی دەسـت كـەوێ، وەك(ئیمـامی بوخـاری‌و موسـلیم) حەدیـسێ ئـەهێنن كـه پێغەمبـەر(ﷺ) لـه مەدینـەدا زرێ‌و تاسكڵاوەكەی خسته بارمته لای جوولەكەیەك له باتی(بیست ساع) جوولەكەكه لێـی وەرگـرت بۆ خۆراكی ماڵ‌و خێزانی، كەواته سەفەرو دەست نەكەوتنی نووسەر مەرج نین بۆ دروستی‌و دامەزراندنی بارمته، بەڵكو باسی ئەم دووانه لـەم ئایەتـەدا بۆ باسـی هۆی لادانه لەنووسین‌و دانانی بارمته وەرگرتنه له جێی نوسیندا. خوای گـەوره لـه كڕین‌و فرۆشتنێكدا كـه قـەرزی تیا بێ سێ جۆری داناوه:**

**یەكەم: ئەوەبوو به نووسین‌و شایەت بكرێ.**

**دووەم: ئەوەبوو كەوا بارمته وەرگیرێ لەسەری.**

سێیەم: ئەمەیە کە بەبێ شایەتو نووسینو بارمتەبێ.

لەسەرەتای ئەم ئایەتەدا کە پێوەی خەریکین دوومی باس کرد، ئینجا لەپاش ئەوە هەر لەم ئایەتەدا سێیەمیش باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ ئەگەر هەندێکتان ئەمین بوون لەهەندێکی ترتان، واتە خاوەنی قەرزەکەتان قەرزارەکەی بەسەر ڕاست زانیو باکی نەبوو لەوەی سەر لاربێت، بەهۆی ئەوەوە داوای سەنەدو شایەتو بارمتەی نەکردو نەیوست لێی، ﴿فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ دەی با ئەو کەسەی کە بە ڕاستو ئەمین دانراوە قەرزەکەی بداتەوە کە کراوە بە ئەمین دار بەسەریەوەو بەبێ بارمتە پێی دراوە، واتە با ئەو قەرزارە بە گوێرەی گومانی خاوەن قەرزەکە ڕەفتار بکاتو لەکاتی خۆی دا قەرزەکەی بەسەر ڕاستی بداتەوە، هەرچۆنێ ئەگەر بارمتەی بدایەو لای خاوەن قەرزەکە بە ئەمانەت دانیایە ئەبوایە بەڕێکی بیداتەوە، ﴿وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ با لە خوا بترسێو خۆی بپارێزێ لەناپاکیو سەرپێچیو لەدان نەنان بەو هەقەی کەلایەتی. بێگومان ئەو شایەتیەی کە شایەتەکان هەڵی ئەگرن سپاردەو ئەمانەتێکە لە گەردنیاندا، کەواتە پێویستە لەسەریان لەکاتی پێویستدا ئەو شایەتیە بدەنو بیگەیەننە جێی خۆی، جا چەند شیرینە بەدوای فەرموودەی پێشوودا ئەم فەرموودەیە ئەهێنێ: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ ئەو شایەتیەی کە لاتانە بەڕێکی بیدەنو مەیشارنەوە، ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا﴾ هەرکەس بیشارێتەوەو نەیدا ﴿فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ بەڕاستی ئەو کەسە دڵی گوناهبارە، فەرمووی: دڵی گوناهبارە، چونکە دڵ جێگای ئەو شاردنەوەیەو لەدڵدا ئەشارڕێتەوەو بە ئارەزووی دڵە، بێجگە لەوەش دڵ سەرۆکو ئاغای لەشەو کانگای هەموو چاکەو خراپەیەکە وەك لە حەدیسی(موسلیم)دا ئەفەرموێ: ئاگادار بن کە لە لەشدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر ئەو چاك بێت ئەوا هەموو لەش چاك ئەبێتو بە پێچەوانەشەوە، ئەو پارچە گۆشتەش دڵە. دەی کاتێ کە دڵ سەرۆکو ئاغا بێت ئەبێ گوناهی ئەو گەورەتر بێت لە گوناهی ئەندامەکانی تری لەش، کەواتە ئەم فەرموودەیە دەست نیشانی تیایە بەمەی کە شاردنەوەی شایەتی گوناهێکی زۆر گەورەیە، وەك لە حەدیسی(ئیبنو عەباس)یش دا هاتووەو دانراوە بە یەکێ لە گوناهە زۆر گەورەکان. ئینجا بەنهێنی هەڕەشە ئەکات لەو کەسانەی کە شایەتی ئەشارنەوە،

وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ
تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ
﴿٢٨٤﴾ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ خوا ئاگاو زانایە بە هەر كردەوەیەك كە ئێوە ئەیكەن، یەكێ لەو كردەوانەش شایەتی دانە بە ڕاستی، وە یەكی تر شایەتی نەدانەو شاردنەوەیەتی، ئینجا دیسان لەسەر ئەو مەبەستە ئەڕواو دڵنیایی لەسەر ئەكاتو دڵئەخاتە ترسەوە لە خوا كە ئاگای لە هەموو نهێنیو ئاشكرایەكی دەروونە، ئەفەرموێ: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ هەر بۆ خوایەو موڵكو دروست كراوی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەكانو زەوی دا، شتێكی ئاشكرایە كە ئەبێ ئەو خاوەنو داهێنەرو دروست كەرە زاناو ئاگاداربێ بە هەموو شتە دروست كراوەكانی، وەكو لە سورەتی﴿الملك﴾دا ئەفەرموێ: ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ﴾ ئایا ئەو كەسەی كە شت دروست ئەكات ئاگادارنیە بە دروستكراوەكەی؟ واتە بەڵێ زاناو ئاگادارە، وەك لێرەشدا دەست نیشانی بۆ ئەكات بەو ئاگادارییە كە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ ئەگەر ئەوەی كەلە دڵتاندایە ئاشكرای بكەنو دەری ببڕن، ﴿أَوۡ تُخۡفُوهُ﴾ یا بیشارنەوە، ﴿يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ﴾ خوا حیسابو پرسیارتان لەگەڵ ئەكا پێی. ﴿فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ خۆش ئەبێ لەهەركەس كە خوا خۆی بیەوێ، ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ سزای هەركەسیش ئەدا كە بیەوێو مەیلی سزادانی بكات، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ خوا دەسەلات دارە بەسەر هەموو شتێكدا، كەواتە هەرچی پێویست بێت ئەیكات. زانایانی ئیسلام ئەفەرموون ئەو خەیاڵو خەتەرەی كە دێت بەدڵدا پێی،پێنج جۆرن:

یەكەم:(هاجس) واتە یەكەم جار كە دێت.

دووەم:(خاطر) لەپاش هاتنو كەوتنە دڵ لەدڵدا ئەگەڕێ.

سێیەم:(حديث النفس) دوو دڵ بوون لە كردنو نەكردنی.

چوارەم:(هم) نیاز كردنی شتەكە.

پێنجەم:(عزم) بڕیار دانی دڵ لەسەركردنی.

بەپێی حەدیسی(بوخاری و موسلیم) سێیەم و چوارەم بوراون و خوا بەندە ناگرێ لەسەریان، دیارە لە جێیە ئەم دووانەیان لێ بووراو بێ ئەوا یەکەم و دووەم باشتر لێ بوراون، تەنها ئەوەی کە گوناهو بێ شەرعی بێت پێنجەمە، ئینجا ئەگەر مەبەست بەوەی کە لەم ئایەتەدا فەرمووی خوا حیساب و پرسیارتان لێ ئەکات، ئەم پێنجەمە بێت ئەوا هیچ قۆرت و گرێیەك پەیدا نابێ وەك زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن و بەم جۆرە ئەفەرموون ئایەتی داهاتوو ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾ خوا داوا ناکات و هیچ ئەرکێك ناخاتە سەرشانی هیچ کەسێك بە ئەندازەی توانای خۆی نەبێ. ئەم ئایەتە مەبەستەکە ڕوون ئەکاتەوە، ئەگەر مەبەست بەم ئایەتەی ئێرە شێوە گشتیەکە بێت کە دیمەن و ڕواڵەتەکە نیشانی ئەدات، واتە هەر جۆرە شتێ لە دڵتاندایە دەری بڕن یان نا، خوا هەر پرسیارتان لێ ئەکات، ئەگەر بەم جۆرە مەبەست بێت ئەو کاتە دژایەتیەکی ڕواڵەتی پەیدا ئەبێ لە نێوان ئەم ئایەتەو ئایەتی داهاتوو و چەند حەدیسێکی صەحیحدا، چونکە بەپێی ئەوانە هەرچی لە ژێر دەسەڵاتدا نەبێ خوا بەندە ناگرێ لەسەری، دەی بێگومان ئەوانە کەدێن بەدڵدا بێجگە لە پێنجەم لە دەسەڵاتدا نین، کەواتە پێویستە ئەو گرێیە بکەینەوە بە یەکێ لەم وەڵامانەی دواوە:

١- لەڕواڵەتەکە لا ئادەین و ئەڵێین: مەبەست پرسیارو هەواڵ پێدانە بە هەرچی کە بەدڵدا بێت، نەك گرتن و تۆڵە سەندن، وەك لە(ئیبن و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کاتێ کە خوا هەموومان زیندوو ئەکاتەوە هەواڵمان پێئەدا بە هەرچی لە دڵماندا بووبێ.

٢- ئەڵێین: مەبەست هەر خەتەرەو خەیاڵێکی خراپە کە خاوەنەکەی پێی ناخۆش نەبێ و خۆی بدا بەدەمیەوەو بەرگری نەکات، دیارە خەتەرەو خەیاڵی ئاوا لە ژێر دەسەڵات دەرناچێ، هۆی گرتن و تۆڵەی خوا ئەگەر خوا نەبووری.

٣- ئەم ئایەتە بە ئایەتی داهاتوو سڕراوەتەوە سەبارەت بەو خەتەرەو خەیاڵانەی کەلە ژێر دەسەڵاتدا نین، بەڵگە لەسەر ئەم سڕینەوەش ئەم حەدیسەیەکە(ئیمامی ئەحمەدو موسلیم) ئەیهێنن لە(ئەبو هورەیرە)وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرمووێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەدڵی ئەسحابەکاندا زۆر سەخت و بە تین بوو، تاقمێك لە

گەورەکان هاتن و هاتن بە چۆکدا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)و عەرزیان کرد کە تا ئێستا کردەوەیەکی داوە بەسەرماندا لە تواناندا بووە: نوێژو ڕۆژووو غەزاو خێرو صەدەقە، ئینجا ئەم ئایەتەی هێناوەتە خوارەوەو لە تواناماندا نیە، ئەویش فەرمووی: ئایا ئەتانەوێ ئێوەش بڵێن: وەك جوولەکەو گاورەکانی پێش ئێوە وتیان: بیستمان و مل پێچی ئەکەین لە فەرمان و گوێڕایەڵ نابین؟ نەخێر ئێوە بڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین و داوای لێ بوردنت لێ ئەکەین ئەی پەروەردگارمان و گەڕانەوە لە ڕۆژی دوایی دا هەر بۆ لای تۆ ئەبێ، کاتێ ئەمەیان وت و زمانیان پێی ڕاهات خوا ئەم دوو ئایەتەی هێنایە خوارەوە کەلە ئایەتی دووەمدا فەرمووی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ﴾. وێنەی ئەم فەرموودەی(ئەبو هورەیرە) لە(عەلی و ئیبن و عەباس و ئیبن و مەسعودو عائیشە)وە هاتووە -خوا لێیان ڕازی بێ- بەڵام لەم وەڵامی سێیەمدا قۆرت و گرێیەکی تر پەیدا ئەبێ کە ئایەتی پێشوو هەواڵ دانەو سڕینەوەش ڕووناکاتە هەواڵ، بەڵکو هەر بۆ فەرمان و جڵەوگیری ئەبێ، مەگەر بڵێین سڕینەوە کە بۆ نەفسی هەواڵەکە نیە، بەڵکو بۆ ئەو داوایە کە وەرئەگیرێ لەو هەواڵەوە.

ئەوەی کە ئەسحابەکان لێی ترسان بریتیە لە جڵەوگیری لە هاتنی هەرکام لەو شتانەی کە دێن بەدڵدا ئیتر لە ژێر دەسەڵاتدا بن یان نا؟ واتە بەم ئایەتی داهاتووە ئەو جڵەوگیریەی سڕیەوە دەربارەی ئەو خەتەرەو خەیاڵانەی کە دەرەقەت ناکرێن.

چەند وەڵامێکی تریش دراوەتەوە بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام لەبەرئەوەی بەلامەوە لاوازبوون، بۆیە بەم سێ وەڵامە وازم هێناو لام وایە بە هەرکام ئەو دژایەتیە ڕواڵەتیەی کە گومان ئەبرا لەپێش ئاو ون ئەبێ و ڕێی هیچ قسەو باسێك نامێنێ.

ئینجا ئەم سورەتە گەورە کە درێژترین سورەتی قورئانە، لە ئامانج و مەبەستدا لە هەموویان گەورەترە بە دوو ئایەت کۆتایی دێ کە وەك کورتەیەك وایە بۆ هەموو سورەتەکەو دەست نیشانی تیایە بۆ هەموو مەبەست و ئامانجەکانی، بەتایبەتی زۆر پەیوەندی بە سەرەتای سورەتەکەوە هەیە کە ئەوەش لە ڕەوانبێژی دا کردەوەیەکی شیرینە، ئەفەرموێ: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ﴾ پێغەمبەرێك کە(محمد)ە بڕوای هێنا بەو قورئانەی کەلە

لایەن خواوە بۆی هێنرایە خوارەوە، ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ﴾ بڕوادارەکانیش ـ واتە ئەو تاقم و کۆمەڵەی کە بەو ناوە ناسرابوون ـ بڕوایان هێنا، کەواتە ئەو تاقمە بەڕێزە هەرچۆنێ لە سەرەتای سورەتەکەوە وەسف و سەنای کردن و جوێی کردنەوە لەدوو تاقمەکەی تر ـ بێ بڕوا و ناپاکان ـ کە لەو کاتەدا ئەو سێ تاقمە لە مەدینەدا کۆبووبوونەوە، هەرچۆنێ لەوێ ڕێزی لێ گرتن و جوێی کردنەوە، لێرەشدا شایەتی ئەدا لەسەر بڕوا هێنانیان و ئەوپەڕی پلە و پایە و ڕێزیان پێ ئەدا کەلە بڕوا هێناندا ئەیانکات بە هاوبەشی پێغەمبەر(ﷺ)! بەڵێ بێگومان ڕادە و پلەی بڕوای پێغەمبەر(ﷺ) هەر زۆر بەرزو بڵندو جیاوازە لە بڕوای ئەمان، چونکە بڕواکەی ئەو یەکسەر لە خواوەیە بەبێ هیچ هۆیەك، بە هەست کردن و دیتنی دڵە پاکەکەی لە هەر گەردو تۆزو لەکەیەك، بەبێ پێویست بە هیچ بەڵگە و ڕابەرێك، بە کورتی بڕواکەی ئەو بەدەم و نووسینی ئێمە باس ناکرێ و ئەو خۆی ئەزانێ تام و بۆنی چۆنە، هەرچەند پلەی بڕواکەی ئەو بەو جۆرە بەرزو جیاوازە، بەڵام کۆکردنەوەی ئەمان و بڕواکەیان لەگەڵ ئەوو بڕواکەی دا لەسەرەتای ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەوپەڕی نرخ پێدان و ڕێزگرتنە بە جۆرێك هەرگیز سوپاسی بۆ بڕواداران بەجێ نایە، بێگومان هەرکەس بەشداری ئەو تاقمەی یەکەمجارە بکات و پەیڕەویان بکات لەم ڕێزو نرخەیاندا بەشدارە، ئینجا سروشت و شێوەی ئەو بڕوایە باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ هەموویان بڕوایان هێناوە بە خوا.

بڕوا بە خوا لە ئیسلام دا بنەڕەت و بنکەیە بۆ بۆچوون و تێگەیشتن و بەرنامەی ژیان و ڕەوشت و ئابووری و پاشەکەوتی و بزووتنەوەی بڕوادارەکە. مەبەست بە بڕوا بە خوا ناسینێتی بەو جۆرەی کە خۆی دیاریی کردووە، تایبەتی کردنی خوا بە خوایەتی و پەروەردگاری و پەرستنیەوە، کەواتە ئەبێ خوا کار بەدەست و فەرمان ڕەوا بێت بەسەر دڵ و کردەوە و ڕەوشتی بەندەدا لە هەموو کاروباری ژیانیاندا. بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ هاوبەش بۆ خوا دانرێ لە هیچ کارو کردەوەیەکدا، چونکە هەرچی خوا نەیکات نابێ و هەرچیش ئەو بیەوێ ئەبێ، بە هیچ ڕەنگ هاوبەش و بەشدار نابێ ببێ لە پەرستن و مل کەچی بۆ ئەو خوای تاك و تەنیا، نابێ گوێڕایەڵی و فەرمانبەری کەس بکرێ جگە لە خوا و هەرکەسێك بڕیاری خوا بەجێ بێنێ و بیچەسپێنێ گوێڕایەڵی و فەرمانبەری ئەو کەسەش ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، کەواتەهەموویاسا وڕژێمی ژیان لەهەموورووییەکەوە هەر لە خواو لە ئایینی خوا وەرئەگیرێ و بە ناوی ئەوو ئیزن و ڕای ئەو ئەبێ، ئەمەیە بە کورتی مەبەستی بڕوا بوون بە خوا،

وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ
رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ

---

﴿وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ﴾ وە هەرکام بڕوای هێناوە بە فریشتەکانی خوا. بڕوا بە فریشتەکان بەشێکە لە بڕوا بە غەیبو بە نادیاری کە یەکەم نیشانەو سیفەتی لە خواترسەکانە، وەك لەسەرەتای ئەم سورەتەوە ئەندازەیەك بە درێژی باس کرا کە ئەو بڕوایە جیاکەرەوەی مرۆڤە لە ئاژەڵو گیانلەبەرەکانی تر، وە بەهۆی ئەو بڕوایەوە مرۆڤ لە چوار چێوەی تەسكو تروسکی هەست هەستیارەکان دەرئەچێو پێئەنێتە جیهانێکی پانو فراوانو نەبڕاوەوە، ئارامیو ئاسایشو ئاشتی پێك دێنێ لە دەروونـدا، بڕوا بە فریشتە ـ وەك هەموو نهێنیو نادیارەکانی تر ـ ئەبێ لەسەر ئەو بارو شێوەیە بێ کە خواو پێغەمبەر(ﷺ) نەخشەیان کێشاوە بۆمان بەبێ کەمو کوڕی، ﴿وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾ هەرکام بڕوایان هێناوە بە نامەکانو پێغەمبەرەکانی خوا، بە جۆرێ ئەڵێن: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ﴾ هیچ جیاوازیەك ناخەینە نێوان پێغەمبەرەکانیەوە، واتە وەك یەك بڕوامان هەیە بە هەموویان، ئیتر بابە پێی ڕاو فەرمانی خوا هەندێکیان بە گەورەتر بزانین لە هەندێکی تریان، ئەوەش لەسەرەتای ئەم جزمەوە باس کرا.

بڕوا بە هەموو نامەکانو پێغەمبەرەکانی خوا بەبێ جیاوازی کردن، بەم ڕەنگە بڕوا بە هەندێکیان نەبێ وەك جوولەکە کە بڕوایان بە عیساو محمد نیە، یان گاور کە بڕوایان بە محمد نیە، ئەو بڕوایە شتێکی ڕاستو ڕەوایەو لە کانگای بڕوا بە خواوە هەڵئەقوڵێ بەم شێوە پاكو خاوێنەی کە ئیسلام هێنایو نەخشەی کێشا، چونکە بڕوا داخوازە بۆ ڕاستی ئەو پێغەمبەرانەی کە خوا ناردوونی، بۆ یەکێتی ئەو سەرچاوەی کە ئەو پێغەمبەرێتیەی لێ هاتووە، وەك لە نامەکانیشیاندا هاتووە، جا لەبەرئەوە ئەو جیاوازیە لەدڵی موسڵماندا پەیدا نابێ، چونکە ئەزانێ هەموویان لای خواوە هاتوون بە شێوەیەکی ڕێك لەگەڵ بارو حاڵی ڕەوانە بۆ لاکراوەکان، هەتا گەیشتە نۆرەی دواترینو گەورەترینو بەرزترینی هەموان محمد(ﷺ) ئەم بە دواترین شێوەی ئایینی خوا ڕەوانە کرا کە لە بنەڕەتدا یەك ئایینەو وێنەو

شێوەکانی جیاوازی تێدایە، لەم دواترین شێوەدا هات بۆ بانگ کردنی هەموو خەڵك تاکو ئەم دنیایە دوایی دێ‌و ئەپێچرێتەوە. ئا بەم جۆرە ئەم گەلە موسڵمانە بوو بە کەلەپوور وەرگری هەموو پەیانەکانی خوا، وە بوو بە چاودێرو پارێزەر بەسەر تاقە ئایینەکەی خواوە، لەبەرئەوە گەلە هەست ئەکات بە گەورەیی‌و گرنگی ئەرکی سەرشان‌و کاروباری خۆی، ئەزانێ کە ئەم کراوە بە پاسەوان‌و پارێزەر بەسەر گەورەترو بەنرخترین دەستکەوت‌و کەلەپوورەوە. ئەزانێ کەئەم هەڵبژێرراوە بۆهەڵگرتن‌و بەرزکردنەوەی ئاڵای خوا لە زەوی دا، بۆ بەرەنگاری هەموو ئاڵا نەفامیەکان کە هەریەکە نیشانەو دروشمێکی بۆ دانراوە لە نەتەوایەتی و نیشتمانی پەروەری‌و سەهیۆنێتی‌و صەلیبیێتی‌و...هتد.

ئەو دەستکەوتە گەورەو بەنرخە دەستکەوتی ئایین‌و بڕوایە، کە مایەی ئارامی‌و ئاشتی‌و ڕووناکی دڵ‌و دەروونە، ڕێگەی بەختەوەری‌و زانین‌و ناسینە، هەر دڵێ بێ بەش بێ لێی تاریکی‌و بێ‌ئارامی‌و گومان داگیری ئەکات‌و هەمیشە بێزارو دڵ تەنگە، سەرگەردان ئەبێ‌و نازانێ چی بکات‌و بۆ کوێ بڕوا.

ئەو گەل‌و کۆمەڵانەی کە بێ‌بەشن بەم بەهرەیە ژیانیان زۆر تاڵە هەرچەند بەڕواڵەت هەموو هۆی کامەرانی‌و بەختەوەریان ببێ، بێ‌بەشن لە ئازادی‌و ژیانی سەربەستی‌و ئادەمیانە، هەرکەسێ ئەم ڕاستیە نەزانێ ئەوا یا خەڵەتاوە یا ئەیەوێ دان بەڕاستی دا نەنێ.

کۆمەڵی بڕواداران بەو جۆرە بڕوایان هێناو ﴿وَقَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿سَمِعۡنَا﴾ فەرموودەکانی تۆمان بیست، ﴿وَأَطَعۡنَا﴾ گوێڕایەڵ بووین‌و فەرمانبەریمان کرد، یا گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریمان کردو بەسۆزو خۆشەویستیەوە وەرمان گرت، ﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا﴾ داوای لێ خۆشبوونت لێ ئەکەین ئەی خوایە لە هەموو کەم‌و کوڕیەکانمان، ﴿وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ گەڕانەوە هەر بۆلای تۆیە چ بە مردن‌و زیندوو بوونەوە.

بڕوادارەکان بەرو بەرهەمی بڕواکەیان بەو وتەیە دەربڕی. بەڵێ بەڕاستی کە بڕوای ڕاستەقینەبوو ئەبێ بیستن‌و وەرگرتن‌و گوێڕایەڵی بە دوادا بێ، بیستن‌و وەرگرتنی هەرشتێ کەلای خواوە بێت بۆیان، وە گوێڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی، ئینجا لەگەڵ ئەو بیستن‌و وەرگرتن‌و گوێڕایەڵیەدا هەستکردن بەکەم‌و کوڕی‌و دەستەپاچەیی لە هەڵسان بە مافی

خوایەتی خواو سوپاسی چاکەو بەهرەکانی و بەجێهێنانی ئەرکی بەندەیی خۆیان، بەبێ ئەوانە نە بڕوای ڕاستەقینە هەیەو نە ئیسلامو ما کەچی بۆ خوا، چونکە نە ئیسلامو نەبڕوا بەقسەی ڕووت پێک نایەو نایەتەدی، بەم دوا وتەیە ﴿وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ بڕوا بەلاّم ڕۆژی دواییان دەربڕی لەلایەن خۆیانەوەو کە بڕوا بەو ڕۆژە بەندێکی سەربەخۆیە لە بەندەکانی بڕوا کە هەموو پێغەمبەرانی پێهاتووە، لەم ئایەتی بڕوادا لە پێشەوە نەیفەرموو، بەڵکو بەم وتەیە گەیاندی.

ئەم ئایینو عەقیدەیە دان ئەنێ بەبوونی مرۆڤدا کە مرۆڤەو دارو بەردو فریشتەو شەیتانو هیچ گیانلەبەرێکی تر نیە، دانی پیا ئەنێ بەوەی کە خاوەنی هێزو لەشێکی وزەدارە، خاوەنی عەقڵێکی بڕیاردەرەو خاوەنی گیانو سۆزو وارەزووە، ئینجا وەك دان ئەنێ بە پێویستو داخوازەکانی لەشو ژیریو گیانەکەی داو ڕەوا داون، هەروەها سنووریشی بۆ دیاری کردوون بەبێ کەمو کوڕیو زیادە ڕەوی بۆئەوەی مرۆڤ کە هەموو کاروبارێکیان جیا نەبێو لە ناوەندی دا ڕانەوەستێ، کەواتە هەر تەکلیفو داوایەکی لێ کردین ڕاستو ڕێکە بەپێی سروشتیەتیو لەتوانادایەو بۆ ڕاگیرکردنیەتی لەو ناوەندیو میانەداو لەو حاڵە چاکە نەترازێ. وەك شاعیری خواناس ئەفەرموێ:

علیك بأوساط الأمور فإنه کلا طرفی أوساط الأمور ذمیم.

واتە: ناوەندی هەموو کاروبارەکان بگرە، چونکە ئەم لاو ئەولای ناوەندیەکانی کاروبار نەویستراوو ڕەخنە لێ گیراون.

ئینجا ئەم مرۆڤە ئازادیو سەربەستیەکی هەیە لە کردەوەدا بەهۆی ئەو خواهیشو ئیرادەیە کە خوا پێی داوە، جا لەبەرئەوە پاداشتو سەرەنجامی هەموو کردەوەکانی بۆ خۆی ئەنجام ئەدرێ، وەکو بەو جۆرەش هەواڵی داوەتیو ئەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾ خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکاتو ئەرکی نەخستۆتە سەرشانی مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی ﴿لَهَا مَا كَسَبَتۡ﴾ هەرکەسێك هەر چاکەیەکی کردبێ سوودو بەرهەمی هەر بۆ خۆیەتی، ﴿وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ﴾ هەر خراپەیەکیشی کردبێ تاوانی بە ئەستۆی خۆیەتی. هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: ئەم دوو ڕستەیە لەگەڵ ڕستەی پێشیدا بەشێکە لە

وتراوی بڕوادارەکان و خوای گەورە ئەیگێڕێتەوە لێیانەوە، بەوە وەسف و سەنایان ئەکات بەمەی وەک گوێڕایەڵی و مل کەچی خۆیان دەربڕی، هەروەها سوپاسی خوایان کرد لە داواو تەکلیفەکانی دا بەمەی لە دەسەڵات و تواناداییەو ئەرکی زۆر قورسی نەخستۆتە سەرشان، لەو داواو تەکلیفەیش دا خوا هیچ سوودو زیانێکی پێناگات، بەڵکو بەرهەمی کردەوەکانیان بۆ خۆیانە، ئەم دوو ڕستەیە کە قسەی بڕوادارەکانە پێکەوە نەیان گووتووە، بەڵکو هەرجارەی یەکێکیان گووتووە بە جیا جیا، لەبەرئەوە نەبەستراون پێکەوەو بە پچڕاوی ئەیان گێڕێتەوە، واتە پیتی عطفی نەلە پێشی ڕستەی یەکەم و نە دووەمدا نەهێناوە.

ئەم ڕایە هەرچەند ئەگونجێ و مەبەستێکی ڕێک نیشان ئەدات، بەڵام ڕای زۆربە بەهێزەو باشتر لەدڵدا ئەچەسپێ کە ئەفەرموون: هەردوو سەربەخۆن و لە وتەی بڕوادارەکان نین، بەڵکو خوا لەلایەن خۆیەوە هەواڵیان پێئەدا، بە یەکەمیان دڵنەوایی بڕواداران ئەکات و میهرەبانی خۆی دەرئەبڕێ کەلە داواو تەکلیفەکانی دا تەنگەتاوی نەکردوون و بە باشی ئەتوانن پێی هەڵسن و لەوەش زیاتریان پێئەکرێ، وەک وتەی ﴿وسع﴾ ئەیگەیەنێ. ئەو میهرەبانیەی لەگەڵ کردن، چونکە ئەوان بەسۆزو خۆشیەوە پێشوازیان کرد لە فەرمان و داواکانی، نەک وەک یەهود کە بێزاریان دەرئەبڕی و گیرو گرفتیان دروست ئەکردو خوایش ئەرکی سەرشانی زیاد ئەکردن، بۆ نموونە وەک مەسەلەی ڕەشە وڵاخەکە کە فەرمانی دا بەسەر بڕینی ـ وەک لەدەورەی یەکەمی ئەم جزئەدا باس کرا ـ، ئینجا هەواڵی پێدان بەدووەم بۆ هاندانیان لەسەر بەجێهێنان و هەڵسانیان بە فەرمانەکانی خوا، ترساندنیان لە مل پێچی و نا فەرمانی، چونکە بڕوادار کە زانی سوودو قازانجی کردەوەی چاکی بۆ خۆیەتی و زیان و تۆڵەی خراپەشی لەسەر خۆیەتی، ئەو زانینە بەهێز پاڵی پێوە ئەنێ بۆ چاکەو لە خراپە ئەیگێڕێتەوە، بەڵکو کاتێ کە بڕوادار بیر ئەکاتەوە لەو سۆزو میهرەبانیەی کە خوا لەگەڵی دا بەکاری هێناوە لەو شتانەی کە پێویستی کردوون لەسەری بۆ تاقی کردنەوەی لەم ژیانی دنیادا، کاتێ بیرئەکاتەوە لەو دادو دادپەروەریەی کەلە ڕۆژی دوایی دا لەگەڵی بەکاری ئەهێنێ، ئەو کاتە ئەکەوێتە سۆزو پەرۆش و فەرمان و پێویستیەکانی سەرشانی بەجێ دێنێ، وە هیچ جۆرە قورسی و گرانیەک لە دەروونی دا نامێنێ.

﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾

---

ئینجا چەند نزایەكی زۆر بە تامو بەنرخ ئەهێنێ و دوایی بە سورەتەكە دێنێ، ئیتر ئەم نزایانە بەشێكی تر بن لە نزای ئەو بڕوادارانە ـ وەك كۆمەڵێ ئەفەرموون ـ یان ئەمانە فێر كردنە لەلایەن خواوەو لەسەر فەرمانی ئەوە كە بڕواداران ئەم نزایانەش بكەن ـ وەك تاقمێ لە زانایان ئەفەرموون ـ بە هەرحاڵ ئەم نزایانە بارو حاڵی بڕواداران نەخشە ئەكێشن كە ئەبێ لەگەڵ پەروەردگاریاندا بەم جۆرە بن، ئەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان مەمان گرە بە سزادان، ﴿إِن نَّسِينَآ﴾ ئەگەر چاكەیەكمان لەبیركردو نەكان كرد، ﴿أَوْ أَخْطَأْنَاۚ﴾ یا خراپەیەكمان كرد.

بەسێ جۆری تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام ڕای زۆربە لەسەر ئەو تەفسیرەیەكە هەڵم بژارد، بەهەر حاڵ ئەوە ئەگەیەنێ كە بڕوادار شایانی گوناهو خراپەكاری نیە بە دەستی ئەنقەست، ئەگەر هەر شتێكی ناڕەوای كرد ئەبێ لەسەر بیرو خۆش نەبێ و بەهەڵە كردبێتی، ئینجا بزانرێ كە خوا ئەم نزایەی وەرگرتو ئەم گەلە ناگرێ لەسەر هەر شتێ كە لە بیری بچێ یا بە هەڵەبیكات، وەك بە ڕوونی لەم حەدیسەدا هاتووە كە(طەبەرانی)و غەیری ئەو هێناویانە،(ئیمامی نەوەوی)ش ئەفەرموێ: حەدیسێكی حەسەنە.(رفع عن امتی الخطأ والنسیان وما استكرهوا علیه) لەسەر گەلی من هەڵگیراوە هەر شتێ كە بەلە بیرچوونو هەڵەو بەزۆر پێیان كرابێ، واتە خوا لەسەر ئەو سێ جۆرە نایانگرێ، ئەم بەهرەو میهرەبانیە هەر لەگەڵ ئەم گەلە كراوە ـ لە لوتفو میهرەبانی خوا بەزیادبێ ـ.

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەرك‌و باری گران مەخەرەسەرمان، واتە داواو تەكلیفی شتی قورسمان لێ مەكەو كاروباری گران مەخەنە ئەستۆمان، ﴿كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ﴾ هەروەكو خستتە سەرشانی ئەوانەی بەر لە ئێمە، بۆ وێنە وەك گەلی موسا كە بەهۆی كردەوەی خراپی خۆیانەوە خوا باری سەرشان‌و ئەركی گران كردن، ئەوە بوو هەندێ لە خواردەمەنی‌و خۆراكی پاك‌و خاوێنی لەسەر قەدەغەكردن، وە قەدەغەی كرد كە ڕۆژانی شەممە مامەڵەو ڕاوە ماسی بكەن، وە پێویستی كرد لەسەریان بەر ببنە یەكترو یەكتر بكوژن لەسەر ئەو گوێرەكە پەرستیەی كە كردیان... خوا نزاكەی وەرگرتن، ئەوەتا ئەو بارە گرانانەی لە كۆڵ خستن، وەك لە سورەتی ﴿الأعراف﴾دا ئەفەرموێ: ﴿وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ لەجیۆی ئەوەدا شەریعەتێكی سووك‌و ئاسانی بۆ ناردن بە پێغەمبەرە ئازیزەكەی دا. ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ﴾ ئەی پەروەردگارمان شتێ مەكە بەباری سەرشانمان كە توانای هەڵگرتنیمان نەبێ، واتە لەسەر گوناهەكانمان سزاو تۆڵەیەكمان مەدە كەلە توانامانـدا نەبێ، یا دووچاری دەردو بەڵایەكمان مەكە كە نەتوانین هەڵیگرین، هەندێ ئەفەرموون: مەبەست بەم نزایەش هەر لە جۆری نزاكەی پێشووە، بەڵام ئەم گشتیە بۆ ئەویش‌و هەر ئەرك‌و تەكلیفێ تر كەزۆر گران بێت، مەبەست لە هەردوو نزاكە پاڕانەوەیە لە خوا كە بەزەیی بێتەوە بەدەستە پاچەیی‌و لاوازیان‌و داوایەكیان لێ نەكات كە نەتوانن هەڵسن پێی، ئەمان بەندەی بێ دەسەڵات‌و لاوازن‌و ئەویش خوای بە دەسەڵاتی كاربەدەستی میهرەبانە، كەواتە پەنای پێ‌ئەبەن‌و چاوەڕوانن بۆ چاكەو بەهرەی خوای پەروەردگاریان، ئینجا سێ داوای تر ئەكەن كە دان نانی تیایە بە تاوان‌و كەم‌و كوڕی خۆیان‌و بیم‌و ترسیان لەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ﴾ زانایانی تەفسیر بە چەند جۆرێك تەفسیری ئەم وتەیان كردۆتەوە، هەموویان ڕێكن‌و گونجاون، یەكێ لەو تەفسیرانە ئەمەیە، گوناهەكانمان بسڕەوەو دروشم‌و نیشانەیمان پێوە مەهێڵە، گوناهو خراپیمان

داشارەو بە دەرخستنی ئابڕومان مەبە، میهرەبانیمان لەگەڵ بکە بە بەخشینی چاکەو بەهرەی خۆت، ﴿أَنتَ مَوۡلَىٰنَا﴾ تۆخاوەن‌وکارسازوکاربەدەستی ئێمەیت،﴿فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە زاڵمان بکە بەسەر گەلە بێبڕواکاندا. بەڵێ بڕواداری ڕاستەقینە ئەبێ هەست‌و بۆچوونی بەم جۆرە بێ کە لەم نزا شیرینانەدا دەرکەوت، ئەبێ دڵی هەر لای خوا بێ‌و هەمیشە سام‌و ترسی ئەو لە دڵی دا بێ‌و داگیری بکات، ئەبێ هەمیشە هەست بکات بە ناتەواوی کەم‌و کوڕی خۆی بەرامبەر بەخوا، هەرچەند هەمیشە هەر خەریك بێ بەخوا پەرستی‌و هەرشتێ کە مایەی ڕەزامەندی خوایە، هێزی دڵی ئومێدو بە تەما بوونی لێبووردن‌و سڕینەوەی گوناهو چاوپۆشی میهرەبانی‌و بەزەیی خوا بێ، ئینجا لە هەر تەنگانەدا هەر پشت لە خوا ببەستێ، هەر ئاڵای ئەو بەرزبکاتەوە بەلای سەریەوە، لە کاتێکدا کە جەنگ ئەکات ئەبێ هەر لە ڕێی خواو بەناوی خواوە بیکات، داوای یارمەتی بکا لە خوا بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو ملهوڕو سەرکێشانەی کە دوژمن‌و ڕێگری ئایینی خواو دۆستەکانی خوان، داواکارین لە خوا لەبەر خاتری ئەم قورئانە لە ریزی ئەو بڕوادارانەدا حیسابمان بکات، ئەوەش بۆ خوا هیچی تێناچێ.

سوپاس بۆ خوا کە یارمەتی دام لە ڕۆژی پێنج شەممە ١٤٠٥/٤/٢٥ لە تەفسیری سورەتی ﴿البقرة﴾ بوومەوەو هەر ئەمڕۆش دەستم کرد بە سورەتی ﴿آل عمران﴾.

# سورەتی «آل عمران»
## مەدینەییە(٢٠٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە بەشێك لە ژیانی گەلی موسڵمانی مەدینە نیشان ئەدات لەپاش غەزای بەدر تا غەزای ئوحود لەساڵی سێیەمی کۆچ کردندا، بریتییە لە یەکەم ئایەتی تا ئایەتی(٩٣)ی بەشی دووەمی جوزئی سێیەم، هەروەك لە سەرەتاوە گوتمان.

بەپێی هەندێ ڕیوایەت لە یەکەم ئایەتەوە تا ئایەتی(مباهلە)و هەندێ ترا تا ئەگاتە ئایەتی(٧٥-٨٥) بەبۆنەی شەش شت کەسێ لە هەڵبژێرراوی مەسیحیەکانی نەجرانەوە هاتووەتە خوارەوە، کە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە، لە ڕێوە چوونە مزگەوت و پاش ماوەیەك دەستیان کرد بە وتوێژو دەمەقاڵێ لەبارەی حەزرەتی عیساوە، کە هەندێ بە کوڕی خوایان ئەزانی، هەندێ بە خواو هەندێکی تر دایان ئەنا بەسێیەمی ئەو سێ خوایەی کە بڕیاریان دابوو، ئینجا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارو پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر تیشکی ئەم ئایەتانە دەستی کرد بە بەرپەرچ دانەوەیان تا بە تەواوی دەم کوتی کردن و هیچیان بەدەستەوە نەما، لە هەندێ لەو ڕیوایەتانەدا کاتی هاتنی ئەو تاقمە دیاریی نەکراوە، وەلە هەندێکیاندا دیاریی کراوە بە ساڵی نۆهەمی کۆچییەوە کە ناونرا بە(عام الوفود) لەبەرئەوەی لەو ساڵەدا لە هەموو ناوچەکانی نیوە دوورگەوە نوێنەر هات، کاتێ کە بۆیان دەرکەوت ئیسلام زاڵ و سەرکەوتوو بووە، جا ئەگەر کاتی هاتنی ئەم تاقمە نەبڕین بەسەر ئەو ساڵی نۆهەمەداو دیاریی نەکەین ئەوا باشەو ڕێی هیچ ڕەخنەو قسەیەك نیە، بەڵام ئەگەر ئەو هاتنە ببڕین بەسەر ئەو ساڵەدا قۆرت و گرێ پەیدا ئەبێ، چونکە:

١- لەو ساڵەدا هەر نوێنەرێك هاتبێ بۆ ئەوە بووە کە خۆیان ببەنە پێشەوەو دۆستی و مل کەچی بۆ ئیسلام دەربڕن لەسەر دەستی پێغەمبەردا(ﷺ) دەی هەر لە ڕیوایەتەکانەوە

دەرئەکەوێ کە هاتنی ئەوانە بۆ ئەوە نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە وتوێـژو دەمـەقاڵێ خۆیان و ئایینەکەیان دەربخەن و قسەی خۆیان سەرخەن، ئەوەتا لەپاش ئەوەی کە دەم کوت کران هەر دانیان نەنا بە ڕاستی دا.

٢- گـەلێك لـەم ئایەتانـە ئاشـکرایە کەلـە پـێش سـاڵی نۆهەمـدا هاتۆتـە خـوارەوە، بـەڵکو هەنـدێکیان لەسـەرەتای چـەرخی مەدینـەدا هاتوونەتـە خـوارەوە، وەك لـەکاتی تەفسیر کردنیانـدا دەرئەکـەوێ، بێجگـە لەوانـەش کـە بـاس کـران، ئایەتـەکانی قورئـان نابەسـترێنەوە بـە هـۆی هاتنـە خوارەوەیانـەوە، کەواتـە چـاك وایـە ئـەم ئایەتانـە نەبەستینەوە بەو ڕووداوەی کە ئـەو ڕیوایەتانە هێناویانە، ئـەوەی کە لـەم سورەتەدا هـاتووە لـە بـارەی وتوێـژو لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ نامەدارەکانـدا، وە بەرپـەرچ دانـەوەی بیروباوەڕە لارو وێرەکەیان کە بەهۆی لادان لە ئایینە ڕاستەکەی خوا دووچاریان بووە، وە بەرپـەرچ دانـەوەی ئـەو پـڕو پاگەنـدەی کـە بڵاویـان ئـەکردەوە بەرامبـەر ڕاسـتی پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) تاك و تەنیایی خوا کە ئیسلام زۆر بە گرنگ گرتی و بەباشی ڕوونـی ئـەکردەوە، هـەروەها دڵنیـا کردنـی موسـڵمانان و دامەزرانـدنیان لەسـەر ئایینـە ڕاسـتەکەیان و وریـا کردنـەوەیان بـە پیلانـی ئـەو نامـەدارە دوژمنانـە، هـەموو ئەمانـەو غـەیری ئەمانـە کـە ئـەم سورەتە خـەریك بوو پێیانـەوەو چارەسـەری کردن، ئەمانـە وا دابنێین کە بەبۆنەی ڕووداوی ترەوە لە پێش ساڵی نۆهەم دا هاتوون، یان ئەم ئایەتانـە هـاتوون هـەر بـۆ وریـا کردنـەوەی موسـڵمانان و دەرخـستنی ئـەو دوژمنایـەتی و بەربەرەکانیەی کەلە نێوان موسڵمان و بیروباوەڕە ڕاستەکەیان نامەدارو بت پەرست و بیروباوەڕە ناڕاست و ناڕەواکەیاندا هەمیشەییە، ئەم ئایەتانە وا نیشان بدەین کە بۆ بەرەنگاری و بەرپەرچ دانەوەی نامەدارە دوژمنەکان هاتوون، ئیتر بەبێ دابڕینی بەسەر ڕووداوێکی تایبەتی دا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴿٢﴾

---

کەواتەلەسەرئەم بارە دەست پێدەکەین‌و ئەڵێین: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * الٓمٓ ﴿١﴾﴾ لەسەرەتای سورەتی ﴿الفاتحة﴾و لە سەرەتای سورەتی ﴿البقرة﴾وە سەبارەت بە تەفسیری ﴿بِسمِ الله﴾ تەفسیری پیتەکان وتراوێکمان پێشکەش کرد، دووبارە کردنەوەی بە پێویست نازانم، با سەرنجی ئەمە بدرێ ﴿اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا کەناوی ﴿الله﴾یە هیچ پەرستراوێکی شایستە نیە بێجگە لەو، تەنیا ئەویش شایستەی پەرستنە ﴿الْحَيُّ﴾ هەر ئەو خوایەیە زیندووە بەبێ سەرەتاو بەبێ دوا هاتن ــ بۆ زیندوویەکەی ــ کەواتە زیندوویەکەی لە خوا خۆیەوە هاتووە، لە ڕاستی دا هەر ئەوە زیندووە، ﴿الْقَيُّومُ﴾ هەر ئەو خوایە خۆی بە خۆی ڕاگیرەو بە هەمیشەیی ڕاگرو تەگبیرکەری هەموو شتێکە بە گیاندارو بێگیانەوە، لە هەموو بارو ڕوویەکیانەوە.

لەسەرەتای سورەتەکەوە جاڕی تەنیایی‌و پاك‌و خاوێنی خوا درا کە جیاکەرەوەی عەقیدەو باوەڕی موسڵمانن لە هەموو عەقیدەو باوەڕەکانی تر، ئیتر چ عەقیدەی بێئایین‌و بت پەرستان، وە چ عەقیدەی نامەدار ــ جوولەکەو گاور ــ بە هەموو تاقم‌و تیرەکانیانەوە کە لایاندا لە ئایینی خوا، هەرچۆنێ بەمە جیا ئەبێتەوە ژیانی موسڵمان لەژیانی هەر خاوەن بیروباوەڕێکی تر ، چونکە هەر ئەم عەقیدە تاك‌و تەنیایەی خوا بەرنامەی ژیان‌و ڕژێمی ژیان بەوردی دیاری ئەکات، ئەوەتا ئەفەرموێ: هیچ هاوبەشێك لەزات‌و سیفات‌و خوایەتی‌و تەنیایی‌و دەسەڵاتی دا نیە، ئەو ڕاگیر کەری هەموو شتێکە بوون‌و ژیان بەبێ ئەو لەم بوونەوەرەدا نیە، بەم عەقیدەو بۆچوونە جیا ئەبێتەوە لەو هەموو عەقیدەو بۆچوونە جیاوازانەی هەموو چەرخ‌و جۆرە نەفامیانە، ئیتر چ باوەڕو بۆچوونی بت پەرستەکانی ئەو چەرخ‌و سەردەمە، وە چ هینی جوولەکەو گاور.

قورئـان لەسـەر زمـانی جوولەكەكانـەوە ئەگێڕێتـەوە كـە ئـەڵێن: عـوزەیر كـوڕی خوایـە. هەرچۆنێ لـە(الكتـاب المقدس)ی خۆشیاندا ئـەمڕۆ شتی وا هەیـە، لـەم ڕووەوە بـا سـەرنجی ئیصحاحی شەشەمی(سفر التكوین)بدرێ، بەڕاستی مرۆڤ شەرم ئەیگرێ قسەكەیان بڵێتـەوە، وە هـەروەها لـە مەسیحیەكانەوە بۆمان باس ئەكات كە هەندێكیان ئەڵێن: سێ خـوا هەیە. هەندێ تریان ئەڵێن عیسا خوایە. هەندێ تریان ئەڵێن: عیسا و دایكی دوو خوای جیاوازن لە ﴿الله﴾. هەروەها بۆمان باس ئەكات كە زانا و عابیدەكانی خۆیانیان كێڕاوە بە پەرستراوی خۆیـان. وەك قورئـان ئـەو شـتانەی بـاس كـرد لێیانـەوەو دای بەناوچاویاندا بەرپەرچیشی داونەوە، هـەروەها لـەكتێبی دانراوی خۆیانـدا دان ئـەنێن بـەم جۆرە بۆچوون و بیروباوەڕەدا، یـەكێ لـەو كتێبانـە(الـدعوة إلى الأسـلام)ە، دانـراوی(ئەرنولـد) وەرگێڕانـی(حـسن إبـراهیم) لاپـەڕە(٥٢-٥٣)، ئینجا لـەبارەی لادانی بت پەرستەكانەوە بۆمـان بـاس ئـەكات كـە جنۆكـەو فریـشتەو مـانگ و ڕۆژو بتـە دەسـتكردەكانی خۆیـان ئەپەرسـتن، لـەناو هەموویانـدا ئـەهوەن ترینیان ئەوانەن كە ئەڵێن: ئێمە ئەوانە ئەپەرستین هەر لەبەرئەوەی نزیكمان بخەنەوە لە خوا.

لەوكاتەدا كە ئەو بیروباوەڕە پڕوپووچانە دنیایـان داگیر كردبوو، ئیسلام هـات دای لـەو هـەموو جـۆرە بیروباوەڕانـە، وە بیروباوەڕی پـاكی خـۆی هێنـاو فـەرمووی: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ بێگومـان هەركـەس ئـەم عەقیـدەو بیروبـاوەڕە لـەدڵ و دەروونـی دا دامـەزرێ، ئـەبێ بەرنامەو ڕژێمی ژیانی ئەو كەسە جیاوازبێت لە هەركەسێ كە دڵ و دەروونی ڕەش و تاریك بووبێ بەو بیروباوەڕە پڕوپووچ و بێنرخانە.

ئەو كەسەی كە دڵ و دەروونی ڕووناك بووبێتەوە بەو بیروباوەڕە پاكە هەر بە تەنیا خوا ئەپەرستێ، بەرنامـەو ڕژێمـی ژیـانی هـەر لـە ئـایین و شـەریعەتی خـوا وەرئـەگرێ، لـە هـەموو كاروبـاری ژیـانی ئـەم دنیـا و ئـەو دنیایـەدا هـەر ڕوو بـۆلای خـوا ئـەكات، كەواتـە ئـەو كەسـە دڵئارامەو یـەكبارەو لـە هـەموو شتێكدا سنووری هەیە، بـەلام هەركـەس ئەو بیروباوەڕەی لا نەبێ ئەوا چەوتەو بە پێچەوانەوە ژیان ئەباتـە سەر، كەواتـە ئـەككرتن و یەككەوتن و گەیشتن بە یەك لەنێوان ئەو دوو بیروباوەڕە ناگونجێ و هەڵگرتنیان جیاوازە.

نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ

لەپاش جاڕ دانی ئەو تاك‌و تەنیایی پاكە، ئینجا باسی ئەوە ئەكات كە تەنیا سەرچاوەیەك هەیە بۆ ئایین‌و نامەو پەیامەكان، ئەفەرموێ: ﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەی پێغەمبەر ناردیە بە خوارەوە بۆ سەر تۆ نامە، واتە قورئان كە نامەیەكی وایە وەك هەر ئەو شایان بێت بەوەی ناوببرێ بە نامە، هەر ئەو بەجۆرێكە كە هەركات باسی نامەی خوا كرا ئەو بكەوێتە دڵ‌و دڵ هەر بۆ ئەو بڕوا ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ لە كاتێكدا ئەو نامەیە بەڕاستی هاتووەو ڕاستی پێیە لە هەموو هەواڵ‌و دەنگ‌و باسەكانیاندا، یا دادی لەگەڵەو دادی پێیە لە هەموو بڕیارەكانی دا ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەو نامەیە بەڕاست‌و دروستی ناردە خوارەوە لە كاتێكدا كە بڕوادارە بەهەر نامەیەك كەلە پێش ئەم دا نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرانی پێشوو، باوەڕدارو بەڕاست گێڕە بۆ هەموو ئەو نامەیانە، بەم ڕەنگە هەواڵی داوە بە هاتنە خوارەوەیان‌و بە پێویستی بڕوا هێنان پێیان، بەڕێكی‌و یەكێتی خۆی لەگەڵ ئەواندا لە بنەڕەت‌و سەرچاوەدا، هەروەها باوەڕی هەیە پێیان‌و بە ڕاستیان دائەنێ لەو ئایین‌و شەریعەتەی كە هێنایان، تەنانەت لەو شتانەشدا كە ئەم شەریعەتە هات بە سڕینەوەیان، چونكە ئەم ئەو سڕراوانە بە ڕاست‌و دروست دائەنێ بۆ كات‌و چەرخی خۆیان، بەس مانەوەیان بەڕاست نازانێ لەپاش هاتنی ئەم دواترین پەیامە، بێگومان ئەو نامە پێشوانەش ئەو مانەوەیە بەڕاست دانانێن‌و ئەزانن كە ئەبێ بەم شەریعەتە دواییە بسڕێنەوە، وەك پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) دەست نیشان ئەكات بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: سوێند بەكەسێ كە گیانی منی بەدەستە ئەگەر موسا و عیسا زیندوو بن ئەبێ هەرپەیڕەوی ئەم شەریعەتە بكەن كە من پێی هاتووم، ئەم قورئانە باوەڕی هەیە بە هەرچی لەو نامە پێشووانەدا هاتووە، بەڕاستیشیان ئەگێڕێ لەدڵی خەڵكی دا، چونكە ئەم خۆی گەورەترین موعجیزەی خوایەو ئەچەسپێ‌و جێگیر ئەبێ لەدڵی هەركەسێكدا كە بێبەش نەبێ لە تێگەیشتن‌و ژیریی، كەواتە هەرچی وت هەموو ژیرێك باوەڕی پێ ئەهێنێ.

ئەم قورئانە لە چەند بارو ڕوویەكەوە موعجیزەیەو بەڵگەیەكی زۆر ڕوونە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) یەكێ لەو بارو ڕووانە ئەمەیە كە ئەم بەندەی خوا(ﷺ)نەخوێندەوارو لەناو گەلێكی نەخوێندەوارو نەزاندا پێگەیشتووە، لەگەڵ ئەوەدا

هەواڵی پێغەمبەران و گەلە ڕابووردووەکان و ئەو نامانەی کە هاتنە خوارەوە بۆ سەر گەلان، هەواڵی ئەوانەی دا بەڕاست و دروستی و بەبێ ئەوەی هیچ دوژمنێکیش بتوانێ تەنیا خاڵێکی بە درۆ بخاتەوە، ئەگەر ئەم قورئانە لەگەڵ ئەو نامە پێووانەدا لەیەك سەرچاوەوە نەهاتایە ئەبوایە دژایەتی و ناڕێکی زۆر پەیدا بوایە لەنێوان ئەم و ئەواندا.

لەناو نامەکانی خوادا کەلە پێش قورئانەوە هاتوون، تەورات و ئینجیل بەناو بانگترینیانن، لەکاتی هاتنیانەوە تا ئێستا و لەداهاتووشدا بەناو هەرکامیانەوە ئوممەت و میللەتێك هەیە، بەتایبەتی لەپێش هاتنی قورئاندا هەر ئەو دووانە بە نامەی ئاسمانی دائەنران، وەلە پاش هاتنی قورئان بەو دوانە و بەناوی ئەو دووانەوە بەربەرەکانێی بەتین و سەخت ئەکا لەگەڵ قورئان و موسڵمانانیدا، ئەو دووانەش لەپێش دەست کاری کردن و گۆڕاندنیان ناونیشان و موژدەدان بە هاتنی پێغەمبەرمانیان تێدابوو(ﷺ) بە جۆرێ زاناکانی ئەو دوو میللەتە لەو کاتەدا بەباشی ئەیانزانی کە ئەم قورئان و ئایینە ڕاستە و ئەوەیە کە نامەکانی خۆیان هەواڵ و موژدەیانداوە بە هاتنی، لەبەرئەوە زانا و سەرۆکە ئایینیەکانیان ـ بەتایبەتی جوولەکە ـ لەبەر حەسادەت و خۆ بەزل زانی و خودپەرستی هەر لەو چەرخەدا گەلێ لەو بەڵگە و نیشانە ڕوونانەیان شاردەوە و لەهێندێ شوێنیشدا دەستکاریان کرد، قورئانیش لە چەند شوێنێکدا ئەو کردەوە پیسانەر دایەوە بە نلوچاویاندا، وەك لەجزمی یەکەمی سورەتی پێشوودا گەلێکمان باس کرد، جا لەبەرئەوە کەواتە زۆر شیرین و بەجێیە لێرەدا بە دوای باسی ناردنە خوارەوەی قورئاندا بەتایبەتی دەفەرمووێ: ﴿وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ * مِن قَبۡلُ﴾ تەورات و ئینجیلیشی ناردە خوارەوە لەپێش قورئاندا ﴿هُدٗى لِّلنَّاسِ﴾ لەبەر ڕێنموونی کردنی ئەو خەڵکەی کە ئەو دوو نامەیە نێررایە سەریان، ڕێنموونی کردنیان بە پەیڕەوی کردن و ڕەفتارکردن بەوەی کەلەو دوو نامەیەدا هات بۆیان، کە هێندێ لەوە فەرماندان و هاندان بوو بەبڕوا هێنان و شوێن کەوتنی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) کاتێ کە ڕەوانە کراو هەرکام لەوان پێی گەیشت و کەوتە کات و چەرخی ئەو، کەواتە جوولەکە و گاور لە هەموو کەس شایستەترن بەبڕواهێنان بەم قورئانە، هیچ بروبیانوویەکیان بە دەستەوە نەبووە و نیە بۆ سەرپێچی کردن، تەنانەت لەپاش ئەوەش کە دەست کاری نامەکانیان کراو بە نامەی خوا نەمانەوە، چونکە بە هەرحاڵ ئەوان زاناترو شارەزا ترن بە ئایینی خوا، ئەگەر هەرلادان و سەر لێ شێوانێ ڕووی تێکردبن ئەگەر مەیل بکەن ئەتوانن بەهۆی قورئانەوە هەموو ڕاست و ناڕاستێك لەیەك جوێبکەنەوە،

وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا
يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦﴾

---

وەکو وەرئەگێڕێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ﴾ خوا جیاکەرەوەی ناردە خوارەوە، واتە قورئان کە تاقانە تەرازووە ڕاستەکەی خوایەو بە خەڵات نادری بۆ هەموو جیهانیان، بۆئەوەی بیکەن بە بەرنامەی خۆیان و تاقانە تەرازوویەك بێت بەدستیانەوە بۆ ناسین و جوێ کردنەوەی هەموو هەق و ناهەقێك و هەموو ڕاست و ناڕاستێك، ئەو قورئانەی کە ــ وەك لە پێشەوە وتمان ــ کە هەموو دەستکاری و گۆڕاندنەکانی دایەوە بە ناوچەوانی زاناکانی هەردوو نامەکەدا، ڕێو بارە ڕاستەکەی خوای ئاشکراکرد.

وتەی ﴿ٱلۡفُرۡقَانَ﴾ بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە لێرەدا: هەموو نامەکانی خوا بە تێکڕایی، تەورات و ئینجیل بەتایبەتی، زەبوور، موعجیزەکانی خوا کە دای بە پێغەمبەران ــ سەلامی خوایان لێ بێ ــ ژیریی، ئەم تەفسیرانەش هەرچەند ئەگونجێن، بەڵام تەفسیر کردنەوەی بە قورئان بەهێزترە لەدڵدا لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: قورئان لەسیفەتی جیا کردنەوەدا گەیشتووەتە پایان، کەواتە لەگەڵ ئەو وتەیە بیسترا زەین و دڵ بۆ ئەو ئەڕوا.

دووەم: لە قورئاندا وشەی ﴿ٱلۡفُرۡقَانَ﴾ بەکارهێنراوە هەر بۆ قورئان، واتە ئەم وتەیە بەو شێوەو بەبێ هاوڕێ و وتەیەکی تر.

سێیەم:(قەتادە) و چەند زانایەکی تر ئەیبڕن بەسەر قورئانداو بەو جۆرە تەفسیری ئەکەنەوە لێرەدا.

چوارەم: بێگومان بەپێی فەرمانی خوا لەپاش ناردنی قورئان ئەبێ مەردوم بگەڕێتەوە هەر بۆلای قورئان و ئەو بکات بە فەرمان ڕەواو حەکەم بۆ نەهێشتنی هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەك و ڕوون کردنەوەی باری ڕاست و ڕەوا، دەی ئەگەر بیڕێت بەسەر قورئاندا ئەو کاتە دەست نیشانی تیایەو سەرنجی جوولەکەو گاور ڕائەکێشێ بەوەی کە واز بێنن لە

ئاژاوەو دووبەرەکی لەناو خۆیان و لەگەڵ موسڵمانانیشدا، بگەڕێنەوە بۆلای ئەم قورئانە جیاکەرەوە.

خوای گەورە بەم چەند فەرمووده کورتە کاری ئایین و عەقیدەی ڕوون کردەوە زۆر بە سووك و ئاسانی: تەنها خوایەك هەیەو ئیتر هەموو بەندەو موڵکی ئەو خوایە، ئەو نامەکانی ناردووە بۆ ڕێنیشاندان و ڕێنموونی بەندەکانی، ئایینی خوا یەکەو ڕێی ڕاست هەر ئەوەیە کە لەو نامانەدایە، دواترین نامە ئەم قورئانەیە کە جیاکەرەوەیە بۆ هەموو هەق و ناهەقێك، کەواتە هیچ کەس ڕێی هیچ بروبیانوویەکی نیە بۆ لادان لەو ڕێڕاستەی کە خوا نیشانی داوە، لەپاش ئەوەی بەو جۆرە شتەکەی ڕوون کردەوە، ئینجا هەڕەشەیەکی سەخت و سامناك ئاڕاستەی بێبڕواکان ئەکات کە لەم شوێنەدا گاورو جوولەکە یەکەم و سەردەستەن بۆ ئاڕاستەکردنی ئەم هەڕەشەیە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی خوا کەلە نامەکانیاندا ناردنی ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی بەتین ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ﴾ خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ خاوەنی تۆڵەو سزایە، ئینجا لەم کاتەدا کە ئەم هەڕەشەیە ئاڕاستەئەکات دڵنیایی ئەکات لەسەر ئاگاداری خۆی بە هەموو شتێ و دەرنەچوون و یاخی نەبوونی هیچ شتێك لە زانین و ئاگاداری ئەو، فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ بێگومان پۆشیدەو ون نابێ لە خوا هیچ شتێك نەلە زەوی و نەلە ئاسماندا، واتە لە هەموو جیهان و بوونەوەردا، کە هێندێ لەو زانراوانەبڕوای بڕواداران و بێبڕوایی بێ بڕوایانە.

ئەم فەرموودەیە هەرچۆنێ هەڕەشەکە بەتین تر ئەکات، هەروەها زۆر ڕێك و پێکە لەگەڵ تاك و تەنیایی خواو زیندوویی و ڕاگری و بەڕێوەبەری خوا بۆ هەموو شتێ کە بەم سێ سیفەتە قاپی سورەتەکەی کردەوەو ئینجا لەپەنای ئەو زانین و ئاگاداریە گشتیەدا دەست کاریەکی هەست و دەروونی بەندەکانی ئەکات لەبارەی ئەو دەستە قودرەتەی کە وێنەو نەخشەیان ئەکێشێ لەتاریکی منداڵداندا، بەبێ ئەوەی هیچ کەس ئاگا و دەسەڵاتی ببێ لەوەدا، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ﴾ ئەو خوای تاك و تەنیا کەسێکە کە نەخشەو وێنەی ئێوە ئەکێشێ لە منداڵدانەکاندا ﴿كَيْفَ يَشَآءُ﴾ چۆنی بوێ وەك ئەبینرێ کە هیچ دوو کەسێك نیە لە جیهاندا جیاواز نەبن، تەنانەت منداڵی دووانەش کە لە باوك و دایکێکن بن و لە یەك منداڵداندا پەیدا بووبن، بە ڕاستی شتێکی زۆر سەر سووڕهێنەرەو هەتا

بیری لێ بکرێتەوە زیاتر سەر سووڕنەمێنێ، هەرکەس بێبەش نەبێ لە ژیریی و بیرێك بکاتەوە لێی ئەبێ هەر ئەمە بڵێ کە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی:﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ هیچ خواو پەرستراوێك بەڕاستی نیە بێجگە لەو، کە هەر ئەو زاڵو دەسەڵاتدارێکی لێزانی کاردروستە، کە ئەو نەخشە کێشانە کاری ئەوە، تەنها ئەم فەرموودەیە بەسە بۆ دەم کوت کردنی مەسیحیەکان کە واز بێنن لەو قسە نەفامانەی کە ئەیکەن سەبارەت بە حەزرەتی عیسا(علیه السلام) بێگومان عیسایش وەك هەموو ئادەمیەکی تر، وەك مەردومی نەبوو لە پاشدا لە سکی دایکیدا پەیدا بووو هاتە جیهان، کەواتە چۆنئەو نەفامانە ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە یان خوایە یان هەرشتێ تری نەگونجاو؟!

قورئان هەمووی چوون یەك نیە لە گەیاندن و وەرگرتنی مەبەستەکانی دا، بەڵکو هێندێکی مەبەستەکەی ڕوونەو جێی سەر لێ کردنەوە نیە، هێندێکیان ڕوون نین و جێگای دووبەرەکین و بەم جۆرەیە کە(ئیبن و عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: قورئان چوار بەشە: بەشێکی هەموو کەس تێی ئەگات و مەبەستەکەی بەڕوونی وەرئەگیرێ، بەشێکی پێویستی هەیە بە ناسین و زانینی زمانی عەرەبی، بەشێکی هەر زانای دامەزراو لەازنیندا نێی ئەگات، بەشێکی هەر خوا خۆی ئەیزانێ، دووانە پێشووەکە پێی ئەوترێ:(محکم) ئەم دووانەیتر(متشابە)، کەواتە بەکورتی قورئان دووبەشە:(محکم و متشابە)، ئینجا هۆی هاتنی قورئان لەسەر ئەم دووبارەو هەمووی نەهاتووە بە(محکم)ی. لە ڕاستی دا خوا خۆی باش ئەزانێ کە لەبەر چی وایە؟ بەڵام زانایانی ئیسلام چەند شتێکیان باس کردووە لەو بارەیەوە هەموو جوان و ڕێکن:

١- لە هێنانی(متشابە)دا تاقی کردنەوە هەیە بۆ بڕواداران، بەبڕوا هێنان بەشتێ وا دەرئەکەوێ مل کەچی تەواو، چونکە بەڕاستی بڕواهێنان بەشتێ کە بڕوادار نەیزانێ و تێی نەگات زۆر هونەرە.

٢- ژیریی و بیری ئەخاتە بزووتنەوەو ئیش و ناچاریان ئەکات کە هەوڵ بدەن بۆ زانین و پەی پێبردنی، وەخستنەکاری ژیریی و بیرش زۆر پێویست و مەبەستێکی گرنگە، چونکە هەرکاتێ وەستا و ئیش و کاریان نەکرد لاوازئەبن و ئەمرن، دەی کاتێ ئەکەونە بزووتنەوەو هەوڵدان کە ڕێیان بکەوێ لەشتی گران، لە ئاستی شتی ئاسان پێویست نیە بکەونە کارو ئیش، کەواتە پێویستە بوونی(متشابە).

٣- (متشابه) قاپی ئەکاتەوە لە هەموو خاوەن بیروباوەڕەکان کە بێن و وورد ببنەوە لە قورئان، چونکە هەرکام ئەیەوێ ڕێکی بکات لەگەڵ ڕاوو بیروباوەڕی خۆی، ڕاو مەزهەبی خۆی بەهێزبکات و سەری بخات بەسەر باقی تردا، ئەوکاتە خەڵکێکی زۆر کۆ ئەبێتەوە لە قورئان، لەسەرەنجامی ورد بوونەوەو لێکۆڵینەوەدا گەلێ کەس ڕێی ئەکەوێ لە هەق و ڕاستی، بۆی دەرئەکەوێ کە ئەبێ شوێنی(محكم)ەکان بکەوێ و وازبێنێ لەو ڕاو بیروباوەڕانەی کە شایستە نین و ئەگەڕێتەوە بۆلای(محكم)ەکان.

٤- بوونی(متشابە) لە قورئان دا بڕوادار ناچار ئەکات بە بیرکردنەوەو بەڵگە هێنانەوە لەسەرئەوەی کە هەق و لەئاین و، بۆ پاراستنی و چەسپاندنی هەق و ڕاستەکەو جڵەوگیری لەلادان لێی، بێگومان ئەوەش ئەرك و زەحمەتی هەیەو هۆی گەیشتنە بەڕەزامەندی خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی.

٥- (متشابه) بوو بەهۆی داهێنان و فێربوون و فێرکردنی زۆر لەو عیلمانەی کە موسڵمانان دایان هێنا، وەك عیلمی زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژی و ئوسولی فیقەو علوم القرآن، چونکە موسڵمانان ناچاربوون تەئویل کردن لەو(متشابە)انەداو ڕێك کردنیان لەگەڵ(محكم)ەکاندا، دیارە ئەوە بەو عیلمانە ئەکرێ.

٦- ئەم قورئانە هاتووە بۆ ئادەمی، لە ناو ئادەمیشدا زیرەك و کەودەن و نەزان و زاناو ژیرو گێل هەیە، ئەوانەی کە نەزان و کەودەن و گێلن زۆر شت هەیە کە تێ ی ناگەن و وەری ناگرن لەسەر بارە ڕاستەقینەکەی خۆی، کەواتە، بەم(متشابە)انە نزیك ئەخرێنەوە لێیانەوە تا بەرەبەرە فێرئەکرێن و ڕام ئەکرێن لەسەر ئەو بارەی کە مەبەستە، بۆ وێنە: ئەگەر لە ڕێوە بڵێیت بە یەکێ لەوانە: شتی وا هەیە نە لەش و قەبارەی هەیەو نە لەجێ و شوێندایەو نە دەست نیشانی بۆ ئەکرێ و نە ڕەنگی هەیە، ئەگەر شتی وا بڵێیت وەری ناگرێ و لەوانەیە یەکسەر ئەڵێ: هەرگیز ناگونجێ شتی وا ببێ، کەواتە بۆ ئەوانە چاکتر ئەوەیە بە چەند وتەو وشەیەك کە ئەو خەیاڵ و گومانی بۆ ئەڕوا قسەی لەگەڵ بکرێ تا ڕام ئەبێ و لەپاشدا ئەگەڕێتەوە بۆ بارە ڕاستەقینەکەو بەپێی ئایەتە(محكم)ەکان وەری ئەگرێ ئەگەر تێ ی گەیشت، ئەگەر تێ ی نەگەیشت بڕوای پێ ئەهێنێ و حەواڵەی خوای ئەکات، وەك لەم ئایەتی داهاتووەدا ڕێمان بۆ دیاری ئەکات.

هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ

---

به هەر حاڵو لەبەر هەرچی قورئان ئەو دوو جۆرە ئایەتەی هەیە، وەك هەواڵمان پێ ئەداتو سروشتو ڕێی بڕواداران دیاریی ئەکات لەگەڵ سروشتو ڕێی ئەوانەی کەلە دڵیاندا لاریو لادان هەیە ئیتر ئایا هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بەبۆنەی گاورەکانی نەجرانەوە هاتبێ بۆ دەم کوت کردنی ئەوان یان هاتبێ بۆ دیاریی کردنی هەڵوێستی خەڵکیو دیاریی کردنی ڕێی بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە قورئانی ناردە خوارەوە بۆ سەر تۆ بە جۆرێ ﴿مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ﴾ هێندێ لەو قورئانە چەند ئایەتێکن کە ڕۆشن کراونو بە ڕوونی مەبەستەکانیان ئەگەیەنن وەرئەگیرێن، کە ﴿هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەوانە ئەسڵو سەرچاوەی قورئاننو لەناو ئایەتەکانی قورئاندا پشت هەر بەوان ئەبەسترێ، ﴿وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ هەندێکی چەند ئایەتێکی ترن کە مەبەستەکانیان ڕوون نین بۆمان، ئیتر لەبەرئەوەی لە گفتوگۆی ئێمەدا باو نەبووە بەکارهێنانیان، ئەوەش وەك ئەو پیتانەی کەلە سەرەتای چەند سورەتێکەوە هاتوون، یا لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبدا دانراون بۆ مەبەستێ کە دەست ناداو ناگونجێ لە قورئاندا ئەو مەبەستانەیان لێ وەرگیرابێ، ئەوەش وەك وتەی(ید: دەست، وجە: ڕوو) بۆ خوا، وە دانانی عیسا بە کەلیمەو ڕوحی خوا، یا لەبەرئەوەی بەڕواڵەت دژایەتی هەیە لە نێوان دوو ئایەتا، وەك کۆمەڵێك ئەفەرموونو ئەمەش هەر بە(متشابە) دائەنێن، ئینجا خەڵکی بەرامبەر ئەو(متشابە)انە بەپێی ڕاستو چەوتی سورشتیان جیاوازو دووبەرەکین بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ﴾ ئەوانەی کەلەدڵیاندا لاریو لادان هەیە لە ڕێی ڕاستی خواو بەد نیازو بەد گومانن، ﴿فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ﴾ ئەوانە شوێنی(متشابە)کەی قورئان ئەکەونو لائەدەن لەوەی کە(محکم)ەو مەبەستێکی ڕوونو ڕەوانی هەیە، ئەو شوێن کەوتنەشیان بە نیازێکی بەدو

خراپــه وەك ئەفــەرموێ: ﴿ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ﴾ لەبــەر تێــك دانــی بیروبــاوەڕی موســڵمانانەو دوو دڵكردنیـان‌و لادانیـان لـە قورئـان‌و ئایینەكـەیان، بـەم ڕەنگـە دژایـەتی پێـك ئـەهێنن لـەنێوان ئایەتـەكانی قورئـانـدا ﴿وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾ لەبـەر تـەئویل‌و تەفسیركردنی بـەجۆرێك كە ڕێك بێت لەگەڵ ئارەزووی خۆیان‌و ناڕێك‌و دژی ئایەتە (محكم)ە كان بێت.

زۆربەو جەماوەری ئەم ئوممەتە ـ سوپاس بۆ خواـ كەلە دڵیاندا لاری‌و لادان نیە هەر شوێنی ئایەتـە(محكم)ەكـان ئەكـەون، هـەموو بڕوایـان هەیە ئایەتـە(متشابە)كـان كەلـە لایـەن خواوە هاتوون‌و ڕاستن، هەركام مەبەست‌و تەفسیری ڕاست‌و ڕەوای خۆی هەیە، هـەموو یـەك قسەن كە هیچ كام دیمەن‌و ڕواڵەتەكەی مەبەست نیە، بەڵكو مەبەستە كە شتێكی ترە، ئینجا لەمەو دوا دووبەرەكین كە ئایا ئەو مەبەستە ڕاستە هەر خوا خۆی ئەیزانێ، یان هەندێ لە بەندە تایبەتیەكانیش ئەیزانن؟ چین‌و تاقمی سەرەتای ئەم ئوممەتە كە ناو ئەبرێن بە(سلف)، لەسـەر ڕای یەكـەمن، لـەوان بـە دوواوە كـە پێیـان ئـەوترێ(خلـف) لەسـەر ڕای دووەمـن، ئـەم بەشـی دووەمـە لـەم ئایەتـە بۆ هـەكام دەسـت ئـەدات، بـەم ڕەنگـە تـاقمی یەكـەم لەسـەر وتـەی ﴿الله﴾ ئەوەسـتن‌و ئـەڵێن: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ هـیچ كـەس تەفـسیرو تـەئویلی(متـشابە) نازنێ بە ڕێك‌و ڕاستی بێجگە بە خوا، تاقمی دووەم لێرەدا ناوەستن بەڵكو ئەڵێن: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئینجا ئەوەستن، واتـە هـیچ كـەس نایزانـێ بێجگـە لـە خـواو كەسـانێ كە دامـەزراون لەزانین‌و زانیاری داو یارمـەتی داون‌و ڕاگیری كردوون لەسـەر ڕێگـەی ڕاسـت، جا لەبەرئەوە تـاقمی یەكـەم ئەفـەرموون:(متـشابە) ئەوەیـە كـە زانینـی تایبەتیـە بـە خـواوە، تـاقمی دووەم ئەفەرموون: ئەمەیە كە مەبەستەكەی ڕوون نەبێ، ئیتر ئایا هـەر خوا ئەیزانێ، ئەوەش وەك زانینی كاتی دوایی هـاتنی ئەم جیهانەو هـاتنی ڕۆژی دوایی‌و زانینـی تایبـەتێتی ژمـارەی نـۆزدە كاربەدەسـتانی دۆزەخ، هـەروەها زانینـی ئـەو شـتانەی كە بـۆ خـوا بـەكار هێنـراون‌و بەڵگـەی ژێـریش هەیـە لەسـەر ئـەوەی كـە بـە ڕوواڵەتەكـەی ناگونجـێ بـۆ خـواو مەبەسـتە ڕاستەقینەكەشـی ڕوون نەكراوەتـەوە، یـا هەرچـۆنێ خـوا ئـەیزانێ‌و هێنـدێ لەبەنـدەكانیش ئـەیزانن، ئـــەوەش وەك هێنـــدێ ئایـــەتی(متـــشابە) كـــە ئـــەو زانایانـــە ئەیانگێڕنـــەوە بۆلای(محكم)ەكان، بە پێـی ئەوە مەبەستیان بۆ دیـاریی ئەكـەن، بۆنموونـە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾

هەردوو تاقم یەك قسەن لەمەدا کە مەبەست ئەوەنیە کە خوا نیشتەجێ و جێگیربووە بەسەر عەرشەوە، چونکە ئەگەر وابێ ئەبێ بە وێنەی دروست کراوەکانی بێت، خۆیشی ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ هیچ شتێك وەك خوا نیە، بێجگە لەوەش بەڵگەی ژیریی زۆریش هەیە لەسەر ئەوە کە ئەو مەبەستەی نابێ لێ بگیرێ لێرەدا، هەروەها هەر ئایەتێکی تر کە مەبەستە عەرەبییەکەی نەگونجێ بۆ خوا، لە هەموو ئەوانەدا هەردوو تاقمی ئوممەت ئەگەڕێنەوە بۆلای ئەم ئایەتە(محكم)ەو شوێنی ئەم ئەکەون، بەڵام لەمەدا دووبەرەکین کە تاقمی یەکەم ئەفەرموون: چۆنێتیەکەی نازانین و حەواڵەی خوای ئەکەین، تاقمی دووەم مەبەستیان بۆ دیاری ئەکەن و تەئویلیان تیا ئەکەن بە جۆرێ ڕێك بێت لەگەڵ ئایەتە(محكم)ەکەدا، بەم ڕەنگە لەو ئایەتەدا ئەفەرموون: مەبەست لە ﴿ٱسْتَوَىٰ﴾ بەرزو بڵندو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، یان کاروباری دروست کراوەکانی تەواو بووو بە پایان گەیشت، بێگومان ڕای یەکەم شەرم و مل کەچی زیاتر تیایە بەرامبەر خوا، مەترسی هەڵە کردنی تیا نیە، ڕای دوومیش بەرگری کەرە بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێ مەردوم گومڕا بکەن و لەڕێی ڕاست بیان ترازێنن بە هۆی ئەو ئایەتە(متشابە)انەوە.

ئەم دوو تاقمە موناقەشەو لێکۆڵینەوەی زۆریان کردووەو هەرکام چەند ڕابەرو بەڵگەیەکی زۆری هێناوەتەوە لەسەر ڕاوڕێبازی خۆی، وەك لە کتێبەکانی تەفسیردا باس کراوە، بە تایبەتی تەفسیری ڕازی و(روح المعاني) زۆر بەدرێژیی باسەکەیان هێناوە، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشایان بکات، ئینجا ئەوانەی کە ئەوەستن لەسەر وتەی ﴿الله﴾ لەوە بەدواوە ئەکەن بە وتەیەکی سەربەخۆ حاڵ و ڕای ئەوانە دەردەخات کەلە دڵیاندا لاری و لادانی نیە، حاڵ و باریان دەرئەخات کە سەبارەت بەو(متشابە)انە بەشەرم و بە ئەدەبن و مل کەچن بۆ خواو زانینیان حەواڵەی خوا ئەکەن، کەواتە با هەرکەس زانا نیە شوێنی ئەو زانایانە بکەوێ و باشتر بەشەرم و مل کەچ بێت، ئەوانەی کە ئەوەستن لەسەر وتەی ﴿ٱلْعِلْمِ﴾ لەوە بە دواوە ناکەن بە ڕستەیەکی سەربەخۆ، بەڵکو ئەیبەستن بە وتەی ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ﴾ەوە، جا بۆ زیادە ڕوون کردنەوە با لەسەر هەردووبارە کە تەفسیری بکەینەوە: لەسەری ڕای یەکەم: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ﴾ ئەوانەی کە دامەزراو نەگۆڕاون لەزانین و زانیاری دا،

يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا
وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِۚ إِنَّ
ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ

---

﴿يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوەو هەیە بە(متشابە) کە فەرموودەی خوایەو بڕوامان هەیە پێی بەو جۆرەی کە خوا نیازی کردووە ﴿كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾ هەرکام لە(محکم) و (متشابە) لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووەو تێ ی گەیاندوین لە(محکم)ەکەی و(متشابە)کەی دەرنەخستووە بۆمان.

لەسەر ڕای دووەم: ئەڵێن: دامەزراوەکانیش(متشابە) ئەزانن لە کاتێکدا ئەڵێن: بڕوامان پێی هەیەو هەرکام لە(محکم)و(متشابە) لە لایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، واتە وەك ئەیزانن مل کەچن بۆ خواو بەجۆرێ تەئویلی ئەکەن کە شایستە بێت بۆ خوا، ئەیانەوێ بەو تەئویلە مەردوم بپارێزن لە بێبڕوایی و لادان لە قورئان، نەك وەك دڵ لاروخێچەکان کە باس کران و خوا نەنگی لێ گرتن و بەدیی دەرخستن. لەسەر هەر بارو هەر ڕایەك پێویستە لەسەر بڕواداران بە تێکڕایی لەسەر ڕێبازی ئەو زانا دامەزراوانە بن، چونکە ئەوان بەباشی ناو ئەبات، ئەوەتا ئەو نازناوە گەورەیان لێ ئەنێ: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ﴾ لەپاش ئەوە دەست نیشان ئەکات کە ئەوانە خاوەنی ژیریی و بیرن، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بیرناکاتەوە لە قورئان و تەمێ و ئامۆژگاری لێ وەرناگرێ مەگەر خاوەنەکانی ژیریی و بیری پاك و خاوێن، واتە ئەوانەی کە ئەزانن قورئان دوو بەشەو بڕوایان بە هەردوو بەشەکە هەیەو دڵیان لاری و لادانی تیانیە، ئەزانن(متشابە)یش هەر ڕاستەو لای خواوە هاتووەو تەفسیرو تەئویلیان ناکەنەوە بەجۆرێکی ناشایستە. هەر ئەوانەن خاوەن ژیریی پاك و بێلەکەن، ئینجا با بزانرێ ئەوانەی کە ئەفەرموون: زانادامەزراوەکانیش(متشابە) ئەزانن مەبەستیان ئەوەنیەکەهەموو (متشابە)ئەزانن، چونکە بە پێی ڕای هەمووان زانینی هێندێ لە(متشابە) تایبەتیە بە خواوە.

ئەو زانا دامەزراوانە باشتر نرخی ڕێنموونی ئەزانن و مەترسی ئەکەن لەلادان لە ڕێی ڕاست، وەترسیان لە ڕۆژی دوایی زۆر ترە، لەبەرئەوە ئەم نزاو پاڕانەوەیە ئەکەن و ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لامەدە لە ڕێی ڕاست ﴿بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا﴾ لەپاش ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین ﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ ببەخشە پێمان لەلایەن خۆتەوە بەزەیی و میهرەبانیەکی گەورەو گرنگ بە ڕتنی چاکەو بەهرەت بە شێوەی گشتیان ڕاگیر کردنمان لەسەر ڕێی ڕاست بەتایبەتی، داوات لێ ئەکەین، چونکە ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ﴾ بەڕاستی هەر تۆی زۆر بەخشندەو بە هەمیشەیی بەخشندەی هەموو بەخشراوێکی، ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ﴾ ئەی پەروەردگارمان بێگومان تۆ کۆکەرەوەی هەموو ئادەمیت بۆ پرسینەوەو تۆڵەو پاداشتی ڕۆژێك کە ﴿لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾ شایستە نیە هیچ گومان و دوو دڵیەکی تیا بێ، چونکە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بەڕاستی خوا بەڵێن هەڵناوەشێنێتەوە، لە کتێبە صەحیحەکاندا هاتووە لە(حەزرەتی عائیشە) وە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەرمان(ﷺ) زۆر نزای ئەکرد بەم شێوەیە: ئەی کەسێ کە دڵەکان وەرئەگێڕی دڵی من دامەزراو بکە لەسەر ئایینەکەت. منیش عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا: ئای چەندە زۆر نزا ئەکەیت بەم نزایە. ئەویش فەرمووی: هیچ دڵێك نیە کەلە بەینی دوو پەنجەدا نەبێ لە چەنجە قودرەتیەکانی خوای میهرەبان. کاتێ ویستی ڕاست و ڕاگیری بکات ڕاگیری ئەکات، وە ئەگەر ویستی لای بدا لای ئەدا. بێگومان هەر کاتێ دڵی بڕوادار هەستی کرد بە زاڵی خواهیش و ئیرادەی خوابەو جۆرو شێوەیە بێگومان ئەو دڵە بێ پەرواو بەسۆزو پەرۆشەوە پەلامار ئەدا بۆ سایەو پەنای خوا بۆئەوەی ئەو بەهرە چاکەی کە پێی بەخشیوە لێی نەسەنێتەوە، بێگومان ئەو زانا دامەزراوانە بەشدارن لەو هەستە پاك و خاوێنەی کە خوا بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)، کەواتە زۆر مافی خۆیانە ئەو نزاو لاڵانەوە بکەن کە قورئان لێیانەوە گێڕایەوە.

﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ
ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ
ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ
كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ

**لەپاش ئەوەی ڕێو ڕێبازی بڕواداران ڕوون کردەوە، ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا چارەنووس و دوا ڕۆژی بێبڕواکان دیاریی ئەکات، بە تایبەتی هەڕەشە ئەکات لە بێبڕواکانی نامەدار کە ئەو هەڵوێستە ناڕەوایان هەیە بەرامبەر ئەم ئایینی ئیسلامە، فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بیان ترسێنێ. وە بیریان بخاتەوە ئەوەی کە بەچاوی خۆیان بینییان لە غەزای بەدردا، کە بەو شێوەیە خوا شکاندنی بە ڕیسوایی و سەر شۆڕی لەسەر دەستی تاقمێکی کەم لە بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە ﴿لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ هەرگیز ماڵ و منداڵەکانیان هیچ جۆرە بەرگریەکیان لێ ناکەن لە سزای خوا، واتە ئەو دارایی و سامانەی کە کەشخەی پێوە ئەکەن و ئامادەیان کردووە بۆ کاتی تەنگانە و بەرگری کردنی زیان و بەسەرهاتی خراپ، بۆ ڕاکێشانی بەرژەوەندی خۆیان، ئەو کوڕو کاڵەی کە پشتیان پێ ئەبەستن بۆ هەر ڕۆژو بەسەرهاتێکی ڕەش، هیچ کام لەوانە هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنن و هیچ کەڵکیان نابێ بۆیان لەکاتی هاتنی سزای خوادا، یا مەبەست ئەوەیە ئەو ماڵ و منداڵانەی کە خەریکن پێیەوە بێئاگای کردوون لە خوا، هیچ لەوانە جێی میهرەبانی خوا یا گوێڕایەڵی خوا ناگرن بۆیان،﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾ ئەو بێبڕوایانە سووتەمەنی و هەڵگیرسێنەری ئاگری دۆزەخن لە ڕۆژی دوایی دا.**

**باوی ئەم بێبڕوایانە لە بڕوا نەهێنان و دووچار بوونیان بە سزای خوا: ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وەك باوی دەستەو بەستەکەی فیرعەون و ئەوانەی کەلە پێش ئەواندا بوون وایە، ئەوان ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ بڕوایان نەهێناو ئایەت و نیشانەو موعجیزەکانی ئێمەیان**

بـەدرۆ دانـا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ ئینجـا خـوایش بـەپێی بـاوی خـۆی گرتنـی بـەخۆیان‌و گوناهەکانیانەوە، ماڵ‌و دارایی‌و کوڕوکاڵ‌و دەستەو بەستەیان هیچ سوودی پێنەگەیاندن، واتە باوی گەلە بێبڕواکانی پێشوو کۆڵ نەدان‌و سووربوون بووە لەسەر بێبڕوایی، باوی خوایش تۆڵە سەندن بووە لێیان، کەواتە بێبڕواکانی ئەم ئوممەتەش دووچاری سزای خۆیان دێن، چونکە ئەمان لەسەر باوی ئەوانن، خوایش هەر خواکەی جارانەو باوی خۆی تێك نادات، ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ خوا تۆڵـەی سـەختەو تۆڵـەی زۆر بە تینە بۆ ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانی خوا. جا لەبەرئەوە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بیانترسێنێ بە چارەنووسی سەختی هەر دوو جیهان، ئەگەر لە یادیان نیەو بێئاگان لە تۆڵەو بەسەرهاتی گەلە پێشووەکان، بێگومان ئەزانن بێبڕواکانی قوڕەیش لە ڕۆژی بەدردا چییان بەسەرهات لەسەر دەستی ئەو تاقمە کەمە بڕوادارەدا، ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بڵێ بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو لە زانینی خوادا تێپەڕی کردووە بڕوانەهێنانیان: ﴿سَتُغْلَبُونَ﴾ بێگومان بـەم نزیکانـە ئەشـکێنرێن‌و ژێردەسـت ئـەکرێن﴿وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ لـە ڕۆژی دواییـشدا کۆئەکرێنـەوە بۆلای دۆزەخ بۆ تێچوونی ﴿وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ دۆزەخ جێ‌و شوێنێکی زۆر بەدو خراپە کە ئامادە کراوە بۆیان!

وا دەرئەکـەوێ یـەك چـێ‌و یـەك تـاقم کـە ئـەم هەڕەشـەیان ئاراسـتەکرا جوولەکـەکانی مەدینــەبوون، چــونکە ئەگێڕنــەوە لــە(ئـیبن‌و عـەباس)ەوە –خـوا لێیــان ڕازی بــێ– کــە جوولەکـەکانی مەدینـە کاتـێ بینیـان زاڵبوونی پێغەمبـەر(ﷺ) لەبەدردا وتیـان: واللە ی ئەمـە ئەو پێغەمبەرەیە کە موسا موژدەی داوە پێی‌و لە تەوراتدا ناونیشانی هـاتووە، خەریك بوون موسڵمان ببن، ئینجا هەندێکیان وتیان: پەلـە مەکـەن هـەتا جەنگ‌و ڕووداوێکی تر، ئینجا کاتێ ڕووداوی(احد) هات کەوتنـە گومان‌و بڕوایان نـەهێنا‌و ئەو پەیمانەی کە دابوویـان بە پێغەمبـەر(ﷺ) شکاندیان،(کـەعبی کـوڕی ئەشرەف) بـە شەسـت کەسـەوە چـوو بـۆ مەککـەو پەیمانی بەست لەسەر جەنگکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، بە ڕیوایەتێکی تردا لە(سەعیدی کوڕی جوبـەیر‌و لە ئیبن‌و عەباس)ەوە –خوا لێیان ڕازی بێ– کەلە پاش گەڕانەوە لەبەدر پێغەمبـەر(ﷺ) جوولەکـەکانی کۆکردەوەو ترساندنی بەوەی کە

دووچار بین بە وێنەی ئەوەی کە دووچاری قورەیش بوو، ئەوانیش وتیان: ئەی محمد بەوە هەڵنەخەڵەتێیت کە ڕێت کەوت لە تاقمێك کە بێئاگا بوون لە جەنگ‌و بە هۆی ئەوەوە ئەو هەلەت بۆ هەڵکەوت، ئەگەر بجەنگێن لەگەڵ ئێمە تێئەگەیت کە سەرکەوتوو ئێمەین‌و تۆ هاوسەری ئێمەنیت، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، بە هەرحاڵ‌و لەسەر هەر بارو ئەو هەواڵدانی قورئانە شتێکی نهێنی‌و غەیبی بوو، موعجیزەیەکی گەورە بوو بەدی هات بەو نزیکانە دەربارەی ئەو جوولەکانە، ئەوە بوو بەهۆی تاوانی گەورەی خۆیانەوە تاقمێ دەرکران‌و تاقمێ کوژران ـ سوپاس بۆ خوا ـ وەك بەدرێژیی لە شوێنی تایبەتی خۆی دا باس کراوە، ئینجا پاش ئەوان هەروا هات پەیتا پەیتا تاقمی بێبڕوایان هەر ژێر کەوت‌و شکێنرا هەتا موسڵمانان لایاندا لە ڕەوشتی پاکی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) دەست بەرداری هۆی سەرکەوتنی خۆیان بوون کە تێکۆشان‌و فیداکاریە لە ڕێی خوادا.

ئەو جوولەکانە ــ وەك لە قسەی خۆیانەوە دەرکەوت ــ زۆر ئەنازین بە خۆیاندا، هەڵخەڵەتا بوون بە زۆریی خۆیان‌و چەك‌و ماڵ‌و سامانیان، جا ئەوا ئەدا لەو کەشخەو سەرکێشیەیان، بەڵگەو نیشانەی ژێر کەوتنیان ئەخاتە پێش چاو، دەری ئەخات کە سەرکەوتن‌و ژێر کەوتن بەدەست خوایە، نەك بەزۆرو کەمی. ئەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ﴾ بێگومان بەڵگەو نیشانەیەکی گەورە لەسەر ڕاستی ژێر دەست کردن‌و شکاندنتان دەرکەوت بۆتان ﴿فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا﴾ لەناوەندی دوو تاقمدا کە تێ‌جەنگێن لە(بەدر)دا ﴿فِئَةٌ﴾ تاقمێکیان بڕوادار کە ﴿تُقَـٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگی ئەکرد لە ڕێی خوادا بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خوا، کەواتە بەرزترین پلەی بڕوایان بوو، واتە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە ڕای بەهێز لەسەر ئەوەیە(٣١٣) کەس بوون(٧٧) کەسیان لە کۆچ کەران‌و(٢٣٦) کەسیان لە مەدینەییەکان ـ خوا لە هەمووان ڕازی بێت ـ، ﴿وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ﴾ تاقمێ تریان کە بێبڕوا بوون، واتە بت پەرستەکانی قورەیش کە نزیکی هەزار کەسێك بوون بە سەرۆکەکانیانەوە هاتبوون، بێگومان ئەو دوو تاقمە هاوسەرو هاوتای یەك نەبوون، بەڵکو زۆر دوور بوون لە یەکەوە، چونکە تاقمی موسڵمانەکان ژمارەیان کەم بوو، کەم چەك بوون، لەماڵەوە بۆ جەنگ نەهاتبوون، بەڵکو بە نیازی ئەو کاروانە هاتن کە وەك هەنگوینی بێ مێش وا بوو، کەواتە

خۆیـان ئامـاده نـەکردبوو، یەکـەم جـاری جـەنگ کردنیـان بـوو، لـەوەو پـێش زۆر کـەم تـێ کەوتبوون یان هێندێکیان زۆر گەنج بوون هەر تێ نکەوتبوون‌و جەنگیان نەدیبوو، بەڵام ئەو تاقمەی تر بە پێچەوانەوە ژمارە زۆر و چەك زۆرو ولاغ زۆرو بە ئامادەیی‌و لێ بڕان هاتبوون، هـەموو لێزان‌و کارامـەو تـێ کـەوتووبوون، چەند جـەنگ‌و تەنگانـەیان لـەوەو پـێش دیبـوو، بێجگە لەوانە گەلێ قورەیش زۆر زۆر تـەقێ لێ کرابوون‌و سام‌و بیمیـان هـەبوو لـەدڵی خـەڵکی دا، بـە تایبـەتی سـەرۆکەکانیان لـە بـاوك‌و باپیریانـەوە هـەر بـە گـەورەیی‌و تـەقێ لێ کـراوی هـاتبوون، کەواتـە ئەگـەر دەستی یارمـەتی خـوا نەهاتایەتـە کـار موسـڵمانەکان تیا ئەچوون، بەڵام خوا یارمەتی لەشکری خۆی ئەدات تەنانەت ئەو لەشکرە بەفەڕە کە پیرۆزترین لەشکر بـوو لـە جیهانـدا، یارمـەتی دان لـە چـەند بـارو ڕوویەکـەوە: یـەکێ لەوانـە ئـەوە بـوو کـە خـوا لەخـەودا بێبڕواکـانی بـە کـەم پیـشانی پێغەمبـەر(ﷺ) دا تـا بـە گێڕانـەوەی ئـەو خـەو موسڵمانەکان دڵیان بەهێز ببێ‌و نەترسن لێیان، یەکێ‌تر ئەوە بوو پێش ئەوەی لە شکرەکان تێك بڕژێن خوا موسڵمانەکانی زۆر بە کەم خستە بەرچاوی بێبڕواکان تا ڕادەیەك ئەبو جەهل ووتی: محمدو هاوڕێکانی هەر هیچ نین‌و بەشی هیچ ناکەن، ئەوەش لەبەرئەوە بەبێ نرخیان دابنێن‌و خۆیـان ئامادەنەکـەن بۆیـان، هـەروەها بێبڕواکانیشی زۆر یەکـەم خستە بەرچاوی موسڵمانەکان تا ڕادەیەك(ئیبن‌و مەسعود) -خوا لێی ڕازی بێ- وتی بە یـەکێ کەلە تەنیشتی بوو: من بە حەفتا کـەس ئـەیان بینم، ئەویش وتـی مـن بە سـەد کەسـێ ئـەیان بینم، خـوا لـەم بارەکەیـشەوە ئەمـەی کـرد تـا موسـڵمانەکان بیمیـان لـێ نەکـەن‌و بێ‌غـەم بـن، خەوەکـەی پێغەمبەریش(ﷺ) بەڕاست بگێڕێ لەپێش چاویان، وەك لە سورەتی ﴿الأنفال﴾دا باسـی ئەم دوو نیشانە گەورەیە ئەکات. ئینجا لەپاش تێك ڕژان موسڵمانەکانی زۆر کرد لەپێش چاوی بێبڕواکـان تـا ڕادەیـەك بـە دوو قـاتی خۆیانیـان ئـەزانین، ئـەوەش لەبەرئـەوە لـە ناکـاودا پێـی سەرگەردان بێن‌و دڵیان داکەوێ‌و هێزیان نەمێنێ،

يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي

ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ

ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ

---

**لێرەشدا دەست نیشان ئەكات بۆ ئەم نشیانەیە كە ئەفەرموێ: ﴿يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ﴾ تاقمە بێبڕواكە ئەو تاقمەكەی تریان ـ واتە موسڵمانەكان ـ ئەبینن بەدوو چەندانەی خۆیان بەدیتنی چاو، یان لەدیتنی چاودا. ئەم فەرموودەیە بەسێ جۆرێ تریش تەفسیر كراوەتەوە، وەك لە تەفسیری ڕازیو ئالوسی دا ئەفەرموێ. بەڵام ئەوەی كە گوتمان بەهێز ترە لای زانایان،(سوددی) كە یەكێكە لەباوەڕ پێكراوان بەو جۆرە تەفسیری كردووەتەوە،(شێخ الإسلامی ڕۆمی)و زۆر لە زانابەرزەكان پەسەندیان كردووە، ڕیوایەتی(محمدی كوڕی فرات) لە(سەعیدی ئەوس)ەوە بە تەواوی ئەیبڕێ بەسەر ئەو بارەدا كە گوتمان: ئەفەرموێ: بت پەرستەكان موسڵمانێكیان بەدیل گرتو لێیان پرسی ئێوە چەند كەس بوون؟ ئەویش ئەڵێ:(٣١٣) كەسێك بووین، ئەوانیش ئەڵێن: ئێمە ئێوەمان بەدوو چەندانەی خۆمان ئەبینی، واتە بە هەزارو نۆسەد كەس، چونكە ژمارەی ڕاستیان(٩٥٠) كەس بوو، كەواتە هەر ئەمە ڕاستە كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ خوا بە یارمەتیو كۆمەكی خۆی بەهێز ئەكات هەركەس كە خوا خۆی بیەوێ، بەڵێ ئەگەر كۆمەكی خوا نەبوایە، چۆن ئەو ڕووداوە بەو جۆرە ئەبوو؟ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ بێگومان لەو یارمەتیەدا كە باس كرا بەو جۆرو شێوەیە پەندو تەمێ هەیە بۆ ئەوانەی كە خاوەنی تێگەیشتن ژیرین، بەڵێ بەڕاستی ئەو ڕووداوە بەڵگەیەكی زۆر ئاشكرا بوو لەسەر ئەوەی كە سەركەوتنو ژێر كەوتن بەدەست خوایە، كەواتە ئەبوایە ئەو جوولەكانە تەمێ خوار ببونایەو كۆتاییان بهێنایە بە دوژمنایەتیو پیلانو ناپاكی، بەڵام كۆتاییان نەهێنا تا خوا بەزوویی هەڕەشەو هەواڵی شكانو ژێر دەست كردنەكەی بەدی هێناو ڕاستی پێغەمبەرەكەی دەرخست(ﷺ)، بێگومان ئەو بەڵێنی خوا هەر بۆئەو كاتە نەبوو، بەڵێنی شكاندنی بێبڕوایانو دوژمنانی ئایینی خوا، بەڵێنی بەهێز كردنو یارمەتی دانی بڕواداران با زۆر كەمیش بن، ئەو بەڵێنانە شتێكی**

هەمیشەیی و هەموو کاتێ، بە مەرجێ ئەوەی کە لە توانادا هەیە بەکاری بێنن، خۆگرو بەئارام و بە ئومێد بن بە میهرەبانی و بەڵێنی خوا، کۆڵنەدەن و بەپێی توانێ چەك و هۆی سەرکەوتن بەکاربێنن، ئەگەر کارەکەیان درێژەی کێشا پەلە نەنێنەوە و نائومێد نەبێ و چاوەڕوانی کات و ماوەی دیاریی کراوی خوا بن. بەڵێ بەڕاستی زۆر ئاشکرایە کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هەمیشەییە و بەو مەرجانەی کە باس کران، ئەگەر ئەو یارمەتیە نەبووایە ئێستا ناوی ئیسلام نەما بوو لەڕووی زەوی دا، چونکە ئەبینێ لەپاش نەمانی سەرکردایەتی و هێزو یەکێتی موسڵمانان و بەش بەش بوونی خۆیان و وڵاتەکانیان، لەپاش ئەو ئەبینێ بێبڕواکان لە هەموو لایەکەوە ـ لەگەڵ ئەو زۆری و هێزو دەسەڵاتەیاندا ـ لەدەرو لەناو و هەموو جۆرە چەکێکیان خستووەتەکار بۆ نەهێشتنی ناوی ئیسلام و موسڵمانان، هەموو جۆرە پیلانێك بەکار ئەهێنن و هەموو جۆرە چونکە کێك ئەخەنە کارو ڕووی ئەکەنە ئەوانەی کە ناوی ئیسلام ئەبەن بە ڕاستی، لەگەڵ ئەوەدا تابێت ناوی ئیسلام پەرەئەسێنێ و موسڵمانان باشترو سوور تر ئەبن لەسەر ئیسلام، دڵیان بەهێزتر ئەبێ و ئومێدیان بەتێ تر ئەبێ بۆئەوەی کە جارێکی تر درەختی ئادەمێتی بڕوێتەوە لە جیهاندا بۆ حەوانەوەی هەموو کەس لە ژێر سایەی دا، بەئیزنی خوا هاتنی ئەو ڕۆژەو گەیشتن بەو ئامانجە دوور نیە!

ئینجا بەپێی باوی قورئان لە پەروەردەکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن و ئامۆژگاری کردنی مەردومدا، بەپێی ئەو باوە شیرینەی لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ چەند شتێکی سروشتی لە ئادەمی دا، کە هەموو خراپی و لادانێك لەوانەوە دەست پێ ئەکات، ئەگەر جڵەویان نەگیرێتەوە بە پارێزگاری کردن و وریاییەکی هەمیشەیی، وە ئەگەر دڵ و دەروون پەیوەست نەکەن بەوەی کە لای خوایە کە هەر ئەوەش پاك و خاوێنە و نەمانی نیە.

ئەو شتە سروشتیانەش ئارەزوواتەکانی نەفسن کەلەم ئایەتی داهاتووەدا کۆی کردوونەتەوە، بێگومان هەرچەند ئەوانە پێویستن لەم جیهانەدا بۆ پارێزگاری ژیان و درێژە پێدان و گەشە پێکردنی، بەڵام سەر تێ‌کردنیان و خۆ خەریك کردن بە هەمیشەیی پێیانەوە دڵ خەریك ئەکەم لە مەبەستی هەرەبەرز، بەرگری مەردوم ئەکەن لە کارو فرمانی سەرەکی خۆی، کارو فەرمانی جێنشینیەکەی لەم جیهانەدا، بێ‌ئاگا و بێهۆشی ئەکەن لەهەوڵ و تێکۆشان و بۆ ژیانی ڕاستەقینە و نەبڕاوەی ئەو جیهان، جا لەبەرئەوە ئیسلام دان ئەنێ بەو

ئارەزووەکانەداو جڵەوگیرییان لێ ناکات، بەڵکو بەشیرین و پیرۆزیش نیشانیان ئەدات، بەڵام لە هەمان کاتدا هەمیشە تەمێ و ئامۆژگاری ئەکات بەمەی ئەو ئارەزووانانە زیادە ڕەویان پێنەکرێ و لەڕادەو سنووری ڕاست و ڕەوای خۆیاندا ڕاگیر بکرێن و بەکاربهێنرێن و بە جۆرێ نەبن کە ژیانی ئەو جیهان لەدەست دەرکەن، بەڵکو بەپێی بەرنامەی خوا بجوڵێتەوە تا خۆشی هەردوو جیهانیان دەست کەوت ببێ.

بەکورتی ئیسلام جیاوازە لە هەموو بیروباوەڕو بەرنامەیەکی تر، نەپێش ئەخواتەوە بە مەردوم تا دووچاری گرێی دەروونی بکات، نە جڵەویش ئەدات بە دەست نەفس و شەیتانەوە تا هەوڵی دێرن و بیخەن بە مل هەموو قەڵبیەکدا، ئەمەی کە ئیسلام بڕیاری ئەدا زاناکانی دەروونی لەم دواییەدا گەڕانەوە بۆلای و بڕوایان پێهێناو تێگەیشتن کە ڕێی ڕاست هەر ئەوەیە کە ئیسلام هێنای، ئەمەی کە ئیسلام هێنای ڕاگیر کردنە لە سنووردا و بەرەڵا نەکردنە کە پێی ئەوترێ:(ضبط النفس) نەك دان نەنان بە ئارەزووو قیزکردنەوە لێی وپێش پێخواردنەوەکەپێی ئەوترێ(کبت النفس)وەگرێی دەروونی هەر لەم پەیدا ئەبێ.

ئیسلام لەسەر ئەو باوو بەرنامە بێ وێنەی خۆیە چەند شتێکی گرنگ و سەرەکی کۆئەکاتەوە کە بەسروشت ئارەزوو ئەکرێن، خۆشەویستن و ئارەزوو کردنیان ڕەوا ئەدا، ئەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾ ڕازێنراوەتەوە بۆ ئادەمی و شیرین کراوە لەبەرچاوی خۆشویستنی ئارەزووەکانی نەفس، واتە بە سروشت وا دروست کراوە ئارەزووی کراوەکانی خۆش ئەوێ کە بریتین لە ﴿مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ لە ئافرەتان ﴿وَٱلْبَنِينَ﴾و کوڕان، ﴿وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ﴾ دارایی زۆرو فراوانی کەڵەکە کراو ﴿مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ﴾ لە زێڕو زیو، ﴿وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ﴾ ئەسپ و ماینی دابەستراو، یان شیرینی نیشانە دار کراو بە سپێتیەك لەناو چاودا، یا بەرەڵا کراو لە لەوەڕگادا، ﴿وَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ چوار پێکان لە حوشترو مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ، ﴿وَٱلْحَرْثِ﴾و کشتوکاڵ، ﴿ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوەی کە باس کرا خۆشی و بەهرەی ژیان و زیندەگانی جیهانە، ئەمانەی کەباس کران نموونەی ئارەزووکراوەکانن، سەرەکین بە تایبەتی لەو چەرخەداو لەناو ئەو چین و گەلەدا کە یەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، هێندێکیان پێویستن لە هەموو چەرخ و کاتێکدا، قورئان ئەوانەی کۆکردەوەو نرخی خۆی بۆ دیاری کردن، بەوەی کە خۆشی و بەهرەی ئەم ژیانە کەم و کورتەن،

وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ
جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ
بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿١٥﴾ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ
ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ

بۆئەوەی لە جێ و سنووری خۆیاندا ڕاگیربکرێن و زیادە ڕەویان تیادا نەکرێن، چاو بېڕێتەبەرزترو گەورەتر کە دەست نیشانی بۆ ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾ لای خوا هەیە شوێنی گەڕانەوەی خۆشی لە ڕۆژی دوایی دا کە ئەوەش بەهەشتە، خوا بەشدارمان بکات لێی.

خوای گەورە خۆشویستنی ئەو شتە ئارەزوو کراوانەی ڕەوا داوە بە پێی ئەو بەرنامە ڕێك و پێکەی کە بۆی داناوە بەڵام لە هەمان کاتدا تەمێ و ئامۆژگاری ئەکات کە مەردوم خۆی نەکات بە بەندەی ئەڵقە لەگوێی ئەو ئارەزووانە، بەڵکو بەگوێرەی پێویست بەکاریان بێنێ، سەرنج ڕائەکێشێ بۆ چاکتر لەوانەو بەرزترو پاك و خاوێن تر لەوانە، بانگ ئەکات بۆ هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئارەزوواتی لەشی و دەروونی نەبڕاوە، لە جیهانێکی تردا وەك لێرەدا بەدوای ئایەتی پێشوودا ئەم ئایەتە ئەهێنێ و بەدرێژتر باسی خۆشی و ئەو شوێنی گەڕانەوە خۆشەی لای خۆی ئەکات کەلە دوایی ئایەتی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرد، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۚ﴾ ئایا هەواڵتان بدەمێ بە چاکتر لەو شتانەی کە باس کرا بۆتان؟ بەو پرسیارە هەواڵ پێدراوەکان وریا ئەکاتەوە بۆ گوێگرتن و بیرکردنەوە، ئینجا بۆیان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ﴾ ئەو بڕوادارانەی کە بەجیهاندا خۆیان پاراست لەخراپە، هەیە بۆیان: ﴿عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ لای پەروەردگاریان ﴿جَنَّٰتٞ﴾ بەهەشت و باخاتێ کە ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە دێت و ئەچێت بە ژێریاندا جۆگەو ڕووبارەکان: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لە کاتێکدا ئەو خۆپارێزەرانە ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە هەمیشەیی و بێبڕانەوە ﴿وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ حەڵاڵ و هاوسەرانێ کە پاك و خاوێن کراون لە هەرشتێ کە بێزراوو قێزلێ کراوە، چ لەدیمەن و دیوی دەریان، چ لە دیوی ناوو دەروون و ڕەوشتیاندا، ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾

هەیە بۆیان ڕەزامەندیەکی گەورە لێیان لەلایەن خواوە، کە ئەوە لە هەموو شت چاکترو گەورەترەو هیچ شتێکی تر هاوتای نیە، لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە کە خوا پرسیارئەکات لە بەهەشتیەکان ئایا ڕازین؟ ئەوانیش عەرزی ئەکەن چۆن ڕازی نین! ئایا باشتر لەوەتان پێ نەبەخشم؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئەی پەروەردگار ئایا چی لەمە باشترە کە تۆ داوتە بە ئێمە؟ خوایش ئەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆم ئەدەم بەسەرتاندا، کەواتە هەرگیز خەشم و نەنگ و ناڕەزاییم نابێ لێتان، خوای پەروەردگاری میهرەبان بەشدارمان بکە لەو بەهرەو چاکە بێوێنەدا. آمین،یٰ‌مین،آمین. ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ خوا بینایە بە بەندەکان، کەواتە زانایە بە هەر کردەوەیەك کە ئەیکەن و پاداشت و سزاو تۆڵەی زۆر بەجێیە، وە ئەزانێ کام بەڕاستی خۆپارێزو لە خوا ترسە، یا مەبەست ئەوەیە کە خوا ئاگایە بە هەرشتێ کە بەرژەوەندی بەندەکانی تیایە، کەواتە با ئەمانیش گوێڕایەڵی و فەرمانبەر بن و هەرچی ئەو بۆیان هەڵئەبژێرێ هەر ئەوە چاکە بۆیان، کەواتە با ئاگایان لە خۆیان بێت و سەرنەکەنە ئارەزوواتی جیهان، با بەهرەی گەورەی ئەو جیهانیان لەدەست دەرنەچێ، ئینجا سیفەت و نیشانەکانی ئەو پارێزەرانە باس ئەکات، ئەفەرموێ:

١- ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەوانەی کە ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا﴾ ئەی پەروەردگارمان بێگومان ئێمە بڕوامان هێناوە: ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ کەواتە خۆشبەو بسڕەوە لێمان گوناهەکانمان، بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ، لەنزاکەیانەوە لە خوا ترسی و خۆپارێزیان دەرئەکەوێ، ئەوەتا جاڕی بڕواهێنانیان ئەدەن و ئەیکەن بە قەڵغان و بەوە تکای سڕینەوەی گوناهو پاراستنیان لە دۆزەخ ئەکەن.

٢- ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ئەو لە خوا ترسانەی کە خۆ گرن، خۆگری بەسێ جۆرە:

ا- خۆگرتن لەسەر بەجێ هێنانی فەرزەکان و کردەوە چاکەکان.

ب- خۆگرتن لەسەر دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان.

ت- خۆگرتن لەسەر هەر دەردو زیان و بارێکی ناخۆش. بێگومان لەم شوێنەدا ئەبێ بە شێوەی گشتی بگیرێ، چونکە ئایەتەکە نەیبڕیوە بەسەر جۆرێکی تایبەتیدا، بەم شێوە گشتیەشایستەترئەبێ بۆوەسف دانی خواو گەیشتن بە ڕەزامەندی ئەو کە بەڵێنی پێدا.

وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ

---

٣- ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەوانەی کە ڕاستن لە نیازیاندا، وە لە وتارو کردەوەی ئاشکراو نهێنیاندا، بەڵێ بە ڕاستی زۆر گەورەو گرنگە لە ژیاندا، ڕاستی هێزو چالاکیە، بە پێچەوانەی درۆ کە لاوازیو دەستەپاچەییە لەبەر خۆپاراستن لە زیان یان ڕاکێشانی سوودو قازانج.

٤- ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ﴾ ئەوانەی کە گوێڕایەڵن و هەمیشەیین لەسەر خواپەرستی و هەڵسان بە پێویستی سەر شانیان، کەواتە بە پێی توانا هەڵئەسن بە مافی خوایەتی خواو مافی بەندەیی خۆیان.

٥- ﴿وَٱلْمُنفِقِينَ﴾ ئەوانەی کە بەخشتکەرن لە ڕێی خوادا لە ماڵو دارایی خۆیان کە بەوە دەرئەچن لە بەندەیی ماڵو لە کۆتو زنجیری چروکی و چاوچنۆکی، بەوە هەڵئەسن بە پێکهێنانی برایەتی ئادەمیتی.

٦- ﴿وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ﴾ ئەوانەی کە شەونوێژ ئەکەن لە بەشی دوایی شەوو لە بەرەبەیان کە لەو کاتەدا خەو زۆر خۆشەو هەستان زەحمەتە لەسەر شان، لەو کاتەدا دڵو دەروون ناگیرێ بە هیچ کارێکەوە، کەواتە بیرو هۆش لای نوێژو خواپەرستیەکەیە، یان مەبەست ئەو کەسانەیە کە شەونوێژیان کردووەو لەو کاتی بەرەبەیانەدا خەریکن بە پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون، وەك لە شەودا هەر خەریکی خراپەکاری بووبن!!

(ئیبن و جەریر) بەم جۆری دووەمە ئەیگێڕێتەوە لە کردەوەی(ئیبن و عومەر)ەوە —خوا لێیان ڕازی بێ— کە باوی وابوو شەونوێژی ئەکرد ئەیفەرموو بە(نافیع): ئایا دوادوایی شەوە؟ ئەویش عەرزی ئەکرد: نەخێر، ئینجا دەستی ئەکردەوە بە نوێژ تا کاتێ(نافیع) عەرزی ئەکرد بەڵێ خەریکە ڕۆژ ئەبێتەوە، ئەو کاتە دائەنیشت و دەستی ئەکرد بە داوای لێخۆشبوون و نزای ئەکرد هەتا ڕۆژ ئەبووەوە، لە چەند ڕیوایەتێکدا حەدیس هاتووە سەبارەت بە فەرماندان بە داوای لێخۆشبوون لەو کاتی بەرەبەیانەدا، کەواتە تەفسیری لەسەر ئەم باری دووەمە بەهێزترە.

ئەمانە بوون سیفەت و نیشانەی ئەو لە خوا ترسانەی کە ئەو بەڵێنە گەورەیان پێدرا، خاوەنی ئەم سیفەتانە شایستەی ڕەزامەندی خوان کە لە هەموو بەهرەیە گەورەترە. ئابەو جۆرو شێوەیە قورئان ڕێنموونی مەردوم ئەکات و دەستی ئەگرێ و لەم زەویەدا ڕاستی ئەکاتەوە بەرەبەرە بۆ ئاسۆی ئادەمێتی، هەتا ئەیگەیەنێ بە کۆمەڵی هەرە بەرز بە هێواشی و میهرەبانی، بەبێ تەنگە تاو کردن و زۆر پێهێنان و پیش خواردنەوە، بەڵکو لەگەڵ تێبینی و چاودێری کردنی بێ هێزی و دەستەپاچەییدا، بەبێ ئەوەی زیان بگەیەنێ بەکاروباری پێویستی ژیانی جیهانی، خوا خاوەن و دروستکەری سروشتی ئادەمیە، خوا خۆی بەرنامەی داناوە بۆئەو سروشتەی دروست کراوی خۆیەتی ئەو خوایە بینا و زانایە بە بەندەو دروستکراوەکانی.

لە یەکەمجاری سورەتەکەوە تا ئێرە مەبەست و ئامانجی ئەگەڕێتەوە بۆ باسی تاک و تەنیایی خوا لە هەموو بارێکەوە، بۆ یەکێتی نامەو بەرنامەکانی خوا، بێگومان ئەو تاک و تەنیاییە داخوازە بۆ ئەوەی کە بەرهەمی ئەو تاک و تەنیاییە بە کردەوە لەژیاندا بەدی بێت، بەم ڕەنگە بەندەیی و پەرستن و مل کەچی و گوێڕایەڵی هەر بۆ ئەو خوای تاک و تەنیا بێت، جا ئەوا لەم ئایەتی داهاتووەدا خەریک ئەبێ بە ڕوون کردنەوەو چەسپاندنی ئەو مەبەستە گرنگەی کە داخوازە بۆ ئەو تاک و تەنیاییە، جا لەبەرئەوە تاک و تەنیاییەکە دووبارە ئەکاتەوە بۆئەوی داخوازەکەی بەدوادا بێنێ، دووبارەی ئەکاتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی تازەی جیاواز کە هەست و دەروون داگیرئەکات، دووبارەی ئەکاتەوە لە شێوەی شایەتی دانی خواو فریشتەکان و زاناکان لەسەر ئەو تاک و تەنیاییە، ئەفەرموێ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ خوا شایەتی داوە کە هیچ پەرستراوێك نیە بە ڕاستی بێجگە لەو ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ﴾ فریشتەکان و زاناکانیش شایەتیان داوە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لەو خوای تاک و تەنیا، شایەتی دانی خوا دەرئەکەوێ لە ئایەتەکانی قورئانەکەی دا کە گەورەترین موعجیزەی خوایە لەم بوونەوەرەدا، لەو هەموو نیشانەو ڕابەرو بەڵگە ئاشکرایانەی کە خوا دایناون لەم بوونەوەرەو لەدەروونی خۆماندا کە هەرکەس بێبەش لەژیری و تێگەیشتن ئەو شایەتیە وەرئەگرێ لە هەر شتێ کە هەستی پێ بکات، وەك وەری ئەگرێ لەو هەموو بەڵگەو ڕابەرە ژیرییانەی کە خوا ڕێنموونی زۆر لە بەندەکانی بۆ کردوون، کەواتە ئەم شایەتی دانی خوا هەرچۆنێ بەکەڵك و بەکارە بۆ بڕوادارەکان بەوەی بڕواکەیان بەهێزترو پتەو تر ئەکات و ئەیانخاتە سۆزو پەرۆش، هەروەها زۆر بەکەڵك و بەکارە بۆ

بێبڕواكانیش، چ ئەوانەی كە بڕوایان هەیە بە بوونی خوا بەڵام بەجۆرێ نیە كە خوا ئەیەوێ، ئەوەش وەك بڕوای بت پەرستان و گاورو جوولەكە، وە چ ئەوانەی كە هەر بڕوایان بەبوونی خوا نیە ـ خوا بمانپارێزێ ـ كەڵكی هەیە بۆیان مەگەر كەسانێ كە وەك بەرد وابن و تەڕاییان تیا نەبێ، لەم باسەوە دەركەوت كە ئەو شایەتی دانی خوا دوو جۆرێ هەیە:

یەكەم: بە ڕێنموونی كردن بۆ تاك و تەنیایی و دەرخستنی بەو هەموو ڕابەرو بەڵگە بەهێزو ڕوونانە كە دەست نیشانمان بۆ كردن.

دووەم: بە هەواڵ پێدان لە چەند ئایەتێ لە قورئانەكەی دا كە گەورەترین موعجیزەی خوایەو هەواڵی شایەتی دانی لە نامەكانی تریشدا باس ئەكات، با بزانرێ كە تاك و تەنیایی خوا هەرچۆنێ بە بەڵگەو ڕابەری ژیریی دەرئەخرێ، هەروەها بەڕابەری بیستنیش(نقلی) هەر دەر ئەخرێ و ئیسپات دەكرێ، چونكە ــ وەك زانایان دەفەرموون ــ ڕەوانە كردنی نامەو پێغەمبەران نەبەستراوە بەتاك و تەنیایی خواوە، مەبەست لەشایەتی دانی فریشتەكان دان پیانان و گوێڕایەڵی و فەرمانبەریەو هەواڵ پێدانە بە پێغەمبەركان و ئەوانیش بە مەردوم، مەبەست لە شایەتی زاناكان بڕوا پێكردنە بەدڵ و دان پیا نان و جاڕ دان و هەواڵ پێیانە بەخەڵكی و بەڵگەو ڕابەر لەسەر هێنانەوەیەتی، گوێڕایەڵی و مل كەچی تەنها بۆ فەرمانی ئەو، ئیتر مەبەست بەو زانایانە هەر پێغەمبەرەكان بێت ـ وەك هێندێ ئەفەرموون ــ یا ئەوانیش و هەموو بڕوادارانە ـ وەك هێندێكی تر ئەفەرموون ــ.

خوای پەروەردگار لەسەر خوایەتی خۆی بە تاك و تەنیا ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ لە كاتێكدا كە داهێنەرو بەدی هێنەرو ڕاگیر كەرو بەكارهێنەری دادو ڕاستیە لە هەموو كردەوەو دروست كراوەكاندا، لە تەدبیرو بەڕێوەبردنی ئەم بوونەوەرەو ژیانی ئادەمی دا، كەواتە دادو ڕاستی بە هیچ نایەت لە ژیانی ئادەمی دا، كارو كردەوەی بە ڕێك و ڕاستی ناڕوا بەوێنەی ڕێك و ڕاستی كاروباری بوونەوەر، ئەو مەبەست و ئامانجە گرنگە بەدی نایەت مەگەر بە پەیڕەوی و ڕەفتار كردن بەو بەرنامەی كە خوا هەڵی بژاردووە بۆ ژیانی ئەم ئادەمیە، لەم دواترین شەریعەتەدا دیاریی كردووەو ئاشكرای كردووە، بەبێ بەدی هێنانی بەو بەرنامەیە نە داد هەیەو نەڕێك و ڕاستی هەیەو نەڕێكی و یەك كەوتن ئەبێ لەگەڵ ئەو بوونەوەرەی كە ئادەمی تێدا ئەژی، كەواتە بەبێ ئەو بەرنامەیە هەر ئەبێ ستەم و تاوان و لادان ڕوویدا، ئەبێ هەر دژایەتی و بەگژا چوون و یەك نەگرتن و سەرگەردانی پەیدا ببێ!

هەرکاتێ ئاوڕێك بدەینەوە بۆلای مێژوو ئەبینین داد هەر لەو ماوەیانەدا هەبووە کە هەر نامەو بەرنامەی خوا لە کاردا بووبێ و کاربەدەست بووبێ، لەهەر ماوەیەکدا بەرنامەیەکی تر لە کاردا بووبێ دادی ڕاستەقینە نەچێژراوە، ئەگەر لەبارێکەوە بە ڕواڵەت داد بووبێ، بێگومان لە چەند بارو لە چەند لای ترەوە جەورو ستەم جیهانی مرۆڤایەتی ڕەش و تاریك کردووە، جەورو ستەمی تاکی یان چەند کەسی بۆ تەواوی گەل، یا جەورو ستەمی گەل و کۆمەڵ بۆ ئەندامەکانی، یا جەورو ستەمی چین و تاقمێ بۆ چین و تاقمێکی تر، تەنها دادەکەی خوا پاك و بێگەردە لە هەرلادان و لایەنگیرییە بۆ هەرکام لەوانە، چونکە هەر خوا خوایە و یەکسانە بۆ هەموو بەندەکانی و ئاگادارە بە هەرچی وا لەئەرزو ئاسماندا، ئینجا تاك و تەنیاییەکەی دووبارە ئەکاتەوە لەگەڵ زیادکردنی دووسیفەتی تری کە بەدی هێنانی داد بەبێ ئەو دووسیفەتە نابێ: سیفەتی توانین و زاڵی و لێزانی و کاردروستی، ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ هیچ پەرستراوێك بەڕاستی نیە بێجگە لەوە کە هەر ئەو خوایە زاڵ و دەسەڵات دارو داناوکار دروستە، بەڵێ داد بەبێ ئەم دوو سیفەتە نابێ و بەدی نایە، چونکە داد بریتیە لە پێك هێنان و دانانی هەر کارێ لە جێ و شوێنی خۆی دا، دەی ئەوەش بەبێ دەسەڵات و توانین و لێ زانین نابێ و ناگونجێ.

ئینجا بەدوای ئەو تاك و تەنیاییەدا شتێ ئەهێنێ کە بەرهەم و سەرەنجامێکی سروشتیە بۆی، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ﴾ بەڕاستی ئایین بەلای خواوە هەر ئیسلامە، واتە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری و مل کەچی بۆ فەرمانی خوا. ئیسلام تەنها لاف و قسەی ڕووت نیە، تەنها نیشانەو ئالای ڕووت نیە، تەنها بۆچوون و بیروباوەڕێکی دەروونی نیە، تەنها نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج نیە، نەخێر، هیچ کام لەوانە ـ بەتەنها ـ ئەو ئیسلامە نیە کە پێی ڕازیە و بێجگە لەو هیچ ئایینێکی تر وەرناگرێ، بەڵکو ئیسلام مل کەچی و فەرمانبەریە بە ڕەزامەندای دڵەوە بۆ هەموو فەرمانەکانی خوا، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە فەرموودەیەکی(ئیمامی عەلی) هەیە -خوا لێی ڕازی بێ- کەلە خوتبەکەیدا

فەرموویەتی و(علی کوڕی ئیبراهیم) ڕیوایەتی ئەکات، بە جوانی ئەزانم ئەو فەرموودەیە بێنم کەلەو خوتبەدا فەرمووی: بێگومان ئیسلام بە جۆرێ دیاریی ئەکەم کە هیچ کەس پێش من بەو جۆرە دیاریی نەکردبێ، ئیسلام بریتیە لە مل کەچی و ڕەزامەندی دڵ، ئەو مل کەچیەش زانینێکی تێرو تەواوی بێ گەردە کە هەر ئەوەیە بڕوا، ئەو بڕوایش کە بوو بەدەم ئەوترێ و دانی پیا ئەنرێ، کە ئەوەش بوو ئەبێ بەدی هێنانی بێ کە ئەوەش بەکردەوە ئەکرێ، کەواتە ئیسلام بریتی بوو لەو مل کەچی و بڕواو زانینەی کەلە کردەوەدا دەرکەوێ، ئینجا فەرمووی: بێگومان بڕوادار ئایینەکەی لە پەروەردگاریەوە وەرئەگرێ، لە ڕاو ئارەزووی خۆیەوە وەری ناگرێ، بێگومان بڕوادار کەسێکە کە بڕواکەی ئەناسرێ لە کردەوەی دا، بێبڕوایش بێبڕواییەکەی ئەناسرێ بە نا فەرمانی و دژکردەوەی دا، ئەی خەڵکینە بنوسێن بە ئایینەکەتانەوەو ئایینەکەتان بەڕاستی بگرن، چونکە گوناه کردن لەم ئایینەدا چاکترە لە چاکەکردن لە هەر ئایینێکی تردا، چونکە گوناه لەم ئایینەدا ئەسڕێتەوە، بەڵام چاکە لە غەیری ئەمدا وەرناگیرێ.

ئیسلام ئایینی هەموو بوونەوەرە، ئیسلام ئەو ئایینەیە کە هەموو پێغەمبەرانی پێ ڕەوانەکراوە ـ درودی خوایان لێ بێ ـ تایبەتی کردنی ئەم ناوە بەم دواترین شەریعەتەوە لەبەرئەوەیە کە ئەم جێگیرو جێنشینی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی پێش خۆیەتی، وەلە هەموویان تێرو تەواو ترە.

ئەو ئایینەی کە هات بۆ موسا و عیسا ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ هەر ئایینی ئیسلام بوو، ئایینی تاک و تەنیایی خوابوو بە پاک و خاوێنی، لە نامەکانیاندا موژدە درابوو بە هاتنی حەزرەتی محمد(ﷺ) و ئەم ئایینە پاکەی کە هاتە سەری کەواتە چۆن ئەو نامەدارانە دووبەرەکی بوون لەو ئایینە پاکەی موسا و عیسادا، بەم ڕەنگە بت پەرستی و چەند شتی پڕوپووچیان تێکەڵ کرد، لەناو خۆیاندا بوون بە چەند تاقم و کۆمەڵێک و چەند جەنگ و کوشتار لەناویاندا پەیدا بوو، چۆن تێکڕایی و بێگیروگرفت هەموو بڕوایان نەهێنا کاتێ ئەم قورئانەو پێغەمبەرە هات؟

خوای گەورە هۆی ئەو دووبەرەکیەی ئەوانمان بۆ دەرئەخات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ دووبەرەکی نەبوون ئەوانەی کە نامەیان پێدرابوو ـ واتە ئوممەتی موساو عیسا ـ ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ﴾ لەپاش ئەوە نەبێ کەزانینی تەواویان بۆهاتبوو، واتە لەلایەن خواوە ئەو زانینەیان بۆ هاتبوو بەهۆی نامەو پێغەمبەرەکانیانەوە، کەواتە بە هەڵەو لێ گۆڕان نەبوو، بەڵکو بەدەستی قەستو بەزانینەوە دووبەرەکی کەوتن ﴿بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ لەبەر ستەمو دەست درێژیی و حەسادەتی ناو خۆیان. خۆیان لەناو خۆیاندا بەدوای گەورەیی و سەرۆکایەتی دا ئەگەڕان تا هەرکەس تاقمێکی پێکەوە نا بۆ خۆی و زاڵبووو بوو بە سەرۆکو هەرچۆن بۆی کرا ستەمو دەست درێژیی کرد لەوانەی کە دژی بوونو مل کەچیان بۆ نەئەکرد تا لەوەوە جەنگو کوشتاری زۆر پەیدا ئەبوو، ئینجا ستەمیان لە خۆیان کردو حەسادەتیان بەکار هێنا کە بڕوایان نەهێنا بە قورئانو پێغەمبەرەی هەمووان(ﷺ) حەسادەتیان لێ هات کە تا ئەو کاتە پێغەمبەرێتی لەناو ئەواندا بوو، عەرەب نەخوێندەوارو نەزان بوونو لەپاش(ئیسماعیل) پێغەمبەریان نەبووەو لەپڕێکدا یەکێ هاتو داوای پێغەمبەرێتی هەموو جیهانیان ئەکات، بەو جۆرە خۆین چارە ڕەشو بەد بەخت کرد ئەگینا زاناکانیان وەکو قورئان ئەفەرموێ: ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ پێغەمبەر ئەناسن هەرچۆنێ کوڕەکانی خۆیان ئەناسن، خوای گەورە لەسێ بارەوە خراپی ئەوانەی دەرخست:

یەکەم: ئەوانە نامە پێدراوبوون، کەواتە ئەبوایە ئەوپەڕی ڕاستییان بەکاربهێنایە لەگەڵ ئەو خوایەی کە ئەو خەڵاتە گەورەی کردنو کردنی بەو ئوممەتە نامەدارە.

دووەم: ئەو لاری و دووبەرەکیەی کە ئەیانکرد بە هەڵەو نەزانینەوە نەبوو، بەڵکو باش ئەیانزانی کە ناهەقی ئەکەن، وە گوناهی زانا گەورەترو ناشیرین ترە.

سێیەم: ستەمو حەسادەتیان بەکارئەهێنا کە ئەو دوو سیفەتانە کانگای زۆربەی تاوانو خراپەکارین.

وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِىَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ ۗ

---

جا لەبەرئەوە دووبەرەكی كردنەكەیانی بەبێ بڕوایی دانا و هەڕەشەی لێ كردن بەوەی بەزوویی ئەگەن بە تۆڵەی خۆیان، فەرمووی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ هەركەس بڕوانەهێنێ بە ئایەت و نیشانە ڕوونەكانی خوا، ئیتر ئایەت و نیشانەی بوونەوەریی یان نامەیی، یان هەردوو كە ئەو ئایەت نیشانانە ڕابەرێكی ئاشكران لەسەر ئایینی خواپەرستی بە تاك و تەنیا و بێ هیچ هاوبەشێك، كە هەر ئەوەیە ئایینی ئیسلام، هەر ئایینی ئیسلامیش ئایینە بەلای خواوە، هەركەس بڕوانەهێنێ بەو ئایەت و نیشانانەو بەپێی ئەوانە ڕەفتار نەكات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ بێگومان خوا بەزوویی تۆڵەی لێ ئەسێنێ، چونكە حیساب و پرسیاری خوا بە چەسپانی و بەزوویی دێت. بەڵێ بە زوویی دێت، چونكە بێگومان بەدی دێت، هەرچیش بەدی بێت ئەوە نزیكە و بە چەسپانی دێت، ئیتر با هەرچەندی پێ بچێت، وەكو ئەڵێن:(كل ات قريب) هەرچی بێت نیزكە، دوور ئەوەیە كە بەدی نەیەت، بێجگە لەوەش دووریی و نزیكی بۆ ئێمەیەو لای ئێمە هەیە، لای خوا هەموو شتێكی داهاتوو نزیك و ئامادەیە، چونكە بۆلای خوا كات و ماوەو دوورو نزیك و دوا و بەر نیە!!

بەشێك لە هەڕەشەو تۆڵەی خوا هەر لە جیهاندا بەزوویی بەدی هات دەربارەی جوولەكەكانی مەدینە كە لەو كاتەدا یەكەم زانا و یەك دژو دوژمن بوون لەو ناوەدا دەربارەی ئایینی ئیسلام، ئەوەبوو بە زوویی لەناوچوون بە كوشتن و دەركردن، ئینجا قورئان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) كە قسەیەكی ڕوون و ڕەوان بڕاوە ئاڕاستەی نامەدارو بت پەرستەكان بكات و كاروبڕیاری خۆی لەگەڵیان ببڕێتەوە، ئینجا پاش ئەوە لێیان گەڕێ بۆ خواو خۆی بە ڕێگە ڕاستەكەی خۆی دا بڕوا، لە یەكەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ حَآجُّوكَ﴾ ئینجا ئەگەر نامەدارەكان دەمەقاڵێیان لەگەڵ كردی لەتاك و تەنیایی خواو ئایینی ئیسلام دا، ﴿فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِىَ لِلَّهِ﴾ بڵێ من ڕووی خۆم مل كەچ و تایبەتی كردووە بۆ خواو تایبەتیم كرد بۆی بەبێ هیچ هاوبەشێك ﴿وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ﴾ هەركەسێك كە شوێنی من كەوتووەو ڕووی خۆی مل كەچ و تایبەتی كردووە بۆ

خـوا، واتـه دەمـەقاڵێیان لەگـەڵ مەكـە، چـونكە دەمـەقاڵێ بـۆ شـتێكی نادیـاریی و شـاراوه پێویسته، ئایینی تۆ شتێكی ڕاست و ئاشكرایەو دەمەقاڵێ تیای دا هەر قسە بە شەڕ دانە، یان مەبەست ئەوەیە: وەڵامی دەمەقاڵێ كەیان بەمە بدەرەوە، كە ئەوانیش هەر بڕوایان هەیە بەبوونی خوایەك كە شایانی پەرستنە، دەی ئەمە كە هەموومان دانی پیا ئەنێین با هەر ئەمە بگرین و من هەر ئەمە ئەگرم و بڕوام پێی هەیە، ئەگەر ئێوە هەر شتێكی تر زیاد ئەكەن من لەسەری نیم و ئێوە ئەبێ ئیسپاتی بكەن، بێگومـان هیچ نیشانەو بەڵگەیـەكی نیـە بـە دەستەوە، كەواتە ئەبێ كۆتایی پێ بێنن، بە هەرحاڵ خوا فەرمانی دا كە ئەم تەنیا وتە پیرۆزەیان ئاراستە بكات كە ڕوون و ڕەوانەو بیروباوەڕو بەرنامەی ژیانی تیایە، ئینجا فەرمانی دا كە پرسیاربكات لەوانیش و بت پەرستەكانیش بۆ ڕوون بوونەوەی بیروباوەڕی هەردوو لا بەبێ تێكەڵ و پێكەڵی و لێ گۆڕان، فەرمووی: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ﴾ بڵێ بەوانەی كە نامەیان پێ دراوە، واتە جوولەكەو گاورو بت پەرستەكانی عەرەب كە بە ناو بانگ بوون بە نەخوێندەواریی، بڵێ پێیان بە تێكڕایی: ﴿ءَأَسْلَمْتُمْ﴾ ئایا موسڵمان بوون؟ واتە هەموو موسڵمان بن وەك من و شوێن كەوتووەكانم كە موسڵمانین، كەواتە ئەوانیش كە خۆیان بە خاوەن ئایین و نامە دائەنا، وەك بت پەرستەكان بانگ ئەكرێن بۆ ئیسلام كە هەر ئەوە ئایینە بەلای خواوە، ئەو ئیسلامەی كە بەجوانی باس كراو ڕوون كرایەوە، ئەو ئیسلامەی كە پاش هاتنی قورئان بریتیە لە گێڕانی تەنها قورئان بە حاكم و كاربەدەست لە جیهان و ژیاندا، ﴿فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟﴾ ئینجا ئەگەر موسڵمان بوون ئەوا ڕێنموونی وەرئەگرن و ڕێی ڕاست ئەدۆزنەوە، چونكە ڕێی ڕاست تەنها یەك ڕێیەو یەك بارو شێوەی هەیە كە بریتیە لە ئیسلام، ئیتر لەو بگەڕێتەوە گومڕاییەو نەفامیەو لادانەو لەڕێی ڕاست ترازانە، ﴿وَّإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان كردە ئیسلام ئەوا تۆ زیانبار نابی، چونكە ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ﴾ بێگومان تۆ ئەوەی لەسەرتە هەر ڕاگەیاندنە، بێگومـان ترش ئەوەت بەجێهێناوە بەو شێوەی كە پێت سپێرراوە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێش ئەو ئایەتەی كە فەرمان ئەدات بە جەنگ كردن لەگەڵیان تا موسڵمان ئەبن، یان بەڵێنی گوێڕایەڵی و مل كەچی ئەدەن بۆ ڕژێمی ئیسلام لە شێوەی سەرانەیەك كە لەسەریان دائەنرێ، باسی دێت بەدرێژیی ــ بە یارمەتی خوا ــ لە سورەتی ﴿التوبة﴾دا، چونكە وەك بەدرێژیی باسمان كرد لە سورەتی ﴿البقرة﴾دا كەس بە زۆر موسڵمان نكرێ،

وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ

وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾ أَلَمۡ

تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ

---

**﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ خوا بینایە بە بەندەکانی، بە گوێرەی زانین و بینینی خۆی لەگەڵیان ڕەفتار ئەکات، کەواتە هەرکەس شایستەی چاکە بێت چاکەی لەگەڵ ئەکات و پاداشتی خۆی ئەداتەوە، هەکەس شایستەی تۆڵەو سزابێت بەو جۆرەی لەگەڵ ئەکات، ئینجا بە شێوەی گشتی هەڕەشەیەکی سەخت و سامناك ئەکات لە بێبڕواکان و چارەنووس و پاشە ڕۆژی بەدبەختیان دیاریی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ئەوانە کە بڕواناهێنن بە ئایەتەکانی خوا، ئیتر هەر ئایەتێك، بەڵام یەکەمجار ئەوانەی کە بڕواناهێنن بەو ئایەتانەی کە باسی ڕاستی ئیسلام ئەکەن ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾ پێغەمبەران ئەکوژن بە ناهەق و ناڕەوا، واتە کە ئەشزانن ناهەق و تاوانە، کەواتە کردەوەکەیان ئێجگار پیس و ناڕەوایە، ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەکوژن ئەو کەسانەی کە فەرمان ئەدەن بەداد و ڕاست ڕەوی، واتە فەرمان ئەدەن بە چاکەو جڵەوگیری ئەکەن لە خراپە، ﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر مژدە بدە بەوانەی بەسزایەکی سەختی ئازار دەر ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەوانە کە ئەو کردەوە پیسانە ئەکەن کەسانێکن کەکردەوە چاکەکانیان پووچ بوون و بەهیچ دەرچوون لە جیهان و لە ڕۆژی دواییدا ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ نیە بۆیان هیچ یاریدەدەران.**

**هێندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: ئەم ئایەتە بە تایبەتی لە جوولەکەدا هاتووەتە خوارەوە، چونکە ئەم کردەوە پیسانە هەر لەوان دا کۆبوونەتەوە و ئەوان وەستا و پێشەوا بوون تێیاندا، وەك ئەم حەدیسەش دەست نیشانی بۆ ئەکات کە(ئیبن و جەریر) و(ئیبن و ئەبی حاتەم) ئەیهێنن لە (ئەبو عوبەیدەی جەراح)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ): ئایا کێ سزای بەتین ترە لە ڕۆژی دوایی دا؟ ئەویش فەرمووی:**

پیاوێك كە پێغەمبەرێكی كوشتبێ یا پیاوێكی كوشتبێ كە فەرمانی دا بێبە چاكەو جڵەوگیری كردبێ لە خراپە، لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە لە پاشان فەرمووی: ئەی (ئەبو عوبەیدە) ئیسرائیلیەكان چل‌و سێ پێغەمبەریان كوشت لە یەك ساتدا لەسەرەتای ڕۆژێكدا، ئینجا سەدو دوانزە كەس لە ڕیوایەتێكدا، سەدو حەفتا كەس لە عابیدەكانیان ڕاپەڕین فەرمانیان دا بەو بكوژە تاوانبارانە بە چاكەو جڵەوگیریان لێ كردن لە خراپە، ئینجا ئەوانیشیان هەمووكوشت لەدوادوای ئەو ڕۆژەدا، ئینجافەرمووی: ئەوانەئەمانەن كەخواباسی كردن. هەرچەند ئەم ڕایە بەهێزە بەڵام ڕێ ناگرێ لەوەی كە گشتی بێت بۆ گاورەكانیش كە چەند هەزارانیان كوشت لەوانەی كە لەسەر بڕوای تاك‌و تەنیایی خوا مانەوەو حەزرەتی عیسایان بە ئادەمی دائەنا كە ئەو كوژراوانە لەوانە بوون كە فەرمانیان ئەدا بە دادو ڕاست ڕەوی، بەڵكو ئەشبێ لە هەر تاوانبارێكی تریش كە دژو دوژمنی بانگ كەرانی ڕێگەی خوان لە پاش ئەوان‌و هەتاهەتایە لە هەموو چەرخ‌و چینێكدا، بێگومان – وەك وتمان– ئەوانەی كە هەڵسان بەو تاوانە گەورانە لە چین‌و تاقمەكانی پێش چەرخی پێغەمبەر بوون(ﷺ) كەواتە ئەبوایە ئایەتەكە بە وتەی ڕابردوو باسی ئەو تاوان‌و كردەوانەی بكردایە، واتە (إن الذین كفروا وقتلوا) ئایا چۆن ئەو كردەوەی ئەوانەی پێشوو ئەدا بە ناوچاوانی ئەمانەی دوای ئەوان‌و بەو كردەوەی ئەوانە هەڕەشە ئەكات لەمان، لە وەڵامدا ئەڵێین:

١- مەبەست گێڕانەوەی كردەوەی پێشووەكانەو لە ڕێوە هەڕەشە كردن لەوان بۆ ئەوەی ئەمانەی دوایی بترسن‌و تەمێ وەرگرن‌و شوێنی ئەوان نەكەون، نەهێنانی بە وتەی ڕابردوو لەبەر ئامادە كردن‌و خستنە بەرچاوی ئەو كردەوەی ئەوانەیە، ئەوەش بە پێی باوی ڕەوانبێژی كە زۆر جار شتی وا بەكارئەهێنرێ كە ئەو شتە ڕابردووە سەرسووڕهێنەر بێت لەبەر زۆر چاكی‌و گرنگی یا لەبەر زۆر خراپی‌و دڵ تەزێنی.

٢- كردەوەی خراپی پێشووان‌و باوك‌و باپیری دوور ئەدرێ بە ناوچاوی تاقم‌و نەوە دواییەكاندا هەركاتێ كە ئەمان ئەو كردەوانە پەسەند بكەن‌و شانازی بكەن بەو پێشووانەوە، ئەوە شتێكی باوەو بە ڕێك‌و پێك سەیر ئەكرێ، دەی شتێكی ئاشكرایە كە ئەم تاقم‌و چینەی كاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هیچ جۆرە بێزاریەكیان

دەرنەبڕیوە لەو کردەوە پیسەی کە ڕابردووەکانیان کردیان، کەواتە مافی خۆیانە بدرێ بە ناوچاوی ئەمانەی دواییدا.

٣- ئەوانەی دوایی لەسەر ڕاو بڕیاری گشتیان نیازی کوشتنی پێغەمبەری ئازیزیان کرد کە کوشتنی ئەم وەك کوشتنی هەموو پێغەمبەران و دادپەروەریان وایە، چونکە جێگیرو جێنشین و گەورەی هەموانە، چەند جار ئەو نیازە پیسەیان کرد، بەڵام خوا بۆی نەکردن، کەواتە ئەمانیش پەیڕەوی ئەمانیان کردو هەروەك ئەوان وان، پێویستە هەمیشە لەسەر یادو هۆش بین کە مەبەست بە بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خوا هەر ئەوانە نین کە بە ئاشکرا جاڕی بێبڕوایی ئەدەن، بەڵکو هەرکەس هەر بیرو باوەڕی تری هەبێ بێجگە لەوەی کە پێغەمبەرمان(ﷺ) هێناو ڕازی بێت بە هەر یاساو ڕژێمێ تر، ئەو کەسە بێگومان لە ڕیزی بێبڕوایانە بە ئایەتەکانی خوا، با بە دەم هەزار شایەتومان بێنێ و فەرزەکانیش بەجێ بێنێ و بەدەم هیچی نەهێشتبێتەوە لە ئیسلامدا! لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەم مەبەستە بە ڕوونی هەیە.

ئینجا شێوە پرسیارێك ئاراستە ئەکات بۆ سەرسووڕهێنان لە کردەوەی بێئابڕووانەی هێندێ لە نامەدارەکان کە ڕازی نەبوون بەوەی نامەی خوا بکەن بە حەکەم و دەمڕاس و بەقسەی بکەن، ئیتر مەبەست بەو نامەیە تەورات بێت وەك لە چەند ڕیوایەتێکدا هەیە، یا مەبەست پێی قورئان بێت وەك لە(ئیبن و عەباس و حسن و قتادە)وە هاتووە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا سەرنجێکت نەداوەو ئاوڕێکت نەداوەتەوە ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ بۆ لای ئەوانەی کە بەشێك لە نامەی خوایان پێدراوە، وەك تەورات بێت کە بە دوایدا ئینجیل هات بۆ ئیسرائیلیەکان کە ئەو دووانە بەشێکن لە نامەی خوا. ﴿يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَـٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ لە کاتێکدا بانگ ئەکرێن بۆلای ئەو نامەی خوا واتە تەورات وەك لەو ڕیوایەتانەدا هاتووە، یا قورئان وەك باس کرا کە جێنشین و جێگری هەموو نامەکانی خوایە، بانگ ئەکرێن بۆ لای ئەو نامەیە بۆ ئەمەی بڕیار بدا لە ناویاندا لەوەی کە تیایدا دووبەرەکین و ئاژاوەیان هەیە، ئیتر لە ناو خۆیان یان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بانگ ئەکرێن بۆلای نامەی خوا کە بارە ڕاستەکە دەرئەخات و هۆی ئاژاوەو دووبەرەکی ناهێڵێ

ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ
وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ
كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ

---

﴿ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾ کەچی لە پاش ئەوە کە ئەزانن پێویستە لەسەریان گەڕانەوە بۆلای نامەی خواو ئەبێ هەر بە قسەی ئەو بکرێ، لەپاش ئەوە تاقمێك لەوان پشت ئەکەنە ئەو بانگ کردن و گەڕانەوە بۆلای ئەو نامەی خوا ﴿وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ ئەوانە هەمیشە ڕوو وەرگێڕن لە ڕاستی و سوورن لەسەر ناهەقی و ناڕاستی.

ئا بەو شێوەیە خوا سەرمان سووڕ ئەهێنێ لەو تاقمە نامەدارە کە چۆن تاوانی ئاوا گەورە ئەکەن، نامەی خوا ناکەن بە حەکەم و دووبەرەکی و ئاژاوەی پێنابڕنەوە! ئەی ئەبێ چۆن بن ئەوانەی کە خۆیان بە موسڵمان دائەنێن و کەچی شەریعەتی خوایان خستووەتە کەنارو پشت گوێ و دووریان خستۆتەوە لە ژیانی خۆیان لە هەموو بارێکەوە؟! ئەبێ حاڵی ئەمان چۆن بێ لە کاتێکدا کە ئەمان نامەیەکیان پێدراوە کە جێگری هەموو نامەو شەریعەتەکانی خوایەو لادان لەم، لادانە لە هەموو نامەو شەریعەتەکانی خوا؟!! بە ڕاستی تاوانە کە ئێجگار سەخت و سامناکە، خوا بە میهرەبانی خۆی بێدارمان بکاتەوە لەو خەوی نەفامی و بێئاگاییە، ئینجا هۆی ئەو هەڵوێستە ناڕەوای ئەو تاقمە دەرئەخات کە بێباکیانە لە حیساب و تۆڵەی ڕۆژی دوایی و هەڵخەڵەتانیانە بە بیرو باوەڕی دەست هەڵبەست، کە ئەوان لە نەوەی(یعقوب)ن و خوا ڕێزی گرتوون و جوێیان ئەکاتەوە لە ڕۆژی دوایی لە مەردمانی تر!

ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو ڕوو وەرگێڕان و پشت تێکردنە ﴿بِأَنَّهُمْ قَالُوا﴾ بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەیان ووت: ﴿لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾ هەرگیز ئاگری دۆزەخ لە لەشمان ناکەوێ مەگەر چەند ڕۆژێکی هەڵژمێرراو کە ئەندازی ئەو چەند ڕۆژەیە کە گوێرەکە پەرستیان تیاکرد،

﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ هەڵی خەڵەتاندن ئەوەی کە بە دەلەسە هەڵیان بەست لە ئایینەکەیاندا، کە ئەمە بوو لێرەدا گێڕایەوە لێیانەوە، وەك(مجاهد) ئەفەرموێ، یا ئەوەیە کە ئەڵێن: ئێمە کوڕو خۆشەویستەکانی خواین، وەك(قەتادە)ئەفەرموێ. یا ئەمانەو چەند دەلەسەی تریان، وەك ئەوەی کە ئەڵێن ئێمە باوك و باپیرمان پێغەمبەر بوون تکامان بۆ ئەکەن، یا ئەڵێن: خوا بەڵێنی داوە بە(یعقوب) کە ڕۆڵەو نەوەکانی سزا نەدا مەگەر بۆئاهی سوێندەکەی! زۆر بەداخەوە ئەو جۆرە هەڵخەڵەتانە سەربازی کرد بۆ ناو موسڵمانەکانیش، بەم ڕەنگە زۆر کەس بووەو هەیە بە نەسەب و نەژادەوە پشت ئەبەستێ و سەرئەکاتە تاوان و گوناه، پشت ئەبەستێ بە زۆر وتەی کە بەناوی حەدیسەوە بڵاوبووەتەوە، با بزانرێ کە هەرکەس بڕواو کردەوەی خۆی فریای نەکەوێ، بەبێ بڕوا هیچ کەس ناتوانێ تکای بۆ بکات، ئەمە شتێکی ئاشکرایە لە ئیسلامدا، هەروەها زۆر نەفام هەیە سەر ئەکاتە گوناهو یاخیە لە نامەو ئایینی خواو ئەڵێ خوا چیەتی بەسەر ئێمەوەو چ پێویستی هەیە بە سزادانی ئێمە، هەرگیز خوا سزانی ئێمە نادا مەگەر بۆ پاك کردنەوەمان لە چڵك و چەپەڵی گوناه، ئیتر ئەمانخاتە بەهەشت! ئایا ئێمە موسڵمان نین؟ ئەم جۆرە گومان و قسە لەق و لۆقە دوورە لە ئیسلامەوە، هەرکەس بەس بیربکاتەوە لەم هەڕەشەی ئێرە تێ ئەگات لە ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو جۆرە گومان و قسە لەق و لۆقانە، هەرکەس بڕوای ڕێك و پێکی ببێ بە گەیشتنی بە حوزووری خواو حیساب و پرسیاری ڕۆژی دوایی دڵی ڕائەچڵەکێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾ دەی ئەوانە چی ئەکەن لەوکاتەدا کە کۆیان ئەکەینەوە لە ڕۆژێکدا کەهیچ گومانێك نیە تیای دا کە ئەبێ بێت بە هەموو ڕووداوەکانیەوە ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ هەموو کەسێك هەر کردەوەیەکی کردبێ لەجیهاندا چاك یان خراپ لەو ڕۆژەدا پێی ئەدرێ، واتە بە تەواوی ئەگات بە بەرهەم و پاداشتی هەموو کردەوەکانی،

وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ

﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ ئەوانە هیچ ستەمێکیان لێ ناکرێ بە کەم کردنەوەی پاداشت و زیاد کردنی تۆڵەو سزا، پرسیارێك ئاراستە کرا بەبێ وەڵام، بەڕاستی دڵی بڕوادار لەو پرسیارە ئەکەوێتە لەرزەو ناتوانێ وەڵام بداتەوەو نازانێ چی بڵێ ـ خوا پەنامان بدات ـ.

ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) و لەپاش ئەو بە هەموو بڕواداران کە ڕوو بکاتە خوای خۆی و پەنای پێ ببا و بانگی لێ بکات بە ئەوپەڕی مل کەچییەوە، بەوەی کە خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو شتێ بەدەستی ئەوەو هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە بەو ئەڕوا بە ڕێوەو تەدبیر ئەکرێ ئەفەرموێ: ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿ٱللَّهُمَّ﴾ ئەی خوایە، ﴿مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ﴾ ئەی خاوەنی پاشایەتی و دەسەڵاتی تەواو بەسەر هەموو شتێکدا بە هەر جۆرو شێوەیەك کە خۆت بتەوێ، بەبێ هیچ هاوبەش و یاریدە دەرێك. بانگ کردنەکە ئەوپەڕی مل کەچی و سام و بیم و شەرم شکۆی لێ وەرئەگیرێ چ لە وتەکانی و چ لە مانا و مەبەستەکانی.

هەر لە یەکەمجارەوە بە کورتی دەست نیشان ئەکات کە هەموو دەسەڵات و هەموو شتێ هینی خوایە، هەموو ڕووداو بەسەرهات و گۆڕان و دەست کاریەك لەم بوونەوەرەدا بەدەست خوایەو ئەو خاوەنی هەموویەتی و هەر ئەو تەدبیری ئەکات و فەراهەمی ئەهێنێ، چونکە هەر ئەو ﴿مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ﴾، ئینجا ئەو کورتەیە ڕوون ئەکاتەوە بە درێژیی بە چەند وێنەو نموونەیەك: ﴿تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ تۆ دەسەڵات و دارایی و هەر شتێك ئەبەخشیت بە هەرکەسێك کە خۆت پتەوێ، وە دەسەڵات و دارایی و هەر شتێك دائەڕنێ و ئەیسێنێتەوە لە هەرکەسێك کە خۆت مەیلت بێ، واتە تۆ مەدروم ئەکەیت بە خاوەن و تۆ لە خاوەن داری ئەخەیت، کەواتە هیچ کەس خاوەنی ڕاستەقینە نیە بۆ هیچ شتێك، بەڵکو هەرکەس هەرچی ببێ خوا پێی داوە، جا هەرکاتێ بڕوا بەو شێوەیە سەرنجی ئەو شتانەی دا کە هەیەتی و وا لە ژێر دەستی دا، ئیتر هێزو دەسەڵات بێت، یا دارایی و سامان بێت، یا زانین و هەرشتێ تر، هەرکاتێ بەو بۆچوون و تێگەیشتنەوە سەرنجی دا ئەو کاتە ئەوشتانە بەکار ئەهێنێ لەڕێی ڕەزامەندیی خاوەنە بەخشندەو میهرەبانەکەیدا کە خوای پەروەردگارە، وە خۆی ئەپارێزێ لە دەست خستن و بەکارهێنانیان بەدژو پێچەوانەی ڕەزامەندی خواو ئەو مەرجانەی کەلەسەری داناون

وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ

**﴿وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ﴾ بەرزو بڵند ئەكەیت هەركەس كە خۆت مەیلت بێ، ڕیسواو زەبوون‌و نابووت ئەكەیت هەركەس خۆت حەز بكەیت، هەركام لەوانە ئەكەیت بەدادی تەواوو هەر ئەوە ڕاست‌و بەجێیە، ئیتر ئێمە تێی ئەگەین‌و هۆكانی ئەزانین یان نا. هەر دڵێك ئەم بڕوایەی تیا جێگیر ببێ ئەوە هەر ڕوو لە خوا ئەكات‌و پشت بەو ئەبەستێ‌و هەر لە ئەو ئەترسێ، ﴿بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ﴾ هەر بە دەست‌و توانینی تۆیە هەموو خێرو چاكەیەك، هیچ خاوەنی نیە تۆ نەبی، هەروەها هەموو شەڕو خراپەیەكیش هەر بە دەست‌و دەسەڵاتی ئەوە، وەك لە چەند شوێندا بە ڕوونی باسی ئەكات، لێرەشدا لە پێشیەوە دەست نیشانی بۆ كرد كە فەرمووی: ﴿وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ﴾ بۆ هۆی باس نەكردنەكەی لێرەدا چەند شتێك وتراوە:**

**١- باس نەكردنی تەمێی بەندەكانی تێدایەو فێری شەرم‌و ئەدەبیات ئەكات كە هەر شتێ ناشایستەو ناڕەوا بێت بە لامانەوە ئاڕاستەی نەكەین بۆ خواو بەتایبەتی لە خواوە نیشانی نەدەین، لەكاتی باس‌و ناوبردنی ئەودا ناوو باسی ئەو جۆرە شتانە نەبەین‌و نەكەین، وە ئەو شەرم‌و ئەدەبە لە هەموو شتێكدا پێویستە، بۆ نموونە: ڕاست‌و ڕەوایە بڵێین: خوا دروست كەرو داهێنەری هەموو شتێكی پاكە، یا بڵێین: خوا دروست كەرو داهێنەری هەموو شتێكە، بەڵام ناڕەوایە بڵێین: خوا دروست كەری فلانە شتی پیسە یا هەموو شتێكی پیس.[1]**

---

[1] بۆ نموونە هاوەڵەكەی موسا(علیه السلام) لە سورەتی ﴿الكهف﴾دا سێ شت باس ئەكات، یەكێكیان مەسەلەی كەشتیەكە كە عەیب داری كرد، چونكە بەڕواڵەت كارێكی بەدبوو گوتی:(فأردت أن أعيبها). ویستم عەیب داری بكەم. لەبارەی كوشتنی منداڵەكەوە فەرمووی:(فأردنا أن يبدلهما). ویستمان كە پەروەردگار لە باتی ئەو منداڵەدا منداڵێكی چاكیان بداتێ، كوشتنی ئەو منداڵە دوویاری هەبوو: باری بەدی كە منداڵێكی كافر دەرئەچوو لەوانە بوویبێ بەهۆی كوفری باوكو دایكەكەی، باری چاكیشی هەبوو كە ئەوان ڕزگار ببن‌و منداڵی چاكتریان ببێ، لەبەرئەوە گوتی(فأردنا) كە بەشێكی ئەگەڕێتەوە بۆ خوا. لەبارەی ڕووداوی سێیەمەوە كە ئەو دیوارەی ڕاست كردەوە كە غەزنەكەی باوكیان دەرنەكەوێ‌و ئەو دوو منداڵە هەتیوە گەورە ببن‌و دەستی خۆیان بكەوێ، دیارە ئەوە خێرو چاكەی ڕووتە لەبەرئەوە گوتی(فأراد ربك) هەر ئاڕاستەی كرد بۆ خوا.

٢- هەرچی خوا بیکات هەرچەند لە بارێکەوە شەڕو خراپەی لێ پەیدا ببێ، لە چەند بارێکی ترەوە خێرەو هەر ئەوە ڕاست ڕەوایە کە خوا ئەیکات و کردوویەتی، کەواتە پێویست نیە بە تایبەتی ناوی شەڕو خراپە ببرێ، چونکە ئەو خراپانەش هەر خێرن لەلایەن خواوە، خوا لەبەر بارە خێرەکەی ئەیکات.

٣- هەموو شەڕو خراپەیەك سووچ و خەتای بەندەی تیایەو بەندە لائەدا لەو دەستوورو باوەی کە خوا دایناوە بۆ خێرو چاکەو ڕێنموونی بۆ کردووە، وەك لەئایەتێکدا دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾ هەر خراپەیەکت دووچار بوو ئەوە لە خۆتەوەیە، کەواتە زۆر بەجێیە کەهەر ناوی خێر ئەبا، هەرچەند هەردوو هەر بەدەست خوایە، وەك نیشانی ئەدا بەم فەرموودەیە کە ئەیهێنێ بە دوای دا: ﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی تۆ - ئەی خوایە ـ بەسەر هەموو شتێکدا توانا و دەسەڵات داریت. ﴿تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾ تۆ شەو ئەبەیت بەناو ڕۆژداو ڕۆژ ئەبەیت بەناو شەودا، ئیتر ئایا مەبەست بەم بردن بەناو یەکدا کورت کردن و درێژ کردنیانە لە چوار وەرزەکاندا کە بەرەبەرە لەشەو ئەخاتە سەر ڕۆژو لە ڕۆژ ئەخاتە سەر شەو، وەك(ئیبن و عەباس و مجاهدو حسن) ئەفەرموون. یان مەبەست هێنانی تاریکی شەو بێت بە شوێنی ڕووناکی ڕۆژو ڕووناکی ڕۆژ بەدوای تاریکی شەودا. گێڕکردنی هەرکام بۆ جێ و شوێنی ئەوی تر - وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرموون ـ. بە هەرکام مەبەست بێت کردەوە کە ئێجگار سەیرو سەرسوڕهێنەرە! بەڕاستی هەر دڵێ وریا بێت هەست ئەکات بەو دەستە قودرەتەی کە هەمیشە خەریکە تاریکی شەوو ڕووناکی ئەپیچێتەوە بە وێنەی لەفی مێزەر بە دەوری ئەم زەویە خڕەدا، لەم پێچانەوەیش دا هەر دەمە یەکێکیان زاڵ ئەکات بەسەر ئەوی تردا بەرە بەرە لێی ئەپچڕێ و ئەیخوات تا ئەگاتە ڕادەی خۆی و تێر ئەخوات، ئینجا لێ خوراوەکەیان زاڵ ئەکات و بەرەبەرە هەرچی لێی پچڕیوە ئەسێنێتەوە، هەر لەسەرەتای زستانەوە ڕۆژ دەست ئەکات بە زیاد کردن تا ئەگاتە دوایی بەهارو ئەوپەڕی درێژی، ئینجا لەو کاتەدا دەست ئەکاتەوە بە کورت بوونەوە هەتا ئەگاتەوە بەکورت بوونەوە هەتا ئەگاتە سەرەتای زستان، هەروەها بەبێ وەستان و شێوان و گۆڕان! دەی هەر دڵێ بە تەواوی کوێر نەبێ و سەمەسای لێ نەبڕابێ چۆن هەست ناکات بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو کردەوە سەرسوڕهێنەرە پێك ئەهێنێ(یا سبحان الله یا سبحان مالك الملك!) ئینجا لەسەر ڕای یەکەم ڕەخنە ناگیرێ

بەو شوێنانەی کە هەمیشەو شەوو ڕۆژیان یەکسانەو زیادو کەم ناکەن، چونکە زۆربەی شوێنو وڵاتان زیادو کەم ئەکەن، کەواتە گوێ نادرێ بەو شوێنە کەمانە، بێجگە لەوەش ئایەتەکە هیچ گشتیەتی ئەو کردەوە ناگەیەنێ، بەڵکو بوونی لە تەنها وڵاتێکدا بەسە بۆ بەڕاستی ئایەتەکەو بۆ ئەو مەبەستەی کە بۆی هاتووە ﴿وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ﴾ زیندوو دەرئەهێنێ لە مردوو ﴿وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ مردوویش لە زیندوو دەرئەهێنێ، ئیتر ئایا مەبەست بەو زیندووو مردووە، ئەو گیانلەبەرانە بێت کەلە کەرەسە بێ گیانەکان خوا فەراهەمیان ئەهێنێ، یان بەتایبەتی مەبەست ئەو گیاندارانە بێت کەلەو ئاوە تایبەتیە دروستیان ئەکات، یان بە شێوەیەکی گشتی ئەوانیشو هەموو ئەوانەی کەلە هێلکەو ناوکەو تۆمە دەریان ئەهێنێ، ئەو ئاوو هێلکەو تۆمەو ناوکانە هەرچەند بەگوێرەی زانیاری تەندروستی مردو نینو بە زیندوو دائەنرێن، بەڵام ئەوانە هەموو بە مردووو بێ گیان دائەنرێن بە پێی باوی گشتی خەڵکیو لەناو مەردومدا، کە قورئان لەسەر ئەو باوە هاتووەو لەگەڵ مەردوم ئەدوێ، بێجگە لەوەش ئەو شتە زیندووانەی کە لەو ئاوو هێلکەو تۆمانەدا هەن لە ڕووی بەڕاستیدا بە زیندوو ناژمێرێن ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ ئەو گیانلەبەرو شتە زیندووانەی کە لێیان پەیدا ئەبن، چونکە جۆری زیندوویەکەیان جیاوازە، یان مەبەست بە زیندووو مردوو ئەوەیە ئەو هەموو سیلو وردیلانەبێت کە بە هەمیشەیی هەزاران هەزار بە مردوویی لە لەشو جەستەی زیندووەکان دەرئەچنو هەزاران هەزار سیلو وردیلەی مردو دێنە جێگاکەیان بە زیندوویی، هەروەها هەرچینێ کە ئەمرێو ئەڕوا لە جارێکی تردا ئەگەڕێتەوە بۆ ژیان، هەرچینێ کە بە زیندوویی دێت لە جارێکی تردا ئەگەڕێتەوە بۆ مردن، هەتاکاتی مردنی هەموو لەشو جەستەکە دێت ئەو کاتە هەموو بەجارێ ئەمرێ.

هەرکام لەم بارو شێوەیانە مەبەست بێت یان هەموو مەبەست بن ئەو دوو جۆرە کردەوە نایابە سەرسوڕهێنەر هەن، هیچ کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێ بدا کە دەخلی ببێ تیایاندا، هەرکەس ڕێزی ژیریی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز نالێ بە ڕێکەوتو لە خۆیانەوە فەراهەم دێن، کەواتە هیچ بارێکی تر نیە بێجگە لەوەی کە بڵێن: ئەی خوا ﴿مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ﴾ تۆ ئەوە ئەکەیت.

وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ

**ئەم فەرموودەيە دەست نيشانى تيايە بۆ چەند بارو گۆڕانێكى تر كە خوا فەراهەمى هێناوە لەم دروستكراوانەيدا: لە بێبڕوا بڕوادارو لە بڕوادار بێبڕوا دروست ئەكات، لە زانا نەزانو لە نەزان زانا، لە زيرەكو ژير كەودەنو نەفامو لە نەفامو كەودەن ژيرو فاميدە، لە پاك پيسو لە پيس پاك، وەك بەو جۆرانەش تەفسيركراونەتەوە. ئينجا بێگومان ئايەتەكە هەرئەوە نيشان ئەدات كە خوا ئەو كردەوەيە ئەكاتو خوا زيندوو لە مردو دەرئەهێنێو مردوو لە زيندوو، ئەوە ناگەيەنێ كە هەموو مردوويەك لە زيندوو پەيدابووەو هەموو زيندوويەك لە مردوو بەبێ سەرەتاو برانەوە، كەواتە ڕێی هيچ دەمبازێك نيە ڕەخنە بگرێت بەوە، ﴿وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ڕۆزی هەر كەس ئەدەيت كە بتەوێ بەبێ هيچ ئەركو ماندوبوون، يا بەلێشاوو بەبێ ژمارە، يان بە ئارەزوو خواهيشی خۆتو بەبێ ئەوەی هيچ كەس هيچ هەقێكی بەلاتەوە بێت.**

**خوايەك كە بەو جۆرە هەموو شت هەر بەدەست ئەو بێت ئيتر بۆ ئەبێ كەس بەندەو گوێڕايەڵی ئەو نەبێ، چۆن بێجگە لەو هيچ كەسو هيچ شتێكی تر ئەپەرستێ، چۆن هێندێ لە بەندەكان لافی خوايەتی لێ ئەدەن بەسەر هێندێكی تردا، چۆن هێندێ لە بەندەكانی ئەوەندە پەستو نەفامن هێندێ لە بەندەيانی وەك خۆيان ئەكەن بە خوا يان شوێنی فەرمانو بەرنامەيان ئەكەون!!**

**لەم دوو ئايەتی پێشوودا هەستو دڵو دەروونی هێنايە سۆزو پەرۆش بەمەی كە هەموو كاروبارێ بە دەست خوايە، هەموو هێزو دەسەڵاتی بۆ خوايە، تەدبيرو بەڕێوەبردنی هەموو شتێ بە خوايە، ژيانو ڕۆزی هەر بە دەست خوايە، كەواتە هەركەس نەفامو نەزانو سپلە نەبێت ئەبێ هەر بە دواى ڕەزامەندیی خوادا بگەڕێ، ئەبێ هەركەس دۆستی خوا بێت**

بەدۆستی بزانیٚ و هەرکەس دوژمنی خوا بێت بە دوژمنی بزانێت، جا لەو بارەیەوە ئەم چەند ئایەتی داهاتووە هاتن بەو هەموو توندو تیژییە، بەو هەموو تەمیٚ و ئامۆژگاریە بەهێزانە، بۆ پچڕینی پەیوەستی بڕواداران لەگەڵ بیٚبڕواکاندا، ئەفەرمویٚ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ با بڕواداران بیٚبڕواکان نەگێڕنو نەیانکەن بە دۆستو خۆشەویستیان بۆ خۆیان، لە کاتێکدا کە واز بێنن لە بڕواداران و بەسەر ئەواندا تێپەڕ بکەن بۆ لای بیٚبڕواکان، مەبەست ئەوە نیە کە خۆشویستنو دۆستایەتیان لەگەڵ بڕوادارانـدا قەیناکات، بەڵکو خۆشویستنو دۆستایەتیان بە هەر جۆرو لەسەر هەر بار قەدەغەیەو نابیٚ، لەدەقی چەند ئایەتی تردا هاتووە یەکیٚ لەوانە: ﴿لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ دژومنی منو دوژمنی خۆتان مەکەن بەدۆستو خۆشەویستتان، کەواتە هێنانی ئەم وتەیە: ﴿مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ لەبەرئەوەیە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بەبۆنەی چەند کەسێکەوە کە هەر هاوڕێتی و دۆستایەتی بیٚبڕواکانیان ئەکرد، ئینجا ئەم ئایەتە کردەوەی ئەوانەی خستە بەرچاوو جڵەوگیری بڕوادارانی لیٚ کردو لە هەمان کاتدا سەرزەنشتی ئەو چەند کەسەیشی پیٚئەکاتو دەست نیشان ئەکات بەوەی کە دۆستایەتی و هاوڕێتی بڕواداران ڕاستو شایستەیە، ئینجا ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات لەسەر ئەو کردەوە ناڕاستە، بەم تێهەڵکێشە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ﴾ هەرکەس ئەوە ئەکات ﴿فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ﴾ ئەوکەسە هیچ شتیٚ لە دۆستایەتی و خۆشەویستی خوای نیەو پەیوەستی بە خواوە ئەپچڕیٚ، چونکە دۆستایەتی و دوژمنایەتی دوو شتی دژ هەرگیز لە دڵێکدا کۆنابێتەوە، کەواتە هەرکەس خوای خۆش بویٚ نابیٚ دوژمنانی خوای خۆش بویٚ، هەرکەس دوژمنانی خوا خۆش بویٚ ئەوا بە شایەتی خوا خوای ناویٚ و پەیوەستی بە خواوە نیە لەم بارەوە شاعیر چاك ئەڵیٚ:

تود عدوي ثم تزعم أنني     صديقك ليس عنك بقارب

دوژمنی منت خۆش ئەویٚ ئینجا لات وایە کە من دۆستی تۆم، ئەگەر وابزانیٚ بەڕاستی نەفامی و لێت جویٚ نابێتەوە، بیٚگومان هەرکەسێك هیچ جۆرە دۆستایەتی و خۆشەویستی

خوای نەبێ و پەیوەستی بپچڕێ بە خواوە بەو کاتە لە ڕیزی بڕواداران دەرئەچێ، وەك لە ئایەتی ﴿المائدة﴾دا ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾هەرکەس لە ئێوەی بڕوادار ئەوان بکات بە دۆست و خۆشەویستی خۆی بەڕاستی ئەو کەسە لەوانەو لەڕیزی بڕواداران نیە.

ئەم خۆشویستن و دۆستایەتیە کە قەدەغەیە جیاوازە لە کردەوەی چاك و داد بەکارهێنان لەگەڵ هێندێ لە بێبڕواکاندا کە جلەوگیری لێ ناکات لە ئایەتی سورەتی ﴿الممتحنة﴾دا ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ﴾ خوا جلەوگیرییتان لێ ناکات سەبارەت بەو بێبڕوایانەی کە جەنگیان لەگەڵ نەکدوون و لە وڵاتی خۆتان ئاوارەیان نەکردوون، جلەوگیرییتان لێ ناکات لەوەی چاکە بکەن و داد بەکاربێنن لەگەڵیان، هەروەها بەڵێن و پەیمان بەستن لەگەڵ بێبڕوایان کە سوودو بەرژەوەندی ئیسلامی تیابێت ڕەوایەو نابێ هیچ مەرج و پەیمانێ بشکێنرێ تا ئەوان ئەوان نەی شکێنن، واتە ئێمە کردەوەی چاك و داد بەکار ئەهێنین لەگەڵیان، پەیمان ئەبەستین ئەگەر سوودی ئیسلامی تیابێت، بازرگانی و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ ئەکەین، لەوانەوە فێری پیشەسازی ئەبین، بەڵام نابێ لەدڵدا خۆشمان بوێن، چونکە خۆشویستنی ئەوان ناگونجێ لەگەڵ خۆشویستنی خواو پێغەمبەرماندا(ﷺ)، بەڵێ خۆشویستن و سۆزو بەزەییەك کە بەسروشت هەیە لەبەر خزمایەتی یا دۆستایەتیەکی کۆن یا لەبەر چاکەو پیاوەتیەك، ئەوە قەیناکات، بەڵام لەئەندازەو ڕادەیەکدا نەبێ کچارنەکرێ و لەژێر دەسەڵاتدا نەبێ، ئینجا ماوەتەوە داوای یارمەتی و کۆمەکی لێیان، لەمەدا ڕای بەهێزی زانایان لەسەر ئەمەیە کە دروستە بە مەرجێك زەبوونی و سەرشۆڕی و ژێر دەستەیی لێ پەیدا نەبێ بۆ موسڵمانان، بێگومان ئەم ئایینی ئیسلامە بە هیچ ڕەنگ مەردوم تەنگە تاو ناکات لە هیچ داواو ئەرکێکدا کە خستوویەتیە سەرشان و پێویستی کردووە، جا لەبەرئەوە لێرەدا لەم جلەوگیریەی کە کردی جۆرو شێوەیەك ڕەوا ئەدا کە پێویستمان هەیە پێی،

إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةًۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُواْ مَا فِي
صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُۗ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ
﴿٢٩﴾ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ
أَمَدًۢا بَعِيدًاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾

ئەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةًۗ﴾ واتە بڕوادارەكان بەهیچ ڕەنگ و بەهیچ هۆیەك بێبڕوایان نەكەن بەدۆست و خۆشەویستی خۆتان مەگەر لە كاتێكداو لەبەرئەوەی خۆتان بپارێزن لە زیانێك لەلایەن ئەوانەوە كە دووچارتان ببێ لە دوژمنایەتیەكەیانەوە، ئەو كاتە ڕەوایە دوستایەتی لەگەڵیان، بەڵام ئەو دۆستایەتیەش ئەبێ هەر دەمی ڕووت بێت، نەك بەدڵ و كردەوە، وەك(ئیبن و عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ:(**لیس التقیة بالعمل إنما بالسان**) ئەو دۆستایەتی خۆپارێزیە نابێ بەكردەوە بێت، خۆپارێزی و دۆستایەتی ئەبێ هەر بەزیان بێت، دیارە كە كردەوەی لەگەڵ نەبێ ئەبێ دڵی هەر لەگەڵ نەبێ، بەم ڕەنگە دڵ دامەزراو بێت لەسەر خەشم و نەویستن، كەواتە شتەكە لەم كاتەدا ئەگەڕێتەوە بۆ دڵ و دەروون و لە خواترسی، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥۗ﴾خوا ئەتان ترسێنێ لەخۆی، واتە لە تۆڵە و سزای خۆی، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەتان لە ڕۆژی دوایی دا، كەواتە وریای خۆتان بن و خۆتان بپارێزن لە هەر شتێ كە مایەی خەشم و سزای خوایە كە یەكێ لەو شتانە ئەمەیە كە بەدڵ بێبڕوایانتان خۆش بوێ، ئینجا هەمیتر لەسەر ئەو ترساندنە ئەڕواو دەست كاری دڵ ئەكات بە بینایی و ئاگاداری خوا بەسەر هەموو شتێكدا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە بەندەكان: ﴿إِن تُخْفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ ئەگەر ئەوەی لەدڵتان دایە بیشارنەوە ﴿أَوْ تُبْدُوهُ﴾ یان دەری بخەن ﴿يَعْلَمْهُ ٱللَّهُۗ﴾ خوا ئەیزانێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ﴾ ئەزانێ بە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لەزەوی دا ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خوا بەسەر هەموو شتێكدا توانایە، ئینجا ترساندن و دەست كاریەكی تری دڵ ئەكات بە ئامادەكردن و هێنانە بەرچاوی ڕۆژە سامناكەكەی دوایی كە هەموو كردەوەو نیازێكی تیا ئامادە ئەكرێ، ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا﴾ لە ڕۆژێكدا كە هەركەسێكی(مكلف) هەر كردەوەیەكی چاكی كردبێ لە جیهاندا دەستی

ئەکەوێتــەوە بــە ئامــادەکراوی لای خــۆی دا، ﴿وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ﴾ وە هــەر کردەوەیــەکی خراپیشی کردبێ هەر دەستی ئەکەوێتەوە لەو ڕۆژەدا ﴿تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا﴾ ئەو کەسە پێی خۆشەو ئاواتە خوازە کە کاشکێ لە نێوان خۆیو ئەو ڕۆژەدا یان ئەو کردەوە خراپەدا ئەندازێکی دوورو درێژ ببوایە تا هەر نەی بینیایەو پێی نەگەیشتایە، ئاواتە خوازەو بەڵام هیچ جۆرە ئاواتێ بەدی نایە، پەنا ئەگرین بە بەزەیی خوا لە بەدبەختیو بیمو ترسی ئەو ڕۆژە سامناکە، پەنا ئەگرین بە بەزەییو لێ بوردنی خوا لە شەرمەزاری بینینی ئەو کردەوە خراپانە کە هەر دیتنەکەیان سزاو ئازارێکی تایبەتیە، ئیتر ئەو دیتنە نامەو دەفتەری کردەوەکان بێت، یان بە دیتانیان بێ لەو شێوە ناشیرینو سامناکەدا وەك لە ڕیوایەتدا هاتووە کە چاکەکان ئەکرێ بە لەشو قەبارەیەکی شیرینی دڵڕفێن، خراپەکانیش ئەکرێن بە قەبارەیەکی ناشیرینی دڵ داچڵەکێن، یان وەك ئەمڕۆی ئەم جیهانە ڤیدیۆی کردەوەکانی ئێرەیان بۆ لێ ئەدرێتەوە، بە هەر جۆرو لەسەر هەر بار ڕۆژەکە ئێجگار سەختە، ئینجا هێرشێ تر ئەکاتەوە سەر دڵو ترساندنەکەی دووبارە ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾ خوا ئەتان ترسێنێ لەخۆی، ئەمان ترسێنێ تا لە جیهاندا خۆمان بپارێزین لە هۆی تۆڵەو سزای، ئەمڕۆ ئەمان ترسێنێ تا هەلو کاتمان لەدەست دەرنەچووە، کەواتە ئەم ترساندنی ئێرەو ئێستایە بەزەیی دارو میهرەبانیە بەکاری ئەهێنێ لەگەڵمان وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ خوا بەزەیی دارو میهرەبانە بە بەندەکانی، هەموو سوپاسو ستایشێ بۆ ئەو.

ئەم هەموو هێرشە بەهێزو جۆر بەجۆرێ کە کردی وا نیشان ئەدا کەلەناو موسڵمانەکاندا چەند کەسانێ بوو‌بن کە بە تەواوی لێ نەبڕابنو خۆیان ڕووت نەکردبێ لە هەموو پەیوەندیو پەیوەستیو خزمایەتیو دۆستایەتیو بەرژەوەندی قازانجو دەست کەوت لەلایەن بێبڕواکانی مەککەو مەدینەدا، لە کاتێکدا کە ئیسلام ئەیەوێ کە هەموو پەیوەندیو پەیوەستیەکی موسڵمانان لەسەر بنەڕەتی بڕواو ئایینو عەقیدە بێتو هەموو شتێکی تر ژێر پێ بکرێ لە پێناوی بڕواو ئاییندا، بێگومان بەم تەمێو ئامۆژگاریو پەروەردە قورئانیە نەبێ هەرگیز دڵو دەروون ڕزگار نابێو ئازاد نابێ لەم هەموو هێزە ڕێکرو ڕاکێشەرانەی ئەم جیهانە، بەوە نەبێ مەردوم خۆی دانابڕێ لە هەموو شتێکی واو ڕناکات بۆلای خواو خۆی نابەستێتەوە تەنها بە بەرنامەکەی خواوە، کەواتە هەمیشەو لە هەموو چەرخێکدا پێویستی هەیە بەم هەوڵو تێکۆشانەو بەبێ ئەوە گەلی موسڵمان پێ ناکات.

﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢﴾

ئینجابە چەند وتەیەکی کورت بڕواو ئایینی ڕاستەقینە ڕوون ئەکاتەوەو جیای ئەکاتەوە لە بێبڕوایی، بەجۆرێ هیچ تەمو تاریکی ناهێڵێ، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە مەردومان ﴿إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ﴾ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ ﴿فَٱتَّبِعُونِي﴾ دەی شوێنی من بکەنو پەیڕەویم بکەن تا ﴿يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾ خواش ئێوەی خۆش بوێ ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ﴾ ببورێ لێتان لە گوناهەکانتان ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ خوا لێ بوردەی میهرەبانە، ﴿قُلۡ﴾ بڵێ پێیان ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ﴾ گوێڕایەڵو فەرمانبەری خواو پێغەمبەر بن، ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئینجا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو مل پێچیان کرد لە فەرمانبەری ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بێگومان خوا بێبڕوایانی ناوێو خەشمی هەیە بۆیان، بێگومان خۆشویستن قسەو لافێکی دەمی نیە، وە تەنیا سۆزێکی دەروونی نیە، مەگەر گوێڕایەڵیو فەرمانبەری پێغەمبەری خوای لەگەڵ بێت(ﷺ) وە پەیڕەوی ڕێنموونیەکەیو هەوڵدان بۆ پێك هێنانو بەدی هێنانی بەرنامەکەی لە ژیاندا، هەروەها بڕواهێنان وتەو وتنێکی زبانی نیە، هەستو زانینێکی دەروونی نیە، تەنیا بەجێهێنانی شیعارو فەرزەکان نیە، بەڵکو لە ڕووی ڕاستیدا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرە(ﷺ)و ڕەفتار کردنە بەو ئایینو بەرنامەی خوا کە پێغەمبەر(ﷺ) هێنای،(ئبن و کەسیر) -خوا لێی ڕازی بێ- لە تەفسیری یەکەم ئایەتدا ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە بڕیار ئەدا بەسەر هەرکەسێکدا کە لافی خۆشویستنی خوا لێ بداو لەسەر ڕێو ڕێبازی پێغەمبەر نەبێ(ﷺ)، بڕیار ئەدا بەمەی کە ئەو کەسە درۆ ئەکات مەگەر کاتێ کە شوێن کەوتووی شەرعی خوابێتو ئایینەکەی لە هەموو وتارو کرداری دا، وەك لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە کە ئەفەرموێ: هەرکەس هەرکردەوەیەك بکات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەو کردەوە وەرناگیرێ، وە لەبارەی ئایەتی دووەمەوە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەگەر پێچەوانەی فەرمانتان کرد ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئەوا بێگومان خوا بێبڕوایانی ناوێ، کەواتە ئەم

فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێچەوانەکردن لە ڕێ‌و ڕێبازی پێغەمبەردا(ﷺ) بێ‌بڕواییە، خوایش ئەو کەسەی ناوێ، هەرچەند لەدەروونی خۆی دا خۆی وا دابنێ خوای خۆش ئەوێ. خاوەنی(زاد المعاد) لەو کتێبەدا ئەفەرموێ:((هەرکەس بیربکاتەوە لە کتێبێ سیرەت‌و حەیسدا لەبارەی شایەتی دانی زۆر لە نامەدارەکان بت پەرستەکان لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ)و ڕاستی ئەو، کەچی بەو شایەتی دانە نەبوون بە موسڵمان، ئەو زانین‌و شایەتیە نەی گێڕان بە موسڵمان، هەرکەس بیربکاتەوە باش ئەزانێ کە ئیسلام شتێ ترە جیاوازە لەوە، تەنیا زانین‌و ناسین نیە، وە تەنیا ناسین دان پیانان نیە، بەڵکو ناسینە‌و دان پیا نانە‌و مل کەچیە‌و گرتنە گەردنی گوێڕایەڵیە بە ئاشکراو نهێنی)).

ئەمەی کە خاوەنی(زاد المعاد) فەرموویەتی شتێکی ڕاستە‌و لەئایەت‌و حەدیسەوە هەر ئەوە وەرئەگیرێ، ڕای پێشەواو زانا بەرزەکانی عیلمی کەلام‌و تەوحیدە. ئەو ئیسلامەی کە هات بۆ ڕزگارکردن‌و ڕاست کردنەوەی ئادەمیە‌و خوا ناردی تابێ بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانیان، ئەو ئیسلامە حەقیقەت‌و بارە ڕاستەکەی بریتیە لە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەری شەریعەت ئایینی خواو پەیڕەوەی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، گێڕانی ئەو ئایین‌و شەریعەتە بە حەکەم‌و لە هەموو شتێکدا، ئەوەش هەڵئەقوڵێ لە بڕوا بە تاک‌و تەنیایی خوابەو جۆرو شێوەی کە ئەم ئایینە پیرۆزە هێنای وەك چەند جارێك ڕوون کرایەوە بەڵێ بڕواکردنی دڵ‌و بەستنەوەی دڵ بەوەی کە پێغەمبەرمان هێنای لای خواوە، مل کەچی دڵ بۆی بە هەموو ئارامی‌و وەرگرتنی بەبێ هیچ جۆرە نیگەرانی‌و بێزاریەکەوە، بڕوای ئاوا لە ڕیزی بێ‌بڕوایانی دەرئەکات بەلای زۆربەی زانایانەوە، بەڵام کار بەوە تەواو نابێ‌و خوا ڕازی نابێت‌و مەبەست لە هاتنی بەوە بەدی نایەت.

بەپێی ئەو ڕیوایەتانەی کەلە سەرەتای سورەتەکەوە باس کران کە ئەم سورەتە هەتا ئایەتی(٨٥-٨٦) هاتووتە خوارەوە بەبۆنەی ئەو تاقمە لە مەسیحیەکانی نەجران. بەپێی ئەو ڕیوایەتانە ئەم بەسەرهات‌و سەرگوزەشتانەی کەلەم سورەتەدا هەن سەبارەت بە حەزرەتی عیسا‌و دایکی‌و لەبارەی حەزرەتی(یحیی)و سەرگوزەشتەکانی تر، ئەم سەرگوزەشتانە

هاتوون بۆ بەرپەرچ دانەوەو دەم کوت کردنی ئەو تاقمە کە هاتبوون بۆ دەمەقاڵێ لەبارەی حەزرەتی عیساو دایکیەوە، بە خەیاڵێ خۆیان ئەیان ویست لە ڕێی قورئانەوە بیروباوەڕەکەی خۆیان بە ڕاست دەرکەن کە ناوی عیسای بردووە بە(كلمة الله)و بە(روح الله)، هەرچەند ئەم ئایەتانە بەو برنەیەوە هاتبن و ئەو دەم کوتکردن و بەرپەرچدانەوەیان تیا بێت، بەڵام هێنانی داستان و سەرگوزەشتەکانی قورئان لێرەو لە هەر سورەتێکی تردا چەند مەبەستێکی گرنگیان پێ دەرئەخرێو ڕوون ئەکرێتەوە کە زۆرتر ئەو مەبەستانە سەرەکین لە سورەتەکەدا، بۆ نموونە لە پێشەوە وتمان: مەبەستی بنەڕەتی و سەرەکی لەم سورەتەدا تاك و تەنیایی خوایە، تەنیایی لە خوایەتی و کاربەدەستی و چاودێری و بەڕێوەبردن و تەدبیری هەموو شتێکدا، دەی داستانی حەزرەتی عیساو دایکی و ئەوەی کە پەیوەندی ببێ بەم داستانەوە، ئەو تاك و تەنیایی خوا ڕوون ئەکاتەوەو ئەدا لە بیروباوەڕی کوڕێتی حەزرەتی عیسا بۆ خواو دانانی هەر وێنەو هاوبەشێك بۆ خواو ئەو جۆرە باوەڕە پووچانە دوور ئەخاتەوەو لەبەر چاو نایان هێڵێ، ئینجا مەبەست و مەسەلەی دووەم ڕوونکردنەوەی مەبەستەلەئایینەکە کە ئاینێ هەر ئیسلامەو ئیسلامیش گوێ ڕایەڵی و مل کەچی و پەیڕەویە، دەی ئەم مەبەستەش لەناوبەناوی ئایەتەکاندا بەرووونی ئەگەیەنرێ، هەروەها لەم سورەتەدا ئەوەی کە بە گرنگ گیرابێ ڕوون کردنەوەی بارو حاڵی بڕوادارانە لەگەڵ خوای خۆیاندا، بێگومان گێڕانەوەی بارو حاڵی ئەم تاقمە بەختیارە هەڵبژێراوە ئەم مەبەستەمان بۆ دەرئەخات بەڕێکی و بە جۆرێ هیچ گەردو تەمی بەسەرەوە ناهێڵێ.

باس و بەسەرهاتی حەزرەتی عیساو دایکی لە سورەتی ﴿مریم﴾یش دا هاتووە، بەڵام جۆری باسەکان جیاوازیان هەیە لە زیادو کەمی ئەڵقەو کورتی و درێژە پێدان بە هێندێ لە ئەڵقەکانی باسەکان، ئەوەش بە پێی پەیوەستی بە مەبەستی سورەتەکانەوەو داخوازیان بۆ ئەو جیاوازی کردنە.

داستانەکان دەست پێئەکات بەباسی ئەوانەی کە خوا هەڵی بژاردن بۆ هەڵگرتنی یەك پەیام و یەك ئاینی و هەر لە یەکەم جاری ئەم ئادەمیەوە، بۆئەوەی ببن بە سەردەستەو پێشرەوی کۆمەڵی برِوادار لە هەموو چەرخ و چینەکاندا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئادەم و نوح و خانەوادەی ئیبراهیم و خانەوادەی عیمرانی هەڵبژارد بەسەر جیهانیاندا، واتە هەرکام بەسەر جیهانیانی چەرخی خۆیاندا.

بە ئادەم دەستی پێکردن، چونکە یەکەمی ئەم تیرەیەو باوکی هەموانە، ئینجا نوحی کرد بەدووەم، چونکە باوکی دووەمە بۆ هەموو ئادەمیانی پاش خۆی، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ﴾ هەر نەوەو وەچەی نوحمان هێشتەوە، واتە بە هۆی تۆفانەکەوە هیچ ئادەمیەك لەسەر زەوی دا نەما بێجگە لەو چەند کەسەی کە لەگەڵ نووح بوون و لەناو کەشتیەکەی ئەودا رزگار بوون لە خنکان بە ئاوی ئەو تۆفانە کە سێ کەس لەوانە(حام و سام و یافسی کوڕی نوح)بوون، ئینجا پاش نەمانی تۆفانەکەو گەڕانەوەیان بۆ حاڵەتی لەوەو پێش هەر نەوەی ئەو سێ کوڕە مایەوەو هەرکەسێکی تری تیابووبێ نەوەیان نەمایەوە، لەبەرئەوە بە نوح ئەوترێ: ئادەمی دووەم: سەلامی خوای لێ بێ، ئینجا سێیەم باس ئەکات بە خانەوادەو خێزانی ئیبراهیم کە بریتین لە ئیسماعیل و ئیسحاق و یعقوب و دوانزە کوڕەکەی، وەك(مقاتل) ئەفەرموێ، بەڵکو هەموو پێغەمبەرانی پاش خۆی لە نەوەی (ئیبراهیم)ن، لە(ئیبن و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە کە مەبەست هەرکەسە کەلەسە ئایینی ئەوبێت، چوارەم ئەکات بە خێزان و خانەوادەی عیمران، مەبەست بەم عیمرانە باوکی مەریەمە کەلە نەوەی(سلیمان)ە بەلای(حسن و وهبە)وەو زۆربەی زانایانی تەفسیری لەسەرە، خانەوادەکەی عیسا و مەریەمە، مەبەست عیمرانی باوکی موسایەو خانەوادەکەی موسا و هارون و پێغەمبەرەکانی تابیعی ئەوانە بەلای(مقاتل) و هەندێ لە زانایانەوە، بەڵام ڕای یەکەم باشتر ئەچێتە دڵەوە بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەری:

١- بەدوای ئەمدا باسی عیمرانی باوکی مەریەم ئەهێنێ، کەواتە دڵ بۆ ئەوە ئەڕوا کە مەبەست بەم دوو عیمرانە یەك کەس بێ، چونکە لە وێنەی ئێرەدا ئەگەر ناوێك دووبارە

بكرێتەوە بە یەك شت سەیر ئەكرێن، بۆ وێنە كەسێ بڵێ:(ئەحمەد) پیاوی چاكە،(ئەحمەد) تۆی خۆش ئەوێ، هەموو كەس ئەم دوو(ئەحمەد)ە بە یەك كەس دائەنێ، بە تایبەتی لێرەدا دڵ هەر بۆئەوە ئەڕوا كە هێنانی باسی عیمران بەدوای دا بۆ ڕوون كردنەوەی هۆی هەڵبژاردنی ئەوخانەوادەیە.

٢- ئەم سورەتە ناوبراوە بە ﴿آل عمران﴾ دەی ئەگەر مەبەست بە عیمران باوكی موسا و هارون بوایە ئەبوایە هەر هیچ نەبێ باسێكی ئەوانیشی تیا بوایە، كەچی بە هیچ جۆر باسی ئەوانی تیا نیە، بەڵام درێژترین باسی مەریەمی تێدایە، كەواتە دڵ هەر بۆ عیمرانی باوكی مەریەم ئەڕوا.

٣- خانەوادەی عیمران لەسەر هەربار، واتە چ مەبەست باوكی موسا بێت یان باوكی مەریەم، بەری خانەوادەی ئیبراهیم ئەكەوێ، كەواتە جوێ كردنەوەو بە تایبەتی باس كردنی ئەبێ لەبەر هۆیەكی گرنگ بێت، دەی ئەو هۆیە بۆ عیمرانی دووەم ئاشكراترە، چونكە دووبەرەكی لە عیسادا زۆرترو بەتین تربووە لەناو نامەدارەكاندا، ئەوەتا جوولەكە زۆر بە پەستو خراپی سەیری ئەكەن، گاورەكانیش ڕادەو پلەی خوایەتی بۆ دائەنێن، كەواتە پێویستی زۆر تر هەیە بەدیاریی كردنی ڕادەو پلەی عیسا بەبێ كەمو كوڕیو زیادە ڕەوی، كەواتە باسی ئەم هەڵبژاردنی خانەوادەی عیمرانە لەم ئایەتەدا بكەین بە سەرەتا بۆ ئایەتی مەریەمو عیساو بەشێك لە ڕادەو پلەی ئەوانەی پێ دیاریی بكەین چاكترە، ئەو كاتە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی داهاتوودا جۆش ترو پەیوەست تر ئەبن.

باسی خانەوادەی ئادەمو نوحی نەكرد، چونكە وا دەرئەكەوێ كە خانەوادەی ئەو دووانە لەپاش خۆیان پچڕابێت لە خواپەرستی، بێبڕوایی‌و بت پەرستی داگیری كردبن بە تەواوی، ئیتر هەرچەند چەرخو چین پاش خۆیان ئەو بەسەرهاتە پیسە ڕووی دابێ، بەڵام خانەوادەی ئیبراهیم ئەم پچڕانە ڕووی تێ نەكردو دووچاری ئەو بەسەرهاتە بۆگەنە نەبوو، بەم ڕەنگە خواپەرستی هەر لێ نەبڕا، چونكە خانەوادەی ئیبراهیم(علیە السلام) لە یەكەمجارەوە دووپەلی لێ بوویەوە: ئیسماعیل‌و ئیسحاق، پەلی ئیسماعیل هەرچەند لەپاش ماوەیەك خواپەرستی لێ بڕا، بەڵام لە پەلی ئیسحاقدا هەر لێی نەبڕا هەتا خوا پێغەمبەرمانی ڕەوانەكرد كەلە پەلی ئیسماعیلە ـ سەلامی خوا لە مانیش‌و لە هەموو ڕەوانەكراوەكانی تری خوا بێت ـ، ئینجا سوپاس بۆ خوا لەسەر دەستی ئەمدا خواپەرستی زاڵ بوو بەسەر هەموو جیهاندا،

ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي
مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ
بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ

---

**خوای گەورە هەڵی بژارد ﴿ذُرِّيَّةً﴾ نەوەو وەچەیەك كە ﴿بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖ﴾ هێندێكیان لە هێندێكی تریان كەوتوونەتەوە.**

**خوای گەورە لە سێ ئایەتی كورتی سورەتی ﴿الأنعام﴾دا باسی شانزە پێغەمبەر ئەكات لە نەوەی ئیبراهیم، با لەسەر ڕیزی ئایەتەكە باسیان بكەین: ئیسحاق، یعقوب، داود، سلیمان، أیوب، یوسف، موسا، هارون، زكریا، یحیی، عیسا، إلیاس، ئیسماعیل، الیسع، یونس، لوط، بێگومان(ئیبراهیم)یش لە نەوەی نووحەو نوحیش لە نەوەی ئادەمە -سەلامی خوا لە هەموویان بێت- بێجگە لەوانە دەست نیشان ئەكات بۆ چەند كەسی تری زۆر لە باوكو براو نەوەو وەچەی زۆری ئەوانەو بەڵام ناویان نابا، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا شنەوای زانایە، شنەوایە بە هەموو وتاری بەندەكانی، زانایە بە هەموو نیازو كرداریان، كەواتە بە پێی زانینو لێزانی خۆی ئەوانەی هەڵبژاردووە، هەركەس ئەو هەڵی بژاردبێ بە ڕاستی شایستەیە بۆ هەڵبژاردن.**

**لەپاش جاڕدانی ئەوهەڵبژاردنە، ئینجا دێتە سەر باسی خانەوادەی عیمرانو پەیدابوونی دایكی عیساو چۆنێتی هەڵبژاردنی ئەم خانەوادەیە، ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕووداوی ئەو كاتە بكە كە ژنەكەی عیمران نەزای كردە لای خوای خۆی بەم ڕەنگە ووتی: ﴿رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا﴾ ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی من نەزرم كرد بۆ تۆ ئەوەی كە لە سكمایە بە ئازاد كراو لە هەر شتێ بێجگە لە خوا، واتە بە تەرخان كراو بۆ خزمەتی خانەی تۆ كە(بیت المقدس)ە، بە نیازو تەمای ئەوە بوو كە كوڕی ببێ، چونكە هەر**

کوڕ ئەکرا بە خادمو مجەوری ئەو خانە پیرۆزە ﴿فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓ﴾ ئینجا ئەی خوایە ئەو نەزرەم لێ وەرگرە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ﴾ چونکە بەڕاستی هەر تۆ شنەواو بیسەری نزاکەی منی ﴿ٱلۡعَلِيمُ﴾ زانای بە نیازو مەبەستم کە هەر ڕەزامەندی تۆیە.

ئەم نزاو نەزرە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر بڕواو پاکو خاوێنی ئەو ئافرەتە دەربارەی پەروەردگاری، ئەوەتا خۆشەویست تری خۆی کە ئەو ڕۆڵە ئاواتەخوازەیەتی ئەیدا تەنها بە خواو دایئەڕنێ لە هەر کارو بارێکی ئەم جیهانەو هەر نیازو مەبەستێکی تر بێجگە لە نیازی ڕەزای خوا، چونکە(محرر) وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: بە پیاوێك وتراوە کە هیچ ئیشێك نەکات بۆ دنیاو ژن نەهێنێو خۆی یەك بار بکاتەوە بۆ کارو کردەوە بۆ ڕۆژی دوایی و خواپەرستی، خزمەتی کەنیسەی کردبێ. ئەوەش بە گوێرەی باوی خواناسە تەواوەکانی ئەو شەریعەتەی کە پێی وتراوە ڕەهبانیەتی و خۆیان پێویستیان کردبوو لەسەر خۆیان، ئەوە دەستوورو باوێکی کاتی بوو بۆ ئەو چەند چەرخە باش بووە، لەبەر ئەوە خوا قەدەغەی نەکرد لێیان، ئینجا کە ئەم شەریعەتی ئیسلامە هات ئەو باوەی نەهێشتو فەرمووی:(لا رهبانية في الإسلام) ڕەهبانیەتی لە ئیسلامدا نیە. ئینجا بەڕاستی ناوبردنی ئەو جۆرە کەسانە بە(محرر) واتە ئازاد کراو، زۆر ڕاستو بەجێیە، چونکە لە ڕووی ڕاستیدا هیچ کەس ئازادی تەواو وەرناگرێ مەگەر کەسێك کە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە ڕا بکات بۆ لای خواو خۆی یەك بارو یەك تەن بکاتو لێ ببڕێ هەر بۆ خوا، هەر دڵی پەیوەندی یا چاوەنواڕی یان بەندەیی غەیری خوای تیابێ ئەو دڵە ئازادی تەواوی وەرنەگرتووە، وە هەر کەسێك پەیڕەوی غەیری ئاینو شەریعەتی خوا بکات، ئەو کەسە بەندەیەو ئازادی وەرنەگرتووە، هەرچەند بە ڕواڵەتو بە دیمەن ئازادو سەربەست بێت، بەڵێ بە ڕاستی ئەو نزاو نەزرە لە لایەن ئەو ئافرەتە بڕوادارەوە نیشانەیەکی ئاشکرا بوو لەسەر ملکەچی و موسڵمانێتی ئەو ئافرەتە بەڕێزە، بەڵام سکەکەی بەو جۆرە دەرنەچوو کە ئەو ئەیویستو داوای کرد، بەم ڕەنگە ئەو

داوای کوڕی کردو خوا کچی دایە، ﴿فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا﴾ ئینجا کاتێ سکەکەی داناو بۆی دەرکەوت کچی بووە غەمبار بووو شکاتی بردە لای خوای خۆی‌و بە داخ‌و خەفەتەوە ﴿قَالَتۡ﴾ وتی ﴿رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ﴾ ئەی پەروەردگارم سکەکەم دانا بە مێینە، واتە داخی خۆم دەرئەبڕم کە ئاواتەکەم بەدی نەهات، کوڕم ببێ‌و بیکەم بە خزمەتچی(بیت المقدس)، لە هەمان کاتدا ڕەنگە مەبەستی عوزر هێنانەوەش بووبێ بۆ ئەوەی کە نەزرەکەی بەدی نایەو دەسەڵاتی ئەمیش نیەو خوا کارەکەی وا کرد، هەر جۆرێ مەبەست بووبێ خوای گەورە ڕێزو نرخ‌و گەورەیی ئەو منداڵە نیشان ئەدات بەم وتە تێهەڵکێشە: ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ﴾ خوا زاناترە بەو منداڵەی کە ژنی عیمران دایناو بوویەتی، واتە ئەو کچەی کە بووی لە کوڕ باشترو بەفەڕترە، ئەوەتا لە پاشەڕۆژدا ئەبێ بە دایکی عیساو ئەبن بە نیشانەو موعجیزەی خوا بۆ جیهانیان، ئینجا ئاماژە ئەکات‌و ئەم مەبەستە ڕوون تر ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰ﴾ ئەو نێرینەی کە ئەو ژنە داوای کرد وەك ئەو مێینە نەبوو کە پێی بەخشرا، واتە ئەم مێینە زۆر چاکترە لەو نێرینەی کە داوای کرد، کەواتە ئەو ژنە بێ‌ئاگایە بۆیە غەمبار بوو بەوەی کە داواکەی بەدی نەهات، هێندێ لەسەر ئەوەن کە ئەم وتەیەش لەلایەن ژنەکەی عیمرانەوە بەو مەبەستە داخ دەربڕینەو عوزر هێنانەوەیە کە نەزرو ئاواتەکەی بەدی نایەت، یان دڵخۆشی خۆی ئەداتەوە بەوەی کە ئەوەی خوا کردی باشترە لەوەی کە ئەم نیازو داوای کرد، ئینجا ئەو ئافرەتە بڕوادارە ناوێکی دانا بۆ کچەکەی کە ڕێك بێت لەگەڵ ئەو سۆزو خواناسی دەروونی خۆی داو پەیوەست بێت لەگەڵ ئەو ئاواتەی کە خواستی بۆ سکەکەی وە بەدی نەهات: ناوی نا(مەریەم) لە زەمانی ئەواندا واتە خواپەرست، بە شێوەی موناجات‌و پاڕانەوە عەرزی خوای کردو خستیە پەنای خوا،

وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ
حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ
يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ هُنَالِكَ دَعَا
زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾

ووتی: ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ من ناوم نا مەریەم ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ﴾ بەڕاستی من ئەیپارێزم‌و پەنای ئەدەم بە تۆ ئەی خوایە ﴿وَذُرِّيَّتَهَا﴾ نەوەو وەچەشی ﴿مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ لە شەیتانێ کە دەرکراوە لە بەزەیی‌و میهرەبانی تۆ، دایکی مەریەم ڕاستی کرد لەگەڵ خوای خۆی‌و بەڕاستی خستیە پەنای خوا ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾ بەهۆی ئەوەوە پەروەردگاری مەریەم لێ وەرگرت بە وەرگرتنێکی جوان‌و بە ڕەزامەندیەوە لە باتی ئەو نەزرەی کە کاتی خۆی کردی، واتە هەرچەند لەو شەریعەتەدا باو وا بووە کە هەر کوڕی گەنجی ژیریی بە توانا بکرێ بە خادمی ئەو خانەی خوا، بەڵام خوا میهرەبانی کرد ئەو کچە منداڵەی وەرگرت بە جوانی ﴿وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ ڕواندی بە ڕوانێکی شیرین، واتە پەروەردەی کردو پێی گەیاندو ئامادەی کرد تا(روح الله)ی وەرگرت‌و عیسای لێ بوو بە شێوەیەکی کەس نەدیوی بێ وێنە لە ناو هەموو ئادەمی دا، ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾(زەکەریا)ی کرد بەدەستەبەری بۆ بەخێوکردن‌و سەرپەرشتی‌و چاودێری،(زەکەریا) لەنەوەی هاروون بوو کە کلیلە وان‌و قاپیەوانی هەیکە لە کەبوون،(زەکەریا) لەو کاتەدا سەرۆك بوو، لەمەو پاش باسی چۆنێتی گێرانی بەدەستەبەرە دێت، کەواتە لێرەدا پێویست نیە بەو باسە، ئینجا ئایا زەکەریا هەر لە شیرەخۆریەوە بووە دەستە بەری بۆی ـ وەك زۆربە لە زانایان ئەفەرموون ـ و چەند ڕیوایەتێکی لێ هاتووە، یا لەپاش بڕینەوەی لە سیر، بە هەرحاڵ‌و لەسەر هەربار میحرابێکی بۆ دروست کرا، واتە هۆدەیەکی تایبەتی لە(بیت المقدس)دا وەقاپیەکەی خرایە سەر ناوەڕاستی دیوارەکەی لە بەرزەوە بە جۆرێ بە پەیژە بۆی سەرئەکەوتن بەوێنەی قاپی کەعبە، وەك(ئیبن‌و عەباس) ئەفەرموێ: -خوا لێیان ڕازی بێ-،(زەکەریا) هات‌و چۆی ئەکردو سەری لێ ئەدا، لەو شوێنە پیرۆزەدا خوا پێی گەیاندو پەروەردەی کرد بە خواپەرستی‌و بە پیرۆزی، بە کەرامەت ژیاندی

به ڕۆزی دانی لەلایەن خۆیەوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ﴾ هەر جارێ کە زەکەریا سەری لێ ئەداو ئەچووە میحرابەکەیەوە﴿وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾ ڕۆزیو خواردەمەنیەکی لەلا ئەبینێ، بێگومان سەرسوڕئەمێنێ لە شتی وا ئەبێ پرسیاری لێ بکرێ، لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ زەکەریا پێی فەرموو: ﴿يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا﴾ ئەی مەریەم ئەمەت لە کوێ بوو؟! ﴿قَالَتْ﴾ مەریەمیش فەرمووی: ﴿هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە لەلای خواوەیە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بێگومان خوا ڕۆزی هەرکەس ئەدا کە بیەوێ بەبێ ژمارەو بە لێشاو. بەڵێ بڕواداری خواناس بەرامبەر میهرەبانیو بەهرەی خوا ئەبێ ئاوا مل کەچیو چاولەبەری خۆی دەرخات، نەك وەك بێبڕواو خوانەناس تا بەهرەو چاکەی خوا زۆرتر برژێ بەسەریدا یاخیو مل هوڕتر ئەبێو کەشخەو بافیش ئەکاتە خۆی، بێگومان ئەم ئایەتە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ڕاستی کەرامەت، هەرکەس کە ڕیکەڕیكو ملەجەڕێ بکات لەم بەڵگە ڕوونەدا خۆی ماندوو ئەکاتو هیچ ژیرێ گوێی بۆ شل ناکات.

ئینجا لەناوەندی داستانەکەی حەزرەتی مەریەمدا داستانو سەرگوزەشتەیەکی حەزرەتی زەکەریا ئەهێنێ، داستانی داواکردنی منداڵێکی پاكو خاوێن لە خوا لە پاش پیری خۆیو نەزۆکی خێزانی، ئەم دوو داستانە زۆر پەیوەستو تێکەڵن بەسەکەوە: هەردوو لە هەواڵە غەیبیەکانو گێڕانەوەیان موعجیزەیەکی سەربەخۆن بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، هەرچۆنێ زەکەریا دەستە بەرو چاودێری مەریەم بوو هەروەها خێزاکەشی پووری بوو، بێجگە لەوەی هەموو لە یەك بەرەو نەژاد بوونو خزمی یەکتر بوون، کەواتە ڕێزی ئەمانیش بەشێکە لە ڕێزگرتنی خانەوادەی عیمران، بینینی مەریەم بەو پاکیو پیرۆزیەیو بە ڕێز گیراوی لای خوا یەکێ بوو لە هۆی ئەو داوای زەکەریا لە خوا، هاتنی ئەو ڕۆزیو خواردەمەنیە لەلایەن خواوە کە شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، بیرخەرەوەو پاڵ پێوەنەر بوو زەکەریا کە داوای منداڵ بکات کە ئەوەش بەپێی باوی مەردوم چاوەڕوانی کراو نەبوو، نزاو داواکەشی لەو سەردەمەو لەو شوێنە پیرۆزەدا بوو، کەواتە زۆر بەجێیەو شوێنی خۆیەتی کەلێرەدا ئەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ﴾ لەو سەردەمەیان لەو شوێنە پیرۆزەدا زەکەریا نزای کردو پاڕایەوە لە پەروەردگاری بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ ووتی: ﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾ پێم ببەخشە لەلایەن خۆتەوە ڕۆڵەیەکی پیرۆزی پاكو خاوێن ﴿إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ بەڕاستی تۆ بیسەرو ژنەوای نزاو پاڕانەوەیت، خۆت گیراکەری نزایت. زەکەریا بەو جۆرە پاڕایەوە،

فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ
وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ
وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾

---

**﴿فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئینجا فریشته بانگی لیْ کرد ﴿وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ﴾ له کاتیْکدا که زەکەریا وەستا بوو نزای ئەکرد، یا شەونویْژی ئەکرد له مزگەوتدا، یان له میحرابەکەی مەریەم ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ﴾ بانگی لیْ کرد بەمەی کە خوا موژدەت پیْئەدا بەبەخشینی کوریْك کە ناوی یەحیائەبیْ ﴿مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ کەلە پاش دا یەکەم بڕواهیْنەر ئەبیْ بە عیسا کەلە دایك بووە بە وتەیەك لە لایەن خواوە بەبیْ پیْویست بە باوك ﴿وَسَيِّدًا﴾ گەورەو پیْشەوا ئەبیْ لە ئاییندا، دیارە ئەکاتە ئەبیْ هەموو سیفەتو ڕەوشتە چاكو شیرینەکانی تیا بیْت، وەك تەفسیرکراوەتەوە بەخاوەنی هەرکام لەو سیفەتانە، ﴿وَحَصُورًا﴾ زۆر خۆپاریْزو جڵەوگیری خۆی ئەبیْ لە کارو کردەوەی ناشیرینو ئارەزووی ناڕەوا ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەبیْ بە پیْغەمبەریْك لە ڕیزی چاکانو چاك کردارەکاندا، بەو جۆرە ئەو موژدە خۆشەی پیْدرا، ئەو نزاو داوایە وەرگیرا لەسەر پیْچەوانەی باوو تیْگەیشتنو چاوەڕوانی مەردومان، کە هەروا لە خۆیانەوە دەم ئەکوتنو ئەیانەویْ باوو بۆچوونی خۆیان بکەن بە یاساو قانوون، گومان وا ئەبەن کە ویستو خواهیش خوا ئەبەستریْتەوە بە یاساو قانوونەکەی ئەمانەوەو نازانن کە ویستو خواهیشی بەربەرەڵایەو نابەستریْتەوە بە زانینی کەموکوڕو بۆچوونی تەنگو تروسکی ئەمانەوە، پیْویستە لەسەرمان کە بزانینو بڕوامان وابیْ کە مەیلو خواهیشی خوا وا بە داوای زانینە بیْ سنوورو نەبڕاوەکەیەوەو ئەمیش نەوەستاوو بەر لیْ نەگیراوە، پیْویستە بڕوای بەهیْزمان بەوە ببیْ تا خۆمان کارو پیشەو سنووری زانینی خۆمان بناسین، ئەو کاتە شەرم ئەمانگریْو دەم ناکوتین لە کاروبڕیاری خوادا. بیْگومان زەکەریا(علیه السلام) بڕوای بەهیْزو تەواوی بووە بە دەسەڵاتو توانای بیْسنووری خوا،**

بەخشینی ئەو منداڵەی بەلاوە شتێك ڕێك‌و گونجاو بووە ئەگینا ئەو داواو نزایەی ئەکرد، بەڵام مەردوم ــ با پێغەمبەریش بێت ــ بە سروشت وا دروست کراوە کەسەری سەرسوڕئەمێنێ لە هەر شتێکی نایابی سەرسوڕهێنەر بە تایبەتی کە دژو پێچەوانەی باو بێت، هەروەها ئەگەر بەتەمای هەر شتێك بێت کە زۆر پێی خۆش بێت‌و بە سۆزو بە پەرۆش بێ بۆی پرسیار ئەکات لە بوون‌و دەست کەوتنی، هەرچەند دڵنیا و بێگومان بێت تیای دا، جا لەبەرئەوە زەکەریا سەری سوڕما لە کرداری خواو لە خۆشی دا پرسیاری لە خوای خۆی بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ ووتی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ﴾ ئەی پەروەردگارم لە چ لایەکەوەو چۆن من کوڕم بۆ ئەبێ ﴿وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ﴾ لە کاتێکدا بەڕاستی پیریم پێگەیشتووەو بە تەواوی کاری لێ کردووم‌و ژنەکەشم نەزۆکە، بێگومان ئەمیش هەر پیربووە.

فریشتە موژدەکەی دا بەزەکەریا، بەڵام دیارە کارەکە هەر بەدەست خوایەو هەر ئەو ئەزانێ چۆنی ئەکات‌و لەبەرچی ئەیکات، لەبەرئەوە پرسیارەکەی لە خوا کرد، خوایش وەڵامی دایەوە بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێی، ئیتر لەسەر زمانی فریشتەکە یا خوا خۆی سروشی کرد بۆ لای: ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ هەر بەوێنەی ئەو کردەوەیە کە پێچەوانەی باوەو زۆر بەدوور دائەنرێ، واتە بەخشینی ئەو منداڵە بەو باوك‌و دایکە ـ هەر بەوێنەی ئەوە خوا هەر کردەوەیەکی تری بووێ ئەیکات، یا ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ﴾ خوا هەر بەو جۆرەیە، واتە ﴿يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ هەر شتێکی بووێ ئەیکات لەو کارو کردەوانەی کە پێچەوانەی باون، بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەم دوو جۆرە لەدڵمدا جێگیرترو سووك تر بوون، وە هەموو جۆرەکان یەك مەبەست ئەگەیەنن کە مەیل‌و خواهیشی خوا ڕووی کردە هەر کارو هەرشتێ ئەبێ ببێ‌و هیچ شتێ بەربەستی ناکات. ئەگەر ئەندازەیە ورد بینەوە باشتر لە مەسەلەکە حاڵی ئەبین، چونکە هەرچی بووە بە باو خوا کردوویەتی بە باو، هەرشتێ لە یەکەمجارەوە پەیدا بووە نەبوونی باو بووەو بوونەکەی دژی باوبووە، خوا کردوویەتی بە باو، کەواتە باوو ناباو بۆ خوا یەکسانەو لای ئێمەی بێ دەسەڵات جیاوازن!

قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗاۗ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا
وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ (٤١) وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ
وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٤٢) يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ (٤٣)

---

حەزرەتی زەكەریا ـ درودی خوای لەسەر بێ ـ سۆزو پەرۆشی ئەوەندە بەتین بوو خستیە پەلە بۆئەوەی خوا نیشانەیەكی بۆ دابنێ لەسەر بەدی هاتنی ئەو داوایە، تا دڵخۆش تر بێ‌و هەر لە یەكەمجارەوە هەڵسێ بە سوپاسی ئەو چاكەو بەهرەیە، لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ ووتی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ﴾ ئەی پەروەردگارم نیشانەیەكم بۆ دابنێ لەسەر ئەوەی كە كەرەسەی ئەو منداڵە جێگیربووە لە سكی دایكی دا، ئینجا خوای میهرەبان ئەم داواو نزاشی لێ وەرگرت‌و نیشانەی ڕوون‌و ئاشكرای بۆ دیاریی كرد بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗاۗ﴾ نیشانەكەت ئەوەیە كەسێ ڕۆژ قسەناكەیت لەگەڵ مەردومانداء واتە ناتوانی قسە بكەیت لەگەڵ هیچ كەس‌و زمانت ئەبەسترێ مەگەر بە ئاماژە بۆكردن‌و دەست نیشان، مەبەست سێ ڕۆژە بە شەوەكانیەوە، وەك لە سورەتی ﴿مریم﴾دا باسی ئەو سێ شەوە ئەكات.

پاك‌و بێگەردی بۆ خوا، ئەو نیشانەی كە بۆی دانا هەرچۆنێ زۆر ڕوون‌و ئاشكرا بوو بۆی‌و خۆی لە دەروون‌و ویژدانی خۆی دا هەستی پێ‌ئەكرد، هەروەها زۆر ڕێك‌و دەقی مەبەستەكەیشی بوو، چونكە ئەمیش وەك ئەو دژو پێچەوانەی باوی لەوەو پێشی بوو، ئەوەتا لەوەو پێش زمانی مەرەخەس بوو بۆ قسەكردن لەگەڵ خەڵكی‌و ج بۆ باس‌و ناوی خواو نزاو پاڕانەوە لە خوا، بەڵام ئێستا بەستراوە لە قسەكردن لەگەڵ خەڵكی‌و مەرەخەسە لەگەڵ خوادا وەك ئاماژە ئەكا بۆ ئەمە كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ﴾ ناوو باسی پەروەردگارت زۆر بكە لەم كاتی زمان گیرانەدا، بە پاكی ڕایگرەو تەسبیحاتی بكە لە ئێوارەو لە كاتی بەیانیاندا، بۆ سوپاس كردنی لەسەر ئەو بەخشین‌و بەهرەیە، ئیتر مەبەست بە تەسبیحات نوێژ بێ‌یان نا؟ بێگومان ئەم نیشانەیە بەدی هات‌و

ئەو ئارامیو خۆسیە کەیشت بەدڵو دەروونی زەکەریاو ئەویش لە خۆشی دا دەستی کرد بەباسو سوپاسو سەنای خوا بە هەرجۆر پێی کرا، قورئان بێدەنگ بوو لەگێڕانەوەی ئەمە، چونکە ئەزانرێ پێویست بە وتن ناکات.

لەپاش هێنانی ئەم داستانی زەکەریا بە تێهەڵکێش لەناو داستانی خانەوادەی عیمراندا کە هێنانەکەشی زۆر رێکو بەجێ بوو، وەك دەست میشانمان بۆ کرد لەسەرەتایەوە، لەپاش هێنانیو دوایی هێنانی بەباسی ئەو نیشانەیە کە هیچ هۆیەکی نەبووە بێجگە لەمەیلو خواهیشی بێسنووری خوا، کە هەر ئەو مەیلو خواهیشەیش کاری مەریەمو عیسای ئەنجامدا، هەروەها دوایی هێنا بە فەرمان دان بە زەکەریا بە یادو سوپاسو پەرستنی خوا تا بەوە بچێ بە پیری ئەو کوڕە پێبەخشراوەو بەوە پێشوازی لێ بکات، کە هەر بەو جۆرەش فەرمان دار بە مەریەمو بەو یادو باسو پەرستنە ئامادەکرا بۆ وەرگرتنی عیسا بە وتەی خواو بە فەرمانی خواو خواهیشی خوا، کەواتە داستانەکەی زەکەریاو دوایی کەشی وەك سەرەتاکەی زۆر رێكو پەیوەست بوو بەباسی خانەوادەی عیمرانەوە، جا لەپاش گێڕانەوە ئەو داستانە رێكو پەیوەستە، ئینجا ئەوا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر داستانە سەرەکیەکە: داستانی خانەوادەی عیمران، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ باسی ڕووداوی ئەو کاتە بکە کە فریشتە وتی بە مەریەم: ﴿يَـٰمَرۡيَمُ﴾ ئەی مەریەم ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ﴾ بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژارد، ئەوەتا وەری گرت لەدایکی بە وەرگرتنێکی جوان وە ڕواندی بە ڕواندنێکی جوان، وە زەکەریای کرد بەدەستەبەرو بەخێوکەریو ڕۆزی لەلایەن خۆیەوە بۆ نارد. ﴿وَطَهَّرَكِ﴾ پاكو خاوێنی کردی لە هەر شتێکی قیزەون، لە هەرکارو کردەوەیەکی چەپەڵ، لە هەر گومانێکی بەد کە لەلایەن جوولەکەوە بۆی هەڵبەسترا، نەفرینی خوایان لێ بێ بۆ خۆیانو گومانی بەدیان. ﴿وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾ هەڵی بژاردیو باوی دای بەسەر هەموو ژنانی جیهانیاندا، ئیتر هەموو جیهانیان، کەواتە ئەبێ گەورەتریش بێت لە فاتمەو خەدیجەو عائیشە -خوا لێیان ڕازی بێ- وەك لە چەند حەدیسێك دا هاتووە، یان مەبەست هەموو ژیانی جیهانیانی چەرخی خۆی بێت وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرموون، بە هەرحاڵو لەسەر هەربار بێجگە لە هەموو بەهرەکانی تری، خوا تاقانە بەهرەیەکی پێدا کە بەهیچ کەسێکی تر

نەدراوە، هەڵی بژارد بۆ وەرگرتنی گیانێك لەلایەن خواوە. وات عیسا، هەرچۆنێ ئادەمی هەڵبژارد بۆ وەرگرتنی گیان لەلایەن خۆیەوە، ئەو کارە تاقانەو بێ وێنەی نیشانی جیهاندا لەسەر دەستی ئەوداو لە ڕێگەی ئەوەوە، بەڕاستی ئێجگار گەورەو گرنگە!!

لەم جۆرە شوێنانەدا گەورەیی ئەم ئایینە بە ڕوونی دەرئەکەوێ‌و سەرچاوەکەی ئاشکرا ئەبێ بۆ هەموو کەس مەگەر ئەوانەی کە چاوی دڵیان بە تەواوی کوێرە، یا ئەو کەسانەی کە خۆیان کوێر ئەکەن لەبەر حەسوودیان، وەك زاناکانی جوولەکەو گاور، پێغەمبەرمان(ﷺ) چونکە ڕاست بوو پشت ئەستوور بوو لە ڕاستیەکەی، بێباك مەریەمی گەیاندە ئاسۆو پۆپەی هەر بەرزی خۆی‌و باوی دا بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا لە کاتێکدا کە گاورو جوولەکەکان ئاژاوەو بەربەرەکانێ‌و دەمە قاڵێیان بوو لەگەڵی‌و بۆ نووختەیەك ئەگەڕان کە بیدۆزنەوە لەسەری بیکەن بە بەڵگە بۆ خۆیان، شتێکی ئاشکرایشە کە جوولەکە تاچ ڕادەیەك بەدگومان‌و دژی حەرزەتی مەریەم بوون، گاورەکانیش تاچ ڕادەیەك زیادەڕەویان کرد پێی‌و گەیاندیانە خوایەتی، دەی ئەمیش بێباك دای لە هەردوو لایان‌و خستنیەوە بەدرۆوەو بارە ڕاستەقینەکەی مەریەم‌و عیسای دا بە ناوچاویاندا!!

ئای هاوار بۆ ئەو ڕاستیە! ئای هاوار بۆ ئەو گەورەییەی کە خوا پێی دا! ئای چ بەڵگەو ڕابەرێکی ئاشکرایەلەسەر ڕاستی سەرچاوەی ئەم ئایینە پیرۆزەو ڕاستی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) واللە ئەگەر ئاوا ڕاست‌و پشت پڕ نەبووایە بە ڕاستیەکەی خۆی ئەو وتەو قسەڕاستەی دەرنەئەخست، چونکە بەپێی باوو تێگەیشتنی ئێمە ئەو دەربڕینە زبانی ئەبوو، وەهیچ بەرژەوەندی تیانەبوو، ﴿ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ ﴾ ئەی مەریەم بەردەوام بە لەسەر فەرمانبەریی‌و خواپەرستی، یا درێژە بدە بە وەستان لە نوێژدا بۆ پەروەردگارت ﴿وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ سوژدە بەرەو ڕکوع بەرە لەگەڵ ڕکوع بەراندا،(زەمەخشەری) ئەفەرموێ: مەبەست لە وتەی ﴿ٱقۡنُتِي﴾و ﴿وَٱسۡجُدِي﴾ نوێژکردنە، مەبەست بە ﴿وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾نوێژ کردنە بە جەماعەت لەگەڵ نوێژکەراندا، زانایانی تر چەند شتێ تریان فەرمووە لە تەفسیری ئەم وتەدا هەموو هەر ئەگونجێن، مەبەست لە هەموو هەر خواپەرستیە بە هەمیشەیی‌و پەیوەستی تا پێبکات‌و ئامادە بێ بۆ وەرگرتنی ئەو گیانە گەورەیە لەلایەن خواوە، واتە عیسای کوڕی.

ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ

لەپاش گێڕانەوەی ئەو چەند داستان و هەواڵە نەزانراوانە، ئینجا پێش ئەوەی باسی چۆنێتی پەیدا بوونی عیسا بکات و داستانی مەریەم تەواو بکات، بە تێهەڵکێش ئاماژە ئەکات بۆ بەشێ لە هۆی گێڕانەوەی ئەم داستانانە، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەو داستانانەی کە باس کرا لەو داستانانەی کە تێپەڕیان کرد بەشێکن لە هەواڵە نادرییی و ونەکان لە تۆو گەلەکەت ﴿نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ﴾ ئێمە سروشی ئەکەین بۆلای تۆ ئەی محمد، واتە زانینی ئەم هەواڵ و داستانەو هەواڵدانی تۆ پێیان بەڵگەو رابەرە لەسەر پێغەمبەرێتی تۆ، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە ئەوانە باسیان نەبووە نەلای تۆو نەلای گەلەکەت، کەواتە ئەبێ هەر بەسروشی ئێمە پێت گەیشتبێ، ئینجا بەتایبەتی ئاماژە ئەکات بۆ ڕووداوێك کەلە چەرخی تەورات و ئینجیلیش دا بەناوبانگ نەبووەو نەزانراوبووە، مەگەر لای زانا و عابیدەکانیان، ئەوەش درێژەکەی ئەمەیە کەلە ڕیوایەتەکاندا هەیە، یەکێ لەوانە ئەمەیە کەلە(ئیبن و عەبباس)ەوە هاتووە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: کاتێ مەریەم لەدایك بوو دایکی پێچایەوەو بە مەتۆلکەیی بردی بۆ(بیت المقدس) دایینا لای خوێندەوارەکان، ئینجا لەبەرئەوەی مەریەم کچی سەرۆك و پێشەوایان بووو باوکی نەمابوو هەرکام ئەیویست وەری گرێ و بەخێوی بکات، ئینجا زەکەریا کە مێردی پووری مەریەم بووو سەرۆکی ئەوان بوو فەرمووی من وەری ئەگرم و من شایستە ترم پێی، ئەوانیش وتیان با قورعەی بۆ بخەین، هەرکەس دەرچوو با لای ئەو بێت، ئینجا ناردیان ئەو هەڵەمانەیان هێنا کە سروشی خوایان پێ ئەنووسی، خڕیان کردنەوە لە شوێنێکداو دایان پۆشتن، ئینجا زەکەریا فەرمووی بە منداڵێ لەو منداڵانەی کە لەوێدا ئەیان خوێند: دەستت ببەو یەکێ لەو قەڵەمانە دەربێنە، ئەویش دەستی بردو قەڵەمەکەی زەکەریا هات بەدەستیەوە، ئینجا وتیان ئێمە بەوە ڕازی نین، بەڵکو قەڵەمەکانمان فڕێ بدەینە ناو ئاو هەرکەس قەڵەمەکەی بەرز بوویەوەو کەوتە سەر ئاوەکە مەریەم لای ئەوبێت، ئینجا کاتێ هەموو قەڵەمەکانیان فڕێ دایە ناو ڕووبارەکەی ئەردەن قەڵەمەکەی زەکەریا کەوتە سەر ئاوو قەڵەمەکانی ئەوانی تر نقوم بوون، دیسان بەوەش ڕازی نەبوون و وتیان: ئەم جارەش فڕێیان ئەدەین قەڵەمی هەرکەس

بەرز بوویەوەو سەر ئاوەکەوە لەگەڵ ئاوەکە ڕۆیی مەریەم لای ئەو کەسە بێت، ئینجا کە فڕێیاندا قەڵەمی ئەوان کەوتەسەر ئاوەکەو وەستا، قەڵەمی زەکەریا وەك کەوتە سەر ئاو لەگەڵ ئاوەکەش ڕۆیی، لەوێدا ئیتر بیانووییان نەماو زەکەریا وەری گرت و بووبە دەستەبەری. ئینجا ئەو ڕووداوە بەجۆری ئەم ڕیوایەتە بووبێ یا بە جۆری هەر ڕیوایەتێکی تر هیچ گرنگ نیەو لە ئایەتەکەوە ئەوە وەرئەگیرێ کە ئەوانە بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کەلە ڕێگەیەکی تایبەتیەوە ـــ بەهۆی ئەو قەڵەمانەیانەوەـــ بزانن کێ مافی هەیەو شایستەیە بۆئەوەی مەریەم بەخێوبکات، لەسەرەنجامدا زەکەریا لەو تاقی کردنەوەدا دەرچوو، بە هەرجۆرو لەسەر هەر شێوە ئەم ڕووداوە ـ وەك لە پێشەوە وتمان شتێکی نادیاریی و ونی نەزانراوبوو، بە هیچ لەوانە نەبووە پێغەمبەر(ﷺ) شتی وا هەر بە دڵیشی دا گوزەربکات، کەواتە نابێ هیچ ژیرێك گومانی ببێ لەوەدا کە خوا ئاگاداری کردووە پێی و سروشی بۆ کردووە، جا لەبەرئەوە بۆ دەم کوت کردنی بێبڕواکان و سەرزەنشتیان بەتایبەتی باسی ئەمەش ئەکات، ئەفەرموێ بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ﴾ تۆ لە لای ئەوان نەبوویت ﴿إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ﴾ ئەو کاتەی کە قەڵەمەکانیان فڕێ دا بۆئەوەی بزانن ﴿أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ﴾ کامیان دەستەبەری مەریەم ئەبن بۆ بەخێوکردن و سەرپەرشتی کردنی، ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ تۆ لایان نەبوویت کاتێ کە ئەوان دەمەقاڵێیان ئەکرد لەبارەی مەریەمەوە، کەواتە ئەم هەواڵەت لە خواوە وەرگرتووەو تۆ پێغەمبەری.

لەپاش ئەو وتە تێهەڵکێشە ئینجا دێتەوە سەر باسە سەرەکیەکەو باسی چۆنێتی پەیدا بوونی عیسا ئەکات کە تاقانە ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەرە بە پێی باوی بوونەوەر، کارێکی ئاسایی و سووك و ئاسانە وەك هەموو کارێکی تر لە بەدەم مەیل و خواهیشی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە فریشتە ووتی بە مەریەم: ﴿يَا مَرْيَمُ﴾ ئەی مەریەم، ﴿إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ﴾ بێگومان خوا موژدەت پێئەدا بە وتەیەك لەلایەن خۆیەوە، واتە بە منداڵێك کە پەیدا ئەبێ بە وتەی خوا کەکاتێ مەیلی بوونی هەر شتێکی کرد ئەفەرموێ ببەو ئەو شتەش ئەبێت، ئیتر مەبەست بەو وتەیە ڕووکەش و ڕواڵەتەکەی بێت بەو جۆرو شێوەی کە شایستەیە بۆ خوا وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرموون. یا مەبەست ڕووکردنی ئیرادەو خواهیشی خوا بێت بۆ ئەو شتە وەك هێندێکی تری لەسەرە، بە هەرکام مەبەست بێت بێگومان هەموو شت هەر بەوە پەیدا ئەبێ،

ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ
وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ
يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ
وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾

---

بەڵام كار و بەرهەمی ئەو وتەیە لە عیسادا ئاشكراترە، لەبەرئەوە بەتایبەتی ئەو بەوە ناوبراوە كە ئەو وتەیە ﴿ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ﴾ ناوەكەی ﴿ٱلْمَسِيحُ﴾ واتە پیتو فەڕ دار یان بەردەوام لەسەر خواپەرستی كە ئەویش ﴿عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ عیسای كوڕی مەریەمە، یا ئەو وتەیە ناونیشانەكەی كە پێی جوێ ئەبێتەوە لە هەركەسێكی تر ئەم سێ شتەیە پێكەوە: ﴿ٱلْمَسِيحُ، عِيسَى، ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ ئەوەی كە وترا لە تەفسیری ﴿بِكَلِمَةٍ﴾دا بەپێی ڕای زۆربەی زانایانە، ڕای هێندێ تر لەسەر ئەوەیە كە ئەو وتە لە(متشابە)كانی قورئانەو هەر حەواڵەی خوا بكرێ باشترە، بەڕاستی هەر ئەم ڕایە بێ ئەركو بێ مەترسیە، ئەوەی كە مەبەستو پێویستە ئەمەیە كە خوا لە دروست كردنی عیسادا باوی لەوەو پێشی گۆڕیو عیسای دروست كرد بەجۆرو شێوەیەكی تر نەك لە ڕێگەی باوكەوە، وەك لە یەكەمجارەوە ئادەمی دروست كرد بەبێ باوكو دایك.

لەو موژدەیەدا كە پێیاندا جۆرەكەیان دیاریی كرد لەگەڵ ناوو نازناوو نەسەبو نەژادی دا، دەریان خست كە نەژادی ئەگەڕێتەوە هەر بۆلای دایكی، هەروەها سیفەتو پایەو پلەیشیان باس كرد بەم جۆرە: ﴿وَجِيهًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ ماقووڵو بەڕێزە لەجیهانو لە ڕۆژی دوایی دا، لەو بەندەیانەیە كە نزیك خراونەتەوە لە بارەگای خواوە، هەروەها باسی نیشانەی موعجیزەیەكی ئاشكرایشی بۆ كرد كە خوا بۆی ئەكات بە دوای لە دایك بوونی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ﴾ قسەئەكات لەگەڵ خەڵكدا لە كاتێكدا كە منداڵەو لە بێشكەدایە ﴿وَكَهْلًا﴾ لە كاتێكدا كە تەمەنی لەسی ساڵ بەرەو ژوورە، واتە قسەكردنی لە بێشكەدا ڕێكو پێكەو یەكسانە لەگەڵ قسەی لەو تەمەنەدا كە سەرەتای جۆشی هێزو پیاوەتیەو لەویشەوە موژدەی تیایە بەمانی تا ئەو تەمەنە، ئینجا باسی كۆڕو كۆمەڵی

ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ لەپیاوچاکانی جیهان ئەبێ. فریشتە ئەو موژدەیەی دایە، بەڵام مەریەمی تازە پێ گەیشتووی داوێن پاکی بێئاگا لەوەی کەشتی وا بگونجێ یاشتی وابەدڵی هیچ کەسێکداگوزەربکات، چونکەدژو پێچەوانەی باوی جیهانە، ئەو مەریەمە دیارە ئەبێ زۆر سەری سوڕبمێنێ لە شتی وا، لەبەرئەوە ڕووی کردە خوای خۆی‌و ﴿قَالَتۡ﴾ ووتی: ﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ﴾ من لە کوێ‌و چۆن مندالّم ئەبێ ﴿وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞۖ﴾ لە کاتێکدا هیچ کەسێکی نێرینە لیێ نەکەوتووە، بەپێی باوی جیهان ژن بەبێ مێرد مندالّی نابێ، ئینجا وەڵام درایەوە بەجۆرێ سەرسوڕمانی نەمێنێ‌و دڵ ئارام ببێ، بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ خوا پێی فەرموو لەسەر زمانی فریشتەکە، یا هەر فریشتەکە پێی فەرموو ﴿كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ هەر بەو جۆرو شێوەیە خوا دروست ئەکات هەرشتێ کە بیەوێ‌و مەیلی ببێ، یا ﴿كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ﴾ هەر بەو جۆرەیە خوا، واتە ﴿يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ هەرچی بووێ دروستی ئەکات، واتە دروست کردنی هەرشتێ کەوا بیەوێ سووک‌و ئاسانە وەکو ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا﴾ کاتێ مەیلی هەرکارێ بکات‌و بڕیاری بدات، ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن﴾ هەر ئەوە ئەفەرموێ: ببە، ﴿فَيَكُونُ﴾ ئیتر ئەو شتە ئەبێ‌و پەیدا ئەبێ بەبێ پێویست بەهیچ کارو کردەوەیەکی تر. ئینجا لەو موژدەیەدا درێژی پێدا بە چەند بەهرەیەکی تری گرنگ کە خوا ئەیدا بەو کوڕەی، ئەفەرموێ: ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَـٰبَ﴾ فێری نووسین‌و خوێندنەوە، یا نامەی ئاسمانی ئەکات ﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ فێری لێزانی‌و کاردروستی، یا زانینی حەرام‌و حەڵاڵ‌و نهسراری شەریعەتی خوا﴿وَٱلتَّوۡرَىٰةَ﴾ فێری تەوراتی ئەکات بە خوێندن‌و خەریک بوون، یا بە بەهرەو بەخشینێکی خوایی، ﴿وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ فێری ئینجیلی ئەکات بە سروش کردنی بۆی، تەورات نامەی عیسایش بوو، بنەڕەتی ئەو ئاین‌و شەریعەتە بووکە پێی ڕەوانە کرا، ئینجیل تەواو کەری تەورات بووو ڕۆحی تەوراتی زیندوو کردەوە لەپاش ئەوەی کوژایەوە لە دڵی زۆربەی ئیسرائیلیەکاندا، ئەو بڕیارو شەریعەتەی تازە کردەوە کە تەورات هێنای بێجگە لە چەند شتێکی تایبەتی کە سڕیەوە، لەبەرئەوەی بۆ چەرخ‌و سەردەمێکی تایبەتی هاتبوون‌و لەکاتی هاتنی ئینجیلدا بەرژەوەندی نەما لە هێشتنەوەی ئەوانەدا، هەوڵی ئەدا بۆ گەڕانەوەی ئیسرائیلیەکان بۆ لای ئەو ڕاستی‌و خواناسی‌و ڕەوشت‌و کردەوە پاک‌و خاوێنەی کە تەورات هێنای‌و ئیسرائیلیەکان دوور کەوتنەوە لێیان،

وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٤٩﴾

---

﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ وە ئەیگێڕێ بە فروستادەو نێرراو بۆلای ئیسرائیلیەکان بە جۆرێ ڕانەگەیەنێ پێیان کە ﴿أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ من هاتووم بۆلاتان بە بەڵگەو موعجیزەیەکی گەورە لەلایەن پەروەردگارتانەوە لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەم، هاتووم بەمەی کە ﴿أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ﴾ من دروست ئەکەمو نەخشە ئەکێشم بۆتان لە قوڕ شتێك بە وێنەی پەلەوەر ﴿فَأَنفُخُ فِيهِ﴾ ئینجا فووی پیا ئەکەم ﴿فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەبێ بە پەلەوەرێکی زیندوو بە ئیزنو فەرمانی خوا ﴿وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾ کوێری مادەر زادەو بەڵەك چاك ئەکەمەوەو ڕزگاریان ئەکەم لە کوێریو بەڵەکی بەئیزنو فەرمانی خوا ﴿وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ﴾ مردووان زیندوو ئەکەمەوە بە ئیزنی خوا، ﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ﴾ هەواڵتان ئەدەمێ بەئەوەی کە ئەیخۆنو ئەوەی کە ئەیهێڵنەوەو زەخیرەی ئەکەن لە ماڵەکانتاندا، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا کەباس کران نیشانەی ڕوون هەیە بۆتان کە ڕاستی فروستادەییو پێغەمبەرێتی من بگەیەنێ، ئەگەر ئێوە بڕواداران ئامادە بن بۆ بڕوا هێنان، واتە ئەگەر ئێوە بەو جۆرە بن سوود وەرئەگرن لەو نیشانانەو بەڕاستی بڕوا ئەهێنن.

خوای میهرەبان پێغەمبەرانی نارد ـ سەلامیان لێ بێ ـ بۆسەر گەلانی جیهان بە نیشانەو موعجیزەوە، هەرکام لەو موعجیزانە هەرچەندە هەموو کەس داماو دەستەپاچە بوون لە ئاستیان، بەڵام هێشتا زیاد لەوەش هەر پێغەمبەری جۆرە نیشانەو موعجیزەیەکی تایبەتی

پێداوه كه گرنگ ترو بەهێزتر بووبێ بەلای گەلەكەیەوە، بۆ نموونە لە چەرخی حەزرەتی موسادا سیحرو جادو باوبووەو بەدڵی خەڵكدا گرنگ بووە، دەی خوا جۆرە موعجیزەیەكی پێدا كە جادووی جادوكەرەكانی پەك خستو لووشین، لەچەرخی حەزرەتی عیسادا ــ سەلامی خوایان لێ بێ ــ پزیشكیو زانیاری تەندروستی باوبووەو زۆرتر جێگەی سەرسوڕمان بووە، دەیخوا ئەو جۆرە موعجیزانەی دایە كە هەموو پزیشكو زاناكان داماوو دەستەپاچەبوون لەبەردەمی دا، ئینجا موعجیزەكانی هەرچۆنێ ئاوا گرنگو بەهێزبوون، هەروەها زۆر ڕێكو پێكو پەیوەست بوون لەگەڵ پەیدا بوونو لەدایك بوونی خۆی، چونكە موعجیزەكانی بریتین لە گیان بەبەراكردنی بێ گیانو گێڕانەوەی بۆ بەگیانو گێڕانەوەی تەندروستی كە جۆرێكە لە گیان بۆ ناساغو نەخۆش كە جۆرێكە لە مردوو، بریتیە لە زانینی شتێ كە ونو نادیاریی بوو، هەرچۆنێ خۆی گیانێك بووو خوا فەراهەمی هێنا لەپاش نەبوون، هەرچۆنێ بوونی نەزانراو بوو، بە دڵی هیچ كەسێكدا نەئەهات كە شتی وا بگونجێ، كەواتە لەپاش بینینی ئەو موعجیزانە لەسەر دەستی حەزرەتی عیسادا ئیتر چۆن جوولەكە سەریان ئەكردەوە لە پاكو خاوێنی مەریەمو عیسادا؟ -سەلامی خوایان لێ بێتو نەفرینو خەشمی خوا بیارێ بەسەر جوولەكەدا- ئایا ئەو خوایە كە ئەو موعجیزانەی دا بەعیسا ناتوانێ عیسا فەراهەم بێنێ بەبێ باوك؟ حەزرەتی عیسا ــ سەلامی خوای لێ بێ ــ ئەو موعجیزانەی ئەنواندو ئەیفەرموو: ئەمە لە لایەن خواوەیەو بە ئیزنو فەرمانی خوا بۆئەوەی كەس زیادەڕەوی نەكاتو لەسنووری بەندەیی دەرنەكرێو بەرز نەكرێتەوە بۆ سنووری خوایەتی، بەلام بەداخەوە زۆربەی ئادەمی هەڵە بازەو لە ڕێگەی ڕاست ئەترازێ بەهەر بارێكدا، ئینجا لەو موژدەیەدا هەواڵی دا بە سروشتو بەرنامەیەكە حەزرەتی عیسای لەسەر ئەبێو ڕای ئەگەیەنێ بە ئیسرائیلیەكان،

ئەفەرموێ: ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ من هاتووم بە بڕواهێنەر بەو تەوراتەی کەلە پێش منەوە هاتووە، یان هاتووم ڕاستی تەورات دەرئەخەم بەمەی کە ڕێکم لەگەڵی و هاتنەکەم دەق و سەربەرە لەگەڵ هەواڵدانی تەورات بەهاتنم، ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْۚ﴾ هاتووم بۆئەوەی حەلاڵ بکەم بۆتان هێندێ لەوانەی کە قەدەغە کرا لەسەرتان لەشەریعەتی موسادا، وەك خواردنی گۆشت و پیوی حوشترو چەوری ئاژەڵ و گۆشتی ماسی و ئەو جۆرە شتانە کە بەهۆی لاری و سەرکێشی ئیسرائیلیەکانی لەوەو پێش خوا قەدەغەی کردن و بەوە تەمێی کردن، ئینجا لەشەرعەتی ئینجیل دا نەرمی بەکار هێناو ئەو قەدەغەیانەی حەلاڵکرد، کەواتە دەرکەوت کە تەورات نامەیەکی سەرەکی بووە لە شەریعەتی عیسادا، سڕینەوەی قەدەغەی ئەو جۆرە شتانە نابێ بەهۆی جیاوازییان، هەرچۆنێ هەر لەشەریعەتی قورئاندا هێندێ لەپێشەوە قەدەغە کراو لەپاشدا حەلاڵ کرا، یا چەند شتێ لە پێشەوە حەلاڵ کراو لەپاشدا قەدەغەکرا، یا لەپێشەوە پێویست کراو لەشدا پێویست کردنەکەی سڕرایەوە، لەوەوە دەرئەکەوێ کە ئاین بە شێوەیەکی گشتی ئەبێ ڕژێم و بەرنامەی ژیانی پێبووبێ، نەك ئاین بریتیە هەر لەپاك و خاوێن کردنەوەی هەست و دەروون و ڕەوشت و هێندێ عیبادەت و خواپەرستی و پەیوەندی بەندە بە خواوەو ئیتر بەس، نەخێر شتی وا هەرگیز نەبووە، بەڵکو ئاین ـ هەموو ئایینێ ـ جۆرێکە لە بەرنامەی ژیان کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی لە هەموو بارو ڕوویەکەی ژیانیانەوە، ئەوەی کەلە مەسیحێتی ئەمڕۆدا ئەبیرێ کە ئایینی دوور خستەوە لەمیریی و دەوڵەت، ئەوە دوورە لەو ئایینەی کە حەزرەتی عیسا هێنای، هەر ئەوەش بوو بەهۆی هەموو لاری و ناڵەباری و گرێیەك لەژیان و جیهاندا، چونکە ئەو جیاکردنەوەی ئایینە لەوانەوە کەوتە ناو جیهانی ئیسلامی و ئەمانیش لاسایی ئەوانیان کردەوەو ڕژێم و یاسای ئاسمانیان لابردو گۆڕییان بەیاسا و ڕژێمی زەمینی، بەهۆی ئەوەوە جیهان و ژیان کەوتە ئەم گێژاوە کە ئەبینرێ و ڕزگاربوون نابێ بە گەڕانەوە نەبێ بۆ ژێر سایەی ئەو ڕژێم و یاسا ئاسمانیەی کە لەم دواترین شەریعەتەدا هات و بە کردەوە لەژیاندا بەدی هێنرا.

وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا
صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٥١﴾ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ
ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ
أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾

---

**لەپاش ئەوەی بەو هەموو موعجیزەو نیشانە ڕوونانە ڕاستی پێغەمبەرێتیەکەی دەردەخات، ئینجا نیشانەیەکی تریان بۆ باس ئەکات کە هۆی دڵنیایی و ئارامی دڵە، ئەوەش ئەمەیە کە ئەوەی ئەم ڕای ئەگەیەنێ تاک و تەنیایی و پەروەردگارێتی خوا بۆ خۆی و بۆ ئەوانیش بەیەکسانی کە ئەوەش ڕێ و ڕێبازی هەموو پێغەمبەرانە - درودی خوایان لێ بێ- بەڕاستی زانین و ناسینی ئەوەش هەر موعجیزەبوو کە ئەو ڕێ ڕاستەی لێ تێك نەچوو لەناو ئەو گەلەدا کە ئایینی خوایان گۆڕی و پێغەمبەرایان کوشت، ئەمیش لەوانە نەبووە لە خۆیەوە شتی وا لاڕێی خوا، هەرئەوەش ڕێی ڕاستە، ئەفەرموێ: ﴿وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ من هاتووم بۆ لاتان بە بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرا لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لە خوا بترسن و خۆتان لەسەر کێشی و نافەرمانی، گوێڕایەڵی من بن لەهەر فەرمانێ کە پێتان ئەسپێرم لەلایەن خواوە.**

**ئەو نیشانە ئاشکرایەش کە بۆم هێناون ئەمەیە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ﴾ بە ڕاستی خوا پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەیشە ﴿هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾ ئەمەیە ڕێی ڕاست، بێجگە لەم ڕێی تاک و تەنیایی خوا ئیتر هەر هەمووی لارو چەوت و مایەی سەر لێ شێوان و بەدبەختیە، یان مەبەست بە وتەی ﴿بِـَٔايَةٖ﴾ هەر موعجیزەکانە کەلە پێشەوە باسی کردن، دووبارەی کردنەوە بۆئەوەی ببێ بەسەرەتا بۆئەوەی کە بەدوای دا ئەیهێنێ، وتنی ئەوەش بەشێکە لە پەیامەکەی کە کورتەکەی ئەوەیە:**

**١- بەڵگەو موعجیزەم هەیە، ئەو بەڵگەو موعجیزەش لەلایەن خواوەیەو من دەسەڵات و توانام نیە بەسەری دا.**

٢- بانگتان ئەکەم بۆ فەرمانبەری خواو خۆپارێزی لەسەرپێچیو نافەرمانی.

٣- گوێ ڕایەڵی خۆی کە پێغەمبەری خوایە.

لەپاش ئەوە ئینجا دڵنیا کردنیان لەسەر خوایەتیو پەروەردگارێتی خوا بۆ خۆیو بۆ ئەوان، کەواتە خۆیشی وەك ئەوان بەندەی خوایەو بەهیچ ڕەنگ نزیکی سنووری خوایەتی نەکەتووەتەوە. ئەو موژدەیەدرا بەحەزرەتی مەریەمو هەرچی وترا لەبارەی ئەو کوڕە تاقانەوە بەدی هات، واتە لەدایك بووو هەر لە بێشکەدا قسەی کرد لەگەڵ ئەوانەی کەلە یەکەمجارەوە بەد گومان بوون سەبارەت بە خۆیو دایکی، وە بەو پاکی خۆیو دایکی ڕوون کردەوە، لەپاش دا کرا بە پێغەمبەر بۆ سەر نەوەی ئیسرائیلو بانگی کردن بۆ ڕێگەی خواو ئەو موعیزانەی کە باس کران لە موژدەکە بەدی هێنان بۆیان کە هەرکەس سەرکێش نەبێو خۆی کوێر نەکات لە ئاستیان ئەزانێ کە خاوەنی ئەو موعجیزانە پێغەمبەری خوایە، ئینجا لەگەڵ ئەو موعجیزە ئاشکرایانەدا جوولەکەکان هەر بڕوایان نەهێناو لاقرتییان ئەکرد بەخۆیو بە موعجیزەکانی، ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ﴾ ئینجا کاتێ کە عیسا هەستی کرد بەبێبڕوایی ئەوانو زانی بە بەپیلانو نیازی بەدیان ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: بە هاوڕێ تایبەتیەکانی: ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ ئایا کێن یارمەتی دەرانی من لە کاتێکدا کە من پەنا ئەبەم بۆ لای خواو بانگی خەڵکی ئەکەم بۆلای؟ واتە هەموو بانگ کەرێك یارمەتی دەری ئەوێ کە لەگەڵ ڕاپەڕینو هەڵگری بانگو ئالاکەی بنو بەرگری لێ بکەنو ئەوانیش بیگەیەنن بە مەردومانی تر لەپاش ئەو، جا لەبەرئەوە کێ لەگەڵ من ئەبێو ئەو ئەرکە ئەگرێتەوە گەردن؟ ﴿قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ﴾ هاوڕێ تایبەتیەکانی وتیان: ﴿نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ ئێمە یارمەتی دەرانی خواین، واتە ئێمە یارمەتی دەری تۆو ئایینی خواین کە مەبەست بە یارمەتی دانی خوا هەر ئەوەیە، بەڵام بەو جۆرە تەعبیرەی کە ئەوان وتیان زۆر بەهێزترەو باشتر سەرنج ڕائەکێشێو ئەگەر دەقی مەبەستەکەیان بووتایە، واتە یارمەتی دەرانی تۆین ئەم جێگەی نەئەگرت. ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ئێمە بڕوامان هێناوە بە خوا، واتە لەبەرئەوە ئەبێ یارمەتی تۆو ئایینەکەی خوا بدەین، چونکە بڕواکەمان داخوازی ئەوەیە، ﴿وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ تۆیش شایەتیمان بۆ بدە لە ڕۆژی دوایی دا کە ئێمە ئێستا ملکەچین بۆ خواو گوێڕایەڵین بۆ فەرمانی تۆ کە یارمەتی دانت

بەشێکە لە داواو فەرمانت، ئینجا ئەوا بارو حاڵی خۆیان پێشکەش ئەکەن بە بارەگای خواو پەیمان بەویش‌و ئەپاڕێنەوە کە وەریان گرێ: ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئێمە بڕوامان هێنا بە هەر نامەیەك کە ناردووتە خوارەوە، بێگومان ئینجیل یەکەم‌و سەردەستەیە لە نیازو مەبەستیاندا، ﴿وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ﴾ شوێنی پێغەمبەرەکەت کەوتین‌و گوێڕایەڵین بۆئەوەی کە هێنای لەلایەن تۆوە بۆ ئێمە ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ کەواتە بمان نووسە لەگەڵ شایەتەکان‌و بمانخەرە ڕیزی ئەوان، ئەوانە کە شایەتن لەسەر تاك‌و تەنیایی خۆت‌و ڕاستی ئاین‌و پێغەمبەرانت، بێگومان هەرکەس بڕوای ببێ بە ئایینی خوا ئەبێ شایەتی بدا بەڕاستی ئەو ئایینە، بەجۆرێ کە بیگەیەنێ‌و دەری ببڕێ کە هەر ئایینی خوا مافی مانەوەو پەیڕەوی کردنی هەیە، ئەو شایەتیەش بەدەمی ڕووت‌و بە بڕوای ڕووت تەواو نابێ‌و جێگەی خۆی ناگرێ، بەڵکو کاتێ شایەتیەکەی ڕاستەقینەو خۆی ئەبێ بە شایەتێکی ڕاست کە بە ڕەوشت‌و کردەوەش ئەو شایەتیە بدات بە جۆرێ ببێ بە ئاوێنەیەکی بالانما بۆ ئەو ئایینە، کەواتە پێویستی سەرشانێتی کە بەپێی توانا بکەوێتە هەوڵ‌و تێکۆشان بۆ گێڕانی ئەو ئایینە بە بنەڕەتی ژیانی، ڕژێمی ژیانی گەل‌و یاسای خۆی‌و گەل لەو ئایینە وەرگرێ، ئەبێ ئامادەبێت بۆ خۆبەخت کردن‌و خوێن ڕشتن لە پێناوی ئەو ئایینەدا، لەبەرئەوەیشە کە ئەو جۆرە خۆبەختکەرانەو ئەو خوێن ڕژاوانە ناو ئەبرێن بە ﴿شهید﴾ لە ڕاستی دا شایەتی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە بەخوێنی خۆیان شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستی‌و ڕێزو نرخی ئایینەکەیان. جا ئەو هاوڕێ ڕاستانەی حەزرەتی عیسا ئەپاڕانەوە لە خوا کە بیان نووسێ لە ڕیزی ئەوانە کە بەو جۆرو شێوە ڕاستەقینە ئەیانکات بە شایەت لەسەر ئایینەکەی، یارمەتیان بدا لەوەی ببنە نموونەو نوێنەری ئەو ئایینەو بیانخاتە ڕاپەڕین‌و بزووتنەوەو تێکۆشان لە ڕێی پێك هێنان‌و بەدی هێنانی بەرنامەی ئەو ئایینە لە ژیاندا، پێك هێنانی گەل‌و کۆمەڵێك کە بێن بە نوێنەری ئەو بەرنامەیە، ئیتر با لەو هەوڵ‌و تێکۆشانەدا سەرو ماڵیان تیا بچێ.

بەڕاستی نزاکەیان شایستەیە بۆ بیرلێ کردنەوە لەلایەن هەر کەسێکەوە کە لافی موسڵمانێتی لێ ئەدات، چونکە ئیسلامی ڕاستەقینە هەر ئەوەیە کە ئەوانە تێی گەیشتوون،

هەرئەوەیش بووە لەدڵی هەمووموسڵمانە ڕاستەقینەکانی هەموو جیهاندا، ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە ئامـاژەکردن بۆ دواترین پیلانی جوولەکەکان دەربارەی حەزرەتی عیسا(علیه السلام)، پیلانی کوشتنی و لەناو بردنی تا خوا ڕزگاری کرد.

ئەو جوولەکانە ـ نەفرینی خوایان لێ بێ ـ وەك بڕوایان پێنەهێنا لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزە ڕوونانە، وەك بڕوایان نەهێنا هەر وازیشیان نەهێنا، بەڵکو نەوەستان لە هەر جۆرە پیلان و کردەوەیەکی خراپ کەلەدەستیان بهاتایە، بوختانیان کرد بۆ خۆی و بۆ دایکە داوێن پاکەکەی، پڕوپاگەندەیان لێ ئەکرد بەوەی کە درۆزن و دەلەسە چی و جادوبازە، بۆیان لێ دا لای پادشای ڕۆمانیەکان(بیلاطیس) و شکاتیان لێ کرد بەوەی کە وڵات تێك ئەدات و گەل هەڵئەخەڵەتێنێ لە دەوڵەت، بە جادو بازیی بیروباوەڕی خەڵکی تێك داوە! هەتا کارێکی وایان کرد ئەو پاشایە ڕێی دان چی لێ ئەکەن بیکەن، خۆی زاتی نەبوو هیچی لێ بکات، چونکە هیچی لێ نەدیبوو، ئینجا ئەوانیش بڕیاری کوشتنیان دا، چەند کەسێکیان بۆ ئامادەکرد کە بچنەسەری و بیکوژن،(یهوذا) ناو کە لەناو هاوڕێ و قوتابیەکانی عیسادا بوو ناپاك بوو ئەو هۆدەیەی نیشان دان کە حەزرەتی عیسای تیابوو، وەخۆی چووە ژوورەکە، بەڵام لەپێش چوونی ئەودا خوا عیسای بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، ئینجا کە ئەم ناپاکە چووە ژوورەکەوە خوا شێوە و ڕەنگ و دەنگی عیسای بەسەردا کێشا، دیارە نازانێ ئەوەی بەسەر هاتووە و بە شوێنی عیسادا ئەگەڕێ، کاتێ دەستی نەکەوت هاتە دەرەوە ووتی: عیسا لەوێ نیە، ئینجا سەرۆکی سەربازەکان کە چاوی پێکەوت بە عیسای زانی فەرمانی دا بەگرتن و کوشتنی،(یهوذا)ی ناپاکیش ووتی: من(یهوذا)موسڵمان، سەرۆکەکەش ووتی: ئەگەر تۆ عیسانیت ئەی عیسا کوا؟ ناپاکەکەش ئەیوت: ئەگەر من عیسابم ئەی(یهوذا) کوا؟ خوای کارساز ئەو ناپاکەی بەو جۆرە لێ کرد تا گرتیان و بە ناوی عیساوە کوشتیان، ڕۆیی بۆ دۆزەخ، لەو بارەکەیشەوە عیسای گەیاند بە پلەی بەرزی خۆی،

وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ
إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ﴾ ئەو جوولەكانە پیلانو فرتوفێڵ تەدبیرەکەی خۆیان کردو بەجێیان هێنا، ﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ﴾ خوایش تەدبیری خۆی کرد، بەم ڕەنگە بەربەستی پیلانو تەدبیرەکەی ئەوانی کردو چارەسەری عیسای کرد ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو تەدبیرکەرانە، وتەی ﴿مکر﴾ بۆ سێ مەبەست بەکار ئەهێنرێ:

١- هەوڵدان بۆ دووچار کردنی یەکێ بە ناڕەواو زیانِ پێگەیاندنی بەفێڵو فڕ بەجۆرێ بەخۆی نەزانێ.

٢- زیان گەیاندن بە یەکێ بەجۆرێ کە بەخۆرێ کە بەخۆی نەزانی.

٣- تەدبیرێکی ڕێکو بەهێز لە کارو کردەوەدا.

بێگومان جۆرێ دووەمو سێیەم بۆ خوا بەکار ئەهێنرێ، بەڵام بەجۆرێ یەکەم ناگونجێ بەکارهێنانی، کەواتە لەسەر باری یەکەم ئەبێ ئەڵێین: بەکارهێنانی لێرەدا بەپێی باوێکە لەباوەکانی ڕەوانبێژی کە پێی ئەوترێ(مشاكلة) واتە هاوتایی کردنو هاو وێنەیی لە وتنی تەنیادا، نەك لە واتاو مەبەستدا، وێنەی ئەوە هەیە بە زۆری لە قورئانو حەدیسو لە وتراوی ڕەوانبێژاندا، بۆ نموونە: قورئان تۆڵەی خراپەی بە خراپە ناوبردووە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ﴾ وە ئاشکرایە کە تۆڵەی خراپە ڕاستو ڕەوایە، لەسەر ئەو باری یەکەمە ئەڵێن لە(متشابه) کانە ئەو کاتە یا مەبەستێکی ڕێكو ڕەوای بۆ دیاریی ئەکەین یان لێی بێدەنگ ئەبینو بڕوامان پێی هەیە بەو جۆرەی کە خوا ویستوویەتی.

خوای پەروەردگار تەدبیری خۆی کردو چارەسەری کاری عیسای کرد ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ﴾ ئەو کاتەی کە خوا فەرمووی بە عیسا: ﴿يَٰعِيسَىٰٓ﴾ ئەی عیسا ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ لەلایەن زانایانی تەفسیرەوە یازدە ڕا هەیە لە تەفسیری ئەم فەرموودەیەدا، ڕایەك لەسەر ئەوەیە کە ئەمە لە(متشابه)کانەو حەواڵەی خوا ئەکرێو مەبەستێکی تایبەتی بۆ دیاریی ناکرێ، ئەو دەڕاکەی تر مەبەستی بۆ دیاریی ئەکەن، لەسەر هەموو بارو هەموو ڕایە بێگومان خوا

عیسای ڕزگار کردو پاراستی لەوەی بکوژرێ، هەرکەس لای وابێ کوژراوە ئەو کەسە لە ئیسلام دەرئەچێ، چونکە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ نە کوشتیانو نە هەڵیان واسی، ئینجا هەندێ لەو ڕایانە بە دوور دانراوەو هێندێ بەنزیك، لەناو ئەو ڕایانەدا دوانیان هەڵئەبژێرم کە دڵم پێیان بە ئارام ترە:

١- بەڕاستی من مرێنەری تۆمو ئەتمرێنم لەو کاتەی کە دیاریم کردووە بۆ مردنی ئاسایی خۆتو ڕێ نادەم کەس بت کوژێ، وە بەرزت ئەکەمەوە بۆلای شوێنێ بەرزو ڕێزگرتنی خۆم، یان بۆلای شوێنێ کە هیچ کەس دەسەڵاتی تیای دا نیە بێجگە لە خۆم، واتە ئاسمان کە وەك زەوی نیە، خوا دەسەڵاتی داوە بە بەندەکانی تیای دا.

٢- بەڕاستی من وەرگری تۆم لەزەوی، وەبەرز کەرەوەتم بۆ لای ئاسمان.

ئینجا لەبەر ڕووکەشو دیمەنی ئایەتەکەو لەبەر چەند حەدیسێکی صەحیح کە بەناو بانگن ئەبێ بڕوامان ببێ کە حەزرەتی عیسا بە لەشو بە ڕۆح بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمانو لە پاش دا دێتەوە بۆ سەر زەویو بەپێی ئەم شەریعەتی ئێمە ڕەفتارئەکاتو زۆر ئەکات لە گاورو جوولەکە بە موسڵمان بوونو بێجگە لەم ئایینی ئیسلامە دان نابێ بەهیچ ئایینێکی تردا، ئینجا هەرکەس سەریکاتەوە لە گونجانی شتی واو خۆیشی بە موسڵمان دابنێ، بەڕاستی ئەو کەسە زۆر جێی سەرسوڕمانە، چونکە ئەگەر موسڵمان بێ ئەبێ تێگەیشتبێ لە خوایەتی خواو بڕوای ببێ بە دەسەڵاتو توانای بێ سنووری خوا، دەی کەلەوە تێگەیشتبێ چۆن سەرئەکاتەوەو سەری سوڕئەمێنێ لەو جۆرە کارانە؟و چۆن بیرناکاتەوە لەوەی کە خوا هەرچۆنێ عیسای بەبێ باوك دروست کردو ئەو هەموو موعجیزەی دایە کە لە توانینی هیچ کەسێکدا نەبوونو دژو پێچەوانەی باوو ژیریی ئێمە بوون، هەروەها بۆ ئەو خوایە هیچی تێناچێ کە عیسا بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمانو لەپاش دا بیشی هێنێتەوە بۆ زەوی؟!

بەڕاستی بەتایبەتی لەم چەرخی ئێمەدا کە ئەبینین گەشت کەرە ئاسمانیەکان ئەچنو دێنەوە، کە گەشتو چوونەکەیان بەهۆی هێندێ لەو هێزو وزەو کەرەسانەوەیە کە خوا دروستی کردوونو ئادەمی ڕێیان پێبردوون! لەم کاتەدا قسەو بەسەرهاتێکی ڕابردووی خۆمم بیرکەوەتەوە بە جوانی ئەزانم گێڕانەوەی:

لەپێش سی ساڵی ڕابووردوو کە تازە لەم وڵاتەدا بوو بوو بەدەنگو باس کە بێگانەکان ئەیانەوێ بچن بۆ سەر مانگو هیچ کەس بڕوای نەئەکرد بەوەی کە شتی وا ئەگونجێ و زۆربەی خەڵکی لاقرتی لێ ئەهات لەو قسەو باسە، لەو چەرخەدا جارێ لەسەفەر ئەگەڕامەوە، لەم لای چەمچەماڵەوە شۆفێری ئۆتۆمۆبیلەکە وا دەرئەکەوت بێبڕوا بوو، لەبەرئەوە بە شێوەیەك وەك شتێکی زۆر گرنگی دەست کەوتبێ دژو پێچەوانەی ئیسلامو ئەیەوێ موسڵمانانی پێ دەم کوت بکات، ووتی: مامۆستا ئەوا خەڵکی ئەیانەوێ بچنەسەر مانگ، بێگومان هەرکەس لە ئیسلام تێگەیشتبێ بەو جۆرە ڕووداوانە دڵ بەهێزو دڵئارام تر ئەبێ، منیش سوپاس بۆ خوا بەو هەستە بەرزەوە وەڵامم دایەوەو ووتم: ئەوە شتێکی چاکەو قسەی ئێمە بەڕاست دەرئەکات، ئەویش سەری سورماو ووتی چۆن؟! وتم: ئێمەی موسڵمان ئەمە نزیکی هەزارو چوار سەد ساڵە ئەڵێین: دوو پێغەمبەرمان چووە بۆ ئاسمان، یەکێکیان چووو گەڕایەوەو ئەوی تریان هێشتا نەگەڕاوەتەوەو لە داهاتوودا ئەگەڕێتەوە، ئێمە ئەم هەواڵەمان دا ئەوەی کە نەفامو تێنەگەیشتوو بوو بڕوای نەئەکرد، تا ئەوا خوا بەڕاستی گێڕاو ڕوونی کردەوە بۆ نەفامان گونانجی شتی وا، دەست بەجێ وەك تۆپەڵەیە قوپبدرێ بە دەمی دا پەکی کەوتو قسەی نەما. خوای گەورە لەم ئایەتەدا موژدەی دا بە حەزرەتی عیسا بەچوار بەهرە: یەکەمو دووەم باس کران.

٣- ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ من پاك کەرەوەی تۆ ئەبم لەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، بەم ڕەنگە لەناویاندا ناتهێڵمو دوورت ئەخەمەوە لێیان.

٤- ﴿وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ئەوانەی کە شوێنی تۆ کەوتوون ئەیانخەمە لای سەرووی ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە پێت، واتە جوولەکە، هەتا ڕۆژی دوایی.

ئەگەر مەبەست بەشوێن کەوتووان هەر مەسیحی بێت کە شوێن کەوتوون لە بڕوا پێبوونو ویستندا وەك(ئیبنو جەریر) ڕیوایەتی ئەکات لە(ئیبنو زەید)ەوە، ئیتر با ئەو بڕواو خۆشویستنە خوا وەری نەگرێو عیسایش ڕازی نەبێ، ئەگەر ئەوە مەبەست بێت کە هەموو مەسیحیەکان ئەگرێتەوە، چ ئەوانەی کە لایان نەدا لە ڕێبازی عیساو چ ئەوانەی کە لایاندا، ئەوا شتێکی ئاشکرایە کە مەسیحیەکان لە هەموو جیهاندا زاڵبوونو سەرکەوتن بەسەر

جوولەکەدا، تا ئێستا و لە داهاتووشدا هەروا ئەبێ، بەڵکو جوولەکە خوا پرژو بڵاوی کردنەوە بە جیهاندا بە ڕیسوایی‌و سەرشۆڕی، بەجۆرێ بوون بەنموونەو چیرۆك بۆ داماویی‌و ژێر دەستەیی‌و کەساسی، لەم دواییەداو ئێستا کە کیام‌و میرییەکیان بۆ دروست بووە لە سایەو پەنای مەسیحیەکانداو بە یارمەتی هەموو میریەکانی ئەوان ئەوەیان دەستکەوت بووو هەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوان خۆیان نەکەن بە خاوەنیان بە هیچ ڕەنگ مانەوەو بوونیان نابێ، ئەگەر مەبەست هەر شوێن کەوتووە ڕاستەقینەکان بێت کە مەسیحیە ڕاستەکانی پێش ئیسلام ئەگرێتەوەو هەموو ئوممەتی ئیسلام تا ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەوەش مەبەست بێت هەر ئاشکرایە کە خوا ئەو بەڵێنەی بەدی هێنا، ئوممەتی ئیسلامی زاڵکرد بەسەر جوولەکەداو شێوەی گشتی هەر زاڵ بووەو هەر زاڵیش ئەبێ، نابێ ڕەخنەبگیرێ بەو میرییە بچکۆلەی کە چەند ساڵێکە لە فەلەستیندا پێك هێنراوە، چونکە یەکەم شتێکی ئاشکرایە کە ئەوە ئوردوگاو مەعەسکەرێکە کە هەموو دەوڵەتە بێگانەکان پێکیان هێنا بۆ خۆیان بە ناوی جوولەکەوە، بە یارمەتی هەموویان ڕاگیریان کردووە بۆ ژێر دەست کردن‌و داگیرکردنی موسڵمانان‌و وڵاتە پڕ لەخێرو بێرەکەیان، دووەم وەك ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوە شتێکی تایبەتیەو گشتی نیە، لەم جۆرە شتانەیش دا تەماشای شێوەی گشتی ئەکرێت، بە شێوەی گشتیش موسڵمانان هەر زاڵبوون‌و هەر زاڵیش ئەبن. ئینجا کاتێ ئێمە پێویستمان هەیە بەم شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە ئەگەر مەبەست بەو سەرکەوتن‌و زاڵبوونە کەلە بەڵێنەکەدایە، سەرکەوتن‌و زاڵبوون بێت لە ژیان‌و جیهاندا، ئەگەر مەبەست سەرکەوتن‌و زاڵبوون بێت لە تەرازووی خواداو لە بەهێزی‌و ڕاستی ئایین‌و بەرنامەدا، ئەگەر ئەمە مەبەست بێت وەك هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن، ئەوکاتە شتێکی ڕوونەو هیچ لێکۆڵینەوەی ناوێ کە ئایینی پاکی ئیسلام کە ئایینی خواپەرستیە بەڕێك‌و ڕاستی، ئایینێکە کە هەموو پێغەمبەرانی پێ‌هاتوون، ئەم ئایینە هەر بەرزو سەرکەوتوو بووە لە تەرازووی خواداو هەر زاڵبووەو هەر بەرزو سەرکەوتووو زاڵیش ئەبێ بەسەر هەموو ئایین‌و بیروباوەڕێکدا لە جیهاندا هەتا هەتایە، لەسەر ئەم بارە مەبەست بە وتەی(إلى يوم القيامة) نەبڕانەوەو هەتا هەتاییە، نەك دوا هاتن‌و نەمانی ئەو بەڵێنە لەو کاتەدا.

ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَٱلذِّكْرِ
ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن

لەپاش هەواڵدان بەوە، ئینجا هەواڵ ئەدا بە هەمووان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ ئینجا لەپاشان هەر بۆلای منە گەڕانەوەتان، واتە عیساو دواکەوتووەکانی و بێبڕواکان ﴿فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ ئینجا حوکم و بڕیار ئەدەم لەناوتاندا ﴿فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ لەوەی کە ئێوە دووبەرەکی کەوتن تیای دا، ئینجا ئەو حوکم و بڕیارە ڕوون ئەکاتەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ دووچاری ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا ـ واتە جوولەکە ـ ئەوانە سزایان ئەدەم بە سزایەکی بەتین لە جیهان و لە ڕۆژی دوایی دا ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾ نیە بۆ ئەوانە یارمەتی دەران کە بەرگری سزاکەیان لێ بکات. سزای سەختی ئەوانە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ جێگەی قسەو باس نیە بۆ هیچ بڕوادارێك، وەسزای جیهانیشیان زۆر ئاشکرایە لای هەرکەسێك کە شارەزا بێت لە مێژووی جوولەکە چ لەپێش ئیسلام و لەپاش هاتنی ئیسلام. ئەوەی کە بەسەر جوولەکە هاتووە لە کوشتن و بڕین و ئاوارە کردن و ڕیسوا کردن هەر وا بە ئاسانی نایەتە ژمارەو باس، هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجی کتێبەکانی مێژوو بدات، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێنا و کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ خوا کرێکانیان بە تەواوی پێ ئەدات و پاداشتی ئەو کردەوانەیان بە فراوانی ئەداتەوە ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ خواستەم

کارانی خۆش ناویێ، کەواتە هەموو کارو بڕیارێکی هەر دادەو بەجێیەو دوورە لە ستەم، دادیش داخوازە بۆ ئەوەی کە تۆڵەو پاداشتی ئەوانە بەو جۆرە بێت کەباس کرا.

تا ئێرە داستانی حەزرەتی عیسای هێنا، ئەو داستانەکەی کە دووبەرەکیو دەمەقاڵێی زۆری تیا کرا، ئینجا بە میهرەبانیەوە ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ)و بەدڵنیایی کردنی لەسەر ڕاستیو بەجێی ئەوەی کە بۆی باس کردووە، کەواتە بە هەموو ئارامیەکەوە وەری گرێو پشتی پێ ببەستێ، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمەی کە باس کرا لەبارەی عیساوە کە باسێکی بەنرخو گرنگە ﴿نَتْلُوهُ عَلَيْكَ﴾ ئەیخوێنینەوە بەسەرتدا لەسەر زمانی جوبرەئیل بە ڕێکو ڕەوانی ﴿مِنَ الْآيَاتِ﴾ لەو ئایەتانەی کە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونن لەسەر پێغەمبەرێتی تۆ، چونکە زانینیان بۆ تۆ ئەبێ هەر لە خواوە بووبێ ﴿وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ﴾ وە لەو قورئانەی کە لێ زانو داناو کاردروستەو بەجۆرێ ئەدوێ کە بەسە بۆ هەرکەسێك کە ژیرو تێگەیشتوو بێ، هەر بەو لێ زانیو کاردروستیە لەبارەی پەیدابوونی عیساوە بەبێ باوك شتێ ئەفەرموێ کە هەموو ژیرێ وەری ئەگرێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ﴾ بەڕاستی کاری پەیدابووی عیسا ـ کەسەر سوڕمێ لێی ـ بەلای خواوە وەك کاری ئادەم وایە، واتە هەرچۆنێ پەیدا بوونی عیسا بەبێ باوك دژو پێچەوانەی باوە، بەڵکو پەیدا بوونی ئادەم دژو پێچەوانەترە، چونکە ئەم بەبێ دایکیشە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ﴾ خوا دروستی کرد لە خاك، واتە لە پێشەوە قاڵبی لەشی دروست کرد لە خۆڵ، بەم ڕەنگە ـ وەك لە چەند ئایەتێکدا دەرئەکەوێ ـ خۆڵەکە کرا بەقوڕو مایەوە تابوو بە قوڕێکی ترشاو، ئینجا شێلرا تا بوو بەقوڕێکی مچ، ئینجا لەو قوڕە مچە جەستەو قەبارەی لەشی لەسەر ئەم شێوەی ئادەمیە پێك هێنرا بەبێ گیان تا وشكو ڕەق بوویەوە وەك سواڵەت، ﴿ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن﴾ لەپاش ئەوە پێی فەرموو ببە بەو گیانلەبەرە تایبەتیە

فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ
فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل
لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾

﴿فَيَكُونُ﴾ دەست بەجێبوو بەو گیانلەبەرە کە ئادەمە، واتە نابێ سەربکرێتەوە لە دروست کردنی عیسا بەبێ باوكو شتی وا بە نەگونجاو سەیر بکرێ لە کاتێکدا کە خوا ئادەمی باوکی هەمووانی دروست کرد لە خاك بەم جۆرەی کە باس کرا. بەڕاستی بەڵگەو رابەرێکی زۆر بەهێزە بۆ هەموو ژیرێك لە تایبەتی بۆ ئەو ئامەدارانە کە بڕوایان بوو بە دروست کردنی ئادەم لە خاك، بەبێ باوكو دایك، کەواتە ئەبوایە باشتر بڕوایان ببوایە بە دروست کردنی ببوایە بە دروست کردنی عیساو لە سنووری بەندەیی دەرنەکرایەو ئەو ئەفسانەو دەلەسەیان هەڵنەبەستایە بە دەوری ئەو پێغەمبەرەدا، یەکێ کردی بە کوڕی خوا، یەکێ تر کردی بەخوا، یەکێ تر بە جۆرێکی تر، ئەو هەمووەش لەبەرئەوە بوو کە باوکی نەبوو، ئا بەو جۆرە بەسوكو ئاسان قورئان مەسەلەکەی عیسای ڕوون کردەوەو ڕێی نەهێشتەوە بۆ گومانی هیچ گوماندارێك بە هیچ بارێکدا، دڵو دەروونی پاراو کردەوە بەو وتە کورتە، ئینجا فەرمووی: ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەوەی کەباس کرا بۆت هەر ئەوە ڕاستو دروستە لە کاتێکدا کە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە، ﴿فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ کەواتە لە گوماندارن مەبە، بێگومان هیچ کاتێ گومانو هیچ کاتێ گومانو دوو دڵی ڕووی نەکردووەتە پێغەمبەر(ﷺ) وە نگونجێ هەرگیز ڕووی تێکردبێ، بەڵام ئاڕاستە کردنی ئەو فەرموودەیە دووشتی گرنگی تیایە:

یەکەم: بەبیستنی ئەو فەرموودەیە پێغەمبەر(ﷺ) هەستو دەروونی ڕاچناو کەوتە بزووتنەوە، بەهۆی ئەوەوە بڕواو ڕووناکی دڵی بەهێزو بەتین تر بوو.

دووەم: ئاڕاستە کردنی ئەوە ئەبێ بەتەمێو ئاگادار کردنەوە بۆ هەر بڕیادارێکی تر کە وریای خۆی بێو دوورکەوێتەوە لە هەرستێ کە هۆی گومانو دوو دڵیە، بەکورتی ئەو

فەرموودەیە مایەی زیادە دامەزران و ئارامە بۆ دڵی پێغەمبەر(ﷺ)، میهرەبانی و لوتفە لەگەڵ بڕواداارانی تر بە پەندو ئاگادار کردنەوەیان. ئینجا لەم فەرموودەیەوە وەرئەگیرێ کە تا چ ڕادەیەك پیلان و فاك و فیکی بێبڕواکان بەهێزبووەو لەوانەبووە کاربکات لە هێندێ کەس لەو کاتەدا، وە بەربەست و بەرهەڵست بۆ ئەو جۆرە پیلانانە لە هەموو چەرخێکدا لەلایەن بڕوادارانەوە هەر دەست گرتنە بە ئایینە ڕاستەکەیانەوە بە ئارامی و دامەزراویەوە، باشترین چەك لەڕووی وژمناندا لە هەموو کاتدا هەر ئەو دەست پێوە گرتن و دامەزراویەیە، ئینجا لەم کاتەدا کە مەسەلەی عیسا و مەریەم بەو جۆرە ڕوون کرایەوە، ئیتر پێویست نامێنێ بەهیچ دەمەقاڵێ و لەسەر ڕۆیشتنێك، لەبەرئەوە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئیتر لەوبارەیەوە لێکۆڵینەوەو دەمەقاڵێیان لەگەڵ نەکات، ئینجا ئەگەر کۆتاییان نەهێناو ملیان شۆر نەکرد بۆ ئەو شتە ڕاست و ڕوونە ئەو کاتە بانگیان بکات بۆ(مباهلة) واتە هەردولا کۆببنەوەو بپاڕێنەوە لە خواو داوای نەفرین بکەن لێی بۆ هەرکام کە درۆزنە،ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ﴾ ئینجا هەرکەس دەمەقاڵێی لەگەڵ کردی لە بارەی عیساوە ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ لەپاش ئەو زانینەی کە بەسروش بۆت هات کە عیسا بەندەی خوایەو شایستەی خوایەتی نیە، وە پەیدا بوونی بەبێ باوك جێگەی سەر لێ کردنەوە نیە، هەرچۆنێ ئادەم کە بێ دایکیشە جێی سەر لێ کرنەوە نیە بەلای خۆیشتانەوە، ئەگەر پاش ئەوە هەرکەس بێدەنگ نەبوو و بڕوای نەهێنا ﴿فَقُلْ تَعَالَوْا۟﴾ بلێ پێیان وەرن ﴿نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ﴾ با بانگی کوڕانی ئێمەو کوڕانی ئێوە بکەین ﴿وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ﴾ ژنانی ئێمەو ژنانی ئێوە، ﴿وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ﴾ خۆمان و خۆتان، واتە هەرکام لە ئێمەو لە ئێوە بانگی دەستەو بەستەی خۆمان بکەین و هەموو پێکەوە بەرامبەری یەك بوەستین، ﴿ثُمَّ نَبْتَهِلْ﴾ لەپاش ئەوە بپاڕێینەوە لە خوا ﴿فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ بەم ڕەنگە لەعنەت و نەفرینی خوا بکەین لە درۆزنەکانمان. واتە: ئێمە ئەڵێین عیسا بەندەی خوایەو شایستەی خوایەتی نیە، ئێوەش ئەڵێن: خوایە یا کوڕی خوایە، دەی ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن با هەموومان لەعنەتی خوا بکەین لە هەرکاممان کە درۆزنە.

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾

پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بە گوێرەی فەرمانەکەی خوا بانگی کردن و ئەوانیش نەیانتوانی و ترسان و پێچیان تێهێنا وەك(ئەبو نعیم) ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە وتیان: لێمان بوەستە تا بیرێ ئەکەینەوە لە کاری خۆمان، ئینجا کۆبوونەوە لای دەمڕاس و ژیرەکەیان و وتیان: ڕات چۆنە؟ ئەویش وتی: بێگومان ئێوە ئەزانن کە محمد پێغەمبەرە، لەگەڵ تاقم و کەلێك لەگەڵ پێغەمبەرێکدا ئەوەی کردبێ تیاچوون و لەناوچوون، کەواتە وازی لێ بێنن و بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان، ئینجا کە هاتنەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی سێ ڕۆژیان لێ خواست و چوون و پرسیاریان کرد بە جوولەکەکانی مەدینە، ئەوانیش پێیان وتن سوڵحی لەگەڵ بکەن و ئەو(مباهلە) مەکەن، وتیان ڕاستە پێغەمبەرەو ئێمە لە تەوراتدا بۆمان دەرکەوتووە، ئەوانیش سوڵحیان لەگەڵ کردو گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

ئەگێڕنەوە کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ڕوویان دێت بە خۆی و حەزرەتی علی و فاطمة و حسن و حسینەوە -خوایان لێ ڕازی بێ- بەم ڕەنگە خۆی لە پێشەوەو حسینی بە باوەشەوەو دەستی حسنی گرتووەو فاطمة لەدوای خۆی و عەلیش لە دوایەوە -سەلامی خوا لە هەمووان بێت- سەرۆکەکەیان ئەڵێت پێیان: ئەی کۆمەڵی مەسیحی بە ڕاستی من چەند ڕوویەك ئەبینم ئەگەر داوا بکەن لە خوا کە شاخێکیان بۆ هەڵکەنێ لە جێگای خۆی لای ئەباو هەڵی ئەکەنێ، کەواتە(مباهلە)ی لەگەڵ مەکەن با لەناو نەچن، بێگومان ئەم ڕووداوەیش هەر موعجیزەو بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگینا ئەوانە ئەهاتنە مەیدان و سەرپێچییان نەئەکرد لەو(مباهلە)یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە شتەکەیان بۆ ڕوون بوو موسڵمان نەبوون لەبەر پارێزگاری ئەو ڕێزو سەرۆکایەتیەی کە بوویان لەناو گەلەکەیاندا!!

﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ﴾بەڕاستی ئەمەی کە وترا لەبارەی عیساوە هەر ئەوە داستانێکی ڕاستە، نەك ئەو هەموو ئەفسانەی کە مەسیحیەکان دەستهەڵبەستیان کردووە، وە نەك هەر

قسەو باسێکی تر کە وتراو یا بوترێ لەبارەی عیسای پێغەمبەری کوڕی مەریەمی پاکی خواناسەوە -سەلامی خوایان لێ بێت-.

دانانی عیسا بە خوا یا بە کوڕی خوا درۆیەو ناگونجێو خوا تاکو تەنیایە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ هیچ پەرستراوێکی ڕساتەقینە نیە بێجگە لەو خوایە کە ناوی(الله)یە، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی بێگومان هەر خوا زاڵی کاردروستە، کەواتە هەر خوا خوایە، ئینجا هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) ناکەون، بڕوا ناهێننو مل کەچ ناکەن بۆ ئەم ئایەتانە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ئینجا ئەگەر ئەوانە ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾ بێگومان خوا زاناو ئاگادارە بە خراپەکارو شێوێنەرەکان، واتە ئەگەر ئەوانە هەر هاوبەشێك بۆ خوا ڕەوا بدەن بێگومان ئەوانە خراپەکارو تێکدەرن، خوایش ئاگایە بەوانەو بەسەریاندا تێپەڕ ناکاتو تۆڵەی شایستەیان لێ ئەسێنێ. بەڵێ بێگومان هەرچی خراپەو ستەمو لاری کە لە جیهاندا ڕووی داوەو ڕوو ئەدات هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ لادان لە پەرستنی خوا بە تەنیاو بەبێ هیچ هاوبەشێك. بێگومان کاروباری ئەم بوونەوەرە ناڕوا بەڕێوە بە تەنیا خوایەك نەبێ، ئەگەر زیاد لە یەك خوا کاربەدەستی بێت ئەشێوێ بە مل یەکدا، دەی هەروەها ئادەمیش کەلەم بوونەوەرەدا ئەبێ کاروباری ژیانیشی بەبێ بەرنامەکەی خوای تاکو تەنیا لارو خێچو پڕ لە ستەمو ناڕەوایی بێت، کاتێ بەختەوەر ئەبێت لە هەر دووجیهاندا کە هەر بەندەی خوا بێت، فەرمانبەرو گوێڕایەڵی تەنیا خوابێت، دەستوورو یاساو بەرنامەی ژیانی تەنها لە خواوە وەرگرێ.

لەهەر چەرخو لە هەر وڵاتێکدا هەر قەندەیەك لە بەندەکان، یان هەر تاقمو کۆمەڵێك لافی ئەوەیان لێ دا کە مافی ئەوەیان هەیە یاساو بەرنامە دابنێن لەلایەن خۆیانەوە بۆ مەردوم، مافی ئەوەیان هەیە لەبەر خودی خۆیان گوێڕایەڵی بکرێن لەلایەن مەردومانەوە، ئەو کەسە یا ئەو کۆمەڵە لە ڕاستی دا لافی خوایەتی لێ ئەدا، ئیتر با بەدەم وەك فیرعەون نەڵێ: من خوای ئێوەم.

﴿قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٦٤﴾

ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە شتێکی سەرەکی و بنەڕەتیە لە ئیسلامدا، جا لەبەرئەوە زۆر بە گرنگ گیراوە لە ئیسلامدا، لە زۆر ئایەت و حەدیسدا باس کراوە و ئاماژەی بۆکراوە، یەکێ لەو شوێنانە ئەم ئایەتەیە کە هێنای بە دوای ئەو هەڕەشەی کە کردی لێرەدا لە خراپەکاران و تێك دەران، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان ـ چ گاور چ جوولەکە ـ ﴿تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ﴾ وەرن بۆلای یەك وتە کە یەکسانە لەنێوان ئێمە و ئێوەدا و هەموویان یەکسانێ تیای دا، هەموو نامەکانی خوا و پێغەمبەرەکانی لەسەر ئەوە و هەر بەوەوە هاتوون، ئەو تەنیا وتەش ئەمەیە: ﴿أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ کە هەر خوا بپەرستێن و بێجگە لەو هیچ شتێکی تر نەپەرستێن ﴿وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا﴾ وە هیچ شتێ نەکەین بە هاوبەشی لەو پەرستنەدا، نە ئادەمی و نەدار و نە بەرد و نە مانگ و ئەستێرە و نەهیچ شتێ، یان مەبەست ئەوەیە هەر خوا بە شایستەی پەرستن بزانێن و هیچ کەس نەکەین بە هاوبەشی لەو شایستەییەدا، نەڵێین هیچ کەسێکی تر خوایە وەك مەسیحیەکان ئەو هەڵەگەورە ئەکەن لە عیسا و دایکی دا، وە نەڵێین: هیچ کەس کوڕی خوایە وەك جوولەکە و گاور ئەیڵێن دەربارەی عوزەیر و عیسا، ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ﴾ هێندێکمان هێندێکی ترمان نەکات بە پەروەردگاری و تێپەڕبکات لە پەروەردگاری تەنیا کە ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾یە، واتە با هیچ کام لە ئێمە گوێڕایەڵی ئەوی ترمان نەبێت لە هەموو کار و کردەوەیەکدا کە خوا ڕەوای نەدابێ، وەك(ئیبن و جوریج) ئەفەرموێ و حەدیسی(ترمزی)ش ئەو مەبەستە بەباشی ئەگەیەنێ کە ئەفەرموێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە(عەدی کوڕی حاتەم) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەوانەمان نەپەرستووە، ئینجا پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەوان ـ واتە زانا و عابیدەکان ـ شتیان حەڵاڵ و حەرام نەئەکرد و ئێوەش بەقسەتان ئەکردن؟ ئەویش ووتی: بەڵێ ئەوەمان ئەکرد. ئینجا پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

مەبەستی ئایەتەکە ئەو گوێ ڕایەڵی و بە قسەکردنە، بە یارمەتی خوا ئەم مەبەستە ڕوون ترو بەدرێژتر دێت لە سورەتی ﴿التوبة﴾دا.

پێویستە بەووردی بیربکرێتەوە لە شیرینی ئەم تەمێ و ئامۆژگاریەی کە قورئان پێی هەڵساو بەکاری هێنا لەگەڵ نامەدارەکاندا، لە لێکۆڵینەوەو دەمەقاڵێدا ئەوپەڕی کاردروستی و لێزانی بەکار هێنا لە ڕێنموونیاندا، بەم ڕەنگە بەرەبەرە هێنانی و پلەپلە لەگەڵ بەرزبوویەوە، ئەوەتا لە یەکەمجارەوە بەسەرهاتی عیسای هێناو باسی کرد بۆیان کە هەرکام لەو بەسەرهاتانە دژی خوایەتیەو ناگونجێ لەگەڵی، ئینجا باسی کرد کەچۆن عیسا بانگی مەدرومی کردووە بۆ ئیسلامو ئایینی پەرستنی خوا بەتاكو تەنیا، ئینجا کاتێ هەر مل پێچیان کردو موسڵمان نەبوون بانگی کردن بۆ(مباهلە) وەك بەدرێژی باس کرا، ئینجا کاتێ زاتیان نەبوو ئەوە بکەنو خۆیان لادا لێی، وە هێندێ ما کەچیان نیشاندا، لەم کاتەدا ئەم بانگ کردنە شیرینەی ئاڕاستەکردن لەم ئایەتەدا، کە بەڕاستی هەرکەس سەرکێشو بەدبەختو چارە شەڕ نەبێ هەرگیز مل پێچی ناکاتو دێت بەدەم ئەم بانگ کردنەوە، چونکە ئەوپەڕی ڕاستی و دادی تیا بەکارهێناوە، ئەوەتا بانگیان ئەکات بۆ شتێ کە عیساو ئینجیلو هەموو نامەو پێغەمبەرانی تری لەسەرە، بانگیان ئەکات بۆ ئەو دوو وتە پیرۆزە کە هەمووانی تیا یەکسانە بەبێ جیاوازی، پێغەمبەریشی تیا جوێنەکردەوە(ﷺ)، هیچ باوێکی ئەوو شوێن کەوتووەکانی نەداوە بەسەر ئەوانو هیچ کەسێکی تردا، بەڵکو هەمووانی بە یەك کۆمەڵو یەك وەجبە گێڕاوە بە بەندەی خوا.

لەپاش ئەوە ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان کردە ئەم بانگکردنە، ﴿فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ ئەو کاتە ئێوە ـ واتە پێغەمبەرو موسڵمانان ـ بڵێن بە نامەدارەکان: ئێوە شایەتی بدەن کە ئێمە موسڵمانین، واتە دژو دوورین لە ئێوەو لە بیروباوەڕتان، بەهیچ کلۆجێ یەك کەوتنو گەشیتن بە یەکمان نابێ لەگەڵتان، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست بەم فەرمانە دەرخستنی دەستە پاچەییانە لەو لێکۆڵینەوەو دەمەقاڵێدا، وە ناچارکردنیان بەوەی دان بنێنو شایەتی بدەن لەسەر موسڵمانێتی ئەمان نەك خۆیان، وەك باو وایە هەرکەس زاڵبووو سەرکەوت، ئەڵێ بەوی تر: دان بنێ بەزاڵی و سەرکەوتنم بەسەرتدا، هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست لەکەدارەکردنی ئەوانە بەبێ بڕوایی و لادانیان لە ئایینی خوا، چونکە ئەم دوو تاقمە دژی یەکترن دەی هەرکامیان لەسەر ڕاستی بێت ئەبێ ئەوی تر لەسەر بێبڕوایی و ناهەقی بێت.

به هەرحاڵ و لەسەر هەر بار شتێکی ئاشکرایە لە ئایینی پاکی ئیسلامدا کە پێویستە لەسەر موسڵمانان بە خۆیان و بیروباوەڕو یاساو ڕژێم و ڕەوشتی خۆیانەوە بوەستن بەرامبەر هەر بیروباوەڕو یاساو ڕژێم و بەرنامەیەکی تر لە جیهاندا بەبێ تێکەڵ کردن و یەك کەوتن و پرد بەستن لە بەینیدا، ئەگەر موسڵمانان بەو جۆرە بوون، ئەوا بەڕاستی موسڵمانن ئەگینا ئەوە نین کە خوا ئەیەوێ و داوای ئەکات، ئیتر هەرچەند بەدەم لافی موسڵمانێتی لێ بدەن، ئینجا لە چوارچێوەی ئیسلام دا ئەمێننەوە، بەم ڕەنگە هەرشتێ کە غەیرە ئیسلامی بێت بەدڵ خراپی دابنێن و ڕازی نەبن پێی، یا هەر لە چوارچێوەکەشی دەرئەچوو، بەم ڕەنگە هەر شتێکی ئیسلامی بەڕاست نەزانن و ڕازی بن بەشتی غەیرە ئیسلامی؟ بێگومان ئیسلام بریتیە لە ئازادی و سەربەستی تەواو لە هەموو بەندەییەك، بێجگە لە بەندەیی بۆ خوا، مەردوم تەنها لەسایەی ڕژێمی ئیسلام دا ئازادی و سەربەستی وەرئەگرێ ئیتر لە ژێر سایەی هەر ڕژێمێکی تری زەمینیدا ئازادی و سەربەستی نیە، چونکە لە هەرکام لەو ڕژێمانەدا ئەبێ بەندە بێ بۆ دروست کراوێکی تری وەك خۆی، ئیتر لە بەرزترین دیموکراتیەوە بیگرە تا پەست ترین ڕژێمی دیکتاتۆری، واتە لە هەرکام لەو ڕژێمانەدا ئەبێ گوێڕایەڵ و مل کەچ بێت بۆ یاساو دەستوورێك کە دەست کردی یەکێکە یا چەند کەس و کۆمەڵێکی ئادەمی وەك خۆی، بەڵام لەژێر سایەی ئیسلامدا هەموو بۆچوون و ڕژێم و یاساو بەرنامەو دەستورێکی لە خوا وەرئەگرێ کە خوای هەموانە، وە بەرنامەو یاساو دەستوورەکەشی بۆ هەموانەو هەموو تیای دا یەکسانن!

ئەو ئیسلامەی کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی و هەر ئەوەیشە بەلای خواوە، وە هەموو پێغەمبەران پێی ڕەوانە کراون، ئەو ئیسلامە ئەبێ بەو شێوەیە بناسرێ و وەرگیرێ، نابێ بە هیچ کلۆجێ تێکەڵی هیچی تر بکرێ و نابێ نیشانەو دروشمی بەندەیی بۆ غەیری خوا تیا بێت، وەك نێرراوی موسڵمانەکان ڕوونی کردەوە بۆ(یەزدی جورد) و کوڕەکەی کە فەرمووی: خوا ئێمەی ناردووە بۆئەوەی بەم ئایینە خەڵکی لە پەرستنی بەندەکانی خوا بۆلای پەرستنی خوا بە تەنیا، دەریان بێنین لەستەمی ئایینەکانی تر بۆ دادو دادپەروەری ئیسلام، جا هەرکەس پشت لەم ئیسلامە هەڵکات، ئەوا بە شایەتی خوا ئەو کەسە موسڵمان نیە، ئیتر با بەدەم هەر لافێك لێ بداو هەر پینەوپەڕۆیەك بکات!

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞۚ

لێره به دواوه سهر ئایهتی(٩١)و دوایی جزمهکه ههر خهریکه به مهبهسته سهرهکیهکهی لهموبهرهوه که بریتیه له لێکۆڵینهوهو بهربهرهکانێ لهگهڵ نامهدارهکاندا لهبارهی عهقیدهو بیروباوهڕهوه، لهبارهی ئهو ههموو تێکۆشان و فروفێڵ و پیلان و درۆو دهلهسهی که لهلایهن دوژمنهکانی ئیسلامهوه بکار ئههێنرا بۆ بهربهست کردنی ئهم ئایینه پیرۆزه، لهبارهی نیازی بهدو خراپیان دهربارهی ئهم ئوومهته، ئینجا بهرهنگاری کردنی قورئانبۆ ئهو ههموو کردهوهو نیازه بهدهی ئهوانه، به ڕوون کردنهوهی ئهو ئایین و باوهڕه ڕاستهی که بڕوادارانی لهسهره، ئهو عهقیدهو باوهڕه ناڕاستهی که ئهو دوژمنانهی لهسهره، وه ئاشنا کردنی بڕواداران بهو دوژمنانه تا وریاو خۆپارێزهری خۆیان بن و دووچار نهبن بهو دوژمنه کۆڵ نهدهرهیان.

له یهکهم جارهوه دهست پێئهکات به ڕوون کردنهوهی پڕوپووچی هەڵوێستیان بهرامبهر به حهزرهتی ئیبراهیم که جوولهکهکان ئهیان ووت: ئیبراهیم یههودی بووه، گاورهکانیش ئهیان ووت: نهسرانی بووه، له کاتێکدا که ئیبراهیم(علیه السلام) له پێش تهورات و ئینجیل و یههودو نهسرانی دا بووه به چهند چهرخێك،(محمدی کوڕی ئیسحاق) ههواڵێ ئههێنێ له(ئیبن و عهباس)هوه -خوا لێیان ڕازی بێ- که فهرموویهتی: نهسرانیهکانی نهجران و زاناکانی جوولهکه کۆبوونهوه لای پێغهمبهر(ﷺ)، ئینجا دهستیان کرد به ئاژاوهو دهستیان کرد به ئاژاوهو دهمهقاڵێ، بهم ڕهنگه جوولهکهکان ئهیان ووت: ئیبراهیم یههودی بووه، گاورهکانیش ئهیان ووت: نهسرانی بووه، ئینجا خوایش ئهم ئایهتهی نارده خوارهوهو فهرمووی: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئهی نامهدارهکان ﴿لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئایا ئێوه دهمهقاڵێ ئهکهن له ئیبراهیمدا ﴿وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ﴾ له کاتێکدا که تهورات و ئینجیل

ئەمێنراونەتە خوارەوە لەپاش ئەو نەبێ ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ژیر نین‌و تێناگەن لە ناڕاستی قسەکەتان؟ واتە ئەوەی کە ئەڵێن پێچەوانەی ژیرییەو هەر بە گەڕانەوە بۆلای مێژوو دەرئەکەوێ کە پرووپووچ‌و بێ بنەوانە، کەواتە چۆن قسەی وا ئەکەن؟!

ئەگەر کەسێ ئەڵێ ڕەنگە مەبەستیان ئەوە بووبێ کە ئیبراهیم لەسەر ئایینێ بووە کە هەر یەهودێتی یان نەسرانێتی ئەگرێتەوە، دەی ئەگەر ئەوەیان نیاز کرد بێ، قسەکەیان دژی ژیریی نیەو ئەگونجێ لەگەڵ دواکەوتنی هاتنە خوارەوەی تەورات‌و ئینجیل لە ئیبراهیم، کەواتە چۆن بەو جۆرە بەرپەرچ درانەوەو بە نەفام دەرکران؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەگەر نیازیان ئەوە بوایە ئەو کاتە ئەیان ووت: یەهودێتی یان نەسرانێتی هەر ئەوەیەکە ئیبراهیمی پێڕەوانە کراوە، نەك ئیبراهیم یەهودی یان نەسرانی بووە، وەك بۆ ئەم ئوممەتە ئیسلامە ئەوترێ: لەسەر میللەتی ئیبراهیمە، بێجگە لەوەش خوا کە ئاگادارە بە هەموو نیازو بە هەموو شتێ‌بەم جۆرە بەرپەرچ داونەتەوە کە وانیشان ئەدات ئەو نیازەیان نەبووبێ، ئەگەر ئەو نیازەیان بکردایە بە شێوەیەکی تر بەرپەرچی ئەدانەوە بەم ڕەنگە ئەیخستنەوە بەدرۆوە لەو یەکسانیەی کە ئەمان لافیان لێ ئەدا لەنێوان یەهودیەتی یان نەسرانێتی لەگەڵ ئایینی ئیبراهیم.

لەپاش ئەو دەم کوت کردنە ئینجا هەمیتر بێزاری دەرئەبڕێ لێیان‌و دەمەقاڵێ‌کەیان بەبێ نرخ دەرئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ بێداربنەوە ئێوە ئەوانەن ﴿حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ﴾ کە دەمەقاڵێیان کرد لە شتێکدا کە هێندێکتان لێ ئەزانێ، وەك لە بارەی موساو عیساو ئەو شتانەی کەلە تەورات‌و ئینجیلەوە وەرتان گرتووە، واتە دەمەقاڵێ لە شتێکدا کە لافی زانینی لێ ئەدەن، بە هەرحاڵ: ﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞۚ﴾ ئەی بۆچی دەمەقاڵێ ئەکەن لە شتێکدا کە هیچ جۆرە زانینتان نیە پێی، وەك باسی ئیبراهیم‌و ئایینی ئیبراهیم، واتە دەمەقاڵێتان لە شتی ئاوادا زۆر بێ‌جێیەو بێجگە لە دەمبازی‌و قسە بەشەڕدان هیچی تری تیا نیە!! بێگومان هەرکەسیش بەو جۆرە بێت قسەی وەرناگیرێ‌و شایستەی ئەوە نیە گوێ بۆ قسەی بگیرێ.

وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا
وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٦٧﴾

**لەپاش ئەوەی قسەی ئەوانی بێنرخ دانا لە بارەی ئیبراهیمەوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ خوا ئەزانێ و ئێوە نازانن، خوا ئەوە ئەزانێ کە ئێوە دەمەقاڵێی تیا ئەکەن لەبارەی ئیبراهیمەوەو ئێوە نایزانن و لە خۆتانەوە دەم ئەکوتن، ئینجا ئەوەی خۆی ئەیزانێ لەوبارەیەوە باسی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا ﴾ ئیبراهیم نە جوولەکە بووەو نەگاور ﴿وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا ﴾ بەڵکو لادەرو پشت هەڵکەر بووە لە هەموو ئایین و بیروباوەڕێکی لارو چەوت، ﴿مُّسۡلِمٗا ﴾ مل کەچ و گوێڕایەڵ بووە بۆ خوای تاک و تەنیا ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ لە هاوبەش بڕیار دەران نەبووە، بێگومان سیفەتی یەکەم و دووەم: ﴿حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا ﴾ ئەمە سیفەتی سێیەمەش ئەگرێتەوە بە ڕوونی، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بە تایبەتی باسی ئەکات و ئەیهێنێ بەدوای ئەو دووانەدا، لەوەوە چەند شتێ وەرئەگیرێ:**

**١- ئەو پەڕی دووری و دژایەتی ئیسلام نیشان ئەدات لەگەڵ هاوبەش ڕەوادان و بت پەرستی دا، بەجۆرێ هەرگیز یەك کەوتنیان نابێ، نابێ ئیسلام تێکەڵی هیچ جۆرێ لە جۆرەکانی بت پەرستی و هاوبەش دنان بکرێ.**

**٢- پلار دانی تیایە بە گاورو جوولەکەو ئاماژە ئەکات بەوەی کە ئەو دووانە لایان داوە لە ئایینی خواو گەڕوان بە هاوبەش بڕیادەر، کەواتە ناگونجێ ئیبراهیم لە هیچ کام بێت.**

**٣- بت پەرستەکانی قوڕەیش دەم کەوت ئەکات کە لافی شوێن کەوتن و پەیڕەوی ئیبراهیمیان لێ ئەداو ئەیان وت: ئێمە لەسەر ئایینی ئەوین و قاپیەوان و کلیل داری خانەی خواین کە ئەو دروستی کرد.**

ئەی ماتووڵ ئیبراهیم(علیه السلام) بەو جۆرە بووە كەباس كرا، كەواتە بۆ هیچ كام لەوانە نیە لافی دۆستایەتی و یەكێتی و شوێن كەوتنی ئیبراهیم لێ بدەن لە كاتێكدا كە ئەوانە دوورن لە عەقیدەو ئایینی ئیبراهیمەوە، بێگومان لە ئایینی ئیسلامدا یەكەم پەیوەستی و هۆی یەك گرتن و كۆبوونەوە ئەبێ عەقیدەو ئایین بێت، كاتێ ئەوە پچڕا هیچ پەیوەستیەكی تر نامێنێ و ئەپچڕێ، پەیوەستی خزمایەتی و نەژاد، پەیوەستی ڕەنگ و تیرەو بەرەو خاك و نیشتمان، چونكە ئادەمی بەلای ئیسلامەوە بەهۆی ئەو گیان و ڕۆحی تایبەتیەوە بووە لەو ئادەمیەو جوێ بووەتەوە لە گیان لەبەرەكانی تر، خۆراك و پێ بژێوی ئەو گیان و ڕۆحەش عەقیدەو ئایینەكەیەتی، جا لەبەرئەوە ئەبێ یەكەم پەیوەستی و هۆی كۆبوونەوەی ئادەمی عەقیدەو ئایین بێت، نەك شتێكی تربێت كە گیان لەبورانی تری تێدا بەشداره، كەواتە هەركەس بەشداری ئیبراهیم بێت لە عەقیدەو ئایینەكەی دا ئەو كەسە دۆستی ئەوەو لە كۆمەڵی ئەوە، وەكو ئامارەی بۆ ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ﴾ بەڕاستی تایبەتی ترو شایستەترو نزیك تر لە ئیبراهیمەوە ﴿لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ﴾ ئەوانەن كەلە كاتی خۆی دا پەیرەوی ئیبراهیمیان كردووەو شوێنی كەوتوون، ﴿وَهَٰذَا النَّبِيُّ﴾ ئەم پێغەمبەرە بەتایبەتی ـ واتە محمد(ﷺ)ـ چونكە شەریعەتەكەی ئەم لەگەڵ شەریعەتەكەی ئەودا ڕێكترو نزیك ترە لە شەریعەتەكانی تر، ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەن كە بڕوایان هێناوە بەم پێغەمبەرە(ﷺ) ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾ خوایش دۆستی بڕوادارانە، كەواتە هەموو بڕواداران یەك كۆمەڵەت هەر لە یەكەم و سەرەتای ئادەمیەوە تا دواترین كەس لەم جیهاندا، هەموو یەك ئوممەتە بەبێ جیاوازی ڕەنگ و زمان و نیشان و تیرەو بەرەو بنە ماڵە، كۆمەڵ و تاقمی خوا هەر بڕوادارانەو ئەبێ ئەوانیش دۆست و خۆشەویستیان هەر خوا بێت و هەركەس كە خوا ڕازی بێ بەدۆستایەتی و خۆشەویستیەكەی.

بەرزترین شێوەی كۆو كۆمەڵ ئەوەیە كە ئیسلام نەخشەی كێشاوە، هەر ئەوەش شایستەو شیاوە لەگەڵ ئەم ئادەمیەدا كەلە بنەڕەتدا هەموو لە یەك باوك و دایكن، كەواتە زۆر ناڕاست و نارەوایە جیا بكرێنەوەو تاقم تاقم بكرێن و بەربەست و پەرژین لە بەینی

تاقمەکانی دا پەیدا بکرێ، بەربەست و پەرژینی ڕەنگ و زمان و نیشتمان و هەروەها هەر شتێکی تر کە بە دەسەڵات و هەڵبژاردنی خۆیان فەراهەم نەهاتوون، بۆ وێنە: گەل عەرەب یا گەل کرد یا هەر گەلێکی تر بە دەسەڵات و هەڵبژاردنی خۆیان نەبوون بەو گەلە تایبەتیانە، کە هەرکام شێوە و ڕەنگێکی تایبەتی و زمانێکی تایبەتی و نیشتمان و وڵاتێکی تایبەتی هەیە، ئەو بارو حاڵەتانە هەر چۆنێ بە دەسەڵات و هەڵبژاردنی خۆیان پێغەمبەر ەیدا نەبوون، هەروەها داڕنین و جوێ بوونەوە لە هێندێکیان بە هیچ شێوەیە ناگونجێ، ئەوەش وەك ڕەنگ و تیرە و نەتەوە. وەهێندێ تریان دەست ئەدات و ئەگونجێ، بەڵام زۆر ئەرك و زەحمەتی ئەوێ، ئەوەش وەك زمان و نیشتمان. کەواتە پێك هێنانی گەل و کۆمەڵی ئادەمی لەسەر بنەڕەتی ئەم جۆرە شتانە، هەرچۆنێ دژو ناشایستەیە لەگەڵ یەکێتی ئادەمی لە بنەڕەتەکاندا، هەروەها دژی یەك گرتن و کۆبوونەوەی هەموانە و مایەی دووبەرەکی بوون و یەك نەگرتنی هەمیشەییانە، چونکە ئەو جۆرە شتانە هەمیشە هەن و ئەبن بە بەربەست و پەرژین و دووبەرەکی دروست ئەکەن، بەڵام ئەگەر گەل و کۆمەڵ ـ وەك ئیسلام فەرمان ئەداـ لەسەر بنەڕەتی عەقیدە و بڕوا دامەزرێ، بێگومان هەموو جۆرە ڕەگەزایەتیەك کە لە ڕیشە ئەهێنێ و ئەو هەموو شتانەی کە ئەکرێن بە بەربەست و پەرژین لە چەرخ و سەردەمەکانی نەفامی یەکسەر لائەبات و ڕێگە پاك ئەکاتەوە لە هەر دڕك وداڵێ و هەموو بڕواداران ئەکات بە یەك لەش و جەستە و جیاوازی نەتەوە و زمان و نیشتمان و هەر شتێکی تر دوور ئەخاتەوە لە بەرچاو و لە هەست و لە دەروونـدا!! بێجگە لەوانە هەموو عەقیدە و بڕوا شتێکە کە بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی مەردوم پەیدا ئەبێ، ڕێکە لەگەڵ ئازادی و سەربەستی ئادەمیدا، وە پەیوەندی هەیە بە بەرزو بەڕێزترین بەشی ئادەمیەوە کە ئەو گیانە تایبەتیەیە خوا پێی داو بەوە ڕێزداری کردو باوی دابەسەر زۆر لە دروست کراوەکانیدا، بەڵکو خۆراك و پێ بژێویەتی و بەبێ ئەو عەقیدە و بڕوایە ئەو گیانە مردووە، کەواتە کۆبوونەوەی ئادەمی لەسەر ئەو عەقیدە و بڕوایە و داڕشتنی گەل و کۆمەڵ هەر لەسەر ئەو بنەڕەتە ڕاست و ڕەوایە و بێجگە لەوە لادان و ترازانە لە ڕێی ئادەمیێتی، کەواتە با ئادەمی بیرێك بکاتەوە لە خۆی و بە ئادەمیێتی بژی، کۆببێتەوە لەسەر خۆراکی گیانی و نیشانەی دڵی و دروشمی هەستی.

وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٩﴾
يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ
ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ
أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ

---

ئینجا بڕواداران ئاگادار ئەکات بە نیازو ئامانجی بەدو خراپی نامەدارەکان دەربارەیان، پیلان‌و تەدبیرە پیسەکانیان دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ دەستەیەك لە نامەدار ـ واتە سەرۆك‌و زاناکانیان ـ بەدڵ حەزی کردو پێی خۆش بوو ﴿لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ﴾ گومراتان بکەن‌و بتانگێڕنەوە بۆلای بێبڕوایی، ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوانە هەر خۆیان گومڕا ئەکەن، چونکە بەوە زیاتر دوور ئەکەونەوە لە ڕێی ڕاست‌و تاوانیان گەورەتر ئەکەن، کەواتە باشتر خۆیان ئەخەنبەر خشمی خواو خۆیان دوورتر ئەخەنەوە لە بەزەیی خوا، ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ﴾ ئەوانە هەست ناکەن‌و تێناگەن کە کارەکەیان بە زیانی خۆیان تەواو ئەبێ، موسڵمانان ئەگەر ڕێك‌و دامەزراو بن لەسەر ڕێی خۆیان خوا چارەسەری هەموو کارێکیان ئەکات، هەر پیلانێکیان لێ بکرێ خوا ئەیگێڕێتەوە بۆ سەر پیلان‌و گێڕەکان. ئینجا هەڵوێستی ناڕەوایان ئەدا بە ناو چاویانداو لە کەداریان ئەکات پێی، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان ﴿لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بۆچی بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانی خوا کەلە قورئاندا هاتووە ﴿وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ﴾ لە کاتێکدا بەهۆی تەورات‌و ئینجیلەوە ئەزانن کە ئەو ئایەتانە ڕاستن‌و پێویستە بڕوا پێ‌هێنانیان؟ یا بۆچی بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانی خوا لە تەورات‌و ئینجیل دا کە بەڵگەو نیشانەن لەسەر ڕاستی تەورات‌و ئینجیل، یا لە کاتێکدا کە ئەزانن‌و ئەبینن ناونیشان‌و سیفەتی محمد(ﷺ)؟

ئەم نامەدارانە لەکاتی خۆی دا ـ وەتا ئێستاش ـ ئەزانن‌و ئەبینن ئەو ڕاست‌و ڕێکیەی کەلەم قورئانەدا هەیەو هاتووە، چ ئەوانەیان کە شارەزا بوون لە نامەکانی خۆیانداو ئاگادار بوون بەسەر ئەو مـوژدەو نیشانانەی کەلـەو نامەیانـەدا هـاتبوون دەربـارەی ئـەم ئـایین‌و پێغەمبـەرە(ﷺ)، وەهێنـدێ لەوانـە بـەڕێکی دانـی نـا بـەو شـتە ڕاسـتەدا، وە هێنـدێ هـەر موسڵمان بوون‌و موسڵمانێتی خۆی دەربڕی، جا چ ئەو شارەزایانەو چ نەشارەزایانیش لەو نامەیانەدا هەر ئەزانن، چونکە ئەم ئایینە ئەوەندە ڕاست‌و ڕێك‌و ڕوون‌و ڕەوانە هەرکەس ژێر بێت هەست ئەکات‌و لە دڵەوە ئەزانێ کە ئایینی خوایەو ڕاستە، بەڵام بەداخەوە ئەوەی کەلە دڵی دایەو ئەیزانێ دەری نابڕێ‌و جاڕی موسڵمانێتی نادا، لەبەرئەوەی کە بەرژەوەندیەکی لەدەست دەرئەچێ، یالووت بەرزەو نەفسی ڕێی نادا، یا حەسادەتی هەیەو داخ لەدڵە، جا ئەوا قورئان بانگی کردن‌و ئەو هەڵوێستە ناڕاستەی دا بە ناوچاویاندا، هەروەها بانگێ تریان لێ ئەکات‌و ئابڕوویان ئەبات بەوەی کە بەفڕو فێڵ‌و دەلەسە هەق‌و ڕاستیەکە ئەشارنەوەو ئەیانـەوێ سـەر تێـك بـدەن لـە مـەردوم، ئەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئـەی نامادارەکـان ﴿لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ بۆچـی ڕاسـت ئـەگۆڕن‌و پۆشـاکی بـە تـاڵ‌و ناڕاسـتی ئەکـەن بـە بـەردا ﴿وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾ ڕاسـت ون ئەکـەن‌و ئەیـشارنەوە، وەك ڕاسـتی پێغەمبـەرێتی‌و نیـشانەکانی پێغەمبەرمان(ﷺ)، ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا کـە خۆیـشتان ئـەزانن‌و بەدەستی قەست ئەوە ئەکەن ئەوەش ئەوپەڕی ناڕاستی‌و نالەباریە.

ئەم کارو کردەوە پیسەی ئەوان کە قورئان بێزاری لێ دەربڕی لە یەکەم جارەوە هەرئەوە ڕەوشت‌و پیشەیانە هەتا ئێستاو لە داهاتوویشدا هـەر وا ئـەبن، لە یەکەم جارەوە جوولەکە دەستیان پێکرد، ئینجا سەلیبیەکانیش بە دوایاندا!

لەم ماوە دوورو درێژەدا هەر جۆر لـە دەسـتیان هـات خـەریك بـوون‌و کۆتاییـان نـەهێنا لـە پیلان‌و فڕو فێڵ‌و دەلەسەو پڕوپاگەندەو ناهەق بە هەق نیشان دان‌و هەق بە ناهـەق‌و چاك بە

خراپ‌و خراپ بە چاك، لە هەموو بارو ڕوویەكەوە دەستی پیسیان خستە كار لەو كەلەپوورو غەزنە گەورەو گرنگەی كە ئیسلام هێنای‌و بڵاوی كردەوە بە جیهاندا، بەڵێ تەنها خوا ئەم قورئانەی پاراست‌و هەر بەو شێوەی كە ناردی هێشتیەوە، دەستی پیسیان خشتە مێژووی ئیسلام‌و ڕووداوەكانی‌و پیاوەكانی، دەستیان خستە حەدیس‌و فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) هەتا خوا چەند پیاوێكی بۆ هەڵخست توانیان هەموو ڕاست‌و ناڕاست‌و دەست هەڵبەست‌و لارو چەوتێ لە یەك جوێ بكەنەوەو هەموویان دیاریی كرد مەگەر شتێكی زۆر كەم كە پیا نەگەیشتبێ‌و لە سنووری دەسەڵات دەرچووبێ، دەستی زۆری نامەردیان خستەكار لە تەفسیری قورئاندا هەتا وایان لێ كرد پیاوی زاناو لێ لێ هاتووی ئەوێ سەری لێ دەركاو هەڵەنەكات، بە سەدان‌و هەزاران پیاویان هەڵخست بەناوی نووسەران‌و زانایانی ئیسلامەوە كە ئێستاش كار بەدەستی‌و سەركردایەتی بیروباوەڕی جیهانی ئیسلامی لەدەستی قوتابی‌و پەروەردە كراوەكانی وەو ناپاكانەدایە، لە ژێر چاودێری سەلیبیێتیدا چەند فس فس پاڵەوانێكی پەروەردەكراوی پێ گەیەنرا تا هەڵسن بە خزمەتكاری پێك هێنانی مەبەست‌و ئامانجی پیسی دوژمنانی ئیسلام لە وڵاتی ئیسلامدا، بە هیچ كلۆجێ ڕزگار بوون نابێ لەدەستی ئەو پیلان گێڕو دوژمنانە تەنها بەگەڕانەوە نەبێ بۆلای ئەم قورئانەو فەرمانبەری ئەم قورئانەو گێڕانەوەی سەركردایەتی بۆلای ئەم قورئانەو پرس كردن بەم قورئانە لە هەموو كاروبارێكی ژیان‌و جیهاندا، ئینجا باسی پیلانێ تری ئەو نامەدارانە ئەكات كە بەكاریان ئەهێنا بۆ تێك دانی دڵی موسڵمانان‌و دوو دڵ كردنیان بە تایبەتی ئەوانەیان كە تازە موسڵمان بوون، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ دەستەیەك لە نامەدارەكان وتیان بەهێندێ لە خۆیان: ﴿ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە دەم‌و بەڕووكەش بڕوا بێنن بەو قورئانەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە، واتە هاوەڵەكانی محمد(ﷺ)، ئەو بڕوا دەمی‌یە بێنن ﴿وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ﴾ سەر لە بەیانی

﴿وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ﴾ پەشیمانیو بێبڕوایی دەربڕن لە دوایی ئەو ڕۆژەو لە ئێوارەکەی دا، ئەم دەستە سەرۆكو شەیتانەکانیان بوونو ئەیان وت بە شوێن کەوتووەکانیان، یا وەك(حسنو سوودی) ئەفەرموێ: دوازدە کەس بوون لە زاناکانی خەیبەرو دەوروبەری وتیان بە یەکتر: ئەم پیلانە بکەنو بڵێن ئێمە لە پێشەوە وامان زانی کە ئەم قورئانە ڕاستەو لەبەرئەوە بڕوامان هێنا، ئینجا بۆمان دەرکەوت کە ڕاست نیەو دەست هەڵبەستە، لەبەرئەوەی پەشیمان بووینەوە، وتیان: ئەم پیلانە بەکار بێنن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ بەڵکو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بگەڕێنەوەو لەسەر ئەو ئایینە نەمێنن، بەڵێ بەڕاستی پیلانەکەیان هەرچۆنێ زۆر بۆگەنو ناپیاوانە بوو، لە هەمان کاتدا زۆر بەهێزو بەکار بووە بۆ ترازاندنی ئەوانەی کە دەروونو ژیریان بێ هێزو لاواز بووبێو تازە موسڵمان بووبنو هێشتا بە تەواوی تێنەگەیشتبن لە ئایینە بەرزەکەی ئیسلام، دڵی ئەو جۆرە کەسانەی پێئەکەوتە بێئارامیو گومانو دوودڵی بۆ فەراهەم ئەهێنان، بەتایبەتی ئەو عەرەبانەی کە نەخوێنەواربوونو لایان وابوو کە نامەدارەکان زانانو باش شارەزان لە ڕاستیو ناڕاستی ئایینیدا، کەواتە کاتێ ئەوانە ببینن کە بڕوا ئەهێننو بە گورجی پەشیمان ئەبنەوە، وا تێ ئەگەن کە ئەوانە بۆیان دەرکەوتووە ناڕاستی ئایینەکە لەبەرئەوە پەشیمان بوونەوەتەوە!

ئەو جۆرە پیلانو فڕوفێڵە بۆ لادانو دوو دڵ کردنی موسڵمانان هەر هەیەو بەکار ئەهێنرێن تا ئێستاش، بەڵام بەچەند جۆرو شێوەیەکی تر کە ڕێكو گونجاو ترە لەگەڵ گۆڕانی چەرخو ڕۆژو بارو حاڵی مەردوم دا.

دوژمنانی ئیسلام نائومێد بوون لە بەکارهێنانی ئەو فێڵی یەکەمجارە، لەبەرئەوە لەوەلایاندا بۆ چەند جۆرو شێوەیەکی ترو لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە لە شکرێکی بەهێزی زۆریان پێك هێنا لە بەکرێ گیراوەکانیان لە هەموو ناوچەکانی جیهانی ئیسلام دا لە شێوەی مامۆستاو دەکتۆرو فەیلەسوفدا، لە شێوەی نووسەرو شاعیرو ڕۆژنامەنووسو هونەرمەندا کەهەرکام ناوێکی موسڵمانانەیان هەیە، چونکە لە نەوەو نەژادی موسڵمانانن، هێندێکیشیان زانایانی ئیسلامن! ئەو لەشکرە بەکرێ گیراوە بەرەڵاکراو بەهێز کرا بۆ لاوازکردنو بێهێزکردنی عەقیدەو بڕوای بڕواداران و لەق کردنی بنەڕەتو پایەکانی، بۆ بێنرخ کردنی عەقیدەو شەریعەتەکەی ئیسلام، بە دەلەسەی بەکار نەهاتنو نەگونجانی بۆ ئەم چەرخو

سەردەمە تازانە، بە هەمیشە تەپڵو دەهۆڵی(رجعیة) کۆنەپەرستی بۆ لێ لدرێ! بانگی مەردوم بکرێ بۆ واز لێ هێنانیو دوور خستنەوەی لە ژیان! بۆ داهێنانی چەند بۆچوونو رەوشتێك کە دژو پێچەوانەی بۆچوونو رەوشتەکانی ئیسلامو عەقیدەی ئیسلامن، ناشیرین کردنی بۆچوونو رەوشتە ئیسلامیەکانو رازاندنەوەو شیرین کردنی بۆچوونو رەوشتە نارەواو نا پەسەندەکانی داهێنراوی خۆیان، ئینجا بەرەڵاکردنی جڵەوی نەفس بۆ هەر شتێ کە نارەزووی ئەکات، لە ریشە هێنانی یاسای خووڕەوشتی مەردیو مرۆڤایەتی کە عەقیدەو بروا لەسەر ئەو یاسایە ئەوەستێو راگیر ئەبێ! ئینجا ئەم لەشکرە بەکرێ گیراوە ناوەکانیان ئیسلامیەو لە دەفتەرەکانیاندا نووسراوە موسڵمانان، ئەوانە بەناوەکانیانو بە دەفتەر نفوسەکانیان موسڵمانێتی دەرئەبڕن، بەو کردەوە پیسانەشیان بێبڕوایی دەرئەبڕن، بەو دوو شتەکارو کردەوەی نامەدارانەکەی کۆنو یەکەم جار ئەبینن!

ئەو دەستە نامەدارە فەرمانیاندا بەو پیلانو فێڵەو ئینجا وتیان: ﴿وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ﴾ دڵنیا مەبنو باوڕتان بە کەس نەبێ مەگەر بە کەسێك کە شوێنی ئاینەکەتانە کەوتووە، ئەو تەدبیرە کە کردمان بۆ دوودڵکردنی موسڵمانەکان لای کەس مەی درکێننو با هەر خۆتان بزانن، چونکە ئەگەر بیدرکێننو موسڵمانەکان پێی بزانن باشتر سوورو دامەزراو ئەبن لەسەر ئاینەکەیان، کەچی نەیانزانی کە خوا ئاگادارە بە هەموو شتێو ئەم تەدبیرە بۆگەنەی ئەوان ئەگەیەنێ بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) گەیاندنی ئەم هەواڵە کە نهێنیو غەیبی بوو ئەیکات بە موعجیزەیەك لە موعجیزەکانیو ئینجا بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان بڕوایان بەهێز تر ئەبێو تەدبیرەکەی ئەوان بەدژو پێچەوانەی ویستو خواستیان دەرئەژێو ئەوان هەر ریسواییو رووڕەشیان بۆ ئەمێنێتەوە!!

وێنەی ئەم تەدبیرو پیلانە پیسەی ئەوان بەکرێ گیراوەکانی صەهیۆنیو صەلیبیەکان هەڵئەسن پێی بە هەمیشەیی ئەمڕۆ بۆ گومرا کردنو لادانی موسڵمانەکانی لە ئاینەکەیان، خۆیان لە ناو خۆیاندا ئاگادارن بەو هەموو پیلانو تەدبیرە پیسانە، ئەیانەوێ موسڵمانان پێیان نەزانن، بەڵام هەرکەس موسڵمانێکی قورئانی بێئەو جۆرە شتانەی لێ ون نابێو لەبەر رووناکی قورئانەکەی ئەو شتانە ئەبینێو بەو پیلانو تەدبیرە پیسانە باشتر گەورەیی ئاینەکەی بۆدەرئەکەوێوسوورتر ئەبێ لەسەر ئیسلامەکەی، باشتر تێئەگات کە ئەم قورئانە نامەی هەتاهەتاییەوبۆڕێنموونی بەندەکانی خواتادنیادنیایە،خواپاداشتی زاناو نووسەرەکانی ئیسلام بداتەوەتیشکی رووناکی قورئانیان دەرخست بۆهەرکەسێك کەبینابێت.

﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٧٣﴾

ئەو جوولەکانە ئەو تەدبیرە بۆگەنەیان کرد ــ وەك وتمان ــ بۆئەوەی لەو ڕێگەوە موسڵمانەکان گومڕا بکەن، ئینجا خوای میهرەبانیش بەرپەرچی قسەکەی ئەوانی دایەوە تا موسڵمانەکان وریا بن‌و بەو پیلانە پیسە سەریان لێ نەشێوێ، بە تێهەڵکێش فەرمووی بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُلۡ﴾ بڵێ: ﴿إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ڕێنموونی هەر ڕێنموونی خوایە کە بریتیە لەوەی بەم قورئانە ناردی، بێجگە لەوە گومڕاییەو دەرچوونە لە ئایین‌و ڕێنموونی خوا، کەواتە با موسڵمانەکان بە پیلانی ئەوانە گومڕا نەبن‌و دامەزراوبن هەر لەسەر ئایینی خۆیان، هەرکەس خوا بەهرەی بڕوای پێبدا هیچ پیلان‌و فێڵ‌و فرێ کاری لێ ناکات، هەر خۆیشی ئەزانێ کێ شایستەیە بۆ ڕێنموونی‌و بەهرەی خوا.

لەپاش ئەو تێهەڵکێشە ئینجا دێتەوە سەر تەواوکردنی پیلانەکەیان ئەفەرموێ: ﴿أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ﴾ واتە دڵنیا مەبن بەهیچ کەسێکی بێگانەو بڕوای خۆتان دەرمەبڕن لای هیچ کەسێکی تر لەلایەن خواوە نامەو پێغەمبەرێتی پێدراوە وەك ئەوەی کە دراوە بە ئێوە، یا هیچ کەسانی تر زاڵ ئەبن بەسەرتاندا لە دەمەقاڵێتان لای پەروەردگارتان، واتە ئێوەی نامەدار ئەزانن کە ئایینی ئیسلام ڕاستە، دەی ئەوە لای کەسی تر مەدرکێنن، چونکە ئەگەر ئەوە بڵێن موسڵمانەکان بڕوایان بەهێزتر ئەبێ‌و نا موسڵمانەکانیش موسڵمان ئەبن، هەروەها ئەگەر ئەوە بڵێن موسڵمانەکان ئەیکەن بە بەڵگە بەسەتانەوە لە ڕۆژی دوایی داو قسەیان سوار ئەبێ بەسەرتاندا، لەوتەکەیاندەوە دوو شتی ناڕەوا دەرئەکەوێ:

١- دەرئەکەوێ کە نەخۆشی کینەو داخ‌و حەسادەت دڵی داگیرکردن‌و بووە بەرگری کەری موسڵمان بوونیان، ئەگینا لە دڵەوە زانیویانە کە ئیسلام ڕاستەو لای خواوە هاتووە.

٢- وا دەرئەکەوێ کە ئەگەر بە دەم ئەوە نەڵێن خوا لێیان ناگرێ‌و موسڵمانەکان قسەیان سوار نابێ بەسەریاندا لە ڕۆژی دوایی دا، دەی ئەوەش هەستێك‌و بۆچوونێکی زۆر

ناڕاستەو نیشانەی تێنەگەیشتنیانە لەبڕوا بە خواو بە سیفەتەکانی خواو بە پەیامو پێغەمبەرێتیو بە ڕێمو بەرنامەی خوا.

ئەم ئایەتە دانراوە بە یەکێ لە ئایەتە زۆر گرانەکانی قورئان کە بیرو ژیریی ماندوو ئەبێ لە تەفسیرکردنی دا، زانایان لە چەند بارو ڕوویەکەوە بۆی ڕۆیشتوون کە هەموو ئەگونجێن، هێندێکیان نزیك ترن لە هێندێکی تریان، بنەڕەتی ئەو هەموو ڕایە لەسەر دوو شتەکە هیش کەس ناتوانێ بە تەواویو بەدڵنیاییەوە یەکێکیان وەرگرێ، بەڵکو هەرکام ئەگونجێو بە تەواوی باوی نادرێ بەسەر ئەوی تردا:

١- وتەی ﴿أَن يُؤْتَىٰٓ﴾ پەیوەست بێت بە وتەی ﴿وَلَا تُؤْمِنُوٓاْ﴾ وە هەردوو وتەکە قسەی ئەو جوولەکانە بنو خوا بۆمان ئەگێڕێتەوەو ئەوی لە بەینی ئەو دووانەدا تێهەڵکێشە لە لایەن خواوە، وەك باسمان کردو لەسەر ئەو بارە تەفسیرەکەیان هێناو بەشێ لە زانایان ئەوەیان هەڵبژاردووە.

٢- قسەی جوولەکەکان لەوتەی پێشوودا دوایی هاتبێ لە ﴿دِينَكُمْ﴾دا.

ئینجا پاش ئەوە لە وتەی ﴿قُلْ إِنَّ﴾ هەتا ﴿عِندَ رَبِّكُمْ﴾ لەلایەن خواوە ئاڕاستە کرابێ بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەوانو سەرزەنشتیان، وەك بەشێکی تر ئەمەیان هەڵبژاردووە، ئەم ڕایە ڕێكو گونجاو ترە لەگەڵ خوێندنەوەی(ئیبنو کەسیر)دا کە ئەفەرموێ: ﴿أَن يُؤْتَىٰٓ﴾، واتە جوولەکەکان فەرمانیاندا بە بەکار هێنانی ئەو فێڵو پیلانە بۆ بەرگری ئیسلامو بڕوا هێنان بە پێغەمبەر(ﷺ)، بەهێزکردنی بڕوا بەوەی کە نامەو پەیامی خوا هەر ئەبێ لە نەوەی ئیسرائیل بێت، ئینجا خوایش فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرپەرچیان بداتەوە بەوەی کە پەیامو ڕێنموونی هەر هینی خوایەو بەدەست کەس نیە، سەر زەنشتیان بکاتو بێزاری دەربڕێ لێیان بەمەی ئایا ئێوە ئەو فڕوفێڵە ئەکەن لەبەرئەوەی پێتان ناخۆشە کەسانی تر نامەو ئایینیان پێبدرێ وەك ئێوە، لە ئەوەیشەوە ئەوە ڕووئەدا کەلە ڕۆژی دوایی دا ئەوانە قسەیان سەرکەوێ بەسەرتاندا؟ واتە کردەوەکەتان ناڕەواو بێزراوە.

ئەگەر لەسەر خوێندنەوەی زۆریەش بڕۆین، ئەو کاتە هەر بەم جۆرەی کە وترا تەفسیر کراوەتەوە هەرچەند بە ڕواڵەت پیت و نیشانەی پرسیاری تیا نەبێ، چونکە زۆر جار نیشانەو پیتی پرسیار ناوترێو هەر لە دڵدا نیاز ئەکرێ، یا ئەڵێین: پەیوەستە بە وتەی پێشووەوەو خەبەرە بۆ ﴿إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ﴾، واتە بڵێ: بەڕاستی ڕێنموونی خوا ئەوەیە کە وەك ئەوەی دراوە بە ئێوە بدرێ بە کەسانێکی ترو ئەوانیش بەوە قسەیان سەربخەن بەسەر قسەی ئێوەدا لای خوا. بەهەرحاڵ تەفسیری ئەم ئایەتە بەجۆرێ بکرێتەوە کە ڕێك بێت لەگەڵ هەردوو خوێندنەوەکەدا ئەوە بەهێز ترو ئاکترە. خاوەنی تەفسیری(المنار) لەم شوێنەدا ڕایەکی هەیە بەلامەوە زۆر پەسەندە، ئەفەرموێ: ئەو جوولەکانە دوو شتیان کرد:

یەکەم: فێڵ و پیلان بۆ هەڵگەڕانەوەی موسڵمانان.

دووەم: شاردنەوەی ئەو پیلان و فێڵەو ئەوەی کە ڕاستەو ئەیانزانی لە هەرکەس لەسەر ئایینی جوولەکە نەبێت، یا باوەڕی نەبێت پێی، ئینجا لە وتەی ﴿إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ﴾ قورئان ئاماژەی کرد بەڕێز بۆ هۆی ئەو دووشتە بەم ڕەنگە هۆی فێڵ و پیلانەکەیان ئەمەیە کە داخ لە دڵن و حەسادەتیان لێ دێ کە نامەو ئایین بدرێ کەسانێکی تر بێجگە لە خۆیان، هۆی شاردنەوەکەش ئەوەیە کە با موسڵمانەکان پێی نەزانن و لە ڕۆژی دوایی دا لای خوا قسەیان زاڵ نەبێ بەسەر قسەی ئەماندا، بەلامەوە پێویست بوو درێژەی دان بە تەفسیری ئەم ئایەتە، کەواتە با بە ووردی سەیر بکرێ و ڕەخنە نەگیرێ لەم درێژە پێدانە، ئینجا لە کۆتایی دا فەرمان ئەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیەنێ بە جوولەکەکان و بە موسڵمانەکانیش کە بەهرەی ئایین و نامەو پەیام بەدەست خوایەو بە هەرکەس بداو بیسپێرێ خۆی ئەزانێ، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ﴾ بڵێ: بێگومان بەهرەی فروستادەیی و پەیام بە دەست خوایەو لە لایەن خواوە دەست کەوت ئەبێ ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ ئەیدا بە هەرکەسێك کە خوا خۆی بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا ڕەحمەن و میهرەبانی فراوانەو زانایە بە هەموو شتێك و خۆی ئەزانێ چی بەجێیەو بەرژەوەندی تیایە.

يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ

﴿يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ﴾ تەرخان‌و تایبەتی ئەكات لە ڕەحمەتی خۆیەوە هەركەسێكە كە بیەوێ، ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ خوا خاوەنی فەزڵ‌و بەهرەی گەورەیە، واتە خۆی ئەزانێ كێ شایستەو شایانە بۆ فروستادەیی‌و پێغەمبەرێتی، هەركەس شایستەو شیاوی هەرچی ببێ خوا پێی ئەدات. بێگومان نەوەی ئیسرائیل شایستەو شیاوی نامەو پەیام‌و پێغەمبەرێتی بوون‌و بەپێی ئەوە خوا بەهرەمەندی كردن‌و باوی دان بەسەر گەلانی چەرخی خۆیان تا لەسەر ڕێگەی ڕاست مانەوە، بەڵام كاتێ كە دەستیان كرد بەخراپەكاری‌و پەیمانی خوایان هەڵوەشاندەوەو ئەو سپاردە گەورەیە كە خرابووە سەرشانیان لە خۆیان داڕنی‌و شەریعەتی خوایان خستە كەنارو پشت گوێ، وەسەركردایەتی ئادەمی پچڕانلە نامەو بەرنامەی خوا، لەو كاتەدا ئەو سەركردایەتی‌و سپاردەیە درا بەم دواترین ئوممەتە بە سەركردایەتی دواترینی پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ، جا كاتێ كە موسڵمانان ئەم فەرموودەیان بیست ئەوكاتە تێئەگەن‌و هەست ئەكەن بەو چاكەو بەهرەیەی كە خوا پێی بەخشین، نرخی ئەو منەتە گەورەیە ئەزانن كە پەروەردگاریان نای بەسەریاندا، ئینجا كە ئەو زانین‌و هەستەیان بۆ پەیدا بوو بە ئەوپەڕی هێزو سۆزو پەرۆشەوە دەست ئەگرن بە ئایینەكەیانەوەو فیداكاری ئەكەن لە پێناوی دا، هەمیشە ئەبن بە پاسەوانێكی وریا بە دیاریەوەو هەرگیز ناخەڵەتێن‌و تەفرە ناخۆن بە دوژمن‌و داخ لە دڵەكانی خۆیان‌و ئایینەكەیان، ئا بەم جۆرە قورئان موسڵمانان پەروەردە ئەكات‌و پێیان ئەگەیەنێ لە هەموو چەرخ‌و چینێكدا.

ئینجا هەروەها لەسەر نامەدارەكان ئەڕواو بارو حاڵیان دەرئەخات، دەست پێ‌ئەكات بە نیشان دانی دوونموونە یان لەبارەی دەست پاكی‌و دەست پیسیەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ﴾ لەو نامەدارانە هینی وایان هەیە ئەگەر بیكەیت بە ئەمیندارو ماڵێكی زۆری لا دابنێ ئەتداتەوە، وەك ئەگێڕنەوە كە(عبدالله ی كوڕی سەلام) پێش موسڵمان بوونی پیاوێكی قوڕەیشی(١٢٠٠) هۆقە ئاڵتوونی بە سپاردە لادانا‌و لەپاشدا بەرێكی دایەوەپێی،

﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥﴾

﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ﴾ هێنی وایان هەیە ئەگەر سپاردەی دینارێکی لادابنێی ﴿لَّا يُؤَدِّهِۦٓ﴾ نایداتەوە پێت و حاشای لێ ئەکات، ﴿إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ﴾ مەگەر لە کاتێکدا هەمیشە بە سەریەوە بیت، واتە دەست لە کۆڵی نەکەیتەوە تا ئەتداتەوە، ئەگێڕنەوە لەم بارەوە(یخاسی کوڕی عازورا) پیاوێکی تری قورەیشی دینارێکی لا دانا بە سپاردە لەپاش دا حاشای لێ کردو نەیدایەوە. دادو ڕاستی و بێ لایەنی ئەبێ ئاوا بێت کە قورئان ڕێنموونیمان ئەکات بۆی، ئەوەتا ئەو هەموو پیلان و دوژمنایەتی و لاری و نالەباری ئەو نامەدارانە پاڵی پێوە نەنا کە هەر باسی خراپییان بکات، وە بەرگری نەکرد لەوەی دان بنێ بە چاکەیاندا، بەڵکو وەك یەك هەردووکی باس کردن و چاکەکەی لە پێشەوە وتن، ئینجا هەر لەسەر ئەو ڕاستی و ڕاست وتنەی لەسەر ئەو خراپانە ئەڕواو خراپەکانی تریشیان لەم بارەیەوە دەرئەخات و موسڵمانانی پێ ئاگادار ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ئەو نەدانەوەو حاشا لێ کردنە ﴿بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ﴾ بەهۆی ئەوەیە کە ئەو نالەبارانە ئەیان ووت: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ﴾ هیچ گوناهو تۆڵەیەکمان لەسەر نیە لە خواردنی ماڵی نەخوێندەوارەکانەوە، کەس دەسەڵاتی بەسەرماندا نیە و ڕێی داواکردنی لێمان سەبارەت بەوان، واتە عەرەب کە لەو کاتەدا ناو ئەبران بە نەخوێندەوار، ئەوەی کە ئەو قسە ناڕاستەی ئەکرد جوولەکەکان بوون، مەبەستیان تەنیا عەرەب نەبوو، بەڵکو هەرکەسێك و هەر تیرەو نەتەوەیەکی تریش کە جوولەکە نەبێت خواردنی ماڵی حەڵاڵ و ڕەوایە بۆ جوولەکە بەهەر جۆرو شێوەیەك دەستی بکەوێ!

سەیر تر ئەمەیە کە بەناوی خواو ئایینی خواوە ئەو قسە ناڕەوایەیان ئەکرد، لە کاتێکدا کە ئەیانزانی و بە دەستی قەست ئەو درۆیان هەڵئەبەست بەدەم خواوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ درۆ بە دەم خواوە ئەکەن کە ئەڵێن: ماف و ماڵی غەیری جوولەکەی بۆ حەڵاڵ کردوین ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لە کاتێکدا کە ئەزانن درۆ ئەکەن، بێگومان خوا ستەم و تاوانی قەدەغە کردووە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، هەموو پەیام و شەریعەتەکانی خوا هاتوون بۆ بەرگری و بەربەست کردنی هەموو تاوان و ستەم و خراپەکارییەك، کەواتە نەفرینی خوایان لێ بێ چوون قسەی ئاوایان ئەکردو ئەیکەن بە دەم خواو نامەو ئایینی خواوە؟!!

بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا
قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا

**ئینجا خوا به درۆیان ئەخاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ﴾ نەخێر وانیە ئەوەی ئەو جوولەکانە ئەیڵێن، بەڵکو گوناهێن ئەکات‌و دەسەڵات‌و ڕێی داواکرنەوە هەیە لێیان، یاساو بڕیاری خوا بەم جۆرە ڕاست‌و ڕەوایە کە بەم شێوە گشتیە ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ﴾ هەرکەسێك هەر پەیمانێ کەلە گەردنیا بێ بەجێی هێنابێ، ﴿وَٱتَّقَىٰ﴾ خۆی پاراستبێ لە ناهەقی تیای دا ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان خوا خۆپارێزەرانی خۆش ئەوێ، واتە هەرکەسێك بەو جۆرە بێت ئەو کەسە لە خوا ترس‌و خۆپارێزەرەو خوایش ئەوانەی خۆش ئەوێ‌و دۆستی ئەوانەیە، ئیتر ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستبێ یا لەگەڵ بەندەکانی خوادا کە ئەبێ هەرکام لەو پەیمانانە بەپێی ئایین‌و بەرنامەی خوابێت، کەواتە ئەو جوولەکەو گاورانەش ئەگەر ئەو پەیمانەیان نەشکاندایە کە خرابووە ئەستۆیان لەلایەن خواوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکان‌و لە نامەکانیاندا، ئەگەر ئەو پەیمانەیان نەشکاندایە ئەو کاتە درۆیان بەدەم خواوە نەئەکردو دەست کاری نامەی خوایان نەئەکردو بەپێی فەرمان‌و شەریعەتی خوا ڕەفتاریان ئەکرد، بێگومان یەکەم کەس ئەبوون لە بڕوا هێنان بەم قورئانەو بەم پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بەو جۆرەش بوونایە ئەبوون بە دۆست‌و خۆشەویستی خوا، بەڵام کارێکی وایان کرد تا کەتنە بەر خەشم‌و نەفرینی خواو نەسەب‌و نەژادی پاکیان چارەسەری هیچ دەردێکی نەکردن.**

**ئەو نامەدارانە خۆیان بە دۆست‌و کەس‌و کاری دائەنا بەهۆی ئەوەوە سەر لێ شێواوو لە خۆگۆڕاو بوون تا ئەو ڕادەیە ماڵ‌و مافی مەردومی تریان بە حەڵاڵ دائەنا بۆ خۆیان ئەیان ووت: ﴿لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ﴾ لە بیریان چوو بوو کە هەر بەجێ‌هێنانی پەیمان‌و لە خوا ترسان مایەی نزیکیە لە خواوەو ئیتر تەنیا نەسەب‌و نەژادی پاك سوود ناگەیەنێ، کەواتە**

ئەم ئایەتە دەم کوتکەرە بۆیانو پلاریان لیٚ ئەدات، ئینجا بەبۆنەی پەیمان شکاندنو ناپاکی لە ماڵی مەردومدا گەورەترین هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە پەیمانی خوا ئەشکێننو ئەوەی کە خوا فەرمانی پێداوە ئەیشارنەوە، لەباتی ئەوەدا شتێکی تر دەرئەخەنو سوێندی ناهەقی لەسەر ئەخۆن کە ئەوەش ئەکەن لەبەر دەست کەوتێکی کەمی دنیاییە، ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئەکڕن، واتە ئەگۆڕنەوە ﴿بِعَهۡدِ ٱللَّهِ﴾ بەو پەیمانەی کە خوا لەگەڵی بەستوون ﴿وَأَيۡمَـٰنِهِمۡ﴾ بە سوێندەکانیان کە بەدرۆو لەسەر ناهەقی ئەیخۆن، ئەوەش وەك باسی سیفەتو ناونیشانی پێغەمبەر کەلە تەوراتو ئینجیل دا هاتووە کە ئەیشارنەوەو بەدستی خۆیان شتی تر ئەنووسنو سوێندی لەسەر ئەخۆن کە ئەوە لەلایەن خواوە هاتووە، ئەو پەیمانو سوێندە ئەگۆڕنەوە بە ﴿ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾ بەدەست کەوتێکی کەمی ئەم دنیایە کە بریتیە لە بەرتیلو ئەو ماڵو لەوەڕەی کە بەناوی ئاینو لە پەنای ئایینداا بە ناڕەوا وەری ئەگرن، کە ئەو دەست کەوتە هەرچەند زۆر بیٚو بە زۆر دابنریٚ هەر کەمەو لەچاو ئەوەی کە بیٚ بەش ئەبن لە ڕۆژی دوایی دا، ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەوانەی کە ئەو گۆڕینەوە ئەکەن هیچ بەشو بەهرەیەکیان نیە لە ڕۆژی دوایی دا ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ خوا قسەیان لەگەڵ ناکاتو بە چاوی میهرەبانی سەرنجیان نادات، واتە خوا خەشمی بەتینی هەیە لێیانو بەزەیی نیە بۆیان، ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمۡ﴾ پاکیان ناکاتەوە لە گوناهو تاوانیانو نایسڕێتەوە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی ئێشو ئازار دەری بەتین، پەنا ئەگرین بە میهرەبانیو بەزەیی خوا لەم هەڕەشە سامناکە.

ئینجا باسی نموونەیەکی تر ئەکات لە نامەدار کە ئەیانەویٚ بە مەردوم گومڕا کەن لە ڕێگەی نامەکەی خواوە، بەم ڕەنگە لایان ئەدەن لەوو دەست هەڵبەستی خۆیان ئەچەسپێنن لە دەروونی خەڵکی دا، بەناوی نامەی خواوە، یان ماناو مەبەستەکە ئەگۆڕنو بای ئەدەن بە باری ئارەزووی خۆیاندا، هێندیٚ لەو دەست هەڵبەستانە ئەو بیرو باوەڕە ناڕاستەیە کە پیاوە ئایینیەکان دایان هێنا لەبارەی حەرزەتی عیساوە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّ مِنۡهُمۡ لَفَرِيقٗا﴾ بە ڕاستی لەو نامەدارانەیە تاقمێك کە،

يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ
مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن
يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن
كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾

﴿يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ﴾ زمانيان پێچ ئەدەن بە خوێندنەوەی نامەکەی خوا، بەم ڕەنگە بەجۆرێ ئەیخوێننەوە کە لای ئەدەن لەبارە ڕاستەکەیەوە بۆ بارێکی تر کە مەبەستێکی ناڕاست بگەیەنێ، یا بەم ڕەنگە وتەو وشە(متشابە)کانی ئەبڕن بەسەر مەبەستێکدا کە ناگونجێ، تەفسیریان ئەکەنەوە بە گوێرەی ڕووکەش و ڕواڵەتەکەیان، وەك ناوبردنی خوا بە باوك بۆ حەزرەتی عیسا یان ناوبردنی عیسا بە(روح الله)، یان مەبەست ئەوەیە زمانیان پێچ ئەدەن بە وتنی وتاری خۆیان و لەژێر لێوەوە ئەیڵێن و شێوەو ئاوازەی نامەی خوای ئەکەن بەبەردا، وەك هێندێ لە نەفامی ناو موسڵمانان کە بۆگاڵتەو گەپ وتەو وتار ئەڵێ بە تەجویدەوە، لەسەر شێوەو ئاوازی قورئان و نەشارەزا گوێی لێ ئەگیرێ وا ئەزانێ کە قورئانە، بە هەرکام مەبەست بێت ئەو تاقمە نامە دارە ئەو کردەوە ناپەسەندە ئەکەن ﴿لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بۆئەوەی ئێوە وا گومان ببەن کە ئەوەی ئەوان گۆڕیان لە نامەی خوایە، ﴿وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوە لە نامەی خوا نیە ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەڵێن ئەوە لەلایەن خواوە لە کاتێکدا کەلەلایەن خواوە نەهاتووە. ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ درۆ ئەکەن بە دەم خواوە لە کاتێکدا کە ئەشزانن درۆیەو درۆ ئەکەن!(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەبارەی گاورو جوولەکەوە، واتە زاناکانیان کە تەورات و ئینجیلیان گۆڕی و دەستکاریان کرد شتی تریان تێکەڵ کرد. چەند کەسێکی تر ئەفەرموون: هاتە خوارەوە لە بارەی تاقمێك لە زانایانی جوولەکە کە دەستکاریی تەوراتیان کردو هەرشتێ کە بکرایە بە بەڵگە بە سەریانەوەو دەم بکرانایە پێی وەك باس و ناونیشانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەیان لێ لائەبرد، بەهەر جۆر بووبێ ئەوە لە کردەوەی پیاوە زاناکانیان بووە، پیاوانی ئایینی کاتێ کە لایان دا ئەبن بە دەردو بەڵایەکی

سەخت بەسەر میللەتەوە، بە ناوی ئایینەوە کارو کردەوەی زۆر پیس ئەکەن‌و مەردومە نەزانەکان چەواشە ئەکەن‌و سەریان لێ تێك ئەدەن، ئەبن بە کوتەك‌و چەکی دەست زۆرداران‌و ستەمکاران بۆ ژێر پێ کردن‌و داگیر کردنی ماف‌و مالی بێدەسەلاتەکان، وێنەی ئەو گومڕاکەرانەی جوولەکەو گاورەکان لەم ئوممەتەدا زۆرو زەبەندە بوون‌و هەن‌و زمانە تیژەکانیان ئەخەنە کار بۆ ناهەق بە هەق کردن‌و هەق بە ناهەق، بە گوێرەی ئارەزووی ستەمکاران بڕیارو فتوا دەرئەکەن، ئایەت‌و حەدیسەکان با ئەدەن بە باری ستەمکاراندا‌و تەفسیرو تەئویلیان ئەکەن بە پێی بەرژەوەندی ئەوان، بەلام خۆیان ڕەنجەڕۆو زیانبار ئەکەن، ئەو کرێ‌و بەشە کەمەی کە وەری ئەگرن ئەوە ناهێنێ کە خۆیان شەرمەزاری لای خواو لای بەندەکانی خوا ئەکەن لەسەری، هێندێ لە زانایانی مەسیحی کە لایان دا لە ڕێبازی حەزرەتی عیساو ئایینە ڕاستەکەی، زیادەڕەوییان کرد لەبارەی عیساوە(علیه السلام) تا گەیاندیانە سنووری خوایەتی، چەند قسەو وتەیەکیان بە دەمیەوە هەلبەست کە لافی خوایەتی ئەگەیاندو بەوە سەریان تێك ئەدا لە مەردوم، ئینجا خوایش دەمکوتی کردن‌و بە درۆی خستنەوە بەم فەرموودەیە: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ﴾ نەبووەو ناگونجێ‌و شایستە نیە بۆ هیچ ئادەمیەك کە خوا نامەو زانین‌و تێگەیشتن‌و پێغەمبەرێتی پێ‌بدا ﴿ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەچی لەپاش ئەوە بلێ بە خەلکی: ببن بە بەندەی من‌و من بپەرستن بێجگە لە خوا، تێپەڕ بکەن لە پەرستنی ئەو، بەلێ بێگومان هەرگیز شتی وا ناگونجێ‌و شتی وای نەوتووەو نالێ بە خەلکی، ﴿وَلَـٰكِن﴾ بەلکو ئەلێ پێیان: ﴿كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ﴾ ببن بە خواییەکی تەواو، بەم ڕەنگە بیناسن‌و هەر بەندەی ئەو بن‌و ڕوو هەر بۆ لای ئەو بکەن‌و شوێنی هەر ئایین‌و بەرنامەی ئەو بکەون‌و لێبڕێن هەر بۆ فەرمانبەریی ئەو ﴿بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە کە ئێوە هەمیشە نامەی خوا فێری مەردوم ئەکەن‌و پێیان ئەخوێنن، بەهۆی ئەوەی کە ئەیخوێنن‌و پیا ئەچنەوە، بێگومان فێرکردن دێت بە دوای خوێندنەوەدا کەچی لێرەدا خوێندنی هێناوە بە دوای فێرکردندا، ئەوەش یا لەبەر ئەوەیە یەکەم بۆ مامۆستاو سەرۆکەکانەو دووەم بۆ قوتابی‌و ژێردەستەکانە.

وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًاۗ أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذۡ
أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا
مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ
فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾

---

ئەم ئایەتە ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەوەی کە موسڵمانان نامەی خوا زۆر بە گرنگ بگرن‌و هەمیشە دڵیان لای بێت، هەوڵ بدەن بۆ خوێندن‌و زانین‌و فێرکردنی، هەروەها ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەبێ ئەو زانین‌و خوێندنەیان پاڵیان پێوە بنێ بۆ کردەوەو ڕەفتار بەو نامەیە تا ئەبن بە بەندەیەکی خوایی بەو شێوەی کە باس کرا، بەڵێ بێگومان ئەو زانین‌و خوێندنە ئەگەر ئاوا پاڵی پێوە نەنێ نابێ بە زانین‌و خوێندن دابنرێ، بەڵکو نەزانین‌و نەخوێندەواری زۆر چاکترە، جا لەبەرئەوەیە کە ئایەت‌و حەدیس دژی ئەو جۆرە زانایانەیەو هەڕەشەی سەخت‌و سامناکیان لێ ئەکات، وێنەو چیرۆکی زۆر دڵتەزێنیان بۆ ئەهێنێتەوە ﴿وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًاۗ﴾ ئەو پێغەمبەرە فەرمانتان پێنادا بەوەی کە فریشتەو پێغەمبەران بکەن بە چەند خوایە بۆ خۆتان، بێگومان ڕازی نەبوون بە پەرستنی بێجگە لە خوا کوفرو بێبڕواییە چ جای فەرماندان پێی دەی: ﴿أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ ئایا پێغەمبەری خوا فەرمانتان پێئەدا بە بێبڕوایی پاش ئەوەی کە ئێوە بڕواتان هێنا بە خواو ملکەچ بوون بۆی لە کاتێکدا کە پێغەمبەران بۆ ئەوە نێرراون کە بانگی خەڵکی بکەن بۆ بڕواهێنان‌و پەرستنی خوا بە تەنیا، هاتوون بۆ ئەوەی ڕێنموونی بکەن نەك بۆ گومڕاکردن، بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا بانگ بکەن بۆ ئیسلام‌و بڕوا هێنان، نەك بۆ ملپێچی‌و بێبڕواکردن، بەڵێ بە ڕاستی زۆر ئاشکرایە کە شتی ئاوا ناگونجێ، ئەوەی کە ئەو گاورانە بە دەم حەزرەتی عیساوە هەڵیان بەستووە هیچ ژیرێك وەری ناگرێ، هەرچۆنێ ئاشکرا بووە دەلەسەیی ئەوەی بە دەم خواوە هەڵیان بەست، لە هەردوو بارە هەرچیان کرد سەری لە هیچەوە دەرچوو، موسڵمانان بەو جۆرە شتانە سەریان لێ نەشێوا، لە کاتێکدا کە قورئانیش ئاوا پیلانی دەرخستن‌و بەدرۆی خستنەوە!

لەپاش ئەو هەموو باس و لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمانەوە(ﷺ) ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ یەکێتی زنجیرەی پێغەمبەران و پەیامەکانیان و بۆ پەیوەستی تەواو لەنێوان هەموو ئەڵقەکانی ئەو زنجیرە پیرۆزەدا بەجۆرێ دەرئەکەوێ کە خوا پێویستی کردووە بڕواهێنان و یارمەتی دانی دواترین پێغەمبەرو پەیام، هەرکەس لەوەلا بدا ئەو کەسە لە فەرمان و سنووری خوا دەرچوو، کەواتە نامەدارەکان ئەگەر ڕاست ئەکەن شوێنی پێغەمبەرو نامەکانیان کەوتوون، ئەبێ بێن بە تێکڕایی بڕوا بێنن بەم ئایینی ئیسلامە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ باسی بکە ئەی پێغەمبەر، یا باسی بکەن ئەی نامەداران، باسی ڕووداوی ئەو کاتە کە خوا پەیمانی بەهێزی لە پێغەمبەران وەرگرت ــ بێگومان ئەو پەیمانە بۆ شوێن کەوتووەکانیشیانە ــ پەیمانی بەهێزی لێ وەرگرتن بەم جۆرە فەرمووی: ﴿لَمَآ ءَاتَيْتُكُم﴾ ئەوەی کە پێم بەخشین ﴿مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ﴾ لەنامەو پێغەمبەرێتی ﴿ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ﴾ لەپاشدا کە هات بۆتان فروستادەیەك کە بڕواکەرو باوەڕدار بێت بەوەی کە لەگەڵ ئێوەیە، واتە بەو نامەو پێغەمبەرێتیەی کە من پێم بەخشین ﴿لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ﴾ بێگومان بڕوا ئەهێنن بەو فروستادەیە ﴿وَلَتَنصُرُنَّهُۥ﴾ وە یارمەتی ئەدەن بە بانگ کردنی مەردومان بۆ بڕواهێنان پێی، واتە ئەبێ بڕوای پێ بهێنن و یارمەتی بدەن، ئینجا ئایا مەبەست بەو فروستادەیە، پێغەمبەرمانە(ﷺ) کە دواتری هەمووانەو خۆی و شەریعەتەکەی جێگرو جێنشینی هەموو پێغەمبەران و شەریعەتەکانیانە، ئەو کاتە ئەبێ بڵێین: خوا پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە کە ئەگەر ئەوان کەوتنە چەرخی ئەم ئەبێ هەموو بڕوای پێ بهێنن و یارمەتی بدەن، هەرچەند خوا زانیویەتی کە هیچ کام لەوانە ناگەنە چەرخی ئەم، بەڵام ئەو پەیمان لێ وەرگرتنە زۆر گرنگە، چونکە ئەوپەڕی ڕادەی شان و شەرەف و بەرزی ئەم نیشان ئەدات، وا ئەگەیەنێ کە مەبەستی سەرەکی ڕەوانەکردنی ئەمەو ڕەوانەکردنی ئەوان وەك سەرەتا وایە بۆ ڕەوانەکردنی ئەم، ئەم پەیمانە ئەگەر لە نامەکانی پێشوودا باس نەکرابێ، بێگومان ئەبێ پێغەمبەرەکان باسیان کردبێ بۆ گەل و ئوممەتەکانیان، کەواتە بووە بەجاڕدانێکی جیهانی لەناو هەموو چەرخ و چینەکاندا کە ئەوەش ئەوپەڕی ڕێزو نرخدا بەم پێغەمبەرە(ﷺ)، ئەگەر مەبەست بەم فروستادەیە هەر پێغەمبەرێ بێت کە هاتبێ بەدوای هەریەکێ تردا، ئەوکاتە ئەڵێین: خوا پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە کە هەرکام لەوان بڕوابێنێ و یارمەتی دەری هەر فروستادەیەك بێت کە بەدوای خۆی دا هاتبێ و ڕەوانەکرابێ، ئیتر لە چەرخ و زەمانێکدا بووبن، وەك حەرزەتی

ئیبراهیم‌و لوط، موسا و هارون‌و سلیمان‌و داودو زەکەریاو یحیی عیسا، یا چەرخ‌و کاتیان نەکەوتبێتە یەك وەك کە ئەوانی تر، مەبەست لە بڕواهێنان‌و یارمەتی دانی ئەوانەیان کەلە چەرخێکدا نەبووبن ئەمەیە پێشووە کە موژدەی دا بە هاتنی دواییەکەو بڕوای خۆی دەربڕی پێی، وەك حەزرەتی عیسا کە موژدەی دا بە ئیسرائیلیەکان بەهاتنی پێغەمبەرمان ـ سەلامی خوا لە هەمووان بێت ـ.(سەعیدی جوبەیرو حسن‌و طاوس) لەسەر ئەم ڕای دووەمەن، حەزرەتی(علی‌و ئیبن‌و عەباس‌و قەتادە سوودی)–خوا لێیان ڕازی بێ– لەسەر ڕای یەکەمن، دەقی فەرموودەی حەزرەتی(علی) –خوا لێی ڕازی بێ– ـ ئەمەیە‌ـ وەك(ئیمامی ڕزای)و چەند کەسێکی تر ئەیهێنن ـ بەڕاستی خوا ئادەم‌و هەرکەس لە پێغەمبەرانی پاش ئەوی ڕەوانە نەکردووە مەگەر پەیمانی لێ وەرگرتووە کە ئەگەر محمد ڕەوانە کراو ئەو زیندوو بوو ئەبێ بڕوای پێ‌بهێنێ‌و یارمەتی بدات، هەروەها چەند حەدیسێك ئاماژە بۆ ئەو ڕایە ئەکات: یەکێ لەوانە ئەم حەدیسەیە کەلە کتێبە باوەڕپێکراوەکاندا ئەیهێنن: ئاگادار بن سوێند بە خوا ئەگەر موسای کوڕی عیمران ئێستا زیندوو بوایە بێجگە لە پەیڕەوی من ڕێی هیچی تری نەئەبوو، بێجگە لەوانەش ڕووکەش‌و ڕواڵەتی ئایەتەکە هەر ئەوە نیشان ئەدات نەك ڕای دووەم، وە نەك ئەو ڕایە کە ئەڵێ: مەبەست وەرگرتنی خوایە ئەو پەیمانانەی کە پێغەمبەرەکان وەریان گرت لە گەل‌و میللەتەکانیان، لەسەر هەر بارو بە هەر جۆر ئەم ئایەتە پێویستی کردووە لەسەر هەموو میللەت‌و خاوەن ئایینەکان بەتایبەتی جوولەکەو گاورەکان کە شارەزا ترن لە ئایین‌و نامەی خوادا، پێویستی کردووە لەسەر هەمووان کە واز بێنن لە هەموو شتێ‌و پەیڕەوی ئەم پێغەمبەرە بکەن(ﷺ)، شوێن کەوتنی ئەم لە ڕاستی دا شوێن کەوتنی هەموو پێغەمبەرانە، چونکە ئەم بڕوای بە هەموو پێغەمبەران‌و نامەکانی ئەوان هەیە.

خوای گەورە ئەو پەیمانەی وەرگرت‌و لە پاش دا ﴿قَالَ﴾ پێی فەرموون: ﴿ءَأَقۡرَرۡتُمۡ﴾ ئایا دانتان نا بەو پەیمانەدا ﴿وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ﴾ پەیمانی منتان وەرگرت لەسەر ئەو بڕواهێنان‌و یارمەتی دانتان؟ ﴿قَالُوٓاْ﴾ وتیان: ﴿أَقۡرَرۡنَا﴾ دانمان پیا ناو پەیمانیان لەسەردا، ئینجا ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿فَٱشۡهَدُواْ﴾ کەواتە شایەتی بدەن لەسەر یەکتر لە بارەی ئەو پەیمان‌و دان پیانانەوە ﴿وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ منیش لەگەڵ ئێوەدا لەو شایەت دەرانەم،

فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ
مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾ قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ
أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ
مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٨٤﴾

---

﴿فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەرکەس پشتی هەڵکرد لەو پەیمانە لەپاش ئەو دان پیانانو لەسەر گرتنە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ هەر ئەوانە دەرچووی ڕاستەقینەن لە سنووری خواو بەدکارانی تەواون.

لەبەر ڕووناکی ئەم ئایەتەپیرۆزەدا کۆمەڵی پێغەمبەرانو شوێن کەوتووەکانیان بە یەکجار ئەکەونە بەرچاوی ژیریی بە کۆمەڵێکی پەیوەستی قۆڵگیری مل کەچ بۆ فەرمانو ئامۆژگاری پەروەردگار، هەموو یەک بەرنامەیان هەیە کە بەرنامەی خوایە، بەدوای یەک شتا ئەگەڕێن کە فەرمانبەریی خوایە، کەئەوەش شتێکە خوای میهرەبانو ویستی ژیانی ئادەمی لەسەر دامەزرێ، بەبێ گیروگرفتو لادانو دژایەتی، لە ژێر سەرکردایەتی پێغەمبەرەکانیاندا، بەپێی ئەو پەیمانەو بەپێی ئەو بۆچوونو تێگەیشتنە ئایینی خوا هەریەک شت سەرنج ئەدریو بڕواداران یەک دڵو یەک هەستو یەک فام ئەبنو هیچ جۆرە دووبەرەکیو ڕەگەزایەتیەک ڕوویان تێ ناکات، ئیتر هەرچەند چەرخو وڵاتیان دووربێت لە یەکتر، هەرچەند جیاوازی نەتەوەو نەژادو ڕەنگو زمانیان ببێ، کەواتە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کە ئەو نامەدارانەی شوێنی ئەم پێغەمبەرە نەکەوتنو یارمەتیان نەدا، ئەوانە هەرچۆنێ لە پەیمانی خواو فەرمانیو پەندی پێغەمبەرەکانیان دەرچوون، هەروەها لە ڕژێمی بوونەوەریش دەرچوونو خۆیان بە تەنیا خستووەو جوێ بوونەتەوە لەم بوونەوەرە پانو فراوانەدا، وەك ئاماژە ئەکات بۆئەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانەی کە پشت هەڵئەکەن

غەیری ئایینی خوایان ئەوێ‌و بەدوای دا ئەگەڕێن؟ ﴿وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ لە کاتێکدا کە هەر بۆ خوا گەردن کەچە هەرکەس کەوا لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا، بیانەوێ‌و نەیانەوێ، واتە هەموو ژێر بارو ملکەچن بۆ ئیرادەو خواهیش خوا پێیان خۆش بێ بەم ڕەنگە ئەوەی کە خوا ئەیەوێ بە گوێرەی ئارەزووی ئەوان بێت، یا پێیان ناخۆش بێ بەم ڕەنگە بەپێچەوانەی ئارەزوویان بێت، واتە بەهیچ کلۆجێ ملکەچیان پێ‌ناکرێ لە هەر شتێ کە خوا ئیرادەی کردبێ لێیان هەرچی خوا ویستبێتی هەر ئەوە ئەبێ.

بە چەند جۆرێ تریش ئەو دوو وتەیە: ﴿طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ تەفسیرکراوەتەوە، ئەو جۆرانە ئەندازێ سەختی‌و زۆرە زماییان تیایە، بەبێ پێویستی‌و ناچاری پێیان، بەڵام ئەم جۆرەی کە وتمان زۆربەی زانایانی لەسەرەو بێ‌ئەرکیشە، بێجگە لەوانەش بەم جۆرە ڕێکترە لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا، وەك ئەم ئایەتە: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوا سوجدە ئەبات هەرکەس وا لە ئاسمانەکان‌و هەرکەس وا لە زەوی دا بەکورتی مەبەست ئیسلام‌و ملکەچی نیە لەپەرستن‌و گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداریدا، بەڵکو ملکەچیە بۆ خواهیش‌و بڕیارو قەزاوقەدەری خوا، واتە ئایا چۆن پشت هەڵئەکەن‌و لائەدەن لە ئایینی خوایەکی وا کە هەموو کەس گەردن کەچە بۆ ئیرادەو بڕیاری، ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ لە ڕۆژی دواییشدا هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێنرێنەوە کەلەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێ ئەکرێ لەم پشت هەڵکردن‌و بڕوا نەهێنانەتان؟

ئینجا کاتێ کە ئایینی خوا هەر یەکەو هەموو پێغەمبەران بۆ یەك مەبەست ڕەوانەکراون کە پەرستنی خوایە بە تەنیا، کاتێ دەرکەوت کە بەپێی ئەو پەیمانەی خوا وەریگرت لە پێغەمبەران، ئەبێ هەموو کەس بڕوابێنن بەو پێغەمبەرە(ﷺ) هەموو ببن بە یەك میللەت، لەپاش ئەوە فەرمان ئەدا کە ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) ڕایگەیەنێ‌و دەربڕێ بڕوای خۆی‌و هەموو شوێنکەوتوانی بە نامەو پەیامەکانی خواو پێغەمبەرەکانی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ئێمە بڕوامان هێناو بڕوامان هەیە بە خوای تاك‌و تەنیا کە ناوی ﴿الله﴾یە

﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا﴾ ئەو قورئانەی کە هێنرایە خوارەوە بۆ سەرمان ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ﴾و بەوەی نێررایە خوارەوە بۆسەر(ئیبراهیم) ﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ﴾و بۆسەر ئیسماعیل‌و ئیسحاقی کوڕی ﴿وَيَعۡقُوبَ﴾ بۆسەر یەعقوبی کوڕی ئیسحاق ﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ وە بۆسەر کوڕو نەوەکانی ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ﴾و بەوەی کە درا بە موسا کە تەوراتە ﴿وَعِيسَىٰ﴾و بەوەی درا بە عیسا کە ئینجیلە ﴿وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾و بەوەی کە درا بە هەموو پێغەمبەرەکان لە لایەن پەروەردگاریانەوە ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچکام لە پێغەمبەرەکانی خوادا لە بڕواپێهێناندا، بەم ڕەنگە بڕوامان بە پێغەمبەرێتی هەمووان هەیە چوون یەك، نەك وەك جوولەکە کە بڕوایان نیە بە عیساو محمد، نەك وەك گاور کە بڕوایان نیە بە محمد ـ سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران بێت ـ ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ ئێمە بۆ خوای خۆمان ملکەچین بە گوێڕایەڵی‌و بەجێهێنانی فەرمانەکانی‌و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکانی، گەردن کەچین بە ڕەزامەندی‌و پێخۆشبوونی دڵەوە.

ئایەتەکەی دەست پێکرد بە دەربڕین‌و جاڕان بە بڕوا، دوایی هێنا بە دەربڕین‌و جاڕ دان بە ئیسلام، واتە ئەو ملکەچی‌و گوێڕایەڵیە کە بەرو بەرهەمی بڕوای ڕاستەقینەیە، کەواتە ئیسلام پێك نایەت‌و بەدی نایەت بە تەنیا بڕوایەکی ڕووتی ساردو سڕی دەروونی، وە پێك نایەت‌و بەدی نایەت بەو بڕوا ڕووتە لەگەڵ وتنی شایتمانی تەنیا بێ شوێنکەوتنی بەرنامەی خواو پەیڕەوی ئەو شەریعەتەی کە خوا پێغەمبەرانی پێ ڕەوانە کردووە، پەیڕەوی کردنی لە هەموو بارو ڕوویەکەوە بە جۆرێ بکرێ بە بەرنامەی ژیان‌و سەرکردایەتی تەنیا بۆ ئەو ڕەوا بدرێ بەبێ تێکەڵ‌و پێکەڵی هیچ جۆرە هاوبەشێك.

ئەو ئیسلامەی کە خوا ئەیەوێ تەنها ئەوەیە، ئەو ئیسلامەی کە هەموو پێغەمبەرانی لەسەرە تەنها ئەوەیە، جا لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا﴾ هەرکەسێك داوای غەیری ئیسلام بکات بە ئاین بۆ خۆیی و ئایینێکی تر وەرگرێ ﴿فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ هەرگیز لێی وەرناگیرێ و بە ئاین دانانرێ بۆی، بەڵکو بەبێ بڕوا و بەبێ ئاین سەیرئەکرێ، چونکە ئاین لای خوا هەر ئیسلامە، وەك لە پێشەوە بە درێژیی باسکرا، ﴿وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئەوکەسە لە ڕۆژی دوایی دا لە زەرەرمەندو زیان بارانە. لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوە ئەم ئایەتە لەگەڵ چوار ئایەتەکەی دواییدا سێ شت وتراوە:

١- لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە هاتنە خوارەوە بەبۆنەی تاقمێکەوە کە بڕوایان هێنا و لەپاشدا هەڵگەڕانەوە چوون بۆ ناو بت پەرستەکانی مەککە، لەپاشدا مانەوە لەوێ بە ئومێدو چاوەڕوانی نەمانی پێغەمبەر(ﷺ) قاپی تەوبەی کردەوە بۆ هەرکەسێك کە ئەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام.

٢- هەر لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە چوار ئایەتەکەی داهاتوو هاتنە خوارەوەلەجوولەکەکانی مەدینەداکەلەپێش ڕەوانەکردنیدابڕوایان هێنابەڕەوانەکردنی، بەڵام کە ڕەوانەکرا پەشیمان بوونەوە لەبەر حەسادەتی ئەوە کەلە خۆیان نیە.

٣- لە(حەسەن)ەوە کە هاتوونەتە خوارەوە لە نامەدارەکاندا گاورو جوولەکە کە ناونیشانی پێغەمبەریان بینی لە نامەکانیاندا، شایەتیاندا کە ڕاستە، بەڵام کاتێ کە ڕەوانەکرا پەشیمان بوونەوە لە حەسادەتدا، بێگومان ـ وەك چەند جار وتمان ـ ئایەتەکانی قورئان لە خۆیاندا پەیوەستن بەیەکترەوە، ئیتر هۆی هاتنە خوارەوەیان هەرچی بووبێ، ئەگەر هۆی هاتنە خوارەوە کە پەیوەندی ببێ بە مەبەستی سورەت و شوێنەکەوە ئەوە چاکتر پەیوەستی ئایەتەکان دەردەخات، جا لەبەرئەوەی سورەتەکە هەر لە یەکەمجارەوە لەگەڵ نامەدارەکان ئەدوێ ئەو ڕیوایەتەمان بەلاوە بەهێزترە کە ئەفەرموێ ئەم ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە دەربارەی نامەدارەکان کەلە پێشەوە بڕوایان بوو بە هاتنی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) و شایەتیان دا لەسەر ڕاستی خۆی و ئایینەکەیی و لەپاشدا کە هات هەڵگەڕانەوە لە بڕواهێنان و شایەتیەکەیان،

كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ
وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾

---

**ئینجا بابێینەسەر ئایەتەکە کە زۆر ڕێکو دەقە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتەدا: ئەفەرموێ: ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا﴾ ئایا چۆن خوا ڕێنموونی گەلێك ئەکات کە ﴿كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ بێبڕوابوون لەپاش بڕواهێنانیان ﴿وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ﴾ شایەتیان دا کە نێرراوەکەی خوا ـ واتە محمد ـ ڕاستە ﴿وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ بەڵگەو نیشانە ئاشکراکانیان بۆ هات لەسەر ڕاستی ئەو نێرراوە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات ـ واتە ئەو بێبڕوایانەی کە ستەم لە خۆیان ئەکەن بەبیرنەکردنەوە.**

**خوای پەروەردگار باوی وایە ئەو کەسانەی کە بیرو ژیریی خۆیان نەخەنە کارو بەهۆی ئەوەوە ستەم لە خۆیان لە بیرو ژیریی خۆیان ئەکەن، خوا ڕێنموونی ئەوانە ناکات چ جای ئەوانە کە ئایینی ڕاستیان بۆ هاتبێ و ناسیبێتیانو لەپاشدا ڕوویان لێ وەرگێڕابێ.**

**﴿أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ﴾ ئەوانە سزاو تۆڵەیان ئەوەیە ﴿أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ کە نەفرینی خواو فریشتەو هەموو مەردومیان لەسەرە، واتە لە میهرەبانی خوا دەرئەکرێنو فریشتە ڕقو خەشمی هەیە بۆیان شایستەی نەفرینی هەموو مەرومانیشن بەجۆرێ ئەگەر هەمووئەمڕۆنەفرینیان لێ نەکەن لەڕۆژی دواییدا ئەونەفرینەیان لێ ئەکەن، وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ لەپاشدا ڕۆژی دواییدا بێبڕوا ئەبن بەیەکترونەفرینی یەکتر ئەکەن. ئەوانە ئەو نەفرینەیان لەسەرە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لە کاتێکدا بەهەمیشەیی ئەمێننەوە تیایدا، ئەوە بارو حاڵیانە ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ سزایان لێ سووك ناکرێ، مۆڵەت نادەینو ڕێگەی هیچ بڕوبیانوو-یەکیان نامێنێ، خوا پەنامان بدات لە خەشمو سزای خۆی. ئەوانە هەرچەند تاوانبارن، بەڵام خوای میهرەبان قاپی تەوبەیان لێ داناخات، بەڵکو ئەو قاپییەی لەسەر پشتە بۆ هەموو تاوانبارێك کەبیربکاتەوەوپەناببات لەمیهرەبانی خواپێش ئەوەی کاتو هەلی لەدەست بچێت،**

إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ
إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾ لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ

**لەبەرئەوە ئەفەرموێ:** ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ ﴾ **مەگەر ئەوانەی کە گەڕابنەوەو تەوبەیان کردبێ لەپاش ئەو بێ بڕوایی‌و هەڵگەڕانەوەی کە کردیان، کردەوەی چاکیان کردبێ لە جێگەی خراپەکانیاندا، ئەوانە بەری ئەو هێرش‌و هەڕەشە سەختە ناکەون** ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ **چونکە بە ڕاستی خوا زۆر لێخۆشبووی میهرەبانە، کەواتە ئەبووری لەو تۆبەکەرانەو میهرەبانیان دەرباره ئەکات، بەڵام ئەوانەی کە ناگەڕێنەوە بۆلای خواو سوورن لەسەر بێبڕوایی‌و تا بێت بێبڕوایی زیاد ئەکەن، ئەوانەی کە سەر ئەکەنە تاوان‌و بێبڕوایی تا ئەمرن‌و کات‌و هەلیان لە دەست ئەچێ، ئەوانە ئیتر تۆبەیان لێ وەرناگیرێ‌و سزای سەختیان هەیە، وەکو ئەفەرموێ:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ﴾ **بەڕاستی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون لەپاش بڕوا هێنانیان** ﴿ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا ﴾ **لە پاش ئەوە زیاتر بوون لەبارەی بێبڕواییەوە، بە بەرگری کردنی ئایینی خواو ئازاردانی پێغەمبەرەکەی‌و ڕێگرتن لە گەیاندن‌و بڵاوبوونەوەی ئایینی خوا، یا وەك جوولەکە کە لە پێشەوە بڕوایان بوو بە پێغەمبەران‌و نامەکانی خوا لە پاشدا بڕوایان بە عیساو ئینجیل، ئینجا بێبڕواییان زیادی کرد بە بڕوا نەهێنانیان بە قورئان‌و پێغەمبەرمان(ﷺ) یان نامەدار بە تێکڕایی کە لە پێشەوە بڕوایان بوو بە هاتنی قورئان‌و پێغەمبەرمان(ﷺ) لە پاشدا کە هاتن بڕوایان پێ نەهێنان، ئینجا بێبڕواییان زیادی کرد بە سەرکێشی‌و پیلان‌و ڕێگرتنیان لە ئیسلام‌و موسڵمانان، ئەوانە** ﴿لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ ﴾ **هەرگیز تۆبەکەیان وەرناگیرێ، لەبەرئەوەی ئەوانە تۆبە ناکەن، مەگەر کاتێ گیانکەنشت‌و نائومێد بوون لە ژیان، وەك(حسن‌و قتادە) ئەفەرموون، بێگومان تۆبەی ئەو کاتەش وەرناگیرێ، یان لەبەرئەوەی تۆبەکەیان لە دڵەوە نایەت، بەڵکو بە ناپاکی‌و ڕووپامایی ئەیکەن، وەك(ئیبن‌و عەباس) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ، یان لەبەر ئەوەیەو ئەوانە**

تۆبەکەیان بێبڕوایی و هەڵگەڕانەوەی بەدوا هاتووە، وەك(ئیمامی ڕازی) ئەفەرموێ. یان ئەوانە ئەو نامەدارانەن کەلەپێشەوە بڕوایان هێنا لەپاشدا هەڵگەڕانەوە، ئینجا چەند گوناهێکیان کردو لەپاشدا تۆبەیان کرد لەو گوناهانەو بەڵام هەر لەسەر هەڵگەڕانەوەو بێبڕوایی مانەوە، وەك(ئیبن و جەریر) ئەفەرموێ. دەی دیارە هەر تۆبەیەك کەبڕوای لەگەڵ نەبێ وەرناگیرێ، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار ئەم ئایەتە دژی ئایەتی پێش ئەم نیە کە بەڵێن و هەواڵی دا بە وەرگرتنی تۆبەی ئەوانەی کەلە بڕوا هەڵگەڕابنەوە.

ئەوانەی کەلە ئایەتەکەدا باسکران و تۆبەیان لێ وەرناگیرێ ﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴾ هەر ئەوانەن گومڕای تەواو ئەوەندە دامەزراون لە گومڕایی دا وەك هەر ئەوان گومڕابن واتە بێبڕوا سێ بەشن:

١- ئەوانەی کەبەڕاستی تۆبە ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، وەك باسکرا لە ئایەتی پێشوودا کە فەرمووی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ ﴾.

٢- ئەوانەی کە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ بەو شێوەی کەباسمان کرد لەم ئایەتەدا کەلە تەفسیری بووینەوە.

٣- ئەوانەن کە بەبێ تۆبە ئەمرن لەسەر بێبڕوایی، ئەوانەش ئەم دەستەیەن کەلێرەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا و مردن لە کاتێکدا کە بێبڕوابوون، واتە بەبێ بڕوایی مردن ﴿فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا ﴾ بەهۆی ئەو مردنەیان بە بێبڕوایی هەرگیز وەرناگیرێ لە هیچ کامێکیان پڕی زەی لە ئاڵتوون کە بیکات بە خێرو صدەقە لە جیهاندا بۆ ڕزگاربوونی ڕۆژی دوایی، وە هیچ سوودی نابێ بۆ ئەو ڕۆژەی، چونکە هەر کردەوەیەکی چاك بڕوای لەگەڵ نەبێ لای خوا هیچ نرخێکی نیە ﴿وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓ ﴾ ئەگەر ئەو ئەندازەش ببێ و لە ڕۆژی دوایی داو بیکا بە فیدیەی خۆی و لە بریتی خۆیدا بیدا هەر لێی وەرناگیرێ و ڕزگاری ناکات، یان مەبەست ئەوەیە ئەوانە هیچ فیدیەو بەدەلێکیان لێوەرناگیرێ با ئەو فیدیەو بەدەلە پڕی زەوی بێ لە ئاڵتوون، یان پڕی زەوی ئاڵتوون وەرناگیرێ باوێنەی ئەوەیشی لەگەڵ بێت و دوو چەندانە بکرێتەوە، بەهەرکام لەم جۆرانە مەبەستەکە ڕێك و گونجاوە و ئایەتی تر هەیە کە قۆڵگیری بێ.

ئەو سیاچارانە بەسێجۆر هەڕەشەی لێکردن:

جۆری یەكەم: ئەمەبوو كە پڕی زەوی ئاڵتوونیان لێ وەرناگیرێ.

جۆری دووەم: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆیان هەیە سزایەكی سەختی ئازاردەر.

جۆری سێیەم: ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ نیە بۆیان هیچ یارمەتی دەران.

لەپاش ئەوەی ئاماژەی كرد بۆ بێكەڵكی بەخت كردنی ماڵ لەلایەن بێبڕوایانەوە، ئینجا ڕووی فەرمووده ئەكاتە بڕواداران و فێریان ئەكات كە بە شێوەیەك ماڵ بەخت بكەن سوودی باشی لێ وەرگرن، ئەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ﴾ هەرگیز ناگەن بە خێرو چاكەی تەواوو ڕاستەقینە ﴿حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾ هەتا بەخت نەكەن لە ڕێی خوادا لەو ماڵ و داراییەی كە خۆشتان ئەوێ و دڵتان پێی خۆشە. بەڵێ شتێكی ئاشكرایە هونەرو ڕاستی لەوەدایە كەلە ڕێی خوادا شتێ بدرێ كە خۆشەویست بێت، هەر ماڵێك نەویستە بێت دڵ دڵ پێی خۆش نەبێ بەخشینی هیچ منەت و ئازایی تیانیە، جا موسڵمانان لە كاتی خۆیدا تێگەیشتن لەو مەبستە، لەبەرئەوە ئەگەڕان لەهەر ماڵێ خۆشەویست بوایە لایان لە ڕێی خوادا ئەیاندا، لەوبارەیەوە ڕووداوی زۆر هەیە كە لە حەدیسی صەحیحدا هاتوون، یەكێ لەوانە: ئەمەیە كە(ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و موسلیم) ئەیهێنن لە(ئەنەس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- كە ئەفەرموێ:(ئەبو تەڵحە) دەوڵەمەند ترینی ئەنصاریەكان بوو، خۆشەویسترینی ماڵەكەی بیر(حا )بوو كەلە بەدرەمی مزگەوتدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەموو جارێ ئەچووە سەر ئەو ئاوەو لێی ئەخواردەوە كە ئاوێكی پاك و شیرین بوو،(ئەنەس) ئەفەرموێ: كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە(ئەبو تەڵحە) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا ئەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾ ڕاستی خۆشەویست ترین ماڵم بە لامەوە بیری(حا )ە، ئەوا صەدەقە بێت لەڕێی خوا بە ئومێدی پاداشتی لای خواو زەخیرە بێت لای. كەواتە خوا چۆنت نیشان ئەدا وای لێبكە، ئینجا پێغەمبەریش فەرمووی بەخ بەخ، ئەوە ماڵێكی بەڕەواجە. ئەوە ماڵێكی بەڕەواجە قسەكەتم بیست. من ڕام وایە كە بیدەیت بە خزمەكانت،(ئەبو تەڵحە)ش ووتی: وا بكە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش دابەشی كرد لە خزم و ئامۆزاكانی. لەسەر ڕێباز ئەو فەرمان و ئامۆژگاریە ڕۆیشتن زۆر لە موسڵمانان، بەهۆی ئەوەوە ڕزگار بوون لە بەندەی ماڵ و لە چەكلی و چروكی دەروون و لە خود پەسەندی و خود پەرستی، بە ئازادی و سەربەستی گەیشتن بەو پۆپەو ئاسۆ بەرزە،

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ هەرشتێ ئێوه بەختی بکەن‌و بیدەن بەهەرکەس بێگومان خوا زاناو ئاگاداره پێی، کەواته پاداشتان ئەداتەوه بەپێی چاکی‌و کەم نرخی شتەکەو نیازو نیەتی خۆتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەکات، بەم فەرموودەیه هانی بڕواداران ئەدا لەسەر ئەوەی بەپێی دەسەلاّت‌و توانا شتی چاکه بەخت بکەن‌و نیازیشیان هەر فەرمانبەری‌و ڕەزامەندی خوابێت، ئەشیان ترسێنێ لەوەی کە بەپێی ڕەزامەندی ئەو نەجووڵێنەوه، خوابەبەزەیی خۆی بمانخاتەسەر ڕێ ڕاستەکەی‌و دامەزراومان بکات ـ آمین ـ.

و صلى الله وسلم على حبيبه محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

به یارمەتی خوا لێبوومەوه له تەفسیر ی جزمی سێیەم له ٨ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٤٠٥. وه هەر لەم ڕۆژەدا دەستم کرد به تەفسیری جزمی چوارەم، داواکارم که خوای میهرەبان وەری گرێ و یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی که ماوه، وه نەمکوژێ هەتا له تەفسیری ئەم قورئانه ئەبمەوه. ـ آمین ـ